زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ژمارە (٧٧٤)
سەرپەرشتیاری گشتیی زنجیرە
ئازاد بەرزنجی



www.sardem.org

■ سێکس و دەروون

نووسینی: د. عەلی کەمال

وەرگێڕانی: سۆزان جەمال

بابەت: سایکۆلۆژی

دیزاینی ناوەوە: ڕەوشت محەمەد

دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخ: ١٥٠٠٠ دینار

چاپی یەکەم: چاپخانەی (سەردەم) ساڵی ٢٠١٥ کوردستان ـ سلێمانی

■ لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١١٢٥)ی ساڵی ٢٠١٥ی پێدراوە

# سێکس و دەروون

نووسینی: د. عەلی کەمال

وەرگێڕانی: سۆزان جەمال

٢٠١٥

**ناونیشانی کتێبەکە**

د. عەلی کەمال

الجنس والنفس

دارالواسط، لندن، الطبعة الاولى ١٩٨٥

## ناوەرۆك

# پێشەکیی نووسەر

ئەم کتێبە لە ڕیزی پێشەوەی کارەکانی من نەبوو لە نووسیندا، دەشێ بە هیچ شێوەیەک هەر بە مێشکمدا نەهاتبێ کتێبێکی لەم جۆرە بنووسم، لەوانەیە هەر لەبەر ئەوەش بێت، ئەم کتێبە بەر لە سات و ڕۆژگاری خۆی هاتە بەرهەم. ئەم لەدایکبوونە لەناکاو و زووە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، چەند ساڵێک لەمەوبەر بۆ پێشکەشکردنی توێژینەوەیەک لە کۆنگرەیەکی جیهانی بانگێشت کرام، کۆنگرەکە لە بەغدا لە لایەن ڕابیتەی جیهانییەوە بۆ ڕێکخستنی خێزان، بەسترا، داوام لێ کرا توێژینەوەیەکم هەبێت دەربارەی یەکێک لەو بابەتانەی کە پەیوەندییان بە ژیانی سێکسییەوە هەیە، داواکەم قبووڵ کرد، لە کاتێکدا بە تەواوی لە فراوانیی ژیانی سێکسی و وێڵگە نەدۆزراوەکانی ئەم ژیانە، هەروەها ئەستەمیی هەڵبژاردنی یەکێک لە بوارەکانی ژیانی سێکسی وەک بابەتێک بۆ توێژینەوە، ورد نەبووبوومەوە.

هەروەها لەو کاتەدا دەرکم بەوە نەکردبوو کە توێژینەوە لە بابەتە سێکسییەکاندا چەندە قەدەغەیە و چۆن خەڵکی لێی دەسڵەمنەوە و بەئاگاییەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکەن، بە شێوەیەک هەندێجار و لە زۆربەی کۆمەڵگەکاندا بابەتە سێکسییەکان وەک زەوییەکی تابۆ دەردەکەون، ئەوەی لەو زەوییەدا چێنراوە وەک توندڕەوی و نەزانین و لادان و بەدگومانی و بەدتێگەیشتن و هەستیارێتی و دووڕوویی و چەندەها هەڵوێستی دیکە، کە وەک

مین وان، هەر ئەوەندە نییە کە دەبنە بەربەست لە بەردەم توێژینەوەی زانستی و شێنەیی لە بابەتی سێکسیدا، بەڵکو توێژەر ڕووبەڕووی مەترسیی ڕۆچوون و پێ هەڵخلیسکان دەبێتەوە، هەروەک بڵێی بەناو لمێکی فشەڵدا هەنگاو دەنێ و قاچی ڕۆدەچێ، بێش ئەوەی خۆی پێی بزانێ.

ئەستەم بوو لەسەر بابەتێک جێگیر ببم و توێژینەوە و بەدواداچوونی لەسەر بکەم، چونکە هەر زوو ئەوەم بۆ دەرکەوت، ژیانی سێکسی زۆر لەوە زیاترە کە لە ڕواڵەتدا دەردەکەوێ، هەروەها بۆم دەرکەوت ئەم ژیانە فرەلایەن و فرەلقە بەناو هەموو لایەنەکانی ژیان و چالاکیی مرۆییدا پەلی هاویشتووە، بەم شێوەیە خۆم بینییەوە سەرجەم ئەملایەن و بوار و لقانەم، هەندێکیان، بەهۆی تێڕامانەوە، هەندێکیان بەهۆی ویست و ئیرادەوە، یان بەهۆی قووڵبوونەوە و بەردەوامبوونەوە، بڕیوە. دەرکم بە خۆم نەکرد من لەناو جەرگەی ئۆقیانووسێکی بەرفراواندام، کە لە ئامانجی توێژینەوە لە بابەتێکی دیاریکراو لام داوە و تێپەڕیوم، بۆم دەرکەوت ئاسانترە بۆم کە توێژینەوە لەسەر لایەنە جیاوازەکانی ژیانی سێکسی بکەم، هەر واشم کرد. ئەم کتێبەی بەردەستیشتان تا ئاستێکی زۆر گەشتێکە بەناو بابەتەکانی ژیانی سێکسیدا زیاتر لەوەی توێژینەوەیەک بێت دەربارەی ژیانی سێکسی بە هەموو لایەنەکانییەوە.

* * *

لەو پارادۆکسانەی ئەگەر نەڵێم، لەو دژبەیەکانەی کە شایەنی تێڕامان و توێژینەوەی جیددی-ین، ئەوەیە لە کاتێکدا پاڵنەری ڕەفتاری سێکسی، پاڵنەرێکی سەرەکی و گشتی و پێویستە لە ژیانی مرۆڤدا، هەروەها ژیان بەبێ ئەو بەردەوام نابێ، هەرچەندە مرۆڤ دەتوانێ بێ سێکس بژی، بەڵام لە هەمان کاتدا مرۆڤ پاڵنەری سێکسی لە ژیانی سێکسی و ڕەفتاری سێکسیدا بە نهێنی

دەهێڵێتەوە، هەروەک بڵێی ئەم پاڵنەرە یەکێک نەبێت لە پاڵنەرەکانی ژیانی سێکسی و ئەم ژیانە ئەوەندە دەشارێتەوە تا ئەو ئاستەی دەرگای هەر تێگەیشتنێک لێی کڵۆم دەدات، هەروەها پێی وایە پێویستە هەڵوێست وەربگرێ بەرامبەر ئەو مەسەلە سێکسییە شاراوە و ئاشکرایانەی کە لەگەڵیدا ناگونجێن، یان لەگەڵ پاڵنەر و ئارەزوو و پراکتیزە ڕاستەقینەکانی ژیانی سێکسیدا دژ دەوەستنەوە.

ئەم پارادۆکسانە لە ژیانی بوونەوەرانی زیندووی دیکەدا بوونیان نییە، هەروەها ئەم پلە بەرزەی دژبەیەکی لە هیچ بوارێکی مرۆیی دیکەدا هاوشێوەی نییە. هەرچەندە ئێمە لێکدانەوەمان هەیە بۆ ئەوەی، بۆچی مرۆڤ ژیانی سێکسی لە نهێنی و پەنهاندا دەهێڵێتەوە، هەروەها لێکدانەوەمان هەیە بۆ ئەوەی، بۆچی هەڵوێستی دژبەیەکی شاراوە، یان ئاشکرای بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان هەیە، هەروەها دەزانین ئەم هەڵوێستانە لەپێناوی گوێڕایەڵبوون بۆ یاسا و ڕێسا کۆمەڵایەتی و بیروبۆچوونە ئایینییەکان پێویستن، هەروەها بۆمان دەرکەوتووە کە ئەمانە تایبەتمەندی و سەرنجڕاکێشانێکی تایبەتی و تاموچێژیان بە ئارەزووی سێکسی بەخشیوە و بەهێزیان کردووە، بەلام لە هەمان کاتدا دەبینین، قاڵبوونەوە لە بەنهێنیهێشتنەوەی سێکس و درێژبوونەوەی پارادۆکسەکان لە نێوان مەسەلە پەنهان و ئاشکراکانی سێکس تا سنوورێکی زۆر، دەشێ دەرئەنجامی نێگەتیڤیان لێ بکەوێتەوە لە ژیانی تاکدا، چونکە ئەو کەسە بەم شێوەیە ناچار دەبێت لە دوو شێوازی ژیانی سێکسی و دەروونیی جیادا بژی، کە ئەمەش دەبێتە هۆی ڕوودانی ململانێی دەروونی، سەرباری واقیعی نەفامی و لایەنگیری و دووفاقی و لادان، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئێمە حەز دەکەین تایبەتمەندێتیی ژیانی سێکسی تا ئەوپەڕی بە پارێزراوی بمێنێتەوە، بەلام پێویستە ئەمە لە

باکگراوندی نەزانین و نائاشنابوون بە ژیانی سێکسی و پێگەی سێکس لە ژیانی مرۆڤایەتیدا ڕوونەدات، هەروەها زیادەڕۆیی لە بەنهێنیهێشتنەوەی ژیانی سێکسیدا نەکرێ، تا ئەو ئاستەی مرۆڤ تووشی دژبەیەکی ببێ لە نێوان ئەوەی ئاشکرایە و ئەوەی کە بەڕاستی تیایدا دەژی، چونکە ئەم دژبەیەکییە دەشێ نەک هەر تایبەتمەندێتیی سێکس و بەها-کەشی وەک هێزێکی کۆمەڵایەتی لەناوببات، بەڵکو دەشێ بەهای سێکس وەک وزەیەکی بزوێنەر و خوڵقێنەر کە لەنێو هەموو وزەکانی دیکەی مرۆڤدا هاوشێوەی نییە، ژیانی تاک و ژیانی کۆمەڵگە و تەواوی ژیانی مرۆڤایەتیش، لەناوبەرێ.

* * *

گرنگترین خاڵ کە توێژەر لە بابەتی ژیانی سێکسیی توخمی مرۆڤدا تێبینیی دەکات، فرەیی هەڵوێستەکانە لە بەرامبەر سێکسدا کە لەنێو کۆمەڵگەیەک بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە، یان سەردەمێک بۆ سەردەمێکی دیکە و لە نێوان تاکێک و یەکێکی دیکەدا و تەنانەت لە لای تاکەکەسێک، لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دیکە جیاوازە، هەروەها توێژینەوە و ڕاپرسییەکان ئەوە ئاشکرا دەکەن، نەگونجانێکی زۆر هەیە لە نێوان هەڵویستە ڕواڵەتییەکان بەرامبەر بە سێکس لەگەڵ هەڵوێستە ڕاستەقینەکاندا کە تاک دەیاننوێنێت، یان خۆزگە دەخوازێ بیانکات ئەگەر بواری بۆ هەڵکەوێ، ئەم حاڵەتی نەبوونی سازانە لە نێوان هەڵوێستی شاراوە و هەڵوێستی ڕاستەقینەی مرۆڤدا، بووەتە هۆی خوڵقاندنی پێوەرێکی دوانی بۆ تێڕوانین لە مەسەلە سێکسییەکان، کە یەکێکیان پێوەرێکی ئاشکرایە و لەگەڵ پێداویستییە کۆمەڵایەتییە باوەکاندا دەگونجێ، ئەوی دیکەیان، یان هەڵوێستی دووەمیان، هەڵوێستێکی شاراوەیە، کە لەگەڵ هەستەکانی مرۆڤدا دەگونجێ و لەگەڵ ئەو ئارەزووانەی کە تاک لە ناخ و دەروونیدا حەزی لێیانە، یان بەڕاستی و لە

واقیعدا بە نهێنی پراکتیزەیان دەکات. ئەم حاڵەتە لە دوالیزم لە هەڵوێستدا، دەشێ بە هەمان شێوە و هەمان پلە لە هەڵوێستەکانی دیکەی مرۆڤدا بەرامبەر بە مەسەلەکانی دیکەی ژیان، بوونی نەبێ، هەروەها دەشێ حاڵەتێک لە ململانێی دەروونی دروست بکات لە نێوان زەروورەتی پابەندبوون بە یاساکانی کۆمەڵگەوە، لەگەڵ زەروورەتی وەڵامدانەوە بۆ پێداویستییەکانی تاک و خەیاڵ و مەیل و ئارەزووەکانی کە دەشێ لە ڕێساکانی کۆمەڵگە دەربچن، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم ململانێیە کاریگەریی نێگەتیڤ بۆ سەر ژیانی دەروونیی تاک و ڕەفتار و هەڵسوکەوتەکانی دروست دەکات، بەڵام ئەم دوالیزمە لە هەڵوێستەکاندا، هەندێ سوودی پۆزەتیڤیشی هەیە، ئەویش ئەوەیە، دەشێ ڕێگری بکات لە ئازادیی سێکسی و ئەگەری چاوپۆشین و ئیباحییەت لە مەسەلە سێکسییەکاندا، کە ئەم حاڵەتانە وا دەکەن ژیانی سێکسی تەنیا پێداویستییەکی بایۆلۆژیی ئاژەڵی بێ و لە ژیانی دەروونی و ژیانی مرۆڤایەتی جیاکراوە بێ، لەبەر ئەوە پێویستە شێوازێکی شیاو لە هەڵوێستەکانماندا بگرینە بەر، بە جۆرێک پارێزگاری لەوپەڕی هاوسەنگیی دەروونی بکرێ لەگەڵ پاراستنی بەها تایبەت و نموونەییەکانی ژیانی سێکسی. وا دەردەکەوێت گەیشتن بەم شێوازە قورس بێ، یان هەڵسوکەوتکردن و کۆنترۆڵکردنی هەست و ڕەفتارمان بەپێی ئەو شێوازە، ئەستەم بێ.

* * *

وەک زانراوە لە کولتووری تاکەکەسی و گشتیماندا، دواکەوتن و نائاشنابوونێکی زۆر بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان لە ڕووی سروشت و ڕێڕەوی ئەم ژیانەوە هەیە، هەروەها لە ڕووی ڕەهەند و گیروگرفتەکانی و هەموو ئەو مەسەلانەی کە پەیوەندییان پێوەی هەیە. ئەمەش تەنیا ئاستی ڕۆشنبیریی تاکەکەسی ناگرێتەوە لەنێو ڕەشایی خەڵکدا، بەڵکو ئەو کەسانەش

دەگریتەوە کە پێویستە زانیاریی تەواویان دەربارەی هەقیقەتە سەرەکی و گونجاوەکان دەربارەی ژیانی سێکسی هەبێت، چونکە پرۆگرامەکانی خوێندن، لە هەموو قۆناغەکانی خوێندندا هەر لە سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندییەوە تا دەگاتە کۆلێژ و زانکۆکان، وەک ئەوە وایە بەدەر بن لە بوونی هەر ئاماژەیەک بۆ بابەتە سێکسییەکان، تەنانەت لە کۆلێژی پزیشکی، ژیانی سێکسی لە پرۆگرامی خوێندندا نییە، لە کاتێکدا بواری پزیشکی یەکێکە لەو بوارانەی خوێندن کە وا پێویست دەکات بە چڕوپڕی بابەتەکانی ژیانی سێکسی بخوێنرێ.

ئەم واقیعە جۆرێک لە حاڵەتی شەرمندەیی بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان دروست کردووە، کە بوونەتە هۆکاریش بۆ ڕەتکردنەوە و شاردنەوە و نەفامی، کە ئەمانە تەنیا مەترسیی ئەم فەرامۆشکردنە نین. لەوانەیە مەترسیی دووەم و مەترسیی گەورە ئەو بۆشاییە بێت کە لە ئەنجامی ئەم فەرامۆشکردنەوە پەیدا دەبێ، کە ئەو بۆشاییە بە لێشاوێک لە زانیاریی هەڵە و زیانمەند و گومڕا پڕ دەبێتەوە کە دەبێتە مایەی بەدحاڵیبوونی زیاتر و زیاتر شێواندنی ژیانی سێکسی لای نەوەی تازە، بە جۆرێ کە نەتوانرێ لە ئایندەدا لەڕێی هیچ هۆکارێکی ڕۆشنبیرکردنەوە چاک بکرێتەوە. لەگەڵ دەرککردنی تەواومان بەو ڕاستییەی کە سڵەمینەوەیەکی شاراوە هەیە کاتێ ڕاشکاوانە باسی مەسەلە سێکسییەکان دەکرێ، بەڵام دەشێ لەڕێی پەیڕەوکردنی هەندێ شێوازی ڕۆشنبیرکردنی بابەتییانەوە کە وڵاتانی دیکە کاتێ ڕووبەڕووی ئەو جۆرە سڵەمینەوانە بوون، لە سەری ڕۆیشتوون، ئێمەش بتوانین ئەو سڵەمینەوە و هەستیارێتییە تێپەڕێنین کە لە باسکردنی بابەتەکانی سێکسیدا ڕووبەڕوومان دەبنەوە. چەندە توانیمان ئەم کارە خێراتر بکەین، ئەوەندە زیاتر دەتوانین خۆمان لەو دەرئەنجامە نێگەتیڤانە بەدوور بگرین کە زاڵبوونی شەپۆلی ڕاگەیاندنەکان دەربارەی

باسکردنی بابەتەکانی سێکس دروستیان کردووە، ئەویش بە ئامانجی دروستکردنی ورووژان و گومڕایی و گەندەڵی و لادان، ئەمەش ئەو ڕوخسارانەن کە کۆمەڵگەکەمان بە شێوەیەکی ئاشکرا و جاڕسکەرانە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر بە دەستییانەوە دەناڵێنێ.

* * *

لەوانەیە یەکێک لە گرنگترین دەرئەنجامە هەڵێنجراوەکانی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکان لە بواری مەسەلە سێکسییەکاندا لە ماوەی ئەم سەدەیەدا ئەوەبێ، کە قۆناغی منداڵی پلەیەک لە پلەکان ژیانی سێکسی لەخۆ دەگرێ، هەروەها فەرامۆشکردنی ئەم ڕاستییە هەڵەیەکی پەروەردەییە، کە دەشێ لە دواڕۆژدا ببێتە مایەی ئاڵۆزکردنی ژیانی سێکسیی منداڵ، دەرئەنجامی دووەمیش، بڕیاردانە، یان ددانننەنانە بە ژیانی سێکسیی مێ-دا، کە مەرج نییە پشت بە پیاو ببەستێ، فەرامۆشکردنی ئەم ڕاستییەش هەڵەیەکی گەورەی دیکەیە و دەبێتە هۆی ڕوودانی ئازار و کۆژان بۆ مێ، هەر بەڕاستیش ئەمە ڕووی داوە، هەروەها دەشبێتە هۆی لەناوچوونی سازان و گونجاندنی نێوان نێر و مێ. دەرئەنجامی سێیەمیش، ئەو دەرککردنە گەشەسەندووەیە بەوەی کە ژیانی سێکسیمان پەیوەندییەکی بەتینی بە ژیانی دەروونیمانەوە هەیە، کاتێ ئەم دوو ژیانە هەریەک ئەوی دیکە تەواو دەکات، تەنیا لەم کاتەدا مرۆڤ ڕزگاری دەبێ و ژیانی مرۆڤایەتی بە هێمنی بەسەر دەبات. ئەگەر هەریەک لە ژیانی سێکسی، یان ژیانی دەروونی، تووشی هەڵنوتان و کەوتن بوون، ئەوا ڕەنگدانەوەی بۆ سەر ئەوی دیکەشیان دەبێ و دەشێ مرۆڤ ئارامی و هاوسەنگی و کارابوونی ژیانی لەدەست بدات. دەرئەنجامی چوارەمیش ئەوەیە، دەشێ ژیانی سێکسی خۆی لە خۆیدا ببێت بە ئامانجێک، ئەو کەسەی سێکس پراکتیزە دەکات، دەشێ تەنیا مەبەستی چێژ و لەزەتبینین بێت، بێ ئەوەی بە پێداویستییەکانی منداڵخستنەوە و مانەوەوە پابەند بێ. ئەم دەرئەنجامانە گرنگیی خۆیان هەیە، هەرچەندە توانیویانە تێگەیشتنێک بۆ ژیانی سێکسی

بەدی بێنن، بەڵام هێشتا نەیانتوانیوە مۆراڵێکی نوێ بۆ ژیانی سێکسیی هاوچەرخ پێشکەش بکەن، هەروەها نەیانتوانیوە لە دوالیزمی هەڵوێستەکان بەرامبەر ئەم ژیانە، کەم بکەنەوە، لەوانەشە ئەوە کاری زانست نەبێ ئەم جۆرە مۆراڵە پێشکەش بکات، بەڵکو قورسایی ئەم کارە دەکەوێتە ئەستۆی تاک و کۆمەڵگە، کە ئەرکی پێشخستنی هەڵوێستەکان بەپێی داتا زانستییەکان لە ئەستۆی ئەوانە.

دەشێ ئەم جۆرە پێشخستنە لە دەرککردن بەم ڕاستی و داتایانە، لەڕێی هۆیەکانی فێربوونەوە زۆر دوا بکەوێ.

ناونیشانی (سێکس و دەروون)م بۆ کتێبەکەم هەڵبژارد، کە دەشێ بتوانێ ئاماژە بدات بە پەیوەستیی نێوان سێکس و دەروون لە ژیانی مرۆڤایەتیدا، لەو باوەڕەدام ئەم هەڵبژاردنە ئاستی توندوتۆڵی ئەو پەیوەندییە بەرجەستە بکات کە لە نێوان لایەنە سێکسی و لایەنە دەروونییەکان هەیە لە ژیانماندا، ئەمەش لەو بابەتانەدا ئاشکرا دەردەکەوێ کە باسم کردوون و چەندەها ڕوخساری چالاکی مرۆیی لەخۆ دەگرن کە نەدەکرا ئاماژەیان پێ بدەیت و باسیان بکەیت ئەگەر ئەو پەیوەستییە توندوتۆڵەی نێوان سێکس و لایەنەکانی دیکەی ژیان نەبوایە. بۆ هەر کەسێ کە ئاشنایەتیی لەگەڵ بابەتی ڕەفتار و پاڵنەرە سێکسییەکان و پێگەیان لە ژیانی دەروونیی مرۆڤدا هەبێ، ئاشکرایە کە من یەکەم کەس نەبووم دەرکم بەم پێگەیە کردبێ، زانایانی سایکۆلۆژی دەرکیان پێکردووە و بەتایبەتی فرۆید کە گەشەی سێکسی و گەشەی دەروونیی پێکەوە بەستووەتەوە و ناوی ناوە قۆناغەکانی گەشەی دەروونیی سێکسی، هەروەها لە سروشتی پەیوەندیی نێوان گەشەی سێکسی و گەشەی دەروونی و قۆناغەکانی ئەم گەشەیە کە تاک پیایاندا دەڕوات، بۆی دەرکەوتووە ئەمانە چ کاریگەرییەکی ڕیشەییان بۆ سەر گەشەی کەسێتی هەیە لە گەورەییدا و لە دوارۆژی ژیانی سێکسیی تاکدا، بەر لە فرۆیدیش چەندەها زانا و

فەیلەسووف دەرکیان بەم هەقیقەتە کردووە، هەروەها لە هەندێک ئایین و بیروباوەڕی شارستانییەت و کۆمەڵگەکاندا هاتووە.

لە هەموو سەردەم و شارستانییەت و کۆمەڵگەیەکدا ئەو کەسانە زۆرن کە بە ڕوانگەیەکی بایۆلۆژیی ڕووت لە مەسەلە سێکسییەکان دەڕوانن و پێیان وایە سێکس تەنیا شەهوەتێکە دەتوانرێ بە کورتترین شێواز، یان ڕێگە، ڕازی بکرێ. ئەم کەسانە پێیان وا نییە سێکس لە ژیانی دەروونیدا هیچ پێگەیەکی هەبێ، هەندێکیان لەوەندە زیاتریش دەڕۆن و دەڵێن، دەروون بەهۆی شەهوەتی سێکسەوە پیس دەبێ.

دەکرێ لەم هەڵوێستانە تێبگەین و دەرکیان بکەین، دەشێ هۆکارەکەی بۆ نەفامیی ئەو کەسانە بگەڕێتەوە و نائاشنابوونیان بەو هێز و وزە کارایانەی کە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا هەیە، یان ئەم ڕایانەیان لە بەئاگاییەوەیە، ڕا و هەڵوێستەکانیان، هەوڵێکی هۆشیارانەیە بۆ گۆڕین و ڕاماڵینی شوێنەواری ئاکارەکانی سێکس لە لایەنە جیاوازەکانی ڕەفتار و ژیان، ئەم کەسانە بەم شێوەیە خۆیان دەخەنە هەڵەوە و دەرگای تێرامان لە خۆیان کڵۆم دەدەن، هەرچەندە سێکس لە ژیانی دەروونییاندا بە کارایی دەمێنێتەوە و هەر کاریگەریی بۆ سەریان دەبێ، بەڵام خۆیان پێی نازانن و بەهۆی ئەو نەفامی و خۆ بەهەڵەبردنەدا خۆیان لە چێژبینین لە سێکس بێبەش دەکەن و بێئاگا دەمێننەوە لە جوانی و کاریگەریی سێکس بۆ سەر ژیانی دەروونی، لەگەڵ ئەوەشدا پاساو هەیە بۆ ئەوەی کە ئەم کتێبە لەبەر خاتری ئەو کەسانە نووسراوە، بەڵام زۆربەی زۆری پاڵنەرەکان بۆ نووسینی ئەم کتێبە لە قەناعەتمەوە دێ بەوەی سێکس مانا و گرنگیی زیاتر و قووڵتری هەیە بۆ سەر ژیانی دەروونیمان، زۆر زیاتر لەوەی کە دەربارەی پێگەی سێکس لە ژیاندا بیری لێ دەکەینەوە، یان بە مێشکماندا دێ.

* * *

له هەر قۆناغێک لە قۆناغەکانی نووسینی ئەم کتێبەدا، ناچاربووم ئەم پرسیارە لە خۆم بکەم: ئامانج لە نووسینی ئەم کتێبە چییە؟ یان ئەو تاک، یان گرووپ، یان خوێنەرانە کامانەن کە ئەم کتێبەیان ئاڕاستە دەکەم؟ لە واقیعدا خۆم بەدوور گرت لە وەڵامدانەوەی وردی دوو مەسەلە، لەجیاتی ئەوە، ڕووەو بەدیهێنانی دوو ئامانج ڕۆیشتم: یەکەمیان، خستنەڕووی هەقیقەتە زانراوەکان وەک خۆیان دەربارەی ژیانی سێکسی و ڕەفتاری سێکسیمان لە حاڵەتە سروشتی و حاڵەتەکانی لادانلدا. هەرچی ئامانجی دووەمیشە، کە لە ڕوانینی منەوە پێداگرتر و گرنگترە، بریتییە لە بەستنەوەی ژیانی سێکسیی مرۆییمان بە ژیانی دەروونییەوە، کە ئەم پەیوەندییەیە ژیانی مرۆڤایەتی لە ژیانی بوونەوەرانی دیکە جیا دەکاتەوە، کە هەر بەو هۆکارەشەوەیە توانراوە ژیانی مرۆڤایەتی لە ڕووی کۆمەڵایەتی و شارستانییەتەوە، پەرە پێ بدرێ. بەو هیوایەی توانیبێتم بەم کارەم سێکس بخەمە پێگە دروستەکەی خۆیەوە، لەو پێگەیە بەرزی بکەمەوە کە سێکس تەنیا وزەیەکی غەریزییە و بیگەڕێنمەوە بۆ پێگەی شیاو بە خۆی، وەک هێزێکی سەرەکیی ژیان کە بەناو هەموو لایەنەکانی ژیاندا ڕۆدەچێ، ئەمە ئەو پێگەیەیە کە خوڵقێنەری هەموو بوونەوەران ویستوویەتی سێکسی تیادا بێ، نەک سێکس تەنیا هۆکارێک بێت بۆ خوڵقاندنی منداڵ و مانەوە، بەڵکو هۆکارێکە بۆ خۆشی و ئارامی و چێژ و پەیوەستییەکی بێوێنەیە بۆ کۆکردنەوەی نێر و مێ پێکەوە، هەروەک چۆن بەو شێوەیەی لە سەرەتاوە دەستی پێکردووە.

بەڵام، ئەم کتێبە بۆ کێیە؟ ئەمە پرسیارێکە تەنیا خوێنەر وەڵامی دەداتەوە، کە هیوادارم لە تێگەیشتنی ئامانجی کتێبەکەدا هەڵە نەکات، یان لە جێبەجێکردنی پێوەرە جوورتماناکاندا پەلە نەکات، یان ئەو شتانە بەدی نەکات کە بوونیان نییە لەم کتێبەدا،

چونکە خوێنەر لەم کتێبەدا ئەو هۆکارانە بەدی ناکات کە بۆ دەستکەوتنی چێژ، یان جۆرێ لە نەزوەی سێکسی، پێویستن، هەروەها ئەم کتێبە ئەو مەبەستانەی تیادا نییە کە خوێنەر بۆ گاڵتەکردن و دەمەتەقێی شەوانە و کات بەسەربردن بیخوێنێتەوە.

ئامانجی ئەم کتێبە ئەوەش نییە کە خوێنەر وەک ڕێبەرێکی سێکسی بۆ پەیڕەوکردنی ڕەفتاری سێکسیی سروشتی، یان لادراو بەکاری بێنێ، هەروەها ئەم کتێبە هیچ نیاز و مەبەستێکی نییە بۆ ئیدانەکردنی هیچ ڕەفتارێک، یان ڕێڕەوێکی سێکسیی دیاریکراو، ئامانجی ئەوەش نییە هەڵوێستێکی سێکسیی تایبەتی بە هەڵوێستێکی دیکە بگۆڕێ، ئەو ئاراستەیەشی نەگرتووە کە هانی سێکس بدات و بەرامبەر بە سێکس لێبووردە بێ، یان بە پێچەوانەوە، هانی خوێنەر بدات بۆ ڕەتکردنەوەی سێکس و خۆپارێزی لێی. بەدەر لەوانە، ئەم کتێبە هەموو ئەو شتانەی تیادایە کە هەر تاکێک وا پێویست دەکات دەربارەی ژیانی سێکسی و ژیانی دەروونی بیانزانێت، کە بە ڕای من پەیوەندیی نێوان ئەم دوو ژیانە گرنگە، کە پاساو بۆ ئەوە دەهێنێتەوە، بۆچی وا لە مرۆڤ دەروانرێ بوونەوەرێکی بالاترە لە تەواوی بوونەوەرەکانی دیکە؟ ئەمە ئەوەیە کە هەوڵم داوە دەرکی پێ بکەم، نابێ خۆم بڕیار لەسەر ئاستی شکستهێنان، یان بەختم لە گەیشتن بەو ئامانجە، بدەم.

د. عەلی کەمال

# پێشەکیی وەرگێڕ

مرۆڤ بە درێژایی مێژووی شارستانییەتەکان، بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان لە پارادۆکسێکدا ژیاوە، کە تا ئەم سەردەمەش بەردەوامە، لە لایەک دەرکی بە چێژ و بایەخ و ڕۆڵی سێکس لە تەواوی ژیانیدا کردووە، لە لایەک لەژێر پەردەی خۆپارێزی و پابەندبوون بە یاسا و ڕێسا کۆمەڵایەتی و نەریتییەکاندا، خۆی بەدوور گرتووە لە سێکس و هەندێ جار ڕەتیشی کردووەتەوە، بەڵام بەردەوام بە شێوازی جیاجیا بایەخی بە مەسەلە سێکسییەکان داوە، هەر ئەو بایەخپێدان و گرنگییەی سێکسیش بووە لە لایەن مرۆڤەوە کە بووەتە مایەی سەرنجڕاکێشانی زانا و توێژەران و کارکردن و هەوڵدان بۆ ئاشکراکردنی تەلسیمەکانی ئەم چەمکە تایبەتییە لە ژیانی مرۆڤدا، بەڵام زۆر لایەنی ژیانی سێکسیی مرۆڤ تا ئێستاش بە شاراوەیی ماونەتەوە و زۆر کەس لەنێو تەمومژی نەزانین و نائاشنابوون بە لایەنەکانی ئەم ژیانە، گیریان خواردووە، بەتایبەتی لە کاتێکدا، تا ئاستێکی زۆر لەو هەقیقەتە دڵنیاین کە ژیانی سێکسیی تاک لەگەڵ ژیانی دەروونیدا بەیەکداچوون و هەریەک لەم دوو ژیانە بە جۆرێ کار دەکەنە سەر یەکدی، زۆر جار ئەستەمە بتوانین ئەوە

یەکلایی بکەینەوە، کامیان کاری کردووەتە سەر کامیان و کامیان هۆکارە و کامیان بەرئەنجام.

هۆکاری سەرەکی لە پشت ئەم نائاشکرایی و ناڕوونییەی ژیانی سێکسیی مرۆڤ بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کارکردن و توێژینەوە دەربارەی مەسەلە سێکسییەکان و ژیانی سێکسیی مرۆڤ، کارێکی قورسە، ئەگەر نەڵێین ئەستەمە، چونکە لە لایەکەوە، ژیانی سێکسیی مرۆڤ بە شێوە سروشتییەکەی، ژیانێکی شاراوەیە و پەیوەندیی سێکسی تەنانەت لەنێو هاوسەرەکانیشدا بە شێوەیەکی پەنهان و دوور لە چاوی هەموو کەس ڕوو دەدات، هەروەها باسکردنیشی بە شتێکی ناباو و نائاسایی دادەنرێ لە زۆربەی کۆمەڵگەکاندا، لەبەر ئەوە کاتێک دەتەوێ، بۆ نموونە ڕاپرسی دەربارەی بابەتێکی ژیانی سێکسی بکەیت، لەوانەیە تەنیا بەشێکی کەمی خەڵک وەڵامت بدەنەوە، وەڵامەکانی ئەوانیش هیچ گرەنتییەک نییە کە ڕاست بن.

هەڵبژاردنی بوارێکی هەستیاری وەک ژیانی سێکسی بۆ نووسین و وەرگێڕان، کارێکی ئاسان نییە، تەنانەت د. عەلی کەمال خۆیشی لە پێشەکیی کتێبەکەیدا ئاماژەی بەوە داوە و دەڵێ: "داوام لێ کرا توێژینەوەیەکم هەبێت دەربارەی یەکێک لەو بابەتانەی کە پەیوەندییان بە ژیانی سێکسییەوە هەیە، داواکەم قبووڵ کرد، لە کاتێکدا بە تەواوی لە فراوانیی ژیانی سێکسی و وێڵگە نەدۆزراوەکانی ئەم ژیانە، هەروەها ئەستەمیی هەڵبژاردنی یەکێک لە بوارەکانی ژیانی سێکسی وەک بابەتێک بۆ توێژینەوە، ورد نەبوو بوومەوە، هەروەها لەو کاتەدا دەرکم بەوە نەکردبوو کە توێژینەوە لە بابەتە سێکسییەکاندا، چەندە قەدەغەیە و چۆن خەڵکی لێی دەسڵەمنەوە و بە هەستیارییەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکەن...".

هەرچەندە زانا و توێژەران لە کارکردن و توێژینەوەکانیان بەردەوام بوون، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو باس و ڕاڤەکردنانەشدا، هێشتا ئەوە نادیارە، یان بە تەواوەتی ڕوون نییە، ئەوە چییە ژن و پیاو بۆ لای یەکدی کێش دەکات؟ بۆچی هەندێ جار مرۆڤەکان لەنێو سەدان و هەزاران کەسدا تەنیا کەسێک سەرنجیان ڕادەکێشێ، بەڵام هەندێ جار-بە زۆری پیاوان- دەتوانن لەگەڵ چەند کەسێکدا سێکس بکەن؟ ئەو فاکتەرانە چین کە بڕیار لەسەر سەرنجڕاکێشانی مرۆڤ نێوان (نێر و مێ) دەدەن؟ ئایا چەندە کۆمەڵگە و نەریتەکانی، ئایین و بنەماکانی، پێشکەوتنی زانست و تەکنۆلۆژیا و کرانەوەی کۆمەڵگەکان بە ڕووی دنیادا بەگشتی، کاریان کردووەتە سەر خەسڵەتە خۆڕسک و سروشتییەکانی مرۆڤ و چەندە ئەم خەسڵەتانەیان بەو ئاقارەدا بردووە کە خزمەت بە مرۆڤایەتی بگەیەنن و چەندە چەپاندن و کۆتوبەندکردنی ئارەزووە سێکسییەکان، یان ئازادیی سێکسی، بوونەتە مایەی داهێنانی زیاتر و ئەفراندنی بالاتر و چەندە بوونەتە هۆی شێواندنی ئەم خەسڵەتە سروشتی و خۆڕسکانەی مرۆڤ و گیرۆدەبوونی مرۆڤ بە چەندەها گرێ و باری دەروونیی ئاڵۆز و پشێوی و لادانی سێکسی؟

هێشتا ئەو هەقیقەتە بۆ مرۆڤ بە تەواوی ڕوون نییە، ماهییەتی سێکس چییە و بەدەر لە هۆکاری زۆربوون و مانەوەی توخمی مرۆیی، بۆچی مرۆڤ هێندە عەوداڵی سێکسە و پراکتیزەکردنی سێکس بۆچی هێندە هەستیارە و بە چەندەها چەمکی سایکۆلۆژی و سۆسیۆلۆژییەوە پەیوەستە؟

گومانی تیادا نییە هەڵوێست و ڕوانینی مرۆڤەکان بەرامبەر بە سێکس، جیاوازە، بێگومان مەبەستم لە هەڵوێستی ڕواڵەتی،

هاوکات هەڵوێستی شاراوە و ڕاستەقینەی مرۆڤەکانە بەرامبەر بە سێکس و حەز و ئارەزووە سێکسییەکانیان، چونکە لە زۆربەی کۆمەڵگەکاندا -ئەگەر نەڵێین لە هەموویاندا- خەڵک بەگشتی لە ژیانی واقیعی و لە بەردەم یەکدی و لە ناو خێزان و لە بەردەم یاسا و لە بەرامبەر دابونەریت و ڕێسا ئایینییەکاندا، هەڵوێستێک دەنوێنن، بەڵام زۆربەی کات، یان هەندێ جار لە ژیانی تایبەتی و ڕاستەقینە و شاراوەیاندا، هەڵوێستێکی دیکەیان هەیە. ئەوەی لە ئاوەز و خەیاڵیاندا هەیە، شتێکی دیکەیە، خولیا و ئارەزووەکانیان لەوانەی پیشانی دەدەن، جیاوازن، زۆرجار بەهۆی ئاستەنگە کۆمەڵایەتی و ئایینی و نەریتییەکانەوە بوێریی ئەوە ناکەن بە ئاشکرا پراکتیزەیان بکەن، دەرئەنجامیش، ئەو ئارەزووە کپکراوانە، ئەگەر هیچ بوارێک بۆ دەربڕین بەدی نەکەن، وەک فرۆید دەڵێ، لە شێوەی نەخۆشی و گرێی دەروونیی جۆراوجۆردا دەردەکەون.

کتێبی سێکس و دەروون لەڕێی باسکردنی زۆربەی ئەو بابەتانەی کە پەیوەستن بە سێکسەوە، هەوڵی داوە ماهییەتی سێکس و ئارەزووی سێکسی لای مرۆڤ شی بکاتەوە و هاوکات هەڵوێست و ڕوانینە جیاجیاکانی مرۆڤ بە درێژایی سەردەم و شارستانییەتەکان بخاتە ڕوو.

د. عەلی کەمال لەم کتێبەدا کاری لەسەر کۆمەڵێک هێڵی سەرەکی کردووە، سەرەتا بە باسکردنی ئەو پاڵنەرە سێکسییانە دەستی پێکردووە کە هانی مرۆڤ دەدەن بۆ نواندنی ڕەفتاری سێکسی. بۆچی مرۆڤ پێویستی بە سێکسە؟ بەدەر لە غەریزەی زۆربوون، ئەگەر مرۆڤ سێکس نەکات، نامرێ، ئەی بۆچی ناتوانێ بێ سێکس بژی؟ پاشان لە بەشی دووەمدا، باسی بابەتی جووتتوخمی دەکات و ئایا بناغەی ئەم جووتتوخمییە لە

ئەفسانەکاندا چۆن باس کراوە و ئەی زانست ڕای چۆنە دەربارەی ئەو بۆچوونەی کە دەڵێ مرۆڤ لە سەرەتادا جووتتوخم بووە و هیچ پیاوێک بە تەواوی نێر نییە و هیچ ژنێکیش بە تەواوی مێ نییە. لە بەشی سێیەمدا باسی زانست و سێکس دەکات.

لە بەشی چوارەمدا بە درێژی ڕاڤەی هۆرمۆنەکان و پەیوەندییان بە سێکسەوە و کاریگەرییان بۆ سەر دروستبوونی ناسنامەی توخمی مرۆڤ دەکات. ئەو پرسیارە دەورووژێنێ، ئەوە چییە بڕیار لەسەر مێیەتی، یان نێرێتیی مرۆڤ دەدات؟ ئایا ئەوە هۆرمۆنەکانە، یان مامەڵەی کۆمەڵایەتییە؟

لە بەشی پێنجەمدا نووسەر بە درێژی باسی ژیانی سێکسی منداڵ دەکات کە لە قۆناغە زووەکانی سەرەتای گەشەی منداڵییەوە دەست پێدەکات، پاشان ڕای زانایانی سایکۆلۆژی دەربارەی ئەم ژیانە دەخاتە ڕوو. لە بەشی شەشەمدا ڕاستەوخۆ درێژە بە باسکردنی ژیانی سێکسی دەدات بە درێژایی قۆناغەکانی تەمەنی مرۆڤ. پاشان لە بەشی حەوتەمدا باسی سێکس و ژیانی هاوسەرێتی دەکات، وەڵامی پرسیارگەلێکی داوەتەوە کە کێشەی بەردەوامی نێوان ژن و پیاوە دەربارەی ئەم پەیوەندییە لە ژیانی هاوسەرێتی و لە دەرەوەی ئەم ژیانەش.

یەکێک لە بەشە هەرە هەرە گرنگەکانی ئەم کتێبە، بەشی هەشتەمە، کە باس لە ژیانی سێکسیی ژن دەکات، لە کاتێکدا تا سەردەمانێکی زۆر ئەو بڕوایە زاڵ بوو کە شتێک نییە ناوی ژیانی سێکسیی ژن بێت، یان بە مانایەکی دیکە، شتێک نییە ناوی سێکس بێت لە ژیانی ژندا، بەڵکو سێکس لای ژن تەنیا دوو ئامانجی هەیە، یەکەمیان زۆربوون و منداڵخستنەوە، دووەمیان تێرکردنی ئارەزووی سێکسی پیاو، بەڵام لە ئەنجامی توێژینەوەی بەردەوام

و بەدواداچوونی زانایانی سایکۆلۆژی، ئەم بیروبۆچوونانە پووچەڵکرانەوە و لە ئێستادا مەسەلەیەکی بەڵگەنەویستە کە سێکس بابەتێکی گرنگە لە ژیانی ژندا و ژنیش خاوەنی پاڵنەر و حەز و ئارەزووی سێکسییە هەر وەک پیاو، بەڵام ترسی ژن لە دووگیانی و بەستنەوەی سێکس بە چەمکی شەرەف و مۆراڵ و ڕێسا ئایینی و بەها کۆمەڵایەتییەکانەوە، وای کردووە ژن بەرامبەر بە سێکس هەستیار بێت و جڵەوی ئارەزووە سێکسییەکانی توندتر بکات بەراورد بە پیاو. بەدەر لەم کۆتوبەندانە، بەپێی ئەنجامی هەندێ لە توێژینەوەکان، ژن لە پیاو سێکسیترە و توانای چێژبینینی زیاترە. نووسەر بە درێژی باسی پاڵنەر و ورووژێنەری سێکسی و قۆناغەکانی وەڵامدانەوەی سێکسی لە ژندا کردووە و جەخت لەوە دەکاتەوە کە ژیانی سێکسی لە ژندا تا تەمەنی نائومێدی و دواتریش گەورەبوون و چوون بەتەمەندا، بەردەوام دەبێ.

لە بەشی نۆیەمدا باسی کێشەیەکی گرنگی ژیانی سێکسیی ژن دەکات، کە تەنیا بۆ ژن خۆی کێشە نییە، بەڵکو لای هاوبەشەکەشی کێشەیەکی ناخۆش و گەورەیە، ئەویش کێشەی سێکسساردییە، بە تێروتەسەلی وەسفی حاڵەتەکانی سێکسساردی دەکات و هۆکارە ئەندامی و دەروونییەکانی ئەم حاڵەتە ڕاڤە دەکات. پاشان لە بەشی دەیەمدا، وەڵامدانەوە سێکسییەکان لە هەریەک لە نێر و مێ-دا باس دەکات، هەروەها ماستەربەیشن، یان خووە نهێنی، یەکێکی دیکەیە لەو بابەتە گرنگانەی لە بەشی یانزەیەمی ئەم کتێبەدا لە ڕووی ڕاڤەکردن و شیکردنەوەوە، مافی تەواوی دراوەتێ. بەدوایدا، واتە بەشی دوانزەیەم، هێزی سێکسی

لە منداڵ و گەورە و جیاوازیی ئەم هێزە لە نێر و مێ-دا باس کراوە.

لاوازیی سێکسی و لەکارکەوتنی توانای سێکسی کە دوو کێشەی گەورەن لە ژیانی پیاو و هاوبەشەکەیدا، بە چڕی لە بەشی سیانزە و چواردەدا باس کراون و هۆکار و جۆر و حاڵەتە جیاجیاکانیان شی کراونەتەوە.

لەدوای خوێندنەوەی ئەم کتێبە، ئاشنایەتیی تەواو پەیدا دەکەیت لەگەڵ هەریەک لە جۆرەکانی لادانی سێکسی وەک، سادۆماسۆشی، سادیزم، ماسۆشیزم و هۆمۆسێکسوالیتی لە نێر و مێ-دا، ئەم بابەتانە لە سێ بەشی دوابەدوای یەکدا، واتە پانزەیەم، شانزەیەم و حەڤدەیەم، بە درێژی کاریان لەسەر کراوە. لە بەشی هەژدەیەمدا لەیزبینیزم، واتە پەیوەندیی سێکسیی نێوان مێ و مێ، لە ڕووی سەرهەڵدانی مێژوویی و هۆکار و چارەسەرکردنەوە شی کراوەتەوە. پاشان لە بەشی نۆزدەیەمدا تابۆ سێکسییەکان خراونەتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. لە بەشی بیستەمدا باسی کاریگەریی دەرمان بۆ سەر سێکس کراوە و نووسەر ئاماژەی بەو دەرمانانە داوە کە دەبنە هۆی لاوازکردنی ئارەزووی سێکسی و ئەوانەش کە بە چالاککەری سێسکی ناودەبرێن و بە زۆری پیاوان پەنای بۆ دەبەن.

لە بەشی بیستویەکدا نووسەر بە قووڵی باسی چارەسەرکردنی پشێوییە سێکسییەکان دەکات بە هەموو جۆرەکانییەوە، ئەم بەشە بە لای منەوە، بەشێکی گرنگە، چونکە کێشەی پەککەوتنی سێکسی و لەکارکەوتنی سێکسی بە هەموو حاڵەتەکانییەوە، کێشەی گەورەن لە ژیانی سێکسیی پیاو و پەیوەندیی سێکسیی لەگەڵ هاوبەشەکەیدا، بەتایبەتی زۆر جار پیاو بەشێکی گەورەی ناسنامەی تۆخمی خۆی وەک نێر، لە توانای سێکسیدا بەدی دەکات. لە بەشی دواتردا، واتە بیستودوو، نووسەر کار لەسەر

بابەتێکی دیکە دەکات کە دەتوانم بڵێم یەکێکە لە تەوەرە سەرەکییەکانی کتێبەکە، ئەویش بریتییە لە کاریگەریی پشێوییە دەروونی و ئەقڵییەکان بۆ سەر سێکس.

لە بەشی بیستوسێدا هەڵوێستە شارستانییەکان بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان باس دەکات و لەم بەشەدا تا ئاستێکی زۆر شارەزایی پەیدا دەکەیت دەربارەی سێکس لای شارستانییەتی میسری، گریکی، ڕۆمانی، هیندی، چینی و مەسیحی، هەروەها سێکس لای ئیسلام بە وردی باس کراوە.

خۆشەویستی و سێکس لە بەشی بیستوچواردا، یەکێکە لە بەشە هەرە سەرنجڕاکێشەکانی ئەم کتێبە بۆ خوێنەر بەگشتی و بەتایبەتیش ئەگەر خولیای دۆزینەوەی ڕایەڵی نێوان سێکس و خۆشەویستیی هەبێ و مەراقی ئەوەی هەبێ، ئەم دوو چەمکە کامیان هۆکارن بۆ لەدایکبوونی ئەوی دیکەیان و کامیان بەرئەنجامن بۆ ئەوی دی.

لە بەشی بیستوپێنجەمدا نووسەر باسی خەسڵەتە سەرنجڕاکێشە سێکسییەکانی ژن و پیاو دەکات، بەدوایدا، واتە لە بەشی بیستوشەشدا بابەتێکی تەواو هەستیار و جوان باس دەکات، کە بریتییە لە پەیوەندیی نێوان هونەر و سێکس. لەدوای خوێندنەوەی ئەم بەشە دەتوانی جیاوازی بکەیت لە نێوان سێکس لە هونەردا، لەگەڵ هونەری پۆرنۆگرافی و پۆرنۆکیچ، پاشان کاریگەریی پۆرنۆگرافی بۆ سەر کەسانی سروشتی و ناسروشتی و بەکارهێنانی وەک بەشێک لە چارەسەر لە حاڵەتەکانی لاوازیی سێکس و لەکارکەوتنی سێکسی لە پیاودا و سێکسساردی لە ژندا.

هەرچەندە نووسەر لە زۆربەی بەشەکاندا، ئاماژەی بە ژیانی سێکسی و بابەتی سێکسی لە شارستانییەتە جیاجیاکان و سەردەمە جیاوازەکان کردووە، بەڵام بەشی بیستوحەوتیشی بە

ناوی سێکس و شارستانییەت، بۆ هەمان مەبەست تەرخان کردووە. پاشان لە بەشی بیستوهەشتدا، بابەتێکی هەستیاری ڕاڤە کردووە کە ڕای جیاواز لەخۆ دەگرێ، ئەویش پەیوەندیی نێوان سێکس و داهێنانە، قسە لەسەر ئەوە دەکات، بۆچی ژمارەیەک لە داهێنەر و ناودارانی دنیا، هۆمۆسێکسوال بوون؟ یان تووشی جۆرێک لە لادانی سێکسی بوون؟ یان لە ژیانیاندا سێکسیان نەکردووە؟ زانایان و داهێنەران ڕای جیاوازیان دەربارەی کاریگەریی ئەم دوو چەمکە و پەیوەندیی نێوان ئەم دوو چەمکە هەیە، لە کاتێکدا کافکا دەڵێ: "ئەوەی کە بە سێکس دەبەخشرێ، لە نووسین وەردەگیرێ". بیکاسۆ دەڵێت: "ئەگەر تەلارساز بوومایە، ڕووکاری هەرچی ماڵەکانە لە وێنەی جەستەی ژندا دیزاینم دەکرد".

پاشان نووسەر لە بەشی بیستونۆدا باسی هەڵوێستە جیاوازەکانی هەریەک لە نێر و مێ دەکات بەرامبەر سێکس. لە بەشی سیدا جیاوازیی نێوان نێر و مێ لە ڕەفتاری سێکسیدا شی دەکاتەوە. لە بەشی سیویەکدا بەگشتی ئاماژە بە کتێب و توێژینەوەکان لە بواری سێکسدا دەدات.

دواجار ئەوەی دەمەوێ بیڵێم، ئەم کتێبە وەک باسمان کرد، کاری لەسەر کۆمەڵێک هێڵی گرنگ کردووە، بەڵام بە پلەیەی یەکەم، هەوڵی داوە بۆ ئاشنابوون بە پەیوەندیی پتەو و توندوتۆڵی نێوان ژیانی سێکس و ژیانی دەروونی لە مرۆڤدا، کە دەکرێ بڵێین لە نێوان ژیانی سێکسیی مرۆڤ و هەموو بوونەوەرانی دیکەدا، دیارترین سیمای جیاکەرەوەیە، پاشان باسکردن و ڕاڤەکردنی ژیانی سێکسیی ژن و پیاو دێت، هەر لە قۆناغە سەرەتاییەکانی تەمەنی منداڵی، تا دەگاتە قۆناغی گەورەبوون و چوون بەتەمەندا،

ئینجا باسکردنی پەیوەندیی سێکسی سروشتی و هەموو ئەو ڕەفتار و پەیوەندییە سێکسییانەی کە هەندێکیان لە ڕابردوودا بە لادان دادەنران، بەڵام لە ئێستادا وەک جیاوازی، یان وەک حاڵەتی نەخۆشی، لێیان دەڕوانرێ.

ڕاڤەکردنی ئەم بابەتانە بەو ڕیزبەندییە ناوازەیەی کە نووسەر بۆ کتێبەکەی هەڵیبژاردووە، یارمەتیی خوێنەر دەدات بۆ تێگەیشتنی باشتر و ئاشنابوونی زیاتری ئەم بوارە گرنگەی ژیان.

وەرگێڕانی ئەم کتێبە ئەگەرچی ماندووبوون و شەونخوونیی زۆری پێویست بوو، بەڵام هەوڵێکی خاکیانەیە لەپاڵ هەوڵەکانی پێشوومدا، ئەویش لەپێناوی تێگەیشتنی زیاتر لە ژیانی سێکسی و ڕەواندنەوەی تەمی بەدحاڵبوون بەرامبەر بە هەندێک بابەتی سێکسی و پەیوەندیی سێکسیی نێوان ژن و پیاو. هیوادارم توانیبێتم بە سەرکەوتوویی ئەو کارە بکەم.

سۆزان جەمال

هاوینی ٢٠١٥

# بەشی یەکەم:
# توێژینەوە بەراییەکان

-پاڵنەری سێکسی
-هاندەری سێکسی
-ئیکتیفای سێکسی
-ڕەفتاری سێکسی
-پێویستی بۆ سێکس
١-پێداویستییەکانی زۆربوون
٢-سێکس پێداویستییەکی کۆمەڵایەتییە
٢- سێکس و چێژ
-فاکتەرەکانی ژیانی سێکسی
- فاکتەرەکانی ڕەفتاری سێکسی لە مرۆڤدا
-شارستانییەت و ڕەفتاری سێکسی لە مرۆڤدا
-سێکس و دەروون

# توێژینەوە بەراییەکان

## پاڵنەری سێکسی

لە کوێ و چۆن و بۆچی پاڵنەری سێکسی دەست پێدەکات و چی دەیبزوێنێ، یان چی دەیوەستێنێت؟

ئەمە یەکێکە لەو بابەتانەی کە تا ئێستا جێگەی بایەخی توێژەرانە. هەرچەندە هەقیقەت و تێبینیی زانستیی زۆر هەن کە لە توێژینەوەکانەوە دەستکەوتوون، بەڵام تا ئێستا بە زۆرێک لایەنی ئەم بابەتە نائاشنابن، هەروەها هەندێک لایەن و دەرئەنجامی کۆتایی هەندێک هەقیقەت دەربارەی ئەم بابەتە هێشتا بە نادیاری و ئاڵۆزی ماونەتەوە.

شتێکی بەڵگەنەویستە، بە حوکمی فاکتەرە بۆماوەییەکان، مرۆڤ پێویستی بە سێکس هەیە، وەک چۆن هەر بوونەوەرێکی دیکە پێویستی پێی هەیە، بەڵام ئەم فاکتەرە بۆماوەییانە، بە شێوەیەکی تایبەتی لە مرۆڤدا بەپێی ڕاهێنان و دابونەریتەکان، گۆڕانیان بەسەردا دێ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم پێداویستییە بۆ سێکس لەگەڵ پێداویستی بۆ خواردن و خواردنەوە، لە ڕووی بایەخی هەنووکەییانەوە بۆ ژیان، یەکسان نین، بەڵام بایەخی پێداویستیی مرۆڤ بۆ سێکس، درێژخایەنە و لە بایەخی خۆراک زیاتر و گەورەترە، چونکە زامنی زۆربوون و مانەوەی توخم و فرەجۆری و پەرەسەندنی مرۆڤ دەکات. دەشێ ئەم پێداویستییە سێکسییە لە پێداویستییە سەرەکییەکانی دیکەی تاک، دوور بکەوێتەوە، یان لابدات لێی، یان لە دژیان بوەستێتەوە. ئەم دیاردەیە ڕێک بە بابەتێکی شرۆڤەنەکراو و تێنەگەیشتراو ماوەتەوە و پێویستی بە لێکدانەوەیە، ئەم جۆرە لادان و ڕێنەکەوتنە لە نێوان پێویستییە

سەرەکییەکان و پێویستییە سێکسییەکاندا، دەشێ ببێتە هۆی ڕوودانی دۆخێکی هاوشێوە لە ڕێنەکەوتن و دژبەیەکی لەنێو پێداویستییە تایبەتییەکانی تاکدا، بە پێداویستییە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکانیشەوە، لەگەڵ پێداویستییە سێکسییە مرۆییەکان، بە شێوەیەکی گشتی.

سروشت و ئامانجی پێداویستییە سێکسییەکان لە مرۆڤدا هەرچییەک بن، لە جەستەی مرۆڤدا کۆمەڵێک کرداری فسیۆلۆژی ڕوو دەدەن و بە شێوەیەک ڕوو دەدەن کە وا پێویست دەکات لە زۆربەی زۆری خەڵکدا بەیناوبەین ئەندامی سێکسی بورووژێ و مرۆڤ بگاتە لوتکەی چێژ، یان ئۆرگازم، کە لە نێر و زۆربەی مێدا ئەمە ڕوو دەدات. بەڵام سەرچاوەی یەکەم و بزوێنەری سەرەتایی بۆ وروووژاندنی ئەم پێداویستییە و دروستبوونی ئەو حاڵەتی گرژبوونە کە بەدوای ئەم وروووژانەدا دێ، تا ئێستا مەسەلەیەکی ئاشکرا نییە، یان لێی تێناگەین. لە سەردەمێکدا بڕوا وا بوو، سەرچاوەی یەکەم بۆ وروووژانی سێکسی لە ئەنجامی کۆبوونەوەی کاوەخۆی تۆواو، یان دەردراوی تورەکەکانی گونەوە ڕوو دەدەن، بەڵام تا ئێستا هیچ وەرگرێکی هەستی نییە کە بتوانێ کۆبوونەوەی تۆواو پێوانە بکات و بزانێ کە کۆبووەتەوە، یان هەیە، بەڵام لە مێ-دا ئەم دەردراوانە کۆنابنەوە.

ڕای گشتی و زاڵ لە کاتی ئێستادا، ئەوەیە کە پاڵنەری سێکسی لە مرۆڤدا، نێر بێ یان مێ، دەشێ سەرەتاکەی لە دەماخەوە دەست پێ بکات، هەرچەندە هیچ بەڵگەیەک نییە ئەمە لە مرۆڤدا بسەلمێنێ، بەڵام توێژینەوە زانستییەکان بوونی ئەم سەنتەرەیان لە ئاژەڵاندا سەلماندووە، بۆ نموونە لە کەروێشکدا، نێر بێ یان مێ، دوو سەنتەر لە ناوکی هایپۆسالامەس لە دەماخدا هەن، سەنتەرێکیان بە شێوەیەکی کورتخایەن کۆنترۆڵی سێکس دەکات، کە هۆرمۆنی ئسترۆجین کاری تێدەکات و سەنتەرەکە چالاک

دەکات و دەبێتە هۆی ڕوودانی ڕەفتاری سێکسی، هەرچی سەنتەری دووەمە، بە شێوەیەکی درێژخایەن کۆنترۆڵی ڕەفتاری سێکسی لە کەرویشکدا دەکات، کە دەکەوێتە ژێر کاریگەریی گۆڕانی وەرزەکان و ئەو دیاردە هەستپێکراوانەی کە هاوکاتن لەگەڵیدا، بۆ نموونە، ڕووناکی، بەڵام لە مرۆڤدا هێشتا بە تەواوەتی لە بوونی ئەم سەنتەرانە دڵنیا نین. ئەگەری زیاتر ئەوەیە، ئەم سەنتەرانە لەناو بەشەکانی دەماخدا دابەشبووبن، بۆ نموونە توێکڵی دەماخ و کۆئەندامی لمبی Limbis System، شانبەشانی هایپۆسالامەس. تەواوی ئەم ناوچانە دەشێ هانی وروووژاندنی ڕەفتاری سێکسی بدەن، یان ببنە ڕێگر لە بەردەمیدا، هەروەها فاکتەرەکانی دیکە، وەک بۆن و دەستلێدان، دەشێ بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ کار بکەنە سەر ئەم ناوچانە و پاشان ڕەفتاری سێکسی ڕوو بدات. ئەمە و تا ئێستاش بە وردی ئەوە نەزانراوە چۆن ئەم سەنتەرە جیاوازانە لەنێو خۆیاندا یارمەتیی یەکدی دەدەن بۆ ڕوودانی وروووژانی پاڵنەری سێکسی. لەو تیۆرانەی لەم بارەیەوە هەن، پێی وایە لە ناوکی هایپۆسالامەس لە دەماخدا، دەمارە خانە هەن کە دەشێ بەرامبەر هۆرمۆنەکانی سێکس هەستیاربن. هەر کاتێ هایپۆسالامەس وروووژا، دەشێ کار بکاتە سەر کوێرەڕژێن pituitary gland، ئەمەش ببێتە هۆی دروستبوونی هۆرمۆن و تۆواو و دەشێ هێلکۆکەش. بەم شێوەیە دەشێ ناوکی هایپۆسالامەس و هۆرمۆنە سێکسییەکان بە شێوەیەکی ئاڵوگۆڕکراو کار بکەنە سەر یەک، بەڵام سەبارەت بەوەی ئایا سەنتەرە (ناوەندە) سێکسییەکان بەڕاستی لە دەماخدا چی دەکەن تا وا لە تاک بکەن ڕووەو توخمەکەی دیکە ئاڕاستە بگرێ و هەوڵ بدات ئەندامە سێکسییەکانی بوروووژێ و بە ئۆرگازم بگات؟ تا ئێستا ئەوەندە زانیاریمان لە بەردەستدا نییە کە وەڵامی ئەم پرسیارەی پێ بدەینەوە، هەروەها تا ئێستا نازانین

چۆن پێداویستیی سێکسی بەکاوەخۆ زیاد دەکات تا دەگاتە ئەو ئاستەی کە تاک ناچار دەکات بەشوێن دەروازەیەکدا بگەڕێ بۆ پڕکردنەوەی ئەم پێداویستییە و دۆزینەوەی ئەو دەروازەیە.

هەرچی دەتوانرێ بوترێ، ئەو گریمانەیەیە کە کۆمەڵێک ناوەند لە دەماخدا هەن و لە چەند ئاستێک زیاتر هەن و کاریگەرییان بۆ سەر ئەندامەکانی سێکس و زاوزێ هەیە، هەر ئەم ناوەندانەن کە پێویستیی دووبارەبووەوەی مرۆڤ بۆ ورووژانی سێکسی و ڕەفتاری سێکسی دروست دەکەن، بەڵام لە کوێ و چۆن و کەی یەکەمین بڵێسەی ئەم پاڵنەرە دەست پێ دەکات؟ تا ئێستا نادیارە، لەوانەیە بەهۆی ئەم نادیاری و ئاڵۆزییەوە، ڕوانین لە ژیانی سێکسی لە مرۆڤدا بەو تایبەتمەندێتی و جیاوازی و فرەجۆرییەوە کە هەیەتی، بە ئەستەمی بمێنێتەوە.

ناکرێ مشتومڕ لەسەر ڕەسەنێتی و سەرەکێتیی پاڵنەری سێکسی لە ژیانی مرۆڤایەتی و ڕێگرییەکانی بکرێ، چونکە پێکهاتەی بایۆلۆژیی مرۆڤ لە ڕووی ئەندامی و هۆرمۆنی و دەمارییەوە، هەموویان بە شێوەیەک ئامادەکراون کە ئەم پاڵنەرە بەدی بهێنن، پاشان گشتگیریی بەدیهاتنی ئەم پاڵنەرە لە تەواوی جیهانی ئاژەڵاندا، بە مرۆڤیشەوە، ناکرێ لەسەر بناغەی وەرگرتنی شارەزایی لە ژیاندا لێک بدرێتەوە، سەرباری ئەوەی دەرکەوتنی سەرەتاکانی ئارەزووی سێکسی و هەوڵدان بۆ بەدیهاتنیان بە شێوەیەکی خۆبەخۆ و بێ هیچ ورووژێنەرێکی بەرەکی لە قۆناغە سەرەتاییەکانی منداڵیدا، ئاماژەن بۆ ئەوەی کە بەشی گەورەی پاڵنەرە سێکسییەکانمان، ئامادەباشیی بایۆلۆژیمان وەک بەشێکی سەرەکی لە واقیعی بایۆلۆژی، بڕیاری لەسەر دەدات.

## هاندەری سێکسی

تا ئێستا گەیشتن بە تێگەیشتنی تەواو دەربارەی چۆنێتیی دروستبوونی پاڵنەری سێکسی و ڕەگەزە پێویستەکان بۆ ئەنجامدانی ئەم پاڵنەرە، ئەستەمە. هەرچەندە کۆمەڵێک تیۆر هەن بۆ لێکدانەوەی ئەمە، بەڵام پێویستە یەکەمجار پشت بە گریمانەی بوونی ڕێسایەکی بایۆلۆژیی سەرەکی بۆ پاڵنەری سێکسی ببەستین. ئەم ڕێسا بایۆلۆژییە لە ژیانی مرۆڤدا، ڕیشەییە، هەروەک چۆن لە ژیانی بوونەوەرانی دیکەشدا هەیە، پرۆگرامی پێویست بە لەش دەبەخشێ کە بڕیار لەسەر ئارەزووی سێکسیمان دەدات و ئەو وروووژێنەرانە دیاری دەکات کە دەبنە هۆی وروووژانی ئەم ئارەزووە و ئەمەش دەبێتە هۆی ڕوودانی وەڵامدانەوەی فسیۆلۆژی، یان خەیاڵی بەرامبەر ئەو وروووژێنەرانە. ڕێسای بایۆلۆژیی ژیانی سێکسیمان فرەناوەند و فرەئەندامە، تەواوکاریی نێوان ئەم ناوەند و ئەندامانەش پێویستە بۆ ئەوەی فەرمانی خۆیان بە شێوەیەکی دروست جێبەجێ بکەن و پاڵنەری سێکسی پرۆگرام بکرێ و هاندەرەکان بوروووژێن و وەڵامدانەوەی پێویست بەرامبەریان ڕوو بدات، تا مرۆڤ بەو ئاستە بگات کە هەست بە تێربوون بکات و لە ئاستێکی دیاریکراوی تێربووندا بوەستێ، واتە ئێکتیفا بکات. ئەم ناوەند و ئەندامانەش، ناوەندە سێکسییەکان لە ناوکی هایپۆسالامەس لە دەماخی ناوەڕاست[*] و ڕێگەکانی پەیوەندیی نێوان ئەم ناوەندانە و ناوەندەکانی دیکەی دەماخ، لەخۆ دەگرن، جگە لەم ناوەندە باڵایانە، ناوەندەدەماری دیکەش هەن، وەک لە دڕکە مۆخدا، ئەندامە دەمارییە خۆویستەکان (سەمپەساوی و پاراسەمپەساوی)، لە کوێرەڕژێنەکاندا کە گلاندی ژێر مێشکەڕژێنین Pitutary، هەروەها گلاندیئەدرینال Adrenal، پاشان گلاندە سێکسییە تایبەتییەکان کە بریتین لە هێلکەدان لە مێدا و گونەکان لە نێردا،

دواجار ئەندامە سێکسییەکانی دیکە کە بە شێوەیەکی سروشتی، یان لەڕێی فێربوون و پراکتیزەکردنەوە، سیفەتی سێکسییان وەرگرتووە، یان پەیوەندییان بە سێکسییەوە هەیە، وەک دەم، مەمک و ناوەندەکانی دیکەی وروووژانی سێکسی.

ئەو پرسیارەی پێویستە بخرێتە ڕوو، ئەوەیە، لە کوێ و چۆن هاندەری سێکسی لەسەر ئەم باکگراوندە بەرفراوان و ئاڵۆزەی ڕێسای بایۆلۆژی، دەست پێدەکات؟ چەند لێکدانەوەیەک بۆ ئەم واقیعە هەیە. ڕای زاڵ ئەوەیە، ئەم هاندەرە دەشێ بە چەند ڕێگەیەک ڕوو بدات، کە هەندێکیان هەستین و هەندێکیان نەستین. هەندێکیان بە شێوەیەکی خۆبەخۆیی دەورووژێن و هەندێکیان بەهۆی بوونی وروووژێنەرێکی ڕاستەقینەوە ڕوو دەدەن. دەشێ مرۆڤ هەست بە بوونی پاڵنەری سێکسی و پەرەسەندنی و ڕۆیشتنی بەرەو وەڵامدانەوە و ڕازیبوون بکات، هەروەها دەشێ ڕووبەڕووی ئەم پاڵنەرە ببێتەوە کاتێ لە حاڵەتی نائاگاییدایە، بۆ نموونە لە کاتی نووستن، یان خەونبینیندا، یان تەنانەت لە حاڵەتی بەئاگاییدا، کاتێ کە بیر لە سێکس دەکاتەوە. دەشێ وروووژاندنی هاندەری سێکسی ئەوەندەی بەس بێ کە تاک بیر لە سێکس بکاتەوە، جا ئیدی تاک لەم بیرکردنەوەیەدا پەنای بۆ وێنەی سێکسیی خەیاڵی بردێ، یان پەنای بۆ نەبردبێ. هەندێ حاڵەتی وروووژاندنیش هەن کە لەڕێی هاندەری سێکسیی ڕاستەقینەوە ڕوو دەدەن، ئیدی ئەم وروووژێنەرانە لە شێوەی وروووژاندنی هەستی بینراو، یان بیستراو، یان بۆنکردن، یان دەستلێدانەوە بێ، یان لەڕێی وروووژێنەری سێکسییەوە بێ. دواجار دەشێ گۆڕانی فسیۆلۆژی لە ئەندامی زاوزێدا ڕوو بدات، ئیدی هۆکارەکەی هەرچییەک بێ، خۆی لە خۆیدا هاندەرێکە بۆ ڕوودانی وروووژاندنی سێکسی، هەروەها هەندێجار ڕەپبوونی خۆبەخۆیی لە نێردا دەشێ خۆی ببێتە هاندەرێکی سێکسی، هاوشێوەی ئەمە،

دەشێ لە مێ-شدا ڕوو بدات، هەڵئاوسانی زێ و تەڕبوونی، یان گرژبوونی میتکە، دەشێ خۆی لە خۆیدا هاندەرێکی سێکسی بێ و ببێتە هۆی ڕوودانی وەڵامدانەوەی زیاتر، بە شێوەیەکی بەرزەڕۆ یان هەڵکشاو، پاڵنەری سێکسی بە زیادبوونی چوون ڕووەو ئۆرگازم، یان لوتکەی چێژ، زیاد دەکات. لەوانەیە هەڵە بێ هاندەری سێکسی بە پرۆسەیەکی خۆبەخۆیی ئەندامە سێکسییەکان دابنێین، ناکرێ تەنیا ئەم هاندەرە سێکسییە خۆبەخۆیە بتوانێ بەبێ کردار و بێ بەشداریی ناوەندە باڵاکانی ڕێسا بایۆلۆژییەکە بگاتە سنووری لوتکەی چێژ، چونکە گەیشتن بە لوتکەی چێژ پێویستی بە هەستکردن بە چێژ هەیە بەهۆی ڕوودانی گۆڕانکاری لە ئەندامە سێکسییەکاندا، ئەم جۆرە هەستەش وا پێویست دەکات هەموو هەست بەشداریی تیادا بکەن، ئەم هەستکردن بە چێژەش پێویستە بۆ ئەوەی هاندەری سێکسی زیاد بکات، بێ ئەو هەستە هاندەرەکە دەوەستێ و پەرت دەبێ. هەندێک کەس جیا لە کەسانی دیکە، هەندێ هاندەری دیاریکراویان بۆ ورووژاندنی سێکسی هەیە، یان لە کەسانی دیکە کەمتر لەڕێی هەندێ هاندەرەوە، دەورووژێن، هۆکاری ئەم جیاوازییانەش، بە شێوەیەکی ئەندەکی دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی لە پێکهاتەی ڕێسا بایۆلۆژییە سێکسییەکان لە ڕووی دەمار و هۆرمۆن و ئەندامەکانەوە. هەروەها بەشێکیشی دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی لە گەشەکردنی ئەزموونە سێکسییەکانی تاک و کاریگەریی فێربوون، یان مۆرک جێهێشتنی ئەو ئەزموونانە لە ژیانی تاکدا، بۆ نموونە ئایا ئەو تاکە لە ڕێگەی تێڕامان و خەیاڵەوە لە ڕووی سێکسییەوە هاندەدرێ و دەورووژێ، یان وا پێویست دەکات لەڕێی پەیوەندییەکی سێکسیی ڕاستەوخۆ و ڕاستەقینەوە، هان بدرێ. ئەوەی تێبینی دەکرێ، چەندە ڕۆشنبیریی سێکسیی تاک و ئەزموونەکانی زیاتر بن، ئەوەندە هاندەری تێڕامان و فەنتازیا بۆ

وروژانی سێکسی زیاتر دەبێ، پێچەوانەکەشی ڕاستە، ئەوانەی ئەو ڕۆشنبیری و ئەزموونانەیان نییە، تەنیا بە کاریگەرییەکانی هەر ڕووبەڕووبوونەوەیەکی پەیوەندیی سێکسی، دەورووژێن، هەروەها تێبینی ئەوە دەکرێ، ژن و پیاو لە هاندانی سێکسییاندا جیاوازن. پیاو بە زۆری بە شێوەیەکی خۆبەخۆ دەورووژێ و بە زۆریش لەڕێی خەیاڵەوە، لە کاتێکدا ژن بە زۆری لەڕێی هاندەری ناوچەیی و ڕاستەقینەوە دەورووژێ و بە دەگمەن بە کاریگەریی خەیاڵ، یان بە شێوەیەکی خۆبەخۆ دەورووژێ، تەنیا لەو دۆخانەدا نەبێ کە تێڕامان و خەیاڵکردنەوە لە سێکس، هاوکاتە لەگەڵ هاندەری ناوچەیی لە ئەندامە سێکسییەکاندا، واتە لەگەڵ خەیاڵکردنەوەدا دەست، بۆ ئەندامە سێکسییەکان ببرێ.

### ئیکتیفای سێکسی

کاتێک تاک دەگاتە ئەوپەڕی وەڵامدانەوە بۆ هاندەری سێکسی کە بریتییە لە لوتکەی چێژ، یان ئۆرگازم Orgasem، ناوەندە تایبەتییەکان بە دەماخ، پرۆسەی خێراکردنی وەڵامدانەوە سێکسییەکان دەوەستێنن، یان کۆتایی بە بەردەوامبوونی دەهێنن، لەم کاتەدا پێویستە پرۆسەی هاتنەخوارەوە لە ئاستی ئەو وەڵامدانەوانە ڕوو بدات کە ڕوویان داوە، کاتێک ئەمە ڕوو دەدات، سەرلەنوێ ڕۆیشتنەوە بۆ ئەوپەڕی ئاستی وەڵامدانەوە هەروا ڕاستەوخۆ ڕوو نادات و پێویستی بە وچانێک لە حەوانەوە هەیە، هەر هەوڵدانێکیش بۆ ڕوودانی ئەو وەڵامدانەوانە بەر لە کاتی خۆیان، بەزۆری یان هەمیشە، بێئەنجام دەبن، هەروەها دەشێ هەوڵدانێکی هیلاککەر و ئازاراوی بن بۆ خاوەنەکەی. ئەم واقیعە لە نێردا زیاتر لە مێ، تێبینی دەکرێ. وا دەردەکەوێ ناوەندی دەماری تایبەت بە کۆنترۆڵی سێکسی لە دەماخدا لە پیاودا کاراتربێ وەک لە ژندا.

هۆکاری جیاوازیی نێر و مێ لە تواناییاندا بۆ سەرلەنوێ گەڕانەوە بۆ وەڵامدانەوەی سێکسی و جارێکی دیکە گەیشتن بە ئۆرگازم، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، ئەو هەڵئاوسانەی بەهۆی پڕبوونی موولوولەکانی ئەندامە سێکسییەکان بە خوێن، لە ژندا ڕوو دەدات، لە کاتی وەڵامدانەوەی سێکسیدا، بۆ ماوەیەکی زیاتر دەمێنێتەوە، هەر لەبەر ئەمەیە ژن دەتوانێ لە هاندانی سێکسیدا بەردەوام بێ و بەدوای ڕوودانی ئۆرگازمێکدا، جارێکی دیکە بە خێرایی ئاستی وەڵامدانەوە سێکسییەکانی بەرز ببنەوە و ئۆرگازمێکی دیکەی بەدوادا بێ، بەڵام کاتێ پیاو بە ئۆرگازم دەگات، پڕبوونی موولوولە خوێنەکانی ئەندامە سێکسییەکەی ڕاستەوخۆ بەرەو خوارەوە دادەبەزێ و پێویستی بە وچانێک لە حەوانەوە هەیە تا بتوانێ جارێکی دیکە سەرلەنوێ بورووژێتەوە. هەریەک لە نێر و مێ لەگەڵ ڕوودانی ئەم واقیعەدا، ڕوودانی گۆڕانکاریی لە دەماخدا هاوکات دەبێ، هەروەک لە جووڵەی کارەبایی دەماخدا دەردەکەوێ کە شێوازەکەی دەگۆڕێ، لە کاتی وەڵامدانەوەی سێکسیدا، جووڵەی کارەبایی دەماخ لە حاڵەتی بەئاگایی چالاکدایە، بەڵام لەدوای گەیشتن بە ئۆرگازم و حەوانەوە، حاڵەتەکەی لە بارێکدا لە هەندێک ڕووەوە لە حاڵەتی کاتی نووستن دەچێ، ئەم گۆڕانە لە نێردا ئاشکراتر دەردەکەوێ وەک لە مێ-دا، ئەمەش ئەو بڕوایە بەهێز دەکات کە دەماخی نێر لە هاندانی سێکسیدا کارایی لە دەماخی مێ زیاترە، هەروەها لە کۆنترۆڵکردنی وەڵامدانەوە سێکسییەکانیشدا بە هەمان شێوە لە نێردا زیاترە وەک لە مێدا، لەبەر ئەوە لە نێردا هاندەرە ورووژێنەرەکانی خەیاڵ و بیرکردنەوە زیاترە وەک لە مێ-دا، ئیدی مەسەلەکە پەیوەندیی بە ورووژاندن، یان ڕەتکردنەوەی ئارەزووییەکەوە هەبێ، یان بە وەستاندن و لەکارخستنی ئەو ئارەزووەوە هەبێ لە کاتی ئەنجامدانیدا.

## ڕەفتاری سێکسی

ڕەفتاری سێکسی پشت بە ورووژاندنی سێکسی دەبەستێ، کە بە زۆری ورووژاندنەکە ورووژاندنی دەرەکییە. لێکچووە لەگەڵ ورووژاندنی سۆزداریدا، تاک لەڕێی ئەزموونەوە فێری هەردوو جۆر ورووژاندنەکە دەبێ. لێکۆڵینەوەکان ئاماژە دەدەن، کاتێک بە شێوەیەکی تەواو کارتێکەرە دەرەکییەکان دەوەستێنرێن، وەڵامدانەوەی ئاژەڵ بۆ ڕەفتاری سێکسی بە شێوەیەکی ڕیشەیی کاریگەر دەبێ، بۆ نموونە ئەگەر مەیموونی نێر و مەیموونی مێ لە سەرەتای گەشەیاندا بە جیا بەخێو بکرێن، پاشان بخرێنەوە لای یەک، تێبینی هیچ ڕەفتارێکی سێکسی لە هیچیاندا بەرامبەر بە یەک ناکرێ، تەنانەت ئەگەر مێیەکە لە سووڕی شەبەقی[**]Oestrousیشدا بوو. ڕەفتاریان لەگەڵ یەکدا زیاتر لە ڕەفتاری نێوان خوشک و برا دەچێ. لەو بارەدا کە نێرێکی بەئەزموون لە ڕووی سێکسییەوە دەخرێتە لای مێیەکی جیاکراوە لە ڕووی هەموو شارەزاییەکی سێکییەوە، دەبینی ڕەفتاری سێکسیی مێیەکە بە شێوەیەکە کە نێرەکە ڕەت دەکاتەوە و حەز بە دوورەپەرێزی دەکات، یان حەز دەکات لەگەڵ نێرەکەدا شەڕ بکات، کاتێکیش مێیەکی بەئەزموون لە ڕووی سێکسییەوە دەبرێتە لای مەیموونێکی نێری دوورخراوە لە ئەزموونی سێکسی، ئەم بارە دەبێتە هۆی ڕوودانی شەڕێکی توند لە نێوانیاندا. بەم شێوەیە ئەو ئەزموونەی کە بەهۆی فێربوون و تاقیکردنەوەوە ڕوو دەدات بۆ ورووژاندنی ڕەفتاری سێکسی لە ئاژەڵاندا، زۆر پێویستە. لەوانەیە بە پلەیەک لە پلەکان ئەم ڕێسایە بۆ ڕەفتاری سێکسی لە مرۆڤیشدا هەر پێویست بێ.

ڕەفتاری سێکسی ئەگەر بەهۆی ورووژاندنی پاڵنەری سێکسییەوە لە سەرچاوەیەکی دیاریکراوی گونجاوەوە ڕوو بدات، ئیدی لە ژندا بێ یان لە پیاودا، ڕەفتارێکە لە تاکێکەوە بۆ تاکێکی

دیکە و لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دیکە جیاوازە و دەگۆڕێ. لەوانەیە کارێکی ئەستەم بێ ئەم ڕەفتارە سێکسییە لە شێوازێک، یان چەند شێوازێکی دیاریکراودا سنووربەند بکەین، چونکە وەڵامدانەوە سێکسییەکان جۆریان زۆرە و لە تاکێکەوە بۆ تاکێکی دیکەش جیاوازە، هەروەها ئەستەمە ئەم ڕەفتارە تەنیا لە مرۆڤیشدا سنووربەند بکرێ، بوونەوەرانی خوارتر، یان نزمتر، بۆ نموونە وەک مشک، دەرکەوتووە بە دوانزە سووڕی وەڵامدانەوەی ورووژانی سێکسیدا تێپەڕ دەبێ، کە ئەم سووڕانە هاوکاتن لەگەڵ ڕوودانی کۆمەڵێک گۆڕانی هۆرمۆنیدا.

لێکۆڵینەوەکانی ماستەرز و جۆنسۆن لە بابەتی وەڵامدانەوە سێکسییەکاندا ئاماژەیان بەوە داوە، لە کاتی بەیەکگەیشتنی سێکسیدا، چەند جۆرێ لە شێوازی وەڵامدانەوەی سێکسی هەیە، بەلام ئەوان ئەم وەڵامدانە فسیۆلۆژیانەیان لە چوار سووڕدا کۆکردەوە. هەرچەندە ئەم چوار سووڕە بە تەواوی وەسفی ئەو ڕوخسارە ڕەفتاری، یان هەستییە دەروونییە جیاوازانە ناکەن کە لە کاتی سێکسدا ڕوو دەدەن.

### پێویستیی سێکسی

پێداویستییەکانی بوونەوەر چەند ئاستێکیان هەیە، بەپێی پێویستی بۆ ژیان و مانەوە بەنیسبەت بوونەوەرەکە و ئەو توخمەش کە ئینتیمای هەیە بۆی، بڕیاریان لەبارەوە دەدرێ. دەشێ لە ئاوەزی بوونەوەری زیندوودا، هۆشیاری بەرامبەر ئەم پێویستییانە نەبێ، بەڵکو تەنیا بەهۆی هێزی غەریزی، یان ڕاستترە بڵێم بایۆلۆژییەوە، هەوڵی تێرکردنیان بدرێ.

بە شێوەیەکی گشتی زیندەوەر ناتوانێ بۆ ماوەیەکی دووردرێژ، یان بە ئاسانی ئەم پێداویستییانە بیانوەستێنێ، یان ڕێگە لە تێربوونیان بگرێ. گرنگترین ئەم پێویستییانە و لە

هەمووشیان پێویستتر و پێداگرتر، ئەوانەن کە پەیوەندییان بە ژینگەی ناوەوەی بوونەوەرە زیندووەکەوە هەیە و هەروەها پێویستییان بە ڕێکخستنی ئەو ژینگەیەوە، ئەم جۆرە ڕێکخستنەش مەسەلەیەکی زیندەگییە بۆ ژیانی تاک و مانەوەی.

پلەی گەرمی، خواردن و ئاو، لەو پێداویستییە سەرەکییانەن کە سەر بە هەمان ئەو سیستمەن، ژینگەی ناوەوەی بوونەوەر ڕێک دەخەن. بەهۆی کاریگەریی ئەم پێویستییانەشەوە، بوونەوەری زیندوو- مرۆڤ- لەو کارتێکەرانە نزیک دەکەوێتەوە کە زامنی دابینکردنی پێویستییەکانی بۆ دەکەن و لەوانەش دوور دەکەوێتەوە کە زامنی ئەو دابینکردنەی بۆ ناکەن، بەڵام بوونەوەری زیندوو پێویستیی دیکەی هەن کە کەمتر پێویستن، یان کەمتر سەرەکین بۆ مانەوەی لە ژیاندا، ئەوەش ئەو پێویستییانەن کە پەیوەندییان بە پەیوەندییەکانی تاکەوە هەیە لەگەڵ ژینگەی دەرەوەدا، کە بۆ پاراستنی هاوسەنگیی ژینگەی ناوەوەی تاک ئەوەندە پێویست نین. سێکس و پەیوەندیی سێکسی لە پێشەوەی ئەم پێویستییانەن.

**١-پێویستیی زۆربوون:**

سادەترین بەڵگە بۆ بایەخی (سێکس و پەیوەندیی سێکسی) ئەوەیە، مانەوە بەبێ سێکس، ئەستەمە. تەواوی بوونەوەرانی زیندوو، جگە لە بەکتریا و هەندێک جۆری کەڕوو، لەگەڵ هەندێک جۆری پرۆتۆزوا Protozoa، هەموویان لەڕێی سێکسەوە زۆر دەبن. بۆ زۆربوونی بوونەوەرانیش لەڕێی سێکسەوە وا پێویست دەکات توخمەخانەی مێ لەگەڵ توخمەخانەی نێر بەیەک بگەن. بەم شێوەیە وا پێویست دەکات ژیانی هەردوو توخمەکە لە یەک ژینگە، یان شوێندا پێکەوە هەبن، هەروەها گەیشتنیان بە یەکدی ئاسان بێ و ئەو توانا بایۆلۆژییانەش هەبن کە بەیەکگەیشتنی ئەم دوو

خانەیە ئاسان دەکەن و وای لێ دەکەن ئەنجامی هەبێ، بە لایەنی کەمەوە تا ئەوکاتەی یەکگرتنی دوو توخمەخانەکە ڕوو دەدات. بۆ زامنکردنی ئەم بەیەکگەیشتن و یەکگرتنەش، وا پێویست دەکات، ئەگەر بۆ ماوەیەکی کاتیش بێ، کار بە ڕێسا سروشتییەکە نەکرێ، کە بریتییە لە ڕاونانی دەستدرێژیکەر و ڕاکردنی نێچیر، لە زۆربەی مێرووەکاندا نێرە و مێ یەک جار لە ڕووی سێکسییەوە بەیەک دەگەن و دوای ئەوە نێرە تەنیا بوونەوەرێکە کە مانەوەی هیچ سوودێکی نییە، یان لە هەندێک جۆری مێروودا، "مێ" کاتێ ماندەرە سێکسییەکەی تێر دەبێ، ڕاستەوخۆ نێرەکە دەخوات، ماندەری سێکسیی هێور دەبێتەوە و پاڵنەری برسێتی و خواردن سەرلەنوێ دەورووژێ. لەوەدەچێ لەم بوونەوەرە زیندووانەدا، پێویستیی سێکسی، خزمەتی زۆر مەبەستی دیکە بکات کە لەسەرووی هەموو مەبەستەکانەوەن، گرنگترینیشیان، مەبەستی زامنکردنی زۆربوونە، نموونەی زۆر هەن لە بوونەوەراندا کە مێیەکە لەدوای کرداری دانانی بێچووەکانی (لەدایکبوونیان) ڕاستەوخۆ، یان دوای ماوەیەکی کەم، دەمرێ، بۆ نموونە وەک مێشوولەی مایو May Fly و مێیەی هەشتپەل (ئەختەبووت) و چەندەهای دیکە.

زۆربەی گیانداران، جگە لە پۆلی باڵندە، ساڵی جارێک لە ڕووی سێکسییەوە بەیەک دەگەن، لەو وەرزەشدا بەیەک دەگەن کە پلەی گەرمیی بۆ وەچەکان گونجاوە و خواردنی پێویست دابینە، بەڵام باڵندە و شیردەرەکان لە هەموو بوونەوەرانی دیکە زیاتر لە ڕووی ڕەفتاری سێکسییەوە فرەجۆرن.

هەندێکیان لەگەڵ سووڕی وەرزی زۆربووندا گونجاون، واتە لە وەرزێکی دیاریکراودا زۆربوون ڕوو دەدات، بەڵام هەندێکیان توانایەکی مەزنتریان هەیە و توانیویانە لەگەڵ پێداویستییەکانی ژینگە و دەوروبەردا خۆیان بگونجێنن. بەم شێوەیە لە زەرووڕەتی

خۆسازاندن لەگەڵ زۆربوون و سێکسی وەرزیدا، تێپەڕیون، واتە گوێ بەوە نادەن لە وەرزێکی دیاریکراودا سێکس بکەن و زاوزێ بکەن، بەڵکو هەر کاتێ بارودۆخی ژینگەکەیان گونجاو بوو، سێکس دەکەن و زۆربوون ڕوو دەدات.

هەندێک جۆری ئاژەڵانیش کۆمەڵێک فاکتەر کاریان تێدەکات کە بەیەکگەیشتنی سێکسییان بۆ ئاسان دەکات، هەندێ لەم فاکتەرانە لە ژینگەی دەرەوەن، بۆ نموونە ئەو ئاماژانە کە نێر دەیدا بە مێ، یان بە پێچەوانەوە، بۆ ئەوەی کە ئامادەیە بۆ سێکس، هەندێکیشیان پەیوەندییان بە ژینگەی ناوەوە هەیە، بۆ نموونە گۆڕانە هۆرمۆنییەکان، بەتایبەتی لە مێ-دا، کە ئەم گۆڕانانە وا لە مێ دەکەن زیاتر بۆ گەیشتن و سێکس لەگەڵ نێردا ئامادە بێ، لە ڕووی بایۆلۆژیشەوە زیاتر ئامادە دەبێ بۆ ئەوەی ئەو بەیەکگەیشتنە سێکسییە بە بەرهەم بێ. هەرچەندە ڕەفتاری هەندێک لە ئاژەڵە شیردەرەکان ئەوە ئاشکرا دەکەن، ئەوەندە لەژێر کۆنترۆڵی هۆرمۆنی سێکسیدا نین بۆ نواندنی ڕەفتاری سێکسی و پێویستیی ئاژەڵەکە بە سێکس، بەڵام بەرزترین پلەکانی ئازادبوون لە کۆنترۆڵی هۆرمۆنی لە مرۆڤدا دەبینین، نموونەی ئەم ئازادبوونەش لە تێبینیکردنی تاقیکردنەوەیەکی کلینیکیدا دەستمان دەکەوێ، دەبینین لەدوای نەمانی هۆرمۆنی ئیسترۆجین لە مێ-دا، پاش ئەوەی هێلکەدانەکانی بۆ لادەبرێ، ڕەفتاری سێکسی لەو مێیەدا گۆڕانی بەسەردا نایەت، هەروەها گۆڕان لە خەیاڵە شەهوانی، یان هەستیارێتی بۆ نێر، یان دووبارەبوونەوەی گەیشتن بە ئۆرگازم ڕوو نادات، هەمان شتیش لە تەمەنی نائومێدیدا تێبینی دەکرێ، لەگەڵ ئەوەشدا هەردوو هۆرمۆنی ئیسترۆجین و پرۆجیسترۆن کەم دەبنەوە، بەڵام ئارەزووی سێکسی بە ڕوخسارە جیاوازەکانییەوە وەک خۆی دەمێنێتەوە.

لەوانەی ڕوونمان کردەوە ئاشکرایە کە مرۆڤ لە مانەوەیدا وەک توخمی مرۆڤ پشت بە کرداری زۆربوون دەبەستێ، کە ئەمیش پشت بە پیتاندنی نێوان دوو توخمەخانە دەبەستێت، کە ئەمە ڕوو نادات، تەنیا لەڕێی بەیەکگەیشتنی "نێر و مێ"وە نەبێ. ئەم ڕێسایە وەک خۆی ماوەتەوە، تەنانەت لە حاڵەتی پەنابردن بۆ پیتاندنی دەستکردیش، چونکە تا ئێستا بۆ ئەوەی کرداری پیتاندن ڕوو بدات، کۆئەندامی بایۆلۆژیی پەرەسەندووی نێر و مێ پێویستە هەبێ، ئیدی پیتاندنەکە سروشتی بێ، یان دەستکرد.

**٢-سێکس؛ پێداویستییەکی کۆمەڵایەتییە:**

ڕەفتاری سێکسی لە مرۆڤدا بە شێوەیەکی تایبەتی، بە یەکێک لە پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکان دادەنرێ، کە لە بناغەدا لە پێویستیی هەریەک لە مێ و کۆرپەکەی بۆ پارێزگاری و چاودێری و دابینبوونی خۆراکەوە دێت. ئەم پێویستییە وەک ئاشکرایە، بەهایەکی (مانەوە)ی هەیە و بێ ئەو ئەستەمە مێ بە تەنیا بتوانێ پارێزگاری لە نەوەی نوێ بکات و پاشان پارێزگاری لە مانەوەی تاک و توخمی مرۆڤ بکات.

لەپێناوی زامنکردنی ئەم ئامانجەدا، وا پێویست دەکات مێ لەم حاڵەتەدا بە شێوەیەک لە شێوەکان پارێزگاری لە سەرنجڕاکێشانی خۆی لە لایەن نێرەوە بکات. بەم شێوەیە سروشتی پەیوەندیی نێوان توخمەکە کە هەڵقوولاوی پێویستییەکانی پارێزگاریکردنە لە وەچە، بووەتە هۆی دەرکەوتنی هەندێ ڕوخساری ڕەفتاری نوێ لە بواری سێکسدا، کە تەنیا خزمەتی پارێزگاریکردن لە سێکس ناکات، هێندەی ئەوەی خزمەتی دروستبوونی گرووپ و کۆمەڵ و توندوتۆڵبوونی پەیوەندیی نێوان تاکەکانی ئەو گرووپانە دەکات. لە

دوا شیکاری ئەم گۆڕانە لە ئامانجەکانی سێکسدا، پێویستە ئەو مەبەستە کۆمەڵایەتییانەش دەستنیشان بکەیت کە بەهۆی پەیوەندیی سێکسییەوە پەیدابوون و دواجار خزمەتی مەبەستەکانی پارێزگاریکردن لە سێکس و مانەوەی دەکەن. هەرچەندە لە بواری بەرهەڵستیکردنی شەڕانگێزیدا دەرکەوتوون، لەجیاتی لە بواری زۆربووندا دەربکەون.

### ٣- سێکس و چێژ:

ئەوەی جێگەی مشتومڕ نییە، پەیوەندیی سێکسی بۆ زۆربەی خەڵک و لە زۆربەی حاڵەتەکاندا پەیوەندییەکە کە چێژ بەو دوو لایەنە دەبەخشێ، پێکەوە بەشدارن لە ئەنجامدانیدا، ئاشکراشە ئەم هەستکردن بە چێژە ئامادەبوونی هەیە بە چاوپۆشین لە ئامانجی پیتێن و زۆربوون لە پەیوەندیی سێکسی. هەستکردن بە چێژ لە سێکسدا بوونی هەیە، ئەگەر ئەو پەیوەندییە سێکسییە ئامانجی زۆربوون بێ، یان ئامانجی زۆربوون نەبێ. بەم شێوەیە توێژەر دەگاتە ئەو دەرئەنجامەی کە پەیوەندیی سێکسی لە ڕووی بایۆلۆژییەوە دوو فەرمانی هەیە کە هەریەکەیان لەوی دیکەیان جیایە، یەکەم فەرمانیان زۆربوونە و دووەمیان بۆ زامنکردنی چێژە. هەرچەندە زۆرێک لە خەڵک بە درێژایی سەردەمەکان و لە شارستانییەتە جیاوازەکاندا ئەوە ڕەت دەکەنەوە کە سێکس جگە لە ئامانجی زۆربوون و وەچەخستنەوە، هیچ ئامانجێکی دیکەی هەبێ، بەڵام ڕەتکردنەوەی ئەم واقیعە هیچ لەو واقیعە ناگۆڕێ کە پەیوەندیی سێکسی بێ جیاکاری، لە حاڵەتە سروشتییەکاندا چێژبەخشە و زۆرجار بە شێوەیەکی سەربەخۆ و جیا لە پێداویستی بۆ زۆربوون و منداڵبوون، پراکتیزە دەکرێ. نێر کاتێ ماستەربەیشن دەکات، واتە خۆی بە مەبەستی چێژوەرگرتن

دەست لە ئەندامەکەی خۆی دەدات، بێئەوەی ئەگەری ڕوودانی زۆربوون لەئارادا هەبێ، هەروەها مێ دەشێ لەڕێی ورووژاندنی ناوچەیەکی سێکسییەوە بە ئۆرگازم بگات، کە ئەو شوێنە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ هیچ پەیوەندییەکی بە کرداری پیتێنەوە نییە.

نێر و مێ لەو ماوانەشدا لەسەر پەیوەندیی سێکسی بەردەوامن کە پیتێنی تیادا ڕوو نادات، وەک لە کاتی سووڕی مانگانەدا و دووگیانی و تەمەنی نائومێدی، یان لەو حاڵەتانەدا کە ژن و پیاو بە مەبەست دەیانەوێ ئەو پەیوەندییە سێکسییە نەبێتە هۆی پیتێن و دروستبوونی منداڵ، وەک لە حاڵەتی بەکارهێنانی حەبی دژەسکپڕی و هۆیەکانی دیکەی ڕێگری لە سکپڕی. هەموو ئەمانە جەخت لەوە دەکەنەوە، کە زۆربەی هەوڵدانی مرۆڤ بۆ سێکس، ئامانجی دەستکەوتنی چێژە لای ئەو دوو هاوبەشەی ئەو هەوڵە دەدەن.

ئەو پرسیارەی کە دەشێ لە بابەتی ئامانجەکانی سێکسدا بورووژێ، ئەوەیە: ئایا هیچ دژایەتییەک هەیە لە نێوان ئەم دوو ئامانجەی سێکسدا، واتە ئامانجی زۆربوون و چێژ؟ پرسیاری دووەمیش ئەوەیە: کام لەم دوو ئامانجە بایەخی زیاترە؟ بە تێڕامان لە پرسیاری یەکەم، هیچ بەڵگەیەک بە دەستەوە نادات کە دژایەتی لە نێوان هەردوو ئامانجی زۆربوون و چێژدا هەبێ، چونکە هەستکردن بە چێژ کە بەهۆی پەیوەندیی سێکسییەوە ڕوو دەدات، وەک هاندەرێکی پێویست وایە بۆ ئەوەی مرۆڤ حەز لەو پەیوەندییە بکات، بەبێ ئەو چێژە دەشێ هاندەرێکی بەهێز نەبێ کە دواجار کرداری زۆربوون و مانەوەی توخمی مرۆیی بەردەوام بێ. بەم شێوەیە چێژی سێکسی خزمەتی مەبەستی هەوڵدان بەرەو پەیوەندیی سێکسی دەکات، تەنانەت ئەگەر مەسەلەی چێژ ئامانجی سەرەکی و یەکەمیش نەبێ لە سێکسدا، دواجار بەهۆی ئەو

چێژەشەوە کە مرۆڤ لە کاتی سێکسدا هەستی پێدەکات، دەشێ زۆربوون و فرەجۆری و مانەوەی توخم بەردەوام دەبێ.

ئەوەی ئاشکرایە، هەریەک لە مرۆڤ و ئاژەڵ لەپێناوی زامنکردنی کرداری زۆربوون و مانەوەی توخمدا، پاڵنەری سێکسیی خۆیان تێر ناکەن و هەوڵی بەدیهێنانی نادەن، هەرچەندە مرۆڤ هەندێجار لەسەر بناغەی ئەم پێداویستییانە، حەزکردن لە سێکس بە شیاو دادەنێ. وردبەرەوە لە نێوان ئەو دژبەیەکییەی لێرەدا هەیە، ڕوانین لە سێکس وەک ئەرک و پێویستییەک بۆ مانەوەی توخم و زۆربوون، لەگەڵ ڕوانین لە سێکس بەو وەسفەی کە سەرچاوەی چێژە، ئەم دژبەیەکییە لە جەوهەری سێکسدا نییە، بەڵکو لە چۆنێتیی ڕوانین بۆ ڕەفتاری سێکسدایە، بۆ نموونە فرۆید پێی وایە پرەنسیپی چێژ ئیدی لە سەرچاوەی سێکسییەوە بێ، یان ناسێکسی، پرەنسیپی باوە و زیاتر ڕەفتاری مرۆیی دیاری دەکات. فرۆید ئەوەشی بۆ دەرکەوتووە، جێبەجێکردنی ئەم پرەنسیپە لەگەڵ پێداویستییەکانی کۆمەڵگەدا دژ دەوەستێ کە هەمیشە کار بۆ ئەوە دەکات ئەم پرەنسیپە سنووردار بکات. ئاشکرایە ئەم دژبەیەکییە تەنیا لەسەر ئاستی جێبەجێکردن هەیە و هەقیقەتێکی بایۆلۆژیی نییە، چونکە پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکان، پێداویستییە سێکسییەکان ڕەت ناکەنەوە، هەروەها پێویستیبوونی چێژیش تیایاندا ڕەت ناکەنەوە، بەڵام هەندێجار تەنیا بوار و ڕێگەکانی گوزارشتکردن دیاری دەکەن، ئەم دیاریکردنەش لە دژی سێکس و پێویستییەکانی ناوەستێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە تەواوی دەکات، چونکە لەگەڵ پێداویستییەکانی مرۆڤ بۆ گەشە و پەرەسەندن دەگونجێ.

## فاکتەرەکانی ژیانی سێکسی

ژیانی سێکسی بەپێی پێگەی بوونەوەر لە پەیژەی پەرەسەندندا، تەنگی و بەرفراوانی بەخۆوە دەبینێ. لەو بوونەوەرانەدا کە ژیانی سێکسی تەنیا لە کرداری زۆربووندا کورت دەبێتەوە، ئەم ژیانە بەرتەسک و تەنگە، بەڵام لە مرۆڤدا کە بوونەوەرێکی پەرەسەندووە، فاکتەری زۆربوون لە ناوەڕۆکی ژیانی سێکسیدا بەشێکی زۆر بچووکە، بەشی گەورەی ئەم ناوەڕۆکە، لایەنەکانی دیکەی ژیان دەگرێتەوە، وەک لایەنی کۆمەڵایەتی و دەروونی و شارستانی کە مرۆڤی لە تەواوی بوونەوەرە زیندووەکانی دیکە پێ جیا دەکرێتەوە.

بەرتەسکترین، یان تەنگترین ژیانی سێکسی لەو بوونەوەرانەدایە کە تاکخانەن، کە کرداری زۆربوون لەڕێی دابەشبوونی خۆیی خانەکەوە بۆ دوو خانە ڕوو دەدات. لەسەر ئاستی پلەی خانەیی لە پەرەسەندنی بایۆلۆژیدا، هەندێجار جۆرێک لە جووتبوون لە نێوان دوو خانەکەدا ڕوو دەدات، ئەم جووتبوونە لە هەندێ ڕووەوە ڕەفتاری سێکسیی هەیە، هەر خانەیەک نیوەی کرۆمۆسۆمەکانی لەگەڵ خانەکەی دیکەدا دەگۆڕێتەوە، لە بوونەوەرە زیندووە پلە باڵاترەکاندا، کرداری زۆربوون، لەڕێی بەیەکگەیشتنی کرۆمۆسۆمەکان بە ڕێگەیەکی دیکە ڕوو دەدات، لەم بوونەوەرانەدا خانەی تایبەتی هەیە کە ئەم کرۆمۆسۆمانەی تیادایە، لە مێ-دا پێیان دەوترێت هێلکۆکە Ova و لە نێریشدا پێیان دەوترێت تۆو Sperm، لە پاش سمینی هێلکۆکە لە لایەن تۆوەوە، هێلکەی پیتێنراو دروست دەبێت و پاشان دابەش دەبێ و گەشە دەکات تا دەبێتە بوونەوەرێکی زیندووی تازە.

لە نێوان بوونەوەرانیشدا جیاوازی هەیە لە ڕووی بەیەکگەیشتنی نێوان هێلکۆکەی مێ و تۆوی نێرەوە. بۆ ئەم بەیەکگەیشتنە چەندەها ڕێگە هەیە، لەوانەیە سادەترینیان ئەوە

بێت، مێ هێلکۆکەکانی لەناو ئاودا بڵاو دەکاتەوە، نێریش تۆوەکانی لە هەمان کاتدا بڵاودەکاتەوە، بێگومان پێویستە بارودۆخی ژینگەییش بۆ بەیەکگەیشتنیان ئاسان و گونجاو بێ، بۆ نموونە لە کاتی بەرزترین هەڵکشانی ئاوەکەدا، یان لە کاتێکدا کە مانگ چواردەیە، بەڵام بەیەکگەیشتنی هێلکۆکە و تۆو لە زۆربەی ئاژەڵاندا لەڕێی پەیوەندیی سێکسیی ڕاستەوخۆی (نێوان نێر و مێ)وە ڕوو دەدات.

ئەوەی ئەم بەیەکگەیشتنەش زامن دەکات، چوونە ناوەوەی تۆوی نێرە بۆ ناو بۆریی زاوزێی مێ و پیتاندنی هێلکۆکەیە، کە هەمان شت لە مرۆڤیشدا ڕوو دەدات. ئەوەی بڕیار لەسەر کرداری زۆربوونی سێکسی دەدات، بە کرداری بەیەکگەیشتنی نێوان دوو تۆخمەکەشەوە و لەسەر هەر ئاستێک بێ، ڕووداوێکە لەڕێی سروشتی بایۆلۆژییەوە بڕیاری لەسەر دەدرێ، ئەم سروشتە بایۆلۆژییە بەپێی ئەو بڕیارانەی کە ڕەگەزەکانی بوونی هەر پلەیەک لە پلەکانی بوونەوەرە زیندووەکان دیاری کردووە، بڕیار دەدات. بنەماکانی ئەم پرۆسەیە، یان ئەم کردارە لە دەرەوەی ئیرادەیە، بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی سەرکەوتوو توانا بایۆلۆژییەکان بەدی بهێنرێن، پێویستە کۆمەڵێک فاکتەری ژینگەیی گونجاو دابین بن، سروشت و کاریگەریی ئەم فاکتەرانەش لە پلەیەکەوە بۆ پلەیەکی دیکەی بوونەوەران جیاوازییان هەیە، چونکە بونیادی بایۆلۆژیی بوونەوەرێک، بە هەموو ئەندامەکانی کە تایبەتن بە کرداری سێکس و هەروەها ناوەندەکانی کە کار دەکەنە سەر فەرمانی ئەم ئەندامانە وەک هۆرمۆنەکان و ناوەندە دەمارییەکان، تەواوی ئەمانە یاسا بایۆلۆژییەکان بڕیاریان لەسەر دەدەن، بەڵام فاکتەرە ژینگەییەکان وەک وەرزەکانی ساڵ و پلەی گەرمی و تیشکی ڕووناکی و بۆن و فاکتەرەکانی دیکەی ژینگە، هەموویان کار دەکەنە سەر کارایی کردارە بایۆلۆژییەکانی کە بۆ

پەیوەندیی سێکسی و زۆربوون پێویستن. هەرچەندە ئەم فاکتەرە ژینگەییانە وەک یەک کار ناکەنە سەر هەموو ئاژەڵان و لە ئاژەڵێکەوە بۆ یەکێکی دیکە جیاوازە، بۆ نموونە لە کاتێکدا هەندێک پۆلی باڵندە و ئاژەڵان بەپێی ڕیسای وەرزەکانی ساڵ سێکس دەکەن، دەبینین هەندێ پۆلی دیکەی باڵندە و ئاژەڵان لەم کۆتوبەندە ڕزگاریان بووە و توانیویانە خۆیان لەگەڵ دەوروبەر و ژینگەدا بگونجێنن و بە ئازادییەکی زیاترەوە لە پەیوەندییە سێکسییەکانیاندا هەڵسوکەوت بکەن، هەروەها هەندێکیان توانیویانە چەند فاکتەرێکی نوێ و کاریگەر بهێننە ناو ژیانی سێکسییانەوە کە پشت دەبەستێ بەو ئاماژانەی لە لایەن هاوبەشەکەیەوە وەریدەگرێ و لەڕێیەوە تێدەگات، ئەوە کاتێکی گونجاوە بۆ سێکس.

### فاکتەرەکانی ڕەفتاری سێکسی لە مرۆڤدا

ڕەفتاری سێکسی لە مرۆڤدا، وەک ڕەفتاری سێکسیی بوونەوەرانی دیکە وایە، هەمان ئەو فاکتەرە سەرەکییانە بڕیاری لەسەر دەدەن کە ڕەفتاری سێکسی لە زۆربەی بوونەوەرە زیندووەکاندا دیاری دەکەن، ئەم فاکتەرانەش بە پلەی یەکەم فاکتەری بایۆلۆژین و بە پلەی دووەمیش فاکتەرە ژینگەییەکانن کە لەگەڵ یەکەمدا کار لێک دەکەن، بەڵام ژیانی سێکسی لە مرۆڤدا لە ژیانی سێکسیی ئەو بوونەوەرانە جیاوازە کە لە پلەیەکی نزمی پەرەسەندندان، سەرباری بوونی فاکتەرێکی دیکە کە بڕیار لەسەر ڕەفتاری سێکسی دەدات، ئەویش فاکتەری شارستانییەتە، کە فاکتەرێکی کارایە لە بەخشینی هەندێ ڕوخساری نوێ بە ژیانی سێکسی لە مرۆڤدا، وەک ڕوخسارەکانی فرەجۆری و جیاوازی و لادان، کە ئەمانە لە بوونەوەرانی دیکەدا نین، بەڵام هەڵەیە ئەگەر وا بیربکەینەوە کە تەنیا مرۆڤ توانیویەتی ئەم ڕەهەندە

شارستانییە بە ژیانی سێکسی ببەخشێ، چونکە زۆر ڕوخساری دیکەی ڕەفتاری سێکسی لە بوونەوەرانی دیکەدا هەن کە وا دەردەکەون تەنیا کاریگەریی فاکتەرە بایۆلۆژی و ژینگەییەکانیان لەسەر نییە، بۆیە وا پێویست دەکات ئەو گریمانەیە بکرێ، کە جۆرێک لە پەرەسەندن لە ژیانی سێکسیی بوونەوەرانی دیکەشدا ڕووی داوە، ئەگەر لەگەڵ ڕەفتاری سێکسیی مرۆڤدا پێوانە بکرێن، دەکرێ بە خەسڵەتی شارستانی دابنرێن. توێژەرەوەکان شێوەیەک لە فرەجۆری و هونەر و لادانیان لە ڕەفتاری سێکسیی هەندێ لە ئاژەڵاندا بەدی کردووە کە ناکرێ تەنیا لەسەر بناغەی فاکتەرە بایۆلۆژی و ژینگەییەکان لێک بدرێنەوە، بەڵکو پێویستە بۆ کاریگەریی فێربوون و لاساییکردنەوە و ئەزموون و پێویستی بگەڕێننەوە، کە تەواوی ئەم فاکتەرانە لە پرۆسەی شارستانی لە ژیانی مرۆڤدا کاران و بە هەمان شێوە لە ژیانی هەندێ لە ئاژەڵانی دیکەشدا، بۆ نموونە، لێکۆڵینەوەکان ئاشکرای دەکەن، ئەو تاکانەی کە لە منداڵییەوە دوور لەناو کۆمەڵ و پەیوەندیکردنی کۆمەڵایەتی پەروەردە دەکرێن، بەگشتی لە گەورەییدا بایەخێکی کەمتر بە لایەنە سێکسییەکانیان دەدەن، هەمان دیاردە لەو مەیموونانەشدا تێبینی کراوە کە بە تەنیا بەخێو دەکرێن. ئەو مەیموونە نێرانەی کە دوور لە مەیموونی دیکە گەورە دەبن، لە گەورەییدا هەرچەندە حەز و ئارەزوویەکی زۆر بۆ مەیموونە مێیەکان دەردەبڕن، بەڵام تێبینی کراوە، توانستی خستنەناوەوەی ئەندامی سێکسییان بۆ ناو ئەندامی سێکسیی مێیەکان کەمە و بەزۆری لەم کردارەدا شکست دێنن. ئەم دیاردەیە بەڵگەیە لەسەر بایەخی ئەزموونی کۆمەڵایەتی لە قۆناغی زووی ژیاندا لەپێناوی پەرەسەندنی ڕەفتاری سێکسیدا، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ بەڵگە هەن بۆ ئەوەی کە شارستانییەت کاری کردووەتە سەر ڕەفتاری سێکسیی هەندێ لە ئاژەڵان، بەڵام ناکرێ بڵێین ئەم کاریگەرییە لە

مرۆڤ و ئاژەڵدا وەک یەکە. لە مرۆڤدا بایەخی شارستانی تا سنووری زیاتر ڕۆیشتووە، تەنانەت لە لایەکەوە بەسەر فاکتەرە ژینگەیی و فاکتەرە بایۆلۆژییەکاندا سەرکەوتووە، لە لایەکی دیکەشەوە گەیشتووەتە ئاستی کۆنترۆڵکردنیان، ئەم جۆرە کاریگەرییەش ئاشکرایە، نەک تەنیا لەسەر ڕەفتاری سێکسیی مرۆڤ، بەڵکو لەسەر ئەو ناسنامە توخمییەش کە تاک بەهۆی کاریگەریی فاکتەرە کۆمەڵایەتی و دەروونییەکانەوە، خاوەنییەتی، کە هەر لە منداڵییەوە ئەو فاکتەرانە کاری تێدەکەن.

دەشێ ئەو فاکتەرانە ناسنامەیەکی توخمی بە تاک ببەخشن کە لە ڕووی ڕەفتار و لە ناوەڕۆکی دەروونیشدا جیاواز بێ لەو ناسنامە توخمییە ڕاستەقینەیەی کە فاکتەرە بایۆلۆژییەکان بڕیاریان لەسەر داوە. (ئەم حاڵەتە لەو کەسانەدا ڕوو دەدات کە توخمەکەیان نادیارە، دەشێ منداڵێکی لەم جۆرە لە منداڵییەوە وەک کچ مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، لە کاتێکدا لە ڕووی بایۆلۆژییەوە کوڕ بێ، یان بە پێچەوانەوە- وەرگێڕ).

## شارستانییەت و ڕەفتاری سێکسی لە مرۆڤدا

فاکتەرە بایۆلۆژییەکان لە مرۆڤدا ناسنامەی سێکسیی تاک، نێر بێ یان مێ، زامن دەکەن، هەروەها جۆر و شێوەی ئەو ئەندامانە دیاری دەکەن کە لە هەردوو توخمەکەدا هەن، بەو شێوەیەی کە لەگەڵ ناسنامەکەدا هاوجێ دەبێ. دواجار شێوازی ئەنجامدانی کرداری سێکسی و وەڵامدانەوەی گونجاو لە هەردوو توخمەکەدا زامن دەکەن.

لەوانەیە نزمترین یان سادەترین ڕەفتاری سێکسی بریتی بێت لە پەیوەندیی سێکسیی ڕاستەقینە، واتە سێکسکردن لە نێوان نێر و مێدا ڕوو دەدات، بێ ئەوەی هیچ فاکتەرێکی کۆمەڵایەتی و

شارستانی بۆ ئەنجامدانی ئەم پرۆسەیە پێویست بێت. ئەم ڕەفتارە لەم ئاستە نزمەدا پێویستی بە هیچ فێربوون، یان لاساییکردنەوەیەکی کۆمەڵایەتی نییە، بەڵام ڕەفتاری سێکسی لە مرۆڤدا لەم سنوورە تەسکانە تێپەڕ دەبێ، واتە لە سنووری ئەوەی کە پەیوەندیی سێکسی تەنیا پەیوەندییەکی بایۆلۆژی بێ، ئەم تێپەڕبوونەش لە ڕووی بەرفراوانی و فرەجۆرییەوە لەنێو تەواوی مرۆڤ لە شارستانییەتە جیاوازەکاندا وەک یەک نییە. ڕوخسارەکانی ڕەفتاری سێکسی و پێگەی ژیانی سێکسی لە دەروونی تاکەکاندا و ئەو بەهایانەی کە گرووپێک بە سێکسی دەبەخشێ، لە کۆمەڵگەیەکی شارستانییەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی شارستانیی دیکە جیاوازن.

ئەو لێکۆڵینەوە زۆرانەی دەربارەی هەڵوێستی کۆمەڵگەکان بەرامبەر بە سێکس لە شارستانییەتە دێرین و سەرەتایی و هاوچەرخ و پێشکەوتووەکاندا و ئەنجام دراون و لەنێو یەکدیدا بەراورد کراون، هەموویان پشتیوانی لەو دەرئەنجامە دەکەن کە بەشی گەورەی ژیانی سێکسیمان بەهۆی کاریگەریی واقیعی ئەو شارستانییەتەوە بڕیاری لەسەر دەدرێ، کە تیایدا دەژین.

ئەو لایەنانەی ژیانی سێکسی کە فاکتەرە زۆر و فرەجۆرەکانی شارستانییەت کاری لێیان کردووە و بەردەوامیش کاریان لێ دەکات، زۆرن وەک ڕەفتاری سێکسی لە ڕووی شێوازە بنەڕەتییەکانی سێکسکردن و ئەو ئەندامانەی کە دەورووژێن و گەمەبازیی سێکسی و هەڵبژاردنی ئەو هاوبەشەی کە سێکسی لەگەڵدا دەکەیت و فرەجۆری، یان فرەژمارەیی پەیوەندییە سێکسییەکان و پەیوەندیی سێکسیی قبوڵکراو، یان حەرام و

لایەنەکانی سەرنجڕاکێشان لە هەردوو توخمەکەدا، لایەنەکانی جوانناسی و بەهای مەعنەوی سێکس، پەیوەستییە سۆزداری و ئەقڵانییەکانی سێکس و چەندەها مانا و پەیوەستی دیکە کە دەربارەی سێکس بەهۆی کاریگەریی شارستانییەتەوە، دروست بوون، کە ئەمانیش کاریگەرییان لەسەر پێشکەوتنی شارستانییەت هەبووە. بەم شێوەیە دەبینین کە سێکس و شارستانییەت لە حاڵەتی کارلێکردنی بەردەوامدان و هەریەکەیان دەبێتە هۆی پێشکەوتنی ئەوی دیکەیان.

**سێکس و دەروون**

هەرچەندە ناکرێ بوونی برێک یان شێوەیەک لە ژیانی دەروونی لەو بوونەوەرانەدا ڕەت بکەینەوە کە لە ڕووی پەرەسەندنەوە لە خوار مرۆڤەوەن، بەڵام ئەوەی گومانی تیادا نییە، ژیانی دەروونی لای مرۆڤ مەزنتر و قووڵتر و مەودا بەرفراوانترە و کاریگەریشی بۆ سەر ژیانی مرۆڤایەتی زیاترە بە بەراورد لەگەڵ هەر بوونەوەرێکی دیکە. ئەم کاریگەرییە لەسەر ژیانی سێکسی زیاتر دەرکەوتووە، ئەگەر لەگەڵ لایەنەکانی دیکەی ژیاندا بەراورد بکرێ. کاریگەریی شارستانیش بۆ سەر ژیانی سێکسی هەر بریتییە لەو کاریگەرییە دەروونییانەی کە لە شێوەیەکی پێشکەوتووتر و دیارتر لە ژیانی مرۆڤدا دەرکەوتووە، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە خەسڵەتە دەروونی و ئەقڵییەکانی کە بەندن بە سروشتی بایۆلۆژی و پەرەسەندنی دەماخییەوە، بەردەوام لە پەرەسەندن و گەشەسەندندان، بە بۆنەی ئەم خەسڵەتەوە مرۆڤ توانیویەتی تێڕامان بکات و لەو ڕێیەوە لە لایەکەوە بە ڕەمز و مانای شتەکان بگات، لە لایەکی دیکەوە بتوانێ وێنای ئەڵتەرناتیڤ و شێوازە نوێیەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ

واقیعدا بکات، لەگەڵ ئەوەشدا کە وا پێویستی کردووە مرۆڤ پشت بە بناغەی بایۆلۆژی ببەستێ و بیکات بە ڕێسا و بناغە بۆ ڕەفتارەکانی، بەڵام بەهۆی پەرەسەندنی دەروونی و ئەقڵییەوە وای لێ هاتووە بە ئیرادەی خۆی مامەڵە لەگەڵ ئەم بناغە بایۆلۆژییەدا بکات، ئەم خەسڵەتەش (واتە خەسڵەتی ئیرادە)، بە لایەنی کەمەوە لە ڕووی جەستەییەوە، تاک وەک خەسڵەتێکی تاکانەیی پراکتیزەی دەکات، هەروەها بەو سیفەتەی کە بەشێکە لەو کۆمەڵگە شارستانییەی کە تیادا دەژی.

ژیانی سێکسی لای زۆربەی خەڵک لەنێوکۆیەکدا دیاری دەکرێ کە زیاتر لەگەڵ ڕێسای بایۆلۆژی و ژیانی سێکسیدا هاوجێ بێ. ئەم شێوازە لە ژیان دەشێ ببێتە مایەی حەوانەوەی تاک و ڕزگاربوونی لە ئازار و کۆژان، ئەگەر داواکارییە بایۆلۆژییەکانی بۆ سێکس تێرکران، ئەمە ئەوەیە کە لای زۆربەی خەڵک ڕوو دەدات، بەڵام دیاریکردنی نێوکۆی ژیانی سێکسی لەڕێی ڕێسای بایۆلۆژییەوە، تاک بێبەش دەکات لە وەبەرهێنانی وزە سێکسییەکانی لەڕێی کارلێکردن لەگەڵ وزە دەروونییەکانیدا. ئەگەر ئەمە ڕووی دا، ئەوا تاک تەنیا ڕەمز و مانا و بەهاکانی سێکس لەدەست نادات، بەڵکو ئەگەری بەکارهێنانی سێکس بۆ مامەڵەکردن و پەیوەندیکردنی مرۆیی لەدەست دەدات، لەسەر ئاستی تاکانەیی و ئاستی کۆمەڵایەتی، بەبێ بوونی ئەم مامەڵەکردنە مرۆییە و ئەم پەیوەندیکردنە، مرۆڤ دوور لە بزاوتی شارستانی دەمێنێتەوە و لە پرۆسەی پەرەسەندندا لەسەر ئاستێکی نزمی گەشە دەمێنێتەوە، یان هەر لە گەشە دەوەستێ. کە دەڵێین پەرەسەندن، مەبەستمان لە پەرەسەندنە بە هەردوو ناوەڕۆکە دەروونی و شارستانییەتییەکەیەوە.

**پەراوێزەکان:**

*دەماخی ناوەڕاست Midbrain، بەشێکە لە ناوەندە کۆئەندامی دەمار و پەیوەستە بە فەرمانەکانی بینین، بیستن، کۆنترۆڵی جووڵە، خەوتن، بێداربوونەوە و ڕێکخستنی پلەی گەرمیی لەش -وەرگێڕ.

**سووڕی شەبەقی Oestrous، ئەم وشەیە لە لاتینییەوە هاتووە کە بە مانای ئارەزووی سێکسیش دێت، سووڕێکە هۆرمۆنەکان کۆنترۆڵی دەکەن، زنجیرەیەک گۆڕانکاریی فسیۆلۆژی لەخۆ دەگرن، لەدوای پێگەیشتنی سێکسی لە مێینەی مرۆڤ و شیردەرەکانی دیکەدا ڕوو دەدات، قۆناغەکانی دروستبوونی هێلکە دەکەونە ناو ئەم سووڕەوە -وەرگێڕ.

# بەشی دووەم
# جووتتوخمی

-پێشەکی
-جووتتوخمی لە چیرۆک و ئەفسانەکاندا
-بەڵگە زانستییەکان
-بەڵگە بایۆلۆژییەکان
-بەڵگە پزیشکییەکان
-بەڵگەکانی دیکە

## جووتتوخمی

جووتتوخمی له هزری مرۆییدا، چەمکێکی دێرینه دەربارەی بنەچەی هەریەکە لە دوو توخمەکە، بەڵام لە سەردەمی نوێدا، جارێکی دیکە دەرکەوتەوە. لەم ساڵانەی دواییدا مشتومڕێکی زۆری لەبارەوە کراو بایەخی پێ درا، چونکە دەشێ ئەم چەمکە تیشک بخاتە سەر هەندێ لەوپراکتیزە و ڕەفتارە سێکسییانەی کە لە ژیانی هەندێک لە تاکەکانی نەوەی تازەدا تێبینی دەکرێن.

زاراوەی جووتتوخمی بەپێی تێگەیشتنی هاوچەرخ، لەو تێبینییەوە هەڵقووڵاوە کە هەندێک لە تاکەکان ژن بن یان پیاو، حەز و ئارەزووی ڕۆمانسی یان سێکسییان لەگەڵ تاکەکانی هەردوو توخمەکەدا هەیە و هەندێکیشیان کرداری سێکسیی ڕاستەقینە لەگەڵ هەردوو توخمەکەدا ئەنجام دەدەن. ئەم حەز و ئارەزووانە وا لێک دەدرێنەوە کە بەڵگەن لەسەر مۆرکی مرۆیی و بنەچە بایۆلۆژییەکان. مەرج نییە کارکردن بەم چەمکە ئاماژە بێت بۆ بوونی هەردوو توخمەکە بە بڕی یەکسان لە هەریەک لە نێر و مێدا، هەروەها بوونی جووتتوخمی ئەوەش ناگەیەنێ، ئیدی ئەو کەسە بەڕاستی دەتوانێ سێکس لەگەڵ هەردوو توخمەکەدا بکات، چونکە ئاراستەی سێکسیی هەر تاکێک بەپێی هەستکردنی ئاگامەندانەی یان بێئاگایانەی، دیاری دەکرێ، ئەگەر ئەوەش ڕووی دا ئەو کەسە گوزارشتی لەو حەز و ئارەزووە سێکسییانەی کرد، ئەوا ئەمە بەپێی هێزی ڕێژەیی بوونی دوو توخمەکە ڕوو دەدات.

هەندێ ڕا هەیە بوونی جووتتوخمی ڕەت دەکاتەوە، هەندێک لە زانایان ڕوخسارەکانی ڕەفتاری جووتتوخمی وا لێک دەدەنەوە کە

بەرئەنجامی کاریگەرە ژینگەیی و شارستانی و کۆمەلایەتییەکانە و لە سروشت و بنەچەی بایۆلۆژیی مرۆڤدا بوونی نییە.

لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک لە ڕوخسارە ڕەفتارییەکانی هەردوو توخمەکە، مۆرکی کارتێکەرە ژینگەیی و شارستانی و کۆمەلایەتییەکانیان هەڵگرتووە، بەلام ناکرێ تەواوی جۆر و پلەکانی ئەم ڕەفتارە سێکسییانە، تەنیا لەسەر بناغەی فاکتەرە ژینگەیی و شارستانی و کۆمەلایەتییەکان لێک بدرێنەوە، هەر دەبێ ئەو گریمانەیە بکرێ کە فاکتەرێکی بایۆلۆژییش هەیە بڕیار لەسەر ڕەفتاری سێکسی دەدات.

قووڵبوونەوە لەم گریمانەیە بە دێرینترین ئەو گریمانانە دادەنرێ کە لە هزری مرۆییدا بوونی هەبووە، ئەگەر بمانەوێ لەم زاراوەیە تێبگەین و هەڵسەنگاندن بۆ ڕەگوڕیشە و ئاستی لێکدانەوەی ئەو دیاردانەی کە لێوەی پەیدا بوون، بکەین، ئەوا ناکرێ خستنەڕووی ئەم گریمانانە بە کۆن و تازەوە پشتگوێ بخەین، لەم خستنەڕووەدا، بەدوای یەکدا باسی ئەمانە دەکەین، چەمکی جووتتوخمی لە چیرۆک و ئەفسانە دێرینەکاندا، پاشان بەڵگە زانستییەکان لە بواری بایۆلۆژی و دەروونیدا، دواجار تێبینییە کلینیکییەکان دەربارەی ئەو ڕەفتارانەی کە ئاماژەن بۆ بوونی ئەم جووتتوخمییە.

### جووتتوخمی لە چیرۆك و ئەفسانەکاندا

ناتوانرێ بە وردی ئەو کات یان شوێن و سەردەمە لە مێژووی دووری مرۆڤایەتیدا دیاری بکرێ، کە مرۆڤ تیایدا دەستی بە تێڕامان دەربارەی یەکەمین بنەچەی خۆی کردووە، ئایا نێر یان مێ کامیان پێشتر خوڵقاون؟ لەوانەیە مرۆڤی دێرین بۆی دەرکەوتبێ باشترین چارەسەر بۆ ئەم کێشەیە ئەو گریمانەیە بێ کە مرۆڤی یەکەم لە کیانیدا (لە بونیادیدا) خەسڵەتی هەردوو

توخمەکەی هەڵگرتبێ، ئەم گریمانەیە لە شوێنەوارە کۆنەکانی شارستانێتی لە زۆر وڵاتانی وەک خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و چین و زۆری دیکەش لە وڵاتان، ئاشکرا دیارە، گەلانی ئەم شارستانییەتانە نێر و مێیان لە ناسنامەیەکی دوانیدا و لە یەک جەستەدا کۆکردووەتەوە و وەک خواوەندێک پەرستوویانە، نموونە وەک (ئەستارتی Astarte) کە مێ بووە بە ڕیشەوە، لە سوریا و فینیقیا پەرستوویانە، لە وڵاتانی ڕافدەین، عەشتاریان پەرستووە کە لە شێوەی مرۆڤێکدا وێنا کراوە و لە یەک کاتدا ڕوخسارەکانی نێرینەیی و مێینەشی هەڵگرتووە. لە غانا، نیامی Nyameیان وەک خواوەند پەرستووە کە سیفەتی هاوبەشی نێرینە و مێینەی هەبووە، تا ئێستاش لە لایەن هەندێک لە هۆزەکانی ئاکان Akan لەو وڵاتانەدا هەر دەپەرسترێ.

ئەفسانە دێرینەکانی یۆنان گریمانەی جووتتوخمییان بە شێوەیەکی وردتر و ڕۆمانسیتر بەرجەستە کردووە، ئەویش لەڕێی ئەفسانەی بەناوبانگ (هرم ئەفرودیتوس Her maphroditus) کە کوڕی هیرمسHermes ی خواوەند و ئەفرۆدیتی خوا بووە، هرم ئەفرودیتوس گەنجێکی تا بڵێی جوان بووە، نیوەی نێر و نیوەکەی دیکەی مێ بووە. بەپێی ئەفسانەکە سلمسیس Salmaciی حۆری هۆکاربووە بۆ ئەوەی هرم ئەفرودیتوس ببێ بە جووتتوخم، کاتێ کەوتووەتە داوی خۆشەویستی ئەم حۆرییەوە، تەنیا نێر بووە، بەهۆی خۆشەویستیی زۆرییەوە بۆی و ترسی لە لێکدابڕانی، داوای لە خواوەند کردووە کە قەد لێی جیا نەکاتەوە، خواوەند وەڵامی بۆ پاڕانەوەکەی بووە و هەردووکیانی لە یەک جەستەدا کۆکردووەتەوە (نیوەی نێر و نیوەی مێ)، ئەم ئەفسانەیە هۆکاری وەرگرتنی خەسڵەتی (نێرەمووکی) لێک دەداتەوە، نێرەمووک ئەو

سیفەتانەی هەیە کە هەریەک لە نێر و مێ هەیانە و زاراوەی هرم ئەفرودیتی ئەفسانەکەش هەر لەمەوە هاتووە.

گریکییەکان تێگەیشتن لەم ئەفسانانەیان لە کارە هونەرییەکاندا نەمر کردووە، وەک لە کاری هەڵکۆڵین و پەیکەرتاشیدا تێبینی دەکرێ، هەروەها لە کردار و ڕەفتاریشیاندا ئەم ئەفسانانە ڕەنگیان داوەتەوە، ئەفلاتوون لە یەکێک لە دیالۆگەکانی (سمبوزیوم Sympoosium)دا دەڵێ: "...لە ڕابردوودا سێ توخم هەبوون، نەک دوو توخم، وەک لە ئێستادا کە تەنیا نێر و مێ هەن، توخمی سێیەم هاوبەش بوو، واتە نێر و مێ پێکەوە بوون، هەرچەندە ئێستا نەماوە، بەڵام ناوەکەی هەر ماوە، هەروەها ئەفلاتوون لەسەر زمانی ئەرستۆفانیس Airstophanesەوە لە هەمان دیالۆگدا دەڵێ، مرۆڤ تەنیا لە ڕووی توخمەوە بە نێرەمووکی نەخولّقاوە، بەڵکو بە هەموو شێوەیەک دوانی بووە، چوار دەست و چوار قاچ و دوو ڕوخساری هەبووە، هێزە هەستی و ماسوولکەییەکانی بێشومار بوون، بە خێراییەکی زۆر جووڵاوە، وەک بەرمیلێکی لوولەکی بە دەوری خۆیدا سووڕاوەتەوە و تێبینیی هەموو شتێکی کردووە کە لە دەورووپشت و لە پشتەوەی ڕوویان داوە، لە یەک کاتدا پێشەوە و دواوەی خۆی بینیوە.

بەڵام ئەم هێزە لە ڕادەبەدەرەی ئەم مرۆڤە خواوەندی نیگەران کرد، ئەپۆلۆ-ی خواوەندی ڕاسپارد کە ئەم مرۆڤە بکات بە دوو بەشەوە، ئەپۆلۆ بە وردی کاری جیاکردنەوەی ئەم مرۆڤە جووتتوخمییەی ئەنجام دا.

هەروەها ئەو ڕایانە هەن کە ئەفسانەی نارسیوس لەسەر بناغەی ناسنامەی جووتتوخمی لێک دەدەنەوە. ئەفسانەکە باس لە چیرۆکی حۆرییەک دەکات بە ناوی ئیکۆ Echo واتە زایەڵە، کە نارسیسوسی لاوی خۆش دەوێ، بەڵام ئەو دڵی ناداتێ، لەبەر ئەوە ئیکۆی حۆری داوا لە ئەفرۆدیت دەکات تۆڵەی لە

نارسیسوس بۆ بکاتەوە، تۆڵەکەش بەو شێوەیە بوو کە وای لە نارسیسوس کرد خەیاڵی خۆی لە ئاوەکەدا ببینێ، نارسیسوس وای زانی حۆرییەکە لەناو ئاوەکەدایە، خۆشی ویست، دانەوییەوە بۆ ئاوەکە تا بیگرێ و باوەشی پیادا بکات، بەڵام نەیتوانی بگات پێی، نارسیسۆس وا تێگەیشت کە لەبەر ئەوە نەیتوانی بە حۆرییەکە بگات، چونکە حۆرییەکە لە نارەحەتیدایە و پێویستی بە یارمەتییە، هەوڵی دا ڕزگاری بکات، بەڵام دیسانەوە سەرنەکەوت، چەند جارێ بە هەمان شێوە هەوڵی دا دەستی بە حۆرییەکە بگات، بەڵام هەموو جارێ شکستی دەهێنا، بۆیە نارسیسۆس مات و نیگەران بوو، ئەوەندە هەوڵی دا و نەیتوانی، تووشی نائومێدی بوو تا لە خەم و خەفەتدا گیانی لەدەست دا.

لێکدانەوەی دیکەش هەیە بۆ ئەفسانەی نارسیسۆس، گوایە شکانەوەی وێنەی خۆی لە ئاوەکەدا بینیوە و کەوتووەتە داوی خۆشەویستیی خۆیەوە، کە ئەمە خۆشەویستییەکە گەیشتن پێی مەحاڵە، ئەم ئەفسانەیە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە یۆنانییەکان بڕوایان بەوە نەبوو تاک خۆی خۆش بوێت، هەروەها بڕوایان بەوە نەبووە ئەم خۆشەویستییە هیچ ئەنجامێکی هەبێ، بەڵام میلانی کلاین لێکدانەوەیەکی دیکەی بۆ ئەم ئەفسانەیە هەیە، کە لە مەغزای ئەفسانەکەوە نزیکترە بە بەراورد لەو لێکدانەوەیەی کە هەمیشە بۆ ئەم ئەفسانەیە باوە و باس دەکرێ، میلانی کلاین پێی وایە کاتێ نارسیسۆس سەیری ئاوەکەی کردووە، پێی وا بووە سەیری جیهانی دەرەوە دەکات، هەروەها لە نەستیدا خەیاڵی لای ئەو خۆشەویستە بوو کە ناسنامەکەی لە خۆیدا دۆزیبووەوە، بەڵام لە واقیعدا سەیری خۆی کردووە. بەم شێوەیە میلانی کلاین لەم ئەفسانەیەدا ئاماژەی بۆ ناسنامەی جووتتوخمی کردووە، ئەم تێڕوانینە بناغەی خۆشەویستی بۆ ئەم حاڵەتە دەگەڕێنێتەوە. لە لێکدانەوەکانی دیکەی جووتتوخمی، لێکدانەوەکەی (یۆنگ)ە بۆ

ئەفسانەی هوموفرودیتوس، کە وێناکانی بۆ نموونە سەرەتاییەکانی مرۆڤیش لەخۆ گرتووە.

بەپێی وێناکردنی یۆنگ، دوو ڕەگەزی سەرەکی لە مرۆڤی سەرەتاییدا هەبوون کە بریتی بوون لە (ئەنیموس Animus) و (ئەنیما Anima)، ئەنیموس لایەنی نێرینەیە لە مێ-دا و ئەنیما لایەنی مێینەیە لە نێردا، لە ڕوانگەی یۆنگەوە ئەم دوانە مەزنترین سەرچاوەکانی هێزن لە ژیانی هەردوو توخمەکەدا، چونکە ئەنیما پاڵ بە پیاوەوە دەنێت لە خۆشەویستیدا بە شوێن هاوبەشەکەی خۆیدا بگەڕێ تاکو لەگەڵ بەشە مێینەکەیدا هاوجێ بێ، لە کاتێکدا ئەنیموس لە مێ-دا بە پەرۆشە بۆ دۆزینەوەی هاوتا نێرینەکەی لەو کەسەدا کە خۆشی دەوێت. یۆنگ پێی وایە بەشە شاراوەکانی توخمی هەریەکەمان لەم دوو هێزەدایە، هەروەها ئەم دوو هێزە، واتە ئەنیموس و ئەنیما سیمبولن بۆ حەز و ئارەزووە هاوبەشەکانی نێوانمان و کە لە هەمووشماندا هەن و هیچ کاتێک لەناو ناچن. یۆنگ (ئیرۆسEros)ی کردووە بە سیمبول بۆ ئەنیما کە بۆ جەوهەری مێی گەڕاندووەتەوە، لە کاتێکدا (ئەقڵ Logos)ی کردووە بە سیمبول بۆ ئەنیمۆ کە بۆ جەوهەری پیاوی گەڕاندووەتەوە.

لە بنەماکانی (بودی)دا، نێر و مێ هەریەکەیان لە دەروونیاندا هەڵگری تێکەڵەیەکن لە ڕەگەزەکانی نێرینە و مێینە. نێر تەنیا نێرە، چونکە ڕەگەزی نێری زیاترە، بە هەمان شێوە لە مێ-شدا هەر وایە. ئەم بەشە نێرینە و مێینەیە لە هەریەکە لە نێر و مێدا، لە ناکۆکییەکی هەمیشەییدا دەمێننەوە، تەنیا بۆ ماوەیەکی کورت دەتوانن پێکەوە بگونجێن، ئەویش لەو ماوەیەدایە کە لە کاتی سێکسدا بەیەک دەگەن، لەم وچانە کورتەی بەیەکگەیشتنی سێکسیدا هەردوو هاوبەشەکە حاڵەتی ڕەهایی بەدەست دەهێنن، بەدەر لەم وچانە، بەدیهێنانی ڕەهایی لە ناسنامەی توخمیدا شتێکی

ئەستەمە، تەنیا لەو بارەدا ڕوو دەدات ئەگەر یەکێک لە دوو هاوبەشەکە هۆشیاریی بەرامبەر ناسنامەی توخمی خۆی لەدەست دا و ناسنامەیەکی دیکەی بۆ خۆی بەدی کرد.

ئەوەی ئەفسانە و شوێنەوارە دێرینەکان ئاماژەی پێ دەدەن، ئەوەیە مرۆڤ بە شوێن بنەچەی خۆیدا گەڕاوە و هەمیشە بەم مەسەلەیەوە سەرقاڵ بووە و تووشی سەرسووڕمانی کردووە، لە ئەفسانە یان شوێنەوارە دێرینەکاندا هیچ ئاماژەیەک بۆ ئەوە بەدی ناکرێ کە مرۆڤی کۆن ڕەفتاری مرۆیی لە بواری سێکس و بوارەکانی دیکەدا، لەسەر بناغەی جووتتوخمی لە یەک تاکدا لێک دابێتەوە. ئەگەر بەیەکگەیشتنی هەردوو توخمەکە لە پەیوەندیی خۆشەویستیدا بە پوختترین ڕێگەچارەسەر دانرابێ بۆ شیکارکردنی ئەو مەتەڵەی، ئایا نێر یان مێ کامیان لە پێشتردا بوونیان هەبووە، ئەوا قورئان مەسەلەکەی بە شێوەیەکی یەکلاییکەرەوە چارەسەر کردووە و ئاماژەی بەوە داوە کە هەردووکیان لە یەک ڕۆحەوە خوڵقاون، ئەمەش لە توێژینەوە و تێبینییە هاوچەرخەکاندا خەریکە جەختی لێ دەکرێتەوە.

### بەڵگە زانستییەکان

زانا داروین Darwin یەکەم کەس بوو کە زاراوەی جووتتوخمی Bisexualityی ساڵی ١٨٧١ لە کتێبەکەیدا (ڕەچەڵەکی مرۆڤ)، بەکار هێناوە، کە دەڵێ: "سەرەتای دوور و دێرینی جیهانی ئاژەڵ وا دەردەکەوێ کە بوونەوەران نێرەمووک بوون". هەروەها داروین پێی وا بوو ئەڵقەی ون لەم جووتتوخمییەدا ئاژەڵی دەریایی (ئسکیدیان Ascidian)ە، ئاژەڵە بڕبڕەدارەکانیش هەر لەمەوە پەیدا بوون. لە نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەدا تێبینییەکانی داروین کاریگەرییەکی بەهێزیان هەبوو لە ئاڕاستەکردنی بایەخپێدانی زۆرێک لە زانایان بە بابەتی

جووتتوخمی. لەم بابەخپێدانەدا زانایانی زۆرێک لە بوارەکان بەشدار بوون، وەک بواری بایۆلۆژی، ئاژەڵ، سایکۆلۆژی، پسپۆڕی ژیانی سێکسی.

زانای دەروونناسی کایرن Kiernan 1888 دەربارەی ئەم بابەتە دەڵێ: "بنەما جووتتوخمییەکان کە لە باوباپیرانماندا هەبوون، واتە بوونی خەسڵەتی یان لایەنی مێینە کە تا ئێستا لە جەستەی مێ-دا ماوەتەوە، کاتێک بەهۆی نەخۆشی، یان کەموکوڕییەکی زگماکییەوە ڕوخسارە ئەقڵی، یان جەستەییەکانی نێر یان مێ بە سروشتی دەرناکەون و بەرهەڵستی دەکرێن، دەشێ لە ڕووی فەرمانەوە لایەنی مێینە لە نێردا و لایەنی نێرینە لە مێ-دا دەربکەونەوە، ئەگەر لە ڕووی ئەندامیشەوە دەرنەکەون... لەبەر ئەوە بە دڵنیایی، دەشێ ئەوە ڕوو بدات، ئەقڵێک کە لە ڕووی فەرمانەوە بە تەواوی مێیە، لە جەستەیەکی نێردا کاربکات، پێچەوانەکەشی ڕاستە". هەرچی زانای ناوداری بواری سێکس (کرافت ئیبنجKraft-Ebing)ە، پێی وایە جووتتوخمی باشترین شیکارە بۆ لێکدانەوەی مەتەڵی هۆمۆسێکسوالیتی و هەروەها لێکدانەوەی شێوەکانی دیکەی نێرەمووکی لەو کەسانەداکە لە ڕووی سێکسی و دەروونییەوە نێرەمووکن.

ئیبنج لە کتێبەکەیدا بە ناوی "سایکۆباتی سێکسی" وەسفی حاڵەتی ژنێک دەکات لە تەمەنی سی ساڵیدا تووشی گۆڕانی توخمی بووە، واتە توخمەکەی خۆی لێ گۆڕاوە .

لە ساڵی ١٨٩١دا بە کتوپڕی ئەو ژنە ڕیشی لێ ڕوا و لە ناوچەی سنگ و سکیدا مووەکانی بە چڕی زیادیان کرد، گۆڕانێکی ڕیشەیی بەسەر دەنگیدا هات، هەرچی مەزاجییەتی زۆر توند و ناسەقامگیر بوو، ڕەفتاری شەڕانگێز بوو، ئەندامەکانی زاوزێی لە دەرەوە گۆڕانیان بەسەردا هات و ڕوخسارەکانی گۆڕانی نێرینەیان لەسەر دەرکەوت، ئیبنج هۆکاری ئەم حاڵەتەی بۆ بوونی

(تۆخمەکەی دیکە) لەو ژنەدا گەڕاندەوە، کە لە جەستەی هەریەکەماندا هەیە و دەشێ هەر کاتێ باری بۆ گونجا، دەربکەوێ. زانای ئاژەڵزانی (کلاوس1891 Claus)، ئەوەی دۆزییەوە، هەندێک جۆر لە ئاژەڵی ئاوی ناسراو بە کرستیزیا Crustacea، نیوەی یەکەمی ژیانی وەک نێر بەسەر دەبات، نیوەکەی دیکەی وەک مێ. شایەنی باسە کلاوس مامۆستای فرۆید بوو، هانی فرۆیدیشی دا بۆ لێکۆڵینەوە لەم دیاردەیە.

لەو زانایانەی دیکە کە لە سەدەی نۆزدەدا بایەخیان بە جووتتوخمی دا، وەک زانا فلایس Fliess، کە بۆ ماوەیەک یەکێک بوو لە هاوڕێ نزیکەکانی فرۆید، کاریگەرییەکی مەزنی هەبوو بۆ سەر هەندێک لایەنی ژیانی فرۆید، هەر فلایس-یش بوو قەناعەتی بە فرۆید کرد کە تەواوی خەڵک جووتتوخمن و ئەمە هەقیقەتێکی فسیۆلۆژییە و ئەم هەقیقەتەش کاریگەریی هەیە بۆ سەر تووشبوون بە نەخۆشییە دەروونییەکان. فلایس کە خاوەنی تیۆری (سووڕی مانگانە)یە لە نێر و مێدا، پێی وایە، ئەو (سووڕە) لە هەردوو توخمەکەدا هەیە، کۆرپەلەی مرۆیش لە سووڕە سەرەتاییەکانی ژیانیدا جووتتوخمە، بەڵام ئەوەی لە دواییدا ڕوو دەدات ئەوەیە، یەکێک لە دوو لایەنەکەی ئەم جووتتوخمییە بەسەر ئەوی دیکەدا زاڵ دەبێت، بەڵام لایەنەکەی دیکە کە بەزیووە، ئەوە ناگەیەنێ کە بەهۆی زاڵبوونی دەسەڵاتی لایەنەکەی دیکە بەسەریدا ئیدی بە تەواوی نامێنێ، بەڵکو دەچەپێنرێ، بەم شێوەیە توخمی لاواز و چەپێنراو لە نائاگایی مرۆڤدا دەمێنێتەوە، واتە لە هەموو مرۆڤێکدا لایەنی مێینە و لایەنی نێرینە هەیە، کاتێ لایەنی نێرینە بەسەر لایەنی مێینەدا زاڵ دەبێ، لایەنی مێینە دەچەپێنرێ و لاواز دەبێ و ئەو کاتە وەک پیاو مامەڵە دەکات، پێچەوانەکەشی بە نیسبەت ژنەوە هەر ڕاستە، واتە لایەنی نێرینەکە دەچەپێنرێ، تەواوی هێزە شاراوەکەی لە نائاگاییدا دەمێنێتەوە. فلایس لە

تیۆرەکەیدا کۆمەڵێ خاڵی دەستکەوتووە کە لێکدانەوە بۆ هەندێ لە دیاردە ڕەفتارییەکان دەکات، بۆ نموونە دەربارەی لێکدانەوەی دیاردەی نێرەمووکی، یان سێکس لای هۆمۆسێکسوالەکان، فلایس پێی وایە نێرەمووک، یان هۆمۆسێکسوالەکان قوربانیی پشێوی، یان وەستانی گەشەی سێکسین، کە ئەمە بووەتە هۆی شکستهێنان لە چەپاندنی یەکێک لە دوو لایەنەکەی توخمی مرۆڤ، ئیدی ئەو کەسە ڕووەو جووتتوخمی ئاڕاستە دەگرێ، هەروەها لێکدانەوەی بۆ نەخۆشییە دەروونییەکانیش کرد و پێی وا بوو ئەو حاڵەتانە دەرئەنجامی چڕکردنەوەی وزەی سێکسن لە نائاگاییدا، لە سەر ئەو توخمەی کە لە نائاگاییدا بە تەواوی نەچەپێنراوە و هێشتا زاڵە، بۆ نموونە لە نێردا، ئەگەر لە نائاگاییدا لایەنی مێینە هەر بە زاڵیمابێتەوە و وەک حاڵەتە سروشتییەکە نەچەپێنرابێ، ئەوا وزەی سێکسیی ئەو نێرە ڕووەو نێر ئاڕاستە دەگرێ، چونکە لایەنە مێینەکەی لە نائاگاییدا ئارەزووی نێر دەکات، بۆ ژنیش بە هەمان شێوە، ئەگەر لە نائاگاییدا لایەنە نێرینەکەی زاڵ بێ، ئەوا ڕووەو مێ ئاڕاستە دەگرێ و ئارەزووی مێ دەکات لەجیاتی ئەوەی ئارەزووی نێر بکات کە لە باری سروشتیدا پێویستە ئارەزووی نێر بکات. دواجار فلایس گەیشتە ئەو دەرئەنجامەی کە نەخۆشییە دەروونییەکان گوزارشت لە ڕەتکردنەوەی هەندێ پاڵنەری سێکسیی دیاریکراو دەکەن، بۆ نموونە پاڵنەری سێکسیی هۆمۆسێکسوالیتی، ئەم دەرئەنجامە یەکێک بوو لە هەرە گرنگترین ئەو کارتێکەرانەی کە کاری کردە سەر بیرکردنەوەی فرۆید و دانانی تیۆری دەروونشیکاری بۆ لێکدانەوەی نەخۆشییە دەروونییەکان. فلایس هەندێک تێبینیی سەرنجڕاکێشی خستە ڕوو بۆ ئەوەی تیۆرەکەی خۆی بسەلمێنێ کە پێی وا بوو جووتتوخمی بناغەی سێکسە لە مرۆڤدا و سەرچاوەی هەڵچوونە بایۆلۆژییە دەروونییەکانیشە. یەکێک لە تێبینییەکانی فلایس، بوونی ئەو دوو

ڕۆژەیە کە لە سووڕی کاتدا بۆ هەریەک لە نێر و مێ گرنگن، ئەوانیش سووڕی ٢٨ ڕۆژییە لە مێدا و سووڕی ٢٣ ڕۆژییە لە نێردا. ئەم دوو سووڕە چارەنووسی خۆیان و چارەنووسی نەوەکانیان دیاری دەکات و لە هەریەک لە نێر و مێدا هەیە، ئەویش بەهۆی بوونی جووتتوخمیی شاراوە لە هەریەکەیاندا.

پاشان تێبینییەکی دیکەی فلایس، لەیەکنەچوونی لای ڕاست و لای چەپی مرۆڤە، لای ڕاست لایەنی نێرینە لە جەستەدا دەنوێنێ، لای چەپیش لایەنی مێینە، لەبەر ئەوە هەریەکە لە ئێمە جەستەی خەسڵەتی نێرینە و خەسڵەتی مێینەشی هەیە. لە نووسینێکدا ساڵی ١٩١٤ ئاماژەی بەوە داوە لای ڕاستی ڕوخسار لە مێ-دا پەیوەستە بە لایەنی نێرینەیی و لای چەپی ڕوخساریش لە پیاودا پەیوەستە بە لایەنی مێینەیی. ژمارەیەک لە داهێنەرە ناودارەکانی جیهانی بە نموونە هێناوەتەوە کە لای چەپی ڕوخساریان بە شێوەیەکی دیار دەرکەوتووە، وەک مایکڵ ئەنجیلۆ، لیۆناردۆ داڤنشی و شۆمان و جیتە، کە یەکەم و دووەمیان چەپلەریش بوون. ئەم تێبینییانە پاڵیان پێوە ناوە بڵێ کە جووتتوخمی لە هونەرمەنداندا زیاتر ئاشکرایە، ئەو ناوانەی کە فلایس کردوونی بە نموونە، زۆر هونەرمەندی دیکەش، بەوە ناسراون کە حەز و ئارەزوویان بۆ هەردوو توخمەکە هەبوو و سێکسیان لەگەڵ هەردووکیاندا کردووە، هەروەها گەیشتووەتە ئەو دەرئەنجامەی کە دەستی ڕاست لایەنە کارا و ئەقڵانییەکان لە تاکدا دەنوێنێ و دەستی چەپیش لایەنی ئیلهام و خەیاڵ لە کەسێتیدا دەنوێنێ و توانای داهێنان بە تاک دەبەخشێ. جێگیرنەبوون و جووڵەی مەزاجیی مرۆڤ لە نێوان مەزاجی کارا و ئەقڵانی لەگەڵ مەزاجی خەیاڵی و ئیلهامی، بەڵگەیە لەسەر بوونی دوو ژێی مەزاج لە یەک مەزاجدا. واینگر Weininiger ی فەیلەسووف، یەکێکە لەو کەسانەی کە تیۆرەکەی فلایس دەربارەی جووتتوخمی کاری

تێکردن، ساڵی ١٩٠٣ واینێنگر کۆمەڵێک ڕای بوێرانەی دەربارەی جووتتوخمی خستە ڕوو، کە ڕەگوڕیشەیان بۆ ڕایەکانی فلایس دەگەڕێتەوە. یەکێک لە ڕایەکانی واینێنگر ئەوە بوو، هەموو بوونەوەرێکی مرۆیی لە نێوان نێر و مێدایە، ئەم جموجۆڵکردنە لە نێوان ئەم دوانەدا، دەشێ گەورە بێ دەشێ بچووک بێ، دەشێ تا ئاستێکی زۆر لە تەنیا کەسێکیشدا بەپێی کات جیاواز بێ. جموجۆڵکردن دەشێ بەرفراوان بێ، دەشێ هەندێجار بەرتەسک بێ، بەڵام هەمیشە بوونی هەیە، کاتێ ئەم جموجۆڵکردنە زۆر دەبێ، کاردەکاتە سەر ڕوخساری تاک (بۆ نموونە گوزارشت و ئاماژە جووڵەییەکانی)، هەروەها ئەم جموجۆڵکردنە شێوەیەکی خولی وەردەگرێ لە ڕووی ئاشکرایی و کاتەکانی دەرکەوتنی.

بەهۆی ئەو پەیوەندییە بەتینەی نێوان فرۆید و فلایس، هەروەها لەبەر ئەوەی فرۆید قوتابیی کلاوسی زانای ئاژەڵزانی بوو، ئەمانە وایان کرد فرۆید بۆ وەرگرتنی بیرۆکەی جووتتوخمی ئامادە بێ، بەخێرایی دەرکی بە چەمکی جووتتوخمی کرد و ئەوەشی بۆ دەرکەوت کە چ بایەخ و ڕۆڵێکی لە دروستبوونی ئەقڵی شاراوەدا هەیە. بیرۆکەی جووتتوخمی بە بەردی بناغەی تیۆرە دەروونییەکانی خۆی دانا، پێی وا بوو جووتتوخمی هێزی بزوێنەری ژیانی دەروونییە، بە فاکتەرێکی یەکلاییکەرەوەشی دانا لە دروستبوونی پشێوییە دەروونی و سۆزدارییەکان، هەروەها جەختی لە بایەخی تایبەتی جووتتوخمی کرد لە گەشەی دەروونی و سێکسیی منداڵدا و بەگشتی وەک فاکتەرێکی یەکلاییکەرەوە وەسفی کردووە، کاتێ دەڵێ: "بەبێ ڕەچاوکردنی جووتتوخمی، لەو باوەڕەدا نیم بە هیچ شێوەیەک لەو دیاردە سێکسییانە تێبگەین کە لە نێر و مێدا تێبینی دەکرێن". لەم ڕایانەوە بۆمان دەردەکەوێ کە فرۆید چەندە فلایسی هاوڕێی کاری تێکردووە، هەرچەندە فرۆید هەوڵی داوە لە ددانپیادانان بەو کارتێکردنە خۆی دەرباز بکات،

یان قەبارەی ئەو کارتێکردنە کەم بکاتەوە، بەڵام بە وردبوونەوە لە ڕایەکانی هەردووکیاندا، بۆمان دەردەکەوێ کە فرۆید چەندە قەرزاربارێ ڕایە پێشەنگ و ڕەسەنەکانی فلایس بووە دەربارەی بایەخی جووتتوخمی لە ژیانی دەروونی و لە دروستبوونی نەخۆشییە دەروونییەکاندا.

جۆرج گرودک Groddeck کە لەگەڵ فرۆیددا هاوسەردەمە، یەکێکی دیکەیە لەو زانایانەی کە بایەخیان بە جووتتوخمی داوە، پەیوەندیشی لەگەڵ فرۆیددا هەبووە، ئەویش پێی وا بووە جووتتوخمی ڕێگەی سروشتییە بۆ خۆشەویستی و لەڕێی قۆناغی منداڵی و نەرزەبوونەوە (باڵقبوون) دیاری ناکرێ وەک هەندێک پێیان وایە، هەروەها دەڵێ: مرۆڤ، بە درێژایی ژیانی جووتتوخمییە، هەر بەم شێوەیەش دەمێنێتەوە، ئەوپەڕی شت بتوانێ بیگۆڕێ، ئەوەیە ماوەیەک یان چەند ماوەیەک لە ژیانیدا لەڕێی سازشکردنەوە، خۆی بگونجێنێ و گوێڕایەڵی ئەو یاسایە بکات کە لەو کاتەدا زاڵە، واتە گوێڕایەڵی بەشە زاڵەکەی خۆی بکات، کە بەشێکە -بەشێکی زۆر بچووکە- لە جووتتوخمییەکەی و بەشەکەی دیکەی خۆی بچەپێنێ، بەم کارەی ئەم جووتتوخمییە لەناو نابات، بەڵام مەوداکەی بەرتەسک دەکاتەوە، هەروەها ئەوەشی خستە ڕوو کە هیچ کەسێک نییە بە تەواوەتی هیترۆسێکسوال Hetrosexual بێ، واتە مەیلی تەنیا بۆ دژەتوخمەکەی خۆی هەبێ، هەروەک چۆن هیچ کەسێکیش نییە بە تەواوەتی هۆمۆسێکسوال Homosexual بێ، واتە بە تەواوی مەیلی بۆ توخمەکەی خۆی هەبێ (١٩٢٣).

هافلۆک ئالیس- زانای سێکسزانی، بڕوای وا بوو، جووتتوخمی حاڵەتێکی بایۆلۆژییە، بەڵام لە ڕووی بوونییەوە بە مانا دەروونییەکەی، تەواو دڵنیا نەبوو، هەرچەندە بڕوای بە تیۆرەکانی فرۆید هەبوو دەربارەی پەیوەندیی نێوان جووتتوخمی و

نەخۆشییە دەروونی و ئەقڵییەکان. ئالیس پێی وا بوو ئەو ژنانەی پەیوەندیی سێکسیی لەیزبینی پراکتیزە دەکەن (لەیزبین واتە هۆمۆسێکسوالیتی، یان پەیوەندیی سێکسی لە نێوان مێ و مێ-دا)، هەمیشە مێ-ی ئەو ژنانە نێرن. شایەنی باسە ژنەکەی ئالیس خۆی یەکێک بووە لەوانە، زۆر زیرەکیش بووە. لەوانەیە ئەمە هۆکار بووبێ بۆ ئەو ڕایەی پێی وایە ژنانی لەیزبین زۆر زیرەکن و توانایان زیاترە و لە ڕووی سێکسییشەوە هەستیارتر و سەرکێشترن بە بەراورد لەگەڵ ژنانی دیکەدا کە مەیلی سێکسییان بەرامبەر توخمەکەی خۆیان واتە مێ، نییە.

میلانی کلاین Melanie Klein شیکارکاری بایۆلۆژی پشتیوانی لە تیۆری جووتتوخمی دەکات و پێی وایە، خەیاڵی منداڵ دەربارەی باوک کاتێ منداڵ تەمەنی ساڵەوەختەیە، تا ئاستێک لەگەڵ وێنەکەی ئەرستۆفانیس دەربارەی مرۆڤی نێرەمووک لە ئەفسانەکاندا، هاوجێ دەبێ، مەبەستی لەو پیاوەیە کە مەمکی هەیە و ئەو ژنەی کە چووکی هەیە و هەردووکیان لە حاڵەتی ئاوێزانی هەمیشەییدان.

بەپێی ڕای کلاین، جووتتوخمی لەم قۆناغەدا بە دڵنیایی نێرەمووکییەکی هاوتایە Ambisexual واتە لە بەشی نێر و بەشی مێدا وەک یەکن و نە نێر و نە مێ هیچیان بەسەر ئەوی دیکەیاندا زاڵ نین، هەر بۆیە منداڵ هەستی خۆشەویستی و غیرە و ڕق ئاڕاستەی دایک دەکات بەپێی ئەو هەڵوێستەی لەو کاتەدا ڕوو دەدات، پاشان هەمان ئەو هەستانە بۆ باوک دەگوازێتەوە، یان بە پێچەوانەوە، لە ڕوانگەی کلاینەوە جووتتوخمی مەسەلەیەکی سروشتییە و هەر لە تەمەنێکی زووەوە لە ئاڕاستەدا هاوتایە.

ئەمانە و دەکرێ ژمارەیەکی زیاتری ئەو زانا و توێژەرانە باس بکەین کە بایەخیان بە بابەتی جووتتوخمی داوە و ڕایەکانیان

ئاماژە پێ بدەین، بەڵام لەوانەیە زۆربەیان لەو ڕایانە تێنەپەڕن کە پێشتر باسمان کردن، کە زۆربەیان ڕای تیۆرین هەرچەندە هەندێکیان بە پشتبەستن بە تێبینیی بایۆلۆژی، یان کلینیکی، بنیاد نراون، بەڵام بۆ ئەوەی لە واقیعی بایۆلۆژیدا گریمانەکردنی جووتتوخمی بسەلمێنرێ، پێویستی بە بەڵگەیە.

ئایا هیچ بەڵگەیەک هەیە ئەمە بسەلمێنێ؟ ئەمە ئەوەیە کە لەمەودوا هەوڵ دەدەین لەڕێی بەڵگەی زانستیی هاوچەرخەوە، بیخەینە ڕوو، کە ئەم بەڵگانە ناکرێ فەرامۆش بکرێن، یان ئاماژەکانیان پشتگوێ بخرێن.

## بەڵگە بایۆلۆژییەکان

گرنگترین ئاماژەکان لەسەر جووتتوخمی لەدوای ئاشکراکردنی کرۆمۆسۆمە سێکسییەکانەوە دەستکەوتن، کە بریتین لە کرۆمۆسۆمی X و Y. کاتێ هەردوو کرۆمۆسۆمە سێکسییەکان X بن، مێ دروست دەبێ و کاتێکیش دوو کرۆمۆسۆمە سێکسییەکە یەکێکیان X بێ و ئەوی دیکەیان Y بێ، نێر دروست دەبێ.

نزیکەی بۆ ماوەی مانگێک لە ژیانی کۆرپەلە، ئەگەری ئەوە هەیە کۆرپەلە بۆ هەریەک لە دوو توخمەکە نێر یان مێ پەرەبسێنێ، ئەمەش لە هەفتەی حەوتەمی ژیانی کۆرپەلەدا کە هێشتا ڕژێنە سێکسییەکان فۆرمەلە نەبوون، ئەم ڕژێنانە لە شێوەی کەناڵدان و پێیان دەوترێت کەناڵەکانی ولفیان و مولیریان Wolffian and mullerian ducts. کاتێک کەناڵەکانی ولفیان لە کۆرپەلەدا گەشە دەکات، ئەو کۆرپەلەیە دەبێ بە نێر و کەناڵی دووەم دەپووکێتەوە، ئەگەر کەناڵەکانی مولیریانش گەشە بکەن، ئەوا ئەو کۆرپەلەیە گەشە دەکات تا ببێ بە مێ و کەناڵەکانی ولفیانش دەپووکێنەوە، بەڵام پووکانەوەکە لە هەردوو حاڵەتەکە بە شێوەیەکی تەواو ڕوو نادات، ئەمە واقیعە کە هەندێ لە پاشماوەی

توخمەکەی دیکە لە هەریەک لە نێر و مێدا دەمێنێتەوە، مێتکە Cliotorisلە مێدا و ڕژێنەکانی پرۆستات و مەمکیش لە نێردا دەمێنێتەوە، بەڵام پەرەسەندنی یەکلاییکەرەوە لە هەردوو توخمەکەدا لە مانگی سێیەمدا ڕوو دەدات، چونکە دەردراوەکانی گونەکان بۆ دروستبوونی ئەندامە سێکسییەکانی نێر، پێویستن، لە کاتێکدا دەردراوەکانی هێلکەدان لە مێدا پێویست نین، ئەمەش جەخت لەوە دەکات کە مێ لە ڕووی بایۆلۆژییەوە زیاتر سەرەتاییە وەک لە نێر. حاڵەتی نێرەمووکی لە جەستەدا، باشترین بەڵگەیە لەسەر جووتتوخمی، ئەمە سەرباری ڕوخسارە هاوبەشە جەستەییەکانی نێر و مێ لە کەسی نێرەمووکدا، ڕژێنە سێکسییەکان لە نێرەمووکدا شانەی گون و شانەی هێلکەدانیشیان تیادایە، لە هەندێکیاندا ڕوخسارەکانی نێر زاڵە، بەڵام لە هەندێکیاندا ڕوخسارەکانی مێ زاڵترە.

بەڵگەی بایۆلۆژیی سێیەم، بریتییە لە کاری کۆئەندامی هۆرمۆنی و کاریگەرییەکەی لە کاتی گەشەی کۆرپەلە و لە ماوەی دوای دووگیانیدا Postnatal، هۆرمۆنەکان کاریگەرییەکی ئاشکرایان لەسەر گەشە هەیە، چونکە گەشە بە ئاراستەی سروشتی یان ناسروشتیدا دەبن، لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستا کاری هۆرمۆنەکان بە تەواوەتی ئاشکرا نییە، بەڵام دەردراوە هۆرمۆنییەکانی ڕژێنە سێکسی و ڕژێنەکانی ئەدرینالین (سەرە گورچیلە ڕژێن Adrenal) و ژێر مێشکەڕژێن، ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕن لە دیاریکردنی پێکهاتەی دەروونیی سێکسی تاکدا. وەک زانراوە هەردوو ڕژێنی سێکسی (گون و هێلکەدانەکان) و ڕژێنی ئەدرینالین هەموو ئەمانە هۆرمۆنی ئەندرۆجین و ئەسترۆجین دەردەدەن. هۆرمۆنی ئەندرۆجین لە گەشەی هۆرمۆنەکان و پاڵنەری سێکسی و گەشەی موو لە نێر و مێدا بەرپرسە، لە کاتێکدا ئەسترۆجین کە هۆرمۆنی مێینەیە (هەرچەندە لە نێریشدا

هەیە)، ڕۆڵێکی گرنگ لە ڕەفتاری سێکسیی مێ-دا نابینێ، بەلام لە کرداری گەشەی سێکسیدا گرنگە. لەبەر ئەوە بوونی هەردوو هۆرمۆنەکە لە نێر و مێدا وامان لێ دەکات بڵێین جووتتوخمی بەشێکە لە سروشتی مرۆڤ، دەتوانین ئەو گریمانەیە بکەین، ڕوودانی هەر پشێوییەک لە بواری کۆئەندامی هۆرمۆنیدا و زاڵبوونی هۆرمۆنێک بەسەر یەکێکی دیکەدا، دەشێ حاڵەتێک دروست بکات کە پێی دەوترێت نێرەمووکی ساختە Pseudohermaphrodismکە دەشێ بە پلەی جیاواز دەربکەوێ، هەندێجار ئەستەمە حاڵەتە سووکەکان دەستنیشان بکرێ. ئەم حاڵەتانە دەشێ بەهۆی ڕوودانی کەموکوڕی یان زیادبوونێکی سروشتی لە یەکێک لە هۆرمۆنەکاندا ڕوو بدات، یان بەهۆی پەیڕەوکردنی چارەسەری هۆرمۆنییەوە لە کاتی دووگیانیدا. کاتێک دایک لە کاتی دووگیانیدا هۆرمۆنی پرۆجیسترۆن، واتە هۆرمۆنی نێرینە وەردەگرێ بۆ ئەوەی ڕێگری لە لەبارچوونی کۆرپەلە بکرێ، ئەگەر منداڵە لەدایکبووەکە مێ بێ، ئەوا هەندێ ڕوخساری نێرینەیی لەسەری دەردەکەوێ.

توێژینەوە نوێیەکان ئەوەیان ئاشکرا کردووە، ماندووبوونی دایکی دووگیان دەشێ ببێتە هۆی کەمبوونەوەی بەرهەمهێنانی ئەندرۆجین و ئەمەش دەبێتە هۆی دەرکەوتنی هەندێ ڕوخساری مێینە لەسەر منداڵی کوڕ.

بەڵگەی بایۆلۆژیی چوارەم، بریتییە لەو بەڵگەیەی توێژەرانی ئەمەریکا و ئەورووپای خۆرئاوا و ڕووسیا بەدەستیان گەیشتووە، ئەویش ئەوەیە ناوکی هایپۆسالامەس Hypothalamus لە ناوەندە دەماخدا، ناوەندی تایبەت بە نێر یان تایبەت بە مێیان تیادایە، ئەم ناوەندانە لە سەرەتای گەشەی کۆرپەلەدا بۆ نێر و مێ جیابوونەتەوە، چونکە هێشتا بڕیار نەدراوە کە ئایا ئەو کۆرپەلەیە دەبێ بە کچ یان کوڕ، ئەم بڕیار، یان دیاریکردنە لە قۆناغی

دواتری گەشەدا ڕوو دەدات، تەنانەت ئەگەر ئەم دیاریکردنە ڕووش بدات، دەتوانرێ گۆڕانی بەسەردا بهێنرێ، ئەویش لەڕێی خەساندن، یان چاندنی ماددەی ڕژێنە سێکسییە مێینەییەکان لە ناوەندی سێکسیی ناوەندە دەماخدا، یان لەڕێی بەکارهێنانی هۆرمۆنی ئەندرۆجین، یان ئەسترۆجینەوە. هەموو ئەم کردارانە دەشێ ببنە هۆی بەمێبوونی کوڕ.

زانایەک بە ناوی دۆرنەر Dorner بۆ سەلماندنی ئەم تیۆرە، ساڵی ١٩٦٩ تاقیکردنەوەیەکی لەسەر جرجی سپی کرد، دەرئەنجام ئەوە دەرچوو ئەم جرجانە هەرچەندە جرجی نێریان بوو، بەڵام لە کاتی لەدایکبووندا ناوەندی سێکسییان لە دەماخدا گۆڕا بە ناوەندی سێکسیی مێینە، لە ڕووی سێکسییشەوە ڕەفتاریان نێرەمووکانە، یان جووتتوخمی بوو.

دۆرنەر لەو باوەڕەدایە، تاقیکردنەوەکانی کە لەسەر ئاژەڵ کردوونی، دەشێ بەسەر مرۆڤیشدا جێبەجێ ببن. توێژینەوەکانی دۆرنەر لە لایەن کۆمەڵێک توێژینەوەی کلینیکییەوە پشتیوانییان لێ کرا کە زانایانی دیکە ئەنجامیان دا، وەک ماسیا Maseia، موونی و ئێرهارد، ئەم زانایانە پێیان وا بوو ڕوودانی هەندێک جۆری تێکچوونی هۆرمۆنی، دەشێ بە شێوەیەکی هەمیشەیی کار بکاتە سەر ناوەندە سێکسییەکان لە هایپۆسالامەسدا. لەبەر ئەوە ڕوودانی هەر پشێوی یان کەموکوڕییەکی هۆرمۆنی کە پەیوەندیی بە ژیانی سێکسییەوە هەبێ، دەشێ ببێتە هۆی ڕوودانی گۆڕان لەو ناوەندانەی کۆنترۆڵی ژیانی سێکسیمان دەکەن لە ڕووی شێوە، یان کردار، یان حەز و ئارەزووەوە.

ئەم هەقیقەتە زانستییانە و چەندەها بەڵگەی دیکە، ئاماژەن بۆ ئەوەی ژیانی سێکسیی نێر و مێ لە بنچینەدا لە یەک یەکەوە هەڵدەقووڵێن، ئەم یەکەیەش لە سەرەتای ژیانی کۆرپەلەوە دەردەکەوێ، بەڵام بە حوکمی فاکتەرە بۆماوەییەکان و بەهۆی

کاری هاوسەنگی نێوان هۆرمۆنە سێکسییەکان لە سەرچاوە جیاوازەکاندا، بەرەو نێر یان مێ ئاراستە دەگرێ و جیا دەبێتەوە. هەندێ جار دەشێ ئەم جیابوونەوەیە بە تەواوەتی ڕوو نەدات، لە حاڵەتی نێرەمووکیدا ئەم جیابوونەوەیە لە نزمترین پلەکانیدایەتی کە بە ئاسانی ئەوە دەردەکەوێ توخمی ئەو کەسە بۆ نێری تەواو یان مێی تەواو جیا نەبووەتەوە، لە هەندێک حاڵەتی دیکەدا دەشێ جیابوونەوەی توخمییش ڕووی نەدابێ، بەڵام ئەو کەسە لە ڕواڵەتدا وەک نێر، یان وەک مێ دەربکەوێ و دواجار نەتوانرێ بەتەواوی ئەوە جیابکرێتەوە، ئایا ئەو کەسە نێرە، یان مێیە، تەنیا لەڕێی دەرکەوتن، یان هەستکردن نەبێ بە هەندێ ڕوخساری هەستی، یان ڕەفتاری لای تاک، ئەمانەش ئاماژەن بۆ ئەوەی کە لە نێردا بڕێک لە مێیەتی هەیە، ئەگەر زۆر کەمیش بێ، هەروەها پێچەوانەوەکەشی هەر ڕاستە. ئەگەر ئەم بناغە بایۆلۆژییەی جووتتوخمی قبوڵ کرا، ئەوا ئەوە دەگەیەنێ، دەشێ نێر و مێ لە یەک تاکدا هاوبەش بن، بەڵام پلەی هاوبەشییەکە ڕێژەییە و هیچ سنوورێک لە جیاوازیی پلەی هاوبەشبوونەکەدا نییە.

### بەڵگە پزیشکییەکان

گرنگترین بەڵگە پزیشکییەکان دەربارەی جووتتوخمی، ئەوانەن کە لەو واقیعە بایۆلۆژییەوە وەرگیراون و نێرەمووکی پێ جیادەکرێتەوە، ئیدی ئەگەر ئەو کەسە نێرەمووکی تەواو بێ، واتە ڕوخسارە سێکسییەکانی هەردوو توخمەکەی بە یەکسانی یان نزیک لە یەک هەڵگرتبێ، یان بە پلەیەکی جیاواز نێرەمووک بێ، واتە بە پلەی جیاواز لە سیفەتەکانی نێر و مێ-دا هاوبەش بێ. کۆمەڵێک بەڵگەی پزیشکیی دیکە هەن کە ئاماژە بە بوونی جووتتوخمی دەدەن، بەڵام بێ ئەوەی بۆ سەلماندنیان پشت بە

ڕێسایەکی بایۆلۆژیی ئاشکرا، یان ڕێگەیەکی زانستیی دیاریکراو بەسترابێت.

بەڵکو زۆربەی ئەم تێبینییانە لەو ڕاپرسییانەوە دەستکەوتوون کە لەسەر کەسانی نێرەمووک و ئەوانەی تووشی لادانی سێکسی بوون، ئەنجام دراون و پرسیاریان دەربارەی حەز و مەیلی سێکسی و ڕەفتار و کرداری سێکسییان لێ کراوە. ناکرێ لێکدانەوەی تەواو بۆ ئەم حاڵەتانە بکرێ، بێ گەڕانەوە بۆ ئەو ڕایەی کە پێی وایە بڕێک لە جووتتوخمی لەم کەسانەدا بوونی هەیە.

ئەم کەسانە کە بە نێرەمووک ناسراون، بە شێوەیەکی ئەندەکی بێ یان بە تەواوەتی، حەز و مەیلی سێکسییان ڕووەو توخمەکەی خۆیان ئاڕاستە دەگرێ و ڕەفتار و پەیوەندیی سێکسیشیان هەر لەگەڵ ئەواندایە.

کینزی-ی توێژەر لە ساڵی ١٩٤٨دا دەربارەی ژیانی سێکسی لای نێر توێژینەوەیەکی ئەنجام دا کە پشتی بە ڕاپرسی بەستبوو، ئاماژە بەوە دەدات کە ٥٠%ی کوڕان سێکسیان تەنیا لەگەڵ توخمە دژەکەی خۆیان، واتە لەگەڵ کچاندا کردووە (واتە هیترۆسێکسوال) ٤%یان سێکسیان تەنیا لەگەڵ توخمەکەی خۆیاندا کردووە (واتە هۆمۆسێکسوال)، بەڵام ٤٦% دانیان بەوەدا ناوە کە ئەزموونی سێکسیی دوانییان هەبووە، واتە سێکسییان لەگەڵ هەردوو توخمەکەدا کردووە، واتە لەگەڵ توخمەکەی خۆیان و لەگەڵ دژەتوخمەکەی خۆشیاندا. لە لێکۆڵینەوەیەکی دواتردا ساڵی ١٩٥٣ دەربارەی ژیانی سێکسی لای کچان، دەرکەوت ١٧%ی کچان کە شوویان نەکردووە، ئەزموونی سێکسیی دوانییان هەبووە، واتە سێکسییان لەگەڵ هەردوو توخمەکەدا کردووە.

ئەم ڕێژە بەرزانە، بەتایبەتی لە کوڕاندا، قەبارەی سروشتیی پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ هەردوو توخمەکەدا نانوێنن، چونکە زۆربەی کردارە سێکسییەکان لەگەڵ توخمەکەی دیکەدا بە سروشتی دادەنرێ و ناچێتە چوارچێوەی جووتتوخمییەوە، هەروەها زۆر کەسیش هەن حەز و مەیلی هۆمۆسێکسوال، یان جووتتوخمیان هەیە، بەڵام پراکتیزەی ناکەن، یان دەیکەن و نایدرکێنن. لێکۆڵینەوەیەکی وردی شارلوت ولف Charlotte wolffلە ساڵی ١٩٧٩دا کە پشتی بە ئەنجامدانی ڕاپرسی بەست لەگەڵ کۆمەڵێک لە کچان و کوڕان لە قۆناغە جیاوازەکانی تەمەندا، بەو ئەنجامە گەیشت، ٢٠% ئەو کوڕانەی بەشداریی لێکۆڵینەوەکەیان کرد، ئارەزووی خۆیان ئاشکرا کرد کە حەزیان دەکرد کچ بوونایە، لە کاتێکدا تەنیا ٦.٧%ی کچان حەزیان دەکرد کوڕ بوونایە. هەمان لێکۆڵینەوە ئاماژە دەدات ٢٩.٣%ی ئەو کوڕانەی بەشدارییان کردووە هەندێ پەیوەندییان هەبووە کە مۆرکێکی هۆمۆسێکسوالیتیی لەخۆ گرتووە، لە بەرامبەر ٥٨%ی کچان کە هەمان جۆری پەیوەندییان هەبووە، لە کاتێکدا ٥٩%ی کوڕان لایەنی سۆزداری بەسەر لایەنی سێکسییاندا زاڵبووە، ٨١.٣%ی کچانیش بە هەمان شێوە، وەک دەردەکەوێ لایەنی سۆزداری لە لای کچان ئاشکراترە بە بەراورد لەگەڵ کوڕاندا.

هەندێ حاڵەتی لادانی سێکسییش هەیە کە لەوە دەچێ ئەو کەسە ئەو ناسنامە توخمییە نوێیەی وەرگرتبێ، ئەم حاڵەتە بەتایبەتی لە لادانی Transvestismدا دەردەکەوێ کە کەسی نەخۆش یان لادەر بەوە جیا دەکرێتەوە پۆشاکی توخمەکەی دژ بە توخمی خۆی لە بەر دەکات، بۆ نموونە پیاوی تووشبوو بەم لادانە جلوبەرگی ژنان لە بەر دەکات، هەروەها لە لادانی ناسراو بە لادانی ناسنامەی توخمی یان دژە توخم Transexuality، هەمان شت تێبینی دەکرێ، لە حاڵەتی دژەتوخمیدا ئەو کەسەی تووشی

ئەم لادانە بووە، وا هەست دەکات کە ڕۆحی توخمەکەی دیکە چووەتە ناو جەستەیەوە (واتە ڕۆحی مێ لەناو جەستەی نێردا، یان ڕۆحی نێر لەناو جەستەی مێ-دا). ئەم حاڵەتانە ئەستەمە لێکدانەوەی تەواویان بۆ بکرێ بەبێ گریمانەکردنی بوونی بڕێک لە جووتتوخمی لەو کەسانەدا.

هەندێک توێژینەوەی نوێی پزیشکی هەن پشتیوانی لەو گریمانەیە دەکەن کە دەڵێ هەریەکەمان دوو دەماخمان هەیە لەجیاتی یەکێک، دەماخی لای ڕاست و دەماخی لای چەپ، کە هەریەکەیان فەرمانێکی جیای لەوی دیکەیان هەیە. زاناکان پێیان وایە زاڵبوونی دەماخی لای ڕاست بەسەر دەماخی لای چەپدا یان بە پێچەوانەوە، مەسەلەیەک نییە کە شوێن بڕیاری لەسەر بدات، واتە لەبەر ئەوەی لای ڕاستە ئیدی زاڵتر بێ بەسەر ئەوی دیکەیاندا، یان بە پێچەوانەوە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە یەکێک لەو دوو دەماخە مێینەیە (لای چەپ) ئەوی دیکەشیان نێرینەیە (لای ڕاست)، زاڵبوونی یەکێکیان بەسەر ئەوی دیکەیاندا، بڕیار لەسەر زاڵبوونی خەسڵەتە مێینەکان، یان نێرینەکان لە تاکدا دەدات، ئیدی ئەو تاکە لە واقیعدا هەر توخمێ بێ. ئەگەر ئەم گریمانەیە ڕاست بێ، ئەوا لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا دەگونجێ کە پێشتر ئاماژەمان پێ دا، کە لای چەپی لەش بە هەموو جەستە و ڕوخسار و پەلەکانەوە، مێ دەنوێنێ و لای ڕاستیش نێر.

### بەڵگەکانی دیکە

دەربارەی بنەچەی جووتتوخمی لە بوونی مرۆییدا بەڵگەی دیکە زۆرن بەدەر لەو تێبینییە بایۆلۆژی یان تۆژدارییانەی کە زاناکان خستوویانەتە ڕوو. ئەم بەڵگانەی دیکە لە تێبینیکردنی ڕەفتاری مرۆیی لە ژیانی ڕۆژانەدا یان لە بەدواداچوونی چالاکیی مرۆیی لە هەندێ لە بوارەکانی ئەفراندن و داهێناندا، سەرچاوەیان

گرتووە، بۆ نموونە زۆرێک لە ڕوخسارە ڕەفتارییەکانی ژیانی ڕۆژانە، وەک شێوازی جل پۆشین یان ڕازاندنەوە یان شێوازی ڕۆیشتن و بەڕێکردن یان جوولە و ئاماژە یان قسەکردن، بە ئاشکرا ئەوە دەردەخەن کە ئەو کەسە زیاتر لە توخمەکەی دیکەوە نزیکە وەک لەو توخمە ڕاستەقینەیەی کە پێی ناسراوە، هەروەها زۆرێک لە ڕوخسارەکانی مامەڵەکردنی ژیانی ڕۆژانە هەمان شت دەردەخەن، بۆ نموونە سروشتی ئەو سۆز و خۆشەویستییەی بەم مامەڵەیەوە بەندە، هەندێجار ئەمانە ئەوە دەردەخەن کە ئەو کەسە جۆرێ لە جووتتوخمیی تیادایە، یان بە تەواوەتی ناسنامەی توخمی توخمەکەی دژ بە توخمی خۆی بەسەریدا زاڵە، بۆ نموونە وەک کچ ناسراوە، بەڵام ڕەفتار و هەڵسوکەوت و هەست و سۆزی وەک کوڕ وایە و سۆز و هەستی زیاتر بەرامبەر بە کچ دەجوولێ، یان بە پێچەوانەوە. لە جیهانی هونەر و ئەدەبدا نموونەی زۆر لەو داهێنەرانە هەن کە سیفەتی جووتتوخمییان ئاشکرا لەسەر دەرکەوتووە، بۆ نموونە سافۆ Saphoی شاعیر لە شارستانییەتی گریکیدا، خاتوو ساکفیل ویست Sackville West و سۆمەرست موم Somerset Maugham و فلۆبێر Flaubertو دۆستۆیڤسکی و چەندانی دیکە لەو هونەرمەند و ئەدیبانەی توانیویانە ساتەکانی ژیانی دەروونیی توخمەکەی دیکەی دژ بە توخمی خۆیان وێنا بکەن... دەشێ ئەم توانایەیان نەبوایە ئەگەر لە ناخیاندا هەڵگری ناسنامەیەکی توخمی دیکە دژ بە ناسنامەی ئاشکرای خۆیان نەبوونایە، ئەگەرچی ئەم ناسنامە توخمییەی دیکە تەنیا لە ئەقڵ و هەستیشیاندا بووبێت. لەوانەیە لێرەدا جێی خۆی بێت، ئەم برگەیە لە نامەیەکی نووسەری بەناوبانگی فەرەنسی فلۆبێر (نووسەری مەدام بۆڤاری) بکەین بە نموونە، کە وەسفێکی وردی خاتوو لویس کۆلیت Coletی دۆستی دەکات، ئەمە وەک جەختکردنەوەیەک وایە لە

جووتتوخمیی خۆی. دەشێ وەک ئەویش هەمان توخمی هەبێ، دەڵێ: "تۆ ژن نییت، قووڵتر لە ژنانی دیکە خۆشم دەوێیت و خۆشەویستییەکی گەورەترم هەیە بۆ تۆ، چونکە هەستم کرد تۆ کەمتر مێی... وردبەرەوە لەم وتەیە، بزانە من هەڵەم... تەنیا خۆزگەی ئەوەشم خواستووە لە ڕووی جەستەییەوە وەک خۆمان بمێنینەوە و یەک ڕۆح پێک بێنین. کاتێ وەک ژن بیرت لێ دەکەمەوە، تەنیا جەستەتم دەوێ، تۆ دەزانی خۆشەویستی تەنیا شەهوەت نییە، بەڵکو شتێکی بالاترە، پێم وایە ئەم ئارەزووە بۆ ڕۆح، جەوهەری سەرەکیی ژیانە، پێویستی مرۆڤە بۆ دەستگرۆییکردنی مرۆڤ خۆی تا مەزنتر بێ، تەواوی هەستەکان لە بوونی مرۆڤەوە پەیدا دەبن، لەبەر ئەم هۆکارە، ئازادی نموونەییترین سۆزە". دەشێ ئەم پەیوەندییەی نێوان فلۆبێر و کۆلێت کە هەردووکیان بە شێوەیەکی ئاشکرا جووتتوخم بوون، شیاوی بەو بۆچوونەی یۆنگ بەخشێ کە دەڵێ، لە هەر پەیوەندییەکی سێکسیدا لە نێوان نێر و مێدا چوار کەس بەشداری دەکەن، ئەوانیش ئەمانەن: نێری ناو نێر لەگەڵ مێی ناو مێ، مێی ناو نێر لەگەڵ نێری ناو مێ، مێی ناو مێ لەگەڵ نێری ناو نێر، هەروەها نێری ناو مێ لەگەڵ مێی ناو نێر.

دەشێ سەرەتا بڕوا بەم بۆچوونە نەکرێ، بەڵام فرەجۆریی پەیوەندییە سێکسییەکان و فرەجۆریی ئەو هەستانەی کە پێیانەوە بەندن، تیشکی زۆر دەخەنە سەر ئەم بۆچوونە و تا ئاستێکی دوور جەختی لێ دەکەنەوە.

لە مێژووی کۆندا، لەبەر هەر هۆکارێ بووبێ، مرۆڤ بڕوای وا بوو کە بنەچەی یەکەمی مرۆڤ تێکەڵەی نێوان نێر و مێ بووە، واتە نێرەمووک بووە، مرۆڤ لە ئەفسانە و هونەرەکاندا گوزارشتی لەم بڕوایەی خۆی کردووە و بە نەمری هێشتوویەتییەوە. مرۆڤی سەردەمی هاوچەرخ بە شوێن ئەم

بنەچەیەی خۆیدا دەگەڕێ و هەوڵ دەدات لە ڕووی زانستییەوە بیسەلمێنێ.

لەو کاتەوە کە داروین لەساڵی ١٨٦٨دا زاراوەی جووتتوخمی بەکار هێنا و ئەو ڕایەی خستە ڕوو کە تەنیا جووتتوخمی دەتوانێ لێکدانەوە بۆ هەندێ خەسڵەتی بۆماوەیی لە هەریەک لە نێر و مێدا بکات، توێژینەوە و تیۆرەکان تا ئێستا بۆ سەلماندنی ئەم جووتتوخمییە بەردەوامن و هەوڵ دەدەن بناغەیەکی زانستیی قبوڵکراوی پێ ببەخشن. دەشێ بەڵگە حازربەدەستەکانی ئێستاکە تەنیا بەشی ئەوە بکەن لە ڕووی لایەنە جەستەییەکانەوە جووتتوخمی بسەلمێنن، بەڵام بایەخی ئەم بابەتە ئەوەندە لەو خاڵەدا کۆنەبووەتەوە کە لایەنی جەستەیی لە جووتتوخمیدا بسەلمێنرێ، هێندەی ئەوەی لە سەلماندنی لایەنی ئەقڵی و دەروونیی جووتتوخمیدا کۆبووەتەوە، چونکە ئەوە لایەنی ئەقڵی و دەروونییە کە ناسنامەی توخمی ڕاستەقینە بە تاک دەبەخشێ و بڕی بەشداریکردنی ڕەگەزەکانی نێر و ڕەگەزەکانی مێ و ئایا کامیان زاڵترن، دیاری دەکات، لێرەشەوە مەیل و ئاڕاستە سێکسییەکانی دەستنیشان دەکرێن.

ئاشکرایە ناکرێ ئەم ناسنامەیە (لە ڕووی ئەقڵی و دەروونییەوە) بسەلمێنرێ، یان ڕەت بکرێتەوە، هەروەها مەرج نییە لەو پەیوەندییە سێکسییەدا دەربکەوێ کە تاک پراکتیزەی دەکات، چونکە زۆر کەس هەست بە ناسنامەی توخمییان دەکەن، بێ ئەوەی لە ڕووی سێکسییەوە پراکتیزەی بکەن. دەشێ تاک لەڕێی دەربڕینی مەیل و ئارەزوو یان کردار یان ڕەفتارێکەوە گوزارشت لەو جووتتوخمییەی بکات کە هیچ پەیوەندییەکی ئاشکرای بە لایەنی سێکسییەوە نەبێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بێئاگایانە هەڵگری ناسنامەیەکی جووتتوخمی بێ.

جووتتوخمی گریمانەی بوونی جیاوازیی سۆزداری و ئەقڵی دیاریکراو ناکات کە تاکی پێ بناسرێتەوە و ئاماژە بێ بۆ ناسنامەکەی وەک نێر یان وەک مێ، بەڵکو گریمانەی بوونی ڕێسایەکی هاوبەش لە نێوان دوو توخمەکەدا دەکات بە پلەی جیاوازی هاوبەشیکردن، بەڵام گەشەی تەواوی تاک، گەشەی تەنیا یەک لایەنی ئەم هاوبەشیکردنە نییە، بەڵکو هەردوو لایەنەکە پێکەوە گەشە دەکەن، بەرئەنجامی کۆتایی گەشە ئەوە نییە کام لە دوو توخمەکە زیاتر بوونیان هەیە، نێر یان مێ، بەڵکو بەرئەنجام، بوونی هەردووکیانە پێکەوە لە یەک جووتدا: نێر و مێ، هەروەها ئایا کام لەو دوو توخمە زاڵترە بەسەر ئەوی دیکەیاندا.

دەشێ کاتێکی زۆر بخایەنێ تا زانست دەتوانێ ئەم ناسنامە دوانییە لە ژیانی هەریەکێکماندا بسەلمێنێ، تا ئەو کاتەی ئەم کارە دەکرێ، ناتوانرێ گریمانەی بوونی ئەم جووتتوخمییە بەتاڵ بکرێتەوە، تەنیا لەبەر ئەوەی بەپەرۆشین بۆ ئەوەی واقیعی سێکسیمان لەگەڵ واقیعی جەستەییماندا هاوجێ بێ، تەنانەت بێ بوونی هیچ بەڵگەیەکی زانستی، وەک ئاماژەشمان پێ دا، هەندێک لە کچان و کوڕان، کە ڕێژەیان کەم نییە، خۆزگەی پێچەوانەکەی خۆیان دەخوازن و پێیان خۆشە واقیعی جەستەییان لەگەڵ واقیعی دەروونییاندا هاوجێ بێ.

# بەشی سێیەم
# زانست و سێکس

## زانست و سێکس

هەر لە بەرەبەیانی مێژووەوە تا سەردەمێکی نزیک لە سەدەی نۆزدە و سەدەی بیستیش، توێژەرانی بواری سێکس، مەسەلە سێکسییەکانیان لەژێر ڕۆشنایی ئەو بیروباوەڕە ئایینییانەدا باس دەکرد کە کۆمەڵگە پێیانەوە پابەند بوون، یان لەژێر ڕۆشنایی ئەو دابونەریتانەی ڕەچاو دەکران و نەوە بۆ نەوە دەگوازرانەوە.

هەرچەندە لە مێژوودا بەڵگەی زۆر هەن لەسەر ئەوەی هەندێک لە توێژەرانی بواری سێکس لە ڕێسا ئایینی و کلاسیکییەکان دەرچوون، بەڵام لەو کاتەدا ئەم دەرچوونە لە ڕێساکان، لە مێژووی ژیانی سێکسیی مرۆڤدا وەرچەرخانێکی هێندە گەورە نەبوو، چونکە ئایین و مۆراڵەکانی، بە هەموو ئەو لقانەی لێی بوونەتەوە، وەک نەریت و یاسا، هەر هێزی زاڵ و بەدەسەڵات بوون لە دروستبوونی هەڵوێستە گرنگەکان بەرامبەر بەم لایەنە گرنگ و سەرەکییە لە ژیانی مرۆڤدا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم هێزە (واتە هێزی ئایین) پارێزگاریی لە پیرۆزی و مۆراڵی سێکس

کردووە و یارمەتیدەر بووە لە هێشتنەوەی سێکس لە چوارچێوەی سنوورە سروشتییەکاندا، بەڵام لە هەمان کاتدا هانی ئەوەی داوە کە پراکتیزە سێکسییە سروشتی و ناسروشتییەکان لە بواری پەنهان و نهێنیدا بمێننەوە، بەمە ژیانی سێکسی چەمکێکی وەرگرت کە زیاتر لە نامۆراڵی و سەرزەنشتکردنی مەعنەوییەوە نزیک بێ، سەرباری بەهێزکردنی حاڵەتی نەزانین و بێئاگایی بەرامبەر بەم لایەنە گرنگەی ژیانمان، ئەمە ئەو حاڵەتەیە کە تا ئێستا ژیانی سێکسیی ئێمەی پێ جیا دەکرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەرکمان بەو پێشکەوتنە مەزنە کردووە کە لە ڕووی تێگەیشتن لە لایەنەکانی دیکەی ژیانی مرۆڤایەتی و ژیان بەگشتی، ڕووی داوە.

ئەستەمە ئەو شوێن و ماوە زەمەنییە دیاری بکرێ کە تیایدا مەسەلە سێکسییەکان بە شێوازی زانستی و بۆ ئامانجی زانستی دەستی پێ کرد. بە درێژایی سەردەمەکان هەندێک کردار و پراکتیزە ئەنجام دراون کە لە ئاماژە یان دەرئەنجامی زانستی بەدەر نین، وەک کرداری خەتەنەکردن و دڕینی پەردەی کچێنی و بەکارهێنانی هۆکاری وروژێنەر و هەوڵدان بۆ زیادکردن یان کەمکردنەوەی شەهوەت، یان کاری سێکسی لەڕێی هۆکاری جیاوازەوە، تەواوی ئەم کردار و پراکتیزانە ئاماژەن بۆ هەوڵدانی مرۆڤ بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی ژیانی سێکسیی خۆی بکات لەپێناوی دەستبەسەرداگرتنی هێز و وزەی سێکس، یان زیادکردن، یان فرەجۆر کردنی. لەگەڵ ئەوەشدا بەهۆی هەندێک هۆکاری مەعنەوییەوە، لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، توانای گەڕان و توێژینەوە دەربارەی ژیانی سێکسی مرۆڤ، کارێکی ئەستەم بووە، یان هەر نەبووە، بەڵام زۆرێک لەو بەڵگانە هەن کە ئاماژەن بۆ ئەوەی هەندێک لە بیریارانی مێژوو، لە ڕووی زانستییەوە، لە ژیانی سێکسی وردبوونەتەوە و گەیشتوون بە هەندێک ڕاوبۆچوون دەربارەی بایەخی ئەم لایەنە لە ژیانی مرۆڤدا، هەروەها

ڕوونکردنەوەی ئەو کاریگەرییانەی کە دەشێ بەهۆی بەندکردنی ئەم وزەیە، یان زیادەڕۆییکردن لە سەرفکردنیدا، ڕوو بدەن.

ئەگەر خاڵی سەرەتایی ئاڕاستەگرتنی زانست ڕووەو مەسەلە سێکسییەکان نادیاریش بێ، ئەوەی گومانی تیادا نییە، سەدەی نۆزدە، هەرچەندە بە خۆپارێزی بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان ناسراوە، بەڵام لە مێژووی زانستی سێکسدا، بە فێرکەرێکی سەرەکی دادەنرێ. ئەم گۆڕانە لە ئەنجامی هاریکاریی نێوان شەپۆلە جیاوازەکانی هزر ڕووی دا، وەک شەپۆلی هزری فەلسەفی و بایۆلۆژی و دەروونی و پزیشکی. بەرئەنجامی کاریگەریی ئەم شەپۆلانە و کارلێکردنیشیان، هاتنەدەرەوەی ژیانی سێکسیمان بوو لە بواری پەنهانی و نهێنییەوە بۆ بواری ئاشکرایی و گەڕان و توێژینەوە دەربارەی ئەم ژیانە.

بەڵام ئەم دەرچوونە بە شێوەیەکی کاوەخۆ، بەرامبەر شەپۆلە پێچەوانە و دژەکان بەڕێوە چوو، ئەو شەپۆلانەی خۆپارێز بوون و تەنیا بە لای هزر و بیروباوەڕەکەی خۆیاندا لایان دا و تا ئێستاش لە زۆرێک لە وڵاتان و کۆمەڵگەکاندا هەر بە کارایی ماونەتەوە.

شۆپنهاوەری فەیلەسووف (١٧٨٨-١٨٦٠)، لە هەموو فەیلەسووفەکانی دیکە زیاتر بایەخی ژیانی سێکسیی لە ژیانی مرۆڤدا، ئاشکرا کرد، لەبەر ئەوە لە هەموویان زیاتر کاریگەریی هەبوو لەسەر لێکۆڵینەوە لە ژیانی سێکسی بە پشتبەستن بە بناغەی زانستی. لە کتێبەکەیدا (جیهان وەک ویست و هزر)، شۆپنهاوەر جەختی لە لایەنە ناهۆشیار و نائەقڵانییەکانی ویست (ئیرادە) کردووەتەوە، بە ڕای ئەو لە پشت ویستەوە دوو غەریزە هەن، ئەوانیش غەریزەی مانەوە و غەریزەی سێکسە.

بە ڕای ئەو، غەریزەی سێکس گرنگترە، هەروەها دەڵێ: "مرۆڤ بەرجەستەی غەریزەی سێکسییە کە هەموو کەسێ دەگرێتەوە، سێکس زیندەخەونی خۆنەویستانەیە کە کەسانی داوێنپاکیش بیری

لێ دەکەنەوە و کلیلی هەموو ئاماژە جوولەییەکانە...."، هەروەها شۆپنهاوەر ئەو ڕایەی هەبوو کە کرداری چەپاندنی سێکسی، دەشێ مرۆڤ بەرەو حاڵەتی شێتبوون بەرێ. شۆبنهاوەر یەکەم کەس نەبوو کە بایەخی سێکسیی لە ژیانی مرۆڤایەتیدا هەڵسەنگاند، چونکە هەر لە کۆنەوە ئەو ڕایە هەبووە کە جەخت لە بایەخی ئەم لایەنەی ژیان کراوە و بڕوا وا بووە خۆشەویستی (مەبەست لە سێکس بووە) لەگەڵ برسێتیدا گرنگترین هێزەکانن لە ژیانی مرۆڤدا، بەڵام گرنگیی ڕایەکانی شۆپنهاوەر لەوەدایە لە کاتێکی گونجاوی مێژووی ڕێنسانسی زانستیدا خرانە ڕوو، هەروەها کاریگەرییەکی نائاگایانە و خۆنەویستانەی بە سێکس بەخشی کە لەگەڵ کاریگەریی ئەقڵدا دژ دەوەستێتەوە، بەمەش پێش فرۆید کەوتووە لە دیاریکردنی کاریگەریی لایەنی سێکسی بۆ سەر ژیانی نائاگایی، لەبەر ئەوە هەر دەبێ فرۆید ئاگای لەم ڕایانەی شۆپنهاوەر بووبێت، هەرچەندە خۆی ئەمەی ڕەت کردووەتەوە.

سەرەتای دووەمی ئاراستەی زانستی ڕووەو سێکس، لەسەر دەستی زانا داروین بوو، ئەو یەکەم کەس بوو جەختی لە بایەخی بایۆلۆژیی هەردوو غەریزەی مانەوە و زۆربوون کرد و بناغەی سەرەتایی ڕەفتاری ئاژەڵی لەم دوو غەریزەیەدا دۆزییەوە. داروین لەمەش دوورتر ڕۆیشت، لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (پەیدابوونی مرۆڤ و هەڵبژاردنی سێکسی)دا هاتووە، هەڵبژاردنی سێکسی دەشێ بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە هەڵبژاردنی سروشتی بەڕێوە بچێ و بەڕاستیش ئەمە ڕووی دا، پێوەری کۆتایی سەرکەوتنی بایۆلۆژیش لە زۆربووندا کۆبووەتەوە، نەک لە پرنیسپی (مانەوە بۆ باشترین)دا، چونکە بوونەوەری باشترین ئەگەر توانای زۆربوونی نەبێ، ئەوا بۆ پەرەسەندنی جۆر هیچ سوودێکی نابێ. لەوانەیە گرنگترین تێبینییەکانی داروین کە کاریگەریی دوورمەودای بۆ سەر توێژینەوە لە بابەتی لادانی سێکسیدا

هەبوو، ئەو تێبینییە بووبێ کە پێی وا بوو هیچ لایەنێکی فسیۆلۆژی لە ئاژەڵدا هێندەی لایەنی سێکسی ڕووبەڕووی فرەجۆری نابێتەوە، بەتایبەتی لەو ئاژەڵانەدا کە لە حاڵەتە سروشتییەکانی خۆیان دوورخراونەتەوە. ئەم تێبینییە پاڵی بە زانا ئالبرت مول-ەوە نا، ئەو ڕایە بخاتە ڕوو کە پەرەسەندنی شارستانی تا ئاستێکی زۆر یارمەتیدەر بووە لە دروستبوونی لادانی سێکسی لە مرۆڤدا.

لەم سەرەتایانەوە لە بواری فەلسەفی و بایۆلۆژیدا، بایەخدان بە بابەتە سێکسییەکان بەتایبەتی لە ڕووی نۆژداری و دەروونییەوە، زیادی کرد و بەرفراوان بوو. بەناوبانگترین ئەو توێژەرەوانەی کە لە بواری بابەتە سێکسییەکاندا توێژینەوەی جیددییان پێشکەش کرد، ئەمانە بوون، کرافت ئیبنج، ئەلکسندەر لکاسان، تۆماس کلۆستۆن، ستانلی هۆل، هافلۆک ئالس، فلایس، کنج، ئالبەرت مول، ئیوان بلوخ، ماجنوس هیرشفیلد و یولنبرگ و چەندانی دیکە، بەڵام لە هەموویان بەناوبانگتر کە بە شێوەیەکی گشتی کاریگەریی گەورەی بۆ سەر بزاوتی سێکسی هەبوو، سیگمۆند فرۆید بوو. توێژینەوەی ئەم زانا و توێژەرانە لایەنی جیاوازی ژیانی سێکسیی لەخۆ گرت، کە هەندێکیان پەیوەندیی بە لایەنە فسیۆلۆژییەکانەوە هەبوو، هەندێکیان گرنگییان بە توێژینەوە دەربارەی ژیانی سێکسی لە زیندەوەراندا دا، بەشێکیشیان توێژینەوەیان دەربارەی قۆناغەکانی گەشەی سێکسیی سروشتی، یان حاڵەتەکانی لادان و پشێویی سێکسی ئەنجام دا، هەرچی فرۆیدە ڕووەو لێکۆڵینەوە لە پەیوەندیی نێوان سێکس و ژیانی دەروونی و ئەقڵی و کاریگەریی چەپاندن لە حاڵەتەکانی نەخۆشیدا، ئاڕاستەی گرت.

تەواوی ئەم ئاڕاستانە لە توێژینەوە دەربارەی ژیانی سێکسی، کاریگەریی پۆزەتیڤیان هەبوو بۆ سەر ڕوانین لە ژیانی سێکسی

به ڕۆحێکی زانستیانەی ئەبستراکتەوە، هەروەها ئەم ئاڕاستانە کاریان کردە سەر تەواوی لایەنەکانی ژیانی سێکسی و بۆ ئاستی توێژینەوەی زانستی لە بوارەکانی دیکەی مەعریفەدا گواستیانەوە، بەڵام ئەم هەوڵە زانستییانە لە دەرئەنجامی نێگەتیڤ بەدەر نەبوون، چونکە کارکردنی توێژەران لەم بوارە هەستیارەدا، بووە هۆی ورووژاندنی دژایەتییەکی توند لە ناوەندە گشتی و تایبەتییەکاندا، تەنانەت لەنێو هەندێک لە زانایانیشدا، ئەمەش بووە هۆی ڕوودانی خۆپارێزی و پابەندبوونی زیاتر لە بوار و پەیوەندییە سێکسییەکاندا، ئەم دەرئەنجامە ئەو ترس و نیگەرانییە دەنوێنێ کە دەشێ زانست مۆراڵە کلاسیکییەکانی سێکس لە ئایینی و کۆمەڵایەتییەوە بە ئەڵتەرناتیڤی نوێی زانستی بگۆڕێ. ئەم ململانێیە لە نێوان کرانەوە و داخران لە ژیانی سێکسی و بابەتە سێکسییەکاندا تا نیوەی سەدەی بیست وەک خۆی مایەوە، ئەم وەرچەرخانە زەمەنییە بە سەرەتای زاڵبوونی زانست بەسەر خۆپارێزی و کۆنەپەرستیدا دادەنرێ.

لەوانەیە توێژینەوەکانی کە د. کینزی دەربارەی ڕەفتاری سێکسی لە نێر و مێدا لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا ئەنجامی دان، بە گرنگترین فاکتەرە کاراکان دابنرێن لە ئاڕاستەگرتنی زانست ڕووەو مەسەلە سێکسییەکان لە سەدەی بیستدا. شێوازی بوێرانەی د. کینزی لە توێژینەوەکانیدا و ئەو ئەنجامانەی کە دەستی کەوتن، کاریگەریی گەورەیان هەبوو لەسەر کارکردن و توێژینەوە لەم بوارە کە لە ڕووی مێژووییەوە بوارێکی داخرا بوو، هەروەها کاریگەریی هەبوو لە داماڵینی زۆرێک لە لادان و پەنهانی دەربارەی ئەم بابەتە. هەرچەندە ئەوەی کنزی پێ ناسرا بریتی بوو لە توێژینەوەکانی دەربارەی ڕەفتاری سێکسی و جۆرەکانی لە نێر و مێ-دا، بەڵام هەندێک توێژینەوەی فسیۆلۆژیشی دەربارەی پەیوەندییە سێکسییەکان ئەنجام دا، لەم توێژینەوانەدا هەریەک لە ویلیەم

ماستەرز و فیرجینیا جۆنسۆن هاوبەشییان کرد و دوای کینزی-یش هەر بەردەوام بوون. ماستەرز و جۆنسۆن، توانییان دەربارەی فسیۆلۆژیی سێکس وەڵام و زانیاریی گرنگ بەدەست بێنن کە پێشتر لە ڕابردوودا نەدۆزرابوونەوە، ئەنجامی توێژینەوەکانیشیان بایەخی گەورەی هەبوو لە تێگەیشتن لە ڕەفتاری سێکسیی سروشتی و لادانی سێکسیدا، هەروەها لە دۆزینەوەی هۆکارە گونجاوەکانی چارەسەرکردن لە حاڵەتەکانی پشێوی لە ڕەفتاری سێکسیدا، ئەم چارەسەرانە لەڕێی شێوازی نۆژداری یان نەشتەرگەری یان دەروونی و ڕەفتارییەوە بەڕێوەچوون.

ئەو کەسەی بەدواداچوون بۆ توێژینەوە زانستییە جیاوازەکان لە بواری ژیانی سێکسیدا دەکات، دەشێ پێی وا بێ ئەم توێژینەوانە کەمێ لەو پیرۆزییە کلاسیکییەی ژیانی سێکسی هەیبوو، کەم کردبێتەوە، ئەو پیرۆزییەی بە درێژایی سەدەکان بەتایبەتمەندێتی و پەنهانییەوە گرێ درابوو، بەڵام تەنانەت ئەگەر ئەوەش ڕووی دابێ، واتە کەمێ لەو پیرۆزییە کەم بووبێتەوە، هەر مەترسیی بۆ سەر ژیانی مرۆڤایەتی کەمترە و کەمتر دەبێتە هۆی ئازار و کۆژان بۆ مرۆڤ، بە بەراورد لەگەڵ هێشتنەوەی ئەم لایەنە گرنگەی ژیان بە داخراوی، چونکە بەهۆی ئەم داخراوییەوە، دەشێ تاک بە هەڵە لە سروشتی مرۆڤ و بەهاکانی ژیانی مرۆڤایەتی و پێگەی ژیانی سێکسی لەناو ئەم سروشت و بەهایانەدا تێبگات، لەگەڵ ئەوەشدا کە توێژینەوە زانستییەکان دەربارەی ئەم بابەتە گرنگە کە پەیوەندیی بەتینی بە ژیانی جەستەیی و دەروونی و تەواوی چالاکییە جیاوازەکانی ژیانەوە هەیە، تا ئێستا بەردەوامن و لەوانەیە کۆتاییشیان پێ نەیەت، بەڵام ئاشکراکردنی نهێنییە زانستییەکان دەربارەی ئەم بابەتە، لە بەختەوەریی مرۆڤ و چێژوەرگرتنی کەم نەکردووەتەوە، بەڵکو لەوانەیە زیادیشی کردبێ و وای لێ کردبێ لەپێناوی بەدیهێنانی خۆیدا بە کارایییەکی زیاتر و بە شێوەیەکی سوودبەخشتر وزە ناوەکییەکانی بەکار بێنێ.

# بەشی چوارەم
# هۆرمۆنەکان و سێکس

-پێشەکی
-هۆرمۆن و دروستبوونی ناسنامەی توخمی
-کاریگەریی هۆرمۆنەکان بۆ سەر ڕەفتاری سێکسی
-کاریگەریی هۆرمۆنی ئەندرۆجین بۆ سەر ڕەفتاری سێکسی
-کاریگەریی ئەزمونی دەروونی بۆ سەر هۆرمۆنی ئەندرۆجین

# هۆرمۆنەکان و سێکس

لە سەرەتای دۆزینەوەی هۆرمۆنەکان و تا ئێستاش، بایەخێکی گەورە بەم ماددانە و ئاستی پەیوەندییان بە ژیانی سێکسیمانەوە، دراوە، ئەم بایەخپێدانە بەتایبەتی لە کاتی ڕوودانی پشێوی لە ژیانی سێکسیدا ئاشکرا دەردەکەوێ، کاتێک هۆرمۆنەکان وەک هۆکارێک بۆ چارەسەرکردن پەنایان بۆ دەبرێ، ئەمەش بە زۆری لە کاتی ڕوودانی پشێویی سێکسی لە نێردا پەیڕەو دەکرێ.

بۆ سەردەمانێکی دووروودرێژ، ئەو بۆچوونە زاڵ بوو کە ئەم ماددانە (واتە هۆرمۆنەکان) بایەخێکی گەورەیان لە ژیانی سێکسیدا هەیە و هەر ئەمەش بووبووە هۆی زیاتر بەکارهێنانیان، بەڵام دواتر پەرۆشی بۆ بەکارهێنانیان وەک چارەسەر زیادیکرد، تا ئێستاش لە ناوەندە زانستییەکان و ئەو ناوەندانەی بایەخ بە ژیانی سێکسی دەدەن، هەمان ئاڕاستەی خۆپارێزی زاڵە، بەڵام لەگەڵ بەکارهێنان و ڕەچاوکردنی کاریگەرییان بۆ سەر ژیانی سێکسی، پەیڕەوکردنی ئەم خۆپارێزییەشدا، هیچ گومانی تێدا نییە ئەم ماددانە کاریگەریی گەورەیان بۆ سەر هێزی پاڵنەری سێکسی و ئەنجامدانی کرداری سێکسی هەیە، هەروەها بە شێوەیەکی گشتی کاریگەرییان بۆ سەر ڕەفتار و دروستبوونی ناسنامەی توخمی لە کۆرپەلەدا هەیە، سەرباری کاریگەرییان بۆ سەر ڕوخسارە جەستەیی و خەسڵەتە دەروونی و ڕەفتارییەکانی تاک لە قۆناغەکانی دواتری ژیان لەدوای لەدایکبوون. کاریگەریی هۆرمۆنەکان بۆ سەر ڕەفتاری سێکسی و گشتی لە تاکدا، لایەنێکی مەسەلەکەیە، لە بەرامبەردا لایەنێکی دیکە هەیە کە بریتییە لە کاریگەریی ئەزموونی تاک بەگشتی و پاڵنەری دەروونی

بەتایبەتی، کە ئەمانەش کار دەکەنە سەر ئاستی هۆرمۆنە سێکسییەکان و ئاستی کاراییان.
هەندێک هۆرمۆن هەن لە نێر و مێدا کە پەیوەندییان بە لایەنە سێکسییەکانەوە هەیە و ئەم پەیوەندییە لەسەر سێ ئاست بەڕێوە دەچێ، یەکەم و دووەمیان لە دەماخدایە، سێیەمیشیان لە ڕژێنە سێکسییەکانی لەشدایە. ئاستی یەکەم ناوکی هایپۆسالامەسە Hypothalamusلە دەماخدا، کە بریتییە لەو ناوکەی دوو ماددەی کیمیاوی دەردەدات و پێیان دەوترێ FSH-RF لەگەڵ LH-RF، هەردووکیان کار دەکەنە سەر ژێر مێشکەڕژێن لە دەماخدا، چونکە هانی ئەم ڕژێنە دەدەن بۆ دەردانی دوو هۆرمۆن، یەکەمیان پێی دەوترێت هۆرمۆنی LH (Luteinizing hormone)واتە هۆرمۆنی هاندەری تەنەزەردە (هانی دروستبوونی تەنەزەردە دەدات و وای لێ دەکات لە ڕژاندنی هۆرمۆنەکانی هێلکەداندا بەشداری بکات)، دووەمیشیان تایبەتە بە نێر و پێی دەوترێت ICSH (Interstitial cell atimulating hormone) واتە هۆرمۆنی نێوانە خانەکان، ئەم دوو هۆرمۆنە ڕژێنە سێکسییەکان (واتە گونەکان لە نێردا و هێلکەدانەکان لە مێدا) بۆ دەردانی هۆرمۆنە سێکسییەکان، هان دەدەن ڕژێنەکانی نێر بە زۆری هۆرمۆنی ئەندرۆجین دەردەدەن و ڕژێنەکانی مێ-ش بەزۆری هۆرمۆنی ئەسترۆجین و پرۆجیسترۆن دەردەدەن، بەڵام هەردوو توخمەکە بە بڕی کەم ئەو هۆرمۆنە دەردەدەن کە بە بڕی زۆر لە توخمە دژەکەدا دەردەدرێت، واتە مێ بڕێکی کەم لە هۆرمۆنی نێرینە و نێریش بڕێکی کەم لە هۆرمۆنی مێینە دەردەدات، لە کاتێکدا هەریەک لە هۆرمۆنی نێرە بە بڕی زۆر لە نێردا و هۆرمۆنی مێینە بە بڕی زۆر لە مێدا دەردەدرێن. سەرباری ئەمانە ڕژێنی ئەدرینالین، یان سەرەگورچیلەڕژێن، بڕی

دیکە لە هۆرمۆنی ئەندرۆجین (هۆرمۆنی نێرینە) لە هەریەک لە نێر و مێدا بەرهەم دێنێ.

لەم خستنەڕووەدا ئەوە دەردەکەوێ کە چەند ئەڵقەیەکی پێکەوە بەستراو لە کاریگەریی بڕی هۆرمۆنە سێکسییەکان لە هەردوو توخمەکەدا هەیە، بوونی هەر پشێوی یان لە کاروەستانێک لە هەر یەکێک لەو ئەڵقانەدا، دەشێ ببێتە هۆی ڕوودانی پشێوی لە لایەنێکی ژیانی سێکسیدا، هەروەها ئاشکرایە کارتێکەرە دەروونی و دەمارییەکان کاریگەریی گرنگیان هەیە بۆ سەر ڕێکخستنی هۆرمۆنە سێکسییەکان و کاراییان، چونکە ڕژێنی هایپۆسالامەس و لەڕێی ئەویشەوە ژێر مێشکەڕژێن، پەیوەندییەکی بەتینیان بە ناوەندە دەمارە باڵاکانی هزر و لایەنی سۆزدارییەوە هەیە. هەقیقەتی سێیەم کە سوودی لێ وەردەگرین، ئەوەیە هەریەک لە دوو توخمەکە نێر یان مێ، بە بڕی کەم ئەو هۆرمۆنەیان هەیە کە لە توخمە دژەکەیاندا بە بڕی زۆر هەیە، سەرچاوەی بوونی ئەم بڕە کەمانەش، بەتایبەتی لە مێدا، زۆربەی سەرچاوەکەی بۆ سەرەگورچیلەڕژێن یان ڕژێنی ئەدرینالین دەگەڕێتەوە.

بە کورتی پەیوەندیی نێوان هۆرمۆنە سێکسییەکان و ژیانی سێکسی لەم سێ بوارەدا دەردەکەون:

١-پەیوەندیی بە دروستبوونی ناسنامەی توخمی و دەرکەوتنی ڕوخسارە جەستەیی و خەسڵەتە دەروونییەکان.

٢-پەیوەندیی بە هاندەری سێکسی و چۆنێتیی ئەنجامدانی کرداری سێکس لە گەورەییدا.

٣-کاریگەریی بۆ سەر ڕەفتاری ناتوخمی لە تاکدا.

## هۆرمۆن و دروستبوونی ناسنامەی توخمی

پۆلێنکردنی توخم بۆ نێر و مێ و دروستبوونی ناسنامەی توخمی، کە بریتییە لەو ناسنامەیەی تاک بەرامبەر بە ئاراستەی سێکسیی خۆی هەستی پێ دەکات، پرۆسەیەکی ئاڵۆز و بەردەوامە و هۆرمۆنەکان ڕۆڵێکی گرنگی تیادا دەگێڕن.

ئەو تیۆرەی ئێستا کاری پێدەکرێ، ئەوەیە، فاکتەری یەکەم لە دیاریکردنی توخمی کۆرپەلە بۆ نێر یان مێ لەڕێی کرۆمۆسۆمی Xو یەوە دەبێ لەناو هێلکەی پیتێنراو Zegote، ئەم کرۆمۆسۆمانە ئەوە دیاری دەکەن، ئایا ڕژێنە سێکسییەکان کە هێشتا جیانەبوونەتەوە، هێلکەدان یان گونەکان دروست دەکەن؟ ئەو کاتەی ئەم جیابوونەوەیە ڕوو دەدات، ڕژێنەکان پرۆگرامێکی گونجاو بۆ گەشە وەردەگرن، ئەگەر ڕژێنەکان بۆ هێلکەدان پرۆگرام کرابوون، ئەوا گەشە ڕووەو مێیەتی ئاراستە دەگرێ، ئەگەر بۆ گونەکان پرۆگرام کرابوون، ئەوە ڕووەو نێرینەیی ئاراستە دەگرن، لە حاڵەتی نێرینەییدا، ئەم ڕژێنانە هۆرمۆنی ئەندرۆجین دەردەدەن و بەمەش منداڵی کۆرپەلە نێر دەردەچێت، ئەگەر ئەمە ڕوو نەدات واتە هۆرمۆنی ئەندرۆجین نەڕێژرێ، ئەوا کۆرپەلە لە پێکهاتەی توخمیدا بە کچی دەمێنێتەوە.

بەم شێوەیە هۆرمۆنەکان کار دەکەنە سەر گەشە و چۆنێتیی ئەنجامدانی کاری ئەندامەکانی سێکس و دروستبوونی خەسڵەتە دووەمییەکانی سێکس لە هەردوو توخمەکەدا. شانبەشانی ئەم کاریگەرییە، فاکتەرێکی دیکە هەیە کاردەکاتە سەر دەماخی کۆرپەلە، بەتایبەتی ناوکی هایپۆسالامەس و ناوچەی لمبی. ئەگەر ئەم کاریگەرییە لە کاتی یەکلاییکەرەوەدا ڕووی دا، ئەوا کۆرپەلە بەپێی ئەوە دەبێ بە نێر یان بە مێ و بە خەسڵەتە دەروونی و ڕەفتارییەکانی نێر یان مێ-وە لەدایک دەبێ. ئەندرۆجین گەورەترین کاریگەریی لەسەر دروستبوونی ئەم ناسنامە دەماخییە

هەیە، کاتێک ئەم هۆرمۆنە زۆر دەبێ، کۆرپەلە بە ئاراستەی نێردا دەڕوات، ئەگەر کەمی کرد بە ئاراستەی مێدا دەڕوات، ئەگەر بە تەواوەتی نەما، ئەوا کۆرپەلە لە ڕووی جەستەییەوە بە تەواوی مێ دەبێ. لەوانەیە سەرەتاکانی ئەم کاریگەرییە لە کاتێکی دواتری گەورەبووندا، واتە دوای نەرزەبوونی تاک، دەربکەوێ. شایەنی باسە هەندێ لە ئاژەڵانی وەک مەیموون، ئەگەر لە کاتی ماوەی دووگیانیدا هۆرمۆنی ئەندرۆجینی پێ درا، ئەوا کۆرپەلەی مێ لە ڕەفتاری سێکسیدا بە نێری لەدایک دەبێ، هەروەها بزێوتر و توندوتیژتر دەبێ و توانای کێبڕکێکردنیشی زیاتر دەبێ، بەڵام لە مرۆڤدا، تێبینی کراوە، بەبێ هۆرمۆنی ئەندرۆجین، تەواوی کۆرپەلەکان لە ڕووی جەستەییەوە مێ دەردەچن، ڕەفتاریشیان لەدواییدا، هەر ڕەفتاری مێینەیی دەبێ، ئەمە لە کاتێکدا ڕوو دەدات، ئەگەر لە کاتە یەکلاییکەرەوەکانی جیابوونەوەی نێر و مێ هۆرمۆنی ئەندرۆجین دەستەبەر نەبوو، بەڵام کاریگەریی هۆرمۆن لە دیاریکردنی ناسنامەی توخمی تاکدا بە شێوەیەکی یەکلاییکەرەوە نییە وەک ئەوەی کە لە مەیموونەدا ڕوو دەدات، چونکە لە مرۆڤدا خێزان و شارستانییەت کە منداڵ لەناویاندا دەژی، کاریگەریی گرنگیان هەیە لە دروستبوونی ناسنامەی توخمیدا، ئەم کاریگەرییە ئاشکراتر دەردەکەوێ کاتێ منداڵە کوڕەکە یان کچەکە تەمەنی دەبێ بە هەژدە مانگ.

ئەو گریمانەیە هەیە کە دەستەبەربوونی بڕی کەم لە هۆرمۆنی ئەندرۆجین لە کاتی گەشەی کۆرپەلەدا، دەشێ ببێتە هۆی دەرکەوتنی خەسڵەتی مێینە لە ڕەفتاری منداڵی کوڕدا، واتە منداڵەکە لەسەرخۆ و نەرمونیان دەردەچێ و ڕقی لە توندوتیژی دەبێ، ئەمەش هانی خێزانەکەی دەدات کە ڕەفتاریان لەگەڵیدا نێگەتیڤ بێ، بەتایبەتی باوک، چونکە بەپێی ئەم گریمانەیە ئەم ڕەفتارە مێینەیە منداڵی کوڕ ئامادە دەکات بۆ هۆمۆسێکسوالیتی و

ئەم منداڵە کە گەورە بوو لە پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ نێری دیکەدا ڕۆڵی نێگەتیڤ دەبینێ. تیۆرێکی دیکەش هەیە لە لایەن د. ئنگەبۆرگ Ingeborg دانراوە و پوختەکەی دەڵێ: "هیلاکبوونی دایک لە کاتی دووگیانیدا، دەشێ ببێتە هۆی کەمکردنەوەی خەسڵەتەکانی نێرینە لە منداڵی کوڕدا، هۆرمۆنی ئەندروستندیون Androstendioneلە لایەن ڕژێنی ئەدرینالینەوە دەردەدرێ، ئەم هۆرمۆنە بە تەواوی هەموو سیفەتەکانی هۆرمۆنی تێستسترونی نییە و دەشێ ڕێگر بێ لەوەی بیری دەماخی بخاتەوە کە ئەو کۆرپەلەیەکی نێرە.

## کاریگەریی هۆرمۆنەکان بۆ سەر ڕەفتاری سێکسی (پاڵنەر و کرداری سێکسی)

هۆرمۆنەکانی ئەندرۆجین کاریگەرییەکی گرنگیان بۆ سەر پاڵنەری سێکس و چۆنێتیی ئەنجامدانی کرداری سێکسی هەیە، لەوە دەچێ ئەم هۆرمۆنە کاریگەییەکی تایبەتمەندی هەبێ، چونکە بوونی هۆرمۆنەکە دەبێتە هۆی زیادبوونی پاڵنەری سێکسی لە نێر و مێدا، کەمبوونیشی بەتایبەتی لە نێردا، دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی ئەم پاڵنەرە. کاریگەریی ئەم هۆرمۆنە بەو شێوەیە لێک دەدرێتەوە کە کاریگەرییەکی چالاککەری بۆ سەر ناوەندە سێکسییەکانی دەماخ هەیە. لە نێردا کەمیی هۆرمۆنی تستسترۆن کە بەهۆی خەساندنەوە، یان بەهۆی نەشتەرگەریی لێکردنەوەی گونەکانەوە، یان نەخۆشییەوە ڕوو دەدات، لە دەرئەنجامەکانی بریتییە لە بەکاوەخۆ لەدەستدانی بایەخدان بە مەسەلە سێکسییەکان، هەروەها نێر توانای ڕەپبوون لەدەست دەدات، هەمان کاریگەری ڕوو دەدات، ئەگەر چارەسەرێکی دژ بە کاریگەریی هۆرمۆنی ئەندرۆجین بە تاک درا، بۆ نموونە بەکارهێنانی ئاوێتەی سایپرۆتیرون Cyproterone وەک چارەسەر بۆ حاڵەتەکانی شەبەقی سێکسی ناچاری، دەبێتە هۆی لەدەستدانی

خێرایی وزەی سێکسی، ئەم حاڵەتە ڕوو دەدات کاتێ هۆرمۆنی ئەسترۆجین بۆ چارەسەری هەندێ لە نەخۆشییەکانی کۆئەندامی مێ، بە نەخۆش دەدرێ، چونکە زیادبوونی ئەم هۆرمۆنە، دەبێتە هۆی تێکچوونی ڕێژەی نێوان ئەندرۆجین و ئەسترۆجین.

کاریگەریی ئەندرۆجین لە مێدا، تا ڕادەیەک هەمان کاریگەریی هەیە کە بۆ سەر نێر هەیەتی، واتە بوونی لە حاڵەتە ئاساییەکاندا کاریگەرییەکی چالاککەری بۆ سەر کرداری سێکسی هەیە، لە حاڵەتەکانی کەمیی پاڵنەری سێکسی و لاوازیی سێکسیشدا کاریگەریی بەهێزکەری هەیە، هەروەها ئەو ژنەی لە سەرچاوە سروشتییەکانی ئەندرۆجین بێبەش بووە بەهۆی لابردنی هێلکەدانەکان، یان سەرەگورچیلەڕژێن (ڕژێنی ئەدرینالین)، تێبینی کراوە کە پاڵنەرە سێکسییەکانی لەدەست دەدات، خەون و خەیاڵی سێکسی نامێنێ و ناتوانرێ لە ڕووی سێکسییەوە بورووژێنرێ وەک ڕابردوو بەر لە لەدەستدانی سەرچاوەکانی ئەم ڕژێنە، بەڵام کاتێ بۆ مەبەستی چارەسەرکردنی لە ڕووی پزیشکییەوە ئەندرۆجینی پێ دەدەرێ، زیاتر لە ڕووی سێکسییەوە دەورووژێنرێ، لەبەر ئەوە لە حاڵەتەکانی تووشبوون بە سێکسساردی، بە چارەسەرێکی گونجاو دادەنرێ لە ژندا، بەڵام کاریگەریی نێگەتیڤی ئەم هۆرمۆنە بۆ سەر ژن ئەوەیە دەشێ ڕوخسارەکانی نێرینەی لەسەر دەربکەوێ، وەک زۆربوونی مووی لەش و گۆڕینی دەنگ. لێرەدا پوختەی ئەو ڕایانە دەخەینە ڕوو کە دەربارەی پەیوەندیی نێوان هۆرمۆنە سێکسییەکان و ڕەفتاری سێکسی لە هەردوو توخمەکەدا زانراون.

١-بایەخی هۆرمۆنە سێکسییەکان لە پرۆسەی گەشە و پێگەیشتنی سێکسیدا بایەخێکە مشتومڕی لەسەر ناکرێ، بەڵام بایەخی هۆرمۆنەکان لەسەر ڕەفتاری سێکسی لە گەورەییدا لە هەردوو توخمەکەدا، تا ئێستا بە تەواوی ئاشکرا نییە.

٢-ئەو پشێوی یان نەخۆشییانەی کە تووشی سەرەگورچیلەڕژێن (ڕژێنی ئەدرینالین) یان ڕژێنە سێکسییەکان دەبن، دەشێ ببنە هۆی لاوازبوونی توانای وروژان و پاڵنەری سێکسی لە هەریەکە لە نێر و مێدا، ئەگەر لە پیاودا ڕووی دا، ئەوا دەبێتە هۆی پەککەوتنی سێکسی.

٣-گونەکان لە نێردا گرنگترین سەرچاوەی ئەندرۆجینن، لابردنیان مەرج نییە ببێتە هۆی لەدەستدانی پاڵنەری سێکسی، یان توانای ڕەپبوون، هەروەها چارەسەرکردن بە هۆرمۆنی ئەندرۆجین مەرج نییە سوودێکی گەورەی هەبێ لە حاڵەتەکانی پەککەوتنی سێکسی لە پیاودا.

٤-بوونی کەمترین بڕ لە هۆرمۆنی ئەندرۆجین بە پێویست دادەنرێ بۆ وروژاندنی پاڵنەری سێکسی و ڕوودانی وەڵامدانەوەی سێکسی.

٥-بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی هۆرمۆنە مێینە زاڵەکان کە بریتین لە ئسترۆجین و پرۆجیسترۆن Oestrogen and progesterone کاریگەریی گرنگیان هەبێ بۆ سەر ڕەفتاری سێکسی لە مێ-دا، چونکە لابردنی، بۆ نموونە هێلکەدانەکان، بەزۆری هاوکات نییە لەگەڵ کەمبوونەوە یان لاوازبوونی پاڵنەری سێکسیدا، بەڵام کەمبوونەوەی هۆرمۆنی ئەندرۆجین، واتە هۆرمۆنی نێرینە کاریگەرییەکی گەورەی هەیە بۆ سەر مێ، زۆرترین سەرچاوەی ئەم هۆرۆمۆنە ڕژێنی ئەدرینالینە، لەبەر ئەوە ئەگەر ئەم ڕژێنە لابرا، ئەوا بە نزیکی ئەندرۆجین لە مێ-دا نامێنێ، بەزۆری ئەم حاڵەتە هاوکات دەبێ لەگەڵ کەمبوونەوە یان لاوازبوونی پاڵنەری سێکسی و وروژاندنی سێکسی لە مێ-دا، بە زۆری ئەم حاڵەتە بۆ چارەسەرکردن لەڕێی هۆرمۆنەوە وەڵامدانەوەی دەبێ، هەروەها زانراوە کەمیی ئسترۆجین لە مێدا دەبێتە هۆی پووکانەوەی زێ.

## کاریگەریی هۆرمۆنی ئەندرۆجین بۆ سەر ڕەفتاری سێکسی

هۆرمۆنی ئەندرۆجین کاریگەرییەکی گرنگی بۆ سەر ڕەفتار هەیە بەگشتی، لەوە تێپەڕ دەبێ تەنیا کار بکاتە سەر وروژاندنی ئارەزووی سێکسی و ئامادەکردنی ناوەندی کیمیاویی پێویست بۆ ئەنجامدانی فەرمانە سروشتییە پێویستەکان کە بۆ وەلامدانەوەی سێکسی پێویستن.

ئەو کاریگەرییە ناسێکسییانەی کە هەبوونی ئەندرۆجین دروستی دەکات، وەک: زیادبوونی ئارەزووی خواردن، گەشەکردنی هێزی ماسوولکەیی گەورەتر و پاڵنەری بەهێزتر بۆ چالاکیی زیاتر و هەروەها کێبڕکێی زیاتر، کە لە هەرزەکاردا دەشێ بە ئاراستەی شەڕانگێزی و ئارەزووی جڵەونەگیراودا بڕوات، بەلام کاتێ ئەندرۆجین کەم دەبێ، ڕوخسارە دەروونییەکان لە تاکدا زیاتر بە خەماوی و سستی وەسف دەکرێن.

## کاریگەریی ئەزموونی دەروونی بۆ سەر ئەندرۆجین

وەک چۆن ئاستی ئەندرۆجین کار دەکاتە سەر ڕەفتاری تاک و هەستی دەروونی، بە هەمان شێوە ئەزموونی دەروونی دەشێ کار بکاتە سەر ئاستی ئەندرۆجین لە جەستەدا و کەم یان زۆری بکات و بەپێی ئەو گۆڕانە لە ئاستەکەیدا شوێنەواری لاوەکی بەجێ بێڵێ. ئەوەی تێبینی کراوە کاتێ تاک فرسەتی سێکسیی سەرنجڕاکێشی بۆ هەڵدەکەوێت، یان هەندێ هۆکاری وروژێنەری سێکسی کاری تێدەکەن، ئەمە دەبێتە هۆی زیادبوونی ئاستی هۆرمۆنی تستسترۆن لە نێردا. بە پێچەوانەشەوە کاتێ تاک ڕووبەڕووی ئەو ئەزموونانەی ژیان دەبێتەوە کە دەبنە هۆی هەستکرن بە خەمۆکی

یان شکستهێنان، ئەوا دەشێ بڕی هۆرمۆنی تستسترۆن لە خوێندا کەم ببێتەوە.

هەروەها لە حاڵەتی ماندووبوونی دەروونی و فشاری دەروونیی درێژخایەندا هەمان شت ڕوو دەدات، بەڵام کاریگەریی ماندووبوونی دەروونی لەسەر ئاستی هۆرمۆنەکان لە مێدا تا ئێستا بە تەواوی ئاشکرا نییە، هەرچەندە دەشێ لە ڕووی کات و ماوە و سروشتی سووڕی مانگانە، پشێوی لە سووڕەکەدا دروست بکات.

# بەشی پێنجەم
# ژیانی سێکسی لە منداڵدا

-پێشەکی
-فرۆید و قۆناغەکانی گەشەی سێکسی
١-قۆناغی زارەکی
٢-قۆناغی کۆمی
٣- قۆناغی چووکی
٤- قۆناغی خامۆشی (متبوون)
٥- قۆناغی نەرزەبوون
-سێکس و ژیانی دەروونیی منداڵ
گرێی ئۆدیپۆس
گرێی ئەلکترا
بایەخی دەروونیی گرێی ئۆدیپۆس
نەیارانی تیۆرەکانی فرۆید
تێگەیشتنی ئێستامان بۆ ژیانی سێکسیی منداڵ
سەرەتای ژیانی سێکسی
بەئاگاهاتنەوە یان بێداربوونەوەی سێکسی
ئۆرگازم لە منداڵدا
ماستەربەیشن لە منداڵدا
بناغەی بایۆلۆژیی توخم لە منداڵدا
هۆمۆسێکسوالیتی لە منداڵدا
پوختە و توانج

## ژیانی سێکسی لە منداڵدا

کۆمەڵگە جیاوازەکان بە درێژایی سەردەمەکانی مێژوو، بوونی ژیانی سێکسییان لە منداڵدا ڕەت کردووەتەوە، لەبەر ئەوە هەندێ ڕوخساری سێکسییان لە ڕەفتاری منداڵدا بە لادان و دەرچوون لە ڕێساکانی پەروەردە و مۆراڵ داناوە. ئەم تێڕوانینە تا ئاستێکی زۆر لە زۆرێک شارستانییەتەکاندا تا ئێستاش هەر باوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە ماوەی ئەم سەد ساڵەی دواییدا کۆمەڵێک لێکۆڵینەوە و توێژینەوە دەربارەی ئەم بابەتە ئەنجام دراون و ئاماژە بە بوونی ژیانی سێکسی لە منداڵدا دەدەن، ئەمەش پاڵ بەو بۆچوونە کلاسیکییەوە دەنێ کە پێی وایە ژیانی سێکسیی تاک لە قۆناغی نەرزەبوونەوە دەست پێ دەکات، گرنگترین ئەو ئەنجامانەی توێژینەوە جیاوازەکان لەم بابەتەدا دەستیان کەوتووە، ئەمانەن:

یەکەم: ژیانی سێکسی لە نەرزەبوونەوە دەست پێ ناکات، بەڵکو ماوەیەکی کەم لەدوای لەدایکبوون بە چەند ڕوخسارێکی سادەوە دەست پێ دەکات.

دووەم: پێویستە بە وردی ئەم دوانە لە یەک جیا بکەینەوە: لایەنی سێکسی Sexual لەگەڵ زاوزێی Genital، چونکە یەکەمیان، چەمکێکی بەرفراوانتر لەخۆ دەگرێ و زۆرێک لەو چالاکییانەش دەگرێتەوە کە هیچ پەیوەندییان بە کۆئەندامی سێکسی، یان زاوزێوە نییە.

سێیەم: ژیانی سێکسی، پرۆسەی دەستکەوتنی چێژ لە چەند ناوچەیەکی جەستە دەگرێتەوە، ئەو ناوچانەی کە پێیان دەوترێ ناوچەکانی چێژ Zones Erotogenic، لە داهاتوودا ئەم پرۆسەیە دەکەوێتە خزمەتی پرۆسەی زاوزێوە، پرۆسەی

دەستکەوتنی چێژ و پرۆسەی زاوزێ، دوو پرۆسەن ئەستەمە گونجان و سازانی تەواو لە نێوانیاندا ڕوو بدات.

چیرۆکی گەیشتن بەم سێ هەقیقەتەی کە باسمان کردن و زانستی هاوچەرخ بڕوای پێیانە، چیرۆکێکی دوورودرێژ و سەیروسەمەرەیە، بەشەکانی ئەم چیرۆکە لە ماوەی سەد ساڵدا نووسراون، چیرۆکێکە پڕە لە مشتومڕ دەربارەی ئەو هەقیقەتەی کێ لەپێشدا ژیانی سێکسیی لە منداڵدا دۆزییەوە. مشتومڕێکی هاوشێوە، بەڵام هێورتر، دەربارەی بوونی سێکس لای منداڵ، یان نەبوونی هاتە ئاراوە، هەروەها دەربارەی کاریگەریی ئەزموونە سێکسییەکانی منداڵ بۆ سەر ڕووداني پشێویی دەروونی لە گەورەییدا، تا ئەم ڕۆژەی ئێستامان هەندێ شوێنەواری ئەو مشتومڕە دوورودرێژە هەر ماوە.

بابەتی سێکس لای منداڵ هەمیشە بە ناوی فرۆیدەوە گرێدراوە تا ئەو ئاستەی زۆر کەس وا دەزانێ فرۆید یەکەم کەس بووە ئەم بابەتەی ئاشکرا کردووە، فرۆیدیش خۆی ویستوویەتی ئەم پێشینەیە بۆ خۆی بێ، بەتایبەتی لە کاتێکدا بابەتی سێکس لە قۆناغی منداڵیدا و چەپاندنی سێکس لەم قۆناغەدا، بەردی بناغەی قوتابخانەی دەروونشیکاری و تیۆرەکانی دیکەی فرۆید بوون کە تایبەتن بە چەپاندن و نائاگایی و گوزارشتکردن لە ئەزموونە چەپێنراوەکان (گرێ دەروونییەکان) لە شێوەی وێنەی سیمبولیدا، یان لە شێوەی نەخۆشیی دەروونیدا. فرۆید هەوڵیشی داوە ئەو پێشینەیە لەو کەسانە داماڵێ کە پێشتر هەمان ڕایەکانی ئەویان هەبووە، هەروەها بە چەندەها هۆکار و ڕێگەی جیا، ویستوویەتی لە پلەوپایەیان کەم بکاتەوە، بەڵام هەقیقەتە مێژووییەکان، مەسەلەکانیان خستەوە جێگەی خۆیان. هەرچەندە زۆر کەس تەنانەت لە بواری نۆژداری و دەروونییشدا، پێیان وایە لەم بابەتەدا، فرۆید خاوەنی پێشینەیە.

ئیرازموس داروین، باپیری زانای بەناوبانگ و خاوەنی تیۆری دروستبوون و بالابوون، (داروین)، یەکەم کەس بووە بە ئاشکرایی تێبینییەکانی خۆی دەربارەی سێکس لە منداڵدا، خستووەتە ڕوو، ئیرازموس داروین پێی وا بووە هەستکردنی منداڵی ساوا بە چێژ کاتێ شیری دایکی دەخوات و مەمکی دایکی دەمژێ، لە ئایندەدا بە شێوازێکی دیکە دەردەکەوێ کە بریتییە لە هەوڵدانی مرۆڤ ڕووەو جوانناسی، گوزارشتکردن لێی.

بەمەش پێش داروینی کوڕەزای کەوت، کە تێبینیی کوڕە تەمەن حەوت هەفتانەکەی کرد کاتێ مەمکی دایکی دەخوارد، زەردەخەنەیەکی ڕەزامەندی لەسەر ڕوخساری بوو، چاوەکانیشی ورد دەیانڕوانی کاتێ گوێ مەمکی دایکی دەمژی. ئەم تێبینییە وای لە داروین کرد بڕوا بەوە بێنێ کە بەڕاستی منداڵان دەتوانن لەم تەمەنە بچووکەدا ئەزموونی شەهوەت و چێژ بکەن (داروین ١٨٧٧). بەدوای داروینیدا کۆمەڵێک زانای دیکە هاتن و لێکۆڵینەوەیان دەربارەی سێکس لە منداڵدا ئەنجام دا و تێبینییەکانی خۆیانیان تۆمار کرد، لەو زانایانەی لە مەسەلە سێکسییەکاندا ناوبانگیان هەبوو وەک: کرافت ئیبنج Kraft-Ebingبلوخ، ماینرت، شامبارد، شارکۆ و هافلوک ئالیس.

لەوانەیە لەنێو هەموویاندا هەردوو زانا فلایس Fliess و مول Mollزۆرترین کاریگەرییان لەسەر فرۆید بەجێ هێشتبێ. کیرنی نووسەر ساڵی١٩٧٣ ئەم هەڵویستەی بەم شێوەیە کورت کردەوە و نووسیی: (تەواوی ڕەگەزەکانی کە لە تیۆرەکەی فرۆیددا دەربارەی سێکس لە منداڵدا هەن، بە نزیکی و بە وردی چاوەڕوانکرابوون، یان بە شێوەیەک لە شێوەکان بەر لە فرۆید سەرنجیان لێ دراوە.

فلایس کە هاوڕێ و هاوکاری فرۆید بوو، دواتریش بەهۆی بۆچوونییەوە بەرامبەر بە فرۆید کە ئەمانەتی زانستیی

نەپاراستووە، بەبینیان تێکچوو، دەڵێ: "دەمەوێ ئاماژە بەوە بدەم، ئەو جووڵانەی مژین کە منداڵانی بچووک بە لێو و زمانیان ئەنجامی دەدەن، هەروەها پەنجەمژینیش، ئەم جووڵانە بەرامبەر بە ماستەربەیشنن و دەشێ ببنە هۆی تووشبوون بە نیوڕۆسس و لاوازی لە گەورەییدا...".

بەم شێوەیە دەبینین فلایس تێبینی ئاماژەی سێکسیی دەمی کردووە، هەروەها دەرکی بەوە کردووە کە ئەم ئەزموونە دەشێ کاریگەریی دەروونیی هەبێ، لەبەر ئەوە لەم دەرککردنەدا پێش فرۆید کەوتووە، هەروەها فلایس ئەندامەکانی دەردان و گوزارشتکردنی لە سێکس لە منداڵی بچووکدا پێکەوە بەستووەتەوە، تێبینیی کردووە، میزڕانەگرتن و میز بەخۆداکردنی منداڵ ماوە ماوە ڕوو دەدات. پێی وا بوو، ئەم دیاردەیە گوزارشت لە حاڵەتی سێکسیی ئەو منداڵە دەکات، ئەم دیاردەیە لە ڕووی پەیوەندییەوە بە کردارە سێکسییەکانەوە، هەر دەبێ لە ڕابردووشدا تێبینی کرابێ. ئەم تێبینییە کاریگەریی بۆ سەر فرۆیدیش هەبوو، کاتێ شیکردنەوەی بۆ دیاردەی میز ڕانەگرتن لە منداڵدا کرد.

هەروەها فلایس پێی وا بوو، گەشەی سێکسی لە شێوەی چەند لێشاو یان شەپۆلێکی بەدوایەکدا هاتوودا ڕوو دەدات. تاک لەڕێی گەشەی فسیۆلۆژییەوە وزەکانی کۆ دەکاتەوە، لەدوای نەرزەبوون و لە قۆناغەکانی دواتریشدا، ئەو وزانە بۆ بەدیهێنانی سێکس، بەکار دێنێتەوە، هەروەها پێی وا بوو، هێزە غەریزییە سێکسییەکان بەو شێوەیە بڕیاریان لەسەر دراوە کە کۆببنەوە و هەڵبگیرێن، تا لەدوای نەرزەبوون خزمەتی بەدیهاتنی ئامانجە شارستانییە مەزنەکان بکەن. لەو ڕووداوە گرنگانەی کە فلایس بۆ سەلماندنی سێکس لە منداڵدا و کاریگەرییە دەروونییەکانی بڵاوی کردەوە، چیرۆکی یان حاڵەتی منداڵێک بوو بە ناوی فریتز Fritz. فریتز

تەمەنی خوار چوار ساڵ بوو، لە ساڵی١٨٩٥ەوە لەژێر چاودێریی نۆژداریی فلایسدا بوو، مێژووی نۆژداری ئاماژەی بەوە داوە، کاتێ فریتز تەمەنی نزیک سێ ساڵان بووە، دایەنەکەی تێبینیی کردووە کە بایەخ بە جەستەی ژن بە ڕووتی دەدا. بێگومان بایەخدانی بە جەستەی ڕووتی ژن، هاوکات بووە لەگەڵ هەستکردن بە شەرم و عەیبە، هەروەها دایەنەکەی دەیووت کە لە شەودا نۆرەی گریان و دڵەڕاوکێ و ورێنەی بۆ هاتووە و لەو کاتانەدا چووکیشی ڕەپ بووە، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ناوەڕۆکی سێکسیی حاڵەتەکە. شەهوەتی سێکسی ورووژاو، شکستهێنان لە بەدیهاتنیدا، ئەو دڵەڕاوکێیەی کە بەهۆی شکستهێنان لە بەدیهێنان و بەهۆی هەستکردن بە شەرم و عەیبەوە دروست دەبێ، ئەمانە زنجیرەیەکی ئاشکران لە هۆکار و دەرئەنجام. دواجار فلایس وای دانا سێکس لە قۆناغی منداڵیدا وزەیەکی بایۆلۆژییە بە شێوەیەکی خولی و پچڕپچڕی دێ، ئەم تیۆرەی فلایس کاریگەری یەکلاییکەرەوەی بۆ سەر تیۆرەکەی فرۆید هەبوو دەربارەی قۆناغەکانی گەشەی سێکسی دەروونی لە منداڵدا.

کاریگەریی دووەم بۆ سەر فرۆید، لە لایەن یەکێکی دیکەوە بوو لە هاوڕێ و هاوسەردەمەکانی، ئەویش زانا مول بوو، کە هێندە بڕوای بە ڕایەکانی فرۆید دەربارەی دەروونشیکاری نەبوو، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە فرۆید تووڕە بوو لێی و دواتر دەنگیان لە یەک دابڕی.

هۆکاری ئەم دەنگدابڕینەی نێوان فرۆید و مول بۆ ئەوە دەگەڕێنرایەوە کە فرۆید هەستی کردبوو مول دەربارەی سێکس لە منداڵدا پێشی کەوتووە، هەروەها مول لە ساڵی ١٨٩٧دا، پێی وا بوو، زۆربەی ڕوخسارەکانی گەمە سێکسییەکان لە منداڵدا پێویستە بەو شێوەیە تەماشا بکرێن کە وەک خۆئامادەکردنێک

وان بۆ خۆگونجاندنی سەرەتایی لەگەڵ کرداری سێکسی لە نەرزەبووندا و دوای نەرزەبوون.

هەروەها تێبینی ئەوەی کرد کە ئەڤینداری و گەمەبازیی سێکسی، خەسڵەت و ڕەفتاری باون لە بوونەوەرە باڵاکاندا. لە مرۆڤیشدا (لە منداڵدا)، چالاکییەکی لەپێشینەیە بۆ بەسروشتیکردنی غەریزەی ئاژەڵی. بە پشت بەستن بەم تێبینیانە، مول ئەو بیروبۆچوونانەی بەدرۆخستەوە کە پێی وا بوو پێگەیشتنی ئەندامی زاوزێ مەرجی سەرەکی و پێویستە بۆ دروستبوونی ئارەزووی سێکسی لە نێر و مێ-دا، بەڵکو بە پێچەوانەوە، پێی وا بوو پێگەیشتن و نەرزەبوون لە زوربەی حاڵەتەکاندا، دەشێ ڕەگەزی دەروونی پێش ڕەگەزی جەستەیی دەربکەوێ (مول ١٨٩٩)، هەروەها لەو باوەڕەدا بوو تەنانەت غیرەکردن، هەستکردن بە شەرم و عەیبە و تەنانەت ماچکردنی دایک و باوک یان کەسانی دیکە لە کاتی دەربڕینی خۆشەویستی بۆیان، هەموو ئەمانە بە ڕەگەزی سێکسی لە قۆناغی منداڵیدا، ڕەنگرێژ کراون. بەپێی بۆچوونی ئەو، پراکتیزەکردنی سێکس لە قۆناغی منداڵیدا تەنیا پەیوەندیی خۆشەویستی و گەمەبازی و دەستبردن بۆ ئەندامی سێکسی نییە، بەڵکو بە ڕەپبوونی چووک و ماستەربەیشن دەست پێدەکات و بەزۆریش لە ساڵی یەکەم و دووەمی تەمەنی منداڵیدا ڕوو دەدات، هەروەها بڕواشی وا بوو، هەندێ کرداری سێکسی لە منداڵدا وەک پراکتیزەکردنی هۆمۆسێکسوالیتی و مەیلە ناسروشتییەکانی دیکە، بە لادانی سێکسی دانانرێن وەک لە ڕابردوودا بڕوا وا بوو، بەڵکو ئەم پاڵنەرانە ئاسایی لە قۆناغی منداڵیدا دەردەکەون و لە کاتی نەرزەبووندا ون دەبن.

لەو بەڵگانەی ئاماژەمان پێ دان، دەردەکەوێ فرۆید ڕای زاناکانی پێش خۆی و تێبینییەکانیان دەربارەی ژیانی سێکسی لە منداڵ زۆر کاریان تێکردووە، بەتایبەتی ڕایەکانی فلایس.

فرۆید نووسیوویەتی (١٨٩٨): ئێمە بە هەڵەدا دەچین ئەگەر ژیانی سێکسیی منداڵ بە تەواوی یان تەنانەت بە شێوەیەکی ئەندەکیش، فەرامۆش بکەین، بەپێی شارەزایی و ئەزموونی خۆم بۆم دەرکەوتووە، منداڵ توانای هەموو چالاکییەکی سێکسی دەروونی هەیە و دەتوانێ زۆر چالاکی سێکسی جەستەییش ئەنجام بدات، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە کارێکی دروستە کە پێکهاتە و پەرەسەندنی توخمی مرۆیی هەوڵی زۆری داوە بۆ ئەوەی مرۆڤ لە قۆناغی منداڵیدا تا ئاستێکی زۆر لە چالاکی سێکسیی بەدوور بێ، لەوە دەچێ وا بڕیار بێ هێزە غەریزییە سێکسییەکان هەڵبگیرێن، تا لە کاتی نەرزەبووندا بچنە خزمەتی ئامانجە شارستانییە مەزنەکانەوە". بەمەش فرۆید لەگەڵ فلایس-دا هاوڕایە کە پێشتر ئەویش هەمان ڕای هەبوو. پاشان لەدوای سێ ساڵ، فرۆید وتەکانی خۆی بەم شێوەیە هەموار کرد: "منداڵ ئەو غەریزە سێکسییە دەچەپێنێ، یان بۆ مەبەستی ئامانجی ناسێکسیی باڵا دەیگۆڕێ، بەمەش پاڵنەرە سێکسییەکانی منداڵ باڵا دەبن و وزەی پێویست بۆ زۆرێک لە دەستکەوتە مرۆییەکان دەستەبەر دەکەن". هەر دەربارەی بابەتی سێکس لە منداڵدا، فرۆید دەڵێ: "ڕوخسارە گشتییەکانی گەشەی سێکسی لە منداڵدا، ڕوخساری خولی و پچڕپچڕن، ئەم پچڕپچڕییە وا لێک دەدرێتەوە بەهۆی متبوونی یان بەهێزبوونی پاڵنەرە سێکسییەکانەوە ڕوو بدات، یان بەهۆی کۆبوونەوەی هێزەکانی دژ بە سێکسن". هەروەها پێی وایە: "پشێوییەکانی گەشەی سێکسی لە منداڵدا دەشێ بۆ گۆڕانکاری زەمەنی لە شەپۆلە بەدوایەکداهاتووەکانی گەشە، بگەڕێتەوە."

لە ڕایە گرنگەکانی دیکەی، پێی وایە، دژەوەستانێکی دینامی هەیە لە نێوان شەپۆلە بەدوایەکداهاتووەکانی لێشاوی وزەی سێکسی لە منداڵدا، لەگەڵ ئەو هێزانەدا کە هەوڵ دەدەن بۆ متکردنی ئەو وزە سێکسییە، لەم بارەیەوە دەڵێ: "کاتێ منداڵ

لەدایک دەبێ و دێتە ئەم جیهانەوە، تۆوی غەریزەی سێکسی تیادایە، ئەم تۆوانە بە شێوەیەکی خولی بەردەوام دەبن لە گەشە، ئەم گەشە خولی-یە لەڕێی چەپاندنەوە ڕووبەڕووی ڕێگری دەبێتەو، تا ڕێگری بکات لە ڕوودانی هەڵچوون یان هەڵکشانی غەریزەی سێکسی، ئەو ڕێگرییانەش بریتین لە ڕەگەزی دەروونی و لە ماوەی قۆناغی متبوون یان خامۆشبوونی غەریزەی سێکسیدا کاردەکەن، دیاردەی یان قۆناغی خامۆشبوونی غەریزەی سێکسیش بۆ زۆر فاکتەری ئەندامی و شارستانی دەگەڕێتەوە...".

## فرۆید و قۆناغەکانی گەشەی سێکسی

فرۆید ڕای وا بوو ژیانی سێکسی لە منداڵدا، بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕ دەبێ، دەرچوونی وزەی سێکسی لە منداڵدا لە چەند شوێنێکی جەستەوە ڕوو دەدات، هەروەها منداڵیەک بەدوای یەک واز لە یەک بەیەکی ئەم ناوچانەی شەهوەتی سێکسی دەهێنێ و لە گەورەییدا یەک شوێن دیاری دەکات. ئەو ناوچانەی دەستبەرداریان دەبێ، دەشێ تەواوی ڕووی جەستەی بن، کە لە کاتێکی دواتردا لە گەورەییدا تا ئاستێک ئەو ناوچانە هەر دەیورووژێنن و لە شێوەی دەربڕینی ئارەزووی سێکسیدا دەردەکەونەوە. بە شێوەیەکی گشتی یادەوەری تاک لەو ناوچە سێکسییانە دوور دەکەوێتەوە کە لە قۆناغی منداڵیدا، منداڵ، بە جۆرێ لە بێزهاتنەوەوە دەستبەرداریان بووە، لەبەر ئەوە ئەم یادەوەرییە دەچەپێنرێ، کاتێکیش وروووژاندنی ئەم ناوچە سێکسییانە بە هەموو ڕوخسارە جیاوازەکانییەوە لە منداڵدا دەکوژێنەوە، مۆراڵ و هەستکردن بە عەیبە و کردارە ئەقڵییە باڵاکانی دیکەی هەست دەردەکەون.

فرۆید وای گریمانە کردووە: "ژیانی سێکسی لە منداڵدا لە شێوەی بازدانێکدا ڕوو نادات و بەو دواقۆناغە ناگات کە لە

نەرزەبووندا دەردەکەوێ، بەڵکو ژیانی سێکسیی منداڵ لە شێوەی چەند قۆناغێکی دوابەدوای یەکدا ڕوو دەدات کە هیچیان لە یەک ناچن، لە هەر قۆناغێکدا گۆڕانکاریی گەورە ڕوو دەدات، ئامانجی سەرەکی لەم قۆناغانە ئەوەیە تەواوی ڕەگەزەکانی غەریزەی سێکسی بکەونە ژێر دەسەڵاتی مەزنی ناوچەی سێکسییەوە و سێکس بچێتە خزمەتی زاوزێ-وە". فرۆید لە پۆلێنە بەناوبانگەیدا قۆناغەکانی گەشەی سێکسی و ناوچە سێکسییەکانی لە یەک جیاکردووەتەوە و بۆ دوو پۆل دابەشی کردوون: دابەشکردنی یەکەم تایبەتە بە قۆناغەکان، کە بریتین لە قۆناغی بەر لە ئەندامی سێکسی Pre-genital و قۆناغی ئەندامی سێکسی Genital.

هەروەها فرۆید ئەوەی ئاشکرا کرد، منداڵ لە تەمەنی سێ ساڵییەوە و دوای سێ ساڵی یاری بە ئەندامی سێکسی دەکات و ئەندامەکەی دەست بە وروژان دەکات، هەروەها بە مەبەستی چێژ دەستی بۆ دەبات، واتە لەڕێی یاریکردنەوە پێی ئارەزووی وروژانی ئەندامی سێکسی، تێر دەکات.

فرۆید ناوچەکانی داهاتووی وروژانی سێکسیی بەم شێوەیە پۆلێن کرد: ناوچەی زارەکی Oral، ناوچەی کۆمی Anal، ئەندامی سێکسی Genital، خەسڵەتی تایبەتی بە هەر یەکێک لەم ناوچانە بەخشی لە ڕووی کات و بابەتەکەیانەوە و ئەو خەسڵەتانەش کە پەیوەندییان بە کەسێتییەوە هەیە. لێرەدا پوختەی ئەم قۆناغانە دەخەینە ڕوو کە فرۆید لە تیۆرەکانیدا باسی کردوون:

### ١-قۆناغی زارەکی Oral stage:

ئەم قۆناغە لە ڕۆژانی یەکەمی ژیانی منداڵەوە دەست پێ دەکات، بابەتی ئەم قۆناغە لە سەرەتاوە دیاری دەکرێ کە بریتییە لە مەمکی دایک، واتە ئەو سەرچاوەیەی کە خۆراک بە منداڵ دەبەخشێ، دەم لەم حاڵەتەدا تەنیا ناوچەیەک نییە بۆ ڕازیکردنی

هەستی برسێتی و وەرگرتنی خۆراک، بەڵکو ناوچەیەکە بۆ ڕازیکردنی وزەی سێکسیش. ئەمەش وا دەکات دەم ببێ بە ناوچەیەکی خۆیی بۆ وروژانی سێکسی Autoerotic، منداڵ دەتوانێ خۆی لەڕێی هۆکاری دیکەوە جگە لە مەمکی دایک، ئەم ناوچەیە بورووژێنێ، بۆ نموونە لە ڕێی مژینی پەنجەی خۆیەوە و شت کردن بە دەمیدا، سووربوونی منداڵ لەسەر ئەنجامدانی ئەم ڕەفتارانە، تەنانەت لەدوای ئەوەش کە لە مەمکی دایکی تێر شیر دەبێت، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە دەمی دەتوانێ بەدەر لە خواردن، چێژی دیکەی دەست بکەوێ، هەر لەبەر ئەوەشە ئەم چێژە بە سێکس دادەنرێ.

لەگەڵ ئەوەشدا دەم لە ڕووی سێکسییەوە لە مانگەکانی یەکەمی منداڵدا لە دەربڕیندا بەهێزە، لە قۆناغەکانی دواتری گەشەدا کەم دەبێتەوە، بەڵام بە تەواوی بایەخی خۆی لەدەست نادات، چونکە لە گەورەییشدا بە سەرچاوەیەکی گرنگی چێژوەرگرتن دادەنرێ، هەروەک لە نەریتی ماچکردن لە هەموو قۆناغەکانی تەمەندا دەردەکەوێ، هەروەها دەم لە کردارە سێکسییە سروشتی یان لادەرەکانیشدا، بەکار دێ.

## ٢- قۆناغی کۆمی Anal Stage:

لە تەمەنی ١٨ مانگی تا سێساڵی بەردەوام دەبێ، لە ماوەی ئەم قۆناغەدا، بەشی گەورەی ناوەندی ڕازیکردنی سێکسی لە منداڵدا لە ناوچەی دەمەوە بۆ ناوچەی کۆم دەگوێزرێتەوە، ئەم گواستنەوەیە لە ساڵی دووەمی تەمەنەوە دەست پێ دەکات کاتێک منداڵ دەست بە فێربوونی چۆنێتیی کۆنترۆڵکردنی میزکردن و پاشەڕۆی کۆمی دەکات. منداڵ چێژ دەبینێ لە: یەکەم، بەتاڵکردنەوەی ڕیخۆڵەی. دووەم، هەستکردن بەوەی ئەم کارە دەکات تا دایک و باوکی ڕازی بکات. لەوانەیە چێژ سێیەمیش

هەبێ کە منداڵ خۆبەتاڵکردنەوە و ڕزگاربوون لە پیسایی دوا دەخات و لەناو ڕیخۆڵەدا دەیهێڵێتەوە، دەشێ لەڕێی درێژکردنەوەی کرداری خۆبەتاڵکردنەوە لە پیسایی، ئەم چێژە ببینێ.

**٣-قۆناغی چووکی-ئۆدیبی Phallic- Oedpal:**

لە تەمەنی ٣-٦ ساڵی، ئەندامە سێکسییەکان لە نێر یان لە مێ-دا، دەبنە ناوچەی بایەخدان و شەهوەتی سێکسی لای منداڵ، بەتایبەتی چووک لە منداڵی کوڕ و میتکە Clitoris لە منداڵی کچدا. لەم قۆناغەدا منداڵ لەڕێی هەوڵدان بۆ دەستلێدان لە ئەندامی سێکسیی خۆی کە لە ماستەربەیشن دەچێ، هەستکردن بە چێژ دەدۆزێتەوە. هەر لەم قۆناغەدا گەشەی دەروونی سێکسی منداڵی کوڕ لە منداڵی کچ جیادەکرێتەوە. بەپێی تیۆری دەروونشیکاریی فرۆید، بایەخدانی سروشتی منداڵی کوڕ بە دایکی، بە شەهوەتی سێکسی بارگاوی دەبێ، کە دەبێتە هۆی دروستبوونی هەستێکی ناهۆشیارانەی ڕقلێبوونەوە لە باوک و ئارەزووکردنی ئازاردانی، ئەمەش بەهۆی ئەو هەستەوە دروست دەبێ کە کوڕ وا دەزانێ باوکی، دایکی داگیر کردووە و خۆی کردووە بە خاوەنی، لە کاتێکدا منداڵی کوڕ حەز دەکات تەنیا خۆی خاوەنی دایکی بێ. بەم شێوەیە منداڵ غیرە لە باوکی دەکات.

فرۆید ئەم مەیلە شەهوانییەی کوڕ بەرامبەر بە دایکی و ڕقلێبوونەوەی لە باوکی و ئارەزووکردنی ئازاردانی، بە گرێی ئۆدیب Oedipal Complex وەسف کردووە.

لەدوای ئەم قۆناغە، کرداری ڕزگاربوون لە گرێی ئۆدیب دەست پێ دەکات، کە لە شوێنێکی دیکەی ئەم بەشەدا باسی دەکەین. هەرچی منداڵی کچە، ئەوا فرۆید پێی وایە، کاتێ گەمەبازی بە میتکەی دەکات، ئەم کارە زۆر فریای ناکەوێ و سوودی لێ نابینێ، لەبەر ئەوە ئارەزووی کچ لە گەمەبازی بە

میتکە بۆ ئارەزووی منداڵخستنەوە دەگۆڕێ، بۆیە ئەو شێوە و دۆخانە تاقی دەکاتەوە و ئەو ڕەفتارانە دەنوێنێ کە نیشانەن بۆ ئەو حەزە. تەواوی ئەم بابەتانە لە نێر و مێ-دا لە نەستدا ڕوو دەدەن.

٤- سووڕی متبوون یان خامۆشی Latency stage:

فرۆید ئەم قۆناغەی لە نێوان ٥ یان ٦ ساڵی تا تەمەنی نەرزەبوون دیاری کردووە کە بەم شێوەیە وەسفی کردووە: "لە ماوەی ئەم قۆناغی خامۆشییە تەواو یان ئەندەکییەدا، هێزی ئەقڵی بینا دەبێت، ئەمەش دواتر دەبێتە بەربەرست لە بەردەم کاروانی غەریزەی سێکسیدا، چونکە ئیدی هێزی ئەقڵی بەڕێوەچوونی غەریزەی سێکسی دیاری دەکات. ئەم هێزە ئەقڵییەش بریتییە لە بێزهاتنەوە، هەستکردن بە عەیبە، مەسەلە ئیستاتیک و مۆراڵییەکان. دەشێ هەندێ کەس ئەو بۆچوونەیان هەبێ ئەم بەربەست یان ئاستەنگانە لە منداڵی ناوچە شارستانییەکاندا بەهۆی فێربوونەوە دروست بێ، هەرچەند گومانی تیادا نییە کە فێرکردن پەیوەندیی گەورەی بە دروستبوونی ئەم بەربەست و ئاستەنگانەوە هەیە، بەڵام واقیعی مەسەلەکە ئەوەیە کە ئەم گەشەیە بە شێوەیەکی ئەندامی بڕیاری لەسەر دەدرێ و بۆماوە دیاری دەکات. زۆرجار بێ بوونی هیچ کۆمەکییەک لەڕێی فێربوونەوە ئەمە ڕوو دەدات". فرۆید پێی وا نییە ئەم وچانی خامۆشبوونە لە هەموو چالاکییەکی سێکسی بەدەر بێ، بەڵکو بەو شێوەیە وێنای کردووە کە پاڵنەرە سێکسییەکانی منداڵی بە شێوەیەکی ئەندەکی داپۆشراون نەک بە تەواوی، هەروەها دەرکەوتنی ئەم وزە شپرزەیەی بە دوور نەزانیوە و دەڵێ: "جووڵەی ئەم پاڵنەرانەی منداڵی لە ماوەی وچانی خامۆشبووندا، ناوەستێ، هەرچەندە بە شێوەیەکی تەواو یان ئەندەکی وزەی ئەم پاڵنەرە سێکسییانەی منداڵی لە بەکارهێنانی سێکسییەوە بەرەو

لایەنی دیکە ئاراستە دەگرێ. فرۆید گریمانەی کردووە ئەم گۆڕانە بۆ گوزارشتکردن دوو ئاراستە دەگرێتەبەر، یەکەمیان پێک دێ لە: هەڵچوونەکان Reaction Formationوەک بێزهاتنەوە و هەستکردن بە عەیبە، ئاراستەی دووەمیشیان ڕووەو باڵابوون و شکۆبوون Sublimation دەڕوات، بەم شێوەیە وزەی سێکسی بە شێوەیەکی ئەندەکی ڕووەو مەسەلەکانی ئستاتیک و هزرە مۆراڵییەکان، دەڕوات. بەپێی ڕای فرۆید ئەم دوو پرۆسەیە لە گۆڕان جەوهەری وچانی خامۆشبوون پێک دێنن.

ئاشکرایە هەموو قۆناغەکانی ژیانی سێکسی لە منداڵیدا، واتە زارەکی و کۆمی و چووکی، هەموویان مۆرکێکی خۆییان Autoeroticپێوەیە، منداڵ لەڕێی وورووژانی ناوچە جیاوازەکانی شەهوەت لە جەستەدا، چێژی دەست دەکەوێ، تەنانەت ئەگەر منداڵ سەرنجی بۆ سەرشتێ یان بابەتێکی دیکە لە دەرەوەی خۆی بە مەبەستی وورووژاندن، گواستەوە، ئەو وورووژانەی کە چێژ دەبەخشێ و شەهوەتی سێکسی تێر دەکات، هەر دەکەوێتە چوارچێوەی جەستەی خۆیەوە. بە تەواوبوونی ئەم قۆناغانە و بە هاتنی قۆناغی خامۆشبوون بەدوایاندا، قۆناغی گەشەکردنی ژیانی سێکسی دەست بە چەسپاندنی دەسەڵاتی خۆی دەکات، ئەم قۆناغە لە ناوچەی سێکسیدا دیاری دەکرێ، هەرچی قۆناغەکانی پێشترە بەم قۆناغەوە دەنووسێن و دەچنە ژێر ڕکێفی ئەمەوە.

ئەو ناوچانەی کە بەم قۆناغانەوە پەیوەستن، دەبن بە ناوچەی وورووژانی کرداری سێکسیی ڕاستەوخۆ، یان دەبن بە بەشێک لێی.

٤- قۆناغی نەرزەبوون:

قۆناغی نەرزەبوون بە دوا قۆناغی گەشەی سێکسی دادەنرێ، ئەو گۆڕانانەی لەم قۆناغەدا ڕوو دەدەن، غەریزەی سێکسی دەخەنە ژێر کۆنترۆڵی ئەندامە سێکسییەکان لە نێردا، بەڵام لە مێ-

دا، فرۆید پێی وایە کچ پێویستی بە شەپۆلێکی نوێیە لە چەپاندن، ئەمە وەک زەروورەتێک وایە بۆ کوژاندنەوەی ناوچەی سێکسیی نێرینە تیایدا کە بریتییە لە میتکە، ئەمەش ڕێگە دەدا بە بێداربوونەوەی ناوچەیەکی سەرەکیی نوێ کە بریتییە لە ناوچەی زێ. ئەرکێکی دیکەی گۆڕانکارییەکانی نەرزەبوون، پەیداکردنی هاوبەشێکە بۆ کاری سێکسی. ئەگەر لە قۆناغەکانی گەشەی سێکسیدا لە منداڵیدا هاوبەشێکی سێکسی هەبووبێ، ئەوە تەنیا لە خەیاڵی منداڵدا بووە، بەڵام ئەم خەیاڵە بە تابۆ دادەنرێ، بەتایبەتی لە کاتێکدا ئەگەر منداڵ سەرنجی لەسەر یەکێک لە باوان لە توخمە دژەکەی، چڕ کردەوە، (واتە کاتێک منداڵی کوڕ لە خەیاڵیدا دایک بە هاوبەشی سێکسی دادەنێ و منداڵی کچیش باوک)، بۆ ئەوەی منداڵ لە گەورەییدا بە ژیانێکی سێکسیی سروشتی بگات، پێویستە بەسەر ئەم خەیاڵەدا زاڵ بێ. هەرزەکار بەزۆری بە دوو قۆناغ هاوبەشی سێکسی هەڵدەبژێرێ، لە قۆناغی یەکەمدا ئەم هاوبەشە کەسێکە لە توخمەکەی خۆی (هۆمۆسێکسوال)، لە قۆناغی دووەمیشدا، کە قۆناغێکی تەواوە لە پێگەیشتن، هەرزەکار پێگەیشتووە و هاوبەشەکەی لە توخمەکەی دیکە، واتە دژ بە توخمی خۆی (هێترۆسێکسوال) هەڵدەبژێرێ.

### سێکس و ژیانی دەروونیی منداڵ

فرۆید بە شێوەیەکی تایبەتی بایەخێکی زۆری بە ژیانی سێکسیی منداڵ داوە، پێی وایە گرنگییەکی زۆری لە دروستبوونی کەسێتیی منداڵ و گەشەی دەروونیدا هەیە، ئەمەش ئاشکرا لەوەدا دەردەکەوێ کە قۆناغەکانی گەشەی سێکسیی منداڵی بە قۆناغەکانی گەشەی سێکسیی دەروونی داناوە، هەروەها پێی وایە ئەزموونەکانی منداڵی و خەیاڵە سێکسییەکانی قۆناغی منداڵی، هۆکاری زاڵن لە ڕوودانی ململانێ دەروونییەکان و ئەو

چەپاندنانەی کە ڕوو دەدەن و ئەو پشێوییانەی دواتر لە ژیانی دەروونیی تاکدا دەبینرێن. فرۆید بە شێوەیەکی تایبەتی سەرنجی لەسەر ئەو مەیلە شەهوانییانە چڕ کردووەتەوە کە منداڵ لە قۆناغێک لە قۆناغەکانی ژیانیدا بەرامبەر بە یەکێ لە باوان هەیەتی، منداڵی کوڕ بەرامبەر بە دایکی و منداڵی کچ بەرامبەر بە باوکی. فرۆید حاڵەتی یەکەمی ناو ناوە گرێی ئۆدیپۆس و دووەمی ناو ناوە گرێی ئەلکترا.

### گرێی ئۆدیپۆس Oedipal Complex

منداڵ لە سەرەتای قۆناغی منداڵیدا هەست بە بوونی شوێنێکی دیاریکراو دەکات کە خزمەتی ورووژانی سێکسی دەکات و ئەمەش لە مەمکی دایکییەوە دەست پێ دەکات کە شیری پێ دەدا.

لەگەڵ بەدوایەکداهاتنی شوێنەکانی دیکەی ورووژان کە ئاماژەمان پێ دان و بریتین لە دەم و کۆم و چووک، بەڵام منداڵ بەر لە چوونی بۆ قۆناغی خامۆشبوون، کاتێ کە هاوبەشی سێکسی بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ، جارێکی دیکە دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەو بابەتەی پەیوەستە بە چێژی زارەکییەوە.

بەپێی ڕای فرۆید، ئەو بابەتە لەم قۆناغەدا "دایکە، ئەگەر مەمکەکانیشی نەبن". فرۆید دەڵێ: "...دایک ناو دەنێین بابەتی خۆشەویستیی یەکەم.... لە ماوەی ئەو کاتەدا کە دایک دەبێتە بابەتی یەکەمی خۆشەویستی، پرۆسەی ئەقڵی بۆ کرداری چەپاندن دەست پێ دەکات، کە ئەم پرۆسەیە ئاشنابوون بە هەندێک بەشی ئامانجە سێکسییەکان لە منداڵ دەستەنێتەوە، یان کێش دەکات. کاتێک منداڵ دایک وەک بابەتی یەکەمی خۆشەویستی هەڵدەبژێرێ، فرۆید هەموو شتێ بە گرێی ئۆدیپەوە و زاراوەی گرێی ئۆدیپ-یشی بۆ وەسفکردنی پەیوەندیی نێوان کوڕ و دایک بەکار هێنا و بەم شێوەیە ئەم گرێیە لێک دەداتەوە: "گرێی ئۆدیپ

به ناوەکەیدا دیارە، هەمووتان ئەفسانەی گریکی ئۆدیپۆس پادشاتان بیستووە کە لە چارەی نووسراوە باوکی خۆی بکوژێ و دایکی بکات بە هاوسەری خۆی، کە باوکی هەر شتێک لە توانایدا بوو کردی تا لەم چارەنووسە دووربکەویتەوە کە کاهنێکی فاڵگرەوە پێشبینیی کردبوو، ئۆدیپۆس لە بەرامبەر تاوانی کوشتنی باوکی خۆی و هێنانی دایکیدا، هەردوو چاوی خۆی هەڵکۆڵی تا لە گوناە پاک بێتەوە. بڕوای تەواوم هەیە زۆربەتان کاریگەریی قووڵی ئەم دراما تراژیدییەتان تاقی کردووەتەوە کە سوفوکلیس لە چیرۆکێکدا داپڕشتووەتەوە... جوکاستا Jocasta شاژنی دایک کە دواتر دەبێتە ژنی کوڕەکەی خۆی، بەردەوام بەرهەڵستیی بەدیهاتنی پێشبینیی فاڵگرەوەکە دەکات، وەک لە دیالۆگی ناو چیرۆکەکەدا هاتووە، جوکاستا بەردەوام دەیوت کە زۆر کەس لە خەونیاندا دایکی خۆیان هێناوە و لە واقیعدا هیچ نەبووە و خەونەکان هیچ بەهایەکیان نییە... گومانی تیادا نییە ئەو خەونەی کە جوکاستا باسی دەکات، پەیوەندییەکی بەتینی بە چیرۆکی ترسناکی ناو ئەفسانەکەوە هەیە. فرۆید درێژە بە قسەکانی دەدات و دەڵێ: "سەیر لەوەدایە ئەم تراژیدیایەی سۆفۆکلیس باسی دەکات نابێتە هۆی تووڕەبوون و ناڕازیبوونی گوێگرانی، گوێگر بۆ بێهودەیی و فەرامۆشکاری جێدەهێڵێ، بەهۆی تراژیدیای ناو ئەفسانەکەوە گوێگر تووشی هیچ جۆرە هەڵچوونێک نابێ، بەڵکو مانا و ناوەڕۆکی شاراوەی ئەفسانەکە تووشی هەڵچوونی دەکەن، هەروەک بڵێی خوێنەر لەڕێی کرداری خۆییە دەروونشیکارییەوە گرێی ئۆدیپ لەناو خۆیدا ئاشکرا دەکات. لە ئەفسانەکەشدا ئۆدیپۆس ئارەزووی سێکسی کە بەرامبەر بە دایکی لە نەستدا هەیبوو، لەڕێی پێشبینیکردنی غەیب و ئیرادەی خواوەندەوە، شاردییەوە، هەروەک بڵێی ئۆدیپۆس ئەوەی هاتبێتەوە یاد کە لە منداڵیدا ئارەزوویەکی هەبووە بۆ لەناوبردنی باوکی و هێنانی

دایکی، هەروەها بیری کەوتووەتەوە کە پێویستە بەوپەڕی ڕەتکردنەوە و بێزهاتنەوەوە دەستبەرداری ئەم ئارەزووە ببێ... پێی وا بووە کە وشەکانی فاڵگرەوە پێشبینیکەرەکە ئەوە دەگەیەنێ گومڕاییە لە بەرپرسیاریێتی ڕابکەیت و گومڕاییە بڵێی زۆر هەوڵم داوە دژی ئەم چارەنووسە دزێوە بوەستم. تۆ هەر گوناهباری، چونکە نەتتوانیوە، ئەو ئارەزووە خامۆش بکەیت و بیکوژێنیتەوە کە تا ئێستا، لە نەستتدا ماوەتەوە."

فرۆید لە درێژەی باسکردنی گرێی ئۆدیب لە منداڵدا دەڵێ: "...ئاسانە بۆمان لەوە تێبگەین ئەم پیاوە بچووکە (مەبەست لە منداڵی کوڕە) بە تەواوی دایکی بۆ خۆی دەوێ، بەڵام دەبینێ باوکی ڕێگرە لە بەردەمیدا، بۆیە هەست بە دڵەڕاوکێ و پشێوی دەکات کاتێ باوکی گەمەبازی لەگەڵ دایکیدا دەکات، هەست بە دڵخۆشی دەکات کاتێ دەبینێ باوکی دووردەکەوێتەوە، یان ئامادەبوونی نابێ. هەندێجار کوڕ لەڕێی وشەوە ئەمە دەردەبڕێ، بۆ نموونە کاتێ بەڵێن بە دایکی دەدات کە بیهێنێ، لەوانەیە ئەمە بە تەواوی لە ئەفسانەکەی ئۆدیپۆس نەچێ ئەگەر بەراوردێ لە نێوانیاندا بکەین، بەڵام ناوەڕۆکی هەردوو حاڵەتەکە هەر یەکێکە"، هەروەها فرۆید ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە منداڵی کوڕ "ئارەزوویەکی ئاشکرای بۆ دایکی هەیە، حەز دەکات شەو لەگەڵیدا بخەوێ، سوور دەبێ لەسەر ئەوەی لەو ژوورە بێ کە دایکی خۆی لێ دەگۆڕێ و خۆی ڕووت دەکاتەوە، تەنانەت هەندێجار ڕەفتاری نیمچە لاقەکردنیش بەرامبەر بە دایکی دەنوێنێ، هەروەها ئەم هۆگربوونەی بە دایکییەوە سیفەتی شەهوانیی لەخۆ گرتووە."

### گرێی ئەلکترا Electra Complex

ئەو حاڵەتی دڵەڕاوکێیەی منداڵی کوڕ بەرامبەر بە دایکی لە گرێی ئۆدیبدا هەیە، فرۆید وا گریمانە دەکات هاوشێوەکەی لە مەیلی منداڵی کچدا بەرامبەر بە باوکی هەبێ، ئەمەش دەردەکەوێ لە "خۆشەویستی و دڵسۆزیی منداڵی کچ بۆ باوکی و حەزکردنی بە دوورکەوتنەوەی دایک و جێگەگرتنەوەی"، هەروەها لە نازکردن و نواندنی هونەر و ڕەفتار مێینەییەکاندا دەردەکەوێ. فرۆید ناوی ئەلکترای بۆ وەسفکردنی ئەم حاڵەتە هەڵبژارد و ناوەکەی لە ئەفسانەیەکی گریکییەوە وەرگرت کە باس لە چیرۆکی ئەلکترای کچی ئاجاممنون دەکات، کە هانی ئۆریستیس-ی برای دابۆکوشتنی دایکی و هاوسەرەکەی ئێستای کە پێشتر دۆستی بووە، تا تۆڵەی کوشتنی باوکی لە دایکی بکاتەوە.

لە کاتی ئێستادا ئەم زاراوەیە هێندە بەکار ناهێنرێ، وا بە باشتر دەزانرێ زاراوەی ئۆدیپۆس بەکار بهێنرێ کە هەردوو حاڵەتەکە دەگرێتەوە، واتە حاڵەتی هۆگربوونی منداڵی کوڕ لەگەڵ دایکیدا و منداڵی کچیش لەگەڵ باوکیدا.

### بایەخی دەروونیی گرێی ئۆدیپۆس

فرۆید وای گریمانە کردووە، ماوەی زەمەنی بۆ دروستبوونی گرێی ئۆدیپۆس لە هەریەک لە منداڵی کچ و منداڵی کوڕدا، تەمەنی سێ ساڵییە، لە منداڵی کوڕدا ئەم ماوەیە هاوکاتە لەگەڵ قۆناغی چووکیدا لە گەشەی سێکسی دەروونی منداڵدا، کە لە تەمەنی سێ ساڵی بۆ شەش یان حەوت ساڵی بەردەوام دەبێ. لەم ماوەیەدا و بە دروستبوونی گرێی ئۆدیب، منداڵی کوڕ کە حەزی سێکسی بەرامبەر بە دایکی هەیە و دەیەوێ پەلاماری باوکی بدات، دەترسێ لەوەی باوکی سزای بدات و بیخەسێنێ، ئەم ترسە لە خەسان دەبێتە هۆی دروستکردنی گرێی خەسان لە منداڵدا،

هەرچی کچە لەم قۆناغەدا - بەپێی لێکدانەوەی دەروونشیکاریی فرۆیدی – هەست بە گرێی ئیرەیی دەکات، ئەویش بەهۆی ئەو جیاوازییە ئەندامییانەی کە لە نێوان خۆی و منداڵی کوڕدا هەستی پێ دەکات، هەر ئەمەشە پاڵی پێوە دەنێ لاسایی کوڕ بکاتەوە و هەوڵ بدات وەک کوڕ دەربکەوێ.

فرۆید و شوێنکەوتووانی، لەو باوەڕەدان قۆناغی ئۆدیبی گرنگترین قۆناغە لە قۆناغەکانی گەشەی کەسێتی، چونکە لەم قۆناغەدا منداڵ دەست دەکات بە بایەخدانی سێکسی بە توخمەکەی دیکە، ئەمەش جۆرێ لە هەستی داگیرکاری و کێبڕکێکاری و دوژمنایەتیی تیادا دروست دەکات، بەڵام لە دەرئەنجامی ئەم هەستانەی خۆی سڵ دەکاتەوە، هەست دەکات بۆ ڕزگاربوون لەو ئازارەی بەهۆی ئەم ئارەزووە سێکسییانەوە هەیەتی، پێویستە ئەو هەست و ئارەزووانەی بچەپێنێ. کاتێک منداڵ دەرک بەوە دەکات ئەو بیرۆکە و خەیاڵ و ئارەزووانەی هەیەتی، تابۆ یان قەدەغەن، ئاڕاستەیەکی نوێ باڵ بەسەر دەروونیدا دەکێشێ، هەستێکی دوانی بەرامبەر بە باوکی دروست دەبێ کە باوکی سەر بە هەمان توخمەکەی خۆیەتی، هەروەها هەستی خۆشەویستی و ڕق لە یەک کاتدا دروست دەبێ، ئەم دژبەیەکییە لە هەستدا دەبێتە هۆی دروستبوونی حاڵەتێک لە دڵەڕاوکێ و هەستکردن بە گوناه و ترس لە سزا. ئەم ترسە (واتە ترس لە خەسان) دەگاتە ئەو ئاستەی پاڵ بە منداڵەوە دەنێ بۆ ملکەچبوون بۆ کێبڕکێکارە بەهێزەکەی (واتە باوک)، هەروەها دەستبەرداربوونی هەموو مەیلە سێکسییەکانی کە بەرامبەر بە دایکی هەیەتی کە لە توخمەکەی دیکەیە، بەم شێوەیە هەستە سێکسییەکان دەچەپێنرێن، واتە ئەو ئارەزووە سێکسییانەی کە بەرامبەر دایک هەیە لە توخمەکەی دیکە و حەزی دەستدرێژیکردنە سەر باوک کە لە هەمان توخمەکەی خۆیەتی.

به شێوەیەکی ئەندەکی قەرەبووی ئەم گرێیە دەکرێتەوە، ئەویش لەو ڕێگەیەوە کە منداڵی کوڕ هەوڵ دەدات لە باوکی بچێت و منداڵی کچ هەوڵ دەدات لە دایکی بچێ، ئەم سیفەتانەی منداڵ کە لە ئەنجامی چاولێکردنی باوانەوە دروست دەبن، بەشێک لە دەروونی منداڵ دروست دەکەن و وەک منی باڵا Super ego وان بۆ منداڵ کە لە ئەنجامی هەستکردنی منداڵ بە نموونە باڵا و مۆراڵەکان لە باواندا لای منداڵ دروست دەبن، ئەمەش دەبێتە سەرەتا بۆ دروستبوونی ویژدان و بەهاکان لە تاکدا، لەڕێی هەوڵدانی منداڵ بۆ ئەوەی لە یەکێک لە باوانی بچێ گرێی ئۆدیب شی دەبێتەوە، لەبەر ئەوە ئەم لێکچوواندنە لەگەڵ باواندا دەبێتە چارەسەرێکی شیاو و ئاسان، بۆ ئەم گرێیە، هەرچەندە لە واقیعدا، ئەمە چارەسەرێکی سەرەتاییە، چونکە منداڵی کوڕ یان کچ کە خۆی بە یەکێک لە باوان دەشوبهێنێ، کەسێتیی ئەو باوانە وەردەگرێ، ئەم لاساییکردنەوەیەش لە کەسێتیدا ئەو هەستە بە منداڵ دەبەخشێ کە ئارەزووەکەی هاتووەتە دی لەڕێی میکانیزمی پێکەوەنووسان* لەگەڵ ئەو باوانەدا کە ئارەزووی دەکات، هەروەک بڵێی بەم کارەی فێڵ لە واقیع دەکات و خۆی هەڵدەخەڵەتێنێ و خۆیشی بەم هەڵخەڵەتاندنە ڕازییە، ڕازییە بەوەی ئەگەر لە واقیعدا خاوەنی ویژدان و بەهاکانی باوانی نەبێ، هیچ نەبێ وا خۆی بنوێنێ کە خاوەنیانە.

فرۆید گریمانە دەکات پرۆسەی دروستبوونی گرێی ئۆدیبی لە گەشەی هەموو منداڵێکی کوڕ و کچدا هەیە، بەڵکو پێویستیشە هەبێ و خزمەتی چەندەها مەبەستی گرنگ دەکات، بۆ نموونە هەڵبژاردنی هاوبەشی ژیان لە توخمەکەی دیکە، هەروەها چەپاندنی حەزە تابۆکان، وەک پەیوەندییە سێکسییە ڕێگە پێ نەدراوەکان و دروستبوونی ویژدان و بەهاکان و لێکچوواندن لەگەڵ باوان لە هەمان توخم و وەرگرتنی سیفەتەکانی.

ئەوەی لە زۆربەی منداڵدا ڕوو دەدات، ئەم گرێیە بە هەموو ململانێ و کۆژانەکانییەوە بە شێوەیەکی گونجاو و ڕازیکەر شی دەبێتەوە، بەشێکی ئەو شیبوونەوەیە لەڕێی چەپاندنەوە ڕوو دەدات، بەشێکی دیکەی لەڕێی گواستنەوەی سۆزەوە بۆ کەسێکی دیکە غەیری باوک، بەشێکیشی لە دروستبوونی منی باڵادا، شی دەبێتەوە، بەڵام دەشێ ئەم گرێیە بە شێوەیەکی گونجاو و وەک پێویست شی نەبێتەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی ڕوودانی پشێوی لە منداڵدا، یان هۆکارێ دەبێت بۆ ڕوودانی پشێویی هاوشێوە لە گەورەییدا. لەوانەیە گرنگترین هۆکار لە بەردەم گەیشتن بە چارەسەری سروشتیی گرێی ئۆدیبۆس ئەمانە بن:

١-گەیشتنی منداڵ بە قۆناغی ئۆدیبی لە کاتێکدا هێشتا هەڵگری ململانێکانی قۆناغە سێکسییەکانی پێشووتری گەشەیە (واتە قۆناغی زارەکی، کۆمی و چووکی)، چونکە ئەمە وا دەکات ئەو منداڵە وزەی دەروونیی پێویستی پێ نەبێ تا لەم قۆناغەدا بەکاری بێنێ.

٢-ئامادەنەبوونی یەکێک لە باوان لەم قۆناغەدا، بێ ئەوەی ئەڵتەرناتیڤیشی هەبێ (بەهۆی مردن، ئامادەنەبوون یان جیابوونەوە).

٣-هەندێجار ڕەفتار و هەڵسوکەوتی باوان هانی منداڵ دەدەن بۆ بەردەوامبوون لە مانەوە لە گرێی ئۆدیبدا، ئیدی هۆکاری ئەوە بەهۆی ڕەفتاری یەکێک لە باوانەوە بێ، یان بەهۆی کەسێتییانەوە بێ، ئەمەش منداڵ بێبەش دەکات لە خۆچوواندن بە باوکی (لە منداڵی کوڕدا) و خۆچوواندن بە دایک (لە منداڵی کچدا)، ئەمانە دەبنە ڕێگر لە بەردەم دروستبوونی منی باڵا بە شێوەیەکی سەقامگیر و سەربەخۆ. فرۆید ئەوەشی ڕوون کردووەتەوە کە چی ڕوو دەدات کاتێ گەیشتن ڕەوینەوەی سروشتی گرێی ئۆدیبۆس لە منداڵدا شکست دەهێنێ، فرۆید دەڵێ ئەو منداڵە دەشێ

لە گەورەییدا تووشی لادانی سێکسی و پەککەوتنی سێکسی و سێکسساردی و نەخۆشییە دەروونییەکان ببن، هەروەها پێی وایە ڕەگوڕیشەی زۆربەی ئەم حاڵەتانە دەکەوێتە ئەم قۆناغەی گەشەوە. دواجار فرۆید وای دەبینێ گرێی ئۆدیب تەنانەت لەدوای شیبوونەوەشی بە سەرکەوتوویی لە کۆتایی قۆناغی ئۆدیبدا، جارێکی دیکە لە قۆناغی نەرزەبووندا، چالاک دەبێتەوە، بە لایەنی کەمەوە بە سەرپێی، لەوە دەچێ ئەم چالاکبوونەوەیە ئامانجی بەهێزکردنی هەستکردن بێت بە پێویستیی دوورکەوتنەوە لە تابۆی حەز و ئارەزووە سێکسییەکان، هەروەها مەیلی هەرزەکار بۆ خۆچوواندن بە خەسڵەتەکانی باوان لە هەمان توخمەکەی خۆی، بەهێز دەکات.

**نەیارانی تیۆرەکانی فرۆید**

فرۆید بەرپرسیاریتی و قورسایی و ئازاری زۆری خستە ئەستۆی خۆی کاتێ بانگەشەی ئەوەی کرد کە ژیانی سێکسیی لە قۆناغی منداڵیدا ئاشکرا کردووە. هەرچەندە ئەم بانگەشەکردنە بووە مایەی تووڕەبوون و ناڕەزایی و ڕەتکردنەوە لە لایەن ئەو کەسانەوە کە پێش فرۆید بڕوایان بە بوونی ژیانی سێکسی لە منداڵیدا هەبوو، بەڵام ناوی فرۆید بە پەیوەستکراوی لەگەڵ ئەم بیرۆکە تایبەتییەدا مایەوە، لەدوای ئەوەی فرۆید تیۆرە سەرنجڕاکێشەرەکەی سەبارەت بە گرێی ئۆدیبۆس لە منداڵدا دانا و باسی لە بایەخی ئەم گرێیە کرد لە دروستبوونی نەخۆشییە دەروونییەکان، فرۆید خۆیشی زۆر پێداگریی لەم گرنگییە کرد. ڕایە بوێرەکانی فرۆید بوونە هۆی دەرکەوتنی شەپۆلێکی توندی ڕەخنەگرتن و هەندێجار بریندارکەریش، هەروەها بوونە هۆی جیابوونەوەی ژمارەیەک لە هەرە بەناوبانگترین مورید و شوێنکەوتووانی بزووتنەوەی دەروونشیکاری، بەناوبانگترین

ڕەخنەکانی بەرەو ڕووی بوونەوە ئەوەبوو کە نەیدەتوانییوونی گرێی ئۆدیب بسەلمێنێ، هەروەها دەربارەی سووربوونی ڕەهای لەسەر ئەوەی چەپاندنی ئەزموونی سێکسیی قۆناغی منداڵی دەبێتە بناغەی گشتی بۆ تووشبوون بە نەخۆشییە دەروونییەکان، ڕەخنەی توندی لێ گیرا.

ڕەخنەکان دەربارەی ژیانی سێکسی لە منداڵدا بەگشتی و ڕەتکردنەوەی بوونی ئەم ژیانە، پاشەکشەیان کرد. فرۆید بە توندی و بە گەرمی بەرگریی لە تیۆرەکانی خۆی دەکرد و بە درێژایی ژیانی بە ناوەڕۆکەکانییەوە پابەند بوو، بەردەوام بوو لەسەر هەوڵەکانی بۆ سەلماندنی بوونی گرێی ئۆدیب لەڕێی ئەو ئەفسانانەوە کە پەیوەندیی سێکسیی تابۆ ڕەت دەکەنەوە وەک پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ دایکدا، هەروەها لەڕێی چاودێریکردنی ڕاستەخۆی ڕەفتاری منداڵانەوە و وردبوونەوە لە یادەوەرییەکانی منداڵی و ناوەڕۆکی خەونەکان، بەڵام فرۆید بۆ ئاشکراکردنی گرێی ئۆدیب لە ئەزموونی منداڵیدا، وەک هۆکارێکی متمانەپێکراو، پشتی بە دەروونشیکاری بەست. فرۆید بانگەشەی ئەوەی کرد کە لە ئەنجامی شیکارکردنی دەروونی خۆیەوە، گەیشتووە بەم دۆزینەوەیە، لەم بارەیەوە دەڵێ: "خۆشەویستی دایک و غیرە لە باوک، لە خۆیشمدا بینییەوە، لەبەر ئەوە ئێستاکە لەو بڕوایەدام ئەمە دیاردەیەکی گشتییە لە قۆناغێکی زووی منداڵیدا... ئەگەر مەسەلەکە بەم شێوەیە بێت، ئەوا هێزی ئاڕاستەکراو بۆ پادشا ئۆدیبۆس ئاشکرایە... ئەفسانە یۆنانییەکە بایەخ لەسەر پاڵنەرێکی ناچاری چڕ دەکاتەوە کە هەموو مرۆڤێ پێی ئاشنایە، چونکە هەست دەکات بەشێک لە شوێنەواری ئەو هەستە لە دەروونیدا بەجێماوە. هەر یەکێک لە ئێمە، لە ڕابردوودا ئەزموونی ئۆدیب لە خەیاڵیدا هەبووە، هەوڵدان بۆ ڕازیکردنی ئەم خەیاڵەلە واقیعدا دەبێتە هۆی چوونەوەیەک و بچووکبوونەوەی ئەو ترسەی لە

هەریەکێکماندا لە منداڵیدا بوونی هەبووە، ئەوەی دۆخی ئێستامان لە گەورەییدا لە قۆناغی منداڵیمان جیا دەکاتەوە، ئەو چەپاندنەیە کە لە منداڵیدا بە ناچاری ڕووی داوە". فرۆید بە پشتبەستن بەو شتانەی لەڕێی شێوازی دەروونشیکارییەوە ئاشکرای کردبوون، بۆ نموونە ئاشکراکردنی گرێی ئۆدیب لە نەخۆشەکانیدا، دەڵێ: "هەریەکێ لەم نەخۆشانەی ئێستا کە تووشی نەخۆشیی دەروونی بوون، لە ڕابردوودا یەکێک بوون وەک ئۆدیپۆس-ی ئەفسانەکە، هەمان شت لە هاملێت-ی شەکسپیردا دەبینینەوە کە هەڵچوونەکانی بەهێزی بوونی ئەم گرێیەوە بوون. ئەو واقیعەی کە لێی دڵنیام، وێنەی شیکاریی ئۆدیپۆس، هەمان وێنەی تەواوکراوی هێڵکاریی قۆناغی منداڵییە، کە بریتییە لە: ڕق بەرامبەر بە باوک و ئارەزووکردنی مردنی. ئەم ئاماژانە چی دیکە تەمومژاوی نامێننەوە، چونکە پەیوەندیی کوڕ لەگەڵ دایکدا، خۆی ئاشکرا دەکات کە ئامانجی بوون بە خاوەنبوونی دایکە بەو وەسفەی کە ژنە."

یەکێک لە گرنگترین ڕەخنەکانی کە ڕووبەڕووی فرۆید بوونەوە، ڕەخنەکانی هاوڕێ و یەکەمین هاوپشتی بوو، واتە یۆنگ، چونکە یۆنگ ئەوەی ئاشکرا کرد کە بڕوای بە تیۆرەکانی فرۆید دەربارەی وزەی سێکسی نییە بە ژیانی سێکسی قۆناغی منداڵییشەوە، هەروەها گریمانەکردنی قۆناغی خامۆشبوونیشی ڕەت کردەوە، ئاشکرای کرد کە بڕوای بە جەختلێکردنەوەی فرۆید نییە لەسەر ئەوەی کە ئەزموونەکانی منداڵی هۆکارن بۆ تووشبوون بە نەخۆشییە دەروونییەکان. لەم بارەیەوە یۆنگ دەڵێ: "دەستکەوتنی چێژ، بە هیچ شێوەیەک یەکسانبوون لەگەڵ سێکسدا ناگەیەنێ". لە شوێنێکی دیکەشدا وتوویەتی: "ڕای فرۆید دەربارەی ژیانی سێکسی لە منداڵدا ناکرێ لە ڕووی بایۆلۆژییەوە قبوڵ بکرێ". سەبارەت بە ڕەخنەگرتنیشی لە قۆناغی خامۆشبوون دەڵێ:

"ئەم کردارەی گەشە، کردارێکی بایۆلۆژیی دەکمەنە، ئەگەر ئەم ڕایەی فرۆید سەبارەت بە قۆناغی خامۆشبوون، ڕاست بێ، ئەوا کاتێک گوڵ لە گۆپکەیەکەوە دەردەچێ تا بکرێتەوە و ببێ بە گوڵ، پێویستە گوڵەکە لەناو گۆپکەکەدا جارێکی دیکە ون بێتەوە، بۆ ئەوەی دوایی هاوشێوەی گوڵە ئەسلییەکە بکرێتەوە". پاشان دەڵێ: "تیۆرەکەی فرۆید دەربارەی قۆناغی یان وچانی خامۆشبوون لە قۆناغەکانی گەشەی دەروونیی سێکسی منداڵدا، گریمانەیەکی نەشیاوە". لەجیاتی ئەمە یۆنگ ڕایەکی دژ بەم ڕایەی فرۆیدی هەبوو، پێی وا بوو، سەرەتای ژیانی سێکسیی منداڵ بە تەواوەتی لەگەڵ سەرەتای وچانی خامۆشبووندا کە فرۆید گریمانەی کردووە (نزیکەی شەش یان حەوتساڵان)، دەگونجێ. یۆنگیش وەک ئادلەر و جانێت دژی ئەو ڕایە بوو کە پێی وایە ئەزموونە سێکسییەکان ڕۆڵیان لە دەرکەوتنی نەخۆشییە دەروونییەکاندا هەیە. یۆنگ پێی وا بوو ململانێ دەروونییە هەنووکەییەکان دەبنە هۆی نەخۆشییە دەروونییەکان، ململانێیکانی قۆناغی منداڵی دەبنە هۆی ڕوودانی نیورۆسس.(**) هەرچی ئەو حاڵەتانەشن کە یەکێک لە ڕەگەزەکانی ژیانی سێکسیی منداڵ هۆکارە لە دەرکەوتنی نەخۆشیی دەروونیدا، ئەمەی بۆ ئەوە گەڕاندەوە کە تاک لە قۆناغێکی دواتری تەمەنیدا، واتە لە گەورەییدا دەشێ بۆ ئەزموونەکانی منداڵی بگەڕێتەوە. بەپێی ڕای یۆنگ ئەوەی بە ئەزموونەکانی منداڵی ناودەبرێ، بریتییە لە ئامادەباشییەکی خۆڕسک کە هەر لە ساتی لەدایکبوونەوە و لە هەردوو تۆخمەکەدا هەیە، یان ئەوەی یۆنگ ناوی لێ ناوە (ستێرۆتایپی یەکەم Archetype کە بریتییە لەو ئامادەباشییەی بەرئەنجامی کۆنەست، بە مرۆڤ دەبەخشێ، ئەو کۆنەستەی کە دەشێ لە گەورەییدا لەڕێی گەڕانەوەی دەروونییەوە بۆ ئەزموونەکانی منداڵی، چالاک بێتەوە، هەروەها ئەم گەڕانەوەیە ڕۆڵێکی گەورە

دەگێڕێ لە ڕوودانی پشێوییە ئەقڵییەکاندا، بە ڕای یۆنگ بێتوانایی تاک لە نواندنی ناوەڕۆکی کۆنەست، ئەوەیە دەبێتە هۆی تووشبوون بە نەخۆشیی دەروونی. بەم شێوەیە ڕایەکانی فرۆید دەربارەی ژیانی سێکسی لە منداڵدا و وچانی خامۆشبوون و گرێی ئۆدیب، بوونە هۆی سەرهەڵدانی شەپۆلێک لە ناڕەزایی کە پشتیوانەکانی پێشووی فرۆیدیش بەشداربوون تیایدا، وەک یۆنگ و فلایس و ئادلەر و هول و ستیکل، هەموویان فرۆیدیان بەوە تۆمەتبار کرد کە ڕایەکانی لەگەڵ واقیعی بایۆلۆژیدا دژ دەوەستێتەوە، هەروەها پشت بەو لێکدانەوە سایکۆلۆژییانە دەبەستێ کە سەلماندنیان ئەستەمە. بەم شێوەیە فرۆید خۆی بینییەوە بۆشاییەکی زانستیی گەورە لە نێوان ئەو و هاوکار و پشتیوانەکانیدا هەیە و بە تەواوی لێیان جیابووەتەوە، بەڵام ئەمە کاری نەکردە سەر کار و پلانەکانی فرۆید بۆ پارێزگاریکردن لە تیۆرە دەروونییەکانی، دەستی کرد بە سزادانی هەریەکێک لەو پشتیوانانەی کە بڕوای تەواوی بە کارەکانیان نەبوو. بە دەنگی بەرز وتی: "دۆزینەوەکانم بناغەی فەلسەفەیەکن لەوپەڕی مەترسیدا، ژمارەیەکی زۆر کەم هەن لەمە تێدەگەن، ژمارەکی زۆر کەم هەن توانای تێگەیشتنی ئەمەیان هەیە."

فرۆید هەوڵی دا لەسەر بناغەیەکی بایۆلۆژی لێکدانەوە بۆ ئەزموونەکانی ژیانی سێکسی لە منداڵدا و گرێی ئۆدیب و نەخۆشییە دەروونییەکان بکات. لەم بارەیەوە دەڵێ: "بە شێوەیەکی گشتی هەوڵ دەدەم سایکۆلۆژی لە هەموو ئەو شتانە دووربخەمەوە کە بە سروشتی ناکۆکە لەگەڵیدا، تەنانەت هێڵە بایۆلۆژییەکانی بیرکردنەوەش". لەگەڵ ئەوەشدا فرۆید هاوکات هەوڵی ئەوەی دا کە تیۆرە سایکۆلۆژییەکانی بناغەیەکی بایۆلۆژی بەدەست بێنن، بەڵام لە ترسی ئەوەی نەوەک دۆزینەوەکانی،

بەتایبەت تیۆرەکانی شیکاری، لەناو لێشاوی بیرکردنەوەی بایۆلۆژیدا ون ببن، بۆی دەرکەوت پێویستە بە شێوەیەکی دوورتر لە بیرکردنەوەی بایۆلۆژی ورد بێتەوە، بە پلەیەکی زیاتر لەوەی کە خۆی بڕوای پێ بوو، هەروەها شوێنکەوتووان و پشتیوانانی خۆی هان دەدا، تەنانەت ناچاریشی دەکردن کە وێنای ئەو بناغە بایۆلۆژییە بکەن. زۆرێک لەم هاوکار و پشتیوانانەی فرۆید بە پەرۆشییەکەوە پشتوانییان لە فرۆید دەکرد کە زۆر زیاتر بوو لە قەناعەتی فرۆید خۆی بە بنەما دەروونییەکانی تیۆرەکانی، بەڵام زۆرێک لە فرۆیدە نوێیەکان و خوێنەرەکانی لەدوای مردنی، بە شێوەیەک لێکدانەوەیان بۆ تیۆرەکانی کرد کە لەگەڵ گریمانە بایۆلۆژییەکاندا بگونجێ، ئەمەش ئەوە بوو کە فرۆید خۆی هانی ئەم جۆرە لێکدانەوەیەی نەدەدا، بەڵام شوێنکەوتووانی دەرکیان بەم حەزەی فرۆید نەکرد لەو کاتەدا. فرۆید دەربارەی چارەنووسی تیۆرەکانی لەدوای مردنی خۆی، پرسیار دەکات و دەڵێ: "لەدوای مردنم چی لە تیۆرەکانم دەکەن؟... ئایا پارێزگاری لە بیرۆکە سەرەکییەکانی خۆم دەربارەیان، دەکەن؟".

ئێستا و لەدوای تێپەڕینی نزیکەی نیو سەدە بەسەر مردنی فرۆیددا، کەسانێک هەن بڕوایان بە تیۆرەکانی هەیە بەو شێوەیەی کە خۆی دەیویست خەڵک لێیان تێبگات، کەسانێکی دیکەش هەن هەوڵ دەدەن لەڕێی پەیوەستکردنیان بە بناغەی بایۆلۆژییەوە لە تیۆرەکانی تێبگەن، کە فرۆید خۆی هەوڵی دوورخستنەوەی ئەم لێکدانەوانەی دەدا و هانی بیرکردنەوەی دەروونیی لە واقیعدا دەدا، کەسانێکی زۆریش هەن بە تێڕوانینێکی ڕەخنەگرانەی توندەوە لە ڕایەکانی فرۆید دەڕوانن، پێیان وایە کە هیچ شتێکیان تیادا نییە

بسەلمێنرێن، یان پشتیان بە بناغەی زانستی بەستبێ. لە بەرئەنجامی تەواوی ئەم ئاراستە دژ بەیەکانەدا، ئەوەتا ئێمە لەدوای تێپەڕبوونی سەردەمێکی دوورودرێژ بەسەر دەرکەوتنی فرۆید و تیۆرە بوێرەکانیدا، تا ئێستاش وەک ئەفسانە باسی فرۆید دەکەین و بە زمانی ئەو قسە دەکەین، وەک ئەوەی واقیعێکی ژیانی بەڵگەنەویست بێ.

## تێگەیشتنی ئێستامان بۆ ژیانی سێکسیی منداڵ

ئەستەمیی تێگەیشتن لە ژیانی سێکسی لە منداڵدا، لەوەوە دێ کە تێبینیکردنی ڕەفتاری سێکسی لە منداڵدا، کارێکی قورسە و ئاسان نییە ئەوە جیابکرێتەوە ڕەفتارەکانی منداڵ کامیان مۆرکێکی سێکسییان هەیە و کامیان مۆرکێکی نیمچەسێکسییان هەیە، قورسیی ئەم کارەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ناتوانین بزانین کاتێ منداڵ یاری بە ئەندامی سێکسیی خۆی دەکات، بیر لە چی دەکاتەوە یان هەست بە چی دەکات و ئەو بیرۆکە و خەیاڵ و هەستانە چین کە لەو کاتەدا لە مێشکیدان. لەو خاڵانەی کە یارمەتیمان نادەن بۆ تێگەیشتن لە ژیانی سێکسیی منداڵ، ئەستەمیی گەڕان و تاقیکردنەوەیە لە لایەنەکانی ئەم ژیانە، ئەویش لەبەر چەند هۆکارێک وەک ئەوەی ناتوانین وا لە منداڵ بکەین باسی هەستەکانی خۆی بکات لەم ئەزموونانەدا و هەروەها ناشتوانین ئەو تاقیکردنەوانە لەسەر منداڵ ئەنجام بدەین کە مۆرکێکی سێکسییان هەیە، ئەویش بەهۆی هۆکاری کۆمەڵایەتی و مۆراڵی و پەروەردەییەوە. لەبەر ئەوە زۆربەی زۆری ئەو شتانەی دەربارەی ژیانی سێکسی لە منداڵدا دەیزانین، لە هەقیقەتی بایۆلۆژیی گەشەی منداڵەوە وەرمان گرتوون، سەرباری تێبینیکردن و وردبوونەوە لە هەندێ لەو ڕەفتارە سێکسییانەی کە منداڵ لە قۆناغە جیاوازەکانی گەشەدا پراکتیزەیان دەکات.

## سەرەتای ژیانی سێکسی

توێژینەوە بایۆلۆژییەکان ئاماژە بەوە دەدەن ئەو کردارە فسیۆلۆژییانەی کە لە پشت ڕەفتارە سێکسییەکانی ئەندامە سێکسییەکانەوەن، تەنانەت بەر لە لەدایکبوون لەڕووی گەشەوە، تەواوبوون، واتە گەشەیان بەر لە لەدایکبوون کۆتایی پێ هاتووە. ئەوەی زانراوە و تێبینی کراوە هەندێجار منداڵی کوڕ لە کاتی لەدایکبوونیدا، چووکی ڕەپ بووە، منداڵی کچیش لەدوای ٤٠ سەعات دوای لەدایکبوون ناوچەی زێی تەڕ و لینج بووە، هەروەها لە منداڵی شیرەخۆرەدا تێبینی کراوە، کوڕ لە کاتی بەئاگاییدا واتە کاتێک کە نەخەوتووە، چووکی ڕەپ دەبێ، هەرچەندە ئەم دیاردەیە لەگەڵ بەرەوپێشچوونی گەشەدا وردەوردە کەم دەکات، هەروەها تێبینی کراوە منداڵی کوڕ لە کاتی خەویشدا، لە قۆناغی خەوی قووڵدا کاتێ دیاردەی جووڵەی خێرای چاو R.E.M ڕوو دەدات، چووکی ڕەپ دەبێ، دەشێ ئەم ڕەپبوونە لە کاتی خەودا لەهەر قۆناغێکی دیکەی خەوندا بێ ڕوو بدات، تەنیا ئەو کاتانە نەبێ کە خەونەکانی خەونی مێردەزمەیین، لە منداڵی کچیشدا لە هەمان قۆناغدا و لە کاتی ڕوودانی جووڵەی خێرای چاودا، ناوچەی زێ تەڕ و لینج بووە، هەروەها تێبینی ڕوخسارەکانی هەستکردنی منداڵ بە ورووژان دەکرێ لە کاتێکدا کە مەمکی دایکی دەخوات، تێبینیی دەکرێ کە تەنانەت لەدوای تێربوونیشی لە شیر خواردن، هەر هەوڵ دەدات گۆی مەمکی دایکی بمژێ و خۆی بە بەرۆکی دایکیدا هەڵبواسێ. ئەم دیاردانە ئاشکران و لە هەموو منداڵێکدا دووبارە دەبنەوە، هەروەها ورووژان لەڕێی بەرکەوتنەوە بە درێژایی ژیان بەردەوام دەبێ و وەک پراکتیزەکردنێکی سەرەتایی بۆ حەز و ئارەزووە سێکسییەکان تەماشا دەکرێ، بەڵام تا ئێستا بە تەواوی بەو ئاماژە فسیۆلۆژییانە ئاشنا نین کە لەپشت ئەم دیاردە خۆبەخۆیانەی منداڵانی بچووکەوەن (واتە

ڕەپبوونی چووک و تەڕبوونی ناوچەی زێ)، هەرچەندە ئاشکرایە دەستکەوتنی چێژ و گەیشتن بە ئۆرگازم لە گەورەییدا، لەم حاڵەتانەدا فرسەتی بەدیهاتنیان زیاترە. هەندێ لە زانایان وای لێک دەدەنەوە کەمیی هۆرمۆنی تستسترۆنی ئازاد Free Testosteroneپەیوەندیی بەم دیاردەیەوە هەیە. فەرمانی بایۆلۆژیی ئەم دیاردەیە وا دەکات ئەگەری بە ڕێکەوت گەیشتن بە ئۆرگازم، مەسەلەیەک بێ زیاتر ئەگەری ڕوودانی هەبێ.

لە قۆناغی دواتری گەشەدا، منداڵ زیاتر بەرامبەر خۆی هۆش پەیدا دەکات، ئەمەش هاوکات دەبێ لەگەڵ ئەزموونەکەی و ناوەڕۆکی خەیاڵەکانی، ئەمە و سەرباری گۆڕانکارییە هۆرمۆنییەکان کە خێرایی گەشەکردنی کاردانەوەکان بەرامبەر بە کارتێکەرە هەستییەکان کۆنترۆڵ دەکەن، تەواوی ئەم فاکتەرانە وا دەکەن گەشەی سێکسی لە منداڵدا گەشەیەک بێ کە لەسەر ئاڕاستەیەکی ڕێک ڕوو نەدات. بەگشتی منداڵ لە قۆناغە زووەکانی گەشەیدا و هەر لە سەرەتای لەدایکبوونییەوە، کاردانەوەی بۆ ڕوودانی هەر بەرکەوتنێکی خۆبەخۆیی یان لاوەکی یان ڕێکەوت، ئامادەن بۆ ئەوەی کاردانەوەی بەرامبەر بە کارتێکەرە هەستییەکان هەیە.

## بەئاگاهاتنەوە یان بێداربوونەوەی سێکسی

دیاریکردنی ئەو کاتەی کە تیایدا منداڵ لە ڕووی سێکسییەوە بێدار دەبێتەوە، کارێکی ئەستەمە، ئەم بێداربوونەوەیە واتە دەرککردنی هۆشیارانەی بە حەزی سێکسی و چۆنێتیی ورووژانی ئەو حەزە و ڕازیکردنی. ئەمە کاتێ ڕوو دەدات کە منداڵ بەرامبەر بە خۆی هۆشیار دەبێ، هەروەها بەرامبەر بە کاردانەوە دەروونییە هەستییەکانیشی هۆشیار دەبێ، واتە کاتێ ئیدی دەتوانێ خۆی هان بدات و چۆنێتیی ڕوودانی ئەزموونەکە خێرا بکات و حەزە شەهوانییەکانی ڕازی بکات.

به شێوەیەکی گشتی بێداربوونەوەی سێکسی لە منداڵدا بە دوو شێوە ڕوو دەدات، شێوەی یەکەم بریتییە لە بێداربوونەوەیەکی خۆیی، ئەمە کاتێ ڕوو دەدات کە منداڵ هۆشیاری بەرامبەر بە خۆی پەیدا دەکات و دەرک بەوە دەکات کە خۆی دەتوانێ لەڕێی دەستلێدانەوە خۆی بورووژێنێ و هەر کاتێکیش ویستی، ئەمە بکات. هەرچی شێوەی دووەمی بێداربوونەوەیە، ئەوا لەڕێی ورووژاندنی سێکسی دەرەکییەوە ڕوو دەدات، ئەم بێداربوونەوەیە مۆرکێکی کۆمەڵایەتیی سێکسیی هەیە، منداڵ لە ڕووی سێکسییەوە بەهۆی دەستلێدان و بەرکەوتن و بینین و بۆنکردن و تامکردنەوە، یان بەهۆی خەیاڵ و بیرکردنەوەوە، لەڕێی کەسانی دیکەوە غەیری خۆی دەورووژێت.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەستەمە ئەو ماوە زەمەنییە دیاری بکرێ کە ئەم گۆڕانکارییانەی بەهۆی بێداربوونەوەی سێکسییەوە تیادا ڕوو دەدەن، بەڵام هەندێ کەس شێوەی یەکەمی بێداربوونەوەی سێکسییان لەبیرە و پێیان وایە تەمەنیان ٣-٤ ساڵان بووە کاتێک توانیویانە خۆیان بە دەستی خۆیان بورووژێنن، هەندێ کەس ئەوەشیان لە یادە کە لەم تەمەنەدا دەستیان بۆ ئەندامی سێکسیی خۆیان بردووە و چێژیشیان لێ بینیوە، یان بە لایەنی کەمەوە پێیان خۆشبووە. کینزی لە لێکۆڵینەوەکانیدا دەربارەی ڕەفتاری سێکسی بۆی دەرکەوتووە منداڵان لە تەمەنی نێوان ٢-٥ساڵی سەرباری ئەوەی یاری بە ئەندامی سێکسیی خۆیان دەکەن و دایک و باوکیان لە ئامێز دەگرن و ماچیان دەکەن، منداڵی کوڕ کاتێ کچێکی جوان دەبینێ، چووکی ڕەپ دەبێ، هەروەها کینزی وەسفی حاڵەتی منداڵێکی کچ دەکات کە هەستی بە مێروولەکردنی جەستەی کردووە، کاتێ پشتەملی منداڵێکی کوڕی لە وێنەیەکی فۆتۆگرافیدا بینیوە، هەروەها زۆر کەس ئاماژە بە ڕوودانی خەونی سێکسی لە منداڵدا دەدەن، کە ئەزموونێکی دەگمەن نییە، ئەگەر

گشتی نەبێ. لە باری بەئاگاییشدا واتە کاتێک منداڵ نەخەوتووە، زۆرێک لەو کردارانە کە مۆرکێکی سێکسییان هەیە لای منداڵانی تەمەن بچووک، ڕوو دەدەن، هەندێ لەم کردارانە بە ڕێکەوت ڕوو دەدەن، هەندێکیان لە ئەنجامی لاساییکردنەوەوە، یان ئارەزووی زانینەوە و هەندێکیشیان بە ئامانجێکی دیاریکراو بۆ ڕازیکردنی حەزێک ڕوو دەدەن، هەروەها دیمەنێکی دەگمەن نییە، هەندێ لە منداڵان لە هەردوو توخمەکە دەبینین کە لە تەمەنێکی زۆر بچووکدان، بەڵام هەندێ جووڵە و ڕەفتار دەنوێنن، بۆ نموونە دەچنە سەر یەک، یان سواری یەک دەبن و دۆخی تەسلیمبوون لە سێکسدا دەنوێنن، بە تەواوەتی وەک ئەو دۆخ و جووڵە سێکسییانەی ژن و پیاو لە کاتی سێکسدا دەیکەن، زۆربەی ئەم جووڵە و ڕەفتارانە بە شێوەیەکی خۆبەخۆیی و بێ فێربوون، یان بینینی ئەو دیمەنانە، لە لایەن منداڵەوە پراکیتزە دەکرێن، تەنانەت بەر لەوەی منداڵ هۆشیاریی بەرامبەر ئەو کردار و ڕەفتارانەی خۆی پەیدا کردبێ. جووڵە و ڕەفتاری سێکسی لە قۆناغی منداڵیدا بەردەوام دەبێ، ئیدی بە مەبەست منداڵ بۆ ئەو کارانە بورووژێنرێ یان خۆبەخۆ، یان بە ڕێکەوت یان لەڕێی وروووژاندنی دەرەکییەوە ڕوو بدەن، هەروەها ئەو بارودۆخانەی کە منداڵ تیایدا دەژی، یارمەتیدەرن بۆ ڕوودانی ئەمانە، چونکە خۆراکپێدانی منداڵ و شۆردنی و چەورکردنی بە زەیت و لێدانی بۆدرە لە گیانی و لە باوەشکردنی و ختووکەدانی و هەروەها ڕێکەوتی بینینی کەسانی ڕووت یان دۆخی سێکسئامێز بە منداڵ، هەموو ئەمانە فرسەتن بۆ ئامادەکردنی منداڵ بۆ ئەو دۆخانەی کە توانای وروووژاندنی منداڵیان هەیە.

## ئۆرگازم لە منداڵدا

زۆربەی ئەو ڕەفتار و جووڵە سێکسییانەی کە منداڵ پراکتیزەیان دەکات، وەک کەسێکی پێگەیشتوو یان گەورە، منداڵ بە حاڵەتی ئۆرگازم ناگەیەنن. هەرچەندە ئەو ڕایانە هەن کە دەڵێن منداڵ بەڕاستی بە ئۆرگازم دەگات و ئەو هەستکردن بە چێژەی کە بەهۆی ئەم گەیشتنەوە ڕوو دەدات، هەمان هەستە لە منداڵی گەورەدا، هەروەها توندیی ئۆرگازم لە هەردوو حاڵەتەکەدا وەک یەکە، نەرزەبوون هیچ لە توندییەکەی ناگۆڕێ، ئەوەی لە قۆناغی نەرزەبووندا ڕوو دەدات، تەنیا کۆمەڵێک گۆڕانکاریی کتوپڕن، کە ماوەی نێوان ماستەربەیشن (دەستلێدان لە ئەندامی سێکسی بە مەبەستی چێژوەرگرتن) و گەیشتن بە ئۆرگازم کەم دەکەنەوە. بابەتی ئۆرگازم لە منداڵدا بابەتێکە مشتومڕی زۆری لەسەرە، چونکە ئەستەمە لەڕێی ڕوودانی تۆوهاویشتنەوە وەک ئەوەی لە گەورەییدا ڕوو دەدات، بسەلمێنرێ، بەڵام لێکۆڵینەوە ڕاپرسییەکان ئاماژە بەوە دەدەن لە هەر پێنج منداڵ، دوانیان لە هەردوو توخمەکە لەڕێی ماستەربەیشنەوە بە ئۆرگازم دەگەن.

## ماستەربەیشن لە منداڵدا

ماستەربەیشن Masturbation لە منداڵدا دیاردەیەکی باوە، لە قۆناغێکی زووی منداڵییەوە دەست پێ دەکات و لە ماوەی ئەم قۆناغەدا بەردەوام دەبێت و ڕێژەی ڕوودان و دووبارەبوونەوەی بەرەو زیادبوون دەچێ. کاتێ منداڵ تەمەنی کەمە و بچووکە و هۆشیاریی تەواوی بەرامبەر بە ویستی خۆی نییە، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا گەورەکان وەک دایک و باوک و بەخێوکاران حەز دەکەن ماستەربەیشنی منداڵ فەرامۆش بکەن و گوێ بەوە نەدەن منداڵ خۆبەخۆ یان بێمەبەست دەست بۆ ئەندامی سێکسیی خۆی بەرێ و یاریی پێ بکات، هەر ئەم فەرامۆشکردن و

پشتگوێخستنەشە وا دەکات لە ژیانی سێکسیی منداڵ تێنەگەین، یان بە تەواوی حاڵی نەبین.

لێکۆڵینەوەکان دەربارەی ماستەربەیشن لە منداڵدا ئاماژە بەوە دەدەن لە هەر پێنج منداڵ، دوانیان لە قۆناغی زووی منداڵیدا تا ئاستی گەیشتن بە ئۆرگازم ماستەربەیشن دەکەن، لە تەمەنی شەش یان حەوتساڵیدا ئەم ڕێژەیە بەرزتر دەبێتەوە، بەتایبەتی لە کوڕاندا. ئامارەکان دەڵێن نیوەی کوڕان لە یەکێک لە ساڵەکانی قۆناغی منداڵیدا و بەر لە چوونە ناو قۆناغی هەرزەکاری، ماستەربەیشن دەکەن، زۆربەیان لەڕێی لاساییکردنەوەی منداڵانی دیکەوە، ئەم کارە دەکەن. هەر بە گەیشتنیان بە قۆناغی نەرزەبوون و هەرزەکاری، ماستەربەیشن دەکەن، ئەو هەرزەکارانەش کە هەلی فێربوونیان لە کەسانی دیکەوە بۆ نەڕەخساوە، یان لە منداڵیدا هەر بە ڕێکەوتیش فێری ماستەربەیشن نەبوون، بە شێوەیەکی خۆبەخۆیی لەگەڵ یەکەمین کرداری تۆوهاویشتن لە نەرزەبووندا ماستەربەیشن دەکەن، بەڵام لە کچاندا تۆزێ جیاوازە، ژمارەی ئەو کچانەی کە لە قۆناغی منداڵی و هەرزەکاریدا ماستەربەیشن دەکەن، بە شێوەیەکی ئەستوونی لە نێوان تەمەنی شەش بۆ حەوت ساڵی تا تەمەنی بیست ساڵی ڕێژەیان زیاد دەکات، هەروەها لە کچاندا هیچ فاکتەرێکی دەروونی یان فسیۆلۆژیی دیاریکراو بۆ دەستپێکردن بە کرداری ماستەربەیشن، نییە. لە کاتێکدا دەشێ کوڕان لەژێر کاریگەریی کۆمەڵایەتی، وەک لاساییکردنەوە یان فێربوون، دەست بە کرداری ماستەربەیشن بکەن، بەڵام کچان بەزۆری دوور لە کارتێکەرە کۆمەڵایەتییەکان ئەم کارە دەکەن و زۆرجار بە ڕێکەوت فێری دەبن، هەروەها لەڕێی ماستەربەیشنەوە بە ئۆرگازم ناگەن، هەرچەندە توانای گەیشتنیان هەیە.

## بناغەی بایۆلۆژیی توخم لە منداڵدا

جێگەی گومان نییە، ژیانی سێکسی لە منداڵدا پشت بە بناغەی بایۆلۆژی دەبەستێ کە بڕیار لە سەرەتای دەرکەوتنی ڕوخسارەکانی ژیانی سێکسی و گەشەکردنی لە قۆناغە یەک بەدوا بەیەکەکاندا دەدات، لەگەڵ ئەوەشدا کە فاکتەری کۆمەڵایەتی و ژینگەیی کاریگەریی گەورەیان لەسەر ڕەوتی ژیانی سێکسی هەیە، بەڵام ئەم کاریگەرییە ڕوو نادات ئەگەر باکگراوندێک لە واقیعی بایۆلۆژی نەبێت تا کارلێکی لەگەڵدا بکات، بەم شێوەیە ئەزموونی سێکسی هەر لە سەرەتاکەیەوە لە قۆناغی منداڵی و هەرزەکاری تا دەشگاتە قۆناغی پێگەیشتن و گەورەبوون، ئەزموونێکە فاکتەری بایۆلۆژی و کۆمەڵایەتی پێکەوە تەواوی دەکەن و پێکەوە کار لێک دەکەن بۆ ڕوودانی.

مونی و ئابرهارت (١٩٧٢) ئەوەیان ئاشکرا کرد کە گەشەی سێکسی لە شێوەی چەند قۆناغێکی بەردەوام و بەدوایەکداهاتووی گەشەدا ڕوو دەدات، هەروەها ئەوەیان ڕوون کردەوە، قۆناغی یەکەمی ئەم گەشەیە ڕۆڵی پرۆگرامدانەر دەبینێ لە دروستبوونی کۆرپەلە و کرۆمۆسۆمەکانی X وYدا، ئەم پێکهاتەیەیە بڕیار دەدات ئایا ئەو ڕژێنانە کە لە سەرەتادا بۆ نێر و مێ جیابوونەتەوە، ئایا بە ئاراستەی دروستبوونی هێلکەدان یان گونەکاندا، دەڕۆن؟ کاتێک ئەم جیابوونەوەیە لە ڕژێنەکاندا ڕوو دەدات، هەریەک لە ڕژێنە تایبەتییەکان بە توخمێکی دیاریکراو، بەرنامەی گەشەی خۆیان دەگرنەبەر، ئەگەر ڕژێنەکە هێلکەدان بوو، ئەوا منداڵەکە مێ دەبێ، ئەگەر گون بوو، ئەوا نێر دەردەچێ، دەرئەنجامی ئەمەش هۆرمۆنی ئەندرۆجین کە پێکهاتەی جەستەیی کۆرپەلە نێر دەکات، دەڕژێ، بەبێ ئەمە بە هیچ شێوەیەک ئەو کۆرپەلەیەی مێ-یە، نابێ بە نێر. لێکۆڵینەوەکان ئاماژە بەوە دەدەن هۆرمۆنەکانی نێرینە کار دەکەنە سەر ناوکی

هایپۆسالامەس لە دەماخدا و دەبنە هۆی دەردانی هۆرمۆنەکانی سێکس (گۆنادۆترۆپین Gonadotropine لە کوێرە ڕژێنەکاندا. ئەگەر هۆرمۆنی ئەندرۆجین (هۆرمۆنی نێرینە) لە کاتی یەکلاییکەرەوە Critical- Periodsی گەشەدا ڕژا، ئەوا ئەم دەدرانە کار دەکاتە سەر دەماخ بەتایبەتی کۆئەندامی لمبیک Limbic System، کە بریتییە لەو کۆئەندامەی ڕەفتار و سۆز لە قۆناغی منداڵی و گەورەییدا ڕێک دەخات.

لە کاتی لەدایکبووندا کاتێک هۆرمۆنەکان کۆرپەلە تەسلیم بە کۆمەڵگە دەکەن، قۆناغی دووەمی کاروانەکە، واتە کاروانی دیاریکردنی توخمی منداڵ بەرەو بەدیهێنانی ناسنامەی توخمی دەست پێ دەکات. لەگەڵ ئەم تەسلیمکردنەشدا، هێشتا تا ماوەیەک لەدوای لەدایکبوونیش هۆرمۆنەکان هەر کار دەکەنە سەر کرداری دروستبوونی ئەم ناسنامە توخمییە.

لە ماوەی ئەم قۆناغە کۆمەڵایەتییەدا، باوان بە شێوەیەکی گونجاو یان شیاو لەگەڵ ناسنامەی توخمیدا، مامەڵە لەگەڵ منداڵەکانیاندا دەکەن. بە شێوەیەکی گشتی زۆربەی منداڵان لەم مامەڵە جیاوازەی باوانەوە بە ناسنامەی توخمی خۆیان ئاشنا دەبن، واتە ئەوە دەزانن ئایا کوڕن یان کچن؟ ئیدی منداڵ دەست بە لاساییکردنەوەی ئەو توخمە دەکات کە ئینتیمای هەیە بۆی، واتە کوڕ لاسایی باوک و کچ لاسایی دایکی دەکاتەوە. لە ڕوخسارەکانی ئەم قۆناغە، هەوڵدانی منداڵە، کچ یان کوڕ، بۆ تەواوکردنی ناسنامە توخمییەکەی خۆی Complementation لەڕێی سەما و یاری و گەمەبازی لەگەڵ توخمەکەی دیکەدا، واتە منداڵی کوڕ لەگەڵ دایکیدا و منداڵی کچ لەگەڵ باوکیدا، لە ماوەی ئەم قۆناغەدا، منداڵ دەست بە تێبینیکردنی ئەندامە سێکسییەکانی دەکات و لەگەڵ ئەندامی سێکسیی توخمەکەی خۆی و توخمە دژەکەی خۆی بەراوردی دەکات. ئەم تێبینیکردنە یارمەتیی منداڵ

دەدات دەرک بە ناسنامەی سێکسیی خۆی بکات و هۆشیاری پەیدا بکات بەرامبەر بە توخمەکەی خۆی، ئایا نێرە یان مێ. لەگەڵ سەرەتای پێنج ساڵیدا، منداڵ لەگەڵ منداڵانی دیکەدا دەست دەکات بە یاریکردن بە ئەندامی سێکسی و بە هاوبەشی لەگەڵ منداڵێکدا، یان بە کۆمەڵ پێکەوە جووڵە و یاریی سێکسی ئەنجام دەدەن، کە جووڵە و یاریی سواربوونی یەکدی و ماچکردن و تەنانەت هەوڵدان بۆ خستنە ناوەوەش لەخۆ دەگرێ.

### هۆمۆسێکسوالیتی لە منداڵدا

هۆمۆسێکسوالیتی لە منداڵدا واتە کرداری سێکسیی نێوان دوو کوڕ یان دوو کچ، دیاردەیەکە زۆر جیاوازە لە هۆمۆسێکسوالیتی لە تەمەنی گەورەییدا. هەرچەندە لە ڕووی بەجێهێنانی کردارە سێکسییەکەوە هەمان شتە، بەڵام قسەکردن دەربارەی دیاردەکە لە منداڵ و گەورەدا پێکەوە و لە یەک بواری توێژینەوەدا، کارێکی هەڵەیە، ئەمەش هەمان ئەو هەڵەیەیە کە لە زۆربەی کۆمەڵگە و شارستانییەکاندا ڕوو دەدات، کاتێ کە پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتی لە منداڵدا بە هەمان حوکمی مەعنەوی و مۆراڵی پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتی لە گەورەییدا حوکم دەدەن، منداڵان بە زۆری، بەتایبەتیش لە کۆمەڵگە دواکەوتووە کۆنەپارێزەکاندا کە بە شێوەیەکی ئاسایی لەم دیاردەیە ناڕوانن، ئەگەر بێزار نەکرێن و سزا نەدرێن، ئەوا بە درێژایی ژیانیان، ئەم نهێنییە نادرکێنن و تەنانەت لە فۆرمی ڕاپرسییەکانیشدا دەربارەی ژیانی سێکسییان لە سەردەمی منداڵیدا، باسی ناکەن.

یەکێک لەو لێکۆڵینەوانەی ئاماژە بە بوونی ئەم دیاردەیە دەدا لە منداڵانی کۆمەڵگەی ئەمەریکیدا لە سەردەمی دواکەوتن و خۆپارێزیی سێکسیدا، لێکۆڵینەوەکەی کینزی بوو لە شێوەی ڕاپرسیدا. کینزی لە ئەنجامی ڕاپرسییەکەدا بۆی دەرکەوت،

٥٠%ی ئەو کورانەی ڕاپرسییەکەیان وەڵام دابووەوە، ددانیان بەوەدا نابوو کە لە تەمەنی منداڵی و بەر لە نەرزەبوون هۆمۆسێکسوالیتیان پراکتیزە کردووە، واتە لەگەڵ کوڕانی دیکەدا سێکسییان کردووە، بەڵام ڕێژەی کچان کە ڕەفتاری سێکسییان لەگەڵ هاوتوخمەکانیاندا کردووە، زۆر کەمتر بوو لە کوڕان، بەڵام دەشێ ڕێژەی ڕاستەقینەی ئەم دیاردەیە لە هەردوو توخمەکەدا زیاتر بێ. لە هەندێ کۆمەڵگە و شارستانییەتەکانی دیکەدا دەشێ ڕێژەکە کەمتر یان زیاتر بێ، بەپێی ڕوانینی کۆمەڵگە و ڕوانگەی کۆمەڵایەتی و مۆراڵی بەرامبەر ئەم دیاردەیە، ڕێژەکە دەگۆڕێ. لە یەکێک لە شارستانییەتە کۆمەڵایەتییەکاندا بە ناوی ئێست بای East Bayکە شارستانییەتێکە لە کۆمەڵگەی میلانیزی، دڤینپۆرت Davenport-ی توێژەر لە لێکۆڵینەوەیەکیدا ساڵی ١٩٦٥ ئاماژەی بەوە داوە، ئەو منداڵە بچووکانەی لەم کۆمەڵگەیەدا لێکۆڵینەوەی لەسەر کردوون، وەک شتێکی ئاسایی ماستەربەیشن دەکەن، لە لایەن خێزانەوە ڕێگەیان پێ دەدرێ ئەو ڕەفتارە سێکسییە ئەنجام بدەن، هەروەها بۆی دەرکەوت کە ئەم کۆمەڵگەیە چاوەڕوانی ئەوە دەکات کە کوڕ لە ماوەی ژیانیدا و بەر لەوەی لەگەڵ توخمەکەی دیکەدا، واتە ژن سێکس بکات، ڕەفتاری هۆمۆسێکسوالیتی لەگەڵ توخمەکەی خۆیدا تاقی بکاتەوە.

بەڵام بێگومان ئەم زیادەڕۆییە لە ئیباحیەت کە لە کۆمەڵگەی میلانیزیدا تێبینی کراوە، دەشێ بەرامبەر دواکەوتن و حەرامکردن بێ لە هەندێ کۆمەڵگەی دیکەدا. ئەو ڕەفتارە سێکسییانەی لە کۆمەڵەگەی میلانیزیدا ڕێگەپێدراو و ئاساییین، لە هەندێ کۆمەڵگەی دیکەدا بە سزا وەڵامدەدرێنەوە. بە سروشتی حاڵ لە نێوان ئەم دوو ئاراستە دوورەدا لە یەکدییەوە، پراکتیزەکردنی پلەی جیاواز لە هۆمۆسێکسوالیتی لە منداڵدا هەیە. بەپێی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی و شارستانییەتەکان کە دەشێ ڕووەو کۆنەپارێزی

یان چاوپۆشین ئاراسته بگرن، تێبینیی گۆڕانی بەردەوام دەکرێ لە پلەی قبوڵکردنی ئەم پراکتیزانە و شاردنەوەیاندا، لەم سەردەمەی ئێستادا، ئاراستەی زاڵ و ئاشکرا بەرامبەر ئەم دیاردەیە لە منداڵدا، ئاراستەی چاوپۆشین و ڕێگەپێدانە.

به چاوپۆشین لە بڵاوبوونەوەی بەرفراوانی هۆمۆسێکسوالیتی لەنێو منداڵدا و لە تەمەنە جیاوازەکانی بەر لە نەرزەبوون، هەروەها بە چاوپۆشین لە ژینگە و شارستانییەتی کۆمەڵایەتیی منداڵ، بۆچوونێک هەیە، پێی وایە ئەم پراکتیزەکردنە سێکسییە لە قۆناغی منداڵیدا، ڕووداوێکی سروشتییە و هەندێ فاکتەری بایۆلۆژیی پێویست بڕیاری لەسەر دەدەن و دەشێ ئامانجەکەی ڕاهێنانی منداڵ بێ لەسەر کرداری سێکس لە گەورەییدا. ئەوانەی پشتیوانی لەم تێڕوانینە دەکەن، لەدوای لێکۆڵینەوە، بۆیان دەرکەوتووە، ئەو منداڵانەی بەم ئەزموونەدا نەڕۆیشتوون، لە گەورەییدا لە ڕووی توانای ئەنجامدانی سێکسییەوە کەمتر گەشەیان کردووە و دەشێ زیاتر لەوانەی کە بەو ئەزموونەدا ڕۆیشتوون، تووشی پەککەوتنی سێکسی ببن. هەندێک لە زانایان لەسەر بناغەی بایۆلۆژی، هەندێک پراکتیزەی سێکسیی هاوشێوە لە ئاژەڵاندا دەکەن بە بەڵگە بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونەیان، هەندێک لە ئاژەڵان بە نموونە دەهێننەوە، لەوانە هەندێ جۆری مەیموون، کە لە تەمەنی بچووکیاندا جۆرێک لە ڕەفتاری سێکسیی وەک سواربوون و خستنەناوەوە و دۆخی تەسلیمبوون دەنوێنن. زاناکان ئەم ڕەفتارانە بە پراکتیزەی پێویست بۆ ئاژەڵی تەمەن بچووک دادەنێن تا فێر بێ لە گەورەییدا چۆن سێکس بکات، ئەوەش تێبینی کراوە ئەم ڕەفتارانە بۆ نێر زیاتر لە مێ پێویستە. لە منداڵی توخمی مرۆییشدا، تێبینیی جووڵە و دۆخی سواربوون و جووڵەی تەسلیمبوون بۆ سێکس کراوە و منداڵ لە تەمەنی دوو ساڵیدا ئەنجامیان دەدا. بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەک هەبێ کە منداڵ

ئەو دیمەنەی بینی بێ یان لاسایی گەورەکان بکاتەوە، لویس Lewis (1965)لە منداڵی تەمەن ٨ مانگ و ١٠ مانگدا، تێبینیی دەرکەوتنی هەندێ جووڵەی پاڵپێوەنانی لە ناوچەی حەوزدا کردووە. هەروەها تێبینیی کردووە ئەو منداڵەی جووڵەی سواربوون دەنوێنێ، هاوکات چووکیشی لەگەڵیدا ڕەپ دەبێ، بەڵام ئەو منداڵەی کە وەرگرە یان پێشوازیکەرە، مەرج نییە چووکی ڕەپ ببێ. منداڵان لە هەردوو توخمەکە لە کاتی یارییە سێکسییەکاندا لە تەنیا جارێکی یاریکردندا، هەردوو دۆخەکە دەبینن، بەڵام هەندێکیان بەردەوام یەک دۆخ دووبارە دەکەنەوە، واتە منداڵ جارێ دۆخی پاڵپێوەنەر دەبێنێ و سواری منداڵەکەی دیکە دەبێ کە هاوبەشی دەکات، جارێکیش خۆی دەبێتە پێشوازیکەر و منداڵەکەی دیکە دەوری ئەو دەبینێ. ئەم گۆڕانکارییە لە ڕۆڵبینینی سێکسیدا و کاتێ منداڵ ڕەفتاری هۆمۆسێکسوالیتی دەنوێنێ، لە تەمەنی چوار ساڵیدا ڕوو دەدات، بەڵام دواتر کە گەورە دەبن، ئەو منداڵەیان کە گەورەترە، سواری ئەو منداڵەیان دەبێ کە تەمەنی لە خۆی بچووکترە، واتە کە گەورە دەبێ، ڕازی نابێ ڕۆڵی پێشوازیکەر ببینێ، بەڵام منداڵە بچووکەکان وەک دەردەکەوێ ڕازی دەبن بە ڕۆڵی پێشوازیکەر و تەسلیمبوون بەرامبەر ئەو منداڵانەی کە لە خۆیان گەورەترن. ئەم دیاردەیە لە تەواوی شارستانییەتە ناسراوەکانی دنیادا هاوشێوەیە. کینزی لە یەکێک لە لێکۆڵینەوەکانی کە لەڕێی ڕاپرسییەوە ئەنجامی داوە، بۆی دەکەوت ٦٠%ی کوڕان بەر لە تەمەنی هەرزەکاری، ڕەفتاری هۆمۆسێکسوالیتییان پراکتیزە کردووە.

ئەو ڕەفتارە سێکسییانەی کە لەنێو منداڵاندا پیادە دەکرێن، بەزۆری ڕەفتاری هۆمۆسێکسوالیتین، واتە منداڵ لەگەڵ هاوتوخمەکەی خۆیدا دەیکات، بەڵام دەشێ منداڵ لەگەڵ توخمە دژەکەی خۆیشیدا بیکات، واتە کچ و کوڕ پێکەوە، ئەمەش ئاماژەیە

بۆ بوونی بناغەیەکی دوانی لە سێکسدا لای مرۆڤ. ئەم ئاڕاستە دوانییە لە بێچووی ئاژەڵانیشدا تێبینی کراوە.

دەشێ ئەو پرسیارە بکرێ، بۆچی ڕەفتاری هۆمۆسێکسوالیتی لە منداڵدا زۆرە یان زاڵترە، واتە منداڵی کوڕ لەگەڵ منداڵی کوڕدا و منداڵی کچ لەگەڵ منداڵی کچدا ڕەفتاری سێکسی دەنوێنن؟ ئایا بۆچی ئەم ڕەفتارە سێکسییانە لای منداڵی کوڕ لەگەڵ منداڵی کچدا کەمتر ڕوو دەدات؟ لە کاتێکدا لۆژیکیترە ڕەفتاری سێکسی لە نێوان دوو توخمی جیاواز لە یەکدی ڕوو بدات؟

بۆ لێکدانەوەی ئەم پرسیارە، وای دەبینن زۆربەی کۆمەڵگە شارستانییەتەکان کەم و زۆر لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، نێر و مێ لە یەک جیا دەکەنەوە. لەبەر ئەوە ئەم واقیعە وا دەکات ئەگەری پراکتیزەکردنی گەمەی سێکسی لە نێوان کچ و کوڕدا کەمتر بێ و منداڵ ناچار بێ ئاڕاستەکەی دیکە بگرێتەبەر و لەگەڵ توخمە لێکچووەکەی خۆیدا ڕەفتاری سێکسی بنوێنێ، یان گەمەی سێکسی بکات، هەروەها دەشێ بۆ لێکدانەوەی ئەم دیاردەیە کۆمەڵێک فاکتەری دیکەش هەبن کە هەندێکیان بایۆلۆژین و هەندێکیان پەیوەندییان بە گەشەی منداڵ و خەیاڵەکانییەوە هەیە و هەروەها چڕبوونەوەی بیری منداڵ لەسەر قۆناغی کۆمی کە یەکێکە لە قۆناغەکانی گەشەی سێکسی دەروونی منداڵ، ئەم بابەتە شوێنەوارێک لای منداڵ بەجێدێڵێ کە بە ئاسانی لە خەیاڵیدا ناسڕێتەوە و دەشێ لە کاتێکی دواتردا کار بکاتە سەر ئاڕاستەی تێربوونی سێکسی لای ئەو منداڵە لە گەورەییدا.

لەگەڵ بەرفراوانی و چڕیی ڕەفتار و پراکتیزە هۆمۆسێکسوالیتیەکان لە ژیانی منداڵدا، بەڵام هەرگیز ئەمانە ناسنامەی سێکسی کۆتایی نانوێنن لە ژیانی منداڵدا. دەشێ منداڵ لە قۆناغی منداڵیدا و کاتێ ئەم ڕەفتارە سێکسییانەی نواندووە، ڕۆڵی بکەری بینی بێ، یان ڕۆڵی پێشوازیکەری بینی بێ و تەسلیم

بووبێت، یان هەردوو ڕۆڵەکەی لەگەڵ توخمەکەی خۆی تاقی کردبێتەوە، یان تەنیا لەگەڵ توخمە دژەکەی خۆی، یان بەیناوبەین لەگەڵ هەردوو توخمەکەدا ئەمانەی کردبێ، بەڵام تەواوی ئەم حاڵەتانە، بە هیچ شێوەیەک ئاماژە بە ناسنامەی توخمی منداڵ لە گەورەییدا نادەن. ئەم ڕەفتارە سێکسییانەی منداڵ بە هیچ شێوەیەک نابنە هۆی ئاڕاستەگرتنی ڕەفتار و پراکتیزەکردنی هۆمۆسێکسوالیتی لە گەورەییدا، چونکە ڕوودانی یان پراکتیزەکردنی هۆمۆسێکسوالیتی لە گەورەییدا، دەرئەنجامی کۆمەڵێک فاکتەری دیکەیە کە لە هەموویان گرنگتر، فاکتەری ژینگەیە، بەتایبەتی پەیوەندیی نێوان منداڵ لەگەڵ باوانیدا. لە بەشێکی دیکە لەم کتێبەدا، کاتێ باسی لادانە سێکسییەکان دەکەین، هۆکارەکانی پراکتیزەکردنی هۆمۆسێکسوالیتی لە گەورەییدا شی دەکەینەوە.

### پوختە و توانج

لەوانەیە پوختەکردنی ئەو لێشاوە گەورەیە لە زانیاری و ڕا و تیۆر و هەڵوێستەکان کە دەربارەی ژیانی سێکسی لای منداڵ هەن، کارێکی ئەستەم بێ. سەرچاوەی تەواوی ئەم زانیارییانە لە بواری بایۆلۆژی و دەروونی و کۆمەڵایەتی و بوارەکانی دیکەی کە پەیوەندییان پێوەیەتی، دەست دەکەون. لێرەدا پوختەی هەڵوێستی هاوچەرخ دەربارەی ئەم بابەتە گرنگە، دەخەینە ڕوو، لەم ڕێیەوە بۆمان دەردەکەوێ کە تا ئێستا لە ڕووی زانستی و کۆمەڵایەتییەوە نەگەیشتووین بە ڕێککەوتنێکی تەواو دەربارەی جەوهەری ئەم بابەتە، هەرچەندە ئاشکرایە کە ئێمە لە هەوڵدانماندا بۆ تێگەیشتن لە ئاڕاستە جیاوازەکانی ژیانی سێکسی لە منداڵدا بە ئاڕاستەیەکی علمانیدا دەڕۆین. پوختەی زانیارییەکان لەم خاڵانەدا دەخەینە ڕوو:

١-لە سەردەمی ئێستادا و لە زۆربەی کۆمەڵگە شارستانی و ناشارستانییەتەکاندا، بەدحاڵیبوونێک دەربارەی ژیانی سێکسی لە منداڵدا هەیە، بەشێک لەم بەدحاڵیبوونە لە نەزانینەوەیە، بەشێکیشی بۆ بەردەوامیی ئەو دابونەریتە دەگەڕێتەوە کە بۆمان ماوەتەوە و چۆنێتیی ڕوانین بۆ ئەم بابەتە و ئەو ئاڕاستە کۆنەپارێز و دەمارگیرەی دەربارەی ئەم بابەتە هەیە و هەروەها پابەندبوون بەو ڕایەوە کە منداڵ بوونەوەرێکی پاک و بێگەردە و بوونی ژیانی سێکسی لای منداڵ شتێکی مەحاڵە و دوورە لە ڕاستییەوە. ئەوانەی ئەم بۆچوونەیان هەیە، پێیان وایە دەرکەوتنی ئەم دەستپێشخەرییە لە ڕەفتاری منداڵدا وەک خراپە یان لادان وایە و وا پێویست دەکات ئەو منداڵە سزا بدرێ، یان بە توندی و بە زۆر ڕەفتار و ڕەوشتی ڕێک بکرێتەوە، یان چارەسەر بکرێ.

٢-زۆرێک بڕوایان وایە، کە ژیانی سێکسی لای منداڵ بەڕاستی لە قۆناغی نەرزەبوونەوە، یان بە ماوەیەکی کورت بەر لەو قۆناغە دەست پێ دەکات، تەنانەت هەندێک لەو کەسانەی بڕوایان بەم بۆچوونە هەیە، لەو کەسانەن کە لە بواری سایکۆلۆژیشدا کار دەکەن. ئەم کەسانە پێیان وایە ڕوخسارە جیاوازەکانی هەر ڕەفتارێکی سێکسی کە بەر لە قۆناغی نەرزەبوون لە منداڵدا دەردەکەون، تەنیا یاری و گەمەن و هیچ پەیوەندییان بە ژیانی سێکسییەوە نییە. زۆرێک لەم ڕایانە لەسەر زمانی نەیارەکانی فرۆیدەوە وتراون، ئەو نەیارانەی کە دژی تیۆرەکانی فرۆید بوون دەربارەی ژیانی سێکسی لای منداڵ، ورە و پەرۆشیی ئەم نەیارانە لە ڕەتکردنەوەی ژیانی سێکسی لای منداڵ، بەرامبەر بە

وره و پەرۆشیی فرۆید بوون لە جەختکردنەوە و ئاشکراکردنی گرنگیی ئەم ژیانە لای منداڵ.

٣- بێگومان تێبینی و ئاماژەی زۆر هەن کە بەڵگەن لەسەر بوونی ڕەفتار و پراکیزەکردنی سێکسی لای منداڵ لە قۆناغە جیاوازەکانی تەمەنی منداڵیدا، هەر لە لەدایکبوونەوە تا قۆناغی نەرزەبوون. پێویستە هۆکاری ئەنجامدانی ئەم پراکتیزانە و نواندنی ئەم ڕەفتارانە لێک بدرێنەوە و لە مانا و ئامانجەکانیان تێبگەین، لەبەر ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە ئەو ڕەفتارانە تەنیا بە یاری و گەمەی بێسوود دابنێین. تێبینییەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە منداڵ هەست بە چێژ و خۆشی دەکات کاتێ یەکێک لە ڕوخسارەکانی ژیانی سێکسی پراکتیزە دەکات، هەروەها هەست بە دڵتەنگی و هەڵچوون دەکات کاتێ ڕێگری لە بەردەم ئەو حەز و جۆشوخرۆشییەیدا دەبێ، چەند بارەبوونەوەی ئەم ڕێگرییە دەشێ کار بکاتە سەر ڕەفتار و گەشەی دەروونیی ئەو منداڵە.

٤-ئەو ڕایەش هەیە کە پێی وایە ڕەفتار و پراکتیزەکردنی سێکس لای منداڵ، بە شێوەیەک لە شێوەکان لە ساتی لەدایکبوونەوە، یان تەنانەت بەر لە ساتی لەدایکبوونیشەوە دەست پێ دەکات. لەم قۆناغەدا منداڵ بە شێوەیەکی خۆبەخۆیی ئەو ڕەفتارانە دەنوێنێ، لە کاتێکدا هێشتا هیچ هۆشیاری و ویست و ئامانجێکی لەم ڕەفتارە سێکسییانەیدا نییە، لە تەمەنی دووساڵیدا هۆشیاری پەیدا دەکات. پاش ئەمە منداڵ بە زنجیرەیەکی بەردەوام لە پراکتیزەکردنی سێکسیدا تێپەڕ دەبێت کە ڕوخساری جیاواز لە خۆیان دەگرن، بەتایبەتی بە هەندێک ناوچەی دیاریکراوی جەستەوە، پەیوەست دەبن. فرۆید ئەم گەشەکردنەی بۆ چەند

قۆناغێک پۆلێن کرد و بە چەند قۆناغێکی دیاریکراوی گەشەوە بەستییەوە کە لایەنە بایۆلۆژییەکانی جەستە بڕیاریان لەسەر دەدات، لەگەڵ ئەوەشدا کە فرۆید بە تەواوی یەکەم کەس نەبوو تیۆری دەربارەی ژیانی سێکسی لە منداڵدا دانا و باسی فاکتەرە بایۆلۆژییەکانی کرد و بە هەندێک ناوچەی دیاریکراوی جەستەوە بەستییەوە لە قۆناغەکانی گەشەدا، بەڵام فرۆید یەکەم کەس بوو کە ئەم گەشەیەی لە چەند قۆناغێکدا ڕێکخست و هەروەها هەوڵی دا بە گەشەی دەروونیی منداڵەوە بیبەستێتەوە و لەژێر ناوی قۆناغەکانی گەشەی سێکسی دەروونیدا، پۆلێنی کردن.

٥-دەربارەی مانای ژیانی سێکسی لای منداڵ، مشتومڕێکی زۆر کرا و تا ئێستاش بەردەوامە، ئایا چی دەگرێتەوە؟! لەم مشتومڕەدا جەمسەرێکی زیادەڕۆ هەیە، پێی وایە ژیانی سێکسیی منداڵ تەنانەت بەر لە لەدایکبوونیش دەست پێ دەکات، بۆ نموونە منداڵ لەناو سکی دایکیدا پەنجەی دەستی یان قاچی دەمژێ، پاشان مژینی گۆی مەمکی دایک لە کاتی شیرخواردندا و پەنجەمژین لە هەر کاتێکدا و کرداری میزکردن و پیساییکردن، تەواوی ئەمانە ڕوخساری سێکسین و گوزارشت لە حاڵەتی گرژی و نائارامیی منداڵ دەکەن و هەوڵدانی منداڵە بۆ دەربڕینی ئەو حەز و گرژبوونە سێکسییەی کە هەیەتی و هەوڵدانە بۆ دەستکەوتنی چێژ. جەمسەرە توندڕەوەکەی دیکە پێی وایە ژیانی سێکسی تەنیا لە قۆناغی نەرزەبووندا دەست پێ دەکات و منداڵ تا نەڕواتە ئەم قۆناغەوە، توانای فڕێدانی تۆو و پیتاندنی نییە. هەڵەی شاراوەی هەریەک لە جەمسەرەکانی ئەم مشتومڕە ئەوەیە، کە لە خاڵێکدا زۆر لە یەکەوە دوورن، ئەویش بریتییە لە هەوڵدانیان بۆ

لێکچوواندنی ژیانی سێکسی لە قۆناغی منداڵیدا لەگەڵ ژیانی سێکسی لە گەورەییدا. لە کاتێکدا پێویستە دەرک بەوە بکرێ ڕوخسارەکانی ئەم دوو ژیانە لای منداڵ و لای گەورە جیاوازن، چونکە ژیانی سێکسی لای منداڵ ژیانێکە بریتییە لە کرداری گەشە و پەرەسەندن و هەوڵدان بۆ تاقیکردنەوەی ئەزموونێکی نوێ، بەڵام ژیانی سێکسی لای کەسێکی گەورە یان پێگەیشتوو بە دۆخی گەشە و فۆرمەلەبوونی تەواو، گەیشتووە، پاشان ئەزموونی سێکسی لای منداڵ، ئەزموونێکی فرە ڕوخسارە، ئیدی بەهۆی کاریگەریی کارتێکەرە بایۆلۆژییەکانەوە بێ یان بەهۆی کاریگەریی ژینگەوە بێ، لە کاتێکدا ئەزموونی سێکسی لە گەورەییدا، ئەزموونێکی گەشەکردووە، هەروەها دیاریکراو و خاوەن ئامانجە و لە حاڵەتە سروشتییەکاندا تەنیا یەک ڕوخساری هەیە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا و چەندە ڕوخسارەکانی ژیانی سێکسی لای منداڵ و لای گەورە لە یەکەوە دووربن، بەڵام جەوهەری ئەم ژیانە لای هەردووکیان هەر یەکێکە، چونکە ئارەزووی سێکسی لە منداڵدا، ئیدی خۆبەخۆ بێ و ناهۆشیارانە یان هۆشیارانە بێ، هەوڵی دەرچوون و دەرکردنی دەدات و کە دەرکردنی دەبێتە هۆی دەستکەوتنی چێژ، ئەمەش هەمان ئەو شتەیە کە لای گەورەکان ڕوو دەدات، ئەگەر بمانتوانیایە ناوەندە دەماری و هۆرمۆنییەکان لە دەماخ و کۆئەندامی دەماردا بخەینە ڕوو کە بەشداری لەم پرۆسەیەدا دەکەن، هەر لە سەرەتای دروستبوونی ئارەزووی سێکسی تا دەگاتە قۆناغی دەرچوون و دەرکردنی ئەو ئارەزووە و چێژوەرگرتن، ئەوا لەوانەبوو

جیاوازییەکی ئەوتۆمان دەست نەکەوتایە لە نێوان ئەوەی لە منداڵ و لە گەورەدا ڕوو دەدات.

٦-ڕەفتار و پراکتیزە سێکسییەکان بە ڕوخسارە جیاوازەکانیانەوە لای منداڵ، وا پێویست دەکات فاکتەرە بایۆلۆژییەکان بڕیاریان لەسەر بدەن، بەڵگەش بۆ ئەمە لێکچوونی ئەم ڕوخسارانەیە لە قۆناغەکانی گەشەکردن لای زۆربەی زۆری منداڵ و تەنانەت بەبێ بوونی فاکتەری فێربوون و لاساییکردنەوەش، هەروەها ڕوخسارەکانی ڕەفتاری سێکسی لای منداڵ لەگەڵ ڕوخسارەکانی ئەم ڕەفتارە لە بێچووی ئاژەڵە باڵاکاندا وەک مەیموون، لەیەک دەچن، بەڵام فاکتەرە کۆمەڵایەتی و شارستانی و پەروەردەییەکانی ئەو کۆمەڵگەیەی کە منداڵ ئینتیمای هەیە بۆی، کار دەکاتە سەر ڕەفتار و پراکتیزە سێکسییەکانی، لەبەر ئەوە ئەم پراکتیزانە تەنیا گەمەیەک نین و منداڵ ئەنجامیان بدات، وەک ئەوەی هەندێک پێیان وایە، بەڵکو دەشێ خزمەتی هەندێک مەبەستی بایۆلۆژی بکەن، وەک ئامادەکردنی منداڵ بۆ دواڕۆژ، لەڕێی ئەم ئامادەکردنە سێکسییەی منداڵەوە زامنی زۆر بوون و مانەوە دەکرێ، هەروەها دەشێ لە ڕووی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و شارستانیشەوە بایەخی هەبێ، چونکە بوونی ئەم ئارەزووە سێکسییە و هەوڵدان بۆ ڕازیکردن و تێرکردنی و سەرچاوەکانی ئەم ڕازیکردنە، دەشێ هاندەرێک بێت بۆ منداڵ بۆ ئارەزووی مانەوە و بەستنی پەیوەندیی سۆزداری لەگەڵ باوانداء لە لایەک ئاسایش و دڵنەوایی بۆ بەدی بێنێ و لە لایەکی دیکەشەوە پارێزگاری لە پەیوەندیی خێزانی بکات، هەروەها ئەم پراکتیزە سێکسییانەی منداڵ لە ڕووی دەروونییەوە

بایەخێکی گەورەی بۆ سەر خەیاڵ و وێنا و بیرکردنەوە و هەڵچوونەکانی منداڵ هەیە، چونکە هەموویان وزەی سێکسی هەڵدەمژن، لەبەر ئەوە بەبێ ئەنجامدانی توێژینەوە لە ژیانی دەروونی بە شێوەیەکی تەواو، ناکرێ توێژینەوە دەربارەی ژیانی سێکسی ئەنجام بدرێ، بوونی ژیانی سێکسیش لە قۆناغی منداڵیدا، مەسەلەیەکە بڕوا بە بوونی ناکرێ، وەک ئەوەی کە لە گەورەییدا بڕوا بە بوونی دەکرێ، لە کاتێکدا بایەخی ژیانی سێکسی لە منداڵیدا گەورەترە، چونکە بناغەیە بۆ گەشەی سێکسی دەروونی لە گەورەییدا.

٧- دەشێ ژیانی سێکسی لای منداڵ بایەخی تەنیا بۆ سەر لایەنە بایۆلۆژییەکان نەبێت، ئەو لایەنانەی کە ئامانجیان مانەوە و ئامادەکردنی منداڵە بۆ دواڕۆژ، هەروەها مەرج نییە ژیانی سێکسی لای منداڵ گرنگیی تەنیا بۆ سەر لایەنە کۆمەڵایەتی و شارستانی و دەروونییەکان هەبێت، بەڵکو ئەوەی گومانی تیادا نییە، پەیوەندییەک هەیە لە نێوان ئەزموون و خەیاڵە سێکسییەکان لە قۆناغی منداڵی و هەرزەکاریدا، لەگەڵ کۆمەڵێک ئامانجی باڵا کە تاک هەوڵی بەدیهێنانیان دەدات، چونکە دەشێ لە ژیانی سێکسیی منداڵدا، کۆمەڵێک مانای شاراوە هەبن کە پاڵ بە منداڵەوە بنێن بۆ هەستکردن و هۆگربوون بە شتە جوانەکان لە ژیاندا و لێرەشەوە پەرەسەندنی ئەم هەستکردنە ڕووەو ئەزموونکردنی ئەفراندن و داهێنان لە بوارەکانی ژیاندا. ئەستەمە بتوانین وێنای منداڵێ بکەین کە لە دواڕۆژدا داهێنان بکات، لە کاتێکدا ژیانی سێکسی و دەروونیی ئەو منداڵە لە هەموو پشکۆ یان جووڵەیەکی ژیانی سێکسی خاڵی بووبێت.

٨- لەم سەردەمەی ئێستاماندا زۆرێک هەن کە دەرک بە بایەخی ژیانی سێکسی لە منداڵدا دەکەن، هەروەها زۆرێک هەن، بەتایبەتی ئەوانەی بروایان بە تیۆرەکانی فرۆید هەیە، ڕووداني نەخۆشی و حاڵەتە دەروونییەکان لە گەورەییدا، بە چەپاندنی ژیانی سێکسییەوە لە منداڵیدا، دەبەستنەوە، بەلام ئەستەمە بە تەواوەتی ددان بە تیۆرەکانی فرۆیددا بنێین دەربارەی بابەتی چەپاندن و ئەو حاڵەتانەی کە بەهۆی چەپاندنەوە ڕوو دەدەن، چونکە سەرچاوەکانی ئەم سەلماندنە بابەتی نین و ئەستەمە دووبارە بکرێنەوە.

هەروەها ئەو بۆچوونەش هەڵەیە پێمان وا بێ ئارەزووە سێکسییەکانی منداڵ هەندێجار ئەو ڕوخسارانە لەخۆ دەگرن کە ڕازیکردن و گونجاندنیان لەگەڵ ئەو ئامانجانەی کە دەیانوروژێنن یان دەیانەوێ بێنە دی، ئەستەمە، لەبەر ئەوە وا پێویست دەکات ئەم ئارەزووانە بچەپێنرێن، یان بە سەختی یان بە شەرمەوە یان بە شڵەژان یان ترس یان ڕقلێبوونەوە یان پەستی یان تووڕەیی یان شڵەژاوی یان ڕووداني پشێوی لە فەرمانەکانی جەستە یان لە ژیانی دەروونی منداڵدا، وازیان لێ بهێنرێ، کە ئەمانەش شوێنەواری خۆیان لەسەر ژیانی دەروونیی منداڵ لە دواڕۆژدا جێدەهێڵن، بەلام ئەم کاردانەوانە کە لە ئەنجامی شکستهێنان لە دەرچوونی ئارەزووی سێکسی لای منداڵ، ڕوویان داوە، لەوانەیە نەبنە هۆی ڕووداني چەپاندن و دەرکەوتنی کاریگەرییەکانی وەک ئەوەی هەندێک ڕا پێیان وایە و بروایان وایە کە بەهۆی ئەم چەپاندنەوە دەشێ لە گەورەییدا جۆرێک لە لادانی سێکسی یان نەخۆشیی دەروونی ڕوو بدات، چونکە دەرکەوتنی ئەم ئەنجامە بەم شێوەیە پشت بە کۆمەڵێک فاکتەر دەبەستێ، وەک توانای پاڵنەری سێکسی و وزەی سێکسی و ئاستی دووبارە

شکستهێنان لە تێرکردنی ئەو پاڵنەرەی کە منداڵ هەستی پێ دەکات، هەروەها نەبوونی هۆیە شیاوەکان بۆ دەرکردنی ئەم وزە سێکسییە بە شێوەی سێکسیی ڕاستەوخۆ، سەرباری فاکتەرە کۆمەڵایەتی و پەروەردەییەکانی کە دەشێ توانای چەپاندن و هێزەکەی و ڕەوتی دزەکردنی بۆ ناو ژیانی دەروونی، کەم یان زیاد بکات. لەوانەیە هەڵە بێ هەندێ کەس وا گریمانە دەکەن کە پێویستە ئارەزووە سێکسییەکانی منداڵ دابین بکرێن و ئاسانکارییان بۆ بکرێ و هانیان بدرێ بە سروشتی ڕوو بدەن، ئەم تێڕوانینە بە هەمان هێندی ئەو بۆچوونە هەڵەیە کە پراکتیزەکردنی سێکسی لە منداڵدا بە تەواوەتی حەرام دەکەن و داوا دەکەن ئەو ئارەزووانە بچەپێنرێن و ڕێگەیان لێ بگیرێ و سزای منداڵ بدرێ. زۆرێک لە جیهانی خۆرئاوا و ئەمەریکا بەتایبەتی، بڕوایان بەو بۆچوونە پەروەردەییە دەروونییە هەیە کە پێی وایە، دەشێ پارێزگاری لە ڕوونی و بێگەردیی ژیانی دەروونیمان بکەین و لەڕێی چاوپۆشین لە ڕەفتار و پراکتیزە سێکسییەکانی منداڵ، نەیەڵین خڵتەی نەخۆشییە دەروونییەکان ژیانی دەروونیمان لێڵ بکەن، چونکە کرداری چەپاندن لە منداڵیدا دەشێ بناغە بێ بۆ ڕوودانی نەخۆشییە دەروونییەکان لە گەورەییدا. هەندێک لەو کەسانەی کە زیاد لە پێویست پەرۆشن بۆ ئەم بۆچوونە و پشتیوانی لەم تیۆرە دەکەن، زیاتر دەڕۆن و داوای پێکهێنانی ئەو گرووپ و ڕێکخراوانە دەکەن کە بانگەشە بۆ ئیباحەتی سێکسی دەکەن لە منداڵدا، هەروەها لەنێو منداڵ و گەورەکاندا. هەڵەی جێبەجێکردنی ئەم ئاڕاستەیەش واتە نواندنی ئاسانکاری و ڕێگەدان بە ئیباحەتی سێکسی لەنێو منداڵدا، سەلمێنراوە، هەڵەی ئەم ئاڕاستەیەش لەوەدایە، ئەوانەی بڕوایان بەم ئاڕاستەیە هەیە، دەرکیان بەوە نەکردووە کە گەشەی ژیانی سێکسی لە قۆناغەکانی منداڵیدا هەر دەبێ دووچاری پیاکێشان ببێ

لەگەڵ ئاستەنگەکانی وەک شکستهێنان لە ڕازیکردن، ئەگەر هەموو منداڵێ بە شێوەیەکی خێرا و هەنووکەیی و بێ هیچ ڕێگرییەک، ئارەزووی سێکسیی ڕازی بکرێ، ئەوا ئارەزووی سێکسی و ڕازیکردنی دەبێتە هۆی ڕوودانی پرۆسەیەکی بایۆلۆژیی ئاژەڵییانەی ڕوون کە هیچ خزمەتێکی دیکە ناکات بەدەر لە مەبەستی زۆربوون و مانەوە، ئەم جۆرە مەبەستەش لە خزمەتی توخمی مرۆییدا نییە کە پێویستی بە زیاترە لە تەنیا ئارەزوویەکی ئاژەڵییانە و ڕازیکردنی، پێویستی بە زیاترە تا ئارەزووی بۆ ژیان هەبێ و بۆ ئەوەی ئەفرێنەر و داهێنەر بێ. لەبەر ئەوە بوونی پلەیەک لە چەپاندن و شکستی لە ڕازیکردنی ئارەزووی سێکسی و هەوڵدان بۆ گۆڕینی ئەم ئارەزووە، بە مەسەلەیەکی گرنگ دادەنرێ لە ژیانی منداڵدا، بەڵام ئایا تا چ ئاستێ پێویستە ئەم چەپاندنە بڕوات و تا چ ئاستێکیش ئاسانکاری بنوێنرێ و ڕێگە بە منداڵ بدرێ گوزارشت لە هەندێک لە ڕوخسارەکانی ژیانی سێکسی بکات؟ مەسەلەیەکە هێشتا بڕیار لە سنوورەکانی نەدراوە و بەپێی واقیعی دابونەریت لە کۆمەڵگە جیاوازەکاندا دەگۆڕێ و هەندێک لە کۆمەڵگە بەرامبەر ئەم مەسەلەیە توندن و هەندێکیان لێبوردەن، ئەوەی گومانی تیادا نییە، ئێمە لەم بوارەدا پێویستمان بە توێژینەوەی وردتر و بابەتیانەتر هەیە، تا ئەو کاتەی ئەمە ڕوو دەدات، هیچ کەسێ لە ئێمە ناتوانێ نکوڵی لە بوونی ژیانی سێکسی لە منداڵدا بکات، یان بایەخی ئەم ژیانە لە گەشەی دەروونی منداڵدا و دواڕۆژی ژیانی لە بوارە جیاوازەکاندا، پشتگوێ بخات.

**پەراوێزەکان:**

*پێکەوەنووسان Introjectin: یەکێکە لە میکانیزمەکانی بەرگری، تاک پەنای بۆ دەبات کاتێک هەوڵ دەدات بۆ بەدەستهێنانی هەندێک خەسڵەت کە لە خۆیدا نییە، تاک بە شێوەیەکی نەستی ئەو خەسڵەتانەی دەیەوێ و خۆی نییەتی لە کەسێکی دیکەوە وەریدەگرێ و دەینووسێنێ بە (من)ی خۆیەوە، پێکەوەنووسان پێچەوانەی خستنەپاڵە projectin.ساندور فرنزی ساڵی ۱۹۰۹ ئەم زاراوەیەی لە بەرامبەر زاراوەی خستنەپاڵدا بەکار هێنا-وەرگێڕ.

**نیورۆسس: حاڵەتێکی دەروونییە، نیشانەکانی گوزارشت لە ململانێیەکی دەروونی دەکەن، کە ڕەگوڕیشەکەی بۆ مێژووی قۆناغی منداڵی دەگەڕێتەوە، ئەم زاراوەیە بۆ یەکەم جار پزیشکی ئسکۆتلەندی ویلیام کۆڵن ساڵی ۱۷۷۷ لە کتێبەکەیدا بە ناوی (هێڵە سەرەتاییەکانی پراکتیزەکردنی تۆژداری) بەکاری هێنا. لە بواری کلینیکیدا زۆر بەکار دێت، بۆ نموونە نیورۆسسی وەسواسی، نیورۆسسی فۆبیا و هستیریا. فرۆید لە پێشەوەی زانا دەروونییەکانە کە بایەخی بە نیورۆسس داوە و کاری لەسەر جیاکردنەوەی نیورۆسس و سایکۆسس کردووە کە زۆر جار تێکەڵی لە نێوانیاندا ڕوو دەدات-وەرگێڕ.

سەرچاوە: معجم مصطلحات التحليل النفسي، ترجمه وتقديم: د: مصطفى حجازي، بيروت، ٢٠١١.

# بەشی شەشەم
# سێکس لە قۆناغەکانی تەمەندا

-قۆناغی نەرزەبوون

-قۆناغی هەرزەکاری

-قۆناغی گەورەبوون

# سێکس لە قۆناغەکانی تەمەندا

## قۆناغی نەرزەبوون

ژیانی سێکسی لە تەمەنی نەرزەبوون و هەرزەکاریدا، قۆناغێکی یەکلاییکەرەوەیە لە قۆناغەکانی گەشەی سێکسیدا، کە بەرئەنجامی چەند فاکتەرێکە، لە لایەکەوە بەردەوامبوونی بایۆلۆژی دەنوێنێ بە ئاراستەی پێگەیشتنی سێکسی کە ڕوخسارەکانی لە قۆناغی کۆرپەلەییەوە دەست پێ دەکات و تا قۆناغە جیاوازەکانی منداڵی بەردەوام دەبێ. لە لایەکی دیکەوە، ژیانی سێکسی لەم قۆناغەدا لایەنێکی گرنگی پرۆسەی ڕوودانی گۆڕان لە هۆرمۆنەکاندا، دەنوێنێ، کە پرۆسەیەکە کاریگەریی ڕیشەیی بۆ سەر کردارە بایۆلۆژییەکان لە لایەک و ڕوخسارە جەستەییەکان لە لایەکی دیکەوە، دەبێ. ئەم گۆڕانکارییە لە هۆرمۆنەکاندا، توخمی تازە دەخاتە ناو پاڵنەرە سێکسییەکان لە ژیانی نەرزەبووندا، هاوکات هانی دەدا بۆ ئەوەی گۆڕانکارییەکانی کە لە جەستە و هەستەکانیدا ڕوو دەدەن، سەرنجی ڕابکێشن، هەروەها سەرلەنوێ وێنای خۆی بکاتەوە بەهۆی ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە هەست و جەستەیدا ڕوویان داوە. سەرباری ئەم فاکتەرانە، کۆمەڵگەش بە دابونەرێت و کۆتوبەندەکانییەوە کە پەیوەندییان بە سێکسەوە هەیە، کار دەکەنە سەر دروستبوونی ژیانی سێکسی لای تاک. ئەمانە و وێڕای فاکتەری شارستانی و جوگرافی و ژینگەیی دیکە، کە هەموویان پێکەوە بڕیار لەسەر ئەو تەمەنە دەدەن کە کچ یان کوڕ تیایدا نەرزە ببێ، هەروەها بڕیاردان لەسەر خێرایی گەشەکردن لەم خاڵەوە و گەیشتن بە پەیوەندیی سێکسیی سروشتی کە گەنج و گەورکانی پێ جیا دەکرێنەوە.

نەرزەبوون لە تەمەنی سیانزە سالییەوە دەست پێ دەکات، بەلام لە رووی فسیۆلۆژییەوە، بەم تەمەن دیاری ناکرێ، چونکە دەشێ بەر لەم تەمەنە، یان دوای ئەم تەمەنە لە هەریەک لە کچ یان کوڕدا ڕوو بدات. لە هەندێ لە کۆمەلگەکاندا، تێبینی دەکرێ، کچ لە تەمەنی هەشت سالی یان نۆ سالیدا، نەرزە دەبێ، ئەوەش ڕوو دەدات کە کوڕ تا تەمەنی شانزە سالی یان دوای ئەو تەمەنەش، نەرزەبوونی دوا دەکەوێ. سەرەتای نەرزەبوون، گەیشتن بە پێگەیشتنی سێکسی دەنوێنێ لە هەریەکە لە کچ و کوڕدا، بەلام ئەم سەرەتایە نزیکەی دوو سال دەخایەنێ، هەر لەم سەرەتایەوە گۆڕانە جەستەیی و سێکسییەکان ڕوو دەدەن کە پێیان دەوترێ خەسلەتە سێکسییە لاوەکییەکان، ئەمەش کاردانەوەی ئەو زیادبوونە کتوپڕ و نوێیەیە کە لە هۆرمۆنەکانی ئەندرۆجین یان ئەسترۆجیندا ڕوو دەدەن.

ئەم گۆڕانکارییانەش دەشێ ببنە هۆی دروستکردنی گۆڕانکاری لە وێنەی تاک خۆی و وا دەکەن ئەو کچ یان کوڕە بەرامبەر ئەم گۆڕانکارییانە زیاتر هۆشیار و هەستیار بێ، هەروەها دەشێ ئەم گۆڕانکارییانە وەک شۆکێکی دەروونی وابن بۆ سەر کەسی نەرزەبوو، بەپێی ئەو چەمکە زالانەی کە بەرامبەر بە سێکس لەو کۆمەلگەیەدا هەیە، ئەم شۆکە دەروونییە کەم و زۆر ئازاری تاکی نەرزەبوو دەدات، بەتایبەتی لەناو خێزانەکەی خۆیدا و پەیوەندیی لەگەل باوانیدا و شێوازی مامەلەیان لەگەل ئەم قۆناغە کتوپڕ و گرنگە لە ژیانی کچ یان کوڕە نەرزەبووەکەیاندا.

لەگەل ڕوودانی گۆڕانکاری لە خەسلەتە جەستەیی و سێکسییەکانی لە تەمەنی نەرزەبووندا ڕوو دەدەن، گۆڕانکارییەکی دیکە ڕوو دەدات کە کچ یان کوڕی نەرزەبوو لە شێوەی پالنەرێکی ناوەکیدا هەستی پێ دەکات، ئەویش بۆ گوزارشتکردن

لەو وزە سێکسییەی کە هەیەتی. ئەم پاڵنەرە ناوەکییە لەم قۆناغەدا، تەنیا وەک گەڕانەوەیەکی پوختی قۆناغەکانی گەشەی دەروونی سێکسی لە منداڵیدا، تەماشا ناکرێ، بەڵکو بە تەواوی وەک ڕووداوێکی نوێ لە هەستی کەسی نەرزەبوودا لێی دەڕوانرێ و هەر ئەمەشە پێداگرانە هانی دەدات بۆ ئەوەی بە شێوازێک لە شێوازەکان گوزارشتی لێی بکات، لەبەر ئەوەی ئەو کچە یان کوڕە نەرزەبووە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە هێشتا توانا و مافی ئەوەی نییە مامەڵە بەم وزە سێکسییەوە بکات، یان تەنانەت دەرکی پێ بکات، لەبەر ئەوە لەپێناوی کوژاندنەوە و دامرکاندنەوەی ئەو پشکۆ سێکسییەی کە لە ناخیدایە، هەر دەبێ پەنا بۆ خۆی بەرێ و خۆی خۆی بورووژێنێ، لەبەر ئەوە ماستەربەیشن پراکتیزە دەکات، واتە بە مەبەستی چێژبینین دەست بۆ خۆی دەبات، ئەوەندە ناخایەنێ ئەم کارە لای کوڕ دەبێتە خوویەک و بە ناچاری دووبارەی دەکاتەوە، ئەم دیاردەیە نزیکە لەوەی کە بڵێین بەگشتی لای هەموو کوڕێک لەم قۆناغەدا ڕوو دەدات و بە دەگمەن کوڕێک هەبێ لەم قۆناغەدا ئەم کارەی نەکردبێ.

بەڵام لە کچاندا کەمتر بڵاوە، هەرچەندە زۆربەی کچان لە قۆناغی هەرزەکارییەوە تا تەمەنی هاوسەریتی لەپێناوی مەبەستی هاوشێوەدا، خۆیان خۆیان دەورووژێنن.

ئەو گۆڕانکارییە دەروونییانەی کە دووچاری هەرزەکار دەبنەوە بەهۆی پراکتیزەکردنی ئەم ڕەفتارەوە (واتە وروژاندنی خۆی بە مەبەستی چێژبینینی سێکسی)، پشت دەبەستێ بە هەڵوێستی باوان بەرامبەر ئەم پراکتیزەکردنە و ئەو زانیارییانەی کە هەرزەکار دەربارەی دەرئەنجامی ئەم کارە هەیەتی، لەو کاریگەرییە دەروونییانەش وەک هەستکردن بە گوناە و ترس لە تووشبوون بە نەخۆشیی جەستەیی یان ئەقڵی و دڵەڕاوکێ و

ناثارامی بەرامبەر ئەوەی کە ئەم رەفتارەی لە چوارچێوەی خێزانەکەی یان کۆمەڵگەکەیدا ئاشکرا ببێ و ئابڕووی بچێ، بەڵام گرنگترین کاریگەریی دەروونیی پراکتیزەکردنی ماستەربەیشن لەوەدا کۆدەبێتەوە کە هەرزەکار هان دەدات بۆ ڕۆچوون بەناو خەیاڵی سێکسیدا، ئەو خەیالانەی کە دەشێ لەگەڵ نموونە واقعییەکانی ژیانی ڕۆژانەدا دووچاری بەرکەوتن بێن، بەتایبەتی ئەگەر ئەو کچە یان ئەو کوڕە لە خەیاڵی خۆیدا هاوبەشێکی سێکسیی بۆ خۆی هەڵبژاردبێ.

جۆرێ لە تێکەڵاوبوون لە نێوان چەمکی نەرزەبوون و هەرزەکاری، هەروەها بەیەکداچوونی زەمنی لە نێوانیاندا، هەیە، بەڵام نەرزەبوون شتێکە و هەرزەکاری شتێکی دیکەیە، لە ڕووی کاتەوە، وچانی یەکەمی نەرزەبوون کە ماوەکەی دوو ساڵ دەخایەنێ لەگەڵ وچانی کۆتایی قۆناغی منداڵی، بەناویەکدا دەچن و تێکەڵ دەبن، منداڵ لەم قۆناغەدا کە دەکەوێتە نێوان نەرزەبوون و هەرزەکاری (بەر لە هەرزەکاری و دوای نەرزەبوون) لە ڕووی سێکسییەوە بە پێگەیشتوو دانانرێ، بەڵام ڕوخسارە جەستەییەکانیشی وەک ڕوخسارەکانی قۆناغی منداڵی نین.

هەرچی بەشی دووەمی پرۆسەی نەرزەبوونە بەدوای ئەم بەشی یەکەمەدا دێ و بۆ دوو ساڵی دیکە بەردەوام دەبێت. لەم وچانەدا یان لەم ماوەیەی گەشەیەدا، پرۆسەی نەرزەبوون و پێگەیشتنی سێکسی تەواو دەبێ، ئەم بەشەی دووەمی نەرزەبوون دەکەوێتە ناو قۆناغی یەکەمی هەرزەکاری، کە تەنیا پێگەیشتنی سێکسی ناگرێتەوە، بەڵکو گۆڕانکاریی گرنگ لە کەسێتیی هەرزەکار و پەیوەندییەکانی لەگەڵ دەوروبەر و لە ژیانی ڕۆژانەیدا دەگرێتەوە، کە پڕکێشتر دەبێ و هاوسەنگی و سەقامگیریی کەمتر دەبێت.

## قۆناغی هەرزەکاری

لای زۆر کەس قۆناغی هەرزەکاری، واتە کۆمەڵێک شتی جیاواز، لەبەر ئەوە دیاریکردنی مانای ئەم قۆناغە کارێکی ئەستەمە، هەرچەندە بە شێوەیەکی شاراوە هەمووان لەسەر ئەوە کۆکن کە هەرزەکاری قۆناغێک لە گەشەی کەسێتی دەنوێنێ کە دەکەوێتە نێوان قۆناغی منداڵی و قۆناغی پێگەیشتن (واتە قۆناغی پیاوەتی یان ژنێتی)، هەندێکیش ئەم قۆناغەی ژیان وا پێناسە دەکەن کە وچانێکی گەشەیە، دەکەوێتە نێوان ئەو قۆناغەی کە مێردمنداڵ بۆ قۆناغی پێگەیشتنی سێکسی دەگەیەنێ، لەگەڵ ئەو قۆناغەی تاک دەگاتە قۆناغی بەرپرسیارێتیی تەواو لە ڕووی یاساییەوە، کە تەمەنی هەژدە ساڵی بە پێپلیکانەیەک بۆ ئەم قۆناغە دادەنرێ، هەروەها لە ڕووی کاتی دەستپێکردنی ئەم قۆناغە و ئەو وچانە زەمەنییانەی کە ئەم قۆناغەی پێ دیاری کراوە، ڕایەکان جیاوازن، هەندێک بۆ تەنیا یەک وچان و هەندێ بۆ دوان و هەندێ بۆ سێ وچان دابەشی دەکەن.

بێگومان وەک زانراوە، فاکتەرە تاکێتی و جیاوازییە شارستانی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان، بڕیار لەسەر ئەم جیاوازییە دەدەن، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی، قۆناغی هەرزەکاری دەکەوێتە نێوان تەمەنی نزیک سیانزە ساڵی و هەژدە ساڵی لە کچاندا و چواردە ساڵی و هەژدە ساڵی لە کوڕاندا. بە زۆری قۆناغەکانی هەرزەکاری یان وچانەکانی هەرزەکاری بۆ دوو قۆناغ پۆلێن دەکرێن، قۆناغی یەکەم بەر لە حەڤدە ساڵی کۆتایی دێ و قۆناغی دووەم لە نێوان حەڤدە و هەژدە ساڵی درێژ دەبێتەوە، هەندێ لە توێژەرانیش وچانی هەرزەکاری بۆ سێ قۆناغ پۆلێن دەکەن، قۆناغی زوو، ناوەند و درەنگ.

گرنگترین شت کە لەم توێژینەوەیەدا دەربارەی قۆناغی هەرزەکاری بە لامانەوە گرنگە، بریتییە لە دیاریکردنی

خەسڵەتەکانی ژیانی سێکسیی هەرزەکار و هەروەها چۆن ئەو وزە سێکسییەی هەرزەکار لەگەڵ واقیعی ژیانی و تواناکانیدا کار لێک دەکەن؟ لە دوو ساڵی یەکەمی وچانی هەرزەکاریدا، مێردمناڵ بەشی دووەمی پرۆسەی نەرزەبوون تەواو دەکات، لەم قۆناغەدا پێگەیشتنی تەواوی سێکسی لە ڕووی بایۆلۆژییەوە (کۆئەندامی سێکسی و جەستە بەگشتی) ڕوو نادات، بەڵکو گەشە و گۆڕانکاری لە ڕووی ڕەفتاری و سۆزدارییەوە لە خەسڵەتەکانی کەسێتیدا ڕوو دەدەن، بەوانەشەوە کە پەیوەندییان بە ژیانی سێکسییەوە هەیە. بە درێژایی قۆناغی هەرزەکاری، دەبینین هەرزەکار بایەخێکی زۆر و پێداگر بە مەسەلە سێکسییەکان دەدا، هاوکات لەگەڵ ئەم بایەخپێدانەدا، گۆڕانکاری لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی هەرزەکاردا ڕوو دەدات، هەروەها ئەم پەیوەندییانە دەکاتە هۆکارێک بۆ گوزارشتکردن لە وزە سێکسییەکانی. لە وچانی یەکەمی قۆناغی هەرزەکاریدا، هەرزەکار خۆی دەبینێتەوە ناچارە پەیوەندیی بەتین لەگەڵ هەرزەکارانی توخمەکەی خۆیدا ببەستێ، بەشێک لەم ناچارییە بۆ ئەو ڕێگرییە کۆمەڵایەتییانە دەگەڕێتەوە کە کچ و کوڕ لە دایک جیا دەکاتەوە هەر کە دەگەنە قۆناغی نەرزەبوون، بەشێکیش لەم ناچارییە بەهۆی ڕوودانی ئەو گۆڕانکارییە جەستەییانەوەیە کە لەم قۆناغەدا ڕوو دەدەن، کە ئەم گۆڕانکارییانە وا دەکەن وێنەی هەرزەکار لای خۆی دەشێوێنن و وا دەکەن لە توخمە دژەکەی دوور بکەوێتەوە، واتە کوڕ لە کچ و کچیش لە کوڕ دوور دەکەوێتەوە. لەبەر ئەوە بەهۆی ئەم هۆکارانەوە و سەرباری ئەو چالاکییە هاوبەشانەی کە لە نێوان کچان یان کوڕانی نەرزەبوودا هەیە، هەرزەکار بە تەواوەتی ڕووەو جەختکردنەوە و سەقامگیرکردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ هەرزەکارانی هەمان توخمەکەی خۆیدا ئاڕاستە دەگرێ. لەم حاڵەتانەشدا شتێکی

سروشتییە ئەم پەیوەندییانەی لەگەڵ توخمەکەی خۆیدا بۆ دەرچوونی وزە سێکسییە پێداگرەکەی بەکاربێنێ، ئەمەش لەڕێی ماستەربەیشنەوە کە خۆی بە مەبەستی دەرچوونی ئەو وزە سێکسییە و چێژبینین، دەست لە ئەندامی سێکسیی خۆی دەدات، یان لەگەڵ هەرزەکارانی هاوڕێیدا بۆ یەکتری دەکەن یان بە هاوبەشی دەیکەن یان لەڕێی پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتییەوە دەیکەن. ئەو پەیوەندییەی کە لە نێوان هەرزەکارانی هەمان توخمدا هەیە، بۆ نموونە لە نێوان کوڕ و کوڕدا یان کچ و کچدا، دەشێ لە چەمکی خۆشەویستیی ئەفلاتوونیی نزیک بێتەوە، هەرچەندە دیاریکردنی جیاوازییەکان لە ڕووی ڕۆحی و جەستەییەوە لەم پەیوەندییەدا، کارێکی ئەستەمە. ڕۆچوونی هەرزەکار بەناو ئەم جۆرە پەیوەندییەدا لەگەڵ هەرزەکارێکی دیکەی هەمان توخمەکەی خۆی، دەرگا بە ڕوویاندا داناخات کە هەریەکەیان لە ڕووی سێکسییەوە بایەخ بە تاکێکی دیکە بدەن کە لە توخمەکەی خۆیان نەبێ، واتە کوڕ لە ڕووی سێکسییەوە بایەخ بە کچ بدات و کچیش بە هەمان شێوە بایەخ بە کوڕ بدات.

ئەم بایەخدانە بە توخمەکەی دیکە، بەپێی بارودۆخی شارستانی و کۆمەڵایەتیی باو و تواناکانی کە لە بەردەستی هەرزەکاردان بۆ مامەڵەکردن و پەیوەندکردن لەگەڵ تاکەکانی توخمەکەی دیکەدا، پەرە دەسێنێ و گەشە دەکات. لە ئەنجامی تێبینیکردن و بەدواداچوونی ژیانی سێکسی لای هەرزەکار، بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم گەشە و پەرەسەندنە بە چەند قۆناغێکدا دەڕوات، بەزۆری، بە سەرسامبوون بە یەک لە دوورەوە دەست پێ دەکات، پاشان دروستبوونی لێشاوێک لە سۆزی خۆشەویستی کە لەسەر کەسێکی دیاریکراو چڕ دەبێتەوە، پاشان ئەوەی دوای ئەم قۆناغە ڕوو دەدات، پشت دەبەستێ بە توانا و ئاستی

پەیوەندیکردن، ئەم توانایەش ڕێسا کۆمەڵایەتییە باوەکان دیاری دەکەن.

ئەو شێوازی پەیوەندییەی کە لە کۆمەڵگەکانی ئێمەدا لەنێو هەرزەکاراندا باوە، ئەوەیە هەرزەکار بە قۆناغێک لە هۆگربوون و سۆزدا تێپەڕدەبێ کە بە زۆری ئەو خۆشەویستییە جۆرێکە لە سۆزی ڕۆمانسی و ئامانجی کۆتاییش، تەنیا هاوسەرێتییە، زۆرجاریش زۆربەی ئەم پەیوەندییانە، ئەگەر نەڵێین هەموویان، پەیوەندیی ویژدانین و بەشی بەتاڵکردنەوەی وزەی سێکسی ناکەن، دەشێ ئەم پەیوەندییانە کار بکەنە سەر وزەی سێکسی و بەهێزی بکەن و زیاتر بیورووژێنن و پێداگرتری بکەن، بەڵام نابنە دەروازە بۆ بەتاڵکردنەوەی.

لەبەر ئەوە هەرزەکار لەپێناوی حەوانەوەی خۆیدا و بۆ ئەوەی لەو گرژی و کۆژانە ڕزگاری ببێت کە هۆگربوونە سۆزدارییەکەی بۆی دروست کردووە و ناشتوانێ لەڕێیە ئەم پەیوەندییەوە وزە سێکسییەکەی بەتاڵ بکاتەوە، هەوڵ دەدات لەڕێی ماستەربەیشنەوە خۆی لەو وزە سێکسییە بەتاڵ بکاتەوە، یان لەڕێی پەیوەندییەکی هۆمۆسێکسوالیتی یان سروشتییەوە ئەو کارە بکات.

ئەو قۆناغانەی کە لە ڕێیانەوە ژیانی سێکسیی هەرزەکار پەرە دەسێنێ و گەشە دەکات، لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییە دەروونییانەدا دەگونجێ کە لە دەروونی هەرزەکاردا ڕوو دەدەن.

گەشە و پەرەسەندنیش لە هەردوو بواری ژیانی سێکسی و دەروونیی هەرزەکاردا بە پێویست دادەنرێ بۆ ئامادەکردنی هەرزەکار تا قۆناغی هەرزەکاری ببڕێ و بڕواتە ناو قۆناغی پێگەیشتن و گەورەبوون و بەرپرسیارێتی، بەڵام ئەو بۆچوونەش هەیە کە پێی وایە، ئەم قۆناغە، واتە قۆناغی هەرزەکاری بە ناوەڕۆکە سێکسی و سۆزدارییەکەیەوە، بۆ گەیشتن بە قۆناغی پێگەیشتن و گەورەبوون، بە پێویست دانانرێ، نەتەوە و

کۆمەڵگەی زۆریش هەن کە هیچ دەربارەی قۆناغی هەرزەکاری نازانن و تاک لە قۆناغی منداڵییەوە بۆ قۆناغی پیاوەتی دەگوێزرێتەوە و تەنیا قۆناغی نەرزەبوون دەکەوێتە نێوان ئەم دوو قۆناغەوە، قۆناغی پیاوەتی یان ژنێتیش، ئەو قۆناغەیە کە تاکی پێگەیشتوو بۆ هاوسەرێتی و نەوەخستنەوە ئامادە دەکات. لەبەر ئەوە دەکرێ هەرزەکاری لە ژیانی تاکدا، بە قۆناغێکی شارستانی، نەک بایۆلۆژی دابنرێ، ئەو کاتەی کە ئەم قۆناغەی تیایدا ڕوو دەدات و ئەوەی لەم قۆناغەدا ڕوو دەدات، بە زۆری خەسڵەتەکانی ئەو شارستانییەتە و دابونەریتەکانی ئەو کۆمەڵگەیە لەخۆ دەگرێ. ئەو ئەزموونە سێکسییانەی کە هەرزەکار پیایاندا تێپەڕ دەبێ، وەک زیندەخەونە سێکسییەکانی و ماستەربەیشن و هۆمۆسێکسوالیتی و ڕوخسارەکانی دیکەی گوزارشتکردن بە شێوازێکی سروشتی یان خەماوی، دەشێ هەموو ئەمانە، لەگەڵ نموونە باڵاکانی هەرزەکاردا دژ بوەستن و تووشی بەرکەوتن ببن. چەندە هەرزەکار لە هۆیەکانی دەربڕینی سێکسی خۆی قووڵ بێتەوە، ئەوەندە هەڵەکردن و شڵەژاوی لە ئیحتواکردنی وزە سێکسییەکەی و دانانی ئەو وزەیە لەنێوکۆ و لە چوارچێوەی دروستی خۆیدا و لە تەواوی ژیانی دەروونیدا، زیاتر دەکات. دەشێ ئەم هەڵەیە ببێتە هۆی شێواندنی ئەو وێنە باڵایەی کە لە خەیاڵی خۆیدا بۆ پەیوەندیی نێوان ژن و پیاو هەیەتی. ئەگەر ئەم پەیوەندییە بە پەلەکردن بۆ بەستنی پەیوەندیی هاوسەرێتی لە قۆناغی هەرزەکاریدا کۆتایی هات، ئەوا کارێکی هەڵەیە، چونکە ئەم حاڵەتە دەبێتە ڕێگر لە بەردەم ئەوەی کە بەڕاستی بۆ ژیانی دوارۆژی، دەیخوازێ. بۆ ئەوەی هەرزەکار لە ژیانی سێکسی و دەروونیدا بە گەشەی تەواو و گونجاو بگات، پێویستە سەرەتا کۆنترۆڵی پاڵنەرە سێکسییەکانی بکات و دەستبەرداری پراکتیزەکردن و شێوازە ناکامڵەکانی گوزارشتکردن لە ژیانی

سێکسی ببێ و بەها چەسپا و باوەڕپێکەر و گونجاوەکان لەگەڵ واقیعی کۆمەڵایەتیدا وەربگرێ و هەست بکات لە توانایدایە بە شێوەیەکی سەقامگیر و بەردەوام ئارەزووەکانی لەگەڵ کەسێکدا لە توخمەکەی دیکە بەدی بهێنێ، لەگەڵ پارێزگاریکردن لە ناسنامەی تەواوی خۆی.

### قۆناغی گەورەبوون

دیاریکردنی سنوورەکانی ئەم قۆناغە لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە و ماوەی زەمەنیی ئەم قۆناغە، جیاوازە، ئەم جیاوازییەش بۆ جیاوازی لە ناوەندی تەمەندا دەگەڕێتەوە، واتە کاتێ لە کۆمەڵگەیەک یان لە سەردەمێکدا، قۆناغی تەمەن لە نێوان پەنجا بۆ شەستساڵی بە قۆناغی کۆتایی ژیان دادەنرێ، دەبینین تەمەنی ٧٠ ساڵی بۆ ٨٠ ساڵی هەمان قۆناغ دەنوێنێ لە وڵات و کۆمەڵگەیەکی دیکە، یان لە سەردەمێکی دیکەدا. ئەم سەردەمە هەڵکشانێکی بەردەوام لە سنوورەکانی قۆناغی کۆتایی ژیان بەخۆوە دەبینێ، هەروەها بواری جیاوازی نێوان سنوورەکانی ئەم قۆناغە لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە لە بچووکبوونەوەدایە. لە کۆمەڵگەی خۆرئاواییدا، سەرەتای قۆناغی گەورەیی لە تەمەنی ٦٥ ساڵی دەست پێ دەکات و تا کۆتایی ژیان بەردەوام دەبێ. تاکەکانی لەم قۆناغەی ژیاندان، نزیکەی ١٢%ی کۆی دانیشتووان پێک دەهێنن و وا چاوەڕوان دەکرێ لە سەرەتای سەدەی داهاتوودا بگاتە ٢٥%.

ژیانی سێکسیی تاک لەم قۆناغەدا، بەگشتی لەگەڵ حاڵەتی دەروونی و جەستەیی تاکدا دەگونجێ و تاک لە تەواوی ئەم لایەنانەی ژیاندا، بە شێوەیەکی کاوەخۆ، تەنانەت ئەگەر نەبینراویش بێ، بەرەو داکشان و هاتنەخوارەوە دەڕوات، هەروەک لە هەردوو بواری جەستەیی و دەروونیدا ڕوو دەدات، کۆمەڵێک

فاکتەر بڕیار لەسەر توانستی تاک لەم قۆناغەدا و خێرایی هاتنەخوارەوەی ئەم توانستانەی دەدەن، وەک توانستی تاک لە ڕووی سێکسییەوە بە درێژایی ژیانی پێشووی، هەروەها پێگەی سێکس لە ژیانی ئێستایدا. ئەگەر ژیانی تاک بە شێوەیەکی پۆزەتیڤانە ئەم فاکتەرانەی لەخۆ گرت، ئەوا تاک لەم قۆناغەدا چاوەڕێی ژیانێکی سێکسیی گونجاو لەگەڵ تەمەنی خۆیدا دەکات، تا دەگاتە حەفتا و هەشتاکانی تەمەنیش، زۆرێک لە لێکۆڵینەوەکان پشتگیری لەم بۆچوونە دەکەن و ئاماژە بەوە دەدەن ٧٠%ی ئەو کەسانەی کە تەمەنیان بە ٦٨ ساڵی گەیشتووە و نزیکەی ٢٥%ی ئەوانەی تەمەنیان بە ٧٨ ساڵی گەیشتووە، لە ڕووی سێکسییەوە چالاکن، ئەمەش بە ڕێژەیەکی بەرز دادەنرێ ئەگەر ئەو فاکتەرە نێگەتیڤانە بە هەند وەربگیرێت کە لەم قۆناغەدا مرۆڤ بەهۆی نەخۆشییەوە تیایاندا دەژی.

کۆمەڵێک فاکتەری فیسیۆلۆژی و دەروونی و جەستەیی کە پەیوەندییان بەو نەخۆشییانەوە هەیە کە تاک لەم تەمەنەدا تووشیان دەبێ، کار دەکەنە سەر ژیانی سێکسیی مرۆڤ لە قۆناغی گەورەبووندا، چونکە فاکتەری فسیۆلۆژی بەندە بە هەقیقەتە بایۆلۆژییەکانی ژیان و هەر ئەوەیشە کە گوزارشتیان لێ دەکات. گرنگترین ئەم هەقیقەتانەش ئاڕاستەگرتنی پرۆسە بایۆلۆژییەکانە ڕووەو داکشان و هاتنەخوارەوە لەدوای تێپەڕبوونی قۆناغی گەنجێتی، چونکە هێزی ڕەپبوونی چووک لەم قۆناغەدا، واتە لە قۆناغی گەنجێتیدا دەگاتە ئەوپەڕی، پاش ئەم قۆناغە، دەشێ تاک تا ماوەیەکیش پارێزگاری لەم توانایەی بکات، یان دەست بکات بە لەدەستدانی بەشێکی ئەم توانا سێکسییە، تەنانەت ئەگەر بە شێوەیەکی هەستپێنەکراویش بێ. توێژینەوەکان دەربارەی پێوانەکردنی پلەی ڕەپبوونی چووک لە کاتی خەوتندا، ئاماژە دەدەن بەوەی، ماوەی ئەم ڕەپبوونە لە کاتی خەوتندا لە

مێرمنداڵی تەمەن ١٣-١٥ ساڵی دەگاتە ٣٢%ی کاتی خەوتن، ئەم ماوە زەمەنییە بە شێوەیەکی کاوەخۆ دادەبەزێ و لە تەمەنی ٦٠ و ٦٩ ساڵی تەمەن دەگاتە ٢٠%ی ماوەی خەوتن.

هاتنەخوارەوە و داکشانی بایۆلۆژی لەگەڵ چوون بە تەمەندا چەند ڕوخسارێکی هەیە، وەک ئەستەمی گەیشتن بە ڕەپبوون و دواکەوتنی هاویشتنی تۆو، هەروەها زیادبوونی لاوازبوون لە هێزی تۆوهاویشتن و ئاستەکەیی و زیادبوونی درێژیی ماوەی دووبارە ڕەپبوونەوەی چووکRefractory phase، هەروەها لەگەڵ چوون بەتەمەندا پیاو پێویستی بە وروژاندنی زیاترە تا ڕەپبوون ڕوو بدات. بە سروشتی حاڵ پلەی پێداگری یان پاڵنەری سێکسی بۆ پراکتیزەکردنی سێکس لەگەڵ چوون بەتەمەندا کەم دەکات، هەروەک لە کەمبوونەوەی ڕێژەی پەیوەندییە سێکسییەکان دەبینرێ هەر لە تەمەنی هەرزەکارییەوە تا تەمەنی گەورەیی.

بەڵام لە ڕووی دەروونییەوە، دەشێ ژیانی دەروونیی تاک کار بکاتە سەر ژیانی سێکسی و چالاکی و چێژبینینی کەسی بەتەمەن لە سێکس کەم یان زیاد بکات. زۆرجار زیادبوونی چالاکیی سێکسی و زیادبوونی چێژبینین لە سێکس لە قۆناغی پیربوون و گەورەییدا ڕوو دەدات، چونکە تاک لە خەمەکانی ژیان و بەرپرسیارێتییەکانی منداڵ ڕزگاری دەبێ، هەروەها زیاتر لە یەک تێدەگەن و ئەو لایەن و خاڵانە لە یەکدیدا دەدۆزنەوە کە وا دەکەن پەیوەندیی سۆزداری و سێکسیی نێوانیان بەهێزتر ببێ و زیاتر سەرنجی یەکدی ڕابکێشن، بە شێوەیەک کە پێشتر نەیانتوانیوە. بەم شێوەیە توانای گوزارشتکردنی سێکسییان بە جۆرێک پەرە دەسێنێ کە لە ڕووی جۆر و بڕیشەوە، جیاوازە لەوەی کە لە ڕابردوودا لەسەری ڕاهاتوون، لەبەر ئەوە دەشێ ژن و پیاو تا تەمەنێکی درەنگ، بە شێوەیەکی سروشتی، بەردەوامی بە ژیانی سێکسیی خۆیان بدەن، ئەگەر نەخۆشییەکی جەستەیی نەبێتە ڕێگر

له بەردەم زیندەگی و وزەیاندا. شانبەشانی ئەم فاکتەرە دەروونییە پۆزەتیڤانە، کۆمەڵێ فاکتەری دەروونیی نێگەتیڤ هەن کە دەشێ کار بکەنە سەر ژیانی سێکسیی تاک لە گەورەییدا، وەک متمانەنەکردنی تاک بە توانای سێکسیی خۆی، کەمیی گونجان و سازان لە نێوان ژن و پیاودا، کەمی یان دەگمەنیی فرسەتی ڕوودانی سێکس، تێڕوانینی کۆمەڵگە بۆ ژیانی سێکسی لە تەمەنی گەورەبوون و پیربووندا، کە بە زۆری کۆمەڵگە کارایی و چالاکیی سێکسی لە کەسانی بەتەمەندا ڕەت دەکاتەوە. لە گرنگترین ئەو فاکتەرە نێگەتیڤانەی دەشێ کار بکەنە سەر ژیانی سێکسیی تاک لەم قۆناغەدا، ئەو فاکتەرانەن کە گۆڕانکاری لە ژیانی دەروونیی تاکدا دروست دەکەن بەتایبەتی کاتێ ئەو گۆڕانکارییانە مرۆڤ بەرەو ئاڕاستەی خەمۆکی و دڵەڕاوکێ دەبەن، چونکە خەمۆکی دەشێ وا لە تاک بکات بیر لە سێکس نەکاتەوە و پاڵنەرە سێکسییەکانیشی کەم ببنەوە، هەرچی دڵەڕاوکێیە، بەتایبەتی ئەو دڵەڕاوکێیەی کە بەهۆی ئەو ترسەوە دروست دەبێ، بۆ نموونەهەندێ کەس لەوە دەترسن پەیوەندیی سێکسی ببێتە هۆی تووشبوون بە نەخۆشی یان مردن، لەبەر ئەوە بەتەواوی لەم تەمەنەدا کۆتایی بە پەیوەندیی سێکسی دەهێنن.

فاکتەری سێیەم کە کار دەکاتە سەر ژیانی سێکسیی کەسانی بەتەمەن، بریتییە لە فاکتەری نەخۆشییە جەستەییەکان، کاریگەریی ئەم فاکتەرە پشت بە کەسێتیی نەخۆش دەبەستێ و ئایا نەخۆشی چی دەگەیەنێ لای ئەو، هەروەها سروشت و پلەی نەخۆشییەکەش ڕۆڵی خۆی دەبینێ لە دروستکردنی کاریگەری بۆ سەر ژیانی سێکسی. هەڵوێستی نەخۆش لە حاڵەتی نەخۆشییە جەستەییەکاندا لە نێوان فەرامۆشکردن یان ڕووبەڕووبوونەوە یان حەزکردندایە. هەر نەخۆشییەکی جەستەیی کە تووشی مرۆڤ دەبێ لە پیریدا، دەشێ کاریگەرییەکی جەستەیی یان دەروونیی

لەسەر بەجێ بێڵێت کە بە شێوەیەک لە شێوەکان ڕەنگدانەوەی بۆ سەر پاڵنەر و چالاکیی سێکسی هەبێ، ئەم کاریگەرییە توندتر و زیاتر بەردەوام دەبێ بە بەراورد لەگەڵ کاریگەریی نەخۆشییەکان لە قۆناغەکانی پێشووتری تەمەندا. ماستەرز و جۆنسۆن بابەخی فاکتەری نەخۆشییە جەستەییەکانیان بەم شێوەیە کورت کردووەتەوە (١٩٦٦): "ئەگەر تاک توانیی پارێزگاری لە ئاستی بەرزی چالاکیی سێکسی لە قۆناغەکانی پێشتری تەمەنیدا بکات، بەو مەرجەی نەخۆشیی توند یان درێژخایەن ڕێگر نەبووبێ، ئەوا لە گەورەییدا دەتوانێ لە چێژوەرگرتن بەردەوام بێ و بە جۆرێ لە جۆرەکان گوزارشت لە چالاکیی سێکسیی خۆی بکات تا حەفتاکانی تەمەنی و تەنانەت هەشتاکانی تەمەنیش". پفایفەر Pfeifferئەم بابەتەی بەم شێوەیە پوخت کردووەتەوە و دەڵێ: "بەدەر لە هەندێ نەخۆشیی دیاریکراو، نە لە پیاوی بەتەمەن نە لە ژنی بەتەمەندا، گۆڕانە فسیۆلۆژییەکان پەردە لەسەر سێکس دانادەنەوە، دەشێ نەخۆشییەکی قورس ببێتە هۆی لەکارخستنی توانای سێکسی، بەڵام هیچ نەخۆشییەک ناتوانێ ئەو ڕاستییە ڕەت بکاتەوە کە مرۆڤ بوونەوەرێکی سێکسییە."

هەروەک گولدن (١٩٧٦) دەڵێ: "هەرچەندە تاک کەفتەکار بێ و توانای جووڵەی نەبێ، یان بەهۆی تووشبوونی بە شێرپەنجە یان هەوکردنی جومگەکان، نەخۆشییەکانی دڵ و ئیفلیجبوونی پەلەکانی خوارەوە، تووشی شکستی و تێکچوونی جەستەیی بووبێ، ژن بێ یان پیاو لەوە ناوەستن و لەوە ناچنەوە کە دوو بوونەوەری سێکسین، هەمان چاوەڕوانی و پێویستی و ئارەزووی ئێمەیان بۆ سێکس هەیە."

یەکێک لەو خاڵانەی مەسەلەیەی سێکس و کاریگەریی گەورەبوون و تەمەن بۆ سەر توانا و ئارەزووی سێکس دەوروووژێنێ، بریتییە لە مەسەلەی پەیوەندیی نێوان

زیادەڕۆییکردنی سێکسی لە هەرزەکاری و تەمەنی گەنجێتی و ناوەندی تەمەندا، لەگەڵ کەمبوونەوەی بڕی ئەم توانستە لە گەورەییدا و لە کاتی چوون بەتەمەندا. بۆچوونێکی باو هەیە پێی وایە، هەر تاکێک ڕەسیدێکی دیاریکراوی لە وزەی سێکسی هەیە، زیادەڕۆییکردن لە سەرفکردنی ئەم وزەیە لە تەمەنی پێشتر و زیاتر لە بڕی سروشتی، دەشێ ببێتە هۆی تووشبوون بە پەککەوتنی پێشوەخت، یان لەکارکەوتنی توانای سێکسی، بەڵام بەڵگەیەکی ئەوتۆ نییە ئەم بۆچوونە بیسەلمێنێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە، چالاکی یان کارایی سێکسی لە تەمەنی زووتر و لە گەنجێتیدا دەشێ پێشبینی بێ بۆ بەردەوامیی ئەم توانایە لە گەورەییدا، تەنیا لەو بارانەدا نەبێ کە فاکتەری دیکە بێتە پێشەوە و ببنە هۆی لەکارکەوتنی توانای سێکسی، بۆ نموونە تووشبوون بە هەندێ نەخۆشیی جەستەیی.

بە شێوەیەکی گشتی، خەسڵەتەکانی ژیانی سێکسی لە تەمەنی زووتر و لە گەنجێتیدا، لە گەورەییدا بەردەوام دەبێ لەگەڵ ڕەچاوکردنی فاکتەری تەمەن. ئەوەی هەندێ لێکۆڵینەوەش ئاشکرای دەکەن بە پێچەوانەی ئەوەوەیە کە چاوەڕوان دەکرێ، ١٠% بۆ ٢٠%ی کەسانی بەتەمەن، چالاکیی سێکسییان لە قۆناغی گەورەبوون و چوون بەتەمەندا زیاتر دەبێ بە بەراورد لەگەڵ قۆناغەکانی پێشووتری ژیانیان.

لەو مەسەلانەی دیکەدا کە شایەنی گرنگیپێدانن لەم بابەتەدا، بریتییە لە جیاوازی لە کاریگەریی تەمەن بۆ سەر ژیانی سێکسی لە ژن و پیاودا، زۆربەی لێکۆڵینەوەکان ئاشکرایان کردووە کە گۆڕانە بایۆلۆژییەکان کە زۆربەیان کار دەکەنە سەر نێر، هیچ کاریگەرییەکیان بۆ سەر ژیانی سێکسی مێ نییە. بەگشتی ژن لە پیاو زیاتر توانای هەیە، بەوپەڕی توانستی سێکسییەوە بە ڕێژەی یەک بۆ دوو جار لە هەفتەیەکدا کاردانەوەی بۆ پاڵنەرە

سێکسییەکان هەبێ تا شەست و حەفتاکانی تەمەنیشی. ژن تووشی ئەو پەککەوتنە سێکسییە نابێ کە پیاو تووشی دەبێ و لەدوای تێپەڕین لە پەنجاکانی تەمەن توندتر دەبێ، لەوە دەچێ کەمبوونەوەی یان وەستانی هۆرمۆنەکانی هێلکەدان لە مێ-دا لەدوای تەمەنی نائومێدییەوە، هیچ کار نەکاتە سەر توانا یان چالاکیی سێکسیی ژن. لەبەر ئەوە بۆمان دەردەکەوێ کۆنترۆڵکردنی توانا و چالاکی سێکسی لە ژندا بەهۆی کاریگەریی ئەو هۆرمۆنانەوەیە کە پەیوەندییان بە هێلکەدانەوە نییە، یان بەهۆی کاریگەریی فاکتەرە دەروونییەکانەوەیە، یان بەهۆی کاریگەریی هەردووکیانەوەیە پێکەوە. ئەگەر ژن زۆرێک لە توانا و چالاکیی سێکسی لە گەورەییدا لەدەستیش نەدا، هەر کاردانەوە فسیۆلۆژییەکانی بەرامبەر کارتێکەرە سێکسییەکان لەگەڵ چوون بەتەمەندا، هێواش دەبنەوە، لە ڕوخسارەکانی ئەم لاوازبوون و هێواشبوونەوەیەش، وەک کەمبوونەوەی توانای ژن بۆ تەڕکردنی زێ و لاوازبوونی گرژبوونە ماسوولکەییەکانی کە هاوکاتن لەگەڵ گەیشتن بە ئۆرگازم و هێواشبوونەوەی ڕەپبوونی گۆی مەمک، ئەمانەش پەیوەندییان بە توانای سێکسیی ئەو ژنەوە هەیە و ئایا تا چەند بە بەردەوامی و بە درێژایی ژیانی لە قۆناغەکانی پێشووی تەمەنیدا سێکسی کردووە، چونکە ئەو بەڵگانە هەن کە ئاماژە بەوە دەدەن، وازهێنان لە سێکس بۆ ماوەیەکی زۆر، دەشێ ببێتە هۆی ڕوودانی حاڵەتەکانی پووکانەوە و لاوازبوونی وەڵامدانەوە لە ئەندامە سێکسییەکاندا و ئەمەش دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی پاڵنەرە سێکسییەکان.

# بەشی حەوتەم
# سێکس و هاوسەرێتی

-پەیوەندیی هاوسەرێتی
-ستێرۆتایپەکانی ژیانی هاوسەرێتی
-سێکس و هاوسەرێتی
١-سێکس بەر لە هاوسەرێتی
٢-سێکس لە هاوسەرێتیدا
٣-سێکس لە دەرەوەی هاوسەرێتی
-ژیانی سێکسی و دوارۆژ

# سێکس و هاوسەرێتی

## پەیوەندیی هاوسەرێتی

لەوانەیە کەسی توێژەر نەتوانێ چۆنێتیی دەستپێکردنی ژیانی هاوسەرێتی لە مێژووی مرۆڤدا یان مێژووی دەستپێکردنی دیاری بکات، بەڵام دەتوانین ئەو گریمانەیە بکەین کە ئەمە کاتێ ڕووی داوە کە سێکس لە تەنیا ڕەفتارێکی بایۆلۆژییەوە بۆ پێگەیەکی بەرفراوانتر لە ڕەفتاری ژیاندا گوازراوەتەوە، چونکە لەو کاتانەدا کە مرۆڤ دروست بووە، هەر دەبێ ژیانی سێکسیی لەڕێی پەیوەندیی کتوپڕ و لەبەردەست و سەرپێی نێوان نێر و مێ دیاری کرابێ. لەوانەیە نێر لە پەیوەندیی سێکسیدا شێوازی ڕاوکردنی پیادە کردبێ، هەروەک چۆن لە پێداویستییەکانی دیکەی ژیانیدا ئەم شێوازەی پیادە کردووە، بەڵام ئەوەی لە دەرئەنجامی ئەم پەیوەندییەوە پەیدا بووە، دووگیانی و منداڵبوون بووە کە کەوتوونەتە ئەستۆی ژن، بێگومان بەرپرسیارێتیی چاودێری و پارێزگاریکردنی منداڵیش هەر کەوتووەتە سەر شانی ژن. لە کاتێکی دواتری پەرەسەندنی مرۆڤدا، ئەو ئارەزووە لای نێر پەیدا بوو کە هاوبەشێکی سێکسیی دیاریکراو هەڵبژێرێ و بۆ درێژترین ماوە پارێزگاریی پێوە بکات، سەرهەڵدانی ئەم ئارەزووە سەرەتایەک بوو بۆ هەڵبژاردنی هاوبەشیی سێکسی، کە ئەم سەرەتایە ئاماژە دەدات بە دزەکردن و ڕۆچوونی سێکس بۆ ناو ڕۆح و دەروونی مرۆڤ، هەروەها هەنگاوێکی نوێی پەرەسەندنی مرۆڤ دەنوێنێ کە شێوازی مامەڵەکردنی لەگەڵ ژینگەدا گۆڕی لە مامەڵەکردنێکی هەنووکەییەوە بۆ مامەڵەکردنێکی درێژخایەن، چونکە دەرکی بەوە کرد کە ئەم شێوازە بە شێوەیەکی بەردەوامتر زامنی ڕازیکردنی پێداویستییەکانی دەکات. لەم هەنگاوی

پەرەسەندنەوە لە پەیوەندیی سێکسیدا، بۆمان دەردەکەوێ کە مرۆڤ لە پەیوەندییەکی کاتی و سەرپێییەوە بۆ پەیوەندییەکی درێژخایەن گوازراوەتەوە کە هەڵبژاردن و پارێزگاریکردنی تیادایە ئەمەش سەرەتا بوو بۆ پەیوەندیی هاوسەرێتی، هەمان ئاستی ئەم سەرەتایە لە ژیانی بوونەوەرانی دیکەدا دەبینرێ، بۆ نموونە لە ئەسپ و ئاژەڵی کێوی لە شوێنە سروشتییەکاندا، کە پەیوەندیی سێکسی لەسەر بناغەی پارێزگاریکردن و دەستبەسەرداگرتن و داگیرکردن بەپێی بەرژەوەندی دروست بووە.

هەندێک لە یاساییەکان پێناسەی هاوسەرێتی دەکەن بەوەی کە پەیوەستییەکە، سێ مەبەست دابین دەکات، یەکەمیان خستنەوەی منداڵ. دووەمیان ڕازیکردنی ئارەزووی سێکسی. سێیەمیان هاودەمی و ئەو حەوانەوە و ئاسوودە دەروونییەی پێکەوەژیانی ژن و پیاو هەردووکیان بە یەکدیی دەبەخشن.

لەوانەیە هیچ کەسێ پێناسەیەکی باشتر یان دیاریکراوتری نەبێ بۆ دامەزراوەی هاوسەرێتی لە ژیانی مرۆڤایەتیدا و بایەخی ئەم دامەزراوە لە دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی سروشتیی مرۆڤایەتیدا. هەندێ لە توێژەران پشتیان بەم سێ ڕەگەزە بەستووە لە لێکۆڵینەوە بەراوردکارییەکانیان دەربارەی دامەزراوە جیاوازەکانی هاوسەرێتی لە شارستانی و کۆمەڵگە جیاوازەکاندا. تیرنر Turnner 1970 ئەم سێ ڕەگەزەی بەم شێوەیە شی کردووەتەوە:

پەیوەستییەکی جەستەییە: ئارەزووە سێکسی یان شەهوانییەکان تێر دەکات کە بەوە دەناسرێن پاڵنەر و ئارەزووی هەنووکەییان بۆ ڕازیکردن هەیە.

پەیوەستییەکی دەروونییە: خۆشەویستی و سۆز بەو دوو کەسە دەبەخشێ کە پەیوەندییان لەگەڵ یەکدا هەیە.

پەیوەستییەکی کۆمەڵایەتییە: لە ڕووی یاسایی و ئابوورییەوە ماف و ئەرک و بەرپرسیارێتییە بەردەوامەکانی خێزان کۆتوبەند دەکات و ڕێکیان دەخات.

لەدوای وردبوونەوە لەم سێ ڕەگەزە سەرەکییە کە ناوەڕۆکی هەر ڕەگەزێکیان ئاشکرایە، دامەزراوەی هاوسەرێتی دەشێ تەنیا پشت بە یەکێ لەم ڕەگەزانە ببەستێ و دوانەکەی دیکە فەرامۆش بکات، چونکە دەشێ هاوسەرێتی تەنیا پێویستیی سێکسی دابین بکات و لە ناوەڕۆکی سۆزداری و بەرپرسیارێتیی کۆمەڵایەتی و خێزانی بەدەر بێ، هەروەها دەشێ زامنی پەیوەستیی سۆزداری بکات، بێ ئەوەی پەیوەندیی سێکسی و بەرپرسیارێتیی کۆمەلایەتی یان خێزانی لەخۆ بگرێ، هەروەها دەشێ پەیوەستیی کۆمەلایەتی و خێزانی بەدی بهێنێ، بەلام لە ناوەڕۆکی سێکسی و سۆزداری بەدەر بێ. ئەم توانا و دیاردانە هەموویان لە ژیانی هاوسەرێتیی زۆربەی خەڵکدا هەن، هەروەها هەندێکیان لەگەڵ شێوازی ژیانی هاوسەرێتیی هەندێ لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا، لەیەک دەچن. ڕاپۆرتێکی ڕێژەیی ئاشکرای دەکات کە هیچ بەڵگەیەک لەسەر ئەوە نییە کە بوونی یەکێک لەم ڕەگەزانە بە تەنیا یان بە شێوەیەکی بەهێزتر لەوانی دیکە، لە توانایدا بێ بڕیار لەسەر سەرکەوتنی هاوسەرێتی وەک دامەزراوەیەک بدات، یان لە ڕووی کاتەوە بڕیار لەسەر بەردەوامییەکەی بدات.

ئەوەی لە ژیانی مرۆڤ لە سەردەمی کۆن و نوێشدا و لە کۆمەڵگە شارستانی و سەرەتاییەکانیشدا، بە باشی زانراوە، ئەوەیە ئەو سێ ڕەگەزەی ئاماژەمان پێ دان، واتە ئارەزووی سێکسی، پەیوەستیی سۆزداری و پەیوەستیی کۆمەلایەتی و خێزانی بە منداڵیشەوە، دەشێ لە ژیانی نێر یان مێدا بوونیان هەبێ، بێ ئەوەی دامەزراوەی هاوسەرێتی هەبێ، سەرباری ئەوەی بوونی هەریەکێک لەم ڕەگەزانە دەشێ بەهێزتر بێ لە دەرەوەی

هاوسەریتی. لەوانەیە پێویستیی سێکسی لە دەرەوەی دامەزراوەی هاوسەریتی زیاتر دابین ببێ وەک لەناو دامەزراوەی هاوسەریتی، وەک ئەوەی لە ژیانی زۆرێک لە هاوسەراندا ڕوو دەدات، هەروەها دەشێ پەیوەندیی سۆزداری زۆر توندوتۆڵتر و بەهێزتر بێ وەک لەناو دامەزراوەی هاوسەریتیدا، هەمان شتیش سەبارەت بە پەیوەستیی کۆمەڵایەتی بە ناوەڕۆکە ئابووری و مەعنەوییەکەیەوە، ڕاستە.

لەگەڵ ئەم واقیعەشدا کە دەشێ ئەو ڕەگەزانەی هاوسەریتی پێک دەهێنن، لاوازیش بن و لە دەرەوەی هاوسەریتی، هەریەکە لەو ڕەگەزانە بەهێزتر بن، بەڵام هاوسەریتی لە ڕابردوودا، هەروەها لە ئێستاشدا لای زۆربەی زۆری مرۆڤ، بە چاوپۆشین لە ڕەچەڵەکی شارستانێتی و ئاستی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و ئابوورییان، لە هەموو جۆرە پەیوەندییەکانی دیکە زیاتر قبووڵ کراوە و خوازراوە.

هۆکاری ئەم دیاردەیە بەوە لێک دەدەینەوە، هاوسەریتی لەتوانایدایە نزمترین ئاستی ئەم سێ ڕەگەزە دابین بکات کە هاوسەریتی لە دروستبوونیدا پشتی پێیان بەستووە، بەم شێوەیە لە زۆربەی پەیوەندییەکانی دیکەدا کە لە نێوان ژن و پیاودا هەن، بوونیان نییە، یان لەبەر ئەوەیە کە هاوسەریتی ناسنامەی ئینتیمابوون بۆ ژیانێکی نوێ بە ژن و پیاو دەبەخشێ کە بێ هاوسەریتی ئەمە بەدی نایەت، تەنانەت ئەگەر دوو هاوسەرەکە یان یەکێکیان ناچار بوو نرخی ئەو ئینتیمابوونە بدات، ئەمەش وا لە پەیوەندیی هاوسەریتی دەکات لە ڕواڵەتدا سوودەکانی ئەم پەیوەستییە زیاتر بکات کە دوو هاوبەش لە پەیوەندیی هاوسەریتیدا بەیەکەوە دەبەستێ.

## ستێرۆتایپەکانی ژیانی هاوسەرێتی

لە پرۆسەی سەرهەڵدان و پەرەسەندنی ژیانی هاوسەرێتیدا، مرۆڤ پشتی بە چەندەها شێوازی پەیوەستیی بەستن لە نێوان دوو هاوبەشدا بەستووە، بەو شێوەیەی کە لەگەڵ نەریتی کۆمەڵایەتی و بۆچوونی ئایینیدا بگونجێ.

لەگەڵ ئەو جیاوازییە ئاشکرایەی کە لەنێو نەریتە کۆمەڵایەتی و بۆچوونە ئایینییەکاندا بە درێژایی سەردەمەکان و تا ئێستاش هەیە، ئاراستەی زاڵ لە ژیانی مرۆڤایەتیدا بریتییە لە کۆکردنەوەی ژن و پیاو لە یەک ماڵدا و بە هاوبەشیی چاودێریکردنی ئەو منداڵانەیە کە لەم پەیوەستییەوە پەیدا دەبن. ئەم پەیوەستییەش لە نێوان هاوسەراندا پێویستی بە ئەنجامدانی کۆمەڵێک ڕێوشوێن و مەراسیمی پێویست هەیە کە گرێبەستی نێوان هەردوو لایەنی پەیوەستییەکە دەسەلمێنێ، وا پێویست دەکات هەردوو لایەن، واتە ژن و پیاوەکە بە دەقی ڕۆحی ئەو گرێبەستەوە پابەند ببن، ئیدی ئەو گرێبەستە نووسراو بێ یان هەڵگری ناوەڕۆکی سروشتیی پەیوەندیی هاوسەرێتی بێ، بەڵام مرۆڤ لە ڕابردوودا لەم ناوەڕۆکەی پەیوەندیی هاوسەرێتی هاتووەتە دەرەوە، هەروەها کەمایەتییەکەش لە خەڵک لە سەردەمی ئێستاماندا لە شێوازی کلاسیکی پەیوەندیی هاوسەرێتی هاتوونەتە دەرەوە، لەبەر ئەوە پەیوەستیی هاوسەرێتی بە چەند ستێرۆتایپێک ناسراوە کە لێرەدا باسی هەندێکیان دەکەین:

١-فرەژنی، لە مێژووی شارستانییەتی عەرەبی و ئیسلامیدا هەبووە، ستێرۆتایپێکە لە ژیانی هاوسەرێتی کە دەشێ لەگەڵ ئەم سەردەمەی ئێستاماندا زۆر ناتەبا بێ، بەڵام هاوشێوەکەی لە شارستانییەتە کۆنەکان و لە ژیانی زۆرێک لە کۆمەڵگە هاوچەرخەکاندا هەیە.

٢-فرەپیاوی، ستیرۆتایپێکە لە ڕابردوودا هەبووە، تا ئێستاش لە هەندێ لە شارستانییەتە هاوچەرخەکاندا پیادە دەکرێ، بەتایبەتی لە باشووری ناوەڕاستی ئاسیا، ژن دەتوانێ زیاتر لە هاوسەرێکی هەبێ و مافی خۆشییەتی کامیان بۆ سێکس هەڵبژێرێ، هەروەها دەتوانێ خۆی یەکێک لەو هاوسەرانەی هەڵبژێرێ و مافی باوکایەتیی منداڵەکەی پێ ببەخشێ و ئەو پیاوەش پێویستە لەسەری وەک منداڵی خۆی چاودێریی ئەو منداڵە بکات و بەخێوی بکات.

٣-هاوسەرێتی چێژ (متعة)، لەم شێوازی هاوسەرێتییەدا، ئەگەر لەم پەیوەندییەدا منداڵ دروست بوو، پیاو هیچ ئەرکێکی چاودێری و بایەخپێدان ناکەوێتە ئەستۆی.

٤-ئەو هاوسەرێتییەی ڕێگە بە ژن دەدات منداڵی لە پیاوێکی دیکە، غەیری هاوسەرەکەی خۆی ببێ. ئەم ستیرۆتایپە لە هاوسەرێتی لە لای عەرەب لە سەردەمی جاهلیدا هەبووە. پاڵنەری ئەم جۆرە هاوسەرێتییە دەستکەوتنی منداڵ بوو لە ڕەچەڵەک و پشتی ئەو پیاوانەی کە بە ئازایەتی و سوارچاکی ناسرابوون.

٥-هاوسەرێتی لەناو کۆمەڵگەی دانیشتووانی دوورگەکانی تروبریاند Trobriand، ستیرۆتایپێکە لە هاوسەرێتی کە ئارەزووی سێکسی بۆ هەردوو هاوبەشەکە بەدەست دەهێنێ، هەروەها خستنەوەی منداڵ دەستەبەر دەکات. ئەم هاوسەرێتییە ئولفەت و سۆز و گەرمی باڵی بەسەردا دەکێشێ، بەڵام قورسایی و بەرپرسیارێتیی بەخێوکردنی منداڵ دەکەوێتە ئەستۆی ژن، پیاو بە تەواوی لە هەموو پابەندبوونێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی، کە بە منداڵەوە دەیبەستێتەوە، ئازادە.

٦-هاوسەرێتیی کۆمەڵگەی ئاکان Akan، لەم هاوسەرێتییەدا هەموو هەنگاو و مەراسیمی بەستنی پەیوەندیی خۆشەویستیی نێوان کچ و کوڕ بە مەبەستی هاوسەرێتی و دەستنیشانکردن و

دەستگیرانی و ڕازیبوونی بنەماڵەی هەردوو لا و پێشکەشکردنی دیاری پیادە دەکرێ، بەڵام ژن و پیاو بە جیا دەژین، ژن لە ماڵەباوانی دەمێنێتەوە و هەروەها پیاویش لە ماڵەباوانی خۆی. ژنەکە شەوانە سەردانی هاوسەرەکەی دەکات و بەشێ لەو خواردنە لەگەڵ خۆیدا دەبات کە لە ماڵە باوانی دروستی دەکات، کە منداڵیش دروست بوو، هەردووکیان بە هاوبەشی بەخێوی دەکەن، بەڵام لەژێر چاودێریی باوکی ژنەکە یان براکانی دەمێنێتەوە. ئەم ستیرۆتایپە لە هاوسەرێتی وەک دەردەکەوێ، پیاو لە بەرپرسیارێتیی یاسایی و ئابووری ئازاد دەکات، هەروەها پرۆسەی کۆتاییپێهێنانی هاوسەرێتی ئاسان دەکات، لە کاتێکدا کە پەیوەندیی هاوسەرێتیی نێوان ئەو ژن وپیاو لە خۆشەویستی و سۆز و سەرنجڕاکێشانی یەکدی و ئارەزووی سێکسی بەتاڵ دەبێتەوە، ئەمەش هیچ پابەندبوونێک ناخاتە ئەستۆی هیچ لایەنێکیان، چونکە لەدوای جیابوونەوە، بنەماڵەی دایک، واتە ماڵەباوانی ژنەکە، نەک ئەو خێزانەی کە ژن و پیاوەکە دروستیان کردووە، دەبێتە یەکەی یاسایی و ئابووریی هەمیشەیی بۆ منداڵەکە و ژنەکەش.

٧- هاوسەرێتیی بە کۆمەڵ. لەم هاوسەرێتییەدا چەند تاکێک لە هەردوو توخمەکە، بەشداریی تیادا دەکەن. ئەم جۆرە هاوسەرێتییە لەم سەردەمی ئێستاشدا لە هەندێ لە کۆمەڵگەکاندا هەر هەیە، بەڵام ژمارەیان تەنیا بە چەند هەزارێک دەخەمڵێنرێ. لەبەر ئەوەی ئەستەمە گونجان و سازان لەنێو ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیەدا بەدی بهێنرێ. لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ئەم هاوسەرێتییە لەدوای چەند هەفتەیەک یان چەند مانگێک شکست دەهێنێ.

٨- هاوسەرێتیی ئاڵوگۆڕکاری Swinging، ژن و پیاو لەم هاوسەرێتییەدا پەیوەندیی هاوسەرێتییان لەگەڵ ژن و پیاوێکی دیکە کە هاوسەری یەکدین دەگۆڕنەوە. ئەم جۆرە هاوسەرێتییە لە

ڕابردوودا هەبووە و لە سەردەمی جاهلیدا باو بووە. ئەم ستیرۆتایپە لە هاوسەریتی لە هەندێ لە کۆمەڵگە خۆرئاواییەکانیشدا بڵاوبووەتەوە، بەتایبەتی لە ئەمەریکا. ڕێژەی ئەو کەسانەی بەشداریی ئەم جۆرە هاوسەرێتییە دەکەن، لە نێوان ١ بۆ ٢% دەخەمڵێنرێ، زۆربەی ئەم حاڵەتانەی هاوسەرێتی بەخێرایی شکست دەهێنێ.

٩-هاوژیانیی هاوسەرێتی Cohabitation، لەم ستیرۆتایپەی هاوسەرێتیدا ژن و پیاو لە یەک ماڵدا دەژین و لە یەک ژووری نووستندا دەخەون و سێکس دەکەن، بەڵام بێ ئەوەی هاوسەرێتیی شەرعییان کردبێ. ئەم جۆرە هاوسەرێتییە بە زۆری لە ئەمەریکا بڵاوە. ڕێژەی ئەو کەسانەی ئەم هاوسەرێتییە دەکەن لەنێو خوێندکاراندا دەگاتە چارەک بۆ نیوەی خوێندکاران. ئەم ڕێژەیە وردەوردە زیاد دەکات تا دەگاتە ٥٠%ی خوێندکاران لەگەڵ تەواوکردنی خوێندنی زانکۆیاندا.

لە ئەنجامی بەدواداچوونی ئەم جۆرە پەیوەندییە سێکسییەدا دەرکەوتووە، زۆربەی حاڵەتەکانی ئەم هاوژیانییە بە بەستنی پەیوەندیی هاوسەرێتی لە نێوان دوو هاوبەشەکەدا کۆتایی دێ، یان یەکێکیان دەڕوات و پەیوەندییەکی دیکەی هاوژیانی لەم شێوەیە لەگەڵ کەسێکی دیکە دەبەستێ و دواتر بە هاوسەرێتی کۆتایی دێ.

١٠-هاوسەرێتیی کراوە Open Marriage. لەم جۆرە هاوسەرێتییەدا ژن و پیاو بەر لە هاوسەرێتی یان لە سەرەتای هاوسەرێتیدا لەسەر ئەو ڕێکدەکەون کە هەریەکێکیان مافی ئەوەی هەبێ پەیوەندیی سێکسیی لەگەڵ کەسێکی دیکەدا لە دەرەوەی پەیوەندیی هاوسەرێتی هەبێ، بێ ئەوەی ئەم پەیوەندییە سێکسییە کار بکاتە سەر پەیوەندیی سێکسی نێوانیان. لە کۆمەڵگە خۆرئاواییەکاندا ئەم جۆرە هاوسەرێتییە زۆر بڵاوە و بە

هاوسەرێتییەکی نوێ دادەنرێ، چونکە ژن بە زۆری ئەم مافەی بە پیاو داوە، بەڵام ئەوەی تازەیە، پیاو ئەم مافە بە ژن بدات و لە دەرەوەی پەیوەندیی هاوسەرێتی، پەیوەندیی سێکسیی لەگەڵ پیاوێکی دیکەدا هەبێ.

١١-هاوسەرێتیی گرێبەست. ئەم هاوسەرێتییە هەر لە سەرەتاوە پشت بە هەندێ ماددەی دیاریکراو دەبەستێ و بەپێی گرێبەستێک ماف و ئەرکی هەردوو هاوسەرەکە دیاری دەکات، بە لایەنی سێکسییشەوە. پشتبەستن بە گرێبەست لە ژیانی هاوسەرێتیدا شتێکی تازە نییە، چونکە لە دابونەریتی کۆنی عیبریدا، ڕێسای دیاریکراو هەبووە بۆ دیاریکردنی مافە سێکسییەکانی هەریەک لە ژن و پیاو، هەروەها ئەم ڕێسایە کەمترین ڕێژەی سێکسکردنی بۆ هەر توێژێک لە توێژە کۆمەڵایەتییەکانی ناو کۆمەڵگە دیاری کردووە.

شایەنی باسە ژنەنووسەری ناسراو (ئەسیلماننج) بەر لە ٣٠ ساڵ زیاتر بانگەشەی بۆ ئەوە کردووە کە هاوسەرێتی بۆ ماوەیەکی زەمەنیی دیاریکراو ببەسترێ و قابیلی تازەکردنەوە بێ.

## سێکس و هاوسەرێتی

لە هەندێک ئایین و دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکاندا، پراکتیزەکردنی سێکس تەنیا لە چوارچێوەی پەیوەستی هاوسەرێتیدا ڕێگەی پێ دەدرێ. هەر چالاکییەک لە دەرەوەی ئەم چوارچێوەیە ئەنجام بدرێ، یان بە حەرام دادەنرێ، یان بە دژی دابونەریت لەقەڵەم دەدرێ، دەرئەنجامی ئەم دەرچوونەش سزا، یان سەرزەنشتکردن دەبێ، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە ڕووی تیۆرییەوە ئەم دیاریکردنە هەردوو توخمەکە دەگرێتەوە، بەڵام کۆتوبەندەکە لەسەر مێ توندترە، لە کاتێکدا ئەگەر نێر لەم ڕێسا

گشتییە دەربچێت، ئەوا کەمتر بە تاوان دادەنرێ و کەمتر سزا دەدرێ. بەهۆی ئەم باکگراوندەوە لە دیاریکردن و لێخۆشبوون، چەندەها ئاڕاستەی دەرچوون لەم ڕێسایە، سەریان هەڵدا. ئەم ئاڕاستانە لە شارستانییەت و کۆمەڵگە کۆن و هاوچەرخە جیاوازەکاندا ڕووبەڕووی هەڵوێستی جیاواز لە قبوڵکردن و ڕەتکردنەوە بوون، لەگەڵ ئەوەشدا کە مەیلێکی خۆبەخۆ هەیە بۆ ئەو بۆچوونەی کە خەڵک لە ڕابردوودا زیاتر بە ڕێسا ئایینی و کۆمەڵایەتییەکانەوە لە ڕووی هاوسەرێتی و سێکسەوە پابەندبوون. بەڵگەکان ئەوە دەسەلمێنن کە هەر دەرچوونێکی هاوچەرخ لەم ڕێسایانە، لە ڕووی بڕ و جۆریشەوە هاوشێوەی لە ڕابردوودا هەبووە، بەڵام دەرچوونی مرۆڤی هاوچەرخ لە ڕێسا کلاسیکییەکان سەبارەت بە ڕەفتاری سێکسی، لای ئێمە سەرنجڕاکێشەرترە و ئاشکراتریشە بە بەراورد لەگەڵ ڕابردوودا، هەروەها بەهۆی هۆیەکانی ڕیکلام (ڕەواجپەیداکردن) و ڕاگەیاندنی هاوچەرخ کە هاوشێوەیان لە ڕابردوودا نەبووە، زیاتر ئەم دەرچوونە لە ڕێساکان دیارتر و ئابڕووبەرترە. بۆ ئەوەی دەربارەی ئەم لایەنەی سێکس وێنەیەکی ئاشکرا بخەینە ڕوو، لە سێ بواردا باسی دەکەین، کە ئەمانەن:

یەکەم: سێکس بەر لە هاوسەرێتی. دووەم: سێکس لە پەیوەندیی هاوسەرێتیدا. سێیەمیشیان: سێکس لە دەرەوەی پەیوەندیی هاوسەرێتی. بەهۆی نەبوونی توێژینەوەی ئاماری دەربارەی ئەم بووارانەی ڕەفتاری سێکس لە کۆمەڵگەکانماندا، لێرەدا تەنیا ئەو زانیاری و بەڵگانە دەخەینە ڕوو کە دەربارەی ئەم بابەتە لە کۆمەڵگەکانی دیکەدا بەدەستکەوتوون.

### ١- سێکس بەر لە هاوسەرێتی:

لێکۆڵینەوەکان ئاماژە دەکەن سالی ١٩٢٩ لە کۆمەڵگەی ئەمەریکیدا ٥٤%ی کوڕان بەر لە هاوسەرێتی، سێکسیان کردووە، ئەم ڕێژەیە بەرزبووەتەوە بۆ ٩٨% لە سالی ١٩٤٨دا، لەو کەسانەدا کە هێشتا خوێندنی دواناوەندییان تەواو نەکردووە. ڕێژەی ئەو کچانەش کە بەر لە هاوسەرێتی سێکسیان کردووە لە سالی ١٩٢٩، ٣٥% بووە و لە سالی ١٩٤٨دا بۆ ٥٠% بەرزبووەتەوە. لە لێکۆڵینەوەکانی سالانی ١٩٧٤-١٩٧٨ بەرزبوونەوەیەکی تێبینیکراویان لەم ڕێژانەدا تۆمارکردووە لەنێو خوێندکارانی کۆلێژ و زانکۆکاندا. لە کچاندا ڕێژەکە بۆ ٦١-٧٧% بەرزبووەتەوە و لە کوڕانیشدا بۆ ٧٠-٩١%. لە ڕاپرسییەکدا کە گۆڤاری Playboy لە سالی ١٩٧٣دا ئەنجامی دا، ڕێژەی نێوان ژنان و پیاوان نزیکبوون لە یەکەوە، ڕاپرسییەکە ئاشکرای کرد ٨٤%ی پیاوان کە تەمەنیان لە سەروو ٥٥ ساڵەوە بووە، هەروەها ٩٥%ی ئەو پیاوانەی خوار ٢٥ سال بوون بەر لە هاوسەرێتی سێکسیان کردووە، ژنانیش کە تەمەنیان لە سەروو ٥٥ ساڵەوە بووە ٣١% و خوار ٢٥ سالی ٨١%یان بەر لە هاوسەرێتی سێکسیان کردووە. ئەم لێکۆڵینەوەیە ئاماژە بە بەرزبوونەوەی ڕێژەی ئەو کچانە دەکات کە بەر لە هاوسەرێتی، سێکسیان کردووە. لە لێکۆڵینەوەیەکی دیکەدا لە ئینگلتەرا سالی ١٩٦٣، پرسیارێک ئاڕاستەی دوو هەزار کچ و کوڕ کراوە، ئایا سێکسکردن بەر لە هاوسەرێتی لە هەموو حاڵەتێکدا هەڵەیە؟ ٥٩%ی کچان و ٢٩%ی کوڕان بە (بەڵێ) وەلامیان داوەتەوە. لە لێکۆڵینەوەیەکیشدا لە سالی ١٩٧٠ هەمان پرسیار ئاڕاستەی کۆمەڵێکی نوێ لە کچان و کوڕان کرا، ١٥%ی کچان و ١٠%ی کوڕان بە هەمان شێوە بە (بەڵێ) وەلامیان دایەوە، ئەمەش گۆڕانێکی گەورە لە هەڵوێستی خەڵک دەربارەی سێکس بەر لە

هاوسەرێتی تێبینی دەکرێ. لەوانەیە کۆمەڵگەی سویدی لە هەموو کۆمەڵگەکانی دیکەی خۆرئاوا، زیاتر ڕێسای پاراستنی پاکیزەیی تا کاتی هاوسەرێتی بشکێنێت، بەتایبەتی بۆ مێ، چونکە یاسا ڕێگەی بە ئازادیی سێکسی بە مێ داوە و پێی وایە: "ئەو هاوکێشە کۆنەی کە پاکیزەیی کچی بەر لە هاوسەرێتی بە کارێکی باش دادەنا، ئاوابوو". بەپێی یاساکان لە سوید، ڕۆشنبیریی سێکسی خرایە ناو قووڵایی پرۆگرامەکانی خوێندن و فێربوون لە کچان و کوڕاندا، هەروەها فێرکردنی مێ کە چۆن ڕێگە لە دووگیانی بگرێ و ڕاهێنانی هەردوو توخمەکە لەسەر چاودێری و بەخێوکردنی منداڵ، هەروەها ددانتنان بە مافی ئازادیی سێکسی بەر لە هاوسەرێتی بۆ هەردوو توخمەکە، هەروەها یاسا ڕێگەی بە مێ داوە کۆرپەلەکەی لەبارببات ئەگەر نەیەوێ، یان بە شەرعی پارێزگاریی لێ بکات.

بابەتی ڕێگەدان بە سێکس و ئیباحەتی سێکسی، یان چاوپۆشین لێی بەر لە هاوسەرێتی، مشتومڕی زۆری لەسەرە. پاساوی ئەو ڕایانەی کە پشتیوانی لە ڕێگەدان بە سێکس بەر لە هاوسەرێتی دەکەن، ئەوەیە پێیان وایە ئازادیی سێکسیی تاک لە چەپاندن و دەرئەنجامەکانی چەپاندن، وەک گرژان و پشێویی دەروونی یان ڕەفتاری، ڕزگار دەبێ، یان پێیان وایە سێکسکردن بەر لە هاوسەرێتی ئەزموونێکی پێویستە بۆ هەریەک لە ژن و پیاو تا دواتر لە هاوسەرێتیدا ئەم پەیوەندییە لە ئاستی چاوەڕوانییەکانی خۆیاندا بێ، پاشان هانی بەستنی پەیوەندیی هاوسەرێتیی بەردەوام دەدەن. ئەو تێڕوانینە لە سوید زاڵە کە پێی وایە سێکس بەر لە هاوسەرێتی، ڕەفتارێکی قبوڵکراوە، ژن یان پیاو لەو ماوە زەمەنییەدا کە گەشەی تیادا دەکات بوارێکی باشە بۆ تاقیکردنەوەی ژیانی هاوسەرێتی بەر لەوەی بە ڕاستی بچنە ناو ئەم ژیانەوە.

ئەم تێڕوانینەیان لەو ڕایەدا پوخت دەکەنەوە کە پەیوەندیی سێکسی بەر لە هاوسەریتی بەتایبەتی پەیوەندیی جێگیر، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا دەبێتە پەیوەندیی هاوسەرێتیی بەردەوام، ئەوانەش کە سێکس بەر لە هاوسەرێتی ڕەت دەکەنەوە، پاساویان ئەوەیە، ئەمە ئاڕاستەیەکە بەرەو زیادەڕۆیکردن لە سەرفکردنی وزەی سێکس و دابەزاندنی بەهای مەعنەوی و تایبەتمەندێتی و پیرۆزیی سێکس لە ژیاندا، هەندێکیشیان پێیان وایە، ڕێگەدان و چاوپۆشیکردن لە سێکس بەر لە هاوسەرێتی، وا دەکات کە سێکس ڕۆڵی خۆی لە ژیاندا وەک فاکتەرێکی سەرەکی لە پرۆسەی پەرەپێدان و داهێناندا لەدەست بدات و دەبێتە هاندەر بۆ ئارەزووکردنی فرەجۆری و فرەسێکسی لەدوای بەستنی پەیوەندیی هاوسەرێتیش و لە دەرەوەی پەیوەندیی هاوسەرێتی، کە ئەم پەیوەندییانەش بێگومان کێشەی زۆریان بەدواوە دەبێت، وەک لەدایکبوونی منداڵی ناشەرعی، یان نەخوازراو و لەدایکبوونی منداڵ لە ئەنجامی پەیوەندیی سێکسیی سەرپێیی و ئەو پەیوەندییانەی کە لای ژن یان پیاو یان لای هەردووکیان بێمانان. لەوانەیە یەکێک لە گرنگترین ئەو ڕەخنانەی ڕووبەڕووی پراکتیزەکردنی سێکس بەر لە هاوسەرێتی دەبێتەوە، ئەوە بێ، دەشێ چێژی سێکسی لە ژیانی هاوسەرێتی زەوت بکات و بەمەش پەیوەستیی هاوسەرێتی لاواز بێ و ژن و پیاو زوو تووشی بێزاری ببن لە پەیوەندیی سێکسی لە ژیانی هاوسەرێتیدا، بەڵگەشیان لەسەر ئەمە بەرزبوونەوەی ڕێژەی تەڵاق و کورتیی ماوەی زەمەنی پەیوەندیی هاوسەرێتییە لای ئەو کەسانەی کە بەر لە هاوسەرێتی و لە تەمەنێکی زوودا و بە زۆری و لەگەڵ چەندەها کەسدا سێکسیان کردووە.

**٢- سێکس لە هاوسەرێتیدا:**

پەیوەستیی هاوسەرێتی بۆ مێ بەرفراوانترین بوارە بۆ پەیوەندیی سێکسی و لە هەموو پەیوەندییەکی دیکەش زیاتر بەردەوامیی هەیە. هەرچەندە ئەم دۆخە بۆ نێریش هەر وایە، بەڵام لە سنوورێکی بەرتەسکتردا. تا ماوەیەکی نزیک لە ئێستا لە زۆرێک شارستانی و کۆمەڵگەکاندا، لە ژیانی هاوسەرێتیدا بە جۆرێ تەماشای سێکسیان دەکرد کە تەنیا هۆکارێکە بۆ خستنەوەی منداڵ، هەروەها سیمبولە بۆ پەیوەستیی خێزانی. لە پەیوەندیی سێکسیشدا بە جۆرێ لە پیاو دەڕوانرا کە ڕۆڵی ئیمتیازی هەیە و خاوەنی مافە، ژنیش ڕۆڵی گوێڕایەڵی دەبینێ و پێویستە ئەرکی خۆی بەجێ بهێنێ. لەم چەند دەیەی پێشوودا، گۆڕانکاری بەسەر ئەم هاوکێشە ناهاوتایەدا لە نێوان ژن و پیاودا هات. ئیدی لەسەر بناغەی هاوتایی لە ماف و ئەرکەکان لە نێوان ژن و پیاودا تەماشای هاوسەرێتی و پەیوەندیی سێکسیی نێوان ژن و پیاو کرا.

لێکۆڵینەوەکانی لە شێوەی ڕاپرسیدا ئەنجام دراون، ئاماژە بەوە دەدەن ڕێژەی ئەنجامدانی سێکس لە نێوان هاوسەرەکاندا بەرزبووەتەوە، بە بەراوردکردنی لەگەڵ ڕابردوودا. هۆکاری ئەمەش تەنیا لەسەر هاوتابوون لە نێوان دوو توخمەکەدا لێک نادرێتەوە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە لە ئێستادا مێ بەرامبەر مافە سێکسییەکانی هۆشیارترە، هەروەها بەرامبەر دەرئەنجامە نەخوازراوەکانی سێکس ئازادترە، ئەویش بەهۆی ڕێگرییەکانی دووگیانی و توانای لەباربردنی کۆرپەلە.

دەرئەنجامی هەموو ئەم گۆڕانکارییانەش، ئەنجامدانی سێکس لە نێوان هاوسەرەکاندا بە ڕێژەی ٢٥% لە قۆناغە جیاوازەکانی تەمەندا، بەرزبووەوە، بە ڕەچاوکردنی ئەوەی ژمارەی ئەنجامدانی

کرداری جووتبوون بە شێوەیەکی بەردەوام لەدوای بیست ساڵی کەم دەکات، بەتایبەتی لە ژندا.

بە ڕای برناردشۆ هاوسەرێتی جۆرێکە لە ڕێکخستن بە ئامانجی زیادکردنی سەرنجڕاکێشانی سێکسی و زیادکردنی فرسەتی ئەنجامدانی لە واقیعدا. ئەوەی گومانی تیادا نییە ئەم ڕێکخستنە، واتە هاوسەرێتی، ئەو دوو ئامانجە بەدی دەهێنێ، بەڵام ئەوەی لە هاوسەرێتیشدا ڕوو دەدات، فرسەتی بەدیهێنانی سێکسی بەردەوامە تا چەندە ئەو هاوسەرێتییە بەردەوام بێ، بەڵام سەرنجڕاکێشان و حەزی هاوسەرەکان بۆ ئەنجامدانی سێکس لەگەڵ یەکدا بەرەو کەمی دەچێ، ئەمەش لە پیاودا زیاتر لە ژن ڕوو دەدات. ئەم کەمبوونەوەیە لە سەرنجڕاکێشانی یەکدی دەگاتە ئاستێک کە هەمان وێنا و بۆچوونەکانی برناردشۆیە، سەردەمێک لە ژیانی هاوسەرێتی دەست پێ دەکات کە فرسەت بۆ سێکسکردن دەگاتە ئەوپەڕی، بەڵام سەرنجڕاکێشانی سێکسی نێوانیان بۆ نزمترین ئاست دێتە خوارەوە.

ئەم ئەنجامە مەسەلەیەکی چاوەڕوانکراوە ئەگەر مەسەلەی هاتنەخوارەوەی پاڵنەری سێکسی لەگەڵ هەڵکشانی تەمەن بە هەند وەربگرین، بەڵام چەندەها هۆکاری دیکە یارمەتیدەرن لە گەیشتن بەم ئەنجامە. لە قۆناغی یەکەمی هاوسەرێتیدا، سێکس ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێ، هەروەک لە ژمارەی ئەو جارانەدا دەردەکەوێ کە ژن و پیاو سێکس دەکەن، هەروەها لە توندی و پەرۆشییان بۆ ئەنجامدانی سێکس و ڕوودانی سێکس لە نێوانیاندا، بەڵام لەگەڵ بەردەوامبوونی ژیانی هاوسەرێتی، ڕۆڵی فاکتەری سێکسی لە ژیانی سێکسیدا کەم دەکات، بەمەش ژمارەی ئەو جارانەی کە سێکس لە نێوان ژن و پیاودا ڕوو دەدات، کەم دەکات، هەروەها پەرۆشی و پاڵنەر بۆ ڕوودانیشی کەم دەکات. بەشێک لە هۆکاری ئەم هاتنەخوارەوەیە لە ڕێژەی سێکسکردن بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە،

پەیوەندیی سێکسیی نێوانیان دەبێتە ڕۆتینی و هیچ تازەبوونەوە و فرەجۆرییەک تیایدا ڕوو نادات، هەروەها ئەو ڕەگەزی سەرنجڕاکێشان و وورووژاندنەی تیادا نییە کە لە پەیوەندییە نوێ و ئەستەم یان لادەرەکاندا هەیە. سەرباری ئەم فاکتەرە دەروونییانە هۆکارەکانی دیکەی ژیانی ڕۆژانە کار دەکەنە سەر پەیوەندیی سێکسیی نێوان ژن و پیاو، بۆ نموونە ئەو گیروگرفتانەی کە لە نێوان هاوسەرەکاندا ڕوو دەدەن کە ئاماژەن بۆ جیاوازیی ڕوانگەی ژن و پیاو، ئەمانەش دەشێ ببنە هۆی ڕوودانی گرژی و ناکۆکی لە نێوانیاندا کە بێگومان کاردانەوەی بۆ سەر حەز و ئارەزووی سێکسی نێوانیان دەبێ.

هاتنەخوارەوە و داکشانی ئارەزووی سێکسی لە نێوان هاوسەراندا دەبێتە هۆی هەستکردن بە شکستی و گرژی، ئەم هەستەش لەوانەیە ببێتە هۆی دەرکەوتنی هەندێک لە ڕوخسارەکانی پەککەوتنی سێکسی لە هەریەکەیاندا، وەک: لاوازبوونی توانای ڕەپبوون لە پیاودا، کەمبوونەوەی جارەکانی گەیشتن بە ئۆرگازم لە ژندا، هەروەها زیادبوونی پلەی هەر پەککەوتنێکی سێکسی کە خۆی هەبووبێ لە هەریەکەیاندا. بەگشتی ژن لە پیاو زیاتر پێویستی بە دابینبوونی فاکتەرە دەروونی و سۆزدارییەکان هەیە تا بورووژێ و لە ڕووی سێکسییەوە تێر و ڕازی ببێ. یەکێک لەو لێکۆڵینەوانەی کە لە ڕێی ڕاپرسییەوە ئەنجام دراوە (١٩٧٨)، ئەم واقیعە ئاشکرا دەکات و ئاماژە بەوە دەدات کە ١٥-١٧%ی ژنان بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ مێردەکانیاندا بە ئۆرگازم ناگەن، ٢٤ بۆ ٤٨%یشیان بە قورسی بە ئۆرگازم دەگەن، واتە تەنیا لە نیوەی ئەو جارانەدا بە ئۆرگازم دەگەن کە سێکسی تیادا ڕوو دەدات، تەنیا ٣٧%ی ژنان هیچ جۆرە پەککەوتنێکی سێکسییان نەبووە.

هاتنەخوارەوە و داکشانی سەرنجکێشکردنی سێکسی لە نێوان هاوسەرەکاندا لەگەڵ تێپەڕبوونی کات، دەشێ فاکتەری سەرەکی بێ بۆ جیابوونەوە یان تەڵاق لە نێوان هاوسەرەکاندا. زۆربەی حاڵەتەکانی تەڵاق لەدوای تێپەڕبوونی شەش ساڵ بەسەر هاوسەرێتیدا ڕوو دەدەن.

ئەم ماوەیەش بەشی ئەوە دەکات هاوسەرێتی بە قۆناغی یەکلاییکەرەوەی هەستکردن بە شکستی سێکسی بگات.

کاتێ هاوسەرێتی بەم قۆناغە دەگات، ئەگەری ڕوودانی تەڵاق زیاتر دەبێ لە ئەگەری بەردەوامبوونی پەیوەندیی هاوسەرێتی، بۆ نموونە لە ئینگلتەرا لە هەر هەشت پەیوەندییەکی هاوسەرێتی، یەکێکیان بە تەڵاق کۆتایی دێ. لە ئەمەریکا ڕێژەکە بەرزتر دەبێتەوە و لە هەر چوار هاوسەرێتییەک، یەکێکیان بە تەڵاق کۆتایی دێ. لە کۆمەڵگەکانی دیکەشدا، بە کۆمەڵگە کلاسیکی و کۆنەپارێز و دواکەوتووەکانیشەوە، بەڵگەکان ئاماژە دەدەن بە بەرزبوونەوەی ڕێژەی تەڵاق بە بەراورد لەگەڵ ڕابردوودا. ئەوەی گومانی تیادا نییە، هۆکاری زیادبوونی ڕێژەی تەڵاق بەم شێوەیە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ژیانی سێکسی لە پەیوەندیی هاوسەرێتیدا نەیتوانیوە بەردەوامیی ئەو پەیوەندییە بپارێزێ، ئەمە هۆکاری سەرەکیی ئەم زیادبوونەیە، بەڵام لە ڕواڵەتدا پاساوی دیکەی بۆ دەهێنرێتەوە.

ئەوەی پشتیوانی لەم بۆچوونە دەکات ئەو ڕاستییەیە، ئەگەر یەکێک لەو دوو هاوسەرە جارێکی دیکە هاوسەرێتیی کردەوە، ئەوا سەرلەنوێ، تەنانەت ئەگەر بۆ ماوەی چەند ساڵێکیش بێ، ورە و پەرۆشیی سێکسی و توانستی سێکسیی بۆ دەگەڕێتەوە. هەندێ لە توێژەران سەبارەت بە پەیوەندیی نێوان سێکس و هاوسەرێتی، پێیان وایە، بەردەوامیی ئەم جۆرە میتۆدە لە پەیوەندیی سێکسیی ژیانی هاوسەرێتیدا، دەشێ ببێتە هۆی

زیادبوونی ڕێژەی ئەو هاوسەرانەی کە دوای ماوەیەکی کورت لە ژیانی هاوسەریتی لە یەکدی جیادەبنەوە و پاشان پەیوەندییەکی نوێی هاوسەریتی دەبەستن.

بەم شێوەیە دەشێ چەند جارێ ئەمە دووبارە بێتەوە. ئەم دیاردەیە لە کۆمەڵگە هاوچەرخەکاندا باوە، ئەمەش دەشێ هەڕەشە لە دامەزراوەی هاوسەریتی بکات کە بە زۆری لە زۆربەی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە زیاتر ناسراوە بە بەردەوامی و مانەوە. یەکێک لە توێژەران دەربارەی ئەم ئەگەرە توانجێکی نووسیوە و دەڵێت: "ئەو سەردەمە دێت کە تیایدا ئەو بڕگەیەی ناوەڕۆکی هاوسەریتی گۆڕانی بەسەردا دێت کە دەڵێ: (بە دڵسۆزی تا مردن) ئەمە دەگۆڕێ بۆ بڕگەیەکی دیکە کە دەڵێ: (بە دڵسۆزی تا مردن، یان وەڕسبوون).

ئەم لایەنە نێگەتیڤانە لە ژیانی هاوسەریتیدا، دەشێ ببنە مایەی دوورکەوتنەوە و ناڕازیبوون لە ژیانی هاوسەریتی، بەڵام واقیع پێچەوانەی ئەمەی سەلماندووە، بۆ نموونە ڕێژەی ئەو کەسانەی لە بەریتانیا بەر لە سەد ساڵ بە هیچ شێوەیەک هاوسەریتییان نەکردووە ٦١% بوون، بەڵام لە ئێستادا ڕێژەی ئەوانەی هاوسەریتییان نەکردووە ٦١% تێپەڕیووە، هەرچەندە واقیعێکی دیکە هەیە ئاماژە بەوە دەدات کە بەردەوامی و جێگیریی هاوسەریتی لە ئێستادا بە بەراورد لەگەڵ سەد ساڵ لەمەوبەر، زۆر کەمترە، بەڵام مەرج نییە جێگیری و بەردەوامیی هاوسەریتی لە ڕابردوودا بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە هاوسەرەکان لەو سەردەمەدا زیاتر لە ڕووی سێکسی و دەروونییەوە قەناعەتیان بە یەکدی هەبووبێ و بە یەکدی ڕازی بووبن، چونکە ئەو قەناعەت و ڕازیبوونە لە سەردەمی ئێستا زیاتر دابین بووە لە پەیوەندیی هاوسەریتیدا ئەگەر لەگەڵ ڕابردوودا بەراورد بکرێ، ئەمەش بەهۆی گۆڕانی ڕوانگە و هەڵوێستی هاوسەران بەرامبەر بە

سێکس و بوونی سازان و گونجانی دەروونی لەنێو هاوسەراندا و هاوتایی و یەکسانیی هاوسەران لە مافی ئازادیی ڕا و هەڵبژاردن و ئارەزوودا. ئەو دژبەیەکییەی لە ئێستادا لە سەقامگیریی ژیانی هاوسەرێتیدا دەیبینین، هەر دەبێ بۆ کارایی ئەم فاکتەرانە بگەڕێتەوە لە ژیانی هاوسەرێتیدا کە هاوێنەی نەبووە لە ڕابردوودا، بەڵام ئەم واقیعە لەو مەترسییە کەم ناکاتەوە کە لەسەر دامەزراوەی هاوسەرێتی هەیە. بەهۆی ئەو ئەستەمی و بەربەرەکانێیانەی ڕووبەڕووی بوونەتەوە، کە ئەگەر ئەم دۆخە بەم شێوەیە بەردەوام بێ، دەشێ ببێتە هۆی لەناوچوونی ئەم پەیوەستییە لە ڕووی چەمکی مێژووییەوە، بوونی زیاتر لە دیاردەیەک ئاماژە بە ڕوودانی ئەم چارەنووسە دەکات، لەبەر ئەوە وا پێویست دەکات پەلە بکرێ لە دۆزینەوەی چارەسەری ئەقڵانی تا ژیانی هاوسەرێتی وەک بچووکترین و گرنگترین یەکەی ناوکی ژیانی کۆمەڵایەتی بمێنێتەوە. هەندێ لە ڕوخسارەکانی دەرچوون لە ڕێسا باو و کلاسیکەکانی ژیانی سێکسی تەنیا بەڵگە نین لەسەر شکستهێنانی پەیوەندیی هاوسەرێتی، هێندەی ئەوەی بەڵگەن لەسەر هەوڵی مرۆڤ بۆ پەرەپێدانی ئەم ژیانە بەو شێوەیەی زامنی بەردەوامی و سەقامگیربوونی بکات، تەنانەت ئەگەر لە ڕواڵەتیشدا ئەم هەوڵانە وا دەرکەوتن کە ڕووەو تێکشکاندنی ئەم ژیانە دەڕۆن و ئامانجیان گۆڕینی ئەم پەیوەندییەیە بۆ ستیرۆتایپی دیکە لە نێوان ژن و پیاودا.

**٣-سێکس لە دەرەوەی هاوسەرێتی:**

لە سەرەتای دانانی شەریعەت و دەرکەوتنی ئایینە ناسراوەکان، جەخت لەسەر بەهای مۆراڵی هاوسەران کراوەتەوە کە لە پەیوەندیی سێکسیی نێوانیاندا دڵسۆز بن بۆ یەکدی و ئەم پەیوەندییە تەنیا لە چوارچێوەی ژیانی هاوسەرێتیدا پراکتیزە

بکەن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم جەختکردنە لە زۆربەی ئایین و شارستانییەتەکاندا هەریەک لە ژن و پیاو دەگریتەوە، بەلام جەختکردنی بۆ مێ زیاتر بووە وەک لە نێر. لەوانەیە بنچینەی ئەم جەختکردنە لە پێویستیی پیاوەوە هاتبێ کە زامنی ئەوە بکات خاوەنی ژنەکەیەتی، هەروەها لەپێناوی زامنکردنی ناسنامەی منداڵەکانی، تا دڵنیا بێت کە منداڵەکانی لە خۆیین. ئەم هەڵوێستە لەو سزایانەدا بە جوانی دەردەکەوێ کە بۆ هەریەک لە ژن و پیاو دانراون، ئەگەر زینایان کرد، یان لە دەرەوەی پەیوەندیی هاوسەرێتی سێکسیان کرد، دەبینیت ژن بە توندی سزا دەدرێ، بەلام ئەگەر پیاو لە دەرەوەی چوارچێوەی ژیانی هاوسەرێتی، پەیوەندیی سێکسیشی هەبێ، سزاکەی فەرامۆش دەکرێ. هۆکاری ئەم لێخۆشبوونەش لە پیاو بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە دیاردەی سێکسکردنی پیاو لە دەرەوەی پەیوەندیی هاوسەرێتی، لە ڕابردوودا لە زۆربەی شارستانی و کۆمەڵگەکاندا بڵاوبووە، بە شێوەیەک ئەستەمە بتوانین بڵێین لە سەردەمی ئێستاماندا پیاو زیاتر لە دەرەوەی پەیوەندیی هاوسەرێتی سێکس دەکات بە بەراورد لەگەڵ ڕابردوو، بەلام ئەوەی گومانی تیادا نییە، سێکسکردنی ژن لە دەرەوەی پەیوەندیی هاوسەرێتی لە سەردەمی ڕابردوودا شتێکی زۆر دەگمەن بووە، ئەگەر بە پەیوەندیی سێکسی پیاو لە دەرەوەی هاوسەرێتی بەراورد بکرێ، یان لەگەڵ سێکسکردنی ژن لە دەرەوەی هاوسەرێتی لە سەردەمی ئێستادا بەراورد بکرێ.

لێکۆڵینەوەکەی کنزی ساڵی ١٩٤٨ ئاماژە بەوە دەدات ٥٠%ی پیاوان لە دەرەوەی چوارچێوەی هاوسەرێتی لەگەڵ لەشفرۆش، یان هاوڕێ کچەکانیان سێکسیان کردووە، لە کاتێکدا ئەم ڕێژەیە لای ژنان تەنیا ٢٠% بووە. لێکۆڵینەوەکەی کینزی ئەوەشی ڕوون کردەوە کە ڕێژەیەکی گەورەی ئەو پیاوانەی ڕۆشنبیرییەکی

زانکۆییان نییە، هەر لە قۆناغێکی زووی گەنجێتییانەوە پەیوەندیی سێکسی لە دەرەوەی هاوسەرێتی پراکتیزە دەکەن، بەڵام لەنێو ڕۆشنبیراندا ئەم ڕێژەیە لە گەورەییدا بەرز دەبێتەوە، بەڵام هەر ناگات بە ڕێژەی ئەو پیاوانەی ئاستی ڕۆشنبیرییان نزمە و لە گەنجێتییەکی زووەوە، لە دەرەوەی ژیانی هاوسەرێتییان سێکس دەکەن.

هەمان لێکۆڵینەوە ئەوەشی خستە ڕوو کە ژن بە دەگمەن لە چەند ساڵی یەکەمی هاوسەرێتییدا، لە دەرەوەی هاوسەرێتی سێکس دەکات، بەڵام لەدوای تێپەڕینی ئەم قۆناغە، وردەوردە ڕێژەی سێکسکردنی ژن لە دەرەوەی هاوسەرێتی بەرز دەبێتەوە.

لێکۆڵینەوەکە ئاماژەی بۆ ئەوەش کرد، ئەو کچەی بەر لە ژیانی هاوسەرێتی سێکس دەکات ئەگەری ئەوە هەیە لەدوای هاوسەرێتیش، لە دەرەوەی ئەم ژیانە سێکس بکات. لە لێکۆڵینەوەکانی دواتردا، فرنچ French (1970) ڕوونی کردەوە، ئەو کچ و کوڕانەی بەر لە هاوسەرێتی و لە قۆناغێکی زووی تەمەندا سێکس دەکەن، لە ئێستادا ڕێژەیان بەرزترە بەراورد لەگەڵ ڕابردوودا، هەروەها ڕێژەی ئەو کچ و کوڕانە کە لە کاتێکی زۆر زوو بەر لە هاوسەرێتی سێکس دەکەن، ئەویش لە بەرزبوونەوەدایە. لێکۆڵینەوەیەکی دیکە کە گۆڤاری Red Bookلە ساڵی 1975دا ئەنجامی داوە، ئاماژەی بەوە داوە ٢٥%ی ژنانی تەمەن ٢٠-٢٥ لە دەرەوەی ژیانی هاوسەرێتی سێکس دەکەن، ئەم ڕێژەیە لە ژنانی تەمەن ٣٥ بۆ ٣٩ ساڵی بۆ ٣٨% بەرز دەبێتەوە، لێکۆڵینەوەکە ئەوەشی خستە ڕوو کە ئەم ڕێژەیە لەو ژنانەدا کە لە دەرەوە کار دەکەن، بەرزترە بەراورد لەگەڵ ئەوانەی ژنی ماڵەوەن. توێژەرەوەکان پێیان وایە ئەم ڕێژانە هێندە بەرز نین کە هەڕەشە لە ژیانی هاوسەرێتی بکەن، هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگێڕنەوە، ئەو بەرزبوونەوە کەمەی لە

ڕێژەکاندا ڕووی داوە، واتە ڕێژەکانیان بەپێی لێکۆڵینەوەکەی گۆڤاری Red Book بەرزتر بووەتەوە، بەراورد لەگەڵ لێکۆڵینەوەکەی کنزی، بەڵام زیادبوونەکە بە شێوەیەکی ڕێژەیی کەمە و ٢٦% بۆ ٣٨% بەرزبووەتەوە، ئەمەش بە کەم دادەنرێ، ئەگەر درێژەی ماوەی نێوان هەردوو لێکۆڵینەوەکە بە هەند وەربگیرێ کە ٣٠ ساڵە، ئەمە وێڕای ئەو گۆڕانکارییە گەورانەی لە هەڵوێستە سێکسییەکاندا لە ماوەی ئەم سی ساڵەدا ڕوویان داوە، هەروەها توێژەرەوەکان پێیان وایە وەستانی زیادبوونی ڕێژەی تەڵاق، پشتیوانی لەو بۆچوونە دەکات کە ژیانی هاوسەرێتی بەرەو سەقامگیری دەڕوات، نەک نەمان.

توێژەرەوەکان لە هەوڵدانیاندا بۆ شیکردنەوەی ئەو پاڵنەرانەی کە هانی ژن یان پیاو دەدەن لە دەرەوەی پەیوەندیی هاوسەرێتی بە شوێن تێربوونی سێکسیدا بگەڕێ، چەند تیۆرێک دەخەنە ڕوو.

یەکێک لەو تیۆرانە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، ئەگەر بەر لە هاوسەرێتی ژن یان پیاو بە ئەزموونێک یان چەند ئەزموونێکی سێکسیدا ڕۆیشتبێ، ئەوا ئەگەری ئەوە بەهێزە لەدوای هاوسەرێتیش پەیوەندیی سێکسیی لە دەرەوەی هاوسەرێتی هەبێت، لەو پاڵنەرانەش کە ناکرێ فەرامۆش بکرێن، پێویستی هەریەک لە ژن و پیاوە بە هەستکردن و چێژوەرگرتن لە هەستی خۆشەویستی کە پێش هاوسەرێتی تیایدا ژیاوە، بەڵام وەک دەزانین لەدوای هاوسەرێتی ئەم هەستانە لای هاوسەرەکان کەم دەبنەوە، ئەمەش دەشێ هانی هەریەکەیان بدات بۆ هەوڵدان بۆ چوونە ناو ئەزموونێکی نوێ، تەنانەت ئەگەر پەیوەندیی هاوسەرێتی لە ڕووی دەروونی و سێکسییشەوە پەیوەندییەکی سەرکەوتووبێ. هەندێکیش پێیان وایە، زامنبوونی پەیوەندیی سێکسی لەناو ژیانی هاوسەرێتیدا، بێزاربوون لەم پەیوەندییە و دووبارەبوونەوەی و بارودۆخی خێزان و گرفت و دۆخە

نێگەتیڤەکانی ژیانی هاوسەریتی، دەشێ هەموو ئەمانە کار بکەنە سەر سەرنجڕاکێشانی سێکسی نێوان هاوسەران و کەمی بکەنەوە، ئەمە سەرباری ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر جەستەدا دێن، بەتایبەتی لە ژندا، کە دەشێ ببنە مایەی گۆڕینی ڕوانینی پیاو بۆ ئەو وێنە جوانەی ژنەکەی، کە بەر لە هاوسەریتی، یان لە سەرەتای هاوسەریتی هەیبووە. هەندێک ئەم دیاردەیە بەوە لێک دەدەنەوە کە ئەم حاڵەتانە گوزارشتن لە تووشبوون بە پشێوییەکی دەروونی.

هەروەها ناکرێ ئەو فاکتەرە گرنگە فەرامۆش بکەین کە هانی ئەم جۆرە پەیوەندییانە لە دەرەوەی هاوسەریتی دەدات، ئەو فاکتەرەش بریتییە لە ڕوودانی حاڵەتێک لە گرژی و پشێوی لە پێکهاتەی دەروونیی هەریەک لە ژن و پیاو، تا ئەو ئاستەی کە یەکێکیان یان هەردووکیان هەستکردن بە هاوژیانی و هارمۆنییەت و ئولفەت لەگەڵ یەکدیدا لەدەست دەدەن، کاتێک ئەمە ڕوو دەدات، هەستکردن بە بۆشایی و بەتاڵی لە ژیاندا دەست پێ دەکات، ئەمەش هانی ئەو هاوسەرە دەدات بۆ ئەوەی لەڕێی پەیوەندییەکی دیکەوە ئەو بۆشاییە سۆزدارییە پڕ بکاتەوە و لێرەشەوە پەیوەندیی سێکسی بەدوایدا ڕوو دەدات.

هەندێکیش پێیان وایە پاڵنەری سێکسی بۆ ئەنجامدانی پەیوندیی سێکسی لە دەرەوەی هاوسەریتی، ئیدی لەگەڵ یەک کەسدا بێ یان لەگەڵ چەند کەسێکدا بێ، هۆکارەکەی بۆ سروشتی مرۆیی دەگەڕێتەوە کە ئارەزووی فرەجۆری و فرەهاوبەشی دەکات لە ژیانی سێکسیدا، هەروەها تەواوی ئەو شتانەی لە ئێستادا دەیبینین، وەک بڵاوبوونەوەی دیاردەی پەیوەندی لای ژن و پیاو، بە ڕووداو یان شتێکی تازە لە مرۆڤدا دانانرێ، هێندەی ئەوەی بەڵگەیە لەسەر بوونی ئەم سروشتە لە مرۆڤدا و هەر کاتێ فرسەت و بارودۆخی بۆ ڕەخسا، ئەنجامی دەدات. لە باکگراوندی

ئەم جۆرە بیروبۆچوونانەوە، لێکدانەوە بۆ چەندها ستیرۆتایپی سێکسی و پەیوەندیی سێکسی لە ناوەوە و دەرەوەی هاوسەرێتی، دەکرێ. لەوانەیە لە گرنگترین ئەم ستیرۆتایپانە، ئەو جۆرە بێ کە بە هاوسەرێتیی کراوە Open Marriage ناسراوە، کە یەکێک لە توێژەران بە "زینای بەمەدەنیکراو" ناوی دەبات، ئێلس Ellis (1973)لە پێناسەکردنی ئەم جۆرە هاوسەرێتییەدا دەڵێ: "ژن و پیاو لەم جۆرە هاوسەرێتییەدا بەر لە هاوسەرێتیی شەرعی، یان لەدوای هاوسەرێتی ڕێکدەکەون لەسەر ئەوەی هەریەکەیان ڕازی دەبێ بەوەی هاوبەشەکەی لە دەرەوەی پەیوەندیی هاوسەرێتی، پەیوەندیی دیکەی هەبێ و بێ هەستکردن بە غیرە، ئەم ڕێککەوتنە دەکەن و لەسەری دەڕۆن."

وەک زانراوە، ئەم جۆرە ڕێککەوتنە لە نێوان هاوسەراندا لە هەندێ لە کۆمەڵگەکاندا، بە ڕاستی بوونی هەیە و دەبەسترێ، ئیدی بە شێوەی نووسراو بێ یان زارەکی یان لە شێوەی ڕێککەوتنێکی بێدەنگدا دەبێ. هەرچەندە ئەو هاوسەرانەی لە ئێستادا کار بەم جۆرە ڕێککەوتنە دەکەن، زۆر کەمن، بەڵام هەندێک پێیان وایە، وا چاوەڕوان دەکرێ کە لە داهاتوودا بڵاوبوونەوەیەکی بەرفراوان بەخۆوە ببینێ. ئەگەر ئەمە ڕووی دا، ئەوا ستیرۆتایپێکی دیکە لە ژیانی هاوسەرێتی دێتە ئاراوە و بە شێوەیەکیش دەبێ کە هەڕەشە لە بنەما سەرەکییەکانی ژیانی هاوسەرێتیی باو دەکات. ئەگەر ئەمە ڕووی دا، ئەوا شێوەیەکی دیکە لە ژیانی کۆمەڵایەتی هەر دەبێ دەربکەوێ، لەگەڵ خۆیشیدا ئەگەرەکانی گۆڕانکاری لە ژیان و شارستانییەتی مرۆڤایەتیدا دەهێنێ.

## ژیانی هاوسەرێتی و دوارۆژ

ئاشکرایە لەم سەردەمەدا گۆڕانکاریی گەورە بەسەر ژیانی هاوسەرێتیدا هاتووە، لەگەڵ ئەوەشدا گۆڕان لە ئاکار و سروشتی ژیانی هاوسەرێتیدا بە درێژایی سەدەکان هەر هەبووە و بەسەر ژیانی هاوسەرێتیشدا جێبەجێ کراوە، بەڵام پلە و بەرفراوانبوونی ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە ئێستادا لەم سەردەمەدا تێبینی دەکرێ، زیاتر و بەهێزترە بەراورد بەو گۆڕانکارییانەی کە لە ڕابردوودا ڕوویان داوە، ئەمەش هەڕەشە لە دوارۆژی چاوەڕوانکراوی ژیانی سێکسی دەکات.

زۆرێک لەو گۆڕانکارییانەی بەسەر ژیانی سێکسیدا هاتوون، دەتوانرێ بە پێشکەوتنی پۆزەتیڤ دابنرێن، گرنگترین خاڵی پۆزەتیڤی ئەم پێشکەوتنە ئەوەیە کە ژن لە ڕووی سێکسییەوە پێگەیەکی هاوتای لەگەڵ پێگەی هاوسەرەکەی بەدەست هێنا، ئەمەش بووە هۆی بەهێزکردنی ژیانی دەروونیی ژن و ژیانی هاوسەرێتی بۆ ژن وای لێ هات ڕۆڵی لەوە زیاتر بێ کە تەنیا ڕۆڵی هاوبەشێکی ناتەواو ببینێ، ئەمەش بووە هۆی دەربەڕینی وزەی سێکسی ژن کە لە ڕووی سێکسییەوە بە تەنیا خۆی ڕازی نەکرد، بەڵکو بوو بەهۆی ئەوەی هاوسەرەکەشی لە پەیوەندیی سێکسیدا لەگەڵیدا چێژی زیاتر ببینێ. ئەمە لە بەرزبوونەوەی ڕێژەی مانگانەی سێکسکردن لەنێو هاوسەراندا دەردەکەوێ، ئەگەر ئەم ڕێژەیە لەگەڵ ڕابردوودا بەراورد بکرێ، هەروەها ئاماژەیەکی پۆزەتیڤی دیکە هەیە، کە بریتییە لە وەستانی بەرزبوونەوەی ڕێژەی تەڵاق لەنێو هاوسەراندا لەم سەدەیەدا، هەندێک بەڵگە هەن کە ئاماژەن بۆ ئەگەری کەمبوونەوەشی. دواجار ڕێژەی ئەنجامدانی هاوسەرێتیش بەرارود لەگەڵ ڕابردوو زیادی کردووە و نزیکەی ٩٨%ی خەڵک درەنگ بێ یان زوو دەچنە ئەم ژیانەوە. لەوانەشە ئەمە بەرزترین ڕێژە بێ کە مرۆڤ

تا ئێستا پێی گەیشتووە. دەتوانرێ تەواوی ئەم بەڵگانە بە ئاماژەی پۆزەتیڤ دابنرێن بۆ چارەنووسی سیستمی هاوسەرێتی لە دواڕۆژدا، شانبەشانی ئەم ئاماژە پۆزەتیڤانە دەربارەی چارەنووسی هاوسەرێتی لە دواڕۆژدا، ئاماژەی دیکە هەن کە توێژەر بە ئێندیکەیتەرێک، یان ڕێنیشاندەرێک دایان دەنێ بۆ ئەو ئەگەرانەی کە هەڕەشە لە دواڕۆژی ژیانی هاوسەرێتی دەکەن. لەوانەیە ئەم ئاماژانە لە دوو سەرچاوەوە سەرهەڵبدەن، یەکەمیان ڕێگەپێدان و چاوپۆشین لە ڕوودانی سێکسکردن بەر لە هاوسەرێتی. دووەمیشیان، ڕێگەپێدان و چاوپۆشین لە ڕوودانی سێکسیکردن لە دەرەوەی پەیوەندیی هاوسەرێتی، بەتایبەتی پیاو.

دەشێ ئەم دوو سەرچاوەیەش. بایەخی پەیوەندیی سێکسیی نێوان ژن و پیاو وەک بناغەیەکی گرنگ بۆ پێکەوەژیانی هاوسەرێتی کەم بکەنەوە.

بەلام هەر هەوڵدانێک بۆ ڕێگەدان و چاوپۆشین لەم دوو سەرچاوەیە لە ڕەفتاری سێکسیدا، پێویستە ئەوە لە بەرچاو بگیرێ کە هەریەکە لە نێر و مێ لە قۆناغێکی زووی تەمەنیانەوە پێویستییەکی پێداگریان بە پراکتیزەکردنی سێکس هەیە، هەروەها دەبێ ئاوڕ لە پێداویستییەکانی هەردوو توخمەکە بۆ فرەجۆری و فرەپەیوەندی لە ڕەفتاری سێکسیدا بدرێتەوە، بەتایبەتی لە پیاودا. وەلانانی ئەو بۆچوونە ئاسان نییە کە پێی وایە پێویستییە سێکسییەکان بەر لە هاوسەرێتی و هەروەها ئاراستەی مرۆڤ بۆ فرەجۆری و فرەپەیوەندی، دەشێ بناغەیەکی بایۆلۆژییان هەبێ کە زاڵبوون بە سەریاندا ئەستەمە لە ژیانی زۆرێک لە خەڵکدا، بەلام ئەم زاڵبوونە دەشێ ڕوو بدات، ئەویش لەو ڕێیەوە کە ژیانی هاوسەرێتی سەرنجڕاکێشتر بێ بۆ هەردوو توخمەکە. بەدیهێنانی ئەم ئامانجە لەوانەیە ڕوو نەدات ئەگەر بەهای مەعنەوی بۆ ژیانی هاوسەرێتی نەگەڕێنرایەوە، هەروەها پێویستە مافی هەڵبژاردن

لەسەر بناغەی زۆرترین گونجان و سازان، بە هەردوو هاوسەر بدریێ، هەروەها دابینبوونی زانیاری و ئازادیی هاوبەشیکردنی سێکسی و دەروونی، بەتایبەتی بۆ ژن و یەکسانبوونی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا، ئەوەی لە ڕەفتاری سێکسی ڕێگەپێدراو لەم سەردەمەدا دەیبینین، وا دەردەکەوێ گەیشتن بەم ئامانجانە ئەستەم بێ، نموونەی زۆر هەن لە شارستانییەتە مێژووییە جیاوازەکاندا، کە ڕێگەدان و زیادەڕۆییکردن لە سەرفکردنی وزەی سێکسی بەسەریاندا زاڵبووە، بەڵام دواتر گەڕاونەتەوە بۆ پیادەکردنی ژیانێکی نموونەیی هاوسەرێتی، ئەگەر لە ڕووی سێکسییشەوە نموونەیی نەبووبێ.

# بەشی هەشتەم
# ژیانی سێکسیی ژن

-پێشەکی
-تێبینی و لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکان
-پاڵنەری سێکسی لای مێ
-وروووژێنەرە سێکسییەکان لای مێ
-شوێنەکانی وروووژانی سێکسی لە جەستەدا
-هۆرمۆنەکان و سێکس
-وەڵامدانەوە سێکسییەکانی مێ
قۆناغی وروووژان
قۆناغی هەڵکشان
قۆناغی ئۆرگازم
قۆناغی هاتنەخوارەوە و دامرکانەوە

-کێشە سێکسییەکانی مێ
١- لەکارکەوتنی چێژ و ئارەزووی سێکسی
أ- لەکارکەوتنی ئارەزوو
ب- لەکارکەوتنی ڕازیبوون و تێربوونی سێکسی
ج- ئەو فاکتەرانەی کار دەکەنە سەر ئۆرگازم

## ژیانی سێکسیی من

لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو پەیوەندییەکی سێکسیی نێوان دوو توخمەکە هەر لە سەرەتای بوونی مرۆییەوە تا ئێستا بە هاوبەشیی نێوان نێرومێ بەڕێوەچووە، بەڵام ئێمە تا ئێستا لە تاریکیدا دەژیین و لە ژیانی سێکسیی ژن تێنەگەیشتووین بەراورد لەگەڵ ئەوەی دەربارەی خەسڵەتەکانی ئەم ژیانە لای پیاو دەیزانین. تێنەگەیشتن یان بە هەڵە تێگەیشتن لەم واقیعە، هۆکاری خۆی هەیە، زۆربەیان پەیوەندیی بە توانای دەستبەسەراگرتن و خاوەندارێتی و بەرگریکردنی پیاوەوە هەیە لە ژن، هەروەها پێویستیی ژن بۆ چاودێری و پاراستن، کە بڕوا وا بووە تەنیا پیاو دەتوانێ ئەمانەی بۆ دابین بکات. لە سەرەتای دابەشکردنی ئەم ڕۆڵانەی ژیان، پیاو بۆ دابینکردنی ژیان و زامنکردنی پێویستییەکانی ژیان هەوڵی داوە و بەرەو ئەو ئاڕاستەیە ڕۆیشتووە، ژنیش ڕووەو دابینکردنی پێویستییەکانی ماڵ و خێزان و پێویستییە سێکسییەکانی پیاو ئاڕاستەی گرتووە. ژن بە خۆشیی خۆی بوو‌بێت، یان بە نابەدڵی، ئەم ڕۆڵە جیاوازانەی قبووڵ کردووە و کە هەندێجار لەوە تێپەڕیوە، چی لە ڕووی بایۆلۆژی و دەروونییەوە شیاوە و چی شیاو نییە. لەبەر ئەوە مایەی سەرسووڕمان نییە پیاو ئەو کولتوورەی بۆ ماوەتەوە کە ژیانی سێکسی تەنیا بۆ پیاوە و ژن هیچ مافێکی نییە لەم ژیانەدا، هەروەها ڕۆڵی ژن لەم ژیانەدا تەنیا گوێڕایەڵییە بۆ پێویستییەکانی پیاو، وەک دابینکردنی وروووژان و تەسلیمبوون بۆ کاردانەوە سێکسییەکانی، تەنانەت منداڵخستنەوە، تا سەردەمانێکی زوو وا دادەنرا کە کاری پیاوە، چونکە پیاو ئەو تۆوە بە ژن دەبەخشێ کە

کۆرپەلەی لێوە پەیدا دەبێت، بەڵام ئەرکی ژن تەنیا هەڵگرتنی کۆرپەلەیە و پاشان لەدایکبوونی، بێ ئەوەی هیچ ڕۆڵێکی بۆماوەیی لە دروستبوونیدا هەبێ، وەک ئەو شێوەیەی ئێستاکە هەمووان دەیزانین کە دایک لە ڕووی بۆماوەوە هاوبەشیی تەواوی باوک دەکات لەڕێی ئەو هێلکۆکانەوە و دەپیتێنرێت کە بێ ئەمانە دووگیانی ڕوو نادات. پێشکەوتنی شارستانیش بە درێژایی مێژوو لەڕێی خۆیەوە پشتیوانیی لەم ڕا هەڵانە دەربارەی ڕۆڵی ژن لە ژیانی سێکسیدا کردووە، زۆربەی شارستانییەتەکان پشتیوانییان لەو بۆچوونە کردووە کە ژن ژیانی سێکسیی نییە، هەروەها چێژی سێکسییان لێ قەدەغە کردووە، بوونی هەر ڕەفتارێکی سێکسی لە ژندا کە دوور بووبێ لەم ڕایەوە، بە لادانی سێکسی دانراوە، یان وەک گوناهە و سیحر تەماشاکراوە، ئەو ژنانەی کەمێک هەڵسوکەوتی سێکسییان نواندبێ، بە ڕەفتار پیاوانە وەسف کراون، یان پێیان وتراوە ئەو ڕەفتارانە ئاماژەن بۆ تووشبوون بە شەبەقی سێکسی کە بە نەخۆشی دانراوە، لەبەر ئەوە ژن ناچار بووە پێویستییە سێکسی و پراکتیزەکردنە سێکسییەکانی کپ بکات و بیانشارێتەوە، چونکە هەر ژنێک لەم نەریتانە دەرچووبێ، وا تەماشا کراوە کە ڕێگەی ون کردووە و ڕەوشتی خراپ بووە. لەوانەیە یەکێک لەو دژبەیەکییانەی کە پێویستییان بە لێکدانەوە و شیکردنەوەیە، ئەو مەسەلەیە بێ کە چۆن پیاو بە درێژایی سەردەمەکان لە مێژوودا ئەوەی لە ژن چاوەڕوان کردووە، فریوی بدات و بیوروورژێنێ و چێژی بۆ دەستەبەر بکات، بەڵام خۆی ئاشنا نەبووە بە پێداویستییە سێکسییەکانی ژن، تەنانەت بوونی ئەو پێویستییانەی لە ژندا هەر ڕەت کردووەتەوە، لێکدانەوەی ئەم دژبەیەکییە هەرچییەک بێ، پیاوی لە دەرکپێکردنی کرداری بەیەکگەیشتنی سێکسی لە نێوان خۆی و ژندا، بێبەش کردووە، لە کاتێکدا دەرککردن و چێژ بینین

بەم کردارە بەدەست نایەت، تەنیا لەو کاتەدا نەبێ کە مرۆڤ بڕوای تەواو بە بوونی حەز و پێویستییە سێکسییەکان لە هاوبەشەکەیدا دەهێنێ، هەروەک چۆن ئەوانە لە خۆیدا بوونیان هەیە، بەبێ ئەم بڕواپێهێنان و ئاڕاستەیە هەر کەسێک، ئیدی ژن بێ یان پیاو، ناتوانێ بە پلە باڵاکانی هەستکردنی بەیەکگەیشتن و پێکەوەنووسانی سێکسی بگات، هەرچەندە خۆی بڕوای وا بێ لە لای خۆیەوە گەیشتووە پێی.

زۆرێک لە کۆمەڵگە شارستانییەکان تا ئێستاش بەم ڕا و هەڵوێستانەوە دەربارەی ژیانی سێکسیی ژن پابەندن، بەڵام زۆرێک لە ئاماژە و ڕوخساری گۆڕانیش لەم ڕا و هەڵوێستانەدا بەدی دەکرێن کە بە پلەی جیاواز لەو هەڵوێستە کلاسیکییانە دوور دەکەونەوە کە ژیانی سێکسیی ژن ڕەت دەکەنەوە. لە چوارچێوەی ئەم جیاوازییە لە پلەی گۆڕاوی هەڵوێست و ڕاکاندا، هەندێک پێیان وایە ژن ژیانی سێکسیی هەیە، بەڵام بە پلەیەکی لاوازتر لەوەی پیاو هەیەتی. هەندێک پێیان وایە، ژیانی سێکسی لای ژن هەیە، بەڵام بەندە بە ڕۆڵەکانی ژن لە ژیاندا، وەک هاوسەر و دایک و کەیبانووی ماڵ. بەم پێیە بۆ ژن هیچ ئازادییەکی لە هەنگاونانی سێکسییدا نییە، تەنانەت دوور لەو ڕۆڵانەی کە لە ژیاندا وەک هاوسەر و دایک و کەیبانووی ماڵ دەیانبینێ، خاوەنی ئامادەییش نییە بۆ ئازادی سێکسیی، لە کاتێکدا لە پیاودا بە پێچەوانەوەیە و پیاو ئامادەباشی تیادایە بۆ جیاکردنەوەی ژیانی سێکسی لە ڕۆڵەکانی دیکەی ژیانی. هەندێک ئەنجامی توێژینەوە و لێکۆڵینەوە زانستییەکان دەربارەی ژیانی سێکسی ژن کاریان تێدەکات، هەندێک ئازادیی سێکسیی ژن، بە ئازادبوونی ژن و یەکسانبوونی لەگەڵ پیاودا دەبەستنەوە. لەوانەیە جۆرێک لە هەڵە و ناڕاستی لە پشت ئەم دوو ڕەهەندە پەرگیرەوە هەبێ کە جیاوازن لە یەکدی. هەڵەیەکی گەورەیە ژیانی سێکسیی ژن ڕەت بکرێتەوە، هەروەک

چۆن هەڵەیە ئەو وێنەیەمان هەبێ کە ژیانی سێکسیی ژن لەگەڵ ژیانی سێکسیی پیاودا لێکچووە و یەکسانە بەو، لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستا نەتوانراوە تێگەیشتنێکی تەواو و پێویست بۆ ژیانی سێکسیی ژن هەبێ، بەڵام ئەوەی تا ئێستا زانراوە دەشێ ڕۆشنایی بخاتە سەر زۆرێک لە ڕا باو و پەرگیر یان زیادەڕۆکان دەربارەی ئەم بابەتە.

### تێبینی و لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکان

تەواوی ئەو لێکۆڵینەوانەی دەربارەی ژیانی سێکسیی ژن ئەنجام دراون، بە شێوەیەکی ڕێژەیی تازەن و لە سەد ساڵ لەمەوبەر تێناپەڕن، بەڵام ناتوانین تێبینییەکان دەربارەی ئەم بابەتە فەرامۆش بکەین کە لە چوارچێوەی توێژینەوە دەربارەی بابەتە سێکسییەکاندا هاتوون لە سەردەم و شارستانییەتە جیاوازەکان بە درێژایی مێژوو، هەر لە شارستانییەتی چینی و هیندی و گریکییەوە تا دەگاتە عەرەبی و خۆرئاوایی. زۆرێک لەو شتانەی کە لەم توێژینەوانەدا هاتوون، مەبەست لێیان چێژبینین یان وروژاندنی شەهوەت بووە لای نێر، بەڵام هەندێک لەو شتانەی باس کراون هەڵگری ئەو ئاماژانەی دەرککردن و تێگەیشتنن لە ژیانی سێکسیی ژن کە هێندە جیاوازییان نییە لەگەڵ تێگەیشتنی هاوچەرخ بۆ لایەنەکانی ئەم ژیانە لە ژندا، بەڵام بەهای ئەم زانیارییە گرنگانە کە لە هەندێک لەم توێژینەوانەدا هاتوون بە هەند وەرنەگیراون و نەیانتوانیوە کار بکەنە سەر ڕەوتی مێژووی توێژینەوەکان دەربارەی ژیانی سێکسی، بەڵکو ئەم نووسراوانە تا ئەم سەردەمی ئێستاش، تەنیا وەک سەرچاوەیەکی ڕاگەیاندن دەربارەی ژیانی سێکسیی ژن ماونەتەوە و تەنیا شەهوەتی پیاو دەورووژێنن، بێ ئەوەی بانگەشە بۆ تێگەیشتن لێیان بکرێ، هەر بۆیە ئەم نووسینانە بەهای ڕاستەقینەی خۆیان لەدەست داوە،

دەشێ ئەو ئامانجەشیان لەدەست دابێ کە لە بناغەدا بۆچی نووسراون.

زۆربەی سەرچاوە هاوچەرخەکانی توێژینەوە لە بابەتی ژیانی سێکسی لای ژن لە ناوەڕاستی سەدەی ڕابردوو، هەروەها ساڵانی دواییدا، دەستی پێ کردووە، وەک بەشێک لە توێژینەوە لە سروشتی ژیانی سێکسی و بنەما بایۆلۆژییەکانی. هەرچەندە زۆربەی توێژینەوەکان دەربارەی ڕەفتاری سێکسی و لادانی سێکسی ئاراستەی پیاو کراون، بەڵام زۆربەی ئەو توێژینەوانەی کە پەیوەندییان بە کاریگەریی ئەزموونی سێکسی و چەپاندنی و گۆڕانی بە نەخۆشیی دەروونییەوە هەیە، ئاراستەی مێ کراون، هەروەها ژیانی سێکسیی مێ بزوێنەری سەرەکیی سەرهەڵدانی تیۆرەکانی دەروونشیکاری بووە. زۆربەی لێکۆڵینەوەکان کە لەم بوارەدا ئەنجامدراون، تەنیا پشتیان بە بەڵگە کلینیکییە شیکارییەکان بەستووە، ئەمەش وای کردووە تێگەیشتنی دروست بۆ ژیانی سێکسی لای ژن نەبێ. یەکەمین لێکۆڵینەوەی جیددی دەربارەی ژیانی سێکسیی ژن، ئەو لێکۆڵینەوەیە بوو کە کنزی Kinseyلە ساڵی 1953دا دەربارەی ڕەفتاری سێکسی لە مێ-دا ئەنجامی دا، پاش ئەویش لێکۆڵینەوەکەی چیسرChesser لە ساڵی1957دا بوو دەربارەی پەیوەندییە سێکسی و خێزانییەکان لای ژنی ئینگلیز، پاشان توێژینەوەکانی ماستەرز و جۆنسۆن (١٩٦٦) کە زۆربەیان پشتیان بەستبوو بە تێبینیکردنی کاردانەوە فسیۆلۆژییەکانی پەیوەندییە سێکسییەکانی مێ، دوای ئەمانیش لێکۆڵینەوەکەی سیگوچ Sigusch و گرووپەکەی لە ساڵی ١٩٧٠دا دێت دەربارەی جیاوازیی نێوان دوو توخمەکە لە وروژاندنی سێکسی دەروونیدا، هەروەها لێکۆڵینەوەکانی سیمون فیشر Fisherلە ساڵی (1970-1973)دا دەربارەی ئۆرگازم لە مێ-دا و زۆر بابەتی دیکەش لەو بابەتانەی بە ژیانی سێکسیی مێ-ەوە

بەندن. یەکێک لە گرنگترین توێژینەوە دەروونییەکان، توێژینەوەکەی ئیزانک Eysenck بوو لە ساڵی 1976دا کە پشتی بەستبووە بە لیستی ڕاپرسییەکان لەسەر هەڵوێستی ژن بەرامبەر بە سێکس. ئەم توێژینەوەیە بە هەمان شێوە ڕاپرسیی دەربارەی هەڵوێستی پیاو بەرامبەر سێکس ئەنجام دا، هەردوو ڕاپرسییەکەی بە یەکدی بەراورد کرد.

لەم توێژینەوانەی ئاماژەمان پێ دان و چەندەها توێژینەوەی دیکەشدا، دەتوانین پوختەی ئەم ئەنجامانە وەربگرین، بەر لەوەی ئەم ئەنجامانە بخەینە ڕوو، وا پێویست دەکات ئەوە ڕوون بکەینەوە کە ئەم لێکۆڵینەوانە لەسەر ژنانی کۆمەڵگە خۆرئاواییەکان ئەنجام دراون کە پێکهاتەی کۆمەڵایەتییان لەگەڵ ئێمەدا جیاوازە، هەروەها ئەو ئەنجامانەی دەستیش کەوتوون، دەشێ لەگەڵ واقیعی خاوەنەکانیاندا کە توێژینەوە و تاقیکردنەوەیان لەبارەوە کراوە و تێبینییان لەسەر وەرگیراوە، ڕاستن نەبن، چونکە مەرج نییە هەموو ئەو کەسانەی بەشداریی ڕاپرسییەکەیان کردووە بە ئەمانەتەوە و ڕاستگۆیانە وەڵامی پرسیارەکانیان دابێتەوە، هەروەها توانای هەریەکەش لەوانە بۆ وەسفکردنی ئەو شتانەی کە لە بواری هەستیدا ڕوو دەدەن، جیاوازە، پاشان ئەوەی لە تاقیکردنەوەی لێکۆڵینەوەکاندا دەکرێ، دەشێ بە شێوەیەکی ڕیشەیی لەگەڵ واقیعی ژیاندا جیاواز بێ. لەگەڵ ئەم هەموو خۆپارێزییەدا، ئەو ئەنجامانەی دەست توێژەرەوەکان کەوتوون لە توێژینەوەکانیاندا، بە لایەنێکی گرنگی واقیعی ژیانی سێکسیی مێ دادەنرێن کە ناتوانین فەرامۆشیان بکەین.

## پاڵنەری سێکسی لای مێ

لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەی ئەو کەسانە کەم نین کە پێیان وایە مێ لە هەموو پاڵنەرێکی سێکسی بەدەرە، هەروەها ئەو چێژەی کە بەهۆی پەیوەندیی سێکسییەوە هەستی پێ دەکات -ئەگەر هەستی پێ بکات- لەبەر ئەوەیە کە هەست دەکات مێردەکەی لێی ڕازییە و چێژی لێ دەبینێ، بەڵام ناکرێ ئەم ڕایە بسەلمێنرێ و بەرگریی لێ بکرێ، لە کاتێکدا کۆمەڵێک بەڵگەی زۆر و تەواو هەن بۆ وەلانان و سەلماندنی نادروستیی ئەو بۆچوونە. لە ئێستا زانراوە و مەسەلەیەکی ئاشکرایە کە مێ، تەنانەت لە قۆناغی زووی منداڵیشدا، بە شێوەیەک لە شێوەکان، گەمەی سێکسی دەکات، تەنانەت بێ ئەوەی منداڵی نێر ئاگای لێ بێ، یان بەشداری بکات، هۆکاری ئەمەش بۆ هەوڵدانی مێ دەگەڕێتەوە تاوەکو ورووژانی سێکسیی دەست بکەوێ. ئەم هەوڵدانە شیاو نەدەبوو یان لە تواناداا نەدەبوو، ئەگەر مێ وەک نێر نەبوایە، هەمان توانای نێری نەبوایە و پاڵنەری سێکسیی نەبوایە کە بە شێوەیەک لە شێوەکان هانی دەدات بۆ ورووژانی سێکسی، هەروەها پێویستە لێرەدا لێکدانەوە بۆ هۆکاری ڕوودانی ئەو کاردانەوە فسیۆلۆژییانە بخەینە ڕوو کە هاوکاتن لەگەڵ ورووژاندنی سێکسیدا، لە کاتێکدا ئەم کاردانەوە سێکسییانە خۆبەخۆ و بێ ئەوەی لە لایەن پاڵنەر یان هاندەرێکەوە بورووژێن، ڕوو نادەن. دواجار هەستی مێ بە ورووژان و ئارەزووی بۆ جووتبوون و دەرئەنجامی ئەمانە، وەک هەستکردن بە حەوانەوە و چێژ و ڕازیبوون، هیچیان ناکرێن و نایەنە دی بەبێ بوونی پاڵنەرێک بۆ ورووژان و پاشان ڕازیبوون و دامرکاندنەوە لەڕێی وەلامدانەوەیان.

بەم شێوەیە دەتوانین وا گریمانە بکەین کەمێ تەنیا وەلامدانەوەی بۆ کاردانەوە سێکسییەکانی پیاو نییە، بەڵکو وەلامدانەوەی بۆ کاردانەوەکانی خۆیشی بۆ پەیوەندیی سێکسی

هەیە، کە لە بناغەدا ئەم کاردانەوە خۆییە بۆ حەز و پاڵنەری سێکسیی خۆی دەگەڕێتەوە، بەمەش لەگەڵ پیاودا یەکسانە لەو ڕووەوە کە خاوەنی هەمان پاڵنەری سێکسییە، بەڵام کاتێک دەڵێین یەکسانە، ئەوە ناگەیەنێ کە هێزی پاڵنەری سێکسی لە هەردووکیاندا و لە هەموو حاڵەتەکاندا وەک یەکە.

لەو جیاوازییانەی لەم بابەتەدا لە نێوان نێر و مێ-دا هەیە، مەسەلەی پاڵنەری سێکسییە، تێبینی دەکەین، پیاو پەیوەندیی سێکسی ناکات ئەگەر پاڵنەری سێکسیی لە هەستیدا نەبێ، بەڵام ژن زۆرجار بەبێ بوونی پاڵنەری سێکسی لە خۆیدا، لە پەیوەندیی سێکسیدا، بەشداریی پیاو دەکات و بە قسەی پیاو دەکات و سێکسی لەگەڵدا دەکات تا پیاوەکە ڕازی ببێ و چێژ ببینێ، تەنانەت بێ ئەوەی خۆی لەو کاتەدا هیچ پاڵنەرێکی سێکسیی هەبێ. لەم حاڵەتەدا وەڵامدانەوەی سێکسی فسیۆلۆژی و هەستی ژن کەموکوڕ و ناتەواو دەبێ، ناتوانێ چێژ ببینێ و هەست بە ڕازیبوون بکات، چونکە لە بناغەدا خۆی هیچ پاڵنەرێکی سێکسیی نەبووە تا وەڵامدانەوەی هەبێ بۆی.

لێکدانەوەی پاڵنەری سێکسیی مێ و تەماشاکردنی وەک پاڵنەری سێکسیی نێر لە ڕووی سروشت و بناغە و بایۆلۆژی و ناوەندە دەمارەکانەوە و چۆنێتیی دەستپێکردن و کۆبوونەوەی، تا ئێستا لێکدانەوەیەکی ناتەواوە. هەرچەندە بوونی بناغەیەکی بایۆلۆژی بۆ پاڵنەری سێکسی مەسەلەیەکی گریمانەکراوە، بەڵام لەوە ناچێ ئەم بناغەیە بەشی لێکدانەوەی ڕوخسارەکانی ئەم پاڵنەرە بکات لە مرۆڤدا، وەک ئەوەی لە توانایدایە لێکدانەوە بۆ پاڵنەری سێکسی بکات لە زۆربەی ئاژەڵاندا. ئەم بۆچوونە بەسەر نێر و مێی مرۆڤدا وەک یەک جێبەجێ دەبێ، لەگەڵ ئەوەشدا پاڵنەرە سەرەکییەکان لە مرۆڤدا وەک برسێتی و تینوێتی، لە یەک دەچن لە نێر و مێدا، بەڵام سەبارەت بە پاڵنەری سێکسی لە

هەندێک ڕووەوە لە نێر و مێدا جیاوازییان هەیە، کە پێویستە لێکدانەوە بۆ ئەم ڕوخسارە جیاوازانەی پاڵنەری سێکسی بکەین، لێکدانەوەی پاڵنەری سێکسی هەرچۆنێ بێ و جیاوازیی ئەم پاڵنەرە لەگەڵ پاڵنەرە سەرەکییەکانی دیکەدا هەرچییەک بێ، ئەوەی گومانی تێدا نییە، ئەم پاڵنەرە بۆیە هەیە تا کاری خۆی بکات و ڕازی بکرێ و تێر بکرێ، کرداری ڕازیکردن و تێرکردنیش هەستکردن بە چێژ دەبەخشێ، ئەم چێژە پێویستییەکی ژیانە، نەک تەنیا لەبەر هۆکاری زۆربوون، بەڵکو لەپێناوی هاندانی مرۆڤ بۆ مانەوە لە جیهانێکدا کە لە چێژ خاڵی نەبێ، لەم گریمانەیەدا هیچ جیاوازییەک لە نێوان نێر و مێدا نییە.

ئەو پرسیارە دەکرێ، ئایا پاڵنەری سێکسی لە مێ-دا هەمان هێزی هەیە کە لە پیاودا هەیە؟ ئایا مێ هەمان توانای هەیە بۆ کۆکردنەوەی پاڵنەرە سێکسییەکانی لەدوای ڕازیبوون و تێربوون، واتە چەند هەوڵ دەدات بۆ دووبارەکردنەوەی پەیوەندیی سێکسی لەدوای تەواوبوون و گەیشتنی بە ئۆرگازم؟

ئایا پاڵنەری سێکسی لە مێ-دا لەگەڵ پاڵنەری سێکسیی نێردا دەگونجێ لە ڕووی ئەو تەمەنەوە کە تیایدا دەست بە کارکردن دەکات و ئەو تەمەنەش کە تیایدا کۆتایی دێ؟ ئەی لە ڕووی زیادبوونی هێز و گوڕەکەی، یان لاوازبوون و دامرکاندنەوەی لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا، هەمان شێوەیە هەروەک چۆن لە نێردا ڕوو دەدات؟ دواجار ئایا وەڵامدانەوەی مێ بۆ پاڵنەری سێکسی بە هەمان ئەو شێوازەیە کە نێر وەڵامدانەوەی دەبێ؟ هەندێک بەڵگە لەسەر ئەم بابەتە لە بەردەستدان و لێرەدا دەیانخەینە ڕوو:

-لێکۆڵینەوەکەی کینزی لەساڵی ١٩٥٣دا ئاماژە بەوە دەدات کە مێ لە نێر کەمتر بەهۆی فاکتەرە وروووژێنەرە سێکسییە دەرەوونییەکانەوە دەورووژێ، بەتایبەتی ئەگەر وروووژێنەری بینراو بن. ژن بە توندی ناوروووژێ، ئەگەر جەستەی ڕووتی

پیاوێ ببینێ، یان لەڕێی هەستی بینینەوە فاکتەرە ورووژێنەرە هاوشێوەکان ببینێ، بەڵام پیاو وا نییە، بە خێرایی و بە توندی دەورووژێ، لەمەشەوە ئەو بەرئەنجامە گەڵاڵە بووە کە مێ کەمتر لە ڕووی سێکسییەوە دەورووژێ، بەڵام ئەم واقیعە، لێکدانەوەکەی هەرچییەک بێ، مەرج نییە ئەوە بگەیەنێ کە پاڵنەری سێکسی لە مێ-دا هێز و گوڕی کەمترە بەراورد لەگەڵ پیاودا. ئەم دیاردەیە تەنیا ئەوە دەگەیەنێت، پاڵنەری سێکسی لای مێ جیاوازە و لەو هەڵوێست و حاڵەتانەی کە نێر تیایدا دەورووژێ مێ ناورووژێ و دەشێ پێویستی بە کۆمەڵێک ورووژێنەری تایبەتی بێت کە مەرج نییە لەگەڵ ئەو ورووژێنەرانەدا بگونجێن کە پاڵنەری سێکسیی پیاو دەورووژێنن. لێکۆڵینەوەکەی سیگوچ لە ساڵی ١٩٧٠دا ئاماژە بەوە دەدات ژن بە هەمان ئەو بابەتانە دەورووژێت کە پیاو پێیان دەورووژێت، بە ورووژێنەرە بینراوەکانیشەوە. هەرچەندە پیاو زیاتر لە ژن دەورووژێ، بەڵام هەندێک لە ژنان هەن بە دیمەنە ورووژێنەرە سێکسییەکان زیاتر لە زۆرێک لە پیاوان دەورووژێن، لەوە دەچێ فاکتەرە کولتووری و شارستانییەکان ڕێگر بن لە ئاشکراکردنی پاڵنەرە سێکسی و ورووژێنەرەکان، ئەگەر ئەم فاکتەرانە نەبن، هەندێک لە توێژەران پێشبینیی ئەوە دەکەن کە لە ڕووی پاڵنەر و ورووژێنەری سێکسییەوە، هیچ جیاوازییەک لە نێوان دوو توخمەکەدا نەبێ.

-لێکۆڵینەوە جیاوازەکان ئەوە ئاشکرا دەکەن، ئەگەر فرسەتەکان بۆ پەیوەندیی سێکسی لە نێوان دوو توخمەکەدا یەکسان بن، ئەگەر دەرفەتی هەڵبژاردن بۆ هەردووکیان هەبێ، بێ ئەوەی ژن ناچار بکرێ، ئەوا ژن خاوەنی پاڵنەرێکی سێکسییە کە لە هێز و گوڕ و توانای دووبارەبوونەوەدا هیچی کەمتر نییە لە پیاو.

دواکەوتنی پاڵنەری سێکسی لە مێ-دا، بەرامبەر پێداگریی پیاوە بۆ ئەم پاڵنەرە، ئەمەش لە دوو دیاردەدا ڕوون دەبێتەوە، یەکەمیان

ئەوەیە کە ماستەربەیشن لە مێ-دا بەراورد لەگەڵ نێر-دا کەمتر ڕوو دەدات و مێ کەمتر پێداگری لەسەر ڕوودانی دەکات، هەروەها ئاستی بڵاوبوونەوەی ماستەربەیشن لە مێ-دا بەراورد لەگەڵ نێردا، کەمترە و لەگەڵ گەشەدا خێراتر نابێ، وەک ئەوەی کە لە پیاودا ڕوو دەدات، دووەم دیاردەش ئەوەیە گەیشتن بە ئۆرگازم لە مێ-دا دوادەکەوێ و بۆ نزیکەی تەمەنی بیستساڵی، لەوانەیە جیاوازیی نێوان نێر و مێ لەم دوو دیاردەیەدا، بەشێکی بۆ فاکتەری بایۆلۆژی بگەڕێتەوە تا مێ بتوانێ پارێزگاری لە وزەی سێکسیی خۆی بکات تا کاتی پێگەیشتنی سێکسی، هەر کاتێ ئەم پێگەیشتنە سێکسییە تەواو بوو، ئەوا هیچ بەڵگەیەک نییە لەسەر ئەوەی پاڵنەری سێکسی لە مێ-دا ئەگەر وروووژا، گوڕ و تینی لە پیاو کەمتر بێت و کەمتر لە پیاو پێویستی بە ڕازیبوون و تێربوون بێت.

-تێبینییەکی دیکە هەیە پاڵنەری سێکسیی مێ لە نێر جیا دەکاتەوە، لە کاتێکدا پاڵنەری سێکسی لە پیاودا زۆربەی کات خۆبەخۆ بەئاگا دێت و بێ ئەوەی پێویستی بە وروووژانی دەرەکی، یان سێکسی، یان دەستلێدان لە جەستە هەبێ، ژن بە پێچەوانەوەیە و کەمتر بە شێوەیەکی خۆبەخۆ هەست بە پاڵنەری سێکسیی خۆی دەکات، بەڵکو بە زۆری پێویستی بە وروووژانی دەرەکی، یان دەستلێدان لە شوێنە هەستیارەکانی جەستەی بۆ سێکس، هەیە. لەوانەیە نەتوانرێ لێکدانەوە بۆ هۆکاری ئەم جیاوازییەی نێوان نێر و مێ بکرێ، بەڵام بوونی ئەم دیاردەیە لە مێ-دا دەشێ هۆکار بێ بۆ شکستهێنانی ژن لە ڕازیکردنی پاڵنەرە سێکسییەکانی بە شێوەیەکی خۆبەخۆ، ئەمەش وا لە ژن دەکات کەمتر لە پیاو ئازار و بێتاقەتیی هەبێ کاتێ کە پاڵنەرە سێکسییەکانی تێر ناکرێن، دەشێ لە پشت هەموو ئەمانەوە مەبەستێکی بایۆلۆژی هەبێ کە خزمەتی ژن و توخمی مرۆیی بکات لە یەک کاتدا.

## وروووژێنەرە سێکسییەکان لای مێ

بە شێوەیەکی گشتی بڕوا وایە یان ئەو بۆچوونە باوە کە ژن بە شێوەیەکی لاوازتر لە پیاو بەهۆی وروووژێنەرە سێکسییەکانەوە دەورووژێ. ئەوەی یارمەتیی بڵاوبوونەوەی ئەم ڕایەی داوە، ئەوەیە ژن خۆیشی لەو باوەڕەدایە کە پیاو بە شێوەیەکی خێراتر و گەرموگوڕتر بەو بابەتانە دەورووژێ کە پەیوەندییان بە سێکسەوە هەیە. لەم ساڵانەی دواییدا زنجیرەیەک توێژینەوە و ڕاپرسی و تاقیکردنەوە ئەنجام دران بۆ سەلماندنی ئەم ڕایە، ئەنجامی توێژینەوەکان جیاوازبوون، هەندێکیان پشتیوانییان لە بوونی جیاوازیی ئاشکرا لە نێوان وروووژاندنی ژن و وروووژاندنی پیاودا دەکرد کاتێ کە ڕووبەڕووی هەندێ وروووژێنەری سێکسی دیاریکراو دەبنەوە، هەندێکیشیان جەختیان لەوە دەکردەوە کە لە ڕووی وروووژاندن بەهۆی کاریگەریی فاکتەرە وروووژێنەرەکانەوە، هیچ جیاوازییەکی جەوهەری لە نێوان ژن و پیاودا نییە. لەم توێژینەوانەدا، وێنە و فیلم و تۆماری دەنگی و چیرۆک و ڕۆمان و ڕووتکردنەوەی لەش و چەندەها فاکتەری دیکەی وروووژاندنی سێکسی بەکارهاتن، ئەو ئەنجامانەی لەم توێژینەوانە دەست کەوتن، ئەمانەبوون:

-کینزی لەو لێکۆڵینەوانەیدا کە لە شێوەی ڕاپرسی دەربارەی ژیانی سێکسی لە مێ-دا لە ساڵی ۱۹۵۳دا ئەنجامی دابوون، ئاماژەی بەوە داوە کە جیاوازیی گەورە لە نێوان نێر و مێ-دا هەیە لە ڕووی وروووژاندنیان بەهۆی بابەتە سێکسییەکانەوە، بۆی دەرکەوت نێر لە مێ زیاتر بە بابەتە سێکسییە ئاشکراکان دەورووژێ.

-لێکۆڵینەوەکەی شمدت و سیگوچ Schmidt and Sigusch لە ساڵی ۱۹۷۰دا، ئاشکرای دەکات کە مێ لە نێر کەمتر بەو وێنانە دەورووژێت کە تایبەتن بە سێکسکردن، بەڵام لە نێر زیاتر بە بەرهەمە ئەدەبییەکان دەورووژێت (لەوانەیە ئەمە هۆکاری حەز و ئارەزووی زۆری ژن بۆ خوێندنەوەی چیرۆک و ڕۆمان و گۆڤارە ئەڤینداریییەکان، لێک بداتەوە).

-لێکۆڵینەوەکەی هایمان Heiman لە ساڵی ١٩٧٧دا، ئاشکرای دەکات کە ژن زیاتر لە پیاو بە فیلم دەورووژێ و کەمتر بە خەیاڵ و لەوەش کەمتر بە چیرۆکی تۆمارکراوی سەر شریت و کاسێت دەورووژێت، هەروەها وەک پیاو بەو تۆمارکراوانە زیاتر دەورووژێ کە ڕاستەوخۆ باسی پەیوەندیی سێکسی دەکەن، زیاتر لەو فیلمانەی کە وەسفی خۆشەویستییەکی ڕۆمانسی دەکەن. بەرئەنجامی ئەم توێژینەوانە ئەوەبوو، هەردوو توخمەکە زیاتر بەو فیلمانە دەورووژێن کە بە ئاشکرا باسی سێکس دەکەن، زیاتر لەو چیرۆکانەی کە کراون بە فیلم و بابەتی سێکسییان تیادایە، بەڵام لەمانەشدا هەر پیاو لە ژن زیاتر دەورووژێ.

-بتریشا جیلان و کرستۆفەر فرس P.Gillan and C.Firthلە ساڵی ١٩٧٧دا کۆمەڵێک تاقیکردنەوەیان ئەنجام دا بۆ سەلماندنی ئەو ڕایەی کە پێی وایە نێر وەڵامدانەوەی بۆ بابەتە سێکسییە بینراوەکان (فیلم) لە مێ زیاترە، لە کاتێکدا مێ زیاتر بە بابەتە زارەکی و دەنگییەکان (چیرۆک) دەورووژێ.

هەروەها لێکۆڵینەوەکە ئەوەشی ئاشکرا کرد کە هەردوو توخمەکە بە شێوەیەکی بەرفراوانتر و بە گوڕتر بەو بابەتە سێکسییانە دەورووژێن، بەراورد لەگەڵ ئەو سەردەمەی کە کینزی لە ساڵی ١٩٥٣دا لێکۆڵینەوەی دەربارەی هەمان بابەت ئەنجام دا، بەڵام لێکۆڵینەوەکەی ئەم دوو توێژەرە بوونی جیاوازییان لە نێوان دوو توخمەکە خستە ڕوو، لە لێکۆڵینەوەکەدا پیاوان وەڵامدانەوەیان بۆ ئەو وروووژێنەرانە زیاتر بوو کە وێنەیی بوون واتە بینراو بوون، لە کاتێکدا ژنان وەڵامدانەوەیان زیاتر بوو بۆ ئەو وروووژێنەرانەی لەڕێی دەنگ و بیستنەوە بوون، هەروەها لێکۆڵینەوەکە شێوازی وروووژاندنیشی ڕوون کردەوە، بە ڕای ئەم دوو توێژەرە مێ بە شێوازی ڕەنگدانەوە دەورووژێ، واتە کاتێک سەیری فیلمێک دەکات لە خۆیدا ڕەنگ دەداتەوە و بەو شێوەیە

وێنای خۆی دەکات کە ئەو هەمان ئەو کچەی ناو فیلمەکەیە کە ئەو پەیوەندییە دەکات، بەڵام نێر بە شێوازێکی بابەتییانە دەورووژێ، واتە بەو شێوەیە وێنای خۆی دەکات کە پەیوەندی لەگەڵ ئەو کچەدا دەکات کە لەناو فیلمە سێکسییەکەدایە. ئەم توێژەرانە ڕایەکانی خۆیان بەو شێوەیە پوخت کردەوە کە نمایشی دەنگی یارمەتیی وەڵامدانەوەی سێکسی بە شێوازی ڕەنگدانەوە دەدات و نمایشی بینراویش یارمەتیی وروووژاندنی سێکسی بە شێوازی بابەتییانە دەدات، ئەمەش جەخت لەو ڕاستییە دەکات کە ژن چیرۆک و قسەکردن و دەنگ زۆر کاری تێدەکەن، بەڵام پیاو زیاتر بابەت و شتە بینراوەکان کاری تێدەکەن.

ئەنجامی ئەم توێژینەوەیە پشتگیری لەو تێبینییە دەکات کە کوڕان لەڕێی بیرکردنەوە و خەیاڵەوە بە مەسەلە سێکسییەکانەوە سەرقاڵ دەبن، کە ئەم کردارە ئەقڵییانە زۆربەیان لەسەر بناغەی بەشبەشکردنی یان پەرتکردنی بینایی بەڕێوەدەچن، لە کاتێکدا کچان لەڕێی گفتوگۆ و چیرۆکەوە بە مەسەلە سێکسییەکانەوە سەرقاڵ دەبن، کە ئەم کردارانە لەسەر بناغەی قسەکردن و دەنگ و بیستن ئەنجام دەدرێن. ئەنجامی ئەم توێژینەوە و تێبینییانە پشتیوانی لەو ڕایە دەکەن کە وەک بۆچوونێکی بەڵگەنەویست گوێمان لێ بووە، کە دەڵێ: "پیاو بە (چاو)ی خۆشەویستی دەکات و ژن بە (گوێ)یەکانی". ڕوونکردنەوەی هۆکاری ئەم دیاردەیە، لەوانەیە قورس بێت و نەتوانین بەتەواوی هۆکاری ئەوە بزانین بۆچی مێ لە وروووژاندنی سێکسیدا پشت بە دەنگ دەبەستێت و نێریش پشت بە هەستی بینین، ئەم دیاردەیە لەنێو زیندەوەرانی دیکەشدا هاوشێوەی هەیە، بەتایبەتی لە باڵندەدا.

دەشێ توێژینەوە نوێیەکان دەربارەی دەماخ و ئەقڵ یارمەتیدەر بن لە تێگەیشتن لەم دیاردەیە. ئەم توێژینەوانە پشتیوانی لەو بۆچوونە دەکەن کە هەموو مرۆڤێک دوو دەماخ و

دوو ئەقڵی هەیە، لای ڕاست و لای چەپ، کە ئەم دوو لایە پێکەوە دەماخ پێک دەهێنن.

توێژەرەوەکان پێیان وایە هەر لایەکی دەماخ بە شێوەیەکی سەربەخۆ کار دەکات بە بیرکردنەوەشەوە. دەماخی لای چەپ کارە ئەقڵییەکان ئەنجام دەدات، ئەوانەی کە زۆربەیان پشت بە گۆکردنی وشە و قسەکردن دەبەستن، لە کاتێکدا دەماخی لای ڕاست ئەو کارە ئەقڵییە ناگفتوگۆییانە ئەنجام دەدات کە قسەکردنی تیادایە، وەک بیرکردنەوەی ئەبستراکت و خەیاڵ و بابەتە واقعییەکانی پشت بە بینین دەبەستن. زاناکان پێیان وایە دەماخ یان ئەقڵی لای چەپ، کە ئەقڵێکی دەنگی یان گفتوگۆییە، ئەوە ئەقڵی مێیە، بەڵام ئەقڵی لای ڕاست یان ناگفتوگۆیی ئەوە ئەقڵی نێرە.

لەبەر ئەوەی هەریەکە لە ئێمە، نێر یان مێ، لە یەک کاتدا هەردوو دەماخەکەی هەیە، ئەقڵی زاڵ لە مێ-دا ئەقڵی لای چەپە (واتە گفتوگۆییە) لە کاتێکدا ئەقڵی زاڵ لە پیاودا ئەقڵی لای ڕاستە (واتە ناگفتوگۆییە). ئەم شیکارییە لێکدانەوەی هۆکاری زاڵبوونی بیستن و قسەکردن لە ژیانی ژندا لێک دەداتەوە، هەروەها زاڵبوونی هزر و خەیاڵ و بینینیش لە ژیانی نێردا. ئەگەر ئەم شیکارییە دروست بێ، ئەوا پێویست دەکات پرسیار دەربارەی ئەو هۆکارە ژیارییانە بکەین کە وای لەم دیاردەیە کردووە پێویستییەکی بایۆلۆژی بێ، دەتوانین هۆکاری ئەم دیاردەیە لەسەر بناغەی پێداویستییە ژیارییەکان لێکبدەینەوە کە وای لە پیاو خواستووە پشت بە توانای بینین و هزری ئەبستراکت و خەیاڵی ببەستێ لەپێناوی زامنکردنی مانەوەی خۆی و خێزانەکەشی، لە کاتێکدا مێ پێویستی بە دەنگ و وشە و بیستن هەبووە وەک هۆکارێک بۆ پەیوەندیکردن و قسەکردن لەگەڵ منداڵەکەیدا، چونکە دەنگی دایک بۆ منداڵەکەی بایەخێکی گەورەی هەیە لە پاراستنی

پەیوەندیی نێوانیان، لەڕێی ئەم پەیوەندییەشەوە دایک توانیویەتی ئاگای لە منداڵەکەی بێ و بەخێوی بکات، بە هەمان شێوە دەنگی منداڵیش بۆ دایک بە گرنگترین ئاماژەکانی هۆگری دادەنرێ. هیچ مایەی سەرسووڕمان نییە کە دەنگ و وشە لە ژیانی ژندا بایەخی زیاترە وەک لە ژیانی پیاودا، هەر لەبەر ئەوەشە ئەوەندەی دەنگ هەڵگری مانای خۆشەویستی و وورووژانی سێکسییە لای ژن، هیچ شتێکی دیکە ئەوەندە کار ناکەنە سەری.

-توێژینەوەیەک ئەنجام درا بۆ ئاشکراکردنی کاریگەریی ڕووتبوونەوەی جەستە لەسەر وەڵامدانەوەی سێکسی لای مێ، ئەم پرسیارە خرایە بەردەم کۆمەڵێکی تێکەڵ و جیاواز لە مێ لە ڕووی تەمەن و ئاستی ڕۆشنبیری و باری کۆمەڵایەتی و زۆر شتی دیکە، کە ژمارەیان ٥٣٦ ژن بووە، پرسیارەکەش ئەمە بوو: ئایا چێژ لە بینینی جەستەی پیاو بە ڕووتی وەردەگریت؟ وەڵامەکانیش بۆ چوار وەڵام پۆلێن کرابوون: "تا ئاستێکی زۆر"، "تا ئاستێک"، "کەم"، "بە هیچ شێوەیەک."

ئەنجامی ڕاپرسییەکە بەم شێوەیە بوو: ٢٦%ی ژنان دەستەواژەی "تا ئاستێکی زۆر"یان هەڵبژارد، ٣٥.٧% دەستەواژەی "تا ئاستێک"، ٢٢% دەستەواژەی "کەم" و ١١.٧% دەستەواژەی "بە هیچ شێوەیەک"یان، هەڵبژارد بوو، ٤.٨%یشیان هیچ وەڵامێکیان نەدابووەوە. لێکۆڵینەوەکە ئاماژەی بەوەش کرد، یەک لەسەر چواری بەشداربووانی ڕاپرسییەکە پێیان وا بووە لەشی پیاو سەرنجڕاکێشە و نیوەیان پێیان وا بووە لەشی پیاو هەستبزوێنە و سێ لەسەر چواریشیان پێیان وا بووە کە لەشی پیاو لە ڕووی سێکسییەوە وروووژێنەرە.

ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەو ڕایانەی پێشووی بەتاڵ کردەوە کە پێی وا بوو ژن هیچ شتێ لە لەشی پیاودا بەدی ناکات تا لە ڕووی سێکسییەوە بیوروووژێنێ. توێژینەوەیەکی دیکەش دەربارەی

کاریگەریی جەستەی پیاو بۆ سەر وورووژاندنی ئارەزووی سێکسیی ژن ئەنجام درا، توێژینەوەکە ڕاپرسییەکی ئەنجام دا و دەربارەی کاریگەریی پێکهاتەی ماسوولکەیی جەستەی پیاو بۆ سەر ئارەزووی سێکسیی ژن، ٥٧.٦% پێیان وا بووە کە گەشەپێکردنی ماسوولکەی جەستە بەو شێوەیە و دەرکەوتنی، شتێکی سروشتی نییە، ٤٨.٤% پێیان وا بووە کە ئەوە ئاماژەیە بۆ لەخۆباییبوونی پیاو، ٣٨.٢% پێیان وا بووە کە ئەوە تێکچوونی جەستەیە، تەنیا ١٤.٩% بە لایانەوە باش بووە. بەم شێوەیە دەردەکەوێ کە زۆربەی زۆری ژنان حەزیان لەو پیاوانە نییە کە لەڕێی ڕاهێنانەوە ماسوولکەکانی جەستەیان گەورە دەکەن و دەریدەخەن و پیاوی ئاسایی، یان سروشتییان بە لاوە باشترە.

دواجار مەسەلەیەکی دیکە هەیە کە بریتییە لە وورووژاندنی خۆبەخۆ لەگەڵ وورووژاندنی دروستکراو، بەگشتی پیاو لە مەسەلە سێکسییەکاندا توانای وورووژاندنی خۆبەخۆی هەیە، ئیدی بەبێ هۆ بێت، یان لەڕێی تێڕامان و خەیاڵ و خەونەوە بێ، بەڵام ژنان بە زۆری بە ئاسانی بەو هۆیانە ناورووژێن کە پیاو پێیان دەورووژێ، ژن پێویستی بە وورووژێنەرێکی دەرەکیی ڕاستەوخۆیە، وەک دەنگ یان وشە یان وێنە، یان وورووژێنەرێکی ناوەکیی ڕاستەوخۆ لە ناوچەیەک لە ناوچە سێکسییەکانی جەستەی. بەم شێوەیە زیاتر بە وورووژێنەرە کردارییەکان دەورووژێت وەک لە وورووژێنەرە ناکردارییە خۆبەخۆیی، یان دەرەکییەکان. ئەم واقیعە تایبەتمەندییەکی گەورەی بە ژن داوە لە هەڵبژاردنی ئەو شتانەی پێی دەورووژێ کە جیاوازە لەگەڵ پیاودا، هەر ئەمەشە لەڕێی زەروورەتی بایۆلۆژییەوە وا لە ژن دەکات لە پەیوەندیی سێکسیدا لە پیاو هاوسەنگتر و بەوەفاتر و سنووربەندتر بێ.

## شوێنەکانی وروووژاندنی سێکسی لە جەستەدا

شوێنەکانی وروووژاندنی سێکسی لە ژندا زۆرتر و بەرفراوانترە وەک لە پیاو. لە کاتێکدا ئەم شوێنانە لە پیاودا بە ئەندامی سێکسی دیاری دەکرێن، لە ژندا وێڕای ئەندامی سێکسی، چەندەها ناوچەی دیکەی هەیە کە بە دەستدان لێیان، دەورووژێن، لەم ناوچانەش وەک مەمکەکان، بەتایبەتی گۆکانیان، دەم، لا مل و گەردن لە هەردوو لاوە. دەم کە ناوچەیەکی وروووژاندنە، بە بەردەوامی قۆناغی زارەکی دادەنرێ لە قۆناغەکانی گەشەی سێکسی دەروونی لە منداڵدا. هەرچی مەمک و گۆکانییەتی، دەتوانرێ وا گریمان بکرێ کە دوو ئەندامن بۆ پەیوەندیکردنی نێوان دایک و منداڵ، سروشتی ژن وا پێویستی کردووە کە وروووژاندن لەو شوێنەدا بەدی بکات، لەبەر ئەوە چێژ دەبینێ لە ڕوودانی بەرکەوتن و دەستدان لێیان. لەوانەیە ئەم چێژە پێویستی بێ بۆ ئەوەی دایک بتوانێ شیر بە کۆرپەکەی بدات و لە ئامێزی بگرێ. بەم شێوەیە مەمک و گۆکانی دەبنە سەنتەرێک بۆ وروووژاندن و کە دەشێ بە مەبەستی وروووژاندنی سێکسی بوروووژێنرێن. دەربارەی فەرمانی مەمک بۆ مەبەستەکانی وروووژاندن، لێکدانەوەی دیکە هەیە، بۆ نموونە، هەندێک پێیان وایە هۆکاری دانانی مەمک بە ناوچەیەکی وروووژێنەر لە ڕووی سێکسییەوە بۆ فێربوون و وەگرتنی کولتووری باو دەگەڕێتەوە لەو کۆمەڵگەیانەدا کە پێگەیەکی تایبەت لە سەرنجراکێشانی سێکسی بە مەمک دەدەن. ژنانیش لە ڕووی هێز و گوڕ و ئاستی وروووژاندنیان لەڕێی ئەم دوو ئەندامەوە، واتە مەمک و گۆکانی، جیاوازیی گەورە لە نێوانیاندا هەیە، هەروەها لە ڕووی وەڵامدانەوەی ژن بۆ ئەم وروووژاندنە هەر جیاوازی هەیە، هەندێکیان هەست بە هیچ ناکەن، هەندێکیان تەنیا لەڕێی ئەم وروووژاندنەوە بە ئۆرگازم دەگەن. هەرچی ئەندامە سێکسییەکانی دیکەی ژنانن کە بە سەرچاوەی

ورووژاندن دادەنرێن، زێ و میتکەیە. مشتومڕێکی زۆر هەیە لەسەر بایەخی هەریەک لەم دوو ئەندامە لە ورووژاندنی سێکسیدا، هەروەها جیاوازی لەنێو ژناندا هەیە دەربارەی ئاستی وەڵامدانەوەی سێکسییان بۆ ورووژاندنی میتکە یان زێ.

شایەنی تێبینیکردنە میتکە لە ڕووی پێکهاتەی بایۆلۆژی و بنچینەی کۆرپەلەییەوە لە چووک دەچێ لە نێردا، میتکە لە مێ-دا لەوە ناچێ بەدەر لە چێژ هیچ ڕۆڵێکی دیکەی هەبێ. هەرچی زێ-یە، لە سێ بەشی دەرەوەیدا هەستە دەمار هەیە کە لەڕێی دەستلێدان و فشار خستنە سەری دەورووژێ، بەڵام سێ بەشی ناوەوەی هیچ دەمارەهەستێکی تیادا نییە، لەبەر ئەوە ئەم بەشە لە ناوەوە لە زێ-دا ناورووژێ. دواتر لە بابەتی توێژینەوە لە وەڵامدانەوە سێکسییەکانی مێ-دا ئەم بابەتە باس دەکەینەوە.

### هۆرمۆنەکان و سێکس

چەندەها هۆرمۆن لە جەستەی مێ-دا هەن، بەڵام بڕی ئەم هۆرمۆنانە لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دیکە دەگۆڕێت، هەروەها لە ڕووی کاریگەریشیانەوە بۆ سەر هاندەرە سێکسییەکان، بایەخیان یەکسان و لەیەکچوو نییە. وەک زانراوە ئەو هۆرمۆنانەی کە بە ستیرۆیدز Steroids ناسراون، بە هۆرمۆنی سەرەکی دادەنرێن کە کار دەکەنە سەر هاندەرە سێکسییەکان. هۆرمۆنەکانی ستیرۆیدز بە شێوەیەکی ڕێژەیی گەردیلەی بچووک و تا ئاستێکی زۆر لەیەکچوون لە پێکهاتەدا، لە ڕژێنەکانی زاوزێوە (هێلکەدان لە مێ، گون لە نێر) هەروەها لە توێکڵی دەرەوەی سەرەگورچیلەڕژێن Suprarenalەوە دەردەدرێن. گرنگترین ئەو هۆرمۆنانەی کە ئەم ڕژێنانە دەریدەدەن، ئەندرۆجینەکان Androgensو ئەسترۆجینەکان Estrogen و هۆرمۆنەکانی پرۆجیسترۆنە Progesterone، بەهێزترین هۆرمۆنی

ئەندرۆجینیش هۆرمۆنی تێستێسترونە Testesterone، لە هەموو هۆرمۆنە ئەسترۆجینەکانیش کاراتر هۆرمۆنی ئسترادیۆلە Edtradiol. هۆرمۆنی ئەندرۆجین و ئەسترۆجین هەردووکیان لە نێر و مێ-دا هەن، بەڵام ڕێژەی ئەندرۆجین بۆ ئەسترۆجین لە نێردا زۆر زیاترە لە مێ، سەرچاوەی سەرەکی ئەندرۆجینیش لە مێ-دا سەرەگورچیلەڕژێنە، بەڵام سەرچاوەی سەرەکیی ئەسترۆجین هێلکەدانەکانن. توێژینەوەکان ئاماژەیان بەوە داوە، لابردن و لێکردنەوەی هێلکەدانەکان لە مێ-دا مەرج نییە هاندەر و حەزە سێکسییەکان لە مێ-دا کەم بکاتەوە، بەڵام بە لابردنی سەرەگورچیلەڕژێن، ژن هەموو سەرچاوەکانی ئەندرۆجین لەدەست دەدات، ئەمەش دەبێتە هۆی لەدەستدانی تەواوی حەز و ئارەزووی سێکسی. بەم شێوەیە ئەندرۆجینەکان، بەتایبەتی ئەوانەی کە سەرچاوەکەیان سەرەگورچیلەڕژێنە، بەو هۆرمۆنانە دادەنرێن کە حەز و هاندەری سێکسی لە مێ-دا دەورووژێنن. لە کاتێکدا ئەسترۆجینەکان کە سەرچاوەکانیان هێلکەدانەکانن، هیچ کاریگەرییەکیان بۆ سەر ئەم هاندەرانە نییە، بۆ نموونە تێبینی دەکرێ لەوانەیە حەز و ئارەزووی سێکسی زۆر بێ، بەڵام ئاستی ئەسترۆجین نزم بێ، هەروەک لە ماوەی دوای منداڵبوون و شیرپێدانی منداڵدا ڕوو دەدات.

ئەو هۆرمۆنانەی دەردراوەکانی ستیرۆیدز ڕێک دەخەن، ئەو هۆرمۆنانەن کە ژێرمێشکەڕژێن لە دەماخدا Pituitary دەریان دەدات. ئەوەی پەیوەندیی بە مێ-وە هەیە ئەوەیە، ئەم هۆرمۆنانە بەرهەمهێنانی ئەسترۆجین دەگۆڕن و دەبنە هۆی پێگەیشتنی هێلکۆکە لە هێلکەداندا، لەگەڵ دەماخیشدا کار لێک دەکەن بۆ ڕوودانی سووڕی مانگانە، هەروەها توێکڵی دەرەوەی سەرەگورچیلەڕژێن دەورووژێنێ تا ستیرۆیدز بەرهەم بهێنێ بە هۆرمۆنەکانی ئەندروجینیشەوە، ئەم هۆرمۆنانە کە

ژێرمێشکەڕژێن بۆ ڕێکخستنی بەرهەمهێنانی ستیرۆیدز دەریدەدات، خۆی ناچار دەکات بۆ ڕێکخستنی هۆرمۆنی باڵاتر کە پێیان دەوترێ هۆرمۆنە دەرچووەکان Releasing Hormones، هەروەها پێشیان دەوترێ هۆرمۆنە دەمارییەکان. ناوەندی بەرهەمهێنانی ئەم هۆرمۆنانە بریتییە لە ناوکی هایپۆسالامەس Hypothalamus کە ناوچەیەکی دەماریی گرنگە و ڕاستەوخۆ دەکەوێتە سەر (ژێرمێشکەڕژێن)، تەنانەت هۆرمۆنە دەمارییەکانی ژێرمێشکەڕژێنیش، هەر دەکەونە ژێر کاریگەریی چەند ناوەندەدەمارێکی دیکە.

لەم خستنەڕووە پوختەی هۆرمۆنە کاراکان لە جەستەی مێ-دا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ، هۆکارەکانی کە کاردەکەنە سەر حەز و ئارەزووی سێکسی لەسەر ئاستی هۆرمۆنەکان، فرەسەرچاوەن.

سەرچاوەکانی ئەم کاریگەرییەش دەشێ فسیۆلۆژی یان دەروونی بن. دەشێ ئەم کارتێکەرانە، لەڕێی زیادکردنی بەرهەمهێنانی ئەندرۆجینکار بکەنە سەر هاندەری سێکسی، هەرچەندە لە هەندێک حاڵەتدا هاندەری سێکسی لای مێ زیاد دەکات، بێ ئەوەی هیچ زیادبوونێک لەم هۆرمۆنانەشدا ڕوو بدەن.

ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە، ئایا پاڵنەرە سێکسییەکانی مێ لە کاتی سووڕی مانگانەدا گۆڕانیان بەسەردا دێ؟ لە کاتێکدا ئاستەکانی هەردوو هۆرمۆنی ئەسترۆجین و پرۆجیسترۆن بە شێوەیەکی ئاشکرا و بەرفراوان گۆڕانیان بەسەردا دێ، هۆرمۆنەکانی ئەندرۆجینیش بە شێوەیەکی کەمتر گۆڕانیان بەسەردا دێ و لە ناوەڕاستی سووڕەکەدا ئەم گۆڕانانە دەگەنە لوتکە. ئادری و مۆریس Udry and Morris لە نێوان ساڵانی (١٩٦٨-١٩٧٠) لێکۆڵینەوەیان دەربارەی ئەم بابەتە ئەنجام دا. دەرئەنجام گەیشتنە ئەو باوەڕەی هاندەری سێکسی لای ژن لە ماوەی بەشی یەکەمی سووڕی مانگانە زیاد دەکات و لە نیوەی

سوورِەکەدا دەگاتە لوتکە، پاشان بەکاوەخۆ دادەبەزێ، دواتر لە کۆتایی سوورِەکەدا زیاد دەکاتەوە.

بەڵام هەندێ لە توێژەرانی دیکە پێیان وایە ئەو فاکتەرەی کە بریار لەسەر گەرموگورِی، یان لاوازیی پاڵنەرە سێکسییەکان دەدات لای مێ، گۆرِانکاری نییە لە هۆرمۆنەکاندا، بەڵکو تێروانینی باو بەرامبەر سوورِی مانگانە ئەمە دروست دەکات، تێبینی دەکرێ رِوونەدان و رِێگەنەدان بە پەیوەندیی سێکسی لە ماوەی رِۆژانی سوورِی مانگانەدا، ئارەزووی سێکسی بەهێزتر دەکات لەدوای کۆتایی هاتنی سوورِەکە، هەروەها بەر لە دەستپێکردنیشی بە هەمان شێوە ژن حەز دەکات لەگەڵ هاوبەشەکەیدا سێکس بکات، چونکە لە ماوەی رِۆژانی سوورِەکەدا ناتوانێ سێکس بکات.

لەگەڵ فرەیی ئەو هۆرمۆنانەی کار دەکەنە سەر ژیانی ژن و جیاوازیی ئاستیان لە کاتی سوورِی مانگانەدا، پێویستە ئەو رِایە بە هەند وەربگیرێ کە ژن لە کارتێکردنی سێکسیدا زیاتر پشت بە پاڵنەرە دەرەکییەکان دەبەستێ لە دەرەوەی خۆی، زیاتر لە پیاو کە پشت پاڵنەرەکانی ناوەوەی خۆی دەبەستێ، ئەمەش لەگەڵ ئەوانەدا دەگونجێ کە لە سەرەتای ئەم بەشەدا باسمان کردن و وتمان ورووژاندنی خۆبەخۆ لە ژیانی سێکسیی ژندا کەمتر دەردەکەوێ بە بەراورد لەگەڵ پیاودا. دەشێ ئەم لێکدانەوەیە هۆکاری ئەوە رِوون بکاتەوە کە بۆچی ژن کەمتر پێداگری دەکات لەسەر حەزە سێکسییەکانی و جێبەجێکردنیان بە بەراورد لەگەڵ پیاودا، هەروەها هیچ کاتێک ژن لە خۆیەوە لاقەی پیاو ناکات و بە زۆر سێکسی لەگەڵدا ناکات، لاقەکردنی سێکسی دیاردەیەکی رِەفتارییە تایبەتە بە نێر و ئاماژە دەدات بە توانا و توندیی کارتێکەرە سێکسییە خۆییەکان لە نێردا.

## وەڵامدانەوە سێکسییەکانی مێ

لێکچوونێکی زۆر لە نێوان وەڵامدانەوە سێکسییەکانی نێر و مێدا هەیە، وەک قۆناغەکانی ئەم وەڵامدانەوەیە لە ڕووی زنجیرەی بەدوایەکداهاتن و ماوەی زەمەنی و گۆڕانە فسیۆلۆژییەکان و ئەو پێکهاتە هەستییەشەوە کە هاوکاتە لەگەڵ ئەم وەڵامدانەوە. ئەم لێکچوونە شتێکی سەیر نییە ئەگەر ئەوەمان بە هەند وەرگرت کە ئەندامە سێکسییەکان لە نێر و مێدا یەک سەرچاوەی بایۆلۆژیی کۆرپەلەییان هەیە، هەروەها سێکس بەنیسبەت هەر یەک لە نێر و مێ کردارێکی سێکسیی سۆزدارییە کە تەواوی جەستە دەگرێتەوە، هەروەها کارلێکردنی تەواوی نێوان جەستە و ئەقڵ بۆ گەیشتن بە کۆتایی وەڵامدانەوە سێکسییەکان. هەروەها ناوەندە کۆئەندامی دەمار و چێوەکۆئەندامی دەمار کە خزمەتی وەڵامدانەوە سێکسییەکە دەکەن لە هەردوو توخمەکەدا، هەر یەکێکن. هەر وەک لە بڕگەی پێشوودا ئاماژەمان پێ دا، ئەو بناغە هۆرمۆنییەی کە لە ڕێکخستنی وەڵامدانەوە سێکسییەکاندا بەشداری دەکات، لە هەردوو توخمەکەدا هاوشێوەیە لەگەڵ بوونی هەندێ جیاوازیی ڕێژەیی لە نێوانیاندا بە شێوەیەک لەگەڵ سروشتی هۆرمۆنی ژن و پیاودا بگونجێ و خزمەتی مەبەستی زۆربوون بکات زیاتر لە مەبەستی سێکس. لەبەر ئەوەی لە بەشی پێشوودا باسی بابەتی وەڵامدانەوە سێکسییەکانمان کرد لە نێر و مێ-دا، لە باسکردنی ئەم بابەتە لەم بەشە تایبەتە بە ژن، تەنیا پوختەی بابەتەکان دەخەینەوە ڕوو، بەڵام جەخت دەکەینەوە لە هەندێ وەڵامدانەوەی سێکسی لە ژندا، بەتایبەتی ئۆرگازم.

***

زوربەی ئەو ڕاستییانەی سەبارەت بە وەڵامدانەوە سێکییەکانی مێ دەیانزانین، دەرئەنجامی ئەو تاقیکردنەوانەن کە ماستەرز و جۆنسۆن ئەنجامیان داوە و ژنانی بەشداربوو بە شێوەیەکی

ئارەزوومەندانە لەو تاقیکردنەوانەدا بەشدارییان کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە ناکرێ ئەو وەڵامدانەوانەی لە بارودۆخی تاقیگەیی و تا ئاستێک ئاشکرادا ڕوویان داوە، بە تەواوی بە یەکسان دابنێین لەگەڵ ئەو وەڵامدانەوە سێکسییانەی کە لە واقیعدا و بە نهێنی ڕوو دەدەن، بەڵام هەندێ لایەنی فسیۆلۆژیی ئەم وەڵامدانەوانە لە هەموو حاڵەتێکدا هەر وەک یەکن. هەردوو توێژەر ماستەرز و جۆنسۆن ئەم وەڵامدانەوانەیان بۆ چوار قۆناغی سەرەکی پۆلێن کردووە، کە بەدوای یەکدا بریتین لە: قۆناغی وروووژان، قۆناغی هەڵکشان، قۆناغی ئۆرگازم، قۆناغی هاتنەخوارەوە و دامرکانەوە. ئەم چوار قۆناغە بەرامبەر چوار قۆناغەکەی وەڵامدانەوەی سێکسین لە نێردا کە بریتین لە: قۆناغی وروووژان، قۆناغی هەڵسان، قۆناغی هاویشتن (ئۆرگازم) و قۆناغی هاتنەخوارەوە و دامرکانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە لێکچوون لە قۆناغەکانی وەڵامدانەوەی سێکسیدا لە نێوان هەردوو توخمەکەدا هەیە، بەڵام وەڵامدانەوە سێکسییەکانی ژن فرەجۆرییان زیاتر پێوە دیارە وەک لە پیاو و زیاتر لەگەڵ جۆری وەڵامدانەوەکەدا لە قۆناغەکاندا هاوجێ دەبن، هەروەها لێکچوونێکی دیکەش هەیە لە نێوان وەڵامدانەوەکانی نێر و مێدا لە ڕووی خێرابوونی هەناسەدان و چالاکبوونی سووڕی خوێن و کارکردنی دڵ، بەڵام گرنگترین جیاوازی لە وەڵامدانەوە سێکسییەکان لە نێوان ژن و پیاودا دەکەوێتە قۆناغی ئۆرگازمەوە.

### قۆناغی یەکەم- قۆناغی وروووژان

کاریگەرییەکانی لەسەر ئەندامەکانی زاوزێ و ئەندامەکانی دیکەش دەردەکەوێ. ئەو هەڵچوونانەی کە لە ئەندامەکانی دیکەدا دەردەکەوێ وەک لە مەمک و گۆی مەمکدا، گۆڕانکاری لە قەبارە و ڕەنگی مەمک و گۆکەیدا ڕوو دەدات. لەم قۆناغەدا گۆی مەمک

ڕەپ دەبێ و لە بنەوە لەسەر باری درێژی و پانی زیاد دەکات، خوێن دێت بۆیان و خوێنبەرەکان لەژێر پێستەکەیەوە دەردەکەون، ئەمەش وایان لێ دەکات قەبارەیان گەورەتر دەربکەوێ، سووربوونەوە لە بەشی سەرەوەی سک کە لەوانەیە تا ناوچەی مەمکیش بێت، ڕوو دەدات، لە نێریشدا دەشێ هەڵچوونی فسیۆلۆژیی توند ڕوو بدات، وەک خێرابوونی هەناسەدان و لێدانی دڵ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، زیادبوونی گرژبوونی ماسوولکەیی کە بە زۆری لە بەشی کۆتایی قۆناغەکەدا ڕوو دەدات، هەرچی ئەو گۆڕانانەشن کە لە ئەندامەکانی زاوزێ و ئەندامە سێکسییەکاندا ڕوو دەدەن، وەک لێوەکان، زێ، میتکە و منداڵدان، فەرمانی ئەم گۆڕانکارییانەش ئامادەکردنی مێیە بۆ خستنەناوەوەی چووک و بۆ ئەوەی چەندە لە تواناندا بێت وورووژاندن لە زێدا دروست بکرێ و بۆ پێشوازیکردن لە چووک ئامادە بکرێ. دوو لێوە گەورەکە کەمێک بۆ سەرەوە بەرز دەبنەوە و لە کونی زێ دوور دەکەونەوە، هەرچی دوو لێوە بچووکەکەشن قەبارەیان زیاد دەکات و سێ ئەوەندەی قەبارەی خۆیان گەورە دەبن، ئینجا لەناو دوو لێوە گەورە تووکنەکەدا بەرز دەبنەوە و دەردەکەون، بەم شێوەیە قووڵایی کەناڵی کونی زێ زیاد دەبێت. هەرچی سێ بەشی دەرەوەی ناوچەی زێ-یە، ئەوانیش گەورە دەبن و دەکرێنەوە. لە وەڵامدانەوەی ئەم قۆناغەدا، دیواری ناوچەی زێ شلەیەکی لینج و تەڕ دەردەدات کە لە ئارەقە دەچێ، ئەمەش لە ماوەی ١٠ بۆ ٣٠ چرکەدا ڕوو دەدات، هەروەها ڕەنگی دیواری ناوچەی زێ بەهۆی هاتنی بڕێکی زۆر خوێن بۆی، دەگۆڕێ. ئەوەی تێبینی دەکرێ ئەم قۆناغە لە ڕووی کاتەوە لەگەڵ هەمان قۆناغ لە نێردا لە یەک دەچن، وەک ئاشکرایە نێر بۆ خستنەناوەوە و مێ-ش بۆ ئاسانکردنی خستنەناوەوە ئامادە دەکات.

## قۆناغی دووەم-قۆناغی هەڵکشان

لەم قۆناغەدا گۆڕانکارییەکی ئەوتۆ لە دوو لێوە گەورە تووکنەکەدا ڕوو نادات، بەڵام هاتنی خوێن بۆ ئەم ناوچەیە بەردەوام دەبێ و لەم قۆناغەدا زیادیش دەکات، هەروەها هاتنی خوێن بۆ سێ بەشی دەرەوەی ناوچەی زێ زیاد دەکات، ئەمەش وا دەکات میتکە بە تەواوی ون ببێ و نەبینرێ، بەڵام ئەمە ڕاست نییە، چونکە لەم دۆخەدا میتکە دەکەوێتە پشت دوو لێوە بچووکەکەوە کە شێوەی سەرقاپێکیان وەرگرتووە، هەروەها ئەم قۆناغە بە قۆناغی هەڵکشانی توندی ئارەزووی سێکسی دادەنرێ، هەندێ وا لەم قۆناغە دەڕوانن هەروەک بڵێی سەحنەی یان پلاتفۆرمی ئۆرگازمە Orgazmic Platform، لەم قۆناغەدا مێ بۆ ئۆرگازم ئامادە دەبێ، یان مێ شکست دێنێ لە دەرککردن پێی، ماوەی زەمەنیی مانەوە لەم قۆناغەدا لە نێوان مێیەکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگۆڕێ، لە یەک مێ-شدا لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دیکە و لە وەڵامدانەوەیەکی سێکسییەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگۆڕێ، ئەم قۆناغە لە وەڵامدانەوەی سێکسیی مێ-دا، جیاوازە لە وەڵامدانەوەی سێکسیی پیاو لەم قۆناغەدا کە نزیکەی دوو بۆ سێ دەقیقە دەخایەنێ.

## قۆناغی سێیەم-قۆناغی ئۆرگازم

قۆناغی پێشوو، مێ بۆ ئۆرگازم لەم قۆناغەدا ئامادە دەکات، بەڵام لە واقیعدا، یان لە هەندێ مێ-دا و لە هەندێ حاڵەتدا، دەتوانن بێ ئەوەی بە قۆناغی پێشوودا تێپەڕن، ڕاستەوخۆ لەم قۆناغەدا بە ئۆرگازم بگەن، هەروەها لەوانەیە بتوانن جارێکی دیکە بە ئۆرگازم بگەنەوە لە ماوەی مانەوە لەم قۆناغەدا، واتە لە قۆناغی ئۆرگازمدا. ئەو گۆڕانکارییە فسیۆلۆژییانەی کە لەم قۆناغەدا ڕوو دەدەن، بریتین لە زنجیرەیەک گرژبوونی

دوابەدوایەکی هاوئاواز کە لە سێ بەشی دەرەوەی ناوچەی زێ-دا ڕوو دەدەن و کاتێ ئۆرگازم بە سێ بەشی ناوەوەی ناوچەی زێ دەگات، کەناڵی زێ درێژکۆلە دەبێتەوە، هەروەها جووڵەی پاڵپێوەنەر ڕووەو حەوز ڕوو دەدات. ئەو گرژبوونانەی لە حەوزدا ڕوو دەدەن، ناوبڕێکی زەمەنی دەکەوێتە نێوانیانەوە کە ماوەکەی هەشت لەسەر دەی چرکەیەکە لە نێوان هەر گرژبوونێک و یەکێکی دیکەدا. ژمارەی گرژبوونەکان ٣-١٥ دانە دەبێ لە هەر هەستکردنێکدا بە ڕوودانی ئۆرگازم، بەڵام ماوەی زەمەنیی نێوان ڕوودانی گرژبوونێک لەگەڵ یەکێکی دیکەدا، وردەوردە زیاد دەکات لەدوای سێ یان شەش گرژبوونی یەکەمەوە، هەروەها توندیی گرژبوونەکان بە زیادبوونی ژمارەیان کەم دەبێتەوە. بەرئەنجامی کۆتایی هەستکردن بە ئۆرگازم پشت دەبەستێ بە ژمارەی گرژبوونەکان و پلەی توندییان، بەم شێوەیە دەشێ مێ دوو یان چەند جارێ لەم قۆناغەدا بە ئۆرگازم بگات، هەروەها دەشێ هەندێ ژن بە حاڵەتێکی بەردەوامی ئۆرگازمدا بۆ ماوەی ٢٠ بۆ ٦٠ چرکە تێپەڕێ Status Orgasmus بێ ئەوەی بە ناوبڕی زەمەنیدا بڕوات، لە کاتی ئەم قۆناغەدا هیچ گۆڕانکارییەک بەسەر مێتکەدا نایەت.

### قۆناغی چوارەم- قۆناغی هاتنەخوارەوە و دامرکانەوە

یەکەمین گۆڕانکارییەکانی ئەم قۆناغە، لە سێ بەشی دەرەوەی ناوچەی زێ-دا ڕوو دەدات، کە سەحنە، یان پلاتفۆرمی ئۆرگازمە. لەم بەشەدا بە خێرایی هاتنی خوێن و سووربوونەوەی ئەم ناوچەیە دەوەستێ، پێچەوانەی پرۆسەی فراوانبوون لە سێ بەشی ناوەوەی زێ-دا بە شێوەیەکی هێواشتر ڕوو دەدات. هەرچی مێتکەشە، لە ماوەی ٥ بۆ ١٠ چرکەدا سەرلەنوێ دەردەکەوێتەوە لەدوای ئەوەی کردارەکانی گرژبوون لە ناوچەی زێ-دا کە

هاوكاتن لەگەڵ ئۆرگازمدا، تەواو دەبن، بەڵام ڕوودانی پێچەوانەی کرداری هاتنی خوێن بۆ میتکە و سووربوونەوە و ڕەپبوونی، لەدوای کۆتاییهاتنی ئۆرگازم پێویستی بە ١٠ بۆ ١٥ دەقیقەیە، ئەگەر مێ لەو پەیوەندییە سێکسییەدا بە ئۆرگازم نەگەیشت، ئەوا پێویستی بە چەند سەعاتێکە تا پێچەوانەی کرداری سووربوونەوە و ڕەپبوونی میتکە ڕوو بدات.

## کێشە سێکسییەکانی مێ

ئەو گیروگرفتانەی کە دەشێ مێ لە ژیانی سێکسیدا ڕووبەڕوویان بێتەوە، زۆر و فرەجۆرن، لە هەندێک ڕووەوە، دەشێ لەو گیروگرفتانە ئاڵۆزتر بن کە نێر لە ژیانی سێکسیدا بەدەستیانەوە دەناڵێنێ، هەروەها بۆ تێگەیشتن و چارەسەرکردنیش، کێشە سێکسییەکانی مێ ئەستەمترن. لەوانەیە هۆکاری ئەم ئاڵۆزی و ئەستەمییە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە ئەندامە سێکسییەکانی مێ ژمارەیان زیاترە و بڵاوبوونەوەیان لە جەستەدا بەرفراوانترە، هەروەها ئەم ئەندامانە زیاتر پەیوەندییان بە ڕۆڵی ژنەوە هەیە وەک دایک و ئەو گۆڕانکارییانەی کە هاوکاتن لەگەڵ ئەم ڕۆڵەدا، وەک ڕوودانی گۆڕانە فسیۆلۆژی و هۆرمۆنییەکان لە کاتی سووڕی مانگانەدا و لە کاتی دووگیانی و منداڵبوون و شیرپێدان و تەمەنی نائومێدیدا، تەواوی ئەم گۆڕانکارییانە کار دەکەنە سەر ورووژاندن و وەڵامدانەوە سێکسییەکانی ژن. بە سروشتی، ژن زیاتر پشت بە پیاو دەبەستێ لە ورووژاندنی سێکسیدا، لەبەر ئەوە توانا و سروشتی پەیوەندیی نێوان ژن و پیاو، کاریگەرییان دەبێ بۆ سەر ژیانی سێکسیی ژن. لەبەر ئەوە ناکرێ لە ژیانی سێکسیی ژن تێبگەین، ئەگەر بەگشتی لە ژیانی مێ تێنەگەین و بەو ڕۆڵانە ئاشنا نەبین کە وا پێویست دەکات وەک مێ پێیانەوە پابەند بێ، لەگەڵ ئەوەشدا ئاسانە لە ژیانی

سێکسیی ژن تێبگەین، ئەگەر لە تێگەیشتنەکەماندا ئەو هەموو هۆکارە زۆرەمان بە هەند وەرگرت کە کاریگەرییان بۆ سەر ژیانی سێکسی ژن هەیە، بەڵام ئەوەی ڕووی دا ئەوە نەبوو کە پێویست بوو ڕوو بدات و تێگەیشتنیش لە ژیانی سێکسیی ژن ئەو ئاڕاستەیەی وەرنەگرت، چونکە هەر لە بناغەوە ئەم ژیانەی ژن ڕەت کرایەوە، ئەمەش بەهۆی نەزانین و دواکەوتنەوە، یان بەهۆی فاکتەری شەرم و حەیا و عەیبەوە و هۆکارەکانی دیکەی کە هاندەرن بۆ شاردنەوە و بە نهێنی هێشتنەوەی ژیانی سێکسی لە ژندا، تەنانەت لەو کاتەشدا کە وردبوونەوە لە ژیانی سێکسیی ژن دەستی پێ کرد و ئەو بڕوایە سەری هەڵدا کە دەشێ ژنیش خاوەنی ژیانی سێکسی بێت، لە گۆشەنیگای پیاوەوە دەستی پێ کرد و ژیانی سێکسیی ئەو و کێشەکانی ئەو کران بە پێوەر، ئاستی سەرکەوتنی ژن لە ژیانی سێکسیدا پشتی بەست بە ئاستی سەرکەوتنی ژن لە ڕازیکردنی پێداویستییە سێکسییەکانی پیاو، لەگەڵ ئەوەشدا کە لەم سەردەمەدا دۆخەکە بە تەواوەتی گۆڕانی بەسەردا هات، بەڵام من بە دەگمەن سەردانی پزیشکی تایبەت دەکات بۆ وەرگرتنی ڕێنمایی پێویست بۆ چارەسەرکردنی کێشە سێکسییەکانی، ئەگەر ئەمەش بکات، ئەوا بە ناوی چارەسەرکردنی کێشەی سێکسییەوە سەردانی پزیشک ناکات، بەڵکو بە ناوی چارەسەرکردنی هەندێک حاڵەتی نەخۆشی و هەوکردن لە کۆئەندامی زاوزێدا ئەو کارە دەکات، یان بە بەهانەی دیکەی کێشەی تەندروستیی جەستەیی، یان دەروونی دەڕواتە لای پزیشک. هۆکاری ئەم شاردنەوەیە بۆ زۆر فاکتەر دەگەڕێتەوە، لەوانە، هۆکاری کۆمەڵایەتی کە شتێکی سروشتی نییە ژن بۆ چارەسەرکردنی کێشەی سێکسی بۆ لای پزیشکی پسپۆر بچێ، هەروەها فاکتەرێکی دیکەشیان بەهۆی ئەوەوەیە کە ژن خۆیشی بە شێوەیەکی تێروتەسەل لە ژیانی سێکسیی خۆی نەگەیشتووە و

نازانن چی سروشتییە و چی سروشتی نییە، هەروەها بڕوایەکی دیکەش هەیە کە مێ لە نێر زیاتر توانای خۆگونجاندن و ڕاهاتنی هەیە لەگەڵ واقیعی سێکسیی خۆیدا و ئەمەش وای کردووە ئەو بۆچوونە گەلاڵە ببێ کە مێ داواکاریی سێکسیی کەمتر هەیە و کەمتریش پێداگری لەسەر تێربوونیان دەکات، بە نزمترین ئاستی ئەم دواکارییانە ڕازی دەبێ و توانای خۆگونجاندنی لەگەڵیاندا هەیە.

* * *

دەشێ ژن بەدەست دوو کۆمەڵە کێشەوە لە ژیانی سێکسیدا بناڵێنێ، کۆمەڵەی یەکەم پەیوەندییان بە مەیلە سێکسییەکانی و تواناییەوە هەیە بۆ دەستکەوتنی چێژ و سێکسکردن. کۆمەڵەی دووەمیان، پەیوەندیی بەو ئەندامە سێکسییانەوە هەیە کە لە کرداری سێکسکردنەکەدا بەشداری دەکەن. لەگەڵ بوونی جیاوازی ئاشکرا لە نێوان دوو کۆمەڵەکەدا، بەڵام ڕوودانی هەر پشێوییەک لە یەکێکیاندا کار دەکاتە سەر ئەوی دیکەشیان، هەر لەبەر ئەوەشە سکاڵاکانی ژن لەم ڕووانەوە زۆرن و فرەلایەنن. لەپێناوی ئاسانکردنی تێگەیشتن لەم لایەنە ئاڵۆزانە لە ژیانی سێکسیی ژندا، هەوڵ دەدەین لە دوو بابەتی سەرەکیدا توێژینەوەکەمان باس بکەین. یەکەمیان لەکارکەوتن لە ئارەزووی سێکسی و چێژی سێکسیدا، دووەمیشیان لەکارکەوتنی پەیوەندیی سێکسی بەگشتی.

### ١- لەکارکەوتنی چێژ و ئارەزووی سێکسی:

لەگەڵ ئەوەشدا کە لەکارکەوتنی ئارەزووی سێکسی بە زۆری دەبێتە هۆی لەکارکەوتنێکی هاوشێوە لە چێژی سێکسیدا، بەڵام لە ڕاستیدا ڕوودانی لەکارکەوتن لە یەکێکیاندا جیا لەوی دیکەیان ڕوو دەدات، نموونەش لەسەر ئەمە، بوونی ئارەزووی سێکسی مەرج نییە هاوکات بێ لەگەڵ ڕوودانی دەستکەوتنی چێژی

سێکسی، لەبەر ئەوە وا پێویست دەکات بە شێوەیەکی جیا تەماشای هەردوو حاڵەتەکە بکەین و لێیان بکۆڵینەوە، هەرچەندە پەیوەندیی نێوانیشیان بەهێز و بەتینە.

ا- لەکارکەوتنی ئارەزوو

ئارەزووی سێکسی لە سەرەتای بیرکردنەوە لە سێکس، یان هەستکردن بە پێداویستیی سێکسی دەست پێ دەکات، ئەمەش لە ژنێکەوە بۆ یەکێکی دیکە و لە تەنیا ژنێکیشدا لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دیکە و لە پەیوەندییەکی سێکسییەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگۆڕێ. لەبەر ئەوە لەکارکەوتنی ئارەزوو دەشێ هەر لە سەرەتاوە ڕوو بدات، یان بیرکردنەوە لە سێکس و ئارەزووکردنی هەر ڕوو نەدات، کاتێ دەست پێ دەکات، پێویستی بە پاڵنەر هەیە بۆ تەواوکردنی و بەدواچوونی ئارەزووەکە، چونکە ئارەزووی سێکسی هێزی پێویستی نییە بۆ وروووژاندنی وەڵامدانەوە فسیۆلۆژییەکانی کە هاوکاتن لەگەڵ وروووژاندنی سێکسیدا. هەندێ جار ئەوە ڕوو دەدات مێ لە ڕووی تیۆرییەوە ئارەزووی سێکسی هەیە، بەڵام شکست دەهێنێ لە گۆڕینی ئەم ئارەزووە بۆ پاڵنەری سێکسی، ئیدی بەهۆی هەر هۆکارێکەوە بێ، هەندێ جاریش ژن هیچ بایەخدانێک بۆ بابەت و حەزی سێکسی دەرنابڕێ، بەڵام کاتێک بە شێوازێک لە شێوازەکانی وروووژاندنی سێکسیی دەوروژێ، ئیدی لەو کاتەدا ئارەزووە سێکسییەکەی بۆ دروست دەبێ، هەندێ جار ئەوەش ڕوو دەدات کە ژن لە سەرەتادا حەز و ئارەزوویەکی زۆری بۆ سێکس هەیە، بەڵام لەگەڵ یەکەمین هەوڵدانی پراکتیکی بۆ بەدیهێنانی، ئارەزووی سێکسیی دەکوژێتەوە. لە هەموو حاڵەتەکاندا، مێ لە نێر زیاتر پێویستی بە هاندەری وروووژێنەرە بۆ ئارەزووی سێکسی، ئەگەر ئەم هاندەرانە بەشی پێویست نەکەن و هاوبەشیی سێکسیی گونجاو ئامادە نەبێ

که بتوانێ بیورووژێنێ، ئەوا ئارەزووی سێکسی بە شاراوەیی دەمێنێتەوە، یان سنوورەکانی توانای بۆ بەدیهێنانی کرداری سێکسی تەواو بە نائاشکرایی دەمێننەوە. دەربارەی هاندەرە ورووژێنەرەکانی مێ، تێبینییەک هەیە هەرچەندە بەڵگەی تەواو نییە بۆ سەلماندنی، بڕوا وایە، هاندەرە ورووژێنەرەکان لە مێ-دا بە بەراوردکردنی لەگەڵ نێردا، تایبەتمەندتر و وردتر و ناسکتر و ئاڵۆزترن، لەبەر ئەوە پێویستە لە کاتی مامەڵەکردن لەگەڵ ژندا، ئەم تایبەتمەندییانە ڕەچاو بکرێن، چونکە ئەگەر وا نەبێ، پیاو شکست دەهێنێ لە وروورژاندنی ئارەزووی سێکسیی شاراوەیی و پاڵپێوەنانی بۆ وەڵامدانەوەی سێکسی سەرکەوتوو، نموونەکانیش دەربارەی لەکارکەوتنی ئارەزووی سێکسیی ژن زۆرن، مێ هەیە بە هیچ شێوەیەک بە هیچ سۆزێکی سێکسی ناورووژێ، ئیدی لە هەر سەرچاوەیەک، یان هەڵوێستێکی سێکسییەوە بێ، مێ هەیە هەست بە سۆز دەکات، بەڵام توانای وروورژاندنی نییە و ناتوانێ ڕووەو وەڵامدانەوەی سێکسی بەردەوام بێ، یان هەست بە چێژ بکات. ژن هەیە هەست بە هیچ سۆزێکی سێکسی ناکات لەگەڵ هاوسەرەکەیدا کە خۆشی ناوێ، یان حەزی لێ ناکات، بەڵام لە ڕاستیدا ئارەزووی سێکسیی هەیە. ژنیش هەیە ئارەزووی سێکسیی خۆی لە پەیوەندیی سێکسیی ئاساییدا ناخاتە ڕوو، بەڵام لە شێوەکانی دیکەی ڕەفتاری سێکسی، وەک ماستەربەیشن، یان پەیوەندیی سێکسیی لەیزبین، ئارەزووی سێکسیی هەیە و دەورووژێت و وەڵامدانەوەی سێکسییشی هەیە، یان پێویستی بە شێوەکانی دیکەی لادانی سێکسییە تا بورووژێت و وەڵامدانەوەی سێکسیی بۆ پیاو هەبێ.

هۆکارەکانی لەکارکەوتنی ئارەزووی سێکسی لە مێ-دا فرەجۆرن، دەشێ لە هۆکارێ زیاتر بەشداری بکەن لە ڕوودانی ئەم لەکارکەوتنەدا. بەگشتی هۆکارەکان لە مێ-دا لێکچوون لەگەڵ

هۆکارەکانی لەکارکەوتنی ئارەزووی سێکسی لە نێردا، هەرچەندە
مێ لەم هۆکارانەدا خاوەنی تایبەتمەندێتیی خۆیەتی، بۆ نموونە
ترسی کلاسیکیی ژن لە سێکس و دەرئەنجامەکانی ئەم پەیوەندییە،
وای لە ژن کردووە لەسەر جۆرێک لە ترس لە سێکس ڕا بێت کە
ئەمە دەبێتە هۆی کۆتوبەندکردنی ئارەزووی سێکسی، هەروەها
پەروەردەی کچ ڕۆڵی هەیە، کە لەسەر جۆرێ لە خۆپارێزی
بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان ڕادەهێنرێ، کە هەمان
کاریگەریی نێگەتیڤی بۆ سەر ئارەزووی سێکسی هەیە. فاکتەرێ
دیکەش هەیە، کە ژن بەردەوام لە دەرئەنجامەکانی پەیوەندیی
سێکسی دەترسێ، وەک دووگیانی و بەرپرسیارێتیی
پەروەردەکردنی منداڵ، ئەمانەش هەموویان ئارەزووی سێکسی
لاواز دەکەن، یان بە تەواوی لە کاری دەخەن. هەندێ جار ژن
دەترسێ پەیوەندیکردنە سێکسییەکەی ببێتە هۆی بەستنی
پەیوەندییەکی هاوسەرێتی کە دواتر نەزانێت چۆن خۆی لێ
دەرباز بکات، ئەمەش دەبێتە هۆی وەستاندنی ئارەزووی سێکسی،
هەندێ جاریش ئارەزووی سێکسیی لاواز دەبێ بەهۆی
لاوازبوونی جەستە بەگشتی بەهۆی نەخۆشییەکەوە، یان بەهۆی
ئەنجامدانی نەشتەرگەری، وەک لابردنی مەمک، یان منداڵدان،
کاریگەریی ئەم هۆکارانە لەم حاڵەتانەدا زیاتر دەروونییە وەک
لەوەی فسیۆلۆژی بێت. ئەگەر بەدواچوون بۆ سەرجەم ئەم
هۆکارانە بکەین، بۆمان دەردەکەوێ، لەدەستدانی سازان و مەیل و
سەرنجڕاکێشانی سێکسی لە نێوان ژن و پیاودا، گرنگترین و
زۆرترین هۆکارە بۆ لێکدانەوەی ڕوودانی پشێوییەکانی ئارەزووی
سێکسی لە کۆی سەرجەم هۆکارەکان لە مێ-دا.

ب- لەکارکەوتنی ڕازیبوونی سێکسی

لەوانەیە مێ بەهۆی لەکارکەوتنی ئارەزووی سێکسی، نەتوانێ چێژ لە پەیوەندیی سێکسی ببینێ، وەک لە بڕگەی پێشوودا باسمان کرد، بەڵام دەشێ ئەم لەکارکەوتنە لە چێژبینین و ڕازیبوونی سێکسی ڕوو بدات، تەنانەت ئەگەر ئارەزووی سێکسییش هەبێ، لەکارکەوتنی ڕازیبوونی سێکسی و چێژبینین، دەشێ بە کەمی ڕوو بدات، واتە مێ تا ئاستێکی کەم چێژ ببینێ، هەندێ جاریش بە تەواوەتییە و مێ هیچ چێژێک نابینێت و هەست بە هیچ ڕازیبوونێک ناکات لە کاتی خۆئامادەکردن، یان ئەنجامدانی سێکسدا، هەندێ جاریش چێژ هەیە، بەڵام مێ ناگاتە لوتکەی چێژ، یان هەموو جارێ ناگات، یان ئەوەندە ناخایەنێ و بەو شێوەیە دووبارە نابێتەوە کە دڵی ئەو ژنە ڕازی بکات.

گرنگترین خاڵ کە لەم بابەتەدا پێویستە دەرکی پێ بکەین، ئەوەیە مێ لەوانەیە بەشی پێویست لە ڕازیبوونی سێکسی دەست بکەوێ، بێ ئەوەی پێویست بکات بە ئۆرگازم بگات. زۆرێک لە ژنان بەو تەماس و سازان و بەیەکگەیشتنە سێکسییە لەگەڵ هاوبەشەکەیاندا قەناعەت دەکەن کە لە کاتی پەیوەندیی سێکسیدا ڕوو دەدات، تەنانەت بێ ئەوەی بە ئۆرگازمیش بگەن، بەڵام ئەوەی لەم ساڵانەی دواییدا، بەهۆی کرانەوەی بواری سێکسی و لە ئەنجامی توێژینەوەکانەوە دەرکەوت، ئاماژەیان دا بە ڕۆڵ و گرنگی گەیشتن بە ئۆرگازم لە مێ-دا، تەنانەت گەیشتنە ئەو بڕوایەی شکستهێنانی ژن لە گەیشتن بە ئۆرگازم، بەڵگەیە لەسەر ڕوودانی لەکارکەوتنێکی گرنگ لە ژیانی سێکسیی مێ-دا، یان بە دەستەواژەیەکی دیکە، مێ لە ئەزموونێکی گرنگ بێبەش دەبێ بۆ تێروتەواوبوونی ژیانی ئەگەر نەیتوانی بە ئۆرگازم بگات لە پەیوەندیی سێکسیدا. ئەم بۆچوونە بووە هۆی سەرهەڵدانی زۆرێک لە پشێوییە دەروونییەکان و گرژی و بارئالۆزی لە

پەیوەندیی نێوان ژن و پیاودا کە ژن بەرپرسیارێتیی نەگەیشتنی بە ئۆرگازم دەخستە ئەستۆی پیاوەکەیەوە. لەبەر ئەوەی ئەم بابەتە لەم ساڵانەی دواییدا بایەخێکی کتوپڕی پێ درا و هەروەها بووە هۆی سەرهەڵدانی ئاڵۆزی لە ژیانی زۆرێک لە ژناندا، پێویستە بە بایەخێکی زیاترەوە ئەم بابەتە بخەینە بەر باس و توێژینەوە، لێرەدا پوختەی هەموو ئەو زانیارییانە دەخەینە ڕوو کە دەربارەی ئۆرگازم لە ڕووی زانستییەوە سەلمێنراون.

- لێکۆڵینەوەکەی کنزی، کە لە شێوەی ڕاپرسیدا ئەنجامی دابوو، هەرچەندە لێکۆڵینەوەیەکی کۆنە بەراورد بە لێکۆڵینەوە نوییەکان، بەڵام گرنگیی خۆی هەیە وەک بناغەیەک بۆ بەراوردکردنی لەگەڵ زانیارییە تازەکاندا، کنزی ئاماژەی داوە، جیاوازییەکی ئاشکرا هەیە لە نێوان توانا و ژمارەی ئەو جارانەی کە مێ بە ئۆرگازم دەگات، لە مێیەکدا کە هاوسەرێتیی کردووە لەگەڵ مێیەکدا کە هاوسەرێتیی نەکردووە، لە کاتێکدا ١٠٠%ی کوڕان لە تەمەنی بیستساڵیدا بە ئۆرگازم دەگەن، ٤٠%ی کچان کە شوویان نەکردووە و ٦٠%ی ژنان کە شوویان کردووە بە ئۆرگازم دەگەن لەم تەمەنەدا. ڕێژەی گەیشتن بە ئۆرگازم لە تەمەنی ٢٥ ساڵیدا، هێدی هێدی بەرز دەبێتەوە بۆ ٥٠% لەو کچانەدا کە هاوسەرێتییان نەکردووە و ٨٠% لە ژنانەدا کە هاوسەرێتییان کردووە، بۆ ٧٠% و ٩٥% بەدوای یەکدا لە تەمەنی ٤٥ ساڵیدا، بەڵام ژمارەی ئۆرگازمەکان بە پێچەوانەی نێرەوەوە، لە مێ-دا هەر بە کەمی دەمێنێتەوە بە درێژایی ژیان، لەو بارەدا ئەگەر ئەو مێیە هەر هاوسەرێتیی نەکرد، بەڵام ژمارەی ئۆرگازم لەو ژنانەدا کە شوویان کردووە، لە تەمەنی گەنجێتیدا زیاترە و وردەوردە لەگەڵ چوون بە تەمەندا کەم دەبێتەوە (بە ڕێژەی ٩ جار لە مانگێکدا لە تەمەنی بیست ساڵیدا و ٢ جار لە مانگێکدا لە تەمەنی ٦٠ ساڵیدا). لەم ڕووەوە کە بەکاوەخۆ لەگەڵ چوون

بەتەمەندا ژمارەی ئۆرگازمەکان کەم دەبنەوە، نێر و مێ لە یەک دەچن، هەرچەندە تەنیا جیاوازییەکی کەم بەدی دەکرێ بە بڕی ١٠ بۆ ٣٠% لە قۆناغە جیاوازەکانی تەمەندا. هەروەها لێکۆڵینەوەکەی کنزی ئاماژەی بەوە دا ئەو مێی بەر لە هاوسەرێتی فرسەتی گەیشتن بە ئۆرگازمی بۆ ڕەخسا بێت، ئیدی بەهۆی هەر سەرچاوەیەکەوە بووبێ، ئەوا لەدوای هاوسەرێتی بەختی زیاترە لە گەیشتن بە ئۆرگازم، بەراورد لەگەڵ ئەو مێیەی ئەو فرسەتەی بۆ نەڕەخساوە بەر لە ژیانی هاوسەرێتی، هەروەها کنزی ئەوەشی تێبینی کرد، ئاستی ڕۆشنبیری مێ فرسەتێکی باشتر بە مێ دەبەخشێ بۆ گەیشتن بە ئۆرگازم. مێ لە کۆتایی ساڵی یەکەمی هاوسەرێتی ئەگەری گەیشتنی بە ئۆرگازم ٧٥%ە، بەڵام لەدوای بیست ساڵ لە ژیانی هاوسەرێتی، ئەم ڕێژەیە دەگاتە ٩٠%، هەروەها بە ڕێژەی ١ لە هەر ٣ مێیەکدا کە کنزی ڕاپرسیی لەگەڵ کردبوون، ئاماژەیان بەوە دا، لە هەر پەیوەندییەکی سێکسیدا لە جارێک زیاتر بە ئۆرگازم گەیشتوون.

- لێکۆڵینەوەکان ئاماژە بەوە دەدەن، مێ لە سەردەمی کنزییەوە، واتە لە ساڵی ١٩٥٣ەوە تا ئێستا، توانای زیاتر بووە لە گەیشتن بە ئۆرگازم، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە مێی هاوچەرخ لە ڕووی سروشتی بایۆلۆژییەوە گۆڕانی بەسەردا هاتووە بەراورد لەگەڵ مێ لە سەردەمی کنزیدا. ئەوەی ڕووی داوە مێی هاوچەرخ چێژ لە ئازادیی سێکسی زیاتر دەبینێ، دەرکی زیاترە بەرامبەر شوێنە وروژێنەرەکانی جەستەی و چۆنێتیی دەستکەوتنی چێژ، هەروەها هاوبەشە سێکسییەکەشی لە سەردەمی هاوچەرخدا هۆشیاریی زیاترە بەرامبەر پێداویستییە سێکسییەکانی و دەزانێ پێویستە هەوڵ بدات بۆ تێرکردن و ڕازیکردنیان، نەک تەنیا لەبەر ژنەکە، بەڵکو بۆ ئەوەی پێکەوە لە یەک کاتدا بە ئۆرگازم بگەن و چێژێکی زیاتر هەست پێ بکەن.

پاشان بەکارهێنانی هۆیەکانی دژەسکپڕی بە شێوەیەکی بەرفراوان، لە سەردەمی ئێستادا، وای کردووە ژن زیاتر حەز لە سێکس بکات و ئارەزووی سێکسی تێر بکات بێ ئەوەی هەست بەو ترسانەی پێشوو بکات سەبارەت بە دەرئەنجامەکانی پەیوەندیی سێکسیی کە زۆربەی کات ڕێگر بوون لە گەیشتنی مێ بە ئۆرگازم. لێکۆڵینەوەکانی هنت Hunt لە ساڵی ١٩٧٤دا دەربارەی ڕەفتاری سێکسی، لە ساڵانی حەفتاکانی ئەمەریکا و لێکۆڵینەوە هاوشێوەکان لە فەرەنسا و ئەڵمانیای خۆرئاوا، ئەم ئەنجامانە پشتڕاست دەکەنەوە.

- لێکۆڵینەوەکانی ماسترز و جۆنسۆن، ئاماژە بەوە دەدەن، کرداره فسیۆلۆژییەکانی کە هاوکاتن لەگەڵ گەیشتن بە ئۆرگازم لە نێر و مێدا هاوشێوەن، بەلام مێ لە نێر زیاتر توانای هەیە لە ماوەیەکی کورتدا لە چەند جارێ زیاتر بە ئۆرگازم بگات. ژمارەیەک لە توێژەران، (کە شێرفی Sherfy یەکێکە لەوانە ١٩٦٦)، بڕوایان وایە ئەم جیاوازییە لە ژمارەی جارەکانی گەیشتن بە ئۆرگازم، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە مێ توانای گەیشتنی بە ئۆرگازم لە پیاو زیاترە.

- توێژینەوەکان ئەوە دەخەنە ڕوو کە مێ توانای ڕەزامەندبوون و تێربوونی سێکسیی هەیە بە بێ ئەوەی بە ئۆرگازم بگات، لەبەر ئەوە ناکرێ ڕەزامەندبوونی سێکسی و گەیشتن بە ئۆرگازم وەک یەک شت تەماشا بکرێن. بۆ نموونە کنزی تێبینیی کردووە، ٣٠%ی ئەو ژنانەی شوویان کردووە، جار جار بە ئۆرگازم دەگەن، یان هەر ناگەن، هەروەها ٥٠%یان بەیناوبەین پێی دەگەن، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی زۆری ئەم ژنانە چێژ لە پەیوەندیی سێکسی دەبینن.

- ژمارەیەک لە توێژەران دەڵێن هەندێ لە ژنان ئەوە ڕەت دەکەنەوە کە بە ئۆرگازم گەیشتبن، تەنانەت بە پلەیەکی زۆر

کەمیش، ئیدی ئەمە لەبەر هەر هۆیەک بێ، هۆکاری ئەم ڕەتکردنەوەیە هەندێ جار بۆ سروشتی ئۆرگازم دەگەڕێتەوە کە دەشێ مێ ئەوەندە کەم هەستی پێ بکات، هەر تێبینیی ڕوودانی نەکات، لەوانەشە ڕازیکەر نەبێ، یان چێژبەخش نەبێ، بۆیە لەم بارانەدا بارگرژیی زیاتر دروست دەکات بۆ مێ، لەجیاتی هەستکردن بە حەوانەوە. هەندێک لە ژنانیش ڕازی نابن ئەزموونی ئۆرگازم تاقی بکەنەوە.

- زۆربەی مێ پێیان وایە وورووژاندنی میتکە لە ڕێی دەستەوە بۆ گەیشتن بە ئۆرگازم، بە کردارێکی گرنگ دادەنرێ، ١٩%یان بە زۆر پێویست وەسفی دەکەن، ٦٤%یان بە لایانەوە خوازراوترە لە وورووژاندنی ناوچەی زێ، زۆربەی لێکۆڵینەوەکان پشتگیری لەو بۆچوونە دەکەن کە مێ بەختی زیاترە لە گەیشتن بە ئۆرگازم لەڕێی وورووژاندنی میتکەوە، ئیدی بە هەر ڕێگەیەک بێ. بەو شێوەیە لە وورووژاندنی زێ دەڕوانن کە وورووژاندنێکی ڕاستەوخۆیە و بە شێوەیەکی میکانیکی بە وورووژاندنی میتکە کۆتایی دێ. ژمارەیەک لە توێژینەوەکان جیاوازی دەکەن لە نێوان هەستی ژن کاتێک کە بە ئۆرگازمی زێ دەگات لەگەڵ هەستی کاتێ کە بە ئۆرگازمی میتکە دەگات. هەستی گەیشتن بە ئۆرگازمی میتکە، توندوتیژترە، بەڵام هەستی گەیشتن بە ئۆرگازمی زێ قووڵتر و هێورترە. ئەم توێژینەوانە، بەپێی ناوچەی وورووژان و گەیشتن بە ئۆرگازم، ژنان لە ڕووی سروشتی دەروونییانەوە بۆ دوو گرووپ پۆلێن دەکەن، ئەو مێیەی لەڕێی میتکەوە دەورووژێت و بە ئۆرگازم دەگات، لەگەڵ ئەو مێیەی کە لەڕێی ناوچەی زێیەوە دەورووژێت و بە ئۆرگازم دەگات. بەو پێیە گرووپی یەکەم کە چێژ لە وورووژاندنی میتکە دەبینن، بەوە دەناسرێن کە دڵەڕاوکێیان هەیە و وێنایەکی ئاشکرایان دەربارەی کۆئەندامی زاوزێ و سێکس نییە. دەروونشیکاران هۆکاری ئەوەی

بۆچی مێ وورووژاندنی هەندێ ناوچەی بە لاوە خوازراوترە لە هەندێکی دیکە، بۆ ئەوە ناگێڕنەوە کە وورووژاندن پەیوەندیی بە شوێنی وورووژاندنەکەوە هەبێت، چونکە لە هەردوو حاڵەتەکەدا هەر دەبێتە هۆی وورووژاندنی میتکە، هۆکاری ئەم جیاوازییە بۆ سروشتی سایکۆلۆژیی مێ دەگەڕێننەوە. ئەو ژنەی حەز دەکات خۆی چەقی بایەخپێدان بێت، هاوبەشە سێکسییەکەی لێی جیا بێت و گرنگیی پێ بدات، ئەوا چێژی گەیشتن بە ئۆرگازم لەڕێی میتکەوە بە لایەوە دڵخوازترە لە زێ، بەڵام ئەو ژنەی کە حەز دەکات پێکەونووسانی تەواو لە نێوان خۆی و هاوبەشەکەیدا ڕوو بدات لە کاتی سێکسکردندا، ئەوا چێژی گەیشتن بە ئۆرگازم لە ناوچەی زێ-ی بە لاوە دڵخوازترە لە میتکە.

### ئەو فاکتەرانەی کار دەکەنە سەر ئۆرگازم

ژمارەیەک فاکتەر هەن کە کار دەکەنە سەر گەیشتنی مێ بە ئۆرگازم، ئەم تێبینییە زانستییانە، هەندێک لەو زانیارییانە پشتڕاست دەکەنەوە کە دەربارەی ئەم بابەتە وتراون و دەماودەم دەگوێزرێنەوە، هەندێکیش لەو زانیارییە باوانە پووچەڵ دەکەنەوە.

هیچ بەڵگەیەکی زانستی ئەوە ناسەلمێنێ کە ژنی دیندار کەمتر بە ئۆرگازم دەگات بەراوردکرندنی لەگەڵ ژنانی دیکە کە گرنگی بە بیروباوەڕی ئایینی نادەن.

ئەو ژنەی لە ڕووی ئاستی خوێندنەوە لە پلەیەکی بەرزتردایە، زیاتر توانای گەیشتنی بە ئۆرگازم هەیە، بەراورد لەگەڵ ئەو ژنانەی کە ئاستی ڕۆشنبیرییان نزمترە، ئەمەش ئەو ڕایە پووچەڵ دەکاتەوە کە پێی وایە ژنی خوێندەوار کەمتر هەست بە وورووژانی سێکسی دەکات.

هیچ پەیوەندییەک لە نێوان ژمارەی جووتبوون و گەیشتن بە ئۆرگازم نییە، هەروەها فاکتەری زەمەن، یان کات، هیچ کەفیل نییە

بۆ ئەوەی ژن بە ئۆرگازم بگات، ئەگەر خۆی هەر نەتوانێ بگات، تەنیا ڕێژەیەکی کەمی ژنان، تێپەڕبوونی کات و ماوەی زەمەنی یارمەتییان دەدات بۆ گەیشتن بە ئۆرگازم.

هیچ پەیوەندییەکی بەتین نییە لە نێوان ئەگەری ڕوودانی ئۆرگازم و خەسڵەتەکانی هاوبەشی سێکسی لە ڕووی کەسێتی و شارەزایی سێکسییەوە، هەرچەندە هەندێک لە توێژەران، بەرپرسیارێتیی شکستهێنانی مێ لە گەیشتن بە ئۆرگازم بۆ ئەستۆی پیاو دەگەڕێننەوە.

هیچ کەسێک تا ئێستا ئەوەی نەسەلماندووە کە گەیشتنی مێ بە ئۆرگازم پەیوەندیی بە فاکتەری هۆرمۆنی یان جەستەییەوە هەیە.

ئەوەی پێویستە لە مەسەلەی گەیشتن بە ئۆرگازم فەرامۆشی نەکەین، بابەتی جیاوازیی نێوان نێر و مێیە لە ڕووی ئەو کاتەوە کە بۆ گەیشتن بە ئۆرگازم پێویستیان پێیەتی، چونکە هەندێ جار پیاو زووتر بە ئۆرگازم دەگات و تەواو دەبێت، ئەمە وا دەکات لە نیوەی ڕێگەکەدا ژن بەجێبێڵێت کە هێشتا پێویستی بە کاتی زیاترە بۆ گەیشتن بە ئۆرگازم، بۆیە ئەم ژنانە ناچارن بە واقیعەکە ڕازی ببن و مەسەلەی گەیشتن بە ئۆرگازم فەرامۆش بکەن، یان بە هاوکاریی دەستی هاوبەشەکەیان، یان دەستی خۆیان بە ئۆرگازم بگەن.

لە ناوەندەکانی دەروونشیکاریی سێکسی، ئەو ڕایە هەیە کە پێی وایە، ئەو ژنەی کە شکست دەهێنێ لە گەیشتن بە ئۆرگازم، بەدەست پشێوییەکی دەروونییەوە دەناڵێنێ. شکستهێنانی ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە خاوەنی پێکهاتەیەکی دەروونییە کە توانای گونجانی نییە، هەروەها کەسێکی پشێوە و خود-ی وەک پێویست کامڵ و تێروتەواو نەبووە. بەدەست کۆمەڵێک ململانێی نەستییەوە دەناڵێنێ کە خۆی بێئاگایە لێیان، ئەمانەش وای لێ دەکەن نائارام بێت و

دەروونی سەقامگیر نەبێت. یەکێک لە گرنگترین ئەو ململانێیانە، گرێی ئۆدیبە، کە دەرئەنجامی گرێی ئیرەییبردن بە چووک، لە مێ-دا دروست دەبێ، یان بەهۆی هەستکردن بە گوناه، یان ئەنگێزەی سادییەوە ڕوو دەدات. بەم شێوەیە لە نەزەری دەروونشیکارانەوە، شکستهێنانی مێ لە گەیشتن بە ئۆرگازم، تەنیا یەکێکە لە نیشانەکانی تووشبوونی ئەو کەسە بە پشێوییەکی دەروونیی گشتی. قوتابخانەی دەروونشیکاری پشتی بە ڕای فرۆید بەستووە لەوەدا کە پێی وایە، ئۆرگازمی سروشتی پێویستە لەڕێی خستنەناوەوەی چووکەوە ڕوو بدات، بەڵام گەیشتن بە ئۆرگازم لەڕێی میتکەوە، بەڵگەیە لە پێنەگەیشتنی مێ و کەموکوڕی لە توانای گونجاندندا، بەڵام بەڵگەی پێویست لە بەردەستدا نین بۆ سەلماندنی ئەم ڕایە و پشتڕاستکردنەوەی، چونکە سەرجەم توێژینەوەکان کە تا ئێستا ئەنجام دراون، هیچ بەڵگەیەکیان نەخستووەتە ڕوو کە پەیوەندی هەبێت لە نێوان هاوسەنگیی دەروونیی ژن و گەیشتن بە ئۆرگازم، تەنیا لە ژمارەیەکی کەمی حاڵەتەکاندا نەبێ. لەبەر ئەوە مرۆڤ دەتوانێ لە ئەنجامی توێژینەوەکانەوە ئەو دەرئەنجامە هەڵهێنجێنێت، کە لە ڕووی زانستییەوە ئەوە نەسەلمێندراوە ئەو ژنەی بە ئۆرگازم ناگات، ئیدی لە ڕووی دەروونییەوە پشێویی هەیە.

ئۆرگازم و فاکتەرەکانی کە دەبنە هۆی وروژاندنی، یان شکستهێنانی، بابەتگەلێکن تا ئێستا پێویستیان بە لێکۆڵینەوە و تێگەیشتنی زیاترە، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەربارەی ئەم بابەتانە زۆر وتراون و زۆر نووسراون، بەڵام هەقیقەتێکی ئاشکرا هەیە، ئەویش ئەوەیە مێ هەر لە سەرەتای ئەم سەدەیەوە (سەدەی بیست) بەختێکی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتری هەبووە لە دەستکەوتن و گەیشتن بە ئۆرگازم، بە لایەنی کەمەوە لە کۆمەڵگەی خۆرئاواییدا، لەوانەیە ئازادبوونی ژن و گەشەسەندنی هۆشیاریی بەرامبەر بە

پێداویستی و چێژ و تواناکانی بۆ دەستکەوتنیان، کاریگەرییەکی زۆری هەبووبێ بۆ سەر زیادبوونی فرسەتەکانی گەیشتن بە ئۆرگازم. شایانی باسە من لە هەندێ لە کۆمەڵگە سەرەتاییە هاوچەرخەکاندا لە زۆربەی، یان هەموو پەیوەندییەکی سێکسیدا بە ئۆرگازم دەگات. لێکۆڵینەوە ئەنسرۆپۆلۆژییەکان دەربارەی کۆمەڵگەی مانگایا Mangaia لە باشووری ئۆقیانووسی هێمن، ئاماژە بەوە دەدەن، من لەم کۆمەڵگایانەدا هەمیشە بە ئۆرگازم دەگات لە هەموو پەیوەندییەکی سێکسیدا، هەروەها پێی سەیرە کە من لە کۆمەڵگەی خۆرئاواییدا هەموو جارێ بە ئۆرگازم ناگات و پێی وایە ئەمە زیان بە تەندروستیی دەگەیەنێ. توێژەران هۆکاری ئەم دیاردەیە بەوە لێک دەدەنەوە، ئەم کۆمەڵگەیە تا ڕادەیەک لێبوردەییان بەرامبەر بە سێکس هەیە و بەهایەکی گەورە بۆ سێکس دادەنێن کە جیاوازە لەو بەهایەی کۆمەڵگەی خۆرئاوایی و کۆمەڵگەکانی دیکە بە سێکسیان بەخشیوە. سەرباری ئەمانە، پەیوەستیی سۆزداری لە نێوان ژن و پیاوەکانی کۆمەڵگەی مانگایا لەدوای تێروتەواوبوونی پەیوەندیی سێکسی دەست پێ دەکات، نەک لەپێش پەیوەندیی سێکسییەوە، ئەمانەش یارمەتیی ژن دەدەن بۆ بە ئاسانی گەیشتن بە ئۆرگازم.

### ٢- لەکارکەوتنی پەیوەندیی سێکسی

دەشێ من بەدەست چەندەها پشێویی ئەندامی، یان فسیۆلۆژیی ناوچەییەوە بناڵێنێ و ئەمانەش کار بکەنە سەر ژیانی سێکسی، گرنگترین ئەو پشێوییانەش بریتین لەم حاڵەتانەی خوارەوە:

١- لەکارکەوتنی سووربوونەوە و هاتنی خوێن: ئەم حاڵەتە دەبێتە هۆی کەموکوڕی لە تەڕبوونی ناوچەی زێ، لێرەشەوە دروستبوونی بەربەست لە بەردەم کشان و بەرفراوانبوونی ئەم ناوچەیەدا.

لەکارکەوتنی ڕەپبوون لە پیاودا بەرامبەر ئەم حاڵەتەیە لە ژندا. دەشێ ئەم دۆخە لە ژندا بەهۆی لاوازیی وەڵامدانەوەی سێکسیی ژن بۆ ئارەزووی سێکسی ڕوو بدات، یان بەهۆی کەمیی ئەم ئارەزووەوە، یان بەهۆی نەبوونی هاندەری سێکسیی گونجاو، بۆ نموونە ژنەکە هاوبەشەکەی بە دڵ نییە، یان شێوازی وورووژاندنەکە لە ئاستی ڕازیبوونی حەزی ژنەکەدا نییە. لەم کاتەدا مێ هەست بە شکستی و پەستی دەکات کە هاوبەشەکەی ناتوانێ لە پێداویستییە سێکسییەکانی تێبگات. گرنگترین هۆکارەکانی ئەم لەکارکەوتنە بەهۆی کەموکوڕی بڕی هۆرمۆنەکانەوەیە (هۆرمۆنی ئەستروٚجین)، ئەویش بەهۆی چوونە تەمەنی نائومێدییەوە، یان شکستهێنانی زووی هێلکەدان، یان بەهۆی نەخۆشییەکی دەمارییەوە کە کاری کردبێتە سەر ناوچەی هایبۆسالامەس-ژێرمێشکەڕژێن- هێلکەدان. لە هۆیەکانی دیکەش وەک نەخۆشیی شەکرە، دڵەڕاوکێ و تووڕەیی و چەندەها حاڵەتی دیکە لەو حاڵەتە هەستییانەی کە لەوانەیە ببنە هۆی دوورکەوتنەوە لە سێکس، بەتایبەتی لەگەڵ هاوبەشێکی سێکسیدا کە ژن هەست بکات، ئەو پیاوە تەنیا بۆ بەرژەوەندی و زەوقی خۆی بەکاری دەهێنێ، بێ ئەوەی بیر لە پێداویستییەکانی ئەم بکاتەوە، یان لەبەر ئەوەی کە حەزی لێ ناکات، یان چیی دیکە لە ڕووی سێکسییەوە سەرنجی ڕاناکێشێ.

٢- لەکارکەوتنی تەشەنووجیی زێ Vaginismus: لە شێوەی گرژبوون و تەشەنووجیی ماسوولکەکانی سێ بەشی دەرەوەی ناوچەی زێ ڕوو دەدات، ئەو ژنەی تووشی ئەم حاڵەتی پەککەوتنە بووە، هەر کە بیر لە پەیوەندیی سێکسی دەکاتەوە، یان هەر لە سەرەتای پەیوەندییەکەوە، تووشی ئەم گرژبوونە دەبێت کە وا دەکات پەیوەندیی سێکسیی ئازاراوی بێت، یان سەرکەوتنی ئەستەم بێت. ئەم تەشەنووجە لەوانەیە ئاڵۆزتر بێت ئەگەر

گرژبوونی ڕانیش لەگەڵیدا هاوکات بوو، لەم بارەدا خستنەناوەوەی چووک لە لایەن پیاوەوە کارێکی ئەستەم دەبێت. هەندێ جار ئەم حاڵەتە لە سەرەتای هاوسەرێتییەوە ڕوو دەدات، کە هۆکارەکەی ڕاهاتنی کچە لەسەر ترس لە پەیوەندیی سێکسی، یان بەهۆی یەکەم ئەزموونی سێکس لە شەوی یەکەمی هاوسەرێتی، یان ئەزموونی لاقەکردن و دەستدرێژیکردنەسەر، هەندێ جاریش هەمان حاڵەت بەهۆی بارودۆخێکی تەواو پێچەوانەوە ڕوو دەدات، کاتێک پیاو زۆر نەرمونیان و ناسک و نێگەتیڤ دەبێت، ئیدی ژن بەردەوام دەبێت لەسەر ڕێگرتن لە پەیوەندیی سێکسی لەڕێی ئەم لەکارکەوتنەوە.

٣- جووتبوونی ئازاراوی **Dyspareunia**: ئەم حاڵەتە لە ژندا زیاتر لە پیاو ڕوو دەدات، هۆکاری دەروونی و جەستەیی و نەشتەرگەری لەپشت ئەم حاڵەتەوەن، کە وەک پێشتریش ئاماژەمان پێ دا، دەشێ هۆکاری سەرەکی بن لە ڕوودانی ئەم حاڵەتەدا. لە هۆکارە گرنگەکانی دیکەی ئەم حاڵەتە، بە توندی سێکسکردنی پیاوە لەگەڵ ژنەکەیدا و سەپاندنی پێداویستییەکانی خۆیەتی بەسەریدا، بێ ئەوەی ڕەچاوی پێداویستییەکانی ژنەکە بکات، هەروەها هەندێ جار هەوکردن، وشکیی ناوچەی زێ و خورانی و میتکە هەمان حاڵەت دروست دەکەن، یان بەکارهێنانی هەندێ لە هۆیەکانی دژەسکپڕی (جگە لە حەب)، وەک بەکارهێنانی هەندێ کرێم و هەتوانی تایبەتی، یان دانانی لەولەب، بەکارهێنانی دوش،[*] بەکارهێنانی کۆندۆم لە لایەن پیاوەوە هەمان ئازار لە کاتی سێکسدا دروست دەکات. ئاشکرایە ئەم حاڵەتانە دەبنە ڕێگر لە بەردەم ڕوودانی وەڵامدانەوەی سێکسی لە ژندا و لێرەشەوە ناتوانێ هەست بە ڕازیبوونی سێکسی بکات و بە ئۆرگازم بگات.

## کێشە هاوبەشەکان لە ژیانی سێکسی ژندا

لەوانەیە می بە هەندێ ئەزموونی پەیوەندیی سێکسیدا تێپەڕ ببێ کە تا ئاستێک جیاواز بن لە پەیوەندیی سروشتیی سێکس لە نێوان ژن و پیاودا. ئەم ئەزموونانە یەکێک یان زیاتر لەم بوارانەی خوارەوە دەگرێتەوە کە بریتین لە: ماستەربەیشن، هۆمۆسێکسوالیتی یان لەیزبینزم و لادانە سێکسییەکان. ئەم بوارانە لە بەش و بابەتی تایبەت بە خۆیان باس کراون، لێرەدا بە کورتی ئاماژە بەو لایەنانە دەدەین کە تایبەتن بە ژیانی ژن لەم بوارانەدا:

### ١- ماستەربەیشن

منداڵان لە هەردوو توخمەکە، هەر لە تەمەنی یەک، یان دوو ساڵییەوە دەست بە گەمەی سێکسی دەکەن، بەم کارەیان چێژێکیان دەست دەکەوێ، ئەگەر ڕێگریشیان لێ بکەیت، هەست بە جۆرێ لە بارگرژی و تووڕەبوون دەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەستەمە بە یەک چاو تەماشای گەمەبازیی سێکسی لە منداڵان و پەیوەندیی سێکسیی سروشتی بکەین لە گەورەکاندا، بەڵام هاوکات، ناشتوانین جیاوازی لە نێوان هەستکردن بە چێژ لە هەردوو حاڵەتەکەدا بکەین. دەکرێ ماستەربەیشن، کە کردارێکە لەڕێی دەستەوە دەکرێ، بە درێژکراوەی گەمەی سێکسیی منداڵی دابنێین. درێژبوونەوەی گەمەی سێکسیی منداڵی لە شێوەی ماستەربەیشندا لە منداڵی کوڕدا زووتر و ئاشکراتر دەردەکەوێ وەک لە منداڵی کچ. لێکۆڵینەوەکەی دویچ و سیگۆش لەسەر کۆمەڵێکی گەورە لە کچان و کوڕانی هەرزەکار لەنێو تەمەنی ١٦-١٧ ساڵیدا، کە هاوسەرێتییان نەکردبوو، ٢٨%یان ددانیان بەوەدا نا کە لە تەمەنی ١٣ ساڵی بۆ خوارەوە ماستەربەیشنیان کردووە. ئەم ژمارەیە لە تەمەنی ١٤ ساڵی بۆ ٣٩% بەرزبووەوە و لە تەمەنی ١٥ ساڵی بۆ ٤٩% بەرزبووەوە و لە تەمەنی ١٦ ساڵی بۆ ٥٠% بەرزبووەوە.

ئەم ڕێژانە لە کوڕاندا بەم جۆرە بوون، ٦١%، ٨٢%، ٩٢%، ٩٣%
بەدوای یەکدا، هەروەها لێکۆڵینەوەکە ئەوەشی ڕوون کردەوە کە
ناوەندی ڕێژەی پراکتیزەکردنی ماستەربەیشن لە مێ-دا ١.٤ جار
بووە لە مانگێکدا، لە کوڕانیشدا ٥.١ جار بووە لە مانگێکدا، هەروەها
تەنیا ٢٥%ی کچان بە شێوەیەکی چالاک ماستەربەیشنیان
کردووە، بەرامبەر بە ڕێژەی کوڕان کە گەیشتووەتە ٧٨%. لە
ڕاپرسییەکەی کنزیشدا دەرکەوتووە لە هەر ١٠ کچ ٦یان
ماستەربەیشن دەکەن تا ئەو ساتەی کە بە ئۆرگازم دەگەن. سێ
بەشی ئەو کچانەی ماستەربەیشن دەکەن، لە بیستەکانی
تەمەنیاندان، لە کاتێکدا ٩٠%ی کوڕان ئەم ڕەفتارە سێکسییە لە
هەمان تەمەندا پراکتیزە دەکەن. ئەنجامەکانی دویچ و سیگۆش،
لەگەڵ ئەنجامەکانی کنزیدا تەواو کۆک بوون، هەردوو لا بەو
ئەنجامە گەیشتن کە ماستەربەیشن لە مێ-دا لە تەمەنێکی درەنگتر
دەست پێ دەکات بەراوردکردن لەگەڵ نێردا، هەروەها کچان کەمتر
لە کوڕان پراکتیزەی ئەم ڕەفتارە سێکسییە دەکەن و دووبارەی
دەکەنەوە. کنزی لە ساڵی ١٩٥٣دا بۆی دەرکەوت ئەو ژنانەی
هاوسەرێتییان کردووە و ماستەربەیشن پراکتیزە دەکەن، بە
ڕێژەی یەک بۆ دوو جار لە مانگێکدا دووبارەی دەکەنەوە. ئەم
دیاردەیە سەرنجی توێژەرانی ڕاکێشا و بە شوێن ئەو هۆکارانەدا
گەڕان کە بۆچی ژن ماستەربەیشن دەکات لە کاتێکدا فرسەتی
ئەوەی هەیە پەیوەندیی سێکسیی سروشتی پراکتیزە بکات؟
توێژەران لە زۆر لایەنەوە لێکدانەوەیان بۆ ئەم دیاردەیە کرد.
ماستەرز و جۆنسۆن پێیان وا بوو ماستەربەیشن لە ڕووی
فسیۆلۆژییەوە، بەنیسبەت وەڵامدانەوەی سێکسییەوە، زیاتر ژن تێر
دەکات وەک لە پەیوەندیی سێکسیی ڕاستەقینە، هەروەها یارمەتیی
ژن دەدات بۆ ناسینی خۆی و ئاشنابوون بە نیشانە زووەکانی
وەڵامدانەوەی سێکسی و گەیشتن بە ئۆرگازم. ژمارەیەکی دیکە لە

توێژەران سەبارەت بە لێکدانەوەی ئەم دیاردەیە پێیان وایە، ماستەربەیشن بەڵگەیە لەسەر ئەوەی وروروژاندنی میتکە لەڕێی دەستەوە، لە هەموو ڕێگەکانی دیکە زیاتر وەڵامدانەوەی سێکسیی تەواو لە ژندا بەدەست دەهێنێ، بە ئۆرگازمیشەوە، ئەویش بەهۆی فەراهەمنەبوونی سەرچاوەکانی دیکەی وروروژانی سێکسی، یان شکستهێنانی ئەم سەرچاوانە. شانبەشانی ئەم لێکدانەوانە، ژمارەیەک لێکدانەوەی دەروونیش هەن بۆ شرۆڤەکردنی ئەو هۆکارانەی وا لە ژن دەکەن، لەگەڵ بوونی فرسەتی جووتبوونی ڕاستەقینە، لەڕێی دەستەوە خۆییە وروروژاندن ئەنجام دەدەن، لەو لێکدانەوانە وەک، لێکدانەوەکەی لینگ Aiang لە ساڵی ١٩٥٩دا، بەپێی لینگ لەبەر ئەوەی ڕەفتاری ماستەربەیشن لە هەندێ ژندا ڕەفتارێکی سێکسییە و دوور لە چاوی کەسانی دیکە دەکرێ، ئەمە وا دەکات خەرمانەیەکی ناسروشتی لە ناواقیعیبوون بە دیاردەکە ببەخشێ. لەم بارەیەوە لینگ دەڵێ: "بەئاگایی ئەو کەسەی کە ماستەربەیشن دەکات، تووشی ئاڵۆزی دەبێت لە نێوان دوو بیرکردنەوەدا. لە لایەک وا دەزانێ جەستەی بەهۆی کردارێکی ڕاستەقینەوە دەستدرێژیی کراوەتە سەری، لە لایەکی دیکەوە لە هەڵوێستێکی خەیاڵیدا دەژی، لە ماستەربەیشندا جەستە بۆ مەبەستێکی ئاشکرا بەکار دێ کە بریتییە لە دەستکەوتنی چێژ و ڕەزامەندبوونی سێکسی لە ڕێگەی سڕینەوەی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کێشە ڕاستەقینەکاندا، ئیدی بابەتی ڕاستەقینەی ئارەزوو لای ئەو کەسە دەبێتە تەنیا سێبەری بابەتێکی دیکەی خەیاڵلێکراوە، ئەمەش کێشەی ئەو کەسانەیە کە ماستەربەیشن دەکەن، خەیاڵی خۆی سێبەری بۆ دروست دەکات". ماستەرز لە ساڵی ١٩٦٧دا گۆشەنیگایەکی نزیکی لەوەی لینگەوە هەبوو، پێی وا بوو، ئەو کەسەی ماستەربەیشن دەکات، لەکاتی ئەنجامدانی ئەم ڕەفتارەدا، ناچارە لە چەند گۆشەنیگایەکەوە لە جەستەی خۆی بڕوانێ، چونکە

له یەک کاتدا خۆی چێژەکە دەبەخشێ و هەر خۆیشی وەریدەگرێ، لەوانەیە لە خەیاڵی خۆیدا، ببێت بە کەسێکی دیکە و بۆ ناو ئەم هەڵوێستە سێکسییە بانگێشت کرابێت، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، ماستەربەیشن، هانی پەرتبوون، یان دابەشبوونی ناسنامەی خۆیی دەدات، هاوکات یارمەتیی دروستکردنی چەندەها شێواز دەدات بۆ ڕوانین لە جەستەی خۆ. ئەم تێبینییانە بەسەر نێر و مێدا وەک یەک جێبەجێ دەبن. لە لایەکی دیکەوە، هەروەک چۆن پاڵنەر هەن بۆ ئەنجامدانی ماستەربەیشن، ڕێگریش هەن بۆ نەکردنی، زۆربەی ئەو ژنانەی ڕێگری دەکەن لە ئەنجامدانی ماستەربەیشن، ئەو ژنانەن کە بڕوایان بە ئازادیی سێکسی، یان بایەخی سێکس لە ژیاندا نییە، هەروەها ژمارەیەکی دیکە لە ژنان، بڕوایان بە ژیانێکی ڕۆتین و خاوێن هەیە، لە ماستەربەیشن دووردەکەونەوە، چونکە پێیان وایە مەسەلەیەکی قێزەوەن و دژ بە نەریت و ڕێسای ئایینییە، ئەگەر بە گوناهیش لەقەڵەمی نەدەن.

هۆکارەکانی ماستەربەیشن لای مێ هەرچییەک بن، پاڵنەر هەبن بۆ ئەنجامدانی، یان ڕێگری هەبن بۆ ئەنجامنەدان، ئەم بابەتە گرنگی و ڕەهەندی نوێی لەخۆ گرت، کاتێک زاناکان دەستیان کرد بە چارەسەرکردنی حاڵەتی لەکارکەوتنی سێکسی لە مێ-دا، یان لە ژن و پیاو هەردووکیاندا و پەنایان بۆ ماستەربەیشن برد وەک هۆکارێک بۆ چارەسەرکردن، هەندێکیان چەندەها میتۆدی ڕاهێنانیان دانا و بۆ ڕاهێنانی هاوسەران لە ژن و پیاو لەسەر ماستەربەیشن، وەک بەشێک لە ڕێنمایی سێکسی بۆ حاڵەتەکانی لەکارکەوتنی سێکسی لە ژن و پیاودا. لەم شێواز و میتۆدانە وەک میتۆدی لوبکولوا ١٩٧٢ کوبلنبرگ ١٩٧٤ بارباخ ١٩٧٥ ئەم توێژەرانە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە میتۆدەکانیان لە پشتبەستن بە ئەنجامدانی ماستەربەیشن وەک تەکنیکێکی چارەسەر، سوودی هەبووە لە چارەسەرکردنی نزیکەی ٨٠ بۆ ١٠٠%ی حاڵەتەکان.

## ٢- هۆمۆسێکسوالیتی-لەیزبینزم

پێشتر لە بەشی تایبەت بەم دیاردەیە، باسی لایەنە جیاوازەکانی ئەم دیاردەیەمان کرد، لێرەدا کارێکی سوودبەخشە هەندێ هەقیقەتی زیاتر دەربارەی بابەتەکە بخەینە ڕوو. لێکۆڵینەوەکەی ئایزک لە ساڵی ١٩٧٦دا کە لە شێوەی ڕاپرسیدا لە بەریتانیا ئەنجامی دا، ئاشکرای دەکات، ٢%ی کچان و ٣%ی کوڕان، لە نێوان تەمەنی (١٨-٦٠) ساڵی، توخمەکەی خۆیان بە لاوە دڵخوازترە بۆ سێکسکردن لەگەڵیاندا، ٤%یان زیاتر توخمەکەی خۆیان سەرنجیان ڕادەکێشێ، ٧٠%ی کچان و٧٤%ی کوڕان پێیان وا بووە کە هۆمۆسێکسوالیتی شتێکی سروشتییە لای هەندێ خەڵک. بەپێی ئاراستەی زانستی لە ئێستادا، پێویستە جیاوازی بکرێ لە نێوان پراکتیزەکردنی هۆمۆسێکسوالیتی و مەیلی هۆمۆسێکسوالیتیدا. توێژەران پێیان وایە تەنیا ئەنجامدانی هۆمۆسێکسوالیتی بەس نییە بۆ دیاریکردنی ئاراستەی هۆمۆسێکسوالیتیی تاک، چونکە زۆر کەس هەن، چەندەها شێوازی جیاوازی پراکتیزەکردنی سێکسییان هەیە، یان خەون و خەیاڵی هۆمۆسێکسوالیتییان هەیە و توخمەکەی خۆیان سەرنجیان ڕادەکێشێ، بێ ئەوەی هیچ ڕوخسارێکی پشێوی لە کەسیتییاندا تێبینی بکرێ، بەڵام ئەو گرووپەی کە لەم بابەتەدا شوێنی بایەخن، ئەو کوڕ یان کچانەن، کە هێندەی بە پراکتیزەکردنی هۆمۆسێکسوالیتییان ناسراون، هێندە پەیوەندیی سێکسیی سروشتی و ڕاستەقینە لەگەڵ توخمە دژەکەی خۆیاندا ئەنجام نادەن، چونکە ئەم گرووپە تەنیا لەڕێی پەیوەندی و ڕەفتاری هۆمۆسێکسوالیتییانەوە هەست بە ڕەزامەندی و چێژی سێکسی دەکەن، ئەم گرووپە بە ڕێژەی ٣%ی کچان (تا تەمەنی ٤٥ ساڵی) و ٨%ی کوڕان (لە هەرزەکارییەوە تا کامڵبوون) مەزەندە دەکرێن. گرنگترین ڕوخسارەکانی هۆمۆسێکسوالیتی لە مێ-دا ئەوەیە

ناسنامەی سێکسیی بەگشتی مێیە، هەرچەندە هەندێک لە لەیزبینییەکان ڕەفتاری پیاوانە دەنوێنن، هەروەها تێبینی کراوە پەیوەندیی لەیزبینی، واتە پەیوەندیی سێکسیی نێوان مێ و مێ لە تەمەنێکی درەنگتر دەست پێ دەکات، بەراورد لەگەڵ کوڕاندا. لە کچاندا ماوەیەکی درێژتر بەردەوام دەبێت و ئەو دوو کچەی کە لەیزبینن، پەیوەندییەکی بەتینتر پێکیانەوە دەبەستێ و دڵسۆزترن بۆ یەکدی بەراورد بە هەمان پەیوەندی لە نێوان دوو کوڕدا. هۆمۆسێکسوالیتی لە مێ-دا یان ئەوەی پێی ناسراوە لەیزبینزم، کەمتر بایەخی پێ دراوە و سەرنجی خەڵکی ڕاکێشاوە، بەڵام لە ڕووی یاسایی و کۆمەڵایەتی و ئەدەبییەوە، ڕەتکراوەیە و ئاشکرا هەست بەوە دەکەین کە جیاوازی هەیە لە نێوان ڕەتکردنەوەی هۆمۆسێکسوالیتی لە کوڕان و هۆمۆسێکسوالیتی لە کچاندا، لە لایەکی دیکەوە، هۆمۆسێکسوالیتی لە مێ-دا دەشێ ببێتە هۆی ڕوودانی زۆر کێشەی کۆمەڵایەتی و هاوسەرێتی، بەتایبەتی زۆرێک لە لەیزبینییەکان لەگەڵ پیاودا هاوسەرێتی دەکەن و منداڵیشیان دەبێ.

### ٣- لادانی سێکسی

هەمان ئەو مەیل و لادانە سێکسییانەی کە لە نێردا هەن، دەشێ لە مێ-شدا ڕوو بدەن. لە بەشی تایبەت بە لادانی سێکسی باسی ئەمانەمان کردووە، سوودی بەراوردکردنی ڕێژەی ڕوودانی لادانە سێکسییەکان لە نێوان نێر و مێدا، لەوەدایە، بەو ڕاستییە ئاشنا دەبین، کە ئەو ڕەفتارە سێکسییانەی بە لادانی سێکسی دادەنرێن، ڕێژەی ڕوودانیان لە مێ-دا کەمترە وەک لە نێردا. بەشێک لە هۆکاری جیاوازی نێوان ئەم ڕێژانە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە مێ لە نێر کەمتر پێداگری لەسەر پراکتیزەکردنی سێکسی خۆیی و ڕاستەقینە دەکات، هەروەها بە کەمترین بڕ لە سێکس و چێژی

سێکسی ڕازی دەبێت، لەبەر ئەوە کەمتر لە کوڕ پێویستی بەوەیە بە شوێن هۆکاری دیکەی تێرکردن و چێژبینیندا بگەڕێ، پاشان دۆخی کۆمەڵایەتیی کلاسیکی ژن وا پێویست دەکات، ژن کەمتر بوێری تیادا بێت بۆ پراکتیزەکردنی لادانی سێکسی بە شێوەیەکی ئارەزوومەندانە. مێ زۆربەی کات ملکەچی نێرە لە پراکتیزەکردنی لادانیدا، بە چاوپۆشین لەوەی ئایا ئەو لادانە چەندە لەگەڵ مەیل و حەزە سێکسییەکانی خۆیدا دەگونجێ یان ناگونجێ. هەروەک لە کوڕاندا ڕوو دەدات، لادانی سێکسی دەشێ ببێتە هۆی گۆڕینی ئامانج، یان بابەتی سێکسی، لە مێ-دا هەمان شت ڕوو دەدات. دەروونشیکاران بە هەمان چاو کە تەماشای لادانی سێکسیی لە کوڕاندا پێ دەکەن، تەماشای لادانی سێکسیی پێ دەکەن لە کچاندا، هەروەها لەسەر هەمان بناغە لێکدانەوەشیان بۆ دەکەن، لادانەکان لە مێ-شدا هەروەک نێر، لە یەکدی جودا نین و پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە. دەشێ ژنێک لە یەک کاتدا بەدەست چەند لادانێکی سێکسییەوە بناڵێنێ، بەڵام مێ هەروەک پێشتریش وتمان، لە نێر کەمتر تووشی ئەم لادانانە دەبێت، هەندێک جۆری لادانیش هەن تەنیا تایبەتن بە نێر و بە دەگمەن لە مێ-دا ڕوو دەدەن، وەک لادانی جۆری خۆنمایشکردن، خۆمەڵاسدان، لەبەرکردنی پۆشاکی توخمەکەی دیکە، گۆڕینی توخم. لە تێڕامانماندا بۆ هۆکاری کەمیی لادانە سێکسییەکان لە مێ-دا بەراورد لەگەڵ نێردا، بۆمان دەردەکەوێ کە ڕێژەی مێیەتی لە مێ-دا زۆر زیاترە لە ڕێژەی نێرینەیی لە نێردا، لەبەر ئەوە مێ لە حەز و مەیل و ڕەفتار و پراکتیزەکردنە سێکسییەکانیدا زیاتر لەگەڵ ناسنامەی توخمی خۆی کۆک و هاوتایە.

## هەڵویستی مێ بەرامبەر بە سێکس

باسکردنی هەڵویستەکانی مێ بەرامبەر بە سێکس، بابەتێکی نوێیە، تەنانەت لە شارستانییەتی خۆرئاوایی هاوچەرخیشدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە نوێیە، ڕەهەندی زۆری لەخۆ گرتووە، بە ڕادەیەک کە ئەستەمە بتوانرێ ڕای مێ و هەڵویستی بەرامبەر بە لایەنێکی ژیانی فەرامۆش بکرێ کە زۆر گرنگە. لە چارەکی کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم، ژمارەیەکی زۆر لە توێژەران، چەندەها توێژینەوەیان ئەنجام دا لەپێناوی دیاریکردنی هەڵویستی مێ بەرامبەر بە بابەتە سێکسییە جۆراوجۆرەکان، ئەو زانیارییانەی کە توێژەران دەستیان کەوت، تیشکی زۆری خستە سەر ژیانی سێکسیی ژن، هەروەها ئەم زانیارییانە یارمەتیدەر بوون بۆ تێگەیشتن لە هەندێک لایەنی ئەم ژیانە لە ژندا، وەک لایەنی هەستکردن و پراکتیزەکردنی پەیوەندیی سێکسی. بۆ دەستکەوتنی ئەم زانیارییانە، ڕاپرسی ئەنجام درا و پرسیار لە ژن کرا دەربارەی زۆر بابەت کە تایبەت بوون بە ڕەفتار و هەستی ژن، بۆ نموونە دەربارەی ئەو شێوازەی کە بەهۆیەوە بە ئۆرگازم دەگات، باری دەروونی و جەستەیی لە کاتی گەیشتن بە ئۆرگازم، ئۆرگازمی مێتکە و ئۆرگازمی مێ، کامیانی بە لاوە دڵخوازترە؟ گەمەبازی بەر لە جووتبوون و سێکسی تەواو، بارودۆخی پەیوەندیی سێکسی، ئەو خەیاڵ و وێنە سێکسییانەی هاوکاتن لەگەڵ کرداری سێکسەکەدا، ئەو هەستانەی کە هەیەتی بەرامبەر شوێنە سێکسییە جیاوازەکان لە جەستەدا، پراکتیزەکردنی ماستەربەیشن، فرەجۆریی سێکسی و لادانەکان، خاڵە سەرنجڕاکێشەکان لە هەردوو توخمەکەدا، ئەمانە و چەندەها بابەتی دیکە کە تایبەتن بە ژیانی سێکسی و هەڵویستی ژن بەرامبەریان، هەروەها هەوڵی باشیش درا بۆ بەستنەوەی هەندێ لە ڕوخسارەکانی ڕەفتاری سێکسیی ژن بە کەسێتیی ژن و هەندێک بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیری و ئایینی و چەندەها فاکتەری دیکەوە کە هەموویان بە بڕ و شێوەی جیاواز دەشێ کار بکەنە سەر

هەست و ڕەفتاری سێکسیی ژن. ئەگەر بتوانین پرەنسیپە گشتییەکان لەم توێژینەوانە هەڵهێنجێنین، ئەوا لەم خاڵانەدا پوختیان دەکەینەوە:

یەکەم: ڕەفتاری سێکسی لە مێیەکەوە بۆ یەکێکی دیکە لە سنووری بەرفراواندا، جیاوازە، لە ڕووی ئەو گەمەبازییانەی کە ئارەزووی دەکەن جیاوازن، هەروەها دەربارەی ئەو گەمەبازییانەی کە پێش کرداری سێکس ئارەزووی دەکەن، لەگەڵ ئەو دۆخە سێکسییانەی لە کاتی سێکسکردندا حەزی لێ دەکەن و چێژی زیاتریان پێ دەبەخشێ.

دووەم: زۆربەی کات ژنان ئاگایان لەم جیاوازییانە نییە کە لە ڕەفتار و هەڵوێستی سێکسییاندا هەیە، لەبەر ئەوە ئەم جیاوازییانە، جیاوازیی ڕەسەنن و لە سروشت و مۆرکی مێ-دا ڕەگیان داکوتاوە، بێ ئەوەی لە یەکدییەوە فێر بووبن.

سێیەم: جیاوازییەکی گەورە لە نێوان ژناندا هەیە سەبارەت بە ئاستی پێویستییان بۆ ڕازیبوون و تێربوونی سێکسی، هەندێک مێ، بە پێداگری و پەیوەندیی سێکسیی ڕاستەقینە و زۆر نەبێ، لە ڕووی سێکسییەوە تێر نابن، بەڵام ئەو مێیانەش هەن کە تەنیا نزیکبوون و تەماسیان بەسە بۆ تێربوونی سێکسی لەگەڵ هاوبەشەکانیاندا.

چوارەم: جیاوازی لە نێو مێ-دا هەیە، نەک تەنیا لە ڕووی ئەو وروژێنەرانەی کە بە لایانەوە کاریگەرترە، بەڵکو لە ڕووی ئەو ماوە زەمەنییانەشەوە کە تیادا زیاتر هەست بە وروژانی سێکسی دەکەن، وەک لە کاتی سووڕی مانگانە و دووگیانیدا.

پوختەی ئەم توێژینەوانە تا ئێستا ئەو دەرئەنجامە دەدەن بەدەستەوە کە ژیانی سێکسیی مێ زیاتر پەیوەستە بە کەسێتی و باری دەروونی و بارودۆخی ژیانی کە چەندەها فاکتەر کاری تێدەکەن، بۆ نموونە وەک پەیوەندیی بە هاوبەشەکەیەوە. لەبەر هەموو ئەم هۆیانە، ژیانی سێکسیی مێ لەوپەڕی وردی و

ئاڵۆزیدایە، مێ پێویستی بەوەیە کە خۆی ببێتە سەرچاوەیەکی گرنگ و سەرەکی بۆ ئەم تێگەیشتنە، بەڵام مێ خۆی بەرامبەر هەموو ئەو شتانەی کە لە ژیانیدا بەسەری دێن، بەئاگا نییە، لەبەر ئەوە پێویستی بەوەیە کە لە دەرەوەی خۆی چاودێریی ڕەفتاری بکرێ، یان لەڕێی هاوبەشە سێکسییەکەیەوە، یان لەڕێی چاودێریکردنی هەردووکیانەوە پێکەوە. لەبەر هەموو ئەو شتانەی باسمان کردن، وا پێویست دەکات، لە چەند ڕەهەندێکەوە لە ژیانی سێکسیی ژن بڕوانین، چونکە ڕوانین لە تەنیا ڕەهەندێکەوە، بۆ نموونە تەنیا تەماشاکردنی وەک مێ، یان تەنیا ڕوانین لە ڕوانگەی پیاوەوە، وەک ئەوە وایە بە یەک چاو تەماشای شت بکەی، کە ناتوانی وەک پێویست ئەو شتە لە هەموو لایەکەوە ببینی. مەسەلەیەکی دیکەی گرنگ هەیە هەر تایبەت بە ژیانی سێکسیی مێ، ئەویش مەسەلەی کاتە، لە کاتێکدا کوڕان هەر لە تەمەنی باڵقبوونەوە بە کۆمەڵێک ڕوخساری سێکسیی تا ڕادەیەک جێگیرەوە دەناسرێن، بەڵام ئەم ڕوخسارە سێکسییانە لە مێ-دا لە سەرەتای زووی باڵقبوونەوە دەرناکەون، تەنانەت کاتێک کە دەریش دەکەون، مەرج نییە لە ڕووی حەز و هەستکردن بە تێربوون و ڕازیبوون و پراکتیزەکردنەوە بە جێگیری بمێننەوە، مێ لە سنووری بەرفراواندا گۆڕانکاری بەسەر ژیانی سێکسییدا دێت، لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دیکە لە ژیانیدا، لە ئەزموونێکی سێکسییەوە بۆ یەکێکی دیکە، بەڵام ئەم گۆڕانکارییە بەردەوامە هێندە لە ژیانی سێکسیی کوڕدا دەرناکەوێ، هەموو ئەم دیاردانە وا دەکەن ژیانی سێکسیی ژن وەک ژن خۆی وا بێ، واتە چۆن پیاو ناتوانێ لە ژن تێبگات و ژن بەرەنگاری هەوڵەکانی پیاو دەکات بۆ تێگەیشتن لێی، بە هەمان شێوە هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لە ژیانی سێکسیشی کارێکی قورس و ئەستەمە، دەشێ ئەمە نهێنیی پەیوەندیی نێوان نێر و مێ بێت و خزمەتی مەبەستی مانەوە بکات.

## قۆناغەکانی ژیانی سێکسی لە مێ-دا

ژیانی سێکسیی ژن بە چەند قۆناغێکی دیاریکراودا دەڕوات، کە ئەم قۆناغانە کار دەکەنە سەر پاڵنەرە سێکسییەکان و وەڵامدانەوەیان بۆ هاندەرە سێکسییەکان، لەبەر ئەوە لە نێر زیاتر دووچاری گۆڕانکاری دەبێت لە ڕوخسارەکانی ژیانی سێکسییدا، لە کاتێکدا نێر تا ئاستێکی زۆر لەسەر هێڵێکی ڕێک دەڕوات. ئەو قۆناغانەی کە مێ لە ژیانی سێکسییدا پیایاندا تێپەڕدەبێت، ئەمانەن: سەرەتای سووڕی مانگانە، یان یەکەم سووڕی مانگانە، سووڕی مانگانە، دووگیانی، منداڵبوون و هەموو ئەو شتانەی کە بەدوایدا دێن، تەمەنی نائومێدی و بەساڵاچوون، لەگەڵ ئەوەدا کە هەریەکێک لەم قۆناغانە خەسڵەتی تایبەت بە خۆیان هەیە، بەڵام هەر مێیەکیش خاوەنی تایبەتمەندێتیی تاکانەیی خۆیەتی لە هەر یەکێک لەم قۆناغانەدا، ئیدی ئەو تایبەتمەندێتییانە بەهۆی کاریگەری بۆماوەوە دروست بووبن، یان بە حوکمی واقیعی شارستانی و کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی و تەندروستییەوە و بارودۆخی ژیانی سێکسییەوە پەیدا بووبن. لێرەدا پوختەی سروشت و خەسڵەتەکانی هەریەکێک لەم قۆناغانەی ژیانی سێکسیی مێ، بەدوای یەکدا، دەخەینە ڕوو:

### ١- یەکەمین سووڕی مانگانە

یەکەمین سووڕی مانگانە Menarche، قۆناغێکی گرنگ و خاڵی وەرچەرخانی سەرەکییە لە ژیانی ژندا کە مۆڵەتی گواستنەوە بە مێ دەدات لە قۆناغی منداڵی و مێردمنداڵییەوە بۆ قۆناغی نەرزەبوون و مێیەتی، لەگەڵ هەموو ئەو گۆڕانکارییە جەستەیی و هۆرمۆنییانەی کە هاوکاتن لەگەڵ ئەم قۆناغە نوێیەدا. ناوەندی تەمەنی مێ لە یەکەمین سووڕی مانگانەدا لە کچێکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگۆڕێ، هەروەها بەپێی کاریگەریی فاکتەرە

کۆمەڵایەتی و شارستانییە جیاوازەکان دەگۆڕێ. ناوەندی تەمەنی یەکەمین سووڕی مانگانە لە نێوان (٨-١٣)ساڵیدایە. لە شارستانییەتی خۆرئاوا دەکەوێتە نێوان (١١-١٢) ساڵی و لە شارستانییەتەکانی خۆرهەڵات و ناوچە گەرمەکاندا بە ساڵێک یان زیاتر لەپێش ئەم تەمەنەوە ڕوو دەدات. لەو جیاوازییە گرنگانەی لە نێوان نەرزەبوون یان باڵقبوونی نێر و مێ-دایە، ئەوەیە کاتێک نێر باڵق دەبێ ئەم گۆڕانە هاوکات دەبێ، لەگەڵ لێشاوێک یان وروژمێکی سێکسیدا و کوڕ توانای ڕشتنی تۆوی دەبێت، ئەمانە و سەرباری ئاراستەگرتنی کوڕ ڕووەو تێرکردنی پاڵنەرە سێکسییەکانی لەڕێی ماستەربەیشنەوە، بەڵام یەکەمین سووڕی مانگانەی کچ هاوکات نییە لەگەڵ گەشەسەندنی پاڵنەرە سێکسییەکانیدا، هەروەها کچ بە لایەنی کەمەوە بۆ ماوەی ساڵێک بۆ دوو ساڵ لەدوای دەستپێکردنی یەکەمین سووڕی مانگانەوە، ئینجا دەتوانێ هێلکۆکەکانی لە کاتی سووڕی مانگانەدا بێنە خوارەوە، هەروەها هەوڵ نادات لە ڕووی سێکسییەوە خۆی بوروروژێنێ، یان لەڕێی ماستەربەیشنەوە خۆی تێر بکات، وەک ئەوەی لە کوڕدا ڕوو دەدات.

### ٢- سووڕی مانگانە

قۆناغی سووڕی مانگانە بە یەکەمین سووڕی مانگانە دەست پێ دەکات و بۆ ماوەی (٣٠-٤٠) ساڵ بەردەوام دەبێ، پاشان کاتێ مێ دەگاتە تەمەنی نائومێدی، ئیدی ئەم سووڕە دەوەستێ. ژیانی سێکسیی مێ تا ئاستێکی زۆر بەو گۆڕانکارییە بایۆلۆژی و فسیۆلۆژییانەوە بەندە کە لە ماوەی سووڕی مانگانەدا ڕوو دەدەن، ئەم گۆڕانکارییانە لە لایەن ناوەندی تایبەتییەوە لە دەماخدا ڕێک دەخرێن و کۆنترۆڵ دەکرێن، گرنگترین ئەم ناوەندانە

دەکەونە ناوکی هایپۆسالامەسەوە، ئەم ناوچەیە بایەخێکی گرنگی لە کۆنترۆڵکردنی هەڵچوونە سۆزدارییەکاندا هەیە.

سووڕی مانگانە لە می‌دا هەر (٢٨-٢٩) ڕۆژ جارێک ڕوو دەدات. ڕۆژی یەکەم بە سەرەتای سووڕی ئەو مانگە دادەنرێ و ماوەی ٣ ڕۆژ بۆ ٧ ڕۆژ دەخایەنێ. ئەم ماوەیە لە مێیەکەوە بۆ یەکێکی دیکە جیاوازە، بەڵام لە یەک می‌دا بە نزیکی جێگیرە، واتە ئەو ژنەی سووڕی مانگانەی ٣ ڕۆژە، هەموو جارێ هەر ٣ ڕۆژ دەخایەنێ و ئەوەش کە ٤ یان ٧ ڕۆژە، بەردەوام هەر ئەوەندە دەخایەنێ. سووڕی مانگانە لە ڕووی بایۆلۆژییەوە بۆ سێ قۆناغ دابەش دەبێ: قۆناغی پێش هێلکەدانان، قۆناغی هێلکەدانان، قۆناغی دوای هێلکەدانان.

قۆناغی هێلکەدانان دەکەوێتە نزیکەی نیوەی سووڕی مانگانە. لە کاتی ڕوودانی سووڕی مانگانەدا تێبینیی هەندێ گۆڕانکاری لە پاڵنەر و وەڵامدانەوەی سێکسیدا دەکرێ، ئەم ڕوخسارانە لە هەموو مێیەکدا هاوبەشن، بەڵام بەپێی فاکتەرە کارتێکەر و تاکییەکان لە مێیەکەوە بۆ یەکێکی دیکە جیاوازیشیان هەیە.

بەگشتی لە ماوەی ڕۆژانی سووڕی مانگانەدا، بەهۆی کاریگەریی هۆرمۆنەکانەوە، وەڵامدانەوە و ئارەزووی سێکسی لە می‌دا دێتە خوارەوە یان دادەبەزێ، بەڵام تا ئاستێکی زۆر ئەمە پەیوەندیی بەو پێودانگە دەروونییانەوە هەیە کە لای هەریەک لە نێر و مێ جێگیر بوون، هەروەها پەیوەندیی هەیە بە چۆنێتیی ڕوانینیانەوە بۆ سووڕی مانگانە کە وەک دۆخێکی ناخاوێن لێی دەڕوانن و پیاو وا لە مێشکیدا چەسپیوە کە نابێ لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژەدا لەگەڵ ژنەکەیدا بخەوێ، تەنانەت لە هەندێ لە شارستانییەتەکاندا نابێ پیاو دەستی بەر جەستەشی بکەوێ، بەڵام هەندێ لە ژنان هەن بە پێچەوانەی زۆربەی ژنانەوە، لە ماوەی چەند ڕۆژی سووڕی مانگانەدا هەست بە وەڵامدانەوە و

ئارەزووی سێکسی دەکەن، هۆکاری ئەمە بەوە لێک دەدرێتەوە کە خوێنی سووڕی مانگانە لای ئەم ژنانە تەنیا سیمبولێک نییە بۆ مێیەتی، بەڵکو سیمبولە بۆ دڕانی پەردەی کچێنی کە هاوکاتە لەگەڵ ئەو خوێنبەربوونەی لەو کاتەدا ڕوو دەدات و کە لەم ساتەوە ئیدی ئەو کچە پێ دەنێتە ناو جیهانی ژنەوە. هەندێک لە توێژینەوەکان ئاماژە بەوە دەدەن، پاڵنەری سێکسی لە نیوەی یەکەمی سووڕی مانگانەدا، وردەوردە زیاد دەکات و لە ناوەڕاستی سووڕەکەدا دەگاتە ئەوپەڕی و پاشان لە نیوەی دووەمی سووڕەکەدا وردەوردە دادەبەزێ. هەندێک پاڵنەر و ئارەزووی سێکسی لە مێ-دا لە سەرەتای سووڕەکەدا و لە کۆتایی و ڕاستەوخۆ لەپێش ڕوودانی سووڕەکەشدا زیاد دەکات، هۆکاری ئەمەش بەوە لێک دەدرێتەوە، لەم ماوانەدا چوونی خوێن بۆ ئەندامی زاوزێ و ناوچەی حەوز زۆر دەبێ و مێ هەست بە وروووژان و خێرا وەڵامدانەوەی سێکسی دەکات.

ناچوونیەکیی ئەو زانیارییانەی کە لە توێژینەوەکانەوە دەستکەوتوون، بەڵگەن لەسەر ئەوەی ژنان لە ماوەی سووڕی مانگانەیاندا جیاوازییان هەیە و وەک یەک نین.

٢-ماوەی دووگیانی

قۆناغی دووگیانی خۆی بە بەربەست دانانرێ لە بەردەم چالاکیی سێکسی لە ژنی دووگیاندا. لە واقیعدا ئەو گۆڕانکاییە فسیۆلۆژییانەی لە ماوەی دووگیانیدا لە ئەندامە سێکسییەکاندا ڕوو دەدەن، دەشێ بە پلەیەک لە پلەکان جۆرێ لە وروووژاندنی سێکسی لە ژندا دروست بکەن، لەبەر ئەوە سروشتییە لە ماوەی دووگیانی و ماوەی دوای دووگیانیدا، وەڵامدانەوەی سێکسیی ژن زیاتر بێ.

سەبارەت بە پەیوەندیی نێوان سێکس و دووگیانی، تێبینی دەکرێ، هەندێ لە ژنان ناگەن بە ئۆرگازم تەنیا دوای یەکەمین سک یان دووگیانی نەبێ، هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، ژنی دووگیان، بەتایبەتی لە سێ بەشی کۆتایی دووگیانییدا، خوێنێکی زۆر بۆ ناوچەی کۆئەندامی زاوزێ و ناوچەی حەوزیان دەچێ، ئەمەش ئەگەری وروورژان و وەڵامدانەوەی سێکسی زیاتر دەکات. دەشێ دووگیانی لە هەندێ لە ژناندا ببێتە هۆکار بۆ ئەوەی ئەو ژنە بە شێوەیەکی هەمیشەیی و لەدوای دووگیانیش ئاستی چالاکیی سێکسیی بەرز بێ و وەڵامدانەوەی خێرای بۆ وروورژێنەرە سێکسییەکان هەبێ.

لە لێکۆڵینەوەیەکی ماستەرز و جۆنسۆندا دەرکەوتووە، ٨٢ ژن لە کۆی ١٠١ ژن، تێبینییان کردووە لە سێ بەشی کۆتایی دووگیانیدا هەستیان بە زیادبوونی پاڵنەر و کارایی سێکسییان کردووە. لە لێکۆڵینەوەیەکی دیکەدا، شەش ژن هەستیان بە زیادبوونی پاڵنەر و وەڵامدانەوەی سێکسی کردووە، دوو ژنی دیکەش لە هەمان لێکۆڵینەوەدا ئاماژە بەوە دەدەن، بۆ یەکەمجار لە ماوەی دووگیانییدا چەند جارێ هەستیان بە ئۆرگازم کردووە. زۆربەی لێکۆڵینەوەکان ئاماژە بەوە دەدەن، دابەزینێکی تێبینیکراو لە پاڵنەر و وەڵامدانەوەی سێکسیی ژن لەدوای منداڵبوون، ڕوو دەدات، ئەم دابەزینەش سێ مانگ دەخایەنێ تا ژن دەگەڕێتەوە بۆ ئاستی پێشووی بەر لە دووگیانی، دەشێ چالاکی سێکسی ژن دوای منداڵبوون هەر نەگەڕێتەوە ئاستی پێش دووگیانی، ئەمەش بەهۆی ئەو کاریگەرییە فسیۆلۆژی و سۆزدارییە نێگەتیڤانەوە کە هەندێ لە ژنان تووشی دەبن، لە هەندێ ژنانیشدا پێچەوانەی ئەمە ڕوو دەدات و ماوەیەک پاش منداڵبوون هەست بە زیادبوونی پاڵنەری سێکسی دەکەن، دەشێ هۆکاری ئەمە چوونی زیاتری خوێن بێ بۆ ئەندام و شانەکانی ناوچەی حەوز، ئەمانە و پێویستە

لە کاتی توێژینەوەدا دەربارەی سێکس و دووگیانی، ئەوە بە هەند وەربگرین یان ڕەچاوی ئەوە بکەین کە هەندێ لە ژنان کاتێ لە ماوەی دووگیانییدا لە سێکس دووردەکەونەوە بەهۆی ترسیانەوەیە لە ڕوودانی لەبارچوون و زیانپێکەوتنی کۆرپەلەکەیان، یان لەو ژنانەدا کە خۆیان لەبەر هەر هۆکارێ بێ بەو دووگیانییە ڕازی نین و دڵیان پێ خۆش نییە، لەبەر ئەوە سێکسیشیان لە بەرچاو دەکەوێ، چونکە پێیان وایە هۆکار بووە لە ڕوودانی ئەو دووگیانییە نەخوازراوە.

بەگشتی، باشترە ژنی دووگیان لە ماوەی کۆتایی دووگیانییدا لە هەموو شێوەکانی سێکس دووربکەوێتەوە، چونکە منداڵدان لەم قۆناغەدا زۆر هەستیارە و دەشێ بە توندی گرژ ببێ و ببێتە هۆی خوێنبەربوون، یان لەبارچوونی کۆرپەلە.

**٤-سێکس و تەمەنی نائومێدی**

تەمەنی نائومێدی Menapause زاراوەیەکە بۆ وەسفکردنی ئەو ماوەیەی تەمەنی مێ کە سووڕی مانگانەی تیادا دەوەستێ و هاوکاتە لەگەڵ هەستکردنی ژن بە نائومێدی بەرامبەر بە ڕوودانی ئەگەری دووگیانی و منداڵخستنەوە، ئەم قۆناغە یان ئەم تەمەنە هیچ پەیوەندییەکی بە توانا و چالاکیی سێکسیی ژنەوە نییە. تەمەنی نائومێدی لەمێ-دا لە نێوان ٤٥-٥٠ساڵی دەست پێ دەکات و دەشێ بەر لەو تەمەنە و دوای ئەو تەمەنەش ڕوو بدات. ئەوەی لەم تەمەنەدا ڕوو دەدات کەمبوونەوەی هۆرمۆنی هێلکەدانەکانە و وەستانی سووڕی مانگانەیە، هەروەها نەمانی توانای منداڵخستنەوە و ئەم گۆڕانانەش کە ڕوو دەدەن بە زۆری هاوکاتن لەگەڵ ڕوودانی هەندێ گۆڕانکاریی جەستەیی و دەروونی، بەڵام ئەم گۆڕانکارییانە ژیانی سێکسیی ژن ناگرنەوە.

زۆربەی توێژینەوەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە ژن دوای تەمەنی نائومێدیش چالاکییەکی سێکسیی وای هەیە کە هیچ جیا ناکرێتەوە لە چالاکیی سێکسیی پێش تەمەنی نائومێدی، ئەگەر خاوەنی تەندروستییەکی جەستەیی و دەروونی سروشتی بێ. هەندێ لە توێژەرانیش تێبینییان کردووە، بە پێچەوانەی ئەوەی دەوترێ، گوایە ژن لەدوای تەمەنی نائومێدی، حەز و پاڵنەری سێکسیی لاواز دەبێ، ژیانی سێکسی لە هەندێ لە ژناندا چالاکتر دەبێ و ژن زیاتر چێژ لە سێکس دەبینێ، چونکە ترسی لە دووگیانی و بەرپرسیارێتیی منداڵخستنەوە و بەرپرسیارێتیی بەکارهێنانی بەربەستەکانی دووگیانی و کاریگەرییە لاوەکییەکانی نامێنێ، هەندێ لەو توێژەرانەش کە توێژینەوەیان لەسەر ئەم دیاردەیە کردووە، پێیان وایە بەشێک لە هۆکاری زیادبوونی چالاکیی سێکسی و لەناکاوی ژن لە تەمەنی نائومێدیدا، وەک هەوڵدانێک وایە کە ژن دەیدات بۆ ئەوەی قەرەبووی ئەوە بکاتەوە کە هەست دەکات بەهۆی چوونە تەمەنی نائومێدییەوە بەشێک لە مێیەتیی لەدەست داوە. لە زۆربەی ژناندا بەهۆی کەمیی ئەسترۆجینەوە گۆڕانکاری لە لێوەکان و پێستیی ناوچەی زێ-دا ڕوو دەدات و ئەمەش دەبێتە هۆی تەنکبوونەوە و پووکانەوەی زێ و وشکبوونەوەی، کە وا دەکات پەیوەندیی سێکسی لەدوای تەمەنی نائومێدی بۆ ژن بەئازار بێ، بەڵام ئەم دەرئەنجامە دەشێ زۆر کەمبێتەوە و ئەم کاریگەرییانە سووکتر لەسەر ژن دەربکەون، ئەگەر ژن لەدوای گەیشتنی بەم تەمەنە، توانیی بە شێوەیەکی ڕێکوپێک بەردەوامی بە پەیوەندیی سێکسی بدات.

٥-سێکس و چوون بەتەمەندا

تەمەنی گەورەیی یان پیربوون لە مێ-دا، هەروەک نێر، لەدوای تێپەڕینی ٦٥ ساڵی دەست پێ دەکات، ئەم تەمەنە لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ یەکێکی دیکە جیاوازە، لە هەموو حاڵەتەکاندا ئەمە تەمەنێکی گریمانەییە و مەرج نییە گۆڕانکاریی ڕیشەیی تیادا ڕوو بدات، نە لە ڕووی دەروونییەوە، نە لە ڕووی جەستەییەوە و نە لە ڕووی سێکسییشەوە، بەتایبەتی لە ژندا. لە شوێنێکی دیکەی ئەم کتێبەدا باسی پەیوەندیی نێوان سێکس و پیریم کردووە، پوختەی تێبینییەکان لەم ڕووەوە پێمان دەڵێن، پیربوون ئەوەندە کار ناکاتە سەر ژیانی سێکسی لە ژندا، وەک ئەوەی لە پیاودا ڕوو دەدات و ڕوخسارەکانی پەککەوتنی سێکسیی لەسەر دەردەکەون. بەگشتی ژن تا حەفتا و تەنانەت تا هەشتاکانی تەمەنیشی پارێزگاری لە بڕێکی گەورەی چالاکیی سێکسیی دەکات.

پەراوێز:

*بەکارهێنانی دوش: بریتییە لە ڕەوانەکردنی وورووژمی ئاو، یان ماددەی کیمیایی بۆ ناو زێ و خاوێنکردنەوەی لەدوای سێکسکردن، بە مەبەستی ڕێگرتن لە دووگیانی-وەرگێڕ.

# بەشی نۆیەم
# سێکسساردی لە مێ-دا

پێشەکی
جۆرەکانی سێکسساردی
هۆکارەکانی سێکسساردی
هۆکارە ماددی و ئەندامییەکان
هۆکارە دەروونییەکانی سێکسساردی
هۆکارە دەروونییە نەستییەکان

## سێکسساردی

زاراوەی سێکسساردی، زاراوەیەکی کۆنە و جاران بەکار دەهات. لە ئێستادا وا باشترە زاراوەی پەککەوتنی سێکسی لە ژندا بەکار بێت، هەروەک لە پیاودا زاراوەی پەککەوتنی سێکسی بەکار دێ، هەندێکیش پێیان وایە زاراوەی پەککەوتنی سێکسی لە پیاواندا یەکسانە لەگەڵ زاراوەی سێکسساردی لە ژناندا، هەندێکیش دژی ئەوەن، ئەو دوو حاڵەتە لە ژن و پیاودا وەک یەک بن. ئەو پیاوەی تووشی پەککەوتنی سێکسی بووە، پاڵنەری سێکسیی سروشتی هۆکارە لە ڕوودانی ئەو حاڵەتە، لە کاتێکدا ئەو ژنەی تووشی سێکسساردی بووە، حەزی لە سێکس نییە و پشتی تێدەکات، هیچ توانایەکی نییە بۆ ئەوەی فەرمان بە خۆی بدات تا حەز لە سێکس بکات، بەڵام پیاو کە ئارەزووی سێکسی هەیە دەشێ لەڕێی ئیرادەی خۆیەوە ڕەپبوون بەدەست بێنێ.

هەندێ بە لایانەوە باشترە زاراوەی سێکسساردی بەکار بێت، نەک لەبەر ئەوەی کۆنترە، بەڵکو لەبەر ئەوەی باوترە بۆ گوزارشتکردن لە ژیانی سێکسیی کۆمەڵێک لە ژنان کە ژمارەیان کەم نییە، پاشان زاراوەی سێکسساردی لە هەموو زاراوەکانی دیکە زیاتر ئاماژە بە واقیع و سروشتی ئەو حاڵەتە لە ژناندا دەدات.

لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە هەوڵ بدەین پێناسەی ئەم زاراوەیە بکەین و سنوور و پلەکانی و جۆرەکانی و هۆکارەکانی ڕوودانی، ڕوون بکەینەوە. باشترین پێناسەی سێکسساردی، ئەو پێناسەیەیە کە دەڵێ: حاڵەتێکە لە هەست و پاڵنەری نێگەتیڤ لای ژن بەرامبەر ئەو بابەتانەی کە پەیوەندییان بە سێکس و ڕەفتاری سێکسییەوە

هەیە. ئەم هەستە دەشێ هەمیشەیی بێ، یان تەنیا لە ماوەیەکی زەمەنیی دیاریکراودا ڕوو بدات، دەشێ گشتی بێ، دەشێ بە هەڵوێستێکەوە، یان بارودۆخێکی تایبەتی، یان بە پەیوەندییەکی سێکسیی دیاریکراوەوە پەیوەست بێ، هەروەها دەشێ گشتگیر بێ و کۆی بواری سێکسی بگرێتەوە، دەشێ تەنیا یەک بوار بگرێتەوە، بۆ نموونە ئارەزووی سێکسی، یان وروژانی سێکسی، یان وەڵامدانەوەی سێکسی، یان تەنیا نەتوانین بێ بۆ گەیشتن بە ئۆرگازم. وا پێویست دەکات تەواوی ئەم پلانە دیاری بکرێن، ئەگەر وا نەبێ ئەوا ئەستەمە هەموو پەککەوتنێکی سێکسی لە چوارچێوەی سێکسساردیدا سنووربەند بکەین، هەروەها ناتوانین بە شوێن هۆکارەکاندا بگەڕێین و چارەسەری گونجاو بدۆزینەوە.

هەندێک پێیان وایە شتێک نییە لە مێ-دا ناوی ژیانی سێکسی بێ و ژن خاوەنی وزەی سێکسی نییە، وروژان و گرژبوونی سێکسی شتێکی خوازراو و سروشتییە لە پیاودا، بەڵام لە ژندا ناسروشتییە و شتێکی نەخوازراوە. ئەو کەسانەی بڕوایان بەم بۆچوونە هەیە، پاساو بۆ هەڵوێستی خۆیان دەهێننەوە و دەڵێن بوونی وروژان و پاڵنەری سێکسی دەشێ بۆ مانەوەی توخمی مرۆیی پێویست بێ، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەمانە لە پیاودا هەن، ئەوا هیچ پێویستییەکی بایۆلۆژی لەئارادا نییە بۆ بوونی وروژان و پاڵنەری سێکسی لە ژندا. بە کورتی ئەم جۆرە ڕایانە مێ لە هەموو ئارەزوویەکی سێکسی و ڕۆڵێکی پۆزەتیڤ لە پرۆسەی سێکسدا دادەماڵن، تەنیا ڕۆڵێکی نێگەتیڤ و تەسلیمبووی لەم کردارەدا پێ دەبەخشن، نموونەی ئەم ڕاوبۆچوونانە لە بیرکردنەوە و دابونەریتی زۆرێک لە خەڵک و زۆرێک لە کۆمەڵگەکاندا جێگیر بووە. ئەم جۆرە وێناکردنە بۆ وزەی سێکسی

لای من دژ بە هەموو ئەو دەرئەنجامانە دەوەستێ کە لە ڕووی زانستی و لە واقیعیشدا سەلمێنراون. زانست و واقیع ئەو ڕاستییەیان سەلماندووە کە مێ وەک نێر چالاکیی سێکسیی هەیە، ئەگەر لەو زیاتریشی نەبێ، ئەم واقیعە بایۆلۆژییە بەهۆی کاریگەریی فاکتەرە کۆمەڵایەتی و شارستانییەکانەوە بە شاراوەیی لە ئەزموونی سێکسیی ژندا ماوەتەوە، ئەمەش بووە بە هاندەر بۆ ئەوەی بە شێوەیەک لە ژن بڕوانرێ کە لەم ڕووەوە لە پیاو کەمترە، یان پێویستە لەسەری ئاستێکی نزمتر لەو توانای سێکسییە دەربخات کە پیاوی پێ دەناسرێ. دەرئەنجامی ئەم ڕوانگە کۆمەڵایەتی و شارستانییە، وروژان و پاڵنەری سێکسی لە نێردا بە شتێکی ڕێگەپێدراو و خواستراو دانراوە و لە ژندا بە ڕێگەپێنەدراو و نەخواستراو. ئەم ڕوانینەش ئەوەی بەسەر ژندا سەپاندووە کە سێکس ڕەت بکاتەوە و ڕێگە نەدات بە تەشەنەسەندنی هیچ ئارەزوویەکی سێکسی بۆ بواری گوزارشتکردن بیگۆڕێ، یان لە شێوەیەکی شێواو و ناسروشتیدا ئاشکرای بکات.

هەندێکیش ئەو بۆچوونەیان هەیە کە پێیان وایە ئەرکی ژن لە پەیوەندیی سێکسیدا تەنیای ڕازیکردنی پیاوە، قەناعەتیشی بە تێربوونی سێکسی لەو هەستەوە دێ کە توانیویەتی پیاوەکەی ڕازی بکات و تێری بکات، ئەم جۆرە ڕوانینە ئەوە ڕەت دەکاتەوە ژن خۆی خاوەنی هیچ وزەیەکی سێکسی بێ تا پێویستی بەوە بێ گوزارشتی لێ بکات و ڕازیی بکات و تێری بکات.

توێژەرێک دەربارەی ئەم بۆچوونە دەڵێ: "ناکرێ ئەو ڕایە قبووڵ بکرێ کە پێی وایە ئەوە شتێکی سروشتییە کە ئامانجی

مرۆڤ له ژیاندا تەنیا وەفا و دڵسۆزی بێ بەرامبەر بە پێداویستییەکانی کەسێکی دیکە لەسەر حیسابی فەرامۆشکردنی پێداویستییەکانی خۆی". لەبەر ئەوە هەڵەیە بەو شێوەیە لە ژن بڕوانین کە هەر بە سروشتی خۆی سارده و بوونی ئەو تەنیا لەبەر خاتری ڕازیکردنی پێداویستییەکانی پیاوە و لەپێناوی بەدیهێنانی مەبەستی زۆربووندایە.

بەهۆی کاریگەرییە کۆمەڵایەتی و شارستانییەتییەکانەوە بۆ سەر ژیانی مێ و ڕوانین لە مێ وەک لایەنێکی نزمتر لە پەیوەندیی سێکسیدا، ژن ناچاربووە لە بواری سێکسدا، بە لایەنی کەمەوە لە هەستکردنی هۆشیارانەیدا بەرامبەر بە خۆی، خۆی بە کەمتر لە پیاو دابنێ، هەروەها پێی وا بێ کە مێیەتیی نموونەیی بریتییە لە دۆخێکی مامناوەند لە نێوان چالاکی و نێگەتیڤی لە ژیانی سێکسیدا، هەروەها ڕۆڵی ژن لە پەیوەندیی سێکسیدا دەچێتە ناو چوارچێوەی باوی دەسەڵاتی خێزان.

### جۆرەکانی سێکسساردی

دەکرێ سێکسساردی لە ژندا لەسەر چەند بنەمایەکی جۆری، یان بنەمایەکی نێگەتیڤ دابەش بکەین. بەگشتی جۆرەکانی سێکسساردی بۆ دوو گرووپ دابەش دەکرێن:

گرووپی یەکەم، بە شێوەیەکی ڕێژەیی ئەم گرووپە ژمارەیان کەمە، حاڵەتە توندەکانی پەککەوتنی سێکسی گشتی لەخۆ دەگرن، واتە نەبوونی ئارەزوو یان مەیلی سێکسی و نەبوونی وەڵامدانەوەی پێویست بەرامبەر بە وروووژێنەرە سێکسییەکان بە شێوەیەکی تەواو. هەرچی گرووپی دووەمە، کە زۆرترین حاڵەتەکانی پەککەوتنی سێکسی لە مێ-دا لەخۆ دەگرێ، بەڵام حاڵەتەکان کەمتر توندن، دوو جۆر لە پەککەوتنی گەیشتن بە

ئۆرگازم دەگریتەوە، جۆری یەکەم، پەککەوتنی ئۆرگازمی سەرەکی، کە مێ لە هیچ کاتێکدا و بە هیچ ڕێگەیەک ناتوانێ بە ئۆرگازم بگات، هەرچی جۆری دووەمە، پێی دەوترێت پەککەوتنی ئۆرگازمی هەڵوێستی، کە مێ لە هەندێ هەڵوێستی تایبەتیدا بە ئۆرگازم ناگات.

لە پەککەوتنی ئۆرگازمیدا وا گریمانە دەکرێ کە مێ حەز لە سێکس دەکات و پاڵنەری سێکسیی تەواوی بەرامبەر بە سێکس هەیە و وەڵامدانەوەی فسیۆلۆژیی پێویستیشی بەرامبەر ئەو پاڵنەرانە هەیە، بەڵام ناتوانێ بە ئۆرگازم بگات، ئیدی لەڕێی دەستی خۆیەوە بێ (واتە ماستەربەیشن) یان لەڕێی دەستی هاوبەشە سێکسییەکەوە بێ، یان لەڕێی جووتبوونی ڕاستەوخۆوە بێ.

### هۆکارەکانی سێکسساردی

هۆکار زۆرن بۆ ڕوودانی سێکسساردی لە مێ-دا، زۆربەی ئەو هۆکارانە لە بابەتی پەککەوتنی سێکسی لە مێ-دا لەو بەشەدا کە تایبەتبوو بە ژیانی سێکسیی مێ، باسمان کردن. دەکرێ لێرەدا ئەو هۆکارانە بەم شێوەیە کورت بکەینەوە، هەروەک ماستەرز و جۆنسۆن باسیان کردووە (١٩٧٤).

### هۆکارە ماددی و ئەندامییەکان

١- بەکارهێنانی ئەو دەرمانانەی کە دەبنە هۆی ئالوودەبوون، ئیدی ئەوانە بن کە دەبنە هۆی لەکاروەستانی کۆئەندامی دەمار، وەک کهول و ماددە خەولێخەرەکان و ئازارشکێنەکان و ماددە بێهۆشکەرە ئەفیۆنییەکان، یان چالاککەرەوەکانی کۆئەندامی دەمار، وەک نیکۆتین (لەڕێی جگەرەکێشانەوە) و کافایین (لەڕێی زۆر

خواردنەوەی قاوەوە) و ئەمفیتامین (جۆرێکە لە وریاکەرەوەکانی ناوەندە کۆئەندامی دەمار).

٢-ئەو دەرمان و ئامادەکراوانەی ڕێگر دەبن لە تەڕبوونی زێ، یان ڕێگر دەبن لە چوونی خوێن و هەڵئاوسانی، یان ئەوانەی ڕێگر دەبن لە ڕوودانی ورووژانی سێکسی، وەک ئەو دەرمانانەی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆڵۆن و دابەزینی فشاری خوێن بەکار دەهێنرێن.

٣-نەخۆشییە درێژخایەنەکانی کە دەبنە هۆی لاوازبوون و بێهێزی، وەک نەخۆشییەکانی دڵ و سووڕی خوێن، نەخۆشییەکانی گورچیلە و خوێن، هەروەها وەرەمە شێرپەنجەییەکان.

٤- پشێوییە هۆرمۆنییەکان کە زۆربەی پشێوییەکانی کوێرەڕژێنەکان دەگرێتەوە و بە زۆری دەبنە هۆی شکستی لە دەردانی ڕژێنەکاندا و ناهاوسەنگی لە دەرداندا، لە هۆکارەکانی ڕوودانی ئەم پشێوییانە وەک بەکارهێنانی هەندێ هۆرمۆنی مێینە، وەک پرۆجیسترۆن و ئەسترۆجین و نەشتەرگەریی لابردنی هێلکەدانەکان و لابردنی سەرەگورچیلەڕژێنەکان.

٥-پشێوییەکانی کۆئەندامی میز و زاوزێ، وەک ڕوودانی هەوکردن و دروستبوونی وەرەم، یان شێواویی زگماکی، یان زێ بە شێوەیەکی ناتەواو گەشەی کردبێ، یان وەک زێی منداڵ وا بێ، یان میتکە نەبێ.

٦-نەخۆشییەکانی کۆئەندامی دەمار، بەتایبەتی سەمپەساوی و پاراسەمپەساوی، هەروەها نەخۆشییەکانی دڕکەپەتک، بەتایبەتی ئەوانەی دەکەونە ناوچەی خالیگە (کەمەرە) و کلێنچکە و پەستان کەوتنە سەر پشت.

## هۆكاره دەروونییەكانی سێكسساردی

هۆكاره دەروونییەكان لە زۆربەی حاڵەتەكاندا هۆكارن بۆ كێشەكانی سێكس لە می-دا، بەتایبەتی لە حاڵەتی سێكسساردیدا. لێرەدا هەندێک لەو ڕایانە دەخەینە ڕوو كە پێیان وایە فاكتەره دەروونییەكان هۆكارن لە ڕوودانی سێكسساردی لە ژندا:

١-سێكسساردی بریتییە لە وەڵامدانەوەی حاڵەتێكی ناسروشتیی دڵەڕاوكێ، لەو سەرچاوە جیاوازانەی كە بزوێنەری دڵەڕاوكێن، وەک:

+ئەو كەسە لە مێشكیدا هەندێ بەهای توند و ڕەتكەرەوەی بەرامبەر بە سێكس هەڵگرتووە، یان تیایدا دەژی. لەبەر ئەوە ورووژێنەره سێكسییەكان، ئیدی لە هەر سەرچاوەیەكەوە بن، ململانێی دەروونی لە ناخیدا دەبزوێنن، وەک هەستكردن بە گوناه و بێزهاتنەوە و دڵەڕاوكێ.

+دەشێ سەرچاوەی ئەو دڵەڕاوكێیە، ئەزموونێكی سێكسیی شكست بێ، یان بووبێتە مایەی ئازار بۆ ئەو ژنە، لەبەر ئەوە ئەو ژنە لە دووبارەبوونەوەی هەمان ئەزموونی شكست، یان ئازاراوی دەترسێ.

+ناشارەزایی و كەم ئاشنابوون بەرامبەر بە وەڵامدانەوە سێكسییە سروشتییەكان، ئیدی ئەو نەزانین و ناشارەزاییە بەهۆی كۆمەڵگە و شارستانییەتەوە بەگشتی بڕیاری لەسەر درابێت، یان ئەو كچە بەهۆی بارودۆخێكی تایبەتی خۆیەوە، یان خێزانەكەیەوە، تیایدا بژی. شارستانییەتی ئێمە بەگشتی كچ هان دەدات لە پەیوەندی سێكسیدا نێگەتیڤ بێت و لە بەرامبەر دەرككردن بە هەستە سێكسییەكانی، چاوی خۆی دابخات و هانی دەدات پاڵنەر و پێداویستییە سێكسییەكانی كەم بكاتەوە، هەروەها كولتوور و شارستانییەتی ئێمە ڕێگربووە لەوەی ژن ناوچە ورووژێنەرەكانی جەستەی خۆی ئاشكرا بكات و هانی داوە دەستپێشخەریی پیاو

قبوڵ بکات و تەسلیمی دەستپێشخەرییەکانی پیاو ببێ. لە ئەنجامی ئەم فاکتەرانە، ژن لە دۆخێکی دەروونیی ناهاوتادا لەگەڵ پیاودا ژیاوە.

ئەمە وای کردووە زۆربەی کات تەنیا ڕۆڵی چاودێریک ببینێ لە کرداری سێکسیدا، هەروەها تەنیا لەو گۆشەیەوە لە توانا و توانستی خۆی لەم پرۆسەیە بڕوانێ و تا چەند توانیویەتی هاوبەشە سێکسییەکەی ڕازی بکات.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ ژن هەستە سێکسییەکانی خۆی ڕەت دەکاتەوە و هەستیان پێ ناکات، دەرئەنجامی ئەم بیرکردنەوانەش، بەربەستی دەروونی لە بەردەم ژندا دروست دەبن و ناتوانێ وەک پێویست و ڕاشکاوانە گوزارشت لە وزەی سێکسیی خۆی بکات.

٢-هۆکارە دەروونییە نەستییەکان، ململانێ دەروونییەکانی نەست دەگرێتەوە، لەو ململانێیانەش وەک ئەوانەی کە لەسەر بناغەی گرێی ئۆدیپۆس لێک دەدرێنەوە، ئەو منداڵە کچەی لە چارەسەرکردن و شیکردنەوەی ئەم گرێیەدا بە شێوەیەکی سروشتی، شکست دەهێنێ، کاتێ گەشە دەکات و گەورە دەبێت و ڕووبەڕووی ئەزموون و وروژانی سێکسی دەبێتەوە، سەرلەنوێ مەیلە سێکسییە تابۆکانی بەرامبەر باوکی بێدار دەبنەوە، ئەمەش دەبێتە مایەی ڕوودانی حاڵەتێک لە دڵەڕاوکێی زۆر و دەبێتە هۆی شکستپێهێنانی مەیل و وەڵامدانەوە سێکسییەکانی. هەندێک تیۆری دیکەی دەروونی هەن کە لێکدانەوەی ترسی مێ لە گەیشتن بە ئۆرگازم ڕوون دەکەنەوە، کە ئەمانەش هەر بۆ ململانێ دەروونییە نەستییەکانی دەگەڕێنەوە، بۆ نموونە ژن لە ئۆرگازم سڵ دەکاتەوە، چونکە لە مردن دەترسێ، یان دەترسێ کۆنترۆڵی جەستەی لەدەست بدات و دەترسێ لەناو بونیادی هاوبەشە سێکسییەکەیدا بتوێتەوە، هەروەها گەڕانەوە بۆ منداڵی و لەدەستدانی ناسنامەی کەسێتیی خۆی و پێویستیی بۆ

ڕەتکردنەوەی ناسنامەی سێکسیی تەواوی خۆی، دەترسێ، ئەمانە و چەندەها شیکاری دیکەی دەروونی.

لەگەڵ زۆریی ئەو تیۆرانەی کە هۆکارەکانی سێکسساردییان لە ژندا خستووەتە ڕوو، هێشتا گەڕان بە دوای ئەم بابەتەدا لە سەرەتادایە، هەرچەندە تا ئێستا مێ لە کۆمەڵگە نەریتییەکاندا بە ئاسانی ڕاستییەکانی ژیانی سێکسیی خۆی نادرکێنێ، بەڵام هەندێک ئاماژەی سەرەتایی هەن ئەوە ئاشکرا دەکەن کە لەم سەردەمەدا مێ زیاتر ئازاد بووە لە ئامادەبوون و ڕازیبوونی بۆ درکاندنی ڕاستییەکانی ژیانی سێکسی، بەڵام هێشتا ماوەیەتی و کاتی زیاتر دەخایەنێ تا ژن ئامادەبێ وەک پیاو ڕاشکاوانە باس لە کێشە سێکسییەکانی خۆی بکات، دەشێ یەکێک لە دەرئەنجامەکانی ئازادبوونی ژن لە کۆتوبەندە کولتووری و کلاسیکییەکان ئەوە بێ، ژن خۆبەخۆ بڕواتە دۆخێکەوە کە لە ڕێگر و تابۆ و چەپێنراوە کەڵەکەبووەکان ڕزگاری بێ، ئەو ڕێگری و چەپێنراوانەی وایان لێ کردووە لە سێکسدا خۆی بە هاوبەشێکی ناکارا و تەسلیمبوو ببینێ، ئەم ڕوانینەش لەگەڵ سروشتی ژندا دژ دەوەستێ و هۆکاریشە بۆ کۆژان و سێکسساردییەکەی لە ژیانی سێکسی لەگەڵ پیاودا.



# بەشی دەیەم
# وەڵامدانەوە سێکسییەکان

قۆناغەکانی وەڵامدانەوەی سێکسی لە نێردا
١- قۆناغی وروژان
٢- قۆناغی هەڵسان (بەرزبوونەوە)
٣- قۆناغی ئۆرگازم و هاویشتنی تۆو
٤- قۆناغی خاوبوونەوە و دامرکانەوە
قۆناغەکانی وەڵامدانەوەی سێکسی لە مێ-دا

## وەڵامدانەوە سێکسییەکان

وەڵامدانەوەی سێکسییەکان بریتین لەو کاردانەوە فسیۆلۆژییانەی کە لە جەستەدا ڕوو دەدەن کاتێک تاک هەست بە پاڵنەر، یان ئارەزووی سێکسی دەکات، ئەم وەڵامدانەوانە لە زۆربەی خەڵکدا بە چەند قۆناغێکی بەدوایەکداهاتوودا تێپەڕ دەبن، بەڵام لە ڕووی ماوەی هەریەک لەو قۆناغانە و هێز و گوڕ و ئاشکراییان، لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە جیاوازە، هەروەها لە تەنیا کەسێکیشدا لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دیکە دەگۆڕێ. مەرج نییە هەر کاتێ تاک هەستی بە ئارەزووی سێکسی کرد، ئیدی ئەم قۆناغانە هەموویان ڕوو بدەن. دەشێ وەڵامدانەوە لە یەکێک لە ڕۆڵەکاندا بوەستێ، ئەویش بەپێی بەردەوامی لە هەستکردن بەو ئارەزووە، یان نەمانی هەستکردن پێی، هەروەها بەپێی ئەگەری بەدیهاتنی ئەو ئارەزووە.

هەرچەندە وەڵامدانەوە سێکسییەکان بریتین لە کرداری فسیۆلۆژی و دەکرێ تێبینی و چاودێری بکرێن و تا ئاستێک پێوانەش بکرێن، بەڵام لە هەمان کاتدا، کۆمەڵێک وەڵامدانەوەی دەروونی هەن هاوکاتن لەگەڵ وەڵامدانەوە فسیۆلۆژییەکاندا، هەندێک لەم وەڵامدانەوە دەروونییانە بەهۆی کاریگەریی وەڵامدانەوە فسیۆلۆژییەکان لەسەر ناوەندە دەمارییەکان ڕوو دەدەن و هەندێکی دیکەشیان بەهۆی کاریگەریی پاڵنەرە سێکسییە سەرەکییەکەوە ڕوو دەدەن.

لە ڕابردوودا ئەو ڕوانگەیە زاڵ بوو کە وەڵامدانەوەی سێکسی لە دوو پرۆسەی سەرەکی پێک دێ کە ئەمانەن:

ڕەپبوون و هاویشتنی تۆو لە نێردا، هەروەها ئۆرگازم لە مێ-دا ئەگەر ڕوو بدات. ئەم ڕوانگەیە تا ماوەیەکی دوورودرێژ باوبوو، ئەوەی یارمەتیی مانەوەی دابوو ئەوە بوو نەدەتوانرا کرداری سێکسی بکرێ و توێژینەوەی بابەتییانە دەربارەی ئەنجام بدرێ. فلیکس ڕۆبود Roabaud یەکێک بوو لەو پێشەنگانەی دەربارەی ئەم بابەتە لێکۆڵینەوەی ئەنجام دا، لە ساڵی١٨٥٥دا تێبینییە سەرەتاییەکانی دەربارەی پەیوەندیی سێکسی لە مرۆڤدا بڵاوکردەوە، لەدوای ئەم دەستپێشخەرییەی فلیکس، چەندەها لێکۆڵینەوەی دیکە بەدوایدا هاتن، بەڵام ئەم لێکۆڵینەوانە بۆ ئەم بابەتە لە ئاستی پێویستدا نەبوون و ژمارەیان کەم بوو، لە هەموویان گرنگتر لێکۆڵینەوەکەی کنزی بوو دەربارەی ژیانی سێکسی لە نێردا (١٩٤٨) و ژیانی سێکسی لە مێ-دا (١٩٥٣)، بەڵام لێکۆڵینەوەکەی کنزی واقیعی نەبوو، بەڵکو لە شێوەی ڕاپرسیدا بوو. پاش ئەم لێکۆڵینەوەیە بە ساڵێک، واتە لە ساڵی ١٩٥٤دا، هەردوو توێژەر د. ویلیەم ماستەرز Masters و فیرجینیا جۆنسۆن Johnsonلی هاوڕێی، پرۆژەیەکی هاوبەشیان دەربارەی ژیانی سێکسی ئەنجام دا، بەرئەنجامی کارەکەیان، بڵاوکردنەوەی کتێبێک بوو بە ناوی وەڵامدانەوە سێکسییە مرۆییەکان Human Sexual Responses لە ساڵی ١٩٨٦دا. ئەم دوو توێژەرە زانیارییەکانیان لەڕێی تێبینی و چاودێریکردنی زانستی ڕاستەوخۆی پەیوەندیی سێکسیی نێوان ژن و پیاو وەرگرت، هەروەها لەڕێی تێبینیکردنی ئەو وەڵامدانەوە سێکسییانەوە کە پشت دەبەستێ بە وورووژانی خۆیی، یان ماستەربەیشن، واتە وورووژان بێ ئامادەبوونی هاوبەشی سێکسی و ئەنجامدانی سێکسی تەواو.

لەبەر ئەوەی پەیوەندیی سێکسیی پەیوەندییەکی شاراوەیە و ڕێگریی زۆر هەن لە بەردەمئاشکراکردنی ئەو هەقیقەتانەی کە

ڕوو دەدەن، ئەم دوو توێژەرە لە سەرەتای توێژینەوەکانیاندا پشتیان بەست بە تێبینیکردنی ژیانی سێکسیی لەشفرۆشەکان، پاشان ئەو کەسانەی کە وەک خۆبەخش بەشداری توێژینەوەکانیان کرد. بەم شێوەیە توانییان توێژینەوە لەسەر ٣٨٢ ژن لەنێو تەمەنی ١٨ و ٧٢ ساڵدا بکەن و لە کۆتاییدا توانییان توێژینەوە دەربارەی ٦٩٤ حاڵەت ئەنجام بدەن، کە ٢٧٦ لەو بەشداربووانە هاوسەری یەک بوون و هەموو ئەم ژمارەیە توانیبوویان بە ئۆرگازم بگەن لەڕێی ماستەربیوشن، یان جووتبوون لەو تاقیگەیەی کە بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کرابوو. ئەم دوو توێژەرە شێوازەکانی تێبینی و چاودێریکردنی زانستییان بۆ ئەو گۆڕانکارییە فسیۆلۆژییانە پیادە کرد کە لە کاتی پەیوەندییە سێکسییەکاندا ڕوویان دەدا، ئەو گۆڕانکارییە گشتییانە، وەک لێدانی دڵ و هەناسەدان و گرژبوونی ماسوولکەکان و گۆڕانکارییە ناوچەییەکانی لە ئەندامە سێکسییەکانی نێر و مێدا ڕوویان دەدا، هەروەها تێبینیکردنی دەردانی ماددەکان و گۆڕانکاری لە موولوولەکانی خوێندا. ئەم دوو توێژەرە ئامێری زانستییان بۆ ئەنجامدانی ئەم پێوانەکردنانە بەکار هێنا، هەروەها ئامێرەکانی وێنەگرتن و تەلەفزیۆنیان بەکار هێنا بۆ چاودێریکردنی زنجیرەی گۆڕانکارییەکان لە قۆناغە جیاوازەکاندا. وێڕای هەوڵیان بۆ ئاشنابوون بەو وەڵامدانەوە سێکسییانەی کە ڕوو دەدەن، ئەم توێژەرانە هەوڵیان دا تێبینیی جیاوازییەکان لە وەڵامدانەوەی سێکسی ژن و پیاودا بکەن کاتێ بەڕاستی پێکەوە جووت دەبن لەگەڵ ئەو کاتانەدا کە بە تەنیا ماستەربەیشن دەکەن. ماستەرز و جۆنسۆن وردەکاریی وەڵامدانەوە فسیۆلۆژییە سێکسییەکانیان لە چوار قۆناغدا پوخت کردەوە، ئەم قۆناغانە ئەگەرچی بەدوای یەکدا دێن، بەڵام لە یەکدی جیاکراوە نین، بۆ نموونە قۆناغی ڕەپبوون لە نێردا لە دوو قۆناغ یان سێ قۆناغدا بەردەوام دەبێ، بەڵام

ئۆرگازم لە هەردوو توخمەکەدا لە هەموو قۆناغەکانی دیکە زیاتر دیاریکراوە لە ڕووی هەست و کاتەوە و لە تەنیا یەک قۆناغدا ڕوو دەدات. لێرەدا هەرچوار قۆناغەکەی وەڵامدانەوەی سێکسی دەخەینە ڕوو وەک ئەوەی کە ماستەرز و جۆنسۆن پۆلێنیان کردووە، کە ئەمانەن: وروووژان Excitement، قۆناغی هەڵسان یان بەرزبوونەوە Plateau، قۆناغی ئۆرگازم Orgasem، قۆناغی خاوبوونەوە و دامرکاندنەوە Resolution. لێرەدا سەرەتا لە نێردا باسیان دەکەین، پاشان لە مێ-دا.

**قۆناغەکانی وەڵامدانەوەی سێکسی لە نێردا:**

**١-قۆناغی وروووژان**

دەشێ ئەم قۆناغە لە وەڵامدانەوەی سێکسی لەدوای کاریگەریی وروووژانێکی دەروونییەوە ڕوو بدات، ئیدی سەرچاوەکەی هەرچییەک بێ، ناوەکی بێ یان دەرەکی، چونکە بیرکردنەوە لە سێکس، یان خەیاڵکردنەوە لێی، یان ئەنجامدانی گەمەبازی لەڕێی زیندەخەونەکانەوە، دەشێ سەرەتا بن بۆ کرداری وروووژان، هەروەها دەشێ وروووژان ڕوو بدات لە ئەنجامی ئەزموونی سێکسییەوە بەهۆی سەرچاوەیەکی دەرەکییەوە، یان وروووژان بەهۆی بابەتێکی سێکسییەوە ڕوو بدات، وەک سەیرکردنی وێنە، یان فیلم، یان گوێگرتن لە میوزیک، یان سەماکردن، یان گۆرانیوتن، یان تەماشاکردنی هەر شێوەیەکی سێکسی مرۆیی، یان تەنانەت هەندێجار ئاژەڵیش. وروووژانی دەروونی دەشێ بە شێوەیەکی خۆبەخۆ ڕوو بدات و ئەو کەسە دەستی نەبێ لە ڕوودانیدا. کاریگەریی پرۆسە دەروونییە ناوەکییە نەستییەکان ڕۆڵی سەرەکی دەبینن لەم وروووژاندنەدا. بەدەر لەم

وروروژێنەرە دەروونییانە، هەندێ وروروژێنەری جەستەیی، یان فسیۆلۆژی هەن کە بەهۆی بەرکەوتن، یان لێخشاندن، یان هۆیەکانی دیکەی وروروژاندنەوە ڕوو دەدەن، کە مەرج نییە تەنیا ناوچە سێکسییەکان لە جەستەدا بگرنەوە و هەندێ جاریش لە ناوچە سێکسییە هەستیارەکاندا ڕوو دەدەن.

ئەگەر یەکێک لەم وروروژێنەرە دەروونی، یان جەستەیی، یان فسیۆلۆژییانە ڕوو بدەن، ئەوا دەشێ زنجیرەیەک وەڵامدانەوە لە قۆناغی یەکەمی وروروژاندا ڕوو بدات.

ئەم قۆناغە دەشێ لە چەند دەقیقەیەکەوە بۆ چەند سەعاتێ بخایەنێت. لە ماوەی ئەم قۆناغەدا گۆڕانکاریی پێویست ڕوو دەدات تا پەیوندیی سێکسی ئەنجام بدرێ.

گۆڕانکارییەکانیش بریتین لە: ڕەپبوون لە نێردا، تەڕبوون و لینجبوونی ناوچەی زێ لە مێ-دا، بە زۆری ڕەپبوون لە نێردا لە ماوەی چەند چرکەیەکدا ڕوو دەدات، ئەویش بەهۆی گرژبوونی موولوولە خوێنەکان، بەڵام هێز و توندیی ڕەپبوونەکە دەگۆڕێ، بەتایبەتی لە سەرەتای وروروژاندنەکەدا، هەروەها پێستی، یان تورەکەی گونەکان دەچنەوە یەک و توند دەبنەوە و ئەمەش وا دەکات گونەکان ڕەپتر بوەستن و شۆڕبوونەوەیان کەم بێتەوە، هەروەها لەوانەیە لەم کاتەدا شلەیەکی ڕوون لە چووکەوە بڕێژرێ (جگە لە تۆواو)، هەرچی گۆڕانکارییە جەستەییەکانیشن، ئەوا ژمارەیان زۆرە، وەک گرژبوونی ماسوولکەیی و بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، زیادبوونی لێدانی دل و هەناسەدان و ڕەپبوونی سەرگۆی مەمکەکان، سووربوونەوەی پێست و چەندەها ڕوخساری دیکەی دەرەکی.

### ٢-قۆناغی هەڵسان، یان بەرزبوونەوە

ئەم قۆناغە بەدوای قۆناغی یەکەمدا دێ، بە قۆناغی ئامادەکاری دادەنرێ بۆ گەیشتن بە ئۆرگازم، هەرچەندە مەرج نییە هەموو جارێ تاک بە ئۆرگازم بگات، ئەگەر بەم قۆناغەی دووەمدا تێپەڕی.

گۆڕانکارییە فسیۆلۆژییەکانی کە لە قۆناغی یەکەمدا ڕوویان داوە، لەم قۆناغەدا زیاتر دەبن و بەردەوامیش دەبن. دەشێ ئەم قۆناغە بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ بخایەنێ، ئەویش بەپێی ورووژێنەرە سێکسییەکان و پاڵنەری سێکسی و هێز و گوڕیان، یان لاوازییان، هەروەها دەشێ شلەییەک بڕێژرێ کە چەند تۆوێکیشیان تیا بێت.

### ٣-قۆناغی ئۆرگازم و هاویشتنی تۆو

ئەم قۆناغە بریتییە لە قۆناغی گەیشتن بە ئۆرگازم، لەناکاو دێ و بۆ ماوەی چەند چرکەیەکی کەم دەخایەنێ، بە زۆری بۆ دوو قۆناغ دابەش دەبێ، قۆناغی یەکەم پێی دەوترێت حەتمییەتی هاویشتن Ejaculatory-Inevitability، کە گرژبوون لە گونەکان و پرۆستات و چیکڵدانۆچکەی تۆواودا ڕوو دەدات. لەم قۆناغەدا تاک هەست دەکات خەریکە هاویشتن ڕوو دەدات و ئیدی ناتوانێ خۆی لێ لابدات. لەوانەیە هەندێ کەس بتوانن خۆیان لە هاویشتنی تۆو لە ناوەوە لابدەن و لە دەرەوە تۆواوەکەیان بڕێژن، ئەم جۆرە کردارە سێکسییە پێی دەوترێ جووتبوونی پچڕپچڕ Coitus Interrupts یان جووتبوونی جیاکەرەوە. لەڕێی ئەو گرژبوونانەی کە پێشتر باسمان کردن، دەردراوەکانی تۆواو کۆدەبنەوە و بەرەو دەروازەی بۆریی میز پاڵیان پێوە دەنرێ، ڕاستەوخۆ بەدوای ئەم قۆناغەدا، قۆناغی هاویشتنی ڕاستەقینە ڕوو دەدات، کە ماسوولکەکانی چووک و بۆریی میز گرژ دەبن و شلەی تۆواو بەرەو کەناڵی بۆریی میز و دەرەوەی چووک دەهاوێژرێ.

ئەم قۆناغی سێیەمە، بە هەردوو قۆناغەکەیەوە، واتە قۆناغی حەتمییەتی هاویشتن و قۆناغی هاویشتنی ڕاستەقینە، هاوکات دەبێ لەگەڵ هەستێکی دەروونیدا کە پێی دەوترێ ئۆرگازم. پێناسەکردن و وەسفکردنی ئەم هەستە ئەستەمە، ئەگەر پێکهاتەی ئەم هەستە دەروونییە وەسف بکەین، ئەوا دەتوانین بڵێین هەستێکی زاڵە و بەدەرە لە پێشبینیکردن، هاوکاتە لەگەڵ هەستێکی دیکە، یان بەدوایدا هەستێکی دیکە لە هۆشیاریی سێکسی بەدوایدا دێ، بەرئەنجامی گشتیی هەردوو هەستەکە، ئەو چێژەیە کە ناتوانرێ وەسف بکرێ، تەنانەت بۆ ئەو کەسانەش کە ئەزموونیان کردووە.

### ٤-قۆناغی خاوبوونەوە و دامرکاندنەوە

ئەمە دوا قۆناغی پرۆسەی وەڵامدانەوەی سێکسییە، قۆناغێکی کارا نییە، ئەوەی لەم قۆناغەدا ڕوو دەدات پێچەوانەی ئەو گۆڕانکارییە فسیۆلۆژی و دەروونییانەیە کە لە ماوەی سێ قۆناغە کاراکەی پێشوودا ڕوویان داوە. دۆخی تاک بۆ ئەو دۆخە سروشتییە دەگەڕێتەوە کە بەر لە ورووژانی سێکسی تیایدا بووە. ئەم قۆناغە ١٠ بۆ ١٥ دەقیقە دەخایەنێ و دوایی تاک بۆ دۆخی یەکەمجاری بەر لە ورووژان دەگەڕێتەوە. کە دەوترێ دۆخی یەکەمجاری، دەشێ ئەمە لەگەڵ واقیعدا یەک نەیەتەوە، چونکە تاک بەشێک لە وزەی سەرف کردووە. لەبەر ئەوە ڕاستترە بوترێ بۆ دۆخی یەکەمجاری پێش ورووژاندن دەگەڕێتەوە، بەڵام بە وزەیەکی سێکسیی کەمترەوە، هەروەها وا پێویست دەکات ماوەیەکی درێژتر تێپەڕێ تا وزەی سێکسیی تەواو بەدەست دەهێنێتەوە، بەڵام لەدوای کۆتاییهاتنی قۆناغی خاوبوونەوە، تاک دەتوانێ ئەزموونێکی سێکسیی هاوشێوەی ئەزموونی پێشووی دووبارە بکاتەوە. بەم قۆناغە دەوترێ وچانی یاخیبوون Refractory Period، چونکە تاک ناتوانێ لەم ماوەیەدا

وەڵامدانەوەی سێکسیی سەرکەوتووی هەبێ. جێی ئاماژەیە دەشێ ئەم وچانە، یان ئەم ماوەیە چەند سەعاتێ بۆ چەند ڕۆژێ لە هەندێ کەس و هەندێک تەمەندا، بخایەنێ، بەڵام لەو کەسانەدا کە بە ئۆرگازم نەگەیشتوون، دەشێ قۆناغی خاوبوونەوە ڕۆژێکی تەواو بخایەنێ. کاتێک لە وچانی یاخیبوون ورد دەبینەوە، پرسیارێ دێتە پێشێ، ئەویش ئەوەیە، ئایا تاک لەدوای کۆتاییهاتنی ئەم وچانە چەندە لە توانایدایە دووبارە کردارێکی سێکسیی نوێ ئەنجام بداتەوە؟ لە ڕووی تیۆرییەوە هیچ شتێ ڕێگر نییە بۆ دووبارەکردنەوەی سێکس لەدوای کۆتاییهاتنی وچانی یاخیبوون و بەم شێوەیە هەر بەردەوام بێ، بەڵام واقیع لەگەڵ لایەنی تیۆریدا هاوجێ نابێ، یان نایەتەوە یەک، چونکە پاڵنەری سێکسی و کۆئەندامە فسیۆلۆژییە جیاوازەکانی کە خزمەتی وەڵامدانەوەی سێکسی دەکەن، کرداری تێربوون، یان ماندووبوونیان بەسەردا دێ، لەبەر ئەوە کۆتاییهاتنی قۆناغی خاوبوونەوە مەرج نییە ڕێگەدان بێ بە ئەگەری دەستپێکردنەوەی کردارێکی سێکسیی نوێ.

## قۆناغەکانی وەڵامدانەوەی سێکسی لە مێدا

وەڵامدانەوە سێکسییەکان لە ژندا مەرج نییە بە هەمان ئەو چوار قۆناغە ئاشکرا و دوابەدوای یەکەدا بێن کە لە نێردا ڕوو دەدەن. لە نێردا فرەجۆریی تاکانەیی لە کات و ماوەی قۆناغەکانی وەڵامدانەوەی سێکسیدا ڕوو دەدات، واتە کات و ماوەی ئەم قۆناغانە لە پیاوێکەوە بۆ پیاوێکی دیکە جیاوازە، بەڵام لە ڕووی گوڕوتینی قۆناغەکانەوە لە پیاودا ئەو فرەجۆرییە نییە و بە زۆری لەم ڕووەوە پیاوان لە یەک دەچن. لە کاتێکدا لە مێ-دا فرەجۆریی تاکانەیی لە کات و لە گوڕوتینیشدا بەدی دەکرێ، واتە ژنان لە ڕووی ماوەی هەریەک لە قۆناغەکانی وەڵامدانەوەی سێکسی و گوڕوتینی قۆناغەکانەوە، جیاوازن و لە ژنێکەوە بۆ ژنێکی دیکە

دەگۆڕێ و لە تەنیا ژنێکیشدا لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دیکە دەگۆڕێ، ئەمەش وای کردووە فرەجۆری لە قۆناغەکانی وەلامدانەوەی سێکسیدا ڕوو بدات. بەگشتی وەلامدانەوەی سێکسی لە مێ-دا بەم شێوەیە ڕوو دەدات:

### ١-قۆناغی ورووژان

گرنگترین خەسلەت کە ئەم قۆناغەی پێ دەناسرێ، دەردانی کۆمەلێک دەردراوە لە زێ-دا کە لە ماوەی ٥-١٥ چرکەدا ڕوو دەدات. ئەم قۆناغە هاوتای قۆناغی ڕەپبوونە لە نێر و لە کات و ماوەی ڕوودانیشدا ئەم دوو قۆناغە یەکسانن. زۆربەی ئەو دەردراوانە کە ناوچەی زێ و دەوروپشتی تەڕ و لینج دەکەن، لەم قۆناغەدا دەردەدرێن و زیاد دەبن و دوای ئەم قۆناغە کەم دەبنەوە، لە ڕوخسارەکانی ئەم قۆناغە وەک ڕەپبوون و بەرزبوونەوەی میتکە لەگەل هەردوو گۆی مەمک، ڕوودانی ئەم گۆڕانانە لەگەل کۆمەلێک گۆڕانکاریی دەروونی و فسیۆلۆژیی دیکەدا هاوکاتن، هەروەک لە قۆناغی ورووژان لە نێردا ڕوو دەدات.

### ٢-قۆناغی هەلکشان

ڕوخسارەکانی گۆڕانە فسیۆلۆژییەکانی کە لە قۆناغی پێشوودا ڕوویان داوە، لەم قۆناغەدا بەردەوام دەبن، بەلام بە زۆری دەردراوەکانی ناوچەی زێ کەم دەکات، هەروەها ڕەپبوون و بەرزبوونەوەی میتکە تۆزێ کەم دەبێتەوە، هەروەها گۆی مەمکەکانیش. لەگەل نزیکبوونەوەی ڕوودانی ئۆرگازمدا، سێ بەشی ناوەوەی زێ فراوان دەبێ و لەگەل منالداندا بەرەو سەرەوە بەرز دەبنەوە، ئەمەش وا دەکات ناوچەی زێ درێژ بێتەوە و فراوانیش ببێ.

### ٣-قۆناغی ئۆرگازم

پێکهاتە دەروونی و فسیۆلۆژییەکان لەم قۆناغەدا لە هەردوو توخمەکەدا وەک یەکن، لەگەڵ بوونی یەک جیاوازیدا، ئەویش ئەوەیە هاویشتنی تۆو لە ژندا ڕوو نادات، هەروەها ئۆرگازم لە مێ-دا شتێکی چاوەڕوانکراو نییە وەک ئەوەی کە لە نێردا ڕوو دەدات، چونکە ئۆرگازم لە مێ-دا دەشێ ڕوو بدات و دەشێ ڕوو نەدات، هەروەها دەشێ چەند جارێکیش بە ئۆرگازم بگات بێ ئەوەی لە قۆناغی هەڵکشان یان بەرزبوونەوە بێتە دەرەوە. لەوانەیە ژن قۆناغی هەڵکشان ببڕێ و بەرەو قۆناغی خاوبوونەوە بڕوات، بێ ئەوەی بە ئۆرگازمدا تێپەڕێ. مێ لە تەواوی ئەم حاڵەتانەدا لەوانەیە لە ڕووی فسیۆلۆژی و دەروونییەوە هەست بە ڕازیبوون و تێربوون بکات، هەروەها دەشێ مێ بە کەمترین وورووژانی ناوچەیی لەڕێی دەستەوە بێ، یان سێکسەوە بە ئۆرگازم بگات، هاوکات لەوانەیە کاتی زۆر بخایەنێ و وا پێویست بکات کە بە توندی وورووژان ئەنجام بدرێ تا بە ئۆرگازم بگات، هەندێ جاریش نە کاتی زۆر و نە توندی، سوودیان نابێ و ئەو ژنە ناتوانێ بە ئۆرگازم بگات.

### ٤-قۆناغی دامرکاندنەوە

ئەم قۆناغە لە مێ-دا زۆر کورتە، بە بەراوردکردن لەگەڵ نێردا، هەروەها هیچ ڕێگرییەک لە بەردەم مێ-دا نییە بۆ دووبارە گەیشتن بە ئۆرگازم، وەک ئەوەی کە لە پیاودا ڕوو دەدات.

ڕوخسارەکانی ئەم قۆناغانەی وەڵامدانەوەی سێکسی لە نێر و مێدا ڕوخساری باو و تێبینیکراون، هەروەک ئاماژەشمان پێ دا لە مێ-دا کەمتر ڕەوتێکی ڕێکخراویان هەیە وەک ئەوەی کە لە نێردا

ڕوو دەدات، هەروەها ئەم ڕوخسارانە لە هەردوو توخمەکەدا لە ڕووی کات و جۆرەوە بەپێی قۆناغەکانی تەمەن و ئەزموونەکانی تاک و بەهۆی نەخۆشی، یان زیانی پزیشکی، یان نەشتەرگەرییەوە، یان بەهۆی بەکارهێنانی حەب و دەرمانەوە، یان بە هۆکاری دەروونییەوە، جیاوازن، هەروەها دەشێ هەندێ بارودۆخ کە تایبەتن بە مێ، وەک سووڕی مانگانە و دووگیانی و منداڵبوون و شیرپێدان، هەروەها نەبوونی توانای منداڵخستنەوە و تەمەنی نائومێدی و چەندەها حاڵەتی دیکە کە تەنها تایبەتن بە مێ و لە نێردا ڕوو نادەن، کار بکەنە سەر ڕوخسارەکانی وەڵامدانەوەی سێکسی لە مێدا.

# بەشی یانزەیەم
# ماستەربەیشن

# ماستەربەیشن

ماستەربەیشن Masturbation[1] واتە هاتنەوەی تۆواو. ئەم کردارە پەیوەستە بە دەستکەوتنی تۆواو و لە نێردا ڕوو دەدات. لە لایەکی دیکەوە ئەم وشەیە لە زماندا مانایەکی دیکەشی هەیە کە بریتییە لە ئاوهاتنەوە، یان تۆواوهاتنەوە لەڕێی چەند هۆیەکەوە.

لە ئێستادا زاراوەی ماستەربەیشن بۆ وەسفکردنی کرداری وروژاندنی سێکسی لەڕێی دەستەوە بەکار دێ، ئیدی لە نێردا بێ، یان لە مێدا بێ، بەڵام چەمکی زانستیی ئەم زاراوەیە ئەمەی تێدەپەڕاند و جگە لە دەست، هەموو ئەو هۆیانەی دیکە دەگرێتەوە کە بە مەبەستی وروژانی سێکسی و دەستکەوتنی چێژ و گەیشتن بە ئۆرگازم، بەکار دەهێنرێن. لەو زاراوە باوانەی کە هاوواتان بۆ ماستەربەیشن، زاراوەی خووەنهێنییە، ئەم ناولێنانەش لەوەوە هاتووە ئەو تاکەی کە ئەنجامی دەدات بە تەنیا و بە نهێنی ئەنجامی دەدات. ئەم دیاردە باوە، بووە مایەی سەرنجڕاکێشانی ئەو کەسانەی کە ئەنجامی دەدەن، هەروەها خێزانەکانیشیان، هاوکات بووە مایەی سەرنجڕاکێشانی بەخێوکاران و دەروونناسان و پزیشکەکان، لەم بارەیەوە چەندەها تیۆر و ڕوانگەی جیاواز هاتنە ئاراوە، لەبەر ئەوە پێویستە توێژینەوە دەربارەی لایەنە جیاوازەکانی ئەم کردارە بکرێ لە ڕووی سروشت و بڵاوبوونەوەی و تەمەنی دەستپێکردن و هۆیەکانی کە بۆ ئەنجامدانی پشتیان پێ دەبەسترێ لە هەریەک لە نێر و مێ-دا، سەرباری لێکۆڵینەوە لە زیان و سوودەکانی ئەم کردارە و گەڕان بە شوێن ئەو هۆیانەی کە ئەم کردارە کەم دەکەنەوە.

ڕەفتارە بەراییەکانی پراکتیزەکردنی ماستەربەیشن دەکرێ تەواوی هۆیەکانی وروژاندن، یان بەرکەوتن، یان گەمەبازی بە

ئەندامی سێکسی، بە ڕەفتاری بەرایی، یان سەرەتایی و سەرەکی و گرنگ دابنرێن و سەرنجی منداڵ ڕووەو ئەو ناوچەیە ڕابکێشن بۆ ئەو چێژانەی کە ڕوو دەدەن، ئەگەر بە هۆیەکەوە ئەو ناوچەیە وروژێنرا. منداڵ هەر زوو دەرک بەوە دەکات ئەو گەمەبازییەی کە خۆی بە ئەندامەکەی خۆی دەیکات، دەشێ وروژان بە دەست بێنێ و دوای ئەویش هەستکردن بە ڕازیبوون و چێژ، دەشێ بە ڕێکەوتن سەرنجی ئەم دیاردەیە بدات، بەتایبەتی دەشێ ئەمە لە کاتێکدا هەستی پێ بکات کە ڕەپبوونی خۆیی ڕوو دەدات کاتێ میزەڵدان پڕدەبێ لە میز و کاتی لەخەوهەستانیشدا، هەر کاتێ ئەم هۆشیارییە لە ناوەزی منداڵدا دروست بوو، ئەوا شتێکی چاوەڕوانکراو دەبێ، بەیناوبەین خۆی هەوڵی وروژاندنی خۆی بدات، یان چاوەڕێی ئەم وروژاندنە بکات بەهۆی بەرکەوتنێکی دەرەکییەوە، بەڵام دیاریکردنی ئەو کاتەی کە ماستەربەیشن لە منداڵدا بە ڕێکوپێکی ڕوو دەدات و دووبارە دەبێتەوە وەک ئەوەی کە لە قۆناغی مێردمنداڵی و نەرزەبووندا ڕوو دەدات، ئەوا مەسەلەیەکە ناکۆکیی هەیە لە سەلماندنی ئەو کاتە دیاریکراوەدا، هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە شارەزایان و بەخێوکاران ناکۆکن لەسەر ئەوەی کام ڕەفتارانە بە ماستەربەیشن دادەنرێن. هەندێ لە توێژەران تێبینیی ڕەفتاری سێکسییان لە منداڵی سێ ساڵ و تەنانەت دوو ساڵیشدا کردووە، کە نزیک بووە لە کرداری ماستەربەیشنەوە.

کەسێکی کامڵ دەربارەی قۆناغی منداڵیی خۆی دەڵێ: "کاتێک بۆ یەکەمجار فێری چۆنێتیی ئەنجامدانی ماستەربەیشن بووم، بیرمە هەستم بە شانازی کرد، چونکە ئەم کردارە دەیوروژاندم و بەو هەستە سەیرەش ئاشنا بووم کە لە کاتی ئەنجامدانی ئەم کردارەدا هەستم پێ دەکرد".

مێردمنداڵێک دەربارەی تەمەنی فێربوونی ماستەربەیشن وتی: "وەک لە بیرم بێ، لە تەمەنی حەوتساڵیدا فێری ماستەربەیشن بووم، لەو کاتەدا هیچم دەربارەی ئەم کارەی خۆم نەدەزانی و نەشمدەزانی مانای چییە، بەڵام هەستم بە خۆشییەکی زۆر دەکرد".

هەروەها تێبینیی زۆر هەن دەربارەی ئەو گرژبوونە سێکسی و گەمەبازییانەی منداڵان بە دەست کردوویانە و دەستییان لە ئەندامی سێکسیی خۆیان داوە. ئەم تێبینییانە هەندێکیان لە لایەن ئەو کەسە خۆیەوە ددانی پیادا نراوە کە لە منداڵیدا چیی کردووە، هەندێکیشیان لە لایەن دەورووبەرەوە تێبینی کراوە، کە بە شێوەیەکی خۆبەخۆیی ڕووی داوە، یان لە ئەنجامی بەرکەوتنێکی ڕێکەوتەوە، یان بە ئەنقەست لەگەڵ منداڵانی دیکەدا، یان بەهۆی ئەوەوە بوو کەسانی دیکەیان لە هەندێ هەڵوێستی سێکسیدا بینیوە کە بووەتە هۆی وورووژانی حەز و شەهوەتیان و هەوڵیان داوە بۆ تێرکردنی ئەو ئارەزووە وورووژێنەرانەیان. وورووژێنەرەکان تەنیا لەڕێی بینینی واقیعەوە سنووربەند نین، بەڵکو وێنەکان لە خەیاڵدا، یان لە زیندەخەوندا، یان لە خەونی شەواندا، دەشێ هەمان وورووژان دروست بکەن.

### بڵاوبوونەوەی ماستەربەیشن

کارێکی ئەستەمە بتوانرێ بە وردی ئەو ڕاستییانە بەدەست بهێنرێ کە تایبەتە بە بڵاوبوونەوەی ماستەربەیشن، ئیدی لەنێو منداڵ و هەرزەکاردا بێ، یان لەنێو هەرزەکار و گەورەکاندا بێ، هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ماستەربەیشن لە ئاوەزی کۆمەڵگەدا وەک شتێکی خراپ و بێزراو تەماشا کراوە و ڕەت کراوەتەوە، هەرچەندە بە نزیکی، هەموو تاکێک ماوەیەک لە ماوەکانی ژیانیدا، ئەگەر بۆ تەنیا جارێکیش بێ ماستەربەیشنی کردووە، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە، لە هەر پێنج کەسێ لەوانەی

دەربارەی ڕەفتار و پراکتیزەکردنی سێکسییان پرسیاریان لێ کراوە، یەکێکیان ئامادەنەبوو دەربارەی ماستەربەیشن هیچ وەڵامێک بداتەوە، سەرباری ئەوەی دداننان بە ئەنجامدانی ماستەربەیشن لەو کەسانەدا کە پرسیاریان لێ کراوە، لەگەڵ هەقیقەتی بڵاوبوونەوەی ماستەربەیشندا ناگونجێن، یان یەک ناگرنەوە، ئیدی لەنێو منداڵدا بێ یان لەنێو گەورەکاندا. لێرەدا ئاماژە بە هەندێک لێکۆڵینەوە دەکەین کە ئاماریان دەربارەی ماستەربەیشن ئامادە کردووە، دەشێ ئەم ئامارانە هەندێ ئاماژە دەربارەی ئاستی بڵاوبوونەوەی ئەنجامدانی ماستەربەیشن لە قۆناغە جیاوازەکانی تەمەندا بخەنە ڕوو.

- لە هەر پێنج منداڵی لەوانەی دەربارەی ماستەربەیشن ڕاپرسییان لەگەڵدا کراوە، تەنیا یەکێکیان هەر لە تەمەنێکی زووی منداڵییەوە ماستەربەیشنی کردووە تا بە ئۆرگازم گەیشتووە. بەم شێوەیە وا دەردەکەوێ کە زۆربەی منداڵان هەرچەندە بە توندی لە ڕووی سێکسەوە خۆبەخۆ دەورووژێن، بەڵام ئەم وروووژانە ناگاتە ئاستی ئۆرگازم.[٢]

- بەپێی ئامارەکان، ژمارەی ئەنجامدانی ماستەربەیشن لە منداڵانی شەش بۆ حەوتساڵی، ڕوو لە زیادبوون دەکات، بەڵام زیادبوونەکە لە منداڵی کوڕ و مێرمنداڵدا خێراتر دەبێت، لە کاتێکدا بە شێوەیەکی هێواش لە کچاندا لە تەمەنی منداڵییەوە تا بیست ساڵی خێرا دەبێت.

- بە گەیشتن بە تەمەنی نەرزەبوون، زۆربەی کوڕان ماستەربەیشن ئەنجام دەدەن، ئەوانەشیان کە بەر لە نەرزەبوون، ئەم کارەیان نەکردووە، ئەوا لەگەڵ یەکەمین ئاوهاتنەوە، واتە فرێدانی تۆواودا، ئەم کردارە سەرنجی ڕاکێشاون و بۆ دووبارەکردنەوەی هانی داون.

یەکێک لە گرنگترین ئەو لێکۆڵینەوانەی لە شێوەی وەرگرتنی ئاماردا دەربارەی ماستەربەیشن ئەنجام دراوە، لێکۆڵینەوەکەی هەردوو توێژەر ستمدیت و سیگوچ-ە Schmidt and Siguschلە ساڵی ١٩٧٠دا. ئاماری ئەم لێکۆڵینەوەیە کە لەسەر کۆمەڵێکی زۆر لەو خوێندکار و کرێکارە کچ و کوڕانە ئەنجامدرا کە بیست ساڵیان تەواو کردبوو، ئاماژەی بەوە دا، کوڕان لە نێوان ١٣ بۆ ١٦ ساڵی بە ڕێژەی دوو ئەوەندەی کچان ماستەربەیشن ئەنجام دەدەن، هەروەها کچان بە بەراورد لەگەڵ کوڕان لە هەمان تەمەندا، درەنگتر دەست بە پراکیتزەکردنی ماستەربەیشن دەکەن، هەروەها بە شێوەیەکی هێواشتر لە کچاندا زیاد دەبێ.

بە شێوەیەکی گشتی لە هەموو قۆناغەکانی تەمەندا، کچان لە کوڕان کەمتر ماستەربەیشن دەکەن. لێکۆڵینەوەکە ئاماژە بەوەش دەدات جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان توێژی کرێکاران و توێژی خوێندکاراندا نەبووە لە کوڕاندا، بەڵام لە کچاندا بە ڕێژەی ١٠%-٥٠% لە قۆناغە جیاوازەکانی تەمەندا جیاوازی لە نێوان خوێندکار و ئیشکەران، یان کرێکاراندا بەدی کراوە. دواجار ئاماری ئەم لێکۆڵینەوەیە ئاماژە بەوە دەدات، ١٠%ی ئیشکەران و ١٦%ی خوێندکاران لە کوڕان ددانیان بەوەدا ناوە لە تەمەنی یانزە ساڵییەوە ماستەربەیشنیان کردووە، لە تەمەنی بیست ساڵیدا ئەم ڕێژەیە لەنێو کوڕانی ئیشکەردا بۆ ٩٢% و خوێندکارانی کوڕیش بۆ ٩٠% بەرزبووەتەوە، بەڵام لە کچانی ئیشکەردا لە تەمەنی یانزە ساڵیدا ٥% و لە کچانی خوێندکاردا ٩% بوو، ئەم ڕێژانە لە کچاندا لە تەمەنی چواردە ساڵیدا، لەنێو ئیشکەراندا بۆ ٢٣% و لەنێو خوێندکاراندا بۆ ٤٠% بەرزبووەتەوە. دەرئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیە کە لە کۆمەڵگەیەکی ئەڵمانیدا ئەنجام درابوو، کۆک بوو لەگەڵ ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوەیەی چەند ساڵی لەوەوپێش لە لایەن کنزییەوە لە کۆمەڵگەی ئەمریکیدا ئەنجام درابوو،

لێکۆڵینەوەکەی کنزی ئاماژە بەوە دەدات بە گەیشتن بە تەمەنی ٢٠ ساڵی ٩٠%ی کوڕان و سێ بەشی کچان، ماستەربەیشن دەکەن، ئەم ئامارانە لەگەڵ ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوە ئەڵمانییەکەدا کۆک بوون.

بەڵام لێکۆڵینەوەکەی کە کنزی ئەنجامی دابوو، ئاماژەشی بەوەدا، ڕێژەی ئەنجامدانی ماستەربەیشن لەنێو کچانی ئەمەریکیدا لە تەمەنی شانزە ساڵیدا ناگات بەو ڕێژەیەی کە لە هەمان تەمەندا کچانی ئەڵمانی پێی دەگەن، ئەم ڕێژەیە لە ئەڵمانیا لەنێو کچانی شانزە ساڵاندا ٣٠%یە، کچانی ئەمەریکا لە تەمەنی بیستوپێنج ساڵیدا بەم ڕێژەیە دەگەن. ئەم جیاوازییە بە جیاوازییەکی گەورە دانانرێ، بە ڕەچاوکردنی جیاوازیی زەمەنی لە نێوان دوو لێکۆڵینەوەکەدا. دەتوانرێ هۆکاری ئەمە بۆ ئەوە بگەڕێنرێتەوە، کە ماستەربەیشن-یش وەک حاڵەتی نەرزەبوون وایە و دەشێ لە ئێستادا لە تەمەنێکی زووتردا دەست پێ بکات بەراورد لەگەڵ ڕابردوو لە زۆربەی کۆمەڵگەکاندا.[٣]

## دووبارەکردنەوەی ماستەربەیشن

زۆربەی زۆری ئەو کەسانەی دەست بە پراکتیزەکردنی ڕەفتاری ماستەربەیشن دەکەن، بە شێوەیەکی ڕێکوپێک دووبارەی دەکەنەوە و دەشێ بۆ ماوەی ساڵانێکی دووردرێژ ئەم کارە بکەن.

بەگشتی دووبارەکردنەوەی هەفتانە لە سەرەتای دەیەکانی تەمەندا (قۆناغی یەکەمی نەرزەبوون) ڕوو دەدات، دەشێ ڕێژەی ئەم دووبارەبوونەوەیە تا کۆتایی هەرزەکاری بە بەرزی بمێنێتەوە، بەتایبەتی لە کۆمەڵگە داخراوەکاندا کە سنوور بۆ پەیوەندییە سێکسییەکان دانراوە، بەڵام دووبارەکردنەوەی ماستەربەیشن لەم تەمەندا لەو کۆمەڵگەیانەدا کەم دەبێتەوە کە

ئاسانکاری لە پەیوەندییە سێکسییەکاندا هەیە، هەروەها لەو کەسانەشدا کەم دەبێتەوە کە هاوسەرێتی دەکەن، بەڵام ڕێژەکە لەوانەیە لەو کەسانەدا بە بەرزی بمێنێتەوە کە هاوسەرێتییان نەکردووە، هەرچەندە بەگشتی لە تەمەنی بیست ساڵیدا بە شێوەیەکی دیار کەم دەکات. ئەو سەرنج و تێبینییانەی کە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی لەسەر مێ دەستکەوتوون، ئاماژە بەوە دەدەن مێ بەگشتی لە کوڕان کەمتر ماستەربەیشن دەکەن و کەمتر لە کوڕان پێداگری لە ئەنجامدانی دەکەن و کەمتر دووبارەی دەکەنەوە. هەرچەندە هەندێ لە کچان لە کوڕان زیاتر پراکتیزەی دەکەن، بەڵام ژمارەی ئەم کچانە بە شێوەیەکی ڕێژەیی کەمە، هەروەها جیاوازیی گەورە هەیە لەنێو ئەو کەسانەدا کە ماستەربەیشن دەکەن، هەندێکیان ڕۆژانە و هەندێکیان هەفتانە دەیکەن و هەندێک بە کەمی و هەندێک زۆر بە دەگمەن، بەڵام هەندێک کەسیش هەیە ڕۆژانە زیاتر لە دە جار دووبارەی دەکاتەوە.

### ئامانجەکانی ماستەربەیشن

ئەوەی گومانی تیادا نییە ئامانجی سەرەکیی ماستەربەیشن ڕازیکردنی ئارەزووی سێکسییە، ئیدی بە شێوەیەکی خۆبەخۆ، یان بە ئەنقەست، یان بەهۆی وروژێنەرێکی دەرەکییەوە بێت. دەشێ ئەم ڕازیکردنە لە تەمەنی منداڵیدا تەنیا وەک گەمەیەک ئەنجام بدرێ، هەروەک پێشتر باسمان کرد مەرج نییە هەموو دەستلێدانێک لە ئەندامی سێکسی لە منداڵدا بە گەیشتن بە ئۆرگازم کۆتایی بێت، بەڵام جۆرێ لە حەوانەوە و ئاسوودەیی و چێژ بە منداڵ دەبەخشێ. لەدوای ئەم تەمەنەوە، واتە لەدوای تێپەڕینی قۆناغی منداڵی، مێردمنداڵ (واتە بەر قۆناغی هەرزەکاری)، هەوڵ دەدات لەڕێی ماستەربەیشنەوە بە ئۆرگازم بگات، هەرچەندە

هەندێک پێیان وایە هاویشتنی تۆو Ejaculation مەرجە بۆ گەیشتن بە ئۆرگازم، بەڵام لە ڕاستیدا دەشێ مێردمنداڵ بەر لە نەرزەبوون بێ ئەوەی تۆواو بڕێژێ، بتوانێ بە ئۆرگازم بگات، هەروەها لە کچانیشدا بێ ئەو کردارە ئۆرگازم ڕوو دەدات. ئەوەی زانراوە زۆربەی کوڕان لەدوای نەرزەبوون بە ئۆرگازم دەگەن کە هاوکاتە لەگەڵ هاویشتنی تۆواودا. لە لێکۆڵینەوەکەی کنزیدا دەرکەوتووە، هەر لە ١٠ کوڕ ٩یان ددانی بەوەدا ناوە کە ماستەربەیشن دەکەن تا بە ئۆرگازم دەگەن، (ئەم ئۆرگازمەش هاوکات بووە لەگەڵ هاویشتنی تۆواو)، بەڵام لە کچاندا لە هەر ١٠ کچ تەنیا شەشیان تا گەیشتن بە ئۆرگازم ماستەربەیشنیان کردووە. لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە دەربارەی ژیانی سێکسی لە مێ-دا دەرکەوتووە، گەیشتن بە ئۆرگازم لە مێ-دا ئامانجێکی ئەوەندە سەرەکی و گرنگ نییە وەک ئەوەی کە لە ژیانی کوڕاندایە. کاتێ ژن ناتوانێ بە ئۆرگازم بگات، ئەمە تووشی هەستکردن بە شکستی و سەختی و نوشوستی و ئەو هەستە نێگەتیڤانەی ناکەن کە کوڕان پێوەی دەناڵێنن.

ئەم واقیعە جەخت لەوە دەکات، ڕازیکردنی سێکسی و هەستکردن بە تێربوون لای ژن تا پلەیەکی زۆر پشت بە پەیوەندییە سێکسی و دەروونییەکە دەبەستێ زیاتر لەوەی پشت بە دەرئەنجامی کۆتایی پەیوەندییە سێکسییەکە ببەستێ و تەنیا خەیاڵی لای گەیشتن بێ بە ئۆرگازم.

ئەو کەسانەی لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە خۆپارێزییان هەیە، کار بەو چەمکانە دەکەن کە خێزان و پەروەردەی کۆمەڵایەتی لەسەری دەڕۆن و لەو ڕەفتارانەش دوور دەکەونەوە کە کۆمەڵگە و دابونەریت ڕەتیان کردوونەتەوە، پێیان وایە پراکتیزەکردنی ماستەربەیشن زیانی هەیە، ئەگەر لە ڕووی تەندروستیشەوە زیانی نەبێ، ئەوا لە ڕووی مۆراڵییەوە زیانی هەیە و ڕەوشتی تاک

تێک دەدات. لەبەر ئەوە هیچ سەیر نییە ئەو ڕایانە بڵاوبێتەوە کە بانگەشە بۆ زیانە تەندروستییەکانی ماستەربەیشن دەکەن بۆ سەر دەروون و ئەقڵ و جەستەی ئەو کەسانەی ئەنجامی دەدەن، بە هەمان شێوە، لەنێو ئەو کەسانەدا، ئەو بۆچوونەش زاڵە، کە پێی وایە ماستەربەیشن زیان بە ڕەفتار و مۆراڵی تاک دەگەیەنێ.

بەهۆی ئەم ڕا و بۆچوونانەوە، ئەو باوەڕە سەریهەڵدا، کە بە نزیکی ئەم نەریتە حەرام کراو لە باشترین حاڵیدا بە گوناه دانرا، یان بە لادان لە گەشەی دروست و مۆراڵی تاک و کۆمەڵگە تەماشا کرا. کەواتە هەقیقەتی مەسەلەکە چۆنە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، وەڵامەکەمان لەسەر لایەنی تەندروستی چڕ دەکەینەوە.

لەوانەیە ئەم وەڵامە یارمەتیدەر بێ لەسەر بەخشینی ڕوانگەیەکی دروستتر لەو حوکم و گۆشەنیگایانەی کە لە ڕووی مۆراڵەوە ئەم ڕەفتارە، یان نەریتە ڕەت دەکەنەوە.

ئەو بیرۆکانەی دەربارەی دەرئەنجام و کاریگەریی خراپ و زیانبەخشیی ماستەربەیشن ماونەتەوە و بەردەوام دەگوێزرێنەوە، ڕەگوڕیشەیان کۆنە، بەڵام تا ئەم سەردەمەی ئێستامان بە جێگیری ماونەتەوە، سەرباری ئەوەی بە شێوەیەک منداڵ و مێردمنداڵ، یان هەرزەکار پەروەردە دەکرێ کە ئەوە نەریتێکی ناشیرینە و عەیبە و گوناهە، ئەوەش دەخەنە مێشکییەوە کە پراکتیزەکردنی ئەم نەریتە، یان زۆری ئەنجامدانی، دەبێتە هۆی تووشبوون بە شکستی و پەککەوتنی سێکسی لە گەورەییدا، هەروەها تووشبوون بە خاوخلیچکیی ئاوەز و لاوازیی یادەوەری و دەماری و تووشبوون بە نەخۆشیی سیل و تەنانەت شێتبوونیش. ئەم ڕایانە تەنیا گوزارشت نەبوون لە بیروبۆچوونی خەڵکانی ئاسایی، بەڵکو هەندێک لە زانا دیارەکانی بواری نۆژداریش باوەڕیان پێی هەبوو، نموونەی فرۆید کە پێی وا بوو

ماستەربەیشن مەترسییەکی گەورەیە و دەشێ مرۆڤ تووشی نەخۆشیی دەروونی بکات. فرۆید ڕایەکانی خۆی دەربارەی کاریگەرییە زیانبەخشەکانی ماستەربەیشن لەم وتەیەدا پوخت کردووەتەوە (١٩١٢): "شتێکی بەڵگەنەویستە، مرۆڤ دژی ئەو جەختکردنەوەیە بوەستێ کە پێی وایە ماستەربەیشن زیانی هەیە، بەڵام بە پێچەوانەوە، هەندێک حاڵەت هەیە کە ئەنجامدانی ماستەربەیشن زیان بە مرۆڤ دەگەیەنێت. هۆکاری نەخۆشییە دەروونییەکانی وەک نیوروٚسس، ئەو ململانێییەیە کە لە نێوان ئارەزووی سێکسی منداڵی و دژوەستانی منەوە ڕوو دەدات (واتە چەپاندن)، لەبەر ئەوە ماستەربەیشن کە وەک دەروازەیەک بۆ ڕازیکردنی ئارەزووی سێکسیی قۆناغی منداڵی پەنای بۆ دەبرێ، ناکرێ وەک شتێکی بەڵگەنەویست بە ڕەفتارێکی بێزیان لەقەڵەم بدرێ". فرۆید پێی وا بووە ئەم زیانە وەک ژەهر وایە و بە هەموو جەستەدا بڵاودەبێتەوە. سەیر لەوەدایە فرۆید هۆشداریی بە کوڕی دووەمی داوە سەبارەت بە مەترسییەکانی ئەم خووە، کاتێ کوڕەکەی دەربارەی هەندێ لایەنی ماستەربەیشن هاتووە و ڕاوێژی بە باوکی کردووە، دوای ئەوە کوڕەکەی، بەهۆی ئەم ڕەتکردنەوە و بەربەستەی کە باوکی لە بەردەم ئارەزووەکانیدا لەو تەمەندا دایناو، نەیتوانی وەک برا گەورەکەی پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ باوکیدا هەبێ. ئەم ڕوانگەیە و هاوتاکانی ئەم ڕوانگە نۆژدارییانە دەربارەی ماستەربەیشن لە سی و چلەکانی سەدەی بیستدا گۆڕانیان بەسەردا هات.

لەم سەردەمەدا بە دەگمەن پزیشکێ هەبێ بڕوای بەوە بێ ماستەربەیشن، یان خووەنهێنی زیانی بۆ سەر تەندروستیی تاک هەبێ، یەکێک لە توێژەرانی ئەم بوارە، لەوە دوورتر دەڕوات و دەڵێ: "لەگەڵ ئەوەدا ماوەی چەند سەدەیەکە هۆشداریی پێچەوانە دەربارەی ماستەربەیشن بڵاو دەکرێتەوە، بەڵام ماستەربەیشن

یەک دەرئەنجامی نێگەتیڤی نییە لە هەردوو توخمەکەدا، بەلام هەندێ بیروبۆچوونی دیکە هەن کە لەگەڵ ئەم ڕا یەکلاییکەرەوەدا ناکۆکن، زۆربەی ئەم ناکۆکییە لە ڕەتکردنەوەی ئەم خووەوە نایەت، بەڵکو پێیان وایە، زۆر دووبارەکردنەوەی ئەم خووە و پێداگری لەسەری، دەشێ ببێتە مایەی ڕوودانی هەندێ دەرئەنجامی نەخواستراو لە ژیانی دەروونی و سێکسی و ڕەفتاری هەندێ لە تاکەکاندا، لەو بۆچوونانەش، بۆ نموونە هەندێک پێیان وایە زۆر ئەنجامدانی ماستەربەیشن دواجار دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی تۆواو و لاوازبوونی گونەکان، بەهۆی هیلاکبوون و شەکەتبوونیانەوە بە کرداری دروستکردنی تۆواو، پاشان پووکانەوەیان و لێرەشەوە پیاو شکست دێنێ لە کرداری پیتێن و پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ ژنەکەیدا، لەو مەترسییانەی ماستەربەیشن کە توێژەران مشتومڕی لەسەر دەکەن، دەرئەنجامی ئەو کرداری پەیوەستکردنەیە کە لە نێوان پراکتیزەکردنی ماستەربەیشن و ئەو خەیاڵانەدا دەکرێ کە ئەو کەسە لە کاتی ئەنجامدانی ئەم خووەدا ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، یان بە شێوەی وێنە سەیریان دەکات، یان خەیاڵیان لێ دەکاتەوە، یان لە زیندەخەوندا لەگەڵیاندا دەژی. ئەو توێژەرانەی بڕوایان بەم بۆچوونە هەیە، پێیان وایە ئەو خەیاڵ و زیندەخەونانەی وێنایان دەکات، دەشێ ببنە هۆی دوورخستنەوەی لە واقیع. ئەگەری ڕوودانی ئەم دوورکەوتنەوەیە لە واقیع لەنێو کەسانی گۆشەگیر و لاتەریکدا، بەهێزترە. ماستەربەیشن بۆ ئەم کەسانە زیانی زیاترە وەک لە کەسانی ئاسایی، چونکە گۆشەگیری و لاتەریکی و دوورکەوتنەوەیان لە واقیع و کۆمەڵگە زیاتر دەکات، دەشێ یارمەتیدەریش بێ لە پەرەپێدانی حاڵەتی شیزۆفرینی لەو کەسانەدا کە خۆیان ئامادەباشییان بۆ تووشبوون هەیە و ماستەربەیشن وا بکات بە شێوەیەکی خێراتر تووش ببن و حاڵەتەکەیان لەسەر

دەربکەوێ، بەڵام پێویستە ئێمە دەرک بەوە بکەین کە قووڵبوونەوە لە پراکتیزەکردنی ماستەربەیشن دەشێ خۆی ڕوخسارێک بێ لە ڕوخسارەکانی نەخۆشییەکە، نەک هۆکارێکی کارا بێت بۆ پەرەسەندنی، هەروەها پەیوەندی لە نێوان ماستەربەیشن و هەندێ لە لادانە سێکسییەکاندا هەیە، وەک ئاڕاستەگرتن ڕووەو هۆمۆسێکسوالیتی، لادانی جۆری فیتشیزم و خۆمەلاسدان و خۆنمایشکردن و سێکسی تابۆ یان حەرام، چونکە وەک زانراوە، زۆربەی ئەو خەیاڵ و وێنە و شتانەی وەک باکگراوند بۆ ئارەزووی سێکسی و یارمەتیدانی دەستکەوتنی چێژ لەڕێی ماستەربەیشنەوە پەنایان بۆ دەبرێ، لەو بابەتانەن کە دوورن لە بابەتی ڕێگەپێدراو لە پەیوەندییە سێکسییە سروشتییەکان لە ڕووی شێواز و بابەتیشەوە، ئەگەر وێنەی ئەو پراکتیزەکردنە سێکسییە و ئەو شتانەی کە پەیوەندییان پێوەیەتی و لە کاتی ماستەربەیشندا لە خەیاڵ و مێشکی ئەو کەسەدان، بە تەواوەتی لە مێشکیدا چەسپی، ئەوا جۆرێ لە مۆرک پەیداکردن بەو شێوە تایبەتییە ڕوو دەدات خووی پێوە دەگرێ و ئەو کەسە ئەستەمە بتوانی لە ئایندەدا ئەو شێوازە تایبەتییە تێپەڕێنێ، و دەستبەرداری بێ، بەم شێوەیە ئەو کەسە لە کەسێکی ئاساییەوە کە ماستەربەیشنی کردووە، بۆ کەسێکی لادەر دەگۆڕێ، کە تەنیا بە شێوەیەک، یان حاڵەتێکی سێکسیی تایبەتی ئارەزووەکانی تێر دەبن.

بەڵام هەندێک لە توێژەرانی دیکە بڕوایان وایە هیچ کام لەو وێناکردنە فەنتازیاییانەی هاوکاتن لەگەڵ ئەنجامدانی ماستەربەیشن، لە دواڕۆژدا هیچ جۆرە کێشە و ئەستەمییەک بۆ ئەو کەسە لە بواری پەیوەندیی سێکسیدا دروست ناکەن، بەڵام لە ژیانی مێ-دا جیاوازە، دەشێ خووی ماستەربەیشن جۆرێک لە کاریگەریی نیگەتیڤ لە هەندێک لە ژناندا دروست بکات، چونکە

ماستەربەیشن خۆی لە لای مێ کردارێکە تایبەتمەندیی خۆی هەیە، بە زۆری مێ بە تەنیا ماستەربەیشن دەکات و زیاتر لە کوڕان بە نهێنی ئەم کردارە دەکات. مێ بە شێوەیەکی خۆبەخۆ فێری ئەم خووە دەبێ، بە پێچەوانەی کوڕانەوە کە لەڕێی لاساییکردنەوە، یان لە هاوتەمەنەکانیانەوە فێری دەبن، پاشان مێ زیاتر لە نێر ڕووبەڕووی سەرزەنشتکردن و سزادان دەبێتەوە، ئەگەر خێزانەکەی یان کەسێ بەوە بزانێ کە ماستەربەیشن دەکات، لەبەر ئەوە لە کوڕان زیاتر بەدەست دڵەڕاوکێ و هەستکردن بە گوناهەوە دەناڵێنن. سەرباری ئەمانە ناوچەکانی وروژاندن لە مێ-دا زیاترن و تەنیا ئەندامی سێکسی ناگرنەوە، ئەمەش وا دەکات کرداری وروژاندن خێراتر بێ.

تەواوی ئەم فاکتەرانە وا دەکەن کرداری ماستەربەیشن لە مێ-دا پەیوەندییەکی بەتینتری لەگەڵ حاڵەتی دەروونیدا هەبێ، هەروەها ئەم فاکتەرانە وا دەکەن کە شوێنی وروژان و سروشتی ئەو جووڵە وروژێنەرانەی بۆ گەیشتن بۆ ئۆرگازم پەیرەو دەکرێ، هەروەها چۆنێتیی وەڵامدانەوەی مێ بۆ ئەو وروژاندنە، دیاریکراوتر و سنووردارتر بێ لە مێ-دا بەراوردکردن لەگەڵ نێر. شایەنی باسە ماستەربەیشن چەندەها شێواز و ڕێگەی هەیە و تەنیا دەست ناگرێتەوە. ئەم ڕێگە و شێوازانە هەندێجار زۆر سەیروسەمەرەن، ئیدی ئەو کەسە خۆی بە تەنیا ئەنجامی بدات، یان بە هاوبەشی لەگەڵ کەسێک، یان کەسانی دیکەدا بێ. ژمارەیەک لە توێژەرانی ئەم بوارە ئاماژەیان بەوە داوە، لەدوای پشکنینی کلینیکی بۆ هەندێک حاڵەتی پەککەوتن و لادانی سێکسی، تێبینییان کردووە، ئەم وێنە و ڕێگە و شێوازە سەیرانەی هەندێ کەس لە ماستەربەیشندا پەنای بۆ دەبەن، جگە لە دەست، هۆکارن بۆ زۆرێک لە کێشەکانی ژیانی سێکسی،

بەتایبەتی ئەو کێشانەی کە خاوەنەکانیان بەدەست لاوازی و کەمتواناییەوە دەناڵێنن لە ئەنجامدانی کرداری سێکسیدا.

ئەگەر بکرێ پوختەیەک دەربارەی هەڵوێستی زانستی و پزیشکی سەبارەت بە ماستەربەیشن بخەینە ڕوو، ئەوا دەڵێین: ماستەربەیشن لە سروشت و ئامانجەکانیدا، کردارێکی سێکسییە، هەروەها کردارێکی گشتییە و بە دەگمەن کەسێ هەبێ ماوەیەک لە ماوەکانی ژیانیدا ئەنجامی نەدابێ، تەنانەت ئەگەر بۆ جارێکیش بێ. لە ڕووی زانستییەوە تا ئێستا هیچ بەڵگەیەکی باوەڕپێکراو لە بەردەستدا نییە بۆ سەلماندنی دروستیی ئەو بانگەشانەی دەربارەی ماستەربەیشن دەکرێن و هەمیشە هۆشداری بە ئەنجامدەرانی دەدرێ گوایە دەبێتە هۆی تووشبوون بە هەندێ نەخۆشی و حاڵەتی وەک کوێربوون و سیل و لاوازی و شێتی و فێ، بەڵام قووڵبوونەوە لە ئەنجامدانیدا تا ئاستی پێداگری، دەشێ ببێتە هۆی کەمکردنەوەی ڕێژەی بەرهەمهێنانی تۆو، هەروەها توانای ئەنجامدانی سێکس لە هەندێ کەسدا کەم دەکاتەوە، پاشان هەندێ وێنە و خەیاڵی سەیر و نامۆ و شێوازی ئەنجامدانی ماستەربەیشن دەشێ ببنە هۆی دروستبوونی جۆرێ لە سروشت و مۆرکی ناسروشتی لە ژیانی سێکسیدا، کە وا دەکەن شێوازی ئەنجامدانی پەیوەندیی سێکسیی سروشتی لە دواڕۆژدا قورس و ئەستەم بێ، ئەمەش زیاتر لە مێ-دا ڕوو دەدات.

پێشتر کاتێ باسی ژیانی سێکسیمان لە منداڵدا کرد، ئاماژەمان بە ڕای فرۆید و فلایسی هاوکاری دا، کە پێیان وا بوو چەپاندنی وزەی سێکسی، وچانی متبوون لە قۆناغی منداڵیدا کە دەکەوێتە نێوان شەشساڵی تا کاتی نەرزەبوون، خزمەتی مەبەستێک دەکات کە بریتییە لە ڕێگرتن لە بەهەدەربردنی ئەم وزەیە و لەجیاتی کۆکردنەوەی بۆ مەبەستی بەدیهاتنی ئامانجی شارستانیی گرنگ لە دواڕۆژدا. ئاشکرایە ئەو ماستەربەیشنەی مێردمنداڵ لەم

وچانەی تەمەندا ئەنجامی دەدات، ناکرێ بە چەپاندنی وزەی سێکسی و ڕێگرتن لە بەهەدەردانی و کۆکردنەوەی وەسفی بکەین، هەرچەندە ئەو بڕە وزەیەی لەم تەمەنەدا دەچەپێنرێ، زۆر زیاترە لەوەی لەڕێی ماستەربەیشنەوە سەرف دەکرێ. بە هەرحاڵ، ئایا دەکرێ وای دابنێین، ئەو وزە سێکسییەی لە منداڵ و مێردمنداڵ و هەرزەکاردا سەرف دەبێ، وزەی سێکسییان بەهەدەر دەبات و کەمی دەکاتەوە و لێرەشەوە کەمتر بۆ مەبەستی شارستانی بەکاردەهێنرێ؟ وەڵامی ئەم پرسیارە و ئەو لایەنانەش کە فرۆید و فلایسی هاوکاری وروژاندیان، لەو بەشەدا بە وردی باس دەکەین کە تایبەتە بە پەیوەندیی نێوان ژیانی سێکسی و هونەر و داهێنان. لێرەدا ئەوەندە بەسە بڵێین کەمیی وزەی سێکسی، یان کەمبوونی ئەم وزەیە بە شێوەیەک لە شێوەکان، دەشێ تا ئاستێک، یان بە تەواوەتی تواناکانی داهێنان، یان بەشداریکردنی شارستانی لە ژیاندا کەم بکەنەوە لەو کەسانەدا کە بە دەستییەوە دەناڵێنن.

### ئایا ماستەربەیشن سوودی هەیە؟

دەشێ شتێکی سەیر و کتوپڕ بێ پرسیارێکی لەم جۆرە بخەینە ڕوو، "ئایا ماستەربەیشن سوودی هەیە؟"، لە کاتێکدا ئەو ڕاوبۆچوونانەی دەربارەی ماستەربەیشن هەن و دەگوێزرێنەوە، زۆربەیان ئاماژە، یان جەخت لە زیانەکانی دەکەنەوە، بەڵام بەدرۆخستنەوەی زیانەکانی ماستەربەیشن لە شوێنێکدا هەڵوەستەمان پێ دەکات کە ناتوانین زانستییانە لێکدانەوەی بۆ بکەین، ئەویش بریتییە لە سەراپاگیریی ماستەربەیشن لە هەموو کۆمەڵگە و لە هەموو سەردەم و لە هەموو توخمی مرۆییدا بە نزیکی و بێ هیچ ئاوارتەیەک، هەروەها لێکدانەوەی سەرەتای دەرکەوتنی لە قۆناغی زووی منداڵیدا و خێرابوونی لەگەڵ قۆناغە

بەدوایەکداهاتووەکانی گەشەدا. ئەم واقیعە بەرەو ئەو دەرئەنجامەمان دەبەن کە ماستەربەیشن ئامانجی بایۆلۆژیی هەیە و بە شێوەیەک یان پلەیەک و لە یەکێک لە قۆناغەکانی ژیاندا هەر دەبێ ڕوو بدات. دەکرێ بەو شێوەیە وێنای ئەو ئامانجە بکەین کە چەند لایەنێک دەگرێتەوە، وەک هەستکردنی تاک بە جەستەی خۆی و ئامادەکردنی بۆ دواڕۆژ، هەروەها سەرفکردنی بەشێک لەو وزە بایۆلۆژییانەی کە لە بوونیادی تاکدا هەن، هەروەها دەشێ مەبەستێکی دیکەشی هەبێ کە بریتییە لە بەستنەوەی منداڵ بە چواردەور و کۆمەڵگەکەیەوە، چونکە ئەو وێنە و خەیاڵ و بابەتانەی کە مرۆڤ دەوروووژێنن و هانی دەدەن بۆ ماستەربەیشن، لەو دەووربەر و کۆمەڵگەیەوە وەریدەگرێ کە تیایدا دەژی، وزەی سێکسی و ڕازیکردنیشی، بە یەکێک لە گرنگترین پێداویستییە مرۆییەکان دادەنرێ، لەبەر ئەوە قۆرغکردنی لەڕێی ماستەربەیشنەوە و ئەو بابەتانەش کە گرێدراوی ئەم خووەن، دەشێ پەیوەستییەکی بەهێز دروست بکەن لە نێوان تاک لەگەڵ کۆمەڵگە و دەورووبەرەکەیدا. کە دەشێ ئەم مەبەستە بەدی نەهێنرێ ئەگەر ڕازیکردنی ئارەزووی سێکسی و سەرفکردنی وزەی سێکسی تا قۆناغێکی درەنگی گەشە دواکەوت.

لە زۆرێک لە منداڵ و مێردمنداڵاندا تێبینیی ڕوودانی هەندێک حاڵەتی پەشۆکان و پشێویی دەروونی کراوە بەهۆی دەستتێوەردانی باوان لەو ڕەفتارانەی منداڵەکانیان کە پەیوەندییان بە ماستەربەیشنەوە هەیە. هەرچەندە هەندێک لەم نیشانانە دەرئەنجامی دڵەڕاوکێ و ترسی منداڵن لە سزا، بەڵام بە دڵنیایی بەشێک لەو هەڵچوونە دەروونییە نەخوازراوەی لەم منداڵانەدا تێبینی دەکرێ، بەهۆی ڕێگرتنەوەیە لە دەرچوونی ئەو وزە سێکسییەکە پێداگری دەکات لە دەرچوون و ڕازیکردنی منداڵ. ئەم

نیشانانە زیاتر لە ژیانی منداڵ و مێردمنداڵی کوردا تێبینی کراوە. دەشێ هەر لەبەر ئەم هۆکارانە بێ، بەشێک لە ناوەندە نۆژدارییەکان پێیان وایە باشترە دەستتێوەردان لە کرداری ماستەربەیشنی منداڵ و مێردمنداڵاندا نەکرێ، هەندێکیشیان دوورتر دەڕۆن و بانگەشەی ئەوە دەکەن کە نابێ دەستتێوەردان لە پراکتیزەکردنە سێکسییەکانی منداڵدا بکرێ، مادام هیچ زیانێکیان پێ ناگەیەنێ. بەشێک لە زانایانی پەروەردە و سایکۆلۆژیش پێیان وایە باشترە چاوپۆشی لەو ڕەفتارە سێکسییانەی منداڵ و مێردمنداڵ بکرێ، چونکە دەشێ ئەم ڕەفتارانە ڕێگر بن لە بەردەم ڕوودانی چەپاندن کە دەشێ بەهۆیەوە (واتە بەهۆی چەپاندنەوە) چەندەها پشێویی دەروونی و ڕەفتاری لە دواڕۆژدا ڕوو بدەن، بەڵام ناکرێ ئەم ئامۆژگاری و ڕێنماییانە بەبێ خەوشەکانیان وەربگرین، چونکە دەشێ ئەم ڕێگەدانە بە ئەنجامدانی ماستەربەیشن مەترسیی نۆژداری و کۆمەڵایەتیی وای لێ بکەوێتەوە، هیچی کەمتر نەبێ، یان زیاتریش بێ لە مەترسییەکانی کۆتوبەندکردن و سنووردارکردنی ماستەربەیشن و ڕوخسارەکانی دیکەی ڕەفتارە سێکسییەکان لە منداڵ و مێردمنداڵاندا. هەرچەندە گەیشتن بە بڕیاری یەکلاییکەرەوە لەم ڕووەوە کارێکی ئەستەمە، بەڵام گرنگترین خاڵ کە پێویستە باوان دەرکی پێ بکەن، پێداویستیی منداڵ و مێردمنداڵە بە ڕازیکردنی سێکسی، هەروەها هەڵەیە ئەم پێداویستییە بەند بکرێ، یان بچەپێنرێ، یان منداڵ لەسەری سزا بدرێ، یان چاوترس بکرێ و نەهێڵرێ پراکتیزەی بکات، یان هەستکردن بە گوناه لە ناخیدا بچەسپێنرێ. ئەوەی باوان لەم ڕووەوە دەتوانن بیکەن تەنیا بەخشین و فەراهەمکردنی ڕۆشنبیریی سێکسییە بە منداڵەکانیان بە شێوەیەک ئەو زانیارییانە لەگەڵ تەمەنیاندا بگونجێ و هاوسەنگ بێ، هەروەها دەروازە و ڕێگەی دیکەیان بۆ بدۆزنەوە بۆ

سەرفکردنی وزەکانیان، وەک ئەنجامدانی وەرزشە جیاوازەکان و پیادەکردنی ئارەزووە جۆربەجۆرەکانی دی. شایەنی سەرنجە "گالینوس" پزیشکی یۆنانی (سەدەی دووی پاش زایین)، یەکەمین کەس بووە تێبینیی سوودی ماستەربەیشنی کردووە بۆ ڕزگاربوون لە حاڵەتەکانی پەشۆکان و گرژبوون.

## ماستەربەیشن و گوناه و یاسا

بەستنەوەی ماستەربەیشن بە گوناهەوە لە بیروباوەڕە ئایینییەکاندا، بابەتێکی کۆنە، هەربۆیە زۆرجار زاراوەی ئۆنانیزم Onanismبەکار دێ کە بۆ ئۆنان دەگەڕێتەوە لە سەردەمی کۆندا ناوی هاتووە و بە هەڵە لێکدانەوە بۆ ڕەفتاری کراوە، هەر ئەمەشە بووەتە هۆی ڕەتکردنەوەی ماستەربەیشن لە سەرچاوە ئایینییە کۆن و نوێیەکاندا، کە تا ئێستا ماستەربەیشن بە گوناه و خراپە دادەنێن. ئەم باوەڕە بۆ زۆرێک لە خەڵک لە کۆمەڵگەکاندا گوازراوەتەوە، بە کۆمەڵگە هاوچەرخ و لێبوردەکانیشەوە کە زیاتر لە کۆمەڵگەکانی دیکە بایەخ بە کێشە سێکسییەکان دەدەن.

لە لێکۆڵینەوەیەکدا ساڵی ١٩٦٧ لەسەر خوێندکارانی زانکۆ لە هەردوو توخمەکە لە ئەمەریکا، دەرکەوت ٨٢%ی کوڕان و ٣٣%ی کچان ماستەربەیشن دەکەن، ئەوەشیان ئاشکرا کرد، لە هەر سێ کەسییان، دوانییان هەست بە گوناه و دڵەڕاوکێ و نائاسوودەیی دەکەن بەهۆی ئەو کارەوە کە دەیکەن.[٤]

لێکۆڵینەوەیەکی دیکە ئاشکرای کردووە، ئەو هاوسەرانەی ئەم خووە سێکسییەیان ئەنجام داوە و کەسانی دیکەش کە هاوسەرێتییان نەکردووە و ئەم خووەیان ئەنجام داوە، بەڵام وازیان لێ هێناوە، لە کەسانی دیکە و هاوسەرانی دیکە زیاتر هەست بە گوناه و عەیبە دەکەن کە ئەم خووە ئەنجام دەدەن و بەردەوامن لەسەری.

هەستکردن بە گوناه و عەیبە و سەرزەنشتکردنی خۆ، لەو کەسانەشدا ئاشکرا دەبێ کە وەڵامی ئەو پرسیارانە نادەنەوە کە تایبەتە بە ماستەربەیشن لە ژیانیاندا. ئەم هەستکردن بە گوناه و عەیبەیە لە ئەنجامدانی ماستەربەیشن و ترس لەوەی لای کەسانی دیکە ئەمە ئاشکرا ببن، بایەخێکی گەورەی هەیە لە دروستبوونی حاڵەتێک لە دڵەڕاوکێ لە دەروونی زۆرێک لەو کەسانەدا، دەشێ ئەم دڵەڕاوکێیە، مەترسییەکی وا بۆ سەر ژیانی دەروونی و سێکسیی ئەو کەسانە دروست بکات کە مەترسی و کاریگەرییە نێگەتیڤەکانی زۆر زیاتر بن لە مەترسی و کاریگەرییە نێگەتیڤەکانی خودی خووە سێکسییەکە.

هەرچی لایەنە یاساییەکانی ماستەربەیشنە، ئەوا یاسا هیچ سزایەکی بۆ ئەنجامدەرانی ئەم خووە دیاری نەکردووە، تەنیا لەو حاڵەتانەدا نەبێ کە بە شێوەیەکی ئاشکرا، یان شەرمهێن ئەنجام دەدرێ، یان لە کاتێکدا ئەنجامدانی ببێتە هۆی دەستدرێژیکردن بۆ سەر مافی کەسانی دیکە، هەروەک لە حاڵەتی خۆنمایشکردن، یان خۆمەلاسداندا ڕوو دەدات.

## ئیستیحلام

ڕوودانی جۆرێک لە وروروژانی سێکسی لە کاتی خەودا و گەیشتن بە ئۆرگازم بەهۆی ئەم وروروژانەوە و دواجار کۆتاییهاتنی لەڕێی هاویشتنی تۆو، پێی دەوترێ ئیستیحلام، کە دیاردەیەکە پەیوەندیی بە خەوەوە هەیە، بەلام نەخۆش (ئەو کەسەی تووشی حاڵەتەکە دەبێ) کاتێ بەئاگا دێتەوە و لە خەوەکەی بێدار دەبێتەوە، هیچی لە یاد نابێ، تەنیا ساتی تۆوهاویشتنەکەی نەبێ. ئەو کەسە حاشا لەوە ناکات کە خەونی بینیوە، بەلام وەک زۆربەی زۆری خەونەکان، قۆناغی یەکەم و ناوەڕاستی خەونەکە لە یاد دەکرێ. زاراوەی ئیستحلام لە ئاوەزی

زۆربەی خەڵکدا ئاماژەی عەیبە و گوناە و حەرام دەبەخشێ، زۆر کەس سەرزەنشتی منداڵەکانیان دەکەن، هەرچەندە ئیستحلام ورووژانێکی سێکسییە و بێ ویستی مرۆڤ ڕوو دەدات، زۆربەی باوان جەخت لەم جۆرە ئامۆژگارییانە دەکەنەوە بۆ منداڵەکانیان و پێیان دەڵێن دیاردەی ئیستحلام وەک ماستەربەیشن وایە ڕوودانی هەر پەیوەندییەکی سێکسی لە پێش هاوسەرێتیدا دەشێ ببێتە هۆی ڕوودانی نەخۆشیی جەستەیی و ئەقڵی، ئەم جۆرە ئاگادارکردنەوە و تەلقیندانە بە هەرزەکار و گەنجان، دەشێ یارمەتیدەر بن لە دروستبوونی جۆرەها حاڵەتی دڵەڕاوکێ لەو کەسانەدا، هەروەها دەشێ ببێتە هۆی ڕوودانی پلەیەک لە پلەکانی پەککەوتنی سێکسی لە هەندێک کەسدا و هەروەها لە هەندێکی دیکەشدا دەشێ ببێتە ڕێگر لە بەردەم گەیشتن بە ئۆرگازم، یان هاویشتنی تۆودا.

## پەراوێزەکان:

١.ماستەربەیشن Masturbation: لە ڕووی زمانەوانییەوە واتە پراکتیزەکردنی خراپە بەرامبەر خۆت، لە ڕووی سێکسییشەوە، واتە پیسبوون بەهۆی دەستەوە، هەروەها زاراوەی ئۆنانی هەیە بۆ وەسفکردنی هەمان حاڵەت و لە کۆندا بەکار هاتووە، ئۆنانی بۆ ئۆنان دەگەڕێتەوە کە لە سەردەمە دێرینەکاندا ناوی هاتووە، هەندێجار لە ئێستاشدا زاراوەی ئۆنانی بەکار دێت بۆ وەسفکردنی حاڵەتی خۆییە ورووژاندن و چێژبینینی سێکسی لەو ڕێگەیەوە.

لە زمانی کوردیدا زاراوەی دەستپەڕ بەکار دێ بۆ ئەو ڕەفتارەی نێر کە بە دەستی خۆی ئەندامی سێکسی دەورووژێنێ، تا دەگاتە دۆخی هاویشتنی تۆو، بەڵام لەبەر ئەوەی لە ڕووی ئەدەبییەوە بە وشەیەکی جوان دانانرێ، بۆیە بە لامەوە باشتر بوو کە زاراوەی ماستەربەیشن، واتە هەمان وشەی بەکارهێنراو لە زمانی ئینگلیزیدا بەکار بێنم، هەندێ جاریش لە زمانی کوردیدا دەستەواژەی خووە نهێنی بەکار دێ کە بریتییە لە وەرگێڕانی دەستەواژەی (عادة سرية) لە عەرەبییەوە_وەرگێڕ.

٢.لێکۆڵینەوەیەک لەسەر منداڵانی ژمارەیەک دایانگە لە ئەمەریکا ئەنجام درا کە ٢٨٠ منداڵی کوڕ و ٣٠٠ منداڵی کچی گرتەوە، کە تەمەنیان لە نێوان دوو بۆ پێنج ساڵدا بوو. تێبینی کرا ٣٤%ی کوڕان ٢١%ی کچان ماستەربەیشن دەکەن، بەڵام لێکۆڵینەوەکە هیچ وەسفێکی کرداری ماستەربەیشنی نەکردووە. لە لێکۆڵینەوەیەکی دیکەدا لە ئەڵمانیا کە لەسەر هەزار منداڵی کوڕ و کچ کە تەمەنی زۆربەیان لە نێوان پێنج بۆ حەوت ساڵ بوو، ئەنجام درا، تێبینی کرا، ٥٢%یان ماستەربەیشن دەکەن. لەوانەیە جیاوازیی نێوان دوو لێکۆڵینەوەکە تەنیا لەوەدا بێ کە توێژەرانی دوو لێکۆڵینەوەکە چی بە ڕەفتاری ماستەربەیشن دادەنێن.

٣.لە لێکۆڵینەوەیەکی دیکەدا ساڵی ١٩٧٦ کە لە لایەن میللەر و لایفی توێژەرەوە ئەنجام درا، تێبینی کرا ١٠٠%ی کوڕان و ٨٥%ی کچان ماستەربەیشن دەکەن.

٤.لێکۆڵینەوەیەک کە لە ساڵی ١٩٧٣دا گرینبرگ و ئارخمبولت لەسەر هەرزەکارانی تەمەن ١٣ تا ١٩ ئەنجامیان دا، بۆیان دەرکەوت ٤٠%ی کوڕان و ٤٨% ی کچان ددانیان بەوەدا نا کە بەهۆی ئەنجامدانی ماستەربەیشنەوە هەست بە گوناه دەکەن، بەڵام ١٩%یان وتوویانە بەهۆی ئەنجامدانی ماستەربەیشنەوە بە هیچ جۆرێک هەستیان بە گوناه نەکردووە.

# بەشی دوانزەیەم

# هێزی سێکسی

- هێزی سێکسی لە منداڵدا
- هێزی سێکسی لە قۆناغی دوای منداڵی
- هێزی سێکسی لە گەورەییدا
- ئاستی هێزی سێکسی
- جیاوازیی ئەم هێزە لە یەک کەسدا
- جیاوازی لەنێو تاکەکاندا
- جیاوازی لە ڕووی ڕەگەز و شارستانییەتەوە
- شەبەق

## هێزی سێکسی

چەندەها زاراوەی دیکە هەن کە وەک هاوواتای هێزی سێکسی بەکار دێن، ئەم زاراوەیە بەیناوبەین بۆ گوزارشتکردن لە گۆشەنیگایەکی دیاریکراو بەکاردێ کە پەیوەندیی بە لایەنێک لە لایەنەکانی ژیانی سێکسییەوە هەیە، لەو زاراوانەی کە لە بواری نۆژداری یان گشتیدا بەکار دێ، غەریزەی سێکسییە Sex Instinct، هەروەها پاڵنەری سێکسی Sex Drive، ئارەزووی سێکسی Sex Desire، وەڵامدانەوەی سێکسی Sex Reponse ، ئەنجامدانی سێکسی Sex Performance و وزەی سێکسی یان لیبدۆ Libod.

ئەگەر لەم زاراوانە ورد بینەوە، بۆمان دەردەکەوێ چەند بناغەیەک پێکەوە کۆیان دەکاتەوە، بۆ نموونە (غەریزە و وزە و پاڵنەر) بناغەیەکی بایۆلۆژییان هەیە، (ئارەزووی سێکسی) بناغەیەکی دەروونیی هەیە و (ئەنجامدانی سێکسی و وەڵامدانەوەی سێکسی) بناغەیەکی فسیۆلۆژییان هەیە. لەگەڵ ئەو جیاوازییە ئاشکرایەی لەنێوان ناوەڕۆکی ئەم زاراوانەدا هەیە، بەڵام هەموویان لایەنی جیاوازی یەک پرۆسەی تێروتەواو پێک دێنن کە پرۆسەی سێکسییە بە مانا گشتگیرەکەی.

هێزی سێکسی، بە یەکێک لە ڕوخسارەکانی ئەم پرۆسەیە دادەنرێ هەروەک لە وەڵامدانەوەی سێکسیدا ڕوو دەدات، کە پرۆسەیەکی فسیۆلۆژییە، هەروەها لە ئەنجامدانی سێکسیدا کە ئەویش هەر پرۆسەیەکی فسیۆلۆژییە، بە لایەنی کەمەوە لە ڕووی پێکهاتە ڕاستەوخۆکانییەوە، بەڵام ئەوەی ئاشکرایە ئەم هێزە سێکسییە بە ئاماژە فسیۆلۆژییەکانییەوە بە تەنیا کار ناکات، بەڵکو

لە ڕەگوڕیشەیدا پشت بە وزە یان غەریزەی سێکسی دەبەستێ، کە هێزێکی بایۆلۆژیی سەرەکیی شاراوەیە لە بوونەوەری زیندوودا، هەروەها پشت بە بناغەی دیکەی وەک بناغەی سۆزداری و دەروونی دەبەستێ و دەیوروورژێنێ و پاڵی پێوە دەنێ بۆ بەدیهاتن. لەبەر ئەوە هەر توێژینەوەیەک لە هێزی سێکسیدا، دواجار پەلکێشمان دەکات بەرەو زەروورەتی توێژینەوە لە تەواوی ئەو فاکتەرە کارلێکردوو و یارمەتیدەر و کۆبووانەی کە لە ڕوودانی پرۆسەی سێکسیدا هاوبەشن، ئەو فاکتەرانەش بریتین لە فاکتەرە بایۆلۆژی و فسیۆلۆژی و دەروونییەکان.

بەکارهێنانی زاراوەی (هێزی سێکسی) لەم بوارەی توێژینەوەدا، وا پێویست دەکات لەڕێی پلەی هێزی بەکارهێنانییەوە لە کرداری ئەنجامدانی سێکسیدا، دیاری بکرێ، یان بە شێوەیەکی وردتر، هێزی سێکسی پێوەری وەڵامدانەوە ڕاستەقینەکانە لە کاتی پرۆسەی سێکسیدا، ئەو وەڵامدانەوانەی کە بەهۆیانەوە تاک بڕیار دەدات لەسەر ئەوەی پرۆسەیەکی سێکسی بەهێزە یان لاوازە، ئەویش بەپێی چەمکی هێز و لاوازی لە ئەزموونی تایبەتی خۆیدا و بە بەراوردکردن لەگەڵ ئەزموونی کەسانی دیکەدا. ئاشکرا هێزی سێکسی لە ئەزموونی کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە جیاوازە، هەروەها بەپێی قۆناغەکانی تەمەنیش گۆڕانی بەسەردا دێ، لە تەنیا کەسێکسیشدا لە بارودۆخە جیاوازەکاندا بەپێی شوێن و کات و ئەو هاوبەشە سێکسییەی کە کردارەکەی لەگەڵدا دەکات و هاندەر و وروژێنەرەکان، جیاوازە، هەروەها هێزی سێکسی بەپێی حاڵەتی جەستەیی و دەروونیی تاک لەو کاتەدا، دەگۆڕێ. تەواوی ئەم فاکتەرانەش هاوبەشن لە دیاریکردنی وەڵامدانەوەی سێکسی و چۆنێتیی ئەنجامدانی ڕاستەقینەی کردارەکە لە هەر جارێکدا. بەهۆی ناجێگیریی ئەم فاکتەرانە لە ئاستێکی دیاریکراوی کاراییدا، پرۆسەی سێکس لە یەک کەسدا لە سنووری جیاواز لە

هێزی ئەنجامدانی سێکسیدا گۆڕانی بەسەردا دێ. ئەم گۆڕانە لە ژیانی ئەو کەسانەدا زیاتر تێبینی دەکرێ کە ژیانی گشتی و تایبەتییان لایەن و کەناڵی جیاوازی هەیە بۆ گوزارشتکردن و بایەخپێدانەکانیان لە زیاتر لە یەک بواردا دابەش بووە، بەڵام ئەوانەی ژیانی گشتی و تایبەتییان لە سنوورێکی دیاریکراودا سنووربەند بووە، ئەوا گۆڕان لە ئاستی هێزی سێکسییاندا، ئەگەر ڕوو بدات، لە سنوورێکی بەرتەسکدا ڕوو دەدات.

لێرەدا پوختەی ئەو تێبینی و لێکۆڵینەوە و گێڕانەوانە دەخەینە ڕوو کە دەربارەی هێزی سێکسی و فاکتەرەکانی، کار دەکەنە سەر دروستبوونی ئەم هێزە، دەستکەوتوون.

### هێزی سێکسی لە منداڵدا

هیچ گومانی تیادا نییە ژیانی سێکسی لە منداڵدا لە سەرەتای تەمەنەوە دەست پێ دەکات. بوونی ڕوخسارەکانی ئەم ژیانە بە شێوەیەک لە شێوەکان، بوونی وزەی بایۆلۆژیی شاراوە بۆ ئەنجامدانی کرداری سێکسی، ئاشکرا دەکات، بەڵام وەک پێشتر لە بەشی تایبەت بە باسکردنی ژیانی سێکسی لە منداڵدا ئاماژەمان پێ دا، ڕوخسارەکانی ژیانی سێکسی لە منداڵدا فرەجۆرن، ناوچەی سێکسی لە منداڵدا لە ڕووی ئەندامییەوە دیاری ناکرێ، تەنیا لە ماوەیەکی درەنگی گەشەی منداڵدا نەبێ، واتە کاتێ منداڵەکە گەشە دەکات، ئینجا کۆئەندامی سێکسیی دەبێتە یەکێک لە ناوچەکانی گرنگیپێدانی سێکسی. لەبەر ئەوە ئەستەمە بتوانرێ بە وردی و بە شێوەیەکی بابەتییانە هێزی سێکسی لە منداڵدا پێوانە بکرێ، سەرەڕای ئەستەمیی تێبینیکردنی ئەم هێزە لە منداڵدا، منداڵ خۆیشی ناتوانێ وەسفی پلەی هێزی سێکسیی خۆی بکات، هەروەها ئێمە ناتوانین هێزی سێکسی لە منداڵ یان مێردمنداڵ پێوانە بکەین بە بەراورد لەگەڵ پێوانەکردنی ئەم هێزە لای

کەسانی هەرزەکار و کەسانی گەورە و پێگەیشتوو، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، کۆمەڵێک ئاماژە هەن کە ئەوە ئاشکرا دەکەن، منداڵ وزە یان پاڵنەری سێکسیی هەیە و ئەمەش لەو ڕەفتارە سێکسییانەدا دەردەکەوێ کە لە قۆناغێکی زووی تەمەندا ئەنجامیان دەدات و پێداگرییان لەسەر دەکات، هەندێجار بەم حاڵەتانە دەوترێ سێکسی زوو Sex precocity، هەرچەندە ئەم دیاردەیە ئاماژە دەدات بەکاوەخۆ گەشەکردنی منداڵ لە ڕووی سێکسییەوە و ڕوودانی گەشەیەکی هاوشێوە لە گەورەییدا، بەڵام مەرج نییە لە هەموو بارێکدا وا بێ، چونکە دەشێ کرانەوەی زووی سێکسی منداڵ تەنیا لێشاوێکی سەرپێیانە و زووی ڕەفتاری سێکسی بێت لە ژیانی تاکدا.

### هێزی سێکسی لەدوای قۆناغی منداڵی

ئەو بناغەیەی توێژەران لە دیاریکردنی هێزی سێکسیدا پێشتی پێ دەبەستن، لە کچ و کوڕدا جیاوازە، ڕشتنی یان هاویشتنی تۆو لە پیاودا و ئۆرگازم لە ژندا بە بناغە دادەنێن. ژمارەی ئەو جارانەی کە تۆوهاویشتن لە پیاودا و ئۆرگازم لە ژندا ڕوو دەدات بە پێوەری هێزی سێکسی دادەنێن. هەرچەندە ئەم بناغەیە بۆ پێوانەکردنی هێزی سێکسی سەرنجێک دەربارەی هێزی پاڵنەر و وەڵامدانەوەی سێکسی لە ژن و پیاودا ئاشکرا دەکات، بەڵام لە هەمان کاتدا بە پێوەرێکی ڕاستگۆ دانانرێ، نە بۆ هێزی پاڵنەری سێکسی و نە بۆ هێزی ئەنجامدانی کرداری سێکسی، چونکە دەشێ تۆوهاویشتن، هەروەها ئۆرگازمیش، ڕوو بدەن بەبێ بوونی هیچ هێزێکی گەورەی پاڵنەر.

هەرچەندە شارەزایان بەئاگان لە پشتبەستن بەو پێوەرانەی کە هێزی سێکسییان پێ پێوان دەکرێ، بەڵام بەگشتی ئۆرگازم لە ژندا

و تۆوهاویشتن لە پیاودا، بە بناغەیەکی گرنگ بۆ پێوانەکردنی هێزی سێکسی دادەنرێن کە ناکرێ فەرامۆش بکرێن.

ئەمانە و هاوکات پێویستە ئاماژە بەوە بدەین، ناوەندی تەمەن کە تۆوهاویشتنی لە کوڕدا تیادا ڕوو دەدات (بەپێی لێکۆڵینەوەکەی کینزی) ١٣-١٤ ساڵە، لێکۆڵینەوە تازەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە لە کۆمەڵگە نوێکاندا زووتر لەم تەمەنە ڕوو دەدات، لە ناوچە گەرم و لەو کۆمەڵگەیانەشدا کە کەمتر شارستانین، زووتر ڕوو دەدات. هەرچی ئۆرگازمە ناوەندی تەمەن بۆ ڕوودانی لە کچدا (بەپێی لێکۆڵینەوەکەی کینزی) تەمەنی بیست ساڵە و لە کۆمەڵگە هاوچەرخ و سەرەتایی و گەرمەکانیشدا، لە خوار ئەم تەمەنەشەوە ڕوو دەدات. لەبەر ئەوەی پەیوەندییە سێکسییەکان لە کچ و کوڕدا لەدوای پێگەیشتن، وەک یەک و بە یەک ئاراستە و لە یەک کاتدا ڕوو نادەن، توێژەران دووبارەبوونەوەی کرداری ماستەربەیشن لە کچ و کوڕدا بە ئاماژەیەکی دیکە دادەنێن بۆ هێزی سێکسی لە قۆناغە جیاوازەکانی تەمەندا. کنزی لە لێکۆڵینەوەکەیدا دەربارەی ژیانی سێکسی لە نێر و مێدا، بە وردی دەربارەی ئەم بابەتە قسەی کردووە، هەروەها لێکۆڵینەوەکەی بابەتی تۆوهاویشتن لە نێر و ئۆرگازم لە نێر و مێدا لەنێو هاوسەران و ئەوانەش کە هاوسەرێتییان نەکردووە، لەخۆ دەگرێ، هەروەها باسی ژمارەی ئەو جارانە دەکات کە هاوسەران لە قۆناغە جیاوازەکانی تەمەندا سێکسی تەواو دەکەن. ئەم لێکۆڵینەوەیە ئاشکرای دەکات، ژمارەی جارەکانی تۆوهاویشتن لە نێردا لە تەمەنی نێوان چواردە ساڵی بۆ سی ساڵی هەفتەی سێ جار زیاترە، پاشان هێدی هێدی ژمارەی ئەم جارانە دێتە خوارەوە و لە تەمەنی چلوشەش ساڵیدا دەبێتە هەفتەی دوو جار و لە تەمەنی شەست ساڵیدا دەبێتە هەفتەی جارێک یان کەمتر، بەڵام لە ژندا بەپێی لێکۆڵینەوەکەی کنزی، مەرج نییە ژمارەی جارەکانی گەیشتن بە ئۆرگازم ئاماژە بێت بۆ

هێزی سێکسی، لەو لێکۆڵینەوەیەدا دەرکەوتووە تەنیا ٥٠%ی ژنان لە تەمەنی بیستوپێنجساڵیدا ئەوانەی کە شوویان کردووە، ددانیان بەوەدا ناوە کە بە ئۆرگازم دەگەن و لە ٨٠%ی ژنان لەم تەمەنەدا کە شوویان نەکردووە ددانیان بەوەدا ناوە کە هەستیان بە ڕوودانی ئۆرگازم کردووە. سەبارەت بە ژمارەی جارەکانی دووبارەبوونەوەی ئۆرگازم لە ژن و پیاودا کە هاوسەرێتییان نەکردووە، هەروەها ئەوانەش کە هاوسەرێتییان کردووە، لێکۆڵینەوەکەی کنزی ئاماژە دەدات، ئەو ژنانەی شوویان نەکردووە ئەگەری گەیشتنیان بە ئۆرگازم لە نیو جار لە هەفتەیەکدا کەمترە (واتە دوو هەفتە جارێ)، ئەمەش بە درێژایی ژیانی مێیەتی کە لە تەمەنی ١٥ەوە دەست پێ دەکات و تا ٦٠ ساڵی درێژ دەبێتەوە، بەڵام لەو ژنانەدا کە شوویان کردووە، ئەوپەڕی ناوەندی گەیشتنیان بە ئۆرگازم دوو جار و نیوە لە هەفتەیەکدا و لە تەمەنی شەست ساڵیدا دەبێتە نیو جار لە هەفتەیەکدا (واتە دوو هەفتە جارێ)، بەڵام لە پیاوانی ڕەبەندا، واتە ئەوانەی ژنیان نەهێناوە، ئەم ڕێژەیە لەگەڵ نەرزەبووندا دەگاتە دوو جار و نیوە لە هەفتەیەکدا، پاشان بە گەیشتن بە تەمەنی پەنجا ساڵی، ئەم ڕێژەیە دێتە خوارەوە و دەبێت بە هەفتەی یەک جار، لەو پیاوانەشدا کە ژنیان هێناوە، لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا سێ جار و نیوە لە هەفتەیەکدا و دواتر ڕێژەکە دێتە خوارەوە بۆ یەک جار ئۆرگازم لە هەفتەیەکدا کاتێ تەمەنی دەگات بە پەنجاوپێنج ساڵ.

سەبارەت بە ناوەندی ڕوودانی پەیوەندیی سێکسی لە نێوان هاوسەراندا، وستۆف Westoff لە ساڵی ١٩٧٤دا لێکۆڵینەوەیەکی ئەنجام دا، لەم لێکۆڵینەوەیەدا وستۆف بەراوردکارییەکی لە نێوان ڕێژەکانی ساڵی ١٩٦٥ و ١٩٧١دا، بەم شێوەیە ئەنجام داوە: لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا ئەوپەڕی ڕێژەی جووتبوون لەنێو

هاوسەراندا ١٢ جارە لە مانگێکدا، هێدی هێدی ئەم ڕێژەیە بۆ هەشت جار لە مانگێکدا دێتە خوارەوە. لێکۆڵینەوەکە هیچ جیاوازییەکی لە نێوان نموونە وەرگیراوەکانی ساڵی ١٩٦١ لەگەڵ ساڵی ١٩٧٠ بەدی نەکرد، پاشان ئەم ڕێژەیە لەنێو گرووپی ساڵی ١٩٧٠دا هێدی هێدی هاتووەتە خوارەوە و لە تەمەنی بیست و دوو ساڵیدا بووە بە هەشت جار و نیو، لەنێو گرووپی ساڵی ١٩٦٥یشدا شەش جار و نیو بووە، دواتر بە گەیشتن بە سیودوو ساڵی لەنێو گرووپی ساڵی ١٩٧٠ ئەم ڕێژەیە بووە بە هەشت جار لە مانگێکدا و لەنێو گرووپی ١٩٦٥یشدا بووە بە کەمتر لە حەوت جار لە مانگێکدا. بە گەیشتن بە تەمەنی چلوپێنج ساڵی لەنێو هەردوو گرووپی ساڵی ١٩٧٠ و ١٩٦٥ ڕێژەکان بۆ پێنج جار لە مانگێکدا هاتووەتە خوارەوە.

لێکۆڵینەوەکە ناوەندێکی گشتی مانگانەی بۆ هەموو تەمەنەکان بەم شێوەیە خستە ڕوو: (لەنێو ١٩-٤٥) ٦.٨ جار لە مانگێکدا بۆ گرووپی ساڵی ١٩٦٥ و ٨.٢ جار بۆ گرووپی ساڵی ١٩٧٠. لەم ئەنجامەوە زیادبوونێکی ئاشکرا لە ژمارەی جووتبوونەکانی نێوان هاوسەران و لە چەند ساڵی دوای ساڵی ١٩٦٥ بەدی دەکرێ، لەوانەیە ئەمەش ڕەنگدانەوەی بایەخپێدان بێ بە مەسەلە سێکسییەکان زیاتر لەوەی ڕەنگدانەوەی واقعی هێزی سێکسی بێت لەنێو ئەو کەسانەدا کە لەو ماوە زەمەنییەدا سێکسییان کردووە.

### هێزی سێکسی لە گەورەییدا

ئەو لێکۆڵینەوانەی کە ئاماژەمان پێ دان، ئاشکرای دەکەن، هێزی سێکسی بە شێوەیەکی تێبینیکراو لەدوای نەرزەبوون و لە ماوەی قۆناغی هەرزەکاری و بیستەکانی تەمەن و تا گەیشتن بە قۆناغە پێشکەوتووەکانی تەمەن، کەم دەبێتەوە.

ئەم هاتنە خوارەوەیە لە ناوەندی هێزی سێکسیدا بە شێوەیەکی کاوەخۆ، واتە هێدی هێدی ڕوو دەدات و تاک لەو ماوە زەمەنییە دووروودرێژەدا بە شێوەیەکی دیار تێبینی ناکات، بەتایبەتی ئەم داکشانە لە هێزی سێکسیدا هاوکاتە لەگەڵ دابەزینی ئاستی چالاکییە جیاوازەکانی دیکەی ژیانی ڕۆژانەی تاک، بەتایبەتی چالاکییە جەستەییەکان.

بەڵام تاک دەشێ بگات بە ئاستێکی ئەم داکشان و هاتنەخوارەوەیە لە هێزی سێکسیدا کە وای لێ بکات هەست بە شکستی و پەککەوتن بکات، بەتایبەتی لە کاتێکدا ئەگەر ئارەزووی سێکسیی هەبوو، بەڵام توانای وەڵامدانەوە و ئەنجامدانی کرداری سێکسی ڕاستەقینە و سەرکەوتووی نەبوو. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، تەمەنێکی یەکلاییکەرەوە لە مرۆڤدا، بە ژن و پیاوەوە، نییە کە وا دابنرێ هێزی سێکسی بە تەواوەتی نامێنێ و ئیدی ئەو کەسە هەست بە هیچ هێزێکی سێکسی ناکات. لە گێڕانەوە و قسە و ددانپیادانانی زۆر کەسەوە، ئەوە ئاشکرا بووە کە ئەم هێزە سێکسییە بە شێوەیەکی سەرکەوتوو تا تەمەنێکی زۆر گەورە لە هەندێ خەڵکدا بەشێکی هەر دەمێنێتەوە.

بۆ پشتیوانیی ئەم قسەیە، کاپتن کوک کاتێ زیارەتی پادشا تونجا لابیتاکاکا Lapetakakaی دووەم دەکات کە تەمەنی هەشتا ساڵە، دەڵێ: ئەم پادشایە بەوە ناسراوە کە پێی وا بووە، یەکێک لە ئەرکەکانی وەک پادشا ئەوەیە پەردەی کچێنیی هەر کچێ کون بکات، کە نەرزە دەبێ. کوک دەڵێ ڕۆژانە ٨-١٠ جار ئەم ئەرکەی خۆی بەجێ هێناوە، بەڵام ڕاستییەکان دەربارەی شێواز و چۆنێتیی ئەنجامدانی سێکس و هێزی سێکسی لە کەسانی بەتەمەندا جیاوازە. ئەم نموونە شازەی ئەم پادشایە و هەندێ نموونەی دیکە کە باس دەکرێن، لە زیادەڕەوی بەدەر نین. بەگشتی قۆناغی چوون بەتەمەندا لای زۆربەی خەڵک هاوکات

لەگەڵ کۆمەڵێک گۆڕانکاری کە هێدی هێدی لە وەڵامدانەوە و چۆنێتیی سێکسکردندا ڕوو دەدەن و سەرجەمیان بە ئاڕاستەی دابەزین و داکشاندا دەڕۆن، ئەم گۆڕانکارییانە بەم شێوەیە کورت دەکەینەوە: پیاوی بەتەمەن چووکی ڕەپ دەبێ، بەڵام پێویستی بە کاتێکی زیاتر دەبێ بەراورد لەگەڵ پیاوێکی گەنجدا کە تەنیا پێویستی بە چەند چرکەیەکە بۆ ڕەپبوون. لە کاتی ڕوودانی ڕەپبوونیشدا پیاوی بەتەمەن دەتوانێ بۆ ماوەی زیاتر لەو بارەدا بمێنێتەوە، بەر لەوەی بە ئۆرگازم بگات و تۆو بڕێژێ، بەڵام ئەگەر بەر لە گەیشتن بە ئۆرگازم چووکی نیشتەوە، ئەوا ئەو ئەگەرە زاڵە کە بە ئەستەم بتوانێ سەرلەنوێ ڕەپبوون بەدەست بێنێتەوە. سەرباری ئەمانە، ئەو گۆڕانکارییە فسیۆلۆژییانەی کە بە شێوەیەکی ئاسایی لە تورەکەی گوندا ڕوو دەدەن (وەک هەستانەوەیان و پڕبوونیان و دەردانی ئەو شلەیەی کە بەر لە تۆوهاویشتن دەڕێژرێ)، هەموو ئەمانە لە وچانی ڕەپبوون لە پیاوی بەتەمەندا نامێنن، یان کەم دەبنەوە، بەڵام زۆربەی زۆری گۆڕانە فسیۆلۆژییەکان لە قۆناغی تۆوهاویشتندا ڕوو دەدەن، چونکە قۆناغی تۆوهاویشتن و ئەو هەستەی ئەو پیاوە هەیەتی، واتە حەتمییەتی تۆوهاویشتن، دەشێ پێکەوە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا ڕوو بدەن، یان هەر ڕوو نەدەن، ئەمەش وا لە پیاو دەکات هەست بکات تۆوهاویشتن و گەیشتن بە ئۆرگازم هەر یەک شتە، یان یەک قۆناغە. لە کاتی ڕوودانی تۆوهاویشتندا، گرژبوونی ماسوولکەیی کەمترە و تۆویش بە هێزێکی کەمتر بە لێشاو دێ، هەرچی قۆناغی حەوانەوەیە واتە خاوبوونەوە، ئەوا لە پیاوی بەتەمەندا درێژەدەکێشێ، زۆربەی پیاوان لە پەنجاکانی تەمەندا ناتوانن بەر لە تێپەڕبوونی ١٢-٢٤ سەعات لەدوای تۆوهاویشتن، جارێکی دیکە بچنەوە قۆناغی ڕەپبوون، هەروەها ئارەزووشیان بۆ دەستکەوتن و گەیشتن بە ئۆرگازم کەم دەکات. ئۆرگازم لە

پیاوانی بەتەمەندا کەم ڕوو دەدات، چونکە دەشێ تەنیا چێژ لە ئەنجامدانی کردارە سێکسییەکە ببینن، بێ ئەوەی بە لایانەوە پێویست بێ هەموو جارێ تۆو بڕێژن، بەڵام ئەگەر بە ئۆرگازم بگەن، ئەوا چێژی زیاتر دەبینن.

هەر کە ئۆرگازم ڕووی دا، بەدوایدا قۆناغی حەوانەوە، یان خاوبوونەوە دێ کە بەدوایدا قۆناغی نیشتنەوەڕوو دەدات، کە لە کەسی بەتەمەندا خێراتر ڕوو دەدات و دووروودرێژتر دەبێ بەراورد لەگەڵ کەسێکی گەنجدا، هەروەها هەروەک پێشتر وتمان سەرلەنوێ هەستانەوە و ڕەپبوونی ڕاستەوخۆش دیسانەوە قورسە.

هەرچی توانستی سێکسی ژنە، ئەوا ئەویش وەک پیاو لەگەڵ چوون بەتەمەندا گۆڕانی بەسەردا دێ. ئەم گۆڕانە لەگەڵ تەمەنی نائومێدی و بەتایبەتی لە پەنجاکانی تەمەن و دواتردا، دەست پێ دەکات. ئەوەی ڕوو دەدات لەم تەمەنەدا بە شێوەیەکی خاوتر لە تەمەنی گەنجێتی دەردراوەکانی ناوچەی زێ دەڕێژرێن و ئەو ناوچەیە کەمتر تەڕ و لینج دەبێ، لەوانەیە ٤-٥ دەقیقە بخایەنێ، لە کاتێکدا لە کچانی گەنجدا تەنیا ١٥-٣٠ چرکەی پێ دەچێ. سەرباری ئەوەی بڕی ئەو دەردراوانە لە ژنی بەتەمەندا کەمترە و ناوچەی زێ-ش ناکرێتەوە، یان درەنگتر دەکرێتەوە بەراورد بە پێشتر، لەگەڵ ئەوەدا کە ئۆرگازم لە ژندا لەم تەمەنەیشدا ڕوو دەدات، بەڵام بەو هێز و گوڕ و تینەوە ڕوو نادات کە لە گەنجێتیدا ڕووی داوە، هەروەها جیاوازیی دیکە هەیە، وەک ڕوودانی ئەو گرژبوونە ماسوولکەییانەی کە هاوکاتن لەگەڵ ڕوودانی ئۆرگازم، ژمارەیان کەمتر دەبێ و توندی و هێزیشیان خاوتر دەبێ، هەروەها قۆناغی خاوبوونەوە لە ژندا، هەروەک پیاو و بگرە خێراتریش ڕوو دەدات، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، ژن لە تەمەنی گەورەییشدا دەتوانێ چەند جارێ بە ئۆرگازم بگات،

هەروەک پیاو، تەمەنێکی یەکلاییکەرەوەی دیاریکراو نییە بۆ نەمانی ئۆرگازم بە شێوەیەکی تەواو.

بەم شێوەیە ڕای زانستیی باو، ئاماژە بەوە دەدات، پرۆسەی چوون بەتەمەندا، لە هەردوو توخمەکەدا، تەنیا هۆکار نییە بۆ ڕوودانی پەککەوتنی سێکسی، هەرچەندە پرۆسەی هاتنەخوارە یان داکشان لە ژیانی سێکسیی ژندا خێرایی کەمترە و کەمتریش ئاشکرایە، بەراورد لەگەڵ هەمان پرۆسە لای پیاو و لە هەمان تەمەنیشدا.

## مەودای هێزی سێکسی

هەروەک لە ئەنجامدانی کردارە سێکسییە جیاوازەکانەوە دەردەکەوێ، هێزی سێکسی مەودایەکی جیاواز و بەرفراوانی هەیە. ئەوانەی لە نزمترین ئاستی ئەم هێزەدان، ئەو کەسانەن کە هێزی سێکسییان لاوازە، یان بە تەواوەتی نییانە، تا ئەو ڕادەیەی وا هەست دەکرێ هێزی سێکسییان هەر نییە، بە پێچەوانەی ئەمانەوە، کەسانێک هەن خاوەنی هێزێکی سێکسیی نائاسایین لە ڕووی توانا و دووبارەکردنەوەوە.

هێزی سێکسی تەنیا لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە جیاواز نییە، بەڵکو لە کەسێکیشدا لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دیکە دەگۆڕێ و لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دیکە جیاوازە و هەروەها بەپێی ئەو هاوبەشە سێکسییەش کە کردارەکەی لەگەڵ ئەنجام دەدرێ، دیسانەوە ئەم هێزە سێکسییە دەگۆڕێ و جیاواز دەبێ.

## جیاوازیی ئەم هێزە لە یەک کەسدا

هیچ کەسێک ناتوانی بە شێوەیەکی جێگیر و دیاریکراو پارێزگاری لە هێزی سێکسیی خۆی بکات، هەر کەسێک توانایەکی تایبەتی خۆی هەیە لە هێزی سێکسیدا، بەڵام دەرخستن و

کارپێکردنی ئەم هێزە سێکسییە زۆرجار کەم دەکات، ئەویش بەهۆی کۆمەڵێک فاکتەری جەستەیی و دەروونییەوە، یان بەهۆی زیادەڕۆییکردن لە ئەنجامدانی سێکسدا، یان بەهۆی نەبوونی حەز و ئارەزووی پێویست بۆ سێکسکردن و چەندەها فاکتەری دیکە، هەروەها هەندێجار دەشێ ئەم هێزە سێکسییە بەرز ببێتەوە ئەگەر وروژێنەر و هاندەر و چالاککەرەوە هەبن کە ئەم ئارەزووە بەهێز بکەن و وەڵامدانەوەی سێکسی چالاک بکەن و پاڵپشتیی ئەنجامدانی سێکسەکە بکەن.

**جیاوازی لە نێوان تاکەکاندا**

جیاوازییەکی بەرفراوان لەنێو تاکەکاندا هەیە، بە جۆرێ لە هەندێ کەسدا هێزی سێکسی ئەوەندە لاوازە کە نزیک دەبێتەوە لە پەککەوتنی تەواو، بەڵام لە هەندێ کەسی دیکەشدا لە هەردوو ڕەگەزەکەدا ئەم هێزە ئەوەندە بەهێزە، دەگاتە ئاستی شەبەقی. ئەم جیاوازییە بەپێی قۆناغی تەمەن و کات و بارودۆخی جیاواز دەگۆڕێ، بەڵام بۆ ماوەیەکی زەمەنیی درێژ ڕەفتاری سێکسیی ئەو کەسەی پێ جیادەکرێتەوە.

لەو چیرۆکانەی دەربارەی جیاوازیی هێزی سێکسی دەگێڕنەوە، دەڵێن کانت-ی فەیلەسووف لە ژیانیدا لەگەڵ تەنیا یەک ژندا سێکسی نەکردووە، بەڵام سیمنون Simenonی ڕۆماننووس دەگێڕنەوە لە ماوەی ژیانیدا لەگەڵ دە هەزار ژن سێکسی کردووە، واتە هەر ٥٠ سەعات جارێ لەگەڵ ژنێکدا بووە.

هەروەها دەڵێن خاتوو دوبۆیس Dubois کە بەر لە شۆڕشی فەرەنسی ژیاوە، فەهرەستێکی بۆ ناوی ئەو پیاوانە دروست کردووە کە لە ماوەی بیست ساڵدا لەگەڵیاندا خەوتووە و ژمارەیان گەیشتووەتە ١٦.٥٢٧ پیاو، واتە ڕۆژی سێ پیاو.

ژنی ئەو تاوانبارەش کە بە خنکێنەرەکەی بۆستن ناسرابوو، دەڵێ: "مێردەکەم ڕۆژی نۆزدە جار سێکسی لەگەڵدا کردووم"، لە کاتێکدا بەگشتی زۆربەی پیاوان هەفتەی یەک جار لەگەڵ ژنەکانیاندا سێکس دەکەن. دەربارەی خاتوو کاترینی ئیمپراتۆرییەتی مەزنی ڕووسیا، دەگێڕنەوە، کە بەردەوام وتوویەتی ڕۆژی شەش جار سێکس بکەن و خۆیشی بەڕاستی وای کردووە. دەشێ هەندێ لەم نموونانە شاز بن و هەندێ لەم چیرۆکانە زیادەڕۆییان تیادا بکرێ، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هێزی سێکسی لەنێو تاکەکاندا جیاوازیی هەیە. هەندێجار کاتێک تاک کە باسی هێزی سێکسیی خۆی دەکات و دەڵێ توانایەکی سێکسیی لە ڕادەبەدەرم هەیە، ئەوا ئاماژەیە بۆ لاوازیی زیاتر، نەک هێز و توانای زۆر، ئەو پیاوانەش کە چەند ژنێک یان چەند دۆستێکیان هەیە، مەرج نییە ئاماژە بی بۆ زۆریی هێزی سێکسییان، بەڵکو دەشێ بە پێچەوانەوە بن و ئەم فرەژنی یان فرەدۆستییە گوزارشت بێ لە لاوازیی حەز و ئارەزوو، یان وزەی سێکسییان. هەندێجار ئەم فرەهاوبەشییە سێکسییە تەنیا هەوڵێکە بۆ ژیاندنەوەی ئەو حەزە کوژاوەیە بۆ سێکس و ئەو پیاوە لەڕێی هاوبەشێکی تازەوە دەیەوێ بیسەلمێنێ کە هێزی سێکسیی ماوە و بەهێزە. هەندێ حاڵەتیش ڕووی داوە کە دوای شەوێ، یان دوو شەو، هاوسەرێتیی نێوان ژن و پیاو کۆتایی دێ و ئەو کەسە کۆمەڵێک شت دەکاتە بیانوو بۆ شکستهێنانی لەو هاوسەرێتییە و بەرەو هاوسەرێتییەکی دیکە دەڕوات. دەشێ چیرۆکی هەزار و یەک شەوە و ڕۆڵی شەهرەیار لەو چیرۆکەدا، یەکێک بێ لەو نموونانە کە پەککەوتنی توانای سێکسیی شەهرەیار دەنوێنێ، زیاتر لە هێز و توانای.

## جیاوازییە ڕەگەزی و شارستانییەکان

هەندێجار گەڕیدە و توێژەران ئاماژە بە بوونی جیاوازی لە هێزی سێکسی لەنێو گەل و نەتەوە و شارستانییەتە جیاوازەکاندا دەدەن. کاتێ لێکدانەوە و شیکاری بۆ ئەم جیاوازییانە دەکەین، پێویستە باسی کۆمەڵێک فاکتەر بکەین کە ڕۆڵییان هەیە لە دروستبوونی هێزی سێکسیدا. دەشێ هەندێ توخمی مرۆیی لە ڕووی بایۆلۆژییەوە خاوەنی وزەیەکی سێکسیی بەرز بن کە زیاتر بێ لە ناوەندی ڕێژەیی ئەو وزەیەی تاکەکانی نەتەوە یان گەلێکی دیکەی پێ دەناسرێ، هەروەها لەوانەیە بارودۆخی ئاووهەوا کاریگەریی هەبێ لە زوو بێداربوونەوەی سێکسیدا، بۆ نموونە لە ناوچە گەرمەکاندا تاک لە ڕووی سێکسییەوە لە تەمەنێکی زووتردا چالاک دەبێ، هەروەها ئەوەی گومانی تیادا نییە ڕوانگەی کۆمەڵایەتیی باو لە کۆمەڵگەیەکی تایبەتیدا دەشێ ئەو بێداربوونەوە سێکسییە دوا بخات، یان وای لێ بکات زووتر ڕوو بدات، ئەمەش دەشێ کار بکاتە سەر لایەنی دەروونی و لێرەشەوە کاریگەریی بۆ سەر ئاستی هۆرمۆنە سێکسییەکان هەبێ، پاشان سروشتی سیستمی خۆراکی و بڕەکەی کار دەکەنە سەر هێزی سێکسی و کاتی دەستپێکردنی بێداربوونەوەی سێکسی، چونکە ئاشکرایە تەمەنی نەرزەبوون هێدی هێدی لەم سەردەمەدا کەم دەکات و ئەویش بەهۆی باشیی سیستمی خۆراکییەوەیە، سەرباری کاریگەریی فاکتەرەکانی هۆشیاریی سێکسی بۆ سەر مێردمنداڵان و ڕێگەدان و چاوپۆشیکردن لەو مەسەلانەی پەیوەندییان بە چالاکیی سێکسییەوە هەیە.

یەکێک لە فاکتەرە گرنگەکان دەربارەی دیاریکردنی هێزی سێکسی، بریتییە لە فاکتەرە شارستانییەتەکان بەنیسبەت تاک و کۆمەڵگەوە، چونکە وزەی سێکسی بەو وەسفەی کە وزەیەکی بایۆلۆژییە، دەشێ بە چەندەها ڕێگەی سێکسی و ناسێکسی لە

ڕواڵەتدا، بەدیّ بێت، هەروەها ڕێگە سێکسییەکان تەنیا مەبەست لە پەیوەندیی سێکسیی ڕاستەوخۆ نییە، سەرجەم ڕێگە سێکسییە جیاوازەکان و غەیرە سێکسییەکانیش هەموویان کەم و زۆر وزەی سێکسیی تاک سەرف دەکەن، لەوانەیە تەنیا بڕێکی سنووورداری ئەو وزەیە بمێنێتەوە و لە بەکاربردنی وزە سێکسییە ڕاستەوخۆکاندا بەکار بهێنریّ. زانراوە مرۆڤ چەندە لە ڕووی شارستانییەت و ڕۆشنبیری و ئەزموونەوە دەوڵەمەندتر بیّ، ئەوەندە لە شێوازەکانی نواندنی ڕەفتاری سێکسیدا فرەجۆرتر دەبیّ و بە شێوەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ وزەی سێکسی سەرف دەکات، بەڵام مرۆڤی هەژار لە ڕووی شارستانییەت و ڕۆشنبیرییەوە، وزەی سێکسیی تەنیا لە ڕێگە ڕاستەوخۆ و باوەکانی پەیوەندیی سێکسیدا سەرف دەکات و لە بوارەکانی دیکەدا کەمتر بەکاری دەبات، ئەم دۆخەش وای لیّ دەکات لە زۆربەی حاڵەتەکاندا، بۆ ئەنجامدانی کرداری سێکسی ڕاستەوخۆ لە مرۆڤێکی شارستانی و هاوچەرخ هێزی زیاتر بخاتە کار، بەڵام ئەم مرۆڤە لەبەر ئەوەی بەردەوام و بە شێوەیەکی دووبارەبووەوە وزەی سێکسیی خۆی تەنیا بەو ڕێگە ڕاستەخۆیەی سێکس سەرف دەکات، هەروەها بەهۆی کاریگەریی فاکتەرەکانی بەدخۆراکی و لاوازیی تەندروستییەوە، کەمتر دەتوانیّ لە ڕووی سێکسییەوە چێژ لەو وزە سێکسییەی هەیەتی، ببینیّ، بە بەراورد لەگەڵ هاوتا شارستانی و هاوچەرخەکەیدا.

**شەبەقی**

شەبەقی Hepersexuilety بریتییە لە چڵێسیی سێکسی و پێداگری لەسەر پاڵنەری سێکسی. دەشیّ ئەم حاڵەتە لە هەندیّ کەسدا بەرزترین وزەی سێکسی بیّ لەمەودا سروشتییەکەیدا، لەبەر ئەوە ئەمە حاڵەتێکی دەگمەن نییە، هەروەک لە هەندیّ

کەسدا لە هەندێ ماوەی ژیاندا ڕوو دەدات، بەتایبەتی لە قۆناغی هەرزەکاریدا.

بەلام حەز و ئارەزووی سێکسی و سووربوون لەسەر ئەنجامدانی، دەشێ لە سنووری سروشتی تێپەڕێ و سیفەتی پالنەر و ڕەفتاری ناچاری لە دووبارەکردنەوەی کاری سێکسی وەربگرێ، لەم حالەتەدا ئەنجامدانی کاری سێکسی ئاماژەیە بۆ لادانی سێکسی، هەروەها دەشێ ئاماژە بێ بۆ بوونی پشێوییەکی نەخۆشی، یان فسیۆلۆژی کە پێویستی بە پشکنین و چارەسەکردن هەبێت.

شەبەقی لە پیاودا پێی دەوترێت Satyriasis و لە ژندا پێی دەوترێت شێتیی بووکی دەریا nymphomania. هەندێ نیشانە هەن ئاماژە دەدەن بە بوونی ئەم حالەتە لە هەندێ لە ئاژەلاندا. هەندێجار هۆکاری شەبەقی بۆ نەخۆشی دەگەڕێتەوە، وەک پشێویی بەشەکانی ئەو کۆئەندامەی کە هەلچوونە سۆزدارییەکان ڕێک دەخات و بە Limbic system ناسراوە، هەروەها لە هەندێ حالەتی فێی لاجانگە بەشی مێشکدا ڕوو دەدات، هەروەها بەهۆی خواردنی هەندێ دەرمانی چالاککەرەوەی دەمارەکان، نموونەی ئەمفاتمین amphetamine و هەروەها ماددە بێهۆشکەرەکان و هەندێ هۆرمۆنی، وەک هۆرمۆنی ئەندرۆجین، بەلام چالاککەرە سێکسییەکان aphrodisiacs هیچ کاریگەرییەکیان بۆ سەر حالەتی شەبەقی نییە، هەروەها شەبەقی تێبینی دەکرێ لە هەندێ نەخۆشیی وەک هستریا و نەخۆشییە ئەقلییەکان، وەک مانیا و ڕەفتاری سایکۆباسی لە قۆناغی هەرزەکاریدا، بەتایبەتی لەو کەسانەدا کە لە حالەتی شەبەقییەکەیاندا سووکایەتی بەو بەها و نەریتانە دەکەن کە ڕەفتاری کۆمەلگە ڕێک دەخەن، بەلام لە ژندا گۆڕانە فسیۆلۆژی و هۆرمۆنییەکان کە لە تەمەنی نائومێدی و لە ماوەی سووڕی

مانگانەدا ڕوو دەدەن، دەشێ لە ئاستی ئاسایی زیاتر حەز و ئارەزووی سێکسی لای ژن زیاد بکەن. پێویستە لە هەموو حاڵەتەکاندا، جیاوازی لە نێوان شەبەقی ڕاستەقینە وەک لادان، یان نەخۆشی بکەین، لەگەڵ ئەو حاڵەتەدا کە وا هەست دەکرێ شەبەقییە، لە حاڵەتی دووەمیاندا، واتە ئەو حاڵەتەی کە خۆی شەبەقی نییە، دەشێ ئەو کەسە تەنیا لە مێشک و خەیاڵی خۆیدا تۆزێ زیادەڕۆیی بکات لە بیرکردنەوە لە مەسەلە سێکسییەکان و ئەم بیرکردنەوەیە هیچ پەیوەندیی بە پاڵنەرێکی سێکسیی پێداگرەوە نەبێ، کە ئەو کەسە ناچار بکات بۆ ئەنجامدان و دووبارەکردنەوەی سێکس، هەندێجاریش کاتێک کەسێ پێداگری دەکات لەسەر باسکردنی سێکس، زیاتر دەیەوێ حاڵەتی لاوازیی سێکسیی خۆی پێ بشارێتەوە.

هەروەها شایەنی ئاماژەپێکردنە ئەو حاڵەتەی لە هەندێ ژندا بە شەبەقی سێکسی وەسف دەکرێ، تەنیا گوزارشتکردنە لە شکستهێنان لە گەیشتن بە ئۆرگازم، ئەو ژنە لە دووبارەکردنەوەی پەیوەندیی سێکسی و ئەنجامدانی سێکسی زۆردا قووڵ دەبێتەوە، بەو هیوایەی بە ئۆرگازم بگات.

# بەشی سیانزەیەم
# لاوازیی سێکسی

-بونیادی جەستەیی
-حاڵەتەکانی نەخۆشییە جەستەییەکان
-لاوازیی گشتی
-نەخۆشییەکانی دڵ
-نەخۆشییەکانی گورچیلە و کۆئەندامی میز
-نەخۆشییەکانی جومگە
-نەخۆشییەکانی کۆئەندامی دەمار
-نەخۆشیی شەکرە
-نەخۆشییەکانی بۆریی خوێن
-پشێوییە هۆرمۆنییەکان
-کردارەکانی نەشتەرگەری

## لاوازیی سێکسی

سروشتی ژیانی سێکسی به جۆرێکه، ئەستەمه بتوانرێ پێوەرێکی تایبەتی به دەست بهێنرێ که له توانایدا بێ بڕی هێز، یان لاوازیی لایەنه جیاوازەکانی ژیانی سێکسی دیاری بکات، ئەو لایەنانەی که له ڕووی ڕەگەز و ئەو فاکتەرانەوە کاریان تێدەکەن، فرەجۆر و بەیەکداچوون. ئەم ئەستەمییه وا له تاک دەکات، لەسەر بناغەی بۆچوون و پێشبینییەکانی خۆی، یان هاوبەشه سێکسییەکەی، توانای سێکسیی خۆی پێوانه بکات، واته لەڕێی ئەو بۆچوون و پێشبینییانەوە توانای سێکسیی خۆی دیاری دەکات که له ئەنجامی ئەزموونەکانی پێشووی و ئەزموونەکانی کەسانی دیکەوە، یان هاوتەمەنەکانی خۆی که هەمان ژینگه و بارودۆخیان هەبووە، دەستی کەوتوون.

بەپێی ئەم ڕوانگەیه بۆ پێوانەکردنی هێز و لاوازی له ژیانی سێکسیدا، دەشێ کەسێک له ڕووی سێکسییەوە به لاواز دابنرێ، ئەگەر لەگەڵ هاوتاکانی بەراورد بکرێ، یان به هۆکارێکەوە ئەو کەسه لاواز بووبێ، له کاتێکدا پێشتر له ڕووی سێکسییەوە بەهێز بووە، ئەم لاوازییەش دەشێ پلەی جیاوازی هەبێ و لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا گۆڕانی بەسەردا بێت، یان دەشێ له هەندێ باردۆخی تایبەتی ژیاندا ڕوو بدات، بۆ نموونه دەشێ گۆڕانی شوێن و جێگەی سێکسکردن یەکێک بێ لەو بارودۆخه کاتییانه و کار بکاته سەر هێز و توانای سێکسی تاک و هاوبەشه سێکسییەکەی و لاوازی بکات. لێرەدا هەندێ لەو هۆکاره گرنگانه باس دەکەین که دەشێ ببنه هۆی ڕوودانی لاوازی له توانا و هێزی سێکسی و هەروەها پاڵنەری سێکسی و شێوازی ئەنجامدامی کرداری سێکسیی ڕاستەقینه.

### بونیادی جەستەیی

بونیادی جەستەیی هیچ پەیوەندییەکی بنچینەیی بە توانای سێکسییەوە نییە، چونکە بالآی بەرز و کورتەبالآیی و بەژنرێکی و قەڵەوی و هێزی ماسوولکەیی مەرج نییە پەیوەندییان بە ئاستێکی دیاریکراوی توانای سێکسییەوە هەبێ، بەلآم بونیادی لاوازی جەستە، یان قەڵەوی بەزۆری پەیوەندییان بە تواناکانی جەستەوە هەیە لە ڕووی زوو هیلاکبوون و هەستکردن بە ماندوویێتی. ئەم پەیوەندییە لە وزە بایۆلۆژییەکانی دیکەی جەستە، بە لایەنی سێکسییشەوە، دەردەکەوێ، هەرچەندە پاڵنەری سێکسی و چۆنێتیی ئەنجامدانی سێکس بۆ زۆر کەس لە یەکەم پەیوەندیی سێکسیدا دەشێ سروشتی بێ، ئیدی توانا و بونیادی جەستەیی ئەو کەسە هەرچۆنێک بێ، بەلآم کاریگەریی هیلاکبوون و ماندوویێتی لەدوای سێکسکردن لە ڕووی زوو هیلاکبوونەوە و درێژەکێشانی ئەم ماندوویێتییە و توانای ئەنجامدانی سێکس بۆ جاری دووەم و سێیەم و هتد، دەردەکەوێ، ئەمەیە کە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە جیاوازە و دەشێ بونیادی جەستەیی لێرەدا ڕۆڵی خۆی بگێڕێ، واتە هەندێ کەس لە ماوەی کورتدا توانای دووبارەکردنەوەی هەبێ و ئەوەندەش هەست بە هیلاکی نەکات و هەندێ کەسی دیکەش بە پێچەوانەوە.

### حاڵەتەکانی نەخۆشییە جەستەییەکان

دەشێ لە زۆربەی ئەو نەخۆشییانەی تووشی جەستە دەبن، ببنە هۆی ڕوودانی لاوازیی سێکسی، ئیدی بەهۆی ماندووبوونی نەخۆشەکەوە بێ بەگشتی، یان ئەو نەخۆشییە کار بکاتە سەر ئەندامێک، یان کۆئەندامێکی دیاریکراو لە جەستەدا، یان بەهۆی کاریگەریی ئەو دەرمانانەوە بێ کە نەخۆش بۆ چارەسەکردنی نەخۆشییەکەی دەیانخوات. ئەو نەخۆشییانەی کە دەبنە هۆی

ڕوودانی لاوازیی سێکسی، دەشێ نەخۆشیی جەستەیی بن، یان بەهۆی نەشتەرگەرییەوە ڕوو بدەن، هەروەها نەخۆشییەکان لەوانەیە گشتی بن، یان تووشی هەندێ ناوچە و ئەندام ببن کە پەیوەندییان بە کرداری سێکسییەوە هەیە. ئەو نەخۆشی و حاڵەتانەی لەوانەیە ببنە هۆی لاوازیی سێکسی ئەمانەن:

### ١-لاوازیی گشتی بەهۆی نەخۆشییەوە

سروشتی زۆربەی نەخۆشییەکان بە جۆرێکن کە دەبنە هۆی ڕوودانی لاوازیی جەستەیی و هەستکردن بە بێهێزیی لەش، لەبەر ئەوە ئاسایی نەخۆش لە کاتی ئەم هەستکردن بە لاوازییەدا، لە حەز و ئارەزووی سێکسی و کرداری سێکسی دەکشێتەوە.

ئەمە بە شێوەیەکی گشتی لە هەموو نەخۆشییەکاندا ڕوو دەدات و نەخۆش هەست بە لاوازی و ئازار و پەککەوتن دەکات، ئیدی هۆکاری نەخۆشییە جەستەییەکە هەرچییەک بێ، بەتایبەتی لە حاڵەتی نەخۆشییە درێژخایەنەکاندا، یان ئەو نەخۆشییانەی پێویستیان بە کاتێکی زۆر هەیە بۆ چاکبوونەوە. ئەم لاوازییە سێکسییەی کە لەم حاڵەتانەدا ڕوو دەدات، بەزۆری دەبێتە مایەی دڵەڕاوکێ لە دەروونی نەخۆشدا و دەشێ ئەمەش کار بکاتە سەر ئاستی توانای سێکسی، کاتێ بە تەواوی لە نەخۆشییەکەی چاک بووەوە.

### ٢- نەخۆشییەکانی دڵ

توێژینەوەی زۆر لە بابەتی پەیوەندیی نێوان نەخۆشییەکانی دڵ و کرداری سێکس، ئەنجام دراون، ئەم توێژینەوانە چەندەها تێبینیی گرنگیان خستە ڕوو، یەکێک لەو تێبینیانە باس لە کاریگەریی سێکسردن دەکات بۆ سەر تەندروستیی ئەو کەسانەی کە نەخۆشیی دڵیان هەیە و سێکسکردن بۆ ئەم کەسانە، وەک

سەرکەوتن بەسەر پلیکانە، یان ڕۆیشتنێکی خێرا بۆ ماوەیەکی کەم وایە، ئەگەر کەسێک نەخۆشیی دڵی هەبێت، توانیی ئەو چالاکییانە بەبێ ماندووبوونێکی تێبینیکراو ئەنجام بدات، ئەوا دەتوانێ لەگەڵ هاوبەشەکەیدا بە شێوەیەکی ئاسایی سێکس بکات، بەڵام سێکسکردن بۆ کەسێک کە نەخۆشیی دڵی هەبێت لەگەڵ هاوبەشێکی تازەدا، یان لەگەڵ هاوبەشە سێکسییەکەی خۆی لەدوای دابڕانێکی زۆر، جێگەی مەترسییە. لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە بلوک ساڵی 1975 ئەنجامی داوە، ئاشکرا بووە ناوەندی ئەنجامدانی سێکس لەو کەسانەدا کە توێژینەوەکەیان لەسەر کراوە، مانگێک بەر لە تووشبوون بە نەخۆشیی دڵ ٥.٢ جار بووە، بەڵام لەدوای ١١ مانگ لە تووشبوونیان، ئەم ژمارەیە بووە بە ٢.٧ جار لە مانگێکدا. ئەو توێژەرەی ئەم توێژینەوەیەی ئەنجام داوە، هۆکاری کەمبوونەوەی ئەم ڕێژەیەی گەڕاندووەتەوە بۆ کۆمەڵێک فاکتەری دەروونی، وەک دڵەڕاوکێ و ترس لە ئەنجامدانی سێکس. لێکۆڵینەوەیەکی دیکە لەسەر ٤٨ نەخۆش ئەنجام درابوو کە تووشی سنگەکوژێ بووبوون، لێکۆڵینەوەکە ئاشکرای کرد، ١٨ نەخۆش لەوانە لە کاتی سێکسدا هەستیان بە هەندێ لە نیشانەکانی ڕوودانی سنگەکوژێ کرد، وەک بەرزبوونەوەی ژمارەی لێدانەکانی دڵ. پێنج کەس لەوانە لە کاتی سێکسدا کاتێ هەستیان بەم نیشانە مەترسیدارە کردووە، ناچار بوون کردارە سێکسییەکەیان بوەستێنن، (فریدمان ١٩٧٨ و رجستاین و هورن ١٩٧٨ و واگنەر ١٩٧٧).

### ٣-نەخۆشییەکانی گورچیلە و کۆئەندامی میز

زۆربەی توێژینەوەکان لەسەر دوو گرووپ لە نەخۆش ئەنجام دراون، یەکەمیان، ئەو نەخۆشانەن کە بەهۆی نەخۆشیی گورچیلەوە تووشی ژەهراویبوون بوون و دواتر ناچار بوون پەنا

بۆ پاكژكردنەوەی خوێن ببەن. گرووپی دووەم، ئەو نەخۆشانەن كە نەشتەرگەریی چاندنی گورچیلەیان بۆ كراوە. لێكۆڵینەوەیەك كە لە ساڵی ۱۹۷۳دا ئەنجام دراوە، ئاماژەی بەوە داوە، ئەو نەخۆشانەی سەر بە گرووپی یەكەمن كێشەی كەمتوانایی سێكسییان هەیە و هەست دەكەن پاڵنەری سێكسییان لاوازە و توانای سێكسكردنیان نییە و ٦٠%ی ئەو نەخۆشانە توانای پاراستنی ڕەپبوونیان نییە، هەروەها ژنانیش كاتێك تووشی ئەم نەخۆشییانەی گورچیلە دەبن، توانای گەیشتن بە ئۆرگازم لەدەست دەدەن، یان ڕێژەی گەیشتن بە ئۆرگازم زۆر كەم دەبێتەوە.

لە كاتێكدا ۹۰%ی ئەو ژنانە بەر لە ژەهراوییبوونی گورچیلەیی بە ئۆرگازم گەیشتوون، لەدوای خاوێنكردنەوەی خوێن، تەنیا ٤٧یان لە كۆی ١٤٢ بە ئۆرگازم گەیشتوون. بەگشتی دەستپێكردن و بەردەوامی لەسەر خاوێنكردنەوەی خوێن بووەتە هۆی تێكچوونی دۆخی سێكسیی ۳٥%ی پیاوان و ٢٤%ی ژنان، تەنیا ڕێژەیەكی زۆر كەم لەم نەخۆشانە حاڵییان باشتر دەبێ. هۆكاری ئەم تێكچوونە زیاتر بۆ فاكتەری دەروونی دەگەڕێتەوە، وەك لە هۆكاری ئەندامی و جەستەیی.

هەرچی دۆخی گرووپی دووەمە، واتە ئەو نەخۆشانەی نەشتەرگەریی چاندنی گورچیلەیان بۆ كراوە، ئەوا لە ڕووی توانای سێكسییەوە هەمان حاڵی گرووپی یەكەمیان هەیە، واتە ئەو نەخۆشانەی تووشی ژەهراوییبوونی گورچیلەیی و خاوێنكردنەوەی خوێن بوون، بەڵام لەم ڕووەوە نیگەرانیی ژن لە پیاو كەمترە. ئەم ئەنجامانە لە لایەن چەند لێكۆڵینەوەیەكی دیكەوە جەختییان لێ كراوەتەوە (ئەبرام و برایان ۱۹۷٥ و سالفتیرا ۱۹۷٥ و ستیل ۱۹۷٦). كۆی ئەم لێكۆڵینەوانە ئەوە ئاشكرا دەكەن كە لە زۆربەی حاڵەتەكانی نەخۆشیی گورچیلەدا، هێز و توانای سێكسی ئەگەر بە

تەواوی لەدەست نەدرێ، ئەوا لاواز دەبێ، سروشتی ئەم پەیوەندییە لە نێوان نەخۆشییەکانی گورچیلە و توانای سێکسیدا، ئاشکرا نەبووە، بەڵام بڕوا وایە باری دەروونیی نەخۆش لە دروستبوونی ئەم دۆخەدا فاکتەری کارا بێ.

### ٤- نەخۆشییەکانی جومگە

نەخۆشییەکانی جومگە بەزۆری و لە زۆر کەسدا، بە شێوەیەک لە شێوەکان نەخۆش تووشی پەککەوتنی سێکسی دەکەن، ئەم دۆخەش، دۆخێکی چاوەڕوانکراوە، بە ڕەچاوکردنی ئەو کاریگەرییە نێگەتیڤانەی نەخۆشییەکانی جومگە دروستی دەکەن، وەک ئازار و تەشەنووج و ڕەقبوونی جومگەیی و ماسوولکەیی، هەموو ئەمانە وا دەکەن کرداری سێکس لە ژن و پیاودا ئازاراوی بێ، بە جۆرێ ئەو ئازارە لە چێژی سێکسەکە، کە چاوەڕێی دەکەن، زیاتر بێ، هەروەها هەندێجار ئازاری نەخۆشییەکانی جومگە دەبێتە ڕێگر لە بەردەم ئەنجامدانی هەندێ دۆخی سێکس و جوولەی پێویست لە کاتی سێکسدا و ئەمەش دەبێتە هۆی کورتکردنەوەی ماوەی ئەو سێکسە، یان کۆتایی پێ هێنانی بەر لەوەی ئەو ژن و پیاوە بە ئۆرگازم بگەن و چێژی تەواو لە سێکسەکە ببینن (هاملتون ١٩٧٥).

هەروەها دەشێ نەخۆشیی جومگەکان جۆرەها ئاڵۆزیی دیکە بخولقێنن، وەک تووشبوون بە هەوکردن لە ئەندامە سێکسییەکاندا، هەروەها کاریگەریی ئەو دەرمانانەی کە بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی جومگەکان بەکاری دەهێنن. پزیشکەکانی جومگە تێبینییان کردووە، زۆرێک لە نەخۆشەکانیان، بەتایبەتی ئەوانەی پیاون، سکاڵای ئازاری پشتیان Lumbago هەیە، ئەم حاڵەتەش لە هەندێکیاندا، کە ژمارەیان کەم نییە، هاوکاتە لەگەڵ لاوازیی سێکسیدا.

هەرچەندە دەشێ ئەم ئازارانە لە ئەنجامی بوونی نەخۆشییەکەوە بێت لە بڕبڕەکاندا، بەڵام سکاڵای لەدەست ناکەن، لەبەر ئەوە پەیوەستکردنی ئازار و لاوازیی سێکسی پێکەوە، تەنیا پەیوەستکردنێکی دەروونییە و سکاڵای نەخۆش بەدەست ئازاری پشتەوە، سکاڵایەکی ڕەمزییە و گوزارشتێکی نەستییە و بەتایبەتی لە پیاودا ڕوو دەدات.

٥- نەخۆشییەکانی کۆئەندامی دەمار

ناوەندی کۆئەندامی دەمار، لە دەماخ و دڕکەپەتک و چێوە کۆئەندامی دەمار بە خۆییە کۆئەندامی دەماریشەوە، ڕۆڵێکی گرنگیان لەو پرۆسە فسیۆلۆژییانەدا هەیە کە قۆناغەکانی کرداری سێکس تیایاندا ڕوو دەدەن، هەر لە خاڵی دروستبوون و دەرچوونی پاڵنەری سێکسییەوە تا کۆتایی وەلامدانەوە جیاوازەکانی ئەم پاڵنەرە، لەبەر ئەوە بوونی هەر تێکچوونێک لەم کۆئەندامەدا یان لە لقەکانیدا، دەشێ زیان بە کرداری سێکسی بگەیەنێ و ببێتە هۆی لاوازکردنی، یان لەکارخستنی. نەخۆشییەکانی کۆئەندامی دەمار، کە دەشێ ببنە هۆی پەککەوتنی سێکسی، تووشی ئەم ناوچانە دەبن:

١- ناوچەدەماخییەکانی تایبەتن بە ژیانی سێکسی کە بریتییە لە ناوچەی لیمبیک Limbic، ناوکی هایپۆسالامەس و سالامەس.

٢- دەمارەکانی چێوە کۆئەندامی دەمار و خۆییە کۆئەندامی دەمار کە پرۆسەی وەلامدانەوەی سێکسی دەست پێ دەکەن و کۆنترۆڵیشی دەکەن.

٣- هەستەدەمارەکانی کە ئاماژە سێکسییەکان بۆ دڕکەپەتک دەگوازنەوە.

٤- ناوەندەکانی دڕکەپەتک بەو دەزوولە یان ڕایەڵە دەمارییانەشەوە کە لە ناوەندەکانی دەماخەوە دەرچوون و دەچن

بۆی. لەو نەخۆشییانەی کە دەشێ کار بکەنە سەر کۆئەندامی دەمار، لێرەشەوە کار بکەنە سەر کرداری سێکس، وەک ڕووداوی بەرکەوتنە توندەکان و وەرەم و هەوکردن و خوێنبەربوون و نەخۆشیی بەمۆمبوونی جگەر و کەموکوڕیی زگماکی لە بڕبڕەی پشتدا Spinal Bifida و پچڕانی دڕکەپەتک بە شێوەیەکی ئەندەکی، یان بە تەواوی.

لەگەڵ ئەوەشدا کە دوو ناوەند لە دڕکەپەتک هەن، کۆنترۆڵی ڕەپبوون دەکەن، یەکێکیان لە کەلەکە دایە و ئەوی دیکەیان لە کلێنچکە دایە، بەڵام هاویشتنی تۆو پشت بە سەلامەتیی هەریەک لەم دوو ناوەندە دەبەستێ.

### ٦-نەخۆشی شەکرە

هیچ نەخۆشییەک خۆی ڕاستەوخۆ نابێتە هۆی لاوازبوونی سێکسی، بەڵام ئەم لاوازییە ڕوو دەدات لە ئەنجامی زیانپێکەوتنی خۆییە کۆئەندامی دەمار بە هەردوو بەشەکەیەوە سەمپەساوی و پاراسەمپەساوی بەهۆی نەخۆشییەوە. ئەم دوو بەشەش هەردووکیان کاریگەرییان هەیە لەسەر کۆنترۆڵکردنی وەڵامدانەوە سێکسییەکان. نەخۆشیی شەکرەش لە هەموو نەخۆشییەکانی دیکە زیاتر زیان بە کۆئەندامی دەمار دەگەیەنێ. وەک زانراوە ٣٠-٦٠%ی تووشبووان بە نەخۆشیی شەکرە، بە شێوەیەک لە شێوەکان، بەدەست لاوازیی سێکسییەوە دەناڵێنن. توێژەران سەبارەت بە کاریگەریی نەخۆشیی شەکرە بۆ سەر لاوازیی سێکسی و ئایا ئەم کاریگەرییە لە کوێوە دێت؟ ناکۆکن. هەندێکیان پێیان وایە لەڕێی دەمارەوەیە و هەندێکی دیکەیان دەڵێن کاریگەرییەکە هۆرمۆنییە، یان لەڕێی موولوولەکانی خوێنەوەیە، بەڵام زۆربەی زانیارییەکان ئاماژە دەدەن بە کاریگەریی نەخۆشیی شەکرە بۆ سەر دەمارەکانی خۆییە کۆئەندامی دەمار و هەندێ توێژەران (کولودنی و ئەوانی دیکە ١٩٧٤،

کوتز و بالودیموس ١٩٧٠) پێیان وایە نەخۆشیی شەکرە بە شێوەیەکی ئەندەکی کار دەکاتە سەر ئەم کۆئەندامە و لێرەشەوە لاوازیی سێکسی ڕوو دەدات.

لەو توێژینەوانەی کە لەسەر ژنانی تووشبوو بە شەکرە ئەنجام دراون، دەرکەوتووە ٥٤%ی ئەم ژنانە بە ئۆرگازم ناگەن (ئالنبرگ ١٩٧٧)، بەڵام توێژینەوەی دیکە هەن ئاماژە بە ڕێژەیەکی کەمتر لەم ژمارەیە دەدەن. ئەمانە و پێویستە بۆ هەر حاڵەتێک ئەوە دیاری بکرێ، ئایا نیشانەی دەماریی دیکە هەیە یان نا؟ چونکە بوونی ئەم نیشانانە وا دەکەن ئەگەری ڕوودانی لاوازیی سێکسی شیاوتر بێ.

### ٧-نەخۆشییەکانی بۆریی خوێن

لەبەر ئەوەی نەخۆشییەکانی بۆریی خوێن بە تەنیا ڕوو نادەن، بەڵکو بەشێکن لەو نەخۆشییانەی کە تووشی کۆئەندامی سووڕی خوێن و گورچیلە و کۆئەندامی میز دەبن، تەنانەت کۆئەندامی دەماریش کە تا ئاستێک کۆنترۆڵی سووڕی خوێن دەکات، هەر لە دڵەوە تا دەگات بە باریکترین موولوولەی خوێن، لەبەر ئەوە ئەستەمە ئەوە دیاری بکرێ، ئەو پەککەوتنە سێکسییەی کە هاوکاتە لەگەڵ نەخۆشییەکانی بۆریی خوێندا، هۆکارەکەی نەخۆشییەکانی بۆریی خوێن خۆیانن، یان ئەو نەخۆشییانەن کە هاوکاتن لەگەڵ پشێوییەکانی بۆریی خوێندا.

بەگشتی ڕوودانی هەر کەمبوونەوەیەک لە چوونی خوێن بۆ کۆئەندامی سێکسی، بەهۆی ڕوودانی هەر نەخۆشی یان ڕووداوێک، کار دەکاتە سەر کرداری سێکسی (کاننغ و ئەوانی دیکە ١٩٦٣).

هەرچەندە نەخۆشیی بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن یەکێکە لە نەخۆشییەکانی بۆریی خوێن کە ڕوودانی هاوکاتە لەگەڵ ڕوودانی

ئەگەری لاوازیی سێکسی، بەڵام هیچ پەیوەندییەکی سەرەکیش لە نێوانیاندا نییە.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کەسانەی بەدەست لاوازیی سێکسییەوە دەناڵێنن، بەزۆری پەستانی خوێنیان بەرزە، بەڵام دەشێ ئەمە دەرئەنجامی ترس و دڵەڕاوکێی نەخۆش بن، یان بەهۆی ماندووبوون و هەڵچوونەوە ڕوو بدات، یان بەهۆی درێژبوونەوەی کاتی سێکس یان دووبارەکردنەوە بێت، یان دەشێ لە دەرئەنجامی کاریگەریی پۆزەتیڤی ئەو حەپانەوە بێت کە بۆ چارەسەکردنی بەرزیی فشاری خوێن بەکار دەهێنرێن. هەرچی ئەوانەشن کە پەستانی خوێنیان نزمە، دیسانەوە لە کاتی سێکسدا زوو هیلاک و ماندوو دەبن.

هەروەها ئەو کەسانەش کە بەدەست فراوانبوون و شلبوونەوەی خوێنهێنەرەکانی کۆمەوە (مایەسیری) دەناڵێنن، تووشی لاوازیی سێکسی دەبن، لەوانەیە هۆکاری ئەم پەیوەستییە بۆ کۆمەڵێک فاکتەری دەروونی بگەڕێتەوە کە دەروونشیکارەکان بۆ حاڵەتێکی دەگەڕێننەوە کە بریتییە لە چەسپاندنی تاک یان گەڕانەوەی تاک بۆ قۆناغێکی سێکسیی ڕابردوو کە پێی دەوترێ قۆناغی کۆمی.

دەشێ مایەسیری هیچ پەیوەندییەکی بە لاوازیی سێکسییەوە نەبێ، بەڵکو ئەمە تەنیا لێکدانەوەی هەندێ لەو نەخۆشانە بێ کە مایەسیری و لاوازیی سێکسییان پێکەوە هەیە، ئیدی وا دەزانن لاوازیی سێکسییان بەهۆی مایەسیرییەکەیانەوەیە، لەوانەیە هەر ئەمەش بووبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی ئەو بۆچوونانە، تەنانەت هەندێ کەس بێ بەڵگەی تەواو و نیشانەی دیار بۆ تووشبوونیان بە مایەسیری، هۆکاری لاوازیی سێکسییان بۆ مایەسیری دەگەڕێننەوە و ئەمەش پاڵیان پێوە دەنێ بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەریی لابردنی مایەسیری.

### ٨-پشێوییە هۆرمۆنییەکان

پەیوەندییەکی سەرەکی و پتەو لە نێوان ژیانی سێکسی و کۆئەندامە هۆرمۆنییە جیاوازەکانی جەستەدا هەیە.

ئەم کۆئەندامە هۆرمۆنییانە پێکدێن لە ناوکی هایپۆسالامەس و ژێرمێشکەڕژێن و ڕژێنە سێکسییەکان (گونەکان لە نێردا و هێلکەدانەکان لە مێ-دا)، هەروەها ئەو نەخۆشی و هەوکردنانەی کە تووشی ژێرمێشکەڕژێن و ڕژێنە سێکسی و سەرەگورچیلەڕژێن دەبن، لەوانەیە ببنە هۆی ڕوودانی لەکارکەوتنی پاڵنەر و توانای ورووژاندنی سێکسی لە هەریەک لە نێر و مێدا.

لەو نەخۆشییانەش وەک پووکانەوەی زگماکی ڕژێنە سێکسییەکان و بەمۆمبوونی جگەر کە دەبێتە هۆی پووکانەوەی گونەکان لە پیاودا، هەروەها لەکارکەوتنی ژێرمێشکەڕژێن و تووشبوون بە وەرەمی سەرەگورچیلەڕژێن.

وەک زانراوە لابرنی هێلکەدانەکان کار ناکاتە سەر ژیانی سێکسی لە ژندا، بەڵام لابردنی ڕژێنی ئەدرینال (سەرەگورچیلەڕژێن) کاریگەریی دەبێ لەسەری. لە پیاودا ئەگەر لەدوای تەواوبوونی گەشە، گونەکان لابران، ئەوا هێندە کار ناکاتە سەر پاڵنەری سێکسی و ڕەپبوون، ئەمە لای زۆربەی ئەو پیاوانەی دەخەسێنرێن، تێبینی دەکرێت.

توێژینەوەکان لە بواری هۆرمۆندا ئاماژە بەوە دەدەن، هەریەک لە نێر و مێ پێویستییان بە بڕی کەم لە هۆرمۆنەکانی ئەندرۆجین دەبێ تا بتوانن ڕەفتاری سێکسیی سروشتی بنوێنن، ئەم بڕەش لە ئەندرۆجین دوو سەرچاوەی هەیە، یەکەمیان ڕژێنە سێکسییەکانە (گون لە نێر و هێلکەدان لە مێدا)، دووەمیشیان ڕژێنی ئەدرینالە (سەرەگورچیلەڕژێن) ئەگەر بەهۆی نەخۆشییەوە یان نەشتەرگەریی لابردنەوە، سەرچاوەی یەکەمیان وشکی کرد، ئەوا

تاک بەشی پێویست لە ئەندرۆجین لە سەرچاوەی دووەمەوە وەردەگرێ. بەم شێوەیە گرنگ ئەوەیە ئەم برە کەمە بمێنێ، بەڵام دەربارەی زیادبوونی، دەرنەکەوتووە هیچ بەهایەکی چارەسەرسازی هەبێ، هەرچەندە وا زانراوە کە زیادبوونی ئەندرۆجین لە ژندا دەبێتە هۆی زیادبوونی پاڵنەری سێکسی.

## ٩-کردارەکانی نەشتەرگەری

کاریگەرییەکانی کرداری نەشتەرگەری بۆ سەر پەیوەندیی سێکسی، یان بەهۆی ئەو ئازارەوە دەبێ کە نەخۆش لە ئەنجامی نەشتەرگەرییەکەوە هەستی پێ دەکات، یان بەهۆی کاریگەریی نەشتەرگەرییەکەوەیە بۆ سەر کۆئەندامی دەمار، بەتایبەتی لەو بەشانەدا کە پەیوەندییان بە کرداری سێکسییەوە هەیە، وەک نەشتەرگەریی پرۆستات، یان بەهۆی پچڕانی دەمارەکانی سەمپەساوی لە ناوچەی کەلەکەدا، یان لە هەندێ کەسدا بەهۆی ئەو شۆکە دەروونییەوە ڕوو دەدات کە نەخۆش بەهۆی نەشتەرگەرییەوە تووشی دەبێ و هەندێجار دەبێتە هۆی شێواندنی وێنەی لە لای خۆی.

# بەشی چواردەیەم
# لەکارکەوتنی سێکسی

-لەکارکەوتنی ئارەزووی سێکسی
-لەکارکەوتنی ڕاستەقینەی کاری سێکسی
-لەکارکەوتنی ڕەپبوون
-لەکارکەوتنی هاویشتنی تۆو
-زووهاویشتن، درەنگهاویشتن، یان هەر ڕوونەدانی
-لەکارکەوتنی ئۆرگازم
-ئاڵۆزییەکانی لەکارکەوتن
-دەرئەنجامە دەروونییەکان، دەرئەنجامە ڕەفتارییەکان، دەرئەنجامە کۆمەڵاتییەکان، دەرئەنجامە یاساییەکان

# لەکارکەوتنی سێکسی

لەکارکەوتنی سێکسی Sexual Dysfunction لە زماندا زاراوەیەکی کۆنە، واتە پیاو ناتوانێ لەگەڵ ژنەکەیدا سێکس بکات،[*] هەروەها ئەم زاراوەیە، زاراوەیەکی باوە و خەڵک بەگشتی و لە ڕابردوودا هەروەها تا ئێستاش، بەتایبەتی لە بواری پزیشکیدا، بەکاری دەهێنن، بەڵام زاراوەکە بە مانا بەربڵاوەکەی واتە لەدەستدانی توانای ئەنجامدانی سێکس. ئەمەش هەمان مانای زاراوەی Impotenceە، کە مانای نەتوانین، یان نەبوونی هێز دەگەیەنێ. لەبەر ئەوەی ئەم زاراوەیە بە مانا باوەکەی، بە تەواوی لەگەڵ مانای بنەڕەتیی وشەکە لە زماندا ناگونجێ، هەروەها لەبەر ئەوەی وشەی لەکارکەوتن بۆ هەموو پلەکانی نەتوانین و لەدەستدانی توانای سێکس بەکار دێ، کە ئەمەش دەشێ ببێتە هۆی خولقاندنی ئاڵۆزی و تێکەڵاوبوون و دەرئەنجامی کۆمەڵایەتی و یاسایی و دەروونیی نەخواستراو، لەبەر ئەم هۆیانە، لە ئێستادا پێویستە مانایەکی وردتر بە زاراوەی لەکارکەوتن ببەخشرێ، یان بە زاراوەیەکی دیکە بگۆڕێ کە تەواوی حاڵەتە جیاوازەکانی نەتوانین لەخۆ بگرێ، بە هەموو جۆر و پلەکانییەوە. لەو زاراوە ئەڵتەرنیڤانەی بۆ جێگرتنەوەی زاراوەی لەکارکەوتن بەکار هێنراون و بەکار دەهێنرێن، وەک زاراوەی 'لاوازیی سێکسی' و زاراوەی 'پشێویی سێکسی' و زاراوەی 'پەککەوتنی سێکسی'، بەڵام ئەم زاراوانە ناتوانن سنوورە بەرفراوانەکانی لەکارکەوتنی سێکسی لە خۆیاندا کۆبکەنەوە، بەڵام زاراوەی لەکارکەوتنی سێکسی لە هەموو زاراوەکانی دیکە زیاتر هەموو ئەو حاڵەتانە دەگرێتەوە کە زاراوەکە مەبەستییەتی، هەم لە ڕووی

جۆرەوە، هەم لە ڕووی پلەی حاڵەتەکانیشەوە، هەروەها زاراوەی لەکارکەوتن لەگەڵ زاراوە لێکچووەکانی دیکەی حاڵەتەکانی لەکارکەوتنی ئەندام و کۆئەندامەکانی دیکەی لەشدا، دەگونجێ. لەبەر ئەوە ئێمە لێرەوە زاراوە تازەکە، واتە لەکارکەوتنی سێکسی بەکار دەهێنین، وەک هاومانا و ئەڵتەرناتیڤی زاراوەی شکستهێنانی سێکسی، لەبەر ئەوەی ژیانی سێکسی لە مرۆڤدا لە زنجیرەیەکی پێکەوەبەستراو لە چالاکی و کردار پێکهاتووە، ئەوا ئەنجامدانی گونجاو و تێروتەواویی ژیانی سێکسی بە هەموو داواکاری و ئەڵقە فرە ژمارەکانییەوە، بە ئەنجامدانێکی سروشتی دادەنرێ، بەڵام ڕوودانی هەر کەموکورپییەک لە ئەنجامدانی ئەم کردارە لە تەواوی زنجیرەی کردارەکە، یان لە یەکێک، یان زیاتر لە ئەڵقەکانیدا، ئەوا بە لەکارکەوتنی سێکسی دادەنرێ و وا پێویست دەکات ئەو لەکارکەوتنە دەستنیشان بکرێ. ئەگەر توانرا ئەو لەکارکەوتنە دیاری بکرێ، ئەوا پێویستە جۆر و پلەی لەکارکەوتنەکەش دیاری بکرێ، لەم دیاریکردنەدا پێویستە ڕەچاوی هەندێ شت بکرێ، وەک توانستی سێکسیی ئەو کەسە بەپێی تەمەن و بارودۆخی کەسێتی و کۆمەڵایەتی و شارستانی، هەروەها پێویستە ئەوە دیاری بکەین، ئایا ئەو لەکارکەوتنە سەرەکییە و هەر لە سەرەتاوە ڕووی داوە، یان لاوەکییە و لە کاتێکی دواتردا بەهۆی هۆکارێکی زانراو، یان نەزانراوە ڕووی داوە و پێشتر ئەو کەسە توانیویەتی بۆ ماوەیەک بە شێوەیەکی سروشتی کرداری سێکسی ئەنجام بدات، هەروەها خاڵێکی دیکە کە پێویستە دیاری بکرێ ئەوەیە، ئایا ئەو لەکارکەوتنە هەمیشەییە؟ یان لەکارکەوتنێکە لە ماوەیەکی زەمەنی، دیاریکراودا پەنگی خواردووە، یان بەیناوبەین دووبارە دەبێتەوە، هەروەها ئەوە بزانرێ، ئایا لەگەڵ هەموو هاوبەشێکی سێکسیدا ئەو کەسە هەر وا ناتوانێ بە سروشتی سێکس بکات، یان لە بارودۆخێکی

تایبەتدا و لەگەڵ هاوبەشێکی تایبەتیدا ناتوانێ؟ مەسەلەکی دیکە هەیە پێویستە ئاماژەی پێ بدرێ، ئەویش ئەوەیە، کاتێ لەکارکەوتنی سێکسی لە زنجیرەیەک چالاکیی کرداری سێکسدا ڕوو دەدات، مەرج نییە لە تەواوی لایەنە سێکسییەکانی دیکەدا هەمان شت ڕوو بدات، چونکە دەشێ ئەنجامدانی کرداری سێکسی، هەرچەندە ئەگەر لە لایەکیشەوە لەکار کەوتبێ، بەڵام لە لایەکی دیکەوە دەشێ بە کارایی و سروشتی بمێنێتەوە، هەروەها زۆرجار کاتێک لەکارکەوتن لە ڕوویەکەوە ڕوو دەدات، کار دەکاتە سەر چالاکیی سێکسی لە ڕووەکانی دیکەشەوە، ئەمەش مەسەلەیەکی چاوەڕوانکراوە بە وردبوونەوە لە پەیوەندیی زەمەنی و فسیۆلۆژیی قۆناغە جیاوازەکانی چالاکیی سێکسی.

* * *

چالاکییە فسیۆلۆژییەکان کە دەشێ دووچاری لەکارکەوتنی سێکسی ببن، بۆ دوو بەش پۆلێن کراون، یەکەمیان ئەو چالاکییەیە کە بە ئارەزووی سێکسی گوزارشتی لێ دەکرێ. دووەمیشیان ئەو چالاکییانەن کە بریتین لە ئەنجامدانی ڕاستەقینەی کرداری سێکس لەپێناوی بەدیهێنانی ئارەزووە سێکسییەکەدا.

### ا-لە کارکەوتنی ئارەزووی سێکسی

هەموو خەڵک لە هێز و تینی ئارەزووی سێکسییاندا وەک یەک نین، هەروەها لە یەک کەسیشدا گوڕوتینی ئارەزووی سێکسی لە بارودۆخە جیاوازەکاندا گۆڕانی بەسەردا دێت، بەڵام کاتێک دەوترێ ئارەزووی سێکسیی کەسێک لەکار کەوتووە، واتە ئەو کەسە لە زۆربەی کاتەکاندا و بەگشتی ئارەزوویەکی کەمی بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان هەیە، ئیدی ئەو ئارەزووە خۆبەخۆ بێ، یان وا پێویست بکات لە ئەنجامی ورووژاندنەوە بێ، لە یەکێک لە سەرچاوە باوەکانی ورووژاندن، واتە لەڕێی خەیاڵ

یان دەنگ یان قسەکردن یان شێوە یان دۆخێکی سێکسیی تایبەتەوە. ئەم لەکارکەوتنە هەر لە سەرەتاوە دەردەکەوێ، یان دەشێ لەدوای سەرەتایەکی سروشتی یان لاوازەوە دەربکەوێ، لەکارکەوتنی ئارەزووی سێکسی یەکێکە لە سکالاکانی تووشبووان بە حاڵەتەکانی لەکارکەوتنی سێکسی، لەبەر ئەوە ١٠% بۆ ٢٧٨%ی ڕێژەی ئەو کەسانە پێک دێنێ کە تووشی لەکارکەوتنی سێکسی بوون (جبوا Geboes ١٩٧٥) و (لایف Lief 1977).

ئەستەمە ناوەڕۆکی ئارەزووی سێکسی وەسف بکرێ، چونکە ئەم ناوەڕۆکە لایەنە فیکری و سۆزدارییەکانیش دەگرێتەوە، کە ئەمانە لایەنی هەستیی تایبەتین و ئەستەمە بۆ تاک گوزارشتیان لێ بکات. هەستکردن بە ئارەزووی سێکسی زنجیرەیەک کردار دەگرێتەوە، وەک چۆنێتیی هاتنی بیرۆکە، یان ئارەزووەکە و دروستبوونی لە دەرووندا، هەروەها ئاستی هاتن و دووبارەبوونەوەی و ئایا ئەو کەسە چۆن بیری لێ دەکاتەوە و گەمەبازیی لەگەڵدا دەکات و لە مێشک و بیرکردنەوەیدا دەیپارێزێ و بۆ دەستکەوتنی هەستێک حەز دەکات ئەو ئارەزووە سێکسییە بەدی بێت، هەروەها ئاستی بەیەکداچوونی لەگەڵ بایەخپێدانەکانی دیکەی تاکدا، ئەمانە و چەندەها ڕوخساری دیکەی هەستکردن بە ئارەزووی سێکسی کە پێویستە دیاری بکرێن تا بتوانرێ بە شێوەیەکی دروست پلەی لەکارکەوتنەکە دەستنیشان بکرێ. بەپێی ئەم باکگراوندە لە تێگەیشتن، لەکارکەوتنی ئارەزووی سێکسی بە شێوەیەک لەم شێوانە یان پلەیەک لەم پلانەی خوارەوە دەردەکەوێ:

١-نەبوونی ئارەزووی سێکسیی گشتی هەر لە سەرەتاوە و لە هەموو بارودۆخ و کاتێکدا. ئەم حاڵەتانە دەگمەن نین، هەندێک کەس، بە ژن و پیاوەوە، ئەوە ڕەت دەکەنەوە هیچ ئەزموونێک یان خولیایەکی سێکسییان بە درێژایی ژیانیان هەبووبێ، هەروەها

جەخت لەوە دەکەنەوە کە هیچ شێوەیەک لە شێوەکانی گەمەبازی، یان کاری سێکسییان تاقی نەکردووەتەوە، بە ماستەربەیشن و خەیاڵ و بەدواداچوونی بابەتە وورووژێنەرە سێکسییەکانیشەوە. ئەم حاڵەتە بە حاڵەتی لەکارکەوتنی سێکسیی سەرەکی دادەنرێ.

٢-لەکارکەوتنی ئارەزووی سێکسیی لاوەکی، ئەم لەکارکەوتنە لە قۆناغێک، یان بارودۆخێکی تایبەتدا دروست بووە، دەشێ لەکارکەوتنێکی تەواو، یان ئەندەکی، یان توند بێ. ئەم لەکارکەوتنە دەشێ گشتی بێ لە هەموو کاتێکدا، یان تەنیا لە هەندێ بارودۆخی تایبەتدا ڕوو بدات. ئەم لەکارکەوتنە لەوانەیە لە کەسێکدا دەربکەوێ کە پێشتر گوڕ و هێزێکی سروشتیی لە ئارەزووی سێکسیدا هەبووبێ، یان لەوانەیە لە کەسێکدا دەربکەوێ کە خۆی هەر لە سەرەتاوە ئارەزووی سێکسیی کەم و لاواز بووبێ. ئەم جۆرە لەکارکەوتنە لە ئارەزووی سێکسیدا، لەوانەیە هۆکارەکەی بەهۆی نەخۆشییەوە بێ، یان خواردنی هەندێ دەرمانی تایبەتی، یان بەهۆی هەندێ نەخۆشییەوە کە پێشتر بە وردی لە بابەتی لاوازیی سێکسیدا باسمان کرد، یان هۆکارەکەی دەروونی بێ و هەندێ جاریش بەهۆی بوونی هەندێ نەخۆشیی ئەندامییەوە ئەو کەسە وا دەزانێ هۆکاری لەکارکەوتنی ئارەزووی سێکسیی بەهۆی تووشبوونەوەیە بەو نەخۆشییانە، واتە لە ڕاستیدا ئەو نەخۆشییانە هیچ پەیوەندییان بە حاڵەتی لەکارکەوتنی ئارەزووی سێکسییەوە نییە، بەڵام ترسی تاک لە پەیوەندیی سێکسی و ترسی لەوەی شکست بێنی و هەروەها ترسی لە دەرئەنجامەکانی بەدیهاتنی ئارەزووەکەی، هەموو ئەمانە دەبنە ئاستەنگ لە بەردەم بەدیهاتنی ئارەزووی سێکسیی ئەو کەسە، لەبەر ئەوە دەشێ واز لەو ئارەزووە بێنێ.

هەروەها لەدەستدانی ئارەزووی سێکسی بەرامبەر بە هاوبەشێکی سێکسیی دیاریکراو، یان لە هەندێ بارودۆخی تایبەتی

ئەو هاوبەشەدا، بۆ نموونە کاتی نەخۆشی، دووگیانی و زەیستانی، لەم دۆخانەدا ئەو کەسە ئارەزووی نامێنێ، یان لاواز دەبێ. هۆکاری دەروونیی دیکەش هەیە کە دەشێ ئارەزووی سێکسی لەناو ببات، بۆ نموونە ترس و دڵەڕاوکێی پیاو لە سەلماندنی توانای پیاوەتیی خۆی و پێداگریکردن لەسەری لەپێناوی سەلماندنی پیاوەتیی خۆی بۆ هاوبەشە سێکسییەکەی، یان بنەماڵە و کۆمەڵگەکەی. لە ئاستەنگەکانی دیکەی ئارەزووی سێکسی، وەک ڕێگرییە ئایینییەکان کە مرۆڤ لە ئارەزوو دووردەخەنەوە، یان دەبنە ڕێگر لە دەرکەوتنی، هەروەها بارودۆخی ژیان کە دەشێ ئەو کەسە لە بارودۆخێکدا بێ ڕێگر بێ لە بیرکردنەوە لە سێکس و بەدواداچوونی ئارەزووی سێکسی، بەڵام گرنگترین هۆکارەکانی لەکارکەوتنی ئارەزووی سێکسی، ئەو هۆکارانەن کە پەیوەندییان بە هاوبەشی سێکسییەوە هەیە، لەوانەیە ئەو هاوبەشە وورووژێنەرێکی باش نەبێ بۆ ئارەزووی سێکسیی هاوبەشەکەی و تەنانەت دەشێ ببێتە هۆی لەکارکەوتنی ئارەزووی سێکسیی هاوبەشەکەی.

لەبەرئەوە ئارەزووی سێکسی لەم کەسانە لەڕێی سێکسکردن لەگەڵ کەسێکی دیکەدا، یان پەیوەندییەکی سێکسیی دیکە، یان وورووژاندن لە لایەن هاوبەشێکی سێکسیی دیکەوە، دەورووژێ. لەو نەخۆشییە دەروونییانەی کە بە شێوەیەکی گشتی، یان ئەندەکی ئارەزووی سێکسی لەکار دەخەن، نەخۆشیی خەمۆکییە، چونکە ئەو دابەزین و لاوازییەی تووشی چالاکییە جەستەیی و دەروونییەکانی تاک دەبێ ئارەزووی سێکسییش دەگرێتەوە، ئەم گشتگیرییەش لە هەموو چالاکییەکانی تاک و ئارەزووی سێکسییشدا بایەخی خۆی هەیە، کاتێ ئارەزووی سێکسی لەو کەسەدا دەگەڕێتەوە، ئەمە بە یەکێک لە ئاماژە گرنگەکانی چاکبوونەوە لە خەمۆکی دادەنرێ، بەڵام لە نەخۆشیی

شیزۆفرینیادا دۆخەکە جیاوازە، ئارەزووی سێکسی دەشێ کەم، یان زیاد بکات، یان بە تەواوی هەر نەمێنێ، بەڵام زۆربەی کات نەخۆش بە شێوەیەکی ناسروشتی و نائاسایی گوزارشتی لێ دەکات کە لە ڕووی شێواز و سروشتی ئارەزووی سێکسی و شێوەی بەدیهاتنییەوە جیاوازە. ئاشکرایە خەڵکی لە ڕووی ئارەزووی سێکسییەوە جیاوازن و هەمووان بە هەمان ورووژێنەر و هەمان پلەی وروووژاندن ناوروووژێن.

هۆکاری ئەم جیاوازییەش لەنێو مرۆڤەکاندا بۆ کۆمەڵێک فاکتەر دەگەڕێتەوە، هەندێکیان پەیوەندیی بە کەسێتیی تاک و ئەزموونەکانییانەوە هەیە و هەندێکیشیان پەیوەندیی بە فاکتەری کۆمەڵایەتی و شارستانی و ئایینییەوە هەیە. جیاوازیی ئەم فاکتەرانە لەنێو تاکەکاندا دەشێ ببێتە هۆی گۆڕان لە حەز و مەیلی سێکسی بە شێوەیەکی گشتی، یان لە هەندێ هەڵوێستی تایبەتدا.

ب- لەکارکەوتنی ڕاستەقینەی کاری سێکسی

دیاریکردنی خاڵی سەرەتا لە کرداری سێکسدا، کارێکی ئەستەمە، چونکە ئەگەر کرداری سێکس بەگشتی وەربگرین، ئەوا ئارەزووی سێکسی بە سەرەتای ئەم کردارە دادەنرێ، بەڵام ئەگەر کردارەکە لە ڕووی ئەنجامدانەوە دیاری بکەین، ئەوا کرداری سێکس لەدوای دروستبوونی ئارەزووی سێکسی و وەڵامدانەوەی پێویست بۆ ڕازیکردنی ئەو ئارەزووە، دیاری دەکرێ. کرداری ڕاستەقینەی سێکس لەڕێی ئەو وەڵامدانەوە فسیۆلۆژییانەوە دیاری دەکرێ کە دەشێ ڕوو بدەن بەهۆی هەوڵدانی تاک بۆ هێورکردنەوەی ئارەزووی سێکسی، وەڵامدانەوە فسیۆلۆژییەکانیش، وەک: ڕەپبوون یان گرژبوونی چووک، هاویشتنی تۆو، ئۆرگازم و هەستکردن بە چێژ کە هاوکاتە لەگەڵ ئەم وەڵامدانەوانەدا. مەرجیشە کرداری سێکس تا کۆتایی

بەردەوام بێ، دەشێ بە هۆیەکەوە، لە یەکێک لە قۆناغەکانی وەڵامدانەوە، بوەستێ.

هەروەک ئارەزووی سێکسی، وەڵامدانەوەی سێکسیش دەشێ هەمووی یان لە یەکێک لە قۆناغەکانی وەڵامدانەوەدا بە شێوەیەکی گشتی یان ئەندەکی لەکار بکەوێ، دەشێ لەکارکەوتنەکە هەر لە سەرەتاوە یان کتوپڕ ڕوو بدات، لەوانەشە لەکارکەوتنی کرداری سێکسی لە هەموو وورووژاندن و کردارە سێکسییەکاندا دەربکەوێ، یان لە چەند شێوەیەکی دیاریکراوی ئەم کردارە سێکسی و وورووژاندنانە دەربکەوێ، یان بە شێوەیەکی هەمیشەیی یان لە هەندێ بارودۆخ و کاتی دیاریکراودا ڕوو بدات. دواجار کاتێ لەکارکەوتنی کرداری سێکس مەزەندە دەکەین، پێویستە کاریگەریی تەمەن بۆ سەر وەڵامدانەوەی سێکسی لە یاد نەکەین، هەروەها کاریگەریی فاکتەرە کۆمەڵایەتی و شارستانییەکانیش بۆ سەر ئەم وەڵامدانەوەدانە.

### لەکارکەوتنی ڕەپبوون

ئەو وەڵامدانەوە فسیۆلۆژییانەی کە کرداری ڕەپبوون دروست دەکەن، ملکەچی فەرمانی چەند کۆئەندامێکن لە جەستەدا، لە هەموویان گرنگتر خۆییە کۆئەندامی دەمارە، وێڕای ئەو هەستانەی کە لە کۆئەندانی زاوزێوە بۆ دڕکەپەتک دەچن.

دەرئەنجامی کۆتایی ئەم ڕەگەزانە پێکەوە، لە سەرەتادا دەبنە هۆی فراوانبوونی خوێنبەرەکان کە ئەمەش گرژی و ڕەپبوون لە چووکدا دروست دەکات.

ئەو لەکارکەوتنەی تووشی کرداری ڕەپبوون دەبێ، پشت بەو فاکتەرانە دەبەستێ کە وەڵامدانەوە فسیۆلۆژییەکان دیاری دەکەن.

ڕەپبوونی چووک یەکەمین قۆناغە لە قۆناغەکانی ئەنجامدانی کرداری سێکس و وەڵامدانەوەی سێکسی، لەوانەیە لە قۆناغی

گەنجێتیدا، ڕەپبوون تەنیا چەند چرکەیەک بخایەنێ، بەڵام بە گرنگترین قۆناغەکانی کرداری سێکس دادەنرێ، نەک تەنیا لە زەین و هەستی خاوەنەکەیدا، بەڵکو لە زەین و هەستی هاوبەشەکەشیدا لە کاری سێکسیدا، چونکە ڕەپبوون ڕووداوێکی هەستپێکراو و بەرجەستەکراوە. لە سەرروو ئەمانەشەوە، ڕەپبوون ئەو ڕووداوەیە کە ئەوە یەکلایی دەکاتەوە، ئایا پیاو دەتوانێ کرداری خستنەناوەوەی چووک ئەنجام بدات، یان ناتوانێ؟ کە بەبێ ڕەپبوون ئەستەمە پەیوەندیی سێکسیی ڕاستەقینە ئەنجام بدرێ، یان بە شێوەیەکی لاواز ڕوو دەدات کە هیچ کام لە ژن و پیاو ڕازی ناکات.

لەبەر ئەوەی دڕینی پەردەی کچێنی لە یەکەم شەوی هاوسەرێتیدا پشت دەبەستێ بە هێزی ڕەپبوون و ماوەی ڕەپبوونی لە کاتی بەرکەوتنی ڕاستەقینەی لەگەڵ ئەندامی ژندا. ڕەپبوون و توانای خستنەناوەوە بە بەڵگەی یەکلاییکەرەوەی توانستی سێکسیی پیاو دادەنرێ، هەروەک چۆن شکستهێنان لەمەدا بە بەڵگەی نەتوانینی پیاو Impotence دادەنرێ، بەڵام بڕیاری تەواو لەسەر نەبوونی توانای ڕەپبوون و سێکسکردن پێویستە دوای ئەو کاتە بدرێ کە ئەوە ڕوون بێتەوە، ئایا ڕەپبوون ڕووی داوە، یان ڕەپبوون بەشی پێویست ڕووی نەداوە و چووک بۆ ماوەیەکی زەمەنیی پێویست لە دۆخی ڕەپبووندا نەماوەتەوە تا کردای خستنەناوەوە بە سەرکەوتوویی جێبەجێ بکات.

لەکارکەوتنی ڕەپبوون پلەی جیاوازی هەیە، ئەم پلانە لە ڕووی هێز و لاوازییەوە دەگۆڕێن، ئەویش بەپێی چەند فاکتەرێک، وەک: پلەی پاڵنەری سێکسی، ئارەزووی سێکسی و بوونی فاکتەری وروووژێنەر، ئامادەباشیی جەستەیی و دەروونی بۆ وەرگرتن و پێشوازیکردن لەم وروووژێنەرانە و وەڵامدانەوەیان، هەروەها

فاکتەری تەمەن و درێژیی ماوەی زەمەنی تێپەڕبوو بەسەر دوایەمین ڕەپبوون، یان پەیوەندیی سێکسیدا. دواجار لایەنە سەرنجڕاکێشەرە سێکسییەکان کە لە پەیوەندییەکەدا هەن لە ڕووی هاوبەشیی سێکسی و ئەو بارودۆخەی کە پەیوەندییە سێکسییەکەی تیادا ئەنجام دەدرێ، کار دەکاتە سەر کرداری ڕەپبوون، یان شکستهێنان و لەکارکەوتنی ڕەپبوون، چونکە کرداری ڕەپبوون بەپێی هاوبەشە سێکسییەکە و کات و بارودۆخی پەیوەندییەکە دەگۆڕێ، دەشێ ڕەپبوون لەگەڵ هاوبەشێکی سێکسیی دیاریکراودا ڕوو بدات و ماوەیەکی زەمەنیی پێویست بخایەنێ، یان بە شێوەیەکی تەواو، یان ئەندەکی ئەو پیاوە لە کردارێکی سێکسیی خۆییدا، یان هۆمۆسێکسوالیتی، یان سروشتی، یان بارودۆخێکی تایبەتی، یان هاوبەشێکی سێکسیی دیاریکراو، شکست بێنێ.

لەبەر ئەم واقیعە تێگەیشتنی باو بەرامبەر بە زاراوەی لەکارکەوتنی ڕەپبوون گۆڕانی بەسەردا هات.

ئەگەر تەواوی ئەم فاکتەرانەمان بە هێند وەرگرت، ئەوا بۆمان دەردەکەوێ کە جۆر و پلەی جیاواز لە حاڵەتی لەکارکەوتنی ڕەپبووندا هەن، کە دەکرێ لە سێ گرووپی جیاوازدا کۆبکرێنەوە:

یەکەمیان: حاڵەتەکانی لەکارکەوتنی گشتی، یان نیمچەگشتی کە هەندێ خەڵک هەر لە سەرەتای ژیانی سێکسییانەوە بەدەستییەوە دەناڵێنن. ئەم حاڵەتە بە لەکارکەوتنی سەرەکیی ڕەپبوونیش دەناسرێ، پیاوی تووشبوو بەزۆری ئارەزووی سێکسی نییە و توانای دڕینی پەردەی کچێنی و جووتبوونی نییە، هەروەها ناتوانێ ماستەربەیشن، یان پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتیی هەبێ. زۆربەی ئەو پیاوانەی تووشی ئەم حاڵەتە دەبن، بە درێژایی ژیانیان ئەم لەکارکەوتنەیان چاک نابێتەوە، هەرچەندە وورووژێنەری سێکسی هەبێت و چارەسەریشیان بۆ بکرێ.

ڕێژەی تووشبوون بەم حاڵەتە لەنێو خەڵکدا زۆر کەمە، لە لێکۆڵینەوەکەی کنزی کە لەسەر ٤١٠٨ پیاو لە ساڵی ١٩٤٨دا ئەنجام درابوو، دەرکەوت تەنیا ٦٦ واتە ١.٦%یان تووشی ئەم جۆرە لەکارکەوتنە بووبوون.

لەوانەیە ئەم ڕێژەیە کەمێک بەرز بوایە، ئەگەر تووشبوان بە لەکارکەوتنی ڕەپبوون لە هەستی خۆبەکەمزانین ڕزگاریان بوایە.
هەرچی گرووپی دووەمە لە حاڵەتەکانی لەکارکەوتنی ڕەپبوون، ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە بە شێوەیەکی هەمیشەیی هەست بە لاوازیی توانای سێکسیی خۆیان دەکەن، یان هاوبەشە سێکسییەکەیان وا هەست دەکات، یان ناتوانن بۆ ماوەیەکی درێژ چووکیان لە کاتی خستنەناوەوە و جووتبووندا، لە دۆخی ڕەپبووندا بهێڵنەوە. ئەم گرووپە لەنێو گەنجاندا ڕێژەیان زۆر کەمە، بەلام لەگەڵ چوون بەرەو قۆناغەکانی تەمەندا ڕێژەکە بەرز دەبێتەوە و لە تەمەنی سیوپێنج ساڵیدا بە ١.٣% و لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا بە ٦.٧% و لە تەمەنی شەست ساڵیدا ١٨.٤% و لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا ٢٧% و لە حەفتاوپێنج ساڵیدا بە ٥٥% مەزەندە دەکرێ. هەرچەندە ئەوە ئاشکرایە هۆکاری ئەو لاوازییەی کە هاوکاتە لەگەڵ چوون بەتەمەندا، پەیوەندیی بەتەمەنەوە هەیە، بەلام دەشێ هۆکاری دیکەش هەبن کە یارمەتیدەر بن لە ڕوودانی ئەم جۆرە لاوازییە لە ڕەپبووندا.

هەرچی گرووپی سێیەمە، لە هەموو گرووپەکانی دیکە بەرفراوانترە و ڕوودانی فرە هۆکارترە، بەلام هەموویان لە یەک شتدا هاوبەشن، ئەویش ئەوەیە پیاو توانای ڕەپبوونی لە ئەزموونێکی سێکسیی دیاریکراودا هەیە و لە یەکێکی دیکەدا نییەتی، بۆ نموونە توانای ڕەپبوونی لە پەیوەندییەکی هۆمۆسێکسوالیتیدا هەیە، بەلام لە پەیوەندییەکی سێکسیی سروشتیدا، واتە لەگەڵ ژندا نییەتی، یان لەوانەیە پیاو توانای

ڕەپبوونی تەنیا لەگەڵ یەک ژندا هەبێ، یان تەنیا لە یەک کات و شوێندا و لە یەک دۆخی سێکسییشدا بتوانێ سێکس بکات.

بۆ نموونە دەشێ پیاوی تووشبوو بەم جۆرە لەکارکەوتنە، لەگەڵ ژنانی لەشفرۆشدا چووکی بە تەواوی ڕەپ ببێ، بەڵام لە شەوی یەکەمی زاوایەتیدا توانای جووتبوونی لەگەڵ ژنەکەیدا نەبێ بەهۆی ڕەپنەبوونی چووکییەوە، یان دەشێ لە شەوی یەکەم و لە بارودۆخی ئاهەنگ و زاوایەتیدا بەهۆی ڕێگری و دڵەڕاوکێوە، توانای ڕەپبوونی چووکی نەبێ، بەڵام دواتر لە بارودۆخی ئاساییدا بە ئاسانی توانای ڕەپبوون و جووتبوونی لەگەڵ ژنەکەیدا هەبێ، هەروەها دەشێ ڕەپنەبوونی چووک و نەبوونی ئارەزووی سێکسی بەهۆی هاوبەشە سێکسییەکەی ئەو پیاوەوە بێ، بۆ نموونە ئەو ژنە ڕێگەی پێ نەدات و سێکس ڕەت بکاتەوە، وەک لە هاوسەرە تازەکاندا، یان لە کاتی کەوتنە سووڕی مانگانەی ژنەوە ڕوو دەدات.

ئەم حاڵەتانە، بەتایبەتی ئەو ڕەپنەبوونەی لە سەرەتای ژیانی هاوسەرێتیدا ڕوو دەدات، ناکرێ لە ڕووی مانای زاراوەکەوە بە لەکارکەوتنی ڕەپبوون دابنرێ، چونکە ئەم لەکارکەوتنە لەکارکەوتنێکە پەیوەندیی بە بارودۆخێکەوە هەیە کە سروشتی ژیانی سێکسی و دەروونی ژن، یان پیاو، یان هەردووکیان ئاشکرا دەکات. لەبەر ئەوە وا پێویست دەکات لە وەسفکردنی ئەم حاڵەتانەدا زاراوەی لەکارکەوتنی ڕەپبوون بەکار نەهێنرێ.

ئەم سێ گرووپەی باسمان کردن جۆرە جیاوازەکانی لەکارکەوتنی ڕەپبوون لەخۆ دەگرن، لەبەر ئەوە ئەو توێژەرەی کار لەسەر حاڵەتی لەکارکەوتنی ڕەپبوون دەکات، پێویستە نەک تەنیا پلەی لەکارکەوتنەکە هەڵسەنگێنێ، بەڵکو پێویستە ماوەی زەمەنی و ئەو بارودۆخەش لە بەرچاو بگرێ کە ڕەپنەبوونەکە تیادا ڕووی داوە. ئەم جۆرە گەڕان و توێژینەوە وردەش تەنیا لە

هەڵبژاردنی چارەسەری گونجاودا پێویست نییە، بەڵکو بۆ حاڵەتی یەکلاییکردنەوەی مەسەلە یاساییەکانیش پێویستە کاتێ پیاو بەهۆی نەبوونی توانای ڕەپبوونەوە لە ژنەکەی جیا دەبێتەوە، ئیدی ئەم دۆخە هەر لە سەرەتای هاوسەرێتییەوە بێ یان دواتر بێ.

لەوانەیە لێرەدا و لەم بەشەی توێژینەوەکەماندا کارێکی پێویست بێ جەخت لە فاکتەرە دەروونییەکان بکەینەوە کە کاریگەرییان بۆ سەر ڕەپبوون هەیە، ئەم جەختکردنەوەیەمان لە بابەتی ژیانی سێکسی بەگشتی و لە گشت قۆناغەکانی وەڵامدانەوە دەروونی و سێکسییەکانیشدا، باس کرد. تەواوی ئەزموون و تێبینیی ئەو پیاوانە کە تووشی پلەیەک لە پلەکانی ڕەپبوون بوون، ئاماژە دەدەن بە بوونی فاکتەری دەروونی لە هەموو حاڵەتەکانی لەکارکەوتندا، بەتایبەتی حاڵەتی لەکارکەوتنە توند و کتوپڕەکان، هەروەها ڕوودانی هەر پلەیەک لە لەکارکەوتنی ڕەپبوون هەر هۆکارێکەوە بێ، دەروونی بێ، یان جەستەیی، دەشێ زیاتر و توندتر ببێ بەهۆی ئەو دڵەڕاوکێ و خەمۆکییەوە کە پیاو بەهۆی ئەم لەکارکەوتنەوە تووشی دەبێ. ئەم واقیعە ئەگەر بەردەوام بوو، دەشێ بازنەیەکی بەتاڵ و بەرفراوان لە دڵەڕاوکێ و لەکارکەوتن دروست بکات، لەبەر ئەوە پێویستە ئەم ئەڵقەیە بشکێنرێ تا ئەو پیاوە لەو بارە دەروونییە ناخۆشە ڕزگاری ببێ.

هەر لەم باسەدا، پێویستە ئاماژە بەوە بدەین، هێزی ڕەپبوون هەمیشە هێزی شەهوەت و ئارەزووی سێکسی ناگەیەنێ، زۆرێک لە پیاوان ئەم توانایەیان هەیە، بەڵام لەگەڵ بوونی ئارەزووی سێکسیدا هاوکات نییە، تەنانەت دەشێ بەبێ ڕوودانی تووهاویشتن و گەیشتن بە ئۆرگازم کۆتایی بێت. هەندێ حاڵەتی دەگمەنیش هەیە کە پیاو بە شێوەیەکی هەمیشەیی لە دۆخی

ڕەپبووندا دەمێنێتەوە، ئەم حاڵەتە بە ڕەپبوونی بەردەوام Priapismناسراوە، نەخۆش لە دۆخی ڕەپبوونێکی بەردەوام و ئازاراویدا دەژی، بەڵام ئەم ڕەپبوونە لە هەموو ناوەڕۆکێکی سێکسی بەتاڵە، هۆکارەکەی بۆ ورووژانی هەندێ بەشی کۆئەندامی دەمار بە شێوەیەکی درێژخایەن، ڕوو دەدات. دواجار پێویستە ئەوە لە یاد نەکەین، دوو جۆر ڕەپبوون هەیە، یەکێکیان لە کاتی نووستندا و ئەوی دیکەیان لەگەڵ بێداربوونەوە لە خەو. ئەم دوو ڕەپبوونە خۆبەخۆ ڕوو دەدەن و مەرج نییە هیچ ناوەڕۆکێکی سێکسییان لەگەڵدا بێ کە پەیوەندیی بە خەون و یان دۆخی بێداربوونەوە هەبێ، بەڵام گرنگیی ئەم دوو حاڵەتی ڕەپبوونەوە لەوەدایە، ئەگەر ئەم دوو جۆرە ڕەپبوونە ڕوویان نەدا، یان ڕەپبوون بە لاوازی ڕووی دا، دەشێ ئاماژە بن بۆ لاوازییەکی هاوشێوە لە هێز و گوڕی ڕەپبوون لە حاڵەتی بێداری و کاتە ئاساییەکانی دیکەشدا، بەڵام هاوکات ناکرێ، ڕەپبوونی کاتی نووستن و بێداربوونەوە بە بەڵگە دابنرێ بۆ ئەوەی کە ئەو پیاوە هێز و گوڕێکی سێکسیی هاوشێوەی هەیە لە کاتی بەئاگایی و کاتە ئاساییەکانی دیکەدا.

دواجار پێویستە ئەوە بڵێین، چەندەها حاڵەتی نەخۆشی هەن کە توانای ڕەپبوون لە پیاودا لاواز دەکەن، لەو حاڵەتانەش وەک ئەو نەخۆشییانەی کە بە شێوەیەکی گشتی تووشی جەستە دەبن، لە هەموویان گرنگتر شکستهێنان و لەکارکەوتنی گورچیلە و نەخۆشییە هۆرمۆنییەکانە، لە هەمووشیان دیارتر نەخۆشیی شەکرە و بەمۆمبوونی جگەر و لەکارکەوتنی ڕژێنەکان و نەخۆشییەکانی کۆئەندامی دەمارە، بەتایبەتی ئەو نەخۆشییانەی تووشی دڕکەپەتک دەبن، هەروەها ئەو نەخۆشییانەی تووشی

کۆئەندامی زاوزێ، یان لوولەکانی خوێن دەبن، هەروەها حاڵەتەکانی دەستتێوەردانی نەشتەرگەری، بەتایبەتی لابردنی ڕژێنی پرۆستات و مێزەڵدان، هەروەها بڕینی دەمارەکانی سەمپەساوی و بەکارهێنانی دەرمانی پزیشکی، وەک ئازارشکێن و هێورکەرەوە و وەستێنەرەکان و دەرمانە بێهۆشکەرەکان و ئەو دەرمانانەی چارەسەری بەرزیی پەستانی خوێن و چەندان حاڵەتی دیکەی نەخۆشی دەکەن.

## لەکارکەوتنی توانای هاویشتنی تۆو

هاویشتنی تۆو قۆناغی دووەمە لە قۆناغەکانی وەڵامدانەوەی سێکسی (یان قۆناغی سێیەمە ئەگەر قۆناغی هەڵسان و ڕەپبوونمان بە دووەم قۆناغ دانا)، ئەم قۆناغە فسیۆلۆژییە، قۆناغێکی کاردانەوەییە و خۆبەخۆ لە کاتی گەیشتن بە خاڵێکی دیاریکراو لە ورووژانی سێکسی، ڕوو دەدات.

قۆناغی هاویشتنی تۆو لە دوو قۆناغ پێک دێ، قۆناغی یەکەم، ئەو قۆناغەیە کە پیاو هەست دەکات هاویشتنی تۆو شتێکی حەتمییە Ejaculatory Inevitability، قۆناغی دووەمیش بریتییە لە هاویشتنی تۆو بۆ دەرەوەی چووک. پیاو لە کاتی پرۆسەی سێکسکردندا تا بە قۆناغی حەتمییەتی هاویشتنی تۆو دەگات، دەتوانێ کۆنترۆڵی هاویشتن بکات، بەڵام بە دەستپێکردنی ئەم قۆناغە ئیدی ناتوانێ هاویشتنی تۆو بوەستێنێ، یان دوای بخات، بەڵام هەندێجار لەم قۆناغەدا دەتوانێ ڕێ لە هاویشتنی تۆو لەناو زێدا بگرێ، ئەگەر بە خێرایی چووکی بەرەو دەرەوە ڕاکێشا بەر لەوەی هاویشتن بە تەواوی ڕوو بدات.

ئەم قۆناغە لە قۆناغەکانی وەڵامدانەوەی سێکسیدا ڕۆڵێکی گرنگی لە پەیوەندیی سێکسیی نێوان ژن و پیاودا هەیە، بایەخی ئەم قۆناغە لە بایەخی ڕەپبوون کەمتر نییە، چونکە لەم قۆناغەدا

که هاویشتنی تۆو ڕوو دەدات، بڕیار لەسەر گەیشتنی پیاو بە ئۆرگازم دەدرێ، هەروەها ئەگەری گەیشتنی ژنیش بە ئۆرگازم دەشێ هەر لەم قۆناغەدا بێ، چونکە هاویشتنی تۆو ئاگادارکردنەوەی هەردوو لایە بە کۆتاییهاتنی پەیوەندییە سێکسییەکە. لەبەر ئەوە ئەو ماوە زەمەنییەی لە ماوەی پرۆسەی ڕەپبوون و پەیوەندیی سێکسیدا، هاویشتنی تۆوی تیادا ڕوو دەدات، کاریگەرییەکی گەورەی بۆ سەر هەردوو هاوبەشە سێکسییەکە هەیە.

لەکارکەوتن یان ڕوودانی پشێوی لە قۆناغی هاویشتنی تۆودا Dysfunction of Ejaculation فرەجۆر و فرەهۆکارە. لە گرنگترین جۆرەکانی پشێوی کە دەشێ ڕوو بدات بریتییە لە هاویشتنی تۆو بەبێ ڕەپبوونی چووک، یان بەبێ ڕەپبوونی تەواوی چووک، یان بەر لە کاتی خۆی ڕوو بدات، واتە بەر لە خستنەناوەوە، یان بە ماوەیەکی کورت لەدوای خستنەناوەوە، یان هاویشتن هەر ڕوو نەدات، یان ڕوو بدات، بەڵام بڕی تۆوی فڕێدراو زۆر کەم بێ، یان زوو ڕوو بدات بێ ئەوەی دوو قۆناغەکەی هاویشتن، واتە حەتمییەتی هاویشتن و هاویشتنی ڕاستەقینەی تۆو لە یەک جیا بکرێنەوە، یان ڕوو بدات بەبێ ئەوەی پیاو هەست بە ڕوودانی بکات، یان پێشبینیی ڕوودانی بکات، یان هەست بە چێژ و گەیشتن بە ئۆرگازم بکات. سەرجەم ئەم جۆرانە بە پشێوییەکانی هاویشتنی تۆو ناسراون و لە سکاڵاکانی نەخۆشەکاندا دووبارە دەبنەوە و وا پێویست دەکات دیاری بکرێن و هۆکارەکانیان دەستنیشان بکرێ.

لێرەدا باسی گرنگترین جۆرەکانی لەکارکەوتنی هاویشتنی تۆو دەکەین.

1- زووهاویشتن

هاویشتنی زوو بەر لە کاتی خۆی Premature Ejaculation، ئەو هاویشتنەیە کە بەر لە کاتی خۆی ڕوو دەدات، یان خێراتر لە کاتی ئاسایی خۆی.(**) دەشێ هاویشتن بەر لە ڕەپبوون یان بەر لە خستنەناوەوە، یان بە ماوەیەکی کورت لەدوای خستنەناوەوە، ڕوو بدات. تەواوی ئەم حاڵەتانە باون، هەندێکیشیان هاوکاتن لەگەڵ حاڵەتی لەکارکەوتنی توانای ڕەپبوون، بەڵام بە زۆری ئەو کەسانەی تووشی پشێوییەکانی هاویشتن دەبن، توانای ڕەپبوونیان سروشتییە، یان بەشی پێویست دەکات. ئەم جۆرە لە لەکارکەوتنی توانای هاویشتن، لەنێو خەڵکدا باوە و زۆرینەی ئەو حاڵەتانەی کە لە ڕووی هەستکردن بە چێژی سێکس سکالایان هەیە، تووشی ئەم جۆرە پشێوییە بوون، شارەزاییان لێکۆڵینەوەی زۆریان دەربارە کردوون، لەوانە وەک لێکۆڵینەوەکەی د. چسرChesser، هەروەها لێکۆڵینەوەکەی ماستەرز و جۆنسۆن کە ساڵی ١٩٧٠ لەسەر ٤٤٨ حاڵەت لە حاڵەتەکانی لەکارکەوتنی سێکسی، ئەنجامیان دا، بۆیان دەرکەوت، ١٨٦یان واتە زیاتر لە سێ بەشی ئەو پیاوانە، بەدەست لەکارکەوتنی هاویشتنی زووەوە نالاندوویانە. زۆربەی ئەو پیاوانەی کە قسەیان لەسەر ئەم حاڵەتە کردووە، ئەوانە بوون کە تازە ژنیان هێناوە و ئارەزووی سێکسییان هێندە بەهێز بووە کە نەیانتوانیوە کرداری هاویشتنی تۆو دوا بخەن.

زووهاویشتن لە کەسانی دیکەشدا ڕوو دەدات، وەک لە هەرزەکاراندا کە پەرۆشی و ئارەزوویەکی بەگوڕیان بۆ سێکس هەیە و ناتوانن کۆنترۆڵی خۆیان بکەن، هەروەها ئەو پیاوانەش کە بە گران چووکیان ڕەپ دەبێ، یان ماوەی ڕەپبوونی چووکیان زۆر کورتە، بۆیە دەیانەوێ بە خێرایی هاویشتن ڕوو بدات.

هۆکاری زووهاویشتن یان هاویشتنی زوو، زۆرن، وەک ڕاهاتنی پیاو لەسەر زووهاویشتن، بۆ نموونە لە قۆناغی هەرزەکاریدا کوڕ وەڵامدانەوەی سێکسیی بۆ وروووژێنەرە سێکسییەکان لەڕێی خێرا هاویشتنەوە دەبێ.

هەندێ جاریش بەهۆی لاوازیی ڕەپبوونەوە، یان کەمیی ئارەزووی سێکسی ڕوو دەدات، یان دەشێ بەهۆی ڕاهاتنی پیاوەوە بێ لەسەر شێوازی سێکسیی خێرا، ئەویش تەنیا بە مەبەستی خۆ بەتاڵکردنەوە، وەک لە حاڵەتی ماستەربەیشن و سێکس لەگەڵ لەشفرۆشدا ڕوو دەدات، یان بەهۆی هەندێ بارودۆخی تایبەتییەوە کە وا پێویست دەکات ئەو پەیوەندییە سێکسییە زوو تەواو بکرێ، بەڵام کاتێ ئەو پیاوە لە بارودۆخی سروشتی لەگەڵ ژنەکەیدا سێکس دەکات، دیسانەوە بە هەمان خێرایی هاویشتن ڕوو دەدات و ناتوانێ کۆنترۆڵی خۆی بکات، چونکە لەسەر دۆخی زووهاویشتن ڕاهاتووە.

زووهاویشتنی تۆو لە پیاودا هۆکاری دیکەی هەیە، بۆ نموونە دەشێ پیاو لە ڕوانگەیەکی بەرتەسک و سنووردار لە سێکس بڕوانێت، یان وەک ئەرکێک تەماشای بکات و بۆ بەتاڵکردنەوەی شەهوەت و ئارەزووی خۆی، یان تەنیا بۆ بە مەبەستی دروستکردنی منداڵ سێکس بکات. ئەو پیاوانەش هەن کە گوێ لە چاوەڕوانییەکانی ژن ناگرن و مافی تێربوون و ڕازیبوونی لە پەیوەندیی سێکسی فەرامۆش دەکەن، لەبەر ئەوە خۆیان نارەنجێنن و هیچ هەوڵێک نادەن بۆ فەراهەمکردنی گونجان و سازان لە نێوان پێویستییە سێکسییەکانی خۆیان و پێویستییە سێکسییەکانی ژنەکەیاندا.

لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆربەی حاڵەتەکانی پشێویی زووهاویشتنی تۆو بە هۆکارێکی دەروونییەوە ڕوو دەدات، یان هۆکارەکەی بۆ ڕاهاتنی پیاو لەسەر زووهاویشتن لە قۆناغی هەرزەکاریدا

دەگەڕێتەوە، یان بۆ بارودۆخێکی تایبەتی، یان دەشێ هۆکارەکە پەیوەندیی بە ئایین و هەستکردن بە گوناهەوە هەبێ، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، هەندێ حاڵەت بۆ هۆکاری ئەندامی دەگەڕێتەوە، بەتایبەتی تووشبوون بە نەخۆشی لە کۆئەندامی دەمار و درکەپەتک، یان تووشبوون بە مۆمبوونی جگەر، هەروەها ئەو حاڵەتانە کەمن کە هاوکاتن لەگەڵ تووشبوون بە هەندێ نەخۆشیی جەستەیی بەگشتی، ئەم حاڵەتانە ڕێژەیەکی کەم لە کۆی حاڵەتەکانی پشێویی زووهاویشتن پێک دەهێنن، بەگشتی هۆکارە دەروونییەکان بەتایبەتی دڵەڕاوکێ و ئەوانەی هەڕەشەن بۆ سەر پیاو، بە گرنگترین هۆکارەکانی زووهاویشتن دادەنرێن، هەروەها پێویستە لە مەسەلەی هۆکارە دەروونییەکاندا، سروشتی پەیوەندیی نێوان ژن و پیاو، یان دوو هاوبەشە سێکسییەکە فەرامۆش نەکەین، دەشێ سروشتی پەیوەندیی سێکسیی نێوان ئەو دوو هاوبەشە وا بخوازێ کە کرداری هاویشتنی تۆو خێرا ڕوو بدات، ئیدی ئەوە بەهۆی بوونی هەستێکی شەڕانگێزی بێت، یان بەهۆی نەبوونی گونجان و سازانەوە بێت لە نێوانیاندا، هەروەها لەوانەیە ئەو خێراییە گوزارشت بێ لەوەی کە ئەو پیاوە ڕەچاوی ئارەزووی هاوبەشە سێکسییەکەی دەکات کە دەیەوێ پەیوەندییەکە زوو تەواو بێ، ئیدی بە هەر هۆکارێکەوە بێت کە پەیوەندیی بە دەروونی، یان حاڵەتی تەندروستیی گشتی، یان ئەندامێکی دیاریکراوی جەستەی ژنەکەیەوە هەبێ.

### ٢- درەنگهاویشتن، یان ڕوونەدانی

درەنگهاویشتن یان ڕوونەدانی Retarded or Absent Ejaculation، لەو جۆرەی پێش خۆی دەگمەنترە، بەڵام لەبەر دوو هۆکاری سەرەکی بە لەکارکەوتنێکی گرنگ دادەنرێ. یەکەمیان، چونکە پیاو لە گەیشتن بە ئۆرگازم بێبەش دەکات و

زۆر دوای دەخات. دووەمیشیان، لەوانەیە ڕێگر بێ لە ڕوودانی هاویشتنی تۆوی پێویست بۆ کرداری پیتێن و دروستبوونی منداڵ.

دوو جۆری سەرەکی لە ڕوونەدانی تۆوهاویشتن هەیە، یەکێکیان سەرەکییە و هەر لە سەرەتای نەرزەبوونەوە ڕوو دەدات، هەرچی جۆری دووەمیشە دواتر لە هەر تەمەنێکدا بە هەر هۆکارێکەوە ڕوو دەدات، ئەم جۆرەی دووەمیان لە جۆری یەکەم زیاتر ڕوو دەدات و ڕێژەی پیاوانی تووشبوو بەم جۆرە، بەرزترە. کینزی لە لێکۆڵینەوەکەیدا ئاماژەی بەوە داوە ٤٠%ی پیاوان بەدەست ڕوونەدانی هاویشتنی تۆوەوە دەناڵێنن، بەڵام ماستەرز و جۆنسۆن دەڵێن لە ماوەی ١١ ساڵ کارکردنمان لە نۆرینگەی چارەسەرکردنی لەکارکەوتنی سێکسی، تەنیا یەک حاڵەتمان تۆمارکردووە کە تووشی لەکارکەوتنی توانای هاویشتنی تۆو بووە.(***)

لە گرنگترین ئەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی ڕوونەدانی هاویشتنی تۆو، هۆکاری دەروونین، بەتایبەتی ئەو هۆکارانەی دەرئەنجامی ئەزموونەکانی قۆناغی منداڵین، کە دەبنە ڕێگر لە بەردەم مەسەلە سێکسییەکاندا، ئەمەش وا دەکات مێردمنداڵ و هەرزەکار لە هەست و سۆزیاندا لە سێکس دووربکەونەوە.

هەروەها ترس لە دووگیانیی ئەو هاوبەشەی سێکسی لەگەڵ دەکرێ، یەکێکی دیکەیە لە هۆکارەکان، بەتایبەتی ئەمە لەدوای ڕوودانی ئەزموونێکەوە ئەم ترسە دروست دەبێت کە ئەو ئەزموونە دڵەڕاوکێیەکی زۆری بۆ کوڕە هەرزەکارەکە دروست کردبێ، ئەم جۆرە ئەزموونانەش لە ژیانی کوڕانی هەرزەکاردا دەگمەن نین. لە هۆکارەکانی دیکەی ئەم لەکارکەوتنە، بەکارهێنانی هەندێ ماددەی هێورکەوەرەوە، یان لەکارخەر، یان ئازارشکێنە، هەروەها چەندان دەرمانی دیکە هەن کە توانای هاویشتن کەم

دەکەنەوە، یان هەر نایهێڵن. هەندێ حاڵەتی دیکەش هەن کە هاویشتن ڕوو نادات، بۆ نموونە لە هەندێ بارودۆخی تایبەتدا پیاو ناتوانێ هیچ تۆوێک بڕژێ، بەڵام لە باردودۆخی ئاساییدا بە شێوەیەکی سروشتی ئەو کردارە ئەنجام دەدات، بۆ نموونە زۆربەی زۆری ئەو پیاوانەی بەزۆر لاقەی کەسانی دیکە دەکەن، ناتوانن کرداری هاویشتن ئەنجام بدەن، هەندێ کەسیش تەنیا لەگەڵ یەک هاوبەشی سێکسیدا دەتوانن ئەو کردارە ئەنجام بدەن، یان تەنیا لە یەک بارودۆخ و لە یەک دۆخی سێکسیی دیاریکراودا. سەرجەم ئەم حاڵەتانە، دەکرێ لەسەر بناغەی ڕەتکردنەوەی دەروونی لێکدانەوەیان بۆ بکرێ، کە ئەم ڕەتکردنەوەیە لە هەڵوێستێکدا خۆی بەسەر ئەو کەسەدا دەسەپێنێ و لە هەڵوێستێکی دیکەدا خۆی ناسەپێنێ. سەرباری هۆکارە دەروونییەکان، کۆمەڵێک هۆکاری ئەندامی هەن کە هۆکاری هاوشێوەن لەگەڵ ئەو هۆکارە ئەندامییانەی دەبنە هۆی لەکارکەوتنی توانای ڕەپبوون، هەروەها هۆکارێکی دیکەش هەیە بۆ ئەم حاڵەتە کە بریتییە لە دروستبوونی ڕوانگەیەکی نێگەتیڤ بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان لای تاک، کە ئەم ڕوانگەیە دەبێتە بەشێک لە سروشت و مۆرکی ئەو کەسە بە درێژایی ژیانی و دەشێ کار بکاتە سەر هەر قۆناغێک لە قۆناغەکانی وەڵامدانەوەی سێکسی، یان سەرجەم قۆناغەکان. دواجار سروشتی پەیوەندیی نێوان پیاو و هاوبەشە سێکسییەکەی، کاریگەریی بۆ سەر توانای هاویشتنی تۆو هەیە لە پیاوەکەدا، دەشێ ئەم پەیوەندییە ئاڵۆز بێ و ئەو ژن و پیاوە ڕێکەوتن و سازانی تەواو لە نێوانیاندا نەبێ، لەبەر ئەوە پەیوەندیی سێکسیی نێوانیان لەوانەیە بە شێوەیەکی سروشتی کۆتایی پێ نەیەت، بە قۆناغی هاویشتنی تۆویشەوە، یان پیاوەکە بە هۆکارێکەوە ئارەزووی دروستکردنی منداڵی نەبێ، هەر هەمان حاڵەت ڕوو

دەدات و پیاوەکە توانای تۆوهاویشتن لەدەست دەدات. هەندێ جاریش پیاو هەست دەکات کە تۆوەکەی فڕێ داوە، بەڵام ئەو شلەی تۆواوە بەرەو دەرەوە نایەت بەهۆی گەڕانەوەی بۆ دواوە، بەم شێوەیە تۆواوەکە بەرەو میزەڵدان دەکشێتەوە، لەجیاتی تێپەڕینی بە ناو میزەڕۆی چووکدا، هۆکاری ئەم دۆخە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ئەندامییە، وەک لە زۆربەی نەخۆشی و نەشتەرگەرییەکانی ئەو ناوچانەدا ڕوو دەدات و دەمارە سەمپەساوییەکان توانای کۆنترۆڵکردنی گیرەی ناوەکیی میزڵدان لەدەست دەدەن. ئەم بارە بە زۆری لە نەشتەرگەریی میزەڵدان و ڕووداوی بەرکەوتنی توند و شکانی ناوچەی حەوزدا ڕوو دەدات. بەدەر لەم هۆکارانە، هەندێ پیاو ئەو توانایەیان هەیە کۆنترۆڵی هاویشتنی تۆواوەکەیان بکەن لەڕێی ڕێگرتن لە هاویشتنی و کۆکردنەوەی، بەم شێوەیە بڕێک لەم تۆواوە بەرەو میزڵدان دەڕوات، بەم جۆرە سێکسە دەوترێت جووتبوونی پارێزراو Coitus Reservatusهەر لەم بارەیەوە بڕوا وایە شێوازی پاراستنی شلەی تۆواو شێوازێک بووە بۆ ڕێگرتن لە دووگیانی و بە درێژایی چەندین سەدە پەیڕەو کراوە، هەروەها سۆفیە یۆگییەکان کە پێیان وا بوو شلەی تۆواو ئەقڵ بەهێز دەکات، خۆیان لەسەر ئەوە ڕاهێناوە کە کۆنترۆڵی ڕۆیشتنی تۆواو بکەن ڕووەو میزڵدان ئاراستەی بکەن لەجیاتی ڕۆیشتنی ڕووەو دەرەوەی لەش و فڕێدانی و بەخەساربردنی، ئەویش بە مەبەستی پارێزگاریکردنی زیندوویێتیی ئەقڵ و بەخشینی وزەی پێویست پێی.

**لەکارکەوتنی ئۆرگازم**

ئۆرگازم دوا قۆناغی وەڵامدانەوەی سێکسییە و ئەم قۆناغە هاوکاتە لەگەڵ قۆناغی هاویشتنی تۆودا، ئەوەندە پێکەوە ڕوو دەدەن ئەستەمە لە یەکدی جیا بکرێنەوە. دەکرێ قۆناغی هاویشتنی تۆو بە قۆناغی کۆتایی وەڵامدانەوەی سێکسی دابنرێ و ئۆرگازمیش وەک دیوە هەستی یان دەروونییەکەی ئەم وەڵامدانەوەیە تەماشا بکرێ. ئۆرگازم ئەو چێژە بە تاک دەبەخشێ کە بە لوتکەی هەستکردن بە چێژ، یان بەرزترین پلەکانی چێژ وەسف دەکرێ. هەرچەندە زۆر کەس ناتوانن هاویشتنی تۆو لەگەڵ ئۆرگازمدا لە یەک جیابکەنەوە، لەبەر ئەوەی هەردووکیان لە یەک کاتدا پێکەوە ڕوو دەدەن، بەڵام هەندێجار هاویشتنی تۆو، بێ گەیشتن بە ئۆرگازم ڕوو دەدات، هەروەها دەشێ ئۆرگازم هەست پێ بکرێ بەبێ بوونی هیچ بەڵگەیەک بۆ ڕوودانی هاویشتنی تۆو. شایانی باسە ڕوودانی ئۆرگازم و هاویشتنی تۆو پێکەوە تەنیا لە پیاودا بەو شێوەیە ڕوو دەدات، چونکە لە ژندا گەیشتن بە ئۆرگازم قۆناغێکی ناوازەیە و لەگەڵ دەردانی هیچ دەردراوێکی تایبەتدا هاوکات نییە، ئەگەر بکرێ هەردوو کرداری بەیەکداچووی هاویشتنی تۆو لەگەڵ گەیشتن بە ئۆرگازم لە یەک جیا بکەینەوە، ئەوا دەکرێ بڵێین ناوەڕۆکی کرداری ئۆرگازم، ناوەڕۆکێکی دەروونییە و لە چاوەڕێکردنی چێژێکی مەزن پێک دێ و ئەم چاوەڕێکردنە بەرەو سەرەوە هەڵدەکشێ تا دەگاتە ئۆرگازم، لەوکاتەدا تاک هەست دەکات لەگەڵ هاوبەشە سێکسییەکەیدا لە وێنەی یەک جەستە و یەک هەستدا یەکیان گرتووە، یان بوون بە یەک، ئەم هەستە هاوکاتە لەگەڵ هەستکردنێکی تەواو بە ئازادبوون، یان گەیشتن بە لوتکە. هەرچی لایەنی ماددیی ئۆرگازمە، پێشتر لە باسکردنی قۆناغی هاویشتنی تۆودا باسمان کرد و وتمان لە دوو بەش پێک دێت، قۆناغی

حەتمییەتی هاویشتن و قۆناغی هاویشتنی ڕاستەقینە، یان تەواو. لەوانەیە ئەو پرسیارە بکرێ، ئایا کام لەم دوو کردارە، واتە هاویشتنی تۆو لەگەڵ ئۆرگازم، سەرەکییە یان پێشتر ڕوو دەدات؟ ئەم پرسیارە تەنیا بەم شێوەیە وەڵام دەدرێتەوە، سەرچاوە بزوێنەرەکانی هەردوو کردارەکە هەمان سەرچاوەن، هەروەها لە یەک ماوەی زەمەنیدا ڕوو دەدەن و لە ڕووی کاتییشەوە بەیەکداچوون. بەم شێوەیە وا ڕاسترە بوترێ کە هەردوو کردارەکە هەر یەکێکن، بەڵام دوو ڕوخساری جیاوازیان هەیە، ڕوخسارێکیان دەروونیی هەستییە و ئەوی دیکەشیان جەستەیی ماددییە و هەردووکیان تایبەتن بە یەکێک لە قۆناغەکانی وەڵامدانەوەی سێکسی. ئەگەر ئەم ڕایەمان بە هەند وەرگرت، ئەوا لەکارکەوتن لە یەکێک لەم دوو ڕوخسارەدا، واتە لەکارکەوتن لە ڕوخسارەکەی دیکەشدا و لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بەم شێوەیە ڕوو دەدات، بەڵام لە هەندێک حاڵەتدا دەشێ ئۆرگازم بەبێ ڕوودانی هاویشتنی تۆو بۆ دەرەوەی لەش، ڕوو بدات، واتە تۆواوەکە دەگەڕێتەوە، ئیدی ئەو حاڵەتە بەهۆی نەخۆشییەوە ڕوو بدات، یان پیاو بە ئەنقەست، بە مەبەستی ڕێگرتن لە دووگیانی، ئەنجامی بدات، یان بە مەبەستی پاراستنی ئەو تۆواوە وەک وزەیەکی ئەقڵی ڕێگە لە دەرچوونی بۆ دەرەوە بگرێ، هەروەها دەشێ کرداری هاویشتنی تۆو بۆ دەرەوە ڕوو بدات بێ ئەوەی پیاو هەست بە ئۆرگازم بکات، یان چاوەڕێی ڕوودانی بکات، ئەمەش بە زۆری لەو پیاوانەدا ڕوو دەدات کە شەهوەتی سێکسییان لاواز بووە، ئیدی بەهۆی نەخۆشییەوە بێ، یان هەر لە بناغەوە خۆیان وا بووبن، لەو کەسانەشدا هەمان حاڵەت ڕوو دەدات کە ڕوانگەیەکی خراپیان بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان هەیە، پێیان وایە ئامانجی پەیوەندیی سێکسی، تەنیا ئامانجێکی سروشتییە کە بریتییە لە پیتێن و دروستکردنی منداڵ، ئەم پیاوانە

چێژ لە کرداری جووتبوون دەبینن، بەڵام گەیشتن بە ئۆرگازم بە گوناه دادەنێن. بەهۆی ئەم لۆژیکەوە کە بڕوایان پێیەتی ڕەتکردنەوەی هەستکردن بە چێژی ئۆرگازم لە دەروونیاندا دەچەسپێ و ئەمە دەبێتە بەشێک لە مۆرک و سروشتیان. هەمان حاڵەت دەشێ لە هەندێ پەیوەندیی مەشروع و نامەشروعدا ڕوو بدات، لەم دۆخانەدا خەمی پیاو تەنیا پێتێن و دروستکردنی منداڵە، یان تەنیا ڕازیکردنی دڵی هاوبەشەکەیەتی، یان تەنیا مەبەست لەو پەیوەندییە سێکسییە، بەتاڵکردنەوەی ئەو گرژی و توندییەیە کە پیاوەکە بەهۆی پێویستی بە سێکس هەستی پێ دەکات، لەم دۆخانەدا، هاویشتنی تۆو بێ تەواوبوونی هەستکردن بە ئۆرگازم، ڕوو دەدات، هەروەها ئەو کەسانەش کە بەهۆی پێویستییان بە سێکس و هەستکردن بە گرژی و توندیی زۆر، ماستەربەیشن دەکەن، ڕووبەڕووی هەمان دۆخ دەبنەوە.

### ئاڵۆزییەکانی لەکارکەوتنی سێکسی

لەبەر ئەوەی پەیوەندیی سێکسی لە ژیانی مرۆڤایەتیدا ڕۆڵێکی سەرەکیی هەیە، شتێکی سروشتییە، ئەگەر هەر کەموکوڕی، یان لەکارکەوتنێ لەم پەیوەندییەدا ڕوو بدات، ببێتە هۆی وروووژانی زۆرێک لە کێشە و دروستبوونی ئاڵۆزییەکان، هەروەها ئەو کێشانەی لە ئەنجامی ڕوودانی ئەو کەموکوڕی و لەکارکەوتنانەوە دروست دەبن، بۆ خاوەنەکەی یان هاوبەشەکەی یان هەردووکیان دروست دەبێ، هیچی کەمتر نییە لەو ئازارە دەروونییانەی کە ئەو پیاوە خۆی بەهۆی لەکارکەوتنی سێکسییەوە هەستی پێ دەکات. لەوانەیە کۆکردنەوە و سنووردارکردنی ئەم ئاڵۆزییانە و دەرئەنجامەکانیان کارێکی قورس بێت، لە سەروو ئەمەشەوە، ئەم ئاڵۆزییانە لە ڕووی پلە و جۆرەوە بەپێی کۆمەڵێک خاڵ دەگۆڕێن، وەک بەپێی کەسێتیی تاک و بایەخی پەیوەندیی سێکسی لە ژیانی

ئەو تاکەدا، بەپێی داواکاری و چاوەڕوانییەکانی لایەنی بەرامبەر لە پەیوەندیی سێکسیدا، هەروەها بەپێی سروشتی ئەو پەیوەندییەی لە نێوان پیاو و هاوبەشە سێکسییەکەیدا هەیە. ئەگەر تەواوی ئەم مەسەلانەمان بە چاوی بایەخەوە تەماشا کرد، ئەوا بۆمان دەردەکەوێ کە لەکارکەوتنی سێکسی هەر جۆرێک بێ و هەر پلەیەکی بێ، چەندەها دەرئەنجامی لە بوارە جیاوازەکاندا لێ دەکەوێتەوە، بۆ نموونە وەک لە بواری نەخۆشیدا، بەتایبەتی نەخۆشییە دەروونییەکان، یان لە بواری ڕەفتاریدا، یان لە بواری کۆمەڵایەتیدا، یان لە یاسا و دادوەریدا. لێرەدا بە کورتی باسی ئەم دەرئەنجامانە دەکەین.

**دەرئەنجامە دەروونییەکان**

پێویستیی مرۆڤ بۆ ژیانی سێکسی و ئەو چێژانەی هاوکاتن لەگەڵیدا، پێداویستییەکی سروشتییە، ئیدی ئەو پێداویستییە بۆ ژیانی سێکسی بەهۆی بایەخی سێکسەوە بێت بۆ مەبەستی زۆربوون و پاراستنی توخم، یان تەنیا بەخشیشێکی خودایی بێت بۆ مرۆڤ، بۆ ئەوەی لە ژیانیدا چێژ ببینێ، یان بۆ ئامانجی کۆمەڵایەتی و شارستانی بێ، هۆکاری پێویستیی مرۆڤ بە سێکس هەر کامێکیان بێت، لەوانە دەرئەنجامەکە هەر یەکێکە لە ڕووی پێویستیی مرۆڤ پێی و بایەخی لە ژیانیدا کە ناکرێ بە هیچ شتێکی دیکە قەرەبوو بکرێ، لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر کەس هەن وا دەردەکەوێ پشکۆی سێکسییان کوژاوەتەوە و هیچ وەڵامدانەوە و ئارەزوویەکی سێکسییان نییە، هەروەها هەست بە بوونی هیچ پاڵنەرێکی سێکسی ناکەن، بەڵام کارێکی هەڵەیە گەر وا بزانین ئارەزووی سێکسی و ڕوخسارەکانی لە ژیانی ئەم کەسانەدا هەر لە بناغەوە بوونیان نەبووە، یان ڕەگوڕیشەیان نییە، چونکە دەشێ ئەو کەسانە وزەی سێکسییان هەبێ، بەڵام هیچ

بوارێک بۆ دەرکەوتنی ئەو وزەیە نەبێ، بۆیە ئەو وزە سێکسییە بە پەنگخواردوویی و شاراوەیی دەمێنێتەوە، یان بۆ چالاکیی دیکە دەگۆڕێ کە لەڕێی ڕەفتار، یان فیکر، یان داهێنانەوە گوزارشت لە بوون و هێزەکەی دەکرێ.

زۆرێک لەو کەسانە هەن خۆیان دەرک بەوە دەکەن کە جۆرێک لە شکستی، یان لاوازی، یان لەکارکەوتنیان لە ڕوخسارەکانی ژیانی سێکسیدا هەیە، بەڵام بە شێوەیەکی سروشتیی ژیانی خۆیان دەژین، ئەویش لەڕێی دروستکردنی جۆرێک لە هاوسەنگی لە نێوان ئاستی پێداویستییەکانیان و توانای سێکسییان، زۆرێک لەم کەسانە لە خولقاندنی ئەم هاوسەنگییەدا سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە، بێ ئەوەی ئەو لاوازی، یان کەموکورتییە لە توانای سێکسییاندا لە ڕووی دەروونییەوە ئازاریان بدات، بەڵام هەندێک کەس ناتوانێ ئەم هاوسەنگییە بەدەست بهێنن، لەبەر ئەوە پێداویستییە سێکسی و داواکارییەکانیان پێداگرتر دەبێ لە ئەگەری تێربوون و ڕازیکردنیان، لێرەوە شکستهێنانیان لە ژیانی سێکسیدا ئەگەری ڕوودانی زیاترە. ئەو پیاوانەی بەدەست کاریگەریی دەروونیی پەککەوتنی سێکسییانەوە دەناڵێن، ئەم کاریگەرییە دەروونییانە تەنیا دەرئەنجامی بێتوانایی، یان کەمتوانایی خۆیان نییە لە ڕازیکردن و تێربوونی سێکسیی خۆیان، بەڵکو دەرئەنجامی شکستهێنانیشیانە لە تێرکردن و ڕازیکردنی هاوبەشە سێکسییەکانیشیان، سەرباری ئەگەری شێکستهێنانیان لە کرداری پیتێن و خستنەوەی منداڵ. دەرئەنجامە باوەکانیش لە بواری دەروونیدا بریتین لە حاڵەتەکانی دڵەڕاوکێ و پەشۆکان و هەڵچوون و خەمۆکی، ئەم حاڵەتانە هەندێ جار دەگەنە ئاستی نەخۆشیی توند و مەترسیدار.

ئەگەر ئەم واقیعە شکستە لە ژیانی ئەم پیاوانەدا بەردەوام بێ، ئەوا بیستن، یان دەرککردن بە ئارەزووی خۆکوشتن، ڕووداوێکی دەگمەن نییە، هەستیان پێ دەکرێ کە مردنیان لە ژیان بە لاوە باشترە. ئەم هەڵچوونە دەروونییانە، لەکارکەوتن و پەککەوتنی سێکسی لەو کەسانەدا زیاتر دەکەن و مەسەلەکە لە ڕووی سێکسی و دەروونییشەوە ئاڵۆزتر دەبێ. حاڵەتەکانی نائومێدی و شکستی دەروونی کە هەندێ پیاو لە ژیانی سێکسیدا هەستی پێ دەکەن، لە هەندێ کەسدا بۆ بواری دیکەی بەرهەم، یان ئەفراندن، یان داهێنان، یان کۆمەڵایەتی، دەگۆڕێ. ئەم گۆڕانە خاوەنەکەی قەرەبوو دەکاتەوە و ڕازیی دەکات، تەنانەت ئەگەر بۆ ماوەیەکی کاتیش بێ، بەڵام ئەم توانای قەرەبووکردنەوەیە لە هەموو ئەو کەسانەدا بەدی ناکرێ کە بەدەست لاوازی و شکستی سێکسییەوە دەناڵێنن، تەنانەت بە شێوەیەکی هەمیشەیی، یان بە تەواوەتی لەو کەسانەشدا فەراهەم نابێ کە توانا و بەهرەی ئەم گۆڕینەیان هەیە. تێبینی دەکرێ ئەم کەسانە، ئەگەر بە شێوەیەک لە شێوەکان لەبەر هەر هۆکار بێ، ئەو کرداری گۆڕینە لە ژیانیاندا بوەستێ، بە شێوەیەکی توند ڕوخسارەکانی هەڵچوونی دەروونییان بۆ دەگەڕێتەوە، هەروەها دەشێ دەرئەنجامە دەروونییەکان وەستانی پرۆسەی گۆڕینی ئارەزووی سێکسی بۆ بوارێکی دیکەی وەک داهێنان، یان سەرقاڵبوونی کۆمەڵایەتی، توندتر بێت و زیاتر ئەو کەسە ئازار بچێژێ.

### دەرئەنجامە ڕەفتارییەکان

ژیانی سێکسیی مرۆڤ پشت بە وزە بایۆلۆژییەکان دەبەستێت، ئەو وزانەی کە بزوێنەری ژیانی مرۆڤن و چالاکییەکانی ئاراستە دەکەن و خۆراکی پێویستی بۆ دابین دەکەن. لە سروشتی وزە و لە تێبینیکردنی واقیعەوە، دەتوانین ئەو گریمانەیە بکەین، لەپێناوی

دروستکردنی هاوسەنگییەکی بایۆلۆژیی تێروتەواو لە ژیانی تاکدا، دەرچوون و سەرفبوونی وزەی سێکسی کردارێکی پێویستە، هەروەها بەندکردنی ئەم وزەیە یان ڕێگەگرتن لە دەرچوونی یان خراپدەرچوونی، دەشێ ببێتە هۆی تێکدانی ئەم هاوسەنگییە بایۆلۆژییە، ئەم تێکدانەش لەسەر ڕەفتاری تاک ڕەنگ دەداتەوە، چونکە مرۆڤ بوونەوەرێکە مامەڵە لەگەڵ ژینگەکەی دەکات و کارلێکیشی لەگەڵدا دەکات. هەرچەندە زۆرێک لەو کەسانەی بەدەست لاوازیی سێکسی، یان شکستهێنانی سێکسییەوە دەناڵێنن، توانیویانە ئەو وزە سێکسییە پەنگخواردووە لە چالاکیی ڕەفتاریی پۆزەتیڤ و بنیادنەر و ئەفرێنەر و بێزیاندا بەکار بێنن، بەڵام هەندێک لەو کەسانە ناتوانن ئەم کارە بکەن، وزەی پەنگخواردوو، یان پەککەوتوویان بۆ ڕوخساری ڕەفتاری نێگەتیڤ دەگۆڕن کە بە لاوازی، یان دڵڕەقی بەرامبەر بە دەروونی خۆیان، یان کەسانی دیکەی دەوروبەر دەناسرێن، یان ئەو کەسە بەرەو ئەنجامدانی هەندێ کرداری لادەرانە، یان شاز ئاڕاستە دەگرێ لە بواری سێکسیدا. شایەنی ئاماژەیە، ناوەندەکانی پاڵنەری سێکسی لەگەڵ ناوەندەکانی توندوتیژیدا لە ناوکی هایپۆسالامەسدا لە تەنیشت یەکەوەن، ئەمەش دەمانگەیەنێتە ئەو بڕوایەی کە پەیوەندییەکی بایۆلۆژیی ڕیشەیی لە نێوان وزەی سێکس و وزەی توندوتیژیدا هەیە، ئەمەش وا دەکات یەکێک لەم دوو وزەیە بۆ خزمەت و مەبەستەکانی وزەکەی دیکە بەکار بێت. بەشی پێویست بەڵگە لەبەر دەست دایە لەسەر ئەوەی شکستهێنانی هەندێ کەس لە بەدیهێنانی وزەی سێکسی دەبێتە هۆی دەرکەوتنی ڕوخساری ڕەفتاریی توندوتیژ لە بواری پەیوەندییە تایبەتی و کۆمەڵایەتییەکان و مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵک و ژیان، هەروەها ئەو حاڵەتانەش زۆرن کە بەهۆی پەنگخواردنەوەی وزەی سێکسییەوە، ڕەفتاری پیاو بەرەو ئازاردان و تاوان ئاڕاستە

دەگرێ، ئیدی ئەو تاوانانە پەیوەندییان بە ئەنجامدانی سێکسەوە هەبێ یان نەبێ. لێکۆڵینەوە ئامارییەکان ئاماژە بە ڕێژەی لەکارکەوتنی سێکسی لەو کەسانەدا دەدەن کە ڕەفتاری تاوانکاری دەنوێنن لە ڕێژەی ئاسایی بەرزترە، هەروەها ڕێژەی ئەو پیاوانەی کە توانای سێکسییان لەکارکەوتووە و سەرپێچیی تاوانکاریی سێکسی ئەنجام دەدەن، دیسانەوە ڕێژەیەکی بەرزە. ئەم ڕێژە بەرزە مەرج نییە ئاماژەبێت بۆ بوونی پاڵنەرێکی سێکسی بەهێز، هێندەی ئەوەی ئاماژەیە بۆ پەککەوتنی ئەو پیاوە لە ڕووی سێکسییەوە کە بەهۆی لەکارکەوتنەوە ناتوانێ بە شێوازی سروشتی سێکس بکات، لەبەر ئەوە بواری سێکسکردن بۆ توندوتیژی دەگوێزێتەوە و لەو ڕێگەیەوە گوزارشت لە وزەی سێکسیی خۆی دەکات.

دواجار ئاشکراترین بواری ڕەفتاری لە حاڵەتەکانی لەکارکەوتنی سێکسی بریتییە لە بواری دوورکەوتنەوە لە سێکس، یان فرەسێکسی، یان لادانی سێکسی. لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو ئەم پلانە لە ڕەفتاری سێکسی مەرج نییە ئاماژە بن بۆ ڕوودانی پەککەوتن، یان لەکارکەوتنی سێکسی، بەڵام زۆربەی حاڵەتەکان دەرئەنجامی هەستی ئەو کەسەن، کە هەست دەکات لایەنێک لە لایەنەکانی ژیانی سێکسیی لەکار کەوتووە، ئەمەش پاڵی پێوە دەنێ ڕەفتاری سێکسیی جیاواز لە ڕەفتاری ئاسایی بنوێنێ، وەک هۆکارێک بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو کەموکورییەی هەستی پێ دەکات. ئەو لێکۆڵینەوانەی دەربارەی ئەو کەسانە ئەنجام دروان کە بە شێوازی باو، یان سروشتی سێکس ناکەن، ئاماژە بەوە دەدەن، هەندێک لەو پیاوانە بەدەست پەککەوتنی سێکسییەوە ناڵاندوویانە، بەڵام وا پێویست دەکات، لە هەموو حاڵەتەکاندا، ئەوە دەستنیشان بکرێ، ئایا کامیان لەپێشترن، پەککەوتنە سێکسییەکە، یان لادان لە بەدیهێنانی ئارەزووی سێکسیدا؟ هەروەها لە کاتی

چارەسەرکردنی ئەم کەسانە، تێبینی کراوە، هەندێک لەو پیاوانە کە بەدەست پەککەوتنی سێکسی، یان لادانی سێکسییەوە نالاندوویانە، کاتێک چارەسەری ڕەفتاری سێکسییان بۆ کراوە و چالاک بوونەتەوە، پەککەوتنی سێکسیشیان نەماوە و بە شێوەیەکی سروشتی سێکسیان کردووە.

### دەرئەنجامە کۆمەڵایەتییەکان

ئەو دەرئەنجامە کۆمەڵاتییانەی کە دەشێ بەهۆی پەککەوتنی سێکسییەوە ڕوو بدەن، زۆرن، ئەمەش بەهۆی ئەگەری ئاڕاستەگرتنی ئەو کەسانە ڕووەو ڕێرەوی لادان و ئازاردان و نواندنی ئەو ڕەفتارانەی دژ بە کۆمەڵگەن، هەروەک لە باسی پێشووتردا، ئاماژەمان پێ دا، بەڵام دەرئەنجامی دیکەش هەن کە پەیوەندییان بە قووڵایی ژیانی کۆمەڵایەتییەوە هەیە، بەتایبەتی لە چوارچێوەی پەیوەندییە تایبەتی و خێزانییەکاندا، لەبەر ئەوە، دەشێ ڕوودانی هەر پەککەوتنێکی سێکسی ببێتە مایەی ئاڵۆزکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، بە جۆرێ کە تاک خۆیشی نەتوانێ خۆی لێیان بەدوور بگرێ، یان فەرامۆشیان بکات، چونکە بوونی پەیوەندیی سێکسی لە نێوان دوو هاوبەشدا، وا پێویست دەکات تەنیا لە ئارەزووی سێکسیدا ڕێککەوتن و سازانیان نەبێ، بەڵکو پێویستە لە قەناعەت و ڕازیبوون و بەخشینی تێربوون بە یەکدی هەیانبێ. کاتێک پیاو لە بەخشینی ئەم هەستانە بە هاوبەشەکەی شکست دەهێنێ، ئەوا بێگومان حاڵەتێک لە ئازار و کوژانی دەروونی بۆ هەردووکیان دروست دەکات کە هیچی کەمتر نییە لە هەستکردنی خۆی بەو شکستهێنان و کەوتنە، ئەم دۆخەش زیانی تەندروستیی جەستەیی و دەروونی بە ژن دەگەیەنێ، لە هەندێ حاڵەتیشدا ئەم دۆخە دەبێتە مایەی خراپبوونی پەیوەندیی نێوانیان، یان جیابوونەوە و کۆتاییهێنان بە پەیوەندیی هاوسەریتی.

## دەرئەنجامە یاساییەکان

زۆربەی حاڵەتاکانی پەککەوتنی سێکسی دەگاتە هەڵوێستە یاساییەکان، بەتایبەتی لەو حاڵەتانەی پەککەوتندا کە پیاو بە تەواوەتی توانای سێکسکردن لەدەست دەدات، یان ناتوانێ بەو شێوەیە پەیوەندیی سێکسی ئەنجام بدات کە هاوبەشە سێکسییەکەی ڕازی بکات. زۆربەی لایەنە یاساییەکانی کە پەیوەندییان بە پەککەوتنی سێکسییەوە هەیە، لە پەیوەندیی هاوسەرێتیدا چڕ بووەتەوە. دەکرێ ئەم پەیوەندییە بۆ دوو قۆناغی زەمەنی دابەش بکەین. قۆناغی یەکەم، سەرەتای هاوسەرێتی. قۆناغی دووەم، جووتبوونی دوای قۆناغی یەکەمە. وەک دەزانین قۆناغی یەکەم وا پێویست دەکات پیاو بتوانێ پەردەی کچێنیی ژنەکەی بدڕێنێ و کرداری خستنەناوەوەی چووک ئەنجام بدات. هەرچی قۆناغی دووەمە، پێویستە لەسەر پیاو، بە بەردەوامی توانای چەندبارەکردنەوەی کرداری خستنەناوەوە و جووتبوونی بە شێوەیەکی شیاو هەبێ. ڕوانگەی یاسا سەبارەت بە یەکسانی لە پەیوەندیی سێکسیی نێوان ژن و پیاودا، بەو شێوەیەیە ژن مافی جیابوونەوەی لە پیاو هەیە، ئەگەر پیاو نەیتوانی داواکارییە سەرەکییە سێکسییەکانی هاوسەرێتی جێبەجێ بکات، بەتایبەتی لە قۆناغی یەکەمدا، واتە سەرەتای هاوسەرێتی و پاشان بە تەواوەتی کەمبوونەوەی لە قۆناغی دواتردا. بە دیاریکردنی ئەم حاڵەتە بە تەواوی، وا پێویست دەکات بە شوێن کۆمەڵێک پێوەردا بگەڕێین، وەک پێناسەکردنی پەککەوتنی سێکسی و دەستنیشانکردنی هۆکارەکانی و ماوەی زەمەنیی پێویست بۆ دڵنیابوون لە تووشبوونی ئەو پیاوە بە

پەککەوتنی سێکسی. گەڕان بەدوای ئەم پێوەرانەدا لە دژوارترن و ئەستەمترین ئەو مەسەلانەیە کە تا ئێستا بواری نۆژداری لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ یاسا، بەدەستییەوە دەناڵێنێ. ئەوەی زۆربەی کات ڕوو دەدات، لەم حاڵەتانەدا یاسا پیاو بۆ پشکنینی پزیشکی دەنێرێ، بۆ ئەوەی پشکنینەکان پەککەوتنەکەی بسەلمێنن. لەم دۆخەدا ژن بۆ ئەم جۆرە پشکنینانە نانێرێ، چونکە بڕوا وایە پیاو کلیلی ژیانی سێکسییە و پێویستە لەسەری توانای سێکسیی خۆی بسەلمێنێ. ئەم جۆرە بڕوایە هەڵەیەکی زمانەوانییە و بە واقیعی هەمیشە دووبارە دەبێتەوە، چونکە ژنیش دەشێ تووشی پەککەوتنی سێکسی ببێ، لەبەر ئەوە پێویستە لەو دۆخەدا پشکنین بۆ هەردووکیان ئەنجام بدرێ. دەشێ ژن لە سەرەتای هاوسەرێتیدا حەز بە سێکس نەکات، یان لێی بترسێ، یان ڕێگری بکات بە شێوەیەک ئیدی پیاوەکە نەتوانێ سێکسی لەگەڵدا بکات. ئەگەر وا گریمانەشمان کرد، ژنەکە ئامادەیی بۆ سێکس تیادایە و ڕێگری لە مەیلە سێکسییەکانی هاوسەرەکەی ناکات، تەنانەت لەم بارەشدا شکستی پیاو لە ئەنجامدانی سێکس لە سەرەتای ژیانی هاوسەرێتیدا، دەشێ بەڵگە نەبێ بۆ لاوازیی سێکسیی پیاو، ئیدی ئەم لاوازییە لە کاتی نزیکبوونەوەی لە ژنەکەی دەربکەوێ یان دەرنەکەوێ، هەروەها بەپێی ئەو ڕاپرسییانەی دەستمان کەوتوون، هەندێک لە پیاوان کە ڕێژەیان کەم نییە، لە ڕۆژانی سەرەتای پەیوەندیی هاوسەرێتیدا، توانای سێکسییان نەبووە و هەندێکیشیان ئەم شکستیەیان بۆ دواتریش درێژەی کێشاوە، هەندێکیان چەند هەفتەیەکی خایاندووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە لەپێش هاوسەرێتیدا هیچ کێشەیەکی لاوازیی سێکسی یان کێشەیەکی توانای

ڕەپبوونیان نەبووە. دەشێ هۆکاری شکستهێنانیان لەم دۆخانەدا، بۆ ئەو دڵەڕاوکێیە بگەڕێتەوە کە هەیانە بەرامبەر بە توانای خۆیان و لەوە بترسن کە نەتوانن هەر لە سەرەتاوە پیاوەتیی خۆیان بسەلمێنن. ئەوەی هاوکاری ئەم جۆرە دڵەڕاوکێیە دەکات، هەندێ شێوازی کلاسیکیی ڕێوڕەسمی هاوسەرێتییە کە داوای بەڵگەی پیاوەتی لە پیاو دەکرێ، هەندێ جار ئەم ڕێوڕەسمانە بەهۆی نائارامی و دڵەڕاوکێی زاواوە دوادەخرێ. دەشێ شکستهێنانی پیاو لە سەلماندنی پیاوەتیی خۆی بەهۆی ڕێگری ژنەکەوە بێ، یان ژنەکە لە سووڕی مانگانەدابێ، یان بەهۆی هۆکاری دیکەوە کە پەیوەندیی بە پەیوەندیی نێوانیانەوە هەبێ. شکستهێنانی پیاو لە سەرەتای هاوسەرێتیدا، ئیدی هۆکارەکەی هەرچییەک بێ، دەبێتە بناغە بۆ ئاسانکردنی ڕوودانی هەمان پەککەوتنی سێکسی لە داهاتوودا، بەتایبەتی ئەگەر پیاو لە هەوڵەکانیدا بۆ تەواوکردنی ڕێوڕەسمی هاوسەرێتی پێداگریی کرد، ئەم پێداگرییە دەشێ هێز و توانای دەروونی و وەڵامدانەوە سێکسییە بایۆلۆژییەکانی ماندوو بکات، لەبەر ئەوە ناچار دەبێ تەواوکردنی ڕێوڕەسمی هاوسەرێتی بە سەرکەوتوویی دوا بخات. ئەم دواخستنە دەشێ چەند ڕۆژ، یان چەند هەفتە، یان چەند مانگێک بخایەنێ، هەرچەندە ئەو پیاوە بەر لە هاوسەرێتی، هیچ جۆرە پەککەوتنێکی سێکسیشی نەبووبێت و بەر لە جووتبوون لەگەڵ ژنەکەیدا، توانای ڕەپبوونی هەبێ، یان ماستەربەیشن بکات، یان توانای سێکسکردنی لەگەڵ هاوبەشێکی دیکەدا هەبێت.

داواکردن لە پیاو بۆ ئەوەی توانای سێکسیی خۆی بسەلمێنێ وەک بەڵگەیەک بۆ ئەوەی مافی مانەوەی لەگەڵ ژنەکەیدا هەبێ،

کارێکی قورسە و هۆکارێکی زانستیی پزیشکی نییە، بە ئاشکرایی ئەوە بسەلمێنێ، چونکە پەیوەندیی سێکسی لە چوارچێوەی پەیوەندیی هاوسەرێتیدا تا ئێستا پەیوەندییەکی شاراوەیە و نهێنییەکە لە نێوان ژن و پیاودا، هەرچەندە دەکرێ چاودێری بکرێ، هەروەک چاودێریی پەیوەندییە سێکسییەکان دەکرێ بە مەبەستی لێکۆڵینەوە، بەڵام ئەم لێکۆڵینەوە و چاودێرییە بە مەبەستی سەلماندنی پەککەوتنی سێکسی، یان پووچەڵکردنەوەی، تا ئێستا بواری پەیوەندیی هاوسەرێتیی نەگرتووەتەوە، تەنانەت ئەگەر تواناى پیاو بۆ ڕەپبوونی بەهێز سەلمێنرا، مەرج نییە پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ ژنەکەیدا سەرکەوتووبێ، دەشێ لە کاتی جووتبووندا بە هۆکارێکەوە کە پەیوەندیی بە پیاوەکەوە، یان ژنەکەوە هەبێ، پیاوەکە نەتوانێ بە سەرکەوتوویی کرداری سێکسی لەگەڵ ژنەکەیدا تەواو بکات. بەم شێوەیە کاتێک یاسا بەرپرسیارێتیی سەلماندنی پیاوەتی دەخاتە ئەستۆی پیاوەوە، ئەوە فەرامۆش دەکات کە دەشێ ژنەکە لە پەککەوتنی سێکسی پیاوەکە بەرپرسیاربێت. لەبەر هەموو ئەمانە هەقیقەت دەرناکەوێ تەنیا لەڕێی ددانپێدانانی ڕاستگۆ و ڕاشکاوانە و تەواوی ژن و پیاوەکە خۆیانەوە نەبێ، ئایا پەیوەندیی سێکسیی نێوانیان چۆنە و چی ڕوو دەدات؟ گەیشتنیش بە ڕاستییەکان لەم ڕێگەیەوە، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا زۆر ئەستەمە. تەنیا بەهانەی یاسا بۆ ئەوەی بەرپرسی ڕاستەقینەی دۆخەکە دیاری نەکات، ئەوەیە ماوەیەکی زەمەنی پێویستە چارەڕێ بکرێ تا ژن و پیاوەکە هەردووکیان ئەو ئاڵۆزییە دەروونی و کۆمەڵایەتییانەی تێدەپەڕێنن کە دەشێ ڕێگربووبن لە سەرکەوتنی پەیوەندیی سێکسی نێوانیان. لە

دیاریکردنی ئەم ماوە زەمەنییەشدا چەندەها ئیجتیهاد هەیە، بەڵام لەم هەڵویستانەدا لە هەموو شتێک گرنگتر، پەیوەستی نێوان ژن و پیاوەکەیە، دەشێ پەیوەستی نێوانیان هێندە بەهێزبێ کە هەردوو لا بۆ ماوەی چەند ساڵێکیش چاوەڕێ بکەن تا پیاوەکە دەتوانێ پەردەی کچێنی بدڕێ و ڕێوڕەسمی هاوسەرێتی بە تەواوەتی جێبەجێ بکات، بەڵام دەشێ ئەم پەیوەندییە ئەوەندە لاواز بێت، ڕێگە نەدات بە دواخستنی بڕیاردان تا ژن و پیاوەکە ئەو دۆخە ئاڵۆزە تێپەڕێنن. چەندە دەرک بەم هەقیقەتانە بکرێ و چەندە لەو ڕوانگەیەوە تەماشای پەیوەندیی هاوسەرێتی بکرێ، کە پەیوەستییەکی ناهاوتایە و لەسەر بناغەی ڕێککەوتن و سازان دروست دەبێ، ئەوەندە ئەگەری تێپەڕکردنی ئەم ئاڵۆزییانە زیاتر دەبێ کە لە ئەنجامی شکستهێنانی پەیوەندیی سێکسیی نێوانیان دروست دەبێ. قورسایی و بەرپرسیارێتیی تێپەڕبوون لەم ئاڵۆزییانە پشت بە توانا و ئیرادەی دوو هاوسەرەکە دەبەستێ پێکەوە، لەبەر ئەوە دەشێ تا ئاستێکی زۆر پەنابردن بۆ یاسا لەپێناوی هەوڵدان بە سەلماندنی ئەوەی ناکرێ بە یاسایی بسەلمێنرێ، کەم بێتەوە.

**پەراوێزەکان:**

*لەکارکەوتنی سێکسی کە لە زمانی عەرەبیدا پێی دەوترێ (عنة)، لە فەرهەنگی زمانەوانیدا ئەم وشەیە هاوواتای زۆرە، بەو پیاوە دەوترێ کە ناتوانێ لەگەڵ ژندا سێکس بکات، ئەو پیاوەی نایەوێت سێکس لەگەڵ ژندا بکات، ئەو ژنەی حەزی لە پیاو نییە و نایەوێ سێکس لەگەڵ هیچ پیاوێکدا بکات، هەروەها بەو پیاوە دەوترێ کە چووکی بۆ خستنەناوەوەی زێ نانوشتێتەوە، لەم مانایانەوە ئەوە دەردەکەوێ زاراوەی (عنة) مانای بەرفراوانتر لەخۆ دەگرێ لەوەی باوە و دەوترێ، بریتییە لە لەکارکەوتنی توانای خستنەناوەوە لە لایەن پیاوەوە.

**ماستەرز و جۆنسۆن بەو شێوەیە پێناسەی هاویشتنی زوو دەکەن ئەگەر پیاو ٥٠%ی حاڵەتەکانی سێکسکردندا نەیتوانی کۆنترۆڵی خۆی بکات و لەگەڵ ڕوودانی وورووژاندنی سێکسی زۆردا، بە خێرایی تۆواو بڕێژێت، لە کاتێکدا نە خۆی نە هاوبەشە سێکسییەکەی ئارەزوو دەکات.

***ژمارەیەک لە ئامارەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە حاڵەتەکانی درەنگهاویشتن، یان ڕوونەدانی زۆر لەوە زیاترن، لەو ئامارانە وەک لێکۆڵینەوەکەی کابلان ١٩٧٤، ئۆکۆنەر Oconner ١٩٧٦، جبوا Geboes ١٩٧٥، کە ئاماژە بەوە دەدەن، نزیکەی ١٥%ی ئەو پیاوانەی گومانی ئەوەیان هەیە تووشی لەکارکەوتنی سێکسی بووبن، ئەم حاڵەتی درەنگهاویشتنەیان هەیە.

# بەشی پانزەیەم
# لادانە سێکسییەکان

- فرەیی سێکسی
- هۆکارەکانی لادانی سێکسی

پێویستیی ڕازیبوونی سێکسی، فرەیی و ئاشکراکردن، فێربوون و مۆرکوەرگرتن، وەستانی گەشەی سێکسی، جووتتوخمی، لادان و ڕق

جۆرەکانی لادانی سێکسی

لادان لە ئامانجدا، لادان لە بابەتدا، لادان لە ڕۆڵدا

بڵاوبوونەوەی لادان

لادان لە ئەنجامدا

خۆ دەرخستن، فتشیزم، خۆمەلاسدان، لەبەرکردنی جلی توخمەکەی دیکە، گێچەڵ پێ کردن.

لادان لە هاوبەشدا

منداڵباز، پیرباز، مردووباز، ئاژەڵباز

لادان لە ناسنامەدا

لادان لە شێوازدا

لاقەکردن

سێکسی حەرام

## لادانە سێکسییەکان

توێژینەوە دەربارەی لادانی سێکسی پشت بەو گریمانەیە دەبەستێ کە هەر تاکێک ژن بێ، یان پیاو، شێوازێکی تایبەتی ژیانی سێکسیی هەیە و ئەم شێوازەش لەڕێی پەیوەندیی سێکسیی بایۆلۆژیی نێوانیان و ئەو ڕێگەیەی کە زامنی بەدیهێنانی ئەم پەیوەندییە دەکات، دیاری دەکرێ، لەگەڵ ئەوەشدا کە شێوازی زاڵی ئەم ژیانە، زامنی بەدیهێنانی ئەم پەیوەندییە دەکات کە پێداویستییە بایۆلۆژییەکان دابین بکات، بەڵام هەندێ شێوازی ژیانی سێکسی هەیە کە دوورن لە شێوازی زاڵەوە، واتە بە لادان لە ژیانی سێکسی سروشتی دادەنرێن. هیچ کەسێک نازانێ لە مێژووی مرۆڤایەتیدا لە کەیەوە لە چ وێنەیەکدا، مرۆڤ دەستی کرد بە دوورکەوتنەوە لە شێوازە سێکسییە بایۆلۆژییەکان، هەروەها ئەو هۆکارانەش نادیارن کە بوونەتە هۆی ئەم دوورکەوتنەوەیە. تێبینیی هەندێ لادانی سێکسی لە ژیانی سێکسیی هەندێ لە ئاژەڵاندا کراوە، بۆیە دەتوانین ئەوە گریمانەیە بکەین کە هەندێ لادانی سێکسی لە مرۆڤیشدا بە هۆکاری بایۆلۆژییەوە ڕوودەدەن، بەڵام فرەجۆری و فرەژمارەیی ئەم لادانە سێکسییانە لە مرۆڤدا و بڵاوبوونەوەی بە شێوەیەکی ئاشکراتر لە کۆمەڵگە و لە ماوەی مێژووییەکی دیاریکراودا، وامان لێ دەکەن، ئەو بڕوایەمان هەبێ کە هۆکاری ژینگەیی و شارستانی لە پشت لادانە سێکسییەکانەوەن و کار دەکەنە سەر واقیعی بایۆلۆژیی ژیانی سێکسی و کارلێکی لەگەڵدا دەکەن.

ئەو کەسەی لە ڕەفتاری سێکسیی باو دوورکەوێتەوە بە کەسێکی شاز لە ڕووی سێکسییەوە پێناسە دەکرێ. دەستەواژەی

"کەسێکی شاز" ئاماژە و مانای فرەجۆر، یان تابۆ لەخۆ دەگرێ، بە شێوەیەکیش مامەڵە لەگەڵ ئەو کەسەدا دەکرێ کە کەسێکی گوناهبارە، یان هەڵەی کردووە و وا پێویست دەکات لەڕێی سزادان، یان بە قێزەون تەماشاکردنی ڕەفتارە سێکسییەکانییەوە، ناچار بکرێ واز لەو شێوازە ناسروشتییە بهێنێت، بەڵام دەرچوونی ژمارەیەکی زۆری خەڵک لە شێوازی باوی سێکسکردن بە درێژایی مێژوو تا ئەم سەردەمەی ئێستا، بووەتە هۆی هێوربوونەوەی هەڵوێستی توندی کۆمەڵگە بەرامبەر ئەم دوورکەوتنەوەیە لە شێوازی باو، یان سروشتی. هەندێ لە کۆمەڵگەکان لە هەڵوێستی کلاسیکییان بۆ ڕەتکردنەوەی ئەم لادانە سێکسییانە هێندە زیادەڕۆییان نەکرد، هەرچەندە ئەم دۆخە هاوکات بوو لەگەڵ تێگەیشتنی زیاتری ئەو کۆمەڵگەیانە لەم دیاردەیە و هۆکارەکانی ڕوودانی لە تاکدا. ئەم تێگەیشتنە نوێیەش لە دیاردەی لادانی سێکسی بەرئەنجامی پێشکەوتنی زانستی و دەروونی بوو لەم سەد ساڵەی ئەم سەدەیەی ئێستاماندا.

یەکێک لە دەرئەنجامەکانی پێشکەوتن لە بواری تێگەیشتن لە دیاردەی لادانی سێکسی، یان دوورکەوتنەوە لە شێوازی سێکسی سروشتی و باو، ئەوە بوو کە بەکارهێنانی زاراوەی نائاسایی یان ناسروشتیی سێکسی perversion کەم بووەوە و زاراوەی لادانی سێکسی Deviation جێگەی گرتەوە، جیاوازیی نێوان ئەم دوو زاراوەیەش وەک ئەوە وایە لە گۆشەیەکەوە بە پلەی جیاواز لە شتێک دەربچی، یان دووربکەویتەوە لێی. ئەوەی دواتر ڕووی دا، ئەوەبوو، بەردەوام ئەو ڕەفتارانەی کە بە لادان لە ڕەفتاری سێکسی ئەژمار دەکران وردەوردە ژمارەیان کەمبووەوە، زۆرێک لەو ڕەفتارانە وەک فرەجۆرییەک، یان شێوازی جیاوازی سێکس دانران، نەک لادان، بە جۆرێک تەماشای ئەم فرەجۆرییە لە شێوازی سێکسدا کرا کە مەسەلەیەکی سروشتییە لە ژیانی مرۆڤدا

و مرۆڤ جیا لە تەواوی ئاژەڵان، توانای گەڕان و دۆزینەوە و ئاشکراکردنی ڕەفتاری نوێی هەیە، ئەم خەسڵەتەش لە مرۆڤدا کاری کردووەتە سەر سۆز و ڕەفتاری. کاتێک زۆرێک لەو ڕەفتارە سێکسییانەی کە لە ڕابردوودا بە لادان ئەژمار دەکران، بە شێوازی جیاوازی سێکس دانران، ئیدی سنوورەکانی لادانی سێکسی بەرتەسک بوونەوە، بۆیە وا پێویستی کرد زاراوەی لادان بۆ زاراوەی کەمایەتیی سێکسی sexual minorities بگۆڕێ، ئەم زاراوەیە ئاماژەیە بۆ کەمیی ژمارەی ئەو کەسانەی کە ئینتیمایان هەیە بۆی، بەڵام لە هەمان کاتدا، بە چاوێکی قێزەون تەماشای ئەم کەسانە ناکرێ، بەڵکو وەک کەمایەتیی سیاسی یان کۆمەڵایەتی، یان نەتەوەیی تەماشا دەکرێن کە ناکرێ فەرامۆش بکرێن. ئەم زاراوە نوێیە دەرگای لە بەردەم ئەگەری کەمبوونەوە، یان زیادبوونی ژمارەی ئەم کەمایەتییانە بە واڵایی بەجێهێشت.

**فرەیی سێکسی**

فرەیی سێکسی Sexual Variation وەک لادانی سێکسی وایە، دەشێ لە بابەتی سێکسکردندا بێ، یان لە شێوازی ئەنجامدانیدا بێ. زۆربەی خەڵک لە سنوورێکی بەرتەسکدا لە ڕێگە و شێوازی ئەنجامدانی سێکسدا، لەگەڵ یەکدا کۆکن، بەڵام تا ئاستێکی زۆر لە بابەتی سێکسدا کە بریتییە لە پەیوەندیی سێکسیی نێوان دوو توخمەکە، لەگەڵ یەکدا کۆکن. یەکێک لە دیاردەکانی سەردەمی نوێ، زۆری ڕوخسارەکانی فرەجۆرییە لە پەیوەندیی سێکسیدا، هەرچەندە ئەم ڕوخسارانە لە بواری سێکسی نوێدا شتێکی نوێ نین، بەڵام پراکتیزەکردنی لە سەردەمی نوێدا بەراورد لەگەڵ هەر سەردەمێکی پێشوو، زیاترە، لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی زۆری ئەو کەسانەی کە شێوازی فرەیی لە سێکسدا پراکتیزە دەکەن، توخمی نێرن، بەڵام تا ئێستا ڕێژەی توخمی مێ-

ش، بەتایبەتی لە شارستانییەتی خۆرئاوادا، بەرەو زیادبوون چووە، تەنانەت خەریکە ژمارەی ژنان لەم ڕووەوە شانبەشانی ژمارەی پیاوان زیاد دەکات، دەبینیت ژنانیش هەوڵی ئەو فرەییە سێکسییە دەدەن، چونکە بە لایانەوە پێویستە، یان لەپێناوی ڕازیکردنی خۆیان و چێژبینیندا دەیکەن.

دەشێ ئەستەم بێ بتوانرێ ئەو هۆکارانە دیاری بکرێن کە لە بناغەدا بوونەتە هۆی دەرکەوتنی فرەیی لە ڕەفتاری سێکسیدا، لەوانەیە هۆکارەکانی فرەیی ئەوەندە جیاوازیی نەبێ لەگەڵ ئەو هۆکارانەی پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێن بۆ گرتنەبەری ڕەفتاری فرەجۆری لە شێوازەکانی دیکەی ژیاندا، وەک لە بواری شوێنی نیشتەجێبوون و خۆراک و خواردن و جلوبەرگ و یاری و...هتد. لەوانەیە بێزاربوونی مرۆڤ لە یەک شێوە و ڕێباز، پاڵ بە مرۆڤەوە بنێ بۆ گرتنەبەری فرەجۆری تا لە کاریگەرییە نێگەتیڤەکانی بێزاربوون ڕزگاری ببێ. ئیدی هۆکارەکانی فرەجۆری هەرچییەک بن. زۆربەی توێژەران، لەسەر سێ مەسەلە لە بابەتی فرەجۆریی سێکسیدا کۆکن. یەکەمیان دەستنەکەوتنی هۆکاری بایۆلۆژی کە لێکدانەوە بۆ ئەو فرەجۆرییە بکات، چونکە هیچ پەیوەستییەک لە نێوان ئەم دیاردەیە و هیچ فاکتەرێکی بۆماوەیی، یان هۆرمۆنی نییە کە ئەوە بسەلمێنێ. دووەم مەسەلە ئەوەیە بە زۆری ڕەگوڕیشەی دیاردەی فرەجۆری بۆ ئەزموونەکانی قۆناغی منداڵی و هەرزەکاری دەگەڕێتەوە، پاشان لەڕێی فێربوون و لاساییکردنەوەوە پەرەدەسێنێ. هەرچی سێیەمیشیانە، ئەوەیە کە زۆربەی زۆری ئەو کەسانەی فرەجۆری بە شێوازە جیاوازەکانییەوە پراکتیزە دەکەن، پیاون یان سەر بە توخمی نێرن.

گرنگترین ئەو مەسەلانەی لە ئێستادا سەبارەت بە سروشتی ڕەفتاری سێکسی ڕوو دەدات، بریتییە لە مەسەلەی

دەستنیشانکردن و بڕیاردان لەسەر ئەو ڕەفتارانەی کە بە فرەجۆریی سێکسی دادەنرێن و جیاکردنەوەیان لەو ڕەفتارانەی کە بە لادانی سێکسی لەقەڵەم دەدرێن. وا پێویست دەکات بواری نۆژداری جۆرێک لە ڕێککەوتن و سازان بخوڵقێنێ لە نێوان ئەو کەسانەی کە پێیان وایە ژیانی سێکسیی سروشتیی مرۆڤ دەکرێ هەموو شێوەکانی فرەجۆریی سێکسی لەخۆ بگرێ، هەروەها هیچ ڕەفتارێکی سێکسی نییە کە بە لادان دابنرێ، لەگەڵ ئەو کەسانەی کە پێیان وایە هەر ڕەفتارێکی سێکسی لە شێوازی کلاسیکی و باو بڕواتە دەرەوە بە لادان دادەنرێ و توندی ئەو لادانەش بە پلەی دوورکەوتنەوەی تاک لە پراکتیزەکردنی شێوازە سروشتییەکانی سێکسکردن دیاری دەکرێ. ئاشکرایە بەهۆی نەبوونی پێوەرێکی جێگیر و هەمیشەیی کە ڕەفتاری سێکسیی پێ پێوانە بکرێ، زانستی نۆژداری نەیتوانیوە ئەو گونجان و سازانە لە نێوان ئەو دوو ڕوانگەیەدا بەدی بێنێ. لەو سەختییانەی کە بواری نۆژداری ڕووبەڕووی بووەتەوە، چۆنیەتیی ڕوانینە لە هەندێ ڕەفتاری سێکسی وەک ماستەربەیشن و هۆمۆسێکسوالیتی. بەردەوام ماستەربەیشن بە جۆرێ لە لادان دانراوە و تا ئێستاش زۆر کەس هۆمۆسێکسوالیتی بە لادانێکی توند دادەنێن، یان وەک ڕەفتارێکی سێکسیی ناسروشتی لێی دەڕوانن، لە کاتێکدا ماستەربەیشن پراکتیزەکردنێکی سێکسیی جیهانییە و بە نزیکی گشتگیرە و زوربەی خەڵک ئەنجامی دەدەن، یان لە قۆناغێکی ژیاندا ئەنجامیان داوە، هەرچی هۆمۆسێکسوالیتیشە، زۆر کەس لەوانەی خۆیان هۆمۆسێکسوالیش نین، بە ڕەفتارێکی سێکسیی سروشتیی دادەنێن. لەبەر ئەوە زۆر کەس و لایەنی زانستی و دەروونی دەستتێوەردانی ڕەفتاری سێکسی لە لایەن بواری نۆژدارییەوە بە هەڵە دادەنێن و پێیان وایە ئەوە کاری ئەو نییە. ئەم تێڕوانینە هەندێ جار درێژ دەبێتەوە و شێوازی دیکەی زۆر دەگرێتەوە کە

له ئێستادا به لادانی سێکسی دادەنرێن. دەشێ ئەم درێژبوونەوەیە تا سنووری داکۆکیکردن لەو گۆشەنیگایە بروات کە لە ئێستادا هەندێک کەس هەیانە و پێیان وایە، هیچ لادانێکی سێکسی نییە، ئەوەی بە لادانی سێکسی ناودەبرێن، تەنیا شێوازێکە لە شێوازەکانی ڕەفتاری سێکسی کە تاک بۆ هەستکردن بە ڕازیبوون و تێرکردنی پاڵنەر و غەریزە سێکسییەکانی پەنای بۆ دەبات، ئەمەش هیچ زیانێکی نییە مادام ئەو شێوازە سێکسییە بە ڕەزامەندیی نێوان هەردوو هاوبەشەکە بەڕێوە دەچێ و زیان بە هیچ کامیان، یان کۆمەڵگە بەگشتی ناگەیەنێ.

### هۆکارەکانی لادانی سێکسی

لەوانەیە کارێکی قورس بێ، تەنیا هۆکارێک بۆ لێکدانەوەی حاڵەتی لادانی سێکسی بدۆزینەوە، چونکە زۆربەی حاڵەتەکانی لادان لە ئەنجامی کارلێکردنی چەندەها فاکتەر پێکەوە، کە پلەی جیاوازیان لە توندی و کاریگەریدا هەیە، ڕوو دەدەن. ئەم فاکتەرانەش وەک، سروشتی کەسێتیی ئەو کەسە لادەرە و شێوازی پەروەردەکردنی و ژینگەی کۆمەڵایەتی و توانا سێکسییەکانی کە هەیەتی. لەڕێی ئەم باگراوندە لە کۆمەڵێک فاکتەری کارلێکردوو لەگەڵ یەکدا، دەکرێ ئەم هۆکارانەی خوارەوە بە هۆکاری کارا دابنرێن لە دروستبوونی حاڵەتی لادانی سێکسیدا:

#### یەکەم: پێویستیی ڕازیبوونی سێکسی

کاتێک مرۆڤ ناتوانێ بە شێوازی سروشتی ڕازیبوونی سێکسی و هەستکردن بە تێربوون بەدەست بێنێ، دەشێ جۆرێ لە توندوتیژیی سۆزداریی سێکسی پاڵی پێوە بنێ بۆ ئەوەی لەڕێی هۆکارێکی دیکەوە ئەو ڕازیبوون و تێربوونەی دەست بکەوێ. ئەم

فاکتەرە هۆکاری حاڵەتی ماستەربەیشن و هۆمۆسێکسوالیتی و سێکسکردن لەگەڵ ئاژەڵدا، یان سێکسکردن لەگەڵ منداڵدا و سێکسکردن لەگەڵ کەسانی تابۆدا و چەندەها حاڵەتی دیکەی لادان، لێک دەداتەوە. زۆربەی ئەم لادانە سێکسییانە بە زۆری لە ژیانی ئەو کەسانەدا نامێنن کاتێک ئەو کەسە دەرفەتی تێربوونی سێکسی لەڕێی شێوازی سروشتیی سێکسکردنەوە بۆ ڕێ دەکەوێ.

## دووەم: فرەجۆری و ئاشکراکردن

هەرچەندە بە تەواوەتی سنوورێکی جیاکراوە نییە لە نێوان سێکسی سروشتی و فرەجۆریی سێکس و لادانی سێکسیدا، دەشێ تاک لە پراکتیزەکردنی سێکسدا ڕەفتارێک بگرێتەبەر کە ڕوخسارەکانی بە هیچ شێوەیەک ئاشکرا نەبن. دەشێ کتوپڕ ڕەفتارێک پراکتیزە بکات کە هیچ کاتێک بە خەیاڵیدا نەهاتووە، ئەم ڕەفتارانە لە سنوورەکانی فرەجۆری و ئاشکراکردندا دەمێننەوە، ئەگەر تاک توانیی دەستبەرداریان بێ و سەرلەنوێ بۆ شێوازی سروشتیی سێکسکردن بگەڕێتەوە، بەڵام نەگەڕانەوەی بۆ شێوازی سروشتی و بەردەوامبوونی لەسەر پراکتیزەکردنی ئەو شێوازە تازەیەی کە دۆزیویەتەوە و پێی فێربووە، دەشێ بە حاڵەتی لادان دابنرێ.

## سێیەم: فێربوون و مۆرکوەرگرتن

زانا ڕەفتارییەکان، لادانی سێکسی بە دەرئەنجامی کردارێک دادەنێن کە لە بارودۆخێکی ناسروشتیی پەیوەندیکردندا ڕووی داوە. کاتێک تاک خۆی دەرک بەوە دەکات ئەو پەیوەندیکردنە بەو شێوەیە هەڵەیە، ڕەفتاری سێکسیی پێچەوانە دەبێتەوە و ڕووەو شێوازە سروشتییەکە ئاڕاستە دەگرێتەوە و دەتوانێ دەستبەرداری

ئەو شێوازە ناسروشتییە بێ. زۆربەی ئەو توێژینەوانەی لە بابەتی لادانی سێکسیدا کار دەکەن، پشت بە نموونەی مۆرکوەرگرتن و خووپێوەگرتن بۆ لێکدانەوەی لادان، دەبەستن، کە پاپلۆڤ ئاشکرای کرد، نموونەی ئەم توێژەرانەش وەک ماجوری Magurie١٩٦٥ کە پشتی بە هەمان بۆچوونەکەی پاڤلۆڤ بەست. بەپێی ئەم لێکدانەوەیە، منداڵ کاتێک بەرکەوتنی لەگەڵ فاکتەر، یان هەڵوێستێکی هەڕەمەکیدا دەبێت و ئەم فاکتەرە دەبێتە هۆی وورووژاندنی سێکسی، منداڵ فێری چێژوەرگرتنی سێکسی دەبێ لەو ڕێگەیەوە، ئەمەش لە سەردەمێکی زۆر زوو بەر لە قۆناغی گەمەکردنی سێکسیدا، یان پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ توخمەکەی دیکەدا، ڕوو دەدات، بەڵام بوونی ئەم پەیوەستییە لە نێوان هەڵوێستێکی یان فاکتەرێکی دیاریکراو و وورووژاندندا، بە تەنیا بەس نییە بۆ ئەوەی ببێتە چەقی هەموو چێژە سێکسییەکان لە داهاتوودا. ماجور و هاوکارانی پێیان وایە فێربوون لەدوای ڕوودانی ئەزموونێکی سێکسی شەرمەندەوە ڕوو دەدات، چونکە یادەوەریی ئەزموونی سێکسی دەبێتە بەشێک لە خەیاڵی ماستەربەیشن، هەروەها پارێزگاری لەو هاوکاتییە وردەش دەکات کە دەکەوێتە نێوان ئەو فاکتەرە وورووژێنەرەی دێتەوە یادی، لەگەڵ ئەو ساتەی کە دەکەوێتە پێش ئۆرگازم، یان لوتکەی چێژ. دووبارەکردنەوەی حاڵەتی ماستەربەیشن کە ئەم جۆرە خەیاڵە بەسەریدا زاڵە، کەفیلە بۆ ئەوەی هێزێکی گەورە بەو فاکتەرە وورووژێنەرە بدات کە بووەتە هۆی ڕوودانی ئەو فرەجۆرییە لە سێکسدا. ئەگەر ئەم خەیاڵە بوو بە بەهێزترین فاکتەری وورووژێنەری سێکسی، ئەوا خەیاڵەکانی دیکە، وەک جووتبوون، کەمتر تاک دەوروووژێنن. ئەم جۆرە لێکدانەوەیە بۆ لادانی سێکسی، هۆکاری زۆر ڕوودانی لادان لە نێردا و بە دەگمەن ڕوودانی لە مێدا، لێک دەداتەوە. ئەوەی پشتیوانی لەم

تیۆره دەكات بۆ لێكدانەوەی هۆكاری ڕوودانی لادان، ئەو دەرئەنجامە پۆزەتیڤانەیە كە لە چارەسەركردنی لادان لەڕێی شێوازە ڕەفتارییەكانەوە، دەستكەوتوون كە ئامانجیان لابردنی ئەو مۆركەیە لە تاكدا كە لە ئەنجامی هەڵوێستێكی دیاریكراوەوە وەریگرتووە و فێری بووە، ئەم شێوازە لە چارەسەركردن پشت بە تیۆرەكەی پاڤلۆڤ دەبەستێ كە لە بەشی تایبەت بە چارەسەركردنی پشێوییە سێكسییەكاندا بە وردی باسی دەكەین.

## چوارەم: وەستانی گەشەی سێكسی

بەپێی تیۆری دەروونشیكاری، فرۆید لەو باوەڕەدایە، لادانی سێكسی (یان بەپێی گوزارشتەكەی ئەو "شزوزی سێكسی") بەم شێوەیە ڕوو دەدات: مرۆڤ لەسەر وزەی سێكسی دەژی (كە ناوی ناوە لیبدۆ Libido)، هەروەها فرۆید پێی وایە، لایەنە بەراییەكانی لادانی سێكسی لە ڕابردووی هەموو تاكێكدا بوونی هەیە. بەپێی ڕوانینی فرۆید، منداڵ خاوەنی چەندین ئەنگێزەی سێكسی و لادەرە Perverse Disposition، مەبەستی لەم ئەنگێزانە ئەوە بوو كە منداڵ لەڕێی چەندەها سەرچاوە و پراكتیزەكردنەوە بە چێژی سێكسی دەگات. لێرەوە فرۆید پێی وایە لادانی سێكسی تەنیا حاڵەتێكە لە گەورەكردن و تەواوكردنی ژیانی سێكسیی قۆناغی منداڵی، بەڵام ئایا بۆچی لادانی سێكسی لە هەموو كەسێكدا ڕوو نادات؟ فرۆید ئەمە لەسەر ئەو بناغەیە لێك دەداتەوە كە گەشەی سێكسی لە نێوكۆ سروشتییەكەی قۆناغی منداڵیدا و تەنانەت گەورەیشدا لە خاڵێكدا لە گەشە دەوەستێ. هەروەها دەشێ ئەو گەشەیەی كە نێوكۆیەكی سروشتیی وەرگرتووە بۆ قۆناغێكی پێشتری گەشە بۆ دواوە بگەڕێتەوە و لەسەر ئەو قۆناغە جێگیر ببێ. (ئەم بۆچوونە هۆكاری ڕەفتاری سێكسیی لادراو لە هەندێ لەو نەخۆشانەدا لێك دەداتەوە كە تووشی شێزۆفرینیا بوون و لە ژیانی

دەروونی و سێکسییاندا بۆ قۆناغێکی زووتری ژیانیان دەگەڕێنەوە).
لە تیۆرەکانی دیکە کە شیکاریی لادانی سێکسی دەکەن، تیۆرەکەی فرانک بیچ –ە لە ساڵی ١٩٧٧دا، کە دەڵێ پراکتیزەکردنی سێکسی سروشتی پشت بە وورووژاندنی هاوبەش لە نێوان دوو کەسدا دەبەستێ، کە هەریەکەیان لە وورووژان و وەڵامدانەوەدا پشت بە هەست و وەڵامدانەوەی هاوبەشەکەی دەبەستێ، بەڵام لە حاڵەتی لادانی سێکسیدا، کەسی لادەر لە ئامادەنەبوونی هاوبەشێکی سێکسیدا، وورووژان و وەڵامدانەوەی دەستدەکەوێ، واتە بێ ئەوەی کەسێکی دیکە لە هەست و وەڵامدانەوەدا بەشداری بکات، خۆی لەڕێی هۆکاری دیکەوە دەورووژێ و چێژ وەردەگرێ، دوور لە هاوبەشێکی سێکسی خۆی دەورووژێنێ، (هەروەک لە حاڵەتی فتشیزم و خۆمەلاسدان و لەبەرکردنی پۆشاکی توخمەکەی دیکە و خۆنمایشکردن و هەندێ حاڵەتی ماددی و مازۆشیدا، ڕوو دەدات)، بەپێی بڕوای بیچ، ئەمە بۆیە ڕوو دەدات، چونکە کەسی لادەر لە هاوبەشیکردن لە هەست لەگەڵ کەسێکی دیکەدا دوور دەکەوێتەوە، یان لە هیچ هاوبەشێکی نزیک نابێتەوە، چونکە ناتوانێ بەرگەی قورسایی ئەو هاوبەشیکردنە بگرێ، ئەم جۆرە خۆبەدوورگرتنە پاڵی پێوە دەنێ بۆ دوورکەوتنەوە لە پراکتیزەکردنی سێکس، بە شێوە سروشتییەکەی و پەنابردن بۆ ئەو شێوازە کە زامنی ئەم بەدوورگرتنەی بۆ دەکات.

**پێنجەم: جووتتوخمی**

ئەم تیۆرە بەو شێوەیە لێکدانەوە بۆ لادانی سێکسی دەکات کە هۆمۆسێکسوالیتی هەڵقووڵاوی سروشتی بایۆلۆژیی جووتتوخمییە لە مرۆڤدا، چونکە بەپێی ئەم تیۆرە مرۆڤ لە بنچینەی دروستبوونیدا جووتتوخمە، بەشێکی نێرە و بەشێکی مێیە و بە پلەی جیاواز هەردوو توخمەکە لە خوڵقاندنی توخمی نێرو مێدا بەشدار دەبن، بەڵام دوا ئاڕاستەی سێکسی ڕووەو نێر یان ڕووەو مێ بەپێی هێزی

ڕێژەیی نێوان ئەم دوو ئاڕاستەیە دیاری دەکرێ. لە لێکدانەوەی هۆمۆسێکسوالیتی لە نێردا کە بە (نێربازی) ناسراوە و هۆمۆسێکسوالیتی لە مێدا کە بە (لەیزبین) ناسراوە، پشت بەم تیۆرە دەبەسترێ. ئەم تیۆرە لە تیۆرێکی دیکەوە نزیکە، کە پێی وایە منداڵ لەگەڵ لەدایکبوونیدا لە ڕووی ئامادەباشیی بایۆلۆژییەوە، لە حاڵەتێکی جووتتوخمیدایە، بەڵام تەنیا ئاڕاستەیەکی دیاریکراو دەگرێ و ئەم ئاڕاستەیە ڕێگە دەدات بە گەشەکردنی یەک توخم و تاک یەک شێوازی سێکسی، یان چەند شێوازێکی سێکسیی جیاواز دەگرێتەبەر، ئەویش بەپێی ئەزموونەکانی ژیان ئەو بارودۆخانەی کە تاک لە پرۆسەی گەشەکردنی سێکسی و دەروونی لە ماوەی قۆناغەکانی منداڵی و هەرزەکاریدا ڕووبەڕوویان دەبێتەوە.

## شەشەم: لادان و ڕق

ئەم تیۆرە پێی وایە، لادانی سێکسی، جۆرێ لە گوزارشکردن لە هەستی ڕق و شەڕانگێزی لە دەروونی تاکدا لەخۆ دەگرێ، پراکتیزەکردنی لادانی سێکسی خزمەتی چەندەها مەبەستی گرنگی ژیان دەکات بۆ ئەو کەسە لادەرە و بۆ خێزان و بۆ کۆمەڵگەکەی بەگشتی، چونکە بەپێی ئەم تیۆرە، لادان زامنی چێژ دەکات بۆ کەسی لادەر لە چوارچێوەی خێزان و کۆمەڵگەدا. خاوەنی ئەم تیۆرە ڕاییەکەی لەسەر ئەم بناغەیە داڕشتووە، لادان ڕێگە بەوە دەدات کە ڕق و شەڕانگێزی لەخۆ بگرێ، چونکە لادان قوربانییەک بۆ خێزان ئامادە دەکات کە هەموو ئەندامانی ئەو خێزانە، ئەنگێزەکانیان ڕووەو لادان و ناسروشتبوون، لەسەر ئەو چڕ ببێتەوە، بەم شێوەیە، خێزان لەڕێی ئەو کەسە لادەرەی ناو خێزانەکەوە لە لادان و ناسروشتیی خۆیاندا دەژین. بەم شێوەیە خێزان خۆی لەوە بەدوور دەگرێ ببێتە قوربانییەکی گەورەتر ئەگەر بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ ڕق و شەڕانگێزی لە نێوان ئەندامەکانیدا پراکتیزە بکرێ. خاوەنی ئەم تیۆرە لە لێکدانەوەی ئەندێشەکانیدا زیاتر دەڕوات و دەڵێت، لەبەر ئەوەی

دینامییەتی سەرەکی بۆ لادان لە ڕق و شەڕانگێزیدا کۆبووەتەوە، ئەوا لادان خزمەتی گۆڕینی ڕق و شەڕانگێزی دەکەن لەو ڕێرەوە وێرانکارییەی کە هەیەتی بۆ ڕێرەو و لقی دیکەی ڕەفتار، ئیدی ئەمە لەڕێی پراکتیزەکردنی لادانەوە بێت بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، یان تەنیا لە خەیاڵدا ئەو کەسە لادانی سێکسی بنوێنێ، یان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لەڕێی شێواز و وێنە و شێوەی هونەری و داهێنانی جیاوازەوە بێت. سەرجەم ئەم شێوازانەی گوزارشتکردن، لە گۆشەنیگای خاوەنی ئەم تیۆرەوە، لەوە باشترن کە تاک بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ گوزارشت لە هەستی ڕق و توندوتیژیی شاراوە لە نەستیدا بکات. پوختەی ئەم تیۆرە دەڵێ، لادان تاک ئامادە دەکات بۆ ئەوەی توانای لەناوچوونی برێکی باشی لە هێزی تووڕەیی و شەڕانگێزی هەبێ، بەم لەناوچوونە تاک خۆی و خێزانەکەشی لە کاریگەرییەکانی ئەو وزە شاراوەیەی ڕق و شەڕانگێزی دەپارێزێ، کە دەشێ ئەو وزانە بۆ تاک خۆی و بۆ خێزانەکەشی وێرانکەر بن. شانبەشانی ئەم تیۆرانە سەبارەت بە هۆکارەکانی لادان، چەندەها تیۆری دیکە هەن. یەکێک لەو تیۆرانە دەڵێ، لەبەر ئەوەی لادانی سێکسی تا ئاستێک و بە شێوەیەکی دیاریکراو لە جیهانی ئاژەڵاندا هەیە، لەبەر ئەوە بوونی لە مرۆڤدا دیاردەیەکی ناسروشتی نییە، بەڵکو لە ڕووی ئامارەوە دیاردەکە کەمینەیەک لە خەڵک پراکتیزەی دەکەن و دەکرێ بە یەکێک لە دیاردەکانی ڕەفتاری مرۆیی حیساب بکرێ. یەکێکی دیکە لەو تیۆرانە، هۆکاری لادانی سێکسی بۆ فاکتەری بۆماوەیی یان هۆرمۆنی یان دەماری لە دەماخدا، دەگەڕێنێتەوە، بەڵام تا ئێستا هیچ ئاماژەیەک نییە لەسەر دروستی ئەم گریمانەیە، چونکە هیچ حاڵەتێکی ئەندامی تایبەتی لە دەماخی مرۆڤدا نەدۆزراوەتەوە کە ببێتە هۆی ڕوودانی لادانی سێکسی. بە سروشتی حاڵ ئەمە ڕێگر نابێ لە ڕوودانی لادانی سێکسی لە هەندێک لەو نەخۆشانەی تووشی نەخۆشییە ئەقڵییەکان بوون کە پەیوەندییان بە تێکچوونی ئەندامی، یان فیسیۆلۆژییەوە هەیە، وەک شیزۆفرینیا و خەڵەفان.

## جۆرەکانی لادانی سێکسی

لادانی سێکسی چەندەها جۆری هەیە، بە پلەی جیاواز لە توندی دەردەکەون و بە پلەی جیاجیاش لە شێوازی سروشتی ژیانی سێکسییەوە دوورن. هەندێ لەم لادانانە بە تەنیا ڕوودەدەن و لە تەنیا یەک شێوازی لاداندا دەردەکەون، بەڵام زۆربەی زۆری ئەو کەسانەی کە تووشی لادانی سێکسی بوون، زیاتر لە جۆرێ یان شێوازێکی لادان لە کاتی جیاوازدا یان لە یەک کاتدا پراکتیزە دەکەن. دەکرێ یەکەمین لادان کە تاک ئەنجامی دەدات بە لادانی سەرەکی یان سەرەتایی دابنرێ و ئەو لادان یان لادانانەش کە لەم لادانەوە دروست دەبن، بە لادانی لاوەکی دابنرێن. لەم ڕووەوە توێژەران لادانە سێکسییەکانیان لەسەر چەند بناغەیەک پۆلێن کردووە، لە هەموویان گرنگتر ئەو پۆلێنەیە کە لەسەر بناغەی ئەو گۆڕانە داندراوە کە لە ئامانجی سەرەکی و بابەتی سێکسی و ناسنامەی توخمیدا ڕوو دەدات. پۆلێنێکی دیکە هەیە پشت بە بناغەی ئەو جیاکردنەوەیە دەبەستێ کە لە نێوان شێوازی پراکتیزەکردنی لادانی سێکسی لە لایەن تاکەوە دەکرێ، ئایا ئەو تاکە یان ئەو کەسە بە تەنیا ئەو لادانە سێکسییە ئەنجام دەدات، یان وا پێویست دەکات ئەو کەسە هاوبەشێکی نێگەتیڤی هەبێ؟ ئەم دوو پۆلێنە هیچیان گشتگیر نین و بە تەواوی لادانەکان ناگرنەوە. لێرەدا هەندێ ڕاستیی دیار دەربارەی لادانی سێکسی دەخەینە ڕوو، بەڵام تا ئاستێکی زۆر بەهۆی زۆریی بەکارهێنانی و بەربڵاوی زاراوەکانی پۆلێنی یەکەم لەنێو خەڵکدا، پشت بەم پۆلێنەیان بەستراوە.

### ا- لادان لە ئامانجدا:

- خۆنمایشکردن: پاڵنەرێک هانی تاک دەدات بۆ ئەوەی خۆی لە بەردەم کەسانی دیکەدا نمایش بکات.

- خۆمەڵاسدان: تاک چێژی سێکسی دەبینێ لە بەنهێنی تەماشاکردنی کەسانی دیکە.

- سادۆماسۆشی: تاک چێژی سێکسی دەبینێ لە چەوسانەوەی کەسانی دیکە، یان کاتێک خۆی لە لایەن کەسانی دیکەوە دەچەوسێنرێتەوە.

- فتشیزم: بریتییە لە چێژبینین لە ئەنجامی بردنی شمەک یان هەر شتێ کە تایبەت بێ بە کەسێکی دیکە، یان بینینی بەشێک لەو شتە.

- دەردراو: بریتییە لەو چێژە سێکسییەی کە بەندە بە دەردراوەکانی جەستەوە، بە جیاوازیی جۆرەکانییەوە.

- شێتی دزیکردن: لەم لادانەدا تاک چێژی سێکسی دەبینێ لە ئەنجامدانی دزی.

- شێتی سووتان: بریتییە لەو هاندەرەی بەهۆی پاڵنەری سێکسییەوە پەنا بۆ سووتان دەبات.

ب- لادان لە بابەتدا:

- ئاژەڵبازی: پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ ئاژەڵاندا.

- مردووبازی: پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ مردوودا.

- هۆمۆسێکسوالیتی: نێربازی و لەیزبین، بریتین لە پەیوەندیی سێکسی لەنێو تاکەکانی هەمان توخمدا.

- منداڵبازی: پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ منداڵ و مێردمنداڵدا.

ج- لادان لە ڕۆڵدا:

- لەبەرکردنی پۆشاکی توخمەکەی دیکە: بریتییە لە ڕازیکردن و تێرکردنی ئارەزووی سێکسی لەڕێی لەبەرکردنی پۆشاکی توخمەکەی دیکەوە.

- سێکسی دژ: بریتییە لە ئارەزووکردنی تاک بۆ گۆڕینی توخمی بایۆلۆژی بۆ توخمە دژەکەی خۆی.

ئەمانە و وا پێویست دەکات جۆرێکی دیکە لە جۆرەکانی لادان بۆ ئەم لادانانە زیاد بکرێت، تا ئەو لادانە تایبەتییانەش لەخۆ بگرێ کە تاک لە شێوازی ئەنجامدانی سێکسی لەگەڵ هاوبەشەکەیدا ئەنجامیان دەدات.

هەروەها دەشێ کۆمەڵێکی بەرفراوان لە گەمەی سێکسی و شێوازە فرەجۆرەکانی وورووژاندن بخرێتە چوارچێوەی ئەم جۆرە لادانانەوە، هەرچەندە زۆربەیان لە ئێستادا لە ڕوانگەی توێژەرانەوە بە فرەجۆریی سێکسی دادەنرێن، نەک بە لادان، هەروەها لەو لادانانەی دیکە کە دەکرێ بخرێنە ناو هەمان پۆلێنەوە، ئەمانەن: سادی و ماسۆشیی لاقەکردن، شەڕانگێزیی سێکسی، سێکسکردن لەگەڵ کەسانی تابۆ، یان مەحرەمدا.

### بڵاوبوونەوەی لادان

مەزندەکردنی ئاستی بڵاوبوونەوەی لادان لە کۆمەڵگەدا لە لایەن توێژەرانەوە، کارێکی ئەستەمە، ئەستەمیی ئەمەش بۆ کۆمەڵێک هۆکار دەگەڕێتەوە، لەوانە ئەو شێواز و ڕەفتارە سێکسییانەی کە بە لادان دادەنرێن، ناسەقامگیرن، هەروەها بەهۆی کاریگەریی فاکتەرە کۆمەڵایەتی و شارستانییە جیاوازەکانەوە ئاراستەی پراکتیزەکردنی ئەو شێواز و ڕەفتارانە بەردەوام گۆڕانیان بەسەردا دێت، هەروەها ئەستەمیی دەستکەوتنی زانیاری و هەقیقەتی ورد دەربارەی ژیانی سێکسیی خەڵک، یەکێکی دیکەیە لە هۆکارەکان، چونکە ئەنجامدەرانی لادانە سێکسییەکان تا ئێستا لە ڕووی مەعنەوی و تەنانەت یاساییشەوە کەسانێکی ڕەتکراوەن و زۆربەشیان خۆیان ئاشکرا ناکەن و زانیاریی پێویست بە توێژەران نابەخشن تا بە شێوەیەکی ورد و دروست ئاستی بڵاوبوونەوەی دیاردەی لادانی سێکسی و جۆرەکانی مەزەندە بکرێ، تەنانەت ماستەربەیشن کە هێورترینی

ڕەفتارە سێکسییەکانە کە بە لادان دادەنرێ، لە کۆی هەر پێنج کەسێک، یەکێکیان ئامادە نەبووە دەربارەی ئەو ڕەفتارە هیچ وەلامێک بداتەوە، تەنانەت ڕێژەیەک لەوانەش کە وەلامیان داوەتەوە، دەشێ وەلامەکانیان لەگەڵ ئەوەی بە ڕاستی لە واقیعدا ڕوو دەدات، هاوجێ نەبێ.

لەوانەیە کارێکی هەڵە بێ، ئەنجامدەرانی لادانی سێکسی بە کەمایەتی وەسف بکەین. ئەم زاراوەیە لەوانەیە جۆرێک بێ لە هەوڵدان بۆ پاراستنی خۆمان لە لادان، بەلام ئەوەی لەم ڕووەوە تێبینی دەکرێ، هەر ڕەفتارێکی یان شێوازێکی سێکسی، ئەگەر لە لایەن کۆمەڵێک خەڵکی تا ڕادەیەک زۆرەوە پراکتیزە بکرێ، ئەوا توێژەران هان دەدات، بۆ ئەوەی ئەو ڕەفتارە، یان شێوازە لە سێکسکردن لە چوارچێوەی لادانی سێکسی دەربێنن و لە چوارچێوەی فرەجۆریی سێکسیدا دایبنێن، بەڕاستی ئەمەش لە هەندێ کۆمەڵگەدا ڕووی دا، کاتێک وەک لادان لە هۆمۆسێکسوالیتییان دەڕوانی کە بلاوبوونەوەی لە هەرچی لادانە سێکسییەکان هەیە بەرفراوانترە. بەهۆی زۆریی ژمارەی ئەنجامدەرانییەوە، لە ئێستادا وەک جۆرێک لە فرەجۆریی سێکسی دادەنرێ. ئەگەر توێژەران لە مەزندەکردنی لاداندا لەسەر ئەم میتۆدە بەردەوام بن، واتا لەسەر بناغەی ئامار، ئەوا دەشێ ئەو سەردەمە بێت کە چەمکی لادان بوونی نەمێنێ و جیاوازی لە نێوان کەسێکی سروشتی یان لادەر لە ڕووی ڕەفتاری سێکسییەوە، نەمێنێ. لەوانەیە ئیدی تەنیا ژمارەیەک حاڵەتی دەگمەن و تایبەتی بمێنن کە پلەی نائاسایی بوون یان زۆر بێ و وا پێویست بکات کە بە لادان ناو ببرێن.

## خۆنمایشکردن

خۆنمایشکردن Exhibitionism لادانێکی سێکسییە و یەکێکە لەو لادانە تاکەکەسییانەی کە تیایدا بەیەکگەیشتنی سێکسی لە نێوان تاک و ئامانجەکەیدا ڕوو نادات، هەروەک لادانە تاکەکەسییەکانی دیکە، نموونەی خۆمەلاسدان و فتشیزم و لەبەرکردنی پۆشاکی توخمەکەی دیکە، لە لادانی خۆنمایشکردندا، تاک بە تەنیا کارەکەی ئەنجام دەدات.

لادانی جۆری خۆنمایشکردن لە هەموو لادانە تاکەکەسییەکانی دیکە زیاتر ڕوو دەدات و لە هەمووشیان زیاتر ڕووبەڕووی لێپرسینەوە یاسایی و بەدواداچوونی دادوەری دەبێتەوە. ئەم لادانە وەک زۆربەی لادانەکانی دیکە، لە نێردا زیاتر ڕوو دەدات، بەراورد لەگەڵ مێ-دا، هەرچەندە لە شارستانییەتە جیاوازەکانی دونیادا، ژنان لە پیاوان زیاتر شێوازەکانی خۆنمایشکردن و خستنە ڕووی ناوچە سێکسییە ورووژێنەوەکانی جەستەیان، پیادە دەکەن، بەڵام دەرکەوتن و خۆ ڕووتکردنەوەی ژنان بەو شێوازە نمایشکردنە، ناکرێ بە لادانی سێکسی بە مانا دروستەکەی ئەم زاراوەیە، دابنرێ، چونکە ژن خۆی چێژی سێکسی لەو نمایشکردنە وەرناگرێ و تەنیا شێوازێکە بۆ ڕاکێشانی سەرنجی تەماشاکەران و بایەخدان پێی و جەختکردن لە کەسێتی و مێینەیەتیی خۆی. نووسەر و زانای بەناوبانگی سایکۆلۆژی هافلوک ئالیس دەربارەی ئەو کەسەی تووشی لادانی سێکسیی خۆنمایشکردن بووە، دەڵێ: "ئەو پیاوەی ئەندامی سێکسیی خۆی نمایش دەکات و پیشانی خەڵکی دەدات بۆ سەرنجڕاکێشانی ژنان، هیچی لەو کەسانە ناوێ کە خۆی بۆیان ڕووت دەکاتەوە، بە دەگمەن یەک وشە لە دەمی دێتە دەرەوە و بە دەگمەن هەوڵی نزیکبوونەوە دەدات لەو کەسانە. دوای ئەوەی ئەندامەکەی خۆی نمایش دەکات و پیشانیان دەدات، بە ئاسوودەیی شوێنەکە

بەجێدێڵن، بەڵام لە ئەنجامی تێبینیکردنی ئەو کەسانەدا دەرکەوتووە، گرژبوونێکی سێکسییان هەیە و بە ئۆرگازم و هاوپشتنی تۆو کۆتایی دێ، ئیدی لەڕێی ماستەربەیشنەوە بێ یان خۆبەخۆ ڕوو بدات. کەسی نمایشکەر، بەزۆری گەنجێکی تەمەن بچووکە، شەرمن و هێمن و دوورەپەرێزە، بەگشتی گومانی لە توانای سێکسیی خۆی هەیە و لە ڕووبەڕووبوونەوەی سێکسیی ڕاستەقینە لەگەڵ هاوبەشێکی سێکسیی ڕاستەقینەدا، سڵ دەکاتەوە، هەروەها زۆربەی کات ئارەزووی ئازاردانی ئەو کەسانە ناکات کە تەماشای دەکەن، بەڵام هەندێکیان دەشێ جۆرێ لە شەڕانگێزی بنوێنن کاتێک تەماشاکار سەرپێچی دەکات لە بینینی نمایشەکەیان، واتە کاتێک ئەو کەسە یان ئەو کەسانەی ئەو کوڕە خۆی لە بەردەمیاندا ڕووت دەکاتەوە، ڕازی نەبن تەماشای بکەن. بۆ لێکدانەوەی ئەم لادانە چەندەها تیۆر هەیە، هەندێکیان پێیان وایە گوزارشت لە پشێویەکی دەروونی دەکات، یان ئەستەمیی توانای گونجاندنی ئەو کەسە لەسەر ژیانی سێکسیی سروشتی دەنوێنێ، یان ئەو کەسە لەو هەستە سێکسییە دەترسێ کە هاوبەشە سێکسییەکەی بەرامبەری دەریدەبڕێ، یان لەوانەیە وەڵامدانەوەی پاڵنەرێکی ناچاری زاڵ بێ، واتە پاڵنەرێک هەبێ کە ئەو کەسە ناچار بکات بۆ ئەو خۆنمایشکردنە، هەر بۆیە ئەو کەسە تەنانەت ئەگەر ئاشکراش بێ و سزاش بدرێ هەر بەردەوام دەبێ لەسەر پراکتیزەکردنی لادانە سێکسییەکەی. هەندێ حاڵەتی نەخۆشیش هەن دەشێ ببنە هۆی دەرکەوتنی ئەم دیاردەیە، بۆ نموونە لە حاڵەتەکانی ئالوودەبوون لەسەر کهول، خڵەفانی پیری و نەخۆشییە ئەندامییەکانی تووشی دەماخ دەبن، بەتایبەتی لەو کەسانەدا کە ئەم نەخۆشیانەیان هەیە و هاوکات بەدەست پەککەوتنی سێکسییشەوە دەناڵێنن، ئەم کەسانە دەشێ لەڕێی نمایشکردنی ئەندامەکەیان قەرەبووی شکستهێنانی

سێکسییان بکەنەوە. لەوانەیە دروستترین لێکدانەوە بۆ ئەم لادانە، ئەوە بێ کە کۆنترۆڵکردنی ئەقڵی بۆ پاڵنەرە سێکسییەکان لەم کەسانەدا کەم ببنەوە، یان هەر نەمێنن. هەندێکیش پێیان وایە، لادانی خۆنمایشکردن، پاشماوەی پراکتیزە سێکسییە سەرەتاییەکان بێ، کە پیاو، یان هەندێ جار ژنیش، ئەندامی سێکسیی خۆیان نمایش کردووە، وەک ئاماژەیەک بۆ دەرخستنی توانایان ئامادەباشییان بۆ وەڵامدانەوەی سێکسی. تیۆرێکی دیکە هەیە کە پێی وایە، خۆنمایشکردن جۆرێکە لە جۆرەکانی ڕەفتاری سادی، کە پیاو توندوتیژیی دەروونی بەکار دەهێنێ بەرامبەر بە ژن و ناچاری دەکات بۆ بەئاگاهاتن و تەماشاکردنی کتوپڕ و ترسناکی ئەندامی سێکسیی خۆی، کە ئەم ناچارکردنە دەبێتە مایەی ئازاردان و ترس و قێزەونی لە دەروونی ژندا، ئەمەش هەمان ئامانجەکانی کەسانی سادین کە لە نێچیرەکەی دەوێن.

**فتشیزم**

لادانی فتشیزم fetishism بەزۆری لە نێردا ڕوو دەدات. کەسی لادەر بۆ بەدیهێنانی چێژی سێکسی ملکەچی پاڵنەرێکی توند دەبێ بۆ دەستلێدان یان گەمەبازی لەگەڵ بەشێکی دیاریکراوی جەستەی ئەو کەسەی کە خەیاڵە سێکسییەکەی لەسەری چڕبووەتەوە، یان دەستدان لە پۆشاک یان ئامراز یان هەر پێویستییەکی ئەو کەسە، وەک جلوبەرگی ژێرەوە و عەتر و گوڵ و پێڵاو و ئامرازەکانی خۆڕازاندنەوە و چەندەها وردەشمەکی دیکە. کەسی فتشیزم بەزۆری بەشێکی دوور لە ناوچە سێکسییەکانی جەستە هەڵدەبژێرێ، وەک قژ و پێ، چەندە ئەو بەشانە لە ناوچە سێکسییەکانەوە دوورتر بن، ئەوەندە حاڵەتی فتشیزمییەکە ئاشکراتر دەردەکەوێ. لە هەڵبژاردنی ئەو شمەکانەشدا، ئەو شتانە هەڵدەبژێرێ کە زیاتر ئارەزووی سێکسی

دەورووژێنن، وەک جلوبەرگی ژێرەوە و گۆرەویی تەنک. کەسی لادەر ئەم ئامراز یان پێویستییانە بە مەبەستی ئەنجامدانی ماستەربەیشن بەکار دەهێنێ، لەڕێی دانانیان لە بەردەمی خۆیدا یان دەستدان لێیان. هەندێ لەم کەسانە ئەو شمەکانە بە هەمان ئەو ڕێگەیەی دەستیان کەوتووە بۆ خاوەنەکەی دەگێڕنەوە، ئەوەش لەدوای ئەوەی ماوەیەک بۆ ئەو مەبەستەی خۆیان بەکاری دەهێنن، لەوانەیە لەدوای گەڕانەوەی بۆ خاوەنەکەی، جارێکی دیکە یان چەند جارێکی دیکەش، هەمان ئەو شتانە بۆ هەمان مەبەست و چێژی سێکسی بەرنەوە. کەسی تووشبوو بە لادانی فتشیزم، لەوانەیە بە لایەوە گرنگ نەبێ ئەو کەسەی ئەو شتانەی لێ بردووە بزانێ یان نەزانێ کە شتی لێ براوە و بە مەبەستی چێژی سێکسی بەکارهێنراوە، هەروەها دەشێ بەبێ ئاگاداریی خاوەنی ئەو شتانە، شتەکان بەرێ و چێژیان لێ وەربگرێ. بەگشتی کەسی فتشیزم کار و کردەوەی دژ بە کۆمەڵگە ئەنجام نادات، تەنیا دزینی ئەو کەلوپەل و وردەشمەکانە نەبێ. بۆ لێکدانەوەی فتشیزم چەندەها تیۆر هەن، هەندێکیان پێیان وایە، کەسی فتشزم هەمان ئەو نەریتە سێکسییانە ئەنجام دەدات کە لە منداڵیدا ئەنجامی داون و هەر لە خەیاڵیدا ماونەتەوە و ناتوانێ دەستبەرداریان بێ. تیۆرێکی دیکە بەو شێوەیە فتشیزم لێک دەداتەوە، کە ئەو ڕەفتارە سێکسییانەی فتشیزم دەیاننوێنێ بەڵگەن لەسەر خۆنەویستی و هۆگربوونی بە دایکییەوە و ڕقلێبوونەوەی باوکی لە منداڵیدا، لەبەر ئەوە لە گەورەییدا هەر حەزی لە دەستلێدانی ئەو شتانەیە کە تایبەتن بە مێ، تەنانەت ئەگەر نەشتوانێ ڕاستەوخۆ دەست لەو کەسەوە بدات کە حەزی لێیەتی و پێی دەورووژێ. هەندێک تیۆری دیکە هەن پێیان وایە، فتشیزم لە ئەنجامی ئەزموونێکی سێکسیی کاریگەرەوە دروست دەبێ کە شوێنەواری لەسەر دەروون و ناخی ئەو کەسە

جێهێشتبێ و کاری کردبێته سەر وەڵامدانەوەی سێکسی کە پەیوەندیی بە ئامرازێ یان کەلوپەلێکی تایبەتی ژنێکەوە هەبێ، بۆ نموونە وەک ئەو جل و شمەکانەی کە تیسکنن و لە فەرووی ئاژەڵ دروست کراون، یان پێڵاو، یان گۆرەویی تەنکی ژنانە. تیۆرێکی دیکە، فتتشزم و ماستەربەیشن بەیەکەوە پەیوەست دەکات، چونکە تێبینی کراوە هەندێ لەو کەسانەی ماستەربەیشن دەکەن، لە بەردەم شتێ یان کەلوپەلێکدا ماستەربەیشن دەکەن کە تایبەت بێ بەو کچەی کە خۆشیان دەوێ، یان حەزیان لێیەتی، یان لەڕێی دەستدان لە شمەکێکی ئەو کچەوە، ئەو کردارە دەکەن و بە ئۆرگازم دەگەن، بەم شێوەیە ئەم ڕەفتارە سێکسییە دەبێتە نەریت، بەتایبەتی لای ئەو پیاوانەی لەبەر هەر هۆیەک بێ لە ئەنجامدانی پەیوەندیی سێکسیی ڕاستەوخۆ سڵ دەکەنەوە. دەشێ ئەم ڕاهاتنە جۆرێ لە مۆرکوەرگرتنی ڕەفتاری مەرجدار لەو کەسەدا دروست بکات. بۆ سەلماندنی ئەم تیۆرە، یەکێک لەو توێژەرانەی بڕوای بەم تیۆرە هەیە، تاقیکردنەوەیەکی لەسەر ژمارەیەک پیاو کرد و وێنەی سێکسیی وروووژێنەری لەسەر شاشەیەک پیشان دان، بەر لە پیشاندانی ئەو وێنە وروووژێنەرانە، وێنەی جووتێ پێڵاوی لەسەر شاشەکە نمایش کرد. وێنە سێکسییەکان، پیاوەکانی وروووژاند، پاشان چەند جارێ هەمان نمایشی دووبارە کردەوە، تێبینیی کرد، پیاوەکان هەر بە نیشاندانی وێنەی پێڵاوەکە دەوروووژێن، واتە بەر لەوەی وێنە سێکسییەکانیش ببیننەوە. لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە لەسەر تۆماری ژیانی ئەو کەسانەی تووشی ئەم لادانە بوون، دەرکەوتووە، کۆمەڵێک خەسڵەتی تایبەتییان هەبووە، وەک ئەوەی ژیانی سێکسیی هاوبەشیان (واتە پەیوەندیی سێکسییان لەگەڵ هاوبەشە ژنەکەیاندا) پەیوەندییەکی کامڵ و گەشەکردوو نەبووە، هەروەها لەمنداڵیدا نەیانتوانیوە لەگەڵ منداڵانی کچدا یاری بکەن و زۆر هۆگری دایکیشیان بوون. ئەم

کەسانە لە کاتێکی زووی بەر لە نەرزەبوون، مەسەلە سێکسییەکان سەرنجیان ڕاکێشاون و بەئاگابوون لێیان. هەرچی واقیعی حاڵە لە ڕووی دەروونی و سێکسییەوە کەسانێکی پێنەگەیشتوون، هەروەها بەدەست ترسی تایبەتەوە لە سێکس دەناڵێنن و لە سێکسی ڕاستەوخۆ و ڕاستەقینە لەگەڵ هاوبەشێکی سێکسیدا سڵ دەکەنەوە.

**خۆمەڵاسدان**

کەسی لادەر لە حاڵەتی لادانی خۆمەڵاسدان voyeurismدا، لەڕێی خۆمەڵاسدان و تەماشاکردنی کەسێکی ڕووت، چێژی سێکسی وەردەگرێ، یان لەڕێی تەماشاکردنی پەیوەندیی سێکسیی نێوان دوو کەسی دیکە کە بێئاگان لەوەی کەسێک تەماشایان دەکات، چێژی سێکسی وەردەگرێ. هەرچەندە شتێکی سروشتییە کە زۆر کەس چێژ دەبینن لە بینینی دۆخە سێکسییە وورووژێنەرەکان و دیمەنی کەسانی دیکە لە کاتی سێکسدا، بەڵام ئەوەی وا دەکات ئەم حەزە بە لادان حیساب بکرێ، لەو کاتەدایە کە تاک تەنیا لەم ڕێگەیەوە هەست بەچێژی سێکسی بکات، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندێ کەس بەهۆی نەبوونی فرسەتی ڕاستەقینە و ڕاستەوخۆی وورووژاندنی سێکسییەوە، پەنا بۆ ئەم جۆرە ڕەفتارە دەبەن، بەڵام ئەمە بە لادانی تەواو دانانرێ، تەنیا لەو دۆخەدا نەبێ ئەگەر تاک ئەم شێوازەی بەدڵخوازترین شێوازی چێژبینیی سێکسی دانا و پراکتیزەی کرد، تەنانەت لە کاتێکیشدا کە توانای ئەنجامدانی پەیوەندیی سێکسیی بە شێوە ڕاستەوخۆ و سروشتییەکە بۆ ئەو کەسە فەراهەم بوو. ئەوانەی تووشی ئەم لادانە بوون بە زۆری سەر بە توخمی نێرن، ئەو پیاوانەش کە تووشی ئەم لادانە بوون و هاوسەرێتیشیان کردووە، ژمارەیان کەم نییە. ئەو پیاوەی چێژی سێکسی لە خۆمەڵاسدان لە کەسانی

دیکە دەبینی، ئەگەر خۆی ژنی هەبێ، ئەوا دەستکەوتنی ئەم جێژەی قورستر دەبێ و ئازار و ماندووبوونی زۆر دەچێژێ و ڕووبەڕووی سەرپێچی و مەترسی دەبێتەوە، هەندێکیان لە نێومالاّندا هاتوچۆ دەکەن لە پەنجەرە و کونی دەرگاوە نیگا دەدزن لەپێناوی بەدیهێنانی ئامانجە سێکسییەکەیاندا، هەندێکیشیان سەربانی ماڵەکان بۆ ئەم مەبەستە بەکار دەهێنن و چاودێریی خەڵکی دەکەن کاتێ خۆیان ڕووت دەکەنەوە، یان سێکس دەکەن، هەندێک پیاویش دووربینی نزیککەرەوە بۆ هەمان مەبەست بەکار دەهێنێ. بە پێچەوانەی ئەو پیاوانەوە کە تووشی لادانی جۆری خۆنمایشکردن بوون و حەز دەکەن بە ئەنقەست خۆیان نمایش بکەن، ئەو پیاوەی تووشی لادانی خۆمەلاسدان بووە، خۆی لە چاوی خەڵک بەدوور دەگرێ و بە دزی و بەئاگاییەوە لە شەودا سەیری خەڵک دەکات. کنزی لە لێکۆڵینەوەکەیدا کە لە شێوەی ڕاپرسی ئەنجامی دا، ئاستی بڵاوبوونەوەی لادانی جۆری خۆمەلاسدانی لە ڕەفتاری سێکسی لە مرۆڤدا خستە ڕوو، تەنانەت ئەگەر ئەم خۆمەلاسدانە بە شێوەیەکی سەرپێیش بێ و هەمیشەیی نەبێ، کنزی ئەوەی ئاشکرا کرد کە ٦٠%ی پیاوان بە شێوەیەک لە شێوەکان یان لە ماوەیەکی ژیانیاندا یان بەیناوبەین ئەم ڕەفتارە سێکسییەیان پراکتیزە کردووە، دەشێ ڕێژە ڕاستەقینەکە لەمەش زیاتر بێ، هەرچەندە ژمارەی ئەو کەسانەی کە خۆڕاگرن لەسەر بەردەوامیدان بەم نەریتە، کەمن. کەسی خۆمەلاسدەر بە زۆری بەتەنیا ئەم کارە ئەنجام دەدات و لە کاتی تەماشاکردندا ماستەربەیشن دەکات. بە زۆری حەزی لە سەیرکردنی ئەو کچانەیە کە نایانناسێ. ئەم کەسە لادەرە، توندوتیژی یان دەستدرێژی ناکاتە سەر ئەو کەسەی کە خۆی لێ مەلاسداوە، تەنیا لەو بارەدا نەبێ کە خۆی لە کێشەیەکدا دەبینێتەوە و ئەو کەسە هەڕەشەی ئاشکراکردنی لێ دەکات، هەروەها لەو بارانەشدا

توندوتیژی دەنوێنێ ئەگەر ئەو پیاوە خۆی کەسێکی شەڕانگێز بێ، یان مەیلی تاوانکاری لە کەسێتییدا هەبێ، هەروەها ئەو کەسانە ئەم ڕەفتارە لادەرە دەنوێنن کە ناتوانن بە شێوەیەکی سروشتی پەیوەندیی سێکسی بکەن، یان لە منداڵییەوە لەسەر ئەوە ڕاهاتوون بە دزییەوە سەیری ئەو دۆخ و کەسانە بکەن کە لە ڕووی سێکسییەوە ورووژێنەرن. ژمارەیەک لە توێژەران پێیان وایە ئەو کەسانەی سەیری وێنە و فیلمی ورووژێنەر لە ڕووی سێکسییەوە دەکەن، هەر بە جۆرێکی تایبەت لە لادانی جۆری خۆمەڵاسدان دادەنرێ، هەروەها ئارەزووکردنی هەندێک کەس لە چوون بۆ یانە و مەلەوانگەکانی کە ڕێگە بە ڕووتبوونەوە دەدەن، هەروەها ئەو گرووپانەی لە هەندێک وڵاتانی دنیادا بڵاوبوونەتەوە کە خۆیان ڕووت دەکەنەوە، هەروەها حەزکردنی هەندێ کەس لە سەیرکردنی سێکس لای ئاژەڵان و چێژبینین لێیان، ئەمانە هەمووی بە جۆری لادانی خۆمەڵاسدان دادەنرێن.

## لەبەرکردنی پۆشاکی توخمەکەی دیکە

لەبەرکردنی پۆشاکی توخمەکەی دیکە Tarnsvestism، تاک لەم لادانەدا پۆشاکی توخمەکەی دیکە لە بەر دەکات، کەسی لادەر لە کاتێکدا ئەم کارە دەکات کە تەنیایە و بەزۆری بەو جلانەوە ماستەربەیشن دەکات، بەڵام هەندێ لە کەسانی لادەر ئەو جلانە لە بەر دەکەن وەک پێشەکییەک بۆ پەیوەندیی سێکسیی هۆمۆسێکوالیتی و ئەو جلانەی کە لە بەری دەکەن لەگەڵ ئەو ڕۆڵەدا دەگونجێ کە لە پەیوەندیی سێکسییەکەدا لەگەڵ توخمەکەی خۆیاندا ئەنجامی دەدەن. ئەو کەسەی تووشی ئەم لادانە بووە کۆئەندامی سێکسیی سروشتیی هەیە و بە تەواویش دەرک بە ناسنامەی توخمی خۆی دەکات و هیچ ئارەزوویەکی نییە بۆ گۆڕینی ناسنامەی توخمی خۆی بە ناسنامەی توخمە دژەکەی کە

جلەکانی لە بەر دەکات، وەک لە حاڵەتی لادانی توخمی پێچەوانە یان دژدا Transexuality ڕوو دەدات. دەروونشیکاران لە لێکدانەوەی ئەم لادانەدا دووچاری ئەستەمی بوونەتەوە، یەکێک لەو لێکدانەوانە ئاماژە بەوە دەدات، حەزی ئەم کەسانە بۆ لەبەرکردنی پۆشاکی توخمەکەی دیکە، بۆ قۆناغی منداڵی دەگەڕێتەوە، بۆچوونی دیکەش هەیە ئەم لادانە لەسەر بناغەی جووتتوخمی لە مرۆڤدا لێک دەداتەوە، بەپێی ئەو بۆچوونە هەریەک لە ئێمە، ژن بێ یان پیاو، بەشێک لە توخمە دژەکەی خۆی تیادایە، لەبەر ئەوە ئارەزوویەکی چاوەڕوانکراو و شیاوە، ژن بێ یان پیاو، هەندێ جار چێژ لە لەبەرکردنی پۆشاکی توخمە دژەکەی خۆی ببینێ. تیۆری دیکەش هەیە کە لادانی لەبەرکردنی پۆشاکی توخمەکەی دیکە بۆ لادانی فتشزم دەگەڕێنێتەوە، دەشێ تەنیا جیاوازی لە نێوان ئەم دوو لادانەدا ئەوە بێ کە لادانی جۆری لەبەرکردنی پۆشاکی توخمەکەی دیکە، بەکردەیی پۆشاک و کەلوپەلی توخمەکەی دیکە لە بەر دەکات و بەکاری دەهێنێ، لەوانەیە ئەمە جۆرێ بێ لە بەیەکگەیشتن و پێکەوەنووسانی هێمایی لە نێوان کەسی لادەر و توخمەکەی دیکەدا کە دەترسێ ڕووبەڕوو بێتەوە لەگەڵیدا و لە واقیعیدا پەیوەندیی سێکسیی لەگەڵدا ئەنجام بدات. یەکێک لە گرنگترین کێشەکانی کە لەم جۆرە لادانەوە سەرچاوە دەگرێ، کێشەی لەبەرکردنی پۆشاکی یونیفۆرمە، یان یەک پۆشاکییە، کە لە هەندێ لە کۆمەڵگەکاندا لە ماوەی چەند ساڵێکی دیاریکراو لە قۆناغی هەرزەکاریدا، هەردوو توخمەکە لە بەری دەکەن، لەبەرئەوە توێژەر لەم بارەدا ناتوانێ بەم حاڵەتانە بڵێ لادان بە مانا دروستەکەی زاراوەکە، بەڵام ئەم حاڵەتە بەڵگەیە بۆ بوونی بڕێک لە جووتتوخمی بە شێوەیەکی ئاشکرا لە هەندێ خەڵکدا و بارودۆخی کۆمەڵایەتی و شارستانی ڕێگەخۆشکەرن بۆ دەرکەوتنی و ڕێگەدان بە گوزارشکردن لێی.

## گێچەڵپێکردن

گێچەڵپێکردن Frotteurism دەکەوێتە نێوان لادانی خۆنمایشکردن و لادانی فتشزم، بە زۆری پیاوان پراکتیزەی دەکەن لەڕێی خۆنوساندن و خۆلێخشاندن لەگەڵ ژناندا و لە شوێنە گشتییە قەرەباڵغەکاندا ئەنجامی دەدەن، بۆ نموونە لەناو پاس و ئەو شوێنانەی پڕ لە خەڵکن، وەک ئاهەنگ و سینەما و گردبوونەوە تێکەڵەکاندا، بەزۆری لەم دۆخانەدا پیاو لەدواوە خۆی بە سمتی ژنەوە دەنوسێنێ. هەرچەندە لەو شوێنانەدا ئەو پیاوە تەنیا دەتوانێ بەم شێوازە خۆی بە ژنەوە بنووسێنێ و ئارەزووی سێکسی ورووژاوی تێر بکات، بەڵام ئەم ڕەفتارە دەشێ بە ڕەفتارێکی لادەرانە بێت و سمتی ژن بابەتێکی فتشزمی بێ کە سەرنجراکێشانی پیاوی لەسەر چڕ بووەتەوە.

## لادانە سێکسییە هاوبەشەکان

ئەم لادانە بەوە دەناسرێ کە ئەنجامدانی پێویستی بە هاوبەشیکردن هەیە لەگەڵ هاوبەشێکی سێکسیدا، لەبەر ئەوە لە لادانەکانی کە پێشتر باسمان کردن، جیاوازە، چونکە لەوانەی پێشوودا کەسی لادەر بەتەنیا بێ ئەوەی پێویستی بە هاوبەشێکی سێکسی بێ، خۆی گوزارشت لە لادانەکەی دەکات. لە لادانی سێکسی هاوبەشدا، کەسی لادەر بە شێوەیەکی ناسروشتی و دژەباو هاوبەشە سێکسییەکەی هەڵدەبژێرێ لە نێوان مرۆڤ یان ئاژەڵدا، دەشێ لە شێوەیەکی سنووردا، تەنیا ئەوانە هەڵبژێرێ کە سەر بە توخمەکەی خۆین، وەک لادانی هۆمۆسێکوالیتی لە نێر و مێدا، یان منداڵبازی pedophilia، یان کەسانی بەتەمەن Gerontophilia، یان لاشەی مردوو Necrophilia، یان پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ ئاژەڵاندا zoophilia. سەبارەت بە گرووپی یەکەم، واتە هۆمۆسێکسوالیتی لە نێر و مێدا کە لە هەموو

لادانەکانی دیکە گرنگترە، لە بەشێکی تایبەتی ئەم کتێبەدا باسمان کرد، لەم بابەتەشدا هیچ شتێکی تازە نییە بۆی زیاد بکەین، جگە لە جەختکردنەوە ئەبێ لەوەی لادانی سێکسیی هۆمۆسێکسوالیتی تەنیا ئەو حاڵەتانە دەگرێتەوە کە تاک بە شێوەیەکی هەمیشەیی و تەواو تەنیا لەگەڵ توخمەکەی خۆیدا سێکس دەکات، تەنانەت لەو حاڵەتانەشدا کە ئەو کەسە فرسەتی سێکسکردنی سروشتیی لەگەڵ توخمە دژەکەی خۆیدا هەیە، بەڵام هەر سێکس لەگەڵ توخمەکەی خۆیدا دەکات. لێرەدا بە کورتی باسی هەریەک لەو لادانە سێکسییە هاوبەشانەی دیکە دەکەین کە تاک پێویستی بە هاوبەشی سێکسییە بۆ ئەنجامدانی لادانەکەی، یان وەرگرتنی چێژی سێکسی لەڕێی ئەو لادانەوە.

**منداڵبازی**

منداڵبازی یان پیدۆفیلیا pedophilia، لادانێکە کە تاک بە زۆری نەک بە ناچاری، بە لایەوە خۆشترە کە سێکس لەگەڵ منداڵدا بکات، ئیدی منداڵەکە سەر بە توخمەکەی خۆی بێ یان توخمە دژەکەی خۆی بێ، هەرچەندە ڕێژەی ئەنجامدەرانی ئەم لادانە لەنێو نێردا زیاترە، بەڵام ژمارەیەک لە مێ-ش لەگەڵ منداڵدا ڕەفتاری سێکسی ئەنجام دەدەن، هەروەها ئەو ژنانەش کە بە پلەی کەمتر ئاشکرا گەمەی سێکسی لەگەڵ منداڵدا دەکەن، ژمارەیان کەم نییە، هەرچەندە ئەمەی دواییان بە لادانی سێکسی دانانرێ بە مانای تەواوی زاراوەکە. زۆربەی زۆری ئەو کەسانەی ئەم لادانە ئەنجام دەدەن، کوڕن و لەگەڵ منداڵانی هاوتوخمی خۆیان لە تەمەنی بچووکتر لە منداڵ و مێردمنداڵ ئەنجامی دەدەن. دەشێ هەڵبژاردنی ئەم هاوبەشانە بۆ سێکس لەو ترسەوە سەرچاوەی گرتبێ کە بە زۆری کوڕان لە دەرئەنجامی سێکسکردن لەگەڵ کچانی هاوتەمەنی خۆیاندا سڵ دەکەنەوە. ئەم لادانە چەند لێکدانەوەیەکی بۆ کراوە،

هەندێکیان لەسەر بناغەی بەتاڵکردنەوەی پێویستیی سێکسی لێکی دەدەنەوە، هەندێکیان لەسەر بناغەی درێژبوونەوەی شارستانیی هەندێ لە کۆمەڵگەکان، هەندێکیان پێیان وایە تەنیا لە ئەنجامی یەککگرتنی خەیاڵی مێردمنداڵانەوە لەگەڵ ئەوانەی کە لە خۆیان گەورەترن ڕوو دەدات، هەندێکیش پێیان وایە ئەم لادانە بەڵگەیە بۆ بوونی ئامادەباشی ڕووەو هۆمۆسێکسوالیتی لە منداڵ، یان مێردمنداڵدا. ئەم لادانە لە ڕووی هاوبەشیکردنی هاوبەشێکی بە تەمەن گەورەتر لە پەیوەندیی سێکسیدا، بەو شێوەیە لێک دەدرێتەوە کە بەڵگەیە بۆ تێروتەواونەبوونی گەشەی سێکسی کە وای لەو کەسە کردووە لە قۆناغی گەشەی دەروونیی هۆمۆسێکسوالیتیدا بمێنێتەوە، هەروەها هەندێ لەو کەسانەی ئەم جۆرە لادانە پراکتیزە دەکەن، لە ڕووبەڕووبوونەوەی گەشەی سێکسیی سروشتی و هاوتا، سڵ دەکەنەوە، لەبەر ئەوە مێردمنداڵان بە بوارێکی باش دادەنێن بۆ گوزارشتکردن لە ئارەزووە سێکسییەکانیان بێ ئەوەی ڕووبەڕووی ململانێی دەروونی ببنەوە. زۆربەی ئەو کەسانەی ئەم لادانە پراکتیزە دەکەن، هیچ نەخۆشییەکی دەروونی یان ئەقڵیی دیاریکراویان نییە، بە شێوەیەکی سروشتی کارەکانیان ڕادەپەڕێنن و لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیاندا دەردەکەون، دەشێ هەندێکیان لە بوارێکدا بەهرەیەکیشی هەبێ، بەڵام هەندێکیان کە ڕێژەکەیان کەم نییە، بەدەست پلەیەک لە پلەکانی پەککەوتنی سێکسییەوە دەناڵێنن، بۆیە پێیان وایە کاتێک سێکس لەگەڵ منداڵ یان مێردمنداڵێ دەکەن، ئەو پەککەوتنەیان کەمتر دەردەکەوێ و بەمەش کەمتر هەست بە شەرمەندەیی و سەرشۆڕی دەکەن بەهۆی کەمتوانایی سێکسییانەوە، لەبەر ئەوە ئەم کەسانە زیاتر گەمەی سێکسی لەگەڵ منداڵاندا دەکەن وەک لەوەی پەیوەندیی سێکسیی ڕاستەقینە ئەنجام بدەن.

## پیربازی

له لادانی سێکسی پیربازی Gerontophilaدا تاک له هەردوو توخمەکه مەیلی بۆ هاوبەشێکی سێکسی هەیه که چەندەها ساڵ له خۆی گەورەتربێ، ئەم ئاڕاستەیه بۆ کەسانی بەتەمەن به لادان دانانرێ ئەگەر بارودۆخی کۆمەلایەتی، یان ئابووری ئەو کەسەی ناچار کردبێ، یان ئەگەر لەبەر پێویستیی سێکسی بوو پەنا بۆ هاوبەشێکی بەتەمەن برا. توێژەران ئەم دیاردەیه لەسەر چەندەها بناغەی جیاواز لێک دەدەنەوە. یەکێک لەو لێکدانەوانه لەسەر بناغەی دەروونشیکارییە، که ئەم لادانه به یەکێک له ڕوخسارەکانی چەقبەستنی ژیانی سێکسیی دەروونیی تاک دادەنێ لەناو قۆناغی ئۆدیبدا. لەم قۆناغەدا منداڵ کوڕ بێ یان کچ هۆگری یەکێک لەباوانی دەبێ له توخمه دژەکەی خۆی، واته کوڕ هۆگری دایکی دەبێ، بۆیه له گەورەییدا بەشوێن ژنێکدا دەگەڕێ که له دایکی بچێ و وەک دایکیشی زۆر له خۆی گەورەتر بێ، به هەمان شێوه کچیش بەهۆی هۆگربوونییەوە لەگەڵ باوکیدا، له قۆناغی ئۆدیبدا و چەقبەستنی لەو قۆناغەدا بەشوێن پیاوێکدا دەگەڕێ که زۆر له خۆی گەورەتر بێ و سێکسی لەگەڵ بکات.

## مردووبازی

له لادانی جۆری مردووبازی Necrophiliaدا تاک حەز دەکات لەگەڵ لاشەی مردوودا سێکس بکات، ئیدی نێر بێ یان مێ. دەشێ ئەم لادانه پاڵ بەو کەسانەوە بنێ بۆ هەڵدانەوەی گۆڕ، یان کاری کوشتن و تاوانکاری تا سێکس لەگەڵ لاشەی کوژراوەکەدا بکەن. هەندێک پێیان وایه بەشێک لەو کەسانەی که له گۆڕستان و لەنێو گۆڕی مردوواندا دەژین، ئەم لادانەیان هەیه، بەلام لێکدانەوەی هۆکارەکانی ئەم لادانه کارێکی قورسە. یەکێک له

تیۆرەکانی دەروونشیکاری بۆ هۆگربوونی زۆر و ناسروشتیی نێوان کەسی لادەر و یەکێک لە باوانی مردووی دەگەڕێنێتەوە، ئەو کەسە پێی وایە سێکسکردن لەگەڵ لاشەی مردوو وەک ئەوە وایە لەگەڵیدا یەک بگرێ. ڕای دیکەش هەیە پێی وایە ئەم لادانە شێوەیەکە لە شێوەکانی بیرۆکەی زاڵ کە بەسەر فیکری کەسی لادەردا زاڵ دەبێ و بە زۆر پاڵی پێوە دەنێت ئەو بیرۆکەیە جێبەجێ بکات.

### ئاژەڵبازی

هەندێک خەڵک، بەتایبەتی کوڕان، ناچار دەبن سێکس لەگەڵ هەندێ ئاژەڵی تایبەتیدا بکەن، ئەم ڕەفتارە لە هەندێک لە کۆمەڵگەکاندا، بەتایبەتی گوندییەکان، ڕەفتارێکی دەگمەن نییە، چونکە لەو کۆمەڵگەیانەدا چەپاندنی سێکسی باوە و سێکسکردنیش لەگەڵ ئاژەڵدا ئاسانە، لەم حاڵەتانەدا مەرج نییە هەموو کاتێک بە لادان دابنرێ، تەنیا لەو حاڵەتانەدا لادانە کە کەسی ئەنجامدەر هەمیشە سێکسی لەگەڵ ئاژەڵدا بە لاوە خۆشتر بێ وەک لە مرۆڤ. هەندێک لە توێژەران لادانی ئاژەڵبازی – zoophilia Beastiality وا لێک دەدەنەوە کە کەسی لادەر بڕوای بە توانای سێکسیی خۆی نییە و دەترسێ ئەگەر لەگەڵ مرۆڤێکدا سێکس بکات، لاوازی یان کەموکوڕییەکەی دەربکەوێ، بەڵام ئاژەڵ ناتوانێ نهێنییەکەی بدرکێنێ. ژمارەیەک ڕای دیکە هەن پێیان وایە، ئەو کەسەی حەز لە سێکسکردن لەگەڵ ئاژەڵدا دەکات، کەسێکە هەموو شتێکی تایبەت بە مرۆڤ و مرۆیی ڕەت دەکاتەوە و ڕقی لێیان دەبێتەوە، لەبەر ئەوە لە سێکسیشدا ئاژەڵی لە مرۆڤ پێ

باشترە. شایەنی ئاماژەیە، ئەم ڕەفتارە لە سەردەمە دێرینەکانەوە تا ماوەیەکی نزیک لەم سەردەمەش، ڕەتکراوەتەوە، تەنانەت ئەو کەسەی لەگەڵ ئاژەڵدا سێکسی بکردایە، حوکمی لەسێدارەدانی دەدرا و ئاژەڵەکەش دەکوژرا. لە یاساکانی حامورابیدا، یاسای تایبەتی بۆ دەرکراوە، بەڵام لەم سەردەمەدا هەندێک لە کۆمەڵگەکاندا سزای ئەنجامدەری ئەم ڕەفتارە دەدات بەو تۆمەتەی کە ئەو کەسە ئازاری ئاژەڵی داوە.

### لادان لە ناسنامەی توخمیدا

زۆربەی زۆری خەڵک بە ژن و پیاوەوە، هەست بە جۆری لە گونجان و ڕازیبوون دەکەن لە نێوان هەقیقەتی جەستەیان و هەستکردنی ئەقڵییان بەوەی کە نێرن یان مێ، بە چاوپۆشین لە مەیلە سێکسییەکانیان ڕووە توخمەکەی خۆیان، یان توخمە دژەکەی خۆیان، بەڵام ژمارەیەکی کەم لە توخمی نێر هەست بەم گونجانە ناکەن (لە نێردا بە ڕێژەی یەک لە ملیۆنێکدا و لە مێ-شدا یەک لە چوارسەد هەزار).(*) ئەم کەسانە جەستەیان دژ بەو ناسنامە ڕاستەقینەیەیە کە خۆیان هەستی پێ دەکەن، بەم حاڵەتە دەوترێ لادانی ناسنامەی توخمی (سێکسوالیتی دژ Transexuality).(**) بۆ نموونە دەبینی کوڕێک لە ڕووی بایۆلۆژییەوە تێروتەواوە، بەڵام خۆی هەست دەکات کچە و ناسنامەی توخمییەکەی مێیە، بە هەمان شێوە کچ دەبینی لە ڕووی بایۆلۆژییەوە مێیەکی تێروتەواوە، بەڵام خۆی سوورە لەسەر ئەوەی ناسنامە توخمییەکەی کە خۆی هەستی پێ دەکات نێرە، لە هەردوو حاڵەتەکەدا وا دەردەکەوێ هەریەکە لەم دوو کەسە لە جەستەیەکدا دەژین کە دژ بە ناسنامەی هەستی و ڕۆحیی خۆیانە. لەوانەیە ئازار و کۆژانی ئەم لادانە وا لەم کەسانە بکات هەوڵ

بدەن بە شێوازی نەشتەرگەری هەندێ بەشی جەستەیان ببڕن و گۆڕانکاری لە جەستەیاندا بکەن تا جەستەیان لەگەڵ ڕۆحیاندا بگونجێ. ئەم حاڵەتە کە واقیع و هەستی مرۆڤ بەرامبەر بە خۆی، دژ بەیەکن، دیاردەیەکی دەگمەن نییە، بەپێی ئامارەکان، ژمارەیەکی زۆر لە هەردوو توخمەکە هەن کە بەپلەی جیاواز، هەست دەکەن ناسنامەی توخمییان دژ بە جەستەیانە، ئەمەش مەسەلەیەکی چاوەڕوانکراوە، ئەگەر بڕوامان بە دروستیی ئەو تیۆرە کرد کە پێی وایە بنەچەی هەردوو توخمەکە یەکێکە واتە جووتتوخمە Bisexual. ئەم تیۆرە وا گریمانە دەکات هەر نێرێک هەڵگری ناسنامەی "مێ"شە، هەروەها هەموو "مێ"یەک هەڵگری ناسنامەی "نێر"یشە. بەپێی ئەم گریمانەیە، دەشێ تاک هەڵگری ناسنامەی توخمی توخمێک بێت کە بە تەواوەتی دژ بە واقیعی جەستەی خۆی بێ، وەک لە حاڵەتی لادانی ناسنامەی توخمیدا ڕوو دەدات. وەک چاوەڕوان دەکرێ، زۆربەی زۆری ئەو کەسانەی بەدەست ئەم لادانەوە دەناڵێنن، هەر لە منداڵییەوە هەست بە ناکۆکی دەکەن لە نێوان هەستیان و جەستەیاندا، هەندێکیشیان بەهۆی ئەو هەستەیانەوە پۆشاکی ئەو توخمە دەپۆشن کە دژ بە واقیعی جەستەیانە و لە ڕواڵەتدا وەک ئەو توخمە خۆیان دەردەخەن کە خۆیان هەستی پێ دەکەن و وەک ئەوانیش ڕەفتار دەکەن، هەندێکیشیان ڕووەو هۆمۆسێکسوالیتی ئاڕاستە دەگرن. ئەو کوڕەی کە بە جەستە و لە ڕووی بایۆلۆژییەوە نێرە، بەڵام خۆی هەست دەکات مێیە، لە پەیوەندیی سێکسیدا لەگەڵ کوڕاندا ڕۆڵی نێگەتیڤ دەبینێ، ئەو کچەش کە لە ڕووی بایۆلۆژییەوە مێیە، بەڵام خۆی هەست دەکات نێرە، لە پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتی لەگەڵ کچاندا، ڕۆڵی بکەر دەبینێ، واتە وەک پیاو ڕەفتار دەکات.

ئەو پزیشکانەی لەم بوارەدا کار دەکەن، لە هەوڵدانیاندا بۆ چارەسەرکردنی ئەم حاڵەتانەی لادان، ڕووبەڕووی ئەستەمی دەبنەوە. چارەسەرکردنی ئەم لادانە لە هەموو لادانەکانی دیکە قورسترە، چونکە نەخۆش نێر بێ یان مێ، سوورە لەسەر ئەنجامدانی گۆڕانکاری لە جەستەیدا تا لەگەڵ ناسنامەی هەستکردنی خۆیدا بگونجێ. پێداگری دەکات لەسەر بەکارهێنانی چارەسەری هۆرمۆنی و نەشتەرگەری بۆ ئەوەی ئامانجەکەی بێنێتە دی. زۆربەیان هەڕەشەی ئەوە دەکەن ئەگەر بە تەواوەتی چارەسەری پێویستیان بۆ نەکرێ و جەستەیان بۆ ئەو توخمە نەگۆڕێ کە خۆیان هەستی پێ دەکەن، ئەوا خۆیان دەکوژن، هەندێکیشیان بەڕاستی هەوڵی خۆکوشتن ئەنجام دەدەن. بەگشتی چارەسەرکردنی ئەم حاڵەتانە لەڕێی ئەم شێوازانەوە، بەتایبەتی شێوازی نەشتەرگەری، بە تەواوەتی سەرکەوتوو نابێ، لە نێرەدا کەمتر وەک لە مێ شکست دەهێنێ. چارەسەری نەشتەرگەری لە نێرەدا وا پێویست دەکات، سەرەتا بۆ ماوەی بە لایەنی کەمەوە، ساڵێک ئەو کەسە چارەسەری هۆرمۆنی وەربگرێ، پاشان نەشتەرگەریی خەساندن و لابردنی گونەکان و چووک ئەنجام دەدرێ و لە لۆچەکانی پێست، زێ و دوو لێوەکە دروست دەکرێ. بەڵام لە "مێ"دا پرۆسەکە زیاتر یەکلاییکەرەوەیە و وا پێویست دەکات، هەردوو مەمک ببڕێت و مناڵدان و هێلکەدان لاببرێ. کونی زێ قەپات دەکرێت و چووکێکی دەستکرد بۆ ئەو کەسە دروست دەکرێ، بە هەمان شێوەی نێر، لە "مێ"شدا وا پێویست دەکات بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ ئەو کەسە هۆرمۆنی ئەندرۆجین وەربگرێ، کە دەشێ یارمەتیدەر بێ لە گەشەکردنی مێتکە و زیادکردنی کاراییەکەی. بەهۆی نەبوونی متمانەی تەواو بە ئەنجامەکانی نەشتەرگەری و چارەسەری هۆرمۆنی، هەروەها بەهۆی ئەگەری ڕوودانی ئەو شێواوییەی کە دەشێ لە ڕوخسارەکانی جەستەدا لە

دەرەوە و ناوەوە ڕوو بدات، هەروەها بەهۆی ئەگەری ڕوودانی دەرئەنجامە لاوەکییە زیانبەخشەکانی ئەم گۆڕانکارییانە، وا پێویست دەکات بەر لە دەستپێکردنی هەر هەنگاوێکی چارەسەرکردن بە مەبەستی گۆڕینی توخم، ئەو حاڵەتە بە وردی لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێ و وێنەیەکی ئاشکرا دەربارەی سەرجەم ئەگەرەکان بخرێتە بەردەم نەخۆش، پاشان بڕیاردان و هەڵگرتنی بەرپرسیارێتیی ئەنجامەکان بخرێتە ئەستۆی. ئەو پزیشکەش کە چارەسەر بۆ ئەو نەخۆشە دەکات، وا پێویست دەکات تا درێژترین ماوە، پرۆسەی چارەسەرکردن و نەشتەرگەری دوا بخات، چونکە دەشێ نەخۆش لە هەوڵدانی بۆ گۆڕینی توخمەکەی خۆی پەشیمان بێتەوە و واز بێنێ.

### لادان لە شێوازدا

هەندێک لە گۆشەنیگایەکی سنووردارەوە لە سێکس دەڕوانن، جۆر و شێوازی ئەنجامدانی لە بوارێکی بەرتەسکی پەیوەندیی نێوان دوو هاوبەشدا، کۆتوبەند دەکەن. ئەم گۆشەنیگایە لەو بنەما ئەندازەییە بەڵگەنەویستە دەچێ کە دەڵێ، هێڵی ڕێک بریتییە لە نزیکترین ماوە لە نێوان دوو خاڵدا. بەم پێیە و بەگوێرەی گۆشەنیگای سنوورداریی ئەو کەسانە، وا پێویست دەکات پەیوەندیی سێکسی ڕاستەوخۆ بێ و لە بوونی هەر فرەجۆرییەک لە شێواز و هەر هونەرنواندن و کەمەیەک لەپێش و لە کاتی پەیوەندییەکە و لەدوای تەواوبوونیشی، بەدەر بێ، هەروەها وا پێویست دەکات سێکس تەنیا لە نێوان دوو هاوسەردا بێ، پیاو لە سەرەوە و ژن لە ژێرەوەی بێت. زۆرێک لە شارستانییەتەکان لە ڕابردوودا تەنانەت هەندێکیان لە ئێستاشدا، دەرچوون لەم شێوازە بە لادان لە قەڵەم دەدەن، هەروەها هەندێ بۆچوونی ئایینیش

هەیە پێی وایە دەرچوون لەم شێوازە گوناهێکی گەورەیە و وا پێویست دەکات ئەنجامدەرانی داوای لێخۆشبوون بکەن.

واقیعی ژیانی سێکسی وەک لێکۆڵینەوە راپرسییەکان ئاماژەی پێ دەدەن، هەروەها وەک لەسەر زاری خەڵکەوە باس دەکرێ، فرەجۆرییەکی زۆر لە شێوازەکانی سێکسکردندا هەیە لە لای رێژەیەکی زۆر خەڵک، زۆربەی ئەم فرەجۆرییانەش لە شێوازدا لە دەرەوەی چوارچێوەی پەیوەندیی هاوسەرێتی ئەنجام دەدرێ. گەران بەدوای شێواز و پلەکانی پراکتیزەکردنی سێکس، ئەو بەڵگانەمان دەخەنە بەردەست کە زۆربەی زۆری خەڵک، کەم تا زۆر لە هێڵی رێکی پراکتیزەکردنی سێکس لا دەدەن. ئەم دوورکەوتنەوەیەش دیاردەیەکی تازە نییە لە ژیانی مرۆڤدا، هەر وەک لە پاشماوە و شوێنەوارەکانی رابردوو بە نووسین و بە وێنە و هێلکاری ئاماژەی پێ دەدەن، بەڵام سەردەمی ئێستا دەرچوونێکی دیاری لە شێوازی کلاسیکی سێکسکردن بەخۆوە بینیوە، تا ئەو ئاستە خەڵکی لە شێوازی کلاسیکی چوونەتە دەرەوە. ئەو کەسەی توێژینەوە لەم بوارەدا دەکات، بە لایەوە قورسە بریار لەسەر ئەوە بدات ئایا کام لەو شێوازانە، شێوازی سروشتین و بە فرەجۆری لە شێواز دادەنرێن و کامیشیان بە لادان دادەنرێن. هەندێک لە توێژەران هەوڵیان داوە لەسەر بناغەی ئامار، سنووری جیاکەرەوە لە نێوان فرەجۆری لە شێواز لەگەڵ لاداندا، دابنێن، هەروەک لە سەرەتای ئەم بەشەدا روونمان کردەوە. هەندێک لە توێژەرانیش جیاوازیی نێوان ئەم دوو حاڵەتە لەسەر بناغەی ئاستی گونجانی نێوان دوو هاوبەشەکە لە سێکسدا، دەکەن، بە چاوپۆشین لەو شێوازەی لە سێکسدا دەیگرنە بەر. بەم پێیە، ورووژاندنی ئەندامی سێکسی لەرێی دەمەوە (واتە Fellatio لە حاڵەتی نێردا و cunnilingus لە حاڵەتی مێدا)، ماستەربەیشنی ئاڵوگۆرکراو، ماستەربەیشنی بەکۆمەڵ،

پەیوەندیی سێکسیی فرەهاوبەش و چەندانی دیکە، ئەمانە هەموویان بە فرەجۆری لە شێوازدا دادەنرێن و بە لادان حیساب ناکرێن.

لە چوارچێوەی ئەم سنوورە بەرفراوانەی شێوازەکانی سێکسکردندا، باسکردنی هەندێکیان هەڵدەبژێرین کە تا ئێستا بە لادان دادەنرێن، وەک لاقەکردن rape و سێکسکردن لەگەڵ ئەو کەسانەی کە حەرامە سێکسیان لەگەڵدا بکرێ، کە بەم سێکسەش دەوترێ سێکسی حەرام Incest، هەروەها سادی و ماسۆشی لە پەیوەندیی سێکسیدا. سێکسی حەرام لە بەشی تایبەت بەم بابەتە بە وردی باسی دەکەین، لێرەدا تەنیا لاقەکردنی سێکسی بە درێژی باس دەکەین، لەگەڵ ئەو لایەنانەی سێکسی حەرام کە لەو بەشەدا باس نەکراون، هەرچی بابەتی سادی و ماسۆشییە ئەوا ڕاستەوخۆ لە بەشی دواتردا بە وردی باسیان لێوە دەکەین. لاقەکردنی سێکسی بریتییە لەو حاڵەتەی سێکس کە تاک (ئاسایی نێر)، بە زەبری هێز و بە زۆر و بێ ڕەزامەندیی هاوبەشەکەی، پەیوەندیی سێکسی دەکات، بەڵام لە ڕووی پێناسەی یاساییەوە سێکسکردنی پیاو لەگەڵ هاوبەشێکدا کە وەک پێویست بەرچاوڕۆشنی و تێگەیشتن و دەرککردنی بەرامبەر بەو کارە سێکسییە نەبێ کە دەیکات، بۆ نموونە کەسی لاقەکراو لە خوار تەمەنی پێگەیشتنەوە بێ، یان لە ڕووی ئەقڵییەوە ناتەواو بێ، یان پشێویی ئەقڵی هەبێ، ئەوا هەر بە لاقەکردن دادەنرێ، تەنانەت ئەگەر ئەو کەسە خۆیشی ڕازی بێ. توێژەران لاقەکردن بۆ چەند جۆرێ پۆلێن دەکەن، یەکێک لەو پۆلێنانە ئاماژە بە چوار جۆری لاقەکردن دەدات. جۆری یەکەم ئەو حاڵەتانە دەگرێتەوە کە کەسی لادەر، کرداری لاقەکردن ئەنجام دەدات بۆ تێرکردنی ئەزوەیەکی سێکسیی جڵەونەگیراو. ئەم جۆرە لە هەموو جۆرەکانی دیکەی لاقەکردن زیاتر ڕوو دەدات، بەزۆری ئەو کەسانەی ئەم لادانە

پراکتیزە دەکەن ئارەزوویەکی سێکسیی جڵەونەگیراویان هەیە کە بەرگەی دواخستن ناگرێ. جۆری دووەم، ئەو کەسانەی ئەنجامی دەدەن کە بەوە دەناسرێن، کەسێتییەکی دڕندانە و توندوتیژیان هەیە، بە ئەنجامدانی لاقەکردن گوزارشت لە هێزی پاڵنەری ئازاردان و دەستدرێژی دەکەن لە دەروونیاندا. جۆری سێیەم لاقەکردنی سادییە کە کەسی لاقەکەر تەنیا لەڕێی ئازاردانی هاوبەشەکەیەوە و بەزۆر سێکسکردن لەگەڵیدا هەست بە ڕازیبوون و تێربوونی سێکسی دەکات. هەرچی جۆری چوارەمە ئەو کەسانە ئەنجامی دەدەن کە کەسێتییەکی سایکۆباتیان هەیە، بەوە دەناسرێن خەسڵەتی دژ بە کۆمەڵگەیان هەیە، وەک دەستدرێژی و ئازاردان، ئەم کەسانە لاقەکردن پراکتیزە دەکەن، وەک بەشێک لە ڕوخساری ڕەفتاریی ناکۆمەڵایەتییان.

بۆ لێکدانەوەی هۆکاری لاقەکردن، چەندەها تیۆر هەن، بۆ نموونە هەندێکیان پێیان وایە کە هەموو پەیوەندییەکی سێکسی بریتییە لە کرداری لاقەکردن. بەپێی تێڕوانینی هەندێک لە دەروونشیکاران، ئەم بۆچوونە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بنچینەی پەیوەندیی سێکسی لە ژیانی مرۆڤدا لەسەر بناغەی دەستدرێژی و لاقەکردن بەڕێوە چووە، کتومت هەر وەک ئەوەی کە لە ڕاوکردندا ڕوو دەدات، پاشان ئەم شێوازە لە سێکسکردن هەر بەردەوام بوو، تەنانەت لەدوای ڕاهاتنی ژیانی مرۆڤایەتی لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، تا وای لێ هات مێ ناچار بوو. تەنانەت ئەگەر بەزۆریش بێ و خۆیشی نەیەوێ سێکس لەگەڵ پیاودا بکات، لەبەر ئەوە تەنانەت ڕازیبوونیشی ئەگەر خۆی لە ناخەوە نەیەوێ، هەر جۆرێکە لە لاقەکردن. لەم بارەیەوە شتی سەیر و سەرسووڕهێنەر هەیە، بۆ نموونە لەناو عەرەبدا لە سەردەمی جاهیلی و تەنانەت دواتریشدا، بڕوا وا بووە، پێویستە ژن لاقە بکرێ کاتێ کە تووڕە دەبێ، چونکە پێیان وا بووە ئەمە گرنتی دروستبوونی منداڵی نێر

که له باوکی خۆیان بچن، دەکات، هەروەها شایەنی باسە ڕێژەیەکی زۆر لە ژنان و پیاوان لە هەندێ لە کۆمەڵگەکاندا، جۆرێ لە توندوتیژی دەنوێنن لە کاتی پەیوەندیی سێکسییاندا. تیۆری دیکەش هەیە باس لەوە دەکات کە ڕوخسارەکانی لاقەکردن گوزارشت لە نەریتێکی شارستانی دەکات کە تیایدا نێر جەخت لە پیاوەتی و دەسەڵاتی خۆی بەسەر مێدا دەکات و هەروەها جەخت لە لاوازیی ژن و تەسلیمبوونی بۆ پیاو دەکات، بەڵگەش لەسەر ئەم تێڕوانینەی کە لە هەندێک لە کۆمەڵگەکاندا باوە، ئەو ناوانەیە کە بۆ وەسفی ئەندامی نێرینە بەکار هاتوون، هەروەها ئەو وێنە و پەیکەرانەی کە هێمان بۆ دیاردەی لاقەکردن. هەندێکیش پێیان وایە مێ خۆی حەزی لە لاقەکردنە، ڕێگریکردنی ئەو کەسەی کە سێکسی لەگەڵدا دەکات، هانی لاقەکردنی دەدات، ئەو کەسانەی بڕوایان بەم لێکدانەوەیەیە، ئەوە دەکەنە بەهانە کە لە زۆربەی حاڵەتەکانی لاقەکردندا، فاکتەرێکی فریودان لە لایەن 'مێ'وە هەبوو کە هانی پیاوی داوە بۆ لاقەکردنی، بەڵام لە هەموو تیۆرەکان زیاتر ئەو تیۆرە جێگەی قبوڵە کە پێی وایە کەسی لاقەکەر پشێوییەکی دەروونی هەیە، ئەم پشێوییەش یەکێک لەم سێ بوارە دەگرێتەوە: توندوتیژی، سایکۆباتی، ناکامڵبوون. لە حاڵەتی یەکەمدا کەسی لادەر، کرداری لاقەکردن ئەنجام دەدات لەپێناوی بەدیهێنانی ئەنگیزەی توندوتیژی و دەستدرێژی، واتە ئەم دوانە پاڵنەری سەرەکیی کارەکەن. هەرچی سایکۆباتییە، پێویستی بە توندوتیژییە تا کرداری سێکسی ئەنجام بدات، بەڵام کەسی کامڵنەبوو، یان ناکامڵ، کەسێکە لە بەرهەڵستی سڵ دەکاتەوە، لەبەر ئەوە توندوتیژی دەخاتە خزمەتی سێکسەوە.

لەو بابەتە گرنگانەی کە پەیوەندییان بە لاقەکردنەوە هەیە، ئەو لاقەکردنانەن کە هاوکاتن لەگەڵ تاوانکاری و ئازاردانی هاوبەشە سێکسییەکە، ژمارەیەک لە توێژەران هۆکاری ڕوودانی ئەم دوانە

و بوونیان پێکەوە لەیەک کرداردا، بۆ ئەوە دەگەڕێننەوە کە لەو کەسانەدا پەیوەستییەکی بایۆلۆژیی ناسروشتی هەیە لە نێوان ناوەندی سێکس و ناوەندی توندوتیژی لە دەماخدا. ئەم ناوەندانە تا ئاستێکی زۆر لەیەکدییەوە نزیکن، هەر بۆیە لە زۆربەی حاڵەتەکانی لاقەکردندا توندوتیژی بەرامبەر بە کەسی لاقەکراو ئەنجامدەدرێ.

## سێکسی حەرام

سێکسکردن بە لادان و سێکسی حەرام Incest[***] دادەنرێ، ئەگەر نێر بێ یان مێ سێکسی لەگەڵ کەسێکدا کرد کە دابونەریتی کۆمەڵگەکەی لێی حەرام کردبوو. لەنێو کۆمەڵگەکاندا جیاوازیی بەرفراوان هەیە لە ڕووی سنووری ئەو تاکانەوە کە مرۆڤ نابێ سێکسیان لەگەڵدا بکات، هەروەها لە ڕووی پلەی ڕەتکردنەوەی ئەم پەیوەندییە سێکسییانەش. زۆربەی شارستانی و کۆمەڵگەکان سێکسیان لەگەڵ ئەو کەسانەدا قەدەغە کردووە کە پلەی پەیوەستیی خوێنیان نزیکە، وەک حەرامکردنی سێکس لەگەڵ دایک و باوک و خوشک و برا. هەر کەسێک سێکس لەگەڵ ئەمانەدا بکات، بە گەورەترین لادان دادەنرێ و ئەو کەسە دەکەوێتە بەردەم تووڕەبوون و سزای توندی کۆمەڵگە، ئەم ئاڕاستە توندە لە ڕەتکردنەوەی ئەم لادانەدا لە کۆنەوە و لە سەردەمەکانی زووەوە پیادە کراوە.

بڕوا وایە لەو سەردەمە دێرینانەوە پراکتیزە کراوە کە سەردەمی دایکسالاری بووە، واتە ژن لە کۆمەڵگەدا بالادەست بووە. بە حەرامکردنی ئەم سێکسە و سزادانی ئەنجامدەرانی لە یاساکانی حەموراپی و دەستووری یاسایی یان نەریتی زۆربەی ئایین و کۆمەڵگەکاندا هاتووە. بە درێژایی سەردەمەکانیش جەختی لێ کراوەتەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر دوو خاڵ. یەکەمیان ئەوەیە،

کەسانێک هەبوون بەیناوبەین، ئەو یاسا و نەریتەیان شکاندووە و دووەمیشیان ئەوەیە کۆمەڵگە ئەم دەرچوونەی تەنیا بە دەرچوون و تێپەڕاندنی سنوورە ئەخلاقییەکان دانەناوە، بەڵکو بە مەترسییەکیش لەقەڵەمی داوە کە هەڕەشە لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگە دەکات.

دەستکەوتنی لێکدانەوەی دروست بۆ ئەو پاڵنەرانەی کە پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێن سێکس لەگەڵ ئەو کەسە نزیکانەیدا بکات کە پەیوەندیی خوێنی لەگەڵیاندا هەیە، کارێکی قورسە. دەشێ لە هەریەک لە حاڵەتەکانی ئەم سێکسە حەرامەدا، هۆکارێکی جیاواز هەبێ. ئەگەر بڕوا بە تیۆرەکانی فرۆید بکەین سەبارەت بە گرێی ئۆدیب، مەیلی نێر بەرامبەر دایکی و مێ بەرامبەر بە باوکی، مەیلێکی سروشتی و ڕەسەنە لە پرۆسەی گەشەی سێکسیی دەروونیی تاکدا. ئەگەر ئەمە واقیعەکە بێت، ئەوا چاوەڕێ ناکرێ ئەم مەیلە بە تەواوەتی لە ژیانی دەروونی و سێکسیی تاکدا ون ببێ، ئەم مەیلە لە هەندێک حاڵەتدا بە کارایی دەمێنێتەوە، دەشێ بە شێوەیەکی ناتەواو، یان ناڕاستەوخۆ دەربکەوێ، بۆ نموونە لە شێوەی یان لە ڕوخساری ئەو میهرەبانی و نەرمونیانییەدا دەربکەوێ کە لە نێوان منداڵان و باوانیاندا هەیە، هەروەها دەشێ هەمان مەیلی منداڵی بۆ باوان لە شێوەیەکی دیکەدا دەربکەوێ کاتێک نێر یان مێ هەوڵ دەدات هاوڕێتی لەگەڵ کەسێکدا بکات کە هەمان خەسڵەتی دایکی یان باوکی هەڵگرتبێ، واتە کوڕ بەشوێن کچێکدا دەگەڕێ کە لە دایکی بچێ و کچیش بەشوێن کوڕێکدا دەگەڕێ کە لە باوکی بچێ. لێکدانەوەی واقیعیی دیکە بۆ هۆکاری ڕوودانی ئەم لادانە، ئەوەیە لە هەندێ خێزانی لەبەریەکهەڵوەشاودا لە ڕووی دیسپلەینی مۆراڵییەوە، ئەگەر ئەندامێک لە ئەندامانی خێزانەکە ڕەفتارێکی لەو جۆرەی نواند، ئەوا ئەندامەکانی دیکەش بێ هیچ خۆپارێزییەک دەشێ دووبارەی بکەنەوە. هەندێ لەم کارە سێکسییە حەرامانەش بەهۆی پێویستیی زۆر و پێداگریی لایەنێکی ئەو پەیوەندییە ڕوو دەدات کە لایەنەکەی

دیکەش بەقسەی دەکات، یان ناچار دەکرێ کە بەقسەی بکات. ئەگەر تەنیا جارێ ئەمە ڕووی دا، ئەوا دووبارەکردنەوەی ئاسان دەبێ لەڕێی ڕێککەوتن لەگەڵ ئەو کەسەدا، یان لە هەندێ حاڵەتدا هەڕەشەکردن لێی بە ناوهێنان و ناوزڕاندنی و ئاشکراکردنی نهێنییەکانی، دەشێ بەهانە بۆ دروستیی تیۆرەکەی فرۆید هەبێ، چونکە هەندێ جار باوک جۆرێ لە چوواندن و لەیەکچوون بەدی دەکات لە نێوان ژنەکەی و کچەکەیدا و ئەمەش لەگەڵ ئەو هەستەی کە کچ بەرامبەر بە باوک هەیەتی، یەکدەگرێ و لەوانەیە دەرئەنجامەکەی ئەو ڕەفتارە سێکسییە نادروستەی لێ بکەوێتەوە کە جۆرێ لە پەیوەندیی سێکس لە نێوان باوک و کچدا دروست ببێ. لە هەندێ حاڵەتیشدا کە بە حاڵەتی دەگمەن دانانرێت، دەبینین پاڵنەری ئەو پەیوەندییە، واقیعی کۆمەڵایەتی یان ماددییە، بەلام ئەو هۆکارانەی باسمان کردن نابنە پاڵنەر بۆ ڕوودانی پەیوەندیی سێکسی لە نێوان ئەو کەسە نزیکانەی کە نەخۆشیی ئەقلی و دەروونییان هەیە.

لێکۆڵینەوەکەی سیمندز و ڕامی symonds and Ramey لە ساڵی ١٩٧٢دا یەکێکە لەو لێکۆڵینەوانەی کە ئاماژە بەوە دەدات ئەم جۆرە پراکتیزەکردنە سێکسییانە دەگمەن نین و دەشێ ژمارەیەک لە ئەنجامدەرانیشی پێیان وا بێ کە پەیوەندییەکی تەواو پۆزەتیڤە و لە هەموو زیانێکی دەروونی و کۆمەڵایەتیش بەدەرە. ئەم دەرئەنجامانە و دەرئەنجامی توێژینەوەکانی چەندەها توێژەری دیکەش، وەک قستەنتین لە ساڵی ١٩٧٣دا، بوونە مایەی سەرهەڵدانی ئەو ڕایەی کە پێی وایە ئەو هۆکارانەی بە درێژایی مێژوو بەهانەی بۆ سێکسی حەرام هێناوەتەوە لە چوارچێوەی خێزاندا، لە ئێستادا بوونیان نییە، لە کۆمەڵگەی هاوچەرخیشدا بەهانەی دیکە بۆ ڕوودانی هەیە. زۆربەی زۆری خەڵک لەگەڵ ئەم ڕایەدا ناکۆکن، بەلام لە ڕووی یاساییەوە لە زۆربەی کۆمەڵگەکاندا پشتیوانیی لێ دەکەن.

**پەراوێزەکان:**

*یەکەمین کەس کە زاراوەی سێکسوالیتیی دژ یان توخمی دژی داهێنا، کولدویل بوو لە ساڵی ١٩٤٩دا، زاراوەکە لە پەنجاکاندا زۆر بەکار دەهات، بەتایبەتی کاتێک ئەوە بڵاو بووەوە پیاوێکی ئەمەریکی بە ناوی جۆرج جۆرجنس ناوەکەی خۆی گۆڕیوە بە کریستین جۆرجنس لەدوای ئەنجامدانی زنجیرەیەک چارەسەری هۆرمۆنی و نەشتەرگەری لە کۆپنهاگن لە نێوان ساڵانی ١٩٥١ – ١٩٥٢.

**ئامارەکان لە سوید ئاماژە بەوە دەدەن، یەک پیاو لە هەر ٣٧.٠٠٠ پیاو، یەک ژن لە هەر ١٠٣.٠٠٠ ژن بەدەست ئەم لادانەوە دەناڵێنن.

*** سەیری بەشی تایبەت بە سێکسی حەرام بکە.

## ئازار و سێکس (سادی و ماسۆشی)

### سادۆماسۆشی

سادیزم واتا ئازاردانی کەسێکی دیکە بە ئازاردانی هاوبەشی سێکسیشەوە وەک هۆکارێک بۆ وروووژاندنی سێکسی، یان دەستکەوتنی تێربوونی سێکسی. هەرچی ماسۆشییە بە پێچەوانەی سادییەوە بریتییە لە قبوڵکردنی ئازار لە هاوبەشی سێکسییەوە وەک هۆکارێک بۆ وروووژاندنی سێکسی، یان دەستکەوتنی تێربوونی سێکسی. دەشێ تاک یەکێک لەم دوو ئاڕاستەیە بگرێ، واتا سادی یان ماسۆشی بێ، بەڵام هەندێ جار لەوانەیە تاک جووتئاڕاستە بێ، واتا سادوماسۆشی sadomasochism، یان وەک ئەوەی هافلوک ئالیس ناوی لێ نا ئەلگۆلەگنیە Algolagnia، هەندێ لە لێکۆڵینەوە ئامارییەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە زۆربەی خەڵک جۆرێ لە چێژ وەردەگرن لەڕێی پلەیەک لە پلەکانی ئازارپێگەیاندنی هاوبەشە سێکسییەکەیان لە کاتی گەمەی سێکسی، یان پەیوەندیی سێکسیدا. زۆربەی ئەو کەسانەی حەزیان لە ئازاردانی هاوبەشە سێکسییەکەیانە توخمی نێرن، هەروەها هەندێ لە ژنان هەست بە جۆرێ لە چێژ دەکەن، کاتێک لە کاتی گەمەی سێکسی، یان پەیوەندیی سێکسیدا هاوبەشەکەیان ئازاریان دەدا. ئەو توێژەرەی لەم بابەتەدا کار دەکات، پێویستە ئەو هەستە زاڵەی لە یاد بێ کە لای زۆربەی خەڵک هەیە لە هەردوو توخمەکە، لەبەر ئەوە بوونی پلەیەک لە ئازار، ئیدی ئەو کەسە خۆی دروستی بکات یان خۆی قبوڵی بکات و وەری بگرێ، لە ژیانی سێکسیی مرۆڤایەتیدا شتێکی سروشتییە، بەڵام بەو مەرجەی لە هێڵی جیاکەرەوەی نێوان ئازار و زیانپێگەیاندن تێنەپەڕێ، ئەگەر هێڵەکە تێپەڕی، ئەوا ئەو دیاردە سروشتییە دەبێتە لادان.

زۆرێک لە توێژەران هەوڵیان داوە لێکدانەوە بۆ ئەم دیاردەیە بکەن بە سنوورە سروشتی و لادەرەکانیشییەوە. لەوانەیە هۆکارەکان کە هەردوو حاڵەتی سروشتی و لادانیشدا هێندە جیاواز نەبن، مەسەلەکە لەوە تێنەپەڕێ کە لە حاڵەتی لاداندا، تەنیا هۆکارەکانی دیاردە سروشتییەکە گەورە بکرێ.

ئەو تیۆرانەی کە باس لە هۆکارەکانی سادی و ماسۆشی دەکەن لە هەریەکە لە بابەتی سادی و ماسۆشی بەجیا باسیان دەکەین، بەڵام لێرەدا تەنیا ئاماژە بەو تیۆرانە دەدەین کە بە شێوەیەکی گشتی و لە سنووری سروشتی و باودا باسی ئەم دوو دیاردەیە دەکەن. گرنگترین تیۆر لەم بارەیەوە پێی وایە پراکتیزەکردنی ئازار و قبوڵکردنی ئازار، پێداویستییەکی بایۆلۆژییە کە زامنی سەرنجڕاکێشانی نێوان دوو توخمەکە دەکات و بەمەش زامنی زۆربوون و مانەوەی توخمی مرۆڤ دەکات. هەندێک ڕای دیکە پێیان وایە، ئەم دیاردەیە پاشماوەی پەیوەندیی سێکسییە لە سەردەمە سەرەتاییەکانی ژیانی مرۆڤ و لەسەر بناغەی توندوتیژی و دەستدرێژی دروست بووە تا زامنی ملکەچبوونی هاوبەشی سێکسی بکات و ئەم ڕوخسارە لە پەیوەندیی سێکسی وەک بۆماوەیەکی بایۆلۆژیی کۆمەڵایەتیی لێ هاتووە و نەوە بۆ نەوە دەگوێزرێتەوە، هەندێکیش پێیان وایە ئازار پەیوەستییەکی بەهێزترە لە پەیوەستیی چێژ و بە شێوەیەکی بەهێزتر خەڵکی بەیەکەوە دەبەستێ، چونکە ئازار لە هەستدا، بنەڕەتییە، بەڵام چێژ تەنیا گەڕانەوەی حاڵەتی ئازارە بۆ خاڵی سەرەتا. هەندێ تیۆری دیکەش هەن کە ئازار و چێژ بەیەکەوە گرێ دەدەن. بەم پێیە ئازار لە ژیانی مرۆڤدا پێویستە و مرۆڤ بۆ زامنکردنی پرۆسەی هەڵبژاردنی سروشتی Natural selection پێویستی بە ئازار هەیە، پرۆسەی هەڵبژاردنی سروشتیش، پرۆسەیەکی پێویستە بۆ مانەوەی مرۆڤ و پەرەسەندنی، هەروەها ئەم تیۆرە، گومانی هەیە

مرۆڤ بێ پراکتیزەکردنی ئازار و هەستکردن پێی بتوانێ زامنی پرۆسەی مانەوە و پەرەسەندن بکات. ئەو کەسانەی بڕوایان بەم تیۆرەیە، ئەو دیاردەیە لە ئاژەڵدا دەکەنە پاڵپشتی بۆچوونەکەیان کە هەندێک لە ئاژەڵان، لە ڕەفتاری سێکسییاندا جۆرێ لە توندوتیژی و ڕەقی دەنوێنن کە هەندێ جار دەگاتە ئاستی مردن، لەبەر ئەوە پێیان وایە جۆرێ لە لێکچوون هەیە لە نێوان ڕەفتاری سێکسیی ئەو ئاژەڵانە لەگەڵ ڕەفتاری سێکسیی مرۆڤ لە ڕووی شێواز و ئامانج و پاڵنەرەوە. تیۆری دیکەش هەیە، دیاردەی ئازار لە سێکسدا لەسەر ئەو بناغەیە لێک دەداتەوە کە ئەم دیاردەیە درێژبوونەوەی ئەو ئازارەیە کە منداڵ لە لایەن دایکییەوە ڕووبەڕووی دەبێتەوە، هەروەها ئەو ئازارەی کە خۆی لە کاتی شیرخواردندا بە مەمکی دایکی دەگەیەنێ، کە لە هەردوو حاڵەتەکەدا، واتە کاتێ دایک ئازار بە منداڵ دەگەیەنێ و کاتێکیش منداڵ ئازار بە دایک دەگەیەنێ، هەستی ئازار و چێژ لای منداڵ تێکەڵ دەبن و پەیوەست دەبن بەیەکەوە و ئەستەمە لە یەکدی جیابکرێنەوە. تیۆری دیکەش هەیە دیاردەی ئازار لە سێکسدا دەگەڕێنێتەوە بۆ مەسەلەی مۆرکوەرگرتنی ڕەفتار و ڕاهاتن لەسەر ئەو هەستە، کاتێک لە هەڵوێستێکی سێکسیی دیاریکراودا چێژ و ئازار پەیوەست دەبن بەیەکەوە و کاتێک ئەمە چەند جارێ دووبارە دەبێتەوە، ئەو کەسە بەردەوام لەسەر پەیوەستیی نێوان ئازار و چێژ لە کاتی سێکسدا ڕادێت. دواجار تیۆرێکی زانستی هەیە کە لەسەر بناغەی بایۆلۆژی، دیاردەی سادۆماسۆشی لێک دەداتەوە. لێکۆڵینەوە فسیۆلۆژییەکان ئاماژە بەوە دەدەن، هەندێ ناوەندی دیاریکراو لە دەماغدا هەن (هایپۆسالامەس)، لەم ناوەندەدا، هەندێ ناوچەی بچووک یان گەورە بەیەکەوە بەستراون، ئەگەر بە کارەبا وروووژێنران، ئەوا دەبنە هۆی وروووژاندنی پاڵنەری سێکسی، یان پاڵنەری توندوتیژی لەو

کەسەدا. ئەمەش جەخت لەو پەیوەستییە بەتینە دەکات کە لە نێوان هەردوو ناوەندی سێکس و توندوتیژیدا هەیە. لەسەر ئەم بناغە بایۆلۆژییە، دەکرێ بگەینە ئەو دەرئەنجامە، هەموو شکستێکی سێکسی دەشێ بۆ حاڵەتی توندوتیژی بگۆڕێ، بە پێچەوانەشەوە، دەشێ خەیاڵەکانی دەستدرێژی و ڕەفتاری دەستدرێژی لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ڕەگەزی سێکسی لەخۆ بگرێ. لەم بارەیەوە نووسەرێک دەڵێ: "بۆ ئەوەی پەیوەندیی سێکسیی نێوان دوو کەس سەرکەوتوو بێت، پێویستە ئەو دوو هاوبەشە، هەردووکیان توانای ملکەچبوونیان هەبێ بۆ یەک، هەردووکیان خۆیان تەسلیمی یەکدی بکەن، چێژ لەوە دەبینن کە تەسلیمی یەکدی دەبن، لە لایەکی دیکەوە، داوای ئەو شتانە لە یەک بکەن کە حەزیان لێیەتی، چالاک ببنەوە و بەنۆبە هەریەکەیان دەستپێشخەری بکات، ئەگەر ئەم هاوسەنگییە پێویستە بە هەر هۆکارێکەوە بەدەست نەهات، ئەوا دەرئەنجام دەشێ وەسفی پەیوەندیی نێوانیان بە سادوماسۆشی بکرێ".

زۆرێک لە ڕەفتارە سێکسییەکانی مرۆڤ، مۆرکی سادۆماسۆشی لەخۆ دەگرن و خەڵکیش چێژ لەمە دەبینن، ئەو ڕاپرسییانەی لەم بارەیەوە ئەنجام دراون، ئاشکرای دەکەن کە توندوتیژی لە پەیوەندیی سێکسیی نێوان دوو هاوبەشدا، مەسەلەیەکی پێویستە، بەڵام مەسەلەکە جیاوازە ئەگەر ئەو توندوتیژییە ئازاربەخش بوو، ئەگەر ئەمە ڕووی دا ئەوا هەردوو حاڵەتەکە، واتە سادی و ماسۆشی بە لادان دادەنرێ.

**سادیزم**

سادیزم sadism یەکێکە لە دوو جەمسەرەکەی سادۆماسۆشیزم، تاک لەم لادانەدا، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ جۆرێ لە توندوتیژی و ئازاردانی جەستەیی یان دەروونی یان هەردووکیان لەگەڵ هاوبەشە سێکسییەکەی لە پەیوەندیی سێکسیدا پراکتیزە دەکات، ئیدی ئەو هاوبەشە خۆی ئارەزووی ئەو مامەڵە توندوتیژە بکات و ملکەچ بێت، یان ڕەتی بکاتەوە و ناچار بکرێ. وەک لە باسی پێشوودا ئاماژەمان پێ دا پلەیەک لە پراکتیزەکردنی سادیزم لە ژیانی زۆربەی خەڵکدا ڕوو دەدات، کە بە شێوەیەکی گشتی لە شێوەی گازگرتن یان ڕووشاندن یان گوشین یان نوقورچگرتن و چەندەهای دیکەدا تێبینی دەکرێ و چێژیشی لێ دەبینن، بەڵام ئەمانە لای زۆربەی خەڵک ناگەنە پێگەی لادان و بە لادان ئەژمار ناکرێن. فورد و بیچ ford and beach (١٩٥١) پێیان وایە پەنابردن بۆ بڕێکی کەم لە وورووژاندنی توند لە کاتی پەیوەندیی سێکسدا بە ڕێسایەکی ڕەفتاری دادەنرێ لە زۆربەی زۆری جۆرەکانی مەملکەتی باڵای ئاژەڵان، ئەم پراکتیزە ڕەفتارییە لە شێوەی توندوتیژیدا بە لادان دانانرێ، تەنیا لەو حاڵەتەدا نەبێ کە دەگاتە سنوورەکانی زیادەڕەوی و ئازاردانی هاوبەشە سێکسییەکە، یان هەر کەسێ لەو پەیوەندییە سێکسییەدا هاوبەشی بکات.

دیاردەی سادیزم لە ژیانی مرۆڤدا دیاردەیەکی تازە نییە، هەر وەک لە شوێنەوارە بۆماوەکانەوە دەردەکەوێ، دیاردەیەکی کۆنە و بۆ سەردەمە دێرینەکان دەگەڕێتەوە، بەڵام جیاکردنەوەی دیاردەکە و بەخشینی ناو پێی، بە شێوەیەکی ڕێژەیی تازەیە. زاراوەی سادیزم بۆ مارکیز دی ساد marquis de sade (١٧٤٠ – ١٨١٤) دەگەڕێتەوە، کە نووسینەکانی بەوە ناسرا بوون، ناوەڕۆکی توندوتیژی لە پەیوەندیی سێکسی لەخۆ گرتبوو. لە گرنگترین نووسینەکانی، ڕۆمانە بەناوبانگەکەیەتی بە ناوی

(جۆستین و جۆلێت)، هەروەها بەم ناونیشانەش ناوی دەرکردووە (نیعمەتی چاکە و نەفرەتی خراپە). هەرچەندە دی ساد زۆر بە کەمی نەبێ پراکتیزەی ئەو شتانەی نەکرد کە خەیاڵە پاراوەکەی لە نووسینەکانیدا خولقاندبووی، بەڵام زاراوەیەکی داهێنا تا ئێستا بە ناوی ئەوەوە ناو دەبرێ و یەکێکە لەو زاراوانەی بەزۆری لەسەر زاری نووسەران لە زۆر بابەتدا بەکار دێ، هەروەها هەمان ئەو زاراوەیەی ئەم ڕۆماننووسە دایهێنا لەنێو خەڵکیشدا بەکار هات بۆ وەسفکردنی ئەو کەسانەی چێژ دەبینن لە ئازاردانی کەسانی دیکە. مێژوونووسان شتێکی ئەوتۆ دەربارەی قۆناغی منداڵیی دی ساد نازانن. هەندێک پێیان وایە، ئەو ئەنگێزە سادیزمەی کە لە ژیانیدا تێبینی کراوە و بە شێوەیەکی یەکلاییکەرەوە و ئاشکرا لە نووسینەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە، بۆ ڕقی زۆری لە دایکی دەگەڕێتەوە، هەر ئەم ڕقەش بووە، بووەتە پاڵنەر بۆ هەوڵی تۆڵەکردنەوەی لە مێ. ئیدی باکگراوندی قۆناغی منداڵیی دی ساد هەرچۆنێک بووبێ، ئاشکرا پێوەی دیار بووە کە جۆرێ لە پشێوی و ناهاوسەنگی لە ژیانی دەروونییدا هەبووە، سەرباری سروشتی نووسینەکانی و ڕەفتارە سادییەکانی، هەرچەندە کەم پێوەی دیار بووە، بەڵام ئەمانە هەموویان بوونە هۆکار بۆ ئەوەی مارکیز دی ساد وەک نەخۆش تا دوا ڕۆژەکانی تەمەنی ژیان لە نەخۆشخانە ئەقڵییەکاندا بەسەر بەرێ.

هەرچەندە ئەو سەرنجە دەربارەی دی ساد زاڵ بوو کە بایەخ بە پراکتیزەکردنی توندوتیژی دەدات لە پەیوەندیی سێکسیدا، بەڵام خاوەنی هەندێ بۆچوون و ڕای تایبەتیش بوو کە لەدوای سەدە و نیوێک لە مردنی خۆی، لە بواری زانستدا بایەخی پێ درا و قسەی لەبارەوە کرا، دی ساد لەڕێی ئەزموونی تایبەتی خۆیەوە دەرکی بەوە کرد بوو، پەیوەندییەکی بەتین، چێژ و ئازار بەیەکەوە گرێ دەدات. لەم بارەیەوە دی ساد خۆی دەڵێ: "زۆر بە سانایی ئازار

بابەتێکە، تەواوی دەمارەکانمان بە توندی و بەوپەڕی هێزەوە ڕادەوەشێنێ. ئێستاش لەبەر ئەوەی بێگومانین کە ئازار لە چێژ زیاتر کارمان تێدەکات، ئەگەر ئەم هەستە لە کەسێکی دیکە ڕووی دا، ئەوا هەموو بوونیادمان بەهێزی زیاتر لەو هێدمەیەی (شۆکەی) کە ڕووی داوە، ڕادەوەشێت". ئیدی زانست لەگەڵ ڕاوبۆچوونەکانی دی ساد کۆک بێ، یان ناکۆک، دی ساد لەڕێی نووسینەکانییەوە و داهێنانی زاراوەی سادیزمەوە کە هەر بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، دەرگایەکی بەرفراوانی بۆ تێڕامان لە دیاردەیەکی دێرین کردەوە کە بە شێوەیەک لە شێوەکان بەردەوام هاوکات بووە لەگەڵ ژیانی مرۆڤایەتیدا. لێرەوە زانست ناچارە بەشوێن لێکدانەوەی ئەو پاڵنەرانەدا بگەڕێ کە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا هەن و وا لە مرۆڤ دەکەن چێژ لە ئازاردانی ئەوی بەرامبەر ببینێ، نەک تەنیا لەپێناوی ئامانجی سێکسیدا، بەڵکو لەپێناوی ئامانجی دیکە کە وا دەردەکەوێ هیچ مەبەست یان ئامانجێکی سێکسی لەپشتیانەوە نەبێ.

لە بابەتی سادیزمدا، ئەوەی بە لای توێژەرانەوە گرنگە، گەیشتنە بە ڕەگوڕیشەی ئەم دیاردەیە لە ژیانی سێکسیی مرۆڤدا. لایەنی دووەم کە شایەنی گرنگیپێدانە، بریتییە لە دیاریکردنی ئاستی پەیوەندیی نێوان، ڕەفتاری توندوتیژی و دەستدرێژی و ئازاردان کە مرۆڤ لە ژیانیدا پراکتیزەی دەکات، لەگەڵ لایەنە سێکسییەکان لە ژیاندا. لەگەڵ گرنگی و بایەخی سادیزم لە پەیوەندییە سێکسییەکاندا، بەڵام ئەو حاڵەتانەی کە لە سنووری باوی ئەم شێوە پراکتیزەکردنە دەردەچن، بە شێوەیەکی ڕێژەیی، ژمارەیان کەمە، هەرچەندە لە هەندێ وڵات بەشی ئەوە ئەو حاڵەتانە بوونیان هەیە کە سەرنجی ڕاگەیاندنەکان ڕابکێشن. لە لایەکی دیکەوە، ئەم دیاردەیە تێگەیشتنی قورسترە و لەوەش گرنگترە کە دەبینرێ و دەرکی پێ دەکرێ، چونکە سادیزم لەنێو

تاکەکانی کۆمەڵگەدا بە ئاشکرا وا دەرناکەوێ کە پەیوەستە بە لایەنە سێکسییەکانەوە، سەلماندنی بوونی پەیوەستی لە نێوان ئەم دوانەشدا کارێکی ئاسان نییە. لە کاتێکدا بەشێک لە دەروونشیکاران پێیان وایە هیچ پەیوەستییەک لە نێوان سادیزم لە مامەڵەکردنی ژیانی ڕۆژانە لەگەڵ لایەنە سێکسییەکاندا نییە، بەشێکی دیکەیان پێیان وایە پێچەوانەی ئەم بۆچوونە ڕاستە و دەڵێن ئەو دەستدرێژی و توندوتیژییەی مرۆڤێک بەرامبەر کەسێک ئەنجامی دەدا، ئیدی بەڕاستی و کرداری ئەنجامی بدات یان لە خەیاڵ و لە خەونەکانیدا، یان ئاسوودە بێ بە نواندنی توندوتیژی و دەستدرێژی لە هەر شوێنێ بێ و لە هەر وێنەیەکدا، ئەوانە وەک هێمایەک وان بۆ بوونی سادیزمی سێکسی لەو کەسەدا. بەم شێوەیە ڕازیبوونی تاک بە ئەنجامدانی ئەو توندوتیژییانە، وەک ئەوە وایە لە ڕووی سێکسییەوە هەست بە جۆرێ لە ڕازیبوون و تێربوون بکات. شکستهێنانی تاکیش بە هەر هۆیەکەوە بێ لە ڕازیبوون و تێربوونی ئارەزووی سێکسی بە شێوەیەکی سروشتی یان سادیزمی، ئەوا دەشێ لە نەستدا و بە شێوەیەکی نائاگا، ئەو هەستی ڕازینەبوون و تێرنەبوونە سێکسییە بۆ شەڕانگێزی بگۆڕێ. لەبەر ئەوە چێژی سادیزم لە بنەڕەت و ڕەگوڕیشەدا، چێژێکی سێکسییە.

کۆتایی ئەم مشتومڕە بە هەر کوێ بگات، تاک هەر دەبێ بەهانەیەک بۆ ئەو هەستە بدۆزێتەوە کە پەیوەستییەکی توندتر و بەتینتر لە خۆشەویستی و سێکسدا هەیە، زیاتر لەوەی لە ڕواڵەتدا دیارە، هەروەها لە نێوان هەردوو سۆزی ئازار و چێژدا هەیە لە ژیانی ئاساییدا. بۆ توێژەریش ئەو کارە هەر بە ئەستەمی دەمێنێتەوە کە چۆن بتوانێ لێکدانەوە بۆ هۆکاری ئەو توندوتیژییە بدۆزێتەوە کە لە پەیوەندیی سێکسیدا ڕوو دەدات، ئیدی ئەو توندوتیژییە لە سنووری قبوڵکراو و ئاسایی و باوەکەدا بێ کە لە

لایەن زۆربەی خەڵکەوە پیادە دەکرێ، یان لە سنووورە نەشاز و ناسروشتییەکەدا بێ.

ئایا مەسەلەکە وەک ئەوەی دەردەکەوێ خزمەتی مەبەستێکی گرنگی ژیان دەکات و ئاسانکاری بۆ مانەوەی مرۆڤ دەکات؟ یان تەنیا لادانێکی نەخۆشییە بەهۆی نزیکی و کارلێکردنی ناوەندەکانی سێکس و توندوتیژی لە دەماخدا پێکەوە، ڕوو دەدات؟ یان ئەم دیاردەیە هەڵەیەک دەنوێنێ لە گەشەی دەروونیی سێکسی مرۆڤدا؟ ئەم گریمانەیە و چەندەهای دیکە لە مەسەلەی سادیزمی سێکسی و سادیزم بە شێوەیەکی گشتی، تا ئێستا یەکلایی نەبوونەتەوە و مشتومڕیان لەسەرە.

یەکێک لەو مەسەلانەی پەیوەندییان بە سادیزمی سێکسییەوە هەیە، بریتییە لە بوونی ئەو دیاردەیە کە خەڵک لە زۆربەی شارستانییەت و سەردەمە جیاوازەکاندا، جۆرێک لە توندوتیژییان نواندووە، ئیدی لە شێوەی چالاکیی جەستەییدا بووبێت، وەک شەڕ و جەنگ و ناکۆکییە ئازاربەخشەکان و وەرزشە توندەکان و چەندەها کار و چالاکیی جەستەیی دیکە کە هەموویان سیفەتی توندوتیژی کۆیان دەکاتەوە، یان چالاکییە ناجەستەییەکانی وەک فیلم و ڕۆمان و ئەو چیرۆکانەی کە وێنای توندوتیژی دەکەن. بەپێی ڕای بەشێک لە توێژەران ئەم دیاردە مرۆڤایەتییە، کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ڕەزامەندیی لەسەرە، لە بنەڕەتدا ڕوخسارێکە لە ڕوخسارەکانی گوزارشتکردن لەو وزە سێکسییەی کە بە ڕێگە ڕاستەوخۆکانی سێکسکردن، بەتاڵ نابێتەوە و دەرنابڕێ، لەبەر ئەوە هەر دەبێ لە وێنەی توندوتیژی یان مەیلی ڕووەو توندوتیژی دەربکەوێ. هەرچەندە سەلماندنی ئەم پەیوەندییە کارێکی ئەستەمە، بەڵام ناتوانین تێبینی و ڕاستییە زانستییەکانیش فەرامۆش بکەین، کە وەڵامدانەوە جەستەییە فسیۆلۆژییەکانی دەستدرێژی و توندوتیژی بە هەر هۆکارێکەوە

بێ، زۆربەیان لێکچوون و هاوشێوەن لەگەڵ وەڵامدانەوە فسیۆلۆژییەکانی پەیوەندیی سێکسی، هەروەها توانای تاک بۆ پیادەکردنی توندوتیژی بە هەر هۆکارێکەوە بێ، تا ئاستێکی زۆر لاواز دەبێ، کاتێک دەگاتە قۆناغی دامرکانەوە و خاوبوونەوە لە وەڵامدانەوەی سێکسیدا، یان ئەو توانایە لاواز دەبێ بەهۆی سەرقاڵبوونی بەردەوامی تاک بە چالاکییە سێکسییەکانەوە.

ئەم تێبینییانە و چەندەهای دیکە، ئاستی پەیوەندیی نێوان توندوتیژی لە ژیانی مرۆڤ و لە بوارە جیاوازەکانی کار و چالاکییەکاندا دەردەخات.

### ماسۆشیزم

ماسۆشی لە تەوەرەی سادۆماسۆشیدا جەمسەری پێچەوانەی سادیزمە، حاڵەتی ماسۆشی، یان ماسۆشیزم masochism بریتییە لە ڕازیبوونی تاک بەو ئازار، یان زیانە جەستەیی یان دەروونییەی لە کەسێکی دیکەوە بەرامبەری دەکرێ لە کاتی خۆئامادەکردن بۆ پەیوەندیی سێکسی، یان لە کاتی ئەنجامدانی پەیوەندیی سێکسیی ڕاستەقینەدا. بە هەمان شێوەی دیاردەی سادیزم، ڕوودانی یان چاوەڕێکردنی پلەیەک لە ئازار کە بەرگە بگیرێ و هەوڵدان بۆی، لای زۆربەی خەڵک بە شتێکی سروشتی دادەنرێ لە پەیوەندیی سێکسیی سروشتیدا، بەڵام دەبێتە حاڵەتێکی لادان ئەگەر ئەم ڕەفتارە ماسۆشییە سنوورە سروشتییەکان تێپەڕێنێ و زیان بە یەکێک لە دوو هاوبەشەکە لە پەیوەندیی سێکسیدا، بگەیەنێ، هەروەها حاڵەتەکە بە لادان دادەنرێ ئەگەر پەیوەندیی سێکسی بە شێوەیەکی سەرەکی پشتی بە قبوڵکردنی ئازار بەست، یان قبوڵکردنی ئازار بوو بە ئامانج یان ئەلتەرناتیڤی پەیوەندیی سێکسی.

زانای سێکسۆلۆژی کرافت ئێبنگ kraft Ebing یەکەم کەس بووە زاراوەی ماسۆشیی بەکار هێناوە کە لە بناغەدا ئەم ناوە بۆ ڕۆماننووسی نەمساوی لیپۆلد زاخر مازۆخ Leopold zacher Masoch (١٨٣٦ – ١٨٩٥) دەگەڕێتەوە، کە ناوی بەم دیاردەیەوە پەیوەست کرا، مازۆخ ڕۆمانێکی بەناوبانگی بە ناوی ڤینۆس لە فەرۆدا venus in Furs نووسی. وەک زانراوە لە هەندێ بەشەکانی ئەم ڕۆمانەدا، بەشێک لە قۆناغەکانی ژیانی نووسەر و ئەزموونەکانی ژیانی تایبەتی خۆی، بەتایبەتی لە قۆناغی منداڵیدا، باس کراوە.(*) پوختەی گرنگترین ڕووداوەکانی ئەزموونی ژیانی مازۆخ ئەو ڕووداوەیە کە سەرنجی دەروونشیکارانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا، بەپێی ئەو ڕووداوە مازۆخ لە منداڵیدا لەگەڵ پووری ژیاوە کە دۆستێکی هەبووە و بەیناوبەین هاتووە بۆ لای. کونجکۆڵی بۆ ئەوەی چی ڕوو دەدات لە نێوان پووری و دۆستەکەیدا پاڵی بە مازۆخەوە ناوە خۆی لەناو دۆلابی جلەکاندا بشارێتەوە، پووری دەبینێ جلەکانی لە بەری دادەکەنێ و جلێکی دروستکراو لە فەروویەکی نەرم لە بەر دەکات، پاشان دۆستەکەی ماچ دەکات و دەست بە ئەڤینداری دەکەن، لە کاتێکدا مازۆخ بەوپەڕی دیقەت و بەئاگاییەوە تەماشای دەکرد بزانێ چی ڕوو دەدات، بێ ویستی خۆی جووڵەیەک دەکات و پووری پێی دەزانێ و بە توندی لێی دەدات و سزای دەدات. دەروونشیکاران بەم شێوەیە چێژ و ئازاریان بەستووەتەوە بەیەکەوە، چێژی وروورژانی سێکسی کە مازۆخ لە کاتی بینینی پووری و دۆستەکەی هەستی پێ کردووە لەگەڵ ئازاری لێدانەکەی پووری کاتێ لێی داوە. دەروونشیکاران پێیان وایە ئەم پەیوەستییە لە نێوان ئازار و چێژدا، لای مازۆخ ئەوەندە بە توندی ڕەگی داکوتاوە کە پێی وا بووە دەکرێ پشت بە شێوەیەکی ئاڵوگۆڕکراو بە هەردوو هەستی چێژ و ئازار ببەسترێ. هەرچەندە ئەم ئەزموونە لە خەیاڵگە و هەستی کەسی

ماسۆشیدا توند و سەختە، بەڵام گومان دەکرێ تەنیا ئەزموونێکی لەو شێوەیە بەشی دروستبوونی ئەو پەیوەستییە هەمیشەییە بکات کە لە نێوان ئازار و چێژدا هەیە و تا ئەو ئاستە بکات کە بە لادان لەقەڵەم بدرێ، بەڵکو بۆ دروستبوونی لادانێکی لەو جۆرە وا پێویست دەکات ئەو پەیوەستییە لە نێوان ئازار و چێژدا چەندبارە بێتەوە، ڕایەکی دیکەش هەیە کە پێی وایە، دەشێ مازۆخ بە سروشتی دەروونیی خۆی ئامادەباشیی بۆ تووشبوون بەم لادانە تیادا بووبێ و تەنیا پێویستی بە ئەزموونێک هەبووبێ بۆ ئەوەی دەست بکات بەو شێوازە لە لادانی سێکسیدا.

تا ئێستا بە تەواوەتی ئەوە ڕوون نەبووەتەوە، ئایا ملکەچبوون یان قبوڵکردنی ئازارەکە دەبێتە هۆی چێژ وەرگرتنی سێکسی، یان ئازارەکە دەبێتە ئەلتەرناتیڤ یان جێگرەوە بۆ چێژی سێکسی، هەروەها هیچ بەڵگەیەکی یەکلاییکەرەوە لەسەر ئەوە نییە، ئایا ئەو کەسەی تووشی ئازارەکە دەبێ، واتە ئەو کەسەی ئازارەکە قبوڵ دەکات، واتە ئازارەکە وەک ئازار هەست پێ دەکات، یان ئەو ئازارە بۆ هەستکردن بە چێژ دەگۆڕێ، تەنانەت بەر لەوەی وەک ئازار هەستی پێ بکات، لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەک لە زانایان لەو بڕوایەدان کە هەستکردن لە ناخی کەسی ماسۆشیدا بە شێوەیەک لە شێوەکان بۆ چێژ دەگۆڕێ، بەڵام تا ئێستا نەیانتوانیوە ئەو شێوەیە، یان ڕێگەیەی گۆڕینی ئازار بۆ چێژی سێکسی ڕوون بکەنەوە، هەروەها پێیان وایە قبوڵکردنی ئازار ئەو نرخەیە کە پێویستە تاک لەپێشەوە بیدات بۆ ئەوەی چێژی سێکسیی دەست بکەوێ. کاتێک ژن لە پەیوەندیی سێکسیدا چەشتنی گەورەترین بڕی ئازاری بەردەکەوێ، تەنیا لەبەر ئەوە نییە کە چێژی سێکسیی دەست دەکەوێ، بەڵکو بەهۆی ناچاربوونیەوەیەتی بە ملکەچبوونی سێکسی بۆ پیاو. لەبەر ئەوە قبوڵکردنی ئازار، ئەو نرخەیە کە دەبێ بیدات لەپێناوی دەستکەوتنی چێژێکی گەورەتردا. هەرچەندە

تیۆری دەروونشیکاری کە لادانی ماسۆشی لەسەر بناغەی ئەزموونەکانی منداڵی لێک دەداتەوە، ئازار و چێژی سێکسی بەیەکەوە پەیوەست دەکات، بە تیۆرێکی قەناعەتپێکەر دادەنرێ، بەڵام مەسەلەکە هێندە ئاسان نییە وەک لە ڕووی تیۆرییەوە دەردەکەوێ، لەم ساڵانەی دواییدا، توێژینەوەکان ڕووەو ئەو ئاڕاستەیە ڕۆیشتوون، کە لە پەیوەستیی نێوان ئازار و چێژ بکۆڵنەوە، ژمارەیەک لە توێژینەوەکان تا ئێستا پشتگیری لەو پەیوەندییە بەتینە دەکەن کە لە نێوان هەردوو هەستەکەدا هەیە، بۆ نموونە هەستەکانی گەرمی و ختووکە و نوقورچ، دەشێ تا ئاستێک هەستی چێژ بورووژێنن، بەڵام دەبن بە ئازار ئەگەر لەم سنوورە تێپەڕ بوون، هەروەها توێژەرەکان تێبینییان کردووە، ئەگەر هەستکردن بە ئازار بەردەوام بوو، ئەوا دەشێ ببێتە هەستێکی خوازراو لای تاک. بەم شێوەیە، وا دەردەکەوێ ئەم شتانە لە بناغەدا تەنیا گوێڕایەڵی، یان ملکەچیبوونێک بن بۆ قبوڵکردنی ئازار لە پەیوەندیی سێکسیدا، بەڵام دواجار ئەو ئازارە ببێتە مایەی چێژ بۆ ئەو کەسە، لێرەشەوە لەوانەیە ئەو کەسە ئیدی خۆی هەوڵ بۆ بەدەستهێنانی چێژی سێکس بدات، تەنانەت ئەگەر لەڕێی قبوڵکردنی ئازاریشەوە بێ. دەشێ ئەم جۆرە ڕایانە پشتیان بەو بۆچوونە بەستبێ کە چەندە ئازار زیاد بکات، ئەوەندە چێژی سێکسی لای ئەو کەسە زیاتر دەبێ، ئەم تێبینییە لە دێر زەمانەوە کراوە و لە چەمکی زانستی هاوچەرخیشدا کەسانێک هەن پشتیوانیی لێ دەکەن. ئەو تێبینییانەی دەربارەی ئەم بابەتە خستماننە ڕوو، بە ئەزموونەکەی مازۆخیی ڕۆماننووسیشەوە، لێکدانەوەی ماسۆشی دەخەنە چوارچێوەی کردارەکانی مۆرکوەرگرتنی مەرجدار لە ڕەفتاری مرۆییدا. ئەم لێکدانەوەیە ڕێگە دەدات بە کۆکردنەوەی ئەو هەستانە پێکەوە کە لە سروشتیاندا دژ بە یەکن، هەروەها دەشێ یەکێکیان لەگەڵ

یەکێکیاندا ئاڵوگۆڕیان پێ بکرێ، یان پشت بە یەکێکیان لەجیاتی یەکێکی دیکەیان ببەسترێ.

لەو تیۆرانەی پێویستە ئاماژەیان پێ بدرێ ئەوانەن، کە لێکدانەوە بۆ ماسۆشی دەکەن، وەک ئەوەی ڕوخساری بێت لە ڕوخسارە سروشتییەکانی مرۆڤایەتی. بەو پێیە سروشتی مرۆڤایەتی لەسەر بناغەی دەسەڵاتدار و ملکەچبوو لە مامەڵەی ژیانی ڕۆژانەدا دامەزراوە، هەروەها ئەم بناغەیە لە مامەڵەکردن، لەپێناوی دەستکەوتنی سازان و ڕێککەوتن لە نێوان دەسەڵاتدار و دەستبەسەراگرتوودا، لە پەیوەندیی سێکسیدا، پێویست بووە. توێژەران پێیان وایە پیاو لە ژیانیدا ڕووەو سادیزم ئاراستە دەگرێ، ژنیش لە پەیوەندیی سێکسیدا کە دەسەڵات بەسەریدا پیادە دەکرێ و ملکەچ بووە، واتە ماسۆشییە، بەڵام هەندێک لە توێژەران بڕوایان بە پێچەوانەی ئەم بۆچوونەیە و پێیان وایە ژن لە پیاو سادیزمترە و لە سروشتدا لە پیاو توندترە، هەرچەندە توندوتیژی و سادیزمی خۆی بەرامبەر بە پیاو بە شێوازێکی ناجەستەیی و ناڕاستەوخۆ پیادە دەکات، هەروەها ژن چێژی سێکسی بەدەست دەهێنێ بەهۆی ئەو ئازارەوە کە هەستی پێ دەکات کاتێک پیاو ئارەزووی دەکات و بە توندی پەرۆشی دەبێ و شوێنی دەکەوێ و لە پەیوەندیی سێکسیدا شەکەت و ماندووی دەکات، هەرچەندە پەیوەندیی سێکسی، پەیوەندییەکە ژن شەکەت نابێ پێی. بەشێک لە توێژەرانی دیکە، ماسۆشی لەسەر ئەو بناغەیە لێک دەدەنەوە کە مێ لەڕێی فێربوون و ڕاهێنانییەوە بۆچوونێکی لا دروست بووە کە ئازار بۆ پرۆسەی منداڵبوون و دڕینی پەردە، پێویستە بوونی هەبێ، واتە ژن هەر لە منداڵییەوە ئەو بۆچوونە لە مێشکیدا دەچەسپێ کە ئەم پرۆسانە ئازاراوین، بەهۆی گەشەکردنی ئەم بۆچوونەوە، مێ جۆرێ لە ئامادەباشیی دەروونیی لا دروست دەبێ، کە هانی دەدات بۆ قبوڵکردنی ئازار

لەپێناوی ئەنجامدانی ئەو ئەرکانە. لەڕێی ئەم ئامادەباشییە دەروونییەوە، دەشێ قبوڵکردنی ئازار بۆ پەیوەندیی سێکسیش بگوێزرێتەوە، دەشێ ئەم ئامادەکردنە تەنیا لایەنە دەروونییەکان نەگرێتەوە، بەڵکو لە بواری دەروونی تێپەڕێ و بواری بایۆلۆژییش بگرێتەوە. ئەوەی پشتیوانی لەم بۆچوونە دەکات، تێبینیکردنی ئەو گۆڕانکارییە فسیۆلۆژییانەیە کە هاوکاتن لەگەڵ ئۆرگازم لە مێدا بە تەواوەتی لێکچوون لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییە فسیۆلۆژییانەی کە لە قۆناغی دووەمی منداڵبووندا ڕوو دەدەن، هەروەها هەستکردن لە هەردوو حاڵەتەکە لەیەک دەچن. ئەم تێبینییە ئەو بەڵگەیە بەدەستەوە دەدات، کە ئازار و ئۆرگازم تەنیا لە ڕووی هەستکردنەوە پەیوەندییان بەیەکەوە نییە، بەڵکو جەخت لەوە دەکات کە هەستکردن بە ئازار، پێویستە، چونکە ئازار ئەزموونێکی ژیانە و خزمەتی ئامانجەکانی ژیان دەکات و هەستکردن بە ڕازیبوون و چێژی مانەوە بە مرۆڤ دەبەخشێ.

هەر وەک پێشتر لە بابەتی سادۆماسۆشی بە شێوەیەکی گشتی ئاماژەمان پێ دا، مەرج نییە تاک تەنیا بەرەو سادیزم، یان ماسۆشیزم جەمسەر بگرێ، دەشێ هەندێک کەس لە یەک کاتدا ڕەفتاری هەردوو جەمسەرەکەی هەبێ، یان بەدوای یەکدا هەریەک لە سادیزم و ماسۆشیزم بنوێنێ، یان دەشێ لە کات و بارودۆخێکی تایبەتیدا سادی بێ و لە کات و بارودۆخێکی دیکەدا ماسۆشی بێت، ئەم دوالیزمە لە لاداندا، ئەگەر هەبێ، ئەوا بە گەورەکردنی واقیعێک دادەنرێ کە بە پلەیەک لە پلەکان ڕووبەڕووی ئەو ئاڕاستە دوانییە دەبێتەوە کە لە هەموو مرۆڤێکدا هەیە، واتە ئەو ئاڕاستەیەی کە مرۆڤ ئارەزوو دەکات برێک ئازاری جەستەیی یان دەروونی بە کەسێک بگەیەنێ، لەگەڵ ئەو ئاڕاستەیەی کە برێک لە ئازار لە لایەن کەسێکی دیکەوە قبوڵ دەکات، بەڵام گرنگترین ئەو خاڵانەی لە ماسۆشیدا بە لامانەوە

گرنگە، هەر وەک لە سادیزمیشدا، بریتییە لە، یەکەم ئاستی پێویستیی تاک بۆ پراکتیزەکردنی ئەو ڕەفتارە لەپێناوی ڕازیبوون و تێربوونی سێکسیدا و ئەو دەرئەنجامە زیانبەخشانەی کە هەردوو هاوبەشە سێکسییەکە تووشی دەبن بەهۆی ئەو ڕەفتارە سادیزم یان ماسۆشییەوە، یان هەردووکیانەوە، هەروەها ئەو هەلومەرجە تاوانکارییانەی دەشێ بەهۆی دەرئەنجامی ئەو ڕەفتارە سێکسییانەوە ڕوو بدەن.

**پەراوێز:**

*یەکێک لە گرنگترین بەڵگەکانی نۆژداری دەروونی، ئەو ڕێککەوتنەیە کە مازۆخ لەگەڵ ژنەکەیدا مۆری کردووە. ئەم بەڵگەیە ئەوە ئاشکرا دەکات چەندە کەسی تووشبوو بە لادانی ماسۆشی یان مازۆخی، پێویستی بە چەوساندنەوە و ئازاردانی جەستەیی یان دەروونی یان هەردووکیان هەیە بۆ ئەوەی ورووژان و چێژی سێکسیی دەست بکەوێ.

# بەشی حەڤدەیەم

# هۆمۆسێکسوالیتی

زاراوەی هۆمۆسێکسوالیتی
مێژووی هۆمۆسێکسوالیتی
هۆمۆسێکسوالیتی لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا
هۆمۆسێکسوالیتی لای ئاژەڵان
هۆمۆسێکسوالیتی لە کۆمەڵگە هاوچەرخەکاندا
سروشتی و لادەر لە پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتیدا
هۆمۆسێکسوالیتیی لادەر
هۆکارەکانی هۆمۆسێکسوالیتی
تیۆرەکانی بایۆلۆژی
تیۆرەکانی ژینگە و دەوروبەر
هۆمۆسێکسوالیتی و یاسا
هۆمۆسێکسوالیتیی شاراوە
هۆمۆسێکسوالیتی و داهێنان
هۆمۆسێکسوالیتی و نەخۆشی
بکەر و وەرگر لە هۆمۆسێکسوالیتیدا
هۆمۆسێکسوالیتی و تاوان
چارەسەری هۆمۆسێکسوالیتی
پوختە

## هۆمۆسێکسوالیتی

هۆمۆسێکسوالیتی یان پەیوەندیی سێکسیی نێوان دوو تاک، نێر بێ یان مێ، لە هەمان توخم، بابەتێکی زۆر ورد و ئاڵۆزە، هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە تا ئێستا بە شێوەیەکی تەواو، لە هەموو لایەنە بایۆلۆژی و دەروونی و ژینگەییەکان تێنەگەیشتووین کە دەشێ ڕۆڵیان هەبێ لە ڕوودانی ئەو حاڵەتەدا، سەرباری ڕوانگەی کۆمەڵایەتی و شارستانی بەرامبەر بەم پەیوەندییە کە ڕوانگەی جیاواز بوون و گۆڕانیان بەسەردا هاتووە و ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی ئەستەم بێ بەتەنیا پشتبەستن بە ڕێسایەک بۆ حوکمدان و لێکدانەوەی بۆ بکرێ. شتێکی لۆژیکییە ئەگەر وا گریمانە بکەین، ئەم شێوە سێکسکردنە لەوانەیە کۆنترین شێوەکانی پەیوەندیی سێکسی بووبێ، ئەگەر نەڵێین کۆنترین شێوەکانی پەیوەندیی سێکسی بووە و هاوکات بووە لەگەڵ پەیوەندیی سێکسیی سروشتیی نێوان نێر و مێ، بەڵام تا ئێستا بە زۆرێک لە پاڵنەرەکانی ئەم شێوازە ڕەفتارییە ئاشنا نین، بەتایبەتی لەو کەسانەدا کە حەز و مەیلی سێکسییان تەنیا بۆ ئەم شێوازەیە لە سێکسکردن. زانا و توێژەرانی بوارە جیاوازەکان، لە بواری بایۆلۆژی و تۆژداری و دەروونی و کۆمەڵایەتی و ئەنسرۆپۆلۆژی و ئایینی و مۆراڵی و یاساییدا، بایەخی تایبەتیان بە بابەتی هۆمۆسێکسوالیتی داوە، بەتایبەتی لە سەدەی بیستدا، لەم هەوڵ و توێژینەوانەوە، زۆرێک لەو زانیارییانە دەست کەوتن کە تیشک دەخەنە سەر ئەم دیاردە مرۆییە دێرینەی هێندەی مرۆڤ کۆنە. ئەو کەسەی بەدواداچوون بۆ ئەم بابەتە بکات، گۆڕانکاریی ئاشکرا لە ڕوانگەی زۆربەی کۆمەڵگەکان بەرامبەر ئەم دیاردەیە، بەدی دەکات، کە ئەم گۆڕانکارییە بووە هۆی

تێگەیشتنی زیاتر لەم ئەنگێزەیە و لە پاڵنەرەکانی، لێرەشەوە بە شێوەیەکی هێورتر لە ڕابردوو ئەو کەسانە ڕەت کرانەوە و سزا دران کە ئەم ڕەفتارە سێکسییە دەنوێنن، بەڵام لە هەندێک کۆمەڵگە و شارستانییەتی دیکەدا، تا ئێستا ئەم دیاردەیە بە سروشتی دانانرێ و ئەو کەسانەی پراکتیزەی دەکەن، لە لایەن کۆمەڵگەوە ڕەت دەکرێنەوە و تەنانەت سزاش دەدرێن. ئەوەی ئێمە ئێستا لە دەستمان دێ بیکەین، خستنەڕووی ڕاستییەکانە، بە کۆن و تازەوە سەبارەت بەم بابەتە، خوێنەر بەجێدێڵین خۆی بڕیار لەسەر بابەتەکە بدات و ئاڕاستەی تایبەتی خۆی بەرامبەر بە بابەتەکە دروست بکات.

### زاراوەی هۆمۆسێکسوالیتی

زاراوەی هۆمۆسێکسوالیتی یان سێکسی هاوشێوە، زاراوەیەکە بۆ گوزارشتکردن لە پەیوەندیی سێکسیی نێوان دوو توخمی هاوشێوە، بەکار دێ، واتە سێکس لە نێوان نێر و نێر، یان مێ و مێ. زاراوەی هۆمۆسێکسوالیتیHomosexuality زانای سویسری د. بنکرت benkert ساڵی ١٨٦٩ دایهێنا، ئەم زاراوەیە تا کۆتایی نەوەدەکانی سەدەی نۆزدە نەهاتە ناو زمانی ئینگلیزییەوە، واتا تا ئەو کاتەی کە زانای بەناوبانگی سێکسۆلۆژی هافلوک ئالیس H.Ellis لە نووسینەکانیدا بەکاری هێنا. بەم شێوەیە زاراوەکە وردەوردە ئەو شوێنەی ئێستای بەدەست هێنا کە لەنێو زاراوە نۆژداری و دەروونی و کۆمەڵایەتی و یاساییەکاندا هەیەتی، هەروەها تا ئاستێکی زۆریش زاراوەی هۆمۆسێکسوالیتی شوێنی ئەو زاراوە و ناووناتۆرانەی گرتەوە کە ئاماژە و حوکمی مۆراڵیان دەدا بەسەر دیاردەکەدا و ڕەتیان دەکردەوە. وردەوردە زاراوەکە هاتە ناو زمانی عەرەبیشەوە، هەرچەندە تەنیا بواری نۆژداری و سایکۆلۆژیی گرتەوە، چونکە

زاراوە کلاسیکە باوەکان بۆ ناوهێنانی دیاردەکە و ئەو کەسانە بەکار دەهات کە ئەو جۆرە سێکسەیان دەکرد، یەکێک لەو زاراوە بەکارهێنراوانە، زاراوەی (لواتییە)، کە لە وشەی (لووت)ەوە وەرگیراوە و لە زمانی عەرەبیدا بە مانای پێوەنووسان دێت، هەروەها بە مانای سواربوونی کوڕ دێ و بە مانای خۆشەویستیی چەسپیویش لە دڵدا دێ. ئەم زاراوەیە هەرچەندە ئەم مانایانەی هەیە، بەڵام لە ڕووی پراکتیزەکردنی ڕەفتارەکە و ڕەتکردنەوەی، زیاتر پەیوەندیی بە پێغەمبەر لووت و خەڵکی لووتەوە هەیە کە ڕەفتاری نێربازییان ئەنجام داوە و سزا دراون، لەبەر ئەوە وشەی (لووت) وەک هاومانای وشەی (لووات) بەکار هاتووە و بەو کەسە وتراوە کە ڕەفتاری سێکسیی نێربازیی نواندووە، وەک ئەوەی قەومی (لووت) کردوویانە، ئەم جۆرە پەیوەندی و وەرگرتنی زاراوەیە لە زمانەکانی دیکەشدا هەیە، بۆ نموونە زاراوەی سۆدۆمی sodomy لە شاری سۆدۆم Sodomەوە هاتووە کە خەڵکەکەی بە شێوەیەکی بەرفراوان نێربازییان کردووە و خودا سزای داون و تەفروتوونای کردوون، ئەم چیرۆکە لە تەورات و قورئانیشدا باس کراوە. بڕوا وایە شوێنی مێژوویی ئەم شارە بەشی باشووری خۆرئاوای دەریای مردوو بێ.

زاراوەی هۆمۆسێکسوالیتی کە لە ئێستادا بەکار دێ، زاراوەیەکی گشتییە بۆ وەسفکردنی پەیوەندیی سێکسی نێوان دوو تاک لە هەمان توخم، واتە نێر و نێر، یان مێ و مێ بەکار دێ. ئەم زاراوەیە بەتەنیا ناتوانێ گوزارشت لە هەموو ئەو حاڵەتانە بکات کە پەیوەندیی سێکسی لە نێوان دوو تاکی هەمان توخمدا ڕوو دەدات، بۆ نموونە لەو حاڵەتانەی کە پێویستیان بە وەسف و دیاریکردن هەیە، پەیوەندیی سێکسیی نێوان نێر و نێر وا پێویست دەکات لەم بارەدا بوترێ هۆمۆسێکسوالیتیی نێرینە، واتە Male Homosexuality، هەروەها پەیوەندیی سێکسیی نێوان مێ و

مێ، وا پێویست دەکات بوترێ هۆمۆسێکسوالیتیی مێینە، واتە female Homosexuality کە هەندێ جار پێشیان دەوترێ (سەحاقی و سافی و لەیزبین)، هەروەها پەیوەندیی سێکسیی منداڵان لە نێوان خۆیاندا هەیە کە پێی دەوترێ هۆمۆسێکسوالیتیی منداڵان Infantile Homosexuality، هەروەها پەیوەندیی سێکسیی نێوان پیاو و منداڵی کوڕ هەیە، کە پێی دەوترێ منداڵبازی یان هۆمۆسێکسوالیتی لەگەڵ منداڵاندا، واتە homosexual pedophilia، هەروەها پەیوەندیی سێکسی لە نێوان ژن و منداڵی کچدا هەیە. شایانی باسکردنە پێویستە جیاوازی بکرێ لە نێوان هۆمۆسێکسوالیتیی هەڵبژاردن facultative Homosexuality کە تاک بە ویستی خۆی ئەو تاکە هەڵدەبژێرێ و سێکس لەگەڵ هاوتوخمەکەی خۆیدا دەکات، لەگەڵ هۆمۆسێکسوالیتیی ناچارکراو، واتە obligative Homosexuality کە تاک بە هەر هۆکارێکەوە بێ ناچار دەکرێ بۆ ئەو پەیوەندییە سێکسییە لەگەڵ هاوتوخمەکەی خۆیدا. هەروەها زاراوەی جیاجیا هەیە بۆ وەسفکردنی ئەو کەسەی کە لە سێکسدا تەنیا هۆمۆسێکسوالیتی پراکتیزە دەکات، واتە تەنیا سێکس لەگەڵ هاوتوخمەکەی خۆیدا دەکات، هەروەها ئەو کەسەی کە هۆمۆسێکسواڵە، واتە سێکس لەگەڵ هاوتوخمەکەی خۆیدا دەکات، بەڵام هاوکات سێکس لەگەڵ توخمە دژەکەی خۆشیدا دەکات واتە توانای سێکسی سروشتیی هەیە، یان پەیوەندیی سێکسیی سروشتییش پراکتیزە دەکات، لەم بارەدا ئەم پەیوەندییە بە هیترۆ هۆمۆسێکسوالیتی وەسف دەکرێ، واتە Hetrosexual Homosexuality یان دەشێ ئەو کەسەی هۆمۆسێکسواڵە لە پەیوەندیی سێکسیدا ڕۆڵی جووتتوخمی ببینێ، واتە ڕۆڵی سالب و ڕۆڵی موجەبیش ببینێ، بە واتایەکی دیکە جارێ ڕۆڵی بکەر دەبینێ لە کاری سێکسدا، جارێ ڕۆڵی وەرگر یان پێشوازیکەر دەبینێ،

واتە دواجار کاریگەریی کارەکە دەکەوێتە سەری. هەندێ حاڵەتی هۆمۆسێکسوالیتی هەیە کە ناگاتە سنووری پراکتیزەکردنی ڕاستەقینەی دیاردەکە، واتە تەنیا لە شێوەی حەز و مەیل و سۆزدا[1] دەمێنێتەوە، یان بۆ هەندێ ڕوخساری ڕەفتاریی، وەک یاری و گەمەبازی و ماستەربەیشن تێدەپەڕێ. دواجار وێڕای ئەو زاراوە جیاجیانەی کە وەسفی حاڵەتە جیاوازەکانی هۆمۆسێکسوالیتی دەکەن، ژمارەیەک زاراوەی دیکە هەن کە هۆمۆسێکسوالیتی دەبەستنەوە بە هەندێ لادانی سێکسیی دیکەوە وەک، سادیزم و ماسۆشیزم و فێتشزم و لەبەرکردنی پۆشاکی توخمەکەی دیکە و سێکسی دژ یان پێچەوانە و چەندەها جۆری دیکە لە لادانی سێکسی. ئەم زاراوانە و هەموو ئەوانەی دیکەش کە لەم بوارەدا بەکار دێن، زۆربەیان زاراوەی تازەن و هەموویان ئاماژەن بۆ ئاستی فرەلقی و ئاڵوگۆڕی بابەتی هۆمۆسێکسوالیتی و ئاستی ئەو گریمانانەی کە دەربارەی لایەنەکانی ئەم بابەتە دەکرێ، کاتێک توێژینەوە دەربارەی ئەنجام دەدرێ.[2]

### مێژووی هۆمۆسێکسوالیتی

دیاریکردنی ئەو زەمەنە مێژوویییەی کە تیایدا مرۆڤ دەستی بە هۆمۆسێکسوالیتی کردووە، کارێکی ئەستەمە. لەوانەیە هەڵەیەکی گەورە نەبێ ئەگەر ئەو گریمانەیە بکەین و بڵێین هۆمۆسێکسوالیتی لە قۆناغی منداڵی و مێردمنداڵیدا، یەکەمین پراکتیزەکردنی سێکس بووە لە ژیانی مرۆڤی سەرەتاییدا، هەروەها لەوانەیە ئەو بۆچوونە لە هەقیقەتەوە دوور نەبێ کە مرۆڤ لە سەرەتاکانی بوونییەوە، هەندێ جار شانبەشانی سێکسی ئاسایی (واتە سێکس لەگەڵ توخمە دژەکەیدا)، هۆمۆسێکسوالیتیی نواندبێ، واتە سێکسی لەگەڵ هاوتوخمەکەی خۆیدا کردبێ، ئیدی لەبەر پێویستی بووبێ یان هەڵبژاردنی خۆی بووبێ. بەپێی چیرۆک و گێڕانەوەکان

ئەنجامدانی ئەم شێوازە لە سێکس لە سەردەمە زووەکانەوە هەبووە و بڵاوبوونەوەیەکی جیهانی و بەرفراوانی لە کۆمەڵگە و شارستانییە جیاواز و پێشکەوتووەکان هەبووە، هەموو ئەمانە ئاماژە بەوە دەدەن کە هۆمۆسێکسوالیتی ڕووداوێکی کتوپڕ و نوێ نییە لە ژیانی مرۆڤدا، هەروەها پراکتیزەکردنی پێش ئەو مێژووە کەوتووە کە بۆی تۆمار کراوە و ڕێگەی پێ دراوە و ڕەتکراوەتەوە. کۆنترین بەڵگەکان لەسەر بوونی هۆمۆسێکسوالیتی ئاماژە بەوە دەدەن کە میسرییە کۆنەکان هۆمۆسێکسوالیتییان پراکتیزە کردووە و ئاماژەیان بەوە داوە ئەم پەیوەندییە سێکسییە لە نێوان خواوەند و لێکچووانی خواوەند و خەڵکی ئاساییدا پیادە کراوە و هەروەها پاشماوە نووسراوەکان لەسەر کاغەزی (بەردی)، ئەوە ئاشکرا دەکەن کە هۆمۆسێکسوالیتی لەنێو پیاواندا بۆ ساڵی ٢٥٠٠ی پێش زاین دەگەڕێتەوە، هەروەها بەڵگەی هاوشێوە لە مێژووی شارستانییەتی بابلی و کلدانی و کەنعانییەکاندا هەیە.

دێرینترین بەڵگەکان لەسەر بوونی هۆمۆسێکسوالیتی، ئەوانەن کە لە دەق و پاشماوەکانی شارستانییەتی گریکی کۆندا هاتوون. لە ئوستوورە گریکییەکاندا زۆرێک لەو ئاماژانە دەبینرێن کە بەڵگەن لەسەر بوونی پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتی لەنێو خواوەندەکانیاندا و پیاوانی دیکە کە هەمان پێگەی خواوەندەکانیان هەبووە و لەنێو خەڵکی ئاساییدا، بۆ نموونە باس لە پەیوەندیی خۆشەویستیی نێوان زیۆس zeus و گەنجێک بە ناوی جانیمید Gonymede دەکرێ، هەروەها پەیوەندیی نێوان بوسیدیون posedionی خواوەند و پلوپس pelops، ئەپۆلۆ Apolloی خواوەند و کادموس cadmus، هیرقلیس Heracles و لولوس Lolus (کە ئەویش نیوەی خواوەند بووە). هەرچی هۆمۆسێکسوالیتیی مرۆییە، یەکەمین جار لە شارستانییەتی گریکدا ئاماژەی پێ دراوە کە لە

ئەلیادەی Ilida شاعیری گریکی "هۆمەر"دا باس کراوە، ئەم شاعیرە لە سەدەی ١٨ی پێش زاین ژیاوە، لە داستانەکەیدا، سەردەمەکەی خۆیی و سەردەمی شاری مسینیی mycenaen باس کردووە، کە دەکەوێتە نێوان ١٤٠٠ تا ١١٥٠ی پێش زاین، بە مێژووی شەڕی تەڕوادەشەوە لە نێوان سالانی ١١٩٤ تا ١١٨٤ی زاین. هەرچەندە هۆمەر یان هۆمیرۆس، شاعیرێکی زۆر خواناس بوو، هەروەها بە توندی پابەند بوو بە بۆچوونەکانییەوە، لە ئەلیازەکەیدا پەیوەندیی نێوان ژنومێردی ئەمر کردووە و بە پەیوەندییەکی ئەرمونیان و پڕ لە بەختەوەری و خۆشیی وەسف کردووە، بەتایبەتی لە داستانی ئۆدیسادا odyssey، بەلام لە چەند شوێنێکی داستانەکەیدا، بەتایبەتی لە دوابەشیدا، ئاماژەی بە جۆرەها شێوازی دەرچوون لە پەیوەندیی باوی سێکسی داوە، یەکێک لەو شێوازانە ئاماژەی بە پەیوەندیی سێکسیی نێوان نێر و نێر کردووە، بەلام هۆمیرۆس بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئاماژەی بە هۆمۆسێکسوالیتی نەداوە، بەلکو بە شێوەیەکی شاعیرانە و بەئاگاوە وەک پەیوەندییەکی بێگەرد ئاماژەی پێ داوە، بەلام ئەم بەئاگاوە باسکردنە دەشێ ئەو مانایە ببەخشێ کە هۆمیرۆس ئەو پەیوەندییە سێکسییەی ئەمر کردبێ کە لە نێوان دوو پیاودا هەبووە، ئەو پەیوەندییەی کە هەندێک بە ناوی هۆمیرۆسەوە بە (خۆشەویستیی هۆمەری) ناوی دەبەن کە هیچ پەیوەندییەکی بە سێکسەوە نییە، هەندێکی دیکەش، بە شێوەیەکی جیاواز لێکی دەدەنەوە کە زیاتر نزیکە لە قبولکردنەوە و دەلێن پەیوەندییەکی خۆشەویستیی هۆمۆسێکسوالیتی بووە. هۆمیرۆس باس لەو پەیوەندییە بەتینە دەکات کە لە نێوان ئاخلیس Achilles پالەوانی شەڕی تەڕوادە و پترۆکولوس potroclus هەبووە، ئەو گەنجەی کە لەگەل ئاخلیسدا گەورە بوو لە شاری فیسیا phthia و دواتریش بوون بە هاوڕێ، بەلام لە شەڕی تەڕوادەدا کوژرا.

ئاخلیس بە توندی تۆڵەی هاوڕێیەکەی سەندەوە. هۆمیرۆس باسی بوونی هیچ پەیوەندییەکی سێکسی ناکات کە لە نێوان ئاخلیس و هاوڕێکەیدا هەبووبێ و پەیوەندیی نێوانیان تەنیا پەیوەندیی هاوڕێیەتی و خۆشەویستییەکی ڕۆحی بووە، نەک پەیوەندییەکی ئیرۆسیی شەهوانی. ئەوەی ئەم ڕایە پووچەڵ دەکاتەوە، ئەو زمانە سۆزداری و پڕ شەیداییە کە هۆمیرۆس چیرۆکی پەیوەندیی نێوانیانی پێ دەگێڕێتەوە، سەرباری ئەو ڕووداوانەی لەدوای مردنی پترۆکولوس ڕوویان دا، بۆ نموونە دەڵێن ئاجا میمنون Agamemnon jmareyek کۆمەڵێک گەنجی خانەدانی پێشکەش بە ئاخلیس کرد تا قەرەبووی لەدەستدانی هاوڕێکەی بۆ بکەنەوە، لە نێوانیاندا گەنجێک بە ناوی ئەنتیلۆخوس Antilochus توانیی لای ئاخلیس شوێنی بتروکلوس بگرێتەوە کە لە شەڕدا کوژرا، ئەمەش یەکێکە لەو هۆکارانەی کە بۆچی ئەم سیانە پێکەوە لە یەک گۆڕدا نێژراون و ئێسکەکانی ئاخلیس لەگەڵ ئێسکەکانی پترۆکولوسی هاوڕێی پێکەوە تێکەڵ بوون، لەوانەیە جوانترین وەسفی ئەم پەیوەندییەی نێوان ئەم دوو هاوڕێیە کە زۆر یەکدییان خۆش ویستووە، وەسفی ئەو خەونە بێت کە ئاخلیس بینویەتی و هۆمیرۆس لە ئەلیازەدا بەم شێوەیە دەیگێڕێتەوە:

... "دڵم گرفتاری هیچ حوزنێکی دیکە نابێ تا تۆ زیندووبێ"

پاشان تارمایی بەدبەخت و هەناسەساردی پترۆکولوس دێت و لەسەر سەری ئاخلیسەوە ڕادەوەستێ و بەم شێوەیە قسەی لەگەڵدا دەکات: "تۆ خەوتوویت و منت لەیاد کرد ئاخلیس، کاتێک زیندوو بووم هیچ کاتێک فەرامۆشت نەکردم. کە مردم بە خێرایی کفنودفنم بکە، تا زوو دەرگاکانی دۆزەخ ببڕم، لە تارماییەکان، لە شەبەنگی پیاوان دوور بم، ئەوانە نایەڵن لەودیو ڕووبارەکەوە ئۆقرە بگرم، بەڵام وەک شێت و شەیدا لە ماڵی گەورەی دۆزەخدا یاری دەکەم، لێت دەپاڕێمەوە، بەزەییت پیامدا بێتەوە و دەستتم

بەرێ، چونکە من لە دۆزەخ ناچمە دەرەوە، لەپاش ئەوەی بەشی خۆم ئاگری پێ بەخشیم، جارێکی دیکە ناتوانین لە ژیاندا پێکەوە دابنیشین و دوور لە هاوڕێکانمان پێکەوە دەمەتەقێ بکەین، چونکە ئەو قەدەرە شوومە پەری پیادا کردم، ئەو قەدەرەی کە لە لەدایکبوونمەوە لە چارەم نووسرا بوو، تەنانەت تۆش ئەی ئاخلیس، تۆش وەک خواوەند، لە چارەت نووسراوە لەژێر دیواری تەڕوادە دەوڵەمەندەکاندا بمریت، شتێکی دیکە هەیە پێت دەڵێم، ئەگەر گوێت لێ گرتم، بەڵێنم پێ بدە بە قسەم بکەیت: ئێسکوپرووسکی من دوور لە ئێسکوپرووسکی خۆت جێ مەهێڵە ئەی ئاخلیس، بەڵکو با بەیەکەوە بن، وا بکە هەردووکیان لە یەک سندووقدا بن، با ئێسکوپرووسکمان لەو سندووقە دوو دەسکییەدا پێکەوە یەکدی لە ئامێز بگرن کە دایکی شاژنت پێی بەخشییت". لە وەڵامدا ئاخلیسی تیژڕەو پێی وت: "ئەی کەللەسەرە خۆشەویستەکە لەبەر چ هۆکارێ بۆ ئێرە هاتوویت و تەکلیفی ئەم شتانەم لێ دەکەیت؟ بەڵێ، بەڵێ، من هەموو شتێ دەکەم و گوێت لێ دەگرم کاتێک تۆ فەرمانم پێ دەدەی، بەڵام لە نزیکەوە بوەستە، تەنانەت ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورتخایەنیش بێ، لێگەڕێ باسکمان لەیەک بئاڵێنین و یەکدی لە ئامێز بگرین، هەریەکەمان ئەوی دیکەمان لەباوەش بگرێ و دڵنەوایی یەکدی بکەین لەو حەسرەتە دڵتەزێنەی کە بەسەرماندا هاتووە". کاتێک ئاخلیس ئەم قسانە دەکات، دەستەکانی بەرەو ڕووی هاوڕێکەی درێژ دەکات، بەڵام لە ئامێزی ناگرێ، چونکە تارماییەکە وەک دووکەڵ لەژێر زەویدا لە چاو ون دەبێ، تارماییەکە بە دەنگێکی کپ و هێواش بەخێرایی لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد". (ئەلیازە).

سەربارى ناکۆکیی نێوان توێژەران سەبارەت بە سروشتی پەیوەندیی نێوان ئەم دوو هاوڕێیە، ئایا پەیوەندیی نێوانیان، پەیوەندیی هاوڕێیەتی و خۆشەویستییەکی ویژدانیی ڕۆحی بووە،

یان پەیوەندیی خۆشەویستییەکی شەهوانیی هۆمۆسێکسوالیتی بووە؟ ناکۆکییەکی دیکە هەیە سەبارەت بەم پەیوەندییە، ئایا کامیان ئاشق و کامیان مەعشوق بوون؟ یان بە واتایەکی دیکە، کامیان بکەر و کامیان وەرگر بوون لە پەیوەندیی سێکسیی نێوانیاندا؟ بڕوا وایە ئاخلیس نەک بترۆکۆلۆس، لەم پەیوەندییەدا، وەرگر بووە، چونکە تەمەنی کەمتر بووە و لە پترۆکۆلۆسی هاوڕێشی جوانتر بووە.

پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتی تەنیا لەناو ئوستوورەکانی یۆنان و لەناو داستانەکانی هۆمیرۆسدا نەبوون، بەڵکو لە ئەسینا و سبارتە و شارە گریکییەکانی دیکەش هەبووە و نەمر کراوە و لە شێوەی پەیکەر و لە کارەکانی سیرامیکدا گوزارشتی لێ کراوە. شاعیران شیعریان دەربارەی نووسیوە و هەندێک لە فەیلەسووفەکانیش بە ڕێزەوە باسیان کردووە. ئەفلاتوون لە هەموان ئاشکراتر و وردتر باسی پەیوەندی هۆمۆسێکسوالیتی کردووە، هەر وەک لە گفتوگۆکەی سمپۆزیومدا symposium هاتووە:

"ئەگەر هۆکارێک هەبوایە تا لەڕێیەوە دەوڵەت لە ئاشقە و مەعشوق دروست بوایە، ئەوا باشتر دەبوون لەوەی کە حاکمی شارەکەیان بوونایە، لە هەموو ئەو شتانە دووردەکەوتنەوە کە شەرەفیان لەکەدار دەکرد، لە شەرەفدا لاسایی یەکدییان دەکردووە، کاتێک شانبەشانی یەکدی شەڕیان دەکرد، ئەگەر ژمارەیان هێندەی ژمارەی پەنجەکانی دەستیش بوایە، بەسەر هەموو جیهاندا سەردەکەوتن، چونکە ئاشق شتێکی مەزنتر لە بینینی مەعشوقەکەی هەڵنابژێرێ، بە لایەوە باشترە هەزار جار بمرێ، نەک شوێنەکەی لە شەڕدا بەجێبێڵێ، یان واز لە چەکەکەی بێنێ. کێ بوێریی ئەوە دەکات لە ساتی مەترسیدا خۆشەویستەکەی بەجێبهێڵێ؟ ترسنۆکترین کەس لەو کاتانەدا

لەگەڵ ئازاترین کەسدا یەکسان دەبێ، چونکە لەو ساتەدا خۆشەویستی ئیلهامی پێ دەبەخشێ" سمپۆزیوم.

لەو بەڵگانەی کە ئاماژە بەوە دەدەن، هۆمۆسێکسوالیتی لە شارستانییەتی گریکی دێریندا نەمرکراوە، چیرۆکی شەڕی شارۆنیایە لە ساڵی ٣٣٨ی پێش زایندا، کە لە نێوان سوپای فیلیپ ماکدونی و گریکییەکاندا ڕووی داوە. دەگێڕنەوە ئەو جەنگاوەرانەی ڕووبەڕووی سوپاکەی فیلیپ بوونەتەوە، سەر بە کەتیبەیەکی تایبەت بوون کە بە (کۆمەڵەی پیرۆز) ناسراوبوون، لە ٣٠٠ گەنج پێک هاتبوون، ئەم گەنجانە، دوو دوو پەیوەندییەکی بەهێزی خۆشەویستی و وەفا لە نێوانیاندا بووە، ئەم کەتیبە پارێزگاریی لە شوێنی خۆی کرد تا دوا کەسیان لەناوچوو. شایەنی باسە لە سەرەتای سەدەی بیستدا، پەیکەری شێرێکیان لە مەرمەڕ لە دەروازەی ئەو گۆڕە بەکۆمەڵەدا دروست کرد کە بڕوا وایە، هەموویان لەو شوێنەدا بەیەکەوە نێژراون. بەهۆی ئەم ڕیوایەت و دەق و ئەفسانانەوە و بەهۆی شوێنەواری هونەرەوە، بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە گریکییەکان، هۆمۆسێکسوالیتییان بە شێوازێکی قبوڵکراو و خواستراو داناوە، بە ئاشکرا هانی ئەم جۆرە پەیوەندییەیان داوە و باسی لایەنە چاکەکانیان کردووە. هەندێکیان پەیوەندیی خۆشەویستیی نێوان پیاو و کوڕیان بە ئەزموونێکی پەروەردەیی نموونەیی داناوە، هەر ئەم ڕاوبۆچوونەشە بۆ شارستانییەتەکانی دیکە دزەی کردووە و لە هەندێک لە سەردەمەکاندا ڕێگەی پێ دراوە. یەکێک لەو فەیلەسووفانەی باسی لە لایەنە باشەکانی ئەم پەیوەندییە کردووە، ئەفلاتوونە کاتێک دەڵێ: "لەڕێی ئەو خۆشەویستییەوە کە لە نێوان

پیاوانو کوڕاندا دروست دەبێ، کاتێک شەوانە پیاو لە خەو بەئاگا دێت، ڕوئیایەکی سروشتی و ڕاستەقینەی بۆ جوانی لە لا دروست دەبێ". بە هەمان شێوە، چۆن هۆمۆسێکسوالیتی لە نێردا نەمر کراوە، لە "مێ"شدا نەمر کراوە، دواتر لە بابەتی سەحاقی (سافی یان لەیزبین) باسی لێوە دەکەین، بەڵام ئەم نەمرکردنە لە شارستانییەتی گریکیدا هەمیشەیی نەبوو، چونکە هۆمیرۆست یەکێک بوو لەوانەی لە داستانەکەیدا هۆمۆسێکسوالیتیی نێوان مێ و مێی ڕەت کردەوە و بە شێوەیەکی یەکلاییکەرەوە و تەواو بە کارێکی حەرام و قەدەغەکراوی دانا.

لە مێژووی عیبرییەکانیشدا، هۆمۆسێکسوالیتی بە شێوەیەکی بەرفراوان، بڵاوبووەوە، وەک زانراوە بەر لە دەستبەسەراگرتنی بابل، هەوڵێکی زۆریان بەم ئاڕاستەیەدا داوە، هەروەها هانی خەڵکیان داوە کە پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتی لەگەڵ کاهنەکاندا ببەستن، بەم شێوەیە پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتی لە نێوان عیبرییەکان خۆیاندا و لەگەڵ دانیشتوانی وڵاتانی دەریای ناوەڕاستدا دروست بوو، ئەمە تا دەرکەوتنی مەسیح بەردەوام بوو، بەڵام لەدوای بەدیلگرتنی بابل، عیبرییەکان خۆیان پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتییان ڕەت کردەوە، هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێنرێتەوە کە هەوڵیان داوە ناسنامەکەی خۆیان لە فەوتان بپارێزن، تەوراتیش بە تەواوەتی ئەم پراکتیزەکردنە سێکسییەی حەرام کرد و ئەم حەرامکردنە لە ئینجیل و ئایینی مەسیحیشدا بەردەوام بوو.

بەهانەی حەرامکردن لای هەموویان ئەوە بوو، کە پەیوەندیی سێکسی لەپێناوی خوڵقاندن و منداڵخستنەوەدا هاتووەتە ئاراوە،

لەبەر ئەوە پێویستە تەنیا بۆ ئەو مەبەستە بەکار بێ و ئیشی پێ بکرێ، لاهوتییەکان ئەو یاسایەیان دارشت کە پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتی ئامانجی خۆی ناپێکێ، لەبەر ئەوە لە نەزەری ئەوانەوە هۆمۆسێکسوالیتی لادانێکی سێکسییە و دەشێ ببێتە مایەی لەکارخستنی پەیوەندیی سێکسیی سروشتیی نێوان ژن و پیاو، هەروەها هۆمۆسێکسوالیتی پەیوەندییەکی ناشیرین و گوناهێکی گەورەیە.[٣] ئەم ڕوانگەیە بەرامبەر بە هۆمۆسێکسوالیتی بە شێوەیەکی توندتر و ڕەتکراوەتر، تا سەدەکانی ناوەڕاست بەردەوام بوو، تەنانەت تا ئەم سەردەمەی ئێستاشمان هەندێ لە کۆمەڵگەی شارستانی و پێشکەوتوودا بە دیاردەیەکی ڕەتکراوە دادەنرێ.

### هۆمۆسێکسوالیتی لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا

ئەو لێکۆڵینەوانەی کە زانایانی ئەنسرۆپۆلۆژی دەربارەی شێوازەکانی پەیوەندیی سێکسی لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا ئەنجامیان داوە، وا گریمانە دەکرێ کە بە درێژایی سەردەمەکان، نەریت و شێوازەکانی پەیوەندیی سێکسی بە شێوەیەکی ڕیشەیی گۆڕانیان بەسەردا نەهاتووە، ئاماژە بەوە دەدەن لەنێو ٤٩ کۆمەڵگەی سەرەتایی لە کۆی ٧٦ کۆمەڵگە کە لێکۆڵینەوەیان لەسەر کراوە، ٦٤%یان[٤] بەو شێوەیە لە هۆمۆسێکسوالیتی دەڕوانن کە پەیوەندییەکی سروشتییە و لە ڕووی کۆمەلایەتییشەوە[٥] قبوڵ کراوە و هەندێ لەم کۆمەڵگەیانەش بە ئاشکرا ڕێگەیان پێ داوە، بەڵام هەندێکی دیکەیان تەنیا لەڕێی پەیوەندیی سێکسیی زارەکی و لەڕێی دەستەوە ڕێگەیان بە ئەنجامدانی داوە، لە هەندێک کۆمەڵگەشدا بە شێوەیەکی کۆمەلایەتیی ڕێکوپێک، ڕێکخراوە. لە لای قەبیلەی مۆهاڤی

Mohave که یەکێکە لە قەبیلەکانی هندییەسوورەکان کە بەوە ناسراون لە جەنگ و ڕاوکرندا زۆر ئازا و بەهێزن، ئەو گەنج و پیاوانەی وەک پێویست توانای ئەم دوو شتەیان نەبێ، جیایان دەکەنەوە و پلەیەکی تایبەتییان پێ دەبەخشن و جلی ژنانەیان لە بەر دەکەن، هەر یەکێکیشیان پیاوێک دەکەنە مێردیان، ئیدی ئەو گەنج یان پیاوەی کراوە بە ژن، وەک هەر ژنێکی ئاسایی کاروباری ناوماڵ جێبەجێ دەکات و پەیوەندیی سێکسییش لەگەڵ مێردەکەیدا ئەنجام دەدات، بەم تاکە بەمێکراوانەش دەڵێن بەرداش berdache.

قەبیلەی ئابورجین کە یەکێکە لە قەبیلەکانی چینی سیبریا، پێشیان دەوترێ چوکچی chukchee، بە شێوەیەکی ئاسایی مەراسیمی هاوسەرێتیی هۆمۆسێکسوالیتی لە ناویاندا بەڕێوە دەچێ، ئەو نێرەی ئامادە دەکرێ ڕۆڵی ژن ببینێ لەو پەیوەندییەدا، لەدوای هاوسەرێتی پێی دەوترێ شمان shaman یان پزیشکی ساحیر.

لە پرۆسەی هاوسەرێتییەکەدا، ڕۆڵی سالب یان وەرگر دەبینێ، بەڵام هاوسەرەکەی کە هەر وەک خۆی نێرە، بۆ مەسەلەی نەوەخستنەوە ژنێک دەهێنێ، هەروەها شمانیش دەتوانێ دۆستی ژنی هەبێ، بەڵام شمان کە خۆی نێرە و دەشێ پەیوەندیی سێکسییشی لەگەڵ دۆستێکی ژندا هەبێ، بۆی نییە نەوە بخاتەوە و ڕێگە بدات منداڵیان ببێ. بێگومان ئەم جۆرە ڕێکخستنە سنوورەکانی هۆمۆسێکسوالیتی ڕووت دەبڕێ و ئاماژەی جووتتوخمی bisexuality لەخۆ دەگرێ.

شایانی باسکردنە ئەو پیاوەی کە ڕۆڵی ژن دەبینێ و شوو بە پیاوێکی دیکە دەکات، واتە دەبێتە شمان یان پزیشکی ساحیر، لەناو کۆمەڵگەدا پێگەیەکی بەرز و ڕێزداری دەبێ، تا ئێستا لە مەبەست و مەغزای ئەم پێگە بەرزە تێناگەین، بۆچی ئەم پیاوە لە

پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتیدا جەمسەرە نێگەتیڤەکەی پەیوەندییەکە دەبینێ، بەڵام ئەو پێگە بەرزەشی لەناو کۆمەڵگەدا هەیە و ئایا ئەمە چ پەیوەندییەکی بە هۆمۆسێکسوالیتییەوە هەیە؟ یەکێکی دیکە لەو شتە سەیرانەی پەیوەندیی بە هاوسەرێتیی نێوان نێر و نێرەوە هەیە، گەڕیدەیەکی عەرەب لەناو کۆمەڵگەیەکی سەرەتایی و نەریتی عەرەبیدا لێکۆڵینەوەیەکی ئەنجام داوە و تێبینیی کردووە، هەمان هاوسەرێتی لە نێوان نێر و نێردا لەناو عەرەبیشدا هەیە، ئەو گەڕیدەیە ئاماژە بەوە دەدا هەندێ لە پیاوان، هاوتوخمێکی خۆیان دەکەن بە ژنیان و جلی ژنانەی لە بەر دەکەن و لەناو ماڵی هاوسەرێتیدا نیشتەجێی دەکەن، هەروەها دەڵێ، ئەگەر لە دەرگای ئەو ماڵە بدرێ، تەنیا لە درزێکی دەرگاکەوە ژنی ئەو پیاوە دەبینی، کە لە ئەسڵدا ئەویش هەر پیاوە، وەڵامت دەداتەوە کە هاوسەرەکەی لە ماڵ نییە. گەڕیدەی ناوبراو هۆکاری ئەمە بۆ خاوەندارێتی و داگیرکردنی ئەو کوڕە لە لایەن ئەو پیاوەوە کە بووەتە هاوسەری، دەگێڕێتەوە، کە تەنانەت غیرەشی لێ دەکات پیاوی دیکە بیبینێت. قەبیلەی سیوان siwan لە باشووری ئەفریقادا، هۆمۆسێکسوالیتی بە ڕەفتارێکی سەیر و نامۆ دانانێن. ئەو پیاوانەی کە بە شێوەیەکی سروشتی ژن دەهێنن، هاوشێوەی ئەو پیاوانەی کە ڕەبەنن و ژنیان نەهێناوە، چاوەڕێی ئەوەیان لێ دەکرێ پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ هاوتوخمەکەیان و توخمە دژەکەشیان پراکتیزە بکەن، تەنانەت گەیشتووەتە ئاستێک کە منداڵەکانی یەکدی بۆ ئەم مەبەستە بە قەرز دەدەن بەیەک. لە قەبیلەکانی ئاراندا arandaش لە ئوستورالیا، وا باوە پیاو دۆستێکی نێری هەبێ و لەگەڵیدا بژی تا ئەو کاتەی پیاوەکە بە شێوەیەکی سروشتی ژن دەهێنێ. پێشتریش ئاماژەمان بە یەکێک لە کۆمەڵگەکانی دوورگەی مەلایۆ کرد کە بە کەنداوی خۆرهەڵات east bay ناسراوە، توێژەران دەربارەی دابونەریتی ئەم

کۆمەڵگەیە دەڵێن، وا چاوەڕوان دەکرێ لە هەر کوڕێک، بەر لە گەیشتنی بە قۆناغی هەرزەکاری، هۆمۆسێکسوالیتیی ئەنجام دابێ، ئاسایی ئەم کارە لەگەڵ ئەو پیاوانەدا دەکات کە لە خۆی گەورەترن، بەم شێوەیە سەردەمی پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتی بێ گەڕانەوە کۆتایی دێت، کاتێک سەردەمی پەیوەندیی سێکسیی سرووشتی لەگەڵ مێدا دەست پێ دەکات. توێژینەوەکان لەم بوارەدا ئاماژە بەوە دەدەن، ئەم کۆمەڵگەیە پەیوەندیی سێکسیی نێوان نێر و مێ بە پەیوەندییەکی مەزنتر و باڵاتر دادەنێن لە پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتی، کە بەدەگمەن لەدوای هاوسەرێتی پراکتیزە دەکرێ. ئەم تێبینییانە دەشێ بەڵگە بن لەسەر ئەوەی وەرگرتنی ناسنامەی سێکسی کۆتایی، بە ناسنامەی هۆمۆسێکسوالیتییشەوە، مەرج نییە پشت بە کات و مەودای ئەنجامدانی سێکس ببەستێ لە هەر قۆناغێک لە قۆناغەکانی گەشەی تاکدا.

### هۆمۆسێکسوالیتی لای ئاژەڵان

زانا و توێژەران و کەسانی دیکەش، تێبینیان کردووە، پراکتیزەکردنی هۆمۆسێکسوالیتی لەنێو هەندێک جۆری ئاژەڵاندا هەیە، بۆ نموونە تێبینی کراوە کیسەڵی نێرە و پشیلە و سەگ و ئەسپ و چەندین جۆری دیکە لە ئاژەڵان لەگەڵ هاوتوخمەکانیاندا سێکس دەکەن، بەڵام ئەم ڕەفتارە سێکسییە لەنێو هەندێ جۆری مەیمووندا زیاتر تێبینی کراوە، هەروەک (زوکرمان ١٩٣٢) تێبینی مەیموونی جۆری بابوون baboon، واتە سەعدانی کردووە، کە بە ماوەیەک بەر لە باڵقبوون لەگەڵ هاوتوخمەکانیان لە نێرەکان پەیوەندیی سێکسیی دەکەن، ئەم قۆناغە، هەمان ئەو قۆناغی گەشەی سێکسییەیە کە لە منداڵ و مێردمنداڵی مرۆڤدا هەیە و دەشتی هۆمۆسێکسوالیتیی تیادا ڕوو بدات، بەڵام مەیموون لەم قۆناغەدا کاتێک سێکس لەگەڵ هاوتوخمەکەی خۆیدا دەکات، لەگەڵ

ئەوانەدا نایکات کە سەر بە هەمان جۆرەکەی خۆین، بەڵکو لەگەڵ هاوتوخمی خۆی لە توخمێکی جیاواز دەیکات، هەروەها تێبینیی ئەوە کراوە، مەیموونی پێگەیشتوو کاتێ لە سواربوونی مەیموونێکی مێ تەواو دەبێ، سواری مەیموونێکی نێریش دەبێ، هەروەها کمپف (kempf ۱۹٥۲) تێبینیی کردووە، ئەو مەیموونەی ڕۆڵی سالب یان وەرگر دەبینێ لەو سێکسەدا، دەشێ لەکاتی ڕازیبوونی بە ڕۆڵی سالب لەو پەیوەندییە هۆمۆسێکسوالییەدا، خۆی ماستەربەیشن بکات، واتە بە مەبەستی چێژبینین دەست بدات لە ئەندامی سێکسیی خۆی، هەروەها تێبینیی هەندێ جووڵەی ئاماژەیی کراوە لە کاتی ئەنجامدانی پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتی، یان لە کاتی خۆئامادەکردن بۆ ئەنجامدانی. ئەو توێژەرانەی کاریان لەسەر ڕەفتاری سێکسی لای هەندێ لە ئاژەڵان کردووە، بەتایبەتی ڕەفتاری هۆمۆسێکسوالیتی، لای جۆرێکی باڵای ئاژەڵان، وەک مەیموون، هەندێ جار دەگەنە ئەو دەرئەنجامەی کە بناغەیەکی بایۆلۆژی بۆ ئەم ڕەفتارە سێکسییە هەیە و ئەم بناغەیە لە جیهانی ئاژەڵاندا دەبەستنەوە بەو بناغە بایۆلۆژییەوە کە لە ژیانی مرۆییدا هەیە. لەم بارەیەوە، شوێنەواری ئەم جۆرە وێناکردنە بەدی دەکەین، هەرچەندە ئەو بناغەیەی وێنا دەکرێ لە مرۆڤدا بوونی هەبێ، بناغەیەکی مۆرالییە، نەک بایۆلۆژی، ئەویش ئەوەیە کە هۆمۆسێکسوالیتی لە ڕەفتاری هەندێک کەسدا بە نەزوەی ئاژەڵی وەسف دەکرێ و گوزارشی (بەگەری ئاژەڵیbuggery) پێ بەخشراوە، واتە لوواتی یان سۆدۆمی ئاژەڵی، هەروەها وەک گوزارشتێ بەکار دێ بۆ وەسفکردنی ئەو کەسانەی هۆمۆسێکسوالیتی ئەنجام دەدەن و مانایەکی مۆرالی لەخۆ دەگرێ. ژمارەیەک لە زانایانی دیکەی تایبەت بە بواری ڕەفتاری ئاژەڵی، هۆکاری ڕوودانی هۆمۆسێکسوالیتی لە ئاژەڵاندا بۆ ئەوە دەگێڕنەوە کە وەک خۆئامادەکردنێک وایە بۆ ئەنجامدانی

پەیوەندیی سێکسیی سروشتی لە گەورەییدا، ئەم ئامادەکردنەش، ئامادەکردنێکی بایۆلۆژی و ڕەفتاری و کۆمەڵایەتییە، ئەنجامدانیش دەشێ هۆیەک بێت بۆ دروستکردنی ڕێساکانی کۆنترۆڵکردن و ملکەچبوون لەنێو ئاژەڵاندا، زیاتر لەوەی کە گوزارشتێکی سێکسیی بایۆلۆژیی ڕووت بێ.

## هۆمۆسێکسوالیتی لە شارستانییەتە هاوچەرخەکاندا

لەوانەیە بۆ توێژەر کارێکی قورس بێ، بە وردی ئەو شارستانییەتانە پۆلێن بکات کە لەم سەردەمەدا هەڵگری سیفەتی هاوچەرخی بن، بە هەمان شێوە دەستکەوتنی زانیاریی متمانەپێکراو دەربارەی ئاستی بڵاوبوونەوە و ڕووودانی پراکتیزەکردنە سێکسییەکان بە هۆمۆسێکسوالیتییشەوە، کارێکی قورسە، ئەم ئەستەمییەش بە شێوەیەکی گشتی پەیوەندیی بە کۆکردنەوەی زانیارییە ئامارییەکانەوە هەیە، هەروەها ئەستەمییەکی تایبەتیش لەم کارەدا هەیە کە پەیوەندی بە سروشتی ئەو زانیارییانەوە هەیە کە پەیوەندییان بە مەسەلەی سێکسەوە هەیە، چونکە بەگشتی خەڵکی لادان و خۆپارێزییان هەیە دەربارەی ئەم بابەتانە و هەروەها لە ڕووی کۆمەڵایەتی و مۆرالی و یاساییشەوە، هۆمۆسێکسوالیتی بە مەسەلەیەکی هەستیار دادەنرێ. ئاشکرایە ئاستەمیی گەیشتن بە زانیاری و هەقیقەتە متمانەپێکراوەکان لە نێوان توێژەرێکەوە بۆ یەکێکی دیکە و لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە جیاوازیی هەیە، هەروەها لە ماوەیەک بۆ ماوەیەکی دیکەش هەر جیاوازیی هەیە، پاشان جیاوازی لە زانیارییە دەستکەوتووەکاندا هەیە، تەنانەت لە یەک کۆمەڵگەشدا، ئەویش بەهۆی فرەجۆریی ئەو سمپڵانە، واتە ئەو تاکانەی توێژینەوەکەیان لەسەر دەکرێ و پرسیارەکانیان

ئاراستە دەکرێ، بەپێی تەمەن و باری ئابووریی بژێوی و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی، جیاوازن.

لەو لێکۆڵینەوە ئامارییانەی کە ئاماژەی تا رادەیەک نزیک لە واقیعیان خستووەتە روو، لێکۆڵینەوەکەی کنزییە لە ساڵی ١٩٤٨دا کە دەربارەی ژیانی سێکسی لای نێر و پاشان لای مێ ئەنجامی دا. کنزی لە لێکۆڵینەوەکەیدا ئاماژەی بەوە داوە لە هەر سێ نێر، بە لای کەمەوە یەکێکیان لە فۆرمی تایبەت بە راپرسییەکە ددانی بەوەدا ناوەکە بە شێوەیەک لە شێوەکان و لەدوای تێپەڕبوونی قۆناغی نەرزەبوونیش ئەزموونی هۆمۆسێکسوالیتیی هەبووە، هەروەها هەمان لێکۆڵینەوە ئاماژە بەوە دەدات ٥٠%ی ئەو نێرانەی کە راپرسییان لەگەڵدا کراوە و لە تەمەنێکی پێگەیشتوودا بوون، نووسیویانە ژیانی سێکسیی ئێستایان، واتە قۆناغی دوای ئەزموونی هۆمۆسێکسوالیتییان، تەواو جیاوازە و پەیوەندیی سێکسییان سنووردارە، واتە تەنیا لەگەڵ مێ دایە. ٤٦%یشیان رەفتاری سێکسیی هۆمۆسێکسوالیتی و هیترۆسێکسوالیتییان بە پلەی جیاواز هەبووە، واتە ٤٦%یان پەیوەندیی سێکسییان لەگەڵ نێر و مێدا هەبووە، تەنیا ٤%یان بە شێوەیەکی سەراپاگیر پەیوەندیی سێکسییان لە هۆمۆسێکسوالیتیدا سنووردار بووە، واتە تەنیا لەگەڵ نێردا سێکسیان کردووە، ئەویش لەبەر هۆکاری جیاجیا، بۆ نموونە خۆیان بە ویستی خۆیان ئەو شێوە سێکسەیان هەڵبژاردووە، یان ناچار بوون ئەو شێوە سکێسە ئەنجام بدەن. لە لێکۆڵینەوەیەکی دواتردا ساڵی ١٩٥٣ کنزی و هاوکارانی ئاماژەیان بەوە دا کە ٣٧%ی نێر و ١٣%ی ئەو مێیانەی ئەزموونی هۆمۆسێکسوالیتییان تاقیکردووەتەوە لە هەندێک لەو کاتانەی ئەم سێکسەیان ئەنجام داوە، بە ئۆرگازم گەیشتوون، هەروەها ٤٠%ی پیاوان و ١٠%ی ژنانی تەمەن (٣٦-٤٠) کە هێشتا هاوسەرێتییان نەکردووە، ئەوەیان ئاشکرا کردووە کە پەیوەندیی

هۆمۆسێکوالیتییان لەگەڵ هاوتوخمەکەی خۆیاندا هەیە و بەردەوامیشن لە پیادەکردنی، هەروەها دەرکەوتووە زۆربەی زۆری ئەو کەسانەی پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتییان هەیە، سەر بەم گرووپەن، واتە تەمەنیان لەو نێوەندەدایە و بێ هاوسەرن. لەگەڵ بایەخی لێکۆڵینەوەکانی کنزی لە مێژووی توێژینەوەکان لەم بوارە هەستیار و قفلکراوەدا، بەڵام ڕەخنەیەکی زۆر ڕووبەڕووی کنزی بووەوە، هەندێ لەو ڕەخنانە بەهۆی پاڵنەری لادان، یان پابەندبوون بە بیروباوەڕێکی دیاریکراوەوە و خۆنابیناکردن و ڕەتکردنەوەی ئەم لایانانە لە ژیانماندا، دروست بوون، هەندێ لەو ڕەخنانەش کە لە کنزی گیران، پشتیان بەستبوو بە بناغەی جیبەجێکردن لە توێژینەوەکەیدا کە لە شێوەی ڕاپرسیدا ئەنجامی دابوو، وا داندرا کە ئەنجامەکانی کنزی لەگەڵ کۆمەڵگەی ئەمەریکیدا ناگونجێن و یەک ناکەون، کە کۆمەڵگەیەکە خاوەنی خەسڵەتی تایەفەگەریی شارستانیی جیاوازە و ئەستەمە دەرئەنجامی ڕاپرسیی سامپڵێکی دیاریکراو بەسەر تەواوی کۆمەڵگەدا بە شێوەیەکی گشتی گشتگیر بکرێ.[٦] لەو لێکۆڵینەوە بەهادارانەی کە لەم بوارەدا ئەنجام دراون، وەک لێکۆڵینەوەکەی زانای سایکۆلۆژی ئیزانک eysenek لە کتێبی (سێکس و کەسێتی لەساڵی ١٩٧٦)دا، ئیزانک لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵی نەدا بۆ ئەوەی پێودانگ، یان پێوەرێکی تایبەت بە دانیشتووانی دەستبکەوێ، بەڵکو ئامانجی لێکۆڵینەوەکە بریتی بوو لە بەستنەوەی فاکتەری هۆمۆسێکسوالیتیبە کەسێتییەوە، یان دۆزینەوەی پەیوەندیی نێوان هۆمۆسێکسوالیتی و کەسێتی. ڕاپرسییەکەی ئیزانک لە ١٥٨ پرسیار پێک هاتبوو کە ئاستی ڕۆشنبیری و ئابووری و کۆمەڵایەتیی جیاوازی لە کۆمەڵگەی ئینگلیزیدا لەخۆ گرتبوو. یەکێک لەو پرسیارانەی بەم شێوەیە ئاڕاستەی بەشداربووان کرابوو: "هۆمۆسێکسوالیتی بە لای

هەندێک کەسەوە شتێکی سروشتییە، ئێوە ڕاتان چۆنە؟'، ٧٨%ی وەڵامەکان لە هەردوو توخمەکە، پۆزەتیف بوو. پرسیارێکی دیکە، بەم شێوەیە خرابووە ڕوو: (تووشی ململانێ بووم لەگەڵ خۆمدا، چونکە مەیلی سێکسیم بۆ هاوتوخمەکەی خۆم هەیە)، ٢٠%ی توخمی نێر و ١٤%ی توخمی مێ بە پۆزەتیف وەڵامیان دایەوە. پرسیاری سێیەمیش بەم شێوەیە بوو: (ئەو کەسانەی هاوتوخمی خۆمن، زۆر سەرنجم ڕادەکێشن)، ٥٠%ی توخمی نێر و ١٠%ی توخمی مێ بە پۆزەتیڤ وەڵامیان دایەوە. ئەم وەڵامانە، بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئاراستەی سێکسی هۆمۆسێکسوالیتی لەو کۆمەڵگەیەدا هەیە. ئەو لێکۆڵینەوانەی دیکە کە لە شێوەی ڕاپرسیدا لە وڵاتانی دیکەی دنیای خۆرئاوادا ئەنجام دراون، ئاشکرای دەکەن، ئاراستەی سێکسی هۆمۆسێکسوالیتی لەو وڵاتانەدا هەیە و دەرئەنجامی ئەو ڕاپرسییانەش نزیکن لە ڕاپرسییەکەی کنزییەوە کە ئاماژە بەوە دەدەن، ٤٠%ی توخمی نێر لەگەڵ ئەوەشدا کە دەرفەتی پەیوەندیی سروشتییان لەگەڵ توخمی مێدا هەیە، بەڵام پەیوەندیی سێکسییان تەنیا لەگەڵ هاوتوخمەکانی خۆیان هەیە و هۆمۆسێکسوالیتی بە دڵخوازترین پەیوەندیی سێکسی دادەنێن، بەڵام لە شارستانییەتەکانی خۆرهەڵاتدا، بەهۆی ئەو هەستیارێتییە زۆرەوە کە بەتایبەتی بەرامبەر بە هۆمۆسێکسوالیتی و بەگشتی بەرامبەر بە سێکس هەیانە، ڕاپرسیی لەو جۆرە نەکراوە کە پشتی پێ ببەسترێ. دەستتێوەردانی زانستییانەی تۆکمە بۆ ناو ئەم بوارە، مەسەلەیەکی ناچارییە، بەتایبەتی لە ئێستا هیچ گومانێک نەماوە بۆ دڵنیابوون لە ڕوودانی ئەو جۆرە پەیوەندییە سێکسییانە و دیاردەکە لەوە زیاتر بڵاوبووەتەوە کە هەوڵی خۆ کوێرکردن بدەین لە بەردەمیدا، بەڵکو بە تەواوی دەتوانین بڕیار لەسەر بوونی بدەین.

## سروشتی و لادەر لە پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتیدا

لەو باسانەی تا ئێستا لەم بەشەدا خستماننە ڕوو، ئەوە ئاشکرای دەبێ کە حوکم و ڕوانگەی جیاواز و پەرگیر هەیە سەبارەت بەو ڕەفتارانەی بە سروشتی دادەنرێن لەگەڵ ئەو ڕەفتارانەی بە نەشاز و لادەر دادەنرێن لە پراکتیزەکردنی هۆمۆسێکسوالیتیدا. لەوانەیە ئەم مشتومڕە کۆتایی نەیەت، چونکە مشتومڕێکە چەندە یاسا و ڕێسای جیاجیا لە تێگەیشتن و حوکم تێکەڵاوی دەبن و دەشێ لەو مشتومڕە گەرمەدا، جەوهەری بابەتەکە لە ڕووی زانستییەوە لەدەست بچێ. ئەگەر وا پێویست بکات، ئەوە ئاشکرا بکرێ، تێگەیشتنی زانستی دەربارەی ئەم دیاردەیە تا ئێستا چۆنە و بە چ ئاستێک گەیشتووە؟ ئەوا لێرەدا پوختەی ئەم تێگەیشتنە دەخەینە ڕوو:

- بەڵگە لەسەر بوونی ڕوخسارەکانی پراکتیزەکردنی هۆمۆسێکسوالیتی لە ئاژەڵان و لە مرۆڤدا هەیە، ئەمە وا دەکات ئەو بڕوایەمان هەبێ کە دیاردەکە بڕێک لە بناغەی بایۆلۆژی لەخۆ دەگرێ و لە هەریەک لە ئاژەڵ و مرۆڤدا خزمەتی مەبەستێکی بایۆلۆژی، یان بایۆلۆژیی دیاریکراو دەکات.

- پراکتیزکردنی هۆمۆسێکسوالیتی لە قۆناغی منداڵی و مێردمنداڵیدا بە شێوەیەکی بەرفراوان ڕوو دەدات. سەراپاگیری ئەو ئەزموونە و بە پلەیەک لە پلەکان دووبارەبوونەوەی لە ژیانی بە نزیکیی زۆرێک لە منداڵ و مێردمنداڵان، دەمانگەیەنێتەوە هەمان بڕوا کە پێشتر گریمانەمان کرد کە دەشێ ئەم دیاردەیە بناغەیەکی بایۆلۆژیی هەبێ، هەروەها دەشێ دیاردەکە خزمەتی مەبەستی بایۆلۆژی و کۆمەڵایەتی و تەنانەت شارستانی بکات لە ژیانی مرۆڤدا.

- بەربڵاوی و ڕوودانی ئەم ئەزموونە هەر لە تەمەنی نەرزەبوونەوە (باڵقبوون) تا کۆتایی تەمەن، بەڵگەیە لەسەر بوونی

ئەنگێزەی مرۆڤایەتیی جووتتوخمی لە مرۆڤدا. دەشێ ئەم ئەنگێزەیە لە ڕووی بایۆلۆژییەوە لێکدانەوەی خۆی هەبێ، تێبینی و توێژینەوەی زانستییش هەن کە بەڵگەن لەسەر ئەوە.

- سێکسکردن تەنیا بە شێوازی هۆمۆسێکسوالیتی و بەدەر لە پەیوەندیی سێکسیی سروشتی لە هەندێک کەسدا، مەسەلەیەکە تا ئێستا نەتوانراوە لێکدانەوەی زانستیی بۆ بکرێ، لەگەڵ ئەوەی چەندەها تیۆری زانستی دیاردەکەیان لێک داوەتەوە. کاتێک توێژینەوەی زانستی بەو ئاڕاستەیەدا کار دەکات کە بناغەی بایۆلۆژیی دیاردەکە بسەلمێنێت، ئەمە مەسەلەیەکی سروشتییە، بەڵام کەمکردنەوەی کاریگەریی فاکتەرەکانی دیکە کە دەشێ ببنە هۆی ڕوودانی ئەم ئەزموونە، کارێکی هەڵەیە. بەم شێوەیە مشتومڕکردن دەربارەی ئەوەی ئایا لە هۆمۆسێکسوالیتیدا چی سروشتییە و چی سروشتی نییە؟ پێویستە بەو ئاڕاستەیەدا نەڕوات مشتومڕەکە لە چوارچێوەی زانست دزە بکات و چواچێوەیەکی دیکە لەخۆ بگرێ کە لەگەڵ زانستدا نەگونجێ، هەرچەندە دەرک بەوە دەکەین کە ئێمە هێشتا لەو ئاست و توانایانە دوورین کە بتوانین بێ ئاماژە کۆمەڵایەتی و مۆراڵییەکان باسی هۆمۆسیکسوالیتی بکەین، لە کاتێکدا ئەم ئاماژانە تا ئێستا لە زۆرێک لە کۆمەڵگەکاندا خزمەتی مەبەستە پۆزەتیڤەکانیان دەکەن.

### هۆمۆسێکسوالیتی لادەر

توێژەران دەربارەی ئەو ڕەفتارانەی بە لادەر دادەنرێن لە مەسەلەی هۆمۆسێکسوالیتیدا ناکۆکن، لە نێوانیاندا ئاڕاستەیەک هەیە هەموو جۆرێک لە ڕەفتار و بەشەکانی هۆمۆسێکسوالیتی بە لادان یان نەشاز یان دژ بەو پەیوەندییە سێکسییەی کە بە سروشتی لە نێوان ژن و پیاودا ڕوو دەدات، بەڵام هەندێ لە توێژەران ئاڕاستەیەکی تەواو پێچەوانەیان هەیە، پێیان وایە ئەم

شێوازە لە سێکس مەسەلەیەکی تەواو سروشتییە و بە لادان دانانرێ، مادام پێویستییەکانی تاک پڕ دەکاتەوە و تاک لەم ڕێیەوە گوزارشت لە وزە و پێویستیی سێکسیی خۆی دەکات بەو شێوەیەی کە دەتوانێت و لەگەڵ کەسێتییدا دەگونجێ. لەوانەیە ڕای دروست بکەوێتە نێوان ئەم دوو ڕایەوە کە هەردووکیان دژ بە یەکن و تا ئاستی زیادەڕەوی لەیەکەوە دوورن. ئەو ڕا دروستەی کە دەڵێین دەکەوێتە نێوان ئەو دوو ئاڕاستە پەڕگیرەوە، هۆموسێکسوالیتی بەپێی دۆخی حاڵەتەکە لێک دەداتەوە. بەم پێیە هۆمۆسێکسوالیتی بەپێی پلە و شێواز و هەروەها هۆکارە پاڵنەرەکان بۆ ڕوودانی پۆلێن دەکات. یەکێک لەو پۆلێنانە کە یارمەتیی توێژەر دەدات بۆ دەستنیشانکردن و بڕیاردان لەسەر ئەوەی کام پەیوەندیی سێکسی بە ڕەفتاری لادەرانە و نەشاز دادەنرێ و کامەش بە سروشتی دادەنرێ، پۆلێنەکەی کنزییەکە بەپێی پێوەرێکی پێنج پلەیی، بەم شێوەیە پۆلێنی کردووە: "پلەی یەکەم، پەیوەندیی سێکسیی سروشتییە، واتە ئەو پەیوەندییە سێکسییەی کە لە نێوان ژن و پیاودا ڕوو دەدات. پلەی دووەم، کاتێک تاک هەمیشە پەیوەندیی سێکسیی سروشتی پراکتیزە دەکات، واتە لەگەڵ توخمە دژەکەی خۆی، بەڵام هەندێ جار لەگەڵ هاوتوخمەکەی خۆیشیدا سێکس دەکات. پلەی سێیەم، کاتێک تاک زۆربەی کات پەیوەندیی سێکسیی سروشتی پراکتیزە دەکات، بەڵام کەمێک لە هەندێ جار زیاتر سێکس لەگەڵ هاوتوخمەکەی خۆیدا دەکات. پلەی چوارەم، تاک بە شێوەیەکی یەکسان پەیوەندیی سێکسیی سروشتی و پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ هاوتوخمەکەی خۆیدا دەکات، پلەی پێنجەم بەوە کۆتایی دێ کە تاک تەنیا و تەنیا لە هەموو کاتێکدا و بە تەواوی، سێکس لەگەڵ هاوتوخمەکەی خۆیدا دەکات. لێکۆڵینەوەکەی کنزی ئاماژە بەوە دەدات، ئەو تاکانەی بە شێوەیەکی تەواو تەنیا سێکس لەگەڵ

هاوتوخمەکەی خۆیاندا دەکەن، ڕێژەیان ٤%ی پێگەیشتووان پێک دێنن. ئەم گرووپە سەرنجی توێژەرانیان بۆ لای خۆیان ڕاکێشا و زۆربەی توێژەران ئەم گرووپە بە کەسانی لادەر لە ڕووی سێکسییەوە وەسف دەکەن، بەڵام ئەمە ئەوە ناگرێتەوە ئەو کەسانەی کە بە ڕێژەیەکی کەمتر هۆمۆسێکسوالیتی پراکتیزە دەکەن و لەگەڵیدا پەیوەندیی سێکسیی سروشتییان هەیە، ئیدی لادەر نەبن، یان تووشی لادان نەبووبن. بڕیاردان لەسەر ئەم بابەتە پێویستە ملکەچی کۆمەڵێک فاکتەری دیکە بێت لە پەیوەندیی سێکسیدا، گرنگترینی ئەو فاکتەرانەش بریتییە لە هێز و تینی ئارەزووی هۆمۆسێکسوالیتی لای ئەو کەسە بە شێوەیەکی گشتی. بە سروشتی حاڵ هۆمۆسێکسوالیتی تەواو یان نیمچە هۆمۆسێکسوالیتی بەزۆری لەگەڵ هەندێک لادانی دیکە پێکەوە گرێدراون، لەبەر ئەوە بڕیاردان لەسەر ئەوەی ئایا ئەو پەیوەندییە هۆمۆسێکسوالیتییە سروشتییە، یان گەیشتووەتە ئاستی لادان، تا ئاستێکی زۆر پشت بە سروشتی ئەو لادانە دەبەستێ کە پێوەی پەیوەستە.

### هۆکارەکانی هۆمۆسێکسوالیتی

توێژەران هەریەکەیان بەپێی بواری پسپۆڕێتییەکەی کۆمەڵێک هۆکاری دیاریکراو بۆ ڕوودانی هۆمۆسێکسوالیتی دەخەنە ڕوو، سەرجەم ئەم هۆکارانە بەزۆری لێکدانەوە بۆ هۆکاری ڕوودانی حاڵەتی هۆمۆسێکسوالیتی و دوورکەوتنەوەی ئەو کەسانە لە پەیوەندیی سروشتی و باو دەکەن، زۆربەی ئەو تیۆرانەی لێکدانەوە بۆ هۆکاری ڕوودانی لادانەکان دەکەن، باس لە هۆمۆسێکسوالیتییش دەکەن، کە بابەتێکی کۆنترە لە پشێویی سێکسی، بوارەکانی کۆمەڵایەتی و پزیشکی و زانستی، زۆرترین ئەو بوارانەن کە بوونەتە هۆی وروووژاندنی بایەخدان بە بابەتی

پشێوییە سێکسییەکان. ئەو تیۆرانەی هۆکارە جیاجیاکانی ئاراستەی هۆمۆسێکسوالیتی لێک دەدەنەوە، دوو بواری سەرەکی لەخۆ دەگرن، یەکەمیان: بواری بایۆلۆژی و دووەمیان: بواری ژینگە و دەوروبەر. لە چوارچێوەی هەر بوارێکیشاندا کۆمەڵێک تیۆر هەن، پوختەکانیان لێرەدا دەخەینە ڕوو.

### تیۆرە بایۆلۆژییەکان

توێژەران لە سەردەمێکدا ئاماژەیان بەوە دا، جینی دیاریکراو، یان تێکچوونی کرۆمۆسۆمەکان وەک باکگراوندی بایۆلۆژی، هۆکارن بۆ ڕوودانی حاڵەتی هۆمۆسێکسوالیتی، بەڵام تا ئێستا هیچ بەڵگەیەکی یەکلاییکەرەوە بۆ سەلماندنی ئەم هۆکارانە لەئارادا نین. هەندێکی دیکە لە توێژەران پێیان وایە ڕەگوڕیشەی هۆمۆسێکسوالیتی لە هۆرمۆنەکاندا خۆی حەشارداوە (بۆ نموونە کەمیی هۆرمۆنی ئەندرۆجین لە نێردا و زۆربوونی لە مێدا)، بە هەمان شێوە هیچ بەڵگەیەک نییە بۆ پشتیوانکردن لەم لێکدانەوەیە، چونکە هەوڵی پزیشکەکان بۆ چارەسەرکردنی ناهاوسەنگی لە دەردانی هۆرمۆنەکان، هیچ کاریگەرییەکی لەسەر گۆڕینی ئاراستەی هۆمۆسێکسوالیتی لەو کەسانەدا نەبووە و چارەسەری هۆرمۆنی نەیتوانیوە ئەو ئاراستەیە بەرەو ڕەوتی سروشتی بەرێ، هەروەها هیچ جیاوازییەکی هۆرمۆنی لە هەردوو توخمی نێر و مێدا لە نێوان ئەو کەسانەدا نییە کە هۆمۆسێکسوالن لەگەڵ ئەو کەسانەی کە پەیوەندیی سێکسیی سروشتییان هەیە، هەندێکیش پێیان وایە، زۆربەی کاریگەریی هۆرمۆنەکان لە قۆناغی کۆرپەلەیی گەشەدا ڕوو دەدات، تا ماوەیەکی کورت لەدوای لەدایکبوونیش بەردەوام دەبێ، ئەمەش دەبێتە باکگراوندی بایۆلۆژی کە ئامادەباشی دەکات بۆ سەرهەڵدانی هۆمۆسێکسوالیتی لە داهاتوودا، ژمارەیەک لە توێژینەوەکان پشتیوانی لەو ڕایە دەکەن. توێژینەوەی دیکەش هەن کە لەسەر گرووپێکی گەورە لە دوانە لە هەردوو توخمەکە ئەنجام

دراون و دەرکەوتووە پەیوەستییەکی تێبینیکراو بە ڕێژەی (0.5-0.6) لە نێوان ئاڕاستەی سێکسی و ڕوخسارەکانی کەسێتییاندا هەیە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بوونی ڕەگەزێکی بۆماوەیی کە بڕیار لەسەر ئاڕاستەکە دەدات، لەم بارەیەوە توێژەران پێیان وایە، بۆماوە نیوەی ئاڕاستەکە ڕووەو هۆمۆسێکسوالیتی پێک دەهێنێ و ژینگە و دەوروبەریش نیوەکەی دیکەی. لەو تیۆرە بایۆلۆژییانەی لێکدانەوە بۆ ئاڕاستەی سێکسیی هۆمۆسێکسوالیتی دەکات، ئەو تیۆرەیە کە پشت بە توێژینەوەکانی زانای ئەڵمانی شلیگل Schlegel (١٩٧٥) دەبەستێ، لە توێژینەوەکانیدا ئەوەی خستە ڕوو کە پەیوەستییەک لە نێوان شێوەی حەوز و مەیلە هۆمۆسێکسوالیتییەکان لە هەردوو توخمەکەدا بە ڕێژەی ٠.٥ هەیە، هەروەها ئەوەشی ئاشکرا کرد، کە جیاوازی گرنگ هەیە لە نێوان شێوەی حەوز لە نێرو مێ-دا و لە ڕووی پلەکانی جیاوازیی نێوان ئەم شێوانەشەوە لە نێر و مێدا، بەیەکداچوونێک هەیە. نێر بە شێوەیەکی گشتی حەوزێکی شێوە ڕەحەتی هەیە، بەڵام مێ حەوزێکی شێوە لوولەیی هەیە. شێوەی کۆتایی حەوزیش لە کاتی لەدایکبووندا بڕیاری لەسەر دەدرێ و بە چەند مانگێک پێش لەدایکبوونیش لەڕێی کاریگەریی هۆرمۆنەکانەوە، ئەو بڕیارە یەکلایی دەبێتەوە. توێژەران بۆیان دەرکەوتووە ئەو نێرەی وەک مێ حەوزێکی شێوە لوولەیی هەیە، وەک مێ ڕەفتار دەکات (واتە توندوتیژی و کۆنترۆڵی کەمە)، هەرچی ئەو مێیانەن کە حەوزی شێوە ڕەحەتییان هەیە وەک نێر، ئەوە وەک نێر هەڵسوکەوت دەکەن. بەگشتی هیچ بەڵگەیەکی یەکلاییکەرەوە بۆ بوونی بناغەی بایۆلۆژیی هۆمۆسێکسوالیتی لەئارادایە نییە، هەرچەندە ئەو تێبینییانەی تا ئێستا لە بەردەستدان، ئاماژە بە ئەگەری گەورەی ئەم بناغەیە دەدەن.

## تیۆرەکانی ژینگە و دەوروبەر

زۆربەی ئەو توێژەرانەی کە لە بواری هۆمۆسێکسوالیتیدا کار دەکەن، لەو باوەڕەدان ڕەگوڕیشەی هۆمۆسێکسوالیتی بۆ قۆناغی منداڵی دەگەڕێتەوە، هەروەها ئەزموونە سێکسییە زووەکانی منداڵ ڕێڕەوی ئاڕاستەی سێکسی منداڵ لە داهاتوودا وێنا دەکەن، بەڵام کۆمەڵێک هۆکار ئەم ڕایە پووچەڵ دەکەنەوە، کە ئەمانەن: یەکەمیان، هۆمۆسێکسوالیتی لەنێو منداڵاندا بەگشتی دیاردەیەکی بڵاوە و یەکەمین ئەزموونی سێکسی ڕاستەقینەیە لە ژیانی ئەواندا، بەڵام لە لای ڕێژەیەکی کەمیان، یان بە لایەنی کەمەوە، کەمترین ڕێژەیان، لە گەورەییدا ڕووەو پراکتیزەکردنی هۆمۆسێکسوالیتیی تەواو یان ئەندەکی ئاڕاستە دەگرن. دووەمین هۆکاری پووچەڵکردنەوەی ئەم ڕایە، ئەوەیە لە لێکۆڵینەوەیەکدا دەربارەی ژیانی سێکسی لای دانیشتوانی کەنداوی خۆرهەڵات، وەک پێشتریش ئاماژەمان پێدا، زۆربەی زۆری منداڵان ئەگەر نەڵێین هەموویان، بەر لە نەرزەبوون(باڵقبوون) و هەرزەکاری، هۆمۆسێکسوالیتی پراکتیزە دەکەن، بەڵام زۆر بەدەگمەن لەدوای هاوسەرێتی ئەنجامی دەدەن.

هەموو ئەو شتانەی لەسەر پەیوەندیی سێکسیی ڕاستەقینە جێبەجێ دەبن، لەسەر گەمەی سێکسیش جێبەجێ دەبن، هەموو جۆرەکانی گەمەی سێکسی لە قۆناغی منداڵی و مێردمنداڵیدا هیچ کاریگەرییەکیان نابێ بۆ سەر ڕوودانی هۆمۆسێکسوالیتی، یان ڕوودانی لە دواڕۆژدا.

یەکێک لە گرنگترین ئەو تیۆرانەی هۆکاری ڕوودانی هۆمۆسێکسوالیتی لێک دەداتەوە، تیۆری ژینگە و دەوروبەرە، کە پێی وایە ڕەگوڕیشەی هۆمۆسێکسوالیتی بۆ سروشتی ئەو پەیوەندییە دەگەڕێتەوە کە لە نێوان منداڵ یان مێردمنداڵ و باوانیدا هەیە، بەتایبەتی دایک. ئەم ئاڕاستەی بیرکردنەوەیە لەگەڵ تیۆری

دەروونشیکاریی فرۆیددا دەگونجێ، بەپێی ئەم تیۆرە هۆمۆسێکسوالیتی بۆ دروستبوونی پەیوەندییەکی ئاڵۆز دەگەڕێتەوە لە نێوان کردارە بایۆلۆژییەکانی گەشە و ئەزموونەکانی ژیاندا. لەم بارەیەوە فرۆید پێی وایە، منداڵی لەدایکبوو، ئاراستەیەکی سێکسیی دوانیی هەیە و هەست بە چێژ دەکات بەرامبەر هەر جۆرێکی وورووژان و لە هەر سەرچاوەیەکەوە بێ، هەروەها پێی وایە هۆمۆسێکسوالیتی بریتییە لە جێگیربوونی تاک لەسەر قۆناغێکی گەشەی سێکسیی دەروونی کە بریتییە لە قۆناغی زارەکی. پاڵنەری ئەم جێگیربوونەش بۆ کاریگەریی ئەو دایکە دەگەڕێتەوە کە سروشتێکی دەسەڵاتداریی هەیە و پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ کوڕەکەیدا هەیە و هانی دەدات بۆ ڕەتکردنەوەی باوکی و ڕەتکردنەوەی ڕۆڵی وەک پیاوێک لە ژیانیدا. لەوە دەچێ فرۆید خۆی ئەوەندە بڕوای بەم لێکدانەوە شیکارییە نەبووبێ، هەر بۆیە هۆشداریی داوە دەربارەی ئەگەری بوونی فاکتەری دیکە، بە فاکتەری بایۆلۆژیشەوە. لەو تیۆرانەی ژینگە و دەورووبەر کە لە لێکدانەوەی هۆمۆسێکسوالیتیدا بە هەند وەردەگرێ، ئەو تیۆرەیە کە ڕوانگەی کۆمەڵایەتیی بەرامبەر منداڵ یان مێردمنداڵی گەشەکردوو کار دەکاتە سەر دروستبوونی ناسنامەی توخمی و دروستیشی دەکات، ئەم ناسنامەیەش دەبێتە بناغەی ناسنامەی سێکسیی تاک لە داهاتوودا، هەروەها ڕازیبوون و هاندان یان ڕەتکردنەوە و ڕەخنەی خێزان بەتایبەتی بەرامبەر بە ڕەفتاری سێکسی منداڵ، کاریگەریی دەبێ بۆ سەر ناسنامەی سێکسی تاک. هەندێک لەو لێکۆڵینەوانەی کە لەسەر خێزان ئەنجام دراون، ئاماژە بەوە دەدەن، سێ بەشی ئەو کەسانەی پەیوەندیی سێکسیی سروشتییان هەیە (واتە ٣٠%)، هەروەها زیاتر لە سێ بەشی (واتە ٤٠%)ی ئەوانەی کە پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتییان هەیە، دایکیان لەو جۆرانە بووە کە

دەسەڵاتدار بووە و لە کوڕەکانییەوە زۆر نزیک بووە، باوکی ئەم کەسانەش لەو جۆرانە بووە کە زاڵم بووە و بەردەوام داواکاریی منداڵەکانی ڕەت کردووەتەوە و هەمیشە لێیانەوە دووربووە، واتە منداڵ لەم خێزانەدا لە دایکەوە نزیکتر بووە وەک لە باوکەوە. ئەم لێکۆڵینەوەیە بایەخ بە باکگراوندی خێزانی لە دروستبوونی هۆمۆسێکسوالیتیدا دەدات، تەنانەت ئەگەر بە شێوەیەکی ئەندەکێش بێت، بەڵام ئەم جۆرە باکگراوندە پشێوە لە دۆخی خێزانیدا، لەوانەیە پێویست نەبێ یان بەشی ئەوە نەکات ببێتە تەنیا هۆکار بۆ ئەنجامدانی پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتی لە ئایندەی منداڵ یان مێردمنداڵدا.

لە تیۆرەکانی دیکەی ژینگە و دەوروبەر، ئەو تیۆرەیە کە پێی وایە هۆمۆسێکسوالیتی بەهۆی ئەزموونەکانی ژیانی ڕۆژانەوە ڕوو دەدات کە دەبنە بەشێک لە مۆرک لەو منداڵ یان مێردمنداڵەدا، لەو ئەزموونانەی ئەم کاریگەرییە لەسەر ڕەفتاری منداڵ دروست دەکەن، بریتییە لە نواندنی ڕەفتاری کچانە لە لایەن کوڕەوە، بۆ نموونە وەک کچ خۆی دەگۆڕێ و بە موتومووری کچانە خۆی دەڕازێنێتەوە و یاریی کچانە دەکات و لەگەڵ کچانیشدا یاری دەکات لەجیاتی ئەوەی لەگەڵ کوڕاندا یاری بکات، کاتێک نواندنی ئەم ڕەفتارانە هاوکات دەبێ لەگەڵ هاندانی باوان، بەتایبەتی دایک بۆ بەردەوامبوون لەسەر ئەم ڕەفتارانە، لە گەورەییدا ئەگەری ئەوەی هەیە ئەو کوڕە ببێتە هۆمۆسێکسوال. لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە چاودێریی ٢٧ منداڵ کرا (لە ڕەفتاردا نێرەمووک بوون، واتە هۆمۆسێکسوال)، دەرکەوت ٤٠. ٥٠% یان لە گەورەییدا هۆمۆسێکسوالیتییان پراکتیزە کردووە، یان تووشی لادانی سێکسیی لەبەرکردنی پۆشاکی توخمەکەی دیکە بوون، واتە Transvestisme یان ناسنامەی سێکسی پێچەوانەیان هەبووە، واتە transexeual (مونی و گرین ١٩٧٤). لێکۆڵینەوەکان ئاماژە

بەوە دەدەن، ماستەربەیشن بە گرنگترین سەرچاوەکانی مۆرکوەرگرتن ڕووەو نواندنی ڕەفتاری هۆمۆسێکسوالیتی دادەنرێ، چونکە خەیاڵە لەپێشینە و هاوکاتەکانی ماستەربەیشن بەزۆری بریتین لە خەیاڵی هۆمۆسێکسوالیتی کە بە سروشتی حاڵ تاک هەست بە ورووژان و چێژ و ڕازیبوون دەکات لە کاتی ئەنجامدانیدا. ئەم هەستە کاتێک دووبارە دەبێتەوە، جۆرێک لە خووپێوەگرتنی کلاسیکی دروست دەکات. کنزی (١٩٤٨) بۆی دەرکەوتووە یەکەمین سەرچاوەی ئۆرگازم لای ٧٠%ی ئەو کەسانەی هۆمۆسێکسوالن، بریتییە لە ماستەربەیشن، ئەم ڕێژەیە بەرامبەر ٥٠%ی ئەو کەسانەیە کە پەیوەندیی سێکسیی سروشتییان هەیە، سەرباری پێویستیی بوونی فاکتەری خەیاڵ لە ماستەربەیشندا تا حاڵەتی ڕاهاتن لەسەر ڕەفتاری هۆمۆسێکسوالیتی دروست ببێ، فاکتەرێکی دیکە هەیە کە بریتییە لە هەڵوێستی هاوڕێ و هاوتەمەنەکانی منداڵ، ئایا ڕەفتاری ماستەربەیشن قبوڵ دەکەن و تەنانەت هاوبەشی دەکەن لەگەڵیدا، یان ڕەتی دەکەنەوە. ئەم هەڵوێستە دەشێ بڕیار لە ڕەفتاری ئەو منداڵە یان مێردمنداڵە بدات لە داهاتوودا. تیۆرەکانی مۆرکوەرگرتن، یان خووپێوەگرتن لە لێکدانەوەی هۆکاری سەرهەڵدانی هۆمۆسێکسوالیتی لە زۆرێک لە کۆڕە زانستییەکاندا ڕەواجی هەبوو، بەتایبەتی لە بواری چارەسەرکردنی ئەم ئاڕاستە یان لادانە سێکسییە و لادانەکانی دیکەدا، ئەو چارەسەرانەی کە پشتیان بەم تیۆرانە دەبەست زۆر بەسوود و کاریگەر بوون. هامپسۆن hampson (١٩٦٣) دەربارەی پشتبەستن بە تیۆرە کۆمەڵایەتییەکان لە لێکدانەوەی هۆمۆسێکسوالیتیدا، دەڵێ: 'لەجیاتی ئەو تیۆرەی کە فرۆید پێشکەشی کردووە دەربارەی ئامادەباشیی زگماکیی پێکهاتەی دەروونی ڕووەو هۆمۆسێکسوالیتی، ئێمە ئەو تیۆرە بە بیرۆکەیەکی دیکە دەگۆڕین کە بریتییە لە بێلایەنیی

سێکسیی دەروونی لە مرۆڤدا لە کاتی لەدایکبووندا. ئەم بێلایەنییە ڕێگە دەدات بە گەشە و بەردەوامیی ئاراستەکردن ڕووەو شێوازی جیاجیا لە ئاراستەو ئەنجامدانی سێکسی دەروونی، بەپێی ئەو ئەزموونانەی تاک لە ژیاندا ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، یان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات".

پوختەی توێژینەوەکان دەربارەی هۆکارەکانی ڕوودانی هۆمۆسێکسوالیتی ئاماژە بەوە دەدەن، تا ئاستێکی زۆر فاکتەرەکانی ژینگە و دەوروبەر، بەتایبەتی لە چوارچێوەی خێزاندا، کاریگەرییان هەیە بۆ سەر دروستبوونی ئاراستەی هۆمۆسێکسوالیتی لە تاکدا، لەو فاکتەرە خێزانییانەش وەک: پەیوەندیی تاک بە باوانەوە، ئاستی هاندانی باوان لەسەر وەرگرتنی ناسنامەیەکی سێکسیی دیاریکراو، ئاستی لێبوردەیی و ڕێگەدانیان بەو ڕەفتارە سێکسییانەی کە منداڵ یان مێردمنداڵ دەیاننوێنێ و هەروەها سروشتی خەیاڵەکانی منداڵ کە هاوکاتن لەگەڵ ماستەربەیشندا، بەڵام ئەو فاکتەرانەی تایبەتن بە ژینگەوە هەموویان یان بەشێکیان پێویستیان بە هاوکاریی فاکتەری بایۆلۆژییە، ئیدی ئەو فاکتەرە بایۆلۆژییانە بۆماوەیی بن یان هۆرمۆنی بن کە کاریگەرییان هەر لە سەرەتای دروستبوونی کۆرپەلەوە، یان سەرەتایەکی زووی گەشەدا، دەردەکەون و دەبنە بناغە بۆ کاریگەریی فاکتەرە ژینگەییە وەرگیراوەکان لە ماوەی ژیاندا. کۆپەرCooper تیۆرە هۆکارییەکانی بەم شێوەیەی کورت کردووەتەوە: "بۆماوە و کارتێکەرە هۆرمۆنییەکان، دەشێ ببنە هاندەر بۆ هەستیاربوونی تاک بەرامبەر بە ژینگە (واتە ژینگەی هۆمۆسێکسوالیتی)، بەتایبەتی لەو کاتانەدا کە دایک بە زەبر و دەسەڵاتدارە و زیاد لە پێویست مشورخۆرەیان توانای فریودانی منداڵی هەیە، ئەم ڕوخسارانە، ڕوخساری دیارن لە زۆربەی حاڵەتەکانی هۆمۆسێکسوالیتیدا"

## هۆمۆسێکسوالیتی و یاسا

خستنەڕووی گۆشەنیگا یاساییە جیاوازەکان دەربارەی هۆمۆسێکسوالیتی، کارێکی ئەستەمە، تەنانەت خستنەڕووی پوختەی ئەو گۆشەنیگایانەش ئاسان نییە، ئەویش بەهۆی ژمارەی زۆری کۆمەڵگە و شارستانییەت و ئایینە دێرین و نوێیەکان، سەرباری گۆشەنیگا و ڕا و حوکمی جیاجیا دەربارەی چۆنێتیی پراکتیزەکردنی ئەم جۆرە لە پەیوەندیی سێکسی، وێڕای ئەم هۆکارە زۆرانە، گۆشەنیگا کۆمەڵایەتی و ئایینی و یاساییەکان بە درێژایی مێژوو، گۆڕان و پەرەسەندنیان بەخۆوە بینیوە، بەتایبەتی لە سەردەمی نوێدا، هەروەها جیاوازی هەیە لە حوکمدان بەسەر پراکتیزکردنی هۆمۆسێکسوالیتی لە نێر و مێدا، هەروەها لە منداڵ و مێردمنداڵ و هەرزەکار و ژن و پیاوی پێگەیشتوودا، هەروەها حوکمی دیکە هەیە کە جیاوازە بەپێی ئەو پشێوی و لادانانەی دیکە کە لە کەسێتی و ڕەفتاری ئەو تاکەدا ڕوو دەدەن و هاوکاتن لەگەڵ ڕەفتاری هۆمۆسێکسوالیتی، هەروەها خستنەڕووی کاروانی حوکمە جیاجیاکان لە بوارە جیاوازەکان، لە بواری کۆمەڵایەتی و ئایینی و یاساییدا ئاماژە بەوە دەدەن، ڕوانین لە ڕەفتاری هۆمۆسێکسوالیتی لە سەدەی بیستدا بە ئاڕاستەی تێگەیشتن لەم پەیوەندییە ڕۆیشتووە، هۆمۆسێکسوالیتی وەک لادانێکی نەخۆشی تەماشا کرا کە وا پێویست دەکات چارەسەر بکرێ، نەک حوکم بەسەریدا بدرێ، یان وەک مافێکی سروشتی تەماشا بکرێ مادام زیان بەکەس ناگەیەنێ، یان کاریگەریی خراپی بۆ سەر هەستی کۆمەڵایەتی نابێ و بە ڕازیبوونی هەردوو لا پێکەوە بەڕێوە دەچێ. هەرچەندە ئەم گۆڕانە لە ڕوانین بۆ هۆمۆسێکسوالیتی ڕووی داوە، بەڵام تا ئێستا لە زۆربەی وڵاتاندا کار بەو یاسایە دەکرێ کە ئەم سێکسە ڕەت دەکاتەوە و ئەنجامدەرانیشی سزا

دەدات. لێرەدا هەندێک یاسای تەشریعی دەربارەی هۆمۆسێکسوالیتی دەخەینە ڕوو:

یەکەم: هەرسێ ئایینە ئاسمانییەکە، هۆمۆسێکسوالیتییان ڕەت کردووەتەوە و حەرامیان کردووە و بە دەرچوون لە سونەتی خوا و شێوازی سروشتی ژیانی سێکسیی مرۆڤایەتی دایانناوە، واتە ئەو پەیوەندییە سروشتییەی کە لە نێوان نێرومێدا هەیە. تا ئێستا بنەماکانی ئەم ئایینانە کاریگەریی دیاریان هەیە بۆ سەر ئاڕاستەکردنی حوکمی کۆمەڵایەتی و حوکمە یاساییەکان لە زۆربەی وڵاتان و شارستانییە هاوچەرخەکاندا، بەڵام ئەم کاریگەرییە و ئاستی جێبەجێکردنی بە شێوەیەکی پراکتیکی پشت بە ئاستی هاتنەناوەوەی ئەم ئایینانە دەبەستێ بۆ ناو کۆمەڵگە، بۆ نموونە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، لە شارستانییەتی مەسیحدا نێربازی حەرام کراوە و تا ئاستی حوکمدانی مردن بەسەر ئەنجامدەرانیدا ڕەت کراوەتەوە، لەم بارەیەوە پشت بە یاسای ئینگلیزی بەستراوە کە هێنریی هەشتەم ساڵی ١٥٣٣ دایڕشتووە، بەم پێیە، هۆمۆسێکسوالیتی بە هەموو جۆرەکانییەوە، نێر و نێر، مێ و مێ، هەروەها مرۆڤ و ئاژەڵ، بە هەموو شێوەیەک ڕەتکراوەتەوە و سزاکەی لەسێدارەدانە. ئەم گۆشەنیگا یاساییە توندە بە درێژایی سەدەی نۆزدەهەم بەردەوام بوو، لە ساڵی (١٨١١)دا، ویلیەم بلاکستۆنی یاسادانەر هەڵوێستی خۆی بەرامبەر بە هۆمۆسێکسوالیتی بەو شێوەیە دەربڕی کە تەنیا ناوهێنانی ئەم ڕەفتارە بە پیسکردنی سروشتی مرۆڤایەتی دادەنرێ. لە کۆتایی هەمان سەدەدا و بە دیاریکراوی لە ساڵی ١٨٩٥دا سەرگۆن بریجزی قازی لە دادگاییکردنی نووسەری بەناوبانگ "ئۆسکار وایلد" ڕایەکی هاوشێوەی ڕایەی ویلیەمی هەبووە و دەڵێ: "هیچ تاوانێک لەمە گەورەتر نییە کە تاوانباری پێ تۆمەتبار کراوە"، پاشان حوکمی زیندانیکردنی بەسەر ئەم نووسەردا سەپاند کە

بەوە تۆمەتبار کرابوو پەیوەندیی سێکسیی لەگەڵ لۆرد ئالفرید دۆگلاسدا هەبووە، ئەمە لەگەڵ ئەوەشدا کە ئۆسکار وایلد لەو سەردەم و ڕۆژگارەی خۆیدا ناو و ناوبانگێکی دیاری هەبوو.

دووەم: یاساش هەر بەو چاوە ڕەتکراوەیە لە هۆمۆسێکسوالیتی دەڕوانێ کە کۆمەڵگە لێی دەڕوانێ و سزادانی ئەنجامدەرانی بە پێویست دادەنێ، بەڵام دادگاییکردنی ئۆسکار وایلد و دادگاییە هاوشێوەکانی دیکە، بوونە مایەی بزاواندنی ئەم ڕوانینە ڕووەو چاکسازیکردن لە گۆشەنیگای کۆمەڵایەتی و یاسایی بەرامبەر بەم شێوازە لە سێکس. بزاواندنی یەکەم لە بواری نۆژداریدا ڕووی دا، ئەم بزاواندنە لەسەر ئەو بناغەیە بنیاد نرا کە وەک حاڵەتێکی نەخۆشی، نەک مۆراڵی تەماشای هۆمۆسێکسوالیتی کرا کە وا باشترە چارەسەر بکرێ. ڕەگوڕیشەی ئەم بزواندنە بۆ ئەو توێژینەوە یەک بەدوای یەکانە دەگەڕێتەوە کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا ئەنجام دران، کە زۆربەیان بەو ئاڕاستەیەدا ڕۆیشتن، تاکی هۆمۆسێکسوال کەسێکی ناچارە، نەک هەڵبژێرەر، هەروەها لادانەکەی لە دەستی خۆیدا نییە و لە سەروو ئیرادەی خۆیەتی، لەبەر ئەوە بەرپرس نییە لەو حەز و مەیلە سێکسییانەی کە لە ناخیدا هەن. هەرچی بزواندنی دووەمە لە بواری کۆمەڵایەتیدا ڕووی دا، کە ڕێکخراوێک بۆ چاکسازیکردن لە یاسای هۆمۆسێکسوالیتیدا لەژێر هەمان ناودا لە ساڵی ١٩٥٨دا دامەزرا. ئەم ڕێکخراوە بانگەشەی ئەوەی دەکرد ئەو یاسایەی کە سەبارەت بەم شێوازە لە سێکس مامەڵەی پێ دەکرێ، لەگەڵ ڕای سەربەست و ئایینی مەسیحیدا ناگونجێ، داوای چاکسازیی لەم یاسایەدا کرد، لەبەر ئەم پێویستییانە: عەدالەت، ئاسایش، تەندروستیی گشتی. لەڕێی هەوڵ و کۆششی هەردوو بزاوتەکە (واتە بواری کۆمەڵایەتی و بواری نۆژداری)، بەتایبەتی ماندووبوونی ڕێکخراوی چاکسازیکردن لە یاسای

هۆمۆسێکسوالیتیدا، ساڵی ١٩٦٧ یاسایەکی نوێ داڕێژرا، بەو پێیە، ڕێگە لە پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتی نەگیرا لەو کەسانەدا کە تەمەنیان سەروو ٢١ ساڵە، بەڵام یاساکە بە توندی ئەم پەیوەندییەی لە خوار ئەم تەمەنەوە و هەروەها ئەنجامدانی بە ئاشکرا، ڕەت کردەوە. بەپێی ئەم یاسا نوێیە پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتی بە تاوان دانانرێ ئەگەر لە نێوان دوو کەسدا بە نهێنی ئەنجام درا بەو مەرجەی تەمەنیان سەروو ٢١ ساڵ بێ، بەدەر لەم مەرجانە، یاساکە هۆمۆسێکسوالیتیی ڕەت کردەوە، هەروەها هەموو ئەو ڕەفتارانەشی ڕەت کردەوە کە دەشێت ئاماژە بن بۆ ئەم جۆرە سێکسە، وەک هەندێ دۆخی جەستەیی کە ئاماژەن بۆ ئەم پەیوەندییە، یان بە ئاشکرا ئاماژەدان و هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی لە شوێنی گشتیدا و نواندنی ئەو ڕەفتارانەی کە دژ بە مۆراڵن. ئەم گۆڕانکارییانە کە لە ئینگلتەرا ڕوویان دا، لە گەلێک وڵاتانی دیکەی ئەورووپاشدا لە شەستەکاندا ڕوویان دا، شەپۆلێک لە ئاسانکاری لە بواری چاکسازیکردنی کۆمەڵێک یاسا بەڕێوە چوو، وەک یاسای لەسێدارەدان، لەباربردنی منداڵ و هۆمۆسێکسوالیتی. تەنیا ئاوارتە لەم شەپۆلی ئەم چاکسازییەدا فەڕەنسا بوو کە بە حوکمی دیگۆلییەوە[٧] پابەند بوو، توندوتیژ بوو دەربارەی کارکردن بەم یاسایانە لەجیاتی ڕێگەدان پێیان. لە ئەمەریکاش تا ئێستا هەمان یاسای توند کاری پێ دەکرێ،[٨] هەرچەندە لە نێوان ویلایەتەکاندا جیاوازیی گەورە هەیە، بۆ نموونە لە ویلایەتی نیۆیۆرک کار کراوە بۆ هێورکردنەوەی سزای یاسایی بەرامبەر بە هۆمۆسێکسوالیتی و بە ڕەفتاری بەد، یان خراپ دانراوە، بەڵام لە ویلایەتی کالیفۆرنیا سزاکان بەرامبەری توندکراو و زیندانیکردنی ئەنجامدەرانی لە ١٠ ساڵەوە بۆ ٢٠ ساڵ زیاد کراوە.

## هۆمۆسێکسوالیتیی شاراوە

پێناسەکردنی هۆمۆسێکسوالیتی لە بواری نۆژداریی دەروونیدا، سەرجەم حاڵەتەکانی هۆمۆسێکسوالیتی دەگرێتەوە، واتە کاتێک دەوترێ هۆمۆسێکسوالیتی، تەنیا ئاماژە نییە بۆ ئەنجامدانی ئەو شێوازە لە سێکس بە شێوەیەکی پراکتیکی. بەهۆی ئەم ڕوانگە نۆژدارییەوە، هۆمۆسێکسوالیتی بە هاومانای زاراوەی (پشێوی لە ئاڕاستەی سێکسیدا) دادەنرێ، کە ئەم پشێوییە تەنیا لە ڕەفتاری سێکسی ڕاستەقینەدا ڕوو نادات، بەڵکو پاڵنەرە سێکسییەکانیش دەگرێتەوە، بەڵام ئەم نزیککردنەوەیە لەوانەیە ڕوو نەدات، یان ئاشکرا دەرنەکەوێ، چونکە دەشێ تاک خەیاڵ لە هۆمۆسێکسوالیتی بکاتەوە، یان خەونی پێوە ببینێ، یان بیری لێ بکاتەوە، یان حەز بکات ئەو جۆرە سێکسە بکات، بێ ئەوەی بەڕاستی بیکات، تەنانەت ئەگەر بوار بۆ ئەنجامدانیشی بڕەخسێ. بەهۆی ئەم تێڕوانینەوە، دەشێ بوار بۆ حاڵەتی هۆمۆسێکسوالیتیی شاراوە یان ناپراکتیکی بڕەخسێ، کە لەم دۆخانەدا تاک تەنیا لە سنووری بیرکردنەوە، یان ئارەزووکردندا دەوەستێ. هەندێکیش پێیان وایە هۆمۆسێکسوالیتیی شاراوە تەنیا بیرکردنەوە، یان ئارەزووکردنی تاک لە باری هەستی یان هۆشیاریدا ناگرێتەوە، بەڵکو ئەو حاڵەتانەی گوزارشتیش دەگرێتەوە کە تاک خۆی هەست بەو ئامادەباشییە بۆ ئەم شێوە سێکسە ناکات و بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ گوزارشتی لێ دەکات، واتە ئەنگێزەی هۆمۆسێکسوالیتی لەو کەسەدا بۆ ڕوخساریی ڕەفتاری مێیەتی دەگۆڕێ کە لە هەڵسوکەوت و کارکردنی هونەری و بوارەکانی دیکەی ژیاندا دەردەکەوێ.

## هۆمۆسێکسوالیتی و داهێنان

مایەی سەرنج و تێبینیکردنە، پراکتیزەکردنی هۆمۆسێکسوالیتی بە شێوەیەک یان پلەیەک لە پلەکان لە بواری هونەر و داهێناندا زۆر دەبینرێ. بە تەواوەتی ئەوەش نازانرێ ئایا هۆکاری ئەمە بۆ بناغەی بایۆلۆژی دەگەڕێتەوە کە لە پشت هەردوو ئاراستەی سێکسی و داهێناندا هەیە، یان سروشتی ژیانی هەندێ لە داهێنەران بووەتە یارمەتیدەر لە سەرهەڵدانی ئەم جۆرە ڕەفتارە سێکسییە، لەگەڵ ئەوەشدا کە دیاریکردنی ڕێژەی دروستی ڕوودانی هۆمۆسێکسوالیتی لەنێو داهێنەراندا کارێکی ئەستەمە، بەڵام ژمارەیەکی زۆر لە داهێنەران لە بوارە جیاوازەکان بەوە ناسراون کە ئەنگێزەی هۆمۆسێکسوالیتییان هەبووە، بۆ نموونە نیگارکێش و پەیکەرساز مایکل ئەنجلۆ، لیۆناردۆ دافنشی، هەروەها چایکۆڤسکیی میوزیکژەن، واگنەر، فلۆبێر، ئۆسکار وایلد، سۆمەرست موم، مارسل پرۆست، ئاندریە ژید و جین کۆکتو کە نووسەر بوون، لەگەڵ فیرلان-ی شاعیر و چەندەها داهێنەری دیکەدا کە لە ژیانیاندا بەزۆری یان تەنیا هۆمۆسێکسوالیتییان پراکتیزە کردووە. بێگومان ناتوانین کاریگەریی ئەم پراکتیزەکردنە سێکسییە لەسەر کار و بەرهەمی داهێنەرانی ئەم هونەرمەند و نووسەرانە دیاری بکەین، بەڵام هەندێک تیۆر هەن توانای داهێنانی ژمارەیەک لە داهێنەران بۆ بوونی ئەو ئەنگێزە هۆمۆسێکسوالیتییە دەگەڕێننەوە کە هەیانبووە، بۆ نموونە وەسفکردنی وردی هەست و سۆزی مێ لە لایەن فلۆبێرەوە لە ڕۆمانی مەدام بۆڤاریدا بۆ بوونی حەز و مەیلی جووتتوخمی دەگەڕێننەوە لەودا. توێژەر لەم بوارەدا دەتوانێ لەڕێی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە لەسەر بەرهەمە داهێنەرەکانی داهێنەران لای ژمارەیەک لە داهێنەرانی جیهانی، تیۆرەکەی دابڕژێ و بگاتە ئەنجامی کۆتایی.[٩]

## هۆمۆسێکسوالیتی و نەخۆشی

زانست بەتایبەتی بواری نۆژداری بەو ئاڕاستەیەدا ڕۆیشتووە کە پراکتیزەکردنی هۆمۆسێکسوالیتیی بە لادان داناوە و پێی وایە ئەم لادانەش دەبێتە هۆی نەخۆشی. ئەم بۆچوونە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەوە دەستی پێ کرد، بەردەوام بوو تا سەرهەڵدانی تیۆرەکانی دەروونشیکاریش کە زۆربەی زۆری نەخۆشییە دەروونییەکانی بۆ ئەزموونە سێکسییەکانی منداڵی گەڕاندەوە، تەنانەت نەخۆشییە ئەقڵییەکانیش وەک شیزۆفرینیا و پارانۆیا لە سەردەمێکدا بڕوا وا بوو کە بەهۆی چەپاندنی پاڵنەر یان یادەوەرییەکانی ئەنجامدانی ڕەفتاری هۆمۆسێکسوالیتییەوە ڕوو دەدەن، هەر لەو کات و سەردەمەدا ئەم بۆچوون و تێڕوانینانە دەربارەی هۆمۆسێکسوالیتی لەجیاتی ئەوەی لە ڕووی مۆرالییەوە سووکایەتییان پێ بکرێ، توانجیان لە توانا دەروونی و ئەقڵییەکانیان دەدا، بەم شێوەیە بواری نۆژداری کاتێ لە سیفەتێکی خراپ و سووک لە ڕووی مۆرالییەوە ئازادی کردن، سیفەتێکی دیکەی خستە پاڵیان و بە وەسفکردنیان بە نەخۆش لە ڕووی دەروونی و ئەقڵییەوە، سووکایەتیی پێ کردن، لەگەڵ ئەوەشدا کە بواری نۆژداری تا ئێستا ڕەفتاری هۆمۆسێکسوالیتی لەسەر بناغەی پشێوی لە گەشەی دەروونی و سێکسیدا لێک دەداتەوە، بەڵام جۆرێک لە بزاوتن بەرامبەر بە زۆرێک لە ڕەفتارە سێکسییەکان هەستی پێ دەکرێ، بە ڕەفتاری هۆمۆسێکسوالیتیشەوە، بە گۆشەنیگایەکی بەرفراوانتر لە ڕابردوو لەم بابەتانە دەڕوانرێ و وەک شێوازی جیاجیا لە پەیوەندیی سێکسی لە ژیانی مرۆڤایەتیدا قبوڵ دەکرێ، بێ ئەوەی بە نەخۆشی یان لادان دابنرێ. هەرچەندە لە ئێستادا جۆرێ لە تێگەیشتن هەیە، بەڵام تا ئێستا لە هەندێ حاڵەتدا وا پێویست دەکات بواری نۆژداری دەرک بەو پاڵنەرانە بکات کە لەو تاکانەدا

هەیە بێ ئەوەی ناچاربن، بە تەواوەتی یان بەزۆری پەیوەندیی سێکسییان لەگەڵ هاوتوخمەکانیاندا هەیە و حەزیان لە توخمە دژەکەی خۆیان نییە، بەڵام ئەو حاڵەتانەی لەنێو هۆمۆسێکسواڵەکاندا پێویستییان بە چاودێریی پزیشکی هەیە زۆرینە نین، بەزۆری ئەو حاڵەتانە پێویستیان بەم چاودێرییە هەیە، ئەوانەن کە بەدەست توندیی ئاڕاستەی سێکسییانەوە دەناڵێنن و دەیانەوێ ڕزگاریان ببێ. هەرچەندە هۆمۆسێکسوالیتی بە نەخۆشییەکی ئەقڵی دانانرێ، بەڵام هەندێ لەو کەسانەی کە ئەنجامی دەدەن و بە تەنیا شێواز یان دڵخوازی خۆیانی دادەنێن، بەهانەی ئەوە دێننەوە کە ئەوان سروشتی نین. ئەو کەسانەی هۆمۆسێکسواڵن، پشێویی دەروونیی دیکەیان هەیە، ئیدی ئەو پشێوییانەی دەشێ دەرئەنجامی ئەنجامدانی ئەو ڕەفتارە سێکسییانەوە ڕوو بدەن، وەک خەمۆکی و بیرۆکەی ناچارکەر، یان دەشێ ئەو پشێوییانە پەیوەندییان بە ڕەگوڕیشەی دروستبوونی ڕەفتاری هۆمۆسێکسوالیتی یان لادانە سێکسییەکانی دیکەوە هەبێ، هەروەها لەوانەیە هۆمۆسێکسوالیتی بە پشێوییەکانی کەسێتیشەوە پەیوەست بێ، بەتایبەتی لە کەسێتیی جۆری سایکۆپاتی یان هستیری، هەروەها دەشێ پەیوەندیی بە هەندێ نەخۆشیی ئەقڵیی وەک شیزۆفرینیاوە هەبێ، کە دەشێ نەخۆش لە کاتی سەرهەڵدانەوەی نەخۆشییەکەیدا بۆ قۆناغی هۆمۆسێکسوالیتی بگەڕێتەوە، هەروەها هۆمۆسێکسواڵ لەوانەیە هەندێ دەرمان و کهول و ماددەی بێهۆشکەریش بخوات، هەرچەندە دەشێ هۆکاری پەنابردنی هۆمۆسێکسواڵ بۆ ئەم ماددانە بۆ ئەو دڵەڕاوکێ و خەمۆکییە بگەڕێتەوە کە بەهۆی ڕەفتاری سێکسییانەوە تووشی دەبن، بەڵام هۆکارێکی دیکەی پەنابردن بۆ ئەو دەرمانانە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە

هۆمۆسێکسوال زۆرجار پەیوەندی بەو گرووپ و کۆمەڵانەوە دەکات کە ئاسانکاری بۆ خواردنی ئەم ماددە و دەرمانانە دەکەن.

هەندێ بڕوایان وایە کە هۆمۆسێکسوالیتی ئاماژەیە بۆ نزمیی ئاستی ئەقڵیی ئەو کەسانەی کە ئەنجامی دەدەن، بەڵام ئەم بۆچوونە لە چوارچێوەی چەمکی مۆرالیدایە و لە چەمکی نۆژداریدا هیچ جێگەیەکی نییە. بەزۆری هۆمۆسێکسوالەکان لە ژیانی کۆمەڵایەتی و پیشەییاندا بە شێوەیەکی سروشتی هەڵسوکەوت دەکەن، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا، هیچ خەسڵەت یان شتێکی ئەوتۆیان نییە کە لە خەڵکانی دیکە جیایان بکاتەوە، پاشان زۆریی ژمارەی کەسانی داهێنەر لە بوارە جیاوازەکاندا کە هۆمۆسێکسوالن، ئەو بۆچوونە بەتاڵ دەکاتەوە کە پێی وایە وزەی ئەقڵیی ئەم کەسانە لە ئاستێکی نزمدا بێ.

### بکەر و وەرگر لە هۆمۆسێکسوالیتیدا

هەندێ کەسانی هۆمۆسێکسوال لە هەموو پەیوەندییەکی سێکسیدا ڕۆڵی بکەر دەبینن، بەڵام هەندێکی دیکەیان ڕۆڵی وەرگر یان پێشوازیکەر دەبینن، دیاریکردنی ئەم ڕۆڵانە پشت بە بارودۆخی ژیانی تایبەتی دەبەستێ کە ئاسانکاری دەکات بۆ ئەو کەسە لەو پەیوەندییەدا ئەو ڕۆڵە ببینێ، یان هانی دەدات یان ناچاری دەکات ئەو ڕۆڵە ببینێ. ئەمەی دواییان لەو هەرزەکارانەدا ڕوو دەدات کە پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ ئەو هاوتوخمانەی خۆیاندا دەبەستن کە لە خۆیان گەورەترن، بەڵام لە زۆربەی ئەو پیاوانەی کە بەزۆری، یان تەنیا سێکس لەگەڵ پیاودا دەکەن، هەردوو ڕۆڵەکە دەبینن، واتە هەندێ جار خۆیان بکەرن و هەندێ جار وەرگرن، یان پێشوازیکەرن لەو پیاوەی کە سێکسی لەگەڵدا دەکەن، بەپێی پەیوەندییەکان ڕۆڵەکانیان دەگۆڕێ، یان لە یەک پەیوەندیشدا بە ئاڵوگۆڕکێ ڕۆڵەکانیان دەگۆڕنەوە، هیچ

خەسڵەتێکی بەو شێوەیەش نییە کە ناسنامەی بکەر یان وەرگر لە هۆمۆسێکسوالیتیدا جیابکاتەوە، هەرچەندە هەندێ خەسڵەتی جەستەیی تایبەتی هەیە دەشێ ئاماژە بە ڕۆڵی کەسەکە بدات، بۆ نموونە ئەو پیاوانەی کە هۆمۆسێکسوالن و لە ڕواڵەت و ڕوخساردا وەک مێ نەرم و ناسکن، ئەمانە ڕۆڵی مێ دەبینن، واتە بە شێوەیەکی گشتی خەسڵەتە پیاوانەییەکان ئاماژەن بۆ ئەوەی ئەو پیاوانە ڕۆڵی بکەر دەبینن و خەسڵەتە مێ یان ژنانەییەکانیش ئاماژە بە ڕۆڵی وەرگر دەدەن لەو پیاوانەدا، بەڵام ئەمە ڕێسایەکی گشتی نییە و بتوانی بڵێیت هەمیشە بەو شێوەیەیە، هەر بۆ نموونە ژەنراڵ کریچنر لەگەڵ زاڵیی ڕوخسارەکانی پیاوەتیی بەسەر جەستەیدا، بەڵام لە پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتیدا ڕۆڵی نێگەتیڤ، یان بکەری دەبینی.

### هۆمۆسێکسوالیتی و تاوان

لەبەر ئەوەی کەسانی تووشبوو بە کەسێتیی جۆری سایکۆباتی کە بەوە ناسراون ڕەفتاری دژەکۆمەڵ دەنوێنن، واتە بە دەستدرێژی و ئازاردانی کەسانی دیکە و دەرچوون لە یاسا و ڕێسا باوەکان ناسراون، بەزۆری هۆمۆسێکسوالن، بۆیە ئەو بۆچوونە گەڵاڵە بووە کە هۆمۆسێکسوالیتی تاوانە. هەرچەندە بۆچوونەکان لەسەر بوونی پەیوەندی لە نێوان هۆمۆسێکسوالیتی و کەسێتیی سایکۆباتیدا، کۆکن، بەڵام پەیوەستکردنی ئەم دوانە پێکەوە تەنیا پەیوەستکردنێکی ئامارییە و بناغەیی نییە. بەزۆری کەسانی سایکۆباتی بەدەست ئەوەوە دەناڵێنن کە ئاراستەی هۆمۆسێکسوالیتیی ناچارکەریان هەیە و بە شێوەیەکی زۆرەملێ و پرکێشانە ناچاریان دەکات هاوبەشێک بۆ ڕازیکردنی حەزە سێکسییەکانیان بدۆزنەوە، واتە کەسی سایکۆبات هاوبەشێکی سێکسی لە توخمەکەی خۆی دەدۆزێتەوە بە هەر شێوەیەک بێ،

ئیدی تەنانەت ئەگەر بە دەستدرێژی و ئازاردان و تەحەداکردنی نەریت و یاساش بێ. ئەو کەسانەی کە سایکۆباتین و هاوکات هۆمۆسێکسوالیشن، پێویستیان بە چارەسەرکردن هەیە، بەڵام بە پلەی یەکەم لەبەر ئەوەی سایکۆباتن. لەو لایەنانەی لە کاتی بەدواداچوون و چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشانەدا پێویستە ڕەچاو بکرێن ئەوەیە، کەسانی سایکۆبات کە هۆمۆسێکسوالیش بن کاتێ تووشی فشاری هەڕەشەکردن دەبنەوە، واتە لە لایەن شوێن یان کەس یان سەرچاوەیەکەوە هەڕەشەی ئەوەیان لێ دەکرێ کە نهێنیی هۆمۆسێکسوالیتیان باس دەکەن، لە ترسی سووکایەتی و ئابڕووچوون، دەشێ پەنا بۆ کاری تاوانکاری و دژ بە یاسا ببەن، لە مێژووی سیاسیی نوێشدا نموونە لەسەر ئەمانە زۆرن.

### چارەسەرکردنی هۆمۆسێکسوالیتی

ئەوەی لە چارەسەرکردنی هۆمۆسێکسوالیتیدا دیارە، ئەو حاڵەتانەن کە پێویستیان بە چارەسەرە، بەپێی تەمەنی ئەو کەسە و پلەی پراکتیزەکردنی بۆ ڕەفتاری هۆمۆسێکسوالیتی، هەر حاڵەتە پێویستە بە جیا مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، هەندێکیش بڕوایان بەو گۆشەنیگایە هەیە کە هەموو حاڵەتەکانی هۆمۆسێکسوالیتی بە لادان دادەنرێ و پێویستە ڕێگە لە ئەنجامدانی بگیرێ، ئیدی لەڕێی سزادانەوە بێ یان چارەسەرکردنەوە، بەڵام هەندێکی دیکە لەو باوەڕەدان پێویستە بواری چارەسەرکردن دیاری بکرێ و لەو حاڵەتانەدا سنووردار بکرێ کە خاوەنەکانیان بە هەر هۆیەکەوە بێ ئارەزوو دەکەن بۆ وازهێنان لەو ڕەفتارەیان، ئەو ڕایەش هەیە کە بڵاوبوونەوەی ئەنجامدانی ئەم ڕەفتارە سێکسییە لە قۆناغێک لە قۆناغەکانی تەمەندا بە قۆناغی منداڵی و مێردمنداڵی و هەرزەکارییشەوە، مەسەلەیەکە زیان بە بنەما دەروونییەکانی ئەنجامدەرانی دەگەیەنێ، هەروەها دەبێتە مایەی لێکترازانی

کۆمەڵایەتی و لەبەریەکهەڵوەشانی خێزانی، لەبەر هەموو ئەمانە وا پێویست ئەم دیاردەیە کەم بکرێتەوە، بەتایبەتی لە کاتی سەرهەڵدانیدا لە قۆناغی بەر لە باڵقبوون. بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، پێویستە هەوڵە پەروەردەییەکان لە چوارچێوەی خێزان و قوتابخانەدا هاوکاریی یەکدی بکەن، بە شێوەیەک کەشێکی لەبار بۆ منداڵ بڕەخسێنرێ تا ئاڕاستەی سەرفکردنی وزەی سێکسیی بۆ بوارەکانی دیکەی وەرزش و داهێنان بگۆڕێ. یەکێک لەو لایەنە پەروەردەییانە ئەوەیە، باوان، بەتایبەتی دایک، بەئاگابێت لەوەی کوڕەکەی ڕوخساری مێیەتی لە ڕەفتاریاندا جێگیر نەبێ و هەروەها فێری کوڕەکانیان بکەن کە هەوڵ نەدەن برا بچووک یان هاوڕێکانیان بۆ لای خۆیان ڕابکێشن و بیانخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە، چونکە ئەم ئاڕاستەیە لە پەیوەندیی خێزانیدا، دەشێ لە گەورەییدا منداڵ ڕووەو هۆمۆسێکسوالیتی بەرێ، هەروەها لەبەر ئەوەی کە بڕوا وایە پەیوەندی لە نێوان قووڵبوونەوە لە ماستەربەیشن و دروستبوونی ڕەفتاری هۆمۆسێکسوالیتیدا هەیە، وا پێویست دەکات لەگەڵ مێردمنداڵ و هەرزەکاردا هەوڵی دیکەش بدرێ لەپێناوی کەمکردنەوەی ئەنجامدانی ماستەربەیشندا.

لەبەر ئەوەی زۆربەی حاڵەتەکانی هۆمۆسێکسوالیتی ئەو حاڵەتانەن کە لە ئەزموونی ژیانی سێکسیی ئەو کەسانەدا بە حاڵەتی سەرپێی ئەژمار دەکرێن، لەبەر ئەوە هیچ پێویست بە چارەسەرکردن ناکات، بە لایەنی کەمەوە لە ڕووی پزیشکییەوە، بۆیە وا باشترە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم حاڵەتانەدا لە چوارچێوەی ڕێسا پەروەردەیی و کۆمەڵایەتییەکاندا بمێنێتەوە، هەروەها ئەنجامدەرانی ئەم ڕەفتارە سێکسییە نابێت بشکێنرێنەوە، چونکە ئەم جۆرە مامەڵانە لەوانەیە ببنە هۆی زیاتر جەختکردن لە ناسنامەی هۆمۆسێکسوالیتی و ئاڵۆزتربوونی ژیانی دەروونیی ئەو کەسە بە ڕادەیەک ئیدی چارەسەرکردنیش سوودی نەبێ.

لە کاتی ئێستادا زۆربەی هۆیەکانی چارەسەرکردن لەسەر ئەو کەسانە پیادەدەکرێ کە بە زۆری یان هەمیشە سێکس لەگەڵ هاوتوخمەکەی خۆیاندا دەکەن، بەڵام حەزدەکەن دەستبەرداری ئەو ڕەفتارەی خۆیان ببن. هەرچەندە ژمارەی ڕاستەقینەی ئەم کەسانە بەپێی لێکۆڵینەوەکەی کنزی لەنێو کوڕانی تازەپێگەیشتوودا زۆر کەمتر نییە ٤% و لەوانەیە لەوەش زیاتر بێ، بەڵام ژمارەی ئەو کەسانەی کە ئارەزووی چارەسەرکردن دەکەن، زۆر کەمترن، هەروەها ئەوانەش کە دەست بە چارەسەرکردن دەکەن و دەتوانن بەردەوام بن، ژمارەیان کەمتریشە. تا ئێستا هێشتا ڕێگەکە دووروودرێژە و زۆری ماوە زۆرینەی ئەم هۆمۆسێکسوالانە بڕوا بە چارەسەرکردن بێنن، چونکە ئەم مەسەلەیە پێویستی بەوەیە ئەو کەسە هەست بە دڵنەوایی و پشتئەستووری کۆمەڵایەتی بکات و متمانەی بە چارەسەرکردن هەبێ.

ئەو هۆیانەی چارەسەرکردن کە تا ئێستا کاریان پێ کراوە، هێشتا نەیانتوانیوە ئامانجەکانیان بپێکن، هەرچەندە دەرئەنجامەکانی چارەسەرکردن لەم ساڵانەی دواییدا پۆزەتیڤتربوون، بەتایبەتی لەو کەسانەدا کە ئارەزووی گۆڕینی ئاڕاستەی سێکسییان کردووە. بە ئەزموون دەرکەوتووە، باشترین دەرئەنجامی چارەسەرکردن لەو کەسانەدا دەستکەوتووە کە خۆیان ئارەزووی گۆڕانکارییان کردووە لە ئاڕاستەی سێکسییان و هەر لە قۆناغە سەرەتاییەکانی تووشبوونیان بەو لادانە، هەوڵیان داوە دەستبەرداری ئەو ڕەفتارەیان ببن بەرلەوەی ئەو لادانە لە ناخ و ڕەفتاریاندا جێگە خۆش بکات و هۆمۆسێکسوالیتی ببێت بە ناسنامەی سێکسییان، بەتایبەتی لەو کەسانەدا کە لە فیکر یان سۆز یان پراکتیزەکردنی کرداری سێکسیدا، ئاڕاستەی سێکسییان لە سەرەتادا بە سروشتی دەرکەوتووە و هیچ خەسڵەتێکی

نێرەمووکییان پێوە دیارنەبووە. شایەنی باسە چەندەها شێوازی چارەسەرکردن پەیڕەو دەکرێ، وەک بەکارهێنانی دەرمان و دەروونشیکاری و چارەسەرکردنی بەکۆمەڵ و چارەسەرکردنی ڕەفتاری.

هەرچی چارەسەرکردنە لەڕێی دەرمانەوە، لەڕاستیدا هیچ سوودێکی نییە لە چارەسەرکردنی حاڵەتەکانی لادانداء لە ڕابردوودا ماددە هێورکەرەوەکان بۆ کەمکردنەوەی ئارەزووی سێکسی بەکار دەهات، بەڵام لە گۆڕینی ناسنامەی سێکسیی ئەو کەسانەدا هیچ سوودێکی نەبووە، هەمان شتیش سەبارەت بە هۆرمۆنەکان دەوترێ کە لە گۆڕینی ناسنامەی سێکسیدا هیچ سوودێکیان نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، هۆرمۆنەکان پاڵنەری سێکسی بەهێز دەکەن کە دەبنە هۆی زیاتر ئاڕاستەگرتن ڕووەو لادان لەجیاتی وازهێنان لێی. سەبارەت بە چارەسەرکردن لەڕێی دەروونشیکارییەوە لە ڕووی سوود و کەڵکی ئەم چارەسەرەوە، ڕای ناکۆک هەن. ئەوانەی پشتیوانیی لێ دەکەن، پێیان وایە لە چارەسەرکردنی ٣٠%ی حاڵەتەکاندا سوودی دەبێ، بەڵام ئەوانەی بڕوایان پێی نییە و ڕەخنەی لێ دەگرن ئەم بانگەشانە ڕەت دەکەنەوە و پێیان وایە تەنیا کاتکوشتنە و بەفیڕۆدانی کۆشش و پارەیە. لە هۆیە دەروونییەکانی دیکە، چارەسەرکردنی بەکۆمەڵە کە کەسی لادەر بەشداریی ئەو دانیشتنە بەکۆمەڵییانە دەکات کە هەردوو توخمەکە دانیشتوون، یان ئەو دوو کەسەی کە پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتییان هەیە پێکەوە، هەردووکیان لە دانیشتنەکانی چارەسەرکردندا ئامادە دەبن، بەڵام دەرئەنجامی ئەم شێوازە لە چارەسەرکردن تا ئێستا ئاشکرا و ڕوون نییە. ئەوەی گومانی تیادا نییە چارەسەرکردنی دەروونی بە شێوەیەک لە شێوەکان یارمەتیی کەسی لادەر دەدات بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو ئازار و کۆژانە دەروونییانەی کە بەهۆی ئەم لادانەوە تووشیان دەبێت،

لەبەر ئەوە ئەم شێوازە زۆرجار یارمەتیی ئەو کەسە دەدات هەست بە دڵنەوایی و ئاسوودەیی بکات و بەمەش لەوانەیە ئارەزووی سێکسی ڕووەو شێوازە سروشتییەکانی پەیوەندیی سێکسی ئاڕاستەبکرێ.

گرنگترین ڕێگەکانی چارەسەر کە لە ئێستادا لە بواری چارەسەرکردنی پزیشکیدا لە بەردەستدان، ئەو شێوازە ڕەفتارییانەن کە پشت بە تیۆرەکانی گونجاندن و مۆرکوەرگرتن دەبەستن، چونکە تیۆرە ڕەفتارییەکان بەو شێوەیە گریمانە دەکەن کە ئاڕاستەی لادانی سێکسی ڕووەو هۆمۆسێکسوالیتی دەرئەنجامی پرۆسەیەکی هەڵەن لە مۆرکوەرگرتن لە گەشەی سێکسی تاکدا، شێوازی لۆژیکییانە بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم ڕەفتارەدا هەر دەبێت لەڕێی ڕاماڵینی ئەو مۆرکوەرگرتنە هەڵەیەی ڕابردووەوە بێ کە بووەتە هۆی ڕوودانی ئەو لادانە، دروستکردنی پەیوەستییەکی تازە وا لە تاک دەکات ڕووەو پەیوەندیی سێکسیی سروشتی ئاڕاستە بکرێ. چەندەها شێوازی چارەسەرکردنی ڕەفتاری هەن کە بە مەبەستی ڕاماڵینی ئەو مۆرکەی پێشوو، پاشان چەسپاندنی مۆرکی تازە لە ڕەفتاردا، بەکار دەهێنرێن. لەم شێوازانەش وەک شێوازی ڕقلێبوونەوە و ڕاماڵینی هەستیارێتی Desensitisation، هەروەها شێوازی بەخشینی مۆدێل Role Modeling. لەپاش هەڵسەنگاندنی دەرئەنجامی پەیڕەوکردنی ئەم شێوازانەوە لەسەر هۆمۆسێکسوالەکان، دەرکەوتووە ٤٠%یان سوودیان لەم شێوازەی چارەسەرکردنە وەرگرتووە، بەڵام ئەو گۆڕانکارییەی کە لە ڕەفتاری زۆربەیاندا تێبینی کراوە، بە تەواوەتی ڕووەو پەیوەندیی سێکسیی سروشتی ئاڕاستەیان نەگرتووە، بەڵکو تەنیا بە شێوەیەکی ئەندەکی بووە.

**پوختە**

پیادەکردنی هۆمۆسێکسوالیتی لە ژیانی مرۆڤایەتیدا هەر لە دێرزەمانەوە تا ئێستا بڵاوبووە و هەبووە. ئەم پەیوەندی و ڕەفتارە سێکسییە ڕووبەڕووی تێڕوانین و ڕای دژبەیەک و بەرگیر بووەتەوە، لە ڕووی قبوڵکردنی و ڕێگەپێدانی لە لایەکەوە، هەروەها ڕەتکردنەوە و حەرامکردنی لە لایەکی دیکەوە، لەنێو هەردوو تێڕوانینەکەشدا پلەی جیاواز هەبووە.

بەگشتی هۆمۆسێکسوالیتی لە قۆناغی مێردمنداڵی و باڵقبوون و هەرزەکاریدا زۆرە و زۆربەی ئەم حاڵەتانەش بە دروستکردنی پەیوەندییەکی سێکسیی سروشتی لەگەڵ توخمەکەی دیکەدا، کۆتاییان دێ، بەڵام ژمارەیەک لەو هۆمۆسێکسوالانە لەدوای ئەوەش کە پەیوەندیی سێکسیی سروشتی لەگەڵ ژنیشدا دروست دەکەن، هەر بە شێوەیەکی تەواو، یان ئەندەکی لە ڕەفتاری هۆمۆسێکسوالیتییان بەردەوام دەبن، ئەمەش ئەو گرووپەن کە دەبنە تەوەری بایەخپێدان لە توێژینەوە و چارەسەرکردندا. ئەو حاڵەتانەن کە بە حاڵەتی لادانی هۆمۆسێکسوالیتی دادەنرێن. لەبەر ئەوە پێویستە جیاوازی لەنێو دوو گرووپ لە هۆمۆسێکسوالدا بکرێ، یەکەم ئەوانەی ڕەفتاری هۆمۆسێکسوالیتییان قۆناغێکە لە قۆناغەکانی گەشەی دەروونیی سێکسی و لەدوای تەواوبوونی ئەو قۆناغە ئیدی بە شێوەیەکی سروشتی سێکس لەگەڵ ژندا دەکەن، بەڵام گرووپی دووەم ئەو هۆمۆسێکسوالانەن کە وزەی سێکسییان تەنیا بەو شێوازە سەرف دەکەن، واتە تەنیا لەگەڵ نێردا سێکس دەکەن و ناتوانن بە شێوەیەکی سروشتی لەگەڵ مێدا سێکس بکەن، هەروەها پێویستە ئەو حاڵەتە سەرهێڵییانەی هۆمۆسێکسوالیتی جیابکرێنەوە لەو حاڵەتانەی کە تاک بە شێوەیەکی ئەندەکی یان تەواوەتی هۆمۆسێکسواڵە و ئەوانەش کە

هۆمۆسێکسوالن، بەڵام لەگەڵ ژنیشدا سێکس دەکەن و ئەوانەش کە بێ ئەوەی ناچاربن، تەنیا سێکس لەگەڵ نێردا دەکەن.

هۆکارەکانی ئاراستەی هۆمۆسێکسوالیتی تا ئێستا نادیار و شاراوەن. هەندێک پێیان وایە هۆمۆسێکسوالیتی ئاماژەیە بۆ بوونی ئاراستەی سێکسی دوالیزمی یان دوانی لە سروشتی مرۆڤایەتیدا و ئەم ئاراستەیەش بە پلەی جیاواز لە هێز و تین لە هەموو مرۆڤێکدا هەیە، هەروەها وا گریمانە دەکرێ فاکتەرە بایۆلۆژییەکان کە بەشێکن لە سروشتی مرۆڤ بڕیار لەسەر ئەم ئاراستەیە بدەن، هەروەها فاکتەرە هۆرمۆنییەکانیش لە ژیانی کۆرپەلەدا بە بناغەی ناسنامەی سێکسی دادەنێن، بەڵام توێژینەوەکان دەربارەی ئەم بابەتە هێشتا تێروتەواو نین. لەو تیۆرانەی کە قبوڵ کراون، ئەو تیۆرانەن کە پێیان وایە ناسنامەی سێکسیی تاک و پراکتیزەکردنە سێکسییەکانی و ئاراستەی سێکسی لە ژیانیدا، هەموو ئەمانە فاکتەرەکانی ژینگە کاریان تێدەکات، ئەم فاکتەرانەش، ژینگەی ناوماڵ، پەیوەندیی منداڵ لەگەڵ باوانیدا و ژینگەی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی گشتی دەگرێتەوە. ئەمانە و سەرباری کردارەکانی مۆرکوەرگرتن کە تاک لە قۆناغەکانی گەشەدا ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، هەروەها ئەو پشتیوانییە کۆمەڵایەتییەی بەرامبەر بە ڕەفتارە سێکسییەکانی و ماستەربەیشن هەستی پێ دەکات، لەگەڵ هەموو ئەو خەیاڵانەی کە تاک بە وێنەی هاوتوخمەکانییەوە پەیوەست دەکات.

ئەوەی لە نائاشکرایی هۆکارەکانی ئەم دیاردە مرۆییە دێرین و بەردەوامە تێبینی دەکەیت، لە نەگەیشتن بە چارەسەرێکی یەکلاییکەرەوەش بۆ ئەم دیاردەیە، تێبینی دەکەین، هەرچەندە لە بواری چارەسەرکردنی ڕەفتاریدا دەستپێشخەریی پۆزەتیڤ و هاندەر بەدی دەکرێن.

گرنگترین لایەن لە بابەتی هۆمۆسێکسوالیتیدا کە شایەنی بایەخپێدان بێ، هەڵوێستی کۆمەڵایەتی و یاساییە بەرامبەر بەم ڕەفتارە و پیادەکردنی. تێبینی گۆڕانکارییەکی گەورە لە گۆشەنیگاکان بەرامبەر ئەم بابەتە ڕووی داوە، لەگەڵ پێویستیی پابەندبوون بە کۆتوبەندە ماقووڵ و تەندروست و یەکسانەکانی ئەم پراکتیزەکردنە، بەڵام پێویستە لە چوارچێوەی نۆژداری و پەروەردەیی و سایکۆلۆژیدا، حاڵەتەکانی هۆمۆسێکسوالیتی، بەتایبەتی حاڵەتە لادەرەکانی بە هەند وەربگرێ، چونکە ئەمە دەبێتە هۆی یارمەتیدان بۆ ئاشکراکردنی ئەو حاڵەتانە بەر لەوەی ئەم حاڵەتانە لە ناسنامەی سێکسیی تاکدا جەخت لە بنەماکانیان بکرێتەوە و بەر لەوەی ئەو کەسە بەهۆی ئەم حاڵەتەیەوە تووشی ئازار و مەینەتیی تایبەتی یان کۆمەڵایەتی بێتەوە، یان بەهۆیەوە تووشی هەندێ حاڵەتی هەڵچوونی نەخۆشیی مەترسیدار بێتەوە، کە خۆلادان لێیان، یان چارەسەرکردنیان ئەستەم بێ.

**پەراوێزەکان:**

١.پەیوەندیی سێکسی لە نێوان دوو تاکی هاوتوخمدا، پەیوەندیی خۆشەویستی و هاوڕێیەتی دروست دەکات لە نێوانیاندا، ئەمەش دیاردەیەکی باوە لەنێو هۆمۆسێکسوالەکان و ئەوانەش کە پەیوەندیی سێکسیی سروشتییان هەیە.

٢.بەهۆی ئەم سنوورە بەرفراوانەی لەنێو دیاردەکانی هۆمۆسێکسوالیتیدا هەیە، کە لە ڕەفتارە نائاگاییەکانی تاک ڕووەو مێینەیی یان نێرینەیی دەست پێ دەکات بۆ فیکر و خەیاڵ و سۆز و مەیل و خەونی هۆمۆسێکسوالیتی و تا دەگاتە

هۆمۆسێکسوالیتیی ڕاستەقینە بە شێوەیەکی سەرپێی، یان هەمیشەیی یان بە زۆری و یان بە تەنیا، لەبەر ئەوەی زاراوەی هۆمۆسێکسوالیتی بەپێی پێویست و بە وردی ناتوانێ ئەو هەموو لق و شێوانەی هۆمۆسێکسوالیتی لەخۆ بگرێ، بۆیە زاراوەی "ناڕاستەی هۆمۆسێکسوالیتی" لەجیاتی هۆمۆسێکسوالیتی بەکار هاتووە.

٣.کڵێسە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هۆمۆسێکسوالیتیی ڕەت کردەوە، نەک تەنیا لەبەر ئەوەی ڕەفتارێکی سێکسیی ناسروشتییە، بەڵکو لەبەر ئەوەش وەک یەکێک لە هۆیەکانی سیحر و جادوو حیسابی بۆ دەکرد و ئەنجامدەرانی ئەم ڕەفتارەی بەوە تۆمەتبار کرد کە پەیوەندییان بەو شەیتانەوە هەیە کە چووکێکی دووفاقیی هەیە، لە یەک کاتدا دەتوانێ زینا لەگەڵ نێرباز و مێدا بکات.

٤.لێکۆڵینەوەکەی فۆرد و بیچ Ford and Beach ١٩٥٢.

٥. ٣٦%ی کۆمەڵگە پێگەیشتووەکانیش ڕێگەیان بە هۆمۆسێکسوالیتی نەداوە، هەرچەندە بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی کە هەندێ کەس ناچار کراون ئەم سێکسە لەگەڵ هاوتوخمەکانیاندا بکەن.

٦.کنزی ڕووبەڕووی ڕەخنە بووەوە، بەتایبەتی لەسەر ئەو ڕایەی کە وتی: "هەر لە بەربەیانی مێژووەوە، هۆمۆسێکسوالیتی بەشێکی گرنگ بووە لە ڕەفتاری مرۆییدا، چونکە ئەم ڕەفتارە گوزارشت لەو توانایانەی مرۆڤ دەکات کە سەرەکین لە سروشتی ئاژەڵیی مرۆڤدا".

٧.حوکمی دیگۆل: ئەم ناوە بۆ چارلس دیگۆل (١٨٩٠-١٩٧٠) دەگەڕێتەوە، کە ژەنڕاڵ و پیاوێکی سیاسیی فەڕەنسی بوو، چەند کتێبێکی دەربارەی بابەتی ستراتیژی و وێنای سەربازی و سیاسی نووسیوە، سەرۆکایەتیی بەرهەڵستیکردنی وڵاتەکەیی کرد

له ماوەی جەنگی دووەمی جیهانیدا، هەروەها سەرۆکایەتیی حکومەتی فەڕەنسای ئازادی کرد له لەندەن، دوای ئەوەش سەرۆکایەتیی لیژنەی ڕزگارکردنی نیشتمانی و دواتر بوو بە یەکەمین سەرۆکی کۆماری پێنجەمی فەڕەنسا -وەرگێڕ.

٨.خاڵی وەرچەرخان له ژیانی هۆمۆسێکسوالەکان له بەرامبەر یاسادا بۆ ساڵی ١٩٧٣ دەگەڕێتەوە، که ڕێکخراوێکی ئەمەریکیی زانایانی سایکۆلۆژی، چیی دیکه هۆمۆسێکسوالیتییان بە پشێویی دەروونی و لادانی سێکسی دانەنا و له هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا، ئەو یاسایانە دەرچوون که پارێزگارییان له مافی هۆمۆسێکسوالەکان دەکرد له ڕووی فرسەتی کارکردن و نیشتەجێبوون و خزمەتگوزارییەوە. له ٢٦ی حوزەیرانی ٢٠١٥شدا دادگای باڵای ئەمەریکی، ڕێگەی بە هاوسەرێتیی نێوان هۆمۆسێکسوالەکان دا و بەمەش ئەمەریکا بوو بە هەژدەیەمین وڵات که ڕێگەی بەم هاوسەرێتییە داوە، بەر له دەرچوونی ئەم بڕیارە، له ٣٨ ویلایەت ڕێگە بەم هاوسەرێتییە دەدرا -وەرگێڕ.

٩.تێبینیی ئەوە دەکرێ له هەندێ کۆمەڵگەدا، هۆمۆسێکسوالەکان شانازی بە ڕەفتاری هۆمۆسێکسوالیتیی خۆیانەوە دەکەن و بە ئاشکرا خۆیان دەردەخەن که هۆمۆسێکسوالن. لەم کۆمەڵگەیانەدا هۆمۆسێکسوالەکان تەنیا بەوە ناناسرێن که له خۆشەویستی و سێکسدا سروشتی نین، بەڵکو بەوەش دەناسرێن که کەسێتییەکی نەرمونیان و هەستێکی ناسکیان هەیە و زۆربەی جار هونەرمەندن و توانای داهێنانیان هەیە و له بوارەکانی هونەر و شانۆدا کار دەکەن.

# بەشی هەژدەیەم

# لەیزبینیزم

-زاراوەی لەیزبینیزم
-بڵاوبوونەوەی لەیزبینیزم
-پراکتیزەکردنی لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا
-پلەکانی پراکتیزەکردنی لەیزبینیزم
-هۆکارەکانی لەیزبینیزم
-حەزە هۆمۆسیکسوالیتییەکان
- چارەسەرکردنی لەیزبینیزم
- لەیزبینیزم و یاسا

## لەیزبین یان سافیزم

### زاراوەی لەیزبین

لەیزبین یان لەیزبینیزم Lesbianism یان سافیزم Sapphismئاماژەیە بە پەیوەندیی سێکسیی مێ لەگەڵ هاوتوخمەکەی خۆیدا، واتە هۆمۆسێکسوالیتیی مێینە HomosexualityFemale. لە زمانی عەرەبیدا پێی دەوترێ "سحاقیە" کە وشەیەکی دروستکراوە لە زمانەکەدا، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی ئەم حاڵەتە لە شارستانییەتە دێرینەکانی عەرەبدا ڕەگداکوتراو نەبووە. لە زمانە خۆرئاواییەکاندا پێی دەوترێ لەیزبینیزم کە بۆ دوورگەی لسبوس Lesbos دەگەڕێتەوە، ئەم دوورگەیە یەکێکە لە دوورگەکانی ئارخەبیلی یۆنانی و ناوەکە لەوەوە هاتووە، هەرچی زاراوەی سافیزمە کە بۆ وەسفکردنی هەمان حاڵەت بەکار دێ، بۆ سافۆ Sapphoی شاعیری یۆنانی دەگەڕێتەوە کە لە سەدەی حەوتی بەر لە زاین ژیاوە، ئەم ژنە شاعیرە یەکەمین جێنیشینگەی ژنی لەسەر دوورگەی لسبوس دروست کردووە. هەرچەندە بە دڵنیایی ئەوە نازانرێ کە ژنانی سەر ئەو دوورگەیە هەموویان پەیوەندیی سێکسی لە نێوانیاندا هەبووبێ، بەڵام بە دڵنیایی پەیوەستییەکی هاوبەش لە ناسنامەی سێکسیی نێوانیاندا هەبووە و هەموویان شەهوەتی سێکسییان بۆ مێ بووە، ئەمەش بە تێپەڕبوونی کات بووەتە هۆی سەرهەڵدانی جۆرێ لە پەیوەندیی خۆشەویستی کە بە خۆشەویستیی سافی یان سافیزم ناوهێنراوە و ئەم زاراوەیە ئاماژە بووە بۆ بوونی پەیوەندییەکی خۆشەویستی و سێکسی شەهوانیی لە نێوان مێ و مێدا، ئیدی ئەو پەیوەندییە لەوانەیە تەنیا

پەیوەندییەکی سۆزداری بووبێ، یان شێوازی دیکەی سیمبولی یان جەستەیی یان سێکسی ڕاستەقینەی لەخۆ گرتبێ، هەندێ جاریش بۆ وەسفکردنی پەیوەندیی سێکسیی نێوان دوو مێ زاراوەیەکی دیکە بەکار دێ کە بریتییە لە زاراوەی تریبادیزم Tribadism، ئەمەش بۆ وەسفکردنی ئەو حاڵەتە بەکار دێ کە ئەو دوو مێیە بۆ گەیشتن بە ئۆرگازم پشت دەبەستن بە لێخشاندنی میتکە، وەرگێڕانی زاراوەکە بۆ عەرەبی دەبێ بە "لێخشان" و دەشێ زاراوەی "سحق" و "ساحقە" و "مساحقە"ش هەر لێرەوە هاتبن.

سافۆی شاعیر یەکەمین کەس نەبووە کە لە مێژووی پراکتیزەکردنە سێکسییەکاندا لەیزبینیزمی داهێنابێ، هەرچەندە ئەو یەکەم کەس بووە خۆی بۆ ئەم پراکتیزەکردنە تەرخان کرد و ئەو زاراوەیەی بەو ڕەفتارە بەخشی کە تا ئێستاش ئەم پەیوەندییەی پێ ناسراوە. لەوانەیە ئەو گریمانەیە هەڵە بێ کە پێی وایە ئەو ڕابتە مێینەییەی کە سافۆ دایمەزراند و لەسەر دوورگەی لسبوس سەرۆکایەتیی کرد، ڕابتەیەکی پۆرنۆگرافی و بێئابڕوویی سێکسی بووە. بەڵکو ئەو شیعرانەی سافۆ کە تا ئێستا ماون، ئاماژە بە هەستیارێتی و ناسکی و گەرمیی سۆزی ئەو شاعیرە دەدەن، شیعرەکانی بە یەکێک لە شیعرە جوانەکانی دڵداری و ئەڤینداری دادەنرێن، بەتایبەتی ئەو شیعرانەی گوزارشت لە خۆشەویستی دەکەن بۆ ئاتیس Attis ئەمە نموونەی یەکێک لەو شیعرانەیە:

کاتێ تەماشات دەکەم
ئیدی یەک وشە لە زاری لاڵمەوە نابیستی
زمانم دەبەسترێ و کڵپەیەکی شاراوە
لە چاوترووکانێکدا جەستەم داگیر دەکات
من بە چاو نابینم، گوێیەکانم تەنیا وڕێنەکانم دەبیستن
ئارەقە وەک تنۆکی شەونم بە تەوێڵمدا دێتە خوارەوە

موچوڕکی خێرا بە هەرچوار پەلمدا دێت و دەچێ
ڕەنگم زەرد دەبێ، زەردتر لە گیای وشک
بە زەبرێکی نزیک لە زەبری مردن
بە ئەستەم هەناسە دەدەم...

وەک لە ڕووی مێژووییەوە دانراوە، سافۆ کە چەقی ئەم ڕابتە مێینەییە بوو، جێنیشینگەکەی وەک قوتابخانەیەک وا بوو بۆ فێربوونی کچان کە لەوێ فێری هونەرەکانی سەما و گۆرانی دەبوون شانبەشانی پەیوەندیی سۆزداری و سێکسی لە نێوانیاندا. ئەو مێیانەی کە سەر بەو ڕابتەیە بوون، پێیان وا بوو، ئەو سۆز و خۆشەویستییەی کە دوو مێ پێکەوە دەبەستێ، بەشکۆترین سۆز و خۆشەویستییە و بالاتر و جوانترە وەک لەو پەیوەندییەی ژن و پیاو پێکەوە دەبەستێ.

بەر لە سافۆی شاعیر، هچبسوتی شاژنی فیرعەونی هۆمۆسێکسوال بووە، کە هەمیشە بە جل و پۆشاکی پیاوانەوە و بە ڕیش و سمێڵێکی ساختەوە دەرکەوتووە و کۆمەڵێک لە ژنانیش هەبوون پەیڕەوی هەمان ستایلی ئەویان کردووە. هەندێک لە ئەنسرۆپۆلیجستەکان پێیان وایە ژن بە شێوەیەکی بەرفراوان هۆمۆسێکسوالیتی لە ژیانیدا پیادە کردووە، کاتێک کە دەسەلاتی دایک حوکمی کۆمەڵگەکانی کردووە، لەجیاتی دەسەلاتی باوک، هەندێکی دیکەش پێیان وایە ژن لە ئەنجامی دوورخستنەوەی لەو دەسەلاتەی کە هەیبووە بەخشینی ڕۆڵی نێگەتیڤ و وەرگر لە پەیوەندیی سێکسیدا بە شوێن دەروازەیەکدا گەڕاوە تا ناسنامەی سێکسیی خۆی تیادا بسەلمێنێ و بە تەواوەتی پیاو فەرامۆش بکات، بۆیە پەنای بۆ سێکسکردن و چێژوەرگرتن لە هاوتوخمەکەی خۆی بردووە. دێرینترین ئایینەکان سێکسکردنی نێوان مێ و مێی ڕەتکردووەتەوە و قەدەغەی کردووە، هەروەک

له "تلمود"دا دەردەکەوێ، هەروەها تەورات بە کارێکی سەرشۆڕانەی داناوە و سزاکەی تەڵاقدانی ئەو ژنە بووە کە سێکسی لەگەڵ هاوتوخمەکەیدا کردووە. دەگێڕنەوە لە مێژووی دێرینی ڕۆمانیدا، ژنان لە جەژنی ساتورنالیادا Saturnalia واتە ئاهەنگگێڕان بە بۆنەی ڕۆژی جوانییەوە (بۆنا دیا Bona Dea) سێکسیان لەگەڵ یەکدا کردووە. لە مێژووی ئایینی مەسیحیشدا پەیوەندیی سێکسیی نێوان مێ و مێ بە گوناهـ دانراوە، بەڵام گوناهێکی بچووکتر لە گوناهی سێکسکردنی نێر و نێر پێکەوە، هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پێیان وا بووە ژن هێز و توانای پیتاندنی نییە، لەبەر ئەوە نابێتە هۆکار بۆ لەکارکەوتنی پرۆسەی خوڵقاندنی سروشتی منداڵ. هەندێک لە زانایانی لاهوت ئیجتیهادی ئەوەیان کردووە و ئەو وتەیەی ناو تەوراتیان بە ئارەزووی خۆیان قۆستووەتەوە کاتێک بە پیاو دەڵێ: "بۆت نییە لەگەڵ پیاودا جووت ببیت، وەک لەگەڵ ژندا جووت دەبیت". بەڵام دەقەکە لە کاتی باسکردنی ژندا وەستاوە و نەهیی لە ژن نەکردووە کە لەگەڵ هاوتوخمەکەی خۆیدا سێکس بکات، بەڵام لە تەوراتدا ئەم ڕەتکردنەوەیە ژنیشی گرتووەتەوە بەپێی ئەم دەقە کە دەڵێ: "لەبەر ئەوە کەمترین سۆزمان پێ بەخشیون، چونکە تەنانەت ژنەکانیشیان ئەو سۆزانەی هەیانە گۆڕانی بەسەردا هاتووە و لە پەیوەندییەکدا بەکاری دێنن کە دژ بە سروشتە". بەگشتی ئایینی مەسیحی لەیزبینیزمی ڕەت کردووەتەوە و بە سەرشۆڕی و نەریتێکی بتپەرستانەیان داناوە، هەرچەندە کڵێسە بە نەرمی مامەڵەی لەگەڵ ئەو ژنانەدا کردووە کە ئەم ڕەفتارە سێکسییەیان لەگەڵ هاوتوخمەکانیاندا نواندووە، لەوانەیە ئەمەش بڵاوبوونەوەی لەیزبینیزمی لەناو دێرەکانی ڕاهیبەکاندا ئاسان کردبێ، بەتایبەتی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، هەرچەندە ڕێگە بە ڕاهیبەکان نەدەدرا پێکەوە لە یەک جێگەدا بخەون، بەڵام لە قورئانی

پیرۆزدا بە ڕاستەوخۆیی هیچ ئاماژەیەک بەم بابەتە نەدراوە، لەوانەشە هۆکاری ئەوەی کە ژنەکەی پێغەمبەر "لووت" لەگەڵ قەومی "لووت"دا سزادرا بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە ئەویش لەگەڵ ژنانی هاوتوخمی خۆیدا سێکسی کردبێ، وەک چۆن قەومەکەی هۆمۆسێکسوال بوون، سزادانیشی لە بەرامبەر ئەوەدا بوو بێ.

### بڵاوبوونەوەی لەیزبینزم

هەروەک چۆن لە هۆمۆسێکسوالیتی نێردا ئەستەمە بە وردی ئەو بەڵگانە دەست بکەون کە ئاماژە بە ڕێژەی ئەم شێوازە لە پەیوەندیی سێکسی دەدەن، دیاریکردنی ڕێژەی لەیزبینیزم یان ئەو ژنانەی کە لەگەڵ ژنانی هاوتوخمی خۆیاندا سێکس دەکەن، ئەستەمە، ئەمەش لەبەر چەند هۆکارێک، یەکەمیان، جیاوازییە کۆمەڵایەتی و شارستانییەکان کە کاریگەرییان لەسەر ڕوودانی ئەم پەیوەندییە سێکسییە هەیە. دووەمیش، کۆمەڵێک ڕێگری تاکانەیی هەن ڕێگە لە تاک دەگرن ڕاستگۆیانە ددان بەوەدا بنێت کە ئەو پەیوەندییە سێکسییە لە ژیانیدا پراکتیزە دەکات، هەروەها پلەی جیاواز لە پراکتیزەکردنی لەیزبینیزم هەیە، هەندێ لە ژنان تەنیا هەست بە حەز و مەیلی سێکسی دەکەن بۆ مێ، بەڵام هەندێکیان بە شێوەیەکی ڕاستەقینە و بە تەواوی ئەم شێوازە لە سێکس پیادە دەکەن، لە حاڵەتە توندەکانیشدا تەنیا ئەم شێوازە لە سێکس هەڵدەبژێرن و لەگەڵ پیاودا سێکس ناکەن. بە شێوەیەکی گشتی مێ لەگەڵ مێدا کەمتر پەیوەندیی سێکسیی هەیە بەراورد لەگەڵ پەیوەندیی سێکسیی نێوان نێر و نێر، بەڵام لە ڕووی بوونی پەیوەندیی سۆزداری و فکری نێوان مێ و مێ لە ژیانی مێدا زیاتر وەک لە نێر. لێکۆڵینەوەکانی کنزی دەربارەی ژیانی سێکسی لە مێدا ئاماژە بەوە دەدەن ٢٥%ی ئەو کچ و ژنانەی بەشدارییی ڕاپرسییەکەیان کردووە و فۆرمەکەیان پڕکردووەتەوە، ئاماژەیان

بەوە داوە کە لە قۆناغێک لە قۆناغەکانی پێش گەیشتن بە تەمەنی سی ساڵی، هەستیان بە سۆز و مەیل بۆ هاوتوخمەکەی خۆیان هەبووە، ١٩%یشیان لە تەمەنی چل ساڵیشدا پەیوەندییەکی جەستەییان لەگەڵ هاوتوخمەکەی خۆیان دروست کردووە کە هەردووکیان یان یەکێک لەو دوو هاوبەشە کە هاوتوخم بوون، ئامانجی سێکسی هەبووە، هەروەها کنزی لە ڕاپرسییە بەرفراوانەکەیدا ئاماژەی بەوە داوە کە ٤%ی قەیرەکچان لە تەمەنی نێوان ٢٠-٢٥ ساڵیدا تەنیا سێکسیان لەگەڵ مێدا کردووە. هەمان لێکۆڵینەوە ئاماژە بەوە دەدات ١٧%ی قەیرەکچان ئاڕاستەی سێکسی دوانییان هەیە، واتە حەز و مەیلیان بۆ ژن و پیاویش هەیە. کنیون Kenyonی توێژەر ئاماژە بەوە دەدات هەر مێیەک لە کۆی ٤٥ مێی پێگەیشتوو لە بەریتانیا لەیزبینە، واتە لەگەڵ مێدا سێکس دەکات، یان حەز و مەیلی سێکسیی بەرامبەر بە مێ هەیە، هەرچەندە ئاماژەی بە ڕێژەی دیاریکراو نەداوە بۆ پلە جیاوازەکانی پیادەکردنی ئەم شێوازە لە سێکس. لە لێکۆڵینەوەیەکی نوێی لایزانک (١٩٧٦) دەرکەوت ١٠%ی مێ هەست بە حەوانەوە دەکەن کاتێ لەگەڵ مێدا دەبن، واتە کاتێک لە شوێنێکدا پێکەوە دەبن، هەمان ڕێژە لە مێ ئاماژە بەوە دەدەن کە توخمەکەی خۆیان زۆر سەرنجیان ڕادەکێشێ، هەروەها ٨٥%یشیان پێیان وا بووە کە لەیزبینیزم یان هۆمۆسێکسوالیتیی مێینە شتێکی سروشتییە. لە توێژینەوەیەکی دیکەدا کە هەر لە شێوازی ڕاپرسی کاترین دیفیس لەسەر ١٢٠٠ ژن ئەنجامی دا، کە شوویان نەکردبوو، بۆی دەرکەوت نیوەیان هەستییان بە پەیوەندیی سۆزداریی زۆر توند و گەرم کردووە بەرامبەر بە مێ. یەک لەسەر پێنجی ئەم ڕێژەیە ددانیان بەوەدا ناوە کە ماستەربەیشنی هاوبەش و پێکەوەنووسانی جەستەییان لەگەڵ مێدا کردووە.

### پراکتیزەکردنی لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا

پەیوەندیی سێکسی نێوان مێ و مێ لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا کەمترە بە بەراورد لەگەڵ پەیوەندیی سێکسیی نێوان نێر و نێر لە هەمان کۆمەڵگەدا، بەڵام لەوە دەچێ ئەمە تەنیا لە ڕواڵەتدا وا دەربکەوێ، هەندێک بڕوایان وایە، ئەو ژنانەی کە پەیوەندیی سێکسییان لەگەڵ ژنانی هاوتوخمی خۆیاندا هەیە، ڕێژەیان زۆر لەوە زیاترە کە دەردەکەوێ، بەتایبەتی لەو کۆمەڵگەیانەدا کە کۆتوبەند لەسەر پەیوەندیی سێکسیی نێوان نێر و مێدا هەیە و تا هاوسەریتی نەکەن، ناتوانن پێکەوە سێکس بکەن.

لێکۆڵینەوە ئەنسرۆپۆلۆژییەکەی فۆرد و بیچ Ford and Bech ئاماژە بەوە دەدەن لە کۆی ٧٦ کۆمەڵگەی سەرەتایی کە لێکۆڵینەوەیان لەسەر کردووە، ١٧یان لەیزبینیزم پراکتیزە دەکەن. یەکێک لەو کۆمەڵگەیانە قەبیلەکانی ئاراندا Arandaی ئەبوروجینییە لە ئوسترالیا کە مێیەکانیان ماستەربەیشنی هاوبەش دەکەن، واتە مێ و مێ پێکەوە بە مەبەستی چێژوەرگرتن دەست لە میتکەی خۆیان و یەکتری دەدەن و وەک پەیوەندیی سێکسیی نێوان نێر و مێ دەچنە سەر یەک. قەبیلەکانی چوکچی Chukcheeیش لە سیبریا، مێیەکانیان چووکێکی دروستکراو لە قاچی ئێسکی ئاسکەکێوی لە پەیوەندیی لەیزبینییاندا واتە سێکسییاندا لەگەڵ هاوتوخمەکانیان بەکار دەهێنن. قەبیلەی 'ئاراندا'ش مێیەکانیان چووکێکی لە تەختە دروستکراو بەکار دەهێنن، هەندێ جاریش مۆز یان پەتاتەی شیرین. ئەم ڕەفتارە سێکسییە سەرەتاییانە و چەندەهای دیکە کە ئاشکرایە بە مەبەستی وورووژاندنی سێکسی و گەیشتن بە ئۆرگازم لای هەندێ لە مێ پەیڕەو دەکرێن، لە کۆمەڵگە شارستانییە هاوچەرخەکاندا باو نین.

## پلەکانی پراکتیزەکردنی لەیزبینیزم

ئەو وێنا باوەی یان زاڵەی کە لە زەینی خەڵکیدا دەربارەی لەیزبین یان ئەو مێیە هەیە کە سێکس لەگەڵ مێیەکی هاوتوخمی خۆیدا دەکات، ئەوەیە ئەو مێیە کۆمەڵێک خەسڵەتی نێرینەی تیادایە کە وای لێ دەکەن لە پەیوەندیی سێکسیدا ڕۆڵی پۆزەتیڤی پیاو، واتە بکەر وەربگرێ و لە پەیوەندیدا لەگەڵ مێ، ئەو زاڵ بێ، هەرچی لایەنی دووەمە لەم پەیوەندییەدا مێیەکە کە خاوەنی خەسڵەتی مێینەیە و ڕۆڵی نێگەتیڤ و وەرگر دەبینێ، ڕازییە بە دەسەڵاتی ئەو مێیەی دیکە کە لە پەیوەندییەکەدا پێکەوە سێکس دەکەن. هەرچەندە دەشێ ئەمە لە هەندێ حاڵەتدا ڕاست بێ، بەڵام ئەمە نموونەی پەیوەندیی سێکسیی لەیزبینیزم نانوێنێ، چونکە هەندێک جار پەیوەندیی لەیزبینیزم لە نێوان دوو مێدا هەیە، بەڵام مەرج نییە هیچیان خاوەنی سیفەتی نێرینەیی بێ و وەک پیاو هەڵسوکەوت بکات، یان سیفەتی مێینەیی زیاد لە ئاستی سروشتی بێ. د. کاپریو Caprio پۆلینێکی بۆ لەیزبینیزم داناوە کە لە شەش پلە پێک هاتووە، لەو مێیەوە دەست پێ دەکات کە لە ڕەفتاری سێکسیدا لەگەڵ مێ توندوتیژە و ڕقی لە پیاویش دەبێتەوە، تا دەگاتە ئەو مێیەی کە ئامادەیی تیادایە بۆ بەستنی پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ نێردا، بەڵام هەندێ جار پەرۆشە بۆ بەستنی پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ هاوتوخمی خۆیدا. ئەوەی لە پەیوەندیی سێکسیی نێوان مێ و مێ پێویستە دەرکی پێ بکرێ، هەمان ئەو شتانەیە کە پێویستە لە پەیوەندیی سێکسیی نێوان نێر و نێردا دەرکی پێ بکرێ، ئەویش ئەوەیە، مەرج نییە لەیزبینیزم بریتی بێ لە ئەنجامدانی پەیوەندیی سێکسیی ڕاستەقینە، یان گەیشتن بە ئۆرگازم، یان تەنانەت بەرکەوتنی جەستەیی نێوان مێ و مێ، چونکە هەر وەک لە نێردا وایە، لە مێشدا، دەشێ ئەو مەیل و حەزە بۆ مێیەکی هاوتوخمی خۆی لە نەستدا هەبێ و ئەو مێیە

خۆی بێئاگا بێ لێی، لەوانەیە ئەم حەز و مەیلە سێکسییە لە خەوندا یان لە دەستپێشخەرییەکی ڕەفتاری، یان گەمەبازی لە خەیاڵدا دەربکەوێ. لەوانەشە لە سۆز و خۆشەویستیدا دەربکەوێ، یان لە ڕوخساریێ لە ڕوخسارەکانی ڕەفتاریدا دەربکەوێ، بێ ئەوەی ئەم ڕوخسارانە هیچ ئاماژەیەکی سێکسیی ڕاشکاوانەیان پێوە دیاربێ. لەبەر ئەوە لە کاتی باسکردن و ئەنجامدانی توێژینەوە لەسەر پەیوەندیی سێکسیی لەیزبینیزم، وا دروستترە بوترێ "ئاڕاستەی هۆمۆسێکسوالیتی لە مێدا"، چونکە ئەم زاراوەیە لەوانەیە تەواوی پلە جیاوازەکانی ئەم ئاڕاستە سێکسییە لەخۆی بگرێ و بە شوێن هۆکار و چارەسەرکردنیدا بگەڕێ.

### هۆکارەکانی لەیزبینیزم

ئەو پەیوەندییە سێکسییەی کە لە نێوان مێ و مێدا هەیە، هێندە سەرنجی توێژەرانی ڕانەکێشاوە، وەک ئەو پەیوەندییە سێکسییەی لە نێوان نێر و نێردا هەیە، واتە لەیزبینیزم وەک هۆمۆسێکسوالیتی لە نێردا هێندە نەبووەتە جێگەی بایەخ و گرنگیی توێژەران. بەشێکی ئەم گوێپێنەدانە بۆ فەرامۆشکردنی کلاسیکیی ژیانی سێکسیی ژن دەگەڕێتەوە، بەشێکیشی بەهۆی ئەو ئاستەنگ و ئەستەمییە باوانەوەیە کە دێنە بەردەم توێژەر کاتێک توێژینەوە لەو مەسەلانەدا دەکات کە تایبەتن بە ژن، بەتایبەتیش مەسەلەی سێکس، هۆکارێکی دیکەش هەیە، ئەویش ئەوەیە، پیادەکردنی ئەم ڕەفتارانە لەنێو مێدا، یان پەیڕەوکردنی پلەیەک لە پلەکانی لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بە سروشتی دانراوە، بۆیە نەبووەتە جێگەی سەرنج و بایەخ. لەگەڵ ئەم فەرامۆشکردنە ڕێژەییەدا لە بواری بایەخدان و توێژینەوە دەربارەی ئەم بابەتە، بەڵام لەیزبینیزم جۆرێ لە بایەخی هەر پێ دراوە و بە شێوازێک لە شێوازەکان هەر جێگەی سەرنج بووە و زۆر کەس توێژینەوەیان دەربارەی

دیاردەکە و هۆکارەکانی ڕوودانی ئەنجام داوە. بە شێوەیەکی گشتی ئەو تیۆرانەی کە دەربارەی هۆکارەکانی لەیزبینیزم، واتە هۆمۆسێکسوالیتی لە مێدا دانراون، هەمان ئەو تیۆرانەن کە باس لە هۆکارەکانی هۆمۆسێکسوالیتی دەکەن لە نێردا. بەگشتی تیۆرەکان لەم بوارەدا هۆکارەکان بۆ دوو کۆمەڵ بەش دەکەن، یەکەمیان لە ڕووی بایۆلۆژییەوە. دووەمیان لە ڕووی ژینگە و دەوروبەرەوە. فاکتەرە کاراکان لە هەردوو ڕووەکەوە پێکەوە کار لێک دەکەن و هاوکاریی یەکدی دەکەن، هەروەها بە پلەی جیاواز لە ڕووی ئامادەبوون و هێزەوە هەن و دەبنە هۆکار بۆ دروستبوونی حەز و ئارەزووی هۆمۆسێکسوالیتی، یان لەیزبینیزم لە نێوان دوو مێدا.

هەندێک لە توێژەران ئەوە ڕەت دەکەنەوە ئاراستەی هۆمۆسێکسوالیتی یان لەیزبینیزم لە مێدا لە ساتی لەدایکبوونەوە دروست بێن، ئیدی بەهۆی فاکتەری بۆماوەییەوە بن، یان هۆرمۆنییەوە کە کار دەکەنە سەر ژیانی کۆرپەلە. هەرچەندە سەلماندنی بوونی فاکتەرێکی لەو جۆرە لە ساتی لەدایکبوونەوە ئەستەمە، بەڵام ڕەتکردنەوەشی هەر ئەستەمە، بە پێچەوانەوە، ڕوخسارە جەستەییەکان و خەسڵەتەکانی کەسێتیی ئەو مێیە کە لە پەیوەندیی لەیزبینیدا ڕۆڵی کارا دەبینێ، هەروەها ئەو مێیەش کە خەسڵەتەکانی مێیەتی تیایدا زۆر بەهێزە و لەو پەیوەندییەدا ڕۆڵی نێگەتیڤ دەبینێ، ئەمانە ئاماژە بەوە دەدەن کە لە هەندێک حاڵەتی لەیزبیندا بناغەیەکی بایۆلۆژیی هەیە، بەتایبەتی لە حاڵەتە توندەکاندا کە ئەو مێیە تەنیا لەگەڵ مێدا سێکس دەکات، یان شێوازی دڵخوازی لە سێکسدا، شێوازی لەیزبینیزمە. ئەگەر وا گریمانە بکەین کە ئەم فاکتەرە بایۆلۆژییە بوونی هەیە، هێشتا نەتوانراوە چۆنێتی و کاتی ڕوودانی لە ساتی دروستبوونی کۆرپەلەدا بسەلمێنرێ، هەروەها گریمانەیەکی دیکەی هاوشێوەی

بوونی فاکتەری بایۆلۆژی هەیە کە ئاڕاستەی سێکسی دیاری دەکات، ئەو گریمانەیەش بریتییە لە بوونی ئاڕاستەی سێکسی دوانی لە سروشتی هەموو مرۆڤێکدا، ئیدی نێر بێ یان مێ، هەرچەندە ئەم ئاڕاستە دوانییە بەهۆی کاریگەریی سروشتی بایۆلۆژییەوە بڕیاری لەسەر دەدرێ، بەڵام هێشتا تا ئاستێکی زۆر زانیاریمان دەربارەی نییە، بە پشتبەستن بەم گریمانەیە، مێ هەروەک نێر، دەشێ مەیلی سێکسی دوانیی هەبێ، واتە مەیلی سێکسی بۆ نێر و مەیلی سێکسی بۆ مێ، ئەم مەیلە سێکسییانە لە بناغەدا بەپێی بوونیان دەردەکەون، دەشێ مەیلی سێکسی بۆ نێر و بۆ مێ وەک یەک وابن، یان لە یەکەوە نزیک بن، یان جیاوازبن لەیەک، ئەم ڕێژانەش بڕیار لەسەر مەیل و ئاڕاستەی سێکسی لە مێدا دەدەن، هەمان شتیش گریمانە دەکرێ کە لە نێردا بوونی هەبێ، هەروەها ئەم گریمانەیە هۆکاری بوونی ئاڕاستەی سێکسی دوانی لە نێر و مێدا لێک دەداتەوە، واتە هۆکاری ئەوەی بۆچی هەندێ جار نێر یان مێ مەیلی سێکسی بۆ هەردوو توخمەکە هەیە.

لەوانەیە بایەخی زیاتر بە هۆکارە ژینگەییەکان درابێ لە ژیانی ژندا، وەک لە بایەخدان بە هۆکارە بایۆلۆژییەکان. ئەو زانایانەی کە بڕوایان بە تیۆرەکانی ژینگە هەیە، پێیان وایە، مێ لە قۆناغێک لە قۆناغەکانی سەرەتای هۆشیاری بەرامبەر بە هەست و سەرنجراکێشانە سێکسییەکان، ڕووەو ئەزموونکردنی واقیعێک دەڕوات کە پێچەوانەی واقیعی ئەزموونی سێکسی سروشتییە لەگەڵ نێردا و ئەمە بە شێوەیەک ڕوو دەدات لەوانەیە قەناعەت بەو مێیە بکات کە پێداویستی و ڕازیبوونە سێکسییەکانی تەنیا لەڕێی پەیوەندییەکی هۆمۆسێکسوالیتییەوە لەگەڵ مێدا بەدی دێ، بەڵام ئایا بۆچی مێ ڕووەو ئەو ئاڕاستەیە دەڕوات، ئەوانەی پشتیوانی لە تیۆری ژینگە دەکەن هۆکاری ئەمە لەسەر بناغەی

ئەزموونی جیاواز لە ژیانی ئەو ژنەدا لێک دەدەنەوە کە لە قۆناغە جیاوازەکانی ژیانیدا ڕووبەڕوویان بووەتەوە، لەو ئەزموونانەش، پەیوەندیی کچە لەگەڵ دایکیدا لە قۆناغەکانی منداڵی و هەرزەکاریدا، هەندێ دایک بەو مۆرکە دەناسرێ کە سروشتێکی کێبڕکێکارانەی هەیە و بە توندوتیژی و کەمیی خەسڵەتی مێیەتی دەناسرێ و ئارەزووی نواندنی سۆزی زیاتری بۆ کوڕەکەی هەیە و هەرچی هاوسەرەکەشیەتی بە شێوەیەکی گشتی ملکەچیەتی. لەم جۆرە ژینگانەدا، کچ بە جۆرێ گەورە دەبێ کە هەست بە شکستی دەکات لە پەیوەندیدا لەگەڵ دایکیدا و هەست بە جۆرێ لە ڕق دەکات بەرامبەر بە مێ. لەبەر ئەوە سروشتییە لە قۆناغێکی داهاتووی تەمەنیدا پەیوەندی لەگەڵ ئەو کچانەدا ببەستێ کە لە دایکی دەچن و سروشتێکی توندی وەک ئەویان هەیە و ڕێگە دەدەن جۆرێ لە توندوتیژیی چەپێنراو بەرامبەریان پیادە بکرێ، بەو مەرجەی لە بەرامبەردا خۆشەویستییان پێ ببەخشرێ و قبوڵ بکرێن. ئەم واقیعە لە ئەزموونی ژیانی هەندێ کچدا هۆکاری پەنابردنیان، یان حەزکردنیان لە پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ هاوتوخمەکەی خۆیاندا، لێک دەداتەوە، بەڵام زۆربەی حاڵەتەکانی لەیزبینیزم یان هۆمۆسێکسوالیتی لە مێدا هۆکارەکەی بۆ تینوێتییەکی سێکسی دەگەڕێتەوە کە هیچ هۆکارێکی دیکە بۆ تێربوون و ڕازیبوون نادۆزێتەوە، یان دەشێ هۆکارەکەی ترس بێ لە بەستنی پەیوەندیی سێکسیی سروشتی لەگەڵ نێردا، ئیدی ئەو ژنە لە پەیوەندییەکە خۆی بترسێ، یان لە دەرئەنجامەکانی، بە ترس لە دووگیانبوونیشەوە و لە منداڵبوون و بەرپرسیارێتیی منداڵ و ژیانی خێزانی و هاوسەرێتییشەوە، هەروەها دەشێ لەیزبینیزم ئەگەر بۆ ماوەیەکی کاتییش بێ، دەشێ بەهۆی بەرکەوتن و لاساییکردنەوە و لادانی نەستەوە بێ ڕووەو ئەم ئاڕاستە ناسروشتییە لە سێکسدا. هەندێ حاڵەتی

هۆمۆسێکسوالیتی یان لەیزبینی لە مێدا هەیە هۆکارەکەی بۆ هەوڵی خۆرزگارکردن و دەربازبوونی ژن دەگەڕێتەوە لە دەسەڵاتی پیاو و حەزکردن لە جەختکردنەوە لە کەسێتیی سەربەخۆی خۆیان و دەرچوون لە چوارچێوەی باوی ژیانی کۆمەڵایەتی، بەدەر لەم هۆکارانە، هۆکاری دیکەش هەن دەکەونە بواری ژیانی دەروونی و ئەقڵییەوە.

## مەیلە هۆمۆسێکسوالیتییەکان

جیاوازییەکی ئاشکرا لە نێوان مەیل و حەزی هۆمۆسێکسوالیتی و پیادەکردنی ڕاستەقینەی هۆمۆسێکسوالیتی هەیە، ئیدی ئەمە لە ژیانی نێردا بێ یان مێ. دەشێ بەئاگایی یان هۆشیاری مرۆڤ لە بوونی ئەم مەیل و حەزانە بێئاگا بێت. لەوانەیە تەنیا لە بوارە ناسێکسییەکاندا گوزارشت لەم مەیل و حەزانە بکرێ، بۆ نموونە لە شێوەی دەربڕینی سەرسامی بە کەسێ یان هۆگربوونی سۆزداری و خۆشەویستی و ئارەزووی مانەوە لەگەڵ ئەو کەسەدا و بەریەککەوتن و لاساییکردنەوەی شێوازی ژیان یان ئاڕاستە ڕەفتاری و سۆزداری و فیکرییەکانیدا دەربکەوێ. د. ئەنتۆنی ستور Storr (١٩٦٤) ئەم واقیعەی لە ژیانی ژندا لە کتێبەکەیدا دەربارەی لادانی سێکسی بەم شێوەیە پوخت کردووەتەوە: "بیرۆکەی بەریەککەوتنی سێکسی و تەنانەت پەیوەندیی سۆزداریی ژنێک لەگەڵ ژنێکی هاوتوخمی خۆیدا، بە لای زۆربەی ژنانەوە، شتێکی ناچیز و نەویستراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەر ئاوڕێک لە قۆناغی منداڵی و سەرەتای هەرزەکارییان بدەینەوە، بەزۆری کۆمەڵێک هاوڕێ و ژنیان دێتەوە یاد کە بە شێوەیەکی نائەقڵانی و سۆزداری خۆشیان ویستوون، کە ئەو پەیوەندییە مەگەر تەنیا لەگەڵ کەوتنە ناو خۆشەویستی بەراورد بکرێ، لە واقیعدا ئەم پەیوەندییانە لەو قۆناغانەدا شێوازێکن لە شێوازەکانی ئەزموونی هۆمۆسێکسوالیتی،

ئەو پەیوەستییانە کە لە نێوان من و مێدا هەیە لەو قۆناغانەدا بە بەشێکی گرنگ لە پرۆسەی گەشە دادەنرێن، چونکە یارمەتیی کچی تازەگەشەکردوو دەدەن بەرامبەر چەندەها لایەنی نوێی کەسێتیی مێینە بەئاگا و هۆشیار بێ. هەموومان بە ″نێر و مێ″وە مەیل و ئارەزووی ئەوەمان هەیە بکەوینە داوی خۆشەویستیی ئەو کەسانەوە کە هەندێک لایەنی ئێمە دەنوێنن، ناتوانین خۆمان لە ژیانی واقیعیدا گوزارشتیان لێ بکەین...″. لەبەر ئەوە نابێ حوکم بەسەر ئەم ئاراستانەی هۆمۆسێکسوالیتیدا بدەین و بە لادان وەسفیان بکەین و پێمان وا بێ پێویستە ڕێگە لەو ئاراستەیە بگیرێ یان چارەسەری ئەو کەسە بکرێ. هەندێک پێیان وایە پێویستە واز لە تاک بهێنرێ لەو ئاراستەیەدا بمێنێتەوە، چونکە دەشێ ئەوە یەکێک بێت لە پێداویستییەکانی گەشەی دەروونی و هاوسەنگیی ئەقلی، بەلام مەسەلەکە جیاوازە کاتێک ژن بێ بوونی هیچ بەهانەیەک یان بەزۆری یان تەنیا ئەم ئاراستەی هۆمۆسێکسوالیتییە لە پەیوەندیدا هەڵدەبژێرێ، چونکە لەم حاڵەتەدا هاوشێوەیە لەگەڵ هەندێک حاڵەتی ڕەفتاری هۆمۆسێکسوالیتی لە نێردا و لە هەردووکیاندا بە لادان دادەنرێن یان بە دوورکەوتنەوە لە پەیوەندیی سروشتیی نێوان ژن و پیاو، لەبەر ئەوە وا پێویست دەکات بە شێوەیەک لە شێوەکان لەسەر ئەم بناغەیە چارەسەر بکرێن.

## چارەسەرکردنی لەیزبینیزم

شارەزایانی بواری سێکسۆلۆژی لەو باوەڕەدان ئەو مێیەی ئاراستەی لەیزبینیزم، یان هۆمۆسێکسوالیتیی هەیە، بەختێکی باشتری لەو کوڕە هەیە کە هۆمۆسێکسواڵە بۆ ئەوەی بۆ ژیانی سێکسیی سروشتیی بگەڕێتەوە. ئەم بۆچوونە پشت بەوە دەبەستێ کە تێبینی کراوە هۆمۆسێکسوالیتی لە مێدا تا ئاستێکی زۆر لەدوای هاوسەرێتی کەم دەبێتەوە. لە چارەسەرکردندا بایەخ

بەو حاڵەتانە دەدرێ کە مێ بەزۆری یان تەنیا پەیوەندیی سێکسیی لەگەڵ هاوتوخمەکەیدا هەیە و ئەمەش کاریگەرییەکی ڕیشەیی بۆ سەر پەیوەندیی هاوسەرێتیی دەبێ، یان هەر ڕێگر دەبێ لە بەردەم ئەم مێیەدا کە پەیوەندیی هاوسەرێتی لەگەڵ پیاودا ببەستێ، هەروەها سەرباری ئەم حاڵەتانە، بایەخ بەوانەش دەدرێ کە پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتی یان لەیزبینیزم هاوکاتە لەگەڵ ژمارەیەک لادانی دیکە و پشێویی ڕەفتاری یان دەروونی یان ئەقڵی.

بەکارهێنانی هۆیە ماددییەکان لە چارەسەرکردندا، وەک بەکارهێنانی هۆرمۆنەکان بێسوودە لە گۆڕینی ئاراستەی سێکسی لە مێدا، ئیدی چارەسەرە هۆرمۆنییەکە لەڕێی پێدانی هۆرمۆنی مێینەوە بێ لەو ژنانەدا کە پیاوانە هەڵکەوتوون و لە پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتیدا ڕۆڵی پۆزەتیڤ و بکەر دەبینن، یان لەڕێی پێدانی هۆرمۆنی نێرینەوە بێ بەو ژنانەی کە خەسڵەتەکانی مێینەتی تیایاندا زۆرە و لە پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتیدا ڕۆڵی نێگەتیڤ و پێشوازیکەر دەبینن، لەم ڕووەوە تەواوی چارەسەرکردنەکان لەڕێی هۆرمۆنەوە بۆ گۆڕینی هەردوو ئاڕاستەکە شکستییان هێناوە. لەبەر ئەوە زیاتر پشت بە شێوازەکانی دیکەی چارەسەرکردن بەستراوە، بۆ نموونە چارەسەرکردن لەڕێی باشکردنی بارودۆخی ژیانی ئەو کەسە تا بە ئاڕاستەی سروشتیدا بڕوات. هەرچەندە زۆربەی کات ئەستەمە ئەو هۆکارانە دەستنیشان بکرێن کە وا لە مێ دەکەن لە قۆناغێکی سێکسیی دیاریکراوی گەشەدا بمێنێتەوە کە قۆناغی هۆمۆسێکسوالیتییە، بەڵام دەستنیشانکردنی ئەم هۆکارانەش لەوانەیە نەبێتە هۆی زاڵبوون بەسەر حاڵەتەکەدا، بەڵام ئەم واقیعە نابێ لە بایەخی تێبینیکردنی باوان بۆ کچەکانیان کەم بکاتەوە کە پێویستە بەئاگابن لە ئاڕاستەی دەروونی و سێکسی کچەکانیان لە

ماوەی قۆناغەکانی منداڵی و مێردمنداڵی و هەرزەکاریدا، هەروەها هەوڵدان بۆ کەمکردنەوەی پاڵنەرەکانی ئاراستەگرتنی سێکسی و قووڵبوونەوە لە پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتی بە هەموو شێوەکانییەوە.

پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتی لە مێدا یان کە پێی دەوترێ لەیزبینیزم بەنیسبەت زۆر لەوانەی پیادەی دەکەن، تەنیا دەروازەیە بۆ خامۆشکردنەوەی تینوێتیی سێکسییان، بەتایبەتی لە ماوەی بەر لە هاوسەرێتی، یان لە کاتی دواکەوتنی هاوسەرێتی و قەیرەیی درێژخایەن، یان بەردەوامدا، هەرچەندە دەکرێ تا ئاستێکی زۆر ڕێگە لە ئەنجامدانی ئەم پەیوەندییانە بگیرێ، بەڵام ڕێگرتن لێی بە تەواوی دەشێ لەسەر حیسابی تەندروستیی دەروونیی ژن بێ. لەبەر ئەوە هەندێ کەس بەم شێوەیە بەهانە بۆ ڕوودانی دەهێننەوە. لەوانەیە بوونی حەز و مەیلی سۆزداری و سێکسیی مێ بەرامبەر مێیەکی هاوتوخمی خۆی، تا ئاستێک شتێکی سروشتی بێ و یارمەتیی مێ بدات لە گەشەکردن و دەستکەوتنی ناسنامەی مێیەتیی خۆی، بەڵام بەردەوامبوونی مانەوەی ئەم حەز و مەیلانە، یان کاتێک ڕەوتێکی پەرگیر وەردەگرن، واتە ئەو مێیە بە شێوەیەکی زیادەڕۆییانە یان بە زۆری لە پەیوەندیی سێکسیدا پەیڕەوی ئەو ئاراستەیە دەکات، ئەوا بە شتێکی ناسروشتی دادەنرێ و ئاماژە بە ڕوودانی تێکچوون و بارێکی ناسروشتی دەدات لە ژیانی دەروونیی مێدا. هەر بە واقیعیش دەرکەوتووە، ئەو مێیانەی حەز و مەیلی سێکسییان لە سنووری سروشتی تێپەڕیوە، هەست بە دڵەڕاوکێ و نەبوونی ئاسوودەیی دەکەن و پێویستیان بە مێیەکی وەک خۆیانە هۆگری ببن و جێگەی دایکیان بۆ بگرێتەوە و بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییەکانیان پشتی پێ ببەستن. بۆ چارەسەرکردنی ئەو مێ یان کچ و ژنانەی بەدەست ئەم حاڵەتەوە دەناڵێنن، کە بەزۆری ئەوانەن لە پەیوەندیی لەیزبینیزمی یان هۆمۆسێکسوالیتییان لەگەڵ هاوتوخمەکەی خۆیاندا ڕۆڵی نێگەتیف دەبینن، وا پێویست دەکات ئاسوودەیی و دڵنەوایی بۆ

ژیانیان بگەڕێنرێتەوە، یارمەتییان بدرێ لەڕێی هۆکاری دیکەوە بەدەر لە پەیوەندیی سێکسی، قەرەبووی بێبەشبوونیان لە دایکیان بۆ بکرێتەوە، بەڵام ئەو مێیەی کە لە پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتی یان لەیزبینیزمدا لەگەڵ مێیەکی دیکەدا ڕۆڵی پۆزەتیڤ و بکەر دەبینێ، بەدەست ئەو خەسڵەتانەوە ناناڵێنێ، هێندەی ئەوەی ڕقی لە ڕۆڵی پیاو دەبێتەوە لە ژیاندا و ئیرەیی پێ دەبات، ئەم حاڵەتە ئادلەر بە "سکاڵاکردنی نێرینەیی" وەسفی دەکات و فرۆید بە "ئیرەیی چووک" ناوی دەهێنێت. ئەم حاڵەتە دەروونییە بریتییە لە کۆبوونەوەی ڕق بەرامبەر پیاو و دەسەڵاتی پیاو، لەگەڵ دەرخستنی لایەنە نێرینەییەکان لەو مێیەدا کە تووشی ئەم حاڵەتە بووە، کە حاڵەتێکی دەروونیی دژبەیەکە، چونکە مێ ڕقی لە پیاو دەبێتەوە، بەڵام لە پەیوەندیی سێکسییشدا ڕۆڵی ئەو دەبینێ.

لەو هۆیانەی کە بۆ چارەسەرکردنی حاڵەتەکانی لەیزبینیزم بەکار دێ، چارەسەری ڕەفتارییە کە پشت بە تیۆرەکانی مۆرکوەرگرتن لە ڕەفتاردا دەبەستێ، ئامانجی ئەم هۆیانەی چارەسەرکردن بریتین لەمانە:

یەکەمیان: کەمکردنەوەی ئەو دڵەڕاوکێیەی بەهۆی پەیوەندیی سێکسیی سروشتییەوە دروست دەبێ.

دووەم: زیادکردنی وەڵامدانەوە بۆ پەیوەندیی سێکسیی سروشتی.

سێیەم: دروستکردنی ڕەفتاری سێکسیی سروشتی.

چوارەم: کەمکردنەوەی بایەخدان و گرنگیدان بە لادانە سێکسییەکان و ڕەفتارە سێکسییە ناسروشتییەکان. لە بەشی تایبەت بە چارەسەرکردنی کێشەکانی سێکس وەک پەککەوتن و لادان، باسی هۆیەکانی چارەسەرکردنی ڕەفتاری دەکەین.

**لەیزبینیزم و یاسا**

بە درێژایی سەردەمەکان، لەیزبینیزم هێندەی هۆمۆسێکسوالیتی لە نێردا ڕووبەڕووی ڕەتکردنەوە و کۆتوبەند نەبووەتەوە، هەرچەندە لە هەندێ سەردەمی مێژووییدا، وەک سەردەمی هۆمیرۆس، قەدەغەکردن و حەرامکردنی لەیزبینیزم لە قەدەغەکردن و حەرامکردنی هۆمۆسێکسوالیتی لە نێردا تێپەڕیوە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی لە زۆربەی سەردەمە مێژوویی و شارستانییەتەکاندا بە شێوەیەکی هێورتر لەیزبینیزم یان هۆمۆسێکسوالیتی لە مێدا تەماشا کراوە و کەمتر لە هۆمۆسێکسوالیتی لە نێردا ڕەت کراوەتەوە و بە گوناهـ و تاوان دانراوە، لەوانەیە هۆکاری ئەم جیاوازییە لە حوکمدان بەسەر ئەم ئەم دوو حاڵەتەدا بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە لەیزبینیزم لە مێدا وەک هۆمۆسێکوالیتی نییە لە نێردا و هێندە کار ناکاتە سەر دروستبوونی خێزان و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی، پاشان وەک لە هەندێ لە ئایینەکاندا ئاماژەی پێ کراوە، نابێتە هۆی لەکارکەوتنی سروشتی ژیانی سێکسی کە بریتییە لە پەیڕەوکردنی پرۆگرامێکی تایبەتی کە ڕووەو پیتاندن و زۆربوون ئاڕاستە دەگرێ. ژن لە پەیوەندیی سروشتیی نێوان نێر و مێ بە لایەنی وەرگر یان پێشوازیکەر دانراوە کە هیچ کارا نییە و بکەر نییە و کاریگەریی فەرمانی بکەرەکە دەکەوێتە سەری و ئەو پیتێنەر نییە لە پەیوەندییەکەدا، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا زۆربەی ئایینەکان لەیزبینیزمیان ڕەت کردووەتەوە و بە گوناهـ و سەرشۆڕی دایانناوە، بەڵام سزای ئەو مێیانەی ئەم ئاڕاستە سێکسییەیان پیادە کردووە، کەمتربووە بەراورد لەگەڵ سزای ئەو نێرانەی سێکسیان

لەگەڵ هاوتوخمەکانیاندا کردووە، هەروەها بە شێوەیەکی گشتی لە ویژدانی خەڵکیشدا، هێندەی هۆمۆسێکسوالیتی لە نێردا ڕەت نەکراوەتەوە، بەڵام هەندێک لە کۆمەڵگەکان لە "مێ"شدا ڕەتیان کردووەتەوە و یاسای تایبەتیان بۆ حەرامکردنی داڕشتووە، هەروەک لە یاسای ئینگلیزی ساڵی ١٨٨٥دا هاتووە، کە سزای نێر و مێی بە شێوەیەکی یەکسان داناوە، بەڵام بەدواداچوون و هەوڵدان بۆ گرتن و سزادانی ژنە لەیزبینییەکان کەمتربووە لە پیاوە هۆمۆسێکسوالەکان. لە سەروبەندی هەوڵدان بۆ داڕشتنی ئەو یاسایەی کە سزای ئەنجامدەرانی هۆمۆسێکسوالیتی دیاری دەکات، ماکستون Macquisten دەڵێ: "داکشانی مۆراڵی مێیەتی، تا ئاستێکی زۆر هۆکار بوو بۆ داڕمانی شارستانیەتی یۆنانی و تا ئاستێکی زیاتریش هۆکار بوو لە کەوتنی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی". لەگەڵ ئەوەشدا کە ژمارەیەک لە وڵاتانی ئەورووپی تا ئێستا لە یاساکانیاندا لەیزبینیزمیان بە حەرام و قەدەغە داناوە، بەڵام هێندە کار بەو یاسایانە ناکرێ، تەنیا لەو حاڵەتانەدا نەبێ بە ئاشکرا دەکرێ، یان لایەنێک ناچار دەکرێ و ئازار دەدرێ، هەندێک لە وڵاتانیش تا ئەو ئاستە ڕێگەیان بە لەیزبینیزم داوە کە یانە و سەندیکای تایبەتیان بۆ داناون و گۆڤار و بڵاوکراوەی تایبەتیشیان هەیە، کە تایبەتن بە کاروبار و ژیانی ئەو کچ و ژنانەی لە ژیانی سێکسییاندا ئەم ئاراستەیەیان هەڵبژاردووە.

## تابۆ سێکسییەکان

### تابۆ و سێکسی حەرام

هەندێک پەیوەندی و پراکتیزەکردنی سێکسی هەن کە لە هەندێک کۆمەڵگەدا بە شتێکی حەرام Incest دادەنرێن و ناکرێ تاک ئەنجامیان بدات، چونکە ڕووبەڕووی ئەو سزایانە دەبێتەوە کە یاسا و نەریتی ئەو کۆمەڵگەیە دیاری کردوون. لەنێو کۆمەڵگەکاندا جیاوازی هەیە لە دیاریکردنی ئەو پەیوەندی و بابەتە سێکسییانەی کە حەرام کراون و سزا دەیانگرێتەوە. ئەم جیاوازییە لەنێو کۆمەڵگەکاندا بەپێی بۆچوونی ژمارەیەک لە توێژەرانی ئەم بوارە، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە تابۆ یان سێکسی حەرامکراو بە هۆکاری دەروونی یان بایۆلۆژییەوە دروست نەبووە، بەڵکو لە ئەنجامی پێداویستیی کۆمەڵایەتیی تایبەتییەوە لە دابونەریتی کۆمەڵگەکان و شارستانییەتە جیاوازەکاندا سەری هەڵداوە. فرۆید بە شێوەیەکی تایبەتی ئەم ڕایە ڕەت دەکاتەوە و پێی وایە، وەک دواتر بە تەواوەتی ڕوونی دەکەینەوە، تابۆی سێکسی لە بناغەدا پشت دەبەستێ بە فاکتەری بایۆلۆژی و دەروونیی بۆماوەیی.

بڕوا وایە، وشەی تابۆ Taboo، کە لە تێگەیشتنی دەروونی و کۆمەڵایەتیدا مانای حەرام و قەدەغەکراو دەگەیەنێ، لە بناغەدا وشەیەکی بولینیزی بێ کە لە وشەی تاپو Tapuوە هاتووە، لە زمانی ئەو کۆمەڵگەیەدا وشەی تاپو واتە ئەو شتەی گەیشتووە بە ئاستێک لە هێز و توندی کە بە مەترسیدار دابنرێ. لە بیروباوەڕی ئەم کۆمەڵگەیە و لە شارستانییەتی دێرینیاندا، هەر بەرکەوتنێک لەگەڵ ئەو شتە مەترسیدارەدا دەبێتە هۆی وێرانکردنی خۆی، نەک لە ئەنجامی سزادانەوە، بەڵکو وەک دەرئەنجامی حەتمیی ئەو کردارە، یان ئەو شتە خۆی. ئەم ڕەچەڵەکە کۆنەی وشەکە نابێ وەک

بەڵگەیەک تەماشا بکرێ کە تابۆ یان پەیوەندیی سێکسیی حەرام لە کۆمەڵگەی بولینیزییەوە دەستی پێ کردبێ، یان ئەوان وشەی تابۆیان بۆ گوزارشتکردن لە پەیوەندیی سێکسیی حەرام دانابێ. توێژەری زمانەوانی لەوانەیە پەیوەندییەک لە نێوان وشەی (تابۆ) و وشەی (تاب)ی عەرەبی سەرنجی ڕابکێشێ، کە ئەمەی دووەمیان لە عەرەبیدا ئاماژەیە بۆ پاساشکاندن و سزا و قەدەغەکردن.

تیۆری زۆر دەربارەی چۆنێتی و پاڵنەرەکانی سەرهەڵدانی تابۆ و پەیوەندیی بە مەسەلە سێکسییەکانەوە هەیە، داروین لە کتێبەکەیدا 'ڕەچەڵەکی مرۆڤ The Descent of Man ' وا گریمانە دەکات، باپیرەگەورەکانی مرۆڤ لە شێوەی گرووپی بچووکدا ژیاون، هەر گرووپێک لە دەوری پیاوێکی بەتەمەن کۆبوونەتەوە کە ماف و دەسەڵاتی بەسەر مێیەکانی ئەو گرووپەدا هەبووە، ئەم پیاوە نەیهێشتووە نێرەکانی دیکە کە تەمەنیان لەو کەمتر بووە، یان کێبڕکێکارەکانی دیکە کە پلەوپایەیان لەو لەخواتر بووە، سێکس لەگەڵ مێیەکانی ئەو گرووپەدا بکەن. بەپێی وێنای داروین، ئەم گرووپە سەرەتاییە کاتێک منداڵە کوڕەکان هەر بە قۆناغی پێگەیشتنی سێکسی گەیشتوون، لە گرووپەکەی خۆیان دەرکراون. جێگەی سەرنجە هەمان دیاردە بە ڕوون و ئاشکرایی لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی هەندێک ئاژەڵاندا تێبینی دەکرێ، بۆ نموونە لە ئەسپی کێویدا، بەهێزترین ئەسپی نێرە دەسەڵاتی تەواوی بەسەر (ئەسپە مێیەکانی- ماین) چواردەوریدا هەیە و ئەسپە نێرەکانی دیکە کە تەمەنیان کەمترە، بەڵام لە ڕووی سێکسییەوە پێگەیشتوون، دەریان دەکات کاتێ دەیانەوێ بەشداری بکەن لە جووتبوون لەگەڵ (ئەسپە مێیەکان- ماین)دا.

فریزر (١٩١٠) پێی وایە تا ئێستا هەندێک قەبیلەی سەرەتایی ڕێگە نادەن بە ڕوودانی هاوسەرێتی لە چوارچێوەی هەمان عەشیرەتدا. فریزر هۆکاری ئەم دیاردەیە بۆ ئەوە دەگەڕێنێتەوە

که ئەم قەبیلانە بەم کارەیان گوزارشت لە ئارەزووی عەشیرەتەکانیان دەکەن تا پارێزگاری بکەن لە ڕوودانی هەر فریودانێک بۆ ئەنجامدانی سێکسی حەرام لەنێو ئەندامەکانیاندا. ئەم تێبینییە کاریگەریی زۆری بۆ سەر فرۆید هەبوو، کە پێی وا بوو ئەم حەرامکردنە لە واقیعدا تەنیا هەوڵێکە بۆ ڕێگەگرتن لە پەیوەندیی خۆشەویستیی سروشتیی نێوان دایک و کوڕ، تا بۆ پەیوەندییەکی سێکسیی حەرام پەرەنەسێنێ. بەپێی ڕای فرۆید، ئەم پەیوەندییە و سڵەمینەوەکان لێی یەکەمین بەڵگەن لەسەر سەرهەڵدانی گرێی ئۆدیپ (فرۆید ١٩١٢ – ١٩١٣). بەپێی وێنای فرۆید، ئەو کۆمەڵگە سەرەتاییەی کە تەنیا یەک پیاو سەرۆکایەتیی دەکات و دەسەڵاتی بەسەر هەموو مێیەکانیدا هەیە، کە باوکە، نێرینەکانی دیکە کە لە مێیەکان بێبەش کراون، گرێی ئۆدیب کە دەرئەنجامی بەشداریکردنی باوک لە ئارەزووی سێکسیدا دروست بووە، پاڵییان پێوە دەنێ هەوڵ بدەن لەڕێی کوشتنی باوکەوە ڕزگاریان بێ لە دەسەڵاتی باوک و لەو بێبەشبوونە سێکسییەی کە تیایدا دەژین، کاتێک باوک دەکوژن، لەبەر ئەوەی لە بناغەدا لە دەرئەنجامی ئەم کارەیان ئاگادار نەکرابوونەوە هەست بە گوناه دەکەن، ئەمەش وایان لێ دەکات تۆبە لە گوناهەکەیان بکەن لەڕێی بەرزکردنەوەی پێگەی باوکیان بۆ پێگەی تەوتەم Totem ێک بۆ عەشیرەتەکەیان، ئەمەش لە ویژدانیاندا سیمبولە بۆ باوک، کە حەرام کراوە بکوژرێ، ئیدی سروشتی ئەم سیمبولە هەرچییەک بێ، کە بەزۆری یەکێکە لە ئاژەڵەکان. لە ڕوانگەی فرۆیدەوە ئەم هەڵوێستە بووەتە هۆی بەستنی پەیوەندیی هاوسەریێتی لە دەرەوەی قەبیلەکە. بەپێی ئەم لێکدانەوەیەی سەرهەڵدانی تەوتەم و تابۆ، فرۆید بنەماکانی گرێی ئۆدیبی لە سایکۆلۆژیدا دۆزییەوە، ئەم گرێیە دوو ڕەگەزی سەرەکی لەخۆ دەگرێ، کە بریتین لە تابۆ سێکسییەکان لەگەڵ ڕێگەنەدان بە کوشتنی باوک. فرۆید پێی وایە

سەرەتاکانی ئایین و مۆراڵ و کۆمەڵگە و هونەر، سەرجەمیان لە گرێی ئۆدیپدا کۆدەبنەوە.

لە ئەنجامی توێژینەوە لەم تویژانەی فرۆید، دەردەکەوێ کە فرۆید لەم بۆچوونانەیدا یەکەم کەس نەبووە، بۆ نموونە ئاتکنسون (١٩٠٢) لە کتێبەکەیدا (یاسای سەرەتایی) باس لەوە دەکات، ئەم یاسایە کاتێ دەرکەوتووە کە خۆشەویستیی دایک بەسەر غیرەی باوکدا زاڵ بووە و ڕێگەی بە بچووکترین کوڕی ناو خێزانەکە داوە لەناو چوارچێوەی کۆمەڵگەی ماڵەوەدا بمێنێتەوە، هاوکات ڕێگربووە لە ئەنجامدانی سێکسی حەرام، یان تابۆ لەو کۆمەڵگە بچووکەدا وەک هۆکارێ بۆ دابینکردنی سازان لەنێو ئەندامەکانیدا، بەم شێوەیە وردەوردە ڕێگە دراوە کە کوڕانی تەمەن گەورەتریش لە هەمان کۆمەڵگەدا، یان گرووپدا بمێننەوە، ئەمەش وای کردووە یاساکانی خزمایەتی ئاڵۆزتربن. بەپێی ڕای فرۆید، پەیوەندییە سێکسییە تابۆ یان قەدەغەکراوەکان، یاسایەکی کۆمەلایەتیی کتوپڕ نین بەنیسبەت تاکەوە و لە ژیاندا فێری ببن، بەڵکو بریتین لە ڕستێک لە ئامادەباشیی بایۆلۆژیی ئەندامی. لەم بارەیەوە دەڵێ: "ئەو ئاستەنگەی ڕێگرە لە بەردەم ئەنجامدانی سێکسی تابۆ یان قەدەغەکراودا، دەشێ بۆ توانا مرۆییەکانی پشتە دوورەکانی، یان باوباپیرانی مرۆڤ بگەڕێتەوە، وەک هەر شتێکی قەدەغەکراوی دیکە، لەڕێی پرۆسەی بۆماوەی ئەندامییەوە، لە دەروونی زۆربەی تاکەکاندا جێگیربووە" (فرۆید ١٩١٥). پاش ئەم وتەیە، فرۆید ئەمەی بۆ زیاد کرد: "منداڵان ناچارن بە کورتی مێژووی مرۆڤایەتی دووبارە بکەنەوە لەڕێی چەپاندنی هەر مەیلێک، یان هەڵبژاردنێک کە هەیانە بۆ بابەتە سێکسییە تابۆ، یان قەدەغەکراوەکان".

***

ئەستەمە ئەو کاتە مێژووییە دیاری بکرێ کە تیایدا پەیوەندییە سێکسییەکان دەستیان پێ کردووە و دواتر پەیوەندییە تابۆ یان قەدەغەکراوەکانیشی لەخۆ گرتووە، هەروەها ئەستەمە ئەو ماوە

زەمەنییە دیاری بکرێ کە تیایدا هەندێ جۆری پەیوەندیی سێکسی حەرام کراوە و ئایا لەبەر چی حەرام کراون. لەوانەیە شتێکی ماقووڵ و لۆژیکی بێ ئەو گریمانەیە بکەین کە یەکەمین پراکتیزەکردنی ڕەهای پەیوەندیی سێکسی لە سەردەمە سەرەتاییەکانی مرۆڤایەتیدا بووە، پاشان ئەم پراکتیزەکردنە سێکسییە بەهۆی دەرئەنجامی دەستبەسەراگرتن و دەسەڵات و هێزەوە سنووردار کراوە، سەرباری کاریگەریی کۆمەڵێک فاکتەری کۆمەڵایەتیی دیکە کە پەیوەندییان بە زۆربوون و مانەوە هەبووە و لێرەشەوە پێویستیی بۆ پاراستنی ناسنامە سەری هەڵداوە، لەمانەشەوە ئەو یاسا و ڕێسا ئایینی و کۆمەڵایەتییانە چڕبوونەتەوە کە پەیوەندییە سێکسییەکانیان ڕێکخست و سنووریان دانا کە چی ڕێگەپێدراوە و چی قەدەغەکراوە. هیچ زانیارییەکی ئەوتۆمان لە بەردەستدا نییە دەربارەی ئەو تابۆ سێکسییانەی قەومە سەرەتاییە دێرینەکان پراکتیزەیان کردوون، یان قەدەغەیان کردوون، تەنیا دەتوانین دەربارەی پراکتیزە سێکسییەکانی قەومە سەرەتاییە هاوچەرخەکان گریمانە بکەین، بەڵام مێژووی شارستانییەتە دێرینەکان هەندێک زانیاری بەدەستەوە دەدات کە تیشک دەخەنە سەر ئەو تابۆ، یان قەدەغەکراوانە. دێرینترین ئەم شارستانییەتانە، شارستانییەتی بابلییە کە یاسای تایبەتی بۆ قەدەغەکردنی هەندێ پەیوەندیی سێکسی داناوە، هەروەک لە یاسای حامورابیدا (١٧٢٨ – ١٦٨٦ پ.ز) دەردەکەوێ. کە بە دێرینترین یاسای تۆمارکراوی مرۆڤایەتی دادەنرێ، لەم یاسایەدا هەندێ ماددە هاتوون، وەک: ماددەی ١٥٤: (ئەگەر باوک لەگەڵ کچەکەی خۆیدا جووت بوو، ئەوا دەبێ شار بەجێبێڵێ). ماددەی ١٥٥: (ئەگەر باوک ژنێکی بۆ کوڕەکەی دیاری کرد، پاشان خۆی لەسەر سنگی خەوت و بەو شێوەیە بینران، ئەوا ئەو پیاوە دەبەسترێتەوە و بۆ ناو ئاو فڕێ

دەدرێ). ماددەی ١٥٦: (ئەگەر باوک ژنێکی بۆ کوڕەکەی دیاری کرد، بەڵام کوڕەکەی لەگەڵیدا جووت نەبوو، بەڵکو باوکەکە لەسەر سنگی خەوت، ئەوە پێویستە نیو مینا لە زیو بدات و... هتد- مینا پێوەرێکە). ماددەی ١٥٧: (ئەگەر پیاوێک لەدوای مردنی باوکی لەسەر سنگی دایکی خەوت، ئەوا سزاکەیان، سووتاندنی هەردووکیانە). ماددەی ١٥٨: (ئەگەر پیاوێک لەدوای مردنی باوکی لەگەڵ باوەژنیدا "واتە ژنی دووەمی باوکی" کە منداڵی لێی هەبووبێ، جووت بوو، ئەوا ڕێگەی هاتوچۆکردنی بۆ ماڵی باوکی لێ قەدەغە دەکرێ).

لە دەقی ئەم ماددانەدا دەردەکەوێ کە توندترین سزا دانراوە بۆ پەیوەندیی سێکسیی نێوان دایک و کوڕ، تا ئێستاش لە زۆربەی زۆری کۆمەڵگەکاندا بە توندترین شێوە ئەم پەیوەندییە سێکسییە قەدەغە و حەرام کراوە و توندترین سزای بۆ دانراوە. لە سەردەمەکانی دواتردا ئاشوورییەکان یاسای حەرامکردن یان قەدەغەکردنی زیاتریان هێنا کە ناسراون بە (یاسای ئاشوورییەکانی سەدەی ناوەڕاست) کە بۆ سەدەی پانزەی بەر لە زاین دەگەڕێنەوە. لەم یاسانە وەک ئەو ماددەیەی سزای ئەو پیاوە دەدات کە دراوسێی پیاوەکەی تۆمەتباری دەکات بەوەی سێکسی لەگەڵدا کردووە، ئیدی ئەمە بە نهێنی باس بکات، یان بە ئاشکرا و لە کاتی شەڕدا بیدرکێنێ، سزای تاوانبار لێدانی پەنجا جەڵدە و کارکردنی سەخت بۆ ماوەی مانگێک، هەروەها دەخەسێنرێ و دەبێت پارەش بدات. لە ماددەی دواتردا هاتووە (ماددەی ٢٠): (ئەگەر پیاوێک لەگەڵ دراوسێی پیاوەکەیدا سێکسی کرد، لە کاتی دادگاییکردن و ئیدانەکردنیدا، حوکمەکەی ئەوە دەبێ کە پیاوێکی دیکە هەمان شت لەگەڵ ئەودا بکات کە ئەو لەگەڵ دراوسێکەیدا کردوویەتی و پاشان دەخەسێنرێ). لەم ماددانە دەردەکەوێ کە قەدەغەکردن و حەرامکردنی هەندێ پەیوەندیی سێکسی،

دراوسێشی گرتووەتەوە، هەرچەندە ئەوە ڕوون نییە بۆچی قەدەغەکردنی پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ دراوسێدا، تەنیا پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتیی نێوان پیاو و پیاوی گرتووەتەوە.

لەو یاسایانەی کە هیتییەکان(*) دایانڕشتووە، ئەم مادده یاساییانەی تیادایە سەبارەت بە سێکسی تابۆ یان حەرام یان قەدەغەکراو: (ئەگەر پیاوێک لەگەڵ بەراندا سێکسی کرد، سزاکەی لەسێدارەدانی ئەو پیاوەیە کە دەهێنرێتە بەردەم پادشا و ئەو فەرمان دەردەکات بە کوشتنی، یان بەخشینی، بەڵام پادشا نابێ بەزەیی پیادا بێتەوە)، (ئەگەر پیاوێک لەگەڵ دایکیدا، یان لەگەڵ کچی خۆیدا، یان لەگەڵ کوڕی خۆیدا سێکسی کرد، ئەمە بە تاوان دادەنرێ و سزاکەی لەسێدارەدانە)، (ئەگەر پیاوێ لەگەڵ ژنی باوکیدا سێکسی کرد، ئەگەر باوکی نەمابێ، ئەوا هیچ سزایەکی لەسەر نییە، بەڵام ئەگەر باوکی لە ژیاندا بێ، ئەوا بە تاوان دادەنرێ و سزاکەی مردنە)، (ئەگەر پیاوێک لەگەڵ چەند ژنێکی شووکردوودا، نەک کۆیلە، سێکسی کرد، کە ئەو ژنانە خوشک و دایکی یەکدی بوون، بەڵام هەریەکەیان لە شارێ بوون و پیاوەکەش نەیزانیبێ هیچی یەکدین، هیچ سزایەک نادرێ، بەڵام ئەگەر ئەو دایک و کچانە هەموویان لە یەک شاردا بژین و پیاوەکەش بە پەیوەندیی نێوانیان بزانێ، واتە بزانێ ئەوان دایک و خوشکی یەکدین، ئەگەر لەگەڵیاندا سێکسی کرد، ئەوا بە تاوان دادەنرێ و سزاکەی مردنە)، (ئەگەر پیاوێ سێکس لەگەڵ ژنی براکەیدا بکات و براکەشی لە ژیاندا بێ، ئەوا بە تاوان دادەنرێ و سزاکەی مردنە)، (ئەگەر پیاوێ ژنێک بێنێ کە پێشتر شوویەکی کردبێ و کچێکی هەبێ لە پیاوێکی دیکە، ئەگەر ئەو پیاوە سێکس لەگەڵ کچی ئەو ژنەدا بکات، ئەوا بە تاوان دادەنرێ و سزاکەی مردنە)، (ئەگەر پیاوێ کچێکی هێنا و دواتر سێکسی لەگەڵ دایک و خوشکی ژنەکەیدا کرد، ئەوا بە تاوان دادەنرێ و سزاکەی مردنە).

ئەم مادده یاساییانە بەرفراوانتر بوون و یاسای قەدەغەکردن و سزادانی دیکەی گرتووەتەوە کە تایبەت بوون بە پەیوەندیی سێکسیی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ، تەنانەت لە نێوان ئاژەڵ و جۆرێکی دیکە لە ئاژەڵ. یەکێک لەو مادده یاساییانە دەڵێ: (ئەگەر مرۆڤ لەگەڵ بەراز یان سەگدا کارێکی ناشیرینی کرد، ئەوا حوکمەکەی مردنە -مەبەست لە کاری سێکسییە-). دادگاییکراو دەهێنرێتە بەردەم دەروازەی کۆشک، پادشا فەرمان دەدات بە کوشتنی، یان هێشتنەوەی لە ژیاندا، بەلام پیاوەکە بۆی نییە داوای پیاچوونەوەی حوکمی پادشا بکات. ئەگەر گایەک دەستدرێژیی کردە سەر پیاوێ، ئەوە گاکە دەکوژرێ و پیاوەکە لە ژیاندا دەمێنێتەوە، هەروەها دەکرێ یەک سەرمەڕ بۆ مێگەلی پیاوەکە زیاد بکرێ، بەلام ئەگەر بەراز دەستدرێژیی کردە سەر پیاوێ، ئەوا هیچ سزایەک نییە بۆ هیچیان. ئەگەر پیاوێ سێکسی لەگەڵ ئەسپ، یان ئێستردا کرد، هیچ سزایەک نادرێ، نە پادشا و نە کاهن بەم حوکمەدا ناچنەوە. ئەگەر پیاوێ لەگەڵ ژنێکی غەریبەدا سێکسی کرد، پاشان لەگەڵ دایکی ئەو ژنە و کچەکانیدا، ئەوا هیچ سزایەک نادرێ.

لەم مادده یاساییانە و چەندەهای دیکەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە کۆمەڵگە شارستانییەتە دێرینەکان، یاسا و ڕێسایان بۆ پەیوەندییە سێکسییەکان جێگیرکردووە و هەندێ لەم پەیوەندییانەیان حەرام کردووە و ئەم حەرامکردنەش بە پلەی جیاواز بووە، ئەو یاسایانەشیان داڕشتووە کە سزای بۆ ئەم جۆرە کارە حەرامکراوانەیان داناوە، کە یاساکان زۆر توند بوون و لە زۆربەی شارستانییەتە دێرین و تازەکاندا کاریان پێ کراوە. ئەو کەسەی بەدواداچوون بۆ کاروانی شارستانییەت و دەرکەوتنی ئایینەکان بکات، دەبینێ پەیوەندییەک هەیە لە نێوان ڕێسا و یاسا کۆنەکان و ئەو یاسا و نەریتە کۆمەلایەتییانەی کە بەدوایاندا هاتوون، بۆ نموونە تەورات هەندێ پەیوەندیی سێکسیی حەرام کردووە: (تۆ نابێ لەگەڵ پیاوێکدا وەک ژن جووت ببی، ئەمە زۆر خراپە، نابێ سێکس لەگەڵ

ئاژەڵدا بکەیت، تۆ بەمە خۆت پیس دەکەیت، ڕێگەش نادرێ مێ لەگەڵ ئاژەڵدا جووت بێ، ئەمە لادان و دەرچوونە لە سروشت...)، تەورات سنووری حەرامکردنی بەزاندووە، تەنانەت بۆ پەیوەندیی سێکسیی نێوان ئاژەڵێک و ئاژەڵێک لە جۆرێکی دیکە، دەڵێ: (...نابێ دوو ئاژەڵ کە لە دوو جۆری جیاواز بن، پێکەوە جووت بێن، دوو تۆوی جیاواز لە کێڵگەکەتاندا پێکەوە مەڕوێنن، پۆشاکی لۆکە لە دوو جۆری جیاواز لە خوری مەڕێسن). ئەم ڕێنماییانەی تەورات تا ئاستێکی زۆر لەو یاسایانە دەچێ کە بابلی و ئاشوورییەکان و هیتییەکان بەر لە تەورات دایانڕشتووە. حەرامکردن لە تەوراتەوە بۆ ئینجیل بەردەوام بوو، زۆربەی زۆری حەرامکردن و قەدەغەکردنەکان بۆ ئەو کارە سێکسییانە بوو کە نێر دەیکردن، هەروەها تەواوی ئەو پەیوەندییە هۆمۆسێکسوالیتییانەی کە نابنە هۆی زۆربوون و نەوەخستنەوە، بەڵام کڵێسە سێکسی نێوان دوو نێر، یان سێکسی نێوان نێرێک و مێیەکی کە سێکس لە نێوانیاندا حەرامە، بە خراپترین کاری سێکسی داناوە، هەر بۆیە شاری (سودم) و پێنج شارەکەی دیکە دەبوو وێران بن، چونکە ئەم جۆرە کارە سێکسییانە تیایاندا کرا و خەڵکەکەی خراپترین کاری قەدەغەکراو و حەرامکراو و گەورەترین گوناهیان ئەنجام دا، بەڵام لە شارستانییەتی دێرینی میسردا، کارە سێکسییە حەرام و قەدەغەکراوەکان بە شێوەیەکی بەرفراوان و لەسەر هەموو ئاستەکان ئەنجام دەدرا، بێ ئەوەی هیچ سزایەک هەبێ، لەوانەیە میسرییەکان پەیڕەوی خواوەندەکانیان کردبێ لە پراکتیزەکردنی ئەم کارە حەرامانەدا. لای یۆنانییەکانیش، هەرچەندە بە ئیباحییەتی سێکسی ناسراون و لە ماوەی دووروودرێژی شارستانییەتییەکەیان بەم ڕەفتارانەدا هەڵیان داوە، بەڵام لە سەردەمی هۆمیرۆس و سەردەمەکانی دواتریشدا هۆمۆسێکسوالیتییان قەدەغە کرد، هەروەها لەگەڵ ئەوەشدا کە بەپێی ئەفسانەکان ڕێگە بە خواوەندەکانیان دراوە ئەم کارە بکەن، بۆ نموونە (زیۆس)، (هیرا)ی خوشکی لە خۆی مارەکرد، بەڵام ئەمە بۆ مرۆڤ قەدەغە کرا، تەنانەت پیاو بۆی نەبوو

لەگەڵ دۆستی باوکیدا جووت ببێ و بە حەرام دانرابوو لێی نزیک ببێتەوە. هۆمیرۆس لە داستانەکەیدا بە شێوەیەکی یەکلاییکەرەوە هۆمۆسێکسوالیتیی لە مێدا قەدەغە کردووە، بەڵام ئەم قەدەغەکردنە لە سەردەمەکانی دواتردا گۆڕانی بەسەردا هات. ئەمانە و تەنانەت بۆ پادشا حەرام بوو لە یەک کاتدا دوو ژنی هەبێ، بەڵام ژنە دۆستەکانیان نەخرابوونە ناو چوارچێوەی قەدەغەکردن، یان حەرامکردن.

لە ئایینی ئیسلامیشدا کارە سێکسییە حەرامەکان بە ئاشکرا دیاری کراون، هەرچەندە هەندێ کاری حەرامی دیکە هەن کە لە قورئاندا باس نەکراون، هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەندێ لەو ڕەفتار و کارانە خۆیان بە دەگمەن لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا لە کاتی هاتنەخوارەوەی قورئاندا ڕوویان داوە، یان لەبەر ئەوەیە یاسا کۆمەڵایەتییەکان خۆیان بەو شێوەیە ئەو شتانەیان قەدەغە کردووە کە لە ڕۆحی ئیسلام دەرنەچێ. ئایەتێکی پیرۆز لە سورەتی (النساء)دا بە ئاشکرایی و دیاریکراوی و سەراپاگیری، باسی لە کارە سێکسییە حەرامەکان کردووە.

**پەراوێز:**

*هیتیەکان: نەتەوەیەکی دێرینی ئاسیای بچووک و باکووری سووریان، لە ٣٠٠٠ی پ.ز لە سووریا نیشتەجێبوون، لە هەمان ئەو کاتانەی سۆمەرییەکان لە وڵاتی ڕافیدەین نیشتەجێبوون، سەر بە هۆز و تیرەی ئەنەدۆڵ بوون، بە خەتا ناسرابوون، وڵاتەکەیان لە سەردەمی شانشینی دووەمدا بە وڵاتی خاتتا یان حاتتا یان خاتی ناو دەبرا -وەرگێڕ.

# دەرمان و سێکس

## کاریگەریی دەرمان بۆ سەر هێزی سێکسی

هەر لە کۆنەوە دەرمان لە سەرچاوەی جیاوازی ڕووەکی و ئاژەڵی و کیمیایی، بە ئامانجی دروستکردنی گۆڕانکاری لە هێزی سێکسیدا بەکار هاتووە. زۆربەی زۆری بایەخپێدانەکان لە ڕابردوودا و تا ئێستاش بۆ دۆزینەوەی ئەو دەرمانانەیە کە هێزی سێکسی چالاک دەکەن، بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا بایەخێکی هاوشێوە درا بە لێکۆڵینەوە دەربارەی کاریگەریی نێگەتیڤی ئەو دەرمان و ئامادەکراوانە بۆ سەر ژیانی سێکسی کە مرۆڤ خۆبەخۆ، یان بە مەبەستی نۆژداری و چارەسەرکردن بەکاریان دەهێنێ. بەهۆی ئەو ژمارە بێشومارەی دەرمانە بەکارهێنراوەکان، لە ئێستادا ئەستەمە بەدواداچوون بۆ کاریگەرییان بۆ سەر ژیانی سێکسی بکرێ، یان بتوانرێ بە شێوەیەکی یەکلاییکەرەوە لەوە دڵنیا بین، ئایا دووهێندبوونی وزەی سێکسی بەهۆی کاریگەریی پۆزەتیڤی ئەو دەرمانانەوە بووە، یان بەهۆی ئەو حاڵەتی نەخۆشییانەوە بووە کە بەم دەرمانانە چارەسەر کراون؟

زانیاریی زۆر لە بەردەستدان کە ئەوە دەسەلمێنن بەکارهێنانی هەندێ دەرمان کاریگەرییەکی لەکارخەرییان هەیە بۆ سەر ژیانی سێکسی لە زۆربەی حاڵەتەکاندا، بەڵام کاریگەریی هەر دەرمانێک یان ئامادەکراوێک تەنیا لە کاریگەریی فارماکۆلۆژیی دیاریکراوی ئەو دەرمانەدا کۆنەبووەتەوە، چونکە ئەم کاریگەرییە لە ڕووی سێکسییەوە پرۆسەیەکی ئاڵۆزە و کۆمەڵێک فاکتەری دەروونی و تایبەتی و ئاستی چاوەڕوانیی ئەو کەسەی دەرمانەکە دەخوات، لەخۆ دەگرێ، سەرباری فاکتەری ئەو پەیوەندییە سێکسییەی لە

نێوان ئەو کەسەدا کە دەرمانەکە دەخوات لەگەڵ هاوبەشە سێکسییەکەیدا. لەبەر ئەوە کاریگەریی دەرمان، ئیدی هەر دەرمانێک بێ، تەنیا یەک فاکتەرە لەنێو کۆمەڵێک فاکتەری دیکەدا کە هەموویان کەم تا زۆر کاریگەرییان هەیە، دەشێ ئەو دەرمانە کاریگەرییەکی جیاواز دروست بکات لە ڕووی دەرئەنجامەوە، ئەویش بەهۆی بەرئەنجامی کارایی فاکتەرەکانی دیکەی غەیری دەرمانەکە، بۆ نموونە دەرمانە هێورکەرەوەکان لە ئاژەڵان و کەسانی سروشتیدا پاڵنەری سێکسی و هێزی سێکسی کەم دەکەنەوە، بەڵام ئەگەر بدرێ بەو نەخۆشانەی کە دڵەڕاوکێیان هەیە، ئەوا هێزی سێکسییان زیاد دەکات، چونکە ئەو دەرمانە دڵەڕاوکێکەیان ناهێڵێ و ئەمە وا دەکات بایەخ و ئاڕاستەیان ڕووەو ئارەزووی سێکسی بڕوات.

بۆ بەدواداچوون و ڕوونکردنەوەی کاریگەریی دەرمانەکان بۆ سەر ژیانی سێکسی، لێرەدا پوختەی ئەوانە دەخەینە ڕوو کە لە بەشەکانی دیکەی ئەم کتێبەدا باسمان کردوون، ئەویش ئەوەیە، ژیانی سێکسیی تاک، بە سنوورە ڕاستەقینەکانییەوە لە دوو ڕەگەز یان دوو قۆناغ پێک دێ. ڕەگەزی یەکەم: پاڵنەری سێکسی، یان ئەوەی کە پێی دەوترێ لیبیدۆ. هەرچی ڕەگەزی دووەمە کە بەشی دووەمی ژیانی سێکسییە، بریتییە لە ڕەگەزی ئەنجامدانی ڕاستەقینەی کرداری سێکس کە لە وەڵامدانەوە سێکسییە ڕاستەقینەکان پێک دێ و لە 'نێر'دا بریتییە لە ڕەپبوون و هاویشتنی تۆو، لە 'مێ'دا بریتییە لە ئۆرگازم.

ڕەگەزی یەکەم، کە بریتییە لە ڕەگەزی پاڵنەری سێکسی، ملکەچی دەسەڵاتی ناوەندە کۆئەندامی دەمار و کۆئەندامی هۆرمۆنییە. هەرچی ڕەگەزی دووەمە، بە پلەی یەکەم ملکەچی دەسەڵاتی خۆییە دەمارەکانە، واتە پاراسەمپەساوی، (کە لە نێردا دەسەڵاتی بەسەر ڕەپبوون و لە مێدا دەسەڵاتی بەسەر ئۆرگازمدا

هەیە)، لەگەڵ دەمارەکانی پاراسەمپەساوی (کە دەسەڵاتیان بەسەر تۆوهاویشتن لە نێر و ئۆرگازم لە مێدا هەیە). هەرچەندە بناغەی دەماری و هۆرمۆنی لە ژیانی سێکسیدا بناغەیەکی زۆر گرنگە، بەڵام تەواوی تێبینی و لێکۆڵینەوەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە فاکتەرە دەروونی و کۆمەڵایەتی و شارستانییەتەکانیش بایەخیان لەو کەمتر نییە لە دروستکردنی وێنەی سەراپاگیری هەریەک لە پاڵنەری سێکسی و کرداری سێکسی. کاتێک دەرک بە سەرچەم ئەم فاکتەرانە دەکەین، ئیدی سروشتییە چاوەڕێی ئەوە بکەین، هەر دەرمانێ، یان ئامادەکراوێ کە دەبێتە هۆی لەکارخستنی ناوەندە دەماری، یان هۆرمۆنییەکان، هەر دەبێ بشبێتە هۆی لەکارخستن یان لاوازکردنی هێزی سێکسی کە لە پاڵنەری سێکسی و کرداری ڕاستەقینەی سێکسدا دەردەکەوێ. پێچەوانەی ئەمە ڕوو دەدات ئەگەر ئەم دەرمانانە کاریگەریی چالاککەرەوەیان هەبوو، تەنانەت ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بێ، یان بە بڕی کەم بەکارهاتن، چونکە هەندێ دەرمان دەشێ کۆئەندامی دەمار چالاک بکاتەوە، لەبەر ئەوە هێزی سێکسیش زیاد دەکات ئەگەر بە بڕی کەم وەرگیرا، وەک خواردنەوە کهولییەکان، بەڵام هەمان ئەم دەرمانە چالاککەرەوانە لەوانەیە کاریگەریی لەکارخەر و لاوازکەریان هەبێ ئەگەر بە بڕی زۆر و بۆ ماوەی دووروودرێژ بەکارهاتن. لێرەدا پوختەی ئەو دەرمانانە دەخەینە ڕوو کە بەڵگەی پێویست لە بەردەستایە دەربارەی کاریگەرییان کە دەبنە هۆی لەکارخستن یان لاوازکردنی هێزی سێکسی، ئەگەر بۆ ماوەیەکی کاتیش هەبێ لە هەندێ لەو کەسانەی کە بەکاری دەهێنن، بەتایبەتی ئەو کەسانەی بە بڕی تەواو وەریدەرگرن و بۆ ماوەی دووروودرێژ بەکاری دەهێنن.

آ- دەرمانە لاوازکەرەکانی سێکس

١- ئەو دەرمانانەی کە دژی بەرزبوونەوەی فشاری خوێنن: زۆربەی ئەو دەرمانانەی کە لە چارەسەرکردنی بەرزیی فشاری خوێندا بەکاردێن، کار دەکەنە سەر کاری سێکسی، لەو دەرمانانە وەک: ئسمالین Ismelin، ئامادەکراوەکانی ڕاولفیا Rauwolfia وەک هاپیرتان Hypertan و سیرپاسیل Serpasil و ئالدومیت Aldomet و ئنفرسین Inversin، بەڵام ئەمە مەرج نییە لەگەڵ هەموو کەسێکدا ڕوو بدات.

٢- دەرمانەکانی دژە خەمۆکی Antidepressants، لە هەموویان بەناوبانگتر لە لەکارخستنی توانای سێکسیدا، ئەو کۆمەڵە دەرمانەن کە بە سێ ئەڵقەیی Tricyclic ناسراون، ئەو ئاوێتانەی کە سەر بەو کۆمەڵەیەن، وەک: تربتزول، ئانافرنیل و نوفرانیل و چەندانی دیکە. بە پلەی کەمتریش ئەو دەرمانانەن کە بە مونامین ئوکسدیز MAOI ناسراون، وەک: ئاوێتەی ماردیل و مارزلید Mardil and Mersalid.

٣- خەولێخەرەکان - ئازارشکێنەکان: ئەمانە ناوەندە کۆئەندامی دەمار لەکار دەخەن، هەروەها کار دەکەنە سەر نێرراوە ماددییە دەمارییەکان Neurotranmitters، گرنگترین ئەم ئاوێتانەش ئامادەکراوەکانی "باربتیوریت"ە وەک لومنال.

٤- دەرمانەکانی دژەتەشەنوجی هەناوی Antispasmodics: هەندێ لەم دەرمانانە کە لە نەخۆشییەکانی ڕیخۆڵە و برینی ڕیخۆڵەدا بەکاردێن، وەک ئاوێتەی پرۆپانسین Probanthine کە دەشێ ببێتە هۆی لاوازکردنی هێزی سێکسی.

٥- ئاوێتەکانی دژەڕشانەوە Antiemetic، بەتایبەتی ئاوێتەی فینرجان Phenergan و چەندەها ئاوێتەی دیکە کە بۆ بەرهەڵستکردنی سەرگێژخواردنی کاتی گەشتکردن بەکاردێن.

٦- دەرمانەکانی دژەنەخۆشیی پارکنسۆن یان نیشانەکانی Antiparkensonian، لەم دەرمانانە وەک دیسپاڵ Disipal و هاوشێوەکانی، ئاوێتەکانی ل. دوپا L.Dopa، ئەمانەش هەموویان کار دەکەنە سەر توانای ڕەپبوون و ئۆرگازم، لە هەندێ حاڵەتی دەگمەندا دەشێ هێزی سێکسی زیاد بکەن.

٧- دەرمانەکانی دژە فێ Antiepileptic، وەک ئاوێتەی فینوباربتون (لومینال و گاردینال)، هەروەها ئامادەکراوەکان ئیپانیوتن Epanutin.

٨- دەرمانەکانی دژەسایکۆسس Neuroleptics، لە هەموویان گرنگتر ئاوێتەکانی "فینوسایازین" Phenothiazine، وەک میللریل Mellerill، لارجکتیل Largactil.

دەشێ کاریگەریی لەکارخەری ئەم ماددانە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بەردەوام بێ، تەنانەت لەدوای وەستانی بەکارهێنانیشیان، هەروەها لەوانەیە کرداری هاویشتن دوابخات و هەندێجار هەر دەیشیوەستێنێ.

ب- دەرمانە چالاککەرەکانی سێکس

لەگەڵ زۆریی ئەو دەرمانانەی کە دەبنە هۆی لەکاروەستانی پاڵنەری سێکسی، یان ئەنجامدانی کرداری سێکسی تەواو، بەلام ژمارەیەکی کەم لەو دەرمانانە هەن کە دەتوانن ژیانی سێکسی چالاک بکەن و ئاستی ئەنجامدانی کرداری سێکسی بەرزبکەنەوە. بە درێژایی سەردەمەکانی مێژوو چەندەها دەرمان بۆ ئەم مەبەستە ئامادەکراون و بانگەشەی زۆر بۆ کاراییان کراوە، تا ئێستا ئەو بانگەشانە لەگەڵ ناوهێنانی هەندێک ئامادەکراودا پەیوەست بوون، یان کۆمەڵێک ماددە تێکەڵ دەکرێن و دەرمانێکی لەو جۆرەیان لێ دروست دەکرێ کە گوایە هێزی سێکسی چالاک دەکەن، وەک ئەو دەرمانانەی بە (کۆکتێلی چالاککردن) دەناسرێن

و شێخەکان بۆ گەنجەکانی دەنووسن، بەڵام تا ئێستا هیچ بەڵگەیەک دروستی ئەم بانگەشانەی نەسەلماندووە، هەرچەندە وا چاوەڕوان لەم دەرمانانە دەکرێ کە هێزی دەروونی چالاک بکەن و ئاراستەی بکەن کە ئەمەش کاریگەرییەکی کاتیی بۆ سەر چالاککردنی ئەو ناوەندە دەمارانە دەبێ کە لە کرداری سێکسدا کاران. کاریگەریی ئەم جۆرە دەرمانانە دەکەوێتە چوارچێوەی دەرمانە ناکاراکان کە لە ڕێگەی دەروونییەوە کار دەکەن (وەک پلاسیبو Placebo).

ئەو دەرمانانەی کە تێبینی کراون کاریگەریی چالاککردنەوەیان بۆ سەر کارایی سێکس هەیە، وەک ئەم ئاوێتانە کە بە ئاگاییەوە ئاماژەیان پێ دەدەین، چونکە کاریگەرییان دەشێ بۆ ماوەیەکی کاتی بێ ئەگەر بە بڕی کەم بەکارهاتن، هەروەها لەوانەیە کاریگەریی چالاککردنەوەیان بە شێوەی کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆ دەرنەکەوێ، بەڵکو سوودەکەیان ئاشکراکردنی ئەو حاڵەتە نەخۆشییە بێ کە بووەتە هۆکاری سەرەکی لە لاوازکردنی سێکسیدا.

**آ- دەرمان و ئامادەکراوەکانی کە کار دەکەنە سەر ناوەندە کۆئەندامی دەمار:**

١- دژەدڵەڕاوکێ و خەولێخەر و ئازارشکێنەکان: وەک ڤالیۆم، لبریۆم و مۆگادۆن. هەرچەندە ئەم ئاوێتانە دەشێ ببنە هۆی لاوازکردنی هێزی سێکسی، بەڵام خواردنیان بە بڕی کەم لەوانەیە چالاکیی سێکسی بەهێز بکەن، چونکە ئەم دەرمانانە دەبنە هۆی لابردنی ئەو دڵەڕاوکێیەی کە بووەتە ڕێگر لە بەردەم پاڵنەری سێکسی و ئەنجامدانی کرداری سێکسیدا. هەندێک پێیان وایە بەکارهێنانی بڕی کەم لەم دەرمانانە بەڕاستی دەبنە هۆی

چالاککردنی کۆئەندامی دەمار، هەروەک چۆن لە حاڵەتی خواردنەوەی کهولدا ڕوو دەدات.

٢- مادده بێهۆشکەرەکان: گرنگترین مادده بێهۆشکەرەکان وەک ئامادەکراوەکانی ئەفیون Opiates، هەندێک پێیان وایە ئەم ماددانە ژیانی سێکسی چالاک دەکەن، بەڵام ئەو کەسانەش کە بە بەردەوامی بۆ ماوەی دوورودرێژ بەکاری دەهێنن، تووشی پەککەوتنی سێکسی دەبن.

٣- مادده وڕێنەپێکەرەکان Hallucinogens: گرنگترین ئەم ماددانە وەک، ماددەی LSD، هیچ بەڵگەیەک نییە لەسەر ئەوەی ئەم ماددانە کاریگەریی چالاککەرەوەیان هەبێ، تەنیا کاریگەرییەکەیان بۆ سەر سێکس ئەوەیە کە هەستی جیاواز بەو کەسە دەبەخشن لە کاتی پەیوەندیی سێکسیدا و ئەمەش وا دەکات سێکس لەدوای بەکارهێنانی ئەم ماددانە سەرنجڕاکێشتر بێ و زیاتر ئارەزووی کەسەکە تێر و ڕازی بکات.

٤- قەنابییەکان Cannabis: ئەم ماددانە بەزۆری لە هیند و میسر و ژمارەیەک وڵاتانی دیکە بەکار دێ و چەندەها ناوی جیاوازی لێ نراوە. لە ڕابردوودا و تا ئێستاش ئەو بیروبۆچوونە بڵاوبووە کە ئەم ماددانە کاریگەرییەکی چالاککەرەوەیان هەیە بۆ سەر لایەنی سێکسی، بەڵام ئەم کاریگەرییە چالاککەرەوەیە تەنیا بریتییە لە ڕاماڵینی ئەو ئاستەنگانەی کە ڕێگرن لە بەردەم ئارەزووە سێکسییەکاندا، کاتێک ئەم ڕێگرییانە بەهۆی کاریگەریی ئەم ماددانەوە نامێنن، ئارەزووی سێکسی و کاری سێکسی زیاتر ئەگەری ڕوودانی دەبێ، بەڵام ئەوە سەلمێنراوە بەکارهێنانی دوورودرێژی ئەم ماددانە، یان زیادەڕۆیکردن لە بەکارهێنانیاندا، دواجار دەبێتە هۆی لاوازکردنی وزەی سێکسی تا ئاستی پەککەوتن لە زۆربەی حاڵەتەکاندا.

٥- چالاککەرەوە دەروونییەکان Psychostimulents: لە گرنگترین ئەم ئاویتانە، ئاویتەی ئەمفیتامینە Amphetamines وەک بنزدرین یان دکسدرین و ئامادەکراوی کۆکایین و سترکنین. وا دەردەکەوێ ئەم ئامادەکراوە کاریگەرییەکی چالاککەرەوەی ڕاستەقینەیان هەبێ، بۆ نموونە بەکارهێنانی ئەمفیتامین لە شێوەی دەرزیدا ڕاستەوخۆ دەبێتە هۆی ڕەپبوونی چووک لە نێردا. لەوانەیە ئەم ڕاستییە بێ، پاڵی بە زۆرێک لە هەرزەکارانی کۆمەڵگەکانی خۆرائاوا نابێ بۆ ئالوودەبوون لەسەر بەکارهێنانی ئەم دەرزییە و لەم ڕێگەیەوە، هەرچەندە ئەم دەرزییە کاریگەرییەکی چالاککەرەوەی بەو شێوەیە هەیە، بەڵام بەکارهێنانی درێژخایەنی دەبێتە هۆی لاوازکردنی بایەخدان و ئارەزووی سێکسی، لەو دەرمانانەی کە بۆ ماوەیەکی زۆر وەک چالاککەرەوەی توانای ئەنجامدانی سێکس بەکار دەهات، ماددەی سترکنین بوو، کە لەدوای بەکارهێنانی ڕاستەوخۆ ڕەپبوونێکی بەهێزی هەنووکەیی بۆ ئەو پیاوە دروست دەکرد کە بەکاری دەهێنا، بەڵام ڕەپبوونێکی بە ئازاراوی. زۆربەی ئەو کەسانەی ئەم ماددەیان بەکارهێناوە لەو پیاوانە بوون کە پێویستیان بە سەلماندنی توانای سێکسییان هەبوو لە هەندێ بارودۆخی تایبەتی وەک سەرەتای هاوسەرێتی.

٦- ئامادەکراوە هۆرمۆنییەکان: ئامادەکراوە هۆرمۆنییە نێرینەییەکان (هۆرمۆنی ئەندرۆجین) دەشێ بۆ مێ چالاککەرەوە بن، هەروەها بۆ ئەو نێرانەش کە بەدەست کەمبوونێکی نائاسایی بڕی ئەم هۆرمۆنەوە دەناڵێنن، بەڵام وەرگرتنی هەر بڕێ لەم هۆرمۆنە لەگەڵ دابینبوونی ئاستی سروشتیی ئەم هۆرمۆنە لە نێردا، لە ڕووی چالاککردنی لایەنە سێکسییەکان هیچ سوودێکی نییە، بەڵام تا ئێستا ئەو میکانیزمە ئاشکرا نییە کە بۆچی وەرگرتنی هۆرمۆنی ئەندرۆجین دەبێتە هۆی چالاککردنی ژیانی

سێکسی له مێدا. هەرچۆنێک بێ ئەم چالاککردنەی ژیانی سێکسی لەڕێی ئەندرۆجینەوە لەسەر حیسابی جوانییەکەی ڕوو دەدات، چونکە ئەندرۆجین دەبێتە هۆی زیادبوونی مووی لەش و دەرکەوتنی زیپکەی هەرزەکاری لەسەر دەموچاو و گۆڕینی دەنگ.

٧- مادده کهولییەکان: مادده کهولییەکان کاریگەرییەکی چالاککەرەوەی سێکسییان هەیە، بەشێکی ئەم چالاککردنەوەیە بۆ کاریگەریی کهول دەگەڕێتەوە بۆ سەر ناوەندە کۆئەندامی دەمار، بەشێکی دیکەی بۆ کەمکردنەوەی ئەو فاکتەرانە دەگەڕێتەوە کە سێکس کۆتوبەند دەکەن، هەر وەک لە حاڵەتەکانی ترس و دڵەڕاوکێدا ڕوو دەدەن، لە هەردوو حاڵەتەکەدا کاریگەریی چالاککەرەوە کاتێ ڕوو دەدات کە بە بڕی کەم کهول بخورێتەوە، کە هەندێ جار پێویستە لەگەڵ بەرگەگرتنی تاک بۆ کهول و ڕاهاتنی لەسەر خواردنی کهول، بگونجێ، بەڵام خواردنەوەی بڕی زۆر لە کهول کاریگەرییەکی لەکارخەر یان وەستێنەری هەیە بۆ سەر پاڵنەری سێکسی و توانای ئەنجامدانی سێکس، هەروەک لە حاڵەتەکانی ئالوودەبوون و ڕاهاتن لەسەر خواردنەوەی کهول ڕوو دەدات.

٨ - گوێزەرەوە دەمارییەکان neurotransmitters: گرنگترین ئەم ئاوێتانە، وەک دۆپامین و٥_HT، بەگشتی ئەو دەرمانانەی ٥_HT لە دەماخدا زیاد دەکەن، دەبنە هۆی کەمکردنەوەی پاڵنەری سێکسی، لە کاتێکدا ئەو دەرمانانەی ئاستی دۆپامین Dopamine بەرز دەکەنەوە، دەبنە هۆی بەرزکردنەوەی پاڵنەری سێکسی.(*)

**ب- دەرمانەکانی کار دەکەنە سەر چێوە کۆئەندامی دەمار:**

ئەم دەرمانانە ئاوێتەکانی کانساریدیس Cantharides دەگرێتەوە کە پێشیان دەڵێن مێشوولەی ئیسپانی Spanish Fly، هەروەها ئاوێتەی ئامیل نایترایت Amyl Nitrite، ئەم دوو ئاوێتەیە هەردووکیان بە چالاککەرەوەی سێکسی یان ئەفرودیزیس Aphrodisiacs دادەنرێن، بەڵام ئەو مەترسییە جەستەییانەی کە لە بەکارهێنانی ئەم ماددانەوە دەشێ ڕوو بدەن، بوونەتە هۆی سنووردارکردنی بەکارهێنانیان بە مەبەستی چالاککردنەوەی سێکسی.

**هەندێك تێبینیی دیکە**

لەم ساڵانەی دواییدا توێژەران سەرنجیان دا لە کاریگەریی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤی بەکارهێنانی هەندێک حەپی کۆن و تازە بۆ سەر لایەنی سێکسیی مرۆڤ. لێرەدا هەندێک لەو تێبینییانە دەخەینە ڕوو کە لەم بارەیەوە دەستکەوتوون.

١- بەکارهێنانی ئازارشکێن و دژەئازار بە ئسپرین و ئەوانەشەوە کە لە کاتی هەڵامەتدا بەکار دەهێنرێن، دەشێ حەز و مەیل و توانستی سێکسی کەم بکەنەوە.

٢- نوێترین تاقیکردنەوەکان ئاماژە بەوە دەدەن زۆر خواردنەوەی قاوە، تا ئاستی ئالوودەبوون، دەشێ ببێتە هۆی هەستکردن بە خەمۆکی و کەمبوونەوەی هێزی سێکسی.

٣- ماددە کهولییەکان هاوشێوەی ماددە هێورکەرەوەکانن، دەشێ لە سەرەتادا و بە بڕی کەم پاڵنەر و وەڵامدانەوەی سێکسی زیاد بکەن، ئەویش بەهۆی ئەو حەوانەوە دەروونییەوە کە بۆ تاکی فەراهەم دەکەن، بەڵام زۆر خواردنەوەیان بە تەواوەتی ئەنجامەکە پێچەوانە دەکەنەوە.

٤- جگەرەکێشانی زۆر دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی توانست و ئارەزووی سێکسی، چونکە دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی بڕی زۆر لە یەکانۆئۆکسیدی کاربۆن لەناو خوێندا، کە دەبێتە ڕێگر لە بەردەم گەیشتنی ئۆکسجینی پێویست بە خانەکان و لێرەشەوە کەمبوونەوەی کارایی خانەدەمار و خانە جەستەییەکان لە توانایان بۆ وەڵامدانەوەی پێویست بۆ وروروژاندنی سێکسی.

٥- یەکێک لەو نەریتە باوانەی لە هەندێک وڵاتانی وەک ئەمریکا بڵاوە، هەڵمژینی ماددەی نایترۆجینی بە هەڵم بووە Volatile Nitrates لە لایەن پیاوانەوە، ئەویش لەپێناوی بەهێزکردنی ئارەزووی سێکسییاندا، لە ئەنجامی تێبینیکردنی ئەو کەسانەی کە ئەم ماددانەیان بەکارهێناوە، دەرکەوتووە کە ئەم ماددانە دەبنە هۆی درێژکردنەوەی ماوەی ئۆرگازم و زیادکردنی قەبارەی چووک.

٦- تێبینی کراوە یەکێک لە ئاوێتە دەرمانییە تازەکان بە ناوی PCPA کە لە چارەسەرکردنی لاسەریەشدا بەکار دێ، دەبێتە هۆی زیادکردنی توانست و ئارەزووی سێکسی، بەڵام ئەم کاریگەرییە تەنیا لەو کەسانەدا دروست دەکات کە تووشی لاسەریەشە بوون و بەزۆریش بەدەست دابەزینی ئارەزووی سێکسییانەوە دەناڵێنن.

٧- لەو ئامادەکراوە تازانەی جێگەی سەرنجن ئەوانەن کە زنک لە پێکهاتەکەیاندایە. لەبەر ئەوەی ماسیی مەحار سەد ئەوەندەی خواردنی دیکە زنکی تیادایە، بۆیە هەندێک جار بەزۆری ئەو کەسانە دەیخۆن کە بەدەست لاوازیی ئارەزووی سێکسییەوە دەناڵێنن.

٨- ئاوێتە تازەکانی پێیان دەوترێ فیرومونز Pheromones کە هەندێ لە ئاژەڵ و مێرووەکان دەریدەدەن، وەک زانراوە ئەم ماددانە سەرنجڕاکێشان بەرەو سێکس دەورووژێنن، هەندێک پێیان وایە دەشێ هەمان کاریگەریش لە مرۆڤدا دروست بکەن. یەکێک لەم ئاوێتانە لە ئارەقەی پیاوەوە ئامادە کراوە و پێی دەوترێ ئەلفا ئەندروستینول Alpha Androstenol کە هەندێک لە تاقیکردنەوەکان ئاماژە بەوە دەدەن ئەم ماددانە ئەگەر لە شێوەی عەتر یان کۆلۆنیای دوای ڕیشتاشین بەکار بهێنرێن، دەبنە هۆی سەرنجڕاکێشانی مێ و وروووژاندنیان.

## حەبەکانی دژەسکپڕی

بابەتی کاریگەریی حەبەکانی دژە سکپڕی و کاریگەرییان بۆ سەر ژیانی سێکسیی ژن، لەو بابەتانەیە کە مشتومڕی لەسەرە و بانگەشەی هەندێ زانیاری دەکرێ و هەندێکی دیکە بەدرۆ دەخرێنەوە. لەوانەیە یەکێک لەو هۆکارانەی یارمەتیدەرە لەم مشتومڕەدا ئەوەبێ کە ئەم ماددەی دژەسکپڕییەی ژن بەکاری دەهێنێ، تەنیا یەکێکە لە کۆمەڵێک فاکتەر کە کار دەکەنە سەر دەرئەنجامی کۆتایی بەکارهێنانی، چونکە کەسێتیی ژن و پێشبینییەکانی و حاڵەتی دەروونی و سروشتی پەیوەندییە سێکسییەکانی، ئەمانە هەموویان لەوانەیە کاریگەریی دەرمانی دژەسکپڕییەکە بشارنەوە، یان نەهێڵن. سەرباری ئەم فاکتەرانە، بەکارهێنانی حەبی دژەسکپڕی لەوانەیە ببێتە هۆی کەمبوونەوەی ئارەزووی سێکسی لە ژندا، هەروەها کاریگەرییەکی لاوەکی دیکەی هەیە، کە بریتییە لە وشکبوونەوەی ناوچەی زێ و کەمبوونەوەی ماددە لینج و تەڕکەرەکان لەو شوێنەدا، ئەمەش وا

دەکات کرداری جووتبوون بۆ ژن ناڕەحەت و ئازاراوی بێ. هەندێ جاریش ژن هەست بە گوناهـ دەکات، چونکە پێی وایە بەهۆی ئەو حەبانەوە کە دەیانخوات، بووەتە ڕێگر لە بەردەم کاروانی سروشتیی خولقاندنی منداڵ و دەسەلاتی خالق، لەوانەیە ئەم هەستە وا لە ژن بکات پاڵنەری سێکسیی لاواز بکات و هەر بەڕاستی خۆی لە ئەنجامدانی سێکس دوور بخاتەوە، بەلام لە لایەکی دیکەوە، کاتێک ژن حەبی دژەسکپڕی دەخوات، ئیدی هەست بە ئاسوودەیی و دڵنەوایی دەکات کە ئەو سێکسە بە دووگیانی و دروستبوونی منداڵ کۆتایی نایەت، ئەمەش وای لێ دەکات زیاتر ڕێگە بە ئارەزووی سێکسی بدات ئازادانە کار بکات و چێژی سێکسیی زیاتر ببینێ و زیاتر لە ڕووی سێکسییەوە تێر و ڕازی بێ. لەو دۆخانەدا کە ژن حەبی دژەسکپڕی بەکار دەهێنێ و هەست دەکات ئارەزووی سێکسیی دابەزیوە، لەوانەیە گۆڕینی حەبەکەی بەو جۆرەی کە بڕی کەمتری لە هۆرمۆنی پرۆجێستۆجین Progestogen تیادایە، سوودبەخش بێ، هەروەها لەوانەیە وەرگرتنی بڕێکی کەم لە هۆرمۆنی نێرینە، واتە تستسترون Testosterone کە ئارەزووی سێکسیی بەهێز دەکات، بەسوود بێ، بەلام پێویستە لە کاتی وەرگرتنی ئەم هۆرمۆنەدا ژن لە کاریگەرییە لاوەکییەکانی بەئاگا بێت، چونکە لەوانەیە ببێتە هۆی زیادبوونی مووی لەش و گۆڕان لە لەرەی دەنگدا و گۆڕینی بۆ دەنگی پیاو، واتە گڕبوونی دەنگ.

**پەراوێز:**

*یەکێک لەو دەرمانانەی جێگەی سەرنج و توێژینەوەیە، دەرمانی برۆم کریپتینە Brocryptin. بەوە ناسراوە کە ژیانی سێکسی چالاک دەکات، هۆکاری ئەم کاریگەرییە بۆ ئاستی پرۆلاکتین دەگەڕێتەوە. ئەگەر ئاستی پرۆلاکتین لەو نەخۆشانەدا بەرز بوو کە بەدەست لاوازیی سێکسییەوە دەناڵێنن، ئەوا برۆم کریپتین دایدەبەزێنێ و حاڵەتی سێکسیی چالاک دەکات، بڕوا وایە ئەم دەرمانە لەڕێی ڕێکخستنی فەرمانەکانی ژێرمێشکەڕژێن و کاریگەریی بۆ سەر گواستنەوەی هاندەرە دەمارییەکان، کاریگەریی پۆزەتیڤی هەبێت.

# بەشی بیستویەك
# چارەسەركردنی پشێوییە سێكسییەكان

پێشەكی

-شێوازەكانی چارەسەركردنی سێكسی

چارەسەركردن لەڕێی كەمكردنەوەی دڵەڕاوكێوە

چارەسەری دەروونی

چارەسەری ماددی

هۆرمۆنەكان

حەبەكان

ڕاهێنان و هۆكارە میكانیكییەكان

-شێوازە ڕەفتارییەكان

شێوازە ڕەفتارییەكانی چارەسەركردن

بەمەبەستی كەمكردنەوەی دڵەڕاوكێ

ڕاهێنانی خاوبوونەوە

لابردنی هەستیارێتی

شێوازی نقوومبوون

-شێوازەكانی چارەسەركردنی ڕەفتاری لەڕێی چاككردنی وەلامدانەوە و چۆنێتیی ئەنجامدانی سێكس

مۆركوەرگرتنی كلاسیكی

فیدباكی بایۆلۆژی

ڕاهێنان لە خەیاڵدا

خەواندن

-چارەسەركردن لەڕێی چالاككردنەوەی سێكسییەوە

شێوازی ماستەرز و جۆنسۆن
شێوازی لوبتز و لوبیکلوا
شێوازی بتریشیا و جیلان
-چارەسەرکردن لەڕێی ماستەربەیشنەوە
-چارەسەرکردنی لادانە سێکسییەکان
-چارەسەری دەروونی
-چارەسەرە ماددییەکان (دەرمان، نەشتەرگەری)
-چارەسەری ڕەفتاری
-چارەسەری حاڵەتە تایبەتییەکان
-چارەسەرکردنی هۆمۆسێکسوالیتی
-چارەسەرکردنی لادانەکانی دیکە
-چارەسەرکردنی پەککەوتنی سێکسی
-چارەسەرکردنی حاڵەتەکانی لەکارکەوتنی سێکسی
-پوختەی چارەسەرکردنی پشێوییە سێکسییەکان
چارەسەرکردنی لەکارکەوتنی سێکسی لە نێردا
پەککەوتن
هاویشتنی خێرا یان زووهاویشتن
هاویشتنی خاو یان درەنگهاویشتن
چارەسەرکردنی لەکارکەوتنی سێکسی لە مێدا
تەشەنووجی زێ
لەکارکەوتنی گشتیی سێکس
لەکارکەوتنی گەیشتن بە ئۆرگازم
-شێوازە نوێیەکانی چارەسەرکردنی سێکسی
شێوازی ناوچەکانی هەستکردن
شێوازی سیمانز (بوەستە و دەست پێ بکە)
شێوازی ماستەرز و جۆنسۆن (گوشین)

## چارەسەرکردنی پشێوییە سێکسییەکان

پشێوییە سێکسییەکان لە ژیانی ئەو کەسانەی کە تووشی بوون، لەوانەیە گرنگترین شت بن و لە هەموو بابەت یان ڕووداوێ زیاتر بایەخی پێ بدەن. ئاسان نییە بۆ کەسێک کە ئەو کێشانەی نەبێ، لە ئازاری ئەم کەسانە تێبگات، نەک تەنیا لەبەر گرنگیی لایەنی سێکسی لە ژیانی هەموو مرۆڤێکدا، بەڵکو بەهۆی پەیوەستیی ئەم لایەنەوە لەگەڵ سروشتی ئەو پەیوەندییانەی کە تاک بە هاوبەشە سێکسییەکەیەوە دەبەستێ و هەروەها کاریگەریی لایەنی سێکسی بۆ سەر سازان و گونجانی نێوان ژن و پیاو، یان نەگونجانیان، هەروەها هەبوونی توانستی سێکسیی تاک، یان نەبوونی تا ئاستێکی زۆر کار دەکاتە سەر دۆخی خێزانی و کۆمەڵایەتیی ئەو تاکەی کە پشێویی سێکسیی هەیە و کار دەکاتە سەر هاوبەشە سێکسییەکەشی. بایەخدان بە پشێوییە سێکسییەکان و چارەسەرکردنیان، بابەتێکی تازە نییە. لە سەردەمی ڕابردوو، هەروەها لە سەردەمی ئێستاشدا مرۆڤ بۆ زامنکردنی ئاستێکی گونجاو لە توانا سێکسییەکانی، یان زامنکردنی بە لایەنی کەمەوە کەمترین ئاست، یان ئاستێکی خواستراوی ئەم تواناییانە، هەوڵی داوە. بەشی زۆری ئەم هەوڵانە لە لایەن نێرەوە دراون کە وا خۆی داناوە ئەو بەخشەر و بکەرە لە پەیوەندیی سێکسیدا، سەرکەوتن یان شکستهێنانی خۆی تاکە بڕیاردەرە لەسەر ئەو پەیوەندییە، بە چاوپۆشین لە هەستی هاوبەشە سێکسییەکەی بەرامبەر بە سەرکەوتن، یان شکستهێنانی ئەو پەیوەندییە، لەبەر ئەوە هیچ جێگەی سەرسووڕمان نییە کە نێر بایەخەکانی لەسەر چارەسەرکردنی پشێوییە سێکسییەکان، یان پەککەوتنی سێکسی لە ژیانیدا چڕبکاتەوە. بەهۆی چڕکردنەوەی

بایەخی نێر لەسەر ئەم بابەتانە، چەندەها ڕێگە و شێوازی چارەسەرکردنی دەروونی یان لەڕێی دەرمانەوە دەرکەوتوون، لەوانەیە مرۆڤی کۆن و تازەش هیچ دەرگایەک نەمابێ لێی نەدابێ، یان هیچ هۆکارێک نەمابێ بۆ چارەسەرکردنی لەکارکەوتنی سێکسی پەیڕەوی نەکردبێ. هەر لە پەنابردن بۆ سروتەکانی سیحر و ئیجا و حەب و هۆرمۆنەکان، تا دەگاتە پەنابردن بۆ هۆیەکانی ورووژانی سێکسی بە هەموو جۆرەکانییەوە. زۆربەی زۆری ئەو کەسانەی لە ڕابردوودا هەوڵی چارەسەرکردنی پشێوییە سێکسییەکانیان داوە، پەنایان بۆ دەرەوەی بواری نۆژداری بردووە تا بەسەر کێشە سێکسییەکانیاندا زاڵ ببن، هەروەک بڵێی بەم کارەیان لەکارکەوتنی سێکسییان بۆ هۆکاری دیکە بگەڕێننەوە، غەیری هۆکاری نۆژداری، بەڵام ئەوەی لە سەدەی بیستدا ڕووی دا، وای کرد ژیانی سێکسی بڕواتە ناو قووڵایی بواری پزیشکییەوە، ئەویش لەڕێی پەرەسەندنی چۆنێتیی ڕوانین لە مەسەلە دەروونییەکان لە بواری پزیشکیدا و بڕواهێنان بەوەی کە ژیانی سێکسی خاڵی سەقامگیربوون دەنوێنێ لە ژیانی دەروونیی تاکدا. دەرئەنجامی ئەمە ژیانی سێکسی لە چەندین گۆشەی جیاجیاوە، وەک بایۆلۆژی و دەروونی و کۆمەڵایەتی لە ناوەندی بایەخپێدان دانرا، ئەم بایەخپێدانانەش پێشکەوتنی لە بواری ژیانی سێکسیی تاک لە چەندین لایەنی جیاوازەوە، لێ کەوتەوە، ئەم تێگەیشتنە کاریگەریی هەبوو لەسەر ئاڕاستەکردنی توێژینەوە و گەڕان و هەڵبژاردنی باشترین هۆیەکانی چارەسەرکردنی حاڵەتە جیاوازەکانی ئەو نەخۆشییانەی کە تاک لە ژیانی سێکسییدا بەدەستییانەوە دەناڵێنێ. لەوانەیە ئەوە بە خەیاڵدا بێ کە پێشکەوتنی ئەم لایەنانە وای کردبێ چارەسەرکردنی ئەم حاڵەتانە ئاسان بێ، بەڵام هێشتا واقیع دوورە لە جەختکردنەوە لەم تێڕوانین و بۆچوونە، چونکە هێشتا تا ئێستا زۆربەی

حاڵەتەکانی ئەم نەخۆشییانە لە ململانێدان بەرامبەر بە بواری نۆژداری. لەوانەیە ئەمە بۆ هۆیە تازەکانی چارەسەرکردن بگەڕێتەوە کە پێویستیان بە کات و تەکنیک و خۆتەرخانکردنی نۆژداران هەیە، بۆیە پەیڕەوکردنیان و دەستکەوتنیان هێشتا ئاسان نییە و لە بەردەستدا نییە، ئەمەش پاڵ بەو نەخۆشانەوە دەنێ پەنا بۆ چارەسەری خێرا و وەرگرتنی حەب و ئەو شێوازانە بەرن کە هێندە سوودیان نییە، ئەم مەسەلەیە ئەو نەخۆشانە بە تەواوی دەرکی پێ دەکەن کە هەر ڕۆژەی دەرمانێک بەکار دەهێنن، بێ ئەوەی هیچ گۆڕانکارییەکی دیار، یان هەمیشەیی لە دۆخی سێکسییاندا ڕوو بدات.

لەگەڵ پێشکەوتنی تازەدا لە شێواز و تەکنیکەکانی چارەسەرکردندا، بەڵام سوودی ئەم شێوازانە لە گرووپێکەوە بۆ گرووپێکی دیکە جیاوازە. بەگشتی ئەو نەخۆشانەی کە زیاتر سوود لە چارەسەرکردن دەبینن و وەڵامدانەوەیان دەبێ، حاڵەتەکانی تەشەنووجی زێ و زووهاویشتنە، هەرچی ئەو حاڵەتانەن کە بەئاسانی چارەسەر ناکرێن، وەک ئەو حاڵەتانەی کە مێ ناتوانێ بە ئۆرگازم بگات (هەندێک مێ بە هیچ شێوەیەک و لە هیچ هەڵوێستێکی سێکسیدا بە ئۆرگازم ناگات)، هەروەها حاڵەتەکانی دواکەوتنی تۆو، حاڵەتەکانی پەککەوتنی لاوەکی (واتە ئەو پەککەوتنەی کە هەندێ جار ڕوو دەدات)، حاڵەتەکانی ڕوونەدانی لاوەکیی ئۆرگازم (ئەو مێیەی کە تەنیا بە دەست بە ئۆرگازم دەگات، بەڵام لە ئەنجامی جووتبوونی لەگەڵ هاوبەشە سێکسییەکەیدا بە ئۆرگازم ناگات). سەربارى ئەم حاڵەتانە، حاڵەتەکانی لادانی سێکسی بە ئەستەم چارەسەر دەکرێن.

## شێوازەکانی چارەسەرکردنی سێکسی

شێوازەکانی چارەسەرکردنی سێکسی، زۆرن، دەکرێ دوو شێواز لە یەک چارەسەرکردندا پیادە بکرێ، هەروەها دەشێ یەک ڕێگە یان شێواز لە چارەسەرکردنی چەند پشێوییەکی سێکسی، یان پەککەوتنێکی سێکسیدا پەیڕەو بکرێ، هەڵبژاردنی ڕێگەی گونجاویش پشت بە نەخۆشەکە دەبەستێ، هەروەها پشت دەبەستێ بە جۆری ئەو پشێوییە سێکسییە و بارودۆخی ڕوودانی پشێوییەکە و سروشتی پەیوەندیی نێوان نەخۆش و هاوبەشە سێکسییەکەی لە هەموو ڕوویەکەوە.

### ١-چارەسەرکردن لەڕێی کەمکردنەوەی دڵەڕاوکێ

دڵەڕاوکێ کاریگەرییەکی گەورەی بۆ سەر ڕوودانی پەککەوتنی سێکسی هەیە، ئیدی ئەو دڵەڕاوکێیە پەیوەندیی بە ژیانی سێکسییەوە هەبێ و هۆکارەکەی بۆ ڕابردوو بگەڕێتەوە بەهۆی ئەزموونەکانی منداڵی و هەرزەکارییەوە، یان دڵەڕاوکێ کتوپڕ بێ و دەرئەنجامی بارودۆخی هەنووکەیی بێ لە ژیانی تاکدا. ڕێژەیەکی زۆری پەککەوتنی سێکسی بەهۆی دڵەڕاوکێی لەناکاو ڕوو دەدەن، بۆ نموونە ترسی تاک لە شکستهێنانی سێکسی، ئەمە بەزۆری لەو کۆمەڵگە کلاسیکییانەدا ڕوو دەدەن کە وا پێویست دەکات پیاو ڕاستەوخۆ لەدوای هاوسەرێتی توانستی سێکسیی خۆی بسەلمێنێ. ئەم مەسەلەیە لەوانەیە بەر لە دەستپێکردنی هاوسەرێتی دڵەڕاوکێ بۆ پیاو دروست بکات. هەندێ جار ڕوو دەدات سەرچاوەی دڵەڕاوکێ شتێکی دیکەیە، غەیری سێکس، بەڵام دەبێتە هۆی لەکارکەوتنی توانستی سێکسی، زۆر کەسیش دڵەڕاوکێکەیان ئەو کاتە دەست پێ دەکات کە ڕووبەڕووی ئەزموونێکی سێکسیی شکست دەبنەوە، ئەم ئەزموونە شکستە دەبێتە هۆی ڕوودانی حاڵەتێکی درێژخایەن لە دڵەڕاوکێ، کە کار

دەکاتە سەر توانای سێکسی. سەرجەم ئەم حاڵەتانە لەوانەیە وەڵامدانەوەیان بۆ هۆیەکانی چارەسەرکردن هەبێ کە ئامانجی ئەم شێوازانەی چارەسەرکردن کەمکردنەوەی دڵەڕاوکێیە، ئیدی چارەسەرکردن لەڕێی پێدانی ماددەی هێورکەرەوەی گونجاو بێ، یان دڵنەواییکردنەوەی ئەو کەسە بێ، یان لەڕێی دابینکردنی بارودۆخێکی ئاسوودەوە بێ لە پەیوەندیی سێکسیدا تا ئەوکاتەی دڵەڕاوکێکەی کەم دەبێتەوە و ئەو ئەزموونە لە مێشک و خەیاڵی دوور دەکەوێتەوە، لەوانەیە پەنابردن بۆ هەموو شێوازەکان لە چارەسەرکردنی یەک حاڵەتدا پیادە بکرێ، هەروەها بوونی شارەزایی لە چارەسەرکردنی حاڵەتەکانی پەککەوتنی سێکسی لە سەرەتاکانی پەیوەندیی هاوسەرێتی سوودی دەبێ.

٢- چارەسەری دەروونی

شێوازی چارەسەرکردنی دەروونی بۆ کێشە سێکسییەکان وا گریمانە دەکات کێشە سێکسییەکان بەهۆی کۆمەڵێک فاکتەری دەروونییەوە ڕوو دەدەن کە کار دەکەنە سەر پرۆسەی گەشەی دەروونی سێکسیی تاک و دەبنە هۆی ئاڵۆزکردنی ئەم گەشەیە، پاشان ڕوودانی جۆرێ لە پەککەوتن یان لادانی سێکسی ڕوو دەدات، هەروەها ئەم شێوازە دەروونییەی چارەسەرکردن وا گریمانە دەکات کە ژیانی سێکسیی هەندێک لە تاکەکان دەشێ هۆکارەکەی کۆمەڵێک فاکتەری دەروونیی کتوپڕ و هەنووکەیی بن و ئەو کەسە تووشی پشێوییەکی سێکسی ببێ، هەرچەندە پێشتر ژیانی سێکسیی سروشتی بووە. لە ڕوانگەی ئەم گریمانەیەوە، چارەسەرکارە دەروونییەکان پێیان وایە چارەسەرکردنی دروست و کارای کێشە سێکسییەکان بریتییە لە چارەسەرکردنی دەروونی. هەرچەندە ئەم گریمانانە وا دەردەکەون کە قەناعەتپێکەرن و تا ئاستێکیش مژدەبەخشن بەرامبەر بە سوودی چارەسەری دەروونی

لە چارەسەرکردنی کێشە سێکسییەکاندا، بەڵام شارەزایی و ئەزموونی زانستیی پسپۆڕانی چارەسەرکردنی کێشە سێکسییەکان، پشتیوانی لەم شێوازەی چارەسەرکردن ناکەن و هێندە ئومێدیان پێی نییە، بەتایبەتی لە چارەسەرکردنی حاڵەتە سەرەکییەکانی پشێویی سێکسیدا کە تاک قۆناغەکانی گەشە دەبڕێ و پیر دەبێ و هەر لەو حاڵەتەدا دەمێنێتەوە، وەک حاڵەتە سەرەکییەکانی پەککەوتنی سێکسی کە نەخۆش لەوانەیە هەر لە سەرەتای ژیانی سێکسییەوە بەدەستییانەوە بناڵێنێ، بەڵام لە حاڵەتە کتوپڕ یان هەنووکەییەکانی تووشبوون بە پشێویی سێکسی، چارەسەرکردن هێندە مەسەلەیەکی ئومێدلێبڕاو نییە، واتە ئەو کێشە سێکسییە هەنووکەییانەی پەیوەندییان بە ئەزموونێکی دەروونی یان ئاشکراوە هەیە، بە شێوەیەکی باش وەڵامدانەوەیان بۆ شێوازەکانی چارەسەری دەروونی دەبێ، بەتایبەتی شێوازە کورتخایەنەکانی چارەسەرکردن کە ئامانج لێیان فەراهەمکردنی دڵنەوایی و متمانەیە بۆ نەخۆش. ئەم ڕێگە یان شێوازانە کە بە شێوازی پشتیوانیکردنی دەروونی دادەنرێن، ئەو دڵەڕاوکێیەی نەخۆش کەم دەکەنەوە کە بەهۆی پەککەوتنی سێکسییەوە تووشی بووە، هەروەها پاڵنەر و وەڵامدانەوە سێکسییەکانی لە هەموو ئەو کاریگەرییانە ئازاد دەکەن کە کۆتوبەندیان دەکەن، یان ڕێگری لە دەرکەوتنیان دەکەن، لەوانەیە پزیشکی دەروونی بە پێویستی نەزانێ تا کۆتایی چارەسەرکردن ئەم شێوازی پشتیوانیکردنە لە چارەسەرکردندا پەیڕەو بکات، ئەگەر هاوبەشی سێکسیی ئەو نەخۆشە بە سەبر و پەرۆش و میهرەبان بوو، ئەوا دەبێتە باشترین پشتیوانی دەروونی بۆ ئەو کەسە نەخۆشەی بەدەست پشێوییەکانی سێکسەوە دەناڵێنێ و پەیڕەوی چارەسەرکردنی دەروونیی بۆ پیادە دەکرێ.

یەکێکی دیکە لە هۆیەکانی چارەسەرکردنی دەروونی کە لە حاڵەتەکانی پەککەوتنی سێکسیدا پەیڕەو دەکرێ، شێوازی ڕێنماییکردنی سێکسییە، کە دەکرێ تەنیا لەگەڵ کەسی نەخۆش، یان نەخۆش و هاوبەشە سێکسییەکەی، یان هاوسەرەکەی پێکەوە ئەنجام بدرێ، یان بە شێوازی چارەسەرکردنی بە کۆمەڵ کە تیایدا چەند تاکێک یان هاوسەرێک پێکەوە بەشداریی دانیشتنەکانی ڕێنمایی سێکسی دەکەن کە بەدەست هەمان پشێویی سێکسییەوە دەناڵێنن. ئامانج لە شێوازی چارەسەرکردن لەڕێی ڕێنماییەوە، بەتایبەتی لەو چارەسەرەدا کە هەردوو هاوبەش، یان هاوسەر پێکەوە ئامادە دەبن، بریتییە لە ڕامالینی ئەو ئاستەنگانەی لە پشت پەیوەندیی نێوانیاندایە، وەک هەستکردن بە شەرانگێزی، یان نەگونجان، یان ترس، هەروەها هەوڵدان بۆ ئەوەی دۆخێک لە هاوسەنگی و یەکدی قبوڵکردن جێگەی ئەو هەستە نێگەتیڤانەی نێوانیان بگرێتەوە، بەو وەسفەی کە هەردووکیان دوو هاوبەشی یەکسانن لە کرداری سێکسیدا و پێکەوە کار بۆ سەرکەوتنی ئەو پەیوەندییەی نێوانیان دەکەن. لەوانەیە ئەم شێوازی چارەسەرکردنە بەشی پێویست نەکات و نەتوانێ ئەو کەسە بە تەواوەتی چارەسەر بکات، چونکە شێوازەکە تەنیا بریتییە لە شیکردنەوە و ڕێنماییکردنی دەروونی بە شێوەیەکی سەرپێی لەپێناوی چارەسەرکردنی کێشە سەرەکییەکە، واتە پەککەوتنی سێکسی، لەبەر ئەوە لەم حاڵەتانەدا وا پێویست دەکات پەنا بۆ هەنگاوی دوورتری چارەسەرکردن ببرێ، هەروەک لەدواییدا بە تێروتەواوی باسی دەکەین.

پەیوەستبوونی مەسەلە سێکسییەکان بە مەسەلە دەروونییەکانەوە، بەتایبەتی لەگەڵ سەرەتای لەدایکبوونی سایکۆلۆژیی نوێدا نزیکەی سەد ساڵ لەمەوبەر، هانی ئەو بۆچوونەی دا کە چارەسەری دەروونشیکاری باشترین چارەسەرە بۆ

حاڵەتەکانی پەککەوتنی سێکسی. لە واقیعدا ئەو نەخۆشانەی کە بەدەست یەکێک یان زیاتر لە پشێوییە سەرەکییە سێکسییەکانەوە دەناڵێنن، وەک پەککەوتنی سێکسی و لادانی سێکسی، بە توندی وابەستەی ئەم شێوازەن لە چارەسەرکردن و وەک دوا ئومێدی چارەسەرکردن بەدوای ئەم شێوازە دەروونییەوە وێڵن. هەرچەندە ژمارەیەک لە دەروونشیکاران هەندێک زانیاری و ڕاستییان دەربارەی ئەو حاڵەتانە خستووەتە ڕوو کە وەڵامدانەوەیان بۆ دەروونشیکاری هەبووە، بەڵام لەم بارەیەوە تا ئێستا هیچ ئامارێک لە بەردەستدا نییە کە پشتی پێ ببەسترێ. ئەمە سەرباری ئەو ماوە دووردوودرێژەی کە چارەسەری دەروونشیکاری دەیخایەنێ، هەرچەندە ئومێد و وابەستەبوون بە چارەسەرەوە هەر پاڵ بە نەخۆشەوە دەنێن ڕووەو ئەم شێوازی چارەسەرکردنە بڕوات.

٢- چارەسەری ماددی

چەندەها هۆکاری ماددی هەن، دەکرێ لە چارەسەرکردنی هەندێک لە حاڵەتەکانی پشێویی سێکسیدا بەکاربێن، ئەویش وەک چارەسەری تەواو یان وەک فاکتەرێکی یاریدەر بۆ هۆیەکانی دیکەی چارەسەرکردنی دەروونی، یان ڕەفتاری. هۆیە ماددییەکان لە چارەسەرکردندا، هۆرمۆنەکان و حەب دەگرێتەوە، هەروەها هەندێک ڕاهێنان یان بەکارهێنانی ناوەندی میکانیکی تاکو بەشێک لە ڕوخسارەکانی پەککەوتنی سێکسی کەم بکەنەوە.

آ - هۆرمۆنەکان

زۆربەی زۆری شێوازە نوێیەکانی چارەسەرکردن لەسەر ئەوە کۆکن، بەکارهێنانی هۆرمۆنی ئەندرۆجین لە چارەسەرکردنی حاڵەتەکانی پەککەوتنی سێکسی لە نێردا، بەهایەکی ئەوتۆی نییە، بەڵام هەندێک تێبینیی پۆزەتیف دەربارەی سوودەکانی هەیە کاتێک

بۆ ئەو نەخۆشانە بەکار دەهێنرێ کە لەتەمەندان، لەوانەیە ئەم سوودەش بەهۆی کاریگەریی هەڵخەڵەتێنەری چارەسەرەکەوە بێ، واتە بەکارهێنانی ئەو هۆرمۆنە وا لە نەخۆش بکات هەست بکات وەڵامدانەوەی سێکسی گۆڕانی بەسەردا هاتووە و باش بووە، ئەمەش وای لێ دەکات کە متمانەی زیاتری بە خۆی هەبێ و لێرەشەوە هێزی دەروونی و توانای ئەنجامدانی بۆ سێکس چالاک دەبێ.

هەرچەندە هەندێک لە توێژەران پێیان وایە بەکارهێنانی هۆرمۆنەکان لەو دۆخانەدا سوودبەخشن کە ئاستی هۆرمۆنەکان لە نەخۆشدا کەمن، بەڵام هەندێک لەو باوەڕەدان تەنانەت لەم حاڵەتانەشدا چارەسەرکردنی هۆرمۆنی بێسوودە. ئەزموونە هاوشێوەکانی چارەسەرکردنی هۆرمۆنی لە مێدا لەڕێی بەکارهێنانی هۆرمۆنی ئەسترۆجینەوە هیچ دەرئەنجامێکی پۆزەتیڤیان نەبووە، تەنیا لەو حاڵەتانەدا نەبێ کە ناوچەی زێ پووکاوەتەوە و ئازاری بۆ نەخۆش دروست کردووە لە کاتی جووتبووندا، بەڵام لە حاڵەتی بەکارهێنانی هۆرمۆنەکانی ئەندرۆجین لە مێدا، وروووژانی سێکسی لە مێدا زیاد دەکەن، چونکە دەبنە هۆی زیادکردنی هەستیاریێتیی ناوچە سێکسییەکان، بەتایبەتی مێتکە، هەروەها ماندەرە سێکسییەکانیش بەهێز دەکەن.

### ب-دەرمانەکان

بە درێژایی سەردەمەکان چەندەها حەب و ئامادەکراو بە شێوەی بەکارهێنانی گشتی و بەکارهێنانی ناوچەیی بەکارهێنراون لەپێناوی دەستکەوتنی وروووژانی سێکسی و پاڵنەری سێکسی و باشتر ئەنجامدانی کرداری سێکسیدا. ئەو زاراوەیەی بۆ ناوهێنانی ئەم حەبانە بەکار دەهێنرێ بریتییە لە ئەفرۆدیزەکان Aphrodisiacs، ئەم ناوە بۆ ئەفرۆدیت خواوەندی جوانی و

مێیەتی دەگەڕێتەوە، بەڵام هیچ حەبێ، یان ئامادەکراوێ نییە بەدیاریکراوی کە جەخت لە کاریگەرییەکەی کرابێتەوە و بە تەواوی ئەوە سەلمێنرابێ کە توانای سێکسی زیاد دەکات. لەم سەردەمەدا چەندەها حەب هەن کە بەتەنیا یان بە شێوەی ئاوێتە یان تێکەڵکراو لەگەڵ هەندێ ئامادەکراوی هۆرمۆنیدا بەکار دەهێنرێن، بە ناوی بازرگانیی جۆراوجۆرەوە دەفرۆشرێن، بۆ نموونە حەبی ئەفرۆدیکس Afrodex کە لە هۆرمۆنی مسیل تستسترون، نوکس فومیکا و یوهمبین پێک هاتووە، هەروەها ئامادەکراوی پوتنسان Potensanی چر کە لە هۆرمۆنی تستسترون و یوهمبین و بیمولین و ئەسترکنین پێک هاتووە، هەروەها چەندەها ئامادەکراوی دیکەی هاوشێوە کە تا ئێستا سوودەکانیان نەسەلمێنراوە، تەنیا ئەوە نەبێ کە خەڵک وا دەزانن ئەو ئامادەکراوانە توانای سێکسی زیاد دەکەن، ئەمەش وا دەکات ئەو کەسە لە ڕووی دەروونییەوە هەست بە متمانەی زیاتر بکات و بێگومان زۆرجاریش ئەمە دەبێتە هۆی باشترکردنی توانای سێکسی لەو کەسەدا. یەکێک لەو حەبانەی لەم ساڵانەی ڕابردوودا سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕاکێشا، حەبی پروموکرپتین Bromocryptin بوو کە وەک زانراوە فەرمانی ژێرمێشکەڕژێن ڕێک دەخات و یارمەتیی گواستنەوەی هەندێک لە ورووژێنەرە دەمارییەکان دەدات، چونکە بڕوا وایە ئەم ماددەیە کار دەکاتە سەر ناوەندەکانی وەرگرتنی دۆپامین لە دەماخدا و بڕواش وایە کرداری سێکسی لە نێردا پەیوەندیی بەم ناوەندانەوە هەیە، ئەمەش بووەتە هۆی دروستبوونی ئەو گریمانەیەی کە ئەم ماددەیە لە چارەسەرکردنی حاڵەتەکانی پەککەوتنی سێکسیدا لە نێردا سوودی هەیە، بەتایبەتی حاڵەتی شکستهێنانی پیاو لە ڕەپبوونی چووکدا، بەڵام تا ئێستا بەڵگەی پێویست لە بەردەستدا نین ئەوە بسەلمێنن کە ئەم ماددەیە وەک چارەسەرکردن بەسوود بێ.

### ج- ڕاهێنان و هۆکارە میکانیکییەکان

زۆربەی ئەو ڕاهێنانانەی بۆ نەخۆش دادەنرێن، ئامانجیان چارەسەرکردنی هەندێک حاڵەتی بەئەستەم وەڵامدانەوەی سێکسییە لە مێدا، چونکە هەندێک مێ بەهۆی لاوازیی ماسوولکەکانی ناوچەی "زێ"وە کە یارمەتیدەرن لە هەستکردن بە وورووژانی سێکسی، وەک پێویست وەڵامدانەوەی سێکسییان نابێ. ژمارەیەک ڕاهێنان دانراون کە دەبنە هۆی بەهێزکردنی ئەم ماسوولکانە و بەمەش مێ دەتوانێ وورووژانی پێویستی دەست بکەوێ تا وەڵامدانەوەی سێکسیی هەبێ و بە ئۆرگازم بگات. گرنگترین ئەم ڕاهێنانانە ئەوانەن کە کیجل (١٩٥٢) پێشنیاری کردوون و پاش ئەو ئانۆن Annon (١٩٧٤) پەرەی پێ دان، هەندێک لە توێژینەوەکان ئاماژە بە سوودی ئەم ڕاهێنانانە دەدەن لە بەدیهێنانی ئەو مەبەستانەی کە لە ژیانی سێکسیی مێدا ئاماژەمان پێ دان.

هەرچی ڕێگە میکانیکییەکانن زۆربەیان ئامانجیان یارمەتیدانی نێرە بۆ ڕزگاربوون لەو لەکارکەوتنە سێکسییەی کە بەدەستییەوە دەناڵێنێ، ئەم هۆیانە یارمەتیی چارەسەرکردن و ڕاستکردنەوەی حاڵەتی دامرکاندنەوە و نیشتنەوەی چووک دەدەن کە ئەو کەسانە بەدەستییەوە دەناڵێنن، هەروەها یارمەتیی ڕەپبوونی میکانیکیی چووک دەدەن. هەندێک لەم هۆکارانە وەک وورووژێنەری کارەبایی کە چالاککەرەوەیەکی ناوچەییە و یارمەتیی نێر دەدا بۆ وەڵامدانەوەی سێکسی، پێی دەوترێ ئامێری چالاککەرەوەی بلاکۆ Blakoe، بەڵام توێژینەوەکانی کۆپەر Copper (١٩٧٤) ئەوەی سەلماند کە بەکارهێنانی وورووژێنەری کارەبایی هیچ سوودێکی نییە. جگە لەم هۆکارانە، هۆکاری دیکەی نوێ هەن، وەک چاندنی تووڵی سلیکۆن لە چووکدا، یان چاندنی ئامێرێک کە توانای هەڵئاوسانی یان فووتێکردنی هەبێ. لە هۆکارە میکانیکییەکانی

دیکە، بەکارهێنانی چووکێکی پلاستیکییە کە وەک بەرگێک دەکرێت بەسەر چووکدا، بەڵام توێژینەوەکان هیچ بەڵگەیەکیان سەبارەت بە سوودی ئەم ئامێرە نەخستووەتە ڕوو، چونکە قەناعەتکردنی پیاو خۆی بەو ئامێرە و قەناعەتکردنی هاوبەشە سێکسییەکەشی کارێکی ئاسان نییە، لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستا هیچ زانیارییەکی ئەوتۆ سەبارەت بە سوودی ئەم هۆکارە میکانیکییانە لە بەردەستدا نین کە پشتیان پێ ببەسترێ، بەڵام هیچ شتێکیش نییە ڕێگر بێ لە بەردەم بەکارهێنانیاندا وەک چارەسەر یان وەک بەشێک لە بەرنامەی چارەسەرێکی تێروتەواو، بەو مەرجەی نەخۆش خۆی و هاوبەشەکەی لە پەیوەندیی سێکسیدا ڕازی بن بە بەکارهێنانی.

٤- شێوازە ڕەفتارییەکان:

شێوازە ڕەفتارییەکان لە چارەسەری پشێوییە سێکسییەکاندا تا ڕادەیەک بە ڕێگە و شێوازی نوێ دادەنرێن، زۆربەی ئەم شێوازانە پشت بە بناغەی تیۆرەکانی مۆرکوەرگرتن دەبەستن. چەندە ئەم تیۆرانە بە مەسەلە سێکسییەکانەوە پەیوەستن، هێندەی ئەوە ئەم تیۆرانە لەسەر بناغەی ئەو گریمانەیە بنیاد نراون کە هەندێک لە وەڵامدانەوەکانی لەکارکەوتنی سێکسی، لەوانەیە بە چەند کارتێکەرێکی سێکسیی دیاریکراوەوە پەیوەست بن، یان دەرئەنجامی پەیوەستبوون بن بە ئەزموونێکی سێکسیی سوودبەخش، یان ئازاراوییەوە. ئەم پەیوەستبوونە ئەگەر سوودبەخش بووبێ، ئەوا تاک هان دەدات بۆ ڕاهاتن لەسەر شێوازێکی سێکسیی دیاریکراو، ئەگەر ئازاراوی بووبێ، ئەوا مۆرکێکی وا لای تاک جێدەهێڵێ کە لە سێکس دووربکەوێتەوە، بەم شێوەیە لەباری یەکەمدا لادانی سێکسی و لەباری دووەمدا پەککەوتنی سێکسی، ڕوو دەدات. بەپێی ئەم وێنایە بۆ ڕوودانی

لەکارکەوتنی سێکسی، یان لادانی سێکسی، ئەوا ڕێگەی نموونەیی بۆ چارەسەرکردن بریتییە لە لەبەریەکهەڵوەشانی ئەو پەیوەستییەی کە لە نێوانیاندایە، ئەویش لەڕێی پەیڕەوکردنی ئەو شێوازانەی کە لە چارەسەرکردنی ڕەفتاریدا بەکار دەهێنرێن، ئیدی چارەسەرەکە ئامانجی لەبەریەکهەڵوەشاندنی مۆرکوەرگرتنەکە بێ، یان ئامانجی دروستکردنی مۆرکێکی نوێ بێ، لە هەردوو حاڵەتەکە مەبەست لە چارەسەرکردن بریتییە لە ڕامالینی ئەو ئاستەنگانەی کە دەبنە ڕێگر لە بەردەم بەسروشتی ئەنجامدانی پەیوەندیی سێکسی و هاندانی وروووژێنەر و وەڵامدانەوەی سێکسیی شیاو. لەبەر ئەوەی زۆربەی ئاستەنگەکان کە دەبنە ڕێگر لە بەردەم بەسروشتی ئەنجامدانی پەیوەندیی سێکسی، ئەو ئاستەنگانەن کە دەرئەنجامی دڵەڕاوکێن، لەبەر ئەوە ئامانجی یەکەمی چارەسەری ڕەفتاری بریتییە لە کەمکردنەوەی ئەم دڵەڕاوکێیە و ڕامالینی، ئەمەش ڕێگە خۆش دەکات بۆ بەدواداچوونی ئامانجی دووەمی چارەسەری ڕەفتاری کە بریتییە لە دروستکردنی وەڵامدانەوەی سێکسی سروشتی لە چوارچێوەی پەیوەندییە سێکسییەکاندا.

ڕێگە و شێوازە ڕەفتارییەکان و تەکنیکەکانیان زۆرن، زۆربەی ئەم ڕێگەیانە بۆ چارەسەرکردنی کێشە سێکسییەکان دەشێن. ئەم شێوازانە لە بواری چارەسەرکردنی سێکسیدا بۆ دوو گرووپ پۆلێن دەکرێن. یەکەمین بە شێوەیەکی تایبەتی بەکار دەهێنرێن بە ئامانجی کەمکردنەوەی دڵەڕاوکێ و شەکەتبوونی دەروونی کە پەیوەندییان بە کرداری سێکسەوە هەیە. گرووپی دووەم ئامانجی چاککردنی وەڵامدانەوە سێکسییەکان و پارێزگاری لێکردنیان و بەردەوامبوونیانە.

**شێوازە ڕەفتارییەکانی چارەسەرکردن**

**بە مەبەستی کەمکردنەوەی دڵەڕاوکێ**

ئەم گرووپە چەندەها شێواز و تەکنیکی ڕەفتاری لەخۆ دەگرێ، لە هەموویان گرنگتر ئەمانەن:

١- ڕاهێنانی حەوانەوە.

٢- لابردنی هەستیاریتی Desensitization

٣- نوقمبوون Flooding

٤- گەورەکردنی زێ Vaginal Dilatation

**١- ڕاهێنانەکانی حەوانەوە**

ڕاهێنانەکانی حەوانەوە لەسەر ئەو بناغەیە ئەنجام دەدرێن کە پشێویی سێکسی بەهۆی ڕوودانی حاڵەتێکی سەرەکی لە دڵەڕاوکێ و گرژییەوە دروست دەبن، لەبەر ئەوە دەکرێ لەڕێی ڕاهێنانەکانی حەوانەوەی ماسوولکەیی یارمەتیی نەخۆش بدرێ بۆ کەمکردنەوەی ئەو دڵەڕاوکێ و گرژییە. زۆربەی ئەو ڕاهێنانەی کە ئەنجام دەدرێن، پشت بەو شێوازی حەوانەوەیە دەبەستن کە جاکبسۆن Jacobson (١٩٣٨) دایناوە و ولپ Walpe(١٩٥٨) پوختەی کردوون. ئەو شێوازەی لە ئێستادا پەیڕەو دەکرێ، هەروەک بیرنشتاین و بورکوفیک (١٩٧٣) وەسفیان کردووە، لە زنجیرەیەک کرداری حەوانەوەی دوابەدوای یەک پێک دێ کە ١٩ کۆمەڵە لە ماسوولکەکانی جەستە دەگرێتەوە و بەو ماسوولکانەی دەست و قۆڵ لەو لایەی جەستەدا کە بەدەسەڵاترە دەست پێ دەکات و بە ماسوولکەکانی پێ لەو لایەی جەستە کە دەسەڵاتی نییە، کۆتایی دێ. ڕاهێنانەکان کرداری کرژبوونی ماسوولکە و پاشان کرداری حەوانەوەی ماسوولکەکە لەخۆ دەگرن. ڕاهێنانەکانی کرژکردن و حەوانەوە چەندبارە دەکرێنەوە تا ئەوکاتەی نەخۆش دەتوانێ بە قووڵی بحەوێتەوە و ئەم

حەوانەوەیە هاوکات بێ لەگەڵ خێرابوونی هەناسەدانی. بەپێی ڕای شارەزایان هەرکاتێک نەخۆش توانیی ئەم ڕاهێنانە بکات، ئیدی لە توانایدا دەبێ ئەم ڕاهێنانانە بۆ کەمکردنەوەی ئەو گرژی و دڵەڕاوکێیە بەکار بهێنێ کە لە کاتی هەڵوێستە سێکسییەکاندا تووشی دەبن.

٢- لابردنی هەستیاریتی

ئەم شێوازەی چارەسەرکردن پشت بەو شێوازی چارەسەرکردنی ڕەفتارییە دەبەستێ کە ولپ Wolpe دایناوە و پشت بە تیۆری لەکارخستنی ئاڵوگۆڕکراو Reciprocal Inhibition دەبەستێ. ولپ لەڕێی تێبینیکردنییەوە بەم ئەنجامە گەیشت کە تەزوویەکی کارەبایی لە پشیلەیەک دا کە لە قەفەزدا بوو، تێبینیی کرد تووشی دڵەڕاوکێیەکی زۆر بووە، بە جۆرێ ئیدی پشیلەکە دواتر نەیتوانیوە لەو تاقیگەیە نان بخوات کە تیایدا لە کارەبا دراوە، بۆ لابردنی ئەم هەستیارێتییە لای پشیلەکە کە بەرامبەر بەو تاقیگەیە لای دروست بووە، ولپ پەنای بۆ خواردنپێدانی پشیلەکە برد لە ژووری جیاوازدا کە هیچ لەو تاقیگەیە نەچن، ئەم کارەی دووبارە کردەوە، بەڵام وردەوردە ژوورەکان بە شێوەیەک بوون کە لە تاقیگەکەی پێشوو دەچوون تا دواجار توانیی لە هەمان تاقیگە و لەناو هەمان قەفەزدا خواردنی بداتێ کە پێشتر کارەبای لێ دابوو، لەو شوێنەدا بێ ئەوەی پشیلەکە هیچ هەڵچوونێ دەرببڕێ، یان تووشی هیچ دڵەڕاوکێیەک ببێ، نانەکەی خوارد. ولپ شێوازەکانی چارەسەرکردنی ڕەفتاری پەرە پێ دا تا مەسەلەی دیکەش بگرێتەوە، نەک تەنیا مەسەلەی خواردن و دڵەڕاوکێ پێکەوە ببەستێتەوە، یەکێک لەو شێوازانەی دیکەی ولپ، ڕاماڵینی ئەو دڵەڕاوکێیە بوو کە پەیوەست بوو بە کارتێکەرە سێکسییەکان،

ئەویش لەڕێی یارمەتیدانی تاک بۆ حەوانەوەی پێویست لەو بارودۆخانەدا کە فاکتەرە وروورژێنەرەکانی دڵەڕاوکێ هەن، یان لەڕێی وێناکردنی لە مێشکدا، بەو مەرجەی ئەم کردارە بەکاوەخۆ بەڕێوە بچێ لەڕێی چەند دانیشتنێکەوە کە نەخۆش وردەوردە ڕووبەڕووی ئەو هەڵوێستانە بکرێ کە تووشی دڵەڕاوکێی دەکەن، بەو هەڵوێستانە دەست پێ بکرێ کە کەمترین دڵەڕاوکێی لا دروست دەکەن و بەوانەش کۆتاییان بێت کە زۆرترین دڵەڕاوکێی نەخۆش دەورووژێنن. زۆرێک لە پسپۆڕان ئەم شێوازەیان بۆ چارەسەرکردنی حاڵەتەکانی پەککەوتنی سێکسی لە نێر و سێکسساردی لە مێدا پەیڕەو کردووە، بۆ نموونە ئەو کاوەخۆییەی کە باسی دەکەین لە پلەی یەکەمدا، نەخۆش لەگەڵ هاوبەشەکەیدا دەست دەکەن بە ماچ و باوەش و سەماکردن پێکەوە کاتێ هەردووکیان هەموو جلەکانیان لە بەر دایە، ئەمە لە پلەی ٢١دا کۆتایی دێ کاتێ هەردووکیان بێ جلن و پێکەوە جووت دەبن. ئەمانە و شێوازی دیکەش هەیە بۆ ڕامالینی هەستیارێتی کە هەندێکیان پشت دەبەستن بە حەوانەوەی ماسوولکەیی تا ئەو حەوانەوەیە جێگەی دڵەڕاوکێکە بگرێتەوە، هەندێکی دیکەیان ڕاستەوخۆ نەخۆش ڕووبەڕووی سەرچاوەی دڵەڕاوکێکە دەکەنەوە In Vivo Desensitization، واتە ڕامالینی هەستیارێتی لەڕێی ڕووبەڕووبوونەوەی زیندووەوە، هەروەها ڕامالینی هەستیارێتی لەڕێی کۆنترۆڵکردنی خودەوە Self-Control.

٣- نقوومبوون

شێوازی چارەسەرکردن لەڕێی نقوومبوونەوە Flooding پشت بە هەمان بناغەی تیۆریی شێوازەکەی پێشوو دەبەستێ، واتە شێوازی ڕامالینی هەستیارێتی، بەلام جیاوازییەکەی ئەوەیە

لەم شێوازەدا نەخۆش بە خێراییەکی زیاتر و بۆ ماوەیەکی درێژتر ڕووبەڕووی ئەو فاکتەرە دەکرێتەوە کە بە وروووژێنەری دڵەڕاوکێکەی دادەنرێ. ئەم دۆخە بەردەوام دەبێ تا ئەو کاتەی نەخۆشەکە هەست دەکات نقووم بووە. ئەم شێوازە لە چارەسەرکردنی ئەو پشێوییانەدا پەیرەو دەکرێ کە لەسەر ئەو بناغەیە دروست بوون، هەندێ خەڵک فێر بوون چۆن لە هەندێ هەڵوێستی سێکسی دوور بکەونەوە و ڕا بکەن، تا لەو دڵەڕاوکێیە دووربکەونەوە کە ئەم هەڵوێستانە، یان دەرئەنجامەکانیان دروستی دەکەن، لەبەر ئەوە ئەم کەسانە هەمیشە دوور و نزیک لەو هەڵوێستانە ڕادەکەن و خۆیان دوور دەخەنەوە کە دەشێ دڵەڕاوکێیان بۆ دروست بکەن. ئامانج لە پەیرەوکردنی شێوازی نقوومکردن، یان نقوومبوون، ڕاستکردنەوەی ئەم واقیعەیە لەڕێی ڕووبەڕووکردنەوەی خێرا و بەزەبری نەخۆش بۆ ئەو هەڵوێستە سێکسییانە و هێشتنەوەی نەخۆش تیایاندا تا هیچ دەرفەتێکی بۆ ڕاکردن لێیان نەبێت. لەڕێی تاقیکردنەوەی پراکتیکییەوە دەرکەوتووە، ئەم کارە ڕێگر دەبێ لە پشتبەستن بە وەڵامدانەوەکانی دڵەڕاوکێ و ڕاکردن لێیان، بەمەش ئەو دڵەڕاوکێیە دەکوژێنێتەوە کە لەم هەڵوێستانەدا دروست دەبێ. دەکرێ ئەم شێوازە جێبەجێ بکرێ لەڕێی شێوازی ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاستەوخۆی ئەم هەڵوێستانەوە، یان ڕووبەڕووبوونەوە لەڕێی وێنەوە، یان خەیاڵکردنەوە لێیان لە ئاوەزدا.

**شێوازەکانی چارەسەرکردنی ڕەفتاری لەڕێی چاککردنی وەڵامدانەوە و چۆنێتیی ئەنجامدانی سێکس**

چەندەها شێوازی چارەسەرکردنی ڕەفتاری هەن کە ئامانجیان بەهێزکردن و چاککردنی وەڵامدانەوە سێکسییەکان و باشکردنی چۆنێتیی ئەنجامدانی کرداری ڕاستەقینەی سێکسە، گرنگترین ئەم ڕێگەیانە، کە بۆ مەبەستی چارەسەرکردنی دیکە بەکاردێن، ئەمانەن: مۆرکوەرگرتنی کلاسیکی، فیدباکی بایۆلۆژی Biofeedback و ڕاهێنانی خەیاڵی و هەندێ لە تەکنیکەکانی خەواندن.

**١- مۆرکوەرگرتنی کلاسیکی**

ئەم شێوازە لەسەر بناغەی تاقیکردنەوەکانی پاڤلۆڤ ئەنجام دەدرێ کە تاک ڕووبەڕووی فاکتەری وورووژێنەری نامەرجی Unconditioned Stimulus دەکرێتەوە، پاشان ڕووبەڕووی فاکتەری وورووژێنەری مەرجدار Conditioned دەکرێتەوە بۆ ماوەی ٣٠ بۆ ٥٠ چرکە لە هەر جارێکدا و ١٠ جاریش دووبارە دەکرێتەوە لە هەر دانیشتنێکدا، سێ جار لە هەفتەیەکدا و بۆ ماوەی سێ هەفتە دەخایەنێ، واتە نزیکەی ٩٠ هەوڵ دەکات، بۆ نموونە چارەسەرکاران لەڕەی کارەباییان وەک فاکتەری وورووژێنەری بێ مەرج بەکارهێناوە و بەدوایدا تۆمارێکی ڕۆمانسیی چێژبەخش و خەیاڵی سێکسییان لەگەڵ هاوبەشی نەخۆشدا، وەک فاکتەری مەرجدار بەکارهێناوە. بەڵگەی پێویست دەربارەی سوودی ئەم شێوازە لە چارەسەرکردنی پەککەوتنی سێکسی لە پیاو و لەکارکەوتنی ئۆرگازم لە ژندا، لە بەردەستدا نین، بەڵام دەرئەنجامی پۆزەتیڤ هەن کە ئەم شێوازە

بەکارهاتووە بە ئامانجی هاندانی وەڵامدانەوە سێسکییەکان بۆ فاکتەرە وروووژێنەرە سێکسییەکانی کە نەخۆش لەسەریان ڕاهاتووە، بەتایبەتی بۆ ئەو نەخۆشانەی کە بەدەست لادانی سێکسییەوە دەناڵێنن، وەک سێکسکردن لەگەڵ منداڵ و هۆمۆسێکسوالیتی.

### ٢ - فیدباکی بایۆلۆژی

ئەم شێوازە بریتییە لە یارمەتیدانی تاک بۆ ئەوەی بچێتە ناو بنجوبناوانی ئەو گۆڕانکارییە بایۆلۆژییانەی کە لە جەستەیدا ڕوو دەدەن، پاشان ڕاهێنانی لەسەر هەوڵدانی بۆ کۆنترۆڵکردن بەسەر جەستەیدا بە ویست و ئیرادەی خۆی. ئەم شێوازە، یان ڕێگەیە بۆ بەهێزکردنی توانای ڕەپبوون پەیڕەوکراوە لەو کەسانەدا کە بەدەست پەککەوتنی سێکسییەوە ناڵاندوویانە. پوختەی ئەم ڕێگەیە بریتییە لەوەی کە بە نەخۆش ڕادەگەیەنرێ پلەی ڕەپبوونەکەی چەندە لە پاش ئەوەی لەڕێی ئامێری هێڵکاریی پۆلیگراف Polygraph، یان لەڕێی ئاماژەی دەنگییەوە پلەی ڕەپبوونەکە دیاری دەکرێ. ئەم فیدباکە بە نەخۆش ڕادەگەیەنرێ لەدوای ئەوەی نەخۆش ڕووبەڕووی چوار حاڵەت دەکرێتەوە، کە هەموویان بەدوای یەکدا دێن. ڕۆژی دوو جار بۆ ماوەی هەشت ڕۆژ بەردەوام دەبێ. ئەو چوار حاڵەتەی کە نەخۆش دوابەدوای یەک ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، ئەمانەن: داوا لە نەخۆش دەکرێ خەیاڵ لە هەڵوێستێکی سێکسیی وروووژێنەر بکاتەوە لە کاتی حەوانەوەیدا (خەیاڵکردنەوە بێ ئەوەی هیچ فیدباکێک بە نەخۆش ڕابگەنرێ، واتە بێ ئەوەی لەڕێی دەنگ، یان دەنگ و وێنەوە هیچ شتێکی پێ بوترێ، یان پێ ڕابگەیەنرێ). حاڵەتی دووەمیش هەروەک حاڵەتی یەکەم وایە، بەڵام جیاوازییەکەی لەوەدایە کە

نەخۆش هەوڵی ڕەپبوونی چووکی دەدات لە کاتێکدا لەڕێی ڕاگەیاندنی بینراو، یان دەنگییەوە پلەی ڕەپبوونی چووکی پێ ڕادەگەیەنن. حاڵەتی سێیەمیش نەخۆش فێر دەکرێت بحەوێتەوە لە کاتێکدا تەماشای وێنەی وروووژێنەری سێکسی دەکات. هەرچی حاڵەتی چوارەمە کە دوا حاڵەتە، وا لە نەخۆش دەکرێ هەوڵی ڕەپبوونی چووکی بدات لە کاتێکدا کە تەماشای وێنەی وروووژێنەری سێکسی دەکات، لەگەڵ سوودوەرگرتن لە ڕاگەیاندنی بینراو و دەنگی. ئەمانە و تا ئێستا ئەم شێوازی چارەسەرکردنە هێشتا لە قۆناغی هەڵسەنگاندن و تاقیکردنەوەدایە.

### ٣- ڕاهێنان لە خەیاڵدا

زۆرێک لە خەڵک هەن لە ژیانی سێکسییاندا پشت بە وروووژاندنی خەیاڵی دەبەستن، زۆربەی حاڵەتەکانی ماستەربەیشن لە نێر و مێدا لەڕێی ئەم خەیاڵە سێکسییە وروووژێنەرانەوە ڕوو دەدەن، هەروەها خەیاڵ کاریگەریی بۆ سەر بەهێزکردنی وەڵامدانەوە سێکسییەکان دەبێ بەر لە پەیوەندیی سێکسیی ڕاستەقینە و لە کاتی پەیوەندییەکەشدا، بەڵام ئاشکرایە خەڵک هەمووی وەک یەک نین لە توانای خەیاڵکردنەوەی سێکسی، لەبەر ئەوە هەندێک خەڵک لەم یارمەتییە بۆ بەهێزکردنی پاڵنەری سێکسییان، بێبەشن، یان کەموکوڕییان هەیە، بۆیە دەشێ ئەمە کار بکاتە سەر وەڵامدانەوەی سێکسییان، لەبەر ئەم هۆیانە ڕاهێنانکردن لەسەر خەیاڵکردنەوە لەوانەیە ببێتە هۆی باشکردنی مەیلە سێکسییەکان و توانا و چۆنێتیی ئەنجامدانی کرداری سێکسی لە هەندێک خەڵکدا. ژمارەیەک لە توێژەران زنجیرەیەک ڕاهێنانیان داناوە کە بەتایبەتی بۆ هاندانی خەیاڵکردنەوەی سێکسی ئامادە کراون.

٤- خەواندن

خەواندن بە چەندەها شێواز لە چارەسەرکردنی هەندێ حاڵەتی پشێویی سێکسیدا بەکار دەهێنرێ. ئامانجەکانی خەواندن چەند ئامانجێکن. یەکەمیان: گەیشتن بە زانیاری و هاتنەوە یادی ئەو شۆکانەی کە پێشتر لە ئەزموونی تاکدا روویان داوە و بوونەتە هۆی پەککەوتنی سێکسی. دووەمیان: یارمەتیدانی نەخۆش بۆ حەوانەوە، بۆ ئەوەی بە ئاسانی شێوازەکانی چارەسەرکردن، بەتایبەتی شێوازی رەفتاری کاریگەریی بۆ سەر نەخۆشەکە هەبێ، هەروەها خەواندن بەکار دێ بۆ ئەوەی ئیجا بە نەخۆش بدرێ، دەتوانێ ئەو کارانە بکات کە لە رابردوودا شکستی هێناوە لە ئەنجامدانیاندا، وەک رەپبوونی چووک لە نێردا و ئۆرگازم لە مێدا، هەروەها دەکرێ لەدوای خەواندنەکە ئیجا Posthypnotic بە نەخۆش بدرێ بۆ هاندانی لەسەر وەلامدانەوەی سێکسی و بۆ ئەوەی لە رەفتاری سێکسی چێژی زیاتر ببینێ. تەکنیکەکانی خەواندن لە چارەسەرکردنی حاڵەتە سێکسییەکاندا لە چەندەها سەرچاوەدا باس کراون، گرنگترینیان کتێبەکەی کراسلنک و هول- Crasilneck and Hall • (١٩٧٥).

چارەسەرکردن لەرێی چالاککردنەوەی سێکسییەوە

چارەسەری سێکسی چالاککردنەوە Sexual Stimulation Therapyئەم شێوازە لە چارەسەرکردنی پەککەوتنی سێکسی لە نێر و سێکسساردی لە مێدا چارەسەرێکی نوێیە. ئامانج لێی زیادکردنی پاڵنەری سێکسییە، کاتێک ئەم پاڵنەرە لاوازە، یان هەر نییە. لاوازیی پاڵنەری سێکسی لە تاکدا لەوانەیە هیچ کێشەیەک دروست نەکات ئەگەر هاوبەشە سێکسییەکەشی بە هەمان هێند پاڵنەریی سێکسیی لاواز بوو، بەلام کاتێک یەکێک لەو دوانە پاڵنەرێکی سێکسیی بەهێز و سروشتیی دەبێ و ئەوی دیکەیان

پاڵنەریی سێکسیی لاواز بێ، ئەوا دەبێتە مایەی خوڵقاندنی کۆژان و کێشە بۆ هەردووکیان. لەم ساڵانەی دواییدا چەندەها شێوازی چارەسەرکردن هاتە ئاراوە بۆ بەهێزکردنی پاڵنەری سێکسی، لێرەدا پوختەکانیان دەخەینە ڕوو:

### ١- شێوازی ماستەرز و جۆنسۆن

هەندێک لە توێژەران شێوازی ماستەرز و جۆنسۆن بە شێوازی چارەسەرکردنی ڕەفتاری دادەنێن، بەڵام خاوەنەکانیان ئەمە ڕەت دەکەنەوە و پێیان وایە شێوازەکەیان، شێوازێکی دەروونییە، هەندێکیش پێیان وایە، شێوازی ماستەرز و جۆنسۆن دەکەوێتە نێوان هەردوو چارەسەری دەروونی و ڕەفتارییەوە. لەواقیعدا ماستەرز و جۆنسۆن چەند تەکنیکێکیان پێشکەش کرد لەپێناوی سەرلەنوێ ڕاهێنانەوەی ئەو کەسانەی کە تووشی لەکارکەوتنی سێکسی بوون، گرنگترین ئەم تەکنیکانە، ئەو تەکنیکەیە کە بە ناوەندی هەستکردن Sensate Focus ناسراوە. ئەم شێوازەیان داهێنا بە پشتبەستن بەو تێبینییەی ئەو کەسانەی تووشی لەکارکەوتنی سێکس بوون، توانای هەستکردن و بیرکردنەوە بە ڕێگەیەکی شەهوانی، لەدەست داوە بەهۆی ئەو فشار و شەکەتییانەی کە بە جووتبوونی سێکسییەوە پەیوەست بوون. لەبەر ئەوە وا پێویست دەکات بچنە ناو پرۆسەیەکی ڕاهێنانەوە کە ڕێگەی بەرکەوتنی جەستەییان پێ بدات، هەر بە چەشنی ئەو بەرکەوتنە سێکسییانەی کە لە قۆناغی منداڵیدا ڕوویان داوە و هیچ ڕێگرییەک لە بەردەمیاندا نەبووە. لەم تەکنیکەوە تاک فێر دەبێ کە بەرکەوتنی جەستەی لەگەڵ بەرکەوتنی جەستەی هاوبەشەکەیدا، خۆی لەخۆیدا شتێکی چێژبەخشە. بەدیهێنانی ئەم چێژە لە تەکنیکەکەی ماستەرز و جۆنسۆندا پێی دەوترێ (چێژوەرگرتن Pleasuring). بە

شێوەیەکی دووبارە و کاوەخۆیی وردەروودە لە بارودۆخی تەواو جیاواز لەو بارودۆخانەی پێشتر بوونەتە مایەی دڵەڕاوکێ بۆ نەخۆش، نەخۆش لەسەر ئەم تەکنیکە ڕاهێنانی پێ دەکرێ، هەروەها بە هەموو شێوەیەک ڕێگە لە بەشداربووان لەم ڕاهێنانەدا دەگیرێ کە لە قۆناغە سەرەتاییەکانی چارەسەرکردندا هیچ پەیوەندییەکی سێکسیی ڕاستەقینە ئەنجام بدەن. سەرباری ئەوەی لەم ڕاهێنانەدا تاک هەست بە بوونی جەستەیی خۆیی و هاوبەشەکەی دەکات، ئەم ڕێگەیە فرسەت بەو کەسە دەبەخشێ دەرک بەوە بکات کە پەیوەندیی سێکسیی نێوان ژن و پیاو، پەیوەندییەکی ئاڵوگۆڕکراوە، هەریەکێک لە دوو لایەنی بەشداربوو، دەبەخشێ و وەریشدەگرێ. ئامانجێکی دیکە کە ئەم شێوازە دەستبەری دەکات بریتییە لە کوژاندنەوەی ئەو ڕێگرییانەی کە لە ڕابردوودا بوونەتە ئاستەنگ لە بەردەم ئامادەباشیی تاک تا لە یەک یەکەی هەستیدا لەگەڵ هاوبەشەکەی تێکەڵ ببێ. دواجار ئەم شێوازە بەهۆی ئەوەوە کە نایەڵێت لە کاتی ڕاهێناندا هیچ پەیوەندییەکی سێکسیی ڕاستەقینە لە نێوان ژن و پیاودا ڕوو بدات، دەبێتە هۆی خولقاندنی حاڵەتێک لە شکستهێنان کە حەز و ئارەزووی سێکسیی بەهێز دەکات و ئەمەش وا دەکات ئەو دوو هاوبەشە زیاتر مەیلیان بۆ یەکدی بجووڵێ. ماستەرز و جۆنسۆن کە خاوەنی ئەم شێوازەن دەڵێن، شێوازەکەیان سەرکەوتنی بەدەست هێناوە لە چارەسەرکردنی ٧٣.٨%ی ئەو پیاوانەی بەدەست پەککەوتنی لاوەکییەوە ناڵاندوویانە، لەگەڵ چارەسەرکردنی ٨٠.٧% ئەو ژنانەی کێشەی لەکارکەوتنی سەرەتایی و لاوەکیی گەیشتن بە ئۆرگازمیان هەبووە.

### ٢- شێوازی لوبتز و لوپیکۆلۆ Lobitz and Lopiccolo

شێوازی ئەم دوو توێژەرە چەند تەکنیکێکی چالاککردنەوەی سێکسی لەخۆی دەگرێ، تیادا ماستەربەیشن و خەیاڵی سێکسی و کتێب و وێنەی شەهوانی و لەرەی کارەبایی بەکار دێ، هەروەها ئەو مێیانەی توانای گەیشتن بە ئۆرگازمیان لەدەست داوە، ڕاهێنانیان لەسەر دەستلێدان لە ئەندامی سێکسیی خۆیان و چێژوەرگرتن، پێ دەکرێ. یەکێک لە ڕێگەکانی ئەم دوو توێژەرە بریتییە لەو شێوازەی کە ناسراوە بە خۆگونجاندنی پۆزەتیڤ، یان ڕاهاتن لەسەر گەیشتن بە ئۆرگازم، کە دەکرێ لەسەر نێر و مێ وەک یەک جێبەجێ بکرێ، بۆ نموونە داوا لە مێ دەکرێ ڕاستەوخۆ لەپێش کرداری ماستەربەیشن، واتە بەر لەوەی بە مەبەستی چێژوەرگرتن دەست لە ئەندامی سێکسیی بدات، بە ڕوون و ئاشکرایی خەیاڵ لە هاوبەشە سێکسییەکەی بکاتەوە و لە کاتی گەیشتن بە ئۆرگازمیش هەر بیری لێ بکاتەوە، پاشان لە هەنگاوەکانی دواتری ڕاهێنانەکەدا داوای لێ دەکرێ بە شێوەیەکی کاوەخۆیانە خەیاڵ لە هاوبەشەکەی بکاتەوە و سەرنج و هۆشیاریی بڕوات بۆ قۆناغە سەرەتاییەکانی سێکسکردن لەگەڵ هاوبەشەکەیدا، ئیدی وردەوردە ئەم ژنە بۆ گەیشتن بە ئۆرگازم تەنیا پێویستی بە خەیاڵکردنەوە لە هاوبەشەکەی دەبێ.

### ٣- شێوازی بتریشیا و جیلان

ئەم شێوازە ئامانجی ڕاهێنانی ئەو کەسانەیە کە بەدەست کەمی و لاوازیی پاڵنەرە سێکسییەکانەوە دەناڵێن و نازانن چۆن ئەم پاڵنەرانە بەهێز بکەن. ئەم شێوازە چوار قۆناغی ڕاهێنان دەگرێتەوە، قۆناغی یەکەم، تاک هان دەدرێ بایەخ بە کاروبارەکانی ژیانی ڕۆژانە بدات و بەئاگا بێت لەوەی چی دەگوزەرێ لە چواردەوری، چونکە ئەم دوو توێژەرە بۆیان دەرکەوتووە، ژیانی سێکسیی لاواز پەیوەستە بە

ژیانی گشتییەوە کە پەیوەندیکردن و بایەخدان تیایدا لاوازە. بەهێزکردنی یەکێکیان بەبێ بەهێزکردنی ئەوی دیکەیان ڕوو نادات. قۆناغی دووەم، ئامانجی ڕاهێنانی تاکە لەسەر بەهێزکردنی پەیوەندییە کەسی و کۆمەڵایەتییەکانی، چونکە پاڵنەری سێکسیی لاواز، بەزۆری هاوکاتە لەگەڵ پەیوەندییەکی لاواز لە نێوان هەردوو لایەنی پەیوەندییە سێکسییەکە. لەبەر ئەوە هەردوو لا هان دەدرێن هەوڵی پەیوەندیکردنی فیکری و سۆزداری و هەستی بدەن لەگەڵ کەسانی دیکەدا و بەتایبەتی لەگەڵ یەکدیدا، هەروەها بە شێوەیەک خۆیان بگۆڕن و بە هەیئەتێکەوە دەربکەون کە هاندەربن بۆ بایەخپێدان و سەرنجراکێشان. هەرچی قۆناغی سێیەمە، بایەخی لەسەر هاندان و پشتیوانیکردنی وروژاندنی سێکسی چڕ دەکاتەوە، ئەویش بە بەکارهێنانی وێنەی ئەو کەسانەی کە سەرنجی هەردوو توخمەکە ڕادەکێشن و لە باروودۆخی ئاساییدان، هەروەها تاماشاکردنی ئەو وێنە و هەڵوێستانەی حەز و وەڵامدانەوەی سێکسی دەورووژێنن. ئەم دوو توێژەرە، ئەم قۆناغەیان ناو ناوە قۆناغی هەستکردن Sensitization، بەڵام لە قۆناغی چوارەم و دوا قۆناغدا، دوو هاوبەشەکە هان دەدرێن بۆ بەهێزکردنی گۆڕینەوەی هەستەکانیان و تێپەڕاندنی ڕێگرییەکان لەڕێی کرداری سێکسەوە. بتریشیا و جیلان پێیان وایە ڕێژەی ئەو پیاوانەی لە بەهێزکردنی توانای ڕەپبوون و خستنەناوەوە و تۆوهاویشتندا سوودیان لەم شێوازە وەرگرتووە، لە سنووری ٩٠%ە، بەڵام ژنان کەمتر سوودیان لەم شێوازی چارەسەرکردنە بینیوە، ئەو ژنانەی کە پێشتر نەیانتوانیوە بە ئۆرگازم بگەن، لەدوای ئەم ڕاهێنانانەش هەر نەیانتوانیوە، بەڵام زیاتر چێژیان لە پەیوەندیی سێکسی بینیوە، ئەو ژنانەش کە بەدەست لاوازیی پاڵنەری سێکسییەوە ناڵاندوویانە، بە ڕێژەی ٥٧% لەدوای ئەم ڕاهێنانانە پاڵنەری سێکسییان بەهێزبووە.

### ٤ - چارەسەرکردن لەڕێی ماستەربەیشنەوە

بیرۆکەی سوودی چارەسەرکردن لەڕێی ماستەربەیشنەوە، لەو تێبینییەوە سەرچاوەی گرتووە کە ماستەربەیشن لە نێردا بە نزیکی لە هەموو حاڵەتەکاندا دەبێتە هۆی گەیشتن بە ئۆرگازم، کە لە گەیشتنی مێ بە ئۆرگازم لەڕێی پەیوەندیی سێکسیی سروشتییەوە زامنترە، هەروەها لەو تێبینییەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەو ئۆرگازمەی کە لە مێدا بەهۆی ماستەربەیشنەوە ڕوو دەدات، بەهێزتر و درێژخایەنترە لەو ئۆرگازمەی بەهۆی هەر وروووژێنەرێکی سێکسیی دیکەوە ڕوو دەدات. ئەم تێبینییانە پاڵی بە جیلانەوە نا، هەروەها پاڵی بە لوبتز و لوپیکۆلۆوە نا ڕاهێنان بەو ژن و پیاوانە بکەن کە کێشەی گەیشتن بە ئۆرگازمیان هەیە، لەڕێی بەکارهێنانی ماددە و ئامراز و بابەتی وروووژێنەری ئارەزووی سێکسی، ماستەربەیشن بکەن. ئامانج لەم ڕاهێنانانە تەنیا دەستکەوتنی ماستەربەیشن نییە لەڕێی هەر هۆکارێکەوە، بەڵکو بۆ ئەوەیە ئەو کەسە لەڕێی ئەم ڕاهێنانانەوە بەخۆی ئاشنا ببێ و بتوانێ سەبارەت بە کاتی گەیشتن بە ئۆرگازم وێنایەک بە هاوبەشە سێکسییەکەی ببەخشێ، هەروەها سوودی دەبێ لە ڕۆشنبیرکردنی تاک، بەتایبەتی مێ، سەبارەت بە پێکهاتەی جەستەی خۆی، بەتایبەتی ئەندامە سێکسییەکانی تا لەم ڕێگەیەوە خۆی بناسێ و یارمەتیی هاوبەشەکەشی بدات بۆ ئەوەی بە ناوچە و خاڵە وروووژێنەرەکانی جەستەی ئاشنا ببێ. پاش ئەمانە، ڕاهێنان بە تاک دەکرێ لەسەر پرۆسەیەکی کاوەخۆیی و وردەوردە هەڵکشان بەرەو سەرەوە لە ڕووی هێز و دووبارەبوونەوەی ئۆرگازم و بەکارهێنانی ڕەگەزە چالاککەرەوەکان بۆ ئارەزووی سێکسی، وەک وێنە و چەندەها ئامرازی دیکە، وەک بابەتی بینراو یان بیستراو یان لەرەی کارەبایی. ئەگەر سەرجەم ئەم هەوڵانە لە گەیشتن بە ئۆرگازم شکستی هێنا، ئەوا چارەسەرکار پێویستە بیر

له ئەگەری بوونی ئەو ترس و ڕێگرییانە بکاتەوە کە بوونەتە ئاستەنگ لە بەردەم گەیشتن بە ئۆرگازم، بۆ ئەمەش پێویستە هانی مێ بدات بەسەر ئەم ترسانەیدا زاڵ بێ لەڕێی هەوڵدان بۆ سەرلەنوێ نواندنی بە شێوەیەکی ڕاستەقینە و بەتەنیا بێ ئەوەی هاوبەشەکەی بەشداری بکات. داهێنەرانی ئەم شێوازە پێیان وایە، پشتبەستن بەم ڕێگەیە بە نزیکی لە سنووری ٨٠ بۆ ١٠٠% ئەنجامی پۆزەتیڤی بەدەست هێناوە، نەک تەنیا بە گەیشتن بە ئۆرگازم لە کاتی ماستەربەیشندا، بەڵکو بە گەیشتن بە ئۆرگازم لەدوای چەند هەفتەیەکیش لە تەواوبوونی ڕاهێنانەکان و لە پەیوەندیی سێکسیی ڕاستەقینەشدا لەگەڵ هاوبەشی سێکسیدا.

بەدەر لەو شێواز و تەکنیکانەی باسمان کردن، چەندەها شێواز و تەکنیکی دیکەی ڕاهێنان و شێوازی چالاککردنەوە و هەستپێکردن، یان ورووژاندن هەن کە ئامانجیان بەرزکردنەوەی ئاستی پاڵنەرە سێکسییەکان و ئەنجامدانی کرداری سێکسە لە نێر و مێدا، زۆربەی ئەم شێوازانە پشتیان بە هەمان ئەو ڕێسایانە بەستووە کە لەم بەشەدا ئاماژەمان پێ دان، بەڵام لە ئێستادا ئەو دەرئەنجامانە لە بەردەستدا نین تا وەک شێوازە باسکراوەکانی دیکە ئاماژەیان پێ بدەین و بیانخەینە ڕیزی شێوازەکانی چارەسەرکردنەوە. بە سروشتی حاڵ ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو شێوازە باسنەکراوانە بێسوود بن، بەڵکو لەوانەیە لە داهاتوودا بچنە ڕیزی شێوازەکانی چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشییە مرۆییەی کە یەکێکە لە گرنگترین ئەو دەردانەی هەندێک خەڵک بەدەستییەوە دەناڵێنن و ژمارەی ئەم خەڵکانەش کەم نین و لە هەموو دەردەکانی دیکەش زیاتر ئازاری دەروون دەدات.

## چارەسەرکردنی لادانە سێکسییەکان

چارەسەرکردنی لادانە سێکسییەکان لە بواری نۆژداریدا، یەکێکە لە کارە قورسەکان و بە تەحەدایەکی گەورە دادەنرێ. ناکرێ بانگەشەی ئەوە بکرێ کە بواری نۆژداری توانیویەتی سەبارەت بە چارەسەرکردنی ئەم حاڵەتانە بە دەرئەنجامی پۆزەتیڤ و یەکلاییکەرەوە بگات. بەشێک لە قورسی و ئەستەمیی گەیشتن بەم دەرئەنجامە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە ئێمە هێشتا نائاشنایین بەرامبەر ئەو هۆکارە ڕاستەقینانەی لەپشت ڕوودانی ئەم حاڵەتەوەن، بەشێکی دیکەی ئەستەمیی چارەسەرکردن بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، حاڵەتەکانی لادان لە دەروونی خاوەنەکانیاندا لە ماوەیەکی دووروودرێژەوە ڕەگیان داکوتیوە و ئەمەش وا دەکات کە هەڵکێشانیان لە ڕەگوڕیشەوە کارێکی ئەستەم بێ، پاشان لایەنگری کۆمەڵایەتی لە لایەک و کۆتوبەندە یاساییەکانیش کە سزای ئەنجامدەرانی ئەم لادانانە دەدەن، لە لایەکی دیکەوە، وایان کردووە کەسی لادەر لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بە لایەوە ئەستەم بێ خۆویستانە بێت و بیەوێ چارەسەری خۆی بکات، سەرباری ئەم ئاستەنگانە، ئەستەمییەکی دیکە لە بەردەم چارەسەری کاریگەردا هەیە، ئەویش ئەوەیە زۆربەی کەسانی لادەر پێیان وایە ئەو دۆخەی ئەوانی تیادایە لادان نییە، ئەگەر لادانیش بێت، ئەمان لەڕێی ئەو لادانەوە چێژی سێکسییان دەست دەکەوێ، لەبەر ئەوە ئەگەر بە چارەسەرکردنیش ڕازی بن، ئەوا بە پەرۆشییەوە هەوڵ نادەن بۆ چارەسەرکردن و هێنانەئارای دۆخێکی نوێ کە چارەسەری لادانەکەیان بکات، چونکە پێیان وایە لەوانەیە ئەو چارەسەرکردنە چێژی سێکسییان لێ زەوت بکات. لەگەڵ بوونی ئەم هەموو ئاستەنگ و ئەستەمییانەدا، چەندەها هەوڵی چارەسەرکردن ئەنجام دراوە کە بە پلەی جیاواز سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە لە چارەسەرکردنی هەندێ حاڵەتی لاداندا،

بەتایبەتی ئەو حاڵەتانەی کە خاوەنەکانیان خۆیان حەز دەکەن بەڕاستی دەستبەرداری ئەو لادانەیان ببن و وەک کەسانی ئاسایی لەڕێی شێوازی سروشتیی سێکسکردنەوە، ئارەزووە سێکسییەکانیان تێربکەن، لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆربەی ئەو حاڵەتانەی تا ئێستا چارەسەرکراون بە ڕەزامەندی و ئارەزووی خاوەنەکانیان بووە، بەڵام هەندێ حاڵەتیش کە خراونەتە ژێر بەرنامەی چارەسەرکردنەوە، بریتی بووە لە جێبەجێکردنی حوکمی یاسایی، دادگا بەسەر ئەو کەسانەدا سەپاندوویەتی کە تاوانی لادانیان ئەنجام داوە، لەپاش حوکمی دادگا ڕەوانەی بواری نۆژداری کراون تا چاکسازی لە ڕەفتاریاندا بکرێ و لادانەکانیان چارەسەر بکرێ.

پرەنسیپی گرنگ لە چارەسەرکردنی حاڵەتەکانی لاداندا، هەروەک لە چارەسەرکردنی پشێوییە سێکسییەکاندا بەگشتی وایە، ئەوەیە چارەسەرکار تەواوی ئەو فاکتەر و بارودۆخانە لە بەرچاو دەگرێ کە پەیوەندییان بە ژیانی نەخۆشەوە هەیە، بە لایەنە بایۆلۆژییەکانیشەوە، هەروەها گەشەی دەروونی و سێکسی و سروشتی پەیوەندیی ئەو کەسە لەگەڵ هاوتوخمەکانی، یان توخمەکەی دیکەدا، سەرباری گرنگیدانی تەواو بە شێوازی پراکتیزەکردنی ئەو لادانەی کە تووشی بووە و هەموو ئەو پەیوەستییانەش کە پەیوەندییان بەم پراکتیزەکردنەیەوە هەیە. بەدواداچوون و توێژینەوەیەکی لەم جۆرە لەوانەیە بتوانێ هۆکارەکانی لادان و پێگەی ئەو لادانە لە ژیانی تاکدا دەستنیشان بکات، هەروەها ئەگەری گۆڕینی ڕەوتی لادانەکەش بۆ ڕەوتێکی سروشتی و ئەنجامدانی پەیوەندیی سێکسی بە شێوەیەکی سروشتی دیاری دەکات. ئەو هۆیانەی کە لە چارەسەرکردنی حاڵەتەکانی لاداندا بەکار دەهێنرێن لە ڕووی پرەنسیپەوە، هەمان ئەو ڕێگەیانەن کە لەم بەشەدا ئەژمارمان کردن و باسمان کردن

که چارەسەری دەروونی و چارەسەری ماددی و چارەسەری ڕەفتاری دەگرنەوە، جیاوازیی سەرەکیی گرنگ لە نێوان چارەسەرکردنی پشێوییە سێکسییەکان بەگشتی، لەگەڵ لادانە سێکسییەکان بەتایبەتی، دەکەوێتە بواری چارەسەرکردنی ڕەفتارییەوە، لە کاتێکدا چارەسەری ڕەفتاری لە حاڵەتەکانی لەکارکەوتنی سێکسیدا ڕووەو چالاککردنی پاڵنەرە سێکسییەکان و چۆنێتیی ئەنجامدانی کرداری سێکسی و ڕاماڵینی ڕێگرەکان، ئاڕاستە دەکرێ، لە چارەسەرکردنی ڕەفتاری لادانی سێکسیدا ئەو تەکنیکانە بەکار دێن کە وا لە کەسی لادەر دەکەن ئاستەنگ لە بەردەم لادانەکەیدا و ڕقلێبوونەوە لەو لادانەی پراکتیزەی دەکات، لە ڕەفتاریدا جێگیر بکەن، لە هەمان کاتیشدا هانی دەدەن بۆ ڕازیبوون و ئەنجامدانی پەیوەندیی سێکسیی سروشتی.

### چارەسەری دەروونی

چارەسەری دەروونی هەوڵ دەدات بۆ ئاشکراکردنی فاکتەرەکانی چەپاندن، واتە ئەو فاکتەرانەی زۆربەی زانایانی قوتابخانەی دەروونشیکاری پێیان وایە هۆکارن لە ڕوودانی حاڵەتەکانی لاداندا. بەپێی بۆچوونی ئەوان گەیشتن بەم فاکتەرانە لەوانەیە ڕەوتی ژیانی سێکسیی کەسێکی لادەر بۆ ڕەوتێکی نوێ و سروشتی بگۆڕێ، بەڵام ئەم وێناکردنە و جێبەجێکردنی شێوازی چارەسەرکردنی دەروونی، بەرهەمێکی ئەوتۆی بەدەستەوە نەدا، هەروەها هیچ بەڵگەیەکیش لە ئارادا نییە بۆ سەلماندنی سوودی ئەم شێوازە لە چارەسەرکردندا، سەرباری ئەو ماوە زەمەنییە دوورودرێژەی کە چارەسەرکردن دەیخایەنێ و ئەو پارە زۆرەی بۆ چارەسەرکردن پێویستە. بڕوا وایە هەر سوودێکی پۆزەتیڤی کردارەکانی دەروونشیکاری، تەنیا دەرئەنجامێکی خۆبەخۆیی بوون و بەرێکەوت لەگەڵ

چارەسەرکردندا هاوکات بوون، لەگەڵ ئەوەشدا کە چارەسەرکردن لەڕێی دەروونشیکارییەوە وا دەرناکەوێ کە سوودمەند بێ، بەڵام چارەسەری دەروونیی کورتخایەن و پوختکراو، ناکرێ لە هیچ هەوڵێکی چارەسەرکردندا فەرامۆش بکرێ، چونکە هەستی متمانە و دڵنەوایی و تێگەیشتن لە کۆژان و ئازارەکان و ڕێزگرتن لە خۆ بە کەسی لادەر دەبەخشێ، کە ئەم ڕەگەزانە لە هەموو پرۆسەیەکی چارەسەرکردندا پێویستن، چونکە یارمەتیی نەخۆش دەدەن قەناعەت بە چارەسەرکردن بکات، هەروەها دڵەڕاوکێی دەروونی و هەستکردن بە خەمۆکی و بێهیوایی و نەفرەت لێکردنی خۆی کەم دەکاتەوە، هەموو ئەمانە، دەشێ هەر شێوازێکی دیکەی چارەسەرکردن، بەتایبەتی چارەسەرکردنی ڕەفتاری، ئاسان بکات. هەرچەندە زۆربەی نەخۆشەکان بە لایانەوە وا باشترە کە بە تەنیا چارەسەریان بکرێن، بەڵام شێوازی بە کۆمەڵ لە چارەسەرکردندا، ئیدی ئەو کەسە لادەرە لەگەڵ هاوبەشە سێکسییەکەدا کۆبکرێتەوە، یان لەگەڵ گرووپێکی دیکەدا کە هەموویان کەسانی لادەر بن وەک خۆی، سوودی زیاتر دەبێ و لە ڕووی کات و بڕی پارەی پێویستیش ئابووریتر دەبێ.

## چارەسەرە ماددییەکان (دەرمان، نەشتەرگەری)

به نزیکی لە ئێستادا ئەوە سەلمێنراوە کە چارەسەرە هۆرمۆنییەکان بە جیاوازیی جۆرەکانیانەوە، لە چارەسەرکردنی لادانە سێکسییە جیاجیاکان لە نێر و مێدا، بێسوودن، بەڵام هەندێک دەرمانی پزیشکی هەن کە بە دژەهۆرمۆنی ئەندرۆجینی دادەنرێن، لەو دەرمانە نوێیانە وەک ئاوێتەی سایپرۆتیرون ئەسیتەیت Cyproterone Acetate، بڕوا وایە ئەم ئاوێتەیە خەسڵەتی مێیەتیی هەیە Feminisation، بەڵام تا ئێستا ئەمە لە ڕووی

پراکتیکییەوە نەسەلمێنراوە، تێبینی کراوە پاڵنەری سێکسی لە نێردا کەم دەکاتەوە، لەبەر ئەوە لەوانەیە لە چارەسەرکردنی حاڵەتەکانی لادانی هۆمۆسێکسوالیتیدا سوودی هەبێ، کە بەزۆری لەو کەسانەدا ڕوو بدات تووشی نەخۆشییەکی ئەقڵی بوون، یان کەسێتیی سایکۆباسی شەڕانگێزیان هەیە. لەو دەرمانە تازانەی کە بۆ چارەسەرکردنی لادانە سێکسییەکان بەکار دەهێنرێن، وەک بنپیریدۆل Benperidol کە چارەسەرێکی هێورکەرەوەیە ئاڕاستەی ئەو کەسە ڕووەو لادان کەم دەکاتەوە، بێ ئەوەی پاڵنەری سێکسی کەم بکاتەوە، بەڵام زۆربەی زۆری دەرمانەکانی دژە سایکۆسس یان هێورکەرەوە بەهێزەکانی وەک لارجکتیل Largactil و ستیلازین و مللریل و چەندەهای دیکە، ئەمانە پاڵنەری سێکسی لاواز دەکەن، لەبەر ئەوە دەکرێ لەو حاڵەتانەی لاداندا بەکار بهێنرێن کە کەسی لادەر زیانی کەسانی دەوروبەری دەدات و دەستدرێژی دەکاتە سەریان. کاریگەریی ئەم دەرمانانە دەشێ چەند مانگێکی دووروودرێژ بخایەنێ، لەدوای ئەوەی کەسی لادەر، یان نەخۆش واز لە بەکارهێنانیان دەهێنێ.

یەکێکی دیکە لە ڕێوشوێنە ماددییەکانی چارەسەرکردن کردارەکانی نەشتەرگەرییە، وەک نەشتەرگەریی لابردنی گونەکان کە ورووژان و هێزی سێکسی لەو کەسانەدا کەم دەکاتەوە کە گونەکانیان بۆ لێ دەکرێتەوە، بەڵام ئەمە ڕێوشوێنێکی توند و یەکلاییکەرەوەیە و هیچ بوارێکی بۆ گەڕانەوە و پەشیمانبوونەوە تیادا نییە و بەزۆری بە ویست و ڕەزامەندیی کەسی لادەر ئەنجام نادرێ، بەڵکو بە فەرمانێکی یاسایی ئەنجام دەدرێ بۆ بنبڕکردنی مەترسییەکانی لادان، هەروەها کرداری نەشتەرگەریی دەماری بۆ چەند شوێنێکی تایبەت لە دەماخدا دەکرێ. بەزۆری بۆ ئەو کەسانە دەکرێ کە لادانی سێکسییان هەیە و شەڕانگێزیی سێکسی و توندوتیژی و ئازاردانی جەستەیی ئەنجام دەدەن بەهۆی بوونی

هەندێ پاڵنەری ناچاری کە پاڵییان پێوە دەنێ بۆ ئەو ڕەفتارە سێکسییانە. زۆربەی ئەم نەشتەرگەرییانە بە بڕیاری یاسایی و بۆ بنبڕکردنی تاوان ئەنجام دەدرێ، لەپێناوی بەرژەوەندیی کۆمەڵگە و پاراستنی تاکەکانی لە مەترسییەکانی لادان.

**چارەسەری ڕەفتاری**

لەپێناوی دەستکەوتنی دەرئەنجامی شیاو لە چارەسەرکردنی لادانی سێکسیدا، شێوازی چارەسەری ڕەفتاری لە هەموو چارەسەرەکانی دیکە زامنترە. ئامانج لەم چارەسەرە لابردنی لادانە یان گۆڕینییەتی، بێ ڕووبەڕووبوونەوەی هۆکارە سەرەکییەکانی ئەو لادانە، ئیدی هەرچییەک بن. چارەسەری ڕەفتاری چەندەها شێوازی هەیە، لەوانەیە گرنگترین شێوازی مۆرکوەرگرتن بێ، یان خۆگونجان بێ لەگەڵ دۆخێکی نوێدا لەڕێی ڕقلێبوونەوە و لەبەرچاوکەوتنی ئەو ڕەفتارە سێکسییەی کەسی لادەر حەزی لێ دەکات، ئەم شێوازە پشت بە تیۆرەکانی پاڤلۆڤ دەبەستێ لە ڕاهاتن و خۆگونجاندا، یان لە مۆرکوەرگرتندا، کاریگەریی ئەم شێوازە لە چارەسەرکردنی لاداندا بەو شێوەیە دەبێ کە فاکتەرێکی وروژێنەری خراپ، یان ناچیز بەو لادانە سێکسییەوە پەیوەست دەکرێ کە کەسی لادەر ئەنجامی دەدات و ئەمەش دەبێتە سزایەک بۆ ئەو کەسە لە بەرامبەر ئەو ڕەفتارە لادەرەی ئەنجامی دەدات، چونکە ئەگەر فاکتەرێکی خراپ یان ناچیز بەو ڕەفتارە سێکسییەوە پەیوەست کرا، ئیدی ئامانجی سێکسی لای کەسی لادەر هێزی سەرنجڕاکێشانی لەدەست دەدات. بۆ ئەم مەبەستە چەندەها شێوازی ناچیز بەکارهاتووە تا کەسی لادەر بەهۆیەوە ئیدی ڕقی لەو ڕەفتارە سێکسییە ناسروشتییەی خۆی بێتەوە، وەک بەکارهێنانی ئەو حەبانەی دەبنە هۆی ڕشانەوە و دڵتێکەڵهاتن، یان بەکارهێنانی وروژێنەری کارەبایی

ئازاربەخش و چەندەهای دیکە. ئەم ڕەگەزە ناچیزانە لە ڕووی کاتەوە پەیوەست دەکرێن بە وێنە و هەڵوێست و خەیاڵی ئەو لادانەوە کە نەخۆش ئەنجامی دەدات، واتە لەو کاتەدا کە کەسی لادەر ئەو ڕەفتارە سێکسییە لادەرانەیە ئەنجام دەدات یەکێک لەو ڕەگەزە ناچیزانەی دەخرێتە بەردەم، بۆ نموونە حەبی ڕشانەوەی پێ دەدرێ، ئەم کارە چەندجارێ بەپێی پێویست دووبارە دەکرێتەوە، تا دەگاتە ئەو ئاستەی کەسی لادەر وای لێ دێ هەر بە وێناکردنی ئەو ڕەگەزە ناچیزەی کە لەگەڵ لادانەکەیدا ڕووی داوە، یان بە بیرکردنەوە لێی، ئیدی واز لە نواندنی لادانەکەی بێنێ. کاتێ ئەمە ڕوو دەدات، ئیدی ئاسان دەبێ ئەم ئەنجامە بۆ هەڵوێستی ڕاستەقینەی لادانە سێکسییەکە بگوێزرێتەوە. ئەم شێوازە بە تەواوی مەبەستی چارەسەرکردن ناپێکێ، چونکە تەنیا پاڵنەری ئەو لادانە سێکسییە کەم دەکاتەوە، یان لادەبات، بەڵام گەڕانەوەی تاک بۆ پراکتیزەکردنی پەیوەندیی سێکسیی سروشتی، ئەوا پێویستی بە ڕێوشوێنی دیکەی چارەسەرکردنە، وەک لە شێوازی چارەسەرکردنی لادانی سێکسیی هۆمۆسێکسوالیتیدا ڕوونی دەکەینەوە. لادانی سێکسیی هۆمۆسێکسوالیتی لە هەموو لادانەکانی دیکە زیاتر وەڵامدانەوەی بۆ شێوازی ڕقلێبوونەوە و بەکارهێنانی ڕەگەزی ناچیز لە چارەسەرکردندا هەیە. ئەم شێوازە بە شێوازی فیلدمان و ماکولوک Feldman and Macculloch (١٩٧١) ناسراوە، بانگەشەی ئەوە دەکەن کە سوودی بۆ ٦٠%ی حاڵەتەکانی لادانی هۆمۆسێکسوالیتی لە نێردا هەبووە کە بەم شێوازە چارەسەر کراون. لەم شێوازەدا لەسەر شاشەیەک بۆ ماوەی ٨ چرکە وێنەی کوڕان بە ڕووتی پیشان دەدرێ، واز لە کەسی لادەر دەهێنرێ تەماشایان بکات تا کاتەکە تەواو دەبێ و پێی دەوترێ بۆت هەیە تا ٨ چرکە تەماشا بکەیت و پاشان دەبێ دەست بە دووگمەیەکدا بنێی بۆ لابردنی وێنەکە، ئیدی کەسی

لادەر ئازادە ئەگەر بەر لەو ماوە دیاریکراوەش دەست بە دووگمەکەدا بنێ بۆ لابردنی وێنەکان، بەڵام ئەگەر لەم کارەدا شکستی هێنا، واتە لەدوای تەواوبوونی کاتی دیاریکراو هەر بەردەوام بوو لە تەماشاکردنی وێنەکان، ئەوا لەگەڵ تەواوبوونی ٨ چرکەکەدا تەزوویەکی کارەبایی لە کەسی لادەر دەدرێ و رایدەوەشێنێ، واتە ئەگەر بەر لە تەواوبوونی ماوەی دیاریکراو دەستی بە دووگمەکەدا نا، ئەوا کارەباکەی لێ نادرێ، هەروەها دەکرێ هەمان تەزووی کارەبایی لە کەسی لادەر بدرێ بێ ئەوەی وێنەکانی پیشان بدرێ، لەو کاتەدا کە خۆی ئاماژە دەکات بەوەی بیر لە خەیاڵی سێکسکردن لەگەڵ هاوتوخمەکەی خۆیدا دەکاتەوە، یان کاتێ کە ئامێری پۆلیگراف Polygraph ئاماژە بەوە دەدات کە چووکی نەخۆشەکە دەستی کردووە بە ڕەپبوون. لە شێوازەکانی دیکەی چارەسەری ڕەفتاری، ئەو تەکنیکەیە کە ناسراوە بە هەستکردنی شاراوەCovert Sensitization، کە لەڕێی چەند هەنگاوێکەوە پەیڕەو دەکرێ: ١.داوا لە کەسی لادەر دەکرێ بیر لەو بابەتە بکاتەوە کە لە لادانەکەیدا حەزی لێیەتی. ٢.داوای لێ دەکرێ وا وێنای بکات کە خەریکە لێی نزیک دەبێتەوە. ٣.داوای لێ دەکرێ وێنای ڕوودانی کارەساتێکی ناخۆش یان ناچیز بکات (بۆ نموونە وێنای خۆی بکات کە ڕشاوەتەوە و هەموو گیانی بووە بە ڕشانەوە، یان هەموو گیانی بە پیسایی پیس بووە). ٤.داوای لێ دەکرێ واز لە وێناکردنی ئەو بابەتە بهێنێ کە لە لادانەکەیدا حەزی لێیەتی، هاوکات بەو شێوەیە ئیحای پێ بدرێ کە ئەو کارەساتە ناخۆش و ناچیزە دەست بە تەواوبوون دەکات. ئەمانە و تا ئێستا لێکۆڵینەوەی پێویست و تەواو لەسەر ئەم شێوازە لە بەردەستدا نین، جگە لەو دەرئەنجامە تۆمارکراوانە نەبێ کە ئەو توێژەرانە بڵاویان کردەوە کە هەوڵیان دا

شێوازەکەی هەردوو توێژەر کوتیلا و سوکی Cautela and Wisocki (١٩٧١) نوێ بکەنەوە.

ئەم شێوازە ڕەفتارییانە و شێوازەکانی دیکەی چارەسەرکردنی لادانە سێکسییە جیاجیاکان بەتایبەتی هۆمۆسێکسوالیتی، شێوازگەلێکن سوودی خۆیان هەیە و ناکرێ فەرامۆش بکرێن، هەروەها لە چارەسەرکردنی لادانەکانی دیکەشدا سوودی خۆیان هەیە، وەک چارەسەرکردنی لادانەکانی فتشیزم و خۆنمایشکردن و چەندەهای دیکە، هەرچەندە سوودی ئەم شێوازە لە چارەسەرکردنی ئەم لادانانە کەمترە بە بەراوردکردن لەگەڵ سوودی لە چارەسەرکردنی لادانی هۆمۆسێکسوالیتیدا.

لەوانەیە کارێکی هێندە قورس نەبێ لەڕێی یەکێک لە شێوازەکانی چارەسەری ڕەفتارییەوە، بەتایبەتی جۆری ڕقلێبوونەوە، وا لە تاک بکرێ کە واز لە لادانەکەی بهێنێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە وا لە تاک بکرێ لەدوای وازهێنانی لەو لادانە، بۆ ژیانی ئاسایی بگەڕێتەوە و ئارەزووە سێکسییەکانی لەڕێی پەیوەندیی سێکسیی سروشتییەوە تێر بکات. هەرچەندە لە هەندێ نەخۆشەکاندا، شێوازی ڕقلێبوونەوە لە چارەسەری ڕەفتاریی لادانی سێکسیدا، خۆبەخۆ وا لە تاک دەکات بۆ پەیوەندیی سێکسیی سروشتی بگەڕێتەوە، بەڵام لە زۆربەیاندا ئەمە ڕوو نادات، بۆیە پێویستە ئەم کەسانە لە چارەسەرکردن بەردەوام بن بەو شێوازە چارەسەرییە ڕەفتارییەی کە خۆیان پێیان خۆشە. گرنگترین ئەو هۆیانەی چارەسەرکردن لەپێناوی گەڕانەوەی نەخۆش بۆ پەیوەندیی سێکسیی سروشتی، بریتییە لە وێناکردنی ئەو بابەتە سێکسییە ورووژێنەرانەی کە پەیوەندییان بە بابەتەکانی ئەو لادانەوە نییە کە پێشتر ئەو کەسە بەدەستییەوە ناڵاندوویەتی.

## چارەسەرکردنی حاڵەتە تایبەتییەکان

ئەو شێوازانەی چارەسەرکردن کە ئاماژەمان پێ دان و باسمان کردن، بریتین لە کۆمەڵێک شێواز کە لە بەردەستدان بۆ چارەسەرکردنی پشێوییە سێکسییە جیاجیاکان بە شێوەیەکی گشتی، دەشێ لە یەک کاتدا سوود لە شێوازێ زیاتر وەربگیرێ و لە چارەسەرکردنی یەک حاڵەتی پشێویدا دوابەدوای یەک پەیرەوبکرێن. لەوانەیە شێوازێکی دیاریکراوی چارەسەرکردن بۆ نەخۆشێک بگونجێ و سوودی لێ وەربگیرێ، بەڵام هەمان شێواز بۆ هەمان حاڵەتی پشێوی لە نەخۆشێکی دیکەدا نەگونجێ و کاریگەریی نەبێ، لەبەر ئەوە پێویستە لەنێو هەموو چارەسەرەکاندا بەشوێن شیاوترینیاندا بگەڕێین. گەیشتن بە شێوازێکی گونجاوی چارەسەرکردن بە پلەی یەکەم پشت دەبەستێ بە ئاشنابوونی ورد و تەواو بە کەسێتیی نەخۆش و گەشەی دەروونی و بارودۆخی ژیانی و ئاستی کات و تەرخانکردنی کاتی بۆ پرۆسەی چارەسەرکردن، هەروەها توانستی ئەو نەخۆشە بۆ جێبەجێکردنی تەکنیکەکانی چارەسەرکردن بەو شێوەیەی کە لەگەڵ پێداویستی و خەسڵەتە تاکانەییە تایبەتییەکانیدا دەگونجێن. ئیدی تەکنیکی چارەسەرکردن ماددی بێ، یان رەفتاری، هەموو هەوڵێکی چارەسەرکردن لە بواری پشێوییە سێکسییەکاندا، وا پێویست دەکات بایەخ بە لایەنە دەروونییەکانی نەخۆش بدرێ، نەک لەبەر ئەوەی لەوانەیە فاکتەری دەروونیی، فاکتەرێکی سەرەکی و کارا بێ لە ڕوودانی هەر پشێوی، یان لادانێکی سێکسیدا، بەڵکو لەبەر ئەوەی هەر لەکارکەوتنێکی سێکسی، یان لادانێکی سێکسی دەشێ ببێتە هۆی

ڕوودانی دڵەڕاوکێ و کۆژانی دەروونی بۆ خاوەنەکەی، لەبەر ئەوە حاڵەتی لادانەکە یان نەخۆشییەکە ئاڵۆزتر دەبێ و زیاتر تەشەنە دەکات. لەبەر ئەم هۆیانە وا پێویست دەکات، لەڕێی هۆیە شیاوەکانی چارەسەرکردنەوە، بەر لە دەستپێکردنی هەر هەوڵێک بۆ چارەسەرکردن، ئەم دڵەڕاوکێیە کەم بکرێتەوە و نەخۆش ئارام بکرێتەوە. لەوانەیە چارەسەرکار پێی وا بێ کەمکردنەوە و ڕامالینی ئەو دڵەڕاوکێیەی کە نەخۆش تیایدا دەژی، لە هەموو شتێک پێویستتر بێ بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشەکە.

لێرەدا بە کورتی باسی هەندێک لەو هۆیانەی چارەسەرکردن دەکەین کە بڕوا وایە ئەنجامی پۆزەتیڤیان هەبێ لە چارەسەرکردنی هەندێ لە حاڵەتە سێکسییەکانی، بەزۆری لە ژیانی خەڵکدا ڕوو دەدەن، وەک هۆمۆسێکسوالیتی و لاوازیی سێکسی لە نێردا و سێکسساردی لە مێدا و چەندانی دیکە.

## چارەسەرکردنی هۆمۆسێکسوالیتی

چارەسەری هۆرمۆنی و بەکارهێنانی حەب لە چارەسەرکردنی هۆمۆسێکسوالیتیدا، هیچ سوودێکیان نییە، هەروەها چارەسەری درێژخایەنی دەروونشیکاریش سوودێکی جێگیری نییە، بەڵام چارەسەری دەروونی و خەواندن و چارەسەری ڕەفتاری لە هەموو ڕێگەکانی دیکە زیاتر بەکاردێن و ٤٠%ی حاڵەتە هەڵبژێراوەکان بۆ چارەسەرکردن، سوودیان لەم شێوازە بینیوە، باشترین دەرئەنجامیش لەو کەسانەدا تێبینی دەکرێ کە خۆیان ئارەزووی چارەسەرکردن دەکەن، ئەوانەش کە بە ئەزموونی سێکسی سروشتیدا تێپەڕبوون. بە شێوەیەکی گشتی باشترین وەڵامدانەوە بۆ چارەسەرکردن بە هەر شێوازێک بێ لەو کەسانەدا بەدی دەهێنرێن کە تەمەنیان نەگەیشتووەتە ٣٥ ساڵ. توێژەران

بۆیان دەرکەوتووە، لابردنی هەستیارێتی لە شێوازی چارەسەرکردن بە ڕقلێبوونەوە کاراترە لەو نەخۆشانەی کە بەدەست دڵەڕاوکێوە دەناڵێنن لە بەستنی پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ توخمەکەی دیکەدا، بەڵام شێوازی ڕقلێبوونەوە لە چارەسەرکردندا، دەرئەنجامی باشتر بەدەستەوە دەدات لەو کەسانەدا کە دڵەڕاوکێیان هەیە بەرامبەر بە پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتی. دەشێ چارەسەرەکە دوو شێواز پێکەوە بگرێتە خۆی، بۆ نموونە لە سەرەتادا شێوازی ڕقلێبوونەوە جێبەجێ بکرێ، پاشان پەیڕەوی شێوازی لابردنی هەستیارێتی بکرێ بۆ ئەوەی ئەو کەسە هەستیارێتیی بەرامبەر بە پەیوەندیی سێکسیی سروشتی نەمێنێ. پێشتر لە شوێنێکی دیکەدا لە هەمان بەشدا تەکنیکی هەردوو شێوازەکەمان ڕوون کردەوە، پوختەی تەکنیکی ڕقلێبوونەوە ئەوەیە بابەتی لادان لە شێوەی وێنەی کوڕی ڕووت لەسەر شاشەیەک پیشانی ئەو کەسە لادەرە دەدرێ، پاشان فاکتەرێکی هەستیی ناچیزی پێ دەبەخشرێ، ئەگەر لە تەماشاکردنی وێنەکەدا خۆی خەریک کرد و بەردەوام بوو. فاکتەری هەستی بەزۆری تەزووی کارەبایە، لەوانەشە تەشویهێکی ناشیرین و قێزەون بێ و لە شێوەی ئەو وێنەیەدا دەکرێ کە پێشتر پیشانی دراوە، ئەم شێوازە چەندجارێ لە یەک دانیشتن و دانیشتنەکانی دواتریشدا دووبارە دەکرێتەوە. کاتێ ڕقلێبوونەوە لە دەروونی کەسەی لادەردا دروست دەبێ، ئیدی شێوازی چارەسەرکردن پەرەدەسێنێ و فاکتەری ڕقلێبوونەوە لە هەندێ هەڵوێست و لە ساتی گونجاودا لە نەخۆش دوور دەخرێتەوە، ئەم ڕێوشوێنە لە زەینی نەخۆشدا بەو شێوەیە لێک دەدرێتەوە کە ئەوە ماوەی حەوانەوەیە و ڕزگاربوونە لە ئازاردانی لەڕێی پیشاندانی ئەو شتە قێزەوەنانەی کە ڕقی لێیان دەبێتەوە، لەبەر ئەوە نەخۆش ئارەزووی بەردەوامبوون لەسەر چارەسەرەکە

دەکات، دەشێ ئەمە سەرەتای گۆڕانی ڕەوتی سێکسیی ئەو کەسە بێ ڕووەو توخمەکەی دیکە. هەرچی تەکنیکی لابردنی هەستیارێتییە، ئەوا بریتییە لە پلیکانەیەک بەرەو سەرەوە کە وردەوردە هەڵوێستی سێکسی سروشتی لەگەڵ توخمەکەی دیکەدا پیشانی ئەو کەسە لادەرە دەدرێ، شێوازەکەش بە پیشاندانی ئەو هەڵوێستانە دەست پێ دەکات کە کەمترین دڵەڕاوکێی نەخۆش دەوروووژێنن، ئەمە هاوکات دەبێ لەگەڵ ڕاهێنانەکانی حەوانەوە، یان بەخشینی پاداشت بە نەخۆش، کاتێک ڕازیبوون و قبوڵکردن لای نەخۆش دەگاتە پلەیەکی دیاریکراو، چارەسەرکار بۆ پلەی سەرووتر دەڕوات، بەم شێوەیە، تا نەخۆش خۆی دەبینێتەوە کە دەتوانێ ڕووبەڕووی پەیوەندیی سێکسیی سروشتی دەبێتەوە، بێ ئەوەی هەست بە هیچ دڵەڕاوکێ و نائارامی و دوورکەوتنەوەیەک بکات. هەرچی چارەسەری هۆمۆسێکسوالیتیە لە مێدا، واتە لەیزبینیزم یان سەحاقی، ئەوا لە چارەسەرکردنی هۆمۆسێکسوالیتی لە نێردا قورسترە، لە چارەسەرکردندا هەمان ئەو شێوازانە پەیڕەو دەکرێن کە لە نێردا دەکرێن، بە ڕێنمایی و چارەسەرکردنی دەروونی ئاراستەکردنی کۆمەڵایەتیشەوە، بەڵام چارەسەری ڕەفتاری لە مێدا کاریگەریی کەمترە بەراورد لەگەڵ هەمان شێواز لە نێردا، دەشێ هۆکاری ئەمە بۆ ژیانی سێکسیی مێ بگەڕێتەوە کە کەمتر کردارەکانی مۆرکوەرگرتن کاری تێدەکەن بەراورد لەگەڵ نێردا. بەگشتی دەرئەنجامی کۆتایی چارەسەرکردنی لەیزبینیزم سەرکەوتنی کەمتر بەدەست دەهێنێ بە بەراوردکردن لەگەڵ چارەسەرکردنی هۆمۆسێکسوالیتی لە نێردا، لەبەر ئەم هۆکارەش هەندێک وازیان لە پەیڕەوکردنی ئەم شێوازە هێناوە و بە چارەسەرێک لە دەرەوەی بواری نۆژداریی دەروونی دایانناوە.

**چارەسەرکردنی لادانەکەی دیکە**

باشترین دەرئەنجامەکانی چارەسەرکردنی حاڵەتەکانی لادان، وەک لادانی فتشیزم و خۆنمایشکردن و منداڵبازی و ئاژەڵبازی و لەبەرکردنی پۆشاکی توخمەکەی دیکە و خۆمەلاسدان، لەڕێی پەیڕەوکردنی شێوازی ڕەفتارییەوە دەست دەکەوێ، لەبەر ئەوەی ئەم لادانانە دوو ئاراستەیان هەیە، یەکەمیان ئاراستەی لادانەکەیە کە لادەر ڕەفتارێکی سێکسیی ناسروشتیی هەیە. دووەمیان ڕەتکردنەوەی پەیوەندیی سێکسیی سروشتییە، لۆژیکی چارەسەرکردنیش پێویستە دوو ئاراستەی هەبێ. یەکەمیان، وا لە کەسی لادەر بکرێ ڕقی لەو لادانە بێتەوە کە ئەنجامی دەدات. دووەمیان، هاندانیەتی بۆ ئەوەی حەزی لە پراکتیزەکردنی پەیوەندیی سێکسیی سروشتی بێ. لەسەر ئەم بناغەیە، شێوازەکانی چارەسەرکردنی ڕقلێبوونەوە لە زۆربەی ئەم لادانانەدا بەکار دەهێنرێن، بۆ نموونە ئەو کەسەی تووشی لادانی سێکسیی منداڵبازی بووە، وێنەی منداڵی بە ڕووتی پیشان دەدەن، پاشان وێنەی جەستەی هەمان منداڵ، بەلام بە شێوەیەکی قێزەون و تەشویهکراو پیشان دەدەن، هەروەها شێوازێکی دیکە هەیە کە بە شێوەیەکی شاراوە Covert Sensitization وا لە تاک دەکرێ هەست بە بابەتی لادانەکەی بکات، داوای لێ دەکرێ، وێنای هەڵویستێکی لادان بکات لە خەیاڵی خۆیدا، کاتێ ئاماژە بە چارەسەرکار دەدات کە بیر لە بابەتی لادانەکەی دەکاتەوە، ڕاستەوخۆ چارەسەرکار لەو ساتەدا وروژێنەرێکی ناخۆش یان ناچیزی پێ دەبەخشێ، ئیدی ئەو وروژێنەرە ناخۆشە بە شێوەیەکی ڕاستەقینە بێ، بۆ نموونە تەزووی کارەبای لێ دەدات، یان تەنیا لە خەیاڵی خۆیدا بێ، بۆ نموونە وێناکردنی کارەساتێکی ناخۆش بەهۆی ئەوەوە کە بیر لە لادان دەکاتەوە. ئەگەر ئەم شێوازە بۆ چارەسەرکردنی لادانی جۆری فتشیزم بەکار بێت کە

هەمیشە بۆ دەستکەوتنی چێژی سێکسی هەوڵی بردن و دزینی پێڵاوی ژنانە دەدات، ئەوا بەم شێوەیە جێبەجێ دەکرێ: هەنگاوی یەکەمی چارەسەرکردن بەم شێوەیە دەست پێ دەکات (ڕۆژی دووجار و بۆ ماوەی دوو هەفتە دووبارە دەکرێتەوە)، داوا لە کەسی لادەر دەکرێ پێڵاوێکی ژنانە لە ئاوەزیدا وێنا بکات، پاشان داوای لێ دەکرێ هەر کە ئەو کارەی کرد، ئاماژە بە چارەسەرکار بدات کە ئەو وێناکردنەی ئەنجام داوە، لەم کاتەدا تەزووی کارەبا لە نەخۆش دەدرێ، ئەمەش دەبێتە هۆی ڕاستەوخۆ ونبوونی ئەو وێنەیە و ئەو وێناکردنە لە ئاوەزیدا، لەدوای دوو دەقیقە پشوو، هەمان کردار دووبارە دەکرێتەوە. تێبینی کراوە، لەگەڵ دووبارەکردنەوەی ئەم ڕێوشوێنەدا، کەسی لادەر کەمتر دەتوانێ وێنای ئەو پێڵاوە لە ئاوەزیدا بکات و کاتێک بەهۆی تەزووە کارەباییەکەوە ئەم وێنەیە لە مێشکیدا ون دەبێ، کاتێکی زیاتر دەوێ بۆ سەرلەنوێ وێناکردنەوەی بابەتی لادانەکەی، کە پێڵاوەکەیە. هەنگاوی دووەم، لەدوای دوو ڕۆژ لە هەنگاوی یەکەم بەڕێوە دەچێ، ئەم هەنگاوە بریتییە لە هەوڵدانی کەسی لادەر بۆ ئەوەی پێی بخاتە ناو پێڵاو، یان پووتێکەوە، لەم ساتەدا ڕاستەوخۆ کارەبا لە نەخۆش دەدرێ و بەردەوامیش دەبێ تا نەخۆشەکە پێڵاوەکە لە پێی دادەکەنێ. کەسی لادەر وا پێویست دەکات هەوڵ بدات بۆ ئەوەی کارێکی دیکە بکات بۆ ئەوەی لێدانی شۆکە کارەباییەکە بوەستێنرێ.

ئەم شێوازە ڕەفتارییانەی چارەسەرکردن سوودی هەیە لە چارەسەرکردنی لادانەکانی خۆنمایشکردن و خۆمەلاسدان و لەبەرکردنی پۆشاکی توخمەکەی دیکە و لادانەکانی سادوماسۆشی، بەڵام لە چارەسەرکردنی لادانی جۆری توخمی پێچەوانە Transexuality هیچ سوودێکیان نییە.

## چارەسەرکردنی پەککەوتنی سێکسی

چەندەها شێوازی چارەسەرکردن بۆ چارەسەرکردنی پەککەوتنی سێکسی لە نێردا هەن، هەروەها هەوڵەکان بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشە سێکسییە کۆنن و بەردەوامن، بۆ نموونە شێوازی ئیحای سیحری بۆ کردنەوەی توانای سێکسیی ئەو پیاوەی بڕوای وایە بەهۆی سیحرێکەوە بەستراوە، بۆیە توانای پیاوەتیی لەدەست داوە، یان چاوی پیس کاری تێکردووە، تا دەگاتە پەنابردن بۆ بەکارهێنانی جۆرەها ماددە و ئامادەکراوی ڕووەکی و ئاژەڵی، وەک ماندراگورا Mandragora و کانساریدس Cantharides و شاخی ئاژەڵی ڕایناسوراس و ئامادەکراوی یوهامبین Yohimbine و حەبە چالاککەرەوەکانی کۆئەندامی دەمار و سووڕی خوێن، وەک ئەمفینامین و ئەبومورفین و ئاوێتەکانی کورتکوستیرویدز Corticosteroids، بەڵام هیچ بەڵگەیەک لەسەر سوودی ئەم چارەسەرانە لە بەردەستدا نین. لەوانەیە سوودی ئەم چارەسەرانە لەوە تێپەڕ نەکات کە کاریگەرییەکی ئیحایی و کامۆفلاجی، یان تەمویهییان هەیە. هەمان شتیش دەربارەی چارەسەری هۆرمۆنی دەوترێ کە بە دەگمەن لە چارەسەرکردنی ئەم لادانانەدا سوودی ڕاستەوخۆیان دەبێ. چارەسەری هۆرمۆنی تەنیا لەو حاڵەتانەدا سوودیان دەبێ کە ئەوە دەسەلمێنرێ ئەو کەسە کەموکوڕی لە هۆرمۆنەکانیدا هەیە، وەک لە حاڵەتی پووکانەوەی گونەکان و لابردنیان لەڕێی نەشتەرگەرییەوە، هەروەها بۆ کەسانی بەتەمەن و ئەو کەسانەش کە نەخۆشیی شەکرەیان هەیە و پشکنینەکان ئاماژە بە کەمیی هۆرمۆنەکان دەکەن، هەروەها لەوانەیە بەکارهێنانی هۆرمۆنەکان وەک هۆرمۆنی ئەندروجینەیز لەو کاتانەدا بەسوود بن کە نەخۆش بە پلەیەک لە پلەکان تووشی پەککەوتنی سێکسی بووە و ئاستی هۆرمۆنیش لە لەشیدا نزمە،

بەڵام تا ئێستا توێژینەوەکان بۆ دۆزینەوەی پەیوەندیی نێوان ئەم دوانە بەردەوامن. هەرچی چارەسەری دەروونییە، سوودەکەی لەو کاریگەرییە خۆبەخۆییە تێپەڕناکات کە لە نەخۆشییە دەروونییەکاندا ڕوو دەدات، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە پەککەوتنی سێکسی لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بناغەیەکی دەروونیی هەیە، بەڵام بەهۆی هەندێک هۆکاری بونیادییەوە کە دەبنە ڕێگر لە بەردەم ئەم سوودوەرگرتنەدا، لەوانەیە نەخۆش وەڵامدانەوەی بۆ چارەسەری دەروونی نەبێ.

**شێوازەکانی چارەسەرکردنی پەککەوتنی سێکسی زۆرن، لێرەدا پوختەکانیان دەخەینە ڕوو:**

**-شێوازی لیون هارد**Leonhard (١٩٦٣)، لەم شێوازەدا داوا لە کەسی نەخۆش دەکرێ بۆ ماوەیەک بە هیچ شێوەیەک سێکس نەکات، لەم ماوەیەدا جۆرەها وروووژێنەری سێکسیی بۆ نمایش دەکرێ. ئەم کارە بەردەوام دەبێ تا متمانەی بە توانستی سێکسیی بۆ دەگەڕێتەوە.

**-شێوازی لابردنی هەستیارێتی**، ئامانج لێی کەمکردنەوەی ئەو دڵەڕاوکێیەیە کە نەخۆش پێشبینیی دەکات تووشی ببێ ئەگەر پەیوەندیی سێکسیی ئەنجام دا، ئەویش لەڕێی بەکاوەخۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ جۆرەها هەڵوێستی سێکسی لەڕێی خەواندنەوە، یان لە باری حەوانەوەدا نەخۆش خۆی لە خەیاڵیدا وێنایان دەکات و بیر لەو هەڵوێستانە دەکاتەوە کە دڵەڕاوکێی بۆ دروست دەکەن. ئەم شێوازە بەردەوام دەبێ تا نەخۆش لەو دڵەڕاوکێیە ڕزگاری دەبێت کە لە کاتی سێکسدا هەستی پێ دەکات.

**-شێوازی ماستەرز و جۆنسۆن**، لەم شێوازەدا هەریەک لە دوو هاوبەشەکە ناوچە و خاڵە وروووژێنەرە سێکسییەکان لە جەستەی خۆیان و جەستەی یەکدیدا ئاشکرا دەکەن، دەست لەم

ناوچانە دەدەن و گەمەبازیی لەگەڵدا دەکەن، بەڵام دەبێ لە گەیشتن بە ئۆرگازم، یان جووتبوونی ڕاستەقینە، خۆیان بەدوور بگرن. لەم شێوازەدا جەخت لە بایەخدانی ئاڵوگۆڕکراو لە نێوان دوو هاوبەشەکەدا دەکرێ، هەروەها یارمەتییان دەدرێ چێژ ببینن و بحەوێنەوە و پەیوەندی لە نێوانیاندا هەبێ و لەڕێی فیدباکی بایۆلۆژییەوە Biofeedback ئەوە دەزانرێ کە لەم کاتانەدا چی ڕوو دەدەن.

-شێوازی لوبیتز و لوباکولو Lobitz and Lopiccolo، ئەم شێوازە بریتییە لە ماستەربەیشن لە نۆ پلەدا.

توێژینەوە جیاوازەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە شێوازی ماستەرز و جۆنسۆن بەم ڕێژانە سوودیان لە چارەسەرکردنی پەککەوتنی سێکسی لە نێردا هەبووە: پەککەوتنی سەرەکی بە ڕێژەی ٥٩%ی حاڵەتەکان، پەککەوتنی لاوەکی بە ڕێژەی ٧٤%، پەککەوتنی تەواو بە ڕێژەی ٦٧%، زووهاویشتن بە ڕێژەی ٩٨%، درەنگهاویشتن بە ڕێژەی ٨٣%، بەڵام ڕێگەی لوبتیز و لوباکولو ئەو پیاوانەی پەککەوتنی تەواویان هەبوو، ٦٦%یان سوودیان لێ وەرگرت و ١٠٠%ی ئەوانەش سوودمەند بوون کە تووشی زووهاویشتن بووبوون. هەرچی چارەسەرکردنی سێکسساردییە لە مێدا ئەوا ئەنجامەکان بەپێی هەردوو چارەسەری پەیڕەوکراو بەم شێوەیە بوون: لەڕێی پەیڕەوکردنی شێوازی ماستەرز و جۆنسۆنەوە ڕێژەکان لە مێدا بەم شێوەیە بوون: لە حاڵەتی ڕوونەدانی سەرەکیی ئۆرگازمدا ٨٣% وەڵامدانەوەیان بۆ چارەسەرکردن هەبوو، ٧٧%ی حاڵەتەکانی نەگەیشتنی لاوەکی بە ئۆرگازم و ٨%ی ئەوانەی بە هیچ شێوەیەک بە ئۆرگازم نەدەگەیشتن، سوودیان لەم چارەسەرە بینی. لە کاتێکدا ١٠٠%ی

ئەو ژنانەی تووشی نەگەیشتنی سەرەکی بە ئۆرگازم بوون و ٣٣%ی ئەوانەی نەگەیشتنی لاوەکییان بە ئۆرگازم هەبوو، ٦٦%ی ئەوانەی بە هیچ شێوەیەک بە ئۆرگازم نەدەگەیشتن سوودیان لە شێوازەکەی لوبیتز و لوباکولو بینی.

- هەروەها لە میانەی توێژینەوەکەمان دەربارەی شێوازەکانی چارەسەرکردن بەگشتی، چەندەها شێوازی دیکەمان خستە ڕوو کە یارمەتیی ورووژاندنی سێکسی دەدەن، ئەم شێوازانە لەوانەیە حەز و پاڵنەری سێکسی زیاد بکەن و بەهێزی بکەن، لەوانەشە ڕوخسارەکانی پەککەوتنی سێکسی کەم بکەنەوە، زۆربەی ئەم شێوازانە هەردوو هاوبەشەکە پێکەوە کۆدەکەنەوە، هەروەها چەندەها هۆکاری جیاجیا لە ڕووی بینین یان بیستنەوە بەکار دەهێنرێن کە هانی چالاکیی سێکسی دەدەن.

- شێوازەکەی ماستەرز و جۆنسۆن چەندەها هەمواری تیادا ئەنجام دراوە، بۆ نموونە ئەم شێوازە لەگەڵ شێوازی ورووژان، یان هاندان Stimulation پێکەوە تێکەڵ کراوە، یان لەگەڵیدا لەرەی کارەبایی بەکارهاتووە. هەموارکردنی یەکەم، دەرئەنجامی باشتری بەدەستەوە دا بە بەراوردکردن لەگەڵ بەتەنیا پەیڕەوکردنی شێوازی ماستەرز و جۆنسۆن، هەروەها هەموارکردنی دووەمیش بە ڕێژەی ١٠٠% سوودی هەبوو لە چارەسەرکردنی پەککەوتنی سەرەکی لە پیاواندا، بەڵام ئەنجامی هەموارکردنەکان ڕێژەی ئەنجامە پۆزەتیڤەکانی چارەسەرکردنی پەککەوتنی لاوەکی کە بە هەموو ڕێگەکان ٧٤% بوو، بەرزنەکردەوە.

## پوختەی چارەسەرکردنی پشێوییە سێکسییەکان

پشێوییە سێکسییەکان دەکرێ بۆ دوو گرووپ دابەش بکرێن، یەکەمیان پشێوییەکانی لەکارکەوتنی سێکسی لە هەریەکە لە نێر و مێدا، گرووپی دووەمیش بریتییە لە گرووپی لادانە سێکسییەکان، بەڵام لە ڕووی چارەسەرکردنەوە چەندەها هۆی جیاجیا هەن کە لە چارەسەرکردنی پشێوییە سێکسییەکان لە جۆری لەکارکەوتنی سێکسی، یان لادان بەکار دەهێنرێن، وەک چارەسەری دەروونی و چارەسەر لەڕێی دەرمانەوە، هەروەها چارەسەری هۆرمۆنی و چارەسەری ڕەفتاری لەڕێی پشتبەستن بە تەکنیکە نوییەکان. لێرەدا پوختەی چارەسەرکرنی ئەم پشێوییانە وەک ئەوەی دەستکەوتوون و تا ئێستا زانراون، دەخەینە ڕوو:

## چارەسەرکردنی حاڵەتەکانی لەکارکەوتنی سێکسی

چەندەها حاڵەتی گرنگی لەکارکەوتنی سێکسی هەیە کە لەوانی دیکە زیاتر لە سکاڵای هەردوو توخمەکەدا دووبارە دەبنەوە، لە هەموویان گرنگتر کە لە هەمووشیان زیاتر لە نێردا ڕوو دەدات، ئەمانەن:

١- حاڵەتەکانی لەکارکەوتنی سێکسی.

٢- حاڵەتەکانی زووهاویشتن.

٣- حاڵەتەکانی درەنگهاویشتن یان خاوهاویشتن.

بەڵام لە مێدا گرنگترین ئەم حاڵەتانە بریتین لە

١- لەکارکەوتنی گشتیی سێکس

٢- لەکارکەوتنی گەیشتن بە ئۆرگازم

٣- تەشەنووجی ناوچەی زێ.

چارەسەرکردنی لەکارکەوتنی سێکسی لە نێردا

### ١- پەککەوتن

پەککەوتنی سێکسی لە پیاودا، بەتایبەتی پەککەوتنی لاوەکی وەڵامدانەوەی بۆ ژمارەیەک لە هۆیەکانی چارەسەرکردن دەبێ. هەرچەندە وەڵامدانەوە بەپێی شێوازی چارەسەرکردن و ئەو کەسانەی کە ئەنجامی دەدەن، جیاواز دەبێ. یەکێک لەو هۆیانەی چارەسەرکردن، چارەسەری دەروونییە کە بانگەشەی ئەوە دەکات چارەسەری شیکاریی درێژخایەن بۆ ماوەی دوو ساڵ، ٧٧%ی حاڵەتەکان چارەسەر دەکات. هەرچی چارەسەری دەروونیی ڕۆشنکەرەوەیە کە کەمتر قووڵە بە بەراورد لەگەڵ چارەسەری شیکاریدا، لەدوای دوو ساڵ ٤٦%ی حاڵەتەکان چارەسەر دەکات. هەرچی ئەو شێوازانەی چارەسەرکردنن کە پشت بە نیشانەکان دەبەستن، وەک چارەسەری دەروونی، دەرکەوتووە ٤٣%ی حاڵەتەکان چارەسەر دەکات.

هەرچی چارەسەرکردنیشە بە شێوازی ماستەرز و جۆنسۆن، ئەوا دەبێتە هۆی چارەسەکردنی ٦٠%ی حاڵەتەکان لە جۆری پەککەوتنی سەرەتایی. بەگشتی دەرئەنجامەکانی چارەسەرکردن و چارەنووسی دواڕۆژی ئەو کەسانەی کە تووشی پەککەوتنی سەرەتایی (سەرەکی) بوون (پەککەوتنی سەرەتایی ئەو حاڵەتەیە کە تاک بە هیچ شێوەیەک نەیتوانیوە پەیوەندیی سێکسیی تەواو ئەنجام بدات)، ئەم حاڵەتانە بەختیان لە چارەسەرکردندا کەمترە بەراورد لەگەڵ پەککەوتنی لاوەکیدا کە بریتییە لە پەککەوتنێکی کتوپڕ و نەخۆش باکگراوندی پەیوەندیی سێکسیی تەواوی لە ڕابردوودا هەیە. ئەو پرەنسیپەی لە زۆربەی حاڵەتەکانی سێکسیدا خۆی دەسەپێنێ ئەوەیە، بەخت و فرسەتی چاکبوونەوە تا ئاستێک پشت دەبەستێ بە توانای کۆنترۆڵکردنی بارودۆخی ژیانی ئەو

کەسە پەککەوتەیە لە ڕووی سێکسییەوە، بەتایبەتی لە پەیوەندییەکانیدا لەگەڵ هاوبەشەکەی. لە هۆکارە کاریگەرەکانی دیکە وەک ئاستی ئامادەباشیی تاک بۆ تووشبوون بە پەککەوتنی سێکسی، هەروەها ئامادەباشیی دەروونی بۆ وروورژێنەرە سۆزدارییەکان، چەندە ئامادەباشیی تاک بۆ یەکەمیان زیاد بکات و بۆ دووەمیان کەم بکات، ئەوەندە چارەسەری پەککەوتنی سێکسی کاریگەریی کەمتر دەبێ، یان نەگونجاو دەبێ، ئیدی شێوازی چارەسەرکردنەکە هەرچۆنێ بێ.

٢- هاویشتنی خێرا، یان زووهاویشتن

دەرئەنجامی پۆزەتیڤی ئەم لەکارکەوتنە سێکسییە باشترە، لە ئەنجامی چارەسەکردنی هەر جۆرێکی دیکە لە پەککەوتن.

باشترین هۆیەکانی چارەسەرکردنیش بریتییە لە شێوازی ماستەرز و جۆنسۆن کە بانگەشەی ئەوە دەکەن ئەم شێوازە توانیویەتی چارەسەری ٩٨%ی حاڵەتەکان بکات، لە ماوەیەکی دیاریکراوی چارەسەرکردن کە لە دوو هەفتە تێپەڕ نابێ، ئەویش بە پەیڕەوکردنی شێوازی چڕی چارەسەرکردن لەڕێی پشتبەستن بە شێوازی (گوشین)، یان شێوازی (بوەستە و دەست پێ بکە).

ئەم ئەنجامانە زۆر باشترن لە ئەنجامەکانی چارەسەرکردن لەڕێی دەروونشیکارییەوە، یان چارەسەرکردنی ڕەفتاری، یان بە جووتە چارەسەرکردنی ژن و پیاو پێکەوە. ئەوەی لەم چارەسەرکردنەدا تێبینی دەکرێ، ئەوەیە ئەنجامەکانی بە شێوەیەکی ڕێژەیی سەربەخۆن لە سروشتی پەیوەندیی نێوان دوو هاوبەشەکە و ناوەڕۆکی دەروونی ئەو پیاوەی بە دەست ئەم جۆرە پشێوییەوە دەناڵێنێ، جیان.

### ٢- هاویشتنی خاو، یان درەنگهاویشتن

بەپێی ڕای ژمارەیەک لە چارەسەرکارە دەروونییەکان، دەروونشیکاری باشترین هۆکاری چارەسەرکردنە بۆ ئەم جۆرە پشێوییە، کە وا گریمانە دەکرێ هۆکارەکانی نەستین و پەیوەندییان بە گرێی ئۆدیبەوە هەیە، بەڵام دەرئەنجامەکانی چارەسەرکردن بەم شێوازە لە باشترین هەڵسەنگاندندا هەر جێگەی گومانە بە نزیکی نیوەی حاڵەتەکان لەڕێی چارەسەری دەروونشیکارییەوە چاک دەبنەوە، بەڵام چارەسەرکردن لەڕێی پەیڕەوکردنی شێوازی ماستەرز و جۆنسۆنەوە دەرئەنجامی پۆزەتیڤ بە ڕێژەی ٦٠% بەدەستەوە دەدات، لە ماوەیەکی زەمەنیشدا کە لە دوو هەفتە تێناپەڕێ. ڕاپۆرتەکان سەبارەت بە چارەسەکردنی ئەم حاڵەتانە ئاماژە بەوە دەدەن، چارەسەرکردنی ئەو پیاوانەی کە بەدەست خاوهاویشتنی خێرایی ڕەهاوە دەناڵێنن (واتە بە هیچ شێوەیەک بە ئۆرگازم ناگەن) مەسەلەیەکە لەوپەڕی ئەستەمیدایە، بەڵام حاڵەتەکانی خاو یان درەنگهاویشتنی لاوەکی (واتە پیاو هەندێجار بە ئۆرگازم دەگات) لە چارەسەرکردندا دەرفەتی باشتریان دەبێ.

باشترین چارەسەر لەڕێی بەکارهێنانی شێوازی ماستەرز و جۆنسۆنەوە دەست دەکەوێ، سەرباری پشتبەستن بە چارەسەری دەروونیی کورتخایەن.

### چارەسەرکردنی لەکارکەوتنی سێکسی لە مێدا

چارەسەرکردنی لەکارکەوتنی سێکسی و شێوە گرنگەکانی لەکارکەوتنی سێکسی لە مێدا، بریتین لە سیان: تەشەنووجی زێ و ڕێگرتنی گشتی لە سێکس و نەگەیشتن بە ئۆرگازم، هەندێ جاریش ئەو دوو حاڵەتەی دواییان پێکەوە کۆ دەکرێنەوە و لەژێر ناوی سێکسساردی، یان لەکارکەوتنی گەیشتن بە ئۆرگازم ناوی دەهێنرێ.

١- تەشەنووجی زێ

باشترین چارەسەر بۆ ئەم حاڵەتە لەڕێی پەیڕەوکردنی شێوازی ماستەرز و جۆنسۆنەوە دەست کەوتووە، کە ناسراوە بە شێوازی (گەورەکردنی زێی کرژبوو)، ئەویش لە ماوەی دوو هەفتە لە چارەسەرکردنی چڕدا.

ڕاپۆرتەکان سەبارەت بەم شێوازە ئاماژە بەوە دەدەن، ئەم ڕێگەیە سەرکەوتنێکی ١٠٠%ی حاڵەتەکانی بەدەست هێناوە. هەندێک پێیان وایە پەیڕەوکردنی ئەم شێوازە لەگەڵ فێرکردنی مێ کە چۆن حەز لە سێکس و بکات، خۆی بۆ پێشوازیکردن لە چووک ئامادە بکات، دەرئەنجامی درێژخایەنتر بەدەست دەهێنێ.

لە شێوازە پەیڕەوکراوەکان، وەک شێوازی چارەسەری دەروونی و چارەسەکردنی دوانی، واتە ژن و پیاو پێکەوە، هەرچەندە دەرئەنجامی چارەسەرکردن بەم دوو شێوازە زۆر هاندەر نین. هەندێک لە پسپۆڕان ئەم حاڵەتە لەڕێی نەشتەرگەریی گەورەکردنی "زێ"وە ئەنجام دەدەن، بەڵام ئەم ڕێگەیە لەوانەیە هەندێک ئازاری دەروونی بۆ ژن دروست بکات، هەروەها ئەنجامەکەشی پشت دەبەستێ بە ئاستی توانای چارەسەرکار لە کوژانەوەی ئەو ترس و تۆقینەی کە ئەو ژنە هەستی پێ دەکات هەر کە بیر لە کرداری خستنەناوەوەی چووک دەکاتەوە، ئەمەش ئەو ترسەیە کە هۆکارە لەو پەرچەکردارە دەمارییەی کە حاڵەتی تەشەنووجەکە لە ژندا دروست دەکات.

٢- لەکارکەوتنی گشتیی سێکس

ئەو حاڵەتانەی کە مێ حەز لە پەیوەندیی سێکسی ناکات، یان توانای وەڵامدانەوەی سێکسی فسیۆلۆژیی ئاسایی نییە، وەک تەڕبوونی زێ و هەڵئاوسانی ئەندامە سێکسییەکانی، دەکەونە چوارچێوەی ئەم زاراوەیەوە.

ئامانج لە چارەسەرکردن لەم حاڵەتانەدا بریتییە لە چالاککردنی وەڵامدانەوەی مێ بۆ ورووژێنەرە سێکسییەکان. بە شێوەیەکی گشتی دەرکەوتووە، شێوازی ماستەرز و جۆنسۆن بە پلە هەڵکشاوەکانیانەوە، باشترین ڕێگەکانی چارەسەرکردنن، بەڵام سەرکەوتنی ئەم ڕێگەیە، یان هەر ڕێگەیەکی دیکە، دواجار هەر پشت بە ئاستی قبوڵکردن، یان ڕەتکردنەوەی پیاو دەبەستێ لە لایەن ژنەوە، واتە ئایا تا چ ئاستێک لە ڕووی سێکسی و دەروونییەوە پیاوەکەی قبوڵە، یان ڕەتی دەکاتەوە.

٣- لەکارکەوتنی گەیشتن بە ئۆرگازم

ئامانجی چارەسەکردن لەم حاڵەتانەدا بریتییە لە کوژانەوەی ئەو فاکتەرەی ڕێگرە لە گەیشتن بە ئۆرگازم، ئەمەش وا پێویست دەکات ورووژاندنی سێکسیی تەواو هەبێ کە لە ڕووی هێز و ماوەی زەمەنییەوە بەشی پێویست بکات، هەروەها دابینکردنی بارودۆخی گونجاو بۆ پەیوەندیی سێکسی لە ڕوانگەی 'مێ'وە. ئەگەر هەموو ئەمانە دابین بوون، ئەوا چارەسەرکردن دەرئەنجامی نزیک لە تەواو بەدەستەوە دەدات لە چارەسەرکردنی ئەم جۆرە لە لەکارکەوتنی سێکسی لە مێدا. سەبارەت بە مەسەلەی بوونی پەیوەندیش لە نێوان بەدیهاتنی ئۆرگازم و ناوچەکانی ورووژاندندا، توێژەران بۆیان دەرکەوتووە، سێ بەشی ئەو مێیانەی کە وەک سەمپڵی توێژینەوەکان کاریان لەسەر کردوون، لەڕێی ورووژاندنی مێتکەوە بە ئۆرگازم گەیشتوون، ئەگەر ئەمە ڕاست بێ، ئەوا ورووژاندن دەبێتە ئامانجێکی چارەسەرکردن لای ئەو ژنانەی بە دەست ئەم جۆرە لەکارکەوتنەوە دەناڵێنن، چونکە لە کاتی پەیوەندی سێکسیدا، تەنیا ورووژاندن لە ناوچەی زێدا ڕووی داوە.

## شێوازە نوێیەکانی چارەسەرکردنی سێکسی

شێوازە نوێیەکانی چارەسەکردنی لەکارکەوتنی سێکسی، چەندەها تەکنیک و شێوازی چارەسەکردن لە خۆیان دەگرن، هەموویان ئەوانە دەگرێتەوە کە دەکەونە دوای ساڵی ١٩٧٠وە، کە هەمان ئەو ساڵەیە ماستەرز و جۆنسۆن کتێبە بەناوبانگەکەیان تیادا چاپ کرد، واتە کتێبی (پەککەوتنی سێکسی لە مرۆڤدا)، کە ئەم کتێبە بوو بە مامۆستایەک بۆ چارەسەکردنی ئەو حاڵەتانە و خاڵی وەرچەرخانیش بوو لە بابەتی چارەسەکردنی لەکارکەوتنی سێکسی. کتێبەکە پەرەنسیپە سەرەکییەکانی تەکنیکی نوێی چارەسەرکردنی لەخۆ گرتبوو، کە لە چوارچێوەی جێبەجێکردنی سایکۆلۆژیدا باس کرابوو، چونکە پشتی بەستبوو بە شێوازی فێرکردن و ڕاهێنانی ڕەفتاری و چارەسەری دەروونیی کورتخایەن. گرنگترین خاڵ لەم تەکنیکی چارەسەرەدا ئەوەیە بە ئاسانی لە بارودۆخی شیاودا جێبەجێ دەکرێ، هەروەها جێبەجێکردنی پێویستی بە ماوەیەکی کورتە کە دوو هەفتە لە چارەسەرکردنی چڕ تێپەڕ ناکات، هەروەها دەرئەنجامەکانی بەکارهێنانی پۆزەتیڤن. تەواوی ئەم خەسڵەتانە وا دەکەن ئەم شێوازی چارەسەرکردنە بە دەروازەیەکی نوێ دابنرێ لە چارەسەرکردنی لەکارکەوتنی سێکسیدا، کە لە ڕووی ئاستی پۆزەتیڤییەوە هیچ شێوازێکی دیکەی چارەسەرکردن پێی ناگات. ئیدی جۆری چارەسەرەکە هەرچۆنێ بێ، واتە چارەسەری شیکاریی دەروونی، یان ڕەفتاری بێ، یان لەڕێی بەکارهێنانی دەرمانەوە بێ، یان کۆی ئەم شێوازانە بێت پێکەوە.

شێوازە نوێیەکانی چارەسەرکردن زۆرن و هەندێکیان پشت بە تەکنیکە سەرەکییەکەی ماستەرز و جۆنسۆن دەبەستن. لێرەدا ڕاڤەیەکی کورتی شێوازەکەی ماستەرز و جۆنسۆن و ئەو شێوازانەی دیکە دەکەین کە لەم شێوازە وەک لق دروست بوون، کە هەموویان بە شێوازە نوێیەکانی چارەسەرکردنی سێکسی ناسراون.

### ١- شێوازی (ناوچەکانی هەستکردن) Sensate Focus

ئەم شێوازە لە چارەسەکردن، ماستەرز و جۆنسۆن دایانهێنا، ئامانج لێی ئەوەیە هەردوو هاوبەشەکە بەو ناوچە و خاڵانە لە جەستەیاندا ئاشنا ببن کە لە ڕووی سێکسییەوە دەیانورووژێنێ، هەروەها ئاشنابوون بە چۆنێتیی وروژاندن تا هەردووکیان بە وەڵامدانەوەی سێکسیی تەواو بگەن. هەردوو هاوبەشەکە بە نۆبە دەست بۆ یەکدی دەبەن و گەمەبازی بۆ یەکدی دەکەن و ئەو شوێنانە دەورووژێنن کە هەریەکەیان چێژی سێکسیی لێ دەبینێ. لەم شێوازەدا وا پێویست دەکات ژن و پیاو هەردووکیان بەشداریی چارەسەرکردنەکە بکەن و هەروەها نابێ لە ماوەی دیاریکراوی چارەسەرکردندا هیچ پەیوەندییەکی سێکسیی ڕاستەقینە ئەنجام بدەن.

پرۆسەی چارەسەرکردن سێ هەنگاو لەخۆ دەگرێ. لە قۆناغی یەکەمدا هەردوو لا هان دەدرێن بۆ هەستکردن بەو وروژاندنەی کە هاوبەشەکەی لەڕێی گەمەبازییەوە لەگەڵیدا دەکات و بۆی هەیە گەمەبازی لە هەر شوێنێکی جەستەیدا بکات، جگە لە ئەندامە سێکسییەکانی، هەروەها هەردووکیان هان دەدرێن تا زانیاری دەربارەی ئەم هەستکردنە لەگەڵ یەکدا بگۆڕنەوە، واتە بە یەکدی بڵێن چێژ لە وروژاندنی کام شوێنی جەستە دەبینن و چییان زیاتر پێ خۆشە؟ لە قۆناغی دووەمدا مەمک و ئەندامە سێکسییە سەرەکییەکان بۆ ناوچەکانی وروژاندن زیاد دەکرێ، واتە بۆیان هەیە لەو ناوچانەش گەمەبازی لەگەڵ یەکدا بکەن، بەڵام نابێ بە ئۆرگازم بگەن. لە قۆناغی سێیەمدا، پیاو هەوڵی خستنەناوەوەی چووک دەدات و هاوکات لە ماوەی ئەم چارەسەکردنەدا، هەردوو هاوبەشەکە لە ڕووی دەروونییەوە یارمەتییان دەدرێ و پشتیوانییان لێ دەکرێ تا ئەو دڵەڕاوکێیەیان کەم بێتەوە کە پێشتر هەستییان پێ کردووە و بەهۆیەوە ئەو هەستە بەسەریاندا زاڵ

بووە، کە ناتوانن کرداری پەیوەندییە سێکسییەکە تەواو بکەن و بگەنە ئۆرگازم.

داهێنەرانی ئەم ڕێگەیە ئاماژەیان بەوە داوە کە پەیڕەوکردنی ئەم شێوازە بووەتە مایەی چارەسەرکردنی نزیکەی ٨٠%ی ئەو حاڵەتانەی تووشی لەکارکەوتنی سێکسی بوون و ئەم چارەسەرەیان بۆ بەکار هاتووە.

ئەم ڕێژەیە بە ڕێژەیەکی بەرز دادەنرێ بەراورد بە ڕێژەی سەرکەوتنی هەموو شێوازە دەروونی، یان ڕەفتارییەکانی دیکە، یان بەکارهێنانی دەرمان و هۆرمۆن، بەتایبەتی لە چارەسەرکردنی حاڵەتەکانی پەککەوتنی سێکسی لە پیاودا، ڕێژەی چاکبوونەوە لە حاڵەتی پەککەوتنی لاوەکیدا گەیشتووەتە ٧٤%، لە حاڵەتەکانی پەککەوتنی سەرەتایی یان سەرەکیدا گەیشتووەتە ٦٠% کە ئەمەی دواییان لەو حاڵەتانەیە کە لە ڕابردوودا زۆربەی چارەسەرەکان شکستیان دەهێنا لە یارمەتیدانی نەخۆش بۆ چاکبوونەوە.

لە حاڵەتەکانی دیکەی لەکارکەوتنی سێکسی کە بە شێوەیەکی تێبینیکراو وەڵامدانەوەی بۆ شێوازی چارەسەرکردنەکەی ماستەرز و جۆنسۆن هەبوو، حاڵەتەکانی لەکارکەوتنی گەیشتن بوو بە ئۆرگازم لە مێدا، لەڕێی پەیڕەوکردنی ئەم شێوازەوە ٨٣%ی حاڵەتەکانی لەکارکەوتنی سەرەکی گەیشتن بە ئۆرگازم چاکبوونەوە، ٧٧%ی ئەو ژنانەش لەدوای پشتبەستن بە شێوازی ماستەرز و جۆنسۆن، توانییان بە ئۆرگازم بگەن کە تووشی لەکارکەتنی لاوەکیی گەیشتن بە ئۆرگازم بووبوون.

لەگەڵ ئەو سوودە زۆرەی کە لە شێوازەکەی ماستەرز و جۆنسۆندا کۆبووەتەوە، بەڵام ئەنجامی چارەسەرکردن بەم شێوازە تا ئاستێکی زۆر بەندە بە ئارەزووی ژن و پیاوەکەوە، بۆ زاڵبوون بەسەر ئەستەمییەکانی پەیوەندیی سێکسیی نێوانیان و توانایان بۆ دەستبەرداربوون لە هەڵوێستە شەڕانگێزییەکانیان، یان

### ٣- شێوازی ماستەرز و جۆنسۆن- گوشین
### Squeeze Technique

ئەم شێوازە بریتییە لە هەموارکراوی شێوازەکەی سیمانز- بوەستە و دەست پێ بکە. لەم شێوازەشدا وەک لە دوو شێوازەکەی پێشوودا ئاماژەمان پێ دا، پەیڕەوکردنی پێویستی بە هاوبەشیکردنی نێوان ژن و پیاوەکە هەیە. لەم شێوازەدا ژن ئەندامی نێرینەی پیاو دەوروووژێنێ، ئیدی بە هەر شێوە و ڕێگەیەک کە خۆیان پێیان خۆشە و هەڵیدەبژێرن. کاتێک ڕەهبوون ڕوو دەدات و لەو کاتەدا کە خەریکە پیاوەکە هاویشتنی تۆو ئەنجام دەدا، یەکسەر هاوبەشەکەی لە قەراغی ژێر کڵاوەی چووک (حشفە) بۆ ماوەی چەند چرکەیەک چووکی پیاوەکەی دەگوشێ، ئەم گوشینە دەبێتە هۆی وەستانی کرداری هاویشتن. ئەم کارە چەند جارێ دووبارە دەکرێتەوە، دواجار ڕێگە بە پیاوەکە دەدا کە هاویشتن ئەنجام بدات. پەیڕەوکردنی ئەم ڕێگەیەی چارەسەرکردن دەبێتە هۆی درێژکردنەوەی قۆناغی هەڵسان، کە بریتییە لە قۆناغی دووەمی قۆناغەکانی وەڵامدانەوەی سێکسی، دەکرێ بۆ ماوەی ١٥-٢٠ دەقیقە لە نێردا درێژ بکرێتەوە.

دژەکانیان بەرامبەر بە یەکدی لە ماوەی چارەسەرکردندا، هەروەها پشت دەبەستێ بە ئامادەباشییان بۆ قبوڵکردنی یەکدی، وەک هاوبەشیی سێکسی و ئامادەییان بۆ کارکردن پێکەوە لەپێناوی بەدیهێنانی باشترین پەیوەندیی سێکسیدا. ئەگەر ئەم مەرج و پێویستییانە دابین بوون، ئەوا ئەستەمە ڕێژەی سەرکەوتنی هەریەک لەو شێوازانەی چارەسەرکردن و کاریگەریی ئەو فاکتەرانە، دیاری بکرێن.

### ٢- شێوازی سیمانز Semans

شێوازی سیمانز یان شێوازی "بوەستە و دەست پێ بکە"، لەسەر بناغەی ئەو تێبینییە بنیاد نراوە کە هاویشتنی تۆو لە نێردا بەر لە کاتی خۆی ڕوو دەدات، ئەگەر پیاو هەستی کرد هاویشتن خەریکە ڕوو دەدات، بەم شێوەیە سیمانز پێی وایە چارەسەری دروست ئەوەیە وا لە پیاو بکرێ لەو هەستانەی بەئاگا بێ، یارمەتیی بدرێ بۆ ئەوەی هۆشی لە لای ورووژاندن بێ، بێ ئەوەی ڕاستەوخۆ تۆو بهاوێژێ. سیمانز ئەم شێوازەی خۆی ناو نا "بوەستە و دەست پێ بکە Stop-Start Technique". پیاو بە یارمەتیی هاوبەشەکەی بۆ ورووژاندنی تەواو هان دەدرێ، کاتێ خەریکە هاویشتن ڕوو دەدات، ڕاستەوخۆ ژنەکەی واز لە ورووژاندنی دەهێنێ و پیاوەکە کەمێ دەحەوێتەوە، پاشان سەرلەنوێ دەست پێ دەکەنەوە. سیمانز ئاماژەی بەوە داوە، پەیڕەوکردنی ئەم شێوازە لە چارەسەکردنی حاڵەتەکانی زووهاویشتندا لە ماوەی مانگێکدا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە.

# بەشی بیستودوو
# سێکس و ژیانی دەروونی و ئەقڵی

- پێشەکی
- کاریگەریی پشێوییە دەروونی و دەماری و ئەقڵییەکان
  بۆ سەر سێکس
- کاریگەریی پشێوییە سێکسییەکان
  بۆ سەر ژیانی دەروونی و ئەقڵی

## سێکس و ژیانی دەروونی و ئەقڵی

چەندەها ڕا و گریمانەی جیاجیا هەن دەربارەی بابەتی پەیوەندیی نێوان ژیانی سێکسی و ژیانی دەروونی و ئەقڵیمان و کاریگەریی هەریەکەیان بۆ سەر ئەوی دیکەیان. ئەو توێژەرەی بەدواداچوون بۆ ئەم بابەتە بکات، بۆی ئاشکرا دەبێ کە جۆرێک لە پەرگیری و جیاوازی لە نێوان ڕایەکاندا هەیە کە هەندێ جار دەگاتە ئاستی دژبەیەکی، بۆ نموونە هەندێ کەس بە چاوێک تەماشای ژیانی سێکسی دەکات، وەک ئەوەی تەنیا غەریزەیەکی ئاژەڵی بێ و هیچ بایەخێکی لە ژیانی مرۆڤایەتیماندا نەبێ، هەندێک بە پێچەوانەوە بایەخێکی هێندە زۆر بە ژیانی سێکسی دەدەن تا ئەو ئاستەی پێیان وایە ئەستەمە تاک بێ هاوبەشیکردنی گەشەیەکی هاوشێوەی ژیانی سێکسی، بتوانێ بە گەشەیەکی دەروونیی دروست بگات. لە نێوان ئەم دوو ئاڕاستە دوور لە یەکەدا، ڕاوبۆچوونی دیکە هەن کە پشتیان بە تێبینی و ئەزموون و ڕووداوی ڕاستەقینە و واقیعی بەستووە، هەموویان پشتیوانی لەو دەرئەنجامە دەکەن کە پەیوەستییەکی بەتین هەیە لە نێوان ژیانی سێکسی و ژیانی دەروونی و ئەقڵیدا، ئیدی لە هەردوو حاڵەتی ساغڵەمی و حاڵەتەکانی نەخۆشیدا وەک یەک. لەبەر ئەوە ژیانی سێکسی لەگەڵ ژیانی دەروونی و ئەقڵیماندا کاریگەرییەکی ئاڵوگۆڕکراویان بۆ سەر یەکدی هەیە، هەرچەندە سەبارەت بە لێکدانەوەی سروشتیی ئەم پەیوەندییە و چۆنێتیی ڕوودانی کاریگەریی و قەبارەی کاریگەریی ئەم پەیوەندییە بۆ سەر هەر یەکێک لەو دوو ژیانە، جیاوازی و ناکۆکی هەیە. لەوانەیە لێرەدا شتێکی بەسوود بێ، بەشێک لەو ڕاوبۆچوونانەی دەربارەی ئەم

پەیوەندییە هەن، بخەینە ڕوو، کە لە شارستانییەتە دێرینەکانەوە دەست پێ دەکەن تا دەگاتە ئەم سەردەمەی ئێستا، ئەمەش ئاماژەیە بۆ بایەخی بەردەوامی مرۆڤ بەم پەیوەندییە و جەختکردنەوە لە گرنگیی لە ژیانی مرۆڤدا.



لەوانەیە گالینوس، نۆژداری بەناوبانگی ڕۆمانی لە سەدەی دووەمی دوای زاین، یەکەمین پزیشک بووبێ کە باسی لە پەیوەندیی نێوان سێکس و دەروون کردووە، بۆ نموونە تێبینیی پەنگخواردنەوەی تۆوی پیاو و دواکەوتنی سووڕی مانگانەی مێی کردووە، کە هەردووکیان یارمەتیدەرن لە خولقاندنی دۆخێکی ناهاوسەنگ لە ژیانی نێر و مێ-دا و دەرکەوتنی دڵەڕاوکێ لە هەردووکیاندا، هەروەها تێبینیی بوونی پەیوەندیی کردووە لە نێوان سەرهەڵدانی نیشانەکانی نەخۆشیی هستیری و نەتوانینی ئەنجامدانی پەیوەندیی سێکسی. ئەو تێبینییە لە سەردەمی ئەبیقراتدا زاڵ بوو کە وشکبوونەوەی منداڵدان بەهۆی ڕێگری لە ڕوودانی سێکس، پاڵ بە منداڵدانەوە دەنێ بۆ گواستنەوە بۆ شوێنێکی دیکە لە لەشدا و بە حیساب منداڵدانی ئەو ژنە بە شوێن تەڕایی و شێدا دەگەڕێ.

ئەمەش دەبێتە هۆی دەرکەوتنی نیشانەکانی نەخۆشیی هستیری کە تەنیا لە مێدا ڕوو دەدات. دواجار گالینوس دەرکی بە سوودی چارەسەکردن کرد کاتێ نەخۆش پەیوەندیی سێکسی دەکات، یان ماستەربەیشن دەکات. لە شارستانییەتە دێرینەکانی دیکەدا، وەک شارستانییەتی هیندی و چینی، تۆوی نێر بە ماددەیەکی گرانبەها و زیندوو دانراوە، کە نەک تەنیا پەیوەندیی بە هێز و چالاکیی جەستەییەوە هەیە، بەڵکو پەیوەندیی بە هێز و چالاکیی ئەقڵیشەوە هەیە، لەبەر ئەوە وا پێویستی کردووە کە خەسار نەکرێ و بە خۆڕایی بەهەدەر نەدرێ. پزیشکی عەرەبی

"ڕازی" یەکێک بوو لەو کەسانەی کە ڕایەکی توند و یەکلاییکەرەوەی هەبوو سەبارەت بە پێویستیی بەفیڕۆنەدانی تۆو، هەروەها پێی وا بوو پێویستە زیادەڕۆیی لە ئەنجامدانی سێکسدا نەکرێ تا ئەو تۆوە بەفیڕۆ نەچێ کە کاریگەریی بۆ سەر زیندەگی و ژیانی دەروونیی ئەقڵی مرۆڤ هەیە. لە کتێبەکەیدا بە ناوی "پزیشکی ڕۆمانی" سەبارەت بە کاریگەریی چێژ لە کاتی جووتبووندا، دەڵێ: "...چاو کز دەکات، جەستە ماندوو دەکات، خێرا پیری دەکات و داڕمانی جەستە و لاوازبوونی خێرا دەکات و زیان بە دەماخ و دەمارەکان دەگەیەنێ و هێز و توانا لەناودەبات... لەبەر ئەوە کەسی ژیر پێویستە خۆی لێ دووربخاتەوە و ڕێگە نەدات ڕوو بدات، تا زیانی پێ نەکەوێ". هەروەها سەبارەت بە چێژیش دەڵێ: چێژی سێکسی لەپێشەوەی ئەو چێژانەوەیە کە دەتوانرێ وەلا بنرێ، چونکە چێژێکی ناچاری نییە بۆ مانەوەی مرۆڤ لە ژیاندا، وەک خواردن و خواردنەوە نییە، وازهێنان لێی هیچ ئازارێکی دیار و هەستپێکراو جێ ناهێڵێ، وەک ئازاری برسێتی و تینوێتی". بەپێی ڕازی، ئەگەر هیچ چارێک نەبوو بۆ ئەوەی مرۆڤ سێکس نەکات، واتە وا پێویستی کرد هەر بیکات، ئەوا دەبێ لە کەمترین پلەدا بکرێ: "...ئەگەر هەر دەبوو سێکس بکرێ، ئەوا بە کەمترین بڕ بکرێ تا کەمترین لۆمە و سەرەکۆنەی خۆمان بکەین". لە کتێبی چێژدا، ڕازی دەڵێ: "...هەرچی جەستەیە، چەندە بەو چێژە هەستپێکراوانە ماندوو بکرێ، ئەوەندە چێژە بەهیمییەکانیشی زیاد دەبن و لە سروشت و مەرجەکانی مرۆڤبوونی دوور دەخەنەوە". بەم شێوەیە ڕازی پێی وایە سێکس و چێژەکانی سێکس، واتە زاڵبوونی غەریزەی ئاژەڵی بەسەر لایەنە مرۆییەکان لە ژیانی مرۆڤدا. لەم سەردەمەدا زۆرێک لەو ڕاوبۆچوونانە هەن کە جەخت لەسەر بایەخی لایەنە سێکسییەکان و کاریگەرییان بۆ سەر کەسێتی و ڕەفتاری سروشتی و

پەیوەندییە هەن، بخەینە ڕوو، کە لە شارستانییەتە دێرینەکانەوە دەست پێ دەکەن تا دەگاتە ئەم سەردەمەی ئێستا، ئەمەش ئاماژەیە بۆ بایەخی بەردەوامی مرۆڤ بەم پەیوەندییە و جەختکردنەوە لە گرنگیی لە ژیانی مرۆڤدا.

***

لەوانەیە گالینوس، نۆژداری بەناوبانگی ڕۆمانی لە سەدەی دووەمی دوای زاین، یەکەمین پزیشک بووبێ کە باسی لە پەیوەندیی نێوان سێکس و دەروون کردووە، بۆ نموونە تێبینیی پەنگخواردنەوەی تۆوی پیاو و دواکەوتنی سووڕی مانگانەی مێی کردووە، کە هەردووکیان یارمەتیدەرن لە خوڵقاندنی دۆخێکی ناهاوسەنگ لە ژیانی نێر و مێ‌دا و دەرکەوتنی دڵەڕاوکێ لە هەردووکیاندا، هەروەها تێبینیی بوونی پەیوەندیی کردووە لە نێوان سەرهەڵدانی نیشانەکانی نەخۆشیی هستیری و نەتوانینی ئەنجامدانی پەیوەندیی سێکسی. ئەو تێبینییە لە سەردەمی ئەبیقراتدا زاڵ بوو کە وشکبوونەوەی منداڵدان بەهۆی ڕێگری لە ڕوودانی سێکس، پاڵ بە منداڵدانەوە دەنێ بۆ گواستنەوە بۆ شوێنێکی دیکە لە لەشدا و بە حیساب منداڵدانی ئەو ژنە بە شوێن تەڕایی و شێدا دەگەڕێ.

ئەمەش دەبێتە هۆی دەرکەوتنی نیشانەکانی نەخۆشیی هستیری کە تەنیا لە مێدا ڕوو دەدات. دواجار گالینۆس دەرکی بە سوودی چارەسەکردن کرد کاتێ نەخۆش پەیوەندیی سێکسی دەکات، یان ماستەربەیشن دەکات. لە شارستانییەتە دێرینەکانی دیکەدا، وەک شارستانییەتی هیندی و چینی، تۆوی نێر بە ماددەیەکی گرانبەها و زیندوو دانراوە، کە نەک تەنیا پەیوەندیی بە هێز و چالاکیی جەستەییەوە هەیە، بەڵکو پەیوەندیی بە هێز و چالاکیی ئەقڵیشەوە هەیە، لەبەر ئەوە وا پێویستی کردووە کە خەسار نەکرێ و بە خۆڕایی بەهەدەر نەدرێ. پزیشکی عەرەبی

"ڕازی" یەکێک بوو لەو کەسانەی کە ڕایەکی توند و یەکلاییکەرەوەی هەبوو سەبارەت بە پێویستیی بەفیڕۆنەدانی تۆو، هەروەها پێی وا بوو پێویستە زیادەڕۆیی لە ئەنجامدانی سێکسدا نەکرێ تا ئەو تۆوە بەفیڕۆ نەچێ کە کاریگەریی بۆ سەر زیندەگی و ژیانی دەروونیی ئەقڵی مرۆڤ هەیە. لە کتێبەکەیدا بە ناوی "پزیشکی ڕۆمانی" سەبارەت بە کاریگەریی چێژ لە کاتی جووتبووندا، دەڵێ: "...چاو کز دەکات، جەستە ماندوو دەکات، خێرا پیری دەکات و داڕمانی جەستە و لاوازبوونی خێرا دەکات و زیان بە دەماخ و دەمارەکان دەگەیەنێ و هێز و توانا لەناودەبات... لەبەر ئەوە کەسی ژیر پێویستە خۆی لێ دووربخاتەوە و ڕێگە نەدات ڕوو بدات، تا زیانی پێ نەکەوێ". هەروەها سەبارەت بە چێژیش دەڵێ: چێژی سێکسی لەپێشەوەی ئەو چێژانەوەیە کە دەتوانرێ وەلا بنرێ، چونکە چێژێکی ناچاری نییە بۆ مانەوەی مرۆڤ لە ژیاندا، وەک خواردن و خواردنەوە نییە، وازهێنان لێی هیچ ئازارێکی دیار و هەستپێکراو جێ ناهێڵێ، وەک ئازاری برسێتی و تینوێتی". بەپێی ڕازی، ئەگەر هیچ چارێک نەبوو بۆ ئەوەی مرۆڤ سێکس نەکات، واتە وا پێویستی کرد هەر بیکات، ئەوا دەبێ لە کەمترین پلەدا بکرێ: "...ئەگەر هەر دەبوو سێکس بکرێ، ئەوا بە کەمترین بڕ بکرێ تا کەمترین لۆمە و سەرەکۆنەی خۆمان بکەین". لە کتێبی چێژدا، ڕازی دەڵێ: "...هەرچی جەستەیە، چەندە بەو چێژە هەستپێکراوانە ماندوو بکرێ، ئەوەندە چێژە بەهیمییەکانیشی زیاد دەبن و لە سروشت و مەرجەکانی مرۆڤبوونی دوور دەخەنەوە". بەم شێوەیە ڕازی پێی وایە سێکس و چێژەکانی سێکس، واتە زاڵبوونی غەریزەی ئاژەڵی بەسەر لایەنە مرۆییەکان لە ژیانی مرۆڤدا. لەم سەردەمەدا زۆرێک لەو ڕاوبۆچوونانە هەن کە جەخت لەسەر بایەخی لایەنە سێکسییەکان و کاریگەرییان بۆ سەر کەسێتی و ڕەفتاری سروشتی و

ناسروشتی و ژیانی دەروونی و ساغلەمیی ئەقلی مرۆڤ دەکەن، ئەو زانیارییانەش زۆرن کە ئاماژە بەوە دەدەن ژیانی سێکسی تووشی پشێوی دەبێ لە ئەنجامی ڕوودانی پشێوی لە ژیانی دەروونی و ئەقڵیدا، هەروەها چالاکیی سێکسییش دەشێ ببێتە هۆکار لە بەردەمی چاکبوونەوەی ئەم نەخۆشییانە، یان مانەوەیاندا. بەڵگەی دیکە هەن ئاماژە بەوە دەکەن، پشێوی لە ژیانی سێکسی و لەکارکەوتنی سێکسی، ئیدی هەر جۆرە لەکارکەوتنێک بێ، لەوانەیە ببنە هۆی ڕوودانی پشێویی دەروونی و سۆزداری، یان ڕەفتاری لە هەندێ خەڵکدا.

لەم سەردەمەدا ژمارەیەکی کەم لە زانا و توێژەران هەن هێندەی فرۆید ئەو بایەخە ڕەهایە بە سێکس بدەن و بایەخ بە کاریگەریی سێکس بدەن بۆ سەر بونیادی دەروونیی مرۆڤ، ئەوانەش کە لەم سەردەمەدا بڕوایان بە قوتابخانەی دەروونشیکارییە بە هەموو کەموکوڕییەکانییەوە، ژمارەیان هەر کەمە. قوتابخانەی دەروونشیکاری بڕوای بەوە هەیە ململانێ دەروونییەکان دەرئەنجامی ئەو ئارەزووە سێکسییانەن کە لە کاتی خۆیاندا تێرنەکراون، بۆیە کاریان کردووەتە سەر گەشەی دەروونیی سێکسی خاوەنەکەیان، هەروەها ئەم کاریگەرییە دەشێ ببێتە هۆی وازهێنان لە سێکس و لەکارکەوتنی سێکسی، یان لادانی سێکسی و ئەگەری ڕوودانی نەخۆشیی دەروونی، هەروەها لەم سەردەمەدا بڕوا وایە پێویستە تاک کۆنترۆڵی پاڵنەرە سێکسییەکانی بکات لە قۆناغی هەرزەکاریدا، ئەگەر وا نەکات، ئەوا لەدەستدانی ئەم کۆنترۆڵە کار دەکاتە سەر ساغلەمیی ئەقلی ئەو کەسە. یەکێک لەو ڕایانەی کە لەگەڵ ڕای بایەخی سێکس لە ژیانی دەروونیماندا دژ دەوەستێت، ڕایەکەی ماسرمان Masserman-ە (١٩٦٦) و ڕای هنت Hunt-ە (1965)، لە کاتێکدا ماسرمان پێی وایە پێداویستییە فسیۆلۆژییەکان هانی ڕەفتاری سێکسی دەدەن،

بەلام هیچ بایەخێکیش بە ئارەزووی سێکسی نادات، چونکە پێی وایە ئەم ئارەزووە کتوپڕ و خولی و سەرپێییە و تاک دەتوانێ دەستبەرداری ببێ. هەرچی "هنت"ە پێی وایە ڕەفتاری سێکسی لەڕێی پێداویستییە فسیۆلۆژییەکانەوە هان نادرێ و هیچ پەیوەندییەک لە نێوان سۆز و ژیانی سێکسیماندا نییە. لە کاتێکدا ئەم ڕایانە لە یەکدی جیاوازن و دژ بە یەک دەوەستن، کۆمەڵێک ئاماژە و بەڵگە هەن کە پشتیوانی لە هەندێکیان دەکەن و لە دژی هەندێکی دیکەیان دەوەستنەوە، بۆ نموونە بەڵگەی زۆر هەن لەسەر ئەوەی هەندێ کەس هەن ژیانی سێکسییان سروشتییە، بەلام بەدەست نەخۆشیی دەروونی و ئەقڵییەوە دەناڵێنن، هاوکات بەڵگەی پێچەوانە هەن، ئەوە ئاشکرا دەکەن ڕێژەی تووشبووان بە نەخۆشیی دەروونی، یان پشێویی سۆزداری، یان ئەقڵی لە ڕێژەی ئاسایی لەو کەسانەدا زیاترە کە بەدەست پشێوییە سێکسییەکانەوە دەناڵێنن.

لەو ڕایانەی کە جەخت لەسەر بوونی پەیوەندی دەکەن لە نێوان سێکس و لایەنە دەروونی و دەماری و ئەقڵییەکان لە ژیانی تاکدا، بەتایبەتی لە حاڵەتەکانی بەهەدەردان و زۆر سەرفکردنی وزەی سێکسی، وەک ڕای هرمان بویرهافی Boerhaave(1668-1738)، پێی وایە سەرفکردنی سەرشێتانەی تۆو، دەبێتە هۆی ڕوودانی لاوازی و بێهێزی و سستبوونی جووڵە و ڕوودانی نۆرەی دەماری و پووکانەوەی جەستەیی و لاوازبوونی هەستکردن و ئازاری پەردەکانی دەماغ.

هەرچی فردریک هوفمان- (١٦٦٠-١٧٤٢) پێی وایە تەسلیمبوون بە خووی ماستەربەیشن دەبێتە هۆی لاوازبوونی یادەوەری، چونکە کۆئەندامی دەمار بەو هۆیەوە شەکەت دەبێ، هەروەها جۆن براون (١٧٥٣-١٧٨٨) پێی وایە پێکەوەنووسانی جەستەیی ئاڵوگۆڕکراو لە نێوان نێر و مێدا، وەک ڕوودانی

ماچکردن، هێزێکی پاڵنەر بە دەمارەکان دەبەخشێ، هەرچی جووتبوونە هەرچەندە حەوانەوەیەکی کاتی دروست دەکات، بەڵام دەشێ وزەیەکی یاخیبووش ببەخشێ، ئەگەر زیادەڕۆیی لە ئەنجامدانیدا کرا، دەشێ ببێتە هۆی ناڕەحەتی بۆ مرۆڤ. تیسوت Tissot (1722-1776) پێی وایە زیاد سێکسکردن و سەرفکردنی وزەی سێکسی دەبێتە هۆی پووکانەوەی فیکر و ڕوودانی حاڵەتێک لە شێتبوون، هەروەها دەبێتە هۆی لاوازبوونی تاک بۆ پێتاندن و ڕوودانی پەککەوتنی سێکسی و زووهاویشتن و جۆرەکانی دیکەی لەکارکەوتنی سێکسی.

لە سەدەی نۆزدەدا بەتایبەتی، بایەخەکان ڕووەو توێژینەوە لە ژیانی سێکسیدا لە هەردوو بواری بایۆلۆژی و دەروونی ئاراستەی گرت. مول Moll و فلیس Fliess و کرافت ئێنج Kraft- Ebing و هافلوک ئالیس و دواجار فرۆید، لە گرنگترین ئەو زانا و توێژەرانە بوون کە بایەخیان بە لێکۆڵینەوە لەم لایەنەی ژیان دا. فرۆید توانیی ئاراستە و ڕای جیاجیای هاوچەرخەکانی خۆی پێکەوە کۆبکاتەوە و ژیانی سێکسی و ژیانی دەروونی پێکەوە پەیوەست بکات. ئەم پەیوەستکردنە لە نێوان سێکس و دەرووندا بە دوو ڕێگە بەڕێوەچوو، یەکەمیان پەیوەستکردنی سێکس و دەروون لە گەشەی کەسێتیدا، هەر لە قۆناغی منداڵییەوە تا قۆناغی هەرزەکاری و بۆ ئەم پەیوەستکردنە زاراوەی گەشەی سێکسیی دەروونی Psycho sexual Development بەکار هات. هەرچی ئاراستەی دووەمە، یان ڕێگەی دووەمە لەو هەوڵانەی فرۆیددا ئاشکرا دەبێ کە ویستی پاسۆلۆژیی سێکس لە لێکدانەوەی پاسۆلۆژیی دەرووندا بقۆزێتەوە (واتە سایکۆپاسۆلۆژی). لەگەڵ ئەم پەیوەستکردنەدا، تیۆرە جیاجیاکانی فرۆید هاتنە ئاراوە، وەک تیۆرەکانی دەربارەی سێکس لە قۆناغی منداڵیدا و قۆناغەکانی گەشەی دەروونیی سێکسی و گرێی ئۆدیب

و ململانێی دەروونی و چەپاندن و کاریگەرییە دەروونییەکانی بەهۆی ئەم حاڵەتانەوە ڕوو دەدەن.

بە ڕەچاوکردنی فرەیی ئەو فاکتەرانەی کاردەکەنە سەر ژیانی دەروونی و ژیانی سێکسیی تاک، ئەستەمە بناغەی ئەو پەیوەندییە دیاری بکرێ کە ئەم دوانە پێکەوە دەبەستێ. هەموو ئەوەی دەکرێ سەبارەت بەم پەیوەندییە ئاشکرا بکرێ، بریتییە لە تێبینیکردنی دەرئەنجامەکانی کاریگەریی هەریەکەیان بۆ سەر ئەوی دیکە. لە کاتی تێبینیکردنی ئەم ئەنجامانەشدا پێویستە لەوە بەئاگابین کە ئەم ئەنجامانە تەنیا کاریگەریی کۆمەڵێک فاکتەری سەرەکین کە بڕیار لەسەر ڕوودانی پشێوی دەدەن لە هەریەک لە بواری دەروونی و سێکسیدا، نەک تەنیا کاریگەریی یەکێکیان بۆ سەر ئەوی دیکەیان.

## کاریگەریی پشێوییە دەروونی و دەماری و ئەقڵییەکان بۆ سەر سێکس

پشێوییە سێکسییەکان بەگشتی وەک لەکارکەوتن، یان لادان، زیاتر لەو کەسانەدا ڕوو دەدەن کە پشێویی دەروونی و دەماری و ئەقڵییان هەیە، بەراورد لەگەڵ ئەو کەسانەی کە سروشتین و ئەم کێشە دەروونی و ئەقڵییانەیان نییە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە هەمیشە چاوەڕێی پشێویی سێکسی لە هەموو حاڵەتێکی نەخۆشیی دەروونی بکرێ، ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە پشێوی و نەخۆشییە دەروونی و ئەقڵییەکان بە تەنیا ناتوانن بڕیار لەسەر بەرئەنجامی کارایی سێکسی بدەن. لەو تێبینییە کلینیکییانەی دەربارەی ئەم بابەتە لە بەردەستدان، ئەمانەن:

١- نەخۆشییە ئەقڵییە ئەندامییەکان، وەک حاڵەتی خەڵەفانی پیری و ڕەقبوونی خوێنبەرەکان و خەمۆکیی ئەندامی، بە شێوەیەکی زیاتر پەیوەستن بە لاوازیی سێکسی و لاوازیی

هاندەری سێکسی، وەک لەوەی پەیوەست بێ بە لادانە سێکسییەکانەوە.

٢- پەککەوتنی سێکسی، یان لاوازیی سێکسی لە حاڵەتەکانی پەرکەمی دەروونیی جووڵەیی (سایکۆمۆتۆر) تێبینی کراوە، هەروەها لادانە سێکسییەکان بە شێوەیەکی زیاتر لەگەڵ ئەو نەخۆشییە ئەندامییانەدا هاوکاتن کە لە ناوچەی لاجانگە دەماخ روو دەدەن.

٣- بەرکەوتنی توندی کەللەسەر کار دەکاتە سەر حاڵەتی سێکسی، بەتایبەتی ئەگەر بەرکەوتنەکە لە ناوچەی بەشی پێشەوەی سەر بوو، بەرکەوتنی دەماخ لە بەشی پێشەوەدا دەبێتە هۆی زیادبوونی پاڵنەری سێکسی، هەروەها حاڵەتەکانی توندوتیژی زیاد دەکات لە کاتی پەیوەندیی سێکسیدا، هەروەها دەشێ نەخۆش تووشی حاڵەتێک لە حاڵەتەکانی پەککەوتنی سێکسی ببێ، وەک بەشێک لە دەرئەنجامە دەروونی و سێکسییەکانی بەرکەوتنی بەشی پێشەوەی دەماخ. ئەوەی لە کاتی بەرکەوتنی توندی سەردا تێبینی دەکرێ، لەدوای ئەنجامدانی نەشتەرگەری، لە بەشی پێشەوەی دەماخیشدا تێبینی دەکرێ. توندوتیژی و پێداگری پاڵنەری سێکسی و لەدەستداتی توانای کۆنترۆڵکردن تێبینی دەکرێ، هەروەها نەخۆش هەست بە هیچ گوناه، یان پەشیمانی، یان شەرم ناکات بەهۆی ئەو توندوتیژییەی کە لە کاتی سێکسدا دەینوێنێ.

٤- لە پشێوییە سۆزدارییەکاندا (مەزاجییەکان) ئەم کاریگەرییانە بەپێی سروشتی مەزاجیی ئەو کەسە دروست دەبێ، بۆ نموونە لە حاڵەتی خەمۆکیی خۆییدا ئارەزووی سێکسی کەم دەکات، یان بە تەواوی نامێنێ. لەوانەیە گەڕانەوەی ئەم ئارەزووە بۆ نەخۆش یەکەمین ئاماژە بێت بۆ چاکبوونەوەی نەخۆشییەکەی و ڕزگاربوونی لەدەست خەمۆکی، لە مانیای خەمۆکیدا ڕێژەی

ڕوودانی پەککەوتنی سێکسی و لاوازبوونی سێکسی بەرزە. هەندێک لەم حاڵەتانە بەهۆی ماندووبوون و هیلاکبوونی جەستەییەوە ڕوودەدەن، کە نەخۆش بەهۆی ئەو جووڵە زۆر و بەردەوامەیەوە تووشی دەبێ، بەڵام لە مانیای سووکدا (هایپۆمانیا) نەخۆش بایەخێکی زیاتر بە لایەنەکانی سێکس دەدات و پێداگری لەسەریان دەکات، بەڵام مەرج نییە ئەمە هاوکات بێت لەگەڵ زیادبوونی چالاکیی سێکسیدا. لە خەمۆکیی ئەقڵیدا گونجاندنی سێکسیی نەخۆش لە ئاستی سروشتی کەمترە.

٥- لە نەخۆشیی شیزۆفرینیادا، چەند ئەگەرێک دەربارەی پشێوییە سێکسییەکان سەرهەڵدەدەن، بە شێوەیەکی گشتی پەیوەندیی سێکسی لەو کەسانەدا کە تووشی شیزۆفرینیا بوون، پەیوەندییەکە وا دەردەکەوێ لە هەموو پێودانگێکی هاوبەشێتی و هاوبەشی سێکسی بەدەر بێ، بەڵام نەخۆش لەوانەیە توندوتیژیی سادی، یان لادانی سێکسی پراکتیزە بکات.

هەندێ لە لێکۆڵینەوەکان ئاماژە بە زیادبوونی چالاکیی سێکسی دەدەن لە قۆناغە سەرەتاییەکانی نەخۆشییەکەدا، هۆکاری ئەمەش بەو شێوەیە لێک دەدرێتەوە کە فاکتەرەکانی ڕێگری لای نەخۆش ئامادەییان نییە، هەروەها تێبینیی ڕوخسارەکانی کارایی سێکسی خۆیی کراوە، وەک ماستەربەیشن لە نەخۆشیی شیزۆفرینیادا. لێکدانەوەی ئەم حاڵەتەش بەو شێوەیە دەکرێ کە ئەمە ڕوخسارێکە لە ڕوخسارەکانی گەڕانەوەی نەخۆش بۆ قۆناغێک لە قۆناغەکانی گەشەی دەروونیی جەستەیی لە سەردەمی منداڵیدا. لێکۆڵینەوەکان ئاماژە بەوە دەدەن، لاوازیی سێکسی لە هەموو حاڵەتەکانی دیکە زیاتر ڕوو دەدات لە نەخۆشیی شیزۆفرینیادا.

٦- حاڵەتەکانی دواکەوتنی ئەقڵی بەزۆری هاوکێشەیەکی پێچەوانە دەخاتە ڕوو لە نێوان گەشەی جەستەیی و سێکسی لەگەڵ پلەی دواکەوتنەکەدا. بەگشتی کەسی تووشبوو بە حاڵەتە

توندەکانی دواکەوتنی ئەقڵی، لەگەڵ توخمەکەی دیکەدا سێکس ناکات. ڕەفتاری سێکسی لەم نەخۆشانەدا بەزۆری ماستەربەیشنی خۆیی، یان ئاڵوگۆڕکراوە. لەو حاڵەتانەدا کە دواکەوتنەکە کەمترە، یان سووکە، نەخۆش پەیوەندیی سێکسیی سروشتی پراکتیزە دەکات، بەڵام ڕەفتارە سێکسییەکانی بە شێوەیەکی گشتی وەک ڕوخسارەکانی ڕەفتاری سێکسی وایە لە منداڵدا، بۆ نموونە نواندنی ڕەفتاری هۆمۆسێکسوالیتی.

هەروەها لەم نەخۆشانەدا مەیلی سێکسی هەیە بۆ سێکسکردن لەگەڵ ئاژەڵدا، بەتایبەتی ئاژەڵە مالییەکان لە ناوچە گوندنشینەکاندا، هەروەها حاڵەتەکانی خۆنمایشکردن لەنێو ئەم نەخۆشانەدا زۆرە.

٧- جۆرێک لە پەیوەستی لە نێوان هەندێ جۆری کەسێتی و ڕەفتاری سێکسیی تایبەتیدا هەیە، بۆ نموونە کەسێتیی جۆری هستیری و کەسێتیی سایکۆپاسی و ناهاوسەنگ لە ڕووی سۆزدارییەوە. خاوەن کەسێتیی هستیری ململانێیەک دەخاتە ڕوو لە نێوان پاڵنەرە سێکسییەکانی و ڕەفتاری سێکسیدا، ئەم ململانێیە تەنیا لەوەدا ڕەنگ دەداتەوە کە پێگەیشتنی سێکسییان لەگەڵ تەمەنیاندا ناگونجێ، بەڵکو لە جۆر و پلەی وەڵامدانەوەی فسیۆلۆژییان بۆ وروووژێنەرە سێکسی و ناسێکسییەکان ڕەنگ دەداتەوە، ئەو کەسانەش کە کەسێتیی سایکۆپاسییان هەیە، چالاکی سێکسییان زیاد دەکات و بایەخی زیاتر بە مەسەلە سێکسییەکان دەدەن. ئەم حاڵەتانە لە مێدا زیاتر دەردەکەون، وەک لە نێردا.

هەروەها لە کەسێتیی سایکۆپاسی دژە کۆمەڵگەدا زیاتر دەردەکەوێ، ڕێژەیەکی زۆریش لەو نەخۆشانە هەن کە خاوەنی کەسێتیی سایکۆپاسین و تاوانی سێکسییان کردووە، یان ڕووەو لادانی سێکسی ئاڕاستەیان گرتووە و بەزۆریش لادانە

سێکسییەکانیان هاوکات بووە لەگەڵ دەرکەوتنی هەندێ لادانی ڕەفتاریی دیکەدا.

هەرچی ئەو کەسانەیە کە خاوەنی کەسێتییەکن لە ڕووی سۆزدارییەوە ناهاوسەنگن، بەتایبەتی لە مێدا بەدەست کێشەکانی ژیانی سێکسییەوە دەناڵێنن سەرباری پێداگری لەسەر سێکس لە قۆناغێکی زووی تەمەندا.

٨- لە حاڵەتەکانی دڵەڕاوکێی دەروونیدا، توێژەرەکان بۆیان دەرکەوتووە، حاڵەتی دڵەڕاوکێ بەزۆری بە برێک لە پەککەوتنی سێکسییەوە پەیوەستە. چەندە پەیوەندییە سێکسییەکان گەرموگوڕی لەدەست بدەن، ئەوەندە ئەگەری دەرکەوتنی دڵەڕاوکێ زیاتر دەبێ، هەروەها بۆیان دەرکەوتووە، دڵەڕاوکێ و ترس و شەڕانگێزیی هەموویان دەبنە هۆی ڕوودانی پشێویی سێکسی لە زۆربەی حاڵەتەکاندا.

ئەم تێبینییانە سەبارەت بە بوونی پەیوەستی لە نێوان پشێوییەکانی کەسێتی و پشێوییە دەروونی و ئەقڵییەکان لەگەڵ ژیانی سێکسیدا، لە بەرامبەردا کۆمەڵێک لێکۆڵینەوەی کلینیکی و بەراوردکاری هەن کە ئەوە ئاشکرا دەکەن، هیچ جیاوازییەکی گرنگ نییە لە نێوان ژیانی سێکسیی کەسێکی دەروون تەندروست، لەگەڵ کەسێکی پشێو لە ڕووی کەسێتی و دەروونی و ئەقڵییەوە.

لەوانەیە کارێکی ئەستەم بێ گونجان و سازان لەنێو ئەم دوو هەڵوێستەدا بدۆزرێتەوە، بەڵام زۆربەی پشکنینە دەروونییەکانی لەسەر ئەو کەسانە جێبەجێ کراون کە بەدەست ڕەفتاری سێکسیی پشێوەوە دەناڵێنن، ئاماژە بەوە دەدەن کە ڕوخسارێک لە ڕوخسارەکانی پشێوی دەروونی، یان بە لایەنی کەمەوە ئەستەمیی سۆزداری بەدی دەکرێ لەو کەسانەدا کە بەدەست کێشەکانی سێکسەوە دەناڵێنن.

## کاریگەریی پشێوییە سێکسییەکان
## بۆ سەر ژیانی دەروونی و ئەقڵی

لەوانەیە کارێکی ئەستەم بێ ئەوە دیاری بکرێ ئایا کامیان لەپێش کامیانەوە دەستی بە پشێوی کردبێ: سێکس یان دەروون؟! لەوانەیە ئەوەی وەک دەرئەنجام دەردەکەوێ خۆی هۆکار بێ، لەوانەشە بە پێچەوانەوە بێ، هەروەها پێوستە ڕەچاوی ئەوە بکەین، دەرکەوتنی یان سەرهەڵدانی هەر پشێوییەک لە بواری سێکسی، یان دەروونیدا، مەرج نییە هەموو کاتێک یەکێکیان هۆکار بێ بۆ ئەوی دیکەیان. دەشێ هەردووکیان پێکەوە دەرئەنجامی یەک فاکتەر بن. لەبەر ئەم هۆکارەیە زۆربەی کات ئەستەمە بتوانین کاریگەریی ژیانی سێکسیمان بۆ سەر ژیانی ئەقڵی دیاری بکەین. گرنگترین کاریگەرییە دەروونییەکانی بەهۆی چەپاندنی وزەی سێکسییەوە ڕوو دەدەن ئەوەیە، کە فرۆید گریمانەی کردووە و پێی وایە چەپاندنی وزەی سێکسی دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی حاڵەتی دڵەڕاوکێ و ئەو پشێوییانەی دیکە کە لە ژیانی دەروونی و جەستەیی تاکدا دەردەکەون.

هەر بەپێی ئەم گریمانەیەی فرۆید، پەنگخواردنەوەی وزەی سێکسی بەهۆی ڕێگرتن لە پەیوەندیی سێکسی، یان ململانێ، یان ئەستەمیی وروورژاندن، یان شکستهێنان لە وروورژاندندا، یان جووتبوونی پچڕپچڕ، یان ڕێنەدان بە جووتبوون و چەندەها حاڵەتی دیکە، کە دەبنە ڕێگر لە بەردەم دەرچوونی وزەی سێکسی و بەتاڵبوونەوەی سێکسیدا، ئەمانە لەوانەیە ببنە هۆی ڕوودانی پشێویی دەروونی لە شێوەی هەڵچوون و دڵەڕاوکێ و خەوزڕان و هستیریا و لاوازبوونی دەماری و گرتنەبەری ئاڕاستەی

سایکۆباسی دژ بە کۆمەڵگە. ئەگەر پەنگخواردنەوەی وزەی سێکسی بە هەر هۆیەکەوە بێ، کاریگەریی بۆ سەر ژیانی سێکسی هەبێ، ئەوا زیادەڕۆییکردنیش لە سەرفکردنی وزەی سێکسیدا کاریگەریی دیکەی دەبێ، بۆ نموونە لەوانەیە ببێتە هۆی شەکەتبوونی جەستەیی و دەماری و بەمەش تاک لەم دوو ڕووەوە توانستی کەم دەبێتەوە.

هەرچی لادانی سێکسییە، دەشێ پشێوییە دەروونییەکان، ئەگەر خۆیان لە بناغەدا هەبوون، ئاڵۆزتر بکەن، چونکە لادانی سێکسی دەشێ ببێتە هۆی گۆشەگیریی تاک و دوورکەوتنەوەی لە کۆمەڵگە و زیادبوونی دڵەڕاوکێ بەرامبەر بە ئاشکرابوونی لادانەکەی، ئەمەش پاڵی پێوە دەنێ بۆ تووشبوون بە ئالوودەبوون و خەمۆکی.



ئەم نمایشە کورتەی پەیوەندیی ئاڵوگۆڕاکراوی نێوان سێکس و دەروون، بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە ژیانی سێکسیی تاک لەگەڵ ژیانی دەروونییدا بەیەکداچوون و کار دەکەنە سەر یەکدی، بە ڕادەیەک کە ناتوانین پەیوەندیی نێوانیان و کاریگەریی هەریەکەیان بۆ سەر ئەوی دیکە فەرامۆش بکەین.

تەنانەت لەو حاڵەتانەشدا کە وا دەردەکەوێ کە ئەم پەیوەندییە نییە، پێویستە دەرک بەوە بکرێ کە شێوازەکانی گوزارشتکردن لە ژیانی سێکسی زۆر جیاوازن، هەندێکیان ڕاستەوخۆ واقعین و هەندێکیان ناڕاستەوخۆن و لە خەیاڵدان، یان لە شێوەی سیمبولێک، یان ڕەفتارێکدان، بە هەمان شێوە ژیانی دەروونیشمان هەر وایە، بە شێوازی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، لە هەست یان

نەستدا گوزارشتی لێ دەکەین. لەبەر ئەوە قووڵبوونەوەی لە هەوڵدان بۆ دەستکەوتنی ئەوپەڕی بڕ لە پەیوەندیی نێوان ژیانی سێکسی و ژیانی دەروونی، مەسەلەیەکی پێویستە لە هەموو حاڵەتەکانی پشێوی لە هەردوو ژیانەکەدا، هەرچەندە تەنانەت لەگەڵ قووڵترین و ئەوپەڕی هەوڵەکاندا، دەشێ نەتوانین زانیاریی تەواومان دەربارەی ئەم پەیوەندییە هەبێ، لەبەر ئەوە بەرامبەر زۆرێک لە ڕوخسار و ڕەهەند و کاریگەرییەکانی ئەم پەیوەندییە بۆ سەر سێکس و دەروون، نائاشنا دەمێنینەوە.

# بەشی بیستوسێ
# هەڵوێستە شارستانییەکان
# بەرامبەر مەسەلە سێکسییەکان

-پێشەکی
-کۆمەڵگە شارستانییەتە دێرینەکان
-شارستانییەتی نێوان دوو ڕافدەین
-شارستانییەتی عیبری (تەورات)
-شارستانییەتی میسری (فیرعەونی)
-شارستانییەتی گریکی
-شارستانییەتی ڕۆمانی
-شارستانییەتی هیندی
-شارستانییەتی چینی
-شارستانییەتی مەسیحی
-شارستانییەتی عەرەبی و ئیسلامی
-عەرەبی سەردەمی جاهلی و سێکس
-ئیسلام و سێکس
-شارستانییەتی مەسیح و سێکس
-چاخە نوێیەکان و سێکس
-سەدەی بیست و سێکس
-شارستانییەتە سەرەتاییە هاوچەرخەکان و سێکس
-چەپاندنی سێکسی
-نیمچەئازادیی سێکسی
-ئەوپەڕی ئیباحییەتی سێکسی
-گوێنەدان بە سێکس
-کۆمەڵگە شارستانییە سەرەتاییەکانی دیکە

## هەڵوێستە شارستانییەکان
## بەرامبەر مەسەلە سێکسییەکان

هیچ کەسێک لە هیچ سەردەم و شارستانییەتێکدا ناتوانێ بانگەشەی ئەوە بکات کە هیچ هەڵوێستێکی بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان نییە، یان هیچ هەڵوێستێکی نییە بەرامبەر ئەو کردار و چالاکییانەی کە پەیوەندییان بە سێکسەوە هەیە. پێویست ناکات هەڵوێستی مرۆڤ بەرامبەر سێکس ئاشکرا و ڕاگەیەندراو بێ، چونکە هەر تاکێک شێوازێکی تایبەتیی گوزارشتکردن، لە هەڵوێستی بەرامبەر بە سێکس هەیە، هەر کەسە و خاوەنی هۆشیاریی تایبەت بە خۆیەتی سەبارەت بەو پێگەیەی کە کێشە سێکسییەکان لە ژیانیدا داگیریان کردووە. بە سروشتی حاڵ، هێندەی ژمارەی خەڵک هەڵوێستی جیاجیا بەرامبەر بە سێکس هەیە، هەرچەندە هەندێ لە هەڵوێستەکان لە یەکدییەوە نزیکن، یان کەم تا زۆر لە یەکدییەوە دوورن. دەشێ ئەم هەڵوێستانەش بەهۆی کاریگەریی جۆرەها فاکتەری جیاوازەوە لە ژیانی خەڵک و گرووپ و شارستانییەتەکاندا گۆڕانیان بەسەردا بێ.

لەبەرئەوە ناکرێ هەڵوێستێکی یەکگرتوو بەرامبەر کێشە و مەسەلە سێکسییەکان وەربگرین و سەرجەم هەڵوێستەکانی دیکە بەپێی ئەو پێوانە بکەین. ئەوەی توێژەران لەم مەسەلەیەدا دەتوانن بیکەن، تەنیا هەوڵدانە بۆ تێگەیشتن لە چۆنێتیی دروستبوون و سەرهەڵدانی ئەو هەڵوێستە جیاوازانە، بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان، هەروەها تێگەیشتن لە چۆنێتیی پەرەسەندن، یان ڕوودانی گۆڕانکاری لەم هەڵوێستانەدا. هەرچەندە ئێمە ناتوانین ئەو یاسا مۆراڵییانە ڕەت بکەینەوە کە مەسەلە سێکسییەکان ڕێک دەخەن و هەڵوێستەکان بەرامبەریان دیاری دەکەن، بەڵام ئەم یاسایانە بەشێکن لە پرۆسەی گۆڕانکاری و پەرەسەندنی

هەڵوێستەکان، کە ئەم پرۆسەیە دەشێ پابەندبوون بەم یاسایانەوە بەهێز و پتەو بکەن، لەوانەشە لاوازی بکەن.

***

لەوانەیە کارێکی ئەستەم بێ توێژەران بتوانن هەڵوێستی مرۆڤی سەرەتایی لە یەکەمین قۆناغەکانی مێژووی مرۆڤایەتی بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان دیاری بکەن، هەروەها دیاریکردنی ئەوەی ئایا ڕەفتاری سێکسیی مرۆڤی سەرەتایی تەنیا وەڵامدانەوەیەکی خۆبەخۆیی بووە بۆ پاڵنەری غەریزەی سێکسی بە مانا بایۆلۆژییە پەتییەکەی؟ هەروەها ئەستەمیشە بتوانین لەوە دڵنیا بین ئایا پاڵنەری هۆشیارانەی مرۆڤی سەرەتایی بۆ پەیوەندیی سێکسی بەهۆی پێداویستییەوە بووە بۆ زۆربوون؟ هەرچەندە مرۆڤی سەرەتایی بەو شێوەیە بیری نەکردووەتەوە کە مەبەستی زۆربوون لەپشت وزەی سێکسی و ڕەفتاری سێکسییەوە بێ، واتە نەیزانیوە ئامانجێکی بایۆلۆژی بۆ پاراستنی مانەوەی توخمی مرۆڤ لە پشت وزە و ڕەفتاری سێکسییەوەیە، بەڵام ئەو ئەگەرەش هەیە کە مرۆڤی کۆن هەر وەک مرۆڤی هاوچەرخ لە ئارەزووی هۆشیارانەیدا دەرکی بەوە کردبێ ئامانجێکی دیکە بۆ سێکسکردن پاڵی پێوە دەنێ. لە تێبینیکردنی ڕەفتاری مرۆیی بەرامبەر بە لایەنە سێکسییەکان ئەوە ئاشکرا دەبێ، زۆربەی ئەم ڕەفتارانە ئامانجیان زۆربوون نییە، لەم سەردەمەدا، بە لایەنی کەمەوە لە هەندێ لە کۆمەڵگەکاندا هەوڵ دەدرێ بۆ دوورکەوتنەوە و ڕێگری لە زۆربوون. لەبەر ئەوە پێویستە ئەو ڕایە بە هەند وەربگرین کە پێی وایە مرۆڤ هەر لە سەرەتاوە سێکسی قبووڵ کردووە، چونکە پێویستییەکی فسیۆلۆژیی سەرەکیی بۆ بەدی دەهێنێ و چێژی پێ دەبەخشێ، یان بە لایەنی کەمەوە، لەپاش کرداری سێکسی، هەستکردن بە ناڕەحەتی نامێنێ و وەک هەر پێداویستییەکی دیکەی سەرەکی لە

ژیانی مرۆڤدا، وەک برسێتی و تینوێتی، لەدوای تێربوون هەست بە ئارامی دەکات. ئەم ڕایە ئەوە ناگەیەنێ ئەو بۆچوونە ڕەت بکاتەوە کە سێکس پێویستییەکە و تێرکردن و هەستکردن بە چێژ لەڕێی سێکسەوە، پرۆسەیەکی بایۆلۆژییە و خزمەتی مەبەستەکانی زۆربوون و مانەوەی توخمی مرۆیی دەکات، بەڵام ئەم ڕایە بوونی ڕوخسارەکانی ڕەفتار و سۆز لە پەیوەندییە سێکسییەکاندا لەخۆ دەگرێ، کە لەم کاتەدا خزمەتی خودی غەریزەی سێکسی، یان مەبەستەکانی زۆربوون و مانەوە ناکات.

گرنگترین ئەم ڕوخسارانە دەکەونە بواری سۆزداری و فیکری کە ژیانی سێکسی مرۆییان پێ جیا دەکرێتەوە، بەڵام ڕوخساری ڕەفتاریی سێکسی لە پلەکانی دیکەی جیهانی ئاژەڵانیشدا هەیە، ئەمە جەخت لەسەر بوونی ئەم فاکتەرانە لە ژیاندا دەکاتەوە کە بە شێوەیەک لە شێوەکان بوونیان هەیە، بوونی ئەم ڕوخسارانە لە سێکسدا مەرج نییە ئەوە بگەیەنێ کە ئەم ڕوخسارانە لە ئامانجە بایۆلۆژییە سەرەکییەکانی سێکس جیابووەتەوە، لەوانەیە ئەمە تەنیا زیادکردنی ڕەهەندێکی نوێ بۆ ئەو ئامانجانە و بەدیهێنانیان ئاسان بکات.

***

لە هەوڵدانماندا بۆ بەدواداچوونی هەڵوێستە جیا و گۆڕاوەکان بەرامبەر بە لایەنەکانی سێکس لە ژیاندا، پێویستە لەسەر دوو بناغە لە بابەتەکە بڕوانین. بناغەی یەکەم، لایەنی سێکسی لە مرۆڤدا لە بناغەدا پشت بە ڕێسای بایۆلۆژی دەبەستێ، ئەم هەقیقەتەش وا دەکات پەرەسەندنی بایۆلۆژیی سێکس، پرۆسەیەکی کوێرانە بێ لە هەڵبژاردنی سروشتیدا Natural selection.

هەرچی بناغەی دووەمە، بریتییە لە فاکتەری شارستانی، کە لە ڕێگەیەوە مرۆڤ دەتوانێ کۆنترۆڵی پرۆسەی زاوزێ و

پەرەسەندنی توخمی مرۆیی بکات. ئەم فاکتەرە شارستانییە وێنەی جوانی و بەهایی و لۆژیکی جیاواز لەخۆ دەگرێ، دەشێ ئەم فاکتەرە بە مەبەست بێ یان خۆبەخۆ، لە هەموو حاڵەتەکاندا پەرەسەندنێکی شارستانی لە ژیانی سێکسیی مرۆڤدا دروست بکات. پەرەسەندنی ئەم دوو پرۆسەیە پێکەوە، واتە پرۆسەی بایۆلۆژی و شارستانی، ڕوخسارە جیاوازەکانی ژیانی سێکسیمان و هەڵوێستەکانمان بەرامبەر ئەم ژیانە لێک دەداتەوە. مرۆڤ کە لە بونیاددا دەگمەنە، تەنیا بوونەوەرە کە لەڕێی کاریگەریی شارستانییەتەوە پەرەی بە ژیانی سێکسی بایۆلۆژی داوە، هەرچەندە ژیانی سێکسی هەندێ لە زیندەوەرانی دیکەش لە هونەر و سەفسەتەگەری و ڕەمزییەت بەدەر نییە، کە ئاماژەن بۆ ئەوەی بەشێک لە ڕوخسارەکانی شارستانی کاریگەریی بۆ سەر پەرەسەندنی ڕەفتاری سێکسیی ئەوانیش هەبووە.

لە هەوڵماندا بۆ بەدواداچوونی پەرەسەندن لە ڕەفتاری سێکسیی مرۆییدا و هەڵوێستی مرۆڤ بەرامبەر ئەم لایەنە لە ژیانیدا، دوو دیاردەی بەرچاو دەبینین. یەکەمیان، فرەیی جۆر و جیاوازییە لەم پەرەسەندنەدا. دووەمیان، گۆڕانکارییە.

لێکۆڵینەوە ئەنسرۆبایۆلۆژییەکان دەربارەی کۆمەڵگە سەرەتایی و هاوچەرخە جیاوازەکان و تۆمارگە مێژووییەکان هەموویان بە ڕوون و ئاشکرایی ئەوە دەخەنە ڕوو کە پەرەسەندن بە دوو ئاراستەدا ڕووی داوە. یەکەمیان، فرە جۆری. دووەمیان گۆڕانکاری. لەگەڵ ئەوەشدا کە مرۆڤ لە ژیانی بایۆلۆژیی سەرەتاییدا لە یەک شێوازی ڕەفتاری سێکسییەوە دەستی پێ کردووە و لە یەک گۆشەوە لە پێداویستی بۆ سێکسی ڕوانیوە، بەڵام دواتر پەرەسەندنی ڕەفتاری سێکسی لەم مرۆڤە سەرەتاییەدا لەسەر یەک هێڵی ڕێک لە فرەجۆری و گۆڕانکاری لە پرۆسەی پەرەسەندنی سێکسیدا نەڕۆیشتووە. ئەمە لەو لێکۆڵینەوانەدا ڕوون

دەبنەوە کە دەربارەی ژیانی سێکسیی کۆمەڵگە سەرەتایی و شارستانییەتەکان ئەنجامدراون. کۆمەڵگە سەرەتاییەکان لەم سەردەمەی ئێستاماندا، کە لە کۆمەڵگەکانی دیکە زیاتر خاوەنی کۆمەڵێک خەسڵەتن کە بۆ ڕابردوویەکی دوور دەگەڕێنەوە، هەروەها شێوازی زۆر و جیاوازیان لە ڕەفتاری سێکسی و هەڵوێستیان بەرامبەر بە ژیانی سێکسی هەیە، ئەم واقیعە ئاشکرا ئەوە دەخاتە ڕوو، پەرەسەندن و فرەجۆریی ڕەفتاری سێکسی و هەڵوێستی کۆمەڵگە بەرامبەری، ملکەچی کۆمەڵێک پرۆسەی شارستانی و کۆمەڵایەتیی دیاریکراو دەبێ، زیاتر لە ملکەچبوون بۆ کاریگەریی کات و سەردەم و پێشکەوتنی شارستانی بە شێوەیەکی گشتی، ئەمەش لێکدانەوە بۆ ئەو جیاوازییە دەکات کە لە نێوان کۆمەڵگە هاوچەرخەکاندا دەیبینین کە هەرچەندە وا دەردەکەون لە ڕووی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیی شارستانییەوە لە یەک دەچن، بەڵام لە ڕووی جیاوازی و فرەجۆریی ڕەفتاری سێکسی و هەڵوێستیان بەرامبەر بە ژیانی سێکسی، جیاوازن.

ئەگەر وا پێویست بکات لێکدانەوە بۆ ئەو دیاردەیە بکەین، کە بۆچی لە نێوان لۆژیکی پێشکەوتنی شارستانی لە لایەک و پەرەسەندنی چەمکی سێکس لە لایەکی دیکەوە، هیچ گونجان و سازانێک نییە؟ ئەوا لەم بارەدا پێویستە سێکس بۆ ڕەگوڕیشە سەرەتاییە بایۆلۆژییەکانی بگەڕێنینەوە، هەروەها باسی ئەوە بکەین ئەم ڕەگوڕیشە بایۆلۆژییە چ گۆڕانێکی بەسەردا هات بەهۆی کاریگەریی دوو پرۆسەی گرنگەوە، کە یەکەمیان بریتی بوو لە پرۆسەی دەستبەسەراگرتنی هاوبەشی سێکسی، دووەمیشیان بریتی بوو لە پرۆسەی سیمبولبەخشین بە کرداری سێکس وەک کردارێکی بایۆلۆژیی ڕاستەقینە. هەرچەندە پرۆسەی یەکەم، واتە دەستبەسەراگرتن و داگیرکردنی هاوبەشی ژیان، پرۆسەیەکە تەنیا لە مرۆڤدا نییە، بەڵکو لە هەندێ لە پلەکانی

دیکەی جیهانی ئاژەڵانیشدا هەیە، پرۆسەی سیمبولبەخشین بە پەیوەندیی سێکسی وەک پەیوەندییەکی بایۆلۆژی، خەسڵەتێکە تەنیا لە مرۆڤدا هەیە، کە پرۆسەیەکی فیکرییە، لە بیرکردنەوەی پیاوەوە سەری هەڵداوە کە ترساوە نەتوانێ ئارەزووی سێکسی لەگەڵ هاوبەشەکەیدا تێر بکات، ئەگەر کەسێکی دیکە هەوڵی دا سێکس لەگەڵ ژنەکەیدا بکات، بەڵام ئەگەر ئەو پرسیارە بکەین: بۆچی لە بناغەدا بیرۆکەی دەستبەسەراگرتن و داگیرکردن سەریهەڵدا، هەروەها بۆچی تەنیا مێ ملکەچی دەسەڵاتی پیاو بوو؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە و تێگەیشتنیان ئاسانە، داگیرکردنی مێ و خاوەنداریێتیکردنی مێ لە لایەن پیاوەوە، لە خاوەنداریێتیکردنی پێداویستییە سەرەکییەکانی دیکەی مرۆڤ لە ژیاندا سەری هەڵدا، وەک خواردن و ئاو، هەروەها پیاو تواناى لە ژن زیاتر بوو بۆ بەکارهێنانی هێزی ماسوولکەیی خۆی لەپێناوی زامنکردنی ئەم پێویستییانەی ژیان بە داگیرکردنی ژنیشەوە. پیاو بۆ پارێزگاریکردن لە داگیرکردنی ژن و خاوەنداریێتیکردنی ژن، ناچار بوو شێوازی ژیانی بەو شێوەیە پەرە پێ بدات کە زامنی مافی هێشتنەوەی ئەم دەسەڵاتەی بکات بەسەر ژندا کە بڕوای وا بوو داگیرکردن و خاوەنداریێتیکردنی ژن، مافی خۆیەتی.

هەرچەندە ئەم مافەی پیاو ئامانجی کۆمەڵایەتی و شارستانی و تەنانەت بایۆلۆژییشی لە پشتەوە بوو، کە پەیوەندییان بە مانەوەی توخمی مرۆڤەوە هەیە، بەڵام ڕەگوڕیشەکانی ئەم مافە لەم ئامانج و مەبەستانە بەدەر بوو، لە ڕابردوودا و تا ئێستاش سروشتییە ئەو ڕێسا و یاسایانە سەرهەڵبدەن کە بواری دەستبەسەرداگرتن و خاوەنداریێتی دیاری دەکەن، دەرچوون لە چوارچێوەی ئەم یاسا و ڕێسایانەش بە تابۆ و قەدەغە دانراوە، هەرچەندە پێمان وایە سنووری ئەو کردار و ڕەفتارە سێکسییانەی حەرام کراون و بە تابۆ دانراون، زۆر بەرفراوانترە لە دەرچوون

لە یاسا و ڕێساکانی دەستبەسەرداگرتن و خاوەندارێتی، بەڵام بەرفراوانیی سنووری تابۆ و قەدەغەکراوەکان لەوانەیە هەر درێژکراوەی یاسا و ڕێساکانی دەستبەسەرداگرتن و خاوەندارێتی بن، بەڵام لەم درێژکردنەوەیەدا مەبەستە سەرەکییەکە بە پارێزراوی مایەوە کە بریتییە لە دەستبەسەرداگرتن و داگیرکردنی ژن. بەم شێوەیە دەستبەسەرداگرتن یەکەمین فاکتەری بزوێنەر بووە بۆ دروستبوونی کۆمەڵگە و پەرەسەندنی شارستانی، پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و پەرەسەندنی شارستانییەتێکەی بۆ پاراستنی ئامانج و مەبەستەکانی کۆمەڵگە خۆیان تەرخان کرد، بە ڕادەیەک ئەستەمە جیاوازی لە نێوان ناسنامەی ئەم دوانەدا بکرێ (واتە لە نێوان دروستبوونی کۆمەڵگە و پەرەسەندنی شارستانیدا). ئەو کەسەی لە ژیانی سێکسیی کۆمەڵگە کۆن و هاوچەرخەکان، یان سەرەتایی و شارستانییەکان، بڕوانێ، بۆی دەردەکەوێ کە هەموویان پارێزگارییان لە پرەنسیپی داگیرکردن و دەستبەسەرداگرتنی ئەو ڕێسایانە کردووە کە ڕێکیان خستوون، هەرچەندە ئەم ڕێسایانە بە ئاشکرا دەرناکەون کە پارێزگاری لە پرەنسیپی دەستبەسەرداگرتن و خاوەندارێتیی سێکسی دەکەن، بەڵام لە کاتی شیکردنەوەی ئەم یاسایانە و بەدواداچوونی ڕەگوڕیشەیاندا، ئاشکرا ئەوە دەردەکەوێ.

هیچ دەروازەیەک نەبوو بۆ ڕزگاربوون لە ڕووبەڕووبوونەوە و بەرکەوتنی نێوان ئارەزووی سێکسی لە مرۆڤدا و پێویستیی بۆ تێرکردنی ئەم ئارەزووە، لەگەڵ پرەنسیپی داگیرکردنی هاوبەشی سێکسی بۆ ئەوەی زامنی بەردەوامبوونی ئەم چێژە بکات، بەڵام کاتێک مرۆڤ شکست دەهێنێ لە زامنکردنی ئەم دەستبەسەرداگرتنە، بەتایبەتی کاتێ هاوبەشی سێکسی لە ژیانی ئەو کەسەدا ون دەبێ، یان ئامادەیی نامێنێ، یان لە لایەن کەسێکی دیکەوە داگیر دەکرێ، وزەی سێکسیی پەنگ دەخواتەوە، لەبەر

ئەوە هەر دەبێ بە ڕێگە و هۆی دیکە دەربکەوێ و دەروازەیەک بدۆزێتەوە بۆ دەرچوون و تێربوون، واتە گوزاشکردن لە وزەی سێکسی بە شێوازێکی دیکە، غەیری شێوازی ڕاستەوخۆی بایۆلۆژی و شێوە باوەکەی سێکسکردن لە نێوان ژن و پیاودا (ئەو پیاوەی وەک هاوسەر یان هاوبەشی سێکسیی ژن داگیر دەکات)، لەبەر پێویستیی سەرفکردن و دەرچوونی ئەم وزە سێکسییە، مرۆڤ پاڵی بەم وزە سێکییەوە نا بۆ کارلێککردن و بەرکەوتن لەگەڵ خەیاڵ و فیکر و سۆزی مرۆییدا. دەرئەنجامی ئەم کارلێکردنەش فرەجۆری و جیاوازی بوو لە شێوازەکانی پراکتیزەکردنی سێکسی و ڕوخسارە جیاوازەکانی گوزارشتکردنی ژیانی سێکسی، تەواوی ئەم فرەجۆری و جیاوازییەش کە لە مرۆڤدا هەیە، لێکچووی نییە لە ژیانی بوونەوەرانی دیکەدا، ئەمەش ئاماژەیە بۆ توانای دەگمەنی مرۆڤ بۆ دروستکردنی سیمبول لە ژیانی فیکریدا و بەکارهێنانی ئەم سیمبولە لەجیاتی شتێکی دیکە و مامەڵەکردن لەگەڵیدا لەسەر ئەو بناغەیە.

لەبەر ئەوە دەکرێ ئەو سیمبولانەی ئاماژەیەکی سێکسییان هەیە، بەو شێوەیە ببینین کە هەوڵدانێکی ئەقڵییە بۆ پاراستنی ئامانجی سێکسی و دەستگرتن بەسەریدا، لەدوای ئەوەی گەیشتن بە خودی ئامانجە سێکییەکە، لەبەر هەر هۆیەک بێ، ئەستەمە. ئەم واقیعە فرەژمارەیی و فرەجۆری ئەو سیمبولانە لێک دەداتەوە کە مۆرکێکی سێکسییان هەیە، کە لە کۆی هەموو ئەو سیمبولە ئەقڵییانە زیاترن کە مرۆڤ بۆ هەموو لایەنەکانی دیکەی ژیانی دروستی کردوون.

هەرچی ئەو سوودەیە کە مرۆڤ بەهۆی ئەم سیمبولە سێکسییانەوە بەدەستی دەهێنێ، فرەلایەنە، دەشێ گرنگترینیان هێورکردنەوەی بێ لە کاریگەریی شکستی و بێبەشبوونی لە پەیوەندیی سێکسیی ڕاستەوخۆ، ئەویش لەڕێی پەیوەستکردنی

بەشێک لەو وزە سێکسییەی بە هەندێک ئامانجی سیمبولییەوە و بەتاڵکردنەوەی ئەو ئامانجە لەم سیمبولانەدا. هەرچی ئامانجی دووەمە، ئامانجێکە کە مرۆڤ ڕاستەوخۆ بەئاگا نییە لێی و دەرکی پێ ناکات، ئەویش بریتییە لە بەرفراوانکردنی بواری ژیانی سێکسی بە جۆرێ لە سنووره ئاژەڵییە بەرتەسکەکانی حەز و ڕازیبوون دەربچێ، هەر یەکە لەم دوو ئامانجە، واتە بەرفراوانکردن و دەرچوون لە سنووری ئاژەڵی، پێویستن بۆ گونجان و سازان لەگەڵ واقیعی پەرەسەندنی ئەقڵیی ناوازەی مرۆڤدا. لەوانەیە جێگەی گومان بێت مرۆڤ بیتوانیایە بەم ئاستەی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی و شارستانییەت بگەیشتایە، ئەگەر ژیانی سێکسیی لە چوارچێوەیەکی بایۆلۆژی سنووردار لە حەز و ڕازیبوون لە پەیوەندیی سێکسیی بمایایەتەوە. بەم شێوەیە هەردوو دیاردەی دەستبەسەرداگرتنی هاوبەشی سێکسی و سیمبولبەخشین بە سێکس، دوو پرۆسەی پێویستن بۆ پەرەسەندنی غەریزەی سێکسی و گواستنەوەی لە بواری بایۆلۆژییەوە بۆ بوارێکی مرۆیی بەرفراوانتر لە سنووره کۆمەڵایەتی و دەروونی و شارستانییەکاندا. لێرەدا کۆمەڵێک نموونەی ژیانی سێکسی لە ژیانی هەندێ لە کۆمەڵگەکاندا دەخەینە ڕوو. ئەم کۆمەڵگەیانە بە جیاوازیی پەرەسەندنیانەوە لە ڕووی شارستانی و کۆمەڵایەتییەوە، فاکتەری دەستبەسەرداگرتن و سیمبولی سێکسی دەردەکەوێ. ئەگەر لە ڕەفتاری سێکسی و هەڵوێستی ئەم کۆمەڵگەیانە بەرامبەر بە سێکس جیاوازی هەبێ، ئەوا ئەم جیاوازییە شتێکی چاوەڕوانکراو و شیاوە، ئەویش بەهۆی ئەو جیاوازییەی شیاوی ڕوودانە لە پرۆسەی پەرەپێدانی هەریەکە لە دوو فاکتەرە سەرەکییەکە، واتە دەستبەسەرداگرتن و سیمبولی سێکسی لە ژیان و مێژووی ئەم کۆمەڵگەیانەدا، چونکە ناکرێ بەو شێوەیە لە پەرەسەندنی ئەم دوو فاکتەرە بڕوانین کە

پرۆسەیەکی بەردەوام و دیاریکراوە، بەڵکو ئەم پرۆسەیە بریتییە لە پەرەسەندنێک کە ملکەچی کۆمەڵێک کارتێکەری دیکەی ژیان دەبێتەوە، کە لەوانەیە هاوشێوە یان هاوکات نەبن لەگەڵ ژیانی گەلان و کۆمەڵگەکانی دیکە.

### کۆمەڵگە شارستانییە دێرینەکان

کارێکی قورسە بۆ توێژەران بەدواداچوون بۆ هەڵوێست و ڕەفتاری سێکسی لە شارستانییەتە سەرەتاییەکاندا بکەن و بتوانن ڕەگوڕیشەیان دیاری بکەن، یان ئەو قۆناغانە دەستنیشان بکەن کە کۆمەڵگە سەرەتاییەکان بەرامبەر بە سێکس پیایدا ڕۆیشتوون تا گەیشتوون بەم دۆخەی ئێستایان.

ناتوانرێ هەموو ئەو فاکتەرانە دیاری بکرێن کە کاریان کردووەتە سەر پرۆسەکانی پەرەسەندن و بوونەتە هۆی دروستبوونی ئەم جیاوازییە ئاشکرایە لە ئاکاری شارستانییەتێکی سەرەتایی و یەکێکی دیکەدا، بەڵام مەسەلەکە سەبارەت بە شارستانییەتە دێرین و ڕەگداکوتراوەکان، ئیدی خۆرهەڵاتی بن یان خۆرئاوایی، جیاوازە، چونکە بڕێکی بێشومار لە زانیاری هەیە کە بۆ سەرچاوەی جیاواز دەگەڕێنەوە، وەک داستان و ڕۆمان و ئایین و شوێنەواری هونەری و مێژوویی، هەموویان پرۆسەی پەرەسەندنی هەڵوێستی مرۆڤ بەرامبەر بە سێکس ڕوون دەکەنەوە، هەروەها ئەو فاکتەرانەش ئاشکرا دەکەن کە لەم پەرەسەندنەدا ڕۆڵی کارایان هەبووە. ئەوەی لە کاروانی ئەم پەرەسەندنەدا تێبینی دەکرێ، بریتییە لە فرەجۆری و ناسەقامگیری لە هەڵوێستە شارستانییەتەکاندا، لە شارستانییەتێکەوە بۆ یەکێکی دیکە، یان لە هەمان شارستانییەتدا، لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکە، هەروەها ئەوە ئاشکرا دەبێ کە زیاتر لە پێوەرێک هەبووە بۆ پێوانەکردنی ڕەفتارە سێکسییەکان، واتە

کۆمەڵگە بەرامبەر بە ڕەفتارە سێکسییەکان هەڵوێستێکی جووتپێوەری نیشانداوە، ئەم جووتپێوەرییەش لە هەڵوێستی شارستانییەتەکاندا بەردەوام بوونی هەبووە، بەڵام مەرج نییە پشتبەستن بەم هەڵوێستە جووتپێوەری یان دوانییە لە شارستانییەتە سەرەتایی و پێشکەوتووەکان، وەک یەک خزمەتی هەمان ئامانج و مەبەستیان کردبێ، چونکە بە وردبوونەوە لە ڕەفتاری سێکسیی هەندێ شارستانییەتی سەرەتاییدا، ئەوە تێبینی دەکرێ، بوونی ئەم شێوازە دوانییە لە پێوانەکردن و هەڵوێستنواندن بەرامبەر بە ڕەفتارە سێکسییەکان، سەرنجڕاکێشانی نێوان ژن و پیاوی بەهێز کردووە، چونکە جێبەجێکردنی ئەو ڕێسایانەی کە بە ئاشکرا هەندێک شێوازی دیاریکراوی لە ڕەفتاری سێکسیی ڕاستەقینە، یان ڕەمزیی قەدەغە کردووە، لەوانەیە هۆیەکی گونجاو بووبێ بۆ پاراستنی وزەی سێکسی و پاراستنی لە بەهەدەرچوون و سوودوەرگرتن لێی لە چالاکییەکی بایۆلۆژیی پوختدا، ئەویش لەڕێی ڕێگەگرتن یان دواخستن یان بە نهێنی ئەنجامدانی ئەو ڕەفتارە سێکسییە.

ناکرێ هەمان شت بوترێ بۆ هۆکاری سەرهەڵدانی پێوەرە دوانییەکان لە شارستانییەتە پێشکەوتووەکاندا، چونکە پێوەرە دوانییەکان لەم کۆمەڵگەیانەدا کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی هەندێ کرداری ئەقڵیی دیکە، وەک دووڕوویی و هەڵخەڵەتاندن و چاوبەستکردن، کە ئەم کردارانە لە بناغەدا بۆ ڕاکردن لە بەرپرسیارێتی پەیرە کراون، نەک بە ئامانجی پەرەپێدانی ژیانی سێکسی و بەستنەوەی بە ژیانی دەروونیی تاکەوە. هەرچەندە هەندێ لە شارستانییەتە دیارەکان، یان لە سەردەمێکی دیاریکراودا، بە زۆری کاریان بە یەک پێوەر کردووە بۆ دیاریکردنی ڕەفتاری سێکسی، بەڵام ئەم پێوەرە لە ڕووی هێز و لاوازییەوە بەپێی ئەو بارودۆخە مێژووییە جیاواز بووە، کە ئەو

شارستانییەتە لەو کاتەدا پیایدا تێپەڕیوە، هەروەها بەپێی ئەو هێزەی کە لە ژیانی ئەو کۆمەڵگە شارستانییەدا بالادەست بووە، ئەم پێوەرەش بەهێز یان لاواز بووە، چەندە ئەو هێزانە توندتر بووبن، ئەوەندە کارکردن بەو پێوەرەش توندتر بووە، چەندە لاواز بووبێ، ئەوەندە ئاسانکاریی بۆ لادان لەو پێوەرە زیاتر بووە و جیاوازی لە نێوان هەڵوێستی ئاشکرا و هەڵوێستی شاراوە بەرامبەر بە ڕەفتاری سێکسی زیاتر بووە. بەگشتی شارستانییەتە ڕەگداکوتراوەکانی وەک شارستانییەتی خۆرئاوا و خۆرهەڵات، هەڵوێستی ئاشکرا و نزیک لە یەکیان بەرامبەر بە مەسەلەکانی سێکس هەبووە، ئیدی شارستانییەتە دێرینەکان بێ، وەک بابلی و ئاشووری و یۆنانی و ڕۆمانییەکان، یان ئەو شارستانییەتانە بێ کە لەسەر بناغەی ئایین دامەزراون، زۆربەی ئەم شارستانییەتانە تەنیا بە یەک هەڵوێستی ئاشکرا و ڕاگەیاندراوەوە پابەند بوون، کە بریتی بووە لە دوورکەوتنەوەی هەریەک لە ژن و پیاو لە هەموو پەیوەندییەکی سێکسی لە دەرەوەی پەیوەندیی هاوسەرێتی، تەنیا ئەم پەیوەندییە لە هەموو شارستانییەتەکانی ئیسلام و مەسیح و تەوراتدا ڕێگەپێدراو بووە. بە دەگمەن لەم شارستانییەتانەدا، بەتایبەتی شارستانییەتی ئایینی، کار بە پێوەرێکی دیکە کراوە بۆ پێوانەکردنی ڕەفتاری سێکسی و ڕێگە بە پەیوەندیی سێکسیی نێوان نێر و مێ بە شێوەیەکی ڕەها نەدراوە، بەڵام هەندێ لە شارستانییەتەکان لە هەندێ سەردەمی کاروانی پەرەسەندنیاندا، کاریان بە پێوەرێکی دیکە کردووە، ئەم شارستانییەتانە ئەگەر بە ئاشکراش کاریان بە پێوەری یەکەم کردبێ، واتە دوورکەوتنەوە لە پەیوەندیی سێکسی لە دەرەوەی هاوسەرێتی، ئەوا بە شاراوەیی لێبووردنیان بەرامبەر بە پیاو هەبووە ئەگەر لە دەرەوەی چوارچێوەی خێزان سێکسی کردبێ، بەڵام ڕێگەیان بە ژن نەداوە، واتە ئەم ئازادییەی بە پیاو بەخشیوە، بەڵام بۆ ژن سنووورداری

کردووه و تەنیا لەو کاتانەدا ڕێگەی بە ژن داوە کە لە بارودۆخی ئامادەباشیدا بووە بۆ هاوسەرێتی. ئەم فرەییە لە پێوانەدا، کاریگەریی ئەو بەها باوانەیە کە کۆمەڵگە لە هەڵوێستدا بەرامبەر بە ڕەفتاری سێکسی پشتی پێ بەستوون.

لێرەدا پوختەی هەندێ هەڵوێستی شارستانییەتە ناودارەدان لە کۆن و نوێدا دەخەینە ڕوو:

### شارستانییەتی نێوان دوو ڕافدەین

شارستانییەتی نێوانی دوو ڕافدەین لەنێو هەموو شارستانییەتەکانی مێژوودا بە دوو دیاردەی دەگمەن ناسراوە. یەکەمیان ئەوەیە، شارستانییەتی نێوان دوو ڕافدەین بە دێرینترین شارستانییەت دادەنرێ کە تا ئێستا دۆزراوەتەوە، لە کەمترین مەزەندەکردنیدا بۆ سەرەتای هەزارەی سێیەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە، ئەگەر زۆر لەوە پێشتریش نەبوو نەبێ. دووەمیشیان ئەوەیە، تەنیا شارستانییەتەکە بۆ ماوەی سێ هەزار ساڵ بێ پچڕان بەردەوام بووە، تەنانەت ئەو کاتەش کە تووشی دابڕان بوو، هێندەی نەخایاندووە بۆ ماوەی هەزار ساڵی دیکە لەگەڵ شارستانییەتی عەرەبی ئیسلامیدا بەردەوام بووە.

لەبەر ئەوەی ئەم شارستانییەتە، یان ڕاستترە بڵێین شارستانییەتەکانی نێوان دوو ڕافدەین کاریان کردووەتە سەر شارستانییەتەکانی دیکە و ئەوانیش کاریان کردووەتە سەر ئەمان، ئەوا ئەستەمە بتوانرێ هەڵوێستیان بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان لە کۆمەڵێک ڕێسای جێگیر و دیاریکراو و سنووردا بەند بکرێ، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا، بەشدارییان کردووە لە دانانی کۆمەڵێک یاسای تایبەتیدا کە ڕەفتاری مرۆیی لە ژیانی مەدەنییەتدا ڕێک دەخەن بە مەسەلە و پەیوەندییە سێکسییەکانیشەوە. لە بەراوردکردنی ماددە یاساییەکان بەرامبەر بە مەسەلە

سێکسییەکان لە سێ شارستانییە سەرەکییەکەدا، واتە شارستانییەتی سۆمەری و بابلی و ئاشووری، ئەوە ڕوون دەبێتەوە، هەموویان لە تێڕوانینیاندا بۆ ژن، وەک ئەوەی موڵکی پیاوە، کۆکن. بەهۆی بە هەند وەرگرتنی ئەم تێڕوانینە و دانانی وەک بناغە، زینا و لاقەکردن بە دەستدرێژی دانراون بۆ سەر مافی خاوەنداریتی، نەک دەرچوون لە مۆراڵ و گوناە. یاسا جیاوازیی کردووە لە نێوان مافی ژن و پیاو لە سێکسکردندا، هەروەها جیاوازیی کردووە سەبارەت بە مافی ژن لە سێکسکردندا لە نێوان ژنێک شووی کردبێ، لەگەڵ کچێک هێشتا شووی نەکردبێ، هەروەها لە نێوان ژنێک شووی کردبێ، لەگەڵ ژنێکی کۆیلەدا. بەپێی ئەم جیاوازییانە پیاو بۆی هەیە سێکس لەگەڵ ژنێکی دیکەدا بکات، ئەگەر خۆی ژنیشی هێنا بێت، بەڵام ژنێک شووی کردبێ، ئەگەر غەیری مێردەکەی سێکس لەگەڵ پیاوێکی دیکەدا بکات، ئەوا سزاکەی مردنە، هەروەها یاسا ئەو ژنانەی پاراستووە کە هاوسەرێتییان کردووە، بەڵام ئەو سزایانەی کە بەسەر ژندا سەپاندوونی لە کاتی سەرپێچیکردنی سێکسیدا بەسەر ژن و ئەو کەسەش کە لەگەڵیدا سێکس دەکات، جیاوازە لە نێوان ژنێک کە شووی کردووە، لەگەڵ کچێک کە شووی نەکردووە. لە یاساکانی ئەم شارستانییەتانەوە ئاشکرا دەبێ کە هاوسەرێتی لەپێناوی منداڵخستنەوەدا بووە، نەک هاوژیانی، ئەرکی سەرەکیی ژنیش بایەخدان بووە بە منداڵ و پەروەردەکردنیان، لەبەر ئەوە ژنی شووکردوو، کە دایکیش بێ، بەتایبەتی لەو بارەدا کە دایکی کوڕ بێ، پێگەی لە کۆمەڵگەدا بەرزتر بووە و لە ڕووی یاساییشەوە بە شێوەیەکی تایبەتی پارێزراوە. لەشفرۆشی لەو شارستانییەتانەدا هەبووە و بە شێوەیەکی بەرفراوان پراکتیزە کراوە، لەم یاسایانەوە دەردەکەوێ کە پراکتیزەکردنی لەشفرۆشی قبوڵ کراوە، یان بە لایەنی کەمەوە قەدەغە نەکراوە. هەمان شتیش

سەبارەت بە هۆمۆسێکسوالیتی ڕاستە کە کاهینەکانیش پراکتیزەیان کردووە، هەروەها دەرکەوتووە ژمارەیەک لە کوڕانیش لە پەرستگەی عەشتار جۆرێ لە لەشفرۆشییان کردووە کە مانای ئایینیی هەبووە، ئەم کوڕانە هەرچەندە وەک نێر تەماشا کراون، بەلام عەشتار کردوونی بە مێ. دەقە ئاشوورییەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە گۆڕانکاری لە هەڵویستی ئاشوورییەکاندا بەرامبەر بە سێکس ڕووی داوە، چونکە یاسای ئاشووری بەو شێوەیە بوو، ئەگەر کەسێک کەسێکی دیکەی بە هۆمۆسێکسوال تۆمەتبار کرد و نەیتوانی ئەو تۆمەتە بسەلمێنێ، ئەوا سزا دەدرێ بە جەلدلێدانی و خزمەتکردنی مەلیک بۆ ماوەی مانگێک و لێسەندنی بڕێک پارە و خەساندنی.

گرنگترین ئەو بابەتانەی کە یاساکانی شارستانییەتی نێوان دوو ڕافدەین بایەخی پێ داوە، مەسەلەی سێکسی تابۆ یان حەرامکراو بووە، هەروەها لادانی سێکسی بەتایبەتی ئاژەڵبازی. لە ماددەی ١٨٩ی یاسای حەموڕابیدا هاتووە: "ئەگەر پیاوێک لەگەڵ دایکیدا جووت ببێ، بە مردن سزا دەدرێ. ئەگەر لەگەڵ کچەکەیدا جووت ببێ، بە مردن سزا دەدرێ. ئەگەر لەگەڵ کوڕەکەیدا جووت ببێ، بە مردت سزا دەدرێ". هەروەها لە ماددەی ١٩٠دا هاتووە: "...ئەگەر پیاوێک لەگەڵ ژنی باوکیدا جووت ببێ، ئەوا هیچ سزایەک نادرێ، بەلام سزاکەی مردن دەبێ ئەگەر باوکی لە ژیاندا مابێ". سەبارەت بە پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ ئاژەلاندا، ئەوا یاساکان بە توندی سزای ئەو کەسانە دەدەن و تا ئاستی لەسێدارەدان (لە ماددەی ١٨٧ لە یاسای حەموڕابی)، بەلام مەلیک مافی دەستکاریکردنی حوکمەکەی هەیە.

لە شارستانییەتی سۆمەریدا، کە دێرینترین شارستانییەتی ناودارە و کاری کردووەتە سەر شارستانییەتەکانی دیکەش، پەیوەندیی سێکسیی تەنانەت لەشفرۆشییش، بە گەورەترین

چاکەکان لە دنیادا دانراوە. لە هەموو شارەکانی وڵاتدا خوداوەندێک هەبووە پێیان وتووە (بەعل)، وەک سەرچاوەیەک بۆ پیتاندن لە شاردا تەماشاکراوە، مەلیکی شار کە لە سلالەی بەعلی خواوەندەوە هاتووە و نوێنەری ئەو بووە، لە وەرزی دروێنەدا کە وەرزێکە سیمبولە بۆ بەپیتیی زەویش، ئاهەنگ گێڕدراوە و مەلیک ڕۆڵی بەعلی خواوەندی بینیوە کە خۆی لەوەوە هاتووە، لەگەڵ (عەشتار) خواوەندی پیتاندن و خۆشەویستیی هاوسەرێتیی پیرۆزی کردووە. بەم شێوەیە نەریتی هاوسەرێتیی پیرۆز لەو شارستانییەتە دێرینانەدا بەردەوام بوو کە بەدوای شارستانییەتی سۆمەریدا هاتن.

بەگشتی چالاکیی سێکسی لە شارستانییەتەکانی نێوان ڕافدەین، وەک بەشێک لە پیتاندن لە سروشتدا تەماشاکراوە، ئەم ڕوانینە ڕێگەی داوە بە پراکتیزەکردنی زۆربەی زۆری شێوە و شێوازەکانی پەیوەندیی سێکسی، بێ هیچ کۆتوبەندێک، جگە لە پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ ئاژەڵ و کەسانی مەحرەمدا. وا دەردەکەوێ ئەوەی لە سەرجەم پەیوەندییە سێکسییەکاندا لای ئەم شارستانییەتانە گرنگە، خودی کردارە سێکسییەکە نییە، بەڵکو زەرووورەتی پابەندبوونە بە پاکوخاوێنی و بەئاگابوونە لەوەی ئەو کەسە سنووری مافەکانی ژیانی هاوسەرێتی نەبەزێنێ کە ئەمە تەنیا ژنی گرتووەتەوە و پیاو ئازاد بووە لە سێکسکردن لە دەرەوەی هاوسەرێتی. بەم شێوەیە دەکرێ شارستانییەتی نێوان دوو ڕافدەینی دێرین، لە ڕیزی ئەو شارستانییەتانە دابنێین کە هەڵوێستی پۆزەتیڤیان بەرامبەر بە لایەنەکانی سێکس هەبووە، ئەم هەڵوێستانەش کاریگەریی پۆزەتیڤ، یان نێگەتیڤیان هەبووە بۆ سەر ئەو کۆمەڵگەیانەی کە هاوسەردەمییان بوون، یان بەدوایاندا هاتوون، ئەویش بەپێی پێداویستیی ئەم کۆمەڵگەیانە و سروشتی ژیانیان. گرنگترین ئەو کاریگەرییانەی کە شارستانییەتی دۆڵی

ڕافدەین بۆ سەر زۆربەی ئەو شارستانییەتانە هەیبووە کە کاری تێکردوون، یان بەدوایدا هاتوون، ئەمانەن: چڕکردەوەی بایەخدان بە مافی پیاو لە پەیوەندیی هاوسەرێتیدا. پەیوەندیی سێکسی زیاتر پەیوەندییەکە بۆ پیتاندن، نەک بۆ ئەوەی ژن چێژی لێ وەربگرێ، هەروەها ڕەتکردنەوەی پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ ئەو خزمانەی بە خوێن نزیکن، واتە لەگەڵ مەحرەمەکاندا، هەروەها تابۆکردنی سێکس لەگەڵ ئاژەڵدا.

ئەوەی سەبارەت بە وەسفکردنی ژیانی مێ لەم سەردەمانەدا، دەستمان کەوتوون، زۆر کەمن، بەتایبەتیش لەو مەسەلانەدا کە پەیوەندییان بە ڕەفتاری سێکسییەوە هەیە. زۆربەی ئەو زانیارییانەی لە لامانن، لەو یاسایانەوە وەرگیراون کە بایەخیان بە دۆخی ژن داوە لە ڕووی هاوسەرێتی و تەڵاق و مافە مەدەنییەکانییەوە، هەروەها ئەم یاسایانە ڕەنگدانەوەی ڕۆڵی مێ بوون لە پەیوەندیدا لەگەڵ پیاو، لێرەوە ئەم پەیوەندییە چەند پلەیەکی لەخۆ گرتووە، وەک هاوسەر کە بەرزترین پلە بووە، پاشان کەنیزەک، پاشان کۆیلە و دوای ئەویش لەشفرۆش.

زۆربەی زۆری جەختکردنەوەکان لەسەر ژن بوون وەک هاوسەر، هەروەها پەیوەندیی بە مێردەکەیەوە و ئەو مافانەی بەهۆی ئەم پەیوەندییەوە هەیبووە. هاوسەر یان ژنی شووکردوو بە مێیەکی ئازاد دانراوە. کە بە ڕەزامەندیی دایک و باوکی نەبوایە هاوسەرێتییەکەی بەڕێوە نەچووە، هەروەها ژن مافی هەبووە خوازبێنیکەر ڕەت بکاتەوە، مافی تەڵاقیشی پێ دراوە ئەگەر توانیبێتی ئەوە بسەلمێنێ کە مێردەکەی ناو و ناوبانگی خراپ کردووە، یان سووکایەتیی پێ کردووە. ژنەکە لە بەڵێننامەی هاوسەرێتیی نێوانیان دەبوو بیکات بە مەرج بەسەر پیاوەکەوە کە ژنێکی دیکە لە هەمان شار و ناوچە نەهێنێ کە ژنی یەکەمی لێ هێناوە، هەروەها بیکات بە مەرج بەسەر پیاوەکەیەوە کە

نەیفرۆشێ و نەیکات بە کۆیلە ئەگەر ناچاربوو، بەڵام ژنیش دەبوو لە بەرامبەردا خۆی بپاراستایە و بۆ ژیانی هاوسەرێتی دڵسۆز بوایە. ژن توندترین سزا چاوەڕێی دەکرد ئەگەر لەم ڕێسایە بڕۆیشتایەتە دەرەوە، هەمان سزا بۆ پیاویش هەبوو ئەگەر زینای لەگەڵ ژنێکی دیکەدا بکردایە، هەروەها شارستانییەتی نێوان دوو ڕافدەین هانی زوو بەشوودانی کچانی نەداوە، لە کاتێکدا ڕێگەی داوە کچی گەنج شوو بکات یان ببێ بە کاهن یان لە ماڵی باوکیدا بمێنێتەوە، بەڵام ئەم شارستانییەتانە بە لایانەوە باشتر بووە کە کچ شوو بکات، نەک بە قەیرەیی لە ماڵی باوکیدا بمێنێتەوە. هەرچەندە دۆخی ژن و مافە بەدەستهێنراوەکانی لە سەردەمە جیاوازەکاندا لە شارستانییەتێکەوە بۆ یەکێکی دیکە جیاواز بووە، بەڵام بەگشتی ژنی شووکردوو بەرزترین پلەی لە ئازادی و مافە کۆمەڵایەتییەکان هەبووە، هەروەها ئەو کار و چالاکی و ئەرکانەی جێبەجێ کردووە کە دەشێ ژنی هاوچەرخ ئیرەیی پێ بەرن. لە پاش پێگەی هاوسەر، کەنیزەک هاتووە، یان ئەوەی ئاشوورییەکان پێیان وتووە (ئەسیرتو) کە لەوانەیە بەرامبەر بە وشەی (ئەسیرە)ی عەرەبی بێ، واتە دیل. کە بەزۆری ژنێکی بیانی بووە و لە شەڕدا بەدیل گیراوە، ئەم ژنە ناچار بووە لە ماڵدا بمێنێتەوە و بۆی نەبووە لە ماڵ بێتە دەرەوە تەنیا لەگەڵ ژنی ئەو پیاوەدا نەبێ کە دیل بووە لە لای. ئەم ژنە وەک دۆستێک وا بووە بۆ پیاو، پێگەی لە نێوان هاوسەر و کۆیلەدا بووە، لە کۆیلە نازدارتر بووە و کۆمەڵێ مافی هەبووە کە ژنی کۆیلە نەیبووە، هەروەها منداڵەکانیشی بە منداڵی شەرعی حیساب کراون. پیاو بە ویستی خۆی بۆی هەبووە ئەو کەنیزەکە بخوازێ و بیکات بە ژنی خۆی و ئەو ژنە بۆی نەبووە ئەمە ڕەت بکاتەوە. پاش ئەمان ژنی کۆیلە دێ کە لە پێگەی سێیەمدا بووە. وەک شمەکێکی بازرگانی مامەڵەی لەگەڵدا کراوە، کڕدراوە و فرۆشراوە و خاوەنەکەی مافی

تەواوی هەبووە بەسەرییەوە بەپێی ئەو بەڵێننامەیەی کە بەندی تیادایە مافی مامەڵەکردن دەدا بەو پیاوەی کە خاوەنیەتی، هەروەها خاوەن کۆیلە بۆی هەبووە لەگەڵ ئەو ژنەدا، کە کۆیلەی بووە، سێکس بکات، کاتێک منداڵیشی لێی بووە، بەپێی یاسا لەدوای مردنی پیاوەکە، واتا خاوەنەکەی، خۆی و منداڵەکەی ئازاد بوون، بەڵام لە مافدا لەگەڵ ژنی خاوەنەکەیدا یەکسان نەبووە، تەنانەت ئەگەر بۆ پێگەی کەنیزەکیش بەرز بووبێتەوە و لەو پیاوە منداڵیشی بووبێ. پلەی چوارەم پلەی لەشفرۆش بووە، لە وڵاتی نێوان دوو ڕافدەیندا، دوو جۆر لەشفرۆش هەبووە. یەکەمیان (لەشفرۆشی پیرۆز) و دووەمیان (لەشفرۆشی گشتی). لەشفرۆشی پیرۆز ناوەکەی لەو ئاهەنگە سیمبولییانەی هاوسەرێتییەوە هاتووە کە لە نێوان عەشتار و تەمووزدا لەسەری ساڵدا ساز دەکرا. ئەم هاوسەرێتییە ناونرابوو (هاوسەرێتیی پیرۆز)، شێوازێکی هاوشێوەی ئەم هاوسەرێتییە لە نێوان کاهینی ژن و پیاودا، هەروەها لە نێوان ئەو کاهینە ژنانەدا کە خۆیان بۆ خواوەند نەزر کردبوو، هەروەها پیاوانی چینە جیاوازەکانی کۆمەڵگە ڕووی دەدا.

ئەم جۆرە پەیوەندییە لەگەڵ لەشفرۆشاندا بە جۆرێ تەماشا دەکرا کە پەیوەندییەکی بەهێزە لە نێوان خواوەند و ئەوانەی کە ئەم جۆرە پەیوەندییەیان دەبەست. ئەم جۆرە لە لەشفرۆشی بۆ ناو ژنانی دەرەوەی ناو پەرستگەکانیش، کە خۆیان لەشفرۆش نەبوون، شۆڕ بووەوە و دەچوون لەگەڵ کاهینی پەرستگەکاندا سێکسیان دەکرد، ئەم نەریتە لە قۆناغەکانی کەوتنی شارستانییەتی بابلیدا ئەوەندە بڵاو بوو، کە هیرودوتسی مێژوونووس لەو باوەڕەدایە هەموو ژنێکی بابلی بە لایەنی کەمەوە جارێ لە ماوەی ژیانیدا بە مەبەستی سێکسکردن لەگەڵ بیانییەکەدا سەردانی پەرستگەی ڤینۆسی کردووە. شایەنی باسە ئەم پەیوەندییە لە

نێوان ژنان و کاهینەکاندا لە شارستانییەتی عیبریشدا ناسراوە و هەبووە.

هەرچی جۆری دووەمی لەشفرۆشییە، لە نێوان گاڵتەپێکردن و قبوولکردندا تەماشا کراوە. هەروەک لە خوێندنەوەی گلگامشەوە دەردەکەوێ. لەم داستانەدا لەسەر زاری ڕاوچییەکەوە کە قسە لەگەڵ لەشفرۆشێکدا دەکات، هاتووە:

"جوانی و نازداریی ژن، دڕندەش بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ"، لەم قبوولکردنەوە ئەوە دەردەکەوێ کە مێ خاوەنی هونەرێکی تایبەتی بووە و جوانی و نازدارییەکەی خزمەتی مەبەستێکی دیکەی غەیری منداڵخستنەوەی کردووە. لە درێژەی قسەکانیدا ڕاوچییەکە بە لەشفرۆشەکە دەڵێ: "ئەو دڕندەیە، پشت لە بێچووەکانی دەکات کە لە لانەکەیدا بەخێوی کردوون، ئەگەر بەختی هەبوو بە تۆ گەیشت و سۆز و خۆشەویستیی بۆ تۆ جووڵا". لەشفرۆشی لەو سەردەمانەدا بە هەمان شێواز و ڕێکخستن پراکتیزە کراوە کە لە ئێستادا لە زۆرێک لە وڵاتەکانی دنیادا پراکتیزە دەکرێ. لە شارستانییەتەکانی نێوان دوو ڕافدەیندا لەشفرۆشی ملکەچی کۆمەڵێک ڕێسای ڕێکخستن بوو کە ئاماژە دەدات بە هۆشیاری و زرنگی یاسادانەران بەرامبەر بە پاڵنەرەکانی کە لەپشت ئەم دیاردە کۆمەڵایەتییەوەن و هەروەها زەروورەتی پابەندبوون بە یاساکانەوە. گرنگترین خاڵ لە مەسەلەکەدا ئەوەیە هەندێک لە شارستانییەتەکانی دۆڵی ڕافدەین لەشفرۆشییان بە پیشەیەکی یاسایی داناوە کە ملکەچی پێداویستیی کۆمەڵایەتی و ئابووری بووە، بەڵام لە هەندێ لە قۆناغەکانی دیکەی شارستانییەتی ئەم دۆڵەدا، لەشفرۆشی بە شێوازێکی نەویستراوی ژیان دانراوە، یان بە چاوی عەیبە و سەرشۆڕییەوە ئەو کەسانە تەماشا کراون کە خاوەنی ئەم پیشەیە بوون. بەپێی ناوبەێن ئەو یاسایانەش دەرچوون کە ڕێگە بە ژنی لەشفرۆش دەدەن واز لە لەشفرۆشی بێنێ و

هاوسەریتی بکات و منداڵەکانی کە لە پەیوەندیی هاوسەریتییەوە پەیدا دەبن، بکات بە منداڵی شەرعی. بەڵام ئەو پیاوەی کە خۆی ژنی هەبووبێ و ژنەکەی لە ژیاندا بووبێ، ڕێگەی پێ نەدراوە ژنێکی لەشفرۆش بێنێ، تەنانەت ئەگەر منداڵیشی لەو ژنە لەشفرۆشە هەبووبێ، ڕێگەی پێ نەدراوە لەگەڵ ژنی یەکەمی ئەو پیاوەدا، لە یەک ماڵدا پێکەوە بژین.

لە بەدواداچوونی هەموو ئەمانەدا بۆمان دەردەکەوێ کە مێ لە شارستانییەتی نێوان ڕافدەیندا خاوەنی ئازادییەکی بەرفراوان بووە بەراورد لەگەڵ هاوتاکەی لە کۆمەڵگە مێژوویی و هاوچەرخەکانی دیکەدا، بەڵام ئازادییەکەی تەنیا لە چوارچێوەی کۆمەڵایەتی و ئابووریدا سنووربەند کراوە، هەرچی ئازادیی سێکسییە ئەوا تەنیا مافی پیاو بووە، چونکە پیاو هەرچەندە ئەرک بووە لەسەری کە ڕێز لە ئازادیی ژنی ئازاد (واتە ژنەکەی) بگرێ و هەروەها ڕێز لە ئابڕووی ژنی پیاوی دیکە بگرێ، بەڵام بۆ خۆی ئازاد بووە لەو پەیوەندییە سێکسییانەی کە لەگەڵ ژنانی دیکە هەیبوون، وەک ژنانی کەنیزەک و کۆیلە، یان ئەو ژنە لەشفرۆشانەی حەزی لێکردوون، ژنەکەشی هیچ مافێکی نەبووە بۆ دەربڕینی ناڕەزایی، تەنیا لەو بارانەدا نەبێ ئەگەر پیاوەکەی لەگەڵ ژنێکدا سێکسی بکردایە، ببوایەتە هۆی ناوزڕاندنی خۆی، یان ژنەکەی.

جۆری پەیوەندیی نێوان نێر و مێ لە شارستانییەکانی دۆڵی ڕافدەیندا کاریگەرییەکی درێژکراوەی هەبوو بۆ سەر شارستانییە هاوچەرخەکانی دیکە، یان ئەوانە کە بەدوایدا هاتن لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست. کاریگەرییەکانی ئاشکرا بەدی دەکەین لە شارستانییەتی عەرەبی جاهلیدا کە پارێزگارییان لە ڕوخسارە سەرەکییەکانی ئەم پەیوەندییە کرد، ڕێز و پایەیەکی بەرزیان بە ژنی شووکردوو بەخشی، ڕێگەیان بە پیاو دا بە ئازادی پەیوەندیی سێکسی بە پلەکانی دیکەی ژنانەوە بکات کە پێشتر ئاماژەمان پێ

دان و لەنێو شارستانییەتی دۆڵی ڕافدەیندا بوونیان هەبوو، ئەم شێوازە تا هاتنی ئیسلام هێندە گۆڕانکاریی بەسەردا نەهات. (لە شوێنێکی دیکەی ئەم بەشەدا، باس لەم بابەتە دەکەینەوە).

## شارستانییەتی عیبری (تەورات)

ئەم شارستانییەتە پشتی بە دەقەکانی تەورات بەستبوو. هەرچەندە تەورات وەک هەموو کتێبە ئاسمانییەکانی دیکە لە ژیانی سێکسیدا تەنیا پشتی بە داوێنپاکی بەستبوو، بەڵام تاک لە شارستانییەتی عیبریدا و لە ژیانی ڕاستەقینەدا کاری بە پێوەرێکی دوانی دەکرد، واتە لەو کاتەدا کە تەورات ڕێگربوو لە سێکسکردن لە دەرەوەی هاوسەرێتی، سزاکان لەسەر ئەو کچەی کە شووی دەکرد و پاکیزەیی لەدەست دابوو، هەروەها ئەو ژنەی کە لە دەرەوەی پەیوەندیی هاوسەرێتی سێکسی لەگەڵ پیاوێکی دیکەدا دەکرد، زۆر توندتر بوون لەو سزایانەی کە بەسەر پیاودا دەدران لە هەمان ئەو حاڵەتانەدا. لە پەیوەندیی نێوان نێر و مێدا تەنیا پرەنسیپ بۆ کۆکردنەوەیان هاوسەرێتی بوو، بە هیچ شێوەیەک خۆشەویستی بەهەند وەرنەدەگیرا. سێکس لە چوارچێوەی پەیوەندیی هاوسەرێتیدا تەنیا چێژبوو بە گوناه دانەدەنرا، بەڵام زیناکردن بە تاوانێکی گەورە دەدانرا و بە دەستدرێژی بۆ سەر مافی موڵکایەتیی پیاو حیساب دەکرا، بەڵام ڕێگە بە پیاو دەدرا لە ژنێک زیاتر هەبێ و خاوەنی چەند کەنیزەکێک بێ. بە پێچەوانەی ئایینی مەسیحییەوە، کە پاکیزەیی هەمیشەیی بە نموونەیەکی باڵا داناوە. لە تەوراتدا بە چاوێکی ئاسایی و ئاسوودەییەوە تەماشای ئەو کەسانە نەکراوە کە پەیوەندیی سێکسییان بە درێژایی ژیانیان لە خۆیان حەرام کردووە، بەڵام لە سەدەی دووەمی پێش مەسیح چەند گرووپێک لە کەسانی پاکیزە و ڕەبەن و خواناس پەیدابوون، جوزیفزسی مێژوونووس بەم شێوەیە وەسفی ئەم گرووپانە

دەکات: "ئەم کەسانە بە جۆرێ تەماشای چێژیان کردووە وەک ئەوەی گوناهێک بێ، بەهایان بە قەناعەت داوە، هەروەها بەسەر سۆز و هەستەکانیاندا زاڵبوون و ئەمەیان بە چاکە زانیوە و هاوسەرێتییان فەرامۆش کردووە".

ئەم گرووپانە و بیروباوەڕەکانیان کاریگەرییان بۆ سەر ئەو کۆمەڵگەیانە هەبووە کە بەر لە دەرکەوتنی مەسیح هەبوون. بەم شێوەیە وشکی و خۆبەستنەوە بەو بیروباوەڕانەوە باڵی بەسەریاندا کێشاوە، بۆ سنووردارکردنی سێکس و ڕێگرتن لە ڕوودانی هەر ئەگەرێکی نەویستراو، کۆتوبەندی جیاواز سەپێنراوە، بۆ نموونە یاریکردنی کوڕان و کچان پێکەوە بە گوناه دانراوە، هەروەها دایک بۆی نەبووە لەگەڵ هاوسەری کچەکەیدا لە یەک ماڵدا پێکەوە نیشتەجێ ببن، ڕێگە بە باوک نەدراوە بە ڕووتی لە بەردەم منداڵەکانیدا دەربکەوێ، هەروەها بە جۆرێ تەماشای ژن کراوە وەک ئەوەی مەترسییەکی سێکسی بێ، ماستەربەیشن قەدەغەکراوە و بە گوناهێکی گەورە دانراوە. لە تەوراتدا (ئۆتان) کراوە بە بەڵگەی قەدەغەکردنی سێکسکردن لە دەرەوەی هاوسەرێتی، وەک دەگێڕنەوە لە کاتێکدا (ئۆتان) براکەی مردووە و فەرمانی پێ کراوە لە براژنەکەی منداڵی بخوڵقێنێ، لە دەرەوەی زێی براژنەکەی تووەکەی فڕێ داوە. حەرامکردنەکە خۆی لە خۆیدا نەریت نەبووە، هێندەی ئەوەی بە لایانەوە مەبەست بووە کە پارێزگاری لە تووی پیاو بکرێ و ڕێگە لە بەهەدەردانی بگیرێ. هەرچەندە شارستانییەتی تەورات پشتی بە وەسیەتەکانی پێغەمبەر مووسا بەستووە، هەروەها چاوەڕوانی پابەندبوون کراوە لەو کەسانەی کە بڕوایان پێی هەبووە، چونکە پابەند نەبوون تووڕەبوونی خوای بەرامبەر بە کۆمەڵگە لێ کەوتووەتەوە، بەڵام جێبەجێکردنی ئەم پابەندبوونە لە مەسەلە سێکسییەکاندا جێگیر نەبووە، هەڵوێستی تاک بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان بەپێی

سەردەم و شوێن و ئیجتیهادی ئەو کەسانەی لەم بوارانەدا کاریان کردووە، گۆڕانی بەسەردا هاتووە. لەم ڕووەوە جیاوازی لە هەڵوێستی عیبرییەکاندا بەدی دەکرێ بەرامبەر بە پەیوەندیی سێکسی لە ماوەی بەر لە دەستبەسەراگرتنی عیبرییەکان و دوای ئەو ماوەیە. هۆکای ئەم جیاوازییە بۆ ئەوە دەگەڕێنرێتەوە کە یەهودییەکان ترساون لەوەی تووشی سڕینەوەی ناسنامە ببن لەنێو کۆمەڵگە زاڵەکانی ئەو سەردەمە، لەبەر ئەوە بڕوا وایە لەپێناوی پاراستنی ناسنامەکەیان و ڕزگارکردنی لە فەوتان، ڕوانگەیان بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان گۆڕانی بەسەردا هات. بەر لە دەستبەسەرداگرتنیان، عیبرییەکان تەنیا چەند یاسا و ڕێسایەکی سادەیان هەبوو بۆ ڕێگرتن لە هەندێ پەیوەندیی سێکسیی، دانانی هەندێکیان بە نامۆڕاڵی، بەڵام دوای دەستبەسەرداگرتنیان و تەنانەت لەدوای دەرکەوتنی مەسیحیش، یەهودییەکان کۆمەڵێک ڕێسای ئاڵۆزیان دانا، پەیوەندیی سێکسییان وا لێ کرد کە لە قووڵایی ژیانی یەهودییەتەوە جێبەجێ بکرێ. لە دیارترین ڕێساکانی ژیانی سێکسیش کە لە تەوراتدا هاتووە، جەتکردنەوەیە لە بەروبووم، هەروەک لە دەقی تەوراتدا هاتووە: "بە برەو بن و زاوزێ بکەن". ئەگەر تەماشای هەڵوێستی یەهودییەکان بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان بکرێ، هەر لە سەردەمی دەستبەسەرداگرتنەوە تا هاتنی مەسیحیش، دەبینیت هەڵوێستەکان ئاماژە بە دوو هێزی گرنگ دەدەن. لە لایەکەوە ئەو ئاراستەیە بوو کە نابێ سێکس تەنیا لە ئەرکی زاوزێدا سنووردار بکرێ، چونکە چێژی خۆی هەیە، لە لایەکی دیکەشەوە ترس لەوە هەبووە کە بە گوێکردنی ئەم چێژە و ملکەچبوون بۆی لەوانەیە ببێتە هۆی لەدەستدانی ناسنامەی یەهودی. هەرچەندە لە ڕواڵەتدا ڕای زاڵ بەو ئاراستەیەدا بوو کە پارێزگاری لە ناسنامەی یەهوودییەت بکرێ، بەڵام لە واقیعدا ئەم بیرکردنەوانە بووە هۆی

دەرکەوتنی هەڵوێست و پێوەری دوانی کە لە لایەکەوە هانی خەڵکی دەدا بۆ سێکس، لە لایەکی دیکەوە کۆتوبەندی لەسەر سێکس دادەنا. هەڵوێستی ڕاگەیەندراو لەم ماوەیەی مێژووی یەهووددا، ئەو ڕایە بوو کە سێکسی بە نەفرەتێکی شەیتانی دادەنا و پیاوی بە لاواز تەماشا دەکرد کە قوربانییە و لە بەرامبەر کاری شەیتاندا هیچی پێ ناکرێ، لەبەر ئەوە سروشتی بوو کە پەیوەندیی سێکسی تا ئاستی تەرککردنی دنیا و ڕەبەنی کۆتوبەند بکات، لە لایەکی دیکەوە، ئەو هەستە پەرەی سەند کە سێکس تەنیا بۆ زاوزێ نییە، بەڵکو بۆ چێژیشە، ئەم ڕایە لە قۆناغەکانی بەر لە دەرکەوتنی مەسیحی گەیشتبووە ئەو ئاستە کە پیاوانی ئایینی بە ئاشکرا دەیانوت ئەم هەستە شتێکی خراپ نییە و چێژی سێکسی مافە، بەتایبەتی لە چوارچێوەی هاوسەرێتیدا. شارستانییەتی عیبری بەگشتی جەختی لەسەر ئەم ڕێسا ڕەفتارییە کردووەتەوە لە مەسەلە سێکسییەکاندا: مافی هاوسەرێتی بۆ هەریەک لە ژن و پیاو، بۆ زامنکردنی ئەم مافە پێویستە پیاو لەگەڵ ژنەکەیدا جووت بێ، تەنانەت ئەگەر ژنەکەی نەزۆکیش بێ، تەنانەت ڕێنماییەکانی (تەلمودی) کەمترین ئاستی ئەو جارانەشی دیاری کردووە کە پێویستە پیاو لەگەڵ ژنەکەیدا جووت بێ، هەروەها جووتبوونی شەوی هەموو هەینییەکی بە پێویست داناوە، هەروەها بە پێویستی داناوە هەریەک لە ژن و پیاو بەر لە جووتبوون خۆیان بشۆن و خاوێن بن و خۆیان بۆ پەیوەندیی سێکسی ئامادە بکەن، بە پێویستی داناوە کە ژن لەدوای سووڕی مانگانە و پیاویش لەدوای هاویشتنی تۆو لەبەر هەر هۆکارێ بێ، خۆیان بشۆن، بەڵام هیچ کۆتوبەندێکی لەسەر شێواز یان دۆخی پەیوەندیی سێکسیی نێوان ژنومێرد دانەناوە، بەو مەرجەی ئەنجامی کردارەکە بریتی بێت لە خستنەناوەوەی چووک بۆ ناو زێ، هەروەها یەهوودییەت پەیوەندیی سێکسیی نێوان ژن و پیاوی لە دەرەوەی هاوسەرێتی

ڕەت نەکردووەتەوە، بەڵام کچی پاکیزەی نەمر کردووە و سزای توندی ئەو بووکەی داوە کە پاکیزە نەبووە و ئەو ژنەی کە لە دەرەوەی هاوسەرێتی سێکسی کردووە.

سەبارەت بە پەیوەندییە سێکسییە قەدەغەکراوەکانیش، ئایینی تەورات بە تەواوەتی هەڵوێستی بابلییەکانی ڕەت کردووەتەوە، هەر وەک لە یاسای حەموراپیدا هاتووە. شایەنی باسە نەریتە دێرینەکانی عبرییەکان، سرووتی هاوسەرێتیی پیرۆزیان وەستاند بەهۆی ئاماژەی بتپەرستییەوە کە لەم سرووتانەدا بەدی دەکرا، هەروەها لەگەڵیدا لەشفرۆشی قەدەغەکرا کە کاهینەکان لەژێر ناوی هاوسەرێتیی پیرۆزدا ئەنجامیان دەدا. لێرەوە بە شێوەیەکی گشتی لەشفرۆشی ڕەت کرایەوە و ئیدانە کرا، بەڵام ئیدانەکردنەکە پەیوەندیی سێکسیی لە دەرەوەی هاوسەرێتی نەگرتەوە. بەگشتی دەکرێ بەو شێوەیە تەماشای شارستانییەتی عیبری بکرێ کە شارستانییەتێکی نێگەتیڤ بووە لە ڕووی مەسەلە سێکسییەکانەوە، چونکە کۆتوبەندێکی زۆری داناوە، کە ئەم کۆتوبەندانە زیاتر بۆ پارێزگاریکردن بوون لە ناسنامەی کۆمەڵگەی عیبری، نەک پارێزگاری لە دابونەریت و یاسا و پێداویستییە مرۆییەکان بکات بە شێوەیەکی تاکەکەسی، یان بەگشتی.

### شارستانییەتی میسری (فیرعەونی)

شارستانییەتی میسری بە لێبوردەیی بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان ناسراوە، تا ئەو ئاستەی کە کەمترین ڕێگری و سنووردارێتیی بۆ پەیوەندییە سێکسییەکان داناوە، ئەو شتانەی کە قەدەغەی کردوون تەنیا بە ئامانجی هێشتنەوەی پاکێتیی سرووتە ئایینییەکان و ڕێزگرتن بووە لێیان، بەم شێوەیە ڕێگەی زیناکردن لە ژن گیراوە و لە پەرستگەکانیشدا لەدوای خۆشتن و پاکبوونەوە نەبێ، ڕێگە بە سێکسکردن نەدراوە، هەرچی نێربازی یان

هۆمۆسێکسوالیتییه له پیاواندا تەنیا له پەرستگه گرنگەکاندا قەدەغه کراوە.

کۆمەڵگەی میسری وەک شارستانییەتە دێرینەکانی دیکە، جەخت لەسەر دەسەڵاتی پیاو بەسەر ژندا دەکات بە لایەنە سێکسییەکانیشەوە، دەبینیت له کاتێکدا زیناکردنی ژنی شووکردووی حەرام کردووە، بەڵام پیاوی لەم کۆتوبەندە ئازاد کردووە و ڕێگەی پێ داوە چەند ژنێک بهێنێ و کەنیزەکی هەبێ، بەتایبەتی ئەمە له تاکەکانی خێزانی فەرمانڕەواکان و گەورەدەسەڵاتداراندا باو بووە. بە شێوەیەکی گشتی شارستانییەتی میسری هانی زوو هاوسەرێتیی بۆ هەردوو توخمەکە داوە، هانی کوڕانی هەرزەکاری داوە بەر له هاوسەرێتی، پەیوەندیی سێکسی تاقی بکەنەوە لەگەڵ ئەو کۆیلە کچانەی کە له بەردەستدا بوون. لەوانەیە سەرچاوەی ئەم لێبوردەییە له شارستانییەتە دێرینەکاندا بۆ سروشت و خواوەند بگەڕێتەوە کە هەردووکیان بە ڕەگەزی سێکسی دانراون. له ئەفسانەی دێرینی میسرییەکاندا دەربارەی سەرەتای خوڵقاندن هاتووە کە گوایە ئاتوونی خواوەند، ماستەربەیشنی کردووە، دەرئەنجانی ئەوەش تۆواوەکەی ڕژاوە و بووە بە سەرچاوەی لەدایکبوونی هەموو شتێکی زیندوو، یان نازیندوو له گەردووندا. له ئەفسانەیەکی دیکەدا هاتووە، نوت Nut ژنە خواوەندی ئاسمان و جب Geb خواوەندی زەوی له جووتبوونێکی هەمیشەییدا بوون، هەموو شەوێ نوت خۆری قووت داوە و بەرەبەیان لەنێو قاچەکانییەوە خۆر لەدایک بووەتەوە. میسرییە دێرینەکان لەم ئەفسانە و داستانانەوە ئەو شتانەیان وەرگرتووە کە ئاماژە بە دۆخی مرۆیی دەدەن و ڕەفتاری جووتبوون و منداڵبوونیش، ڕەفتارێکە کە مرۆڤ لاسایی سروشت و خواوەند دەکاتەوە. بەم شێوەیە له سێکس و مەسەلە سێکسییەکانیان ڕوانیوە کە لایەنی پیرۆزن له

ژیاندا و پەیوەندیی سێکسی جۆرێکە لە خواپەرستی و مرۆڤ پیتاندن و سێکس لە یەک کرداردا کۆدەکاتەوە کە هەریەک لەو دوانە پشت بە یەکدی دەبەستن و یارمەتیی یەکدی دەدەن. میسرییەکان وەک یەکەم شارستانییەت دانراون کە کرداری خەتەنەکردنیان بۆ هەردوو توخمەکە ئەنجام داوە، هەروەها لەو نەریتانەی کە تەنیا لەناو میسرییەکاندا هەبووە، هاوسەرێتیی نێوان خوشک و برایە. سەبارەت بە پەیوەندییە سێکسییەکانی دیکە، بەڵگە هەن لەسەر ئەوەی هۆمۆسێکسوالیتی و سێکسکردن لەگەڵ مێ لە دواوە لەناو میسرییەکاندا هەبووە، بەڵام تا ئێستا ئاستی قبوڵکردن یان ڕەتکردنەوە بەرامبەر ئەم ڕەفتارە سێکسییانە نەزانراوە. بەڵام هەندێک لە کۆتوبەندە مێژووییەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە هۆمۆسێکسوالیتی لەنێو کوڕاندا پەسەندکراو نەبووە و ئاماژە بووە بۆ سەرشۆڕی و ڕیسوایی ئەو کوڕەی کە کاریگەریی کردارەکە کەوتووەتە سەری، واتە لە پەیوەندییە سێکسییەکەدا ڕۆڵی نێگەتیڤی بینیوە و بەهۆی ئەم ڕەفتارەشییەوە شەرەفی لەکەدار بووە، هەروەها لە میسری دێریندا پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ ئاژەڵدا بڵاوبووە، هەروەها ئەو لادانە سێکسییەش هەبووە کە لەپێناوی دەستکەوتنی چێژی سێکسیدا، پیاو پۆشاکی ژنی لە بەر کردووە، یان بە پێچەوانەوە، ژن وەک پیاو خۆی گۆڕیوە. بەگشتی شارستانییەتی فیرعەونی، شارستانییەتێکی لێبوردە بووە بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان، بە کورتی میسرییەکان بڕوایان بەوە بووە، ئەگەر تاک ئەرکی هێنانەدنیای منداڵی جێبەجێ کرد، ئەوا لە پەیوەندییە سێکسییەکانیدا ئازاد دەبێت، بەو مەرجەی ئازادیی کەسانی دیکە قۆرغ نەکات.

## شارستانییەتی گریکی

هەڵوێستی گریکییەکان بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان بەپێی سەردەم و کۆمەڵگەکان فرەجۆر و جیاواز بووە. هەڵوێستەکان لە نێوان خۆبەستنەوەی توند و ئیباحییەتی ئازاددا بووە. ئاراستەی دووەمیان بەزۆری ئاراستەی زاڵ بووە لە پەیوەندییە سێکسییەکاندا، بەڵام ئاراستەی یەکەم، واتە خۆبەدوورگرتن لە سێکسدا، هەرچەندە ژمارەی پەیڕەوکەران و شوێنکەوتووانی کەم بووە، بەڵام کاریگەریی زیاتری بۆ سەر شارستانییەتی ئەورووپیی مەسیحی هەبووە لە دواتردا.

شارستانییەتی یۆنانی، وەک حاڵی زۆربەی شارستانییەتەکانی دیکە، زیاتر بایەخی لەسەر پیاو چڕکردووەتەوە. هەرچەندە ژن لە هەندێک سەردەمدا ئازادییەکی کۆمەڵایەتیی بەرفراوانی هەبووە، بەڵام ئەو ئازادییە لە چوارچێوەی دەسەڵاتی خێزانیدا سنووردار کرابوو بۆ ئەو پیاوەی وا پێویستی کردووە ئەو ژنە بپارێزێ کە هاوسەر یان دایکی بووە. لەو سەردەمەدا مەدح و سەنای ئەو کچانە دەکرا کە بەر لە هاوسەرێتی، بە حەیا و حورمەت بوون و هیچ پەیوەندییەکی سێکسییان نەکردووە.

لەدوای هاوسەرێتییش ئەرکی مێ خستنەوەی منداڵ بووە، بەتایبەتی منداڵی کوڕ، هەروەک ئەرستۆ باسی دەکات. خێزان بە مانا دروستەکەی بوونەوەرێکی زیندووە، وا پێویست دەکات لە هەموو نەوەیەکدا نوێگەریی تیادا بکرێ، تا ئەو خێزانە بمێنێتەوە و پارێزگاری لە مانەوەی بکرێ.

سەبارەت بە پەیوەندیی نێوان دوو توخمەکە، ژن لە چاوی پیاودا لە پێگەیەکی نزمدا تەماشاکراوە. هەندێک لە توێژەران سەبارەت بەم ڕوانینە لە ژن لە چاوی پیاوەوە دەڵێن، ئەوە دەرئەنجامی ترسی پیاو بووە لە ژن و هەستکردنی پیاو بە کەموکوڕیی بەرامبەر بە ژن، هەر ئەم ترس و هەستکردن بە کەموکوڕییەی پیاو بەرامبەر بە ژن، کراوە بە بەهانە و هۆکاری

حەزکردنی گریکییەکان بە پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتی لەنێو پیاواندا، هەروەها لێکدانەوەی دیکە بۆ هەمان دیاردەی بڵاوبوونەوەی هۆمۆسێکسوالیتی لەنێو گریکەکاندا هەیە، بۆ نموونە گۆڕانی خێزان لە خێزانی درێژەوەبوو بۆ خێزانی ناوکی، هەروەها سەرهەڵدانی شارستانییەتی گەنجان کە پەیوەندیی سێکسیی نێوان نێر و نێر و ڕقلێبوونەوە لە ژنانی نەمر کرد.

پەیوەندییە سێکسییەکان لای گریکییەکان ئاڕاستەی ئەو ڕەوت و ڕوخسارانەی گرت کە دەرئەنجامی شارستانییەتی گریکی بوو لە ژیاندا بە شێوەیەکی گشتی، کە هەڵوێستێک بوو پێگەی چێژی لە ژیاندا بەرز دەنرخاند، تەنیا ژمارەیەکی کەم بڕوایان بەوە بوو کە هەوڵدان و ڕۆیشتن بەدوای چێژدا دژی چاکەیە کە ئەرستۆ لە ژیانی کەسێکی تەواودا بانگەشەی بۆ دەکرد، تەنانەت خواوەندەکانیان لە ئەفسانەکاندا بەدوای چێژدا ڕۆیشتوون و هەوڵیان بۆ داوە، هەرچەندە لەپێناوی مرۆڤیشدا بووە. لە دەرەوەی چوارچێوەی هاوسەرێتی، هانی دەستکەوتنی چێژ دراوە، بەڵام هاوسەری ژن تەنیا وەک ئامرازێک بۆ خستنەوەی منداڵی شەرعی و پارێزەری ئاگردانی ماڵ دانراوە. گریکەکان پەیوەندییە سێکسییەکانیان دیاری نەکردووە، هەروەها سووڕی مانگانەیان بە شتێکی سروشتی داناوە و وەک شتێکی پیس تەماشایان نەکردووە، هەروەها ماستەربەیشنیان بە کارێکی سروشتی سەیر کردووە و لەو دۆخانەدا کە هیچ دەروازەیەک بۆ دەرچوونی وزەی سێکسی لەئارادا نەبووە. بە چاوی پەسەندنەکردنیشەوە تەماشای پەیوەندیی سێکسی لە پێش هاوسەرێتی یان لەدوای هاوسەرێتی نەکراوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە هانی ڕوودانی دراوە، بە هەمان شێوە بە پێچەوانەی شارستانییەتەکانی دیکەوە، بە چاوی پەسەندکردنەوە لە ڕووتبوونەوەی جەستەیان ڕوانیوە و جەستەیان نەمر کردووە، پێیان وا بووە، پێویستە تاک لە یەک

کاتدا چاکەخواز و جوانیش بێ، جەستەی جوان بۆ ڕۆحی جوان پێویستە. بەم شێوەیە ڕاهێنانی جەستەیان بە ڕاهێنانی ڕۆح داناوە. کاریگەریی ئەم بیرکردنەوە و بۆچوونانەیان تەنیا لە ڕەفتار و نەریت و ئادابیاندا نادۆزینەوە، بەڵکو لە شوێنەوارە دێرینەکانیشدا ئەمانە دەبینینەوە، بەتایبەتی لە پەیکەرە ڕووتەکانیاندا کە زۆربەیان بریتین لە وێناکردنی پیاو و گەنج و کوڕ بە ڕووتی.

هۆمۆسێکسوالیتی لەنێو پیاواندا گرنگترین ڕوخسارەکانی ژیانی سێکسی بووە لای گریکەکان، هەرچەندە ئەم پەیوەندییە نەمر کراوە، بەڵام هەندێجاریش ڕەت کراوەتەوە و ئیدانە کراوە، هۆکاری ئەم دژبەیەکییەش بۆ ئەوە دەگەڕێنرێتەوە کە یاسادانەران ویستوویانە پراکتیزەکردنی ئەم ڕەفتارە سێکسییە لەو سنوورەدا بهێڵنەوە کە وەک ڕەفتارێکی چینی باڵا حیسابی بۆ بکرێ، لەبەر ئەوە ڕێگە بە کۆیلە و ئەو هاووڵاتییانە نەدراوە هۆمۆسێکسوال بن کە ئازادییان لەدەست داوە و پێیان وا بووە شایستەی ئەوە نین ئەم ڕەفتارە سێکسییە پراکتیزە بکەن. ئەم ڕەفتارە لە لایەن گەنجەکانەوە ئەنجام دراوە، ئاڕاستەی هەرزەکارانیان کردووە و ئەو کەسەی کە لە پەیوەندییەکەدا تەمەنی گەورەتر بووە بە ئازا و بوێر ناسراوە، لەبەر ئەوە ئەم پەیوەندییە سێکسییە لە نێوان دوو کوڕدا کە یەکێکیان تەمەنی گەورەتر بووە، وەک پەیوەندییەکی فێرکاری بە شیاو دانراوە، دانایی و ئازایی بەوی دیکەیان بەخشیوە کە تەمەنی منداڵتر بووە، یان هەرزەکار بووە. ئەم شیاوی ڕێگەدانە بە پەیوەندیی سێکسیی نێوان نێر و نێر بۆ شارستانییەتەکانی دیکەش گوازراوەتەوە و هانی پیاو دراوە لەگەڵ کوڕی تەمەن منداڵدا سێکس بکات. توێژەر لە بواری شوێنەوارە ئەدەبی و مێژووییەکانی گریک دیمەن و دەق و شوێنەواری زۆر دەبینێ کە هەموویان ئاماژە بە ئاستی بڵاوی هۆمۆسێکسوالیتی دەدەن، بەتایبەتی لە نێوان کەسانی پێگەیشتوو

لەگەڵ کوڕانی هەرزەکار، یان لە خۆیان منداڵتر. ئەم پەیوەندییە سێکسییانە لە لایەن سۆکرات و ئەرستۆ و ئەفلاتوونەوە باسکراون و نەمر کراون، هەروەها لەنێو شاعیر و هونەرمەند و نووسەرانیشدا هەبووە.

هەرچی پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتییە لای کچان، ئەوا ئەمیش لە شارستانییەتی گریکیدا هەر بڵاوبووە، ئەویش بەهۆی جیاکردنەوەی ژن و ڕێسا و یاساکانی پەیوەندی لە کۆمەڵگەی نێرەکاندا کە ژنی لێ جیاکرابووەوە، بەڵام بەڵگەکان لەسەر بڵاوبوونەوەی ئەم دیاردەیە کەمن، لەوانەیە هۆکارەکەی بۆ کەم بایەخدان بووبێ بە پراکتیزەکردنی پەیوەندیی سێکسی لەنێو کچان یان ژناندا. گرنگترین بەڵگەی بەردەست لەسەر بڵاوبوونەوەی هۆمۆسێکسوالیتی لای مێ بریتییە لە سافۆی ژنە شاعیر کە لەسەر دوورگەی لسبوس ژیاوە، کە ناوی سافۆ، یان شوێنی لەدایکبوونەکەی، واتە دوورگەی (لەسبی) بە پەیوەندیی سێکسیی نێوان مێ و مێ بەخشرا.

هەرچی دیاردەی لەشفرۆشییە، لە یۆنانی گریکییەکاندا بە هەردوو شێوەکەی، واتە هۆمۆسێکسوالیتی نێوان نێر و نێر، هەروەها نێوان مێ و مێ، هەروەها پەیوەندیی سێکسیی نێوان نێر و مێ، هەبووە و بەربڵاو بووە، بەڵام بە شێوەیەکی پەسەندکراو تەماشا نەکراوە، چونکە ئەو پەیوەندییە سێکسییە لە بەرامبەر وەرگرتنی کرێیەکدا ئەنجام دراوە و گریکییەکان هەموو پەیوەندییەکی سێکسیی گرێدراویان بە ماددەوە، بە بێزراو داناوە، بە پەیوەندییەک وەسفیان دەکرد کە دژی بەرژەوەندیی گشتییە، هەروەها پەیوەندییەکی دیکەی سێکسی هەبووە بە ناوی لەبەرکردنی پۆشاکی توخمەکەی دیکە کە ئەکتەران لە هەندێک مەراسیمی هاوسەرێتیدا و لە هەوڵدانیان بۆ خۆشاردنەوە و

هەڵخەڵەتاندنی چاوی ئیرەکار و چاوی خراپ، هەروەها لە هەندێ مەراسیمی ئاهەنگگێڕاندا، ئەنجامیان داوە.

هەروەها گریکییەکان بە سێکسی دژەتوخم ئاشنابوون کە تاک هەوڵی دەدا توخمە سروشتییەکەی خۆی بگۆڕێ، زۆرترین هەوڵەکانیش لەنێو ژناندا بووە کە هەوڵیان داوە سیفەتە مێینەییەکانی خۆیان بۆ سیفەتی نێرینە بگۆڕن.

***

ئەفلاتوون لەنێو هەموو فەیلەسووفەکانی دیکەدا تەنیا فەیلەسووف بووە کە بایەخی بە پێگەی ژیانی سێکسی داوە لە ژیانی مرۆڤدا. ڕایەکانی لەم بوارەدا کاریگەرییەکی زۆری هەبووە بۆ سەر بیرکردنەوەی ئەو فەیلەسووفانەی بەدوایدا هاتن لە شارستانییەتی گریکی و شارستانییەتەکانی دیکەشدا، بەتایبەتی شارستانییەتی مەسیحی و ئەورووپی. یەکێک لەو فەیلەسووفانەی کە ئەفلاتوون زۆر کاری تێکردووە، دایۆجنیس Diogenes بووە کە یەکێکە لە فەیلەسووفەکانی قوتابخانەی فەلسەفیی سەگی Cynics[1] لە سەدەی چواری پێش زاییندا، کە بانگەشەی ئەوەی دەکرد پێویستە مرۆڤ چەندە دەتوانێ لە ئارەزووەکانی کەم بکاتەوە و داوای ئەوەی دەکرد پێویستە هەموو ئەو ئارەزووە سێکسییانە ببێزرێنرێن کە مەدەنییەت سەپاندوونی و مەدح و سەنای ئەو کەسانەی دەکرد کە وازیان لە هاوسەرێتی هێناوە و لە خۆیان حەرام کردووە.

دەگێڕنەوە لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا کە گونجاوترین تەمەن بۆ هاوسەرێتی کامەیە؟ وتویەتی: "بەنیسبەت گەنجەکانەوە هێشتا کات ماویەتی، بەڵام بۆ گەورەکان با دەست پێ بکەن..". لەو فەیلەسووفانەی دیکە کە ڕایەکی هاوشێوەی ڕای دایۆجنیسیان هەبوو، زینۆ Zeno (٢٦٥-٣٤٠ی پ.ز) بوو کە یەکێکە لە ناودارانی قوتابخانەی ڕەواقی Stoics[2] کە بانگەشەی ئەوەی

دەکرد، پێویستە مرۆڤ لە ژینگەیەکی ماددیدا بژی، لەبەر ئەم هۆکارەش مەرج نییە غەریزە و سۆز دژ بە ژیانی دروست بن، بەڵام هەر دەبێ ملکەچی کۆنترۆڵکردن بن.

سێکس لای ڕەواقییەکان خۆی لە خۆیدا شتێکی خراپ نەبوو، چونکە پێیان وا بوو دەبێتە هۆی لەدایکبوون، لەدایکبوونیش تەنیا هەر بۆ جەستە نییە، بەڵکو بۆ ڕۆحیشە، چونکە پرەنسیپی دەسەڵاتی بەسەر گەردووندا هەیە، لەسەر ئەندامەکانی لەدایکبوونیش ڕەنگ دەداتەوە، هەروەک چۆن لەسەر هەستەکان ڕەنگ دەداتەوە، ئەو تووەش کە لە ئەنجامی ئەمەوە پەیدا دەبێ، توویکی خوایانەیە. مرۆڤ وەک هەموو گیانەوەرانی دیکە لەڕێی حەز و بەرپەرچدانەوە بڕیاری لەسەر دەدات، بەڵام مرۆڤ لەڕێی ئەقڵەوە کۆنترۆڵی خۆی دەکات، گوێنەدان بە چالاکییە جەستەییەکان و هێشتنەوەیان لە سنوورێکی مامناوەندا، شتێکی نائەقڵانییە، چونکە ئەمە وا دەکات تاک پشت بە جەستەی ببەستێ. لە لای زینۆ جووتبوون تەنیا ئەو کاتە ڕێگەپێدراوە کە مەبەست لێی نەوەخستنەوە بێ، بەڵام جووتبوون لە چوارچێوەی هاوسەرێتیدا و بە مەبەستی چێژوەرگرتن، ئەوا شتێکی خواستراو نییە، هەر لەبەر ئەوە هۆمۆسێکسوالیتییش کە تەنیا لەبەر خاتری چێژە، ڕەت کراوەتەوە و بە شتێکی شاز و ناسروشتی دانراوە. لەو ڕەواقییانەی دیکە کە هەڵوێستێکی هاوشێوەی هەبووە، سنیکا Seneca (سەدەی یەکەم د.ز) کە لە ڕووی مێژووییەوە کەوتووەتە دواوە، واتە لەدوای ڕەواقییەکانی دیکەوە ژیاوە، سنیکا پێی وا بووە پیاوانی دانا بە دانایی ژنەکانیان خۆش دەوێ، نەک بە سۆز و لەڕێی هەست و سۆزەوە، هەروەها پێویستە کۆنترۆڵی هەستەکانیان بکەن و لەڕێی زوو جووتبوونەوە دەستپێشخەر نەبن، لەوە خراپتر نییە پیاو ژنەکەی خۆی وەک ژنێکی سۆزانی خۆش بووێت. هەرچی قوتابخانەی نوێی فیساگۆرسییە[٣] پێی وایە

ڕۆح لە جەوهەردا لەگەڵ شتە ماددی و ئەبەدییەکاندا هاوئاوازە، جیهان و جەستە هەردووکیان دوژمنی ڕۆحن، ئەم قوتابخانەیە وای دەبینێ جووتبوون لە نێوان ژن و پیاودا تەنیا لەبەر خاتری خوڵقاندنە، نەک چێژ، هەروەها ڕزگاربوونی مرۆڤ لە ئازادبوونی ڕۆحدایە لە کۆتوبەندی جەستە و هەستەکان. ناودارترین فەیلەسووفەکانی ئەم قوتابخانەیە نیومینیوم Numenium (سەدەی دوو د.ز) بوو لەگەڵ بلوتونیوس (سەدەی سێ د.ز) کە دامەزرێنەری قوتابخانەی ئەفلاتوونی نوێ بوو.

نیومینیوم پێی وا بوو ڕزگاربوونی تاکانەیی مرۆڤ لەڕێی وازهێنان لە چالاکیی سێکسییەوە دێتە دی، چونکە ئەم جۆرە خۆبێبەریکردنە لە سێکس، ڕۆح لە سۆز ئازاد دەکات و مرۆڤ دەخاتە حاڵەتی نەمریی ڕۆحییەوە.

هەرچی بلوتونیوسە لە ژیانیدا شەرمی لە جەستەی خۆی دەکرد، تەنانەت مەسەلەی باوکایەتیی خۆی و شوێنی لەدایکبوونی خۆی بە شتێکی گرنگ نەدەزانی، لە خواناسی و سۆفیگەریدا نقووم بووبوو، پێی وا بوو ڕزگاربوون بریتییە لە یەکگرتنی تاک لەگەڵ ڕۆحی گەردووندا، ڕێگەی ئەم یەکگرتنەش دووروودرێژە و هێدی هێدییە، پێویستە لەڕێی خۆکۆنترۆڵکردنێکی سەختەوە مرۆڤ خۆی ئامادە بکات، خۆکۆنترۆڵکردن لە ڕووی مەعنەوی و ئەقڵییەوە، بەبێ ڕاهێنان لەسەر ئەم خۆکۆنترۆڵکردنە، ڕۆح ناتوانێ بەپێی پێویست بەهێز بێ تا بتوانێ خۆی بەو بەرزاییانە بگەیەنێ کە ڕزگاربوون لەوێ نیشتەجێیە و بۆ ئەوەی بەرگەی بینینی ئەو ڕوئیا جوانە بگرێ کە لەگەڵ ڕزگاربووندا دەردەکەوێ. لەم وتانەوە ئەوە دەردەکەوێ پێویستە تاک گوێ بە سێکس نەدات. پۆرفری Porphry کە قوتابیی بلوتونیوس بوو هەڵوێستی توندتری لە مامۆستاکەی هەبوو تا ئەو ئاستەی پەیوەندیی سێکسیی بە شتێکی ڕەتکراوە دادەنا، شانبەشانی چێژەکانی دیکە،

وەک سواربوونی ئەسپ، چوونە سەر شانۆ، سەماکردن و گۆشتخواردن. لە قوتابخانەی ئەسکەندەرییە[٤]ش لە سەدەی یەکەمی پێش زاین فیلۆ Philoی فەیلەسووفیش کە کەوتبووە ژێر کاریگەریی فەلسەفەی ڕەواقییەکان و یەکێک بوو لە ناودارترین فەیلەسووفەکانی ئەم قوتابخانەیە، پێی وا بوو بالاترین سروشتی مرۆڤ بریتییە لە سروشتی ناسێکسی کە سروشتێکی لێکچووە لەگەڵ سروشتی خوادا. یەکەم هەڵەی ئادەم و حەوا دەرئەنجامی ئارەزووی سێکسی و چێژەکانی جەستە بوو، ئەم چێژانە سەرەتای هەڵەکان و شکاندنی یاساکان بوو، بەپێی بڕوای ئەو، مرۆڤ لەپێناوی سێکسدا نەمری و نیعمەتی بە ژیانێکی بەتاڵ و هیچ و بەدبەختی گۆڕییەوە. یەکێک لە ناودارترین ڕایەکانی ئەو ڕایەیە کە شارستانییەتی مەسیحیش بڕوای پێ هێنا کە پێی وایە سێکس تەنیا لە چوارچێوەی ژیانی هاوسەرێتیدا شیاوە و تەنانەت لەم چوارچێوەیەشدا پێویستە ئامانجەکەی خستنەوەی منداڵی شەرعی بێ لەپێناوی پاراستنی مانەوەی توخمی مرۆڤدا، بەڵام ئەو پیاوانەی سێکس لەگەڵ ژنێکی نەزۆکدا دەکەن، شایەنی ئەوەن لۆمە بکرێن، چونکە لە هەوڵدانیاندا بەرەو چێژوەرگرتن "بە ئەنقەست تۆوی خولقاندن بەهەدەر دەبەن". بەم شێوەیە فیلۆ ئیدانەی هەموو پەیوەندییەکی سێکسی دەکات کە ئامانجی منداڵخستنەوە نەبێ، یان نەبێتە مایەی منداڵخستنەوە، هەروەها ئیدانەی هەموو ئەزموونێکی نێگەتیڤی دیکەی لەم شێوەیە کردووە، وەک هۆمۆسێکسوالیتی لە پیاواندا، کە وای بینیوە لەنێو نێردا هۆمۆسێکسوالیتی بەڵگەیە لەسەر کۆیلایەتی و سۆز و نائەقڵانی. ئەو تاکەی کە ئەم کارە دەکات، تووشی پەتای نەخۆشیی مێیەتی بووە، چونکە لای ئەو مێیەتی، واتە دەرککردن بە هەست و جیهانی خولقێنراو، بەڵام نێرینەیی واتە ڕۆح و سۆز، هەر لەبەر ئەم هۆیانەیە کە فیلۆ پەردەی کچێنیی نەمر کردووە.

## شارستانییەتی ڕۆمانی

هەرچەندە ڕۆمانییەکان بە زیادەڕۆییان لە لایەنە سێکسییەکاندا ناسراون، بەڵام ئەم زیادەڕۆییەیان هاوکات بووە لەگەڵ داگیرکردنەکانیان و تەنیا چینە باڵاکانیان لە کاربەدەستانی ڕۆما و چینە ئورستۆکراتەکانیان ئەم زیادەڕۆییەیان لە سێکسدا کردووە، لەبەر ئەوە ئەم زیادەڕۆییە، پراکتیزەکردنی سێکس لە ژیانی گشتی و هەڵوێستی ڕۆمانییەکان بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان نانوێنێ. زۆربەی توێژینەوەکان دەربارەی شارستانییەتی ڕۆمانی بەو ئەنجامە گەیشتوون، کە هەرچەندە ڕۆمانییەکان بڕوایان بەوە هەبووە سێکس و جەستە چێژبەخشن، بەڵام لەڕێلادانی مۆڕاڵییان ڕەت کردووەتەوە. بە شێوەیەکی گشتی بە مۆڕاڵەوە پابەندبوون، هانی پەیوەندیی سروشتیی نێوان نێر و مێیان داوە و مامناوەندێتییان لە سێکسدا بە باش زانیوە. لادان و زیادەڕۆیی لە سێکسدا تایبەت بووە بە چینی دەسەڵاتدار و نموونەکانیان لە کاربەدەستانی باڵای دەسەڵات.

ڕۆمان بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ کەوتبووە ژێر کاریگەریی گریکییەکان وەک ڕوانگەی نەمرکردن و ڕۆمانتیکییانەیان بۆ پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتی، بەتایبەتی لە نێوان کوڕانی تەمەن بچووک و گەورەکاندا. بەڵامدواتر ڕۆمانییەکان ڕێگر بوون لە لاساییکردنەوەی ئەم میتۆدە گریکییە و پراکتیزەکردنی ئەم پەیوەندییەیان ڕەت کردەوە، هەروەها ئەو ڕایەی گریکییەکانیشیان ڕەت کردەوە کە پێی وا بوو پەیوەندیی سێکسیی نێوان کوڕانی بچووک و گەورەکان خزمەتی مەبەستێکی فێرکاری دەکات لە کاروانی ژیانی کوڕدا، چونکە فێرکردن لای ڕۆمانییەکان، واتە ڕێزگرتن لە باوباپیران و دابونەریتەکانیان و ڕۆیشتن بە ڕێگەی ئەواندا، لەبەر ئەوە جەختیان لە بایەخی ماڵ کردووە و پێیان وا بووە شوێنی دروست بۆ فێربوون ماڵە، بۆ ئەم ئەرکەش تا

تەمەنی حەوت ساڵی پشت بە دایک بەستراوە و منداڵ لەژێر چاودێری و پەروەردەی دایکیدا بووە، نەک کۆیلە، پاش ئەم تەمەنەش باوک ئەرکی فێرکردنی کوڕەکەی گرتووەتە ئەستۆ، تەنانەت مامۆستاکانیش ئەگەر پێویستی بە خزمەتەکانیان هەبووبێ، وەک مامۆستا دانراون، نەک وەک خۆشەویست، وەک ئەوەی کە لە شارستانییەتی گریکیدا وابوو. هەروەها بە پێچەوانەی گریکەکانیشەوە، ڕۆمانییەکان وەرزشیان وەک ئامرازێک بۆ یاری و کات بەسەربردن داناوە، نەک وەک پرۆسەیەکی کێبڕکێکاری، هەروەها پێیان وا بوو پێویستە وەرزش لەڕێی ڕاهێنانەوە بەڕێوە بچێ، نەک تەنیا وەک یاری و هەروەها پێویستە ئامانجی مۆراڵی لە پشتەوە بێت شانبەشانی ئامانجە جەستەییەکان.

ڕۆمانییەکان ئەوپەڕی هەوڵیشیان بۆ ئەوە خستە کار کە خۆیان بەدوور بگرن لە فاکتەرە کارتێکەرەکانی گریکییەکان بۆ سەر ژیانی سێکسییان، هەروەها جەختیان کردووە لەسەر بایەخی هاوسەرێتی و منداڵ و دژی لادان وەستاونەتەوە و هیچ جۆرە لادانێکیان قبووڵ نەکردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جۆر لە لادان لەنێو ڕۆمانییەکاندا ناسراوە، وەک هۆمۆسێکسوالیتی و لەبەرکردنی پۆشاکی توخمەکەی دیکە (واتە پیاو جلی ژن لە بەر دەکات و ژنیش جلی پیاو)، بەڵام بەگشتی بڵاوبوونەوەی ئەم لادانانە سنووردداربوون و نووسەران و ڕەخنەگرانیش چەندە شایستە بووە ڕەخنەیان لەم لادانانە گرتووە و ئیدانەیان کردوون. هەر وەک لە شارستانییەتی گریکیدا هەبوو، لە شارستانییەتی ڕۆمانیشدا ئەنگێزەیەک هەبوو ڕووەو تەرککردنی دنیا و خواپەرستی کە ڕێنماییەکانی ڕەواقییەکان وەک ئایینێک وا بوو بۆ ئەم ئاڕاستەیە. لە گرنگترین ڕێنماییەکانی شێوازی ڕەواقیش، ئەمانەبوون: چاکەکاری، واتە تاک بە هاوسەنگی لەگەڵ ئەقڵدا

بژی، چونکە ئەمە تەنیا چاکەیە، هەروەها ئازار و مردن بە خراپە دانانرێن وەک ئەوەی هەندێک کەس وا دەزانن و چێژیش شتە باشەکە نییە. ئەم ڕێنماییانە لەگەڵ ڕایەکانی فەیلەسووفی گریکیی خواناس بلوتونیوس کە هانی ڕەفتاری ڕێگرتنی دەکرد لە هەموو چێژە جەستەییەکان بە پەیوەندیی سێکسییشەوە، هەروەها پێی وا بوو پەیڕەوکردنی ڕێگەی چێژ گوناهێکی گەورەیە. بەگشتی شارستانییەتی ڕۆمانی و یاسا سنووردار و یەکلاییکەرەوەکانیان بۆ ڕەفتار، کاریگەرییەکی گەورەتری بۆ سەر مەسیحییەت هەبوو لە کاریگەریی شارستانییەتی گریکییەکان کە زیادەڕۆییان لە مەسەلەکانی جەستەدا دەکرد و هیچ هەستیان بە گوناه نەدەکرد.

### شارستانییەتی هیندی

لە شارستانییەتی دێرینی هیندیدا ڕوانین بۆ مەسەلە سێکسییەکان پەیوەستییەکی توندی هەبووە لەگەڵ بیروباوەڕی ئایینی و فەلسەفییاندا، لەبەر ئەوە کاتێک ئەم بیروباوەڕانە بەرفراوان و فرەجۆر بوون، ڕوانینیش بۆ مەسەلە سێکسییەکان گۆڕانی بەسەردا هات و فرەجۆر بوو، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هەندێک ڕێسای سەرەکی هەبوون کە تایبەت بوون بە پەیوەندییە سێکسییەکان، وەک خۆیان مانەوە، کە لە بناغەدا بۆ یاسای (مانو) کتێبی پیرۆز و سەرەکی (فیداس) دەگەڕێنەوە، کە هیندۆسەکان پێیان وایە ئەم کتێبە پیرۆزە بۆ سەرەتای کات و ڕۆژگار دەگەڕێتەوە. لەم کتێبەدا ئەم دەقە هاتووە: "...لە سەرەتادا ئارەزووییەک هەبوو، کە تۆوی یەکەمی ئەقڵ بوو...". بەم شێوەیە حەز و ئارەزووی سێکسی لە ڕەچەڵەکی مرۆڤدا لە پایەی یەکەمدا دانرابوو، بەهۆی ئەم بیروباوەڕەوە ئەفسانە هندییەکان لە لایەک و داستانە شیعرییەکان لە لایەکی دیکەوە، پەیوەندیی جەستەییان نەمر کردووە و وەک کارێکی باشە، نەک خراپە تەماشایان

کردووه، هەموو ئەمانەش کاریگەریی گەورەی هەبووە بۆ سەر فۆرمەلەبوونی ڕوانگەی ئازادیخوازانە بەرامبەر بە سێکس، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سێکس هەر بە پراکتیزەکردنێکی تایبەتی دانراوە. هەرچەندە پەیوەندیی سێکسی بە سەرچاوەیەکی گرنگی چێژ دانراوە، بەڵام سەرچاوەیەکە تەنیا لە ڕوانگەی پیاوەوە، نەک ژن تەماشا کراوە، چونکە ژن وەک، بوونەوەرێکی شەهوانی و نێچیرێکی جوانی ڕاوچیی پیاو سەیرکراوە. بەم شێوەیە ژن وەک ئامرازێک بۆ تێرکردنی سۆزی پیاو و کێڵگەیەک بۆ تۆوەکانی تەماشا کراوە، بەڵام ئەم جۆرە ڕوانینە وای لە ژن نەکردووە لەپێناوی بەدیهاتنی ئەو دوو ئامانجەدا، هەڵوێستێکی نێگەتیڤی هەبێ، بەڵکو ڕۆڵی ژن ڕۆڵێکی پۆزەتیڤ بووە و لەگەڵ پیاودا گونجاوە و پەیوەندیی سێکسییش، دواجار سەرکەوتنێک بووە بۆ هەردووکیان.

سەرباری ئەوەی سێکس هۆکارێک بووە بۆ زاوزێ و سەرچاوەیەکیش بووە بۆ چێژ، لە ڕوانگەیەکی جادوویی و ڕۆحییشەوە تەماشا کراوە و هندۆسەکان سیمبولە سێکسییەکانیان بۆ گوزارشتکردن لە بیرۆکە فەلسەفییەکان بەکارهێناوە. بەرئەنجامی ئەم بایەخپێدانە بووەتە مایەی ڕوانین لە پەیوەندیی سێکسی وەک پەیوەندییەکی دەروونیی ڕۆحی، چونکە حاڵەتێک لە بەختەوەریی سادە و واقیعییەت بۆ ئەو دوو لایەنە فەراهەم دەکات کە لە پەیوەندییەکەدا بەشداری دەکەن، هەروەها لە هەمان کاتدا پەیوەندیی سێکسی دەبێتە هۆکار بۆ ئاشکراکردنی نهێنیی جیهانێکی شاراوە و نادیار، بۆ ئەو دوو هاوبەشەی کە پێکەوە سێکس دەکەن، بەڵام دەرککردن بەم نهێنییە تەنیا لەو کاتەدا دێتە دی کە تاک حاڵەتی سێکسی تێدەپەڕێنێ و بە سەروو ئاستی سۆز دەکات.

بەرئەنجامی ئەم ڕوانینە بۆ سێکس، بە شێوەیەکی ئاشکرا و دیار، بووە هۆی سەرهەڵدانی سۆفیگەریتی و داوێنپاکیی سێکسی لە ژیانی هیندۆسەکاندا، ئەمانە تەنیا بۆ پیاو بوون، چونکە پاکیزەیی لە ژندا وەک شتێکی ناچیز تەماشا دەکرا.

سەبارەت بەو پەیوەندییە سێکسییانەش کە بە لادان دادەنران لە شارستانییەتەکانی دیکەدا، لە لای هیندۆسەکان ڕێگەپێدراو بوو، بە لایەنی کەمەوە لێخۆشبوونیان هەبوو بەرامبەر بە هەموو شێوەکانی پەیوەندیی سێکسی، بە پەیوەندیی سێکسییشەوە لەڕێی دەمەوە، کە پێیان وا بووە ئەم شێوازە لە سێکس هێزێکی ئەفسووناویی هەیە، بەهۆی ئەم بیروباوەڕەشەوە لە ڕوانگەیەکی قبوڵکردن و لێخۆشبوونەوە لە لەیزبینزمیان ڕوانیوە (واتە پەیوەندیی سێکسیی نێوان مێ و مێ). هەرچی سێکسە لە دواوە، واتە لەڕێی کۆمەوە، ئەمیش لە شارستانییەتی هیندۆسیدا ڕێگەی پێ دراوە، چونکە هیندۆسەکان پێیان وا بووە کۆم ناوچەیەکە هێزێکی مەزنی تیادا کۆبووەتەوە و لە واقیعدا چەقی هێزی دەروونییە لە جەستەدا، لەبەر ئەوە وروروژاندنی کۆم لەڕێی یەکێک لە شێوازە سێکسییەکانەوە، ئیدی لەڕێی خستنەناوەوەی چووک بێ لە نێوان نێر و نێرێکدا، یان لە نێوان نێر و مێیەکدا، یان لەڕێی بەکارهێنانی هۆکاری دیکەوە بێ کە قەرەبووی پەیوەندیی ڕاستەوخۆی نێوان دوو هاوبەش بکات پێکەوە، هەموو ئەمانە هێزە دەروونی و شیعری و ڕۆحانییەکان چالاک دەکەن. بەم شێوەیە هۆمۆسێکسوالیتی لە کوڕاندا، یان ئەوەی پێی دەوترێت نێربازی، بە لادان دانەنراوە، هەرچەندە بەپێی یاسای (مانو) ئەو تاکەی نێربازی دەکات، ئیدی پێگەی چینایەتیی خۆی لەدەست دەدات، هەروەها لە هەمان یاساکانی (مانو)دا ئەوەش هاتووە هەر کەسێک زیادەڕۆیی لە پیاوەتییەکەیدا بکات، ئەوا توانای بەخشینی لەدەست دەدات و وا پێویست دەکات لەڕێی سوجدەبردنەوە

ئارەزوویەک پیرۆزە و هیچ گوناهێک ڕوو نادات ئەگەر تاک ملکەچی ببێ، بەو مەرجەی ئەقڵ ساف بێ.

دەرئەنجامی ئەم جەختکردنە لەسەر نێر، ئەو ڕوانگەیە پەیدابوو کە بە شێوەیەکی پۆزەتیڤ لەو پیاوانە بڕوانرێ کە سێکس ناکەن، بەڵام بۆ مێ بە پێچەوانەوە بوو، پاکیزەیی لە مێدا شتێکی خواستراو نەبوو، چونکە بڕوایان وا بوو کە ژن بوونەوەرێکی شەهوانییە و ناتوانێ پابەندی ڕێسا باڵاکانی یۆگا بێ.

### شارستانییەتی چینی

لێکچوونێکی زۆر هەیە لە نێوان هەڵوێستی هیندۆسە دێرینەکان لەگەڵ هەڵوێستی چینییە دێرینەکان بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان.

ئەو پرەنسیپەی کە شارستانییەتی چینی بڕوایان پێی بووە، ئەوە بووە کە سێکس هۆیەکە لەڕێیەوە تاک بە نەمری دەگات. لەبەر ئەوە هیچ هۆشداری، یان ڕێگرییەک نییە لە بەردەم هیچ شێوازێک لە پەیوەندیی سێکسی، مادام ئەو شێوازە نابێتە هۆی بەهەدەردانی ئەو وزەیەی ئامانجی نەمری بەدی دەهێنێ. لەبەر ئەوە لای چینییەکان سێکس بە گوناه دانەنراوە، بەڵکو وەک شتێک تەماشا کراوە، دەکرێ بیپەرستی، تەنانەت نێربازیش ڕەت نەکراوەتەوە، بەڵام ئەوە ڕەت کراوەتەوە کە پەیوەندیی سێکسی لە چوارچێوەی نێربازیدا سنووربەند بکرێ، چونکە ئەمە دەبێتە ڕێگر لە بەردەم پرۆسەی منداڵخستنەوەدا، ئەمەش دەبێتە مایەی ڕێگرتن لە دەرکەوتنی نەوەی نوێ کە درێژە بە ڕەچەڵەکی باوباپیران بدات.

**شارستانییەتی مەسیحی**

شارستانییەتی مەسیحی هەڵوێستی فرەجۆر و جیاوازی بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان هەبووە، ئەویش بەپێی ئەو ماوە و قۆناغە زەمەنییەی کە ئەم شارستانییەتە پیایدا تێپەڕیوە، هەروەها بەپێی پێگەی جوگرافیی ئەو شارستانییەتە، هەروەک لەو جیاوازییانەوە ئاشکرا دەبێ کە لە نێوان هەڵوێستی کڵێسەی خۆرئاواییدا هەبوون. بەهۆی فرەیی و بەرفراوانی و جیاوازیی ئەم هەڵوێستانە لە شارستانییەتی مەسیحیدا، ئەستەمە بە شێوەیەکی دیار کورتیان بکەینەوە، لێرەدا هەندێک لە ئەدگارە سەرەکییەکانی ئەم هەڵوێستانە لە شارستانییەتی مەسیحیدا دەخەینە ڕوو، کە سەرجەمیان لە یەک هەڵوێستی تیۆرییەوە پەیدابوون، کە ئەویش بریتییە لە ڕوانین بۆ سێکس لە ڕوانگەی گوناە و دوژمنایەتییەوە، ئەم هەڵوێستانە وەک چاوەڕوان دەکرێ، بەهۆی کاریگەریی چوارچێوەی شارستانی و کۆمەڵایەتی و ئایینییەوە، ڕووبەڕووی کۆمەڵێک گۆڕانکاری و ڕاستکردنەوە بووەتەوە، لێرەدا بە خاڵ دەیانخەینە ڕوو:

١- لە سەردەمە سەرەتاییەکانی ژیانی کڵێسەی خۆرهەڵات، پرەنسیپی وشکی و خۆپارێزی بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان زاڵ بوون، چونکە ئەم کڵێسەیە سێکسی بە مەترسی و گوناە دانابوو، هانی ڕەهبانەکانی دەدا لە بەرامبەر فریودانی سێکسیدا چاوکراوە و بەئاگا بن، چونکە کلیلی ژیانی چاکەخوازانە بریتییە لە خۆبەدوورگرتنی ڕەها لە سێکس، بەڵام ئەم هەڵوێستە دواتر گۆڕانی بەسەردا هات، کڵێسەی خۆرهەڵاتی ڕێگەی بە پیاوانی ئایینی دا هاوسەرێتی بکەن، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە کڵێسەی خۆرئاوایی بەردەوامبوو لەسەر ڕێگرتن لێی. سەبارەت بە ژیانی سێکسیی خەڵکی ئاسایی، هیچ هەڵوێستێکی ئاشکرا و ڕاگەیەنراو لە لایەن دامەزراوەکانی کڵێسەوە لەئارادا نییە. هەندێک بەڵگە

ئاماژە بەوە دەدەن کە زۆرێک لە شێوازەکانی پراکتیزەکردنی سێکسی لەنێو خەڵکی ئاساییدا بڵاوبووە، بە پەیوەندیی سێکسیی نێوان پیاوانیشەوە، بەڵام بە ئاشکرایی پەیوەندیی سێکسیی نێوان نێر و نێر بە مەسەلەیەکی مەترسیدار و تاوانێکی گەورە داندرا بوو، بەتایبەتی ئەگەر لە نێوان کوڕانی هەرزەکاردا ڕووی بدایە، سزاکەی مردن بوو، هەمان سزای ئەو کەسانە بوو کە زینایان دەکرد.

بەگشتی گرنگترین ڕوخسارەکانی سەردەمی بیزەنتینی لە شارستانییەتی مەسیحیدا بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان بریتی بوو لە جیاکردنەوەی توندی نێر و مێ لە یەکدی، ئەمەش هانی بڵاوبوونەوەی هۆمۆسێکسوالیتی و بڵاوبوونەوەی دیاردەی خەساندن و کۆیلە و کەنیزەکی دا لە کۆمەڵگەی بیزەنتیدا.

٢- کڵێسەی خۆرئاوایی لە سەردەمە سەرەتاییەکانی چاخی ناوەڕاستدا هەڵوێستێکی توند و خۆپارێزی گرتە بەر بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان، وەک گوناه مامەڵەی لەگەڵ هەموو پەیوەندییەکی سێکسی دەکرد، بەڵام بە گوناهێکی کەمتر ئەو پەیوەندییە سێکسییەی لە قەڵەم دەدا ئەگەر بۆ مەبەستی منداڵخستنەوە ئەنجام بدرایە. بەدەر لەمە، بە چاوپۆشین لە مەبەست و شێوازەکانی پەیوەندیی سێکسی و شێوازەکانی تێرکردنی سێکسی، هەموو شێواز و پراکتیزە سێکسییەکانی دیکە بە گوناه دادەنران. هەرچی ڕەهبان و ڕاهیبەکانە، حەرام بوو بە هەر شێوەیەک و لە هەر ئاستێکدا بێ، سێکس بکەن. لەگەڵ ئەم هەموو کۆتوبەندە توندانەدا، ئەستەم بوو ئەم یاسا و ڕێنماییانە بە شێوەیەکی سەرکەوتوو جێبەجێ بکرێن، بەتایبەتی لە بواری پەیوەندیی سێکسیی هۆمۆسێکسوالیتیدا.

٣- لە سەردەمەکانی دواتری چاخەکانی ناوەڕاستدا، هەڵوێستەکان بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان ئاڕاستەی

دژبەیەکیان گرتە بەر، لە لایەکەوە سێکس بە شتێکی خراپ و نێگەتیڤ داندرا کە وا پێویست دەکات ڕەت بکرێتەوە و بەئاگا بێت بەرامبەری، بەڵام لە لایەکی دیکەوە ئەو ئاڕاستانە پەیدا بوون کە هانی سێکس و پراکتیزەکردنی سێکسییان دەدا. ئەو هەڵوێستانەی کە لە ڕووی پرەنسیپەوە سێکسیان ڕەت دەکردەوە، هەموو لادانە سێکسییەکانیان وەک جۆرێک لە کوفر دانا کە وا پێویست دەکات ئەنجامدەرەکەی بەپێی ئەو لادانەی نواندوویەتی، سزا بدرێ.

٤- هەر لە سەدەی پانزەهەمەوە، گۆڕانێک لە فیکری مەسیحییەتدا ڕووی دا بە ئاڕاستەیەکدا کە تا ڕادەیەک دووربوو لە بیروباوەڕی کلاسیکیی مەسیحییەتەوە کە پێی وا بوو خۆبەدوورگرتن لە سێکس ڕێگەیەکە بۆ ڕەزامەندیی خوا. مارتن لۆسەر پێشەنگی ئەم ئاڕاستە چاکسازییەی کرد، کە پێی وا بوو سێکس گوناهێکی گەورەتر نییە لە گوناهی هەندێ کار و کردەوەی دیکە. بیروباوەڕی لۆسەر بەو شێوەیە بوو کە لە هاوسەرێتیدا پێداویستییەکە لە سروشتی سەرەکی مرۆڤدا، هەروەها حاڵەتێکی ڕاستگۆیانە و ئاسمانی و ڕۆحییە. لۆسەر مانای دیکەی بە ژن بەخشی لە پەیوەندیی هاوسەرێتیدا، غەیری منداڵخستنەوە و چێژ. لۆسەر لەم بارەیەوە دەڵێ: "وێنای بکە ئەم ژیانە بەبێ سێکس چیی بەسەردا دێ، ماڵ و شار و ژیانی ئابووری و حکومەت، سەرجەمیان ون دەبن. پیاوان ناتوانن بەبێ ژنان بژین، تەنانەت ئەگەر پیاوان بتوانن دووگیانیش ببن و منداڵیشیان ببێ، لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانن دەستبەرداری ژنان ببن...". لۆسەر بەرامبەر بە پەیوەندیی سێکسی لە دەرەوەی هاوسەرێتی ناڕەزایی دەربڕیوە و هەروەها لەشفرۆشی و زینای ڕەتکردووەتەوە، بەڵام ڕوانگەیەکی هێورتری بەرامبەر بە فرەژنی هەبوو، هەرچەندە بە لایەوە باشتر بوو، ئەگەر وا پێویستی کرد، پیاو دۆستێکی هەبێ، باشترە لەوەی ژنێکی دیکە بهێنێ.

سەبارەت بە زینا، ڕەتی کردووەتەوە، پێی وا بووە پێویستە هەموو هەوڵێک بۆ ڕزگارکردنی هاوسەرێتی بدرێ، تەنیا لەو حاڵەتانەدا نەبێ کە زیناکە ئابڕووبەرانەیە و دووبارەبووەوەیە. مەسەلەی نێربازی لای لۆسەر جێگەی بایەخێکی تایبەت بوو، پەیوەندیی سێکسیی نێوان نێر و نێر بە لادان و دەرچوون لە یاسای سروشت داناوە، ئەو یاسایەی کە سێکسی خستووەتە خزمەتی مرۆڤەوە.

لە پاش لۆسەر، کلڤن هات و ئەویش کۆمەڵێک ئیجتیهادی بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان دەرکرد، پەیوەندیی سێکسیی بە گوناه دانەنا، بەڵکو وەک مەسەلەیەکی ئابڕومەندانە و پیرۆز لێی ڕوانی، چونکە لە دامەزراوەیەکی خۆیانەدا بەڕێوە دەچێ، بەڵام لەوەش دەترسا کە ڕەگەزی چێژ لە سێکسدا، دەشێ یەکێک لە فاکتەرەکانی خراپی و هۆکاری تێکدانی سروشتی مرۆیی لەخۆ بگرێ.

بەڵام چێژی بە گوناه دانەناوە ئەگەر مرۆڤ لە چوارچێوەی ئامانجی منداڵبوون و دامەزراندنی کۆمەڵگەدا هەوڵی بۆ بدات. بەم شێوەیە کلڤن هەروەک لۆسەر کۆمەڵێک ئامانجی پۆزەتیڤ و کۆمەڵایەتیی بە سێکس بەخشی و ئەوەشی بۆ زیاد کرد کە پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکان لە مەسەلەی سێکسدا لە ئامانجەکانی منداڵخستنەوە گرنگترن، بانگەشەی بۆ ئەوە کرد کە هاوسەران بە ئازادی پێکەوە چێژ ببینن، بەو مەرجەی پابەند بن بە هاوسەنگی و ئابڕووی یەکدییەوە و کردەوەکانیان لەگەڵ پێگەی کۆمەڵایەتییاندا بگونجێ.

هەروەها کلڤن گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە ژن هاوڕێ و هاوژیانی پیاوە و بە ڕای ئەو خودا ژنی بۆ ئەوە نەخوڵقاندووە کە تەنیا هاوبەشیی پیاو بکات لە کرداری منداڵخستنەوەدا، یان لە

تێرکردنی پێداویستییە سێکسییەکاندا کە بووە هۆی تێکدانی سروشتی مرۆیی لە کاتی دەرکردنی ئادەم و حەوا لە بەهەشت، بەڵکو ژن هاوڕێ و هاودەمی پیاوە کە لە ژیان و لەسەر جێگە وەک یەک لێی جیا نەبێتەوە. یەکێک لەو لادانە سێکسییانەی کە مەسیحییەت بە توندی ئیدانەی کردووە و بە دەرچوون لە یاسای سروشت دایناوە، پەیوەندیی سێکسییە لەگەڵ ئاژەڵدا، هەروەها پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتییە بە هەردوو جۆرەکەیەوە، لە نێوان نێر و نێردا، واتە نێربازی و لە نێوان مێ و مێدا، واتە لەیزبینیزم. ئەنجامدەرانی ئەم لادانانە سزاکەیان مردن بوو، بەپێی دەقی یاسا ئایینی و مەدەنییەکان کە بەدەگمەن بە شێوەیەکی ورد جێبەجێ دەکران.

### شارستانییەتی عەرەبی و ئیسلامی

ڕەگوڕیشەی شارستانییەتی عەرەبی بۆ ژیانی عەرەبی جەهلی بەر لە ئیسلام دەگەڕێتەوە، لەبەر ئەوە لە کاتی توێژینەوە و گەڕان دەربارەی ژیانی سێکسی لە شارستانییەتی ئیسلامیدا، بە ئەدگارەکانی ئەم ژیانە لای عەرەبی سەردەمی جاهلییەت ئاشنا دەبین. ئەم جۆرە وردبوونەوە و بەدواداچوونە لە کاتی ئەنجامی توێژینەوە دەربارەی هەڵوێستە سێکسییەکان لە شارستانییەتی ئیسلامیشدا هەر پێویستە، چونکە ئایینی ئیسلام یەکەمین جار بنەما جیاوازەکانی بۆ عەرەبی جاهلی دابەزاند، کە کۆمەڵگەیەک بوو بەدەرنەبوو لە دابونەریت و پراکتیزە و هەڵوێستی جیاواز بەرامبەر بە سێکس.

ئەو توێژەرەی کە بە شێوەیەکی بابەتییانە کار دەکات، بۆی دەردەکەوێ کە ئایینی ئیسلام زۆرێک لەو نەریتە سێکسییانەی هێشووەتەوە کە لە کۆمەڵگەی جاهلیدا هەبوون، بەڵام لەڕێی ڕێسا ئاینییەکان، ژیانی سێکسیی کۆتوبەند کردووە، هەروەها هەندێ لەم هەڵوێستانەی گۆڕیوە و ئیدانەی هەندێکیانی کردووە و دەستکاریی لە هەندێکیشیاندا ئەنجام داوە. هەموو ئەمانەی لە کۆمەڵێک ڕێسای ڕەفتاری و کۆمەڵایەتیدا کۆکردووەتەوە کە بە شێوەیەکی ئاشکرا و بێ هیچ تێکەڵییەک، پەیوەندییە سێکسییەکان ڕێک دەخەن.

## عەرەبی جاهلی و سێکس

سەرچاوەکانی توێژینەوە دەربارەی عەرەبی جاهلی زۆرن، زۆربەیان پشت بەو گێڕانەوە و دەقە شیعری و پەخشانانە دەبەستن کە بەدوای یەکدا باسی ئەو سەردەمە دەکەن، زۆربەی ئەم دەقانەش هیچ پشتیوانییەکیان نییە کە پشتڕاستیان بکاتەوە، هەندێک لە توێژەران پێیان وایە زۆربەی ئەم دەقانە تەنیا دروستکراوی خەیاڵی ئەو خەڵکانەن کە لەدوای سەردەمی جاهلی و سەرەتای سەردەمی ئیسلامدا ژیاون، بەڵام ئەو زانیارییانە هەن کە بوونی کۆمەڵێک پراکتیزە و هەڵوێستی جیاواز دەسەلمێنن بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان لە کۆمەڵگەکانی جاهلیدا، هەرچەندە ئەستەمە ئاستی بڵاوبوونەوەی ئەم پراکتیزە سێکسییانە و مەودای قبوولکردن یان ڕەتکردنەوەی لە لایەن ئەم کۆمەڵگەیانەوە، دیاری بکرێ.

ئەو توێژەرەی کار لەسەر پاشماوە ئەدەبییەکان دەکات لە شیعر و پەخشان و چیرۆکی تایبەت بە شارستانییەتی عەرەبی جاهلی، بە ئاشکرا تێبینیی ئەوە دەکات کە عەرەبی جاهلی لە دوو

بواری سەرەکیی چالاکیدا خۆیان سەرقاڵ کردووە. یەکەمیان، بواری توندوتیژی. دووەمیان، بواری سێکس. هەریەکەیان خاوەنی زمان و ئامڕازی خۆیان بوون، کە هیچیان لە زمان و ئامڕازی هیچیان کەمتر نەبوون لەسەر زاری شاعیر و گێڕەرەوەکان، تا ئەو ئاستەی گوزارشت و ماناکانی یەکێک لەم دوو بوارە بەسەر بوارەکەی دیکەدا زاڵ دەبوو، یان بەشێک لەم گوزارشت و مانایانە بۆ گوزارشتکردن لە هەردووکیان بەکار دەهات. لەوانەیە کارێکی ئەستەم نەبێ لێکدانەوە بۆ ئەم دیاردەیە بکرێ و هۆکاری سەرقاڵبوون بەتایبەتی بەم دوو بوارەوە بزانرێ. بەشێک لە هۆکارەکان بۆ بناغەی بایۆلۆژیی هەریەکە لەم دوو سۆزە (واتە توندوتیژی و سێکس) دەگەڕێتەوە، چونکە هەردووکیان کۆمەڵێک ناوەندە دەماری لە تەنیشت یەکدا و بەیەکداچوو لە دەماخدا، کۆنترۆڵیان دەکات، کە وروژاندنی ناوەندێکیان لەوانەیە ببێتە هۆی وروژاندنی ناوەندەکەی دیکەیان و لە نێوان خۆیاندا ڕۆڵەکان بگۆڕنەوە.

هەروەها بەشێکی دیکەی هۆکاری ئەم بایەخدانە تایبەتییە بە توندوتیژی و سێکس، بۆ سروشتی ژیانی عەرەبی جاهلی دەگەڕێتەوە، کە سروشتێکی بیابانشینییان هەیە و سروشتی ژیانیش لە بیاباندا وای کردووە بواری سەرقاڵبوون بە کاروباری ژیانەوە سنووردار بێ و تاک هێندە بواری فرەجۆری لە بەردەمدا نەبێ تا وزە زیندەگییەکانی لەناویاندا بەتاڵ بکاتەوە. بەهۆی ئەم سنووردارییە لە ژیانی عەرەبی بیاباندا، تاک تەنیا چەند بوارێکی بۆ ماوەتەوە تا وزە و چالاکییەکانی پراکتیزە بکات. سێکس و توندوتیژی لە هەموو بوارەکانی دیکە زیاتر لە بەردەم تاکدا کراوە و ئاسانتر بوون، لەبەر ئەوە دەبینین وزە و بایەخپێدانەکانی تا ئاستی سەرشێتییەکی ناچارانە بۆ ئەم دوو بوارە تەرخان کردووە. لەوانەیە هۆکاری یارمەتیدەر بۆ پێویستیی ئەم خۆ

تەرخانکردنە بۆ چۆڵیی بیابان و بەرفراوانیی ڕووبەرەکەی و درێژیی کات و نەبوونی هیچ گۆڕانکارییەک لەو ناوچەیەدا، بگەڕێتەوە، کە ئەم بارودۆخ و شێوەی ژیانە لەوانەیە ئەو کەسانە تووشی شەکەتی و ماندووبوون بکات، کە تیایدا دەژین. لەبەر ئەوە پیاوی بیابانشین لە ژن و جەستەی ژندا، لەگەڵ غەزا و ئامرازەکانیدا ئەو ئامانجانەی دۆزیوەتەوە کە جووڵە بە ژیانی ببەخشن، چونکە ئەگەر وا نەکات، ئەوا لەنێو گردی لمین و بێزاریدا بە هیلاک دەچێ.

لە هەوڵداندا بۆ تێگەیشتن لە شێوازەکانی پراکتیزەکردنی سێکس لای عەرەبی جاهلی و هەڵوێستیان بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان، پێویستە ئەو گریمانەیە بکەین کە ئەم خەڵکانە دەرئەنجامی پێویستییەکانی ژیان و ئەو بارودۆخە ژینگەییەی تیایدا ژیاون، بەم شێواز و هەڵوێستانە گەیشتوون، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە شێوازی پراکتیزەکردنی سێکس و هەڵوێستی ئەو شارستانییەتانە کاری تێنەکردوون کە لەڕێی غەزا یان بازرگانی یان خواپەرستییەوە پەیوەندییان لەگەڵیاندا هەبووە. هەرچەندە شتێکی لۆژیکییە کاریگەریی سروشتی ژیان بەسەر کاریگەریی پەیوەندیکردن لەگەڵ شارستانییەتەکانی دیکەدا زاڵ بێت.

گرنگترین ئەو خەسڵەتانەی کە عەرەبی جاهلی پێ جیا دەکرێتەوە ئەوەیە، لە ڕوانگەیەکی ئازاد و کراوەوە لە ژن و پەیوەندییان لەگەڵ ژندا، ڕوانیوە. لەبەر ئەوە لە وەسفکردنیدا و لە گوزارشتکردن لە پێویستییان پێی و چێژی گەیشتن پێی، قووڵ بوونەتەوە، لە ئاشکرا دەربڕینی ئەم پێویستییە، یان چێژبینین لە ژن، هیچ شەرمیان نەکردووە و هەستیان بە شەرمندەیی و شاردنەوەی ئەم دەربڕینەیان نەکردووە، ئەم هەڵوێستە تەنیا بۆ پیاو سنووردار نەکراوە، بەڵکو ژنیش بوارێکی بەرفراوان بۆ

گوزارشتکردن لە حەز و هیوا و مەیل و ئارەزووەکانی بۆ پیاو، لە بەردەمدا والآ بووە. زۆری دەق و نووسراوەکان دەربارەی ئەم بابەتە پشتیوانی لەم دەرئەنجامە دەکەن کە ژن و پیاو وەک یەک بەرامبەر ئەو مەسەلە سێکسییانە ئازادبوون کە لە کۆمەڵگە جاهلییەکاندا باو بوون. ئەو نموونانەی کە بەڵگەن لەسەر ئەم ئازادییە، وەک دیاردەی فرەژنی بە شێوەیەکی بێشومار و بڵاوبوونەوەی زینا و لەشفرۆشی، هەروەها بڵاوبوونەوەی ئەو پراکتیزە سێکسییانەی کە لە دابونەریت و شارستانییەت و ئایینەکانی دیکەدا بە حەرام و تابۆ دانراون، وەک هاوسەرێتیی نێوان باوک و کچ، شووکردنی دوو خوشک یان جووتبوونی دوو خوشک لەگەڵ یەک پیاودا، جووتبوون لەگەڵ باوەژندا، یەکێکی دیکە لەو شێوازە سەیرانەی سێکسکردن لە سەردەمی جاهلیدا ئەوە بوو، پیاو رێگەی بە ژنەکەی دەدا لەگەڵ پیاوێکی دیکەدا جووت بێ کە بەهێز و ئازا و بوێر بووە، تا کوڕێک بخاتەوە خاوەنی ئەم سیفەتانە بێت، هەروەها دیاردەی گۆڕینەوەی ژنیش لەنێو پیاواندا کە بە جووتبوونی لەجیاتی ناسرابوو، باو بوو، هەروەها لادانەکانی دیکەش، وەک نێربازی و لەیزبینیزم و نێرەمووکبازی و ئاژەڵبازیش لەو سەردەمەدا رێگە پێ درابوو.

### ئیسلام و سێکس

یەکەمین جار ئایینی ئیسلام بۆ عەرەبی جاهلی دابەزی لە کۆمەڵگە شارستانی و بیابانشینەکاندا، کە باکگراوندێکیان لە ئازادی و کرانەوە و سەرقاڵبوون بە مەسەلە سێکسییەکانەوە هەبوو. ئایینی ئیسلام سەرەتا لە قورئاندا و دواتر لە فەرموودەکاندا هەڵوێستێکی پۆزەتیڤی بەرامبەر بە سێکس گرتە بەر. ئیسلام سێکسی ڕەت نەکردەوە، وەک ئەوەی هەندێک لە شارستانی و ئایینەکانی دیکە ڕەتیان کردەوە، هەروەها رێگریشی

لێ نەکرد. بە پێچەوانەوە زۆرێک لە پێگەی سێکسی بەو شێوەیە هێشتەوە کە لە سەردەمی جاهلیدا باوبوون، لە سەروو ئەمەشەوە چەمکێکی کۆمەڵایەتی و مرۆیی و دەروونیی نوێی پێ بەخشی. قورئانی پیرۆز لە چەندەها ئایەت و سورەتدا باسی سێکس و هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر بە سێکس دەکات، ئەم جەختکردنە نیشانەی گرنگیی سێکسە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا. قورئان بە ئاشکرا باسی بایەخی ژیانی سێکسی لە ژیاندا و زۆربوون و چێژ و جووتبوون و هۆگربوون دەکات. ئەم سەراپاگیرییە بە تەواوەتی لەگەڵ چەمکە زانستی و نموونەییەکان دەربارەی پێگەی سێکس لە ژیاندا، کۆکە. هەرچەندە قورئان هۆگری و حەزی عەرەبی بۆ سێکس هێشتەوە، بەڵام ئەم خۆشەویستی و هۆگربوونەی و لەڕێی کۆمەڵێک یاسا و ڕێسای دیاریکراوەوە ڕێکخست، پیرۆزی و تایبەتمەندێتیی بە سێکس بەخشی، لە بواری زیادەڕۆیی و لادان دووری خستەوە، سنووری بۆ زیادەڕۆییکردن لە پراکتیزەکردنی سێکس دانا و نەیهێشت لە سنووری ماقووڵ بڕواتە دەرەوە، هەروەها بۆ سێکسکردن لەگەڵ مەحرەمدا توندترین سزای دانا. لەوانەیە ئەستەم بێت لەم توێژینەوە کورتەدا باسی هەموو ئەو شتانە بکەین کە لە قورئاندا دەربارەی سێکس ئاماژەیان پێ دراوە. خالق لە سێکسدا چێژی بەدی کردووە، کاتێک دەفەرموێ: (فما أستمتعتم به منهن فاتوهن اجورهن فريضة)، هەروەها دەفەرموێ: (و أنكحوا ما طاب لكم...)، هەروەها دەفەرموێ: (وأن يخفف عنكم) هەروەها لە قورئاندا هاتووە کە پەنگخواردنەوەی وزەی سێکسی، ئازاربەخشە، لەبەر ئەوە بۆ دەرچوونی ئەم وزەیە ڕێگەی بە جووتبوون داوە چەند موسوڵمان لە توانایدا بێ (من لم يستيع منكم طولا أن ينكح المحصنات المؤمنات فمن ما ملكت إيمانكم)، هەروەها سەبارەت بە کاریگەریی هێورکەرەوەی سێکس بۆ دەروون، دەفەرموێ: (يريد الله أن يخفف عنكم). قورئان

هاوسەرێتیی بە گرنگترین پەیوەندیی سێکسیی شیاو دادەنێ، ئەم پەیوەندییەی بە هۆگربوون تایبەتمەند کردووە، دەفەرموێ: (و جعلنا لکم من أنفسکم لتأنسوا...)، هەروەها دەفەرموێ: (هو الذی خلقکم من نفس واحدة و خلق منها زوجها لیسکن إلیها)،[٥] هەروەها بە توندی پەیوەندیی سێکسی لە دەرەوەی هاوسەرێتی لە شێوەی زینادا کە دەستدرێژی دەکاتە، سەر مافەکانی هاوسەرێتی، ڕەت دەکاتەوە. بەڵام قورئان سەلماندنی ڕوودانی زینای وا لێ کردووە نزیک بێ لە ئەستەمەوە، هەروەک چۆن ڕێگە بە فرەژنی دەدا بەو مەرجەی پیاو یەکسانی بکات لە نێوانیاندا. قورئان حەرامکراوە سێکسییەکانی لە یەک ئایەت لە سورەتی ژندا کۆکردووەتەوە.

قورئان بە وردی و بە شێوەیەکی بەرفراوان باسی لادانە سێکسییەکانی نەکردووە، بەڵام ئەوەی ئاماژەی پێ داوە، پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتییە لە نێردا، واتە نێربازی.

هەرچەندە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ نێربازیی ڕەت نەکردووەتەوە، بەڵام لەو سزایەوە کە بە سەر قەومی (لووت)دا سەپاندوویەتی، ئەو دەرئەنجامە ڕوون و ئاشکرایە کە پەیوەندیی نێربازی لە ئیسلامدا ڕەت کراوەیە، بە هەمان شێوە هۆمۆسێکسوالیتیش لە مێدا، واتە لەیزبینیزم. قورئان باسی منداڵبازی، یان سێکسکردن لەگەڵ کوڕی منداڵی لە بەهەشتدا کردووە، دەشێ وا لێکدانەوە بۆ ئەم ئایەتە بکرێ، بانگەشەیەک بێ بۆ وازهێنان لە سێکسکردن لەگەڵ کوڕی منداڵ لەم دنیا. هەرچەندە قورئان هەڵوێستێکی ئاشکرای دەربارەی پەیوەندیی سێکسیی نێوان ژن و پیاو دەرنەبڕیوە، بەڵام ڕێگەی بە پیاو داوە لە کوێ ویستی زەوییەکەی بکێڵێ[٦].



قورئانی پیرۆز هەموو شتێکی باس نەکردووە و هەڵوێستی بەرامبەر هەموو حاڵەتێک لە حاڵەتەکانی پراکتیزەکردنی سێکسی دەرنەبڕیوە، بەڵام ئەوەی لە قورئانی پیرۆزدا بە دەق، یان بە وردی باس نەکراوە، لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا باسکراوە. هیچ بوارێک نەماوەتەوە کە لەناو فەرمودەکانی پێغەمبەردا ئاماژەی پێ نەدرابێت، بەڵام ئەوانەی کە هیچ گومان نییە لەوەی ڕاستەوخۆ لەسەر زاری پێغەمبەرەوە بیستراون و تۆمارکراون، ژمارەیان کەمە، هەروەها ئەستەمە بە تەواوەتی پشت بە ڕەسەنێتیی هەزارەها فەرموودەی دیکە ببەسترێ کە هەموویان هەر فەرموودەی پێغەمبەرن. بە سروشتی حاڵ ئیجتیهاد و لێکدانەوەی جیاوازیش هەن کە لەسەر زاری زۆرێک لە ڕاڤەکاران و لێکدەرەوان و زانا و عەلامەکان دەگێڕێنەوە، کە هەر دەبێ وەک بەشێک لە بیروباوەڕی ئیسلامی و فاکتەرێکی کاریگەر بۆ سەر دروستبوونی شارستانییەتی ئیسلامی دابنرێن. هەر کەسێک بە وردی لەم سەرچاوانە بڕوانێ، هەر لە قورئانی پیرۆزەوە تا دەگاتە فەرمووده و ئیجتیهاد و فەتواکان، بۆی دەردەکەوێ، ئیسلام دوور لە خۆپارێزی و خۆبەستنەوە بە تەنیا بیروباوەڕێکەوە، لە سێکسی ڕوانیوە و هانی سێکسی داوە لە ژیاندا، بەڵام لە هەمان کاتدا بە شێوەیەک دیاری و سنوورداری کردووە کە لەگەڵ پێویستییەکانی کۆمەڵگە و مۆراڵدا بگونجێ.

***

ژیانی سێکسی لە شارستانییەتی ئیسلامیدا، لەڕێی بنەماکانی ئیسلامەوە لە هەموو قۆناغەکانی ئەم شارستانییەتەدا ڕەنگی نەداوەتەوە، عەرەب لە پراکتیزەکردنی ژیانی سێکسییاندا، لەدوای سەدەی یەکەمی کۆچی بە شێوەیەکی ئابڕووبەرانە لە یاسا و ڕێساکانی ئیسلام دەرچوون. هەندێک لە خەلیفەکانیان نموونە بوون بۆ خەڵکە ئاساییەکە بەگشتی و خەڵکی لاسایی دەکردنەوە و

له زیادەڕۆیی و لادانە سێکسییەکانیاندا کە لە سەردەمی ئەمەوییەکانەوە دەستی پێ کرد و لە سەردەمی عەباسییەکاندا زیاتر پەرەی سەند و توندوتیژ بوو، زیاتر لە سنووری باو دەرچوو. ئەو کەسەی بەدواداچوون بۆ ئەم بابەتە دەکات، ئەوەندە بەڵگەی ڕۆچوون و لادانی لە بارەی سێکسەوە دەست دەکەون کە تووشی سەرسامی دەبێ. کەسی توێژەر لەوانەیە بە لایەوە ئەستەم بێ سازان بکات لە نێوان ئەو ژیانە بێبەهایەی ئەو کاتە و ئەدگارەکانی ئەو شارستانییەتانەی ئەو سەردەمانەی پێ ناسراون.
لە لێکدانەوەی هۆکاری ئەم دیاردەیەدا، توێژەر هەر دەبێ بەشوێن کۆمەڵێک فاکتەردا بگەڕێ، کە هەندێکیان زیادەڕۆیی زۆر دەکەن لە گێڕانەوەی ئەو بەرەڵاییە سێکسییەی ئەو کاتە و هەندێکیشیان زیادەڕۆیی دەکەن لە هەڵسەنگاندنی شارستانییەتی ئەو سەردەمە مێژووییانە، هەروەها ئەگەری سێیەمیش هەیە کە بریتییە لە ئازادیی سێکسی، کە فاکتەرێکی کارا بووە بۆ دەرچوونی ئەو وزە داهێنەرانەی ئەم سەردەمانەی پێ ناسراوە و بەر لەوەی کاریگەریی ئەم ئازادییە بگاتە ئاستی دەرچوون لە سنووری باو و ئەوەی کە باس دەکرێ، کە بەهۆی کاریگەریی سێکسەوە ئەو شارستانییەتانە وێران بوون، هەروەک ئەوەی لە ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی و ئیمپراتۆرییەتی یۆنانی و شارستانییەتەکانی دیکە ڕوویان دا، دواجار ئەگەری بوونی لێبووردەیی سێکسی هەیە، شانبەشانی ئەنگیزەکانی خۆپاریزی و پابەندبوون بە بنەما دروستەکانی ئیسلامەوە لەژێر سایەی یەک شارستانییەتی فرەلایەندا. بە ڕای ئێمە دەکرێ تەواوی ئەم لێکدانەوانە بە هەند وەربگیرێن. هەرچەندە بەشێک لەو شتانەی کە دەربارەی لەبەریەکهەڵوەشانی بنەماکانی ئیسلام دەربارەی سێکس و ڕۆچوونی عەرەب لەناو ژیانی سێکسی لە سەردەمە پرشنگدارەکانی شارستانییەتی عەرەبی و ئیسلامی ڕاستن و

لەگەڵ واقیعدا هاوجێن، بەڵام هەندێجار ئەوەی دەربارەی سێکس لە ئیسلامدا باس کراوە، کاریگەریی خراپی هەبووە بۆ سەر ناوبانگی شارستانییەتی ئیسلامی، دوژمنەکانی ئیسلام و عەرەب وەک بەڵگە و چەکێک بەکاریانهێناون بۆ لێدان لە بیروباوەڕی ئایینی ئیسلام.

وردبوونەوە لە دەقە ئاینییەکانی ئیسلام، هەر لە قورئانەوە تا دەگاتە فەرموودەکان، سەبارەت بە بابەتی ژیانی سێکسی، ئەوە ئاشکرا دەکەن کە ئەم دەقانە چەندە هەڵگری ئامانج و حیکمەت بوون، کە لە هیچ ئایین یان بیروباوەڕێکی دیکەدا بوونیان نییە. ئەم دەقانە پێگە و مانایان بە سێکس بەخشی لە ژیاندا، پێداویستییە گەورەکانی سێکس لە پێداویستیی بایۆلۆژی و کۆمەڵایەتی و دەروونییەکان بە هەند وەرگیراون. ئەم پێداویستییانە هەمان ئەو پێداویستییانەن کە ئایینی مرۆڤایەتیش داوای بەدیهێنانیانی کردووە لە سنووری ماقووڵ و مۆراڵی و مرۆییدا.

## شارستانییەتی مەسیحی و سێکس

شارستانییەتی مەسیحی هەر لە سەرەتاکەیەوە بۆ نزیکەی دوو هەزار ساڵ درێژەی کێشا. لەبەر ئەوە ئەستەمە پشت بە تەنیا یەک ماوەی زەمەنی ببەسترێ لەم مێژووە دوورودرێژەدا و وەک نموونە وەربگیرێ، بەسەر هەموو ئەو کۆمەڵگەیانەدا هاوجێ بکرێ کە کەوتوونەتە ژێر سایەی شارستانییەتی مەسیحییەوە. بەگشتی هەڵوێستی ئەم شارستانییەتە، بەتایبەتی لە سەرەتاکەیدا، دەکرێ بە درێژکراوەی هەڵوێستە تەوراتییەکان دابنرێ، یان دروستترە بڵێین، هەڵوێستی مەسیحی بەرامبەر بە سێکس درێژکراوەی هەڵوێستی ئەو داوێنپاکییە بوو کە خواناس و سەرڕاستەکانی هەردوو سەدەی بەر لە دەرکەوتنی مەسیحی پێ

ناسرابوو. لە سەرەتای مەسیحییەتدا تەنیا یەک پێوەر بۆ ژیانی سێکسی زاڵ بوو، لەجیاتی ئەو پێوەرە دوانییەی، یان جووتپێوەرەی کە شارستانییەتی تەوراتی پێ ناسرابوو، ئەم پێوەرە کاری بە پرەنسیپی ڕەتکردنەوەی چێژە جەستەییەکان دەکرد و ئەم چێژانەی بە گوڕان و لادان لە مەسەلە ڕۆحییەکان دادەنا، ئایین بانگەشەی داوێنپاکی و ڕێگریی دەکرد لە سێکس بۆ هەردوو توخمەکە، بە چاوی شکۆوە لەم قەدەغەکردنەی لە سێکس دەڕوانی و بە نموونەی باڵای دادەنا، هەروەها وەک شتێکی خراپ و سووک لە پەیوەندیی سێکسیی دەڕوانی، تەنانەت هاوسەرێتی و منداڵخستنەوەی وەک شتێکی خواستراو تەماشا نەدەکرد و پێی وا بوو کە بەڵگەن لەسەر سەرقاڵبوونی مرۆڤ بە پێداویستییە دنیاییەکانەوە. قەدیس پۆلس، دامەزرێنەری کڵێسەی مەسیحی کە کەسێکی خواناس بوو، هەروەها لە هاوسەرێتی خۆی بێبەری کردبوو، بانگەشەی بۆ پابەندبوون دەکرد بەو بەرنامەیەوە کە بۆ خۆی دانابوو، دەیوت: "...بەو کەسانە کە هاوسەرێتییان نەکردووە و ئەوانەش کە ژنیان نییە، یان بێوەژنن، دەڵێم، باشترە بە ڕەبەنی بمێننەوە وەک من، بەڵام ئەگەر نەیانتوانی کۆنترۆڵی خۆیان بکەن، ئەوا هاوسەرێتی بکەن، ئەمە باشترە لەوەی کە بە ئاگری حەز و ئارەزوو بسووتێن". ئەم پرەنسیپە هەر مایەوە و لە سەدەکانی دواتردا بەهێزتر بوو. بە هاتنی سەدەی هەشتەم بیروباوەڕ یان بنەماکانی کڵێسە دەرکەوتن کە لە سێ هەڵوێستی یەکلاییکەرەوە و سنووردار بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان کۆبوونەوە. یەکەمیان، وا پێویست دەکات کە خواناسی و تەرککردنی دنیا ڕەفتاری نموونەیی بن، ئەمانە فەرزن لەسەر ڕاهیبەکان، هەموو پاکیزەکانیش بووکی مەسیحن، کچی پاکیزە گوناە دەکات کاتی هاوسەرێتی دەکات، بەڵام کاتێک پاکیزەکان شوو دەکەن، پێویستە چەندە دەتوانن لە هاوسەرێتیشدا هەر بە

پاکی بمێننەوە. هەرچی پرەنسیپی دووەمە، هەموو پەیوەندییەکی سێکسی، ئیدی هەر جۆرێ بێ، ئەوا بە گوناه و حەرام دادەنرێ، تەنیا ئەوانە نەبێ کە بۆ مەبەستی پیتاندن و منداڵخستنەوە ئەنجام دەدرێن، بە جێبەجێکردنی ئەم پرەنسیپە، هەموو پەیوەندییەکی سێکسی بە گوناه دادەنرا، ئەگەر لەپێناوی چێژ یان مەبەستێکی دیکەدا، غەیری منداڵخستنەوە ئەنجام بدرایە، هەروەها هەموو پەیوەندییەکی دیکەش لە دەرەوەی چوارچێوەی هاوسەرێتی بە گوناهێکی هاوشێوە لە قەڵەم درابوو، تەنانەت بە گوناه دانرابوو ئەگەر کەسێک لە خەونیدا چێژی سێکسی ببینێ، یان ئەوەی کە پێی دەوترێ ئیستحلام. لەم بارەدا دەبوو هەندێک برگەی ئینجیل بڵێتەوە و داوای لێخۆشبوون لە گوناهەکەی بکات، هەروەها ماستەربەیشن هەر ڕەت کرایەوە. قەدیس توما ئەقوینی، لە سەدەی سیانزەی زایندا بە گوناهێکی گەورەتر لە زینا داینا. پرەنسیپی سێیەمیش کە کڵێسە پشتی پێ بەست، بریتی بوو لە دیاریکردنی ئەو ڕۆژانەی کە شیاون یان ڕێگەپێدراون ژنومێرد سێکسی تیادا بکەن، ڕۆژانی یەکشەممە و چوارشەممە و هەیینی حەرام بوو ژن و پیاو جووت ببن، هەروەها حەرام بوو ٤٠ ڕۆژ بەر لە جەژنی قیامەت و بەر لە جەژنی لەدایکبوون سێکس بکەن، هەروەها سێ ڕۆژ پێش سووڕی مانگانە و لە کاتی دووگیانیشدا و چوار ڕۆژی یەکەمی دوای منداڵبوونیش، لەگەڵ ماوەکانی تۆبەکاری، نابێ لە سەرجەم ئەم کاتانەدا ژنومێرد سێکس بکەن. ئەم ڕێسایانە بە پلەی جیاواز تا سەدەکانی ناوەڕاستیش جێبەجێ دەکران، بەڵام دەرچوون و لادانی زۆر لەم ڕێسایانە تێبینی کران، لەگەڵ بوونی ئەو فاکتەرە سەرنجڕاکێشانەدا، کە بە شێوەیەک لە شێوەکان هانی ژن و پیاویان دەدا بۆ دەرچوون و لادان لەم ڕێسایانە، بەڵام هەستکردن بە گوناه لە کۆمەڵگە مەسیحییەکاندا

ڕەگی داکوتا، تەنانەت لە بەرتەسکترین سنوورەکانیدا کە بریتی بوو لە هاوسەرێتی.

تەنانەت تا ئێستاش، ئەم هەستە لە ژیانی دەروونیی زۆرێک لە تاکەکانی ئەم کۆمەڵگەیانەدا بە کارایی ماوەتەوە، ئیدی خۆیان دەرکیان پێ کردبێ، یان بێئاگا بووبن بەرامبەری. لە سەردەمی ڕێنسانسدا جۆرێک لە ئازادیی سێکسی لە ژیانی پیاواندا سەریهەڵدا، هۆکاری ئەمەش بۆ دوو فاکتەر دەگەڕێنرێتەوە، یان لێک دەدرێتەوە. یەکێکیان بۆ لاوازیی کڵێسە دەگەڕێتەوە، ئەوی دیکەشیان بۆ ڕوانگەی کۆمەڵگەی ڕێنسانس بەرامبەر بە خۆی دەگەڕێتەوە کە خۆی بە میراتگر و درێژکراوەی شارستانییەتی گریکیی ئازاد دادەنێ.

لە سەردەمی فکتۆری (سەردەمی شاژنە فکتۆریا) کە بە نزیکی لە هەموو سەدەی نۆزدەدا درێژەی کێشا، هەڵوێستی خۆپارێزی و پابەندبوون زاڵ بوو بەرامبەر بە ڕەفتاری سێکسی، بەهای دیاریکراو بۆ ئەم ڕەفتارە دانرا، لەوانە وەک ئەوەی دەوترا، ژن بە سروشتی خۆی چێژ لە سێکس نابینێ، بەڵام پیاو، بۆ بەدبەختی، سێکس بۆ لای خۆیی کێش دەکات و پیاو پڕکێشی بۆ سێکس زۆرە، هەروەها ئەو پیاوەی زیادەڕۆیی لە سێکسدا دەکات، خۆی تووشی نەخۆشیی زیادەڕۆیی لە فڕێدانی تۆودا دەکات. بەم شێوەیە ژنی بەئابڕوو هاوسەرەکەی لەم نەخۆشییە دەپارێزێ. بەگشتی ژن وا تەماشا کراوە کە هیچ حەز و ئارەزووییەکی سێکسیی نییە، هەروەها ملکەچی ڕازیکردنی داواکارییەکانی پیاوەکەیەتی و ئەگەر ئارەزووی بۆ بوون بە دایک نەبوایە، ئەوا لە سێکسەوە بەتەواوی دوور دەبوو. بەم شێوەیە پیاو هیچ دڵەڕاوکێیەکی نییە بۆ ئەوەی پەیوەندیی هاوسەرێتیی لەوە زیاتری لێ داوا بکات کە هەیە، چونکە ژنی شووکردوو حەز ناکات هاوسەرەکەی لەو ئاستەدا مامەڵەی لەگەڵدا بکات کە لەگەڵ

دۆستەکەیدا دەیکات. لەگەڵ ئەم بە ئاشکرا دیاریکردنەوەی ڕۆڵی ژن و پیاو لەم سەردەمەدا، بەڵام زۆرێک لە چینە ئرستۆکراتییەکان و ئیشکەرەکان لەم ڕێسایە دەرچوون، هەرچەندە لادان و دەرچوونیش لەم ڕێسایانە بە نهێنی دەبوو، زیاتریش لە ژیانی پیاودا ڕووی دەدا، نەک ژن، لەگەڵ ئەمانەشدا کڵێسە هەر پارێزگاریی لە ڕوانگەی خۆی بەرامبەر بە ژیانی سێکسی کرد و بە شێوەیەک لە سێکسی دەڕوانی کە گوناهێکی گەورەیە و سێکس تەنیا لەو کاتەدا شیاو و ڕێگەپێدراوە کە لە چوارچێوەی هاوسەرێتیدا ڕوو دەدات و لەپێناوی منداڵخستنەوەدایە.

## چاخە نوێیەکان و سێکس

بە کۆتاییهاتنی چاخەکانی ناوەڕاست، واتە ئەو چاخانەی دەسەڵاتی کڵێسە زاڵ بوو، ئەو ئاڕاستەیە دەستی پێ کرد کە دەسەڵاتە دنیاییەکان یاسا و حوکمی تایبەت بە مەسەلە سێکسییەکان دابڕێژن و جێبەجێیان بکەن. دەوڵەتانی ئەورووپی، دەربارەی چۆنێتی ڕوانین و پلەی بە توندوەرگرتنیان بۆ ئەم یاسایانە جیاوازبوون، کە هەندێجار ئەوەندە توندبوون، لە یاساکانی کڵێسە خراپتربوون. فەرەنسا و ئەڵمانیا و بەریتانیا لە بابەتی سێکس و پەیوەندییە سێکسییەکاندا، ئاڕاستە سەرەکییەکانیان دەنواند.

لە فەرەنسا پەرەسەندنێکی گرنگ ڕووی دا دەربارەی ڕوانین بۆ مەسەلەکانی سێکس، ئەویش لە دەرئەنجامی فیکری شۆڕشگێڕانەی فەرەنسی کە شۆڕشی فەرەنسی بزواندی، بۆ نموونە سزای لەسێدارەدان بۆ سەرپێچییە سێکسییەکان ڕەت کرایەوە و لابرا، هەروەها یاسای سزادان کە بە یاسای ناپلیۆن ناسرابوو، کۆمەڵێک بەندی لە خۆی گرتبوو، یەکێک لە گرنگترین

ئەو بەندانەی لەم یاسایەدا هاتبوو، ئەوە بوو ڕەفتاری سێکسی هەر جۆری بێ و هەر چۆنێ بێ و لەگەڵ هەر کەسێکدا، ڕەفتارێکە ئەنجامدەرانی سزا نادرێن، ئەگەر لە نێوان دوو لایەن، یان دوو هاوبەشی پێگەیشتوودا ڕووی دا بێ و بە ئاشکرایی نەبێ و هەردووکیان بە ڕەزامەندیی خۆیان ئەو کارە بکەن، تەنانەت لە پەیوەندیی سێکسیی جۆری لادانیشدا، تەنیا لەو بارانەدا بە تاوان دانرا کە بە شێوەیەکی ئاشکرا ئادابی گشتی لەکەدار بکات، یان هاوکات بێ لەگەڵ توندوتیژیدا، یان بەبێ ڕەزامەندیی لایەنێکیان ڕوو بدات، یانی یەکێک لە دوو لایەنەکە لە تەمەنێکی پێگەیشتوودا نەبێ، یان بێتوانا بێ لە دەربڕینی مافی ڕەزامەندی، یان ڕەتکردنەوە.

بەلام هەندێک لە هەرێمەکانی ئەڵمانیا، لەو سەردەمەدا، هەمان ڕێگەی فەڕەنسایان گرتەبەر، هەروەک ئیسپانیا و پرتوگال و ڕۆمان و ڕووسیا و ئەمەریکای لاتینیش، بەلام بروسیا جەختی لە هەڵوێستی توندی خۆی کردەوە و سزای لەسێدارەدانی بۆ تاوانە سێکسییەکان هێشتەوە. لە ئینگلتەراش نارەزایی دژی یاسای ناپلیۆن سەری هەڵدا و ڕازیبوونی هەردوو هاوبەشی سێکسی لە پەیوەندییەکی سێکسیی ناسروشتیدا بە شیاو و ڕێگەپێدراو دانەنرا و بە پێویست زانرا کە سزا بدرێن، بەلام یاسای ئینگلیزی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ، سەبارەت بە دیاریکردنی ماهییەتی ڕەفتاری سێکسی "دژ بە سروشت" بە نادیاری و تەمومژاوی مایەوە. لەگەڵ فرەیی هەوڵەکان بۆ ئەنجامدانی چاکسازی لە یاسای ئینگلیزیدا سەبارەت بە مەسەلە سێکسییەکان، بەلام مۆراڵی خۆپارێز و پابەندبووی سەدەی نۆزدە، بووە ڕێگر لە بەردەم گەیشتن بە گۆڕانێکی ڕیشەیی لە یاسادا. ئەوەی ڕووی دا تەنیا لابردنی سزای لەسێدارەدان بوو بەرامبەر بە سەرپێچییە سێکسییەکان لە ساڵی ١٨٦١دا.

لەوانەیە گرنگترین ئەو بابەتانەی کە ڕای گشتیی ئینگلیزی لەم ماوەیەدا بایەخی پێ دابێ بابەتی هۆمۆسێکسوالیتی بووبێ لەنێو نێردا. ئەم بابەتە پیاوانی یاسا و سیاسییەکانیشی سەرقاڵ کرد. دادگاییکردنی نووسەری ناودار ئۆسکار وایلد و تاوانبارکردنی بە تۆمەتی نێربازی لەگەڵ لۆرد ئالفرێد دۆگلاس، کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لەسەر هاندانی گەڕان و توێژینەوە لەسەر پەیوەندییە سێکسییەکان بەگشتی و لادانە سێکسییەکان بە شێوەیەکی تایبەتی، هەروەها لە ئەڵمانیاش حاڵەتێکی هاوشێوە هەبوو، فردریک کروپ کە سەرۆکی ئیدارەی کارگەیەکی ناوداری دروستکردنی چەک بوو، بە تۆمەتی نێربازی سزا درا.

## سەدەی بیست و سێکس

زۆربەی زۆر و گرنگترین ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە هەڵوێستە کلاسیکییەکان بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان ڕوویان دا، لە سەدەی بیستدا بوو. بەشێک لەم گۆڕانکارییانە درێژکراوەی ئەو پەرەسەندن و پێشکەوتنانە بوو کە لە چەند سەدەیەکی کەمی پێش سەدەی بیستدا ڕوویان دابوو، بەڵام زۆربەی ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە هەڵوێستەکاندا بەرامبەر بە سێکس و ڕەفتاری سێکسی ڕوویان دابوو، بەهۆی کاریگەریی کۆمەڵێک فاکتەری تەکنیکییەوە بوو، کە هەموویان پێکەوە بوونە هۆی ڕوودانی پرۆسەی پەرەسەندن و ئاڵوگۆڕکاری. گرنگترین ئەم فاکتەرانە لە نەزەری توێژەرانەوە بریتی بوون لە بزووتنەوەی دەروونشیکاری کە فرۆید دەستی پێ کرد، هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی، ئازادبوونی ژن و دۆزینەوەی حەبی دژەسکپڕی، توێژینەوەکانی هەر یەک لە کنزی و ماستەرز و جۆنسۆن، فرەیی هۆیەکانی ڕاگەیاندن و گەشتکردن و گەشەسەندنی هۆیەکانی گەشتوگوزار.

سەدەی بیت بە شۆڕشێکی نوێ لە بواری مەسەلە سێکسییەکاندا دەستی پێ کرد، ژیانی سێکسی تەوەرەی ئەم شۆڕشە بوو، هەرچەندە تۆوی ئەم شۆڕشە بەر لە فرۆید ڕوابوو، بەڵام تیۆر و کتێبەکانی و کاردانەوە بەرامبەریان لە پشتیوانی یان ڕەتکردنەوە، کاریگەریی مەزنیان هەبوو بۆ سەر ڕزگارکردن و دەرهێنانی ژیان سێکسی لە بواری تاریکی و شاردنەوە، بۆ بواری توێژینەوەی دروست. فرۆید ژیانی سێکسیی بە ژیانی دەروونیی تاکەوە پەیوەست کرد، هەر لە قۆناغی منداڵییەوە تا دەگاتە گەورەبوون و پێگەیشتن، هەروەها هەریەک لە بواری تەندروستی و نەخۆشیشی، بە بواری سێکسییەوە گرێ دا. وای لێ هات ئەستەم بوو بتوانی توێژینەوە دەربارەی پەیوەستیی نێوان ئەم بوارانە لەگەڵ سێکسدا ڕابگری. بواری ئەم پەیوەستکردنە ئەوەندە بەرفراوان بوو، کە بواری پزیشکی و پەروەردەیی تێپەڕاند بۆ بوارەکانی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و بوارەکانی دیکەش ڕۆیشت، تا ئەو ئاستەی ئەستەمە لە ئێستادا بوارێکی زیندەگی هەبێ بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بە سێکسەوە پەیوەست نەبێ. نووسەر و هونەرمەند و ڕۆماننووسەکان بەهۆی ئەم پەیوەستکردنەوە، بوارێکی بەرفراوانیان بۆ گوزارشتکردن لە خەیاڵەکانیان دۆزییەوە، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا بە دیاردەیەک لە دیاردەکانی پەیوەستیی نێوان سێکس و داهێنان دادەنرێ. هەرچەندە زۆر کەس لەم سەردەمەدا، بڕوایان بە حەرف بە حەرفی تیۆرەکانی فرۆید نییە، بەتایبەتی لە بابەتی سێکس لە قۆناغی منداڵی و گرێی ئۆدیب و سەرکوتکردنی، بەڵام ژمارەیەکی کەمیش هەن بتوانن بایەخی ژیانی سێکسی لە فۆرمەلەبوونی ژیانی دەروونی سروشتی، یان پشێوی لە مرۆڤدا ڕەت بکەنەوە، بەم شێوەیە ژیانی سێکسیی هەر تاکێک بوو بە بوارێکی گرنگ کە وا پێویست بکات توێژینەوەی لەسەر بکرێ بۆ دەستکەوتنی

تێگەیشتنێکی دروست و تەواو دەربارەی ژیانی ئەو تاکە، بەتایبەتی لەو دۆخانەدا کە تووشی نەخۆشییەکی دەروونی، یان لادانێکی ڕەفتاری دەبێ.

هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی کاریگەریی گەورەی هەبوو بۆ سەر ئازادکردنی تاک لە کۆتوبەندی سنووردارکردنی ژیانی سێکسی لە شارستانییەتی خۆرئاوادا. ئەم کاریگەرییە تەنیا بەهۆی بێبایەخیی ژیانی سێکسییەوە لە سەردەمی جەنگەکاندا ڕووی نەدا، بەڵکو دەرئەنجامی ئەو بێهیوایی و نائومێدییەش بوو کە تاک بەرامبەر بە بەها مرۆییەکان و چارەنووسی مرۆڤ هەستی پێ دەکرد. لەبەر ئەوە لەڕێی سەرقاڵبوون بە ژیانی سێکسی و تێرکردنی پێویستییە سێکسییەکان، مرۆڤ دەروازەیەکی دیکەی دۆزییەوە بۆ ڕزگاربوون لە نائومێدی و کەمکردنەوەی ئەو بێهیواییەی کە لە سەردەمی جەنگەکاندا تیادا دەژیا.

لە سەدەی بیستدا هەڵوێستی ژن لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا بەهێزتربوو، بەشێکی باشی لەو مافانە بەدەست هێنا کە بە شێوەیەکی کلاسیکی بێبەشبوو لێیان. ئەم بزووتنەوە ئازادیخوازە کاریگەریی بۆ سەر ژیانی سێکسیش هەبوو، ئیدی مێ بە چاوێک تەماشای خۆی دەکرد کە هاوبەشێکی تەواوی پیاوە لە ژیانی سێکسیدا و تەنیا شوێنکەوتوویەک نییە کە ملکەچی حەز و نەزوە و خۆپەرستیی پیاو بێ. لەوانەیە یەکێک لە گرنگترین فاکتەرەکانی ئەم کرانەوە سێکسییە، توێژینەوەکانی کنزی و هاوکارانی بووبێ سەبارەت بە ژیانی سێکسی نێر و مێ.

دەرئەنجامی توێژینەوەکانی کنزی شۆڕشێک بوو بۆ خۆی، ئەو زانیارییانەی کە بەرهەمی لەدایکبوونی توێژینەوە و ڕاپرسییەکانی ئەو بوون، دۆزینەوەیەکی سەرسووڕهێنەر بوون بۆ ئاشکراکردنی دیوە شاراوەکانی ژیانی سێکسی کە بەڕاستی

خەڵکی تیایدا دەژیان. هەرچەندە توێژینەوەکانی کنزی مەوداکەیان سنووردار بوو، هەروەها وەک باشترین هەڵسەنگاندن، تەنیا نمایندەی کۆمەڵگەی ئەمەریکی دەکرد، بەڵام ئەو لێکۆڵینەوە و توێژینەوانەی کە بەدوایدا هاتن لە ئەمەریکا و وڵاتانی دیکەش، هەموویان پشتیوانییان لەو هەقیقەتە کرد کە ژیانی سێکسیمان و چۆنێتیی پراکتیزەکردنی تەنیا لەو ڕووداوانە دەردەکەوێ کە دەشاردرێنەوە، نەک لەوانەدا کە بە ئاشکرا دیارن و بە شێوەیەکی کلاسیکی دەربارەی ئەم ژیانە زانراون. بەدوای توێژینەوەکانی کنزیدا، توێژینەوەکانی ماستەرز و جۆنسۆن هاتن، کە بریتی بوون لە توێژینەوەی زانستیی ورد، بابەتە سێکسییەکانیان لە بوارێکی هەژاریی زانینەوە بۆ بواری توێژینەوەی زانستیی تۆکمە و دەوڵەمەند بە زانیاری، گواستەوە، هەروەها باشترین شێوازی چارەسەری بۆ ئەو نەخۆشانە دۆزییەوە کە بەدەست پەککەوتنی سێکسییەوە دەیانناڵاند، بێگومان فەراهەمبوونی ئەم دەرفەتەش وا پێویست دەکات تاک چارەسەکردن قبووڵ بکات و بەرهەڵستیی ئاشکراکردنی وردەکارییەکانی ژیانی سێکسیی خۆی نەکات. کە ئەمەش تا ئێستا دەستەبەر نەبووە.

لەو فاکتەرانەی کە یارمەتیدەربوون لە گۆڕین و پێشکەوتنی هەڵوێستەکان بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان، ئاشکراکردنی هۆیەکانی دژەسکپڕی بوو. یەکێک لە هەرە گرنگترین دەرئەنجامەکانی ئەم دۆزینەوەیە ئەوەبوو، وای لە مێ کرد مافی هەبێ لە کۆنترۆڵکردنی پەیوەندییە سێکسییەکانی، هەروەها بە شێوەیەکی ئاشکرا ئاماژەش بوو بۆ ئەوەی کە سێکس مەرج نییە تەنیا خزمەتی ئامانجی پیتاندن و زۆربوون بکات، بەڵکو خزمەتی مەبەستی چێژیش دەکات، هەروەها شتێکی سروشتییە کە گەشتوگوزار و هۆیەکانی ڕاگەیاندن کاریگەریی گەورەیان هەبووبێ بۆ سەر ژیانی سێکسی و هەڵوێستی تاک بەرامبەر بە سێکس، چونکە

دابینبوونی ئەم فاکتەرە کارایانە لە ژیانی ملیۆنەها مرۆڤدا، وایان کرد کە زۆرێک لەو کەسانە لە کۆتوبەندی کۆمەڵایەتی لە ژیانی سێکسییاندا ڕزگاریان ببێ، هەروەها بواری ڕەخساند بۆ چاولێکردن و لاساییکردنەوە لە هەڵوێست و ڕەفتاری سێکسیدا.

تەواوی ئەم کارتێکەرانە کاریگەریی خۆیان هەبوو، پەردەیان لەسەر هەقیقەتی ژیانی سێکسی هەڵماڵی، هەروەها زۆرێک لەو دیوە شاراوانەی ژیانی سێکسییان ئاشکرا کرد، بۆ نموونە پابەندبوونی هەندێک کەس بە پێوەرە دوانییەکانەوە، واتە بە ڕواڵەت بڕوایان بە شتێک بوو، بەڵام لەژێرەوە و بە شاراوەیی بە جۆرێکی دیکە ڕەفتاری سێکسییان دەنواند.

بەرئەنجامی هەموو ئەمانە، دەستەبەربوونی ڕوانگەیەکی واقیعی و زانستی بوو بەرامبەر بەم لایەنە گرنگ و فەرامۆشکراوەی ژیانی هەموو مرۆڤێک، بەڵام کرانەوە و ئازادبوون لە بواری ژیانی سێکسیدا تا ئێستا، لە دەرئەنجامی نێگەتیڤ بەدەر نەبووە، چونکە شۆڕشی سێکسی ئاڕاستەیەکی ڕووەو لێبوردەیی و ئیباحییەت لە ڕەفتاری سێکسیی زۆرێک لە کۆمەڵگەکاندا، لێکەوتەوە، هەروەها ئەمانە هاوکات بوون لەگەڵ دەرکەوتن و بەرفراوانبوونی کۆمەڵێک لادان لە بواری سێکسی و لە بوارە ڕەفتارییەکانی دیکە کە پەیوەست بوون بەم بوارەوە، تەنانەت ترسێک هاتە ئاراوە کە جڵەوی ماقووڵی و شیاوی لە ژیانی سێکسیدا لەدەست دەربچێ و ئەمەش ببێتە هۆی بێبایەخبوونی سێکس و لەدەستدانی جوانی و پیرۆزی و مانا سەرەکییەکانی، سەرەتاکانی ڕوودانی ئەم دۆخەش لە زۆرێک لە کۆمەڵگەکاندا تێبینی دەکەین. لەوانەیە ماوەیەکی دوورودرێژ بخایەنێ تا کاردانەوەی ئەم بابەتە دەردەکەوێ، یان دەگەینە ئاستێکی هاوسەنگ و دروست لە ڕوانینمان بۆ ژیانی سێکسی لە نێوان ئازادبوون لە چەپاندن و تێگەیشتن لە ڕاستی.

## شارستانییەتە سەرەتاییە هاوچەرخەکان و سێکس

توێژەر پێشبینیی ئەوە دەکات ڕەفتاری سێکسی و هەموو ئەو لایەنانەی کە پەیوەندییان بە ژیانی سێکسییەوە هەیە لە دابونەریتەکان، لەنێو کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا لەیەک دەچن.

هۆکاری ئەم پێشبینیکردنەش بەم شێوەیە بۆ نزیکیی گەشەکردنی شارستانییەت دەگەڕێتەوە لەگەڵ بنەما شارستانییەتە مرۆییەکان، بەڵام ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە لەسەر ژمارەیەکی زۆری ئەم کۆمەڵگەیانە ئاماژە دەدەن بە بوونی جیاوازییەکی زۆر لە قۆناغە جیاجیاکانی گەشەی شارستانیی ئەم کۆمەڵگەیانە و توانای مرۆیی تاکەکان بۆ نواندنی ڕەفتاری سێکسی کە دەشێ مرۆڤ لە کۆمەڵگە جیاجیاکاندا بیگرێتەبەر، ئەمەیان ئەگەرە دروستەکەیە. لێرەدا بەشێک لە شێوازەکانی ڕەفتاری سێکسی لە شارستانییەتە سەرەتاییە هاوچەرخەکاندا دەخەینە ڕوو:

### ١- چەپاندنی سێکسی-ئەنیس بیاج

مسنجر لە ساڵی ١٩٧١دا لێکۆڵینەوەی لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی و سێکسیی ئەم کۆمەڵگەیە کردووە کە پێیان دەوترێ ئەنیس بیاج Inis-Beag. ئەم کۆمەڵگەیە بریتین لە کۆمەڵێکی بچووک لە خەڵک کە لەسەر دوورگەیەک لە نزیک ئیرلەندا نیشتەجێن، دانیشتووانەکەی هەموو کاسۆلیکین، خەڵکانێکی هەژار و فەقیرحاڵن لە ڕووی داراییەوە، لە بواری کشتوکاڵدا کار دەکەن. لێکۆڵینەوەکە دەربارەی ئەم کۆمەڵگەیە ئەوەی ئاشکرا کردووە، ڕێسای پەیڕەوکراو لەم دوورگەیە تەنیا بریتییە لە هاوسەرێتی و پێویستە سێکس تەنیا لەم چوارچێوەیەدا ڕوو بدات. تاکەکانی ئەم کۆمەڵگەیە بڕوایان بە ئەفسانە و چاوپیسی و نەفرەتی و بوختان هەیە.

هەروەها پێیان وایە پیاو حەزی لە سێکسە، بەڵام ژن تەنیا وەک ئەنجامدانی ئەرکێک قبووڵی دەکات، هۆکاری بوونی هێزی

سێکسی لە پیاودا بۆ ئەوە دەگەڕێننەوە کە پیاو زیاتر لە ژن پەتاتە دەخوات. پەیوەندیی سێکسی لەنێو ژن و پیاوی ئەم کۆمەڵگەیەدا بەبێ هیچ گەمەبازییەکی لەپێشینە بەڕێوەدەچێ، هەروەها پێویست ناکات ژن بە ئۆرگازم بگات، تەنانەت ئەگەر ژنێ لە کاتی سێکسدا بە ئۆرگازم بگات، بە جۆرێ لە لادان و ناسروشتیی دادەنێن. پیاوانی ئەم دوورگەیە پێیان وایە جووتبوون لەگەڵ ژنەکانیاندا ماندوویان دەکات، لەبەر ئەوە بەر لە چوونە سەر ئیش و کارکردن، سێکس ناکەن، هەروەها هەندێ چالاکیی سروشتیی مرۆڤ بە عەیبە و عار دادەنێن، بۆ نموونە، ڕووداني سووڕی مانگانە لە مێدا، ڕووتبوونەوە، میزکردن و پیسایيکردن، لەبەر ئەوە پێویستە سەرجەم ئەمانە بە نهێنی و دوور لە چاوی هەموو کەسێ ئەنجام بدرێ. ئەمانە و زۆر شتی دیکەش، بۆ نموونە خەڵکی هیچ نوکتە و قسەیەکی خۆش لەبارەی سێکسەوە ناکەن، هەروەها کچان و کوڕان لە قوتابخانە و لە کڵێسە و تەنانەت لە دانیشتن و کۆبوونەوەی گەورەکانیشدا لە یەکدی جیا دەکەنەوە و دوور لە یەکدی دادەنیشن، هەروەها چەندەها ڕوخساری دیکەی چەپاندنی سێکسی لەم کۆمەڵگەیەدا تێبینی دەکرێ، بۆ نموونە، پیادەکردنی دەسەڵات بەسەر شەهوەتی سێکسیدا، وەک ڕێگرتن لە ڕووتبوونەوە و ماستەربەیشن و بەرکەوتن و دەستلێدان و گوزارشتە سێکسییەکانی دیکە و هۆشداری دان بەرامبەر نەکردنیان.

### ٢- نیمچەئازادیی سێکسی - بالا

خاتوو مریام-ی توێژەر لە ساڵی ١٩٧١دا لێکۆڵینەوەی دەربارەی ئەم کۆمەڵگە ئەفریقییە لە کۆنگۆ ئەنجام داوە. ئەم کۆمەڵگە بچووکە لە بواری کشتوکاڵ و ڕاوکردن و بازرگانیدا کار دەکەن. لەم کۆمەڵگەیەدا بە شێوەیەکی ئاشکرا ڕۆڵە سێکسییەکان

دیاری کراون، هەریەک لە ژن و پیاو کاری خۆی هەیە، ئەو کەسانەی هێڵی جیاکەرەوەی نێوان کاری یەکدی دەبڕن، بە کەسانی ئەتوار سەیر، یان ڕەفتار سەیر دادەنرێن.

ژن لەم کۆمەڵگەیەدا ملکەچی دەسەڵاتی پیاوە، بەڵام دەسەڵاتی پیاو لەدوای ساڵانێکی دووردرێژ لە هاوسەرێتی لاواز دەبێ. ئەم کۆمەڵگەیە لە ڕووی مەسەلە سێکسییەکانەوە لە کۆمەڵگەکەی پێشوو (واتە کۆمەڵگەی ئانیس بیاچ) لێبووردەترن، سەبارەت بە قسەکردن لەبارەی سێکسەوە، کەمتر شەرم دەکەن و خۆپارێزییان کەمترە.

شارستانییەتی بالا Bala ڕووتبوونەوەی لەنێو تاکەکانی یەک توخمدا بە لاوە ئاساییە، بەڵام عەیبەیەکی گەورەیە ئەگەر لەنێو تاکەکانی دوو توخمی جیادا، واتە لە نێوان نێر و مێدا ڕووی دا، هەروەها ئەم شارستانییە نەبوونی کۆکبوون و سازان لە نێوان ئەو ڕێسایانەی کە بە ئاشکرا دەربارەی ڕەفتاری سێکسی ڕاگەیەنراون لەگەڵ ئەو ڕەفتارانەی کە بە دزییەوە و لە نهێنیدا ڕوودەدەن، قبوڵ دەکات، مادام ئەم دوو شتە تێکەڵ ناکرێن لەگەڵ یەکدیدا. ئەم شارستانییەتە گەمەی سێکسیی نێوان منداڵان قبوڵ دەکات، بە ماستەربەیشنی بەکۆمەڵیشەوە، هەروەها ئەم کۆمەڵگەیە کچەکانی لەنێو تەمەنی (٧-١٢) ساڵی خەتەنە دەکات، لە شوێنی سارێژبوونی لێکردنەوەی میتکە، جۆرە گرێیەکی بچووک لەسەر ئەندامی مێینەی ئەم کچە بچووکانە دروست دەبێ. بەپێی نەریتی ئەم شارستانییەتە، ڕێگە بە کچی خەتەنەکراو دەدرێ یاری بەو گرێیە بکات کە لە ئەنجامی سارێژبوونی برینداری خەتەنەکردکە دروستبووە، لەڕێی ئەم یاریکردنەوە کچی منداڵ کە تازە بەرەو قۆناغی هەرزەکاری دەچێ، لەسەر وورووژاندنی سێکسی ڕاهێنان دەکات و ئەمە بە سیمبولێکی سێکسی دادەنرێ. پیاو وەک دەستدرێژیکەر لە پەیوەندیی سێکسیدا تەماشا دەکرێ، بەڵام ژن

وا پێویست دەکات خۆی وەک نێچیرێک پیشان بدات کە پیاو ڕاوی دەکات.

پیاوانیش لەم کۆمەڵگەیەدا هەندێ مەرجی تایبەتیان هەیە کە خوازیارن لە ژندا هەبێ، وەک قەبارەی مەمک، بە لەنجەولار ڕۆیشتن (هویداو ۳۵۱)، لەرینەوەی سمت و کەفەڵ، هەروەها هەڵبژاردن لە پەیوەندیی هاوسەرێتیدا لەسەر بناغەی گونجان و شیاوی لە ڕوخسارە جەستەییەکانی نێوان ژن و پیاو بەڕێوە دەچێ. جۆرێک لە فرەجۆری لە ڕوخسارەکانی پەیوەندیی سێکسیدا هەیە، وەک گەمەی سێکسی بەر لە ئەنجامدانی کرداری جووتبوونی ڕاستەقینە. ئەم کۆمەڵگەیە ڕێگە بە زیناکردن نادات و بە تاوانێکی گەورەی دادەنێ، هەروەها کۆمەڵگە دەرکیش بەوە دەکات، ئەگەر یەکێک لە ژن و پیاو بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ لە پەیوەندیی سێکسیدا ئامادەیی نەبوو، واتە نەیتوانی سێکس بکات، ئەوا لەوانەیە هیچ دەروازەیەک نەبێ بۆ قوتاربوون و کۆتاییهێنان بە پەیوەندیی هاوسەرێتی، بەڵام مافی جیابوونەوەی بە پیاو بەخشیوە و لە هیچ بارێکدا ژن ناتوانێ لە هاوسەرەکەی جیابێتەوە.

بەر لە هاوسەرێتی، پەیوەندیی سێکسیی تەواو ڕێگەپێنەدراوە، بەڵام ئەگەر سێکس ڕووی دا و ژن دووگیان بوو، ئەوا ئەمە بە کێشەیەکی گەورە دادەنرێ و لەو بارەدا پێویستە پیاو بە ناچاری ئەو ژنە بێنێ و هاوسەرێتیی لەگەڵ بکات، یان ئەو شوێنە بەجێبێڵێ.

بە شێوەیەکی گشتی کۆمەڵگە سەبارەت بە مەسەلە سێکسییەکان، بە دوو ڕێساوە پابەندە. یەکەمیان بە ئاشکرا پەیڕەوکردنی یاسا ڕەچاوکراوەکان. دووەمیشیان ڕێگەدان یان ئاسانکاری و چاوپۆشین لە جێبەجێکردنی ئەم یاسایانە، بەتایبەتی. ئەگەر دوور لە ئاشکرایی و چاوی خەڵک بەڕێوەچوون.

بەهۆی ئەم هەڵوێست و پراکتیزە سێکسییانەوە، ئەم کۆمەڵگەیە نزیکە لەو کۆمەڵگە هاوچەرخە خۆرئاواییانەی کە بە دوو پێوەر لە مەسەلە سێکسییەکان دەڕوانن، پێوەرێکیان ڕاگەیاندراو و ئاشکرایە، ئەوی دیکەشیان ڕانەگەیەندراوە و بە نهێنی و شاراوەیی کاری پێ دەکرێ. هەرچەندە ئەم کۆمەڵگە هاوچەرخە سەرەتاییە، کەمتر دووڕوویی دەنوێنن لە کارکردن بەم پێوەرە دوانییە.

### ٢- ئەوپەڕی ئیباحییەتی سێکسی- مانگای

مارشاڵ ساڵی ١٩٧١ لێکۆڵینەوەیەکی دەربارەی ژیانی سێکسیی ئەم کۆمەڵگەیە ئەنجام دا کە لەسەر یەکێک لە دوورگەکانی کوک لە ناوەڕاستی پۆلنیزیا لە باشووری باسفیک دەژین. ئەم کۆمەڵگەیە بە ئازادیی تەواو لە پەیوەندیی سێکسیدا دەناسرێ، بەڵام کۆتوبەند دەخاتە سەر پەیوەندی و هاوڕێیەتییە ئاشکرا و ڕاگەیاندراوەکان لە نێوان دوو توخمەکەدا. منداڵان لە تەمەنی سێ ساڵییەوە لە یەکدی جیا دەکرێنەوە، هەروەها قەدەغەیە کچان و کوڕان پێکەوە تێکەڵاو بن، بەڵام پیاسەکردنی کوڕانی مێردمنداڵ بە ڕووتی، بەو مەرجەی خەتەنەکرابن، شتێکی ئاسایی و قبووڵ کراوە، هەروەها نووکتە و قسەی خۆش دەربارەی سێکس لە دانیشتن و کۆبوونەوەکانی هەردوو توخمەکە بە کارێکی باش دادەنرێ. هانی جووتبوونی سێکسیی شاراوە دەدرێ لەدوای باڵقبوون، هەروەها ماستەربەیشنیش بەر لە باڵقبوون.

شارستانییەتی مانگای Mangaia هەرچەندە بە ڕوخسارە سیمبولییە ئاشکراکانی سێکس، وەک باوەش و ماچکردن لەبەر چاوی خەڵک پەست و تووڕە دەبێ، بەڵام لێبوردەیی هەیە بەرامبەر بە هەموو پەیوەندییەکی سێکسیی دوو توخمەکە بە

نهێنی و شاراوەیی، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی ئەم شارستانییەتە دوو پێوەر بەرامبەر بە ڕەفتاری سێکسی جێبەجێ دەکات، ئاشکرا و نهێنی. یەکێک لە ڕوانگە سەیرەکانی ئەم شارستانییەتە بۆ سێکس ئەوەیە، بایەخێکی زۆر دەدات بەو سۆزەی کە ژن و پیاو دەبەستێ بەیەکەوە و هانی دەربڕینی ئەو هەست و سۆز و خۆشەویستییە دەدات کە لەدوای تەواوبوونی پەیوەندیی سێکسی دەخرێتە ڕوو، هەروەها بە هەند وەری دەگرێ و پەسەنی دەکات، بەڵام سەیرەکە لەوەدایە گەمەبازیی بەر لە سێکس و ڕوخسارەکانی سۆزداری کە لەوانەیە وەک پێشەکی لە پەیوەندیی سێکسیدا ڕوو بدەن، ڕەت دەکاتەوە و سەیریشی پێ دێ.

هەقیقەتە سێکسییەکان فێری منداڵانی کوڕ و کچ دەکەن و لە تەمەنی ١٣-١٤ ساڵییەوە لەسەر تەکنیکی چێژوەرگرتنی سێکسی ڕایان دەهێنن، کە تەکنیکێکە زۆرێک لە سیمبولە سێکسییەکانی، وەک جووڵە و دەنگ لەخۆ دەگرێ. مێ ڕادەهێنرێ تا لە پەیوەندیی سێکسیدا ڕۆڵی پۆزەتیڤی هەبێ، چونکە ئەگەر وا نەبێ، ئەوا وەک کەسێکی لادەر لە ڕووی سێکسییەوە تەماشا دەکرێ. لێکۆڵینەوەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە مێ لەم کۆمەڵگەیەدا لە سەرجەم پەیوەندییە سێکسییەکاندا بە ئۆرگازم دەگات. هەرچەندە مامەڵەکردنی نێوان دوو توخمەکە لە ڕووی سێکسییەوە بە شێوەیەکی ئاشکرا، قەدەغەیە، بەڵام هۆیەکانی بە نهێنی و شاراوەیی مامەڵەکردن زۆرن، بۆ نموونە خۆبەکێشکردن و ڕۆیشتنی شەوانەی پیاو بۆ لای هاوبەشەکەی لە ماڵەکەی خۆیدا و سێکسکردن بە تاریکی. ئەم ڕەفتارە لای ئەم کۆمەڵگەیە، ڕەفتارێکی شیاو و قبووڵ کراوە، ئەگەر نەڵێین هاندراویشە. خێزان هیچ ڕێگرییەک ناکەن لەوەی کچەکەیان لەگەڵ چەند پیاوێکدا سێکس بکات، پێیان وایە ئەم ئەزموونانە بۆ دوارۆژی بەسوودن، هەروەها لەو باوەڕەدان دووگیانی بەهۆی جووتبوونی

دووبارەبووەوە لەگەڵ یەک پیاودا ڕوو دەدات، نەک سێکسکردن لەگەڵ چەند پیاوێکدا، پاشان باوکی بایۆلۆژیی منداڵ، مەرج نییە هاوسەری شەرعیی ژنەکە بێ، چونکە هاوسەرێتیی شەرعی لەسەر بناغەی خزمایەتی و موڵکایەتی و کەسایەتی و کارکردن دروست دەبێ. وەک چاوەڕوان دەکرێ هۆمۆسێکسوالیتی لەم کۆمەڵگەیەدا نەزانراوە، یان هەر زۆر دەگمەنە، ئەگەر هەبێ.

٤- گوێنەدان بە سێکس - کۆمەڵگەی دانی

یەکێکی دیکە لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکان، کۆمەڵگەی دانی Daniیە لە غینیای نوێی خۆرئاوا، کە کۆمەڵگەیەکی سەیرە لە ڕووی خەسڵەتەکانی ژیانی سێکسییەوە. بەوە ناسراون کە وازیان لە سێکس هێناوە تا ئاستی گوێپێنەدان. کارل هیدر ١٩٧٦ زانای ئەنسرۆپۆلۆژی لێکۆڵینەوەی دەربارەی ئەم کۆمەڵگەیە ئەنجام داوە، لە تێبینییەکانیدا بەم شێوەیە باسی ئەم کۆمەڵگەیە دەکات: "پیاوانیش وەک ژنان هیچ بایەخێک بە لایەنە سێکسییەکان نادەن. دەگمەنە لە ژیانی ئەم کۆمەڵگەیەدا، کەسێک بەر لە هاوسەرێتی، پەیوەندیی سێکسیی هەبێ، یان لە دەرەوەی چوارچێوەی هاوسەرێتی، پەیوەندیی سێکسی ببەستێ، یان لەپاش کۆتاییهاتنی پەیوەندیی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا، بەهۆی مردن یان جیابوونەوە یان تەلاقەوە، پەیوەندییەکی دیکەی سێکسیی هەبێ".

هەروەها ماستەربەیشن بە نزیکی هەر دیاردەیەکی نەزانراوە لای تاکەکانی ئەم کۆمەڵگەیە. مەراسیمەکانی هاوسەرێتی هەر (٤-٦) ساڵ جارێک لە مەراسیمی بەکۆمەڵدا بەڕێوە دەچێ. ژن و پیاو لەدوای هاوسەرێتی تا دوو ساڵ هیچ جۆرە پەیوەندییەکی سێکسی لە نێوانیاندا ڕوو نادات، تا ئەو کاتەی دوو هاوسەرەکە دەتوانن لەماڵێکی هاوبەشدا تایبەت بە خۆیان پێکەوە نیشتەجێ ببن، دوای ئەوەش کە پەیوەندیی سێکسی ڕوو دەدات، ئینجا

درەنگ درەنگ دووبارە دەبێتەوە. بەزۆری بۆ ماوەی (٤-٥) ساڵ لەدوای منداڵبوون سێکسی نێوان ژن و پیاو قەدەغەیە. دانییەکان، واتە تاکەکانی کۆمەڵگەی دانی هیچ گوزارشتێک دەرنابڕن کە ئاماژە بن بۆ بایەخدانیان، یان ئاڕاستەگرتنیان ڕووەو سێکس. تەنیا ئاوارتە لە قۆناغی هەرزەکاریدایە کە هەرزەکاران لەڕێی کارە هونەری و میوزیکییەکان بایەخدانیان بە سێکس دەردەبڕن. لەو تێبینییانەی دیکە کە توێژەری لێکۆڵینەوەکە ئاماژەی پێداون ئەوەیە، ئەم کۆمەڵگە سەرەتاییە عەشایرییە بەوە ناسراون تاکەکانی زۆر بە دەگمەن ڕووبەڕووی هەڵچوونە سۆزدارییەکان دەبنەوە، کەم تووڕە دەبن، بە سروشتی خۆیان کەسانێکی هێمنن و لە پەیوەندییە گشتییەکاندا سروشتیان ئارامە و هیچ جۆرە توندوتیژییەک نانوێنن، هەروەها لە ناخیاندا هەستەکانی وەک ڕق و ڕقلێبوونەوە هەڵناگرن.

لەپێناوی شیکردنەوەی ئەم دیاردە ڕەفتارییە دەگمەنە، توێژەران توێژینەوەیان دەربارەی فاکتەرە بایۆلۆژییەکان، وەک هۆرمۆنەکان ئەنجام دا، هەروەها لە کاریگەریی ژینگە و کاریگەریی فاکتەرە شارستانییەتەکانیان کۆڵییەوە، لە ئەنجامدا هەردوو فاکتەری بایۆلۆژی و ژینگە دوورخرانەوە و بەهەند وەرنەگیران، چونکە هیچ کەموکوڕی یان جیاوازی لە بڕی هۆرمۆنەکاندا، بە بەراوردکردنیان لەگەڵ ئاستی سروشتیدا بەدی نەکرا، هەروەها ژینگەی جوگرافیش دژ بە ئاڕاستەی سێکسی نەبوو. لەبەر ئەوە بڕوا وایە کەمیی پاڵنەری سێکسی لە کۆمەڵگەی دانیدا دەرئەنجامی لاوازیی کاریگەریی سێکس بێ بۆ سەر ژیانی تاکەکان، سەرباری لاوازیی ژیانی دەروونیی ئەم کۆمەڵگەیە.

### ٥- کۆمەڵگە شارستانییە سەرەتاییەکانی دیکە

مارگرێت مید Med ساڵی ١٩٥٣ توێژینەوەیەکی بەراوردکاریی لەسەر ژمارەیەک کۆمەڵگەی شارستانیی سەرەتایی ئەنجام دا. بۆی دەرکەوت بە لایەنی کەمەوە، دوو کۆمەڵگە لەنێو ئەو کۆمەڵگەیانەی کە کاری لەسەر کردبوون، لە نێوان ڕۆڵی نێر و ڕۆڵی مێ لە ژیانی سێکسیدا و هەموو ئەو لایەنانەی کە پەیوەندییان بە ناسنامەوە هەیە، جیاوازی لە نێوانیاندا کەمە. هۆزی ئاراپش Arapesh لە غینیای نوێ، ژن و پیاو هەردووکیان نەرمونیانن و خاوەنی ئەو خەسڵەتانەن کە مێی لە کۆمەڵگە خۆرئاواییەکاندا پێی دەناسرێ. لە کاتێکدا هۆزی ماندوگومور Mundugumore لە هەمان وڵات، نێر و مێ هەمان ئەو سیفەتە زبرانەیان هەیە لە توندوتیژی و دڵڕانەگرتن کە بە شێوەیەکی گشتی نێری پێ دەناسرێ، هەروەها مید تێبینیی کردووە، لە هەمان وڵاتدا کۆمەڵگەیەکی دیکە هەن، پێیان دەوترێ چامبولی. بەگوێرەی پێوەرە باوەکان، لای ئێمە دەکرێ بە هۆزێکی لادەریان دابنێین. لەوێ پیاوان هێمن و لەسەرخۆن و پشت بە ژنان دەبەستن، داوا لە ژن ناکەن پێداویستییە سێکسییەکانیان بۆ تێر بکات، وەک ئەوەی باوە، هەرچی ژنی چامبولییە بە دەسەڵات و زەبروزەنگە و سەربەخۆیە و لە سێکسیشدا توندوتیژە.

**پەراوێزەکان:**

١.قوتابخانەی سەگی The Cynic School: ئەم قوتابخانەیە لە بناغەدا لە سەدەی چواری پێش زاین دامەزراوە و تا سەدەی سێی پێش زاین بەردەوام بووە و لە سەدەی یەکی زاینیدا دەرکەوتووەتەوە و لە سەدەی دووی زاینیدا ڕەواجی پەیدا کردووە. ئەم قوتابخانەیە بڕوای بە نەشونماکردنی خود هەیە دوور لە هەر شارستانی و یاسا و ڕێسایەک. بۆ ئەوەی تاک خۆی بێت، پێویستە دەستبەرداری هەموو ئەو شتانە ببێت کە لە پێکهاتەی دەروونییدا نین، بۆ نموونە سامان، پلەوپایە، دەسەلات، خێزان، دەولەت و کۆمەلگە. دامەزرێنەری ئەم قوتابخانەیە (دیوجین سینوبی)یە، نازناوەکەی سەگ بوو، لەوانەیە ئەم نازناوەی لەوەوە هاتبێت کە زۆربەی نموونەکانی لەسەر ئاژەلان دەهێنایەوە، بەتایبەتی سەگ، بۆ نموونە دەیوت سەگ لە زۆر شت دەبورێت و پێویستی بەو شتانە نییە کە ئێوە دەتانەوێت، هەروەها دەلێن پیاوێکی کەمزەوق بووە و شەرمی نەکردووە، خەلکی ڕاچلەکاندووە و لە هەلە و کەموکوڕییەکانیان بەئاگای هێناونەتەوە، هەر بۆیە پێیان وتووە، وەک سەگ دەوەڕێت-وەرگێڕ.

٢.قوتابخانەی ڕەواقی The stoic School: ڕەواقییە مەزهەبێکی ڕەفتاری دەروونییە، پشت دەبەستێت بە ئەزموونکردن، ئەزموونکردن لای ڕەواقییەکان چاوگی مەعریفە و فێربوونە. کەسی دانا ئەو کەسەیە کە فێری یاساکانی سروشت دەبێت و ئەو یاسایانە لەگەل باری دەروونی خۆیدا ڕێک دەخات، بۆ ئەمەش ئەکتەر و ڕۆلبینین لە نمایشی شانۆییدا دەکرێت بە نموونە. ئەکتەری باش ئەو ئەکتەرەیە کە لە ڕۆلەکەی خۆی بە باشی تێدەگات و بە تەواوی جێبەجێی دەکات، ئەمە وەک حالی کەسی دانا وایە کە لە یاساکان تێدەگات و خۆی لەگەلیاندا دەگونجێنێت، بەلام ئەکتەری خراپ لە ڕۆلەکەی خۆی تێناگات و لۆمەی دەرهێنەرەکە دەکات، ئەمە وەک

حاڵی نەزانێک وایە لە سروشتی شتەکان تێناگات، لەبەر ئەوە ململانێ لە نێوان دەروون و ئەقڵیدا دروست دەبێت-وەرگێڕ.

٣. قوتابخانەی فیساگۆرسی The Pythagorean School: لە قوتابخانەی فیساگۆرسیدا زانستەکانی ماتماتیک و گەردوون و میوزیک و پزیشکی دەخوێنران، قوتابی لە قوتابخانەی فیساگۆرسیدا پابەندی یاسایەکی سادە و ساکار بوو لە خواردن و پۆشاکدا، هەروەها پەیڕەوی لە وەرزشی جەستەیی و وەرزشی دەروونی دەکرد و دەبوو تاعەتی زانست بکات و بەردەوام دەیوت: "مامۆستا وتی"، لە نێوان قوتابی و مامۆستادا، ڕایەڵێکی دەروونیی قووڵ هەبوو. مامۆستا پاڵنەرێکی پەروەردەیی دەروونیی هەبوو، هەروەها سۆزێکی ئایینیی بەهێز و ورەیەکی مۆراڵیی بەهێزی بۆ فێربوون هەبوو. ئامانج لە قوتابخانەی فیساگۆرسدا بێرازکردنی مۆراڵ و پیرۆزکردنی کۆمەڵگەی ئیخوان بوو، واتە هەموان لە یەکێکدا و یەکێک لە هەمواندا-وەرگێڕ.

٤.قوتابخانەی ئەسکەندەریە The Alexandrian School: ئەم قوتابخانەیە لە سایکۆلۆژیدا لە سەدەی یەکەمی پێش زاین و سەدەی یەکەم و دووەمی دوای زاین ڕەواجی هەبوو، لەژێر ناوی پاراسایکۆلۆژی ناوی دەرکردبوو، ئامانجی ئاسوودەیی دەروونە، یان دەروونی ئاسوودەیە، ئەفلۆتین (٢٠٥-٢٧٠)ز لە ناوە دیارەکانی ئەم قوتابخانەیە بوو، مەعریفە لە قوتابخانەی ئەسکەندەریە. بەپێی ئەم قوتابخانەیە هەستکردن کەمترین پلەکانی دەرککردنی هەیە و هەست هەڵخەڵەتێنەرە، بەڵام دەرککردن لەڕێی بینین، یان ئەقڵەوە، ڕاستگۆترە-وەرگێڕ.

٥.نابێ ئەوەش لەبیر بکەین کە زۆربەی ئەم ئایەت و فەرموودانەی باسی ژیانی سێکسیی موسڵمان دەکەن، تەنیا ئاراستەی پیاو کراون، بەدەر لە ژن-وەرگێڕ.

٦.ئەمەش ئاماژەیەکی دیکەیە بۆ بەخشینی مافی سێکسکردن بە پیاو، بە هەر شێوەیەک کە ویستی- وەرگێڕ.

# بەشی بیستوچوار
# خۆشەویستی و سێکس

-چەمکە مێژووییەکانی خۆشەویستی
-ڕای گریکییەکان و خۆشەویستی
-گۆشەنیگا ئایینی و لاهوتییەکان بەرامبەر بە خۆشەویستی
-شیعر و خۆشەویستی
-سایکۆلۆژی و خۆشەویستی
-خۆشەویستی لە ڕووی بایۆلۆژی و کۆمەڵناسییەوە
-خۆشەویستی لە ڕووی زانستییەوە
-جۆرەکانی خۆشەویستی
-توانای بزواتنی خۆشەویستی
-خۆشەویستی و پێداویستییە مرۆییەکان
-پۆلێنەکەی ئیبن حەزمی ئەندەلوسی بۆ خۆشەویستی
-خۆشەویستی لای ڕازی
-خۆشەویستیی پاکیزەیی
-خۆشەویستی ئەفلاتوونی
-خۆشەویستیی ڕۆمانسی
-بزاوتی ڕۆمانسیی و خۆشەویستی
-خۆشەویستیی نارسیزمی

## خۆشەویستی و سێکس

دەشێ هەندێک کەس خۆشەویستی لە سێکس پاک بکەنەوە، بەڵام هەندێکی دیکە تەواو بە پێچەوانەوە بیردەکەنەوە و پێیان وایە خۆشەویستی هەمووی سێکسە، کەواتە هەقیقەت لە نێوان ئەم دوو جەمسەرە دوور لە یەکدییەوە لەکوێدایە؟ هەرچەندە زۆربەی خەڵک ئەو ڕایەیان هەیە کە کارلێک لە نێوان هەردوو سۆزەکەدا هەیە، بەڵام سروشت و هۆکار و ئامانجەکانی ئەم کارلێکە هێشتا نادیار و ئاڵۆزە.

هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگێڕنەوە کە خۆشەویستی وەک سێکس، دەشێ بە ڕوخساری جیاواز دەربکەوێ، هەروەها دەشێ لە یەک کاتدا چەند ڕوخسارێ پێکەوە کۆبکاتەوە، یان هەندێ کەس لەمە دوورتر دەڕۆن، ئەو بنەچانەی کە ئەم دوو سۆزە، واتە سێکس و خۆشەویستی، لێیانەوە سەرچاوەیان گرتووە، بە بنەمای هاوبەش دادەنێن، ئەگەر ئەو بنەچانە لە بناغەدا هەبن.

ئەو کەسەی بەناو مێژووی سێکسدا بگەڕێ، دەشێ لە گەیشتن بە چەمکێکی گشتی و بەردەوامی ئەم لایەنە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا، هێندە نەکەوێتە هەڵەوە، هەرچەندە ئێمە لەم سەردەمەدا لە هەموو کاتێک زیاتر دەرک بە وێنە و ڕوخسارە جیاوازەکانی ژیانی سێکسی دەکەین لە ڕووی جۆر یان سیمبولییەوە، هەر ئەم دەرککردنەشە کە چەمکی ژیانی سێکسی تا ئەوپەڕی سنوور بەرفراوان کردووە و ژیانی سێکسی لەوە دەرچووە کە تەنیا وەک ئارەزوویەکی سێکسی دەرکی پێ بکەین و ویستمان هەبێ بۆ بەدیهێنانی، بەڵام ئەو توێژەرەی کە لە مێژووی خۆشەویستیدا کار دەکات، هەر لە سەرەتاوە فرەجۆرییەک لە تێگەیشتن لەم دیاردەیە و هۆکار و شێوەکانیدا، هەست پێ دەکات، هەروەها ئەوەندە

بەڵگەی دەست دەکەوێ لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ لە شارستانییەتە دێرینەکاندا، دەرکی بەوە کردووە کە هەندێک لە هۆکار و شێوە و ئامانجەکانی خۆشەویستی دەکەونە ناو چوارچێوەی بواری سۆزداریی سێکسی و ئامانجەکانی، بەم شێوەیە باوباپیران دەرکیان بەوە کردووە کە بەشێک لە خۆشەویستی، سێکسە و سێکسیش دەشێ شێوازی ناڕاستەوخۆ و سیمبولی بگرێتە بەر بۆ گوزارشتکردن لە هەندێک قۆناغ و حاڵەتەکانی، لەبەر ئەوە باوباپیرە دێرینەکانمان یەکەمین کەس بوون کە زیاتر لە ڕوخسارێکیان بە سێکس بەخشیوە بۆ گوزارشتکردن، بۆیە لەم ڕووەوە لە فرۆید لە پێشترن کە لە تیۆرەکانیدا باسی ئەگەری گۆڕانی ڕەوتی ڕاستەوخۆی وزەی سێکسی دەکات بۆ ڕەوتی دیکەی دەرچوونی ئەو وزەیە، واتە دەشێ گوزارشتکردن لە وزەی سێکسی تەنیا بە شێوەی ڕاستەوخۆ نەبێ، بەڵکو ڕوخساری دیکە لەخۆ بگرێ.

* * *

ئەستەمە بۆ هەر کەسێک، تەنانەت بتوانێ پوختەی ئەو شتانە کۆبکاتەوە کە دەربارەی خۆشەویستی وتراون و نووسراون، یان بتوانێ لەنێو لێشاوی هۆیەکانی دەربڕین و گوزارشتکردن لە شێوەی وتن، یان کردار، یان ڕەفتار، یان ئەفراندندا، لە بوونی خۆشەویستی لە ژیانی مرۆییدا، تێبگات. ئاشکرایە بۆ هەر کەسێ بیەوێ بەدواداچوون بۆ ئەم سۆزە لە ڕادەبەدەرە بکات، بۆی دەردەکەوێ، کە لەناو ئایینەکان و پەیوەندیی تاک بە خالقەوە، ئامادەبوونی هەبووە، هەروەها کاریگەریی بۆ سەر دروستبوونی کۆمەڵگە و خێزان و دامەزراوەکان هەبووە، هەروەها کاریگەریی لەسەر دروستبوونی مێژووی مرۆیی و سیاسی و شارستانی هەبووە، سەرجەم ڕوخسارەکانی ئەم ئامادەبوونە ئەوەندە ڕوون و ئاشکران، دەشێ پێویستی بە ڕوونکردنەوەی زیاتر نەبێ.

هەرچەندە خەمی ئێمە و ئامانجی ئێمە، لەم بەشە دیاریکراوەدا، دیاریکردنی ئاستی پەیوەندی و پەیوەستیی نێوان سۆزی خۆشەویستی و پاڵنەری سێکسییە، بەڵام وا پێویست دەکات ئاماژە بە هەندێک لەو ڕایانە بدەین کە دەربارەی ئەم بابەتە وتراون، هەر لەو کاتەوە کە مرۆڤ هۆشیاریی بەرامبەر بوونی ئەم جۆرە پەیوەندییە لە نێوان خۆشەویستی و سێکسدا پەیدا کردووە.

لێرەدا سەرجەم پوختەی ئەو ڕا هاوچەرخانە دەخەینە ڕوو کە دەربارەی ئەم بابەتە دەستمان کەوتوون، بە پوختەی ئەو توێژینەوە زانستییانەشەوە کە ئامانجیان گەیشتنە بە تێگەیشتنێکی وردتری ئەو پەیوەندییەی کە سۆزی خۆشەویستی و سۆزی سێکس پێکەوە دەبەستێ.

دەشێ لەدوای بەدواداچوونی ئەم بابەتانە، کەمێ لەو نادیاری و ئاڵۆزییە کەم بکاتەوە کە باڵی بەسەر پەیوەندیی نێوان ئەم دوو سۆزەدا کێشاوە. لەوانەیە بۆ خوێنەر ئاسانتر بێ، یان کەم ئەستەمتر بێ کە بوونی سێکس لە نەبوونی، لەناو سۆزی خۆشەویستیدا جیا بکاتەوە، هەروەها بە بایەخی ئەم ئامادەبوونە ئاشنا ببێ، نەک تەنیا بۆ سۆزی خۆشەویستی، بەڵکو بۆ سێکسیش و ئەو ئامانجانەی لە ژیانی مرۆڤایەتیدا لەم دوو سۆزە چاوەڕێ دەکرێن، دواجار خۆشەویستی لە سێکس دابماڵرێ و پاک بکرێتەوە، یان لەڕێی سێکسەوە خۆشەویستی ئیدانە بکرێ، ئەمانە تەنیا ئاڕاستەن لە تێگەیشتندا و مەرج نییە ئاماژە بن بۆ تێگەیشتنی دروست و دەشێ هەرچی ئەدگارە سەرەکییەکانی ئەم دوو سۆزە و شوێنیان هەیە لە ژیاندا، بسڕنەوە.

## چەمکە مێژووییەکانی خۆشەویستی

### ڕای گریکییەکان دەربارەی خۆشەویستی

بەپێی وێناکانی هسیود Hesiod، شاعیری داستانبێژی گریکی که لە سەدەی حەوتی پێش زایندا ژیاوە و ئەفسانەی سەدەکانی پێشووی لە سەردەمەکەی خۆیدا، کۆکردەوە و ڕێکی خستوونەتەوە، جیهان لە سەرەتادا فەوزا، واتە چۆس Chaos بووە، کە بریتییە لە دۆخی سەرەتایی گەردوون. لەم دۆخەی بوونەوە، کرۆنۆس Chronos کە ڕۆحی زەمەنە، هێلکەیەکی داناوە کە ئیرۆس Eros (واتە خۆشەویستی)ی لێ هاتووەتە دەرەوە، بەم شێوەیە ئیرۆس بووە خواوەندێکی گرنگ کە بە زەمەنەوە پەیوەست بوو، زەمەن مەزنێتی و زەبروزەنگی خۆی هەبوو. هەرچەندە ئیرۆس خەسڵەتی توندوتیژ و ئازاردەری هەبوو، بەڵام خاوەنی هێزی ئەفراندن و داهێنانیش بوو، هەروەها بە خەسڵەتی یەکبوون و هارمۆنییەت و هاوئاوازیش ناسرابوو، کە ئەم خەسڵەتانە دژ بە خەسڵەتی ئەو فەوزایە بوون کە گەردوونی لەو کاتەدا تیا بوو. ئیرۆس وەک خواوەندی خۆشەویستی تا سەدەی شەشی پێش زاین پارێزگاریی بەو پێگەیەی خۆیەوە کرد، بەڵام لە ڕاستیدا دوو سەدە بەر لەو کاتە، ئەم پێگەیە گۆڕانی بەسەردا هات بوو، بۆیە هۆمیرۆسی شاعیری داستانبێژ، ئیدی ئیرۆسی بە خواوەند دانەنا، لە ئەلیازەدا وەک هەر ناوێکی گشتی، ناوی هێناوە، لەو کاتەوە ئیدی ناوی ئیرۆس تەنیا ئاماژە بوو بۆ ئارەزووییەکی وەک خواردن و خواردنەوە، یان شەهوەت، یان خۆشەویستیی سێکسی.

ئەم سیفەتە نوێیە کە هۆمیرۆس بە ئیرۆسی بەخشی، بووە مایەی جەختکردنی زیاتر، تا ئیرۆس لای ئەسخیلوس Aeschylus(525-456ی پ.ز) و دوای ئەویش هیرۆدتوس Herodotus(484-407ی پ.ز)، بوو بە سیمبولی حەز و

ئارەزوو. ئەم هاتنەخوارەوەیە لە پێگەی ئیرۆسدا بووە هۆی بەشبەشکردنی پێگەی وەک خواوەندێکی تاقانە، بۆ خواوەندێکی پێکهاتوو لە چەند بەشێکی بچووک، بەو شێوەیە خۆشەویستیش وەک ئیرۆس بۆ چەند پۆلێک دابەش بوو، واتە لە ئیرۆسەوە بوو بە ئیرۆسەکان Erotes، ئەم زاراوە نوێیە یوریپیدس Euripides (484-424ی پ.ز) هێنایە ئاراوە. پاش ئەم لە ڕۆما هەریەک لە بلاوتس و شیشرون و ئۆفید، ڕایەکەی یوریپیدسیان بە هەند وەرگرت و خۆشەویستی بۆ چەند جۆرێک دابەش بوو کە لە بابەت و ئاراستە و شێوازەکانی دەربڕیندا جیاواز بوون، هەموو ئەمانە لەسەر ڕای زۆرێک لە فەیلەسووف و شاعیر و پیاوانی ئاییني ڕەنگدانەوەی هەبوو، کە ئەمانیش خۆشەویستییان بۆ چەند جۆرێ پۆلێن کرد، یان لە چەند پلەیەکدا ڕێکیان خست.

یەکێک لە یەکەمین پۆلێنەکانی خۆشەویستی ئەو پۆلێنەیە کە خۆشەویستیی بۆ دوو بەش دابەش کرد: (هاوڕێیەتی – فیلیا Philia، یان خۆشەویستیی ڕۆحی، لەگەڵ ئیرۆس، یان سەرنجڕاکێشانی سێکسی). هۆمیرۆس لە داستانی گلگامشدا ئاماژەی بەم پۆلێنە داوە، کاتێک وەسفی پەیوەندیی نێوان ئاخلیس Achilles و پترۆکلوس Patroclusی هاوڕێی دەکات، بەڵام دوای ئەو، ئەسخیلۆس Aeschylus ڕەگەزێکی جەستەیی بەم خۆشەویستییە بەخشی، ئەم ڕایە لە گفتوگۆکانی ئەفلاتوون و لە کتێبەکانی لوسیان سوفییشدا هاتووە، هەموویان ڕەگەزێکی جەستەییان بە پەیوەندیی نێوان ئاخلیس و هاوڕێکەی بەخشی. چەند وشە یان بێژەیەکی زمانەوانیی نوێ بۆ گوزارشتکردن لە جۆرە جیاجیا و سەرەکییەکانی خۆشەویستی، دانرا، بۆ نموونە لە یۆنانیدا وشەکانی ئیرۆس Eros و فیلیا Philia و ئاگاپی Agape بەکارهاتن، کە لە بەرامبەریاندا لە لاتینیدا ئەم وشانە بوون: ئامۆر Amor، ئامسیتیا Amicitia، کاریتاس Caritas، کە

بەدوای یەکدا ئەمە ماناکانیانە: خۆشەویستی سێکسی، خۆشەویستیی هاوڕێیەتی، خۆشەویستیی چاکەخوازی. ئەم پۆلێنە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خۆشەویستیی لە هەر سێ جۆرەکەدا هەیە و پێویستە جیاکاری لە نێوانیاندا بکرێ. ئەفلاتوون لە دیالۆگەکان یسمبوزیوم Sympoosiumدا پلیکانەیەکی بۆ خۆشەویستی داناوە، لەسەر زاری دایۆتیما Diotema قسە لەگەڵ سوکرات دەکات و دەڵێ: "ئەگەر گەنج دەستی بەوە کرد شێوەیەکی جوانی بینراوی خۆش بوێ، .... ئەوا هەر زوو تێبینیی ئەوە دەکات، جوانیی شێوەیەکی قەشەنگ، هاوشێوەیە لەگەڵ جوانیی شتێکی دیکەدا. لەبەر ئەوە، چەند گێلە ئەگەر دەرک بەوە نەکات جوانی لە هەموو شێوەیەکدا هەر یەکێکە و هەموو جوانییەکان هەر لە یەک دەچن -لەم کاتەدا کە دەرک بەمە دەکات، ئیدی خۆشەویستییە توندوتیژەکەی بۆ تەنیا کەسێک هێور دەبێتەوە، وردەوردە- لەجیاتی ئەوەی شێوە جوانەکانی خۆش بوێت، دەرک بەوە دەکات جوانیی ئەقڵ زۆر شەرەفمەندانەترە لە جوانیی شێوەی دەرەوە، پاشان بەرەو خۆشەویستیی یاسا و دامەزراوەکان دەچێ، لەدوای یاسا و دامەزراوەکانیش، ڕووەو زانست ڕێ دەکات تا جوانییەکەی ببینێ". ئەفلاتوون ئەمانە لەسەر زاری دایۆتیماوە پوخت دەکاتەوە، هەروەها ڕیزبەندیی ڕاستگۆیانەی خۆشەویستی لە جوانیی زەوییەوە دەست پێ دەکات و بەرەو سەرەوە هەڵدەکشێ. لە شێوە جوانەکانەوە بۆ کردارە جوانەکان و لە کردارە جوانەکانەوە، بۆ بیرۆکە جوانەکان دەڕوات، تا لە بیرۆکە جوانەکانەوە بە بیرۆکەی جوانیی ڕەها دەگات، ئەرستۆش هەر لەسەر شوێنپێی ئەفلاتوون ڕۆیشت و خۆشەویستیی بۆ چەند جۆرێ دابەش کرد، ئەمە لەو کاتەدا بوو کە ویستیی هاوڕێیەتی شی بکاتەوە. ئەرستۆ پۆلێنەکانی لەسەر ئەو گریمانەیە دامەزراند کە کەسی خۆشەویست (واتە کەسی مەحبووب یان مەحبووبە،

یان ئەو کەسەی کە مرۆڤ خۆشی دەوێ) لە سێ بەش پێکدێ: چاکە، ئەرمونیانی و سوودمەندی، بەم شێوەیە سێ جۆر لە هاوڕێیەتی هەیە کە لەگەڵ شتە خۆشەویستەکاندا یەکسانە.

هەروەها دەڵێ: "بەنیسبەت هەریەکێک لە ئێمە خۆشەویستییەکی زانراو و ئاڵوگۆڕکراو هەیە، هەروەها ئەو کەسانەی کە یەکدییان خۆش دەوێ، خۆزگەی خێر و چاکە بۆ یەکدی دەخوازن لەو لایەنەوە کە یەکدییان خۆش دەوێ". هەروەها ئەرستۆ دەرکی بەوە کرد کە چەند شێوازێک لە هاوڕێیەتی هەیە، کە لەسەر بناغەی سوودمەندێتی دامەزراون، یان بەدوای تێرکردنی چێژەکاندا دەڕۆن، بەڵام بەتەواوەتی ئەم خۆشەویستییەی ڕەت نەکردووەتەوە و پێی وا بووە وەک هەر خۆشەویستییەکی دیکە، دەشێ چاکەخواز بێ، یان شەڕخواز بێ، چونکە تەنیا لەو بارەدا خۆشەویستییەکی باش دەبێ کە لەڕێی ئەقڵەوە مامناوەند و هێور دەبێتەوە و لەسەر شێوازی ڕێکخستنی دروستی خێرخوازانە کۆنترۆڵ دەکرێ، کە پێویستە لەسەر ئەم شێوازە خۆشەویستییەکانی مرۆڤ بێنە ئاراوە. سوکرات بەر لە ئەفلاتوون و ئەرستۆ، دەرکی بە ئەگەری بوونی سۆزی سێکسی لە خۆشەویستیدا کردووە و هەروەها تا چەند ئەم سۆزە دەبێتە هۆی دروستبوونی حەز و پەژارە و ئازار، تا ئەو ئاستەی کە لەوانەیە یاسا، یان ئەقڵ نەتوانێ خامۆشی بکاتەوە، ئەمە لەو پرسیارەوە دروست بوو کە سوکرات لە سیفالوس Cephalusی پیرەمێردی کرد، کاتێک لێی پرسی: ئایا ژیان لە کۆتاییەکەیدا سەختتر دەبێ؟ پیرەمێرد وەڵام دەداتەوە و وتەکەی سوفۆلکیس دووبارە دەکاتەوە، کاتی پرسیاریان لێ کرد، چۆن خۆشەویستی لەگەڵ تەمەندا دەگونجێ؟ ئەویش بەم شێوەیە وەڵامی دابووەوە: "هەست دەکەم هەروەک بڵێی لە چەپۆکی دەسەڵاتدارێکی سەرشێت و هەژاو ڕزگارم بووە". لوکریتوس Lucretius بە

چێژە سێکسییەکان ئاشنا بووبوو، ئازاریشیان پێ بەخشیبوو، لەبەر ئەوە داوای فەرامۆشکردنی ڤینۆسی دەکرد کە بە تیرەکانی دڵی پیاوانی بریندار کردبوو. لەم بارەیەوە لوکریتوس دەڵێ: "خۆشی و نەشئەی دڵ تا بێ گەشە دەسێنێ و چەندە خۆتی بۆ شل بکەیت و خزمەتی بکەی، زیاتر زامدارت دەکات، شێت و شەیدایی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ کڵپە دەکات و دەردەدڵی شانمان قورستر دەکات، ئەوە تەنیا شتە کە چەندە زیاد بکات، ناتوانین هیچی لێ وەربگرین، تەنیا دڵمان بەو حەزە نەفرەتییە هێندەی دیکە دەسووتێ".

بەپێی ڕای لوکریتوس، ئەم جۆرە خۆشەویستییە لە خۆشەویستیی ڕاستگۆ و سەرکەوتوودا هەیە، هەروەها دەڵێ: "بەڵام کاتێ خۆشەویستی شکست دەهێنێ و هیچ ئومێدێکی تیادا نامێنێ، ئەو کاتە خراپەکانی تەنانەت بە چاوی داخراویشەوەە دەرکیان پێ دەکرێ".

گۆشەنیگا فەلسەفییە جیاجیاکان دەربارەی سۆزی خۆشەویستی بەدوای یەکدا هاتوون، لەوانە پاسکال Pascal دەڵێ: "دڵ هۆکاری خۆی هەیە، کە ئەقڵ نایزانێ، بەڵام ئێمە لەڕێی هەزار شتەوە هەستی پێ دەکەین". قەدیس ئۆگستین لە ددانپیادانانەکانیدا دەڵێ: "چی دڵخۆشی کردووم بەدەر لەوەی کە خۆشەویستی دەکەم و خۆشەویستی دەکەم؟ بەڵام من پاریزگاریم لە تەرازووی خۆشەویستی نەکرد، ئەقڵ بۆ ئەقڵە، تا ئاستی شەوقدانەوە بۆ هاوڕێیەتییە، بەڵام لە حەزی جڵەونەگیراوە و لە شپرزەیی جەستەوە، هەروەها لە گڕوکەفی گەنجێتییەوە، تەم و هەورێکی ترسناک بۆ سەر دڵم هەڵکشا، بە جۆرێ نەمتوانی ئاشکرایی و بێگەردی و ڕوونیی خۆشەویستی لەودیو تەمی شەهوەتەوە جیا بکەمەوە".

هەرچی "تۆما ئاکوینی"یە دوو جۆر لە خۆشەویستیی جیا کردووەتەوە: ئەو خۆشەویستییەی کە دەکەوێتە بواری نەمرییەوە، لەگەڵ ئەو خۆشەویستییەی کە دەکەوێتە بواری ئیرادەوە. یەکەمیانی بۆ خەسڵەتی شەهوانیی شەهوەتی هەستیار گەڕاندەوە و جۆری دووەمی خۆشەویستییشی بۆ شەهوەتی ئەقڵی، یان فیکری گەڕاندەوە.

## گۆشەنیگا ئایینی و لاهوتییەکان بەرامبەر بە خۆشەویستی

سەرجەم ئایینەکان خۆشەویستی وەک سۆزێکی سەربەخۆ دەبینن. ئەم گۆشەنیگایە ڕێگە بە تێپەڕبوونی شەهوەت و حەز و سێکس بۆ ناو خۆشەویستی نادات، خۆشەویستی بەنیسبەت زۆربەی ئایینەکانەوە، ئایدیال (یان نموونەی باڵا)ی لە خۆشەویستیی خالق بۆ خۆی و بۆ ئادەمیزادەکانی، وەرگرتووە، بەهۆی ئەم گۆشەنیگایەوە خۆشەویستی بە خوا چوێنراوە، ئایینەکان لە ئایدیالی خۆشەویستیی خواوە تەرازوویەکان داناوە کە هەموو خۆشەویستییەک بەو تەرازووە پێوانە دەکەن.

قەدیس یوحنا لەم بارەیەوە دەڵێ: "خوا خۆشەویستییە، ئەو کەسەی لەگەڵ خۆشەویستیدا نیشتەجێیە، واتە لەگەڵ خوادا نیشتەجێیە، خواش لەگەڵیدایە".

دانتی لە کۆمێدیای ئیلاهیدا دەڵێ: "حەز و ئیرادە بەو خۆشەویستییە دەسووڕێنەوە کە خۆر و ئەستێرەکانی پێ دەسووڕێنەوە، هەروەک ئەو گالیسکەیەی کە بە ڕێکوپێکی دەسووڕێتەوە". بەم شێوەیە ئایینەکان وا لە خۆشەویستی دەڕوانن کە تەنیا بیروباوەڕێک نییە تایبەت بێ بە مەخلوقەکانی سەر زەوی و چاودێری ئیلاهی و ڕزگاربوون، بەڵکو پێوەرێکە بۆ سەرجەم شێوازەکانی خۆشەویستی کە مرۆڤ لە خوا نزیک دەخاتەوە، یان دووری دەخاتەوە. ئەوەی لاهوتییەکانی زۆر

سەرقاڵ کرد، هەوڵدان بوو بۆ چارەسەرکردنی ململانێی نێوان خۆشەویستی و مۆراڵ، نەک لە ڕووی پرەنسیپەوە، بەڵکو لە ڕووی پراکتیزەکردنەوە. قەدیس ئۆگستین لەم بارەیەوە دەڵێ: "پیاوی باش ئەو پیاوە نییە کە دەزانێ چاکە لە کوێدایە، بەڵکو ئەو پیاوەیە کە دەزانێ چیی خۆش دەوێ، ئایا ئەوە ئاشکرا نییە، ئێمە لە خۆماندا ئەو خۆشەویستییەمان خۆش دەوێ کە ئەو شتەمان پێ خۆش دەوێ کە خۆشمان دەوێ؟ چونکە خۆشەویستییەکی دیکە هەیە ئەو شتەمان پێی خۆش دەوێ کە خۆشمان ناوێ. ئەم خۆشەویستییە ڕقی لەو شتە دەبێتەوە کە پێویستە خۆشمان بوێت. لەبەر ئەوە بە تەواوەتی دەشێ دوو خۆشەویستی لە یەک کەسدا بوونی هەبێ، ئەم یەککگرتنە بۆ مرۆڤ شتێکی باشە، چونکە دەشێ ئەو خۆشەویستییە گەشە پێ بکا کە مرۆڤ بەرەو ژیانێکی چاکەخوازانە بەرێ، هەروەها لەو خۆشەویستییە کەم بکاتەوە کە بەرەو خراپەمان دەبات، بە جۆرێ تا ئەو ئاستەمان بەرێ کە ژیانمان هەمووی باش بێ و بۆ خێر و چاکە بگۆڕێ". بەم شێوەیە قەدیس ئۆگستین ددان بە هەڵەکانی خۆشەویستیدا دەنێ، بەڵام پێی وایە خۆشەویستیی تێروتەواو و باش و ڕاستگۆ و باشترین، ئەو خۆشەویستییەیە کە خاوەنی هێزی پێویستە بۆ زاڵبوون بەسەر هەڵەکانی خۆشەویستیدا. ئۆگستین کاتێک دەڵێ: "خۆشەویستی بکە و ئەوە بکە کە دەتەوێ"، مەبەستی ئەو خۆشەویستییە تێروتەواوەیە کە لە زەینی خۆیدایە. هەرچی هەوڵدانە بۆ چارەسەرکردنی ململانێی نێوان خۆشەویستی و مۆراڵ لە لای شارەزا لاهوتییەکان، بریتییە لە هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی ململانێی نێوان جۆرە جیاوازەکانی خۆشەویستی، ئەم چارەسەرە هاوکاتە لەگەڵ پرۆسەی کەماڵبوونی خودی خۆشەویستی.

## شیعر و خۆشەویستی

شیعر و خۆشەویستیی داستان و قەسیدە شیعرییەکان لە زۆربەی زمان و شارستانییەتەکاندا، پڕن لە سۆزی خۆشەویستی. شاعیرەکانیش بە تێکەڵەیەک لە ڕێژەی جیاواز لە پاڵنەری جەستەیی و پاڵنەری ڕۆحی، باسی ئەم سۆزە دەکەن. زۆربەی کات جیاکردنەوەی ڕەگەزەکانی ئەم تێکەڵەیە، یان دیاریکردنی ئاماژەکانی بوونی ڕەگەزێکیان، کارێکی قورسە. دەشێ شەیدابوونی ڕۆحی لای شاعیرێک بە شێوەیەکی دیار دەربکەوێ، بەڵام شەیدابوونی جەستەیی لای شاعیرێکی دیکە شوێنی بایەخ بێ، وا دەردەکەوێ ئەوە دژ بە سروشتی شاعیر بێ ئەگەر دوو پێداویستیی دژ بەیەک پێکەوە لە شیعری شاعیرێکدا کۆببنەوە، لە کاتێکدا شاعیر هەمیشە لە شیعرەکانیدا بەدوای هەقیقەتێکدا دەگەڕێ و جوانی لەودا دەدۆزێتەوە، بەڵام ئەم کۆکردنەوەیە بۆ شیعر ڕێگەپێدراوە، لە کاتێکدا ڕێگە بە کەسێکی دیکە نادرێ دوو چەمکی دژ بەیەک پێکەوە کۆ بکاتەوە، هەروەک بڵێی شاعیر لە چارەی نووسراوە لە شیعرەکانیدا لەم دژبەیەکییەدا بژی و لە یاسا ئاساییەکان ئاوارتە بکرێ. دەشێ ئەمە بەهۆی پێداویستییەکانی خودی شیعرەوە بێ، یان دەشێ بەهۆی سروشتی خۆشەویستییەوە بێ کە پێویستی بەم ئاوارتەکردنە هەیە، ئەمەش ئەو سروشتەیە کە شاعیران لە کەسانی دیکە زیاتر دەرکی پێ دەکەن.

چوسر Chauser لەسەر زاری ئارکایت Arcite دەڵێ: "ئەو کەسە کێیە کە یاسا بۆ خۆشەویستی دادەنێ؟ خۆشەویستی خۆی مەزنترین یاسایە و لە هەموو ئەو یاسایانە مەزنترە کە توخمی مرۆڤ لەسەر زەوی دایانناوە".

کۆکردنەوەی نێوان سۆزی ڕۆح و سۆزی جەستە تەنیا لەنێو شیعر و لەناو شاعیراندا سنووردار نەبووە، چونکە ئەم جۆرە

کۆکردنەوەیە زۆریک لە ڕووداوە گرنگەکانی لە مێژووی تاکەکان و گەلاندا پێ جیا دەکرێتەوە. ئەو چیرۆکانەی دەربارەی پەیوەندییەکانی خۆشەویستی لەئارادان، بەهۆی شەهوەتی جەستە و پێداویستییەکانەوە بزواوە، ئەفسانە، یان داستان، یان ژیاننامە تایبەتی و مێژووییەکان لە ڕوخسارەکانی پاڵەوانێتی و وەفا و قوربانی و گیان فیداکردن بەدەر نین.

لە چیرۆک و داستان و ئەفسانە و مێژووی دێریندا، خۆشەویستیی عەشتار بۆ گلگامش و خۆشەویستیی پاریس و هێلین لە شەڕی تەڕوادە (لە ئەلیازەی هۆمیروسدا) بەدی دەکەین، هەروەها لە شەڕی داحس و غەبرا، خۆشەویستیی نێوان شازادە ئاندرۆ و ناتاشا لە جەنگ و ئاشتیی تۆلۆستۆیدا، مەجنون و لەیلا، خۆشویستیی نێوان دۆن کیشۆت و دلسینیا، هەروەها دانتی و بیاتریس، شەمشون و دەلیلە، ڕۆمیۆ و جولێت، هەروەها ئادەم و حەوا، چەندان چیرۆکی دیکەی خۆشەویستی کە کاریگەرییان هەبووە بۆ سەر ژیانی ئەم پاڵەوانانە خۆیان و کاروانی شارستانییەت و ڕەوتی مێژووش.

مێژوو لە سەردەمە دێرینەکانەوە و تا ئێستاش، کۆکردنەوەی پێداویستییە ڕۆحی و جەستەییەکانی لە یەک سۆزدا و ناولێنانی بە سۆزی خۆشەویستی، ڕەت نەکردووەتەوە، ئەمەش تەنیا لەبەر ئەوە نییە کە ڕێگە بە شاعیران دراوە لە شیعردا، سۆزی ڕۆح و سۆزی جەستە پێکەوە کۆبکەنەوە، لەبەر هەر هۆیەک بووبێ، مێژوو لە بەرژەوەندیی خۆشەویستی حوکمی داوە، کۆکردنەوەی سۆزی جەستە و سۆزی ڕۆحی پێکەوە ڕەت نەکردووەتەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئەو کەسانەی نەمر کردووە کە لەم ئەزموونی خۆشەویستییانەدا ژیاون، لە تێڕامان لەم واقیعەوە، ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە هەندێجار هاوسۆزییەکی مرۆڤایەتیی وا پەیدا دەبێ، بەشی ئەوە دەکات بەرامبەر بە یاسا ئایینی و مۆراڵییە

کلاسیکییەکان بوەستێتەوە، زۆربەی کات تەنیا ئەو کەسانە دەتوانن ئەم هاوسۆزییە بنوێنن، کە لە کەسانی ئاسایی زیاتر پێشکەش بە ژیان دەکەن، هەروەک بڵێی بەم کارەیان بۆ پلەیەکی بالاتر لە پلەی سەرجەم خەڵک بەرز دەبنەوە و ئەمەش وا دەکات ئەوەی بۆ ئەوان شیاو و ڕێگەپێدراو بێ، نەکرێ بۆ هیچ کەسێ شیاو و ڕێگەپێدراو بێ. چۆن شیاو و ڕێگەپێدراو نابێ بۆ کەسێکی وەک شەکسپیر، کاتێک دەربارەی خۆشەویستی دەڵێ: "سەرجەم بوونەوەران لەڕێی خۆشەویستییەوە پەیدابوون، ئەگەر خۆشەویستی لەناوچوو، ئەوا دەشێ هەموو ئەو شتانە لەناو بچن کە دەکرا بمانایەتەوە" یان لەسەر زاری جولێت-ەوە دەڵێ: "بەخشینم وەک دەریا وایە، هیچ سنوورێکی نییە، خۆشەویستیشم وەک قووڵاییەکەی وایە، چەند پێت ببەخشم ئەوەندە زیاتر دەبم بە خاوەنت، ئەم دوو شتە کۆتاییان بۆ نییە"؟.

## سایکۆلۆژی و خۆشەویستی

هەروەک چۆن لاهووتییەکان هەوڵیان دا بۆ چارەسەرکردنی ململانێی نێوان خۆشەویستی بە مانا ئایینیەکەی لەگەڵ مۆراڵدا، بە هەمان شێوە سایکۆلۆژییش هەوڵی دا چارەسەری ئەم ململانێیە بکات، یان بە لایەنی کەمەوە لێی تێبگات.

ئەم ململانێیە لای سایکۆلۆژی یان بەنیسبەت بواری سایکۆلۆژییەوە بریتی بوو لە ململانێ لە نێوان پاڵنەر و ئارەزووە سێکسییەکان لەگەڵ مۆراڵدا. لە ڕوانگەی سایکۆلۆژییەوە، خۆشەویستی بە شێوەیەک لە شێوەکان لە ئەنجامی ئەم ململانێیە و شێوازی چارەسەرکردنییەوە دروست دەبێ، چونکە ئەو ململانێیەی کە لە ژیانی ئەقڵی ناوەکیی تاکدا هەیە، لە پەیوەندیی نێوان تاک و ژینگەکەشیدا هەیە. فرۆید ڕەگوڕیشەی خۆشەویستیی لە غەریزەی سێکسدا دۆزییەوە، بەپێی بۆچوونی

فرۆید، شێوازە جیاوازەکانی خۆشەویستی، تەنیا ڕەنگدانەوەی ڕوخسارەکانی ئەو وزە سێکسییەن کە ئاڕاستەی بابەتی جیاواز دەکرێن، لەم بارەیەوە، دەڵێ: "ناوکی خۆشەویستی بە شێوەیەکی سروشتی لە خۆشەویستیی سێکسییەوە دروست دەبێ و پەیوەندیی سێکسییش ئامانجەکەیەتی. ئێمە لەمەدا جیاوازی ناکەین لە نێوان خۆشەویستیی نێوان نێر و مێ، لەگەڵ خۆشەویستیی نێوان منداڵ و باوان، هەروەها خۆشەویستیی هاوڕێیەتی و خۆشەویستیی مرۆیی بە شێوەیەکی گشتی، یان پابەندبوونی مرۆڤ بە کۆمەڵێک بابەتی دیاریکراو یان فیکریی ڕەهاوە. هەموو ئەم مەیل و ئارەزووانە گوزارشتن لە جەوهەری چالاکییە غەریزەییەکان، بەڵام لە خۆشەویستیی سێکسیدا جیاوازن، چونکە لەوانەیە خۆشەویستیی سێکسی لە ئامانجەکەی خۆی لابدات، یان ڕێگە بگیرێ لە گەیشتن پێی، هەرچەندە هەمیشە ئەوەندە پارێزگاری لە سروشتی سەرەکیی خۆی دەکات کە بەشی پاراستنی ناسنامەکەی بکات بە ئاشکرایی". فرۆید پێی وایە ناسنامەی خۆشەویستیی سێکسی لە گوزارشتەکانی منداڵ و گەورەکاندا دەردەکەوێ، یان دەشاردرێتەوە، هەروەها لە ڕەفتاری هاوسەنگ یان ڕەفتاری ناسروشتیی مرۆڤ و لە شێوازی نەرم یان ڕەقی مامەڵەکردندا، یان لە پرۆسەی ئەفراندن و داهێناندا دەردەکەوێ لە هەر شوێنێک و بە هەر شێوەیەک بوونی هەبێ.

## خۆشەویستی لە ڕووی بایۆلۆژی و کۆمەڵناسییەوە

دەشێ هەڵە بێ خۆشەویستی بەو سۆزە دابنرێ کە تایبەت بێ بە هەندێ خەڵک و کەسێتی و تەنیا مەیل و حەزەکانی ئەوان بنوێنێ، یان بڵێین سۆزێکی کتوپڕە لە ژیاندا و خزمەتی مەبەستەکانی خۆی ناکات. واقیعی ژیانی مرۆڤایەتی و تەنانەت

ئاژەڵیش بەو شێوەیە ئاماژە نادەن، چونکە ئەو سۆزەی کە تەواوی مرۆڤ و ئاژەڵەکان بۆ چاودێری و پاراستنی منداڵ و بێچووەکانیان دەری دەبڕن، لە جەوهەردا هێندە جیاوازیی نییە لەگەڵ ئەو سۆزەی کە نێر و مێ، یان خەڵکی بەگشتی لەنێو ژیاندا پێکەوە پەیوەست دەکات، هەر ئەمەشە پاڵی بە داروینەوە ناوە بڵێ: "شتێکی جەختلێکراوە، ئەو ئاژەڵانەی کە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە پێکەوە بەستراون، هەڵگری سۆزێکی خۆشەویستین بۆ یەکدی، لە کاتێکدا ئەو ئاژەڵانەی دیکە هەست بەم سۆزە ناکەن کە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە لەگەڵ یەکدیدا پەیوەست نین".

تەنانەت فرۆیدیش کە سێکس و چەپاندنی سێکسی بە ڕەگوڕیشەی ئاشکرای هەموو سۆزەکانی خۆشەویستی داناوە، بە هەموو جۆرە جیاوازەکانی گوزارشتکردنەوە لێی، دەرکی بەوە کردووە ئەم سۆزە ڕەگوڕیشەی کۆمەڵایەتیی هەیە، کاتێک دەڵێ، ئەو سۆزەی کە خەڵکی پێکەوە کۆدەکاتەوە و بە خۆشەویستی ناوی دەبرێ، لە واقیعدا تەنیا ترسە لە ئازار و زیان پێگەیاندن. بەم شێوەیە پێویستە لە خۆشەویستیدا، یان لە هەندێ جۆری خۆشەویستیدا، ئەو شتانە ببینین کە پارێزگاری لە مەبەستە سەرەکییە بایۆلۆژی و کۆمەڵایەتییەکان دەکەن لە ژیانی مرۆڤ و ئاژەڵدا، کە دەشێ نەتوانن بێ ئەو مەبەستانە لە ژیاندا بمێننەوە، ئەوەی لە هەندێ سۆزی خۆشەویستیدا بەدیی دەکەین کە بایەخ لەسەر ئامانجە سێکسییەکان چڕ دەکاتەوە، تەنیا پاڵپشت و جەختکردنە لەم ئامانجانە و بۆ زامنکردنی بەدیهێنانیانە و دابینکردنی وزەی پێویستە بۆ ئەمە.

## خۆشەویستی لە ڕووی زانستییەوە

لە یەکێک لە فیلمە بەناوبانگەکانی نزیکەی چل ساڵ لەمەوبەر، پاڵەوانی فیلمەکە دەیەوێ خۆشەویستیی خۆی بۆ ئەو ژنە دەرببڕێ کە سەرسامە پێی، شەرم دەکات لە دەربڕینی هەستەکانیدا ناوی خۆشەویستی بهێنێ، پێی دەڵێ: "بە زمانی کیمیا، من و تۆ کێشکردنێک لە نێوانماندا هەیە". دەشێ ئەم وتەیە پێش زۆر لەو توێژینەوە هاوچەرخانە کەوتبێ کە ئامانجیان شیکردنەوەی سۆز و ڕەفتاری خۆشەویستی و گەیشتن بووە بەو ڕەگەزانەی کە خۆشەویستیی لێ دروست دەبێ و هەروەها چۆن دروست دەبێ و چۆن و بە شێوەیەک و لە چ شێوەیەکدا فۆرمەلە دەبێ. دەربارەی ئەم بابەتە توێژینەوەی زۆر ئەنجام دراون، ژمارەیەک لە توێژەران بەو ئاڕاستەیەدا ڕۆیشتن هەندێک لەو گریمانانە بسەلمێنن کە لە تێگەیشتنیاندا دژی ڕا و بیروباوەڕە باوەکان بوون دەربارەی خۆشەویستی. یەکێک لەو گریمانانە دەڵێ، خۆشەویستی بریتییە لە مامەڵەکردن یان ئاڵوگۆڕکاری.

ئەو توێژەرانەی بڕوایان بەم ڕایە بوو، تیۆرەکەیان بۆ لێکدانەوەی هۆکاری پەیوەستیی نێوان دوو کەس کە سۆزی خۆشەویستی لە نێوانیاندا بوو، بەکارهێنا. ئاشکرایە هەوڵدان بۆ لێکدانەوەی خۆشەویستی لەسەر ئەم بناغەیە دژ دەوەستێتەوە لەگەڵ ئەوەی دەربارەی خۆشەویستی دەوترێ کە بریتییە لە ڕەتکردنەوەی خود و چاودێریی ئەوی دیکە و خۆنەویستی و هاوبەشیکردن.

ڕۆبن Robin1973، کە لە هەموو ئەوانی دیکە ئەهوەنترە، دەربارەی ڕەچاوکردنی تیۆری ئاڵوگۆڕکاری لە خۆشەویستیدا، دەڵێ: "...تەنانەت لە حاڵەتی خۆشەویستیدا، ئەو دوالیزمە بەیەکداچووە بەدی دەکەین کە لە نێوان ئەوەدا هەیە کە دەتوانین بیبەین لەگەڵ ئەوەی دەیبەخشین".

توێژینەوەی زۆر ئەنجام دراون سەبارەت بە هەوڵدان بۆ سەلماندنی ئەم گریمانەیە و خستنە ڕووی چۆنێتیی گەشەکردنی خۆشەویستی لە پەیوەندییەکی ڕووکەشی نێوان دوو کەسەوە بۆ پەیوەندییەکی خۆشەویستی و سۆزداری لەسەر بناغەی ئاڵوگۆڕکردنی سوود لە نێوانیاندا، هەروەها ئاشکراکردنی ئەو هۆکارەی بۆچی هەندێک پەیوەندی هەر لەسەر ئاستی ڕووکەشی دەمێننەوە، لە کاتێکدا هەندێ پەیوەندیی دیکە بۆ ئاستی سۆزداری پاڵی پێوە دەنرێ بە چاوپۆشین لەو سوودمەندییە ئاڵوگۆڕکراوەی نێوان دوو کەسەکە؟ ئەنجامی زۆربەی توێژینەوەکان لەم بابەتە ئاماژە بەوە دەدەن، ئەوەی وا لە هەندێک کەس دەکات بۆ گەیشتن و پەیوەندیکردن لەگەڵ کەسانی دیکەدا، پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکانە، لەم چوارچێوەیەدا ئەو کەسانەی کە بەیەکدی دەگەن، هیچ هەڵبژاردنێکیان لە بەردەستدا نییە ئایا بە کێ دەگەن و پەیوەندی لەگەڵ کێ دەبەستن و هیچ بیرۆکەیەکیشیان دەربارەی ناوەڕۆکی کارلێکردنی نێوانیان نییە.

ئەگەر بە یەکگەیشتن لە نێوان ئەو دوو کەسەدا بووە هۆی ڕوودانی کارلێکردن، ئەوا وا پێویست دەکات یەکێک لەم دوو لایەنە، بەخشینێک پێشکەش بکات کە بەهۆیەوە لە بەرامبەردا بەخشینێکی دەست بکەوێ، بەم شێوەیە ئەگەر وا پێویست بکات کە کارلێکردن سوودمەند بێ، ئەوا ئەمە پشت دەبەستێ بەو هاوبەشەی کە دەستپێشخەریی کردووە، ئایا هاوبەشێکی هەڵبژاردووە لە مامەڵەکردندا توانای دابینکردنی بەخشینی هەیە، هەروەها ئایا چەندە هاندەری بۆ ئامادەکردووە تا هاوبەشەکەی بەخشین پێشکەش بکات.

بێجگە لەم تیۆرە سەبارەت بە دروستبوونی خۆشەویستی، چەندەها تیۆری دیکەش هەن، زۆربەی زۆری ئەم تیۆرانە چۆنێتی

و هۆکارەکانی سەرهەڵدانی کێشکردنی نێوان دوو تاک شی دەکەنەوە، لەنێو ئەم تیۆرانەدا:

**١- تیۆری مۆرکوەرگرتن یان گونجان:**

ئەم تیۆرە ئەوە ئاشکرا دەکات، سەرنجڕاکێشانی تاک بەرامبەر بە کەسێکی دیکە، لەو هەستەوە پەیدا دەبێ کە تاک لە ئامادەبوونی ئەو کەسەدا هەست بە گونجان دەکات.

**٢- تیۆری ئاڵوگۆڕکاریی کۆمەڵایەتی:**

پوختەکەی ئەوەیە، چەندە تاک چالاکی تاکێکی دیکە بە هەند وەربگرێ و بە باشی هەڵیبسەنگێنێ، ئەوەندە سەرنجڕاکێشانی بەرامبەر ئەو تاکە زیاد دەبێت. چەندە ژمارەی ئەو کات و بۆنانە زیاد بکەن کە کارلێک لە نێوان دوو تاکدا ڕوو دەدات، ئەوەندە سەرنجڕاکێشانی نێوانیان زیاد دەکات (هومانز Homans 1961).

**٣- تیۆری پێکەوەژیان:**

ئەم تیۆرە سەرنجڕاکێشانی نێوان دوو تاک لەسەر ئەو بناغەیە لێک دەداتەوە، تاک بەزۆری کەسێ هەڵدەبژێرێ کە هەست دەکات نزیکە لێیەوە و پێی وایە لە کەسانی دیکە زیاتر دەتوانێ پێداویستییەکانی بۆ دابین بکات و ڕازیی بکات. (ونچ Winch 1958).

**٤- تیۆری ئەقڵی:**

ئەم تیۆرە پێی وایە ڕەفتارمان بەرامبەر بە یەکدی کار دەکاتە سەر سەرنجڕاکێشانمان بەرامبەر بە یەکدی. دویچ و سلمون Deutch and Solomo (1959) پێیان وایە: ' ئێمە ئەو کەسانەمان خۆش دەوێ کە خۆشیان دەوێین، بەڵام ئەمە تەنیا لەو بارەدا ئەگەر ئێمە خۆمان خۆش بوێت، ئەگەر خۆمان خۆش نەوێ، ئەوا گوێ نادەین بە خۆشەویستیی ئەو کەسانەی کە

خۆشیان دەوێین، چونکە ئەم حاڵەتە دەبێتە هۆی ڕوودانی کۆژانی ئەقڵی بۆمان".

ئەم تیۆرە لەگەڵ وتەکانی تۆما ئاکوییینیدا کۆکە کە جیاوازیی کردووە لە نێوان خۆشەویستیی سروشتی و ئەو خۆشەویستییەی لە سەروو خۆشەویستیی سروشتییە. دەربارەی خۆشەویستیی سروشتی دەڵێ: ئەو خۆشەویستییەیە کە تاک هەوڵ دەدات بە شوێن ئەو شتانەدا بگەڕێ کە لەگەڵیدا دەگونجێن و بەپێی سروشتی خۆی دەجووڵێنەوە".

ئەم تیۆرە پادشا ڕیچاردی سێیەممان بیر دەخاتەوە کە نەیتوانی هیچ کەسێکی خۆش بوێت، چونکە نەیتوانی خۆی خۆش بوێت.

### جۆرەکانی خۆشەویستی

لەوانەیە ئەو هەڵە سەرەکییەی زۆربەی ئەو کەسانە دەیکەن، کە گرنگی بەم سۆزە دەدەن، لە سۆنگەی ئەو وێنایەوە دروست بووبێ، کە یەک سۆزی تەنیا و دیاریکراو هەیە و پێی دەوترێت خۆشەویستی. ئەوەی ئەم بۆچوونە هەڵەیەی بەهێز کردووە ئەو بونیادە ئەدەبی و شیعری و شارستانییەیە کە زاراوەکەی لەسەر بنیادنراوە و ئەم بنیادنانەش لەگەڵ ڕوخسار و سیفەتەکانی خۆشەویستیدا گونجاوە. ئەم جۆرە ڕایە ڕێگە بە بوونی سیفەت و خەسڵەتی دیکە بە خۆشەویستی نادات، بەڵام ئەگەر ئێمە بڕوا بەم بۆچوونە بهێنین، واتە بڕوامان وا بێت کە خۆشەویستی تەنیا سۆزێکی دیاریکراوە، ئەوا لە تێگەیشتن لە ڕەگوڕیشەی ئەم سۆزە و گەشەکردنی و ئەو وزانەی کە دەیبەخشێ، دوور دەکەوینەوە.

لە ئەنجامی بەدواداچوونی مێژووی سەرهەڵدانی ئەم زاراوەیە و پەرەسەندنی، بۆمان دەردەکەوێ کە جۆری دیکە لە خۆشەویستی پەیدا بووە، جگە لەو خۆشەویستییەی لە سەرەتادا

هەبووە (ئەو جۆرەی کە لە ئەفسانەکاندا باس کراوە). دەشێ ئەم جۆرانەی دیکە جیاواز بن لەو خۆشەویستییەی کە لە چیرۆکی ئادەم و حەوادا باس دەکرێ کە ئاماژەیە بۆ تێکەڵەیەک لە سۆز و فریودان لە نێوان نێر و مێدا. لەم سەرەتایانەوە جۆرەکانی سۆزی خۆشەویستی پەرەیان سەند و خۆشەویستیی دیکەیان لەخۆ گرت، وەک خۆشەویستیی هاورێیەتی و خۆشەویستیی سوودگەرایی و خۆشەویستیی شەهوەت، هەروەها هەریەک لەم زاراوانەی دیکەش هاتنە ئاراوە: خۆشەویستیی پاکیزەیی، خۆشەویستیی ئەفلاتوونی، خۆشەویستیی ڕۆمانسی، خۆشەویستیی دادپەروەری و خۆشەویستیی ئازادی و چەندەها جۆری دیکەی خۆشەویستی. خۆشەویستیی مرۆیی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، بەپێی گەشە و پەرەسەندنی بۆ پێنج جۆر پۆلێن کرا کە ئەمانەن: خۆشەویستیی دایک، خۆشەویستیی منداڵ بۆ دایکی، خۆشەویستیی خزم و کەسوکار، خۆشەویستیی باوک و ئەو خۆشەویستییەی کە دوو توخمەکە پێکەوە دەبەستێ.

خۆشەویستیی منداڵ بۆ دایک لە ئەنجامی پەیوەستکردنی ڕوخسار و شێوەی دایک لەگەڵ پرۆسەی شیردان، دروست دەبێ. تێبینی دەکرێ کۆمەڵێک ڕەگەزی هاوبەش هەیە لە نێوان خۆشەویستیی منداڵ بۆ دایک، لەگەڵ خۆشەویستیدا بە شێوەیەکی گشتی، لە هەردووکیاندا دەبینین پەیوەندیکردن لەڕێی چاو و بەرکەوتنی جەستەییەوەیە و هەردووکیان حەوانەوە و چێژ دەبەخشن. لەبەر ئەوە هەر دەبێ ئەو پرسیارە بورووژێ، ئایا هیچ پەیوەندییەک هەیە لە نێوان سێکس و ئەم جۆرە لە خۆشەویستی؟ هەروەها ئایا پەیوەندیی سێکسی لە ئایندەی منداڵدا لەسەر ئەم بناغە بایۆلۆژییەی پەیوەندیی نێوان دایک و منداڵ دروست دەبێ؟ هەرچی پەیوەندیی خۆشەویستیی نێوان هاوتەمەنەکانە لە هەمان توخم یان دوو توخمی جیاواز لەگەڵ یەکدی، ئەوا ماوەیەکی

زەمەنیی درێژتر دەخایەنێ، هەرچەندە زۆربەی ڕوخسارەکانی ئەم خۆشەویستییە وا دەردەکەون کە ئەفلاتوونی بن، بەڵام دەشێ مێردمنداڵ ئامادە بکات بۆ هەستکردن بە سەرهەڵدانی خۆشەویستییەک لە ئایندەدا کە پڕ بێ لە شەیدایی، هەروەها دەشێ مێردمنداڵان لەڕێی یارییەوە، مەبەستێکی کۆمەڵایەتیی گرنگ بەدی بێنن کە بریتییە لە خۆئامادەکردن بۆ قۆناغەکانی خۆشەویستیی نێوان دوو توخمەکە لە ئایندەدا. قۆناغەکانی خۆشەویستیی نێوان دوو توخمەکە، لەنێو کۆی گەشەی سۆزداریدا، قۆناغگەلێکی سروشتین و پشت بە کامڵبوونی پرۆسەی بەرکەوتنی جەستەیی و قبوڵکردنی دەبەستێ، هەروەها ئەم پرۆسەیە لە پەیوەندیی نێوان منداڵ و دایکەوە دەست پێ دەکات و لەڕێی پەیوەندیکردن و بەرکەوتنی منداڵان لەگەڵ یەکدی لە کاتی یاری و تا قۆناغی مێردمنداڵی بەردەوام دەبێ، قبوڵکردن و ڕازیبوونی منداڵ بەم بەرکەوتنە، دەشێ متمانە و قبوڵکردنی تاک بە کەسانی دیکە بگەیەنێ، کاتێک تاک بەم قۆناغە گەشەکردووەی خۆشەویستیی نێوان دوو توخمەکە دەگات، بە تەواوەتی کۆتایی بە قۆناغی خۆشەویستی لەگەڵ هاوڕێ و هاوەڵەکانیدا ناهێنێ، دەکرێ بەو شێوەیە تەماشای ئەم قۆناغە لە خۆشەویستی بکەین کە قۆناغێکی تایبەتمەندترە، وەک ئاشکرایە پێش ئەو کاتە دەست پێ دەکات کە پەیوەندیی سێکسی لە نێوان دوو توخمەکەدا دروست دەبێ. پێکهاتەکانی ئەم قۆناغەی خۆشەویستی لە خەسڵەتی جووتتوخمی تاکدا هەیە، لە "نێر"دا لە شێوەی هەڕەشە و ڕۆحی دەسەڵات و لە "مێ"شدا لە شێوەی ڕەفتاری فریودەرانەدا تێبینی دەکرێ.

جۆن لی‌Lee(1973) لە کتێبەکەیدا بەناوی (ڕەنگەکانی خۆشەویستی)، خۆشەویستیی بۆ شەش جۆری ئاشکرا پۆلێن کردووە، بە ڕای ئەو ئەم جۆرانە نموونەیین، هەروەها لە نێوان

خۆیاندا ئاڵوگۆڕکراون و هەر هەموویان واقعین، دەشێ تاک بە جۆرێکیان یان چەند جۆرێکیان لە یەک کاتدا، بناسرێ، هەروەها خۆشەویستی دەشێ شتی جیاواز بگەیەنێ لای خەڵکانی جیاجیا، هەروەها خۆشەویستی سۆزێکە لە یەک کاتدا هەست و فیکر لەخۆ دەگرێ. شەش جۆرەکەی کە جۆن لی پۆلێنی کردوون، ئەمانەن:

١- هاوڕێیەتیی هەمیشەیی Storge.

٢- خۆشەویستیی چەقبەستوو لەسەر کەسانی دی Agape.

٣- مانیا- یان خۆشەویستیی پشتبەستنی توند Mania.

٤- خۆشەویستیی لۆژیکیی ماقووڵ Pragma.

٥- خۆشەویستیی چەقبەستوو لەسەر خود Ludus.

٦- خۆشەویستیی ڕۆمانسی Eros.

ئەم پۆلێنە کراوە بە بناغە بۆ خۆشەویستی و دیاریکردنی جۆرە باوەکانی خۆشەویستی لەو کەسانەدا کە سەر بە بنەچەی یان شارستانیی جیاوازن، هەروەها کراوە بە بناغە بۆ دیاریکردنی جیاوازییەکانی نێوان نێر و مێ. لە لێکۆڵینەوەکەدا دەرکەوتووە کە پیاوان زیاتر لە ژنان بیریان لەسەر خۆیان چڕ دەکەنەوە، واتە خۆویستترن، هەروەها شەهوانیتریشن.

لە کاتێکدا ژن کەمێک لە پیاو زیاتر خۆشەویستیی پشتبەستنیان بە کەسانی دیکە، واتە مانیا، هەیە، هەروەها لە خۆشەویستیی هاوڕێیەتیی هەمیشەیی و خۆشەویستیی لۆژیکی (ماقووڵ) ڕێژەی ژن لە پیاو زیاترە. لە چڕکردنەوەی خۆشەویستیی لەسەر کەسێکی دیکە، هیچ جیاوازییەک لە نێوان نێر و مێدا نەبوو. یەکێک لە توێژینەوە بەراوردکارییەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە مێ لە دوورگەی هوای(*) لە پیاو زیاتر خاوەنی خۆشەویستیی چەقبەستووە لەسەر کەسانی دیکە، لە کاتێکدا لەنێو دانیشتووانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا لەم خۆشەویستییەدا هیچ جیاوازییەک لە نێوان نێر و مێدا نییە.

**شەش خەسڵەتەکەی خۆشەویستی**

**بەم شێوەیە پوخت کراوەتەوە:**

١- خۆشەویستیی هاوڕێیەتی (هاوسۆزی، پشتبەستن بە یەکدی و دەربڕینی هەستەکانی ناو ناخ و دەروون و دڵسۆزی لە دابینکردنی پێداویستیدا).

٢- خۆشەویستیی چەقبەستوو لەسەر کەسانی دی (لێبووردەیی و بەخشینی ئەو کەسەی خۆشمان دەوێ و گوێنەدان بە هەڵە و سەرپێچییەکانی و چاودێریکردنی و بایەخدان بە بەختەوەری، تەنانەت قوربانیدان بۆی، ئەگەر ئەوە لە بەرژەوەندیی ئەودا بوو).

٣- خۆشەویستیی پشتبەستن (مانیا)، بە زاڵبوونی سۆز و هۆگربوون بەو کەسەوە دەناسرێ کە خۆشمان دەوێ. لەم خۆشەویستییەدا، تاک تووشی لەدەستدانی ئارەزووی خۆشەویستی و خەوزڕان و بێتوانایی لە بیرکردنەوەی لۆژیکییانەدا دەبێ، هەندێجار تووشی هەڵچوون و هەندێجار تووشی خەمۆکی دەبێ، هەروەها بەدەست دڵەڕاوکێیەکی زۆرەوە و پشێوی لە پەیوەندیکردنی سێکسیدا دەناڵێنێ.

٤- هەرچی خۆشەویستیی لۆژیکی، یان قورس و سەنگییە، بریتییە لەو خۆشەویستییەی کە خۆی دەنوێنێ لە دوورکەوتنەوە لە هەڵبژاردنی ئەو کەسەی کە شایستەی خۆشەویستی نییە. ئەو تاکەی بەم شێوەیە کەسێکی خۆش دەوێ بە وردی شایستەیی ئەو کەسە هەڵدەسەنگێنێ و بەهاکەی مەزەندە دەکات بەر لەوەی بکەوێتە ناو داوی خۆشەویستیی ئەو کەسەوە، هەروەها پارێزگاری لە خۆشەویستەکەی دەکات و دەیپارێزێ مادام خۆشەویستەکەی داواکانی بۆ جێبەجێ دەکات. لە خەسڵەتەکانی ئەم خۆشەویستییە ئەوەیە، تاک هەوڵ دەدات ئەو پێداویستییانە فەراهەم بکات کە پێگەی خۆشەویستەکەی بەرز دەکەنەوە، چونکە

ئەمانە بەهای خۆشەویستەکەی زیاد دەکەن، هەروەها ئەو تاکەی کەسێکی بەم جۆرە خۆشەویستییە خۆش دەوێ بە پەرۆشە بۆ هەڵسەنگاندنی بەهای خۆشەویستەکەی لەڕێی دابینکردنی ئەو توانا ماددی و مەعنەوییانەی کە پێشتر خۆشەویستەکەی لە خێزانەکەی خۆیدا تیایدا ژیاوە.

٥- بەڵام ئەو خۆشەویستییەی کە لەسەر خود چەق دەبەستێ (خۆویستی)، ئەو تاکەی خاوەنی ئەم خۆشەویستییەیە، وەک ئەو کەسە وایە کە یارییەک دەکات، یان مەتەڵێک حەل دەکات، تەنیا خەمی ئەوەیە خۆی بیباتەوە و بەهرەمەندی و توانستەکانی دەربکەون و پێگەی بەرز بێتەوە، هیچ بە لایەوە گرنگ نییە لەپێناوی بەدیهێنانی ئەم پێداویستییانەیدا، لە یەک کاتدا چەند کەسێکی خۆش بوێت. لایەنی سێکسی لەم جۆرە خۆشەویستییەدا، لایەنێکی خۆپەرستی و داگیرکارییە. سروشتی پەیوەندیی سێکسی لەم خۆشەویستییەدا بە خۆپەرستی و ڕازیکردنی خود دەناسرێ، بێ گوێدان بە هاوبەشەکەی. پاراستنی ئەو کەسەی کە خۆشی دەوێت، لەسەر بناغەی هەنووکەیی دامەزراوە و هەمیشە ئەو کەسە ئەو ئەگەرەی لە بەرچاوە کە دەشێ خۆشەویستەکەی لەدەست بدات ئەگەر هیچ سوودێکی نەبێ و بە ئاسانی دەتوانێ بۆ لای کەسێکی دیکە بچێ و خۆشی بوێت، ئەگەر بەرژەوەندیی لەگەڵیدا گونجا.

٦- خۆشەویستیی ئیرۆسی (ڕۆمانسی)، ئەو خۆشەویستییەیە کە بڕوای بە خۆشەویستییە لە یەکەم نیگاوە و بڕوای بە کەوتنە ناو خۆشەویستی هەیە. تاک لەم خۆشەویستییەدا کە کەسێکی خۆش دەوێ، دەیەوێ تەواوی وردەکارییەکانی خۆشەویستەکەی لە یاد بێ، هەموو شتێ دەربارەی خۆشەویستەکەی بزانێ، لە ڕووی کەسێتی و نەریت و حەز و ئارەزووەکانەوە، تا دەگاتە ئاستی گەیشتن بە ناسنامەیەکی هاوبەش بۆ هەردووکیان (واتە

خۆی و خۆشەویستەکەی). ئەو کەسانەی ئەم خۆشەویستییە دەکەن، هەر زوو ئارەزووی پەیوەندیی سێکسی دەکەن لەم خۆشەویستییەدا.

هەروەها هەمیشە هەوڵ دەدات لەڕێی هەرچی هۆکار و ئاماژە و دەستپێشخەرییەکەوەیە دڵی خۆشەویستەکەی ڕازی بکات.

ئەو درەئەنجامانەی کە لەم لێکۆڵینەوەیە دەست کەوتوون، زۆرن، لێرەدا گرنگەکانیان باس دەکەین:

١- ئەو جیاوازییانەی کە لە شێوازەکانی خۆشەویستیدا هەن، جیاوازیی شارستانین، نەک بۆماوەیی.

٢- ژن لە پیاو زیاتر ڕووەو خۆشەویستیی هاوڕێیەتی و خۆشەویستیی سەنگین دەڕوات. بەم شێوەیە ژن لە لایەکەوە لە پیاو ئەقڵانیترە، لە لایەکی دیکەشەوە کەمتر ئارەزووی خۆشەویستییەکی ڕۆمانسی دەکات کە لایەنی ئابووری و تەندروستی و هاوژیانیی هاوسەرێتیی تیادا فەرامۆش کراوە، لەبەر ئەوە توانایەکی باشتری بۆ دەسەڵاتگرتن بەسەر سۆزەکەیدا هەیە.

٣- جیاوازییە شارستانییەتەکان دەشێ هانی جۆرێک لە خۆشەویستی بدەن و لە خۆشەویستییەکی دیکە بە لایانەوە خوازراوتر بێ، هەروەک لە دوورگەکانی هوای ڕوو دەدات کە بنەچەیان بەزۆری خۆرهەڵاتییە، کاتێک پیاو ژنێکی خۆش دەوێ، ڕووەو خۆشەویستییەک ئاڕاستە دەگرێ کە بایەخ لەسەر خۆشەویستەکەی چڕ دەکاتەوە لە خۆی خوازراوتر دەبێ.

٤- خۆشەویستیی خاوەندارێتی، یان پشتبەستن لە ژناندا زیاتر ڕوو دەدات، ئەمەش شتێکی لۆژیکییە لە بارودۆخە کۆمەڵایەتی و ئابوورییە باوەکان و پێگەی ژن تیایدا. لەم بارودۆخانەدا ژن هان دەدرێ بۆ ئەوەی سۆز و خۆشەویستی خۆی ئاڕاستەی پیاوێ بکات و وەک پاڵپشت و زەمانەت و هێز لە ژیانیدا لێی بڕوانێ. ئەم

جۆرە پاڵنەرانە وا لە ژن دەکەن خۆشەویستییەکی داگیرکارانەی هەبێ و غیرە بکات.

٥- هەرچی خۆشەویستیی ڕۆمانسییە کە لە خەسڵەتە سەرەکییەکانی پەلەکردن و سەرنجراکێشانی جەستەیی و بیرکردنەوەی ڕۆمانسییانەیە، لێکۆڵینەوەکان ئاماژە دەدەن کە پیاوان لە ژنان لە خۆشەویستییاندا ڕۆمانسیترن، بەڵام لێکۆڵینەوەی دیکە هەن پێچەوانەی ئەمە دەڵێن و پێیان وایە ژنان ڕۆمانسیترن، یان لە نێوان ڕۆمانسییەتی زۆر و ڕۆمانسییەتی کەمدا، هاتوچۆیانە. هۆکاری ئەمە لێکدەدرێتەوە بەپێی هەستکردنی ژن بە پاڵنەرە سێکسییەکەی و بە سۆزی ڕۆمانسی، یان توانای بۆ دەربڕین و ئاشکراکردنی ئەوەی هەستی پێ دەکات.

٦- لێکۆڵینەوەکان ئاماژە بەوە دەدەن، پێکهاتەکانی خۆشەویستیی سۆزداری و ئەقڵی لە یەکدی جیان و سەربەخۆن، توندیی سۆز پەیوەندیی بە ناوەڕۆکی ئەقڵیی جۆرێک لە خۆشەویستییەوە نییە.

### توانای بزاوتنی خۆشەویستی

تیۆری توانای بزاوتنی پێداویستییە مرۆڤایەتییەکان، تیۆرێکی گریمانەکراوە، ئامانجی گەیشتنە بە لێکدانەوەی خۆشەویستی و سروشتیی سۆزی خۆشەویستی. ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵی داوە لە ڕووی زانستییەوە ئەم تیۆرە بیسەلمێنێ، کە لە شێوەی ئەم هاوکێشەیەدا مەبەستەکانی خستووەتە ڕوو:

پ ج + ن ج= ب

پ ج: پێداویستییە جەستەییەکان

ن ج: پێداویستییە ناجەستەییەکان کە بریتین لە پێداویستییە کۆمەڵایەتی و دەروونییەکان

ب: بڕێکی جێگیر

بەم شێوەیە چەندە کۆمەڵگە لە ڕووی تەکنیکەوە پێشکەوتووتر بێ، ئەوەندە تێرکردنی پێداویستییە فسیۆلۆژییەکان زیاتر، هاوکات دەبێ لەگەڵ جەختکردنی زیاتر لە پێداویستییە کۆمەلایەتی و دەروونییەکان (باردیس Bardis 1957).

تیۆرەکەی باردیس سەبارەت بە توانای بزاوتنی خۆشەویستی لە پێنج گریمانە پێک دێ:

١- هەموو خۆشەویستییەکی نێوان دوو توخمەکە، دەرئەنجامی پێداویستیی جەستەیی و ناجەستەییە و بۆ تێرکردن و ڕازیکردنیان هەوڵ دەدرێ.

٢- ئەم پێداویستییانە قابیلی گۆڕانیان هەیە، بۆ نموونە شکستهێنان لە تێرکردنی پێداویستییەکی جەستەیی یان ناجەستەیی، دەشێ بۆ پێداویستییەکی جەستەیی یان ناجەستەیی دیکە بگۆڕێ.

٣- کاتێک بابەتی خۆشەویستی (یان ئەو کەسەی کە مرۆڤ خۆشی دەوێ) لە تێرکردن و ڕازیکردنی پێداویستییەکانی تاک دەوەستێ، بابەتێکی دیکە (واتە کەسێکی دیکە) دەشێ جێگەی بگرێتەوە.

٤- کاتێک خۆشەویستیی نێوان دوو هاوبەش بەهێز دەبێ، یان بە نزیکی تێروتەواو دەبێ، لەم بارەدا بەزۆری تێرکردن و ڕازیکردنی پێداویستییە جەستەیی و ناجەستەییەکان بەزۆری لاواز یان نایەکسان دەبن، واتە هەندێک لەو پێداویستییانە زیاتر لەوانی دیکە تێر دەکرێن.

باردیس پێوەرێکی بۆ پێوانەی خۆشەویستیی نێوان دوو توخمەکە داناوە کە ناوی ناوە (ئیرۆتومیتەر Erotometer) و لە پەنجا یەکە پێکهاتووە، هەر یەکەیەکی پێوانە، بەهایەکی هەیە، لە سفرەوە دەست پێ دەکات (کە بە تەواوەتی لە خۆشەویستی

بەدەرە) تا دەگاتە ١٠٠٠ کە بەرزترین ئاستە (خۆشەویستی لەم ئاستەدا تێروتەواو یان کامڵە).

بارديس توێژینەوەکەی لەسەر کۆمەڵی جیاواز لە پەیوەندیی نێوان دوو توخمەکە ئەنجام دا کە ئەمانە بوون:

**١- هاوبەش لە هاوسەریێتیدا.**

**٢- خوێندکاری کوڕ لە کۆلێژەکان.**

**٣- خوێندکاری کچ لە کۆلێژەکان.**

**٤- خێزانەکان.**

لێکۆڵینەوەکە کۆمەڵێک دەرئەنجامی گرنگی دەستکەوت کە تا ئاستێکی زۆر پشتیوانی لە تیۆری خاوەنەکەی دەکەن سەبارەت بە سروشتی خۆشەویستی و پێداویستییەکانی:

١- لە لێکۆڵینەوەکەدا چەند ئاستێک لە تێرکردن و ڕازیکردنی پێداویستییە جەستەیی و ناجەستەییەکان دەرکەوتوون، یەکەمیان ئاستی بەرزیی پێوانەی ئیرۆتومیتەر، کە ئاستێکی بەرز و یەکسانی تێرکردن و ڕازیکردنی پێداویستییە جەستەیی و ناجەستەییەکانە. توێژەر ئەم جۆرە خۆشەویستییەی بە خۆشەویستیی ئۆرفیوس- یوردیس Orpheus- Euridice شوبهاندووە، ئەم خۆشەویستییە بەوە ناسراوە کە زۆر بەهێز بووە و توانای ڕازیکردن و تێرکردنی پێداویستییە جەستەیی و ناجەستەییەکانی هەبووە.

هەرچی ئاستی دووەمە کە جەخت لەسەر لایەنە جەستەییەکان دەکاتەوە، بریتییە لە خۆشەویستییەکی ناتەواو، یان ناکامڵ. توێژەر بە خۆشەویستیی زیوس Zeusی شوبهاندووە. هەرچی ئاستی نزمی پێوەری ئیرۆتومیتەرە، بریتییە لەو خۆشەویستییە نووقسانەی کە جەخت لەسەر ڕەگەزە جەستەییەکان دەکاتەوە، لەگەڵ بوونی شکستهێنان لە ڕووی جەستەییەوە. توێژەر ناوی لێ ناوە (پنولۆپی Penelopy).

٢- دەرئەنجامی لێکۆڵینەوەکە ئاماژە بەوە دەدات، لە زۆربەی تاکەکاندا بەخشینی خۆشەویستی گرنگتر بووە لە وەرگرتن و پێشوازیکردن لێی. لەگەڵ یەکسانیی جەختکردن لەسەر بایەخی وەرگرتن و بەخشین لە خۆشەویستیدا.

٣- ڕای زاڵ ئەوەیە خۆشەویستیی جەستەیی بایەخی کەمترە لە خۆشەویستیی ناجەستەیی. هەرچەندە پیاوان لە ژنان زیاتر (لەنێو ئەوانەی هاوسەرێتییان کردووە) زیاتر خۆشەویستیی جەستەییان هەڵسەنگاندووە.

٤- وەڵامدانەوە بۆ ڕەگەزە ناجەستەییەکان لە خۆشەویستیدا لەنێو کچە خوێندکارانی زانکۆدا زیاتر بووە وەک لە دایکاندا. کەمترین ئاست لە دایکاندا تۆمارکراوە.

٥- پەیوەندییەکی گرنگ دۆزراوەتەوە لە نێوان تەمەن لەگەڵ خۆشەویستیی جەستەیی و ناجەستەیی، هەروەها پەیوەستییەکی پۆزەتیڤ بەدی کراوە لە نێوان هەرزەکاران و خۆشەویستیی ناجەستەییدا، بەو مانایەی کە هەرزەکاران بە سۆزێک جیا دەکرێنەوە کە لە ڕووی پێداویستییەوە ناجەستەییە، هۆکاری ئەمەش بەوە لێک دەدرێتەوە کە دەرئەنجامی بێبەشبوونی سێکسی و کۆتوبەندە کۆمەڵایەتییەکانە، بەڵام دواتر وردەوردە هەرزەکار ڕووەو خۆشەویستی جەستەیی ئاڕاستە دەگرێ، ئەم دیاردەیە لە ژیانی مێدا زاڵترە بەراورد بە نێر.

٦- پێچەوانەی ئەو دیاردەیەی پێشوو لە باواندا ڕوو دەدات، دەرکەوتووە بەگشتی دایکان خاوەنی پێوەرێکی نزمترن لە ڕووی بایەخی خۆشەویستیی جەستەیی و خۆشەویستیی ناجەستەییەوە، ئەمەش لە بایەخی بەخشینی خۆشەویستیدا دەردەکەوێ، بەڵام پێوەرەکەیان لە بابەتی ئارەزوویان بۆ دەستکەوتنی خۆشەویستی، لە ئاستێکی بەرزدایە.

٧- فاکتەرە ئایینییەکان کار دەکەنە سەر ڕوانین بۆ خۆشەویستیی ناجەستەیی و جەستەیی پەیوەستە بە ڕوانین بۆ خۆشەویستی، ئەم پەیوەستییە کۆکە لەگەڵ ئەو ڕایەدا پێی وایە هەرچەندە ئاستی ڕۆشنبیری بەرزبێتەوە، ئاستی خۆشەویستیی جەستەییش لەگەڵیدا زیاد دەبێ.

ئەم لێکۆڵینەوەیەی کە ئاماژەمان پێ دا، بایەخی خۆی هەیە، نەک تەنیا لەبەر ئەوەی هەوڵی داوە پێوانەی خۆشەویستی بکات، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەو ڕەگەزانەی ئاشکرا کردووە و پێوانە کردووە کە خۆشەویستییان پێک هێناوە، ئەوانیش بریتین لە ڕەگەزە جەستەیی و ڕەگەزە ناجەستەییەکان: (کۆمەڵایەتی و دەروونییەکان)، هەروەها ئەوەشی ڕوون کردووەتەوە کە ئەم سۆزە بڕێکی جێگیر نییە، بەڵکو توانای بزاوتن و جووڵەی هەیە و گەشە دەکات و گۆڕانی بەسەردا دێ، بەهۆی کاریگەریی تەمەن و سروشتیی پەیوەندی و ئایین و ئاستی ڕۆشنبیری و چەندەها فاکتەری دیکەوە، کە دەشێ پێداویستییە جەستەیی یان ناجەستەییەکان کەم یان زیاد بکەن.

## خۆشەویستی و پێداویستییە مرۆڤایەتییەکان

لەو تیۆرانەی کە دەشێ لێکدانەوە بۆ خۆشەویستی بکات، تیۆرەکەی ماسلۆ Maslowیە (١٩٥٤)، کە وا گریمانە دەکات هاندەرە مرۆییەکان لە ژیانی مرۆڤایەتیدا لە شێوەی هەرەمێکیی پلەدارداییە کە بەرەو سەرەوە هەڵدەکشێ. ماسلۆ ئەم پێداویستییانەی کردووە بە دوو جۆرەوە: ئاستی یەکەم کە نزمترین ئاستی هەرەمەکە بریتییە لە پێداویستییە سەرەکییە دونیاییەکان، هەرچی جۆری دووەمە لە بەرزترین ئاستی هەرەمەکەدایە و ئەو پێداویستییانە لەخۆ دەگرێ کە ناوی ناون بەها وجوودییەکان، پێداویستییە سەرەکییەکان، یان دونیاییەکان بریتین لە پێداویستییە فسیۆلۆژییەکان، وەک برسێتی و

تینوێتی و سێکس، پاش ئەمانیش پێداویستییەکانی دڵنەوایی و دڵنیابوون لە زیان پێ نەکەوتن دێن و دواتریش پێداویستییەکانی گەشە و خۆشەویستی دێن، لە پلەیەکی بەرزتریشدا پێداویستی ڕێزگرتن لە خود لە لایەن خود و کەسانی دیکەوە دێت. هەرچی پلەی بەرزی پێداویستییە مرۆڤایەتییەکانە، واتە بەها وجوودییەکان، بریتییە لە پێداویستیی تاک بۆ بەدیهێنانی تواناکانی خود، ئەویش بەها وجوودییەکان و پاڵنەرەکانی گەشە لەخۆ دەگرێ. لەم پەیژە پلەکراوەوە خۆشەویستی لە چەند ئاستێکدا دەردەکەوێ، نزمترینیان ئاستی سێکسییە، کە ماسلۆ بەم شێوەیە بەدوای یەکدا ڕیزی کردوون: ئاستی پێداویستییە فسیۆلۆژییە سەرەکییەکان، پاشان ئاستی ئینتیما و خۆشەویستی کە خەڵکی لە نێوان یەکدیدا پێکەوە دەبەستێ کە لە تێرکردنی پێداویستیی سێکسی تێدەپەڕێ، پاشان بەرزترین ئاست و دوا ئاست بریتییە لەو ئاستەی کە خۆشەویستیی مرۆڤ ڕووەو شتە جوان و دادپەروەر و کامڵەکان ئاڕاستەدەگرێ کە ئەمە بەرزترین پلەکانی خۆشەویستییە، لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەبێ تاک بەم پلەبەندییەی پێداویستییە مرۆڤایەتییەکاندا تێپەڕێ، بەڵام سەلماندنی ئەم جۆرە پلەبەندییە کە ماسلۆ دایناوە، تا ئێستا لە ڕووی زانستییەوە نەسەلمێنراوە، ئەمەش ئامانجێکە گەیشتن پێی لەم بابەتەدا کارێکی قورسە.

### پۆلێنەکەی ئیبن حەزمی ئەندەلووسی بۆ خۆشەویستی

یەکێک لە پۆلێنە دەگمەنەکان بۆ خۆشەویستی، پۆلێنەکەی ئیبن حەزمی ئەندەلووسییە. ئەم پۆلێنە لەبەر چەند هۆکارێک بایەخی خۆی هەیە، لەوانە: بەرفراوانترین پۆلێنە بۆ خۆشەویستی کە لەو سەردەمەدا دانراوە، هەروەها لە هەموویان وردترە. ئیبن حەزمی پۆلێنەکەی لە چوارچێوەی توێژینەوەیەکی وردی دەروونیدا ئەنجام داوە دەربارەی ماهییەتی خۆشەویستی و ناوی ناوە

(گەردنبەندی کۆتر لە هۆگربوون و بەڵێندا). ناوی جۆرەکانی خۆشەویستیی هێناوە و جیاکاریی لە نێوانیاندا کردووە، بەم شێوەیە: "...ئەوەی جەخت لەم وتەیە دەکاتەوە ئەوەیە، ئێمە دەزانین خۆشەویستی چەند جۆرێکی هەیە، باشترینیان خۆشەویستیی خوایە، بەڵام کۆششکردن لە کاردا، خۆشەویستیی خزم و کەسوکار، خۆشەویستیی هۆگربوون و هاوبەشی لە داواکاریدا، خۆشەویستیی هاوڕێیەتی و مەعریفە، خۆشەویستیی مرۆڤ بۆ براکەی و چاکەکردن لەگەڵیدا، خۆشەویستیی پارێزگاریکردن لە ماڵ و سامانی ئەو کەسەی خۆشت دەوێ، خۆشەویستیی نێوان دوو کەس لەپێناوی نهێنییەکدا کە هەردووکیان دەیانەوێ پێکەوە بیپارێزن لە ئاشکرابوون، خۆشەویستی بۆ گەیشتن بە چێژێک، هەموو ئەم جۆرانەی خۆشەویستی بە لەناوچوونی هۆکارەکانیان، خۆشیان لەناو دەچن، بە زیادبوونی هۆکارەکانیان زیاد دەبن و بە کەمبوونەوەیان کەم دەبنەوە، بەڵام ئەشقی ڕاستەقینە بەردەوام لە کڵپەسەندندایە، تا مردن فەنابوونی نییە...". سەبارەت بە ماهییەتی خۆشەویستی، ئیبن حەزمی دەڵێت: "خۆشەویستی بەسەرکردنەوەی خوایە، سەرەتاکەی گاڵتەیە و کۆتاییەکەی دڵکارییە، دەرک بە هەقیقەتەکەی ناکەی تەنیا لەڕێی کوژان و ئازارەوە نەبێ". پاشان بەردەوام دەبێت و دەڵێ: " سەبارەت بە ماهییەتی خۆشەویستی، خەڵک بە شێوەی جیاواز بیر دەکەنەوە و شتیان وتووە و درێژدادڕیشیان کردووە، بۆ نموونە دەڵێن خۆشەویستی بەیەکەوەنووسانی نێوان ئەو دوو بەشەی مرۆڤە کە پێشتر خۆیان یەک بوونەوەر بوون پێکەوە، نهێنیی جیاوازی و تێکەولاوبوون لە بوونەوەراندا، بۆ پەیوەندیکردن و جیابوونەوە دەگەڕێتەوە، هەموو شێوەیەک بەدوای شێوەی خۆیدا دەگەڕێ، دژەکان لە یەکدی دووردەکەونەوە، ناکۆکی لە نێوانماندا هەیە، کەواتە لە نێوان

دەروون و جیهانە بێگەردە سووکەکەیدا چۆن پەیوەندی نییە، دەروون ئامادەیە بۆ قبوڵکردنی ڕێککەوتن و مەیل و پەرۆشی و لادان و شەهوەت و ناڕازیبوون، هەموو ئەمانە دەشێ لە هەڵسوکەوتی مرۆڤدا ڕوو بدەن، خوای گەورە دەڵێ: (هو الذی خلقکم من النفس واحدة و خلق منها زوجها لیسکن الیها). ئەوەی لەم پێشەکییەی کتێبەکەی ئیبن حەزمیدا هاتووە، دروستە بە یەکەمین و بەرفراوانترین و وردترین شیکاریی دەروونی دابنێین بۆ ئەم سۆزە مرۆییە لەڕووی وەسف و خستنەڕووی مانا و هۆکار و نمایشکردنی وێنەکانی خۆشەویستی، بۆ نموونە وەک ئەو کەسەی لە خەونیدا ئەو کەسە دەناسێ کە خۆشی دەوێ، یان ئەو کەسەی لەڕێی وەسفەوە کەسێکی خۆش دەوێ، هەروەها ئەو کەسەی لە یەکەمین نیگاوە کەسێکی خۆش دەوێ، ئەو کەسەی تەنیا دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی دووروودرێژ دەتوانێ کەسێکی خۆشبوێ، یان ئەو کەسەی سیفەتێک لە کەسی بەرامبەردا دەدۆزێتەوە کە پێشتر کەس دەرکی بەو سیفەتە لەو کەسەدا نەکردووە، لەبەر ئەو سیفەتە ئەو کەسە دەچێ بە دڵیدا و خۆشی دەوێ،...". ئیبن حەزمی لە پوختەی شیکارەکەیدا بۆ جۆرەکانی خۆشەویستی، ڕایەکی قووڵی هەیە، کە ڕای باشتر لەم بابەتدا لە ڕایەکەی حەزمی بەدی ناکرێ، لەم بارەیەوە دەڵێ: "زانیمان دەروون لەم جیهانە نزمەدا، کە لەنێو بەربەستەکاندا ڕۆچووە، دەرد و نەخۆشییەکان چواردەوریان تەنیوە و مۆرکە زەمینییەکانیان دەورووپشتیان گرتووە، لەبەر ئەوە زۆرێک لە سیفەتەکانی شاراونەتەوە، هەرچەندە هەموو ئەم شتانە نەیانتوانیوە لەناوی بەرن، بەڵام دەروون بێ ئەم سیفەتانەی خۆی ڕێی کردووە، لەبەر ئەوە مرۆڤ تەنیا لەو کاتەدا بە هەقیقەت دەگات کە لە دەرووندا خۆی بۆ ئامادە دەکات و لەدوای ئەوەی بەوە ئاشنا دەبێ کە چی لەگەڵیدا دەگونجێ و لەدوای ئەوەی بە

ڕەوشت و هەڵسوکەوتی خۆشەویستەکەی ئاشنا دەبێ، لەم کاتەدا پەیوەندیکردنی دروست و بێ هیچ بەربەستێ ڕوو دەدات، بەڵام ئەگەر لە یەکەم نیگاوە مرۆڤ بە هەندێ جوانیی جەستە لەڕێی چاوەوە ئاشنا بوو کە لە بینیی ڕەنگەکان تێناپەڕێ، نهێنیی شەهوەت و بوونی لە هەقیقەتدا بۆ ئەمە دەگەڕێتەوە، بەڵام ئەگەر شەهوەت لەو هەستانە جیا کرایەوە و هەستەکان ئاستی شەهوەتیان تێپەڕاند، ئەم جیاکردنەوەیە هاوکات بوو لەگەڵ پەیوەندیکردنێکی دەروونیدا کە تیایدا مۆرک و سروشتەکان لەگەڵ دەروونددا هاوبەش بوون، ئەوا ئەمە پێی دەوترێ ئەشق".

### خۆشەویستی لای ڕازی

خۆشەویستی یان ئەشق لای ڕازی، حاڵەتێکە کە تیایدا ئاشقەکان سنوورێک تێدەپەڕێنن، "...بۆ ئاستی ئاژەڵان دێنە خوارەوە، لە دەسەڵاتگرتن بەسەر نەفس و جڵەگرتنی حەز و ڕامکردنی شەهوەتەکانیدا، ئەوان ڕازی نەبوون، ئەم شەهوەتە، مەبەستم لە چێژی جووتبوونە، لە هەر شوێنێکەوە بێ بیانپێکێ، تا ئەو کاتەی ئەو شوێنەی پێکا کە خۆیان ویستیان، باوەشیان بۆ شەهوەت لەدوای شەهوەت کردەوە، سواری شەهوەت لەدوای شەهوەت بوون، هەوەس ڕامی کردن و ملکەچی حەزەکان بوون، بوون بە کۆیلەیان، ئەم کەسانە بەو ڕەفتارە ئاژەڵییەیانەوە لە ملدان بۆ مۆرک و غەریزە نەوەستان، بەڵکو داوایان لە ئەقڵیش کرد کە خوا جیا لە هەموو ئاژەڵان، بەوانی بەخشی بوو، تا خراپییەکانی هەوەس ببینێ، ویستیان جڵەوی ئەقڵیش بگرن، ببن بە خاوەنی بۆ هەڵزنان و چوون بە شوێن شەهوەتە نەرمەکان و هێورکردنەوەیان و لادان بە لای ئەواندا و پەرۆشبوون بۆیان، پێویستە لەسەریان و ئەوە هەقێکە بەسەریانەوە کە هیچ

مەبەستێکیان لەم شەهوەتانە نەبێ و لەڕێیانەوە بە هیچ حەوانەوە و حەسانەوەیەک نەگەن".

هەروەها ڕازی ڕای ئەو کەسانە پووچەڵ دەکاتەوە کە دەڵێن: "سروشتە ناسکەکان و ئاوەزە نەرمونیانەکان لەسەر ئەشق ڕادێن و هۆگری ئەشق دەبن، هەروەها ئەشق بانگەشەی بێگەردی و گفتشیرینی و جوانی و هەیئەت دەکات"، هەروەها ئەشقی شاعیران و پیاوانی پایەبڵند و سەرۆکەکان و تەنانەت سنوور دەبەزێنن و پێغەمبەران دەهێننەوە بە بەهانە، بەڵام ڕازی پێچەوانەی هەموو ئەمانە دەبینێ: "ناسکی لە مۆرک و سروشتدا و نەرمونیانی لە ئاوەزدا و بێگەردیی ئاوەز، ئەمانە گوزارشت لە سەرپەرشتیکردنی خاوەنەکانیان دەکەن بۆ مەسەلە نادیار و ئاڵۆز و دوورەکان و زانستە نەرم و وردەکان...".

بەڵام بەهانەهێنانەوەیان بۆ ئەشق بەوەی ئەشق لەنێو ئەدیب و شاعیر و پیاوانی پایەبڵند و سەرۆکەکاندا زۆرە، ئەوا ئێمە دەڵێین، چاکەکردن و فەرمانڕەوایەتی و شیعر و ڕەوانبێژی، هیچ کام لەمانە بەبێ کامڵبوونی ئەقڵ و دانایی بوونیان نییە، ئەگەر مەسەلەکە بەم شێوەیە بێ، ئەوا دەشێ ئاشقەکان لەو کەسانە بن کە کەموکوڕییان لە ئەقڵ و داناییدا هەیە... هەرچی ئەو وتەیەشیانە کە دەڵێن ئەشق بانگەشەی بێگەردی و گفتشیرین و جوانی و هەیئەت دەکات، ئەوە دەڵێین: چی لە جوانیی جەستە دەکرێ کاتێ دەروون ناشرین بێ؟ ئایا کێ پێویستی بە جوانیی جەستە هەیە و هەوڵی بۆ دەدات غەیری ژنان و پیاوە نێرەمووکەکان؟ لەم وتانە و چەندانی دیکە ڕاوبۆچوونی ڕازی بەرامبەر بە خۆشەویستی ڕوون دەبێتەوە کە پێی وایە خۆشەویستی هەوڵدانە بۆ گەیشتن بە چێژ، بەڵام هەوڵدانێکی هەڵەیە و ئەمە بۆ خاوەنەکەی ناهێنێتە دی "...ئەو کەسەی وەها وێنای کردووە، بەهەڵەدا چووە، خۆشەویستی بوونێکی پوختە لە ئازار و زیان".

## خۆشەویستیی پاکیزەیی

لە تێگەیشتنی گشتیدا، ئەم خۆشەویستییە لەگەڵ خۆشەویستیی سافۆدا باس دەکرێ کە هەردووکیان لە هەموو مەرامێکی سێکسی بەدەرن. زاراوەکە لای هەندێک کەس تێکەڵاوی دروست دەکات و پێیان وایە مەبەست لە خۆشەویستیی مێیەکی پاکیزەیە. هەندێک لە توێژەران پەیوەندییەکی مێژوویی یان وەسفی دەبیننەوە لە نێوان ئەم خۆشەویستییە و خۆشەویستیی ئەفلاتوونی، یان لەگەڵ خۆشەویستیی ڕۆمانسیدا. لەوانەیە سەرجەم ئەم پەیوەندییانە ڕوون ببنەوە لەدوای بەدواداچوونی سەرهەڵدانی ئەم جۆرە خۆشەویستی و ئامانجەکانی و شێوازەکانی گوزارشتکردن لێی.

خۆشەویستیی پاکیزەیی، یان (الحب العذری) بۆ (بنی عذرة) دەگەڕێتەوە و ناوەکەشی لە ناوی ئەمانەوە هاتووە، (بنی عذرة) یان (بنو عذرة) تیرەیەکی عەرەبین بە تەواوەتی ڕەچەڵەکیان دیار نییە، بەڵام زۆربەی ڕایەکان پێیان وایە سەر بە هۆزی قەزاعەی یەمەنین، لە گوند و لادێکانی تبوک و دیارقەیس نیشتەجێ بوون، لەگەڵ هۆزەکانی دیکەی قەزاعەدا دراوسێ بوون. ئەم هۆزە بە دڵناسکی و ئارەزووکردنی جوانی و هەستی ناسک ناسراون، هەروەها بەوە ناسراون کە بە توندی و ڕاستگۆیانە ئەشق دەکەن و پارێزگاری لە ڕێساکانی داوێنپاکی دەکەن.

زۆربەی ئەم چیرۆکانە کە دەربارەی خۆشەویستیی نێوان تاکەکانی ئەم هۆزە دەگێڕنەوە، ئاماژە بەوە دەدەن خۆشەویستییان بە خۆنەویستی و هۆگربوونی زۆر و سەبر و ددان بەخۆداگرتن ناسراوە و پاشان بەهۆی ئازار و دەردی خۆشەویستییەوە گیانیان لەدەست داوە. لە زۆربەی حاڵەتەکاندا، مێ لەتاو خۆشەویستیی زۆری بۆ خۆشەویستەکەی و لەدەستدانی خۆشەویستەکەی، گیانی لەدەست داوە.

لەنێو هۆزە عەرەبییەکاندا تەنیا هۆزی (بنی عذرة) نەبوون کە ڕۆڵەکانیان لەم جۆرە خۆشەویستییە پاک و بێگەردەدا ژیاون، بەڵکو چەندەها هۆزی دیکەش بە هەمان سۆز و خۆشەویستی ناسراون، وەک هۆزی (بنی عامر) کە بە عامرییەکان بەناوبانگن، کە قەیس کوڕی ملوح و لەیلای عامریە سەر بەم هۆزەن. ئەگەر هۆزی (بنی عذرة) بە خۆشەویستی تا ئاستی مەرگ ناسرابن، ئەوا هۆزی (بنی عامر) بە خۆشەویستی تا ئاستی شێتوشەیدابوون ناسراون، لە نموونەکانیان وەک مەجنون لەیلا واتە قەیسی کوڕی ملوح، هەروەها چەندین چیرۆک و پەخشانی شیعری هەن کە بۆ خەڵکانێک لە هۆزەکانی سەردەمی جاهلی و ئیسلام دەگەڕێنرێنەوە و لەم چیرۆک و شیعرانەدا باسی خەم و ئازارەکانی ئەو کەسانە کراون کە لەم جۆرە خۆشەویستییەدا ژیاون، کە زۆر هۆگری خۆشەویستەکانیان بوون و بێ ئەوەی ئومێدی بەیەکگەیشتنیان هەبووبێ، نەیانتوانیوە دەستبەرداریان ببن. ئەم خۆشەویستییە پابەندبوونێک لە دڵسۆزی و خۆنەویستی و خۆتەرخانەکردن دەسەپێنێ بەسەر ئەو کەسەی هاوبەشی دەکات لەم خۆشەویستییەدا، هەروەها ئەوە دەسەپێنێ بەسەر ئەو پیاوەی ئەم خۆشەویستییە دەکات کە ژیانی وێنەیەکی هاوجێی خۆشەویستەکەی بێ و ئازایەتی و بوێری بخاتە ڕوو تا لە چاوی ئەو ژنەی کە خۆشی دەوێ شایەنی، ئەم خۆشەویستییە بێ.

مشتومڕ هەیە لەسەر ئەوەی ئایا ئەم جۆرە خۆشەویستییە تەنیا تایبەت بووە بە خەڵکانی سەردەمی جاهلی، یان تەنیا سەردەمی ئیسلام؟ هەروەها ئایا لە ژیانی بیابانشینەکاندا زیاتر بڵاوبووە، یان لە ژیانی شارنشینەکاندا؟

توێژەر لەم بابەتەدا نموونەی ئەم خۆشەویستییەی لە سەردەمی جاهلی و ئیسلام و لەنێو بیاباننشین و شارنشینەکاندا دەست دەکەوێ، هەرچەندە شتێکی لۆژیکییە پێشبینیی ئەوە بکەین

که له ژیانی عەرەبی بیاباننشیندا ئەم خۆشەویستییە بەربڵاوتر بووە، چونکە لە کاتی دەستبەتاڵییان زیاتر توانیویانە لە واقیع و لە خەیاڵیشدا، هەست بە لایەنە جوان و دڵڕفێنەکانی سروشت و ژن بکەن.

گرنگترین لایەنی خۆشەویستیی پاکیزەیی بە لای ئێمەوە، ئامانجەکەیەتی لەگەڵ ئاستی پەیوەستبوونی بە لایەنە سێکسییەکانەوە. لەوانەیە گەیشتن بە دیاریکردنی ئەم ئامانجە، یان دیاریکردنی مەودا و سروشتی پەیوەندیی نێوان خۆشەویستیی پاکیزەیی و لایەنە سێکسییەکان، کارێکی ئاسان نەبێ، چونکە زاراوەکە لە ڕواڵەتدا وا دەردەکەوێ کە سۆزێکی ویژدانی باڵادەستە و لەسەر کچێک یان ژنێکی دیاریکراو چەق دەبەستێ کە هیچ ئومێدێک نییە بۆ گەیشتن پێی، یان پەیوەندیکردن لەگەڵیدا. خاوەنی ئەم سۆزە تەنیا ئازار و کۆڕانی خۆشەویستیی بۆ دەمێنێتەوە، لەگەڵ گڕوتینی هۆگربوون کە هەر دەبێ لەناوی بەرێ. بەم شێوەیە وا دەردەکەوێ ئەم خۆشەویستییە خزمەتی مەبەستی گەشەکردن و ڕەگداکوتانی هەستی ئازار و کۆڕان دەکات لە دەروونی ئەو پیاوەی کە ژنێکی خۆش دەوێ و بە هیچ شێوەیەک ئامانجی چێژوەرگرتنی جەستەیی نییە. لە واقیعدا زۆربەی ئەو چیرۆک و شیعرانەی باسی ئەو کەسانە دەکەن کە کەوتوونەتە ناو ئەم جۆرە خۆشەویستییەوە، بەدەرن لە هەموو گوزارشت و ئاماژەیەکی سێکسیی ڕاستەوخۆ، هەرچەندە لە زۆربەی چیرۆک و شیعرەکاندا، باس لە جوانی و شۆخیی مەحبوبە کراوە و وەسفی جەستە و جووڵە و لەنجەولار و دەنگی و لایەنەکانی دیکەی سەرنجڕاکێشانی مێ کراوە. باسکردنی جوانی و ناوداریی ژن، مەرج نییە ئامانجەکەی سێکسی بێ، بەڵکو لەم حاڵەتەدا، جەستەی مەحبوبە دەبێتە خاڵی پشتیوانی لەوەی کە ئەو سۆز و ئەشقە واقعییە و خەیاڵی نییە، کە بە بوونیادێکی

بەرجەستەکراو و هەستپێکراو ژیانی ئەو پیاوە پڕ دەکات، هیچ شتێکیش لە جەستەی ژن جوانتر نییە بۆ بەرجەستەکردنی ئەم سۆزە لە واقیعێکی هەستپێکراودا. هەرچەندە شاعیری عەرەبی لە جوانیی شەو و هەیڤ و ئەسپ و حوشتر و بیابان و گردۆکە لمینەکانی و شمشێر و تیردا، هەستکردنی خۆی بە جوانی بەرجەستە کردووە، بەڵام هەر هەوڵێکی بۆ دوورخستنەوەی خۆشەویستیی پاکیزەیی لە ئامانجە سێکسییەکان، بریتییە لە هەوڵێک کە ڕەنگدانەوەی ڕوانگەیەکی ساکارە بۆ واقیعی سۆزێکی مرۆڤایەتی و پێگەی پاڵنەرە سێکسییەکان لەم سۆزەدا، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە خۆشەویستیی پاکیزەیی پەردەپۆشکراوە و لەڕێی ئەو شیعرانەوە ئامانجە سێکسییەکان شاراونەتەوە، بەڵکو دروستترین لێکدانەوە ئەوەیە، خۆشەویستیی پاکیزەیی بەو ئازار و شەیدایی و کۆژانەوە، کە لە خۆی دەگرێ، خزمەتی کۆمەڵێک مەبەستی دەروونیی دیاریکراو دەکات لە ژیانی ئەو پیاوەدا کە ژنێکی خۆش دەوێ، هەرچەندە ئەم مەبەستانە لە ناخ و دەروونی ئەو کەسەدا ئاشکرا نین، تەنانەت کاتێک کە پەیوەست دەبن بە تەنیا کەسێکی دیاریکراویشەوە و کاتێک کە بایەخی لەسەر ئومێدی گەیشتن پێی چڕ دەکاتەوە و هاوکات ئەستەمیشە بگات پێی. لە کاتی شیکردنەوەی ئەم مەبەستە دەروونییانەدا، پێویستە خەسڵەتە تایبەتییەکانی تاک و ئەو ژینگە شارستانییەی کە تیایدا دەژی و دابونەریت و چۆنێتیی ڕوانین بۆ ژن و سنوورە شیاوەکانی گوزارشتکردن لە پێگەکەی لە ناخی پیاودا، بە هەند وەربگیرێن. لە ئەنجامی بەدواداچوونی خۆشەویستیی پاکیزەیی، بەتایبەتی ئەوانەی کە لە شیعری دڵداریدا گوزارشتیان لێ کراوە، دەگەینە ئەو پوختەیەی کە خۆشەویستیی پاکیزەیی تەنیا سۆزێکە ژن و پیاو پێکەوە دەبەستێ، تەنیا لەو بارودۆخانەدا کە ناتوانن بە یەکدی بگەن. داماوی و تراژیدیای ئەم سۆزە لەوەدایە، ئەم

خۆشەویستییە نە تەواو دەبێ و نە بەیەکدی دەگەن و نە هیچ پەیوەندی و وەسڵێک لە نێوانیاندایە، بەڵام نەبوونی یان لەدەستدانی هەموو ئاماژەیەکی سێکسی لەم خۆشەویستییەدا، بۆ دابونەریتی باو دەگەڕێتەوە، کە ڕێگەی بە دەربڕینی ئەم ئاماژانە، یان باسکردنیان نەداوە، ئەویش لەبەر ئەوەی ئاماژە سێکسییەکان دەشێ مانای خۆشەویستی تێک بدەن، یان لەبەر ئەوەیە ئەو گوزارشتانە دەشێ کاردانەوە دروست بکەن لای ئەو کەسانەی مەسەلەکە دەیانگرێتەوە. بەم شێوەیە ژینگەی شارستانی کە پەرەی سەند و خۆشەویستیی پاکیزەیی تیایدا بەردەوام بوو، ڕێگەی نەدا ئەو پیاوەی ژنێکی بەم شێوەیە خۆش دەوێ، لە سنووری ئەو کۆتوبەندە بێتە دەرەوە کە لە ژیانی و شیعرەکانیدا پابەندبووە پێیانەوە. بەم شێوەیە هیچ دەروازەیەک نەبوو بۆ مانەوەی پاڵنەری سێکسی، ئیدی کاریگەرییەکەی هەرچەندێ بووبێ لە بزواندنی سۆز، یان قۆرغکردنی، یان گوزارشتکردن لێی لەڕێی شیعر، یان پەخشانەوە، بە شاراوەیی و پەنهانی کە بە گوڕوتینێکی نائاگا و نەبینراوەوە ئەو کەسەی دەبزواند، وەک بڵێی ئەمە قەدەرێک بێ و لە چارەی نووسرابێت و پێویستە لەسەری جێبەجێی بکات، تەنانەت ئەگەر بە فەنابوونی خۆیشی کۆتایی بێت.

هەوڵدان بۆ شوبهاندنی خۆشەویستیی پاکیزەیی بە خۆشەویستی ئەفلاتوونی، هەوڵدانێکی هەڵە و نادروستە، چونکە ڕەگوڕیشەی ئەم دوو خۆشەویستییە جیاوازن و لە یەکەوە دوورن. خۆشەویستیی پاکیزەیی ڕەگوڕیشەی بیابانئشینە لە خەسڵەتدا، بەڵام خۆشەویستیی ئەفلاتوونی ڕەگوڕیشەکەی فەلسەفییە و شارستانییە لە خەسڵەتدا، بەڵام هەردووکیان لەو خاڵەدا هاوبەشن کە ئەو کەسەی ئەم خۆشەویستییە دەکات، ئەم خۆشەویستییە هانی دەدات بۆ قوربانیدان بە گیانی خۆی و مردن لەپێناوی ئەو کەسەی کە خۆشی دەوێ. یەکێک لەو خەسڵەتانەی

که له هەموو خەسڵەتەکانی دیکە زیاتر ئەم دوو خۆشەویستییە لە یەکدی جیا دەکاتەوە، ئەوەیە باڵاترین جۆرەکانی خۆشەویستی لای ئەفلاتوون، خۆشەویستی نێوان پیاو و کوڕێکی گەنجە کە خەریکە پێدەگات، کە لەم خۆشەویستییەدا سۆزی خۆشەویستی بۆ گەنجەکە و هەوڵدان بۆ فەلەسەفە و چاکە پێکەوە کۆ دەبنەوە.

لەم خۆشەویستییەدا مرۆڤ دانایی و چاکە بەو کەسە دەبەخشێ کە خۆشی دەوێ، لە کاتێکدا مەحبوبە، یان ئەو کەسەی کە کەسێکی دیکە خۆشی دەوێ، هەوڵی بەدەستهێنانی دەدات. ئەفلاتوون هاوسەرێتیی نێوان ئەم دوو کەسەی لە ڕۆحدا بە هاوسەرێتییەک داناوە کە زۆر بەهێزتر و ڕاستگۆتر و نەرمونیانترە لەو هاوسەرێتییە جەستەییەی منداڵ دەخاتەوە. لەبەر ئەوە جیاوازییەکی ڕیشەیی لە نێوان خۆشەویستیی ئەفلاتوونی و خۆشەویستیی پاکیزەییدا هەیە، هەرچەندە لە هەندێک خەسڵەتدا یەک دەگرنەوە، لە هەریەک لە خۆشەویستی ئەفلاتوونی و خۆشەویستیی پاکیزەییدا، مرۆڤ خۆشەویستی بۆ هەموو شتێکی جوان هەیە و هەوڵ دەدات ببێت بە خاوەنی، ئامادەیە لەپێناوی خۆشەویستەکەیدا قوربانی بدات، بۆ مانەوەی ئەو خۆشەویستییە، جەستە و ئارەزووە جەستەییەکان فەرامۆش دەکات.

هەرچی پەیوەندیی نێوان خۆشەویستیی پاکیزەیی و خۆشەویستیی ڕۆمانسییە، ئەوا ئاشکراترە، چونکە خۆشەویستیی ڕۆمانسی ڕەگوڕیشەکەی بۆ کاریگەریی ڕاستەوخۆی شارستانییەتی عەرەبی لە ئەندەلووس دەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەو هۆز و تیرانەی کە لە ئیسپانیا و فەرەنسا دراوسێیان بوون. یەکێک لەو کاریگەرییانە، بڵاوبوونەوەی چەمکی دڵداری بوو لە شیعری عەرەبیدا، بە دڵداریی پاکیزەییشەوە، لەناو عەرەبەوە بۆ دراوسێکانیان گوازرایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە جیاوازی لە

شارستانییەت و بارودۆخی ژیان و خەسڵەتە دەروونییەکانی عەرەب و هۆز و تیرەکانی دراوسێیاندا هەبوو، هەرچی ئەورووپییەکانە، ئەوانیش هەندێک دابونەریت و خەسڵەتی دڵداریی پاکیزەییان لە عەرەبەوە وەرگرتووە، پارێزگاریشیان لەم نەریتانە کردووە کە گرنگترینیان خۆشەویستیی بێگەرد و ڕێگەپێنەدراوە کە هیچ ئومێدێک نییە بۆ بەدیهێنانی، یان گەیشتن پێی، لەگەڵ قوربانیدان لەپێناوی ئەو کەسەی کە خۆشت دەوێ، بەڵام ئەم خۆشەویستییە دواتر پەرەی سەند، هەروەها خۆشەویستیی پاکیزەییش لە سەردەمی ئیسلامدا و دوای ئەویش پەرەی سەند بۆ خۆشەویستییەکی هەستی کە ئامانجی خاوەندارێتیکردنی مەحبوبەیە، تەنانەت لەم ڕۆژگارەی ئێستاشماندا، هەندێ ڕوخسار و نموونەی خۆشەویستیی پاکیزەیی ڕەسەن هەر ماوەتەوە، هەروەها هەندێک ڕوخساری خۆشەویستیی ڕۆمانسیش لە زۆربەی شارستانییەتە جیاجیاکاندا تا ئێستا هەر ماونەتەوە، بەردەوامیی ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو فاکتەرانەی کە پاڵی ناوە بە سەرهەڵدانی ئەم شێوازانەی خۆشەویستییەوە، تا ئێستا لە دەروونی مرۆڤایەتیدا هەر ماون و هیچ ڕێگەیەک نییە بۆ لەناوچوونیان، یان قەرەبووکردنەوەیان و جێگەگرتنەوەیان، تەنانەت کاتێک ئەوپەڕی پلەکانی لێبووردەیی و ئازادی لە پەیوەندییە سێکسییەکاندا دەرکەوت.

لەوانەیە مانەوەی ئەم خۆشەویستییە و هۆیەکانی گوزارشتکردن لێی، بەهێزترین پاڵنەر بن بۆ هاندانی دەروون و ناخی مرۆیی بۆ ڕۆیشتن بەرەو هەر شتێ کە جوان و ئایدیال و ڕەسەنە، واتە ڕووەو ئەو ڕەگەزانەی کە لە خوڵقاندن و نەمریدا پێویستن.

## خۆشەویستیی ئەفلاتوونی

خۆشەویستیی ئەفلاتوونی، وەک ئاشکرایە بە ناوی فەیلەسووفی گریکی ئەفلاتوونەوە پەیوەستە، هەروەها بەزۆری خۆشەویستیی ئەفلاتوونی بەو شێوەیە لە زەینی خەڵکدا چەسپیوە کە پەیوەستییەکی خۆشەویستییە لە نێوان دوو کەسدا بێ ئەوەی هیچ مەرام و مەبەستێکی جەستەیی لەخۆ بگرێ. لەوانەیە ئەمە نزیک بێ لەو خۆشەویستییەی کە ئەفلاتوون بەدەستییەوە ناڵاندوویەتی، هەر بۆیە ئەم خۆشەویستییە بە ناوی ئەوەوە ناونراوە.

ئەفلاتوون ڕایەکانی خۆی لە وتوێژەکانیدا لە سمپوزیوم Symposiumدا دەربڕیوە، ئەم ڕایانە لەسەر زاری ئەو کەسانەوە وتراون کە بەشداریی گفتوگۆکەیان کردووە. ئەفلاتوون دەرکی بەوە کرد کە چەند جۆرێک لە خۆشەویستی هەیە، بەڵام لەنێو هەموویاندا تەنیا یەک جۆریانی بە شایستەی بایەخپێدان و ڕێزگرتن داناوە، هەروەها ئەفلاتوون جیاوازی لە نێوان ئەم دوو خۆشەویستییەدا دەکات و دەڵێ: "ئێمە هەموومان دەزانین ناکرێ خۆشەویستی لە ئەفرۆدیت جیا بکەینەوە. ئەگەر تەنیا یەک ئەفرۆدیت هەبوایە، ئەوا تەنیا یەک خۆشەویستی دەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی دوو خوای خۆشەویستی هەیە، ئەوا دەبێت بۆ هەریەکێکیان خۆشەویستێک هەبێ. ئەفرۆدیتی گەورە کە دایکی نییە و پێشی دەوترێ ئەفرۆدیتی ئاسمانی، کچی یۆرانۆسە، ئەفرۆدیتی بچووکیش کچی زیوس و دیوانە، کە پێیشی دەڵێین ئەفرۆدیتی ئاسایی. ئەو خۆشەویستییەی کە بە گەورەکەیانەوە پەیوەستە، بە خۆشەویستیی ئاسمانی ناودەبرێ، ئەوەشیان کە بە بچووکەکەیانەوە پەیوەستە، پێی دەوترێ خۆشەویستیی ئاسایی، هەموو خواوەندەکانیش پێویستە ستایشیان بکەن، بەڵام نەک بەبێ جیاکردنەوەی سروشتی نێوانیان". ئەفلاتوون پێی وایە هەموو

خۆشەویستییەک ڕەسەن نییە و شایستەی پیاهەڵدان نییە، تەنیا ئەو خۆشەویستییە نەبێ کە ئامانجێکی ڕەسەنی هەیە. ئەو خۆشەویستییەی کە لە نەسلی ئەفرۆدیتی ئاساییە، خۆشەویستییەکی ئاساییە و توانای ناوازەیی نییە، لەو جۆرە خراپەیە کە پیاوان و ژنان و گەنجان هەستی پێ دەکەن، خۆشەویستییەکە لە جەستەوەیە، نەک لە ڕۆحەوە. دەربارەی ئەم خۆشەویستییە ئەفلاتوون دەڵێ: "خەڵکانی گێل و گەمژە دەکەونە ناو ئەم خۆشەویستییەوە. ئەم خۆشەویستییە تەنیا بۆ دەستکەوتنی ئامانجەکەی هەوڵ دەدات، بەڵام هیچ کات بیر لەوە ناکاتەوە جوامێرانە ئەم ئامانجە بەدی بهێنرێ، لەبەر ئەوە چاکە و خراپە بێ جیاکردنەوە ئەنجام دەدات. ئەو خوایەی کە دایکی ئەفرۆدیتی ئاساییە، زۆر بچووکترە لە خوایەکی دیکە و لە ئەنجامی جووتبوونی نێوان نێر و مێ پەیدابووە و بەشی لە هەردووکیان وەرگرتووە، بەڵام نەسلی ئەفرۆدیتی ئاسمانی لە خوایەکەوەیە کە دایک بەشی نەبووە لە لەدایکبوونیدا، تەنیا لە نێرەوە دروست بووە، ئەمەش ئەو خۆشەویستییەیە کە بۆ گەنجانە، ئەو خوایەی کە ئەفرۆدیتی ئاسمانی لێوە پەیدا بووە هیچ کردەوەیەکی ناشیرین و بێئابڕووییەکی نییە. ئەو کەسانەی دەکەونە داوی خۆشەویستیی ئەفرۆدیتی ئاسمانییەوە، ڕووەو نێر ئاڕاستە دەگرن و خۆشەویستی لەمەدا دەبیننەوە کە لە سروشتیدا بوێرتر و زیرەکترە و لێزانترە".

***

لەو دەقەی ئەفلاتوون و دەقەکانی دیکەیەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە ئەفلاتوون ڕوانینێکی دوانیی بۆ خۆشەویستی هەبووە. خۆشەویستییەک هەیە کە سەرقاڵی جەستەی مەحبووبە، ئیدی بابەتی خۆشەویستییەکە لە نێوان دوو کەسدا بێ لە هەمان توخم، یان دوو توخمی جیاواز. لە نەزەری ئەفلاتوونەوە بە

بەراورد لەگەڵ خۆشەویستییەکی دیکە کە سەرقاڵی فیکر و کەسێتیی مەحبوبەیە، ئەمە خۆشەویستیی ڕاستگۆیانەیە و ئەو خۆشەویستییەیە کە بەرزترین پێگەی هەیە و خاوەنەکەی بە بەختەوەریی ڕاستەقینە دەگەیەنێت. بۆ گەیشتن بەم خۆشەویستییە ڕاستگۆ و ناجەستەییە، ئەفلاتوون پێی وایە، هەر کەس هەوڵی ئەمە دەدات، هێدی هێدی بە چەند قۆناغێکدا دەڕوات، کە بە تێڕامان لە جوانیی جەستەی مەحبوب و پاشان جوانیی جەستە بە شێوەیەکی گشتی، دوای ئەمانەش تێڕامان لە جوانیی ئەقڵ و ڕۆح و دواجار تێڕامان لە وێنەی پوختی جوانی، یان جەوهەری جوانی، کە جەوهەرێکی تاقانە و ساکار و ئەبەدییە، نە زیاد دەکات نە کەم دەکات و نە دەگۆڕێ، جوانی بە هەموو شتێ دەبەخشێ. ئەفلاتوون هەردوو جۆرەکەی خۆشەویستی، واتە خۆشەویستیی جەستەیی لەگەڵ خۆشەویستیی فیکری و ڕۆحی، بە گالیسکەیەک شوبهاندووە کە دوو ئەسپی باڵدار لێی دەخوڕن، یەکێکیان ئەسپێکی ڕەسەنە و لەسەرخۆیە، هەوڵ دەدات شوفێری گالیسکەکە بەرەو بەرزایی و بۆ خزمەتی ئایدیال بەرێ، لە کاتێکدا ئەوی دیکەیان ئەسپێکی سەرشێت و کەللەڕەقە و بەردەوام لە جڵەو دەرباز دەبێ و بە شوێن تێرکردنی ئارەزووەکانی جەستەوەیە. ئەفلاتوون پێی وایە دەکرێ کۆنترۆڵی ئەو جۆرە خۆشەویستییە بکرێ ئەگەر ئەسپە سەرشێتەکە ڕاهێنرا بۆ خۆگونجان و ڕێ ڕۆیشتن لەگەڵ ئەسپە ڕەسەنەکە. ئەگەر شۆفێرەکە لەم کۆنترۆڵکردنەدا سەرکەوتوو بوو، ئەوا هەردوو ئەسپیەکە پێکەوە و خاوەنەکەی و ئەو کەسەی کە خۆشی دەوێ بۆ دوور لە جیهانی هەستەکان دەگوێزنەوە و بۆ بینینی جوانیی ڕەها دەیانبەن، کە تەنیا ئەم جوانییەیە وا لە دوو خۆشەویست دەکات لە چاوی یەکدیدا جوان بن. بەم شێوەیە خۆشەویستی لای ئەفلاتوون دەبێتە گەیشتنی هاوبەش بۆ کۆنترۆڵکردنی دەروون کە

لەڕێی گەیشتن بەم کۆنترۆڵەوە، مرۆڤ لە نەخۆشییەکانی شەهوەتی جەستەیی ڕزگاری دەبێ.

پوختەی چەمکی خۆشەویستی لای ئەفلاتوون بەم شێوەیەیە: خۆشەویستیی جەستەیی نزمترین پێگەی هەیە بەراورد لەگەڵ خۆشەویستیی ڕاستگۆدا، ئیدی ئەو خۆشەویستییە جەستەییە لە نێوان دوو کەسدا بێ کە هەمان توخمیان هەبێ، یان لە نێوان دوو کەسدا بێ کە توخمەکەیان جیاواز بێ، هەروەها پەیوەندیی سێکسی لە بەهای مرۆڤ کەم دەکاتەوە و بەرەو سۆزێکی هەڵەشە و گەمژانەی دەبات کە دڕندەکانی پێ دەناسرێ. بەم شێوەیە ئەفلاتوون ئارەزووی سێکسیی بۆ نزمترین پێگەکانی دەروون پاڵ پێوە ناوە، هەروەها جەختی لەوە کردووەتەوە کە خۆشەویستیی ڕاستگۆیانە لە هەموو چالاکییەکی سێکسی بەدەرە.

ئەفلاتوون لەنێو فەیلەسووفەکانی گریکدا، تەنیا فایلەسووف نەبووە کە بایەخی بە بابەتی خۆشەویستی داوە، بەڵکو ژمارەیەک لە فەیلەسووفانی دیکەش باسی بابەتی خۆشەویستییان کردووە، بەڵام ڕایەکانی ئەفلاتوون دەربارەی خۆشەویستی چڕتر و ئاشکراتر بوون و کاریگەرییان بۆ سەر فەیلەسووفەکانی دوای خۆی زیاتر بووە، هەروەها کاریگەرییان بۆ سەر ڕوانگەی مەسیحیش بۆ خۆشەویستی زیاتر بووە بەتایبەتی لە شارستانییەتی ئەورووپیدا. یەکێک لەو فەیلەسووفانەی باسی خۆشەویستیی کردووە (دیمۆکریتس Democritis) بووە، کە پێی وا بووە چێژ ئەو ئامانجەیە کە بە سروشت، مرۆڤەکان هەموویان هەوڵی بۆ دەدەن کاتێک کە لە ئازار دوور دەکەونەوە، بەڵام هەموو چێژەکان لە ڕووی باشی و چاکەوە یەکسانن، چێژە هەستییەکان کورتخایەنن و دواجار دەبنە هۆی زیادەڕۆیی و ئازار، هەروەها هێندەی چێژە ئەقڵییەکان خواستراو نین کە هێمن و مامناوەندن و لە ئازار بەدەرن.

چاکە بە لای دیمۆکریتسەوە بریتییە لە پراکیتزەکردنی زیرەکی و لێزانی، لە کاتێکدا کارایی سێکسی لەگەڵ چێژە ئەقلییەکاندا بەیەکدا دەچن و تێکەڵاو دەبن. دیمۆکریتس ئەمە ڕەت دەکاتەوە، لەو وتانەی سەبارەت بەم بابەتە دەخرێنە پاڵ ئەو: "هەندێک لە پیاوان کە سەرگەورەی وڵاتن، بەڵام کۆیلەی ژنانن...". لە ڕایەکانی دیکەی، وەک: "گەورەترین عەیبە و سەرشۆڕی بۆ پیاو ئەوەیە، ژنێک حوکمی بکات..."، هەروەها دەڵێ: "جوانیی جەستە بە تەنیا جوانییەکی سەرنجڕاکێشەری ئاژەڵانەیە، ئەگەر زیرەکیی لەگەڵدا نەبێ".

هەرچی ئەبیقوری Epicurus فەیلەسووفە کە قوتابیی دیمۆکریتس بوو، پێی وا بوو دە ژن سوودی پیاوێکیان نییە. ژیانی باشیش لە ئەنجامی جووتبوونی سێکسی لەگەڵ ژناندا نایەتە بەرهەم. هەرچی لوقریتوس Lucretiusی ڕۆمانییە (۹۸-٥٤ی پ.ز)، بە ڕای ئەو ئارەزووی سێکسی نەخۆشییە و هیچ چارەسەرێکی نییە، ئیدی ئەو پەیوەندییە سێکسییە لە نێوان دوو توخمی جیاوازدا بێ (واتە نێر و مێ) یان هۆمۆسێکسوالیتی بێ (لە نێوان دوو توخمی وەک یەکدا). گەیشتبووە ئەو دەرئەنجامە کە پیاوی حەکیم دەتوانێ خۆی لە شێتی بەدوور بگرێ، چونکە سێکس ناتوانێ مرۆڤ بۆ ژیانێکی ئایدیالیی پوخت بەرێ. چەمکی خۆشەویستیی ئەفلاتوونی بە کۆتاییهاتنی شارستانییەتی یۆنانی کۆتایی نەهات، بەڵکو ئەم چەمکە لە شارستانییەتی ئەورووپیشدا بەردەوام بوو. لە ئیتالیا لە سەدەی پانزەدا، خۆشەویستیی ئەفلاتوونی بابەتێکی ئەدەبی بوو، ئەمەش بەهۆی وەرگێڕانی گفتوگۆکانی ئەفلاتوونەوە بوو، هەروەها خۆشەویستیی ئەفلاتوونی بە دیاردەیەکی فیکری ناسێکسی دانرا.

یەکێک لەوانەی کە خۆشەویستیی ئەفلاتوونی نەمر کرد کاستلیۆنی Castiglione(۱٥۲۸) بوو کە خۆشەویستیی سێکسیی

له ئاستی خۆشەویستیی ئاژەڵیدا دانا، هەروەها پێی وا بوو ئامانجی خۆشەویستیی ڕاستگۆیانە بریتییە لە بەرزکردنەوەی پێگەی پیاوان بۆ پێگەیەکی باڵاتر. خۆشەویستیی ڕۆحیی نێوان ژن و پیاو دەتوانێ ئەوە بکات. زۆرترین شت کە کاستلیۆنی ڕێگەی پێ دا، ماچ بوو، کە ئەمەش ڕێگەی پێ دەدرێ، لەپێناوی بەئاگاهێنانەوەی ئارەزووە خەوشدارەکاندا نییە، بەڵکو لەپێناوی یەکگرتنی ڕۆحی ژن و پیاودایە، چونکە دەم کە بەشێکە لە جەستە، بەڵام بە دەروازەی ڕۆحیش دادەنرێ.

هەندێک وا لە خۆشەویستیی ئەفلاتوونی دەڕوانن کە ئەفلاتوون پەیوەندیی شەهوانیی نێوان دوو تاکی هەمان توخمی، نەمر کردووە. مارسیلو فینینو Marcolio Finino(١٤٤٣-١٤٤٩) کە بیروڕایەکانی ئەفلاتوونی کردووە بە بەڵگە، دەڵێ: "لە هەموو خەڵکانێک گونجاوتر بۆ خۆشەویستیی ڕۆحی، کوڕانن، نەک کچان. هەرزەکارانن، نەک منداڵان". لە سەدەی شانزەشدا فلامنیو نۆبلی Flamino Nobili دیسانەوە پەنای بۆ بۆچوونەکانی ئەفلاتوون بردووە بۆ حوکمدان لەسەر جوانی و پێی وایە جوانیی کوڕی گەنج لە جوانیی کچی گەنج گونجاوترە بۆ وروووژاندنی ئارەزووە ویژدانییەکانی فیکر. ئەوانەی کە ژنیان خۆش دەوێ، لە جەستەدا بە پیتتر و داهێنەرترن، نەک لە ڕۆحدا.

هەروەها وای دەبینێ جوانیی پیاو ئارەزووی شەهوانی ناورووژێنی، وەک ئەوەی جوانیی ژن دەیورووژێنی. بەم شێوەیە بەپێی ڕای ئەو، ئەفلاتوون هانی خۆشەویستیی کوڕانی داوە، چونکە ڕێگە بە خۆیان نادەن بەدوای شەهوەتێکی هەڵخەڵەتێنەردا بڕۆن کە سروشت بە تەواوەتی نەمری کردووە.

لە ماوەی داهاتوودا، خۆشەویستیی ئەفلاتوونی بە هۆکارێک دانرا بۆ ڕێگەدان بە پەیوەندیی نێوان نێر و نێر کە دەشێ پەیوەندیی سێکسی بێ، یان پەیوەندیی فیکری مۆراڵ بێ. فسینیو

Ficinio هەوڵی داوە، خۆشەویستی ئەفلاتوونی بکرێ بە بناغە بۆ پەیوەندییە تایبەتییەکان. پێی وا بوو خۆشەویستی ئەو هێزەیە کە لەتوانایدایە پیاوان بگۆڕێ و بیانکات بە کەسانی نەجیب و وەچاغزادە، هەروەها ئەم هێزە لە هاوبەشیکردنی دوو کەس لە ژیانی تێڕاماندا پەیدا دەبێ، چونکە ئەو ڕۆحانەی کە بەهۆی خۆشەویستییانەوە بۆ تێڕامان بۆ خوا، تێکەڵ بوون، پیاوان بۆ سەروو ئاستی ئەو دڕندانە بەرز دەکەنەوە کە بیر لە خۆشەویستی ناکەنەوە.

پیترۆ بۆمبۆ Pitro Bombo (١٤٧٠-١٥٤٧) سەبارەت بە خۆشەویستی پێی وایە چاکە و خێرێکە قەد کۆتایی نایەت، هەروەها ناکرێ بە تەواوەتی لێی تێبگەین. خۆشەویستی وەک ئارەزوو نییە، هەرچەندە ئارەزوو بێ خۆشەویستی نابێت، هەروەها پێی وایە، سروشت کە هەڵە ناکات، هێزی ئیرادەی بە پیاو بەخشیوە لەڕێی هەستەکان لابدات و ببێت بە ئاژەڵ، یان لەڕێی ئەقڵەوە بۆ پێگەی بالاتر بەرزبێتەوە، هەروەها لەڕێی خۆشەویستییەوە، تاک بە نەزەری ئەو، دەشێ هەر بە ئاژەڵی بمێنێتەوە، یان ببێ بە خواوەند.

بزاوتی یان بزوتنەوەی ڕۆمانسی لە هەندێ ڕووەوە سوودی لە فیکری ئەفلاتوونی وەرگرتووە و ڕای ئەوی زیندوو ڕاگرتووە کە دەڵێ هەموو تاکێک تەنیا نیوەیەکی تەواوە و لەوانەیە بتوانێ لە شوێنێکدا نیوە و برا ڕۆحی و دوانە لەدەستچووەکەی بدۆزێتەوە، تەنیا لەڕێی ئەم توانایەوە تاک دەتوانێ تێروتەواویی کەسێتیی خۆی بەدی بێنێ.

ڕایەکانی بزاوتی ڕۆمانسی سەبارەت بە خۆشەویستیی ئەفلاتوونی لە بابەتی تایبەت بە بزاوتی ڕۆمانسی، باس دەکەین.

## خۆشەویستیی ڕۆمانسی

زاراوەی خۆشەویستیی ڕۆمانسی لە کاروانی مێژوودا، هەر لە دەرکەوتنییەوە لە سەدەکانی ناوەڕاست تا ئەم سەردەمەی ئێستامان، مانای جیاوازی بەخۆوە بینیوە. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، پەیوەستییەکی بەهێز لە نێوان کوڕە گەنجەکانی وەچاغزادەکاندا هەبوو کە ڕاهێنانیان لەسەر سوارچاکی پێ دەکرا و وا پێویستی دەکرد بە شێوەی گرووپی بچووک بچووک پێکەوە بژین، هەروەها هەر لەم ڕێگەیەوە فێر دەکران وەک برا یەکدییان خۆش بوێت لەژێر چاودێریی پیاوێکدا، کە تەمەنی لە خۆیان گەورەتر بوو، دەمانەوە. وا فێر دەکران هەستی شەڕانگێزی بەرامبەر بە ژن لە دەروونیاندا پەرە پێ بدەن. لەبەر ئەوەی لە تەمەنی نزیک بیستویەک ساڵ تا سی ساڵ بەم شێوەیە ژیانیان دوور لە مێ بەسەر دەبرد، پاشان هاوسەرێتییان دەکرد، ئەمە هانی دەدان بۆ بەستنی پەیوەندیی نێربازی لەنێو خۆیاندا. لەبەر ئەوە لەم ڕووەوە کەمێک لێکچوون لە نێوان ئەم پەیوەندییە خۆشەویستییە و خۆشەویستیی ئەفلاتوونیدا هەیە.

لە سەرەتای سەدەی پانزەی زایندا، سەرەتاکانی بزاوتێک (بزووتنەوەیەک) سەری هەڵدا کە بە بزاوتی ڕۆمانسی ناسرا. ئەم بزاوتە لە باشووری فەرەنسا لەسەر دەستی شاعیران دەستی پێ کرد، هەروەها بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی ئەم شاعیرانە کە بە تروبادوزر ناسراون، کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی چیرۆکەکانی خۆشەویستیی پاکیزەیی کە لەسەر زاری شاعیرانی عەرەبەوە وتراوە و لەڕێی عەرەبی ئەندەلووسەوە بەمان گەیشتووە.

هەروەها دەڵێن ئەم شاعیرانە لە کاتی گەڕانەکانیاندا تەنیا سەردانی وەچاغزادەکانیان دەکرد و پیایاندا هەڵیان دەدا و شیعریان بۆ سوارچاکێتییان دەوت. دەگێڕنەوە یەکێک لەم شاعیرانە لە کاتی گەڕاندا ڕێی دەکەوێتە قەڵای پیاوێکی

وەچاغزادە، لە بەردەم دەرگاکەیدا دەوەستێ و لەپێناوی دەستکەوتنی پاروونانێک و پەناگەیەک بۆ مانەوە، شیعر بە باڵای خاوەن ماڵدا دەچڕێ، بەڵام بۆ بەدبەختی، پیاوی وەچاغزادە، واتە خاوەن ماڵ، لەو کاتەدا لە ماڵ نابێ، ژنەکەشی هیچ بایەخێک بە شیعر و مەدح و سەناکانی ئەم شاعیرە بێلانەیە نادات. بەهۆی پاڵنەری بەهێزی برسێتی و پێویستیی زۆری بە پەناگەیەک شەوی تیا ڕۆژ بکاتەوە، شاعیرە برسییەکە ئامانجەکەی دەگۆڕێ، دەست دەکات بە پیاهەڵدان بە جوانی و سەخاوەتی خانمی کۆشکدا، کە ئەم پیاهەڵدانە کار دەکاتە سەر خانمی کۆشک و شاعیرەکە دەکاتە ژوورەوە، نانی پێ دەدات و ڕێزی لێ دەگرێ، زۆر باشتر لەوەی لە وەچاغزادەکەی هاوسەری چاوەڕوان دەکرا.

بەم شێوەیە نەریتی پیاهەڵدانی شاعیران بە ژنە وەجاغزادەکان سەری هەڵدا و بڵاوبووەوە و لە شاعیرانیشەوە بۆ سوارچاکە وەجاغزادەکان گوازرایەوە کە بەهرەی شیعر و گۆرانی و سوارچاکێتییان پێکەوە کۆکردبووەوە، بەڵام ئەم پیاهەڵدانە تەنیا بۆ ئەو ژنە وەجاغزادانە بوو کە هاوسەرێتییان کردبوو، هەروەها پیاهەڵدانەکان لە هەموو مەبەست و مەرامێکی سێکسی بەدەربوو. ئەم جۆرە پەیوەندییە خەسڵەتێکی تراژیدیی لەخۆ گرتبوو کە شاعیر، یان سوارچاکی بەو ژنەوە دەبەستەوە کە خۆشی دەوێ، ئەم خۆشەویستییە پاڵی بەو پیاوەوە دەنا بۆ بەخشین و لێبووردەیی و لەخۆبووردن و ئەنجامدانی کاری مەزن لەپێناوی خزمەتی ئەو ژنەی کە خۆشی دەویست و بۆ بەهانەهێنانەوە بۆ خۆشەویستەکەی. ئەم جۆرە لە خۆشەویستی بوو بە خۆشەویستییەکی ڕاستگۆیانە کە هیچ بەیەککەیشتنێکی تیادا نەبوو، هەروەها نەدەبووە هۆی ڕوودانی پەیوەندیی سێکسی، چونکە لایەنی دووەم لەم خۆشەویستییەدا ژنێکی وەجاغزادەی شووکردوو بوو کە ناکرێ بە هیچ شێوەیەک وەک ژن تەماشا

بکرێ و هیچ ئومێدێک بۆ گەیشتن پێی و پەیوەندیکردن لەگەڵیدا هەبێ. هەروەک ئاشکرایە، لە هەندێک ڕووەوە ئەم خۆشەویستییە لەگەڵ خۆشەویستیی پاکیزەییدا لەیەک دەچن، لەو ڕووەوە کە هەردووکیان ڕوخسارەکانی سوارچاکێتی و تراژیدی لەخۆ دەگرن کە هیچ ئومێد و بەیەکگەیشتنێ لە نێوان ئەو دوو کەسەدا بەدی ناکرێ. لە کاتێکدا خۆشەویستیی پاکیزەیی ئازار و کوژان لەخۆ دەگرێ، خۆشەویستیی ڕۆمانسی، پەرستن و دڵداری لەخۆ دەگرێ. لەبەر ئەوە شتێکی سروشتی بوو هەندێک لەم حاڵەتانەی خۆشەویستیی ڕۆمانسی بگاتە بەیەکگەیشتن و زیناکردن، بەڵام نەریتەکانی خۆشەویستیی سوارچاکێتی ڕێگەی بە ڕۆیشتن بەرەو ئەم ڕەوتە نەدەدا، هەروەها شاعیرەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ڕەتیان کردووەتەوە و بە چاوی تانوت و گاڵتەپێکردنەوە لەو کەسانەیان ڕوانیوە کە ئەم کارەیان کردووە. لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا ئەم شێوازە لە خۆشەویستی کە لە سێکس بەدەر بوو، گۆڕا بۆ ئاڕاستەیەکی دیکە و هێدی هێدی ڕۆیشتن بەرەو پەیوەندیی سێکسی، لەو سیستمەوە کە ژنی وەجاغزادە یان شاژن خاوەنی پێگەیەکی تایبەتی بوو لای سوارچاکەکانی، گۆڕا بۆ سیستمێکی دیکە کە سێکسکردنی ژنە وەجاغزادەکان لەگەڵ یەکێک یان زیاتر لە سوارچاکەکانی بوو بە نەریت. ئەم نەریتە لە سەدەی شانزەهەم و دواتردا باوبوو.

لەم بارودۆخەدا، هەر دەبوو خۆشەویستی لە سێکس و لە هاوسەرێتی جیابکرێتەوە. ئەوەی یارمەتیی ئەم جیاکردنەوەیەشی دا، ڕای کڵێسە بوو دەربارەی سێکس و هاوسەرێتی.

کڵێسە، سێکسی بە گوناهی یەکەم دانا، تەنیا لە چوارچێوەی پەیوەندیی هاوسەرێتیدا ڕێگەی پێ دا و تەنیا بە مەبەستی منداڵخستنەوە، لە ڕووی ڕۆمانسییشەوە بەو شێوەیە لە پەیوەندیی سێکسیی دەڕوانی لە هاوسەرێتیدا کە خۆشەویستی تێک دەدات،

لەبەر ئەوە پێویستە خۆشەویستی، خۆشەویستییەکی ناسێکسی بێت و بە هاوسەرێتی کۆتایی نەیەت.

لەوانەیە هەر ئەم ڕوانینەش بێت کە هانی خۆشەویستیی پاکیزەیی دابێ، ئەو خۆشەویستییەی پابەندبوون و لەخۆبواردنی تیادایە لەپێناوی ئەو کەسەی کە خۆشت دەوێ، هەروەها هەر ئەم هۆکارەش بووەتە هۆی دەرکەوتنی چەندەها کۆمەڵ لە سوارچاکان کە هەڵگری هەمان ناو بوون. لە واقیعدا پیرۆزکردنی خۆشەویستیی ڕۆمانسی لە سەرەتاکانیدا لە لایەن کڵێسەوە، بڵاوبوونەوە و گواستنەوەی ئەم خۆشەویستییەی بەنێو وڵاتانی ئەورووپیدا ئاسان کرد.

لە سەدەی حەڤدەهەمدا، خۆشەویستیی ڕۆمانسی بۆ خانمێکی شووکردوو گۆڕا بۆ خۆشەویستیی ڕۆمانسی بۆ کچێکی پاکیزەیی، لە سەدەی نۆزدەهەمیشدا خۆشەویستیی ڕۆمانسی گۆڕا بۆ پەیوەندیی خۆشەویستیی بەر لە هاوسەرێتی، وەک سەرەتایەک بۆ ئەو پەیوەندییە. ئەم جۆرە خۆشەویستییە ڕۆمانسییە، بەتایبەتی لەنێو چینی مامناوەندیدا، بە پەیوەندییەکی نموونەیی دانرا کە خۆشەویستی بە هاوسەرێتییەوە دەبەستێتەوە و هاوسەرێتیش بە بەیەکگەیشتنی سێکسییەوە. لەگەڵ ئەم گۆڕانەدا لە خۆشەویستیی ڕۆمانسی لە سۆزێکەوە کە هیچ ئومێدێکی تیادا نییە بۆ بەیەکگەیشتن، بۆ سۆزێک کە ئامانجی هاوسەرێتییە و بە بەیەکگەیشتنی سێکسی کۆتایی دێ، بەڵام ئەم گۆڕانە ڕیشەییە نەبووە هۆی لەدەستدانی ناوەڕۆکی سەرەکیی خۆشەویستیی ڕۆمانسی کە بریتییە لە کۆڵان و ئازار لە ژیان و هەستی ئەو کەسەدا کە کەسێکی دیکەی خۆش دەوێ و پاڵی پێوە دەنێ بۆ لەخۆبواردن و خۆتەرخانکردن تا ئاستی تراژیدیا.

لەوانەیە پێشبینیی کەمبوونەوەی ڕوودانی ئەم شێوازە لە خۆشەویستیی ڕۆمانسی بکەین لە ژیانی مرۆڤی هاوچەرخدا،

ئەویش بەهۆی فەراهەمبوونی دەرفەتی سێکسی و ئەگەرەکانی نزیکبوونەوەی هەردوو توخمەکە لە یەکدی کە لە ڕابردوودا ئەمانە ئاسان نەبوون، بەڵام واقیع ئاماژە بەوە دەدات ئەم پەیوەستییە سۆزدارییە لە زیادبوونێکی بەردەوامدایە و بە پەیوەندییەکی سروشتیی پێویست دادەنرێ بەر لە بیرکردنەوە لە هاوسەرێتی و هەنگاونان بۆی، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە سۆزی مرۆڤایەتی بە پێداویستییە سێکسییەکانیشەوە، پێویستی بە شێوەی ناڕاستەوخۆیە لە وێنەکانی گوزارشتکردن لە خۆشەویستی بە شێوەی جیاجیا، کە بەپێی سەردەمەکانیش دەگۆڕێ.

**بزاوتی ڕۆمانسی و خۆشەویستی**

هەندێجار چەمکی خۆشەویستیی ڕۆمانسی کە ئاماژەمان پێ دا، لەگەڵ چەمکی بزاوتی ڕۆمانسیدا تێکەڵ دەبن. هەرچەندە لە زاراوەکەدا هاوبەشن، بەڵام سەرەتاکانیان جیاوازە، هەروەها ناوەڕۆکی فیکریشیان هەر جیاوازە. بزاوتی ڕۆمانسی وەک کاردانەوەیەک بۆ ڕای ئەقڵانیی فەیلەسووفە ڕۆشنگەرا و ئازادەکان لەدایک بوو، بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە مرۆڤ و پێداویستییەکانی لە ژیاندا، دەشێ بابەتی بن.

بە پێچەوانەی ئەم ڕوانینەوە، ڕۆمانسییەکان لەو بڕوایەدا بوون مرۆڤ زیاتر دەنوێنێ لەوەی تەنیا کۆی بەشەکانی بێ. فەرامۆشکردنی ئەم مەسەلەیە، مانای فەرامۆشکردنی ڕەگەزە سەرەکییەکانی مرۆڤ و ئاکارەکانین، بەڵام سەرەتای بزاوت یان بزووتنەوەکە، دەکرێ بۆ نووسینەکانی ژان ژاک ڕۆسۆ و جۆهان وۆلفجانج Wolfgang و گۆتەی شاعیر بگەڕێتەوە. ئەم بزاوتە لە سەدەی نۆزدەدا لە ئەڵمانیا گەیشتە ئەوپەڕی کاریگەری و لەوێوە بۆ وڵاتانی دیکەی ئەورووپا بڵاوبووەوە.

به جۆرێ له بزاوتی ڕۆمانسی دەڕوانرێ که بریتییه له بزاوتێکی ئازادیخوازی بۆ سێکس، له هەندێ لایەنەوە، جەخت له شەیدایی و سۆز دەکاتەوە بەو وەسفەی که دوو شتی سەربەخۆن له فیکری ئەقڵانی، هەروەها ڕۆحی ڕەخنەئامێزانە به ڕۆحێکی خەیاڵئامێزانە دەگۆڕێ و بەوە دەناسرێ که جەخت دەکاتەوە لەسەر نەمریی جەستە، هەروەها ددان دەنێ به جێگیرنەبوونی سێکسیدا و گەشەسەندنی سۆز و هەست لەپێناوی خۆیاندا. بزاوتی ڕۆمانسی بڕوای وایە سێکس سوودێکی پۆزەتیڤانەی هەیە، بەو مەرجەی تەنیا له چوارچێوەی پەیوەندییەکی دەروونیی توندا ڕوو بدات، هەروەها سێکس دەشێ ڕوو بدات تەنیا لەنێو دوو کەسدا که شکۆترین سۆز له نێوانیاندا بێ، یان خاوەنی بالاترین سۆز بن بەرامبەر به یەکدی. لەبەر ئەوە سێکس پەیوەندییەکی ڕێگەپێنەدراو و نامەشروعە، تەنیا لەو کاتەدا نەبێ که ئەو دوو کەسە به پەیوەستییەکی سۆزداری و فیکری، سەرباری پەیوەستیی جەستەیی بەیەکەوە بەسترابن. بەم شێوەیە ئەو پەیوەندییه هاوسەرێتییانەی که له خۆشەویستی بەدەرە، وا پێویست دەکات لەبەر یەک هەڵبوەشێنرێن و کۆتاییان پێ بێ. ئەگەر خۆشەویستیی ڕاستگۆیانه دۆزرایەوە، ئەوا ئەو دوو خۆشەویسته به شێوەیەکی تەواو له جەسته و ڕۆحدا پێکەوە دەنووسێن، تا ئەو ئاستەی خۆشەویستیی ڕاستگۆیانه دەبێته نموونەی دڵسۆزی. لەو کەسانەی که خاوەنی ئەم ڕایه بوون، شاعیری ڕۆمانسی (شیلی) بوو، که خۆشەویستی له ڕوانینی ئەوەوە شتێکی ئەبەدی نییه، چونکه دەشێ مرۆڤ زیاتر له جارێ بکەوێته ناو خۆشەویستییەوە، دەڵێت: "پێویسته ژن و پیاو که هاوسەرێتییان کردووە، پەیوەستی نێوانیان بەردەوام بێ، مادام یەکدییان خۆش دەوێ، هیچ یاسایەکیش ناتوانێ بۆ یەک سات پارێزگاری له

پەیوەستیی نێوانیان بکات و ناچاریان بکات پێکەوە بژین، کاتێک خۆشەویستیی نێوانیان کۆتایی پێ دێت، ئەمە زوڵمێکە بەرگەی ناگیرێ'. بزاوتی ڕۆمانسی چەندەها ڕەوتی گرتەبەر، یەکێک لە ئاڕاستەکانی ڕووەو ئازادکردنی ژن ڕۆیشت، بە جۆرێ تەماشای ژنی کرد کە مرۆڤێکە لە مرۆییبوونی داماڵراوە لە جیهانێکدا کە پیاوان حوکمی دەکەن، هەروەها ژن پێویستی بە ئازادبوونە لە کۆیلایەتیبوونی بۆ پیاوان.

لە سەدەی نۆزدەدا ڕۆمانسییەت گۆڕانی بەسەردا هات، بە جۆرێ تەماشای هاوسەرێتی کرا، وەک دەرئەنجامێکی سروشتی بۆ خۆشەویستیی ڕۆمانسی. هەر لەم سەدەیەدا لەنێو ئەڵمانییەکان و دواتر ئینگلیزەکاندا، ئاڕاستەیەکی دیکە سەری هەڵدا کە بریتی بوو لە ڕێگەدان و نەمرکردنی خۆشەویستیی هۆمۆسێکسوالیتی لە نێوان دوو تاکی هاوتوخمدا.

### خۆشەویستیی نارسیزمی

زاراوەی نارسیزم و خۆشەویستیی نارسیزمی، لەو ئەفسانە گریکییەوە وەرگیراوە کە باسی گەنجێکی جوان دەکات بە ناوی نارسیسوس یان نێرگز Narcissus بەپێی چیرۆکەکە، ئەم گەنجە جوانە دەکەوێتە داوی خۆشەویستیی خەیاڵی خۆیەوە و لە ئاوەکەدا، بێئاگا بووە لەوەی ئەو وێنەیەی کە لە ئاوەکەدا بینیویەتی و ئاشقی بووە، تەنیا پێچەوانەبوونەوەی وێنەکەی خۆیەتی. بەپێی تێگەیشتنی دەروونشیکاری، نارسیزم واتە وزەی سێکسی (لبیدو)، لەدوای ئەوەی بۆ بابەتەکانی دەرەوەی خودی تاک درێژ دەبێتەوە، سەرلەنوێ جارێکی دیکە ئەم بابەتە بۆ ناو خود ڕادەکێشرێتەوە.

فرۆید یەکێک بوو لە پێشەنگەکانی ئەو کەسانەی کە بایەخیان بە بابەتی نارسیزم دەدا. فرۆید پێی وا بوو دیاردەکە لە ژیانی

زۆر کەسدا ڕوو دەدات، ئیدی سروشتی بن، یان تووشی نەخۆشیی ئەقڵی یان دەروونی بووبن، هەروەها لە هەندێک حاڵەتی شەکەتی و ماندووبوونیشدا ڕوو دەدات. فرۆید دوو جۆری لە نارسیزم جیاکردووەتەوە، جۆری سەرەتایی و جۆری لاوەکی. هەرچی جۆری سەرەتاییە، واتە نارسیزمی یەکەمی، بریتییە لە نارسیزمی منداڵی بچووک، منداڵی بچووک بە تەواوەتی کەسێکی نارسیزمە و وزە لیبیدۆییەکەی، واتە وزە سێکسییەکەی بە تەواوەتی بۆ پڕکرنەوەی پێداویستییەکانی و پارێزگاریکردن لە بوونی خۆی تەرخان دەکات. لەم قۆناغەدا منداڵ خاوەنی هەستێکی خودیی دەروونی نییە، هیچ جیاوازییەک ناکات لە نێوان خودی خۆی و جیهانی دەرەکی.

لەم واقیعی جیاکردنەوەیەدا، منداڵ هەر شتێ لە جیهانەکەی خۆیدا ببینێ وا دەزانێ خۆیەتی، یان بە خۆی دادەنێ، پێی وایە هێزی ئەم جیهانە و هەرچییەکیشی تیادایە، هێزی ئەون، ئەم هەستە لەگەڵ هەستی (سۆفی)دا لە یەک دەچن کاتێک لە تەنیا یەک خوددا لەگەڵ گەردووندا پێکەوە یەک دەگرن. هەرچی جۆری دووەمی نارسیزمییە، واتە نارسیزمی لاوەکی، لە کاتێکی دیکەی دوای قۆناغی منداڵی دەست پێ دەکات، واتە ئەو کاتەی کە خودی تاک لە شتەکانی دەوروبەری جیا دەبێتەوە، هەروەها کاتێک کە بەشێک لەم وزە لیبیدیە لە خودەوە بۆ بەشێک لە شتەکانی دەوروبەر دەگوێزرێتەوە، یان دەڕوات. ئەم گۆڕانە لە ئاڕاستەکردنی وزەدا بەهۆی دەرککردنی منداڵەوە ڕوو دەدات بەوەی کە گرژی و دڵەڕاوکێکانی کەم بوونەتەوە، یەکێک لەوانە، دەرککردنییەتی بەوەی دەشێ چێژی لەڕێی کەسێکی دیکەوە دەست بکەوێ، لەبەر ئەوە بەشێک لە وزە لیبیدییەکەی بۆ شتەکانی دەوروبەری تەرخان دەکات. بەم شێوەیە نارسیزمی سەرەتایی بۆ پەیوەندییەکی بابەتییانە پەرەدەسێنێ و دەگۆڕێ.

دەشێ لەم قۆناغەدا منداڵ ڕووبەڕووی شکستی و سەرشۆڕی، یان ڕەتکردنەوە ببێ لە لایەن ئەو شتانەوە کە وزەی لیبیدی خۆی پێ بەخشیون. ئەگەر ئەمە ڕووی دا، منداڵ ئەو وزەیە لەو شتانە ڕادەکێشێتەوە و لەجیاتی ئەوە، دەیداتەوە بە خۆی (فرۆید ١٩١٤-١٩١٥).

فرۆید و ژمارەیەکی دیکە لە دەروونشیکاران بەدواداچوونیان کردووە بۆ ئەوەی کە لە گەورەییدا نارسیزم چیی بەسەر دێت. ڕای زاڵ دەربارەی چارەنووسی نارسیزم ئەوەیە کە وزەی پێویست بۆ گەشەکردنی (من) دەبەخشێ، هەروەها بڕی پێویست لە ڕێزگرتن و بەهادانان بۆ سێکس دروست دەکات. سەبارەت بە پەیوەندیی نێوان نارسیزم لەگەڵ خۆشەویستی، یان سێکس، بەو شێوەیە لە نارسیزمی منداڵی دەڕوانرێ کە قۆناغێکی ناوەندییە لە گەشە و هێدی هێدی هەنگاونانە ڕووەو پێگەیشتنی سێکسی، کە لە کۆتاییدا بۆ خۆشەویستیی شتێکی دیکە لە دەرەوەی دەروون و بەهادانان بۆ دەروون، دەگۆڕێ.

بەڵام نارسیزم دەشێ لەم دەروازە سروشتییانەوە بە شێوەیەکی هەمەکی، یان ئەندەکی، سەرف نەبێ، ئەمەش ئەو بارەیە کە گەشەی تاک ڕووەو ئاڕاستەی سەرهەڵدانی کەسێتیی نارسیزیم، یان ڕووەو لادانی سێکسی، یان جۆرێک لە جۆرەکانی پشێوی، پاڵی پێوە دەنرێ.

فرۆید بایەخێکی تایبەتی بە ئەنگێزەی نارسیزمی لە تاکدا داوە، هەروەها بە چۆنێتیی گونجاندنی تاک لەگەڵ ئەم ئەنگێزەیەدا، ئایا بەرەو ئەو ئاڕاستەیە دەڕوات کە خۆی خۆش دەوێت و ئەم خۆشەویستییەی بۆ خۆی لە خۆشەویستی شتێکی دیکەدا دەخاتەوە بەر فەرمان (تەوزیفی دەکات)، یان کەسێکی دیکەی لە دەرەوەی خۆی خۆش دەوێت.

ئەم مەسەلەیە لە ڕواڵەتدا لە شێوەی خۆشەویستی بۆ کەسێک لە دەرەوەی خۆ دەردەکەوێ، بەڵام لە واقیعدا تەنیا ڕەنگدانەوەی نارسیزمی تاکە بۆ دەرەوە. فرۆید لە لێکۆڵینەوە دەروونییەکەیدا دەربارەی هونەرمەند لیۆناردۆ داڤینشی نموونەیەکی پێشکەش کردووە و دەڵێ: "منداڵی کوڕ خۆشەویستیی بۆ دایکی دەچەپێنێ، خۆی دەخاتە شوێنی ئەو، خۆی بەو دەچوێنێ، خۆی دەکات بە نموونەیەک، لە وێنەی ئەو نموونەیەدا، بابەتێکی نوێ بۆ خۆشەویستییەکەی هەڵدەبژێرێ. بەم شێوەیە دەبێتە هۆمۆسێکسوال (نێرباز)، بەڵام ئەوەی کە لە واقیعدا ڕوو دەدات، کشانەوەیەتی لە ئاڕاستەی سێکسی ڕووەو خود. ئەو منداڵە کوڕە کە لە ئێستادا خۆی گەورە بووە، کوڕی تازەپێگەیشتوو یان مێردمنداڵی دیکەی خۆش دەوێ و ئارەزوویان دەکات، ئەمانە تەنیا شێوە و وێنەی قەرەبووبوین و پوختەی خۆیین لە منداڵیدا، واتە لەو کوڕە تازەپێگەیشتووانەدا خۆی دەبینێتەوە، بە هەمان ئەو ڕێگەیە خۆشی دەوێن کە دایکی بە منداڵی ئەمی خۆشویستووە، واتە بەهۆی شێوازی نارسیزمییەوە ئەو کەسانە دەدۆزێتەوە کە خۆشی دەوێن...".

بەم شێوەیە فرۆید بۆی دەرکەوت کە تاک لە گەورەییدا کاتێک کەسێک هەڵدەبژێری کە خۆشی بووێت، لەبەر ئەوەیە لەو وێنەیە دەچێت کە تاک دەربارەی خۆی لە زەینیدا هەڵیگرتووە، ئەو وێنەیەی کە کردوویەتی بە نموونەی باڵا بۆ خۆی، یان لەبەر ئەوە ئەو کەسە هەڵدەبژێرێ کە خۆشی بوێت، چونکە لەو کەسە دەچێ کە لە ساڵەکانی یەکەمی ژیانیدا چاودێری بووە و بایەخی پێ داوە. بەهەند وەرگرتنی ئەم شرۆڤەیە ئەوە دەگەیەنێ، خۆشەویستیی کەسێکی نارسیزم بۆ کەسێکی دیکە، لە بناغەدا بریتییە لە خۆشەویستیی تاک بۆ خۆی، چونکە بەزۆری تاک کەسێک لە وێنەی خۆیدا هەڵدەبژێرێ، هەروەها ئەوە دەگەیەنێ کە

پەیوەندییە سێکسییەکانی کەسێکی نارسیزمی، ئیدی سروشتی، یان لادراو و ناسروشتی بێ، دواجار تەنیا پەیوەندیی خودین لە نێوان کەسی نارسیزم و ئەو کەسەی کە لێی دەچێ، هەروەک بڵێی لە پەیوەندییەکی سێکسیدایە لەگەڵ خۆیدا، بەڵام جیاوازی لە نێوانیشیاندا هەیە، لە کاتێکدا تاک لە سێکسوالیتیی خودیدایە کە بریتییە لەو هەستە سێکسییەی لە منداڵی بچووکدا هەیە لە سێ قۆناغەکەی گەشەی دەروونیی سێکسیدا (قۆناغی زارەکی و قۆناغی کۆمی و قۆناغی چووکی)، بە شێوەیەکی هەمەکی، یان ئەندەکی چێژ لە ورووژاندنی سێکسی جەستەی خۆیان دەبینن، بەڵام کەسی نارسیزم چێژ لە خۆشەویستیی ئەو شتە، یان ئەو کەسە دەبینێ کە خودی خۆی دەنوێنێ، بەم شێوەیە خود لای کەسی نارسیزم مانایەکی ئەبستراکت وەردەگرێ کە جیاوازە لە ماددییەتی جەستە و لە هەستی سێکسی خۆیی لای منداڵ.

*** 

نارسیزم و ئاستی پەیوەندیی لە لایەکەوە، هەروەها خۆشەویستی لەگەڵ سێکس لە لایەکی دیکەوە، تا ئێستا بابەتێکەلێکن شوێنی بایەخی توێژەران و دەروونناسانە و هەوڵەکانی شیکارکردن و شرۆڤەکاری ئەم بابەتە بەردەوامە.

لەوانەیە هەڵە بێ، هەمان گریمانەکەی فرۆید دووبارە بکەینەوە و وا بزانین کە خۆشەویستیی خۆ لە قۆناغە سەرەتاییەکانی ژیاندا، حاڵەتێکی نەخۆشی دەنوێنێ، چونکە خۆشەویستیی خۆ تا ئاستێک، بەشێکە لەو هەستانەی خۆشەویستی کە مرۆڤ خاوەنیانە و هیچ مەترسییەکیشی تیادا نییە ئەگەر تاک پارێزگاری لە بڕێکی پێویستی ئەو خۆشەویستییە بکات بۆ بەهێزکردنی ناسنامەی خۆیی و بەهادانان بۆ خودی خۆی، کە ئەمانە خەسڵەتی پێویستن، نەک تەنیا بۆ مانەوەی، بەڵکو بۆ بەدیهێنانی توانا خودییەکانی و پابەندبوون بە بەها باڵاکانەوە لە ژیانیدا، بەڵام

ئەگەر لەمە تێپەڕ بکات، ئەوا هەر دەبێ لەسەر حیسابی پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکان بێت، هەروەها دەبێتە بەڵگەیەک بۆ ڕوودانی تێکچوون و پشێوی لە ئاراستەکردنی وزە دەروونییەکاندا، کاتێک پشێوی و لادانە ڕەفتارییەکان و نەخۆشییە دەروونییەکان و تەنانەت هەندێک لە نەخۆشییە ئەقڵییەکانیش، بەو شێوەیە لێک دەدرێنەوە کە دەرئەنجامی ڕوودانی ئەم جۆرە تێکچوون و پشێوییانەن.

**پەراوێز:**

ڕێژەیەکی زۆری دانیشتووانی هوای، ڕەچەڵەکیان خۆرهەڵاتییە، لەبەر ئەوە ئەم دەرئەنجامە لەگەڵ ئەو دابونەریتەدا دەگونجێ کە لە شارستانییەت و کۆمەڵگە خۆرهەڵاتییەکاندا باو بووە و ژن وا پەروەردە کراوە کە هاوسەرەکەی لە خۆی زیاتر بە لاوە گرنگ بێت.

# بەشی بیستوپێنجەم
# سەرنجڕاکێشانی سێکسی

-پێشەکی
-سەرنجڕاکێشانی نێوان دوو تۆخمەکە
-ڕای عەرەب دەربارەی سەرنجڕاکێشانی سێکسی
ئەوەی پیاو لە ژندا دەیبینێ
ئەوەی ژن لە پیاودا دەیبینێ
چی سەرنجی ژنان لە ژناندا ڕادەکێشێ؟
-توێژینەوە هاوچەرخەکان دەربارەی سەرنجڕاکێشانی سێکسی
خاڵە سەرنجڕاکێشەرە جەستەییەکان لە مێدا
خەسڵەتە جەستەییەکانی نێر کە مێ حەزیان لێ دەکات
-سەرنجڕاکێشانی سێکسی
-هۆیە یارمەتیدەرەکانی سەرنجڕاکێشان
-فیمرۆن و سەرنجڕاکێشانی سێکسی

## سەرنجڕاکێشانی سێکسی

فاکتەرەکانی کارتێکردن لە ژیانی مرۆڤدا، کە خەڵکی بەرامبەر یەکدی پاڵ پێوە دەنێ تا پەیوەندی پێکەوە ببەستن، هەمان ئەو فاکتەرانەن کە بەرپرس بوون لە دروستبوونی کۆمەڵگە جیاجیاکان بە سیستم و نەریت و ڕوخسارە شارستانییەتەکانیشیانەوە.

زانایانی بواری سایکۆلۆژی لەم ساڵانەی دواییدا بایەخێکی تایبەتییان دا بە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەم فاکتەرانە و هۆکارەکانی کارکردنیان و شێوازی کاریگەرییان و چۆنێتیی پەرەسەندنیان لەپێناوی ئامانج و مەبەستەکانی ژیانی مرۆڤایەتی. لەو بابەتانەی کەوتنە بەر باس و توێژینەوە، بابەتی سەرنجڕاکێشانی نێوان دوو توخمەکە بوو لە پەیوەندیدا، کە بابەتێکی سەرەکییە لە پەیوەندییە مرۆییەکاندا و زۆرێک لە فاکتەرە کارتێکەرەکان کاریگەرییان هەیە بۆ سەری، هەروەها سەرنجڕاکێشانی نێوان نێر و مێ لە مامەڵەکردنی مرۆییشدا خاڵێکی سەنتراڵی داگیر کردووە کە زۆرێک لە بەرئەنجام و کاریگەرییە کۆمەڵایەتی و شارستانی و دەروونییەکانی لەسەر بنیادنراوە. بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ورد و سوودبەخش ئەم بابەتە توێژینەوەی لەسەر بکرێ، پێویستە توێژەران وەڵامی چەندەها پرسیار بدەنەوە، وەک: ئایا لە بناغەدا ئەوە چییە مرۆڤ بۆ لای مرۆڤێکی دیکە ڕادەکێشێ؟ بۆچی تاک بەتایبەتی کەسێک بەدەر لە هەموو کەسانی دیکە سەرنجی ڕادەکێشێ؟ ئەوە چییە کە بڕیار لەسەر سازان و گونجانی نێوان دوو تاک دەدات؟ بۆچی نێر تەنیا ڕووەو مێ ئاڕاستە دەگرێ؟ یان مێ بەرامبەر نێر؟ هەروەها ئایا چی بڕیار دەربارەی سازان و گونجانی نێوانیان دەدا؟ ئەو

سیفەتانە چین کە تاک لە مێ یان لە نێردا سەرنجی ڕادەکێشن؟ ئایا کاریگەریی کۆمەڵگە و شارستانییەت چین بۆ سەر ئەم فاکتەرە سەرنجڕاکێشانە؟

لایەنی دووەمی بابەتەکە، پەیوەندیی هەیە بە ئاستی پەیوەستیی سەرنجڕاکێشان لەگەڵ مەسەلە سێکسییەکاندا، هەروەها ئاستی کاریگەریی ئەم سەرنجڕاکێشانە بۆ سەر حەز و وەڵامدانەوەی سێکسی لە واقیعدا. ئاشکرایە وەڵامی زانستیی دروست بۆ ئەم پرسیارانە و چەندەها پرسیاری دیکەش، کارێکی ئاسان نییە لەم شوێنەدا، چونکە جیاوازییەکی گەورە لە نێوان خەڵکدا هەیە سەبارەت بەو شتانەی کە بەرامبەر بە یەکدی سەرنجیان ڕادەکێشێ، ئەمەش وا دەکات بۆ توێژەر کارێکی قورس بێت بتوانێت بەو یاسا و ڕێسا گشتییانە بگات کە تەواوی ئەم دیاردانە لێکدەدەنەوە کە لەم بابەتە تێبینی دەکرێن.

لەگەڵ ئەم هەموو قورسی و ئەستەمییەدا، زۆرێک لە زانیاریی مێژوویی و تێبینیی زانستی و لێکۆڵینەوەی هاوچەرخ هەن، کە تیشک دەخەنە سەر لایەنە جیاجیاکانی ئەم بابەتە، لێرەدا پوختەکانیان دەخەینە ڕوو:

### سەرنجڕاکێشانی نێوان دوو توخمەکە

سەرنجڕاکێشان لە نێوان دوو توخمەکەدا لە پلە جیاجیاکانی زۆربەی بوونەوەرانی زیندوودا بەدی دەکرێ، گومانی تیادا نییە ئەم سەرنجڕاکێشانە خزمەتی ئامانج و مەبەستی گرنگ دەکەن لە ژیانی ئەم بوونەوەرانەدا و بۆ گەشە و مانەوە و پاراستنی جۆر و بەردەوامیی مانەوەی جۆرە جیاوازەکان، بوونیان پێویستە. هەندێک لە جۆرەکانی مێروو، هەروەها تەنانەت باڵندە و مەیموونیش، کۆمەڵێک هەڵسوکەوتی تایبەتی، بە شێوەیەکی غەریزی، بە مەبەستی سەرنجڕاکێشانی توخمەکەی دیکە دەنوێنن.

لەوانەیە ئەم پێداویستییە بایۆلۆژییانە لە ژیانی ئەم جۆرانە لە بوونەوەران، لە ژیانی مرۆڤیشدا هەبن، هەروەها وەڵامدانەوە بۆ ئەم سەرنجڕاکێشانە بڕیار لەسەر پرۆسەی هەڵبژاردنی سروشتی دەدات، ئەمەش پرۆسەیەکی گرنگە بۆ مانەوەی توخم و جۆر. ئەم پرۆسەیە لە مرۆڤ و بوونەوەرانی دیکەشدا هەیە، ئەقڵی بەئاگا و ئەو سۆزە مرۆییە تایبەتییەی کە لە مرۆڤدا هەیە، کاریگەرییان لەسەر حوکمدان لەسەر ئەم دیاردە غەریزییە هەیە، واتە مانەوەی توخمی مرۆڤ لەسەر زەوی. ئەمە وا دەکات سەرنجڕاکێشانی مرۆڤ بەرامبەر تاکێکی دیاریکراو و پەیوەندیی نێوانیان، ئامانجەکانی پرۆسەی هەڵبژاردنی سروشتی لە ژیاندا بەدی نەهێنێ.

لەوانەیە کارێکی ئاسان نەبێ لێکۆڵینەوە دەربارەی لایەنە سەرنجڕاکێشەکانی پەیوەندیی نێوان دوو توخمەکە بکەین لە سەدە سەرەتاییەکانی بەر لە مێژوودا، هەروەها بەر لەوەی مرۆڤ لە سیستمی خێزانیدا هۆگر ببێ. لە کاتێکدا پێویستیی سێکسی و توانای تێرکردن و ڕازیکردنی ژن لە لایەن پیاوەوە لەڕێی لاقەکردن و بە زۆر سێکسکردن لەگەڵیدا، یان لەڕێی ڕەزامەندیی خۆیەوە، تەنیا شێواز بوو کە لە پەیوەندیی سێکسیدا کاری پێ دەکرا، بەڵام کاتێک پیاو دەستی بە پرۆسەی داگیرکردن و خاوەندارێتیی شتەکانی دەوروبەری کرد، بە ژنیشەوە، هەروەها ئارەزووی ژنیش بۆ ئەوەی پارێزراو بێت و کەسێک بەتەنگییەوە بێت، لێرەوە پرۆسەکانی هەڵبژاردن و تەفرەدان لە نێوان نێر و مێدا پەیدا بوو، ئەمەش لەپێناوی زامنکردنی دابینبوونی ئەم پێداویستییانەدا. لەوانەیە لە واقیعدا هیچ گومانی تیادا نەبێ کە هەردوو توخمەکە بەرەو هەندێک لایەنی سەرنجڕاکێشان لە یەکدیدا ڕۆیشتوون و هەوڵیان داوە ئەو لایەنانە لە خۆشیاندا زەق

بکەنەوە بە مەبەستی تەفرەدان و سەرنجڕاکێشانی توخمی بەرامبەر.

ناکرێ ئەوە فەرامۆش بکرێ کە ئەم لایەنانەی سەرنجڕاکێشان خزمەتی مەبەستە سێکسییەکانی کردووە، یان بەو شێوەیە لە لایەنە سێکسییەکانیان ڕوانیوە، وەک ئەوەی کە بەشێکن لە مەبەستەکانی دیکەی ژیان کە پێویستیان بە تێرکردن و ڕازیکردن هەیە. توێژەران لەسەر ئەوە کۆکن کە دەشێ مەبەستە سێکسییەکان پاڵنەری یەکەم بووبن و لەوانەیە تەنیا پاڵنەریش بووبن لە پەیوەندیی نێوان نێر و مێدا بەر لە دروستبوونی خێزان و فەراهەمبوونی بایەخدان بە وەچەکان، هەروەها مەبەستەکانی دیکەی ژیانیش، وەک پارێزگاریکردن لە وەچە و مانەوەی خێزان بوون بەهۆی دەرکەوتنی لایەنی دیکەی سەرنجڕاکێشان لە پەیوەندیی نێوان دوو توخمەکەدا. شوێنەوارە دێرینەکان کە بۆ سەدەکانی بەر لە مێژوو دەگەڕێنەوە، ئاماژە بەوە دەدەن کە جەختکردن لەسەر پەیوەندیی نێوان دوو توخمەکە لە سەرەتادا لەسەر مێ چڕبووەتەوە، لەوانەیە ئەم چڕبوونەوەیە لەگەڵ قۆناغی دەسەڵات و پەرستنی مێدا بگونجێ، چونکە مێ بە هەندێک خەسڵەتی وەک دووگیانی و منداڵبوون ناسراوە، کە ئەمانە وا دانراون لە هێزە لە ڕادەبەدەرەکانن، یان لە هێزی جادووەوە وەرگیراون. لە زۆربەی دۆزینەوە هێمایی و وێنەییەکاندا دەربارەی ئەم سەدانە، مێ وا دەردەکەوێ کە دووگیانە و سکی بەرزبووەتەوە، یان مەمکەکانی پڕ و گۆکانی بەرزبوونەتەوە کە ئاماژەن بۆ شیرپێدان و تێرکردنی منداڵ، یان بەچیچکانەوە لەسەر هەردوو لای سمتە گەورەکانی دانیشتووە کە ئاماژەیە بۆ منداڵبوون. ئەو نموونانەی لە شوێنەوارەکانەوە دەستکەوتوون هێندە ڕوخساری جوانناسییان تیادا بەدی ناکرێ، واتە ناتوانرێ وێنەی ئەو ژنانەی کە لەو شوێنەوارە کۆنانەدا دەرکەوتوون بە

جوان وەسف بکرێن، ئەمەش ئاماژە بەوە دەدات کە سەرنجڕاکێشانی سێکسی لەو سەردەمەدا هێندە گرنگ نەبووە لە پەرستنی مێدا، بەڵکو زیاتر بایەخ بە توانای خوڵقاندن و منداڵخستنەوەی مێ دراوە. هەرچی ڕووداوی گۆڕانە ڕووەو بناغەکانی جوانی لە سەرنجڕاکێشانی نێوان نێر و مێ، دواکەوت تا ئەو کاتەی کاریگەریی توانای لە ڕادەبەدەری مێ کەمبووەوە و سەردەمەکە بە سەردەمێکی نوێ گۆڕا کە نێر دەسەڵاتی بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتیدا گرت، بە دەسەڵاتگرتن بەسەر مێ و خاوەندارێتیکردنی و هەڵبژاردنیشییەوە. لەم حاڵەتانەدا دەبوو مێ لەڕێی یەکێک لە هۆیەکانی تەفرەدان، نێر بۆ لای خۆی ڕابکێشێت، چونکە مێ وەک توخمێکی سێکسی، یان دایک، یان کەیبانووی ماڵ، یان یارمەتیدەرێک تەماشا کراوە. بەرئەنجامی ئەم کارلێکەی نێوان ژن و پیاو لەپێناوی دابینبوونی ئەم پێداویستییانەدا، هەموو ئەوانە دروستبوون کە دەربارەی شوێنەوارە مێژووییەکانی پەیوەندیی نێوان دوو توخمەکە دەیزانین.

لێرەدا بە کورتی ئەو لایەنانەی سەرنجڕاکێشان دەخەینە ڕوو کە نێر و مێ لە شارستانییەتە جیاوازەکاندا پێیان وا بووە لە توخمی بەرامبەردا تەفرەدەر و سەرنجڕاکێشن، یان بوونیان دەبێتە هۆی تەفرەدان و سەرنجڕاکێشانی توخمەکەی دیکە. لە کاتی خستنەڕووی ئەم لایەنانەی سەرنجڕاکێشان، تێبینیی ئەوە دەکەین، ئەستەمە بتوانین بە کۆمەڵێک خاڵ و لایەنی سەرنجڕاکێشانی دیاریکراو و جێگیر لە هەردوو توخمەکەدا بگەین، هەروەها تێبینیی جیاوازیی ئەم لایەنانە دەکەین لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ یەکێکی دیکە، تەنانەت لە تەنیا کۆمەڵگەیەکدا لە تاکێکەوە بۆ تاکێکی دیکە. لەوانەیە مایەی سەرسووڕمان بێ کاتێک ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە عەرەبی جاهلییەت لە باسکردنی ئەم بابەتەدا بە وردی، پێش چەندەها شارستانییەتی

دێرین کەوتووە، ئەو لایەنانەیان دیاری کردووە کە نێر لە لایەن مێینەوە ڕادەکێشن، هەروەها مێینەش بۆ نێر، هەروەها دیاریکردنی ئەو خاڵانەی کە نێر پێی وایە لە مێدا سەرنجڕاکێشەرن و ئەوانەش کە مێ پێی وایە لە نێردا سەرنجڕاکێشەرن.

لەبەر ئەوە لەم بەشەدا بە شێوەیەکی تایبەتی بایەخ بە بەشدارییەکانی عەرەب دەدەین لەم بابەتەدا، بەتایبەتی لە کاتێکدا هەوڵەکانی عەرەبە دێرینەکان تا ئاستێکی زۆر لێکچووە لەگەڵ توێژینەوە هاوچەرخ و نوێیەکان کە بە ئاراستەی شیکردنەوەی لایەنەکانی سەرنجڕاکێشان لە نێوان دوو توخمەکەدا ڕۆیشتوون، هەروەها وا دەردەکەوێ کە لەسەر بناغەیەکی لێکچوو کاریان کردبێ.

## ڕای عەرەب دەربارەی سەرنجڕاکێشانی سێکسی

سەرچاوەکانمان دەربارەی فۆلکلۆر و پاشماوەی عەرەب لە سەردەمی جاهلی و سەرەتای ئیسلامدا، بریتین لە دەقی ئەدەبی، لە شیعر یان پەخشان. ئەستەمە ڕاستیی وتن و سەردەم و بارودۆخی ئەم شیعرانە بسەلمێنرێن، بەڵام بەدوایەکداهاتنی ئەم دەقانە، دەشێ ئاماژە بن بۆ هەوڵی بەردەوامی عەرەب بۆ دیاریکردنی سەرنجڕاکێشانی نێوان دوو توخمەکە لە سەردەمێک لە سەردەمەکانی مێژووی دووروودرێژی عەرەب. ئەوەی لەم هەولانەوە تێبینی دەکرێ ئەوەیە، زۆربەیان بە ئاراستەی ئاشکراکردنی لایەنەکانی سەرنجڕاکێشانی مێدا، ڕۆیشتوون، هەروەها ڕووەو ئەو شوێنانەی کە سەرنجی نێر ڕادەکێشن، ئەوەی تێبینی دەکرێ جوانترین دەربڕینی پەخشانی و شیعری بۆ گوزارشتکردن لەم لایەنانە بەکارهێنراون، ئەمەش ئاماژە بەوە دەدات کە عەرەب هەر لە سەردەمێکی زووەوە لایەنەکانی

سەرنجڕاکێشانی سێکسییان لەگەڵ لایەنەکانی جوانناسی و داهێنان لە ژیانیاندا، پێکەوە گرێ داوە. لەبەر ئەوە بۆمان دەردەکەوێ کە داهێنانی عەرەب لە بواری شیعر یان پەخشان بۆ گوزارشتکردن لە لایەنە سەرنجڕاکێشەرەکانی مێ یەکسانە، یان هاوتایە بە گوزارشتەکانی داهێنان لە شارستانییەتەکانی دیکەدا و بە شێوازە فرەجۆرەکانی دەربڕین وەک پەیکەرتاشی و سیرامیک لە شارستانییەتی یۆنانی و ڕۆمانی، نیگارکێشان لە شارستانییەتی ڕێنسانس و سەردەمی نوێدا.

### ئەوەی پیاو لە ژندا دەیبینێ

عەرەب دەربارەی ئەو خەسڵەتانەی کە لە مێدا سەرنجیان ڕادەکێشێ، لەنێو یەکدا ناکۆکن، لەو کاتەدا کە ئەو خەسڵەتە جوانناسیانەیان خستووەتە ڕوو کە پێویستە لە مێدا هەبن، بەڵام لە مێی جوان سڵەمیونەتەوە، ترساون لەوەی ملکەچبوونیان بۆ جوانیی مێ، بە سەرشۆڕییان بگەیەنێ و ئەمەش ڕووەو حەز و بەڵای دژایەتی و سەرشێتیی تافی لاوێتی و دەرئەنجامەکانی لەخشتەبردنیان بەرێ.

کەسانێکی دیکە هەر لەناو عەرەبدا ڕای جیاوازییان هەبوو، پێیان وا بوو، جوانیی ژن خەسڵەتێکی پێویستە بۆ بەردەوامیی ئولفەت و هۆگربوونی نێوان نێر و مێ. لەنێو عەرەبدا ئەو وەسفە جەستەیی و ئاکارییانە دەماودەم گوێزراونەتەوە کە دڵ و ئەقڵی پیاو ڕادەکێشن. زۆر لێزان و درێژدادڕ بوون لە هەڵبژاردنی وەسفە جەستەییەکانی مێ، بۆ نموونە وەسفی (ڕەبیعە) و (عەمرو)ی جووتە برا لە سەردەمی جاهلیدا، کاتێ باوکە ڕیشسپییەکەیان دەربارەی ئەو سیفەتانە پرسیاری لێ کردن کە پێیان خۆشە لە ژناندا هەبن. عەمرو بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە: "سمتی گەورە بێ، ڕانەکانی قەڵە و گەردنی بەرز بێ، بە قسەکانی

شیفای دەردەدار بکات، بەرچاوی تێر بێ، ناو لەپی دەستی وەک پەڕی گوڵی یاسەمین سپیوسۆڵ بێ، سمت و کەفەڵی پڕ و گۆشتن بێ...". بەڵام ڕەبیعەی برای بەم شێوەیە وەسفی کرد: "دوو چاوی مەستی هەبێ، کوڵمی نەرم و ناسک بێ، سنگ و مەمکی قووت بێ، سمتی گەورە بێ، شوکرانەبژێر بێ، یارمەتیی دراوسێ بدات، نەرمونیان بێ لە قسەکردندا...".

پیاوێکی دیکەی عەرەب کە ئامۆژگاریی هاوڕێکەی دەکات، ژنێکی لەم جۆرە بخوازێ، دەڵێ: "پاوپوزی سافولووس بێ، ڕانەکانی گۆشتن بن، سنگ و مەمکی هەڵتۆقیوو و دیار بێ، کوڵمەکانی سوور و ئاڵ بن، چاوەکانی ڕەش ڕەش بن وەک ئەوەی ڕێژرا بن، برۆکانی باریک و کەوانەیی بن وەک ئەوەی بە قەڵەم کێشرا بن، لێوەکانی تەنک و باریک، قەدوباڵای شۆخوشەنگ بێ و سکی تەخت بێ...". یەکێکی دیکە دەڵێ: "ددانەکانی بچووک و خاوێن بن، ڕەنگوڕووی سپیوسۆڵ، برۆ و برژانگی پڕ بێ، چاوی ڕەش و گەورە بێ، سپێنەکەی سپی سپی و ڕەشێنەکەی ڕەش ڕەش بچێتەوە، لووتی قنج بێ، باڵای بەرز بێ، چاوی بدرەوشێتەوە، ڕوومەتی چاڵ بێ، ماچکردنی خۆش بێ، پرچی درێژ و لێکئاڵاو بێ، سەری گەورە بێ، سنگی پانوپۆڕ بێ، مەمکی خڕ بێ، سنگ و مەمکی نەرم و شل بێ، پێیەکانی نەرم و نۆڵ بن، لەسەرخۆ بە ڕێدا بڕوات، لووتی نە زۆر باریک و نە زۆر پان بێ، واتە ناسک بێ، نەفسی بەرز بێ، قورس و سەنگین بێ، لێبوردە و ژیر بێ، هەر کاتێ دات بە زەویدا زەوقی هەڵبسێ و هەر کاتێک جێتهێشت تەواو ببێ...".

لە وەسفکردنی ژنی سەرنجڕاکێشەردا لە لایەن پیاوەوە، ژنێکی خێڵی کندە کە پێیان دەوت عیسام، حارسی کوڕی عەمرو،

سەرۆک خێڵی کندە، دەینێرێ بۆ سەیرکردنی کچەکەی عەوف، کاتێک عیسام گەڕایەوە تا وەسفی کەماڵ و جوانی و ژیری و دانایی کچەکە بکات، حارس بەم پەندە عیسامی هێنایە جواب: "چی لە هەگبەکەتدایە عیسام"؟. ژنە وتی: "...ڕوخسارێکم بینی وەک ئاوێنە دەبریسکایەوە، پرچێکی ڕەش وەک یاڵی ئەسپ دایپۆشیبوو، دوو برۆ هەر دەتگوت بە قەڵەم کێشراون، یان بە خەڵووز ڕەش کراون، لە کاتێکدا لووتی ڕێک و جوان وەک دەمی شمشیر وا بوو، لەملاولاوە دوو گۆنای ئاڵی سپی سپی وەک مرواری دەدرەوشانەوە، دەمی شەفاف و بچووک وەک ئەنگوستیلە وا بوو، خەندەی شیرین و ڕوومەتەکانی لە لاتەنیشتەوە چاڵ، زمان بە ڕەوانبێژی و ئاشکرایی لە ناویدا ئەمدیو و ئەودیوی دەکرد، بە ئەقڵێکی دەوڵەمەند و وەڵامی حازربەدەستەوە قسەی دەکرد، گەردنی سپی سپی وەک زیو، سنگ و مەمکێک وەک لەسەر پەیکەری بووکەشووشەیەک داندرابێ، وا بوو، سنگێکی گۆشتن کە هەرچی ئێسکە تیادا بەدیت نەدەکرد، لەملاولاوە قۆڵەکانی پێوەنووساوبوون، لەم سنگە گۆشتنەوە دوو مەمکی جووتی وەک جووتێک هەنار هەڵتۆقیو، وەختەبوو جلەکانیان دەدڕان و دەهاتنە دەرەوە، پشتێکی هەبوو وەک بڵێی جۆگەلەیەک بە ناوەڕاستیدا شۆڕ بووەتەوە، لە ناوقەددا کۆتایی هاتبوو، گەر ڕەحمەت و بەزەیی خوا نەبایە لەبەریەک دەپچڕان، سمت و کەفەڵێکی پێوە بوو گەر بیویستایە هەستێتە سەر پێ، دایدەنیشتاندەوە، بیویستایە دانیشێ، هەڵیدەستانەوە سەر پێ، هەر دەتووت تەپۆڵکەیەکی لمینە کە جووتێک ڕانی گۆشتنی داڕێژراو هەڵیانگرتووە، لەژێریاندا دوو قاچی پڕی ڕێک، بە مووی ڕەش داپۆشرابوون کە وەک زرێی چنراو بووبوون بە قەڵغان بۆیان، دوو پێی لووس وەک زمان، ئای لە گەورەیی خوا چۆن ئەم قاچانە توانیویانە ئەو جەستەیە ڕاگیر بکەن؟".

کاتێک سەرۆک خێڵی کندە گوێی لەم وەسفانە دەبێ، ڕاستەوخۆ خەڵکانێک بۆ لای باوکی کچە بۆ خوازبێنی دەنێرێ و پاشان دەیهێنێ. هەر کەسێک تا کۆتایی ئەم چیرۆکە بخوێنێتەوە دەبینێ دایکی کچەکەش چۆن لەڕووی جوانکاری و زینەت و ڕەفتار و ئەدەبەوە ئامۆژگاریی کچەکەی دەکات تا بە تەواوی مافی هاوسەرێتی بە هاوسەرەکەی ببەخشێ. قسەکانی ئەم دایکە باشترین باسوخواسن کە لە حاڵەتی لەم جۆرەدا دەکرێن.

لەم وەسفانەوە دەربارەی سەرنجڕاکێشانی مێ و هەموو ئەو سیفەت و خەسڵەتانەی کە لە ڕووی جەستەیی و ڕەفتار و فیکرییەوە خراونەتە پاڵ ژنی سەرنجڕاکێش، بۆمان دەردەکەوێ کۆکبوونێکی زۆر هەیە دەربارەی سیفەتی جوانی و سەرنجڕاکێشان لە مێدا، ئیدی لە چاوی پیاوەوە بێ، یان لە چاوی ژنەوە بێ، ئەم سازان و کۆکبوونە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە عەرەبە دێرینەکان لەسەر بناغەیەکی جوانناسیی ئایدیالی لە تەواوکاریی نێوان جەستە و ئەقڵ لە ژنیان ڕوانیوە.

هەرچەندە هەندێک لەو سیفەتانەی کە ئاماژەیان پێ دراوە دەشێ دەگمەن بن، ئەگەر نەڵێین بوونی هەموویان پێکەوە لە یەک ژندا ئەستەمە، بەڵام وەسفەکانیان لە کاری هونەرمەندێکی پەیکەرتاشی یۆنانی دەچێ کە پەیکەری ڤینۆس، خوای جوانیی داتاشیوە، لەو پەیکەرەدا جوانتر لەو جوانییانەی بەرجەستە کردووە کە لە ژناندا بینیونی و لە خەیاڵیدا بوون بەرامبەر بە ژن، لێکچوونێکی ئاشکرا هەیە لە نێوان کاری ئەم پەیکەرتاشە و وەسفەکانی عیسامدا، بەتایبەتی کە بە حارسی وت: "...سنگێک وەک لەسەر پەیکەری بووکەشووشەیەک داندرا بێ، وا بوو...". ئاشکرایە فاکتەری سێکسی لە جوانناسیی ئەم وەسفەدا، فاکتەری وورووژێنەر نەبووە، چونکە ژن و پیاو هەردووکیان وەک یەک وەسفی لایەنە جوان و دڵگیرەکانی مێیان کردووە، بەڵام ئەمە ئەوە

ڕەتِ ناکاتەوە کە پەیوەستییەک لە نێوان جوانی و سێکسدا لە ئاوەزی خاوەنەکانیاندا هەبووە و ئەم پەیوەستییەش بۆ خزمەتکردنی مەبەست و مەرامی ورووژانی ئارەزووی سێکسی و هاندانی شەهوەت و بەهێزکردنی خەیاڵی بەیەکگەیشتن هاتووەتە ئاراوە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا و چەندە ئەو ڕاستییەش ڕوون و دیارە کە جوانناسیی مێ چ پێگەیەکی باڵای لە دەروونی عەرەبەکاندا هەبووە و چەندە بە پەرۆش بوون بۆ گەیشتن پێی، بەڵام جوانیی جەستەیان بەسەر شەرەف و چاکەی ژندا پەسەند نەکردووە، بیروبۆچوونی زۆربەیان نزیکبوو لە وتەکانی (سەیفی کوڕی ئەکسەم) بۆ کوڕەکەی: "کوڕەکەم، جوانیی ژن هانت نەدات بۆ گوێنەدان بە پوختی و بێخەوشیی بنەچە و بنەماڵە، ژنهێنان لە خێزان و بنەماڵە بەدو نالەبارەکان، شەرەف لەناودەبەن. لەبەر ئەوە هەوڵ بدە ژنی بەشەرەف و داوێنپاک بێنی کە خاوەن بنەچەی دیار و ئاشکرا بێ، بەڕەوشت و سەلیقە و خانەدان بێ".
لەبەر ئەوە ئاسان نەبووە بۆ پیاوی عەرەب کە هەردوو ئامانجەکە بپێکێ، واتە ژنێک بدۆزێتەوە کە هەم جوان بێ و هەمیش چاک بێ، لەبەر ئەوە ڕووەو ئەو ئاڕاستەیە ڕۆیشتوون کە لە بوارێکدا بە شوێن خەسڵەتە مۆراڵییەکانی ژندا بگەڕێن و لە بوارێکی دیکەشدا بە شوێن خەسڵەتەکانی جوانی جەستە و ڕوخساردا بگەڕێن، بۆیە دوو جۆر ژنیان هەبووە، یەکێکیان بەڕاستی هاوسەرێتییان لەگەڵدا کردووە کە ژنێکی ئازاد بوو، جۆرەکەی دیکەش دەشێ لە دانەیەک زیاتری بووبێ و کۆیلە و کەنیزەک بوون، وەک ئەوە وا بووە کە یەک کەس لە یەک کاتدا لە دوو شوێن بژی. لەوانەیە عەرەب لە مێژووی دێرینیاندا و دوای ئەو سەردەمەش، هەوڵەکانیان بۆ یەکخستنی نێوان ئەم دوو حاڵەتە، وەک هەوڵی کەسانی دیکە بێ لە شارستانییەتەکانی دیکەدا، ئەگەر زیاتر نەبێ، لەوانەیە زیاتر لە شارستانییەتەکانی دیکە توانیبێتیان

شێوازێکی تایبەتی لە ژیانی کەنیزەک پێکبێنن، کە ئەم شێوە ژیانە بووەتە مایەی داهێنانی شارستانی لە بوارەکانی ئەدەب و شیعر و میوزیک و گۆرانیدا، کە لە هیچ شارستانییەتێکی دیکەدا هاوشێوەیان نییە.

ئەوەی ژن لە پیاودا دەیبینێ (سەیری دەکات) هەروەک چۆن لەسەر زاری عەرەبی جاهلی باسی ئەو وەسفانە کراوە کە لە ژندا هەن و سەرنجی پیاو ڕادەکێشن، بە هەمان شێوە باسی ئەو وەسفانەش لە پیاودا کراون کە سەرنجی ژن ڕادەکێشن.

یەکێک لەم وەسفانە لەسەر زاری کچی پادشایەک لە پادشاکانی حەمیر لە یەمەن، باسکراوە، باسی خەسڵەتەکانی ئەو پیاوە دەکات کە دەیەوێ ببێ بە هاوسەری: "ڕەوشتی بەرز بێ، شوێنی متمانە بێ، ئاژاوەگێڕ نەبێ، دەرک بە ئامانجەکەی خۆم دەکەم، ئەو پیاوەی دەبێت بە هاوسەرم، پێویستە بەتوانا و بەدەستودڵ بێ، حوکمی عەشیرەتەکەی بکات، ئاگای لێیان بێ، لە ماوەی ژیانمدا نەبێتە مایەی سەرشۆڕیم، لەدوای مردنیشم هیچ سەرشۆڕییەک بۆ کەسوکارەکەم دروست نەکات". پاشان کچەکە داوای لە هاوڕێکانی کرد لە یەکدی جیا ببنەوە و بڕۆن بە شوێن پیاوێکدا بگەڕێن بەو وەسفانەی کە پێی داون، پاشان دەستەخوشکەکانی گەڕانەوە، هەریەکەیان پیاوێکی دۆزیبووەوە کە دەکرێ بە نموونەی باڵای پیاو دابنرێ لە ڕوانگەی مێینەوە، یەکەمیان وتی: "لە کاتی خۆیدا بەتەنگ هاوار و پاڕانەوەتەوە دێت، بۆ ئەبەد پەناگەت دەبێت، دەبێتە مایەی خێروخۆشی بۆت....". دووەمیان وتی: "دۆزیمەوە، ڕەسەن و وەجاغزادەیە، بەدەستودڵ و شوکرانەبژێرە، بەڕەوشت و بەئەدەبە، زۆر بەخشندەیە و گەنجە، فەرمانی ڕەت ناکرێتەوە و ژنەکەشی لێی ڕازی دەبێ". سێیەمیشیان وتی: "کۆمەککارێکی مەزنە، بەر لەوەی داوای لێ بکرێ دەبەخشێ، جوامێرە بەر لەوەی جوامێریی لەگەڵدا بنوێنرێ،

لەناو عەشیرەتدا سەرگەورە و لە کاتی خێر و بەخشیندا بەدەستودڵ و بەخشندەیە...". ئیدی کچەکە دووەمیانی هەڵبژارد و ڕازی بوو ببێ بە هاوسەری. لە شوێنێکی دیکەدا و سەبارەت بە هەمان بابەت سێ کچی دیکە دەربارەی سیفەتەکانی ئەو پیاوەی کە خۆزگە دەخوازن ببێ بە هاوسەریان، بەم شێوەیە دڵی خۆیان دەکەنەوە، یەکەمیان وتی: "...دەمەوێ ڕووی خۆش و دەم بە خەندە بێ، سەرگەورە و ڕێنیشاندەری خێڵ بێ، سەرلەشکری عەشیرەتەکەی بێ، فریاکەوتەی هۆزەکەی بێ، دیوەخانی ئاوەدان و بەرین بێ، ڕامکردنی ئەستەم بێ....". دووەمیان وتی: "دەمەوێ بالا بەرز و کەڵەگەت بێ، ڕەند و دەستڕۆیشتوو بێ، ژنەکەی بیپەرستێ و چاکە باڵی بەسەردا بکێشێ....". سێیەمیشیان وتی: "دەمەوێ وەک شمشێری نەنووشتاوە وا بێ، جووتبوون لەگەڵیدا ببێتە مایەی شادی و ئاسوودەیی، گەیشتن پێی نەشئەبەخش بێ، کە باوەشی پیادا کردم ئێسقانەکانم وردوخاش بکات، کاتێک دێتە ناومەوە چاوی بنوقێنێ، کاتێکیش زەوقی هەستا دەمی ئاو بکات".
ئەم بۆچوون و سەرنجانەی ئەم ژنانە زۆر نزیکن لەو سەرنج و قسانەوە کە لەسەر زاری یانزە ژنی شووکردوو دەگێڕنەوە کە لە یەکێک لە لادێکانی یەمەندا لە سەردەمی جاهلیدا ژیاون، کە هەریەکەیان بەدوای یەکدا وەسفی هاوسەرەکەی خۆی دەکات، زەمی ئەو سیفەتانەیان دەکەن کە بە لایانەوە ناخۆش و نەخوازراوە، هاوکات وەسفی سیفەتە باشەکانیشیان دەکەن. وەسفەکان لە هەردوو حاڵەتەکەدا زۆرن، سەلماندنیان لەم بوارەدا ئەستەمە، بەڵام گەڕانەوە بۆ سەرچاوەکان و بەدواداچوونیان چێژێکی زۆر بە خوێنەر دەبەخشن کە هاوتای نییە، هاوکات خوێنەر دەرک بە وردیی ئەو وەسفانە دەکات کە بەکارهاتوون.

## چی سەرنجی ژنان لە ژناندا ڕادەکێشێ؟

ژنانی عەرەبی جاهلی ڕاوبۆچوونی خۆیان هەبوو دەربارەی ئەو ژنانەی کە لە ژنانی دیکە باشترن، یان لە لای پیاو خوازراوترن. ئەو سیفەتانەی کە ژنان پێیان باشە لە ژندا هەبێ، یان پێیان خۆشە لە خۆیاندا هەبێ، لەبەر ئەوەیە پێیان وایە پیاوان ئەو سیفەتانەیان پێ باشە، یان پێ جوانە.

سەبارەت بەم بابەتە ڕیوایەتی زۆر باس کراون کە وەسفی باشترین ژن دەکەن، یەکێک لەو ڕیوایەتانە، (مەیدانی) لەسەر زاری عەجفا کچی علقەمەی سەعدی و سێ ژنی دیکەی عەشیرەتەکەیان، دەگێڕدرێتەوە، کە گفتوگۆیان کردووە و باسی ئەوەیان کردووە کامە مێ لە هەموو مێیەک باشترە؟ یەکێکیان وتوویەتی: "پاکیزەی دەستلێنەدراو بێ، بەسۆز و میهرەبان بێ، منداڵی زۆری ببێ". دووەمیان وتوویەتی: "دەوڵەمەند و پارەدار بێ، ناو و ناوبانگی باش بێ، بەحەیاوحورمەت بێ". سێیەمیشیان وتویەتی: "باشترینیان ئەو ژنەیە کە گوێڕایەڵ بێ، پارە و سامان کۆبکاتەوە، سوودمەند بێ، ڕەتکردنەوەی نەبێ". چوارەمیشیان وتوویەتی: "کۆکەرەوە بێ بۆ کەسوکارەکەی، هێمن و لەسەرخۆ بێ، سەری کەسوکارەکەی بەرز بکاتەوە، نەک نەوی بکات".

***

لەم ڕیوایەتانەوە، بە جیاوازیی بیروبۆچوونەکانەوە و بە چاوپۆشین لە ڕاستی و دروستیی ئەو کەسانەی ئەم وتانەیان بۆ دەگەڕێنرێتەوە، ئاشکرا ئەوە دەردەکەوێ کە عەرەب لە سەردەمی جاهلیدا بایەخێکی زۆریان بە خەسڵەتەکانی ژن و پیاو داوە، هەروەها ئاشکرایە وەسفە جوانناسییەکان تایبەت بە مێی ڕۆحسووک و پایەبڵند بەسەر وەسفەکانی پیاواندا زاڵبووە، هەروەها عەرەب لەم قۆناغەی مێژووویاندا و تا قۆناغەکانی دواتریش، بە چاوێ تەماشای ژنیان کردووە کە منداڵ دەخاتەوە،

بۆیە ویستوویانە داوێنپاک و بەشەرەف و خاوەن بنەچە و وەجاغزادە بێت، بەڵام بایەخیشیان بە لایەنی جوانناسی داوە، خۆزگەیان خواستووە ژنێک بخوازن، ئەو سیفەت و وەسفانەی تیایدا بێ کە خەونیان پێوە بینیوە، ئەگەر ئەمە تەنیا بۆ سەرگەورە و پیاوە دەستڕۆیشتووەکان شیاو بووبێ، ئەوا پیاوەکانی دیکە پەنایان بۆ کۆیلە و کەنیزەک بردووە، ئەم ژنانە ئەو شتانەیان بۆ بەدی هێناون کە لە ژنەکانی خۆیاندا دەستیان نەکەوتووە، یان لەڕێی ئەدەب و ماناکانیانەوە گەمەبازییان لەگەڵ خەونەکانیاندا کردووە، هەروەک بڵێی ئەم وتە و مانایانە لە ئەدەبدا، جەستەی مێیە لە شوێن و شکڵ و شێوە و ڕەنگ و جووڵەدا، لەوانەیە هەر ئەمەش بووبێتە هۆکار بۆ خوڵقاندن و داهێنانی ئەو برە بێشوومارە لە گێڕانەوە ئەدەبی و شیعرییەکان و گۆرانیوتن و پیاهەڵدان بە جوانییەکانی مێدا، ئیدی ئەمە لە سەردەمی جاهلیدا بێ، یان لە سەرەتای ئیسلامدا و سەردەمەکانی دواتریش. لە لێکدانەوەی ئەم دۆخەدا ڕاوبۆچوونەکان زۆرن، بەڵام هەر لێکدانەوەیەکی ڕاستگۆیانە، پێویستە لەگەڵ ئەو تێبینییەدا کۆک بێ کە سروشتی ژیان، لە ڕووی ژینگە و شێواز و کۆمەڵگەوە، دەشێ وای لە تاکی عەرەبی کردبێ لە ڕۆڵەی زۆرێک لە شارستانییەت و کۆمەڵگەکانی دیکە، زیاتر ڕووەو مەسەلە سێکسییەکان ئاڕاستەی گرتبێ، چڕکردنەوەی ئاڕاستە ڕووەو ئەم مەسەلانە گەیشتووەتە ئاستی زاڵبوونی لایەنی سێکسی بەسەر لایەنی سۆزداری و فیکریی تاکدا. ئەم دیاردەیە تا ئەم سەردەمەی ئێستامان هەر ماوە و تێبینیی دەکەین.

بەڵام ملکەچبوونی ڕەها بۆ ئەم زاڵبوونە (واتە زاڵبوونی لایەنی سێکسی بەسەر لایەنی سۆزداری و فیکریدا) لەڕێی تەنیا تێرکردن و ڕازیکردنی لایەنە بایۆلۆژییەکانەوە، دەشێ ببێتە ڕێگر لە بەردەم توانای تاک بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی واقیعی ژیان، بەتایبەتی لە

ژینگەیەکی ڕەق و توندوتیژدا، لەبەر ئەمانە تاکی عەرەبی ناچاربووە بەشێک لە ئارەزووە سێکسییەکانی بۆ پێگەی جوانناسی بەرز بکاتەوە، وەک سیمبولێک کە قەرەبووی بەشێک لەو ئارەزووانەی بۆ بکاتەوە کە ناتوانێ لە ژیانی سێکسیدا بەدییان بێنێت.

بە بڕوای من ئەمە یەکێکە لە هۆکارە گرنگەکان -ئەگەر گرنگترینیان نەبێت- بۆ لێکدانەوەی ئەو پەیوەستییە گەورەیەی لە نێوان جوانی و سێکسدا لای عەرەب هەبووە کە بە دەگمەن لە ژیانی گەلانی دیکەدا دەیبینین. بەهۆی هەندێک لەم پەیوەستییەوە، ژن لە ئەدەبی جاهلی و ئەدەبی عەرەبی هەر لە سەرەتای ئیسلام و تا ئەم ڕۆژگارەی ئێستاشمان، بەختی لە وەسفی دەگمەن و پەرجووئاسا هەبووە، کە ژن وا دەردەکەوێ لە تاوێری خەیاڵەوە هێدی هێدی خولقاوە، هەروەک بڵێی بوونەوەرێکی تازەبابەتە و هیچ پەیوەندییەکی بە واقیعەوە نییە. بەم شێوەیە عەرەب پێگەی ژنیان بۆ سنووری کەماڵ و تێروتەواوی بەرزکردووەتەوە، کە یۆنانییەکان لە پەیکەرەکانیاندا بۆ ژن بەرجەستەیان کردووە، تەنانەت تا دەگاتە ئاستی کەماڵ و تێروتەواویی گەردوونی کە لای یۆنانییەکان پشتی بە ماتماتیک بەستووە. جیاوازیی نێوان یۆنانییەکان و عەرەب لەوەدایە، یۆنانییەکان بۆ دەربڕینی ئەو جوانی و کەماڵەی ژن، پەنایان بۆ زانستی ژمارە و هێما و بەرجەستەکردن لەناو بەرد و پەیکەرەکاندا بردووە، بەڵام عەرەب لە وتە و مانا و شیعردا ئەم کارەیان کردووە. لەوانەیە ئەو جیاوازییە ڕاستەقینەیەی نێوان ئەم دوو شارستانییەتە، تەنیا لە حیساب و ژمارە، یان بەرجەستەکردن لەڕێی بەرد و وشەوە نەبێ، بەڵکو جیاوازییەکە لە نێوان کەماڵی ئەقڵی و کەماڵی سۆزدارییدایە، ژن لە خەیاڵی هونەرمەندی یۆنانیدا بەهۆی کاریگەریی ئەقڵ و تێڕامان و لە کەماڵی گەردوونەوە خولقاوە،

بەلام لە خەیالی هونەرمەندی عەرەبیدا، ژن بەهۆی کاریگەریی سۆز و ئارەزووەوە خولقاوە. خولقاندنەکە لە هەردوو حالەتەکەدا هەر جوان دەرچوون، بەلام خولقاندنی ژن بەو شکل و شێوەیە لای عەرەب لە پێگەی جەستە و شەهوەتەوە دەستی پێ کردووە و بەرەو سەرەوە بەرزبووەتەوە، بەلام لای یۆنانییەکان لە پێگەی ئەقل و فیکرەوە و تێرامان لە گەردوونەوە دەستی پێ کردووە و بەرەو خوارەوە دابەزیوە.

**توێژینەوە هاوچەرخەکان دەربارەی سەرنجڕاکێشانی سێکسی**

لەم سالانەی دواییدا چەندەها توێژینەوەی زانستی ئەنجام دراون بۆ خستنەڕووی ئەو خەسلەتانەی کە بڕیار لەسەر پرۆسەی سەرنجڕاکێشانی نێوان دوو توخمەکە دەدەن، ئەم توێژینەوانە خستنەڕووی خەسلەتە جەستەیی و ڕەفتاری و ئەقلییەکانیشی لەخۆ گرت. هەندێک لەم توێژینەوانە دەربارەی ئەم بابەتە بایەخیان دا بە لێکۆلینەوە لە خەسلەتە سەرنجڕاکێشەکانی هەردوو توخمەکە لە چوار ڕەهەندەوە، واتە لێکۆلینەوە دەربارەی ئەو خەسلەتانەی لە مێدا هەن و نێر ڕادەکێشن، ئەو خەسلەتانەی کە نێر بڕوای وایە لە مێدا سەرنجڕاکێشن، ئەو خەسلەتانەی کە لە نێردا هەن و سەرنجی مێ ڕادەکێشن، هەروەها ئەو خەسلەتانەی کە مێ بڕوای وایە لە نێردا سەرنجڕاکێشن. ئەم توێژینەوانە دەرئەنجامی زۆریان کۆکردەوە، هەرچەندە ئەنجامی توێژینەوەکان لە توێژەرێکەوە بۆ یەکێکی دیکە جیاوازبوو. لەبەر ئەوەی هەندێ لەم توێژینەوانە لە چەند کۆمەلگەیەکی کەم و سنووردار‌دا ئەنجام دراون، ناکرێ ئەنجامەکانیان لە شێوەی ڕێسای گشتیدا بەسەر هەموو کۆمەلگەکاندا جێبەجێ بکرێ. ئەو ڕێسایانەی کە دەشێ وەک ڕێسای گشتی تەماشا بکرێن، لە ڕاستیدا بریتین لە کۆمەلێک ڕەگەزی جەستەیی لە پەیوەندییەکانی نێوان خەلکدا کە ڕەگەزی

گرنگ و کاران لە دروستکردنی ئەم پەیوەندییانە و پارێزگاریکردن لە مانەوەیان، یەکێک لەو ڕێسا گشتییانە ئەوەیە کە ڕەگەزە جەستەییەکان لە دیاریکردنی پەیوەندیی نێوان منداڵ و مێردمنداڵ و هەرزەکاردا، ڕەگەزی گرنگن. ژمارەیەکی زۆر لە لێکۆڵینەوەکان ئاماژە بەوە دەدەن ئەو کەسەی کە لەنێو هاوتەمەنەکانیدا لە منداڵ و مێردمنداڵ، بە سەرنجڕاکێش دادەنرێ، ئیدی نێر بێ یان مێ، لە لایەن ئەو کەسانەشەوە کە لە خۆیان گەورەترن، هەر وەک کەسێکی سەرنجڕاکێش تەماشا کراوە، هەروەها ئەو منداڵ و مێردمنداڵانەی کە سەرنجڕاکێشەرن لە لایەن دەوروبەرەوە، خۆشەویستتر و خواستراوترن، بەراورد لەگەڵ هاوتەمەنەکانیان لە هەمان توخم، یان لە توخمی دژ، ئەوانەش کە هیچ خەسڵەتێکی سەرنجڕاکێشانیان تیادا نییە، خۆشەویست نین و هاوتەمەنەکانیان ڕقیان لێیان دەبێتەوە (دیون Dion و ئەوانی دیکە ١٩٧٤).

هەروەها (دیون ١٩٧٧) بۆی دەرکەوت سەرنجڕاکێشانی ڕوخسار بە یەکەمین خاڵی سەرنجڕاکێشانی تاک دادەنرێ و یارمەتیی خاوەنەکەی دەدات بتوانێ پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی بەردەوام و هاوڕێیانەتر و ڕاستگۆتر ببەستێ، هەروەها کاریگەریی دیاری دەبێ لە ئاڕاستەکردنی ڕەفتاری تاک بەو ڕەوتانەدا کە دوورە لە لاوازی و شەڕانگێزی و ئازاردانی کەسانی دیکە. لە لێکۆڵینەوەی دیکەدا ئەوە دەرکەوتووە، بە شێوەیەکی گشتی ئەو تاکانەی کە سەرنجڕاکێشەرترن، لە ڕوانگەی ئەو کەسانەوە کە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن، خاوەنی خەسڵەتی پۆزەتیڤن، بە پێچەوانەی ئەوانەوە کە خاوەنی ئەم سەرنجڕاکێشانە نین، کەسانی دەوروبەریان بە جۆرێ لێیان دەڕوانن کە خاوەنی خەسڵەتی نێگەتیڤن. لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە سولومون و ساکس (1979)Solomon and sax ئەنجامیان داوە، گرتەی ڤیدیۆییان دەربارەی چەند کچێک پیشانی کۆمەڵێک کەس داوە،

هەندێ لە کچەکانیان بە سەرنجڕاکێش پیشان داوە و هەندێکی دیکەیان بە شێوەیەکی کەمتر سەرنجڕاکێش، لەژێر وێنەکانیشیاندا ئاماژەیان بە ئاستی زیرەکیی ئەو کچانە داوە کە نمایشیان کردوون، دەرئەنجام لێکۆڵینەوەکە ئەو ئەنجامانەی بەدەستەوە دا، کە سەرنجڕاکێشانی جەستەیی و ئاستی زیرەکی کاریگەریی گرنگیان هەیە لەسەر دروستبوونی بۆچوونی کەسی بینەر و بڕیاردان لەسەر ئەوەی ئایا ئەو کەسە سەرنجڕاکێشە یان نا، هەروەها لێکۆڵینەکەوە ئەوەشی خستە ڕوو کە خەڵک بە شێوەیەکی گشتی لە کاتی حوکمدانیان لەسەر ئاستی سەرنجڕاکێشانی کەسی بەرامبەر بە تەمەڵ وەسف دەکرێن، چونکە خەڵک خۆیان نارەنجێنن کە بە قووڵی ورد ببنەوە، تەنیا لەڕێی ڕواڵەتی دیار و ئاشکراوە بڕیار دەدەن، ئایا ئەو کەسە سەرنجڕاکێشە، یان سەرنجڕاکێش نییە، هەمان شت لە زۆربەی چاوپێکەوتنە کورتەکاندا ڕوو دەدات کە بۆ مەبەستی کار و خوێندن و دامەزراندن ئەنجام دەدرێن، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی کە بە خێرایی ڕواڵەتە جەستەییەکان لە کەسێکدا دەیانجووڵێنی و بە سەرنجڕاکێشەر دایدەنێن، هەمان ئەو هەڵچوونە خێراییە بۆ بڕیاری کۆتایی بەرامبەریان بەکاری دەهێنن. لە ژمارەیەک لێکۆڵینەوەی دیکەدا کە کۆمەڵێک خوێندکار بە هەڕەمەکی بەسەر کۆمەڵێک کۆمپیوتەردا دابەش کراون، دواتر تێبینی کراوە ئەوەی لە سەرەتاوە پاڵ بە هەردوو توخمەکەوە دەنێ بۆ ئەوەی یەکدی بناسن و لەگەڵ یەکدیدا دابنشین و قسە بکەن، پشت دەبەستێت بە خەسڵەتە جەستەییە سەرنجڕاکێشەرەکان، ئەم دەرئەنجامە لە لایەن ئەو تێبینییانە پشتیوانیی لێ دەکرێ کە لەسەر کۆمەڵە خوێندکارییەکان و ئەو کۆمەڵگەیانەی دیکە کۆکرانەتەوە کە بۆ یەکەم جار نێر و مێ پێکەوە کۆدەبنەوە.

**خاڵە سەرنجڕاکێشە جەستەییەکانی مێ**

دەربارەی ئەو خەسڵەتانەی کە لە مێدا هەن و سەرنجی پیاو ڕادەکێشن، جیاوازیی شارستانی و تاکانەیی هەیە، تەنانەت لەناو یەک شارستانییەتیشدا.

لەگەڵ بوونی ئەم جیاوازییانەدا، بەڵام وا دەردەکەوێ خەسڵەتە جەستەییەکانی مێ لە هەموو خەسڵەتە مێینەییەکان زیاتر سەرنجی نێر ڕابکێشن، هەروەها لەڕێی ئەم سیفەتانەوە بڕیار لەسەر ئاستی بایەخدانی نێر بە مێ دەدەن، بەڵام سەبارەت بە جیاوازی لە نێوان تاکەکاندا، ئەوا ڕەنگدانەوەی خەسڵەتی کەسێتیی نێرن لەگەڵ باکگراوندی کۆمەڵایەتی و شارستانی و ڕۆشنبیریدا. لە لێکۆڵینەوە تازەکاندا کە سالی بک Sally Beck لە زانکۆی بتلر لە ئەمەریکا ساڵی (١٩٧٩) و ویگن wiggin لە ساڵی (١٩٨٦)دا ئەنجامیان دان، ئەم زانیارییانەیان خستە ڕوو: ئەو پیاوانەی کە مێی قەڵەو و قەبە هەڵدەبژێرن، بەزۆری لە ڕووی سۆزدارییەوە سەقامگیر نین، کەم بایەخ بە بڕوانامە و دەستکەوتنی ئەکادیمی، یان مەسەلەکانی جوانناسی دەدەن. ئەو پیاوانەی ئەو ژنانە هەڵدەبژێرن کە لە ڕووی کێش و قەبارەوە مامناوەندن، بەزۆری هەست بە بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی دەکەن و لەڕێی بەئاگایی زۆریان و قووڵبوونەوە بەناو خودی خۆیاندا، لە پێگەی خۆیان کەم دەکەنەوە. هەرچی ئەو کوڕانەیە کە مێی لاواز و بچووک هەڵدەبژێرن، بەزۆری بەوە دەناسرێن کە لە خەسڵەتەکانی کەسێتی و لە کارەکەیاندا جێگیر نین.

هەروەها هەردوو لێکۆڵینەوەکە ئاماژەیان بەوە داوە ئەو نێرانەی کە حەزیان لە مەمکی گەورەیە بەزۆری ڕووەو توندوتیژی و سەربەخۆیی لە ژیان ئاڕاستەدەگرن، ئەوانەش کە حەزیان لە مەمکی بچووکە بەزۆری ڕووەو نێگەتیڤی دەڕۆن، هەروەها لە پێگەی خۆیان کەم دەکەنەوە، سەرباری ئەوەی کە لە

ڕاکانیاندا یەکلاییکەرەوە نین، هەروەها هەردوو لێکۆڵینەوەکە ئاماژەیان بەوەدا، ئەو نێرانەی کە حەزیان لە سمت و کەفەڵی گەورەیە لە مێدا، بە زۆری وێنایەکی لاوازییان بەرامبەر بە خۆیان هەیە و خۆیان لە پێگەی خۆیان دادەبەزێنن، هەروەها کێشەی خۆگونجاندنیان هەیە، هەرچی ئەو پیاوانەیە کە قاچی قەڵەو هەڵدەبژێرن، بەوە دەناسرێن کەسێتییەکی هێمنیان هەیە و هەست بە بەرپرسیارێتی دەکەن و هۆشیان لەسەر بیرۆکە و هەستەکانی خۆیان چڕ دەکەنەوە، هەرچی ئەوانەیە کە حەزیان لە قاچی ورد و باریکە، بەزۆری حەز و مەیلی جوانناسییان هەیە و هەست بە دژواری دەکەن لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی فشارەکاندا، بەڵام هەیشیانە بەوە دەناسرێن کە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە پشت بە کەسانی دیکە دەبەستن، یان هەوڵ دەدەن سەرنجی کەسانی دەوروبەر بۆ لای خۆیان ڕابکێشن.

## خەسڵەتە جەستەییەکانی نێر کە مێ حەزیان لێ دەکات

هەندێک خەسڵەتی جەستەیی لە نێردا هەن کە سەرنجی مێ ڕادەکێشن. بەگشتی خەسڵەتە جەستەییەکان لە نێردا کەمتر سەرنجی مێ ڕادەکێشن، هەروەها ئەو خەسڵەتانەی کە لە نێردا سەرنجی مێ ڕادەکێشن، لەگەڵ ئەو خەسڵەتانەدا ناگونجێن کە نێر بڕوای وایە لای مێ سەرنجڕاکێشن. ئەو دوو لێکۆڵینەوەیەی کە پێشتر ئاماژەمان پێ دان، ئەم دەرئەنجامانەشیان بەدەستەوە دا: "مێ حەزی لە سنگی مامناوەندیی نێرە لە ڕووی قەبارەوە، بەڵام ئەو مێیانەی حەزیان لە سنگی گەورە و قەبەی پیاوانە، بەزۆری ئەو مێیانەن کە مەیلی یاریی وەرزشی و چالاکیی جەستەییان هەیە و بە جۆرێکیش لە خۆیان دەڕوانن کە کەمتر مێیەتییان هەیە، ئەو پیاوانەش کە لە ڕووی قەبارەوە سنگیان مامناوەندە، بەزۆری سەرنجی ئەو مێیانە ڕادەکێشن کە بە مێیەتی دەناسرێن و بایەخپێدانی ژینگەییان هەیە.

نێره لەڕولاوازەکانیش سەرنجی ئەو مێیانە ڕادەکێشن کە خۆپارێزن و سەر بە ئاستی ئابووری و کۆمەڵایەتی باڵان. سەبارەت بە بەشە نێرینەییەکانیش لە پیاودا، ئەو مێیانەی حەز دەکەن پیاو سنگی گەورە بێ و ناوچەی سمتی بچووک بێ، بەزۆری ئەوانەن کە ئاستی خوێندن و بەدەستهێنانی ئەکادیمیان بە لاوە گرنگە، ئەوانەش کە پیاوی سنگ و قاچ بچووک هەڵدەبژێرن، بەزۆری لە ڕاکانیاندا یەکلاییکەرەوەن و لە ڕووی مێیەتییەوە نیگەتیڤن...".

***

ئەو خەسڵەتانەی سەرنجی نێر لە مێدا ڕادەکێشن، یان سەرنجی مێ لە نێردا ڕادەکێشن بۆ مەبەستی هاوسەریتی، یان هاوڕێیەتی، مەرج نییە هەمان ئەو خەسڵەتانە بن کە بۆ مەبەستی سێکسی سەرنجی مرۆڤ ڕادەکێشن، هەروەها لێکۆڵینەوەکان ئاماژە بەوە دەدەن جیاوازییەکی گەورە هەیە لە نێوان ئەو خەسڵەتانەی کە پیاو پێی وایە سەرنجی ژن ڕادەکێشن، لەگەڵ ئەو خەسڵەتانەی کە مێ پێی وایە لە پیاودا سەرنجڕاکێشن. بەگشتی نێر پێی وایە ئەو خەسڵەتانەی لە پیاودا لای مێ سەرنجڕاکێشن بریتین لە ڕوخسارە جەستەییە نموونەییەکان بەپێی بایەخەکانیان لە سەرەوە بۆ خوارەوە کە بریتین لە: سنگ و شان و ملی ماسوولکەیی، قۆڵی ماسوولکەدار، کەلەگەتی و گەورەیی ئەندامی نێرینە، بەڵام ئەو خەسڵەتانەی لە پیاودا لای مێ سەرنجڕاکێشن بە تەواوەتی جیاوازن، بەپێی لێکۆڵینەوەکان دەرکەوتووە، ئەم خەسڵەتە جەستەییانە لە سەرەوە بۆ خوارەوە لە پیاودا لای مێ سەرنجڕاکێشن ئەمانەن: "سمتی بچووک، جەستەی باریکەلەی مامناوەند و سکی تەخت و چاوی گوزارشتکەر". لە یەکداچوونی ئەم خەسڵەتانەدا دەردەکەوێ کە نێر پێی وایە ئەو خەسڵەتانەی سەرنجی مێ ڕادەکێشن، ئەو خەسڵەتانەن کە توخمی نێر لە مێ جیا دەکەنەوە، بەڵام مەسەلەکە لای ژن جیاوازە، بۆیە وا دەردەکەوێ کە نێر دەرکی بە حەز و مەیلەکانی مێ نەکردبێ.

## سەرنجڕاکێشانی سێکسی

ئەو خەسڵەتانەی کە سەرنجی کەسێک بە مەبەستی پەیوەندیی سێکسی ڕادەکێشن، مەرج نییە هاوتا بێ لەگەڵ خەسڵەتە سەرنجڕاکێشەرەکان بە مەبەستی دیکە، بەڵام هەندێک لەو ڕەگەزانەی خەسڵەتە سەرنجڕاکێشەرە سێکسییەکان پێک دەهێنن بەزۆری لە زۆربەی حاڵەتەکانی سەرنجڕاکێشانی نێوان نێر و مێ هەیە.

ئەم واقیعە لە نێردا زیاتر بوونی هەیە وەک لە مێ، هەروەک لە دەقە ئەدەبی و بوارە هونەرییەکاندا ڕوون و ئاشکرایە، هەروەها توێژینەوە هاوچەرخەکانیش وەک ئاماژەمان پێ دان، پشتیوانی لەو بۆچوونانە دەکەن، کە نێر زیاتر لە مێ لە کاتی هەڵبژاردنی کەسێکدا، یان یەکترناسین، یان هاوڕێیەتی، یان هاوسەرێتی، دەکەونە ژێر کاریگەریی خەسڵەتە جەستەییەکانەوە، هەروەها ئەوەی لەم پەیوەندییەدا لە ڕووی سێکسییەوە دەیانوروژێنێ، دەبێتە بناغە بۆ هەر پەیوەندییەکی دیکە، ئیدی تاک خۆی لەمە بەئاگا بێ، یان بێئاگا بێ. دەکرێ لە هەمان ئەو سەرچاوانەوە ئەو دەرئەنجامە هەڵبهێنجێنین، ئەوەی لە نێردا سەرنجی مێ ڕادەکێشێ، بە تەواوەتی جیاوازە لەوەی لە مێدا سەرنجی نێر ڕادەکێشێ، ئەمەش ئەو ئینتباعە دەبەخشێ کە هەموو لایەنە سێکسییەکانیان لە سەرنجڕاکێشانی مێ بۆ نێر و بۆ هەر مەبەستێک بێ، ڕۆڵێکی لاوەکی و کەمبایەخیان هەیە، ئەم جیاوازییە لە نێوان دوو توخمەکەدا، دەشێ بەهۆی جیاوازیی بایۆلۆژیی نێوان دوو توخمەکەوە نەبێ، هێندەی ئەوەی بۆ جیاوازیی کۆمەڵایەتی و شارستانی بگەڕێنەوە، کە ئەم جیاوازییانە ڕێگە بە نێر دەدەن لەسەر بناغەی سێکسی هەڵبژاردن بکەن، لە کاتێکدا پاڵ بە مێینەوە دەنێن ڕووەو ئەو خەسڵەتە

سەرنجڕاکێشەرانە ئاڕاستە بگرێ کە پاراستن و چاودێری و دڵنەوایی بۆ فەراهەم دەکەن. ئاشکرایە ئەو فاکتەرانەی کە بڕیار لەسەر هەندێ لایەنی سەرنجڕاکێشانی نێوان دوو توخمەکە دەدەن، گۆڕانیان بەسەردا دێ، چونکە ڕۆڵی ژیانی هەریەک لە دوو توخمەکەش لە گۆڕاندایە، تا گەیشتووە بەو دۆخەی کە بۆشایی نێوانیان کەم بووەتەوە، ئەویش بەهۆی فاکتەرەکانی گۆڕانەوە کە لە سەردەمی نوێدا ڕووبەڕووی ژن بوونەتەوە، بە زامنکردنی ئازادی و ڕۆشنبیری و سەرچاوەی بژێویی ژیانیشییەوە. ئەم گۆڕانە ڕێگەی بە ژن داوە مافی هەڵبژاردنی پیاوی هەبێ لە پەیوەندییەکانیدا، بە پەیوەندیی سێکسییشەوە، لەبەر ئەوە وا لە مێ چاوەڕوان دەکرێ لە سەردەمی ئێستا و سەردەمەکانی داهاتووشدا، حەز و مەیلە ڕەسەنەکانی بخاتە ڕوو زیاتر لەوەی کە تا ئێستا خستوونییەتە ڕوو، هەروەها ئازادانە ئەم حەز و مەیلانە باس بکات و ڕاشکاوانە دەریانببڕێ. بەڵام هیچ کەس ئەوە نازانێ، پەیوەندیی نێوان دوو توخمەکە، بەرەو چ ئاڕاستەیەک سەقامگیر دەبێ کاتێک کە هەردووکیان لەگەڵ یەکدا یەکسان دەبن، ئەوەی لە دەق، یان دەرئەنجامی توێژینەوەکان، یان تێبینییە بەڵگەنەویستەکانەوە دەردەکەوێ، ئەوەیە جیاوازیی نێوان دوو توخمەکە لە هەڵوێستە ئاشکرا، یان شاراوەکانیان بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان، خۆی لە خۆیدا دەبێتە هێزی سەرنجڕاکێشان لە نێوان دوو توخمەکەدا، چونکە گۆڕانی پاڵنەرە سێکسییەکان بۆ پاڵنەری دیکە وا دەکەن ڕازیبوونی سێکسی ببێتە فاکتەرێکی قورستر و کەمتر بتوانرێ ڕازی بکرێ، هەر ئەمەش هۆکارە بۆ هەوڵی مرۆڤ بەرەو کەماڵ و ڕازیبوونێک کە کۆتایی بۆ نییە، ئەم هەوڵدانەش، بە زیادبوونی کاریگەریی شارستانییەت بۆ سەر فاکتەرە سەرەتاییە بایۆلۆژییەکان، هەروەها بە زیادبوونی

کاریگەریی ئەقڵ بۆ سەر لایەنی سۆزداری، ئەوەندەی دیکە زەحمەتتر بووە. ئەگەر مرۆڤ بیتوانیایە، بەهۆی کاریگەریی پێشکەوتن، یان بەرەودواوە گەڕانەوە، سەرلەنوێ بۆ ڕەگوڕیشە بایۆلۆژییەکەی بگەڕایەتەوە، کە پەیوەندیی سێکسیی ڕاستەوخۆ و بەدەر لە شەهوەتی ئەقڵی، ئاسان و ڕێگەپێدراو بوو، ئەوا ئەو پێشکەوتنە هەموو ڕەگەزەکانی سەرنجڕاکێشانی نێوان دوو توخمەکەی دەسڕییەوە، دۆخێکی لەم جۆرەش دەشێ یەکسانی، یان لێکچوون لە نێوان دوو توخمەکەدا دروست بکات لەو حەز و مەیلانەی هەیانە و ئەو ڕەگەزانەش کە ئەم مەیل و حەزانە دروست دەکەن و هەروەها سەرنجڕاکێشانی نێوانیشیان، چونکە هاوجێبوونی نێوان دوو توخمەکە لەم ڕەگەزانەدا، مەرج نییە گونجان و سازان لە نێوانیاندا دروست بکات. دوورکەوتنەوەی نێوان دوو توخمەکە زیاتر زەمانەتی ڕوودانی تەواوکاریی نێوانیان دەکات، چونکە لە هەمان ئەو کاتەدا کە دووری لە نێوانیاندا دروست دەکات، ئەگەری دروستبوونی لێشاوێک لە وزە بەرامبەر یەکدیش دروست دەکات. لەوانەیە ئەم تێڕامانە هەمان ئەو شتە بێ کە د.ه. لۆرانس لە پێناسەکردنی سەرنجڕاکێشانی نێوان دوو توخمەکە مەبەستی بووە، کاتێک دەڵێ: "ئاگرێک لە دوو ئاگردا یەکدەگرێ...". ئەم تێڕامانە لەگەڵ ئەو تێبینییەدا کۆکە کە هەردوو توخمەکە لە پەیوەندییاندا لەگەڵ یەکدی، نە نێر دەزانێ چی سەرنجی مێ ڕادەکێشێ، نە مێ دەزانێ چی سەرنجی نێر ڕادەکێشێ، چەندە ئاشنابوون بەم زانیارییانە بۆ هەردوو لا ئەستەم و قورس بێ، ئەوەندە سەرنجڕاکێشانی نێوانیان زیاتر بەدی دێت.

## هۆیە پارمەتیدەرەکانی سەرنجڕاکێشان

کۆمەڵێک فاکتەر بڕیار لەسەر سەرنجڕاکێشان بەگشتی و سەرنجڕاکێشانی سێکسی بەتایبەتی، دەدەن، کە خەسڵەتی جەستەیی یان ناجەستەیی تاک خۆی نین. هەر لە کۆنەوە مرۆڤ، نێر بێ یان مێ، دەرکی بە کاریگەریی ئەم هۆیە بەکارهێنراوانە کردووە، کە لە کۆندا و تا ئێستاش ئامانجیان دەرخستن و جەختکردن بووە لە لایەنە باشەکانی تاک لە هەردوو توخمەکەدا، بە شێوەیەک کە سەرنجی پیاوەتیی نێر بۆ مێ و سەرنجی مێیەتیی مێ بۆ پیاو بگوازێتەوە. هەرچەندە زۆربەی جەختکردن و قورسایی کارەکەش کەوتووەتە ئەستۆی ژن زیاتر لە پیاو، بەڵام پیاوان لە کۆندا و لە سەردەمی نوێشدا شێوازی تایبەتییان هەبووە و هەیە لە خستنەڕووی ئەو خەسڵەت و لایەنانەی کە پێیان وایە لای مێ سەرنجڕاکێشن. بەم شێوەیە هیچ کەس ناتوانێ شێوازەکانی خۆگۆڕین و هونەری خۆ ڕازاندنەوە، بە درێژایی سەردەمەکان و تا ئەم سەردەمەی ئێستاشمان، لە ماناکانی سەرنجڕاکێشانی سێکسی جیا بکاتەوە، ئیدی ئەو مانایانە ئاشکرا و لەباری ئاگایی مرۆڤدا بن و خۆی دەرکیان پێ بکات، یان شاراوە و نائاشکرا بن لای ئەو کەسانەی کە ئەنجامی دەدەن و لای ئەوانەش کە لەبەر خاتری ئەوان ئەم کارانە دەکرێ، یان دەکەونە بەردەم کاریگەریی ئەو ڕەفتار و کردارانەوە. ئەگەر ناچاربین لێکدانەوە بۆ ئەم جۆرە سەرنجڕاکێشانە جوانکارییانە ڕوون بکەینەوە، ئەوا بۆمان دەردەکەوێ ئەم خەسڵەتە زیادانە بۆ سەر خەسڵەتەکانی سەرنجڕاکێشان وەک قیافەت و خۆگۆڕین و خۆڕازاندنەوە، ئامانجیان دەرخستنی خاڵ و پنتەکانی ورووژانە لە هەردوو توخمەکەدا بە باشترین شێوە، یان ئەم لایەنە زیادانەی سەرنجڕاکێشان دەبنە هۆی پڕکردنەوەی کەموکوڕییەکان لەو خاڵ

و پێتانەی کە نوقسانن، یان ناشیرینن و بۆ شاردنەوەی کەموکوڕییەکان و تێروتەواوکردنی جوانییەکان.

کۆی هەوڵدانەکە ئامادەباشیی تاک دەنوێنێ بۆ قبوڵکردنی فێڵ و هەڵخەڵەتاندن، تەنانەت ئەگەر بۆ ماوەیەکی کاتیش بێ، هەروەک بڵێی ئەو پرنسیپە جێبەجێ دەکات کە دەڵێ: "هەموو شتێکی جوان باشە". هەرچەندە هەوڵدان بۆ سەرنجڕاکێشان لەڕێی هۆیە دەستکردەکانەوە، یەکێکە لە ڕێساکانی ڕەفتاری مرۆیی، بەڵام زۆرێک لە حاڵەتی شاز هەن کە لەم ڕێسایە دەردەچن، بۆ نموونە هەندێک لە ژنان و پیاوان پێیان وایە سەرنجڕاکێشانی دروست لە سێکسدا و لە توخمی بەرامبەردا کە سێکسی لەگەڵ دەکرێ، بریتییە لە دەرکەوتن بە سروشتی و بێ یارمەتیی هیچ هۆکارێکی دەستکردی سەرنجڕاکێشان، هەروەها هەندێک کەس هەن، کە دەشێ پلەیەک لە پلەکانی لادان بنوێنن، لە ڕووی سێکسییەوە خراپترین شێوە و جوانی سەرنجیان ڕادەکێشێ. لە هەندێک لە شارستانییەتەکاندا، بە شێوەیەکی بەرچاو، حەز و مەیلی ئەو کەسانە دەردەکەوێ، کە بە لایانەوە سەرنجڕاکێشە هاوبەشە سێکسییەکەیان لە شکڵ و شێوە و هەیئەتی لەش و پۆشاکەوە وەک مرۆڤی سەرەتایی، یان بە شێوەیەکی ئاژەڵییانە، دەربکەوێ، تەنانەت لە بەکارهێنانی عەتر و هەڵبژاردنی جۆرەکەشیدا، بۆ ئەوەی بۆنە سروشتییەکانی جەستە بەهێزتر دەربکەوێن و هەستیان پێ بکرێ، بڵاوبوونەوەی ئەم ئاڕاستانە ناکرێ تەنیا لەسەر بناغەی لادان لە حەز و مەیل و وەڵامدانەوە سێکسییەکان، لێکدانەوەیان بۆ بکرێ.

## فیمرون و سەرنجڕاکێشانی سێکسی

فیمرون Phemerone زاراوەیەکە بەو ماددەیە دەوترێ کە بوونەوەر بۆ دەرەوەی جەستەی دەری دەدات و بوونەوەری بەرامبەری، کە سەر بە هەمان جۆرە، لەڕێی هەستەکانییەوە وەریدەگرێ و هەڵچوونێکی تایبەتی دروست دەکات لە شێوەی ڕەفتارێکی دیاریکراودا، یان کردارێکی گەشەدا. هەر لە ساڵی ۱۹۵۹وە کە ئەم زاراوەیە بۆ وەسفکردنی ئەم ماددەیە بەکار هات، ماناکەی بەرفراوان بوو بۆ ئەوەی ئاوێتەیەکی کیمیایی دیاریکراو و ئاشکرا بگەیەنێ کە بوونەوەران لەپێناوی خزمەتکردنی مەبەستێکی دیاریکراوی هەڵچوون و وەڵامدانەوە، دروستی دەکات و بۆ دەرەوە فڕێی دەدات، هەروەها توێژینەوە بایۆلۆژییەکان ئاماژەیان بەوە داوە کە ئەم ماددە کیمیاییە کاریگەریی گەورەی لەسەر ڕەفتاری مێرووەکان هەیە. ئەم ماددانە کاریگەرییەکەیان، یان بە شێوەیەکی سەرەتایی دەبێ، یان بە شێوەیەکی ڕەها، بۆ نموونە، لە شێوە سەرەتاییەکەدا، وەڵامدانەوە درەنگوەخت ڕوو دەدات، بەڵام لە حاڵەتی دووەمدا خێرا و هەنووکەییە، وەک لە کرمی ئاوریشمدا، کاتێ مێیەکە فیمرون بڵاودەکاتەوە، دەبێتە هۆی ڕوودانی لەرەلەرێک لە نێردا و لە ماوەی دوو چرکەدا ئەمە ڕوو دەدات. سەبارەت بە جۆری یەکەمیش، کە جۆرێکە کاریگەرییەکی هێواش دەردەکەوێ، زانا بایۆلۆژییەکان چەندەها نموونە دەخەنە ڕوو، لەوانە کوللە، کاتێک مێیەکی پێگەیشتوو فیمرون دەڕێژێ، دەبێتە یارمەتیدەر بۆ خێراکردنی گەشەی کوللەی نێر.

ئەم تێبینییانە بوونە مایەی بایەخدانی توێژەران بە ڕەفتاری ئاژەڵی و بایەخێکی تایبەتیشیان بە هەستی بۆنکردن لەم ڕەفتارەدا دا، هەروەها لە ئەگەری بوونی ئەم ماددەیە و کاریگەرییەکانی لەسەر پلە باڵاکانی ئاژەڵ وەک مرۆڤ، کۆڵییەوە. ئەگەر ئەم کاریگەرییە لە مرۆڤدا هەبێ، ئەوا ئەگەری ئەوە هەیە وەک

ئارەزووهێنی سێکسی بەکاربێن بۆ یارمەتیدانی ئەو کەسانەی کە تووشی پەککەوتنی سێکسی بوون تا بتوانن حاڵەتەکەیان تێپەڕێنن و چاک ببنەوە. هەرچەندە هەندێک لە توێژەران مژدەی ئەم دۆزینەوەیە و سوودەکانیان بە خەڵکی داوە، بەڵام تا ئێستا هیچ بەڵگەیەکی یەکلاییکەرەوە لەسەر ئەوە نییە کە ئەم ئاوێتە کیمیاییە لە مرۆڤیشدا هەیە، هەروەک لە بوونەوەرانی دیکەدا هەیە.(*) ڕەتکردنەوەی بوونی ئەم ماددەیە لە مرۆڤدا، ئەوە ناگەیەنێ کە هەستی بۆنکردن هەستێکی کارا نییە لە سەرنجڕاکێشانی سێکسیدا، هەروەها ئەوەش ناگەیەنێ کە هیچ دەردراوێکی تایبەتی نییە لە لەشی هەردوو توخمەکەدا کە هەمان کاریگەریی هەبێ، واتە وەک هۆکارێک بۆ سەرنجڕاکێشانی سێکسی ڕۆڵی هەبێ، هەرچەندە زۆربەی خەڵک هەوڵ دەدەن لەڕێی بەکارهێنانی بۆن و عەترە جیاوازەکانەوە کاریگەریی ئەو دەردراوە سروشتییانەی لەش ون بکەن.

تا ئێستا بابەتی فیمرون و پەیوەندیی بە ڕەفتاری سێکسیی مرۆییەوە لەژێر باس و لێکۆڵینەوەدایە، هەرچەندە زاناکان ئەوە ڕەت دەکەنەوە کە هەستی بۆنکردن کاریگەریی لەسەر سەرنجڕاکێشانی سێکسی هەبێ،(**) بەڵام مرۆڤ جیاواز لە زۆربەی پۆلەکانی دیکەی زیندەوەران، توانای هەیە لەڕێی بەکارهێنانی هەستییەوە قەرەبووی هەستێکی دیکەی لەکارکەوتووی بکاتەوە. بە هەرحاڵ توێژەران لەڕێی تێبینیکردنی هەندێ ڕەفتاری ئاژەڵانە و سەرەتاییانەی مرۆڤەوە لە مەسەلە سێکسییەکاندا، بوونی فیمرون لە مرۆڤدا پشتڕاست دەکەنەوە.

**پەراویزەکان:**

*فیرومون بریتییە لە ژمارەیەک ماددەی کیمیایی، لە چەند شوێنێکی جەستە هەیە و لەڕێی ئارەقەوە بە شێوەیەکی تایبەت یان بەرکەوتنەوە دەگوێزرێتەوە. فیرومون وشەیەکی گریکییە و واتە هەڵگری وروووژێنەر و بەرپرسە لە وروووژاندنی سێکسی لە مرۆڤ و ئاژەڵدا هەیە و ڕۆڵی سەرەکیی هاندانی ئاژەڵە بۆ زاوزێ.

فیرومون بە تەنیا بۆنێکی تایبەتی بەرجەستە نییە و لەگەڵ نەستدا مامەڵە دەکات و غەریزەی زاوزێ دەبزوێنێت. فیرومون لەڕێی بۆنەوە هەڵدەگیرێ و ڕۆڵی خۆی دەبینێت، بەلام لەوانەیە ئەو بۆنەی کە فیرومۆنەکەی هەڵگرتووە خۆی بە تەنیا سەرچاوەی وروووژاندن و سەرنجراکێشان بێت، هەرچەندە لە حاڵەتی کارلێککردندا ئەستەمە ئەو دوانە لە یەکدی جیا بکرێنەوە. مرۆڤ، هەروەها ئاژەڵ و ڕووکیش لە جەستەیەوە بۆن دەنێرێت، یان دەردەکات، ئەو بۆنە گوزارشت دەکات لە پێویستی بە پێتاندن، لە مرۆڤدا جیاوازی هەیە، چونکە ئارەزووی سێکسی تەنیا پەیوەست نییە بە زاوزێ و زۆربوونەوە، ئارەزووی سێکس دەشێت تەنیا ئارەزوو بێت بۆ جووتبوون نەک پێتاندن، یان لە هەندێک حاڵەتی دیاریکراودا دەشێت پێوستیی مرۆڤ بێت بۆ خۆبەتاڵکردنەوە لە هەندێک حاڵەتی وەک هەستکردن بە تووڕەیی یان شکستی یان هیلاکی. (سەرچاوە: الرائحه والجنس، د. فوزیه الدریع، منشورات الجمل ٢٠٠٨-وەرگێڕ).

**بەلام د. فەوزیە ئەلدریع لە کتێبی (بۆن و سێکسدا) ڕایەکی دیکەی هەیە و پێی وایە بۆن لە سەرنجراکێشانی سێکسیدا ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت. بۆنی جەستە ئارەزووی سێکسی دەوروووژێنێت، ئیدی لە نزیکەوە بێ لە کاتی بەرکەوتن، یان لە دوورەوە بێ، بۆنی جەستە بەگشتی و هەروەها ئەو ئارەقەی بەسەر پێستەوەیە، ئارەزووی سێکسی لە هەردوو توخمەکەدا دەوروووژێنێ-وەرگێڕ.

# بەشی بیستوشەش
# هونەر و سێکس

-هونەری ڕووت و سێکس (پۆرنۆگرافی)
کاریگەریی هونەری پۆرنۆگرافی
کاریگەریی هونەری پۆرنۆگرافی بۆ سەر کەسانی سروشتی
پۆرنۆگرافی و سەرپێچییە یاساییەکان
پۆرنۆگرافی وەک چارەسەر

## هونەر و سێکس

ئەو کەسەی توێژینەوە دەربارەی بابەتی پەیوەندیی نێوان هونەر و سێکس دەکات، بۆی دەردەکەوێ، ڕوخسار و بوارەکانی ئەم پەیوەندییە زۆر لەوە زیاتر و قووڵترن کە لە ڕواڵەتدا دەردەکەون. هەردووکیان لە ئامانجێکدا هاوبەشن، ئەویش بریتییە لە ئامانجی ژیان و مانەوە، ئەو جوانناسییەی کە لە هونەردا هەیە، وا دەکات کە ژیان خواستراو بێ، سێکسیش وا دەکات مانەوە شیاو بێت. هەریەکەیان خەسڵەتەکانی ئەوی دیکە بۆ خۆی قۆرغ دەکات تا بە ئامانجەکەی بگات، هونەر سیفەتە مرۆییەکان لە شێوەی ڕەنگ و دەنگ و جووڵەدا قۆرغ دەکات بۆ ئەوەی ڕەگەزە سەرەکییەکانی لە بەرهەمی ئەدەبیدا پێ دروست بکات، سێکسیش ئامرازە هونەرییەکان قۆرغ دەکات تا بەئاگایی و حەز و قبوڵکردنی پەیوەندیی سێکسی بەهێز بکات. دروستبوونی ئەم پەیوەندییە لە نێوان ئەم دوانەدا، واتە لە نێوان هونەر و سێکسدا، هەموویان بەهۆی کاریگەریی مرۆڤەوە نەبووە، چونکە بناغەی پەیوەندیی نێوان ئەم دوانە وەک چۆن لە سروشتی مرۆڤدا بوونی هەیە، هاوشێوەکەشی لە سروشتی ئاژەڵان و مێروو هەروەها زیندەوەرانی دیکەشدا هەیە، کە خزمەتی ڕەگەزە هونەرییەکان لە دەنگ، یان ڕەنگ، یان شێوە، یان جووڵەی ئامانجە سێکسییەکان لە ژیانی بوونەوەراندا دەکەن و لێرەشەوە ئامانجی ژیان و مانەوەی بەدی دێنن، نموونە لەسەر ئەمە لە ژیانی هەندێک لە جۆرەکانی ئاژەڵ و باڵندە و ماسی و مێرووودا، زۆرن.

لەبەر ئەمانە، هەر لە سەرەتاوە، سێکس لای مرۆڤ تەنیا واقیعێکی غەریزی، یان فسیۆلۆژی نەبووە کە پەیوەست نەبێ بە

هەست و سۆزەکانی دیکەوە. ئەم واقیعە غەریزییە بایۆلۆژییە پشت بە وزە شاراوەکەی دەبەستێ، بەڵام پێویستی بە هۆکارێکی دیکەیە تا بیورووژێنی و بۆ گوزارشتکردن لە تواناکانی هانی بدات، ئەم وروووژاندنە هەر دەبێ لە سەرچاوە هەستی و ئاوەزییەکانی دیکەوە پەیدا ببن، کە لە ڕواڵەتدا وا دەردەکەون سێکسی نین، بەڵام لە واقیعدا بە توندی لەگەڵ ژیانی سێکسیدا گرێ دراون.

لە بناغەی ئەم پەیوەستییە هاوبەشەی نێوان هونەر و سێکس لە ژیانی مرۆڤدا، پەیوەندیی نێوانیان بەردەوام بوو، هەروەها بە تێپەڕبوونی کات، هەر لە سەرهەڵدانی شارستانییەتە مرۆییەکانەوە و تا ئێستاش، پەیوەندیی نێوانیان بەتینتر بوو. دەرئەنجامی ئەم پەیوەندییەش، سێکس بووە هەڵگری مانا و چەمکی شارستانی و سرووتی و ئایینی و جوانناسی و ویژدانی، وای لێهات سێکس زیاتر پێویستی بە بەکارهێنانی ئامرازەکانی هونەر و فیکر بوو، بۆ ئەوەی گوزارشت لەم چەمکانە بکات و بەهێزیان بکات، ئیدی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بوو بێ یان ناڕاستەوخۆ بوو بێ لە شێوەی سیمبول و ڕەمز و ئەو وێنانەی دیکە کە دەکرێ لە ڕێیانەوە گوزارش لە چەمک و مانا هەستی و نەستییەکان بکەن لە ژیانی مرۆڤدا.

***

پێشتر و لە ئێستاشدا سروشتییە هونەر هەر لە سەرەتاوە ڕووەو جەستەی مرۆڤ ئاڕاستە بگرێ، بەتایبەتی مێ بۆ ئەوەی ببێت بە بابەتی هونەر، هەروەها پێشتر و تا ئێستاش سروشتییە، سێکس جەستە، بەتایبەتی جەستەی مێ، بکات بە سیمبول بۆ پێویستیی سێکسی، بەڵام سەرەتای بایەخدانی هونەر بە جەستە و بەتایبەتی جەستەی مێ، هۆکارە پاڵنەرەکەی سێکس نەبووە بۆ ئەوەی چێژ ببەخشێ، بەڵکو لەسەر بناغەی چەمکی پەرستن بووە

که له گۆشەنیگای خولقاندن و پیتاندنەوە لە ژنیان ڕوانیوە، هەروەها وەک خوای خولقێنەری سەر زەوی تەماشایان کردووە کە ئەوەی ئەو دەتوانێ بیکات، کەس ناتوانێ، هەر لەبەر ئەوەشە هونەرمەندە دێرینەکان پەیکەری ڕووتی ژنیان لە دۆخی پیتاندن و دووگیانیدا داتاشیوە. گومان هەیە کە هونەرمەند، یان بینەر کاتێ لەو سەردەمە زۆر کۆنانەدا تەماشای ئەم پەیکەرە ڕووتانەی ژنیان کردووە، شتێکیان تیا بەدی کردبێ کە ئارەزووی سێکسییانی ورووژاندبێ تەنیا لە پێناوی سێکسدا، بەڵام ئەوە دوور نییە کە ئەو هونەرمەندە توانیویەتی لە یەک هەستدا، دوو ئارەزوو پێکەوە تێکەڵ بکات، ئارەزووی سێکسی لەگەڵ بڕواهێنان بە پیرۆزیی سێکس و کۆکردنەوەی ئەم دوانە لە وێنەی ژنێکی خولقێنەردا.

ئەوەی پشتیوانی لەم وێنایە دەربارەی مرۆڤی دێرین دەکات، تێبینیکردنی پێگەی هونەری گوزارشتکردنە لە جەستە لە ژیانی کۆمەڵگە سەرەتاییە هاوچەرخەکاندا، هەروەها بەدواداچوونی ئەم شێوازە لە هونەری سێکسی لە شارستانییەتە ڕەسەن و دێرینەکانی وەک هونەری یۆنانی و هیندی و چینی، هەمان ڕامان لا دروست دەبێ. پەیکەرە سەرەتاییەکان، بەتایبەتی پەیکەری مێ، جەخت لەو ناوچە جەستەییانە دەکەن کە تایبەتن بە پیتاندن، لەوانەشە ئەم پەیکەرانە بۆ مەبەستی جادوویی بەکار هاتبن کە لەو سەردەمەدا ئەم مەبەستانە دەشێ بە شێوەیەک لە شێوەکان لە خزمەتی ژیانی ئەم کۆمەڵگەیانەدا بووبن. لە هونەری گریکدا، ئەو پەیکەرانە زۆرن کە جەخت لەسەر شێوەی جەستەی مرۆیی دەکەن، بە ئەندامە سێکسییەکانی هەردوو توخمەکەشەوە، بەتایبەتی جەستەی مێ. پاڵنەری ئەم جۆرە کارە هونەرییانە لە سەرەتادا ئایینی، یان ئەفسانەیی بووە، هەروەها ئامانجی جەختکردن بووە لەسەر ڕۆڵی مێ لە پرۆسەی خولقاندندا و ڕۆڵی

پیاو لە ڕووی دەسەڵات و زیندەگییەوە، هەروەها چەندەها پاشماوەی دێرینی سەردەمی گریکی هەن کە بە شێوازێکی دیار و ئابڕووبەرانە پەیوەندییە سێکسییە جیاجیاکانیان وێنا کردووە، بە پەیوەندیی سروشتی و هۆمۆسێکسوالیتییشەوە.

بڵاوبوونەوەی ئەم جۆرە وێنەیە لە شێوەی پەیکەر، یان سیرامیک، یان لەسەر پارەی کانزایی، هەموویان ئاماژەن بۆ ئەوەی ئامانج لەم هونەرە سێکسییە بریتییە لە دەربڕینی یان بەرەڵاکردنی وزەی سێکسی، هەروەها دەربڕینیشی لەم کۆمەڵگەیانەدا گونجاوە لەگەڵ ئەو ڕێز و پلەوپایەیەی کە بە خواوەند بەخشراوە. هونەری گریکی ڕووەو جەستە ئاڕاستەی گرتووە و بە تەرزێک یان نموونەیەک بۆ جوانی و هاوسەنگی دایناوە، لە سەرەتادا بایەخی زۆر بۆ جەستەی پیاو تەرخان کرابوو، پاشان بۆ بایەخدان بە جەستەی ژن گوازرایەوە. لەگەڵ ئەم گۆڕانەدا، گۆڕانێکی دیکە لە ڕوانینی هونەرمەند بۆ بابەتی هونەرەکەی سەری هەڵدا، دەرئەنجام ئەوەی پەیدابوو هونەرێک بوو دەکرێ وای دابنێین کە لەپێناوی بەهێزکردنی ئارەزووی سێکسیدایە، یان هونەرێکی جەستەییە، بەڵام سەرهەڵدانی ئەم ئاڕاستەیە لای هونەرمەند و لای بینەریش، بە تەواوەتی ئەو ئامانجەی هونەری جەستەیی بەتاڵ نەکردەوە کە هۆکارێکە بۆ گوزارشتکردن لە بیروباوەڕی ئایینی، یان ئەفسانەیی. ئەوەی بەسەر شارستانییەتی گریکیدا ڕووی دا، هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانی هونەر بە مەبەستی پەرستن و سروتە ئایینییەکان، پاشان پەرەسەندنی بۆ خزمەتکردنی مەبەستە سێکسییەکان و کۆکردنەوەی ئەم دوو ئامانجە پێکەوە بە بڕ و هێندی جیاواز، هەمان شت بەسەر شارستانییەتەکانی دیکەشدا ڕووی داوە، وەک شارستانییەتی ڕۆمانی و هیندی و چینی و شارستانییەتەکانی سەدەکانی ناوەڕاست و سەردەمی ڕێنسانس، هەندێجار ئاڕاستەی

هونەر لەپێناوی ئایین، یان لەپێناوی ئامانجی نەمرکردنی ئەفسانەکان و وێناکردنیان، زاڵ بوو، هەندێجاری دیکەش ئاراستەی هونەر لەپێناوی ئامانجی گوزارشتکردن لە پاڵنەرە سێکسییەکان و وروژاندنی ئارەزووی سێکسیدا زاڵ بوو. لەم حاڵەتەی دواییاندا، هونەرمەند گوزارشتی لە بایەخی فاکتەری سێکسی دەکرد لە ژیانیدا و لێرەشەوە ئەم بایەخپێدانە لە هونەرەکەیدا ڕەنگی دایەوە.

هەروەها ئاشکرایە ئەم بایەخپێدانە لە لایەن هونەرمەندەوە یەکی گرت لەگەڵ بایەخپێدانی هاوشێوەی زۆر کەسی دیکە لە کۆمەڵگە جیاوازەکاندا، کە بۆیان دەرکەوت وێنە و سیمبولەکان لە کاری هونەریدا زۆر لەوە زیاترە کە تەنیا گوزارشتێکی جوانناسی، یان ئایینی، یان ئەفسانەیی بن، لە سەرەتادا قورس بوو بۆ هونەرمەند، لایەنە شەهوانییەکان لە هونەردا لە وێنەیەکی ڕاستەوخۆ و ڕاستگۆیانەدا بخاتە ڕوو، لەبەرئەوە پەنای بردووە بۆ خستنەڕوویان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لەڕێی بەکارهێنانی بابەتە ئایین و ئەفسانەییە کلاسیکییەکانەوە، هەروەک بوچللی و ڕوفائیل کردیان. لە هەندێک حاڵەتیشدا هونەرمەند سەرکەوتوو نەبووە لە شاردنەوەی پاڵنەرە سێکسییەکان، تەنانەت لە بابەتە ئایینییەکانیشدا، هەروەک لە وێنەکەی هونەرمەند مایکڵ ئەنجلۆ لە کڵێسەی سستین لە ڕۆما، ڕووی دا، کە بە قێزەوەن دانرا، بۆیە پاپا ناچاربوو لای ببات، پاشان بڕیارەکەی هەموار کرد و فەرمانی دەرکرد جل و پۆشاک بکەنە بەری وێنە و پەیکەرە ڕووتەکانی فریشتەکان و مریەمی پاکیزەیی و کەسایەتییە ئایینییەکانی دیکە. ئەم دۆخە لە کۆنەپارێزی بەرامبەر ئەم بابەتانە، هێندە درێژەی نەکێشا، چوارچێوەی گوزارشتکردنی سێکسی ڕاستەوخۆ بەرفراوان بوو لەڕێی هۆیە جیاجیا هونەرییەکانەوە لە پەیکەرتاشی و وێنە و چیرۆک و شیعر و ڕۆمان و کتێب و

شێوازەکانی دیکە، وەک شێوە رووتە هونەرییەکانی بوچللی و رۆفائیل و رۆمانۆ، هەروەها گۆرانییەکانی ئاریتینۆ Aretinoی ئیباحی، کتێبی بوکاشیو دیکامیرۆن The Decameron، هەروەها کتێبی رابلیەی گارگانتوا و پانتاگرول Gargantua and Pantagrul، هەروەها چیرۆکەکەی دۆن جوان کە لە چەندەها ولاتی ئەورووپی جیاجیا پەرەی پێ درا و بوو بە سیمبول بۆ داوێنپیسی و بێئابڕوویی، هەروەها یادەوەرییەکانی کازانۆڤا، یادەوەرییەکانی ژنی چێژەکان و ڤالنی براون، رۆمانەکانی مارکیز دی ساد کە ئەو دروشمەی بەرز کردەوە، ئازار نەک چێژ، بالاترین شێوەکانی چالاکیی سێکسییە لای من، دەرکەوتنی ماسۆشی بەهۆی رۆمانەکانی مازۆخەوە، هەروەها دەرکەوتنی ئەو داستانانەی کە هۆیەکانی توندوتیژی و ئازادکردنی سێکسییان خستە روو، لەگەڵ ئەو کتێبانەی کە باسی پەیوەندیی سێکسیی هۆمۆسێکسوالیتییان دەکرد، کە دەرکەوتنی ئەم بەرهەمانە بوونە مایەی رێزلێنانی شارستانییەتی گریک و شارستانییەتی رێنسانس لە ئیتالیا لە پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتی، هەروەها کتێبۆکە و بەڵگەی جیاواز دەرکەوتن کە هەموویان جەختیان لەسەر لایەنی سێکسی لە هاوسەرێتیدا دەکرد و هەروەها هانی گەمەی سێکسیی بەر لە سێکسی راستەقینەیان دەدا. ئەم نامیلکە یان کتێبۆکانە لەژێر ئەو وتەیەدا دەشارانەوە کە لەسەر زاری ئەرستۆوە دەیانگێڕایەوە، کە سێکس شتێکی باشە و بەشێکی گرنگە لە ژیاندا و بەخشندەیەکە لە لایەن خواوە و پێویستە قبوڵی بکەین و چێژی لێ ببینین. ئەم وتەیە کاریگەرییەکی گەورەی بۆ سەر شارستانییەتی خۆرئاوە و هەڵوێستەکانی بەرامبەر بە سێکس هەبوو، ئەگەر هیچ کاریگەرییەکیشی نەبووبێ، بەڵگەیەکی پێشکەش کرد کە لە ئاراستەگرتن رووەو رێگەدان بە سێکس لە ژیاندا، پشتی پێ

بەسترا، هەروەها ڕێگەی بۆ هونەری ئەورووپی و خۆرئاوایی خۆش کرد تا بابەتە سێکسییەکان بە زمانێکی سیمبولی دەرببڕن و لەم بابەتانەدا ئەو شێوە و سیمبولانە هەڵبژێرن کە هەست دەورووژێنن. کە بێ بەکارهێنانی ئەو هەستە وروووژێنەرانە لە شێوە و سیمبولە هونەرییەکاندا، لەوانەبوو، گوزارشتکردن لە بابەتی سێکس لە هونەردا، وەک خۆی بمایەتەوە، کاتێکیش هونەر دەستی بۆ ئەو بابەتانە برد کە لە ڕواڵەتدا مەغزایەکی مۆراڵییان هەیە، هونەرمەندان بە جۆرێک کاریان کرد کە ناوەڕۆک قبوڵکراو و شیاو بێت لای خۆیان و لای بینەریش.

*** 

بڵاوبوونەوەی ئەو هونەرانەی کە خاوەنی بابەت یان ئاماژەی سێکسی بوون، لە شارستانییەتەکانی دیکەشدا جگە لە شارستانییەتی گریکی و ئەورووپی، ڕووی دا، هەندێک لەم شارستانییەتانە کەوتبوونە ژێر کاریگەریی شارستانییەتی گریکییەوە، هەروەک شارستانییەتی هیندی، هەندێکی دیکەشیان دەرئەنجامی پەرەسەندنێکی سەربەخۆی پەیوەندیی نێوان هونەر و سێکس پەیدابوون.

ئەو نەخشونیگارانەی کە لەسەر بەردەکان هەڵکۆڵراون و بە پاشماوەی شارستانییەتی چاخی بەردین دادەنرێن لەسەر شاخەکانی ئەتڵەسی بیابانی، دیمەنی وێنەیی سێکسی دەخەنە ڕوو، کە بەزۆری بابەتەکانی ڕاو و بابەتە سێکسییەکان پێکەوە پەیوەست کراون. لە شارستانییەتی هیندیدا، بەردەوامییەک لە نێوان ئەفسانە و واقیعدا بەدی دەکەین. هەرچەندە هونەری هیندی لەژێر کاریگەریی هونەری گریکیدا بووە لە ڕووی ناوەڕۆکی سێکسییەوە، بەڵام ئاڕاستەیەکی وروووژێنەرتری لە گوزارشتدا گرتەبەر. شکڵ و شێوە هونەرییەکانیان، بەتایبەتی لە پەیکەرتاشیدا، زۆر وروووژێنەر بوون، هونەرمەند هەوڵی داوە

خستنەڕووی توانا جەستەییەکانی مێ لەگەڵ ئیقاعی پەیکەرتاشیدا پێکەوە کۆ بکاتەوە، کە ئەمەش وروژان و شەهوەت بەهێز دەکات. ئەوەی لە پەیکەر و داتاشراوەکاندا تێبینی دەکرێ، لە وێنەکانیشدا تێبینی دەکرێ، کە ئەوانیش ئەفسانە و واقیع پێکەوە کۆ دەکەنەوە، بە هەمان شێوە لە هونەرە جیاوازەکانی میوزیکیشدا هەمان شت ڕووی داوە. هەرچەندە دەکرێ بە جۆرێ لەم نموونە و تەرزە هونەرییانە بڕوانین کە گوزارش لە پەیوەندیی نێوان سێکس و ئایین دەکەن، بەڵام هاوکات هەڵگری وزەیەکی سێکسیی شەهوانیشن. لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵگەی هیندی، یان تەنانەت هونەرمەند و بینەریش، هەست بە هیچ شەرمندەیی، یان گوناه، یان ترس ناکەن، بەڵکو لەو نێوکۆیەدا لێی دەڕوانن کە سێکس و ئەنجامدانی سێکس شتێکی جوانە و لەگەڵ ئەفسانە و بیروباوەڕی ئایینییشدا دەگونجێ. بە باکگراوندێکی دەوڵەمەند بەم جۆرە هەستانە، ئیدی نووسین و دەستاودەستکردنی کتێبێکی بەناوبانگی وەک کاماسوترا Kama Sutra شیاو دەبێ، کە ئەم کتێبە بە کۆنترین بەڵگەی سێکسی دادەنرێ لە جیهاندا، کە لەم سەردەمەدا وەک کتێبێکی هونەریی شەهوانیی سێکسی (پۆرنۆگرافی) تەماشا دەکرێ. هەرچەندە تەنیا پوختە و کورتکراوەی نووسینە سەنسکریتییە دێرینەکانە دەربارەی سێکس و ئایین و ڕۆحانییەت، بەڵام بۆ سەردەمانێکی دوورودرێژ وەک هۆکارێکی یارمەتیدەر بۆ ڕاهێنانی ڕۆحی تەماشای کرا. لە شارستانییەتی چینیشدا، ئەو چیرۆکانە بڵاوبوونەوە کە ناوەڕۆکێکی سێکسییان هەبوو و هەمیشە ئەو سەرنجەیان دەبەخشی کە مەبەستەکانی ئەم چیرۆکانە پۆرنۆگرافی و شەهوانین، بەڵام هەمیشە بەڵگەی مۆراڵییان لەخۆ دەگرت، چونکە کەسایەتییەکانی ناو ئەم چیرۆکە سێکسییانە هەمیشە دەگەیشتن بە ئاشکراکردنی هەقیقەتە ئایینییەکان.

## هونەری پۆرنۆگرافی

پۆرنۆگرافی Pornography لە ڕووی داڕشتنەوە، لە دوو بێژە پێک هاتووە: پۆرنۆ، واتە لەشفرۆشیی نزمترین پلە، گرافی، واتە هێڵ، یان وێنە. بەم شێوەیە زاراوەکە پێکەوە ئاماژە دەدات بە وێناکردنی پەیوەندیی سێکسیی لەشفرۆشی بە ڕێگەی بەرنامەڕێژی، بەڵام ئەم زاراوەیە بەرفراوان بوو، هەموو ئەو بابەتانەی گرتەوە کە ئاماژە بە سێکس دەدەن و شەهوەتی سێکسی دەورووژێنن لەڕێی هەموو هۆیەکانی گوزارش و دەربڕینەوە کە هونەر و ئەدەب بەکاری دەهێنن لە شێوەی وێنە، یان وێنەگرتن، یان نواندن، یان سەما، یان پەیکەرتاشی، یان میوزیک و هەموو بوارەکانی دیکەی هونەری شێوەکاری و تەعبیری. ئەستەمە کات و شوێنی سەرهەڵدان و دەستپێکردنی هونەری پۆرنۆگرافی دیاری بکرێ، هەروەها ناکۆکی هەیە سەبارەت بەوەی هونەری پۆرنۆگرافی چی دەگرێتەوە، هەروەها لە دانانی سنووری جیاکەرەوەی نێوان هونەری پۆرنۆگرافی و هونەری ناپۆرنۆگرافی، بەتایبەتی لە کاتێکدا کە بابەتی هونەرەکە بریتی بێ لە جەستەی مرۆیی. هەندێک ئەم مشتومڕە بەو شێوەیە یەکلایی دەکەنەوە کە هونەری پۆرنۆگرافی، ئەو هونەرەیە کە خراپترین زەوق و ئارەزووی هونەری تیادایە و لە جیهانی جوانناسیدا جێگەی نابێتەوە، تەنیا بایەخ هەیبێ لە بواری مۆراڵی و ئەنترۆپۆلۆژیدایە، بەڵام هەندێک کەسی دیکە ڕوانگەیەکی جیاوازیان بۆ ئەم جۆرە لە هونەر هەیە و وای دەبینن پۆرنۆگرافی هونەرێکە ڕەگەزی سێکسی بە شێوەیەکی جوانناسانە و ناسک لە دەربڕیندا بەکارهێناوە.

کارێکی قورسە، ئەگەر زۆربەی کات ئەستەمیش نەبێ، بتوانرێ سنوورێکی جیاکراوە لە نێوان هونەری ڕەسەن و هونەری پۆرنۆگرافیدا دابنرێ، مادام بابەتی هەردوو بواری هونەرەکە هەر

یەک بابەتە. ئەم ئەستەمییە لەو کاتەدا ئاشکرا دەبێ کە لە ڕابردوودا و تەنانەت لە سەردەمی ئێستاشدا چۆن و بە چ چاوێک تەماشای نموونە و مۆدێلە هونەرییەکان دەکرێ، ئاڕاستەی فیکری و سۆزداریمان ئەوە دیاری دەکات ئایا ئەو بەرهەمە کارێکی هونەرییە، یان پۆرنۆگرافییە، ئەم ئاڕاستە فیکری و سۆزدارییەش لە شارستانییەتێکەوە بۆ یەکێکی دیکە و لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکە و لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە، دەگۆڕێ. ئەم واقیعە وای کردووە کارێکی پێویست بێ ئەو ڕێسایانە دیاری بکرێن کە سنوورر لە نێوان هەردوو بواری هونەرەکەدا دادەنێن، بۆ نموونە جیاکردنەوەی ئامانجی هونەرمەند، ئایا ئامانجەکەی جوانناسییە، یان سێکسییە؟ چونکە ئامانجی یەکەم وا دەکات بەرهەمەکەی ببێت بە کارێکی هونەری، لە کاتێکدا ئامانجی دووەم وا دەکات بەرهەمەکەی ببێت بە کارێکی پۆرنۆگرافی، بەڵام لەڕاستیدا هونەرمەند ناتوانێ پرسیار دەربارەی ئامانجەکەی بکات، هەروەها هونەرمەند دەشێ هەموو شێوە و بابەتەکانی قۆرغ بکات و وەک بەهانە بەکاریان بێنێت لەپێناوی کامۆفلاجکردنی(*) مەرام و مەبەستە ڕاستەقینەکانی کە لەودیو هونەرەکەیەوەن، لەوانەیە لە ئامانج و نیاز و مەبەستی هونەرمەند، گرنگتر، ئەو کاریگەرییە بێ کە لەسەر بینەر، یان ئەو کەسانە بەجێی دێڵێت کە کارە هونەرییەکەیان دەخاتە بەردەم و بۆیان نمایش دەکات و ئەوانیش حوکمی لەسەر دەدەن، بەڵام ناشکرێ، ئەم کاریگەرییەی کە لەسەر بینەر بەجێی دێڵێت بکرێ بەتەنیا بناغە بۆ جیاکردنەوەی نێوان هونەر و پۆرنۆگرافی، چونکە بینەر یان تەماشاکار و هەموو ئەو کەسانەی کە کارە هونەری و پۆرنۆگرافییەکانیان بۆ نمایش دەکرێ، بەپێی بەرئەنجام و باکگراوندی دەروونیی خۆیان تووشی هەڵچوون دەبن لە کاتی تەماشاکردنی ئەو کارانەدا، ئەم بەرئەنجامەش زۆر شت دەگرێتەوە، وەک توانا تایبەتییەکانیان،

هەروەها فاکتەرە شارستانی و کۆمەڵایەتییەکانی کە ئەو کەسە تیایدا دەژی. لەوانەیە گرنگترین فاکتەر کە ئەم دوو هونەرە لە یەکدی جیابکاتەوە، بریتی بێ لە ئاستی هەبوونی زەوق و جوانناسی لە هەریەکەیاندا. ئیدی ئەوە گرنگ نییە لە جیاکردنەوەی نێوان ئەم دوو هونەرەدا پشت بەوە ببەسترێ ئایا ڕەگەزی سێکس لە کامیاندا هەیە و لە کامیاندا نییە، چونکە هەقیقەتە سێکسییەکان هیچ کاتێک بۆ مرۆڤ یان بە لای مرۆڤەوە تەنیا هەقیقەتی غەریزی، یان فسیۆلۆژی نەبوون، بەڵکو هەمیشە هەڵگری کۆمەڵێک مانا و چەمکی شارستانی و سرووتی و ئایینی و جوانناسی و ویژدانی بوون، ئەگەر جیاوازییەک لە نێوان هونەری ڕەسەن بەم مانایەنەوە و هونەری پۆرنۆگرافی هەبێ، ئەوا لەوەدا کۆدەبێتەوە کە هونەری پۆرنۆگرافی هەڵگری ئەم مانا و چەمکانە نییە و ئەمانە بۆ بینەر و تەماشاکار ناگوێزێتەوە، چونکە سروشتی هونەری پۆرنۆگرافی بەو شێوەیەیە کە ڕەق و زبر و توندە و هیچ مەسەلەیەکی فەلسەفی، یان جوانناسی ناورووژێنێ، هەروەها هیچ ئامانجێکی هونەری، یان زانستیی نییە و بانگەشەی ئەم ئامانجانەش ناکات، بەکورتی پۆرنۆگرافی دیاردەیەکە کە جوانناسی نییە و ئامانجی نواندنی ڕەفتاری سێکسییە و ڕەواج بۆ پەیداکردنیەتی لە ناو کتێب و فیلمەکاندا، تەنیا لەپێناوی وروووژاندنی سێکسیدا.

ئەوەی لە بابەتی هونەری پۆرنۆگرافیدا دەبێتە مایەی مشتومڕ ئەوەیە، هەندێک کاری هونەری هەن کە ئامانجەکەیان پۆرنۆگرافییە، بەڵام لە پشت پاکانەکردنی جوانناسی، یان زانستییەوە خۆی شاردووەتەوە. بەم جۆرە هونەرە پۆرنۆگرافییە دەوترێ پورنوکیچ Pornokitch، کە بریتییە لە شێوازێکی هونەری بۆ لەشفرۆشی و لەم سەردەمەی ئێستاماندا بە شێوەیەکی بەرفراوان بڵاوبووەتەوە و باڵی بەسەر چەندەها بواری

پۆرنۆگرافی و وێنە و سینەما و شانۆ و میوزیک و ڤیدیۆ و ڕیکلامدا کێشاوە. ڕەخنەگران پۆرنۆکیچ بە هونەرێکی نزمتر و لەخوارتر لە هونەری پۆرنۆگرافی ڕاشکاوانە و ڕاستەوخۆ دادەنێن، چونکە هونەری پۆرنۆگرافی بانگەشەی هونەر ناکات و لە پشت تەکنیکی هونەرییەوە خۆی حەشار نادات، وەک هونەری پۆرنۆکیچ دەیکات کە ڕەگەزە سێکسییەکان و ڕەگەزەکانی پاکانەکردنی جوانناسی پێکەوە تێکەڵاو دەکات. بەم تێکەڵاوکردنە پۆرنۆکیچ شتەکان لە شوێنی خۆیان دەردەهێنێ، بۆ نموونە ژن دەکاتە تەنیا بابەتێک و سێکسیش لەگەڵیدا تەواوی مانا مرۆڤایەتییەکان لەدەست دەدات.

هونەرمەندان لە ڕابردوودا، بەرهەم و کاری هونەرییان بەهۆی ئەو پاکانەیەوە خوڵقاندووە کە ئەم کارە لەپێناوی خستنەڕووی بابەتە ئەفسانەیی یان ئایینییەکان دەکەن، ئەگەر ئامانجی سێکسییش لەم کارانەدا بەدی بکرێ، ئەوا ئامانجێکی لاوەکییە، بەڵام هونەرمەندی پۆرنۆکیچی هاوچەرخ بانگەشەی ئەوە دەکات کە ئامانجەکەی ڕۆشنبیری و زانستییە و لەپێناوی ساخڵەمیی مۆراڵی و دەروونیدایە، هەروەها پێی وایە شێوازە هونەرییەکەی ڕێگەی نەشوەی سێکسی و هارمۆنییەتی سێکسی لە نێوان دوو هاوبەشەکەدا، ئاشکرا دەکات و ڕوونی دەکاتەوە، ددان بەوەدا نانێت کە هونەرەکەی جۆرێکە لە مەراییکردن، بەڵکو پێی وایە شێوازێکی فێرکاری، یان ڕۆشنبیرییە، یان هونەرێکە لەپێناوی تێڕامانی جوانناسیدایە. ئەو شێوازانەی هونەری پۆرنۆکیچ پەیڕەویان دەکات، زۆرن، بۆ نموونە شێوازی پێشکەوتووخوازانە و پێشەنگییانە لە وەسفکردنی ئەم هونەرەدا پەیڕەو دەکات و بانگەشەی ئەوە دەکات هەموو ئەمانە لەپێناوی هونەردایە. ئەو

شێوازانەی کە بۆ گوزارشکردن و لێکچوواندن بەکاریان دەهێنێ، هیچ پەیوەستییەکی لۆژیکی، یان جوانناسی پێکەوە نایانبەستێتەوە، تەنیا ئامانج لێیان ئەوەیە بینەر، یان خوێنەر تووشی شۆک و پەشۆکان بکات، بۆ ئەوەی سەری سووڕبمێنێ و هانی بدات ئەو وێنایەی لە لا دروست ببێ کە ڕووبەڕووی پەخشانێکی هونەری دەبێتەوە. یەکێک لەو شێوازانەی کە هونەرمەندی پۆرنۆکیچ بەکاریان دەهێنێ، هێنانە ناوەوە و بەکارهێنانی هەندێک سیمبولی سێکسیی ئاشکرا، یان تونێکڵدارە لەژێر لێشاوێکی نائاشکرای پەخشانی گفتوگۆییدا، یان ناسنامەی ئەفسانەییدا و بەو کەسانەی دەبەخشێ کە بوون بە بابەتی ئەم هونەرە، بۆ نموونە بەخشینی ناوی خوا، یان ڤینۆس، یان حۆریە، ئەمانە و چەندەها گوزارشی دیکە کە زیاتر بۆ قەناعەتپێکردنی ئەقڵییەتێکی دووڕوو دانراوە، نەک قەناعەتپێکردنی ئەقڵییەتێکی پاک و بێتاوان و ڕاست و ڕێک، چونکە کەسی دووڕوو لە ناوەزیدا هەڵگری پێوەرە دوانییەکانە بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان، ئەم کەسە دووڕووە پێویستی بە ڕازیکردن و تێرکردنی پێویستییە سێکسییەکانییەتی، بەڵام سڵ دەکاتەوە، بەڵام کاتێک پاکانەیەکی هونەری فەراهەم دەبێ و حەزە شەهوانییەکانی بۆ کامۆفلاج دەکات بە ئاشکرا، ئیدی ئەم جۆرە چێژە قبوڵ دەکات لەسەر ئەو بناغەیەی کە ئەمە هونەرە، یان زانستە، یان ڕۆشنبیرییە. لەم واقیعەدا مەترسیی پۆرنۆکیچ خۆی حەشارداوە، مەترسییەکە تەنیا بۆ سەر کەسی بینەر، یان ئەو کەسە نییە کە بەرهەمەکەی بۆ نمایش دەکرێ، بەڵکو مەترسییەکە بۆ سەر هونەرە بەگشتی، هەروەک یەکێک لە نووسەرەکان وەسفی کردووە: "پۆرنۆگراف ڕەگەزێکی چەوت و خراپی تیادایە،

نەک لەو ڕووەوە کە گوناهێکی مۆراڵییە، بەڵکو لەو ڕووەوە کە گوناهێکی هونەرییە"، لەبەر ئەوە دیاردەیەکە زەبوونبوونی زەوق دەنوێنێ لەسەر هەردوو ئاستی جوانناسی و ئەنترۆپۆلۆژی. لەبەر ئەوە مەترسی حەشارردراو لە هونەری پۆرنۆکیچدا لەوەدایە کە هونەرێکی پەردەپۆشکراو و کامۆفلاجکراو و دووڕووە، ئەمەش مەترسییەکی گەورەتر بۆ سەر هونەر و هەقیقەتی سێکس لە هونەری پۆرنۆگرافی دەنوێنێت، کە هونەرێکی ئاشکرا و ئابڕووبەرە لە شێواز و ئامانجەکانیدا و هەوڵ نادات هەقیقەتی خۆی بشارێتەوە و پەنا بۆ پاکانەکردن نابات.

**کاریگەریی هونەری پۆرنۆگرافی**

هەندێک بەڵگە بۆ ئەو گریمانەیە دەهێننەوە کە پێی وایە هونەری پۆرنۆگرافی دەرئەنجامی ڕیسوابوون و زەبوونبوونی مۆراڵییە لە کۆمەڵگە هاوچەرخەکاندا، یان جۆرێکە لە زەبوونبوونی جوانناسی کە ئەمیش دەرئەنجامی دۆخێکە، کاری ناپەسەند و ناشیرین و چێژە جیاوازەکان، شوێنی هاوتا ڕەسەنەکانیان گرتووەتەوە. بەهۆی ئەم دۆخی گۆڕینەوەیەوە، سێکس دەبێت بە شتێک و تەواوی مانا مرۆڤایەتییەکانی لەدەست دەدات، لەم پرۆسەیەدا هونەری پۆرنۆگراف ڕۆڵی کاریگەریی بەردەوامی دەبێ لە ڕەتکردنەوە و داماڵین لە مانا، یان بە شێوەیەکی دروستتر، پۆرنۆگرافی دەبێتە ئەو فاکتەرەی شتەکان لە چوارچێوەی ڕەسەنی خۆیان دەردەهێنێ و دەیانخاتە ناو چوارچێوەیەکی سەرابناسای ساختەوە. ئەوەی مرۆڤ لەم هونەرەدا دەیبینێ: "بریتییە لە کۆمەڵێک ئاماژەی هاتنەخوارەوەی سێکسی کە ئاماژە بەحەیاوحورمەتێکی ساختە دەدات کە بە دزییەوە ئاماژەیەک دەبەخشێ، بەڵام بێ ئەوەی ئاماژەکە دیاربێ،

شتەکان دەشارێتەوە، بەڵام نیمچە ئاشکرا و ڕوونیشن٠. لەوانەیە لەم توێژینەوەیەدا، هەڵسەنگاندنی هونەری پۆرنۆگرافیمان لە ڕووی ناوەڕۆکی هونەری، یان مرۆییەوە بە لاوە گرنگ نەبێ، ئەوەی لە ئێستادا بە لامانەوە شوێنی بایەخە، کاریگەریی هونەری پۆرنۆگرافییە بۆ سەر ژیانی سێکسیی تاک کە بە شێوەیەک لە شێوەکان و بۆ ماوەیەکی کورتخایەن، یان درێژخایەن، ڕووبەڕووی کاریگەریی هونەر و ئەدەبی پۆرنۆگرافی دەبێتەوە.

توێژەران وا گریمانەیان کردووە کە هونەری پۆرنۆگرافی کاریگەریی بۆ سەر دەروون و ڕەفتاری سێکسیی ئەو تاکە هەیە کە ڕووبەڕووی دەبێتەوە. ئەم گریمانانە لە ڕووی بۆچوونیانەوە جیاوازن، هەندێک پێی وایە هونەری پۆرنۆگرافی ڕەفتاری سێکسی زیاد و بەهێز دەکات، هەندێک بڕوایان بە پێچەوانەی ئەم بۆچوونە هەیە و پێیان وایە کارایی و چالاکیی ڕەفتاری سێکسی دێنێتە خوارەوە، بەڵام هەندێک گریمانەی دیکە ئەوە ڕەت دەکەنەوە کە هونەری پۆرنۆگرافی هیچ کاریگەرییەکی پۆزەتیڤ، یان نێگەتیڤی بۆ سەر ژیانی سێکسیی تاک هەبێ. ئەم گریمانانە، لە وڵاتان و سەنتەرە جیاوازەکانی لێکۆڵینەوە، خرانە ژێر باس و توێژینەوە، زۆربەی توێژینەوەکان لەسەر کەسانی خۆبەخش ئەنجام دران، بۆ ماوەی کورتخایەن، مامناوەند و درێژخایەن، ڕووبەڕووی کاریگەریی هونەری پۆرنۆگرافی کرانەوە. بەرئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوانە لە یەکدییەوە نزیک بوون، لێرەدا پوختەکانیان دەخەینە ڕوو، هەروەها پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە کاریگەریی هونەری پۆرنۆگرافی بۆ سەر تاکی سروشتی و تاکی ناسروشتی جیاوازە، بەتایبەتی کاریگەریی بۆ سەر ئەو تاکانەی تووشی لادانی سێکسی بوون و لادانەکەشیان پەیوەستە بە کاری توندوتیژی و تاوانەوە.

## کاریگەریی هونەری پۆرنۆگرافی
## بۆ سەر کەسانی سروشتی

١-لە لێکۆڵینەوەیەکی بەرفراواندا لەسەر ژمارەیەکی زۆری کەسانی خۆبەخش لە هەردوو توخمەکە، یەک جار ڕووبەڕووی سەیرکردنی فیلمێکی پۆرنۆگرافیان کردنەوە، دەرکەوت ئەوپەڕی کاریگەریی ئەم فیلمە بۆ سەر بینەران زیادبوونێکی زۆر کەم بوو لە ڕەفتاری سێکسییاندا، لەگەڵ چەند هەوڵێکی زۆر کەم بۆ پەیڕەوکردنی شێوازی تازە لە پەیوەندیی سێکسییاندا کە ناکرێ بە هونەر و جۆری تازە لەقەڵەم بدرێن، هەروەها ئەو کەسانە بەهۆی کاریگەریی چوونە ناو ئەم ئەزموونەوە، هیچ سەرپێچییەکی سێکسییان نەکرد.

٢-لە دوو ئەزموونی جیاجیادا لەسەر دوو گرووپ لە هاوسەران، گرووپی یەکەم، بۆ ماوەی چوار هەفتە، ڕووبەڕووی هونەری پۆرنۆگرافی کرانەوە، داوایان لێ کرا بارودۆخی ڕەفتاری سێکسییان تۆمار بکەن لە چوار هەفتە پێش سەیرکردنی فیلمە پۆرنۆگرافییەکان و چوار هەفتەی کاتی تەماشاکردن و چوار هەفتەش دوای سەیرکردنی ئەو فیلمانە. لەو یاداشتانەوە کە بەشداربووان خۆیان تۆماریان کردبوو دەرکەوت ڕەفتاری سێکسییان لە چوار هەفتەی پێش تەماشاکردنی ئەو فیلمانە زیاتر بووە، ڕێژەی زیادبوونەکەش زیاتر بوو لەو ڕێژەی زیادبوونەی کە لە ماوەی چوار هەفتەی تەماشاکردندا ڕووی داوە، هەروەها ئاماژەیان بەوەش دابوو، ئەو زیادبوونەی کە لە ماوەی چوار هەفتەی تەماشاکردندا هەستیان پێ کردبوو، بەزۆری سنووردار بوو، تەنیا لەو شەوانەدا بوو کە فیلمە پۆرنۆگرافییەکانیان پیشان داون. تەنیا ژمارەیەکی کەمیان ئاماژەیان بەوە دابوو کە شتێکی زیادەی نوێ لە شێوازی پەیوەندیی سێکسییاندا ڕووی داوە، هەروەها تێبینی هیچ گۆڕانێک لە شێوازی سروشتیی پەیوەندییە

سێکسییەکانیاندا نەکرا. هەرچی کۆمەڵی دووەمە، لە ماوەی چوار هەفتەکەدا، هیچ فیلمێکی پۆرنۆگرافیان پیشان نەدرا، بەڵکو فیلمی ئاسایی دوور لە پۆرنۆگرافیان پیشان دان، بەڵام بەڵێنیان پێ دان لەدوای تەواوبوونی ماوەی تاقیکردنەوەکە فیلمی پۆرنۆگرافیان بۆ نمایش بکەن. بەشداربووانی ئەم گرووپە ئاماژەیان بەوە دا کە ڕەفتاری سێکسییان لە ماوەی ئەو چوار هەفتەیەدا کە تەماشای فیلمیان کردووە هیچ دانەبەزیوە (وەک لە گرووپی یەکەمدا ڕووی دا)، بەڵام لەو ماوەیەدا کە فیلمی پۆرنۆگرافیان سەیرکردووە، ڕەفتاری سێکسییان دابەزیوە. توێژەران دەرئەنجامی ئەم توێژینەوەیەیان بەو شێوەیە پوخت کردەوە کە چاوەڕوانیی بینەر بۆ بینینی فیلمی پۆرنۆگرافی دەشێ ئارەزووی سێکسی بورووژێنێ و کار بکاتە سەر ڕەفتاری سێکسی بە شێوەیەکی زیاتر لەوەی کە تەماشای دەکات.

٣-لە تاقیکردنەوەی سێیەمدا بۆ هەڵسەنگاندنی کاریگەریی نمایشی چڕ و درێژخایەنی هونەری پۆرنۆگرافی بۆ ماوەی ٩٠ دەقیقە هەموو ڕۆژێک و پێنج ڕۆژ لە هەفتەیەکدا و بۆ ماوەی سێ هەفتە، لە ماوەی ئەم تاقیکردنەوەیەدا هیچ گۆڕانێک لە ڕەفتاری سێکسیی بەشداربووان لەو ماوەیەدا تێبینی نەکرا، ئاماژەیان بەوە دا لە سەرەتادا بە شێوەیەکی قووڵ بیریان لە مەسەلە سێکسییەکان کردووەتەوە، بەڵام هەر خێرا ئاستی ئەم بیرکردنەوە دابەزیوە بۆ ئاستێکی خوارتر لەو ئاستەی کە بەر لە تەماشاکردنی هونەری پۆرنۆگرافی بیریان لە سێکس کردووەتەوە. ئەم تاقیکردنەوەیە لە لایەن کۆمەڵێک تاقیکردنەوەی دیکەوە پشتڕاست کرایەوە کە هەموویان ئاماژەیان بە هاتنەخوارەوەی ئاستی بایەخپێدانی سێکسیی بەشداربووان کردووە بۆ خوار ئاستی سروشتی، ئەویش بەهۆی ڕووبەڕووبوونەوەی درێژخایەنیان لەگەڵ هونەری پۆرنۆگرافیدا.

پوختەی ئەم توێژینەوانە و توێژینەوەکانی دیکەش کە لەسەر هەمان بابەت ئەنجام دراون، ئەوە ئاشکرا دەکەن کە ڕووبەڕووبوونەوەی پۆرنۆگرافی دەشێ بڕێکی کەم لە وورووژانی سێکسی دروست بکات، بەڵام وورووژاندنەکە کورتخایەنە، ئەمە ڕوو دەدات ئەگەر کاتی ڕووبەڕووبوونەوەکە کەم بوو، بەڵام کاتێک مرۆڤ بۆ ماوەی درێژخایەن ڕووبەڕووی تەماشاکردنی پۆرنۆگرافی دەبێتەوە، دەشێ ببێتە هۆی کەمکردنەوەی بایەخپێدانی سێکسی و پشتتێکردنی. لە پێشاندانی هۆکاری کاریگەریی تەماشاکردنی پۆرنۆگرافی بۆ سەر ژیانی سێکسی، پێویستە بایەخی فاکتەری دەروونی لەیاد نەکەین، چونکە ئەو وورووژاندنە کورتخایەنەی لە ئارەزووی سێکسیدا ڕوو دەدات، بەهۆی پێشبینیکردنی کاریگەریی پۆرنۆگرافیاکەوەیە، نەک خودی پۆرنۆگرافی خۆی، ئەم کاریگەرییەش، کاریگەرییەکی دەروونییە، بەڵام ئارەزووی سێکسی بەهۆی تەماشاکردنی پۆرنۆگرافییەوە کەم دەبێتەوە، چونکە پۆرنۆگرافی دەبێتە هۆی لەناوبردنی وزەی خەیاڵ لەو کەسەدا بە وزەی پێشبینیکردنیشەوە، ئەم لەناوبردنەش وزەی پاڵپێوەنەر ڕووەو سێکس و ئەنجامدانی کرداری سێکس کەم دەکاتەوە، هەروەها دەبێ فاکتەرێکی کارای دیکەش بۆ پرۆسەی دابەزینی ئارەزووی سێکسی بەهۆی پۆرنۆگرافییەوە زیاد بکەین، ئەویش ئەوەیە ڕووتبوونەوەی سێکس لەم هونەرەدا دەبێتە هۆی ئاشکراکردنی لایەنە ساختە و کامۆفلاجکراوەکان لە سێکسدا، ئەم مەسەلەیەش لای بینەر بە چەمکی سێکسەوە دەنووسێ و نهێنیی ژیانی سێکسی زەوت دەکات و ئاماژە بە بێشەرم و شکۆی سێکس دەدات. لەبەر ئەوە وا چاوەڕوان دەکەین ئەو کاتەی، یان ئەو کۆمەڵگەیەی کە لەسەر ئەم هونەرە پۆرنۆگرافییە ئالوودە بووە، تەنیا ڕووبەڕووی شکست و پەککەوتنی لایەنە سێکسییەکان نابێتەوە، بەڵکو تووشی شکست و

پەککەوتنی دەروونی و جوانناسی و داهێنانیش دەبێت. لەوانەیە مایەی خۆشبەختیی مرۆڤ بێ کە بە سروشتی خۆی کاتێ ڕووبەڕووی تەماشاکردنی هونەری پۆرنۆگرافی دەبێتەوە و ئالوودەی دەبێ، هەر خۆی لە دەرئەنجامەکانی ئەم تەماشاکردن و ئالوودەبوونە دوور دەکەوێتەوە. هەندێ لە وڵاتان دەرکیان بەم هەقیقەتە کردووە، بۆیە کۆتوبەندەکانیان لەسەر تەماشاکردنی هەموو جۆرەکانی هونەری پۆرنۆگرافی لابردووە، هەروەک دانیمارک کە یەکێک بوو لەو وڵاتانە. ئەنجامی ئەم ڕێگەدانە بە پۆرنۆگرافی وەک چاوەڕوان دەکرێ، لە سەرەتادا زیادبوونی دەستاوەدەستکردنی ئەم فیلمانە بوو، پاشان بەدوایدا کەمبوونەوەیەکی ڕیشەیی لە بەرەوپیرچوونی پۆرنۆگرافی ڕووی دا، ئەمەش ئەو وتەیەی پێشینان دەسەلمێنێ کە دەڵێ: "هەموو شتێکی قەدەغەکراو خواستراوە"، پێچەوانەکەشی ڕاستە.

## پۆرنۆگرافی و سەرپێچییە سێکسییەکان

وەک لەو توێژینەوانەدا دەرکەوتن کە ئاماژەمان پێ دان، ڕووبەڕووبوونەوەی تەماشاکردنی پۆرنۆگرافی نابێتە هۆی ئەنجامدانی کاری سێکسیی دژ بە نەریت و یاسا. لێکۆڵینەوەی دیکەش ئەنجام دراون لەپێناوی خستنەڕووی کاریگەریی پۆرنۆگرافی لەسەر ئەو تاکانەی کە ناسروشتین و سەرپێچیی یاسایی، یان تاوانی سێکسییان ئەنجام داوە. یەکێک لەو لێکۆڵینەوانە کنزی ئەنجامی دا و ئەو ئەنجامانەی خستە ڕوو کە پۆرنۆگرافی فاکتەرێکی گرنگ نییە لە پاڵپێوەنانی تاک ڕووەو تاوانی سێکسی لەنێو زۆربەی زۆری ئەو تاوانبارانەی کە تاوانیان ئەنجام داوە، بەڵام ئەم ئەنجامانە ئەو کەسانەی نەگرتەوە کە تووشی لادانی سێکسیی هۆمۆسێکسوالیتی بوون، یان ئەوانەی کە

توندوتیژیی سێکسی دژ بە هەرزەکارانی نەبەکام دەکەن، (واتە تەمەنی خوار هەژدە ساڵ)، چونکە دەرکەوت ئەو کەسانە لە کەسانی دیکە زیاتر ئامادەباشییان تیادایە بۆ هەڵچوون و کەوتنە ژێر کاریگەریی ورووژێنەرەکان بە هەموو جۆرەکانییەوە و بە ورووژێنەری جۆری پۆرنۆگرافیشەوە. لە لێکۆڵینەوەیەکی دیکەدا دەرکەوت ئەو کەسانەی سەرپێچی و تاوانی سێکسییان ئەنجام داوە، لە ڕابردوودا، هەروەها لەو ماوە زەمەنییەشدا کە سەرپێچی و تاوانیان ئەنجام داوە، کەمتر ڕووبەڕووی کاریگەریی پۆرنۆگرافی بوونەتەوە. دەشێ ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوانە ئاماژە بێ بۆ ئەوەی کە ڕووبەڕووبوونەوەی تەماشاکردنی پۆرنۆگرافی ببێتە هۆی لەناوبردنی هەندێک خەیاڵی سێکسی کە لەپشت ئەو هێزە پاڵنەرەوەیە کە پێویستە بۆ ئەنجامدانی تاوانی سێکسی، ئەم ئەنجامە پشتی بەست بە ئەزموونی دانیمارک لە ئازادی دەستکەوتن و تەماشاکردنی پۆرنۆگرافی لە ساڵی ١٩٦٧دا. ئامارە بەراوردکارییەکان سەبارەت بە تاوان و سەرپێچییە سێکسییەکان لە ماوەی بەر ئازادیی پۆرنۆگرافی لە ساڵی ١٩٥٩دا و لەدوای پراکتیزەکردنی ئەو ئازادییە لە ساڵی ١٩٦٣دا دەرکەوت کە جیاوازییەکی تێبینیکراو لە نێوان ئەو دوو ماوەیەدا هەیە و ڕێژەی ئەنجامدانی سەرپێچییە سێکسییەکان بەم ڕێژانە دابەزین:

١. لاقەکردن ١٦%
٢. خۆنمایشکردن ٥٨%
٣. خۆمەلاسدان ٨٠%
٤. سێکسکردن لەگەڵ نەبەکام ٦٣%
٥. بەدگۆیی زارەکیی سێکسی ٧١%
٦. سەرپێچیی دیکە بەرامبەر بە ژنان ٥٦%
٧. سەرپێچیی دیکە بەرامبەر بە کچان ٦٩%

کۆی ئەم ئەنجامانە ئەوە دەسەلمێنن کە ئازادی و ڕێگەدان بە تەماشاکردن و دەستاوەدەستکردنی پۆرنۆگرافی نەبوونەتە هۆی زیادبوون لە ئەنجامدانی تاوانی سێکسی، بەڵکو بە پێچەوانەوە بوونەتە هۆی کەمبوونەوەی، ئەمەش بەرەو ئەو دەرئەنجامە پاڵمان پێوە دەنێ کە دەشێ پۆرنۆگرافی ئەڵتەرناتیڤێکی خواستراو بێ بۆ بنبڕکردنی ئەو ڕەفتارانەی کە دژ بە کۆمەڵگەن و هەندێک لە تاکەکان بەدەستییەوە دەناڵێنن.

### بەکارهێنانی پۆرنۆگرافی وەك چارەسەر

لە ئەنجامی ئەو توێژینەوانە کە تا ئێستا ئاماژەمان پێ داون، ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە دەشێ پۆرنۆگرافی هەندێک توانای چارەسەرکردنی تیادابێ کە دەکرێ لە چارەسەرکردنی هەندێک حاڵەتی نەخۆشیی سێکسیدا سوودی لێ ببینرێ. لە واقیعدا ئەم سوودوەرگرتنە لە زۆرێک لەو حاڵەتانەدا تاقیکراونەتەوە کە بەدەست پەککەوتنی سێکسی، یان لادانی سێکسییەوە، یان سەرپێچی و تاوانی سێکسییەوە ناڵاندوویانە.

هەندێک لە لێکۆڵینەوەکان ئاماژە بەوە دەدەن، هەندێک لەو کەسانەی کە بەدەست کێشەی سێکسیی ژیانی هاوسەرێتییەوە دەناڵێنن، کاتێک هونەری پۆرنۆگرافییان بۆ نمایش دەکرێ، لەوانەیە هەندێک دەرئەنجامی پۆزەتیڤ لە پەیوەندیی سێکسییاندا تێبینی بکرێ، چونکە تەماشاکردنی ئەم فیلمانە حاڵەتەکانی ڕێگری دەڕەوێنێتەوە ئەگەر هەبێ، هەروەها پەیوەندیکردنی نێوان ژن و پیاو سەبارەت بە چارەسەرکردنی ئەم کێشانە ئاسان دەکات. هەندێجار تەماشاکردنی ئەم فیلمانە و لە ماوەی دوور لە یەک،

یارمەتیی هاوسەران دەدات بۆ زاڵبوون بەسەر هەندێک پلەی کەمی پەککەوتنی سێکسی لە نێردا و بەتایبەتی لە کەسانی بەتەمەندا، هەروەها دەشێ ترسەکانی ژن بەرامبەر بە پەیوەندیی سێکسی کەم بکەنەوە و ئەو ڕێگرییانە بڕەوێننەوە کە بوونەتە ئاستەنگ لە بەردەم وەڵامدانەوەی سێکسیدا.

سەبارەت بە بەکارهێنانی پۆرنۆگرافی لە چارەسەرکردنی حاڵەتەکانی لادانی سێکسیدا، لێکۆڵینەوەکان ئاماژەیان بەوە داوە، دەشێ پۆرنۆگرافی بە شێوەیەکی گشتی، حاڵەتەکانی لادان لەنێو تاکەکانی کۆمەڵگەدا کەم بکاتەوە. بەڵام لە ڕووی بەکارهێنانی تاکەکەسییەوە، پۆرنۆگرافی بە مەبەستی مۆرکوەرگرتن و خۆڕاهێنان لە دژی لادانی هۆمۆسێکسوالیتی و حاڵەتەکانی فتشیزم و حاڵەتەکانی دیکەی لادان بەکارهێنراوە و ئەنجامی پۆزەتیڤیشی بەدەستەوە داوە. هەر وەک لە چەند شوێنێکی جیاجیای ئەم کتێبەدا ئاماژەمان پێ دا. هەرچی بەکارهێنانی پۆرنۆگرافییە لە چارەسەرکردنی حاڵەتەکانی تاوانی سێکسیدا، ئەوا بەڵگە هەیە لەسەر کاریگەرییەکەی، ژمارەیەک لە لێکۆڵینەوەکان ئاماژەیان بە سوودی پۆرنۆگرافی داوە لە چارەسەرکردنی ئەو حاڵەتانەی توندوتیژیی سێکسی کە پەیوەندییان بە لاقەکردنەوە هەیە.

دەکرێ بە شێوەیەکی گشتی بڵێین، ڕووبەڕووبوونەوەی پۆرنۆگرافی بە شێوەیەک لە شێوەکان و هەر لە تەمەنی منداڵییەوە و بە درێژایی قۆناغی گەشەکردن، دەشێ فاکتەرەکانی ڕێگری و چەپاندنی سێکسی کەم بکەنەوە، لێرەشەوە کەمبوونەوەی حاڵەتەکانی پەککەوتنی سێکسی و کێشە و

ئاراستەوەرگرتن ڕووەو لادانی سێکسی، بەڵام ڕووبەڕووبوونەوەی زۆریش لەگەڵ پۆرنۆگرافیدا، لەوانەیە دەرئەنجامی نێگەتیڤی هەبێ و ببێتە هۆی تێکچوونی ڕەفتاریی گشتی و مۆراڵی تاک و خەسڵەتی مرۆڤایەتی و ئەو نەریتانەی کە کۆمەڵگە لەسەریان دەڕوات، سەرباری سووکبوون و ڕیسوابوونی چەمکی ژیانی سێکسی لە لای تاک و کۆمەڵگە و خراپبوونی پێگەی هونەر لە ژیانی تاکدا کە پێگەیەکی جوانناسیی هەیە لە ژیاندا و هانی مانەوەی مرۆڤ دەدات.

**پەراوێز:**

*کامۆفلاج camouflage: لە بنەڕەتدا ئەم وشەیە واتە هەڵخەڵەتاندن و فریودان، کاتێک لایەنێک یان تیمێکی سەربازی ڕەنگی ئامراز و ئۆتۆمبێل و چەک و تەقەمەنیی خۆیان دەگۆڕن لەڕێی سواخدان بە قوڕ یان شاردنەوەیان بە گەڵای دار و درەخت، بەمە دەوترێت کامۆفلاج بۆ ئەوەی سەر لە دوژمن تێکبدەن و نەناسرێنەوە.

## سێکس و شارستانییەت

پەندێکی پێشینان هەیە دەڵێ: "برسێتی و خۆشەویستی حوکمی کاروبارەکانی جیهان دەکەن". لەوانەیە خۆشەویستی لێرەدا مەبەست لەو سۆزە نەبێ کە دوو کەس پێکەوە دەبەستێتەوە، بەڵکو مەبەست لە خۆشەویستیی حەز و مەیلە سێکسییەکان بێ. لەوانەیە ئەم وتەیە لە ڕاستی و دروستییەکەیدا هیچ مشتومڕ و ناکۆکییەک هەڵنەگرێ، لە هەموو بارەکاندا، لەگەڵ ڕاوبۆچوونی زانایانی سەردەمی هاوچەرخدا دەگونجێ، کە پێیان وایە گرنگترین غەریزە لە مرۆڤدا غەریزەی زۆربوونە، (واتە غەریزەی سێکس) لەگەڵ غەریزەی مانەوە (واتە غەریزەی برسێتی و خۆراک). خاوەنی ئەو وتەیە کە باس لە دەسەڵاتی خۆشەویستی، یان سێکس دەکات بەسەر جیهاندا، لەوانەیە تەنیا لە سنوورە بەرتەسک و ڕاستەوخۆکانی حەز و ئارەزووی سێکسی و هەوڵدان بۆ تێرکردنی بە شێوازی ڕاستەوخۆ، لە سێکسی ڕوانی بێ، هەروەها لەوانەیە لە سنوورێکی بەرتەسکیشەوە لە کاروبارەکانی جیهانی ڕوانی بێت، واتە تەنیا لایەنە کردارییەکانی لە چالاکیی مرۆڤ بینی بێت و تێنەپەڕی بێ بۆ لایەنەکانی دیکە، وەک لایەنە فیکری و مەعنەوی و کۆمەڵایەتی و جوانناسییەکان و ئەو لایەنانەی دیکە کە سێکس، بە شێوەیە کارا و کاریگەر، ئەگەرچی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و بە ڕواڵەت دیار نییە، خۆی دەکات بەناویاندا.

ئاشکرایە مرۆڤ دەتوانێ بەبێ پراکتیزەکردنی ژیانی سێکسیش لە ژیان و مانەوە بەردەوام بێ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ژیانی سێکسی وەک پاڵنەرە سەرەکییەکانی دیکە، وەک برسێتی و

تینویتی، ئەوەندە بۆ مانەوەی مرۆڤ لە ژیاندا بە زیندوویی، گرنگ نین، بەڵام ئەم جیاوازییە بۆ ماوەی کورتخایەنە و تەنیا لەسەر ئاستی تاکەکەسییە، چونکە وەک چۆن تێرکردنی پاڵنەرەکانی برسێتی و تینویتی زامنی ئامانجەکانی مانەوەی مرۆڤ وەک تاک دەکەن، بە هەمان شێوەیەش، سێکس زامنی ئامانجەکانی مانەوەی توخمی مرۆیی دەکات وەک گشت، یان هەموو مرۆڤایەتی، ئەم ئامانجانەش لە مانەوەی تاک تێدەپەڕن، چونکە توخمی مرۆیی ناتوانێ بەبێ سێکس و هەوڵدان بۆ تێرکردنی و هەوڵەکانی دیکە بۆ زۆربوون و بەردەوامیدان بە مانەوەی مرۆڤ، بمێنێتەوە.

لەوانەیە ئەم لێکدانەوەیە دەربارەی بایەخی سێکس لە ژیانی مرۆڤایەتیدا، یەکێک بێت لەو بەڵگەنەویستانەی کە پێویستی بە هیچ جەختکردنەوە، یان سەلماندنێک نەبێت، بەڵام سێکس لایەنی دیکەی گوزارش و کاریگەریی هەیە بۆ سەر ژیانمان، زیاتر لەوانەی کە لە ڕواڵەتی ئەم بەڵگەنەویستەوە دەردەکەون، ئەم لایەنانەش پێوستیان بە توێژینەوە و ڕوونکردنەوە هەیە. ئەم لایەنانە بوونەتە هۆی سەرنجڕاکێشانی بایەخی توێژەران لە فەیلەسووف و زانایانی سایکۆلۆژی و سۆسیۆلۆژی، بەتایبەتی لەم دوو سەدەیەی دوایی مێژووی هاوچەرخدا. دەرئەنجامی ئەم توێژینەوانە، تیشکی خستە سەر زۆرێک لە لایەنەکانی ژیانی سێکسیمان و ئاستی پەیوەندیی نێوان ژیانی سێکسی و بوارە زۆر و جیاجیاکانی دیکەی ژیانمان. لە بەدواداچوونی ئەم توێژینەوانە و ئەو زانیارییانەی کە ئاماژەیان پێ داوە، ئەوە ئاشکرا دەبێت و بە جوانی ڕوون دەبێتەوە کە ئەو پەندەی دەڵێ خۆشەویستی (سێکس) و برسێتی حوکمی کاروبارەکانی جیهان دەکەن، وتەیەکە لەگەڵ واقیعدا یەک دەگرێتەوە، تەنانەت لە بەرفراوانترین سنوورەکانیدا، ئەمانە و لەوانەیە سەلماندنی ئەو واقیعە، کارێکی ئەستەم نەبێ، کە پاڵنەری سێکسی و هەوڵدان بۆ گوزارشکردن

لێی لەڕێی یەکێک لە هۆیەکانی گوزارشکردنەوە، پاڵنەرێکە بڕیار لەسەر واقیعی مرۆیی دەدات، لەوانەیە هیچ لایەنێک نەبێ لە لایەنەکانی ژیان لەژێر حوکمی پاڵنەری سێکسی قوتاری ببێ، تەنانەت ئەگەر ئەو لایەنە، لایەنێکی بەرتەسکیش بێ لە واقیعی مرۆییدا، لە سەروو ئەم کاریگەرییەشیەوە بۆ سەر واقیع، پاڵنەری سێکسی کاریگەریی دیار و ئاشکرای هەیە بۆ سەر پەرەسەندنی مرۆڤ و شارستانییەتییەکەی.

***

ئەوەی لە بیروبۆچوونی زۆربەی خەڵکدا زاڵە، توێژینەوە دەربارەی ژیانی سێکسیی مرۆڤ دەرئەنجامی تیۆرەکانی زانای سایکۆلۆژی فرۆید و کتێبەکانی ئەوەوە، پەیدابووە، یان دەستی پێ کردووە، هەرچەندە ئەو ڕاستییە مشتومڕ هەڵناگرێ، کە فرۆید لە هەموو توێژەران زیاتر بایەخی بە لایەنەکانی سێکس و پەیوەندیی بە ژیانی دەروونییەوە داوە، هەروەها گرنگیی بە پەیوەستیی نێوان ژیانی سێکسی و ژیانی دەروونی داوە لە حاڵەتەکانی ساغلەمی و نەخۆشیدا، بەڵام فرۆید یەکەم کەس نەبوو کە بایەخی بە لایەنە سێکسییەکان داوە و هەروەها بە پێگەی سێکس لە ژیانی مرۆڤایەتیدا، زۆرێک لە فەیلەسووف و زاناکان، لە زۆربەی ڕایەکاندا، پێش فرۆید کەوتوون، بەڵام فرۆید توانیی کۆنترۆڵی ئەو ڕایانە بکات و سەرلەنوێ تیوریزەیان بکاتەوە و لە وێنەیەکی نوێدا دایانبڕێژێتەوە، بە شێوەیەک ئەو سەرنجە ببەخشێ ئەوانە ڕاوبۆچوونی خۆین، بێگومان وەرگرتنی بیروبۆچوونی زانایانی پێش خۆی هێندە لە ڕەسەنێتیی تیۆر و نووسینەکانی کەم ناکەنەوە کە هەموویانی تەرخان کردووە بۆ توێژینەوە دەربارەی پێگەی وزەی سێکسی لە ژیانی مرۆڤدا لە سنووره تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی و شارستانییەتییەکاندا، هەروەها کەمترین گومان دەربارەی ئەو ڕاستییە نییە کە فرۆید خاوەنی کۆمەڵێک

توێژینەوەی زۆرە دەربارەی ئەم بابەتە، چوار کتێبی بە تەواوی و بەشی گەورەی کتێبی پێنجەمی بۆ توێژینەوە دەربارەی پەیوەندیی نێوان سێکس و مەدەنییەت، تەرخان کردووە.

لەوانەیە شۆپنهاوەری فەیلەسووف یەکەمین کەس بووبێ کە سەرنجی لە بایەخی سێکس لە ژیانی مرۆڤایەتیدا دابێ، هەندێک بڕوایان وایە ڕایەکانی شۆپنهاوەر دەربارەی ئەم بابەتە، یەکێک بوون لە سەرچاوەکانی کارتێکردن کە کاریان کردووەتە سەر فرۆید و بایەخپێدانەکانی دەربارەی مەسەلە سێکسییەکان. شۆپنهاوەر جەختی لەسەر نائاگایی و لایەن نائەقڵانییەکانی ئیرادە کردووە. پێی وا بووە دوو غەریزە لەپشت پرۆسەکانی ئیرادەوەن. یەکەمیان، غەریزەی پارێزگاریکردن لە مانەوە. دووەمیان، غەریزەی سێکس. شۆپنهاوەر غەریزەی سێکسی بە گرنگترین غەریزە لەم دوو غەریزەیە داناوە. لە وتەکانی کە ئاماژە بە گرنگیی ئەم غەریزەیە دەدەن، وەک: "مرۆڤ بریتییە لە بەرجەستەکردنی غەریزەی سێکسی". شۆپنهاوەر دژایەتییەکی لە نێوان سێکس و فیکردا بەدی کردووە، پێی وا بووە شێتی دەرئەنجامی چەپاندنی سێکسییە، ئەم ڕایەشی لە جەوهەردا هێندە جیاوازیی نییە لەگەڵ تیۆرەکەی فرۆیددا کە پێی وایە چەپاندنی سێکسی لە یەکێک لە قۆناغەکانی گەشەی سێکسیی دەروونی، بناغەی پشێوییە دەروونییەکانە. یەکێکی دیکە لەو فەیلەسووفانەی باسیان لە بابەتی سێکس و کاریگەریی بۆ سەر ژیان کردووە، نیتشەی فەیلەسووفە، کە پێی وا بووە مەدەنیەت لەسەر بناغەی دەستبەرداربوون لە غەریزە بنیاد نراوە، ئەم ڕایەشی هاوجێیە لەگەڵ ئەو ڕایەی فرۆیددا کە دەڵێ: مەدەنیەت تەنیا گوزارشکردنە لە هەڵکشانی وزەی سێکسیی پەنگخواردوو بە شێوازێکی ناسێکسییانە، هەروەها پێشکەوتنی مەدەنیەت بە پلەی یەکەم لەسەر حیسابی گوزارشکردنی ڕاستەوخۆ لە سێکس، بنیاد نراوە.

لەوانەیە گەورەترین کاریگەری لە ئاراستەوەرگرتنی بیرکردنەوەی زانستی و مرۆیی ڕووەو مەسەلە سێکسییەکان لە سەدەی نۆزدەدا، بەهۆی ڕایەکانی داروینی زاناوە بووبێ، کە بیرکردنەوەی ئەو کاریگەریی دیاری هەبوو بۆ سەر ئاراستەوەرگرتنی فرۆید ڕووەو ئەم بابەتە. یەکێک لە ڕا بوێر و ڕاشکاوەکانی داروین دەربارەی ئەم بابەتە، وتەکەیەتی کە دەڵێ: "ئەقڵی مرۆڤ لە غەریزەی ئاژەڵ کاملتر نییە، ....هەروەها پەیدابوونمان بۆ ڕەگوڕیشەی باپیرە شەیتانییەکەمان دەگەڕێتەوە، چونکە شەیتان لە شێوەی مەیموونندا باپیرەی ئێمەیە". لە بەراوردکردنی نێوان بایەخی دوو غەریزەکە، غەریزەی مانەوە، یان غەریزەی زۆربوون (سێکس)، داروین زاڵبوونی بە غەریزەی زۆربوون بەخشی و جەختی لەسەر گرنگییەکەی کردەوە لە پرۆسەی پەرەسەندنی مرۆییدا، دەربارەی ئەمە دەڵێ: "سەنگی مەحەکی سەرکەوتنی ئیڤۆلیوشنی بایۆلۆژی لە زۆربووندایە، نەک لە مانەوەی باشترین، چونکە ئەگەر ئەو باشترینە زاوزێی نەکرد، ئیدی ئیڤۆلیوشنی مرۆڤ هیچ بایەخێکی نابێ". داروین سەرنجی ڕاکێشاوە بۆ قووڵایی پەیوەندی لە نێوان سەرنجڕاکێشانی سێکسی و سۆزداریی خۆشەویستی و غیرە و سۆزە سێکسییەکانی دیکە لەگەڵ ئیڤۆلیوشن و کاریگەریی کۆئەندامی دەمار، لە دەرئەنجامەکانی ئەم ئیڤۆلیوشنانەوەیە مرۆڤ توانیویەتی کۆمەڵێک سیفەت و خەسڵەت بۆ خۆی بەدەست بخات، هەروەها دەڵێت: "ئەو کەسەی بڕوا بە پرەنسیپی هەڵبژاردنی سێکسی دەهێنێت، دواجار بەو دەرئەنجامە سەرنجڕاکێشە دەگات کە کۆئەندامی دەمار تەنیا زۆربەی فەرمانەکانی جەستە ڕێک ناخات، بەڵکو بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆش کاری کردووەتە سەر ئیڤۆلیوشنی کاوەخۆیی ئەندامەکانی جەستە و هەندێک لە خەسڵەتە ئەقڵییەکان، چونکە بوێری و نەیاری و کۆڵنەدان و هێزی جەستە

و تەواوی چەکەکان و ئامێرە میوزیکییەکان بە دەنگ و ئامرازەوە، هەروەها ڕەنگە شەوقدارەکان و ئامرازەکانی جوانکاری، هەموو ئەمانە لە لایەن مرۆڤەوە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و لەڕێی پراکتیزەکردنی هەڵبژاردنەوە، هەروەها بە کاریگەریی خۆشەویستی و غیرە و بەجوانترداناني ڕەنگ و دەنگ و شێوە، بەرفراوان بوون. ئەم هێزانەی ئەقڵ بە ئاشکرا پشت دەبەستن بە پەرەسەندنی دەماخ". لەم وتەیەوە ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە داروین پێی وا بووە بناغەی هەڵبژاردن لە سێکسدا و لە ئازادیی هەڵبژاردنی هاوبەشی سێکسی (هەڵبژاردنی سروشتی)دا، تەنیا ئیڤۆلیوشنی جەستە و ئەقڵ نییە، بەڵکو هێزی پاڵپێوەنەری پشت ڕەفتاری مرۆییە لە هەموو لایەن و بوارە جیاوازەکاندا، بەو لایەنانەشەوە کە دەبنە هۆی نەیاری و جەنگ و بەگژداچوون، یان ئەو لایەنانەی ڕووەو ئەنجامدان و پەرەپێدانی هونەرەکانی جوانناسی ئاڕاستە دەگرن بە هەموو جۆرە جیاوازەکانەوە.

ڕایەکانی داروین کاریگەرییەکی گەورەیان هەبوو بۆ سەر دروستبوونی ڕای هاوشێوە لای ژمارەیەکی زۆری ئەو کەسانەی کە بایەخیان بە لایەنە سێکسییەکان و پێگەیان لە ژیانی مرۆڤدا دەدا. لەو زانایانەی وەک زانا کرافت ئبنج، کە پێی وا بوو پەیوەندییەکی گەورە لە نێوان سێکس و ئەدگارەکانی شارستانییەتی مرۆڤایەتیدا هەیە، هەروەها کرافت وای دەبینی، داماڵین لە خود، مۆراڵ، خواناسی و تەنانەت سۆزی ئایینی، بناغەکەیان هەستی سێکسییە. لە یەکێک لە وتەکانیدا دەڵێ: "ئەگەر مرۆڤ لە ئاوازەییە سێکسییەکەی دابماڵرێ و لەو چێژە ڕەسەنەی کە لەم ئاوازەییەوە هەڵدەقوڵێ، ئەوا شیعر و لەوانەیە هەموو حەز و مەیلە مۆراڵییەکانیش لە ژیاندا ون بین"، هەروەها پێی وا بوو شارستانییەت و مەدەنیەت بەهۆی بیزارکاری و چەپاندنی وزەی سێکسی مرۆڤەوە پەیدابوون. دەربارەی ئەم بابەتە دەڵێ:

"ژیان زۆرانێکی کۆتایی نەهاتووە، لە نێوان غەریزەی ئاژەڵی و غەریزەی مۆراڵیدا" بەم شێوەیە کرافت ئیبنج، وەک هەموو فەیلەسووفە هاوچەرخەکانی، نموونەی نوفالیس و شۆپنهاوەر و نیتشە، بڕوای وا بوو، مەدەنیەت و مۆراڵ و باڵاترین و هونەرەکانی شیعر، لە هەستی سێکسیی مرۆییەوە سەریان هەڵداوە. زانای سایکۆلۆژی مودزلی بەو شێوەیە گوزارشی لە ڕای خۆی دەربارەی ئەم بابەتە کردووە کە دەڵێ، هەستی سێکسی بناغەی یەکەمی تەواوی ژیانی کۆمەڵایەتییە.

بەڵگەکان لە هەندێ سەرچاوەی دیکە ئاماژە بەوە دەدەن فرۆید لە بابەتی پەیوەندیی سێکس و پێشکەوتنی مەدەنیەت و شارستانییەت، کەوتووەتە ژێر کاریگەریی نووسینەکانی فلایس Fleissی هاوڕێی، کە وا دەردەکەون بەر لە زۆرێک لە ڕا و تیۆرەکانی فرۆید تۆماری کردبن. لە یەکێک لەو تیۆرانەدا، فلایس ڕای وایە، باڵاترین دەستکەوتەکانی مرۆڤ، بە دەستکەوتە دەروونییەکانیشەوە، لە فاکتەرە فسیۆلۆژییە نزمەکانییەوە، سەریان هەڵداوە. ئەو پێی وا بوو ئەم فاکتەرە فسیۆلۆژیانە بریتین لە ماددەی سێکسی، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ دەستکەوتە باڵاکانی مرۆڤ، تەنیا گۆڕانی فاکتەرە کیمیاییەکانی ماددە سێکسییەکانن، ئەم ڕایە لە ناوەڕۆکدا لەگەڵ ڕایەکەی فرۆید یەک دەگرێتەوە کە دەڵێ، وزەی سێکسی باڵا دەبێ، (یان هەڵدەکشێ) بۆ ئەوەی گوزارش لە دەستکەوتی شارستانی باڵاتر بکات. لەو بارەیەوە فلایس دەڵێ: "لە کاتی قۆناغی منداڵیدا، لەڕێی گەشەی فسیۆلۆژییەوە، وزەکان کۆدەبنەوە -واتە ماددە سێکسییەکان- بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێ لە تەمەنی باڵقبوونەوە تا دواتر بۆ ئامانجەکانی پارێزگاریکردن لە توخمی مرۆیی سەرفیان بکات، یان بەکاریان بهێنێ". ئەمانە و لەوانەیە کارێکی قورس نەبێ تێبینیی ئەوە بکەین، ئەم وتەیە دوان لە پرەنسیپە گرنگەکانی فرۆید لەخۆ

دەگرێ، یەکەمیان گریمانەکردنی بوونی ژیانی سێکسی لە منداڵدا، دووەمیشیان ئەو گریمانەیەیە کە ئەم وزەیە لە ژیانی منداڵدا پەنگ دەخواتەوە تا خزمەتی مەبەست و مەرامی دیکە بکات. سەبارەت بە مەسەلەی یەکەمیان، فرۆید دەڵێ: "ئێمە بە هەڵەدا دەچین، ئەگەر ژیانی سێکسی لای منداڵ فەرامۆش بکەین، بەپێی شارەزایی و ئەزموونی خۆم، منداڵان توانای هەموو چالاکییەکی سێکسی دەروونییان هەیە، لەگەڵ زۆرێک لە چالاکییە سێکسییە جەستەییەکانیش". پاشان فرۆید بەردەوام دەبێ و دەربارەی مەسەلەی دووەمیان، بەم شێوەیە ڕای خۆی دەربارەی بایەخی ئایندەیی وزەی سێکسی دەردەبڕێ، کە لە قۆناغی منداڵیدا ئەم وزەیە پەنگ دەخواتەوە، دەڵێ: "...لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە ڕاستودروستە، دروستبوون و ئیڤۆلیوشنی توخمی مرۆیی هەوڵی ئەوە دەدات کە لە هەر پلەیەکی بەرزی چالاکیی سێکسی لە قۆناغی منداڵیدا دووربکەوێتەوە، هەروەها وا دەردەکەوێ لە مرۆڤدا، هێزە غەریزەییە سێکسییەکان لە چارەیان نووسرابێ کە پارێزگارییان لێ بکرێ، بۆ ئەوەی لە قۆناغی باڵقبووندا بەرەلا، یان ئازاد بکرێن تا خزمەتی مەبەست و مەرامی شارستانیی مەزن و گەورە بکەن". بەم وتەیە فرۆید بەرئەنجامی ڕایەکانی دەربارەی پەیوەندیی نێوان سێکس و شارستانییەت پوخت دەکاتەوە، ئەمەش ئەو ڕایانەن لە ژمارەیەک لە کتێبەکانیدا جیای کردوونەتەوە کە بە شێوەیەکی سەرەکی مەبەستی ئەم بابەتە بووە، لەو کتێبانەش گرنگترینیان ئەمانەن: تەوتەم و تابۆ، مەدەنیەت و خراپییەکانی، ئایندەی سەراب، مەدەنیەت و سێکس و مۆراڵ و نەخۆشییە دەروونییە هاوچەرخەکان و چەندەها کتێبی دیکە.

فرۆید لە تیۆرەکەیدا، لێکدانەوەی بۆ پەیوەندیی نێوان پێویستیی سێکسی و سەرهەڵدانی کۆمەڵگە و پێشکەوتنی شارستانییەت، کرد، بەپێی ئەم تیۆرە فرۆید لە سەردەمێکدا وەک

ئاژەڵانی دیکە لەسەر چوار پێ ڕۆیشتووە، هەروەها وەک بوونەوەرانی دیکە پشتی بە هەستی بۆنکردن بەستووە بۆ وروژانی سێکسی و گەڕان بەدوای هۆیەکدا بۆ تێرکردن و ڕازیکردنی، هەروەک مەیموون لە سووڕی شەبەقیدا Oestrous دەیکات. لە سەردەمێکدا کە بارودۆخی مانەوە و پێویستییەکانی وای خواستووە، مرۆڤ لەسەر پێیەکانی وەستاوە و ڕێک بووەتەوە، بەهۆی ئەم گۆڕانەوە کاریگەریی هەستی بۆنکردن وەک ئامرازێک بۆ بەدەستهێنانی سێکس، کەم بووەتەوە، هەستی بینین شوێنی گرتووەتەوە، ئەمە وا پێویستی کردووە کە مرۆڤ هاوبەشی سێکسیی هەبێ، نەک تەنیا لە ماوەی سووڕی شەبەقیدا، بەڵکو لە هەموو کاتەکاندا، بە سروشتی حاڵ ئەمە پاڵی پێوە ناوە بۆ زامنکردنی ئەو هاوبەشە لەڕێی پارێزگاریکردن لێیەوە. فرۆید لەم پێویستییەوە و لە هەوڵی مرۆڤ بۆ زامنکردنی ئەم پێویستییە، سەرەتای دروستبوونی کۆمەڵگەی لەڕێی زۆربوونەوە و سەرهەڵدانی سۆزی خۆشەویستی (ئیرۆس)، دۆزییەوە، ئەم سۆزی خۆشەویستییە وەک هۆیەک بۆ پەیوەستکردنی تۆخمی مرۆڤ لەنێو گرووپی گەورەتردا و لەنێو خێزان و کۆمەڵگە و دەوڵەت و یەکێتییەک کە هەموو تۆخمی مرۆڤ کۆبکاتەوە، بەڵام گەیشتنی مرۆڤ بەم قۆناغە، لە ڕوانگەی فرۆیدەوە بەبێ قوربانیدان لە لایەن تاکەوە، یان بەبێ ڕوودانی گۆڕان لە ئازادیی ڕەهای تاک بۆ گوزارشتکردن لە پێداویستییە سێکسییەکانی، بەدەست نەهاتووە. بە ڕای فرۆید گۆڕان لە ژیانی سێکسیی مرۆڤدا بە دوو هەنگاو ڕووی دا، هەنگاوی یەکەم هاوکات بوو لەگەڵ گۆڕینی هەستی بۆنکردن بە هەستی بینین لە سەرنجڕاکێشانی سێکسیدا، هەنگاوی دووەمیش، بریتی بوو لە پێویستیی دیاریکردنی دەسەڵاتی باوک و داگیرکردن و دەسەڵاتگرتن بەسەر مێدا لەپێناوی چێژی سێکسیدا. هەنگاوی

یەکەم، بووە هۆی بنبڕکردنی پیسوپۆخڵی لەڕێی گۆڕینی بە پاکوخاوێنی، هەروەها بوو بەهۆی سەرهەڵدانی هەستی شەرم و عەیبە لە ڕووتبوونەوە و سەرهەڵدانی هەستی قێزهاتنەوە لە بە ئاشکرا بەکارهێنانی هەندێ کونی دەردراوە جەستەییە ناچیزەکان. دەرکەوتنی ئەم هەستی عەیبە و قێزهاتنەوەیە لە ڕوانگەی فرۆیدەوە، یەکەمین پرۆسەی هەڵکشانی غەریزەی سێکسی بوو، هەروەها بوو بە فاکتەری هاندەر بۆ هەموو هەستە مۆراڵییە باڵاکان، هەروەها ئەوەی تیادا دۆزییەوە کە هەموو قێزهاتنەوەیەک کلیلە بۆ پرۆسەی چەپاندن، بەم شێوەیە فرۆید بناغەیەکی ئەندامی بە پرۆسەی چەپاندن بەخشی کە لە بناغەدا پشت بە هەستی بۆنکردن دەبەستێ. فرۆید تەنیا کەس نەبوو کە سەرنجی بۆ بایەخی هەستی عەیبە و قێزهاتنەوە ڕاکێشا لە پێشکەوتنی شارستانییەتدا، چونکە تەورات و ئایینە ئاسمانییەکانی دیکەی دواتریش، ڕەگوڕیشەی ئەم هەستەیان بۆ ساتی سەرەتای بوونی مرۆڤ گێڕاوەتەوە، کاتێک کە ئادەم دەرکی بە ڕووتبوونی خۆی لە بەردەم خالقکدا کرد و بە دیاریکراوی ناوچەی سێکسیی هەریەک لە ئادەم و حەوا ئاشکرا دیار بوو. فلایس، واتە هاوڕێکەی فرۆید، بەر لە فرۆید دەرکی بە پەیوەندیی نێوان سێکس و عەیبە کرد، هەروەها دەرکی بە بایەخی ئەم پەیوەندییە کرد لە دروستبوونی کاردانەوەی تاکدا. فلایس لێکۆڵینەوەی لەسەر منداڵێکی تەمەن سێ ساڵ کرد کە هەستی بە شەرم دەکرد کاتێ کە یاریی بە چووکی دەکرد لە ڕۆژدا، لە شەویشدا بەدەست حاڵەتی دڵەڕاوکێ و گریانەوە دەینالاند، هەروەها وردەزیپکە لەسەر پێستی دەرکەوتبوون. تەواوی ئەم نیشانانە لە ڕوانینی فلایسەوە، بەڵگە بوون لەسەر ڕەگوڕیشەی سێکسیی منداڵەکە کە بۆ نیشانەی نەخۆشی گۆڕابوون. هەرچی هەنگاوی دووەمە لە ئازادیی گوزارشکردنی سێکسی، بەهۆی پێویستیی دیاریکردنی

دەسەڵاتی باوک و سەرهەڵدانی نەریتی (تەوتەم و تابۆ)وە پەیدابوو، هەروەها بەهۆی گەشەکردنی ئەو دامەزراوانەوە کە دەرئەنجامی سەرهەڵدانی ئەو نەریتانە بوون و پشتیوانی و پاریزگارییان لەم نەریتانە دەکرد. فرۆید لەم هەنگاوەوە، واتە هەنگاوی دووەم، سەرچاوەی سەرەکیی پرۆسەی چەپاندنی دۆزییەوە، چونکە حەرامکردنی کوشتنی باوک بەهۆی مەرام و مەبەستی سێکسییەوە، وا پێویست دەکات هەستی عەیبە و ترس و قێزەوەنی لە دەروونی ئەو کوڕەدا بچێنێ کە کێبڕکێ لەگەڵ باوکیدا دەکات لە بواری سێکسیدا، ئەمەش دەبێتە هۆی چەپاندنی ئارەزووی سێکسی لە کوڕدا. فرۆید لەم چەپاندنە سەرەتاییەی کە دەرئەنجامی (تەوتەم و تابۆ)یە، ڕەگوڕیشەیەکی ئەندامی بۆ چەپاندنی مرۆیی دۆزییەوە، هەروەها لەم چەپاندنەدا بایەخێکی شارستانیی مەزنی دۆزییەوە. فرۆید دەڵێ پاڵنەرە سێکسییەکانی منداڵ، بەهۆی چەپاندنیانەوە، یان گۆڕینیانەوە بۆ ئامانجی باڵا و ناسێکسی، واتە بە شکۆکردنیان Sublimation، ئەوە بۆ منداڵ دەستنیشان دەکەن، کە ئەو وزەیە لە گەورەییدا بۆ بەدیهێنانی دەستکەوتە شارستانییەتەکانی فەراهەم ببێ. دەربارەی ئەم بابەتە، فرۆید دەڵێ: "...لە ماوەی متبوونی ئەندەکی، یان هەمەکی واتە تەواو، لە نێوان پێنج ساڵی و تەمەنی نەرزەبوون (باڵقبوون)دا، هێزە ئەقڵییەکان بنیاد دەنرێن، کە دواتر دەبنە ئاستەنگ لە بەردەم ڕەوتی غەریزە سێکسییەکاندا، کتومت وەک بەربەست یان بەنداوەکان، بوونی هەر هەستێکی قێزەونی، هەستکردن بە عەیبە، داواکارییە جوانناسییەکان و مۆراڵییەکان و هەموو ئەو شتانە بەند دەکات و دەبێت بە ئاستەنگ لە بەردەم ڕەوتی غەریزە سێکسییەکاندا. ئەو سەرنجەی کە تاک لە لای دروست دەبێ، ئەوەیە لە منداڵانی شارنشیندا، ئەم بەربەست یان بەنداوانە، بەهۆی کاریگەریی فێربوونەوە، دروست دەبن، ئەوەی گومانی

تیادا نییە، فێربوون پەیوەندییەکی گەورەی بەمەوە هەیە، بەڵام دروستبوونی لە واقیعدا، بۆ فاکتەرێکی ئەندامی دەگەڕێتەوە کەبۆماوە بڕیاری لەسەر داوە، هەروەها دەشێ لە هەندێک حاڵەتدا بوونی هەبێت، تەنانەت بەبێ بوونی هیچ یارمەتییەک لە بواری فێربوونەوە. فرۆید ڕایەکەی خۆی بەم شێوەیە پوخت کردەوە: (پاڵنەرە سێکسییەکانی منداڵی لەم ماوەیەدا، واتە لە ماوەی قۆناغی متبووندا، ناوەستن، بەڵکو وزەکەیان بە شێوەیەکی هەمەکی، یان تا ئاستێکی زۆر دەگۆڕن، لە ئامانج و بەکارهێنانی سێکسییەوە، بۆ ئامانج و مەبەستی دیکە، کە ئارەزووە سێکسییەکان تیایاندا، یان هەڵدەکشێن و بەشکۆ دەبن و ڕووەو ئامانج و مەبەستی شارستانی ئاڕاستە دەگرن، یان ڕووەو دروستبوونی کاردانەوەی نەخۆشی ئاڕاستە دەگرن و ئەوکاتە وزەی سێکسی بە دەرکەوتنی نیشانەی نەخۆشی و ڕەفتارییەوە پەیوەست دەبێ).

***

لە بەدواداچوونی ئەم ڕایانەدا و هەموو ئەو ڕایانەی کە پێشتر ئاماژەمان پێ دان، تەنیا دەرک بە ئاستی ئەو بایەخە گەورەیە ناکەین کە مەسەلە سێکسییەکان لە بیرکردنەوەی فەیلەسووف و زانا و پزیشکە دەروونییەکاندا، داگیریان کردووە، بەڵکو ئەمە جەختکردنێکیشە لەسەر ئەوەی کە سێکس وزەیەکی سەرەکییە لە ژیاندا کە تەنیا لە بواری گوزارشی سێکسی ڕاستەوخۆدا سنووردار ناکرێ، بەڵکو بواری گوزارشکردنی بەرفراوان دەبێ، تا بواری بەرفراوانتر و ناڕاستەوخۆش بگرێتەوە لە ژیانی مرۆڤدا و تا ئەو ئاستەی ئەستەمە بوارێک لە بوارەکانی ژیان بدۆزرێتەوە، بە شێوەیەک لە شێوەکان سێکس دژەی بۆ نەکردبێ، ئەم واقیعە وا دەکات، ئەو وتە دێرینەی کە پێشتر ئاماژەمان پێ دا و دەڵێ: "سێکس و برسێتی حوکمی کاروبارەکانی جیهان دەکەن" وتەیەک

بێ زیادەڕۆیی تیادا نەبێ، چونکە مێژوو، شارستانی، پەند و وتەکانی پێشینان، نەریت، ئایین، پۆشاک و خۆڕازاندنەوە، گۆرانی و سەما و شیعر، هونەر بە بوارە جیاوازەکانییەوە، هەموویان هەڵگری مۆرکی سێکسن، تەنانەت ئەگەر ئەم مۆرکە بە ئاشکراش دەرنەکەوێ، یان چاوەڕوانکراو نەبێ. لە واقیعێکی لەم جۆرەدا، نابێت بە تێڕوانینێکی ڕەتکراوە و قێزەوەن و پەرچدانەوە لە سێکس بڕوانین، چونکە بوونمان پشت بەو دەبەستێ، شارستانییەتەکەمان بەهۆی ئەوەوە بنیاد نراوە، ئەم دوانەش هەردووکیان دەشێ نەمێنن، ئەگەر هەستی تەواو بۆ پێویستبوون بە سێکس و گوزارشکردن لێی جارێ بە ئازادی و جارێ بە چەپاندن و لە کاتێکی دیکەدا ڕاستەوخۆ و لە هەندێک کاتدا ناڕاستەوخۆ، دابین نەبێ. لەوانەیە هۆکاری ناوازەیی مرۆڤ لە پەرەسەندنی شارستانیدا و لەنێو تەواوی بوونەوەرەکانی دیکەدا، بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، یان بە لایەنی کەمەوە، هاوکات بێ لەگەڵ ناوازەیی سێکسیدا، ئەو ناوازەییەی مرۆڤ بێت کە دەتوانێ هەندێ جار وزەی سێکسیی خۆی بچەپێنێ و ڕەوتەکەی بۆ بوارەکانی دیکە بگۆڕێ تا زامنی پێداویستییە مرۆڤایەتییە باڵاکانی بۆ بکەن.

## سێکس و داهێنان

پێشتر هەندێک ڕا و تیۆرمان دەربارەی وزەی سێکسی لە ژیانی مرۆڤدا و کاریگەریی بۆ سەر شارستانییەتی مرۆڤایەتی و پەرەسەندنی خستە ڕوو، ئەم ڕا و تیۆرانە کاریگەریی ژیانی سێکسی تەنیا بۆ سەر کاروانی شارستانییەت و کۆمەڵگە بەگشتی لێک نادەنەوە، بەڵکو کاریگەرییەکەیان لەسەر ئاستی تاکەکەسییش لێک دەدەنەوە، بەو وەسفەی ژیانی سێکسی فاکتەرێکی سەرەکییە لە پرۆسەی ئەفراندن و داهێناندا. زۆرێک لە توێژەران لە هەوڵدانیاندا بۆ ڕوونکردنەوەی ماهییەتی داهێنان و ئەو فاکتەرانەی کە بڕیار دەدەن لەسەری و پێگەی وزەی سێکسی لەنێو ئەم فاکتەرانەدا، باسی ئەم بابەتەیان کردووە.

کۆکبوونێک هەیە وەختە بڵێی کۆکبوونێکی گشتییە لەنێو توێژەراندا، ئەویش ئەوەیە داهێنەران لە بلیمەت و داهێنەران لە بوارە جیاجیاکانی داهێناندا، کاتێک لەدایک دەبن بە بەهرەی تایبەتییەوە لەدایک دەبن، بەڵام تا ئێستا قورسە بۆمان سروشتی ئەم بەهرانە بە دیاریکراوی بزانین و ئایا تا چ ئاستێک بەهرە لەڕێی فاکتەری بۆماوەییەوە بڕیاری لەسەر دەدرێ، هەروەها تا چ ئاستێک ئەم فاکتەرە بۆماوەییانە بڕیار لەسەر دەرکەوتنی هەستیارێتیی دەرککردن بە شێوەیەکی ناسک و تایبەتی دەدەن لای کەسی بەهرەمەند و هەروەها توانای ناسروشتیی بۆ پەیوەستکردن و پێکەوەنووسانی بیرۆکەکانی بە خەیاڵەوە لە پرۆسەی ئەفراندن و داهێناندا.

هەندێک لە توێژەران لە ژیاننامەی ئەو کەسایەتییانەوە کە خاوەن بەهرەی داهێنان بوون تێبینییان کردووە، ڕێژەیەکیان کە

به کەم دادەنرێ، بە خەسڵەتی توندوتیژی و دەستدرێژی وەسف دەکرێن، ئەم سیفەتە بەهۆی کاریگەریی هێزە غەریزییەکانەوە بڕیاری لەسەر دەدرێ، ئەم تێبینییە بووە هۆی وروژاندنی ئەگەری بوونی پەیوەستی لە نێوان داهێنان و هێزێکی غەریزی دیکەدا، کە غەریزەی سێکسییە. لەوانەیە لە هەموو کەس زیاتر فرۆید سەرنجی بوونی ئەم پەیوەستییەی دابێ، کە لە زۆربەی نووسینەکانیدا بایەخی لەسەر گرنگیی وزەی سێکسی لە ژیانی مرۆڤایەتیدا چڕ کردووەتەوە، بە کاریگەریی ئەو وزەیەشەوە بۆ سەر پێشکەوتنی گشتیی شارستانییەت و کاریگەریی بۆ سەر داهێنان لەسەر ئاستی تاکەکەسی، چەندەها لێکۆڵینەوەی دەربارەی کاریگەریی ئەم وزەیە لە ژیانی هەندێک لە داهێنەراندا ئەنجام داوە، یەکێک لەو داهێنەرانە هونەرمەند لیۆناردۆ داڤینشی بوو.

فرۆید پرۆسەی داهێنان لە تاکی بەهرەمەندا وا لێک دەداتەوە کە پرۆسەیەکی هەڵکشانە، یان شکۆبوونی ئەو وزە سێکسییە کە ناچار بووە لە قۆناغێک لە قۆناغەکانی گەشەدا بچەپێنرێ و پاشان گۆڕانێک لە ڕەوتەکەیدا ڕووی داوە و بۆ کردارێکی داهێنانی خەلاق گۆڕاوە. فرۆید ماوەی چەپاندنی سێکسیی دیاری کردووە و پێی وایە دەکەوێتە قۆناغی متبوون لە قۆناغەکانی گەشەی دەروونیدا، واتە دەکەوێتە تەمەنی نێوان پێنج ساڵ و تەمەنی نەرزەبوون واتە باڵقبوون.

بەهۆی پەنگخواردنەوەی وزەی سێکسییەوە لەم ماوەیەدا، ئەم وزەیە بۆ مەبەست و ئامانجی دیکە دەگۆڕێ، یان بۆ بواری گوزارشتی داهێنان و ئەفراندن دەگۆڕێ، کە پێی دەوترێ پرۆسەی شکۆبوون، کە هەڵکشانیشی پێ دەوترێ، یان دەگۆڕێ بۆ سکاڵا و نیشانەکانی پشێویی دەروونی، واتە ئەوەی پێی دەوترێ کاردانەوە، کە گۆڕانێک نییە ڕووەو داهێنان. بەم شێوەیە بەپێی ڕای فرۆید تاک بەهۆی چەپاندن و گۆڕینی وزەی

سێکسییەوە، ڕووەو داهێنان، یان دروستبوونی کاردانەوەی نەخۆشی ئاراستە دەگرێ. بەڵام مەسەلەکە بەم شێوەیە ئاسان نییە، چونکە وا پێویست دەکات، سەرەتا تاک لە دروستبوون و لە توانای بۆماوەییدا هەڵگری تواناکانی بەهرەی داهێنان بێ، بەڵام ئەوەی دواتر ڕوو دەدات، پشت دەبەستێ بە بوونی فاکتەرەکانی دیکەدا، یان ئاراستەگرتن ڕووەو داهێنان، یان ڕووەو نەخۆشی. تاکی بلیمەت، دەشێ لە ژیانی دەروونیدا سروشتی بێ، یان هاوکات بەدەست پشێویی دەروونییەوە بناڵێنێ، ئەو کۆژانە دەروونییانەی کە بەدەستیانەوە گیرۆدەیە، یان لە پرۆسەی داهێنان و ئەفراندندا یارمەتیی دەدەن، یان لە بەردەم بەدیهێنانی ئەم توانایەدا، دەرگای لەسەر دادەخەن. ئەم واقیعە ئەوە لێک دەداتەوە بۆچی هەندێ لە کەسانی داهێنەر ژیانێکی سروشتییان هەیە و بۆچی هەندێک دیکەیان بەدەست ئەو پشێوییە دەروونییانەوە دەناڵێنن کە دەشێ هەندێجار توندیش بن، لە هەندێک کەسی دیکەشدا، ڕوودانی نەخۆشیی دەروونی لەوانەیە بە شێوەیەکی کاتی پرۆسەی ئەفراندن بوەستێنێ، یان بە شێوەیەکی یەکجارەکی کۆتایی پێ بهێنێ.

لەو تێبینییانەی دیکە دەربارەی بابەتی پەیوەندیی نێوان سێکس و داهێنان، ئەو تێبینییەیە کە قۆناغەکانی گەشەی سێکسی کە تاک لە منداڵی و هەرزەکاریدا پیایاندا تێپەڕ دەبێ، لە کەسی داهێنەردا لە ڕووی ئەدگارەوە ئاشکرا و دیار نین، هەروەها تێبینی کراوە، بە شێوەیەکی گشتی کەسێتیی تاکی داهێنەر بە شێوەیەک لە شێوەکان لە ڕووی ژیانی سێکسییەوە لە کەسێتیی ئەو کەسانە دەچێ کە لە ڕووی سێکسییەوە تووشی لادان بوون، زیاتر لەوەی لە کەسانی سروشتی بچێ، ئەم تێبینییە مەرج نییە ئاماژە بێ بۆ بوونی ڕوخسارەکانی ڕەفتاری سێکسیی لادراو لای کەسانی داهێنەر، هەرچەندە هەندێک لە توێژەران لادانی سێکسی و داهێنان

پێکەوە پەیوەست دەکەن، بەتایبەتی لە حاڵەتەکانی لادانی سێکسی جۆری هۆمۆسێکسوالیتی. هەندێک لە توێژەرانی دیکە وای دەبینن، ئەو کەسانەی خاوەن بەهرەی داهێنانن، خاوەن وزەیەکی سێکسیی گەورەشن کە ئەمەش توانایەکی زیاتریان بۆ جووڵە و چالاکی لە ڕەفتاری سێکسییاندا پێ دەبەخشێ، مەرج نییە ئەم چالاکییە لەڕێی پراکتیزەکردنی کرداری سێکسییەوە بێ، بەڵکو دەشێ بە شێوازی دیکە گوزارشی لێ بکەن، بۆ نموونە لەڕێی خۆشەویستییەوە. خاتوو گرین ئێکر Green Acerی توێژەر دەربارەی ئەم بابەتە دەڵێت: "داهێنان یان خەلاقییەت، بەخشندەیەکە لە خواوە، داهێنەر لە پرۆسەیەکی خۆشەویستیی بەکۆمەڵدایە لەگەڵ جیهاندا، بەخشندەکانی، خۆشەویستی بۆ ئەم جیهانە دەستەبەر دەکات، لەبەر ئەوە تەنیا بۆ دەستکەوتنی تێربوون و ڕازیبوونی سێکسی هەوڵ نادات".

هەندێک پێیان وایە ئەگەر مرۆڤ بە شێوەیەکی حەواوە و سوودمەند و دڵخۆشکەرانە سێکسی کرد و هەستی بە تێربوونی سێکسی کرد، ئەوا دەشێ ڕێگر بێ لە ئەنجامدانی کاری داهێنانە، لەم بارەیەوە ئیسلەر Eissler دەڵێ: "پەیوەندیی سوودبەخش لە ڕووی سێکسییەوە لە نێوان تاک و بابەتێکی دیاریکراودا، پەیوەندییەکە لەگەڵ ئەفراندن یان خەلاقییەتدا ناگونجێ". گوتەی ئەڵمانی دەهێنێتەوە بە نموونە، کاتێک کە پەیوەندیی خۆشەویستیی سوودبەخشی لە ڕووی سێکسییەوە هەبووە، ئیدی شکستی هێناوە لە داهێنان و ئەفراندنی بەرهەمی نوێدا. لەبەر ئەوە ئیسلەر تێربوون و ڕازیکردنی سێکسی بە فاکتەرێکی وەستێنەری ئەفراندن، یان خەلاقییەت دادەنێ.

هەر لە کۆنەوە و بەر لە چەندەها سەدە، ئەم ڕایە دەربارەی داهێنان و سێکس هەبووە، عەرەبی جاهلی پێیان وا بووە زیادەڕۆییکردن لە سێکسدا دەبێتە فاکتەرێکی زیانبەخش بۆ سەر

ئەقڵ، "ڕازی"یش ڕایەکی هاوشێوەی هەبووە کاتێک جەختی لەوە کردووەتەوە کە تەسلیمبوون بە شەهوەتی سێکسی، کاریگەریی بۆ سەر ئەقڵ و دانایی دەبێ.

لەوە دەچێ جیاوازی و ناکۆکییەک لە ڕایەکاندا هەبێ دەربارەی بەهای وزەی سێکسی لە بواری داهێناندا، لەنێو ئەو کەسانەدا کە پێیان وایە ئەم وزەیە سەرچاوەیەکی داهێنانە. لەوانەیە ناکۆکی لە نێو ئەم ڕایانەدا نەبێ وەک ئەوەی لە ڕواڵەتدا دیارە، ئەگەر بڕوامان بە بایەخی وزەی سێکسی هێنا کە وزەیەکی ئەفرێنەرە، بەو مەرجەی ئەم وزەیە دوور لە کاری ئەفراندن سەرف نەبێ و بەفیڕۆ نەچێ، ئیدی ئەو سەرفکردنە بەهۆی حاڵەتەکانی نەخۆشییەوە بێ، یان بەهۆی بەردەوام قووڵبوونەوە بێ لە ئەنجامدانی کاری سێکسی.

ئەگەر وزەی سێکسی ئەو بایەخەی هەبێ بۆ بواری داهێنان، کە زۆرێک وای دەبینن هەیبێت، ئەوا پێویستە لەپێناوی ئەو بوارەدا بخرێتە بەر وەبەرهێنان، ئەگەر لەپێناوی مەبەستێکی دیکەدا سەرف کرا، ئەوا ڕێڕەوەکەی لە پرۆسەی داهێناندا وشک دەکات. کافکای نووسەر دەربارەی هۆکاری دوورکەوتنەوەی لە پەیوەندیی سێکسی، هەمان ڕای هەبووە، لەم بارەیەوە وتوویەتی: "ئەوەی بە سێکس دەبەخشرێ، لە نووسین وەردەگیرێ". بەڵام بیکاسۆ هەمان ڕای کافکای نەبووە، تەنانەت لە تەمەنی گەورەییدا دەڵێ: "ئەگەر تەلارساز بوومایە، ڕووکاری هەرچی ماڵەکانە لە وێنەی جەستەی ژندا دیزاینم دەکرد". دوورکەوتنەوە و بۆشاییی گەورەی نێوان ئەم دوو وتەیە، هەندێک لە ڕەهەندەکانی ژیانی سێکسی و بایەخی لە پرۆسەی ئەفراندن و داهێناندا دەخەنە ڕوو.

لەوانەی ئاماژەمان پێ دان، ئاستی پەیوەندیی نێوان غەریزەی سێکسی لە مرۆڤدا و پێشکەوتنی شارستانیی مرۆڤیشمان بۆ ڕوون دەبێتەوە. لەوانەیە ئەم غەریزەیە بەم شێوەیە کاریگەریی

نەبوایە، ئەگەر مرۆڤ خاوەنی ئەو پلەیە لە پەرەسەندنی توانا ئەقڵی و سۆزدارییەکان نەبوایە، کە بوونیان پێویستە بۆ ئەوەی سێکس وەک هۆکارێکی گوزارشتکردن و ئامرازی پەرەسەندنی شارستانییەتی مرۆڤایەتی بەکار بێنێ. لەوانەیە هەڵەبێ، وزەی سێکسی لە لایەک سەیر بکەین و وزەی ئەقڵی و سۆزیش لە لایەکی دیکە وەک ئەوەی دوو وزەی جیابن لە یەکدی و لەسەر بناغەی ئەو جیابوونەوەیەش لە یەکدی، لەگەڵ یەکدیدا کارلێک بکەن، چونکە لە ڕاستیدا تەواوی ئەم وزانە لە واقیعی بایۆلۆژیی مرۆڤدا خۆیان پێکەوە پەیوەستن و ئەستەمە بتوانرێ سنووری جیاکردنەوەیان بۆ دابنرێ، لەبەر ئەوە کارلێکردنی نێوانیان، کارلێکێکی بەردەوامە و لە چوارچێوەی کردارە بایۆلۆژییەکان خۆیاندا ڕوودەدەن، ئەم کارلێکانە تەنیا نابنە هۆی هێشتنەوەی حاڵەتێک لە هاوسەنگیی زیندەیی، یان هێشتنەوەی سێکس، بەڵکو پرۆسەی ئیڤۆلیوشنی مرۆڤیش لەخۆ دەگرن، کە پرۆسەیەکە ئەقڵ کاریگەریی خۆی بەسەر ژیانی سێکسیدا دەسەپێنێ، بە پێوانەیەک کە هیچی کەمتر نییە لە کاریگەریی سێکس بۆ سەر ژیانی ئەقڵی. ئەم واقیعەی وێنەیەکی ناوازەی بە ژیانی سێکسیی مرۆڤ بەخشیوە کە جیاوازە لە ژیانی سێکسیی هەرچی بوونەوەرانی دیکە، هەروەها توانای پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و شارستانێتیی بە مرۆڤ بەخشیوە کە بوونەوەرانی دیکە ئەو توانایەیان نییە. لەوانەیە هەر لەبەر ئەوە بێت، ئەگەر یەکێک لەو دوو وزەیە وزەی ئەقڵی، یان وزەی سێکسی، لە ڕووی هێز و ناوازەییەوە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا کەمی کرد، ئەوا وزەکەی دیکەش کەم دەکات، یان توانای کەم دەبێتەوە و لێرەشەوە وەستان، یان دواکەوتن و گەڕانەوەی شارستانی لە ژیانی مرۆڤایەتیدا ڕوو دەدات.

## نێر و مێ و هەڵوێستەکانیان
## بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان

ئەو بابەت و هەڵوێستانەی کە لە لاپەڕەکانی پێشوودا توێژینەوەمان دەربارەیان کرد و باسمان کردن، پەیوەندییان بە ژیانی سێکسییەوە هەبوو، لە چوارچێوەی شارستانی و کۆمەڵایەتیدا، بە درێژایی سەردەمە بەدوایەکدا هاتووەکان، بە شێوەیەکی گشتی، وێناکردنی هەڵوێستی پیاو بوون دەربارەی ژن، باسەکان لەمانە تێنەپەڕیون و نەچوونەتە سەر گەڕان و توێژینەوە دەربارەی هەڵوێستە تاکەکەسییەکانی هەریەک لە نێر و مێ دەربارەی ژیانی سێکسی. بەم شێوەیە هیچ ڕێگەچارەیەکی دیکە نەبوو بەدەر لە چاوەڕوانی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ تا بتوانرێ بە شێوەیەکی زانستییانە و ورد ڕاپرسی دەربارەی ئەم هەڵوێستانە بکرێ، بەتایبەتی بۆ زانینی هەڵوێستی ژن بەرامبەر بە ژیانی سێکسی. ئەوەی پێویستە ڕەچاو بکرێ، ئەم ڕاپرسییانە لەگەڵ ئەوەشدا کە وردن، بەڵام ئەو ئەنجامانەی دەیانخەنە ڕوو، ئەنجامی بارودۆخ و قۆناغێکی دیاریکراون، چونکە هەڵوێستی هەردوو توخمەکە، بەتایبەتیش هەڵوێستی ژن، بە شێوەیەکی بەردەوام لە باری گۆڕاندان، پاشان ئەو دەرئەنجام و هەڵوێستانەی کە لەگەڵ هەندێک بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیری و شارستانی و جوگرافیی دیاریکراودا دەگونجێن، لەگەڵ بارودۆخی دیکەدا ناگونجێن کە ناکۆکن لەگەڵ ئەو بارودۆخانە یان تەنانەت ئەگەر لێکچووش بن، هەر ناشێت هەمان هەڵوێست و دەرئەنجامیان بەسەردا جێبەجێ ببێ. بەم خۆپارێزییەوە لە گشتگیرکردن، کورتەیەک دەربارەی نوێترین

ڕاپرسیی زانستی و ورد سەبارەت بەم بابەتە دەخەینە ڕوو، ئەم ڕاپرسییە لە لێکۆڵینەوەیەکی چڕوپڕی زانا و توێژەری سایکۆلۆژی "ئایزنک" هاتووە لە چوارچێوەی کتێبەکەیدا بە ناونیشانی (سێکس و کەسێتی)، کە زیاتر لە شوێنێک ئاماژەمان بەم نووسەرە داوە لە بەشەکانی ئەم کتێبەدا. لە کۆتایی بەشەکەشدا ڕاپرسییەکی دیکەی گرنگ دەخەینە ڕوو کە هۆبارت Hobart لە زانکۆی ئالبرتا لە کەنەدا ئەنجامی داوە، کە بریتییە لە لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکاری، تیایدا جیاوازییەکانی نێوان هەڵوێستی دوو توخمەکە ئاماژە پێ دەدات لەنێو کۆمەڵێک خوێندکاردا لە چوارچێوەی دوو ڕاپرسیدا کە لە ڕووی زەمەنییەوە ماوەی نۆ ساڵیان بەینە، یەکەم ڕاپرسی لە ساڵی ١٩٦٨دا و دووەمیان لە ساڵی ١٩٧٧دا ئەنجام دراوە. ئاشکرایە لەڕێی بەدواداچوونی ماددەکانی هەردوو لێکۆڵینەوەکە، یەکەم لە ئینگلتەرا و دووەم لە کەنەدا، ئەستەمە ئەم ڕاپرسییانە لە کۆمەڵگە خۆپارێزەکانی وەک کۆمەڵگەی عەرەبی جێبەجێ بکرێن، لەبەر ئەوە چەند بەش و بڕگەیەک لەو ڕاپرسییانە وەردەگرین، تا بە سەرنجی هەردوو توخمەکە بەرامبەر بە هەڵوێستە سێکسییەکان ئاشنا ببین لە دوو شارستانییەتی دوو وڵاتی خۆرئاوایی هاوچەرخدا.

### لێکۆڵینەوەکەی ئایزنک

ڕاپرسیی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەسەر ٤٢٧ نێر و ٤٣٦ مێ لە نێوان تەمەنی (١٨-٦٠) و بە ناوەندی ڕێژەیی نزیک ٣٠ ساڵ، ئەنجام درا. ئەو سەمپەڵانەی کە بۆ ڕاپرسییەکە هەڵبژێران، چینی کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیریی جیاجیای گرتەوە و هەروەها لە ڕووی کار و پیشەوە بە هەمان شێوە. دەربارەی ئامانجی لێکۆڵینەوەکە، ئایزنک وتی ئامانجی دیاریکردنی پێوانە

دانیشتوانییەکان نییە، بەڵکو هەوڵی داوە بۆ دۆزینەوەی پلەی گونجانی نێوان وەڵام و پرسیارەکان، هەروەها پەیوەندیی نێوان کەسێتی و وەڵامی پرسیارەکان. ئایزنک ١٥٨ پرسیاری داناوە، کە پرسیارەکان لە نێر و مێدا وەک یەک بوون، هەرچەندە هەندێجار لە هەندێ پرسیاردا ناچاربووە شێواز و داڕشتنەوەی پرسیارەکە بەو جۆرە لێ بکات کە لەگەڵ ناسنامەی توخمی کەسەکەدا بگونجێ. داوا لە بەشداربووان کراوە بە (بەڵێ) یان (نەخێر) وەڵام بدەنەوە، یان بە (ڕازیبوون) یان بە (ناڕازیبوون). ئایزنک ڕێژەی سەدی بەرامبەر بە وەڵامدانەوە بە (بەڵێ) بەرامبەر هەر پرسیارێک داناوە بۆ وەڵامی هەریەک لە دوو توخمەکە.

## ڕاپرسییەکە

ژمارە: پرسیار ڕێژەی سەدی وەڵامدانەوە بە (بەڵێ) لە هەردوو توخمەکە

نێر مێ

١- توخمی بەرامبەر ڕێزت لێ دەگرێ، ئەگەر ناچار نەبێ؟
%٤٥ %٤٨

٢- سێکس بێ خۆشەویستی، هیچ کاتێک، ڕازیکەر نییە.
%٤٣ %٦٠

٣- پێویستە بارودۆخ بە تەواوی شیاو و گونجاو بێ تا
%١٥ %٤٠

لە ڕووی سێکسییەوە بورووژێم.

٤- بە دەگمەن بیر لە سێکس دەکەمەوە.
%٥ %١٢

٥- ماستەربەیشن ڕەفتارێکی تەندروست نییە.
%٤ %٤

٦- هەست بە چێژ دەکەم کاتێ دەست لە ئەندامی سێکسیی خۆم دەدەم.
%٦٦ %٨١

٧- پێویستم بە ڕێزی مێ یان نێر نییە تا هەست بە چێژ
%٢٦ %٤٣

لە گەمەبازی یان پەیوەندیی سێکسی بکەم.

٨- بەڕاستی من کەسانی هاوتوخمی خۆمم لا خوازراوترە.
%٣ %٤

٩- من لە بەئاگاییدا، هەوڵ دەدەم پاڵ بە بیرۆکە
سێکسییەکانەوە بنێم لە مێشکمدا. %٣ %٤

١٠- تووشی ململانێی دەروونی بووم بەهۆی هەستە سێکسییەکانمەوە
%١٤ %٢٠

بەرامبەر بە کەسێکی هاوتوخمی خۆم.

١١- ئەوەندە پێویستم بە وزە نییە تا لە ڕووی سێکسییەوە بورووژێم.
%٤٤ %٧٥

١٢- هاوتوخمەکانی خۆم زۆر سەرنجم ڕادەکێشن.
%١٠ %٥

١٣- پێویستە منداڵان ڕاستییە سێکسییەکان بزانن.
%٩٧ %٩٦

١٤- ڕۆژانە بیر لە سێکس دەکەمەوە.
%٦١ %٨٧

١٥- زۆر بە ئاسانی لە ڕووی سێکسییەوە دەورووژێم.
%٤٠ %٦٨

١٦- حەز لە سەیرکردنی وێنەی سێکسی دەکەم.
%٤٥ %٨٠

١٧- بینینی کەسێکم بە ڕووتی بە لاوە گرنگ نییە.
%٢٨ %٦

١٨- بیرۆکەکانی لادانی سێکسی، هەندێجار نارەحەتم دەکەن.
%١٥ %٢٤

١٩- وا پێویست دەکات هەندێجار من لە رووی سێکسییەوە توندوتیژ بن.
%٨٨ %٩٥

٢٠- هەوڵ دەدەم لە هەر شوێنێ دەستم کەوت چێژی خۆم ببینم.
%١٩ %٣٤

٢١- هەندێجار هەست دەکەم حەزم لە چەوسانەوەی
%١٦ %٢٢

هاوبەشە سێکسییەکەمە.

٢٢- خۆشڕابواردن مەترسییەک نییە ئەگەر بە شێوەیەکی دروست ئەنجامدرا.
%٨٠ %٨٤

٢٣- هەندێجار هەست بە شەڕانگێزی دەکەم بەرامبەر
%٥٩ %٥٤

بە هاوبەشە سێکسییەکەم.

٢٤- پێویستە بە تەواوەتی هاوسەرێتی ڕەت بکەینەوە.
%٨ %٨

٢٥- لەنێو هەموو چێژەکانمدا، سێکس گرنگترینیانە.
%٢٦ %٣٥

٢٦- ڕێگەدان و لێخۆشبوونی سێکسی هەڕەشە دەکات بە تێکشکانی
%١٤ %٩

تەواوی بناغەکانی شارستانییەتمان.

٢٧- پێویستە سێکس بۆ مەبەستی زۆربوون بێ، نەک چێژی تایبەتی.
%١ سفر

٢٨- دڵسۆزبوونی تەواو بۆ هاوبەشی سێکسی بە درێژایی ژیان
%٢٨ %٤١

**شتێکی پووچە، هەروەک چۆن ڕەبەنی و پاکیزەیی شتێکی بێمانان.**

٢٩- سەرقاڵبوونی هاوچەرخ بە سێکسەوە لە کۆمەڵگەکانماندا زۆربەیان بەهۆی فیلم و ڕۆژنامە و تەلەفزیۆن و ڕیکلامەوە دروست بوون.

%٥٤ %٤٥

٣٠- گەمەبازیی سێکسیی نێوان منداڵان هیچ زیانێکی نییە.

%٧٤ %٧٨

٣١- مێ وەک نێر ئارەزووی سێکسی بەهێزی هەیە.

%٢٢ %١٧

٣٢- من دەنگ بە یاسای ڕێگەدان بە فرەژنی دەدەم.

%١١ %٣٠

٣٣- هەرچەندە مرۆڤ پەیوەندیی سێکسیی هەبێ و جووتبوون

%٣٩ %٥٥

**بکات، بەڵام هەندێجار ماستەربەیشن خۆشە.**

٣٤- حەزم لە هاوبەشێکی سێکسییە چەند ساڵێک لە خۆم گەورەتر بێ.

%٢٥ %٦

٣٥- هیچ کاتێک ناتوانم لەگەڵ باوکمدا باسی سێکس بکەم.

%٦٠ %٦٤

٣٦- هەندێ شت کە دەیکەم تەنیا بۆ ڕازیکردنی هاوبەشە

%٤٧ %٤٥

**سێکسییەکەم دەیکەم.**

٣٧- دڵنیا نیم لەوەی بە ئۆرگازم گەیشتووم.

%٢٣ %٣

٣٨- بە لای منەوە تەنیا چەند شتێکی کەم لە سێکس گرنگتر هەیە.

%٢٦ %٤٤

٣٩- زۆر بە پەرۆشم بۆ ئەوەی منداڵم ببێ.
%٤٥ %٢٩
٤٠- سێکسی جەستەیی گرنگترین شتە لە هاوسەرێتیدا.
%٢٠ %٢١
٤١- سەرنجڕاکێشانی جەستەیی زۆر گرنگە بە لای منەوە.
%٥٦ %٦٣
٤٢- نەرمونیانی لە پەیوەندیی سێکسیدا گرنگترین سیفەتە.
%٥٨ %٥٣
٤٣- خۆشەویستی ڕۆمانسی تەنیا سەرابێکی هەرزەکارانەیە.
هیچ وەڵامێک لە بەرامبەریدا دانەنراوە
٤٤- من پێم وایە خواردنی حەبی دژەسکپڕی بۆ هەر چەندێک بێ، مەترسیی بۆ سەر ژن هەیە.
%٤ %٢٦
٤٥- پیاو لە ژن خۆپەرستترە لە پەیوەندیی سێکسیدا،
%٥٥
**ژن لە پیاو خۆپەرستترە لە پەیوەندیی سێکسیدا.**
٤٦- ژن سێکس بۆ بەدیهێنانی دەستکەوتی جیاواز بەکار دەهێنێ.
%٦٨ %٥٩
٤٧- لە مەسەلە سێکسییەکاندا من بەختێکی لاوەکیی هەیە.
%٢٠ %٢٠

لەپاش ئەم پرسیارانە، کۆمەڵێک پرسیاری دیکە دێن کە پەیوەندییان بە پەیوەندیی سێکسییەوە هەیە لە ڕووی حەز و دووبارەبوونەوەوە، هەروەها لە ڕووی پەککەوتنی سێکسی و سێکسساردی و ئۆرگازم و هاویشتنی تۆو، هەروەها بابەتە سێکسییەکانی دیکە، کە ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە هەڵوێستەکانەوە نییە بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان، بۆیە لێرەدا بە پێویستی نازانین بەڵگە بۆ سەلماندنیان بهێنینەوە.

# بەشی سییەم
# جیاوازیی نێوان نێر و مێ
# لە ڕەفتاری سێکسیدا

-فرەجۆری و فرەژمارەیی
-دەستپێشخەری
-خاوەنداریێتی
-بەجێهێشتن
-تابۆکان
-جیاوازیی تەمەن
-نمایشە سێکسییەکان
-وروژاندنی سێکسی
-ئۆرگازم
-چێژ و ئازار
-قۆناغە سێکسییەکان

## جیاوازیی نێوان نێر و مێ لە ڕەفتاری سێکسیدا

توێژینەوە دەربارەی ژیانی سێکسیی هەریەک لە نێر و مێ، کۆمەڵێک جیاوازیی گشتیی نێوانیان دەخاتە ڕوو. ئەم جیاوازییانە پاڵنەری سێکسی و ڕەفتاری سێکسییش بە مەبەستی تێرکردن و ڕازیکردنی حەزی سێکسی لەخۆ دەگرن. سەرەتا و لەگەڵ یەکەم سەرنجدا، وا دەردەکەوێ کە ئەم جیاوازییانە لە نێوان دوو توخمەکەدا ببنە ڕێگر لە بەردەم سازان و گونجانی نێوانیاندا و لێرەشەوە بەدیهێنانی ئامانجە هەنووکەییەکان و دوا ئامانجی مرۆڤ لە پەیوەندیی سێکسیدا، بەڵام تێڕامان و وردبوونەوە لەم جیاوازییانە، ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکەن کە ئەم جیاوازییانە خزمەتی پرۆسەی تەواوکاریی سێکسی دەکەن و دەبنە هۆی بەدیهێنانی پێداویستییە بایۆلۆژی و کۆمەڵایەتی و شارستانییەتەکان کە هەردوو توخمەکە هەوڵی بۆ دەدەن بێ ئەوەی هۆشیارانە بیری لێ بکەنەوە.

هەرچەندە ئەم جیاوازییانە لە هەموو حاڵەتێکدا ئاشکرا دەرناکەون، بەڵام تا ئاستێک ئەوەندە بوونیان هەیە کە تێبینی بکرێن و توێژینەوەیان لەسەر بکرێ، بەڵام بەپێی سروشتی هەر تاکێک، نێر بێ یان مێ، دەشێ زیاد بکەن، یان کەم بکەن، هەروەها بەهۆی کاریگەریی فاکتەرە کۆمەڵایەتی و شارستانییە جیاجیاکانەوە، لێرەدا هەندێک لە بوارەکانی جیاوازیی نێوان دوو توخمەکە دەخەینە ڕوو دەربارەی ئەدگارەکانی ژیانی سێکسییان لە پاڵنەر، یان ڕەفتارە سێکسییەکان.

### فرەجۆری و فرەژمارەی

تێبینی و لێکۆڵینەوەکان ئاماژە دەدەن کە نێر لە پەیوەندییە سێکسییەکاندا زیاتر لە مێ، مەیل و حەزی بۆ فرەجۆری هەیە. ئەم تێبینییە لە هەموو کۆمەڵگە و وڵاتانی دنیا دووبارە دەبێتەوە، هەروەها ئەمە تێبینییەکی بەدوایەکدا هاتووە بە درێژایی سەردەم و شارستانییەتەکان. لەوانەیە بە نزیکی هەرچی نێر هەیە حەز لە بەدیهێنانی ئەم فرەجۆری و فرەژمارەییە بکەن لە پەیوەندییە سێکسییەکاندا ئەگەر ڕێگریی کۆمەڵایەتی نەبێتە ئاستەنگێک لە بەردەمیاندا.

یەکێک لەو لێکۆڵینەوە بەرفراوانانە دەربارەی ئەم بابەتە، ئاماژە بەوە دەدەن ٨٤%ی ١٦٥ کۆمەڵگەی هاوچەرخ کە لێکۆڵینەوەیان لەسەر ئەنجام دراوە، ڕێگە دەدەن پیاو لە یەک کاتدا زیاتر لە هاوبەشێکی سێکسیی هەبێ، ئیدی لەڕێی هاوسەرێتییەوە بێت، یان بە ڕێگەیەکی دیکە بێ.

لێکۆڵینەوەیەکی دیکە ئاماژە بەوە دەدات کە پیاوان لە ژنان زیاتر حەز و مەیلی فرەجۆرییان هەیە لە پەیوەندییە سێکسییەکانیاندا. ئەم دیاردەیە لەسەر بناغەی بایۆلۆژی لێکدراوەتەوە، چونکە فرەجۆری لە نێردا خزمەتی مەبەستی ڕەگداکوتان و جەختکردنەوە لە بەردەوامێتیی بۆماوە دەکات، هەروەها خزمەتی مەبەستی تواناکانی بەرفراوانکردن دەکات لە بواری هەڵبژاردنی سروشتیدا کە ئەمیش لەجێی خۆیەوە خزمەتی بەردەوامێتیی بۆماوە و فرەجۆری و ئیڤۆلیوشن دەکات، بەڵام لە مێدا، مەیل و حەزی مێ بۆ فرەجۆری لەسەر بناغەی بایۆلۆژی و کۆمەڵایەتی لێک دەدرێتەوە، چونکە مێ بە حوکمی سروشتی بایۆلۆژی و پێگە کۆمەڵایەتییەکەی ناتوانرێ بەردەوامێتیی توانای بۆماوەیی خۆی زامن بکات تەنیا لەڕێی خۆیەوە نەبێ، ئەم توانایە

لەڕێی ماوەی دوور لەیەک و سنووردای دووگیانییەوە دیاری دەکرێ. لەبەر ئەوە وا پێویست دەکات مێ پەیوەندییە سێکسییەکانی سنووربەند بکات بە شێوەیەک لە چوارچێوەی هاوسەرێتی نەڕواتە دەرەوە.

### دەستپێشخەری

لە پەیوەندیی نێوان نێر و مێدا، نێر دەستپێشخەریی یەکەم دەکات و هەوڵی کێشکردنی دڵی مێ دەدات، واتە یەکەم جار ژن ئەو پیاوە هەڵنابژێرێ کە دەیەوێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە، مێ خۆپارێزی پیشان دەدات و تا ئاستێک کۆنترۆڵی سۆزی خۆی دەکات و تەنانەت هەندێجار دەگاتە سنووری ناڕەزایی و ڕێگرتنیش، ئەم دیاردەیە لە پۆلەکانی دیکەی بوونەوەرانیشدا هەیە سەرباری بوونی لە مرۆڤدا. هەوڵدانی نێر بۆ کێشکردنی سۆز و دڵی مێ، تەنیا سیفەتێکی شارستانی و کۆمەڵایەتی نانوێنێ، بەڵکو زیاتر سیفەتێکە فاکتەری بایۆلۆژی بڕیاری لەسەر دەدات، ئەم جیاوازییە لە نێوان ڕەفتاری نێر و مێدا دەشێ حەزی نێر بەهێز بکات، هەروەها بواری پێویست بە مێ ببەخشێ تا دەست بە وەڵامدانەوە سێکسییەکانی بکات کە بەگشتی لە زۆربەی زۆری ئەم وەڵامدانەوە سێکسییانەدا لە پیاو خاوترە.

### خاوەندارێتی

ئەنگێزەی خاوەندارێتیکردنی هاوبەشی سێکسی، ئەنگێزەیەکە لە هەریەک لە نێر و مێدا دەردەکەوێ، دەشێ بە پلەی یەکسان لای هەردووکیان تێبینی بکرێ، هەرچەندە پاڵنەرەکانی خاوەندارێتی لای هەردووکیان جیاوازە. لە نێردا حەز و مەیلی خاوەندارێتی بەهۆی پاڵنەری حەزکردنی پیاوەوەیە بۆ ئەوەی

پارێزگاری لە مانەوە و بەردەوامیتیی وەچەی خۆی بکات، ئەم مەسەلەیەش تەنیا لەڕێی پارێزگاریکردنی هاوبەشی سێکسی دەکرێ زامن بکرێ، هەرچی ئەنگێزەی مێیە بۆ خاوەندارێتیکردنی نێر لەوەوە هاتووە، هەوڵ دەدات پارێزگاری لە مانەوەی ئەو کەسە بکات کە پێداویستییەکانی خۆی و منداڵەکانی جێبەجێ دەکات. لەوانەیە پاڵنەرێکی هاوبەش هەبێ بۆ ئەنگێزەی خاوەندارێتی لە نێوان هەردووکیاندا، ڕەگوڕیشەی ئەم پاڵنەرە هاوبەشە دەشێ بریتی بێت لە پێداویستیی هەردووکیان بۆ ئولفەت و هاوژیانی.

**بەجێهێشتن**

دیاردەی بەجێهێشتنی هاوبەشی سێکسی لە لایەن یەکێک لە دوو توخمەکەوە، دیاردەیەکە لە مرۆڤدا، هەروەک چۆن لە بوونەوەرانی دیکەشدا هەیە، وەک باڵندە. ئامانج لە جێهێشتنی مێ لە لایەن نێرەوە، واتە کاتێک نێرێک مێیەکەی بەجێ دەهێڵێ، ئامانجی لەم جێهێشتنە جەختکردنەوەیە لە توانای بۆ سێکس و زۆربوون، بەڵام مێ ئەم کارە ناکات، چونکە تووشی زیان دەبێ بەهۆی خاوی پرۆسەی خستنەوەی منداڵ. ئامارەکان لە ئەمەریکا ئاماژە بەوە دەدەن ڕێژەی بەجێهێشتنی مێ لە لایەن نێرەوە، بیست ئەوەندەی بەجێهێشتنی نێرە لە لایەن مێینەوە.

**تابۆکان**

ڕەفتاری سێکسیی حەرام یان تابۆ لە ڕووی شارستانی و کۆمەڵایەتی و ئایینییەوە، بە ڕێژەیەکی بەرزتر لە مێ لە لایەن نێرەوە ئەنجام دەدرێ، زۆرترین پەیوەندییە سێکسییە حەرامەکان کە ڕوودەدەن، پەیوەندیی نێوان باوک و کچە، کەمترینیان

پەیوەندیی نێوان دایک و کوڕە. لێکۆڵینەوە و ئامارەکان لەسەر زیاتر لە کۆمەڵگەیەک ئاماژە بەوە دەدەن، پەیوەندیی سێکسیی حەرامی نێوان باوک و کچ کە نێر بەرامبەر بە مێ دەیکات، بە ڕێژەی سەد جار زیاتر ڕوو دەدات بەراورد بە پەیوەندیی سێکسیی حەرامی نێوان دایک و کوڕ، کە مێ بەرامبەر بە نێر ئەنجامی بدات. کەمیی حەزی مێ بۆ پەیوەندیی سێکسیی حەرام، بە بەراورد لەگەڵ نێردا، لەسەر بناغەی بایۆلۆژی و شارستانی لێک دەدرێتەوە. یەکێک لە هەقیقەتە سەیروسەمەرەکان، نێرە و مێیەی مەیموونی شەمپانزی جیاوازییان هەیە لە ئەنجامدانی پەیوەندیی سێکسیی حەرامدا، لە کاتێکدا نێرەی باوک لەگەڵ وەچە مێیەکانی خۆیدا سێکس دەکات، بەڵام مێیەی دایک لەگەڵ وەچە نێرەکانی خۆیدا سێکس ناکات، ئەمەش جەخت لە بوونی فاکتەرێکی بایۆلۆژیی بڕیارلێدراو دەکاتەوە.

هەروەها تیۆرێکی بایۆلۆژیی کۆمەڵایەتی هەیە هۆکاری ئەوەی کە نێر زیاتر لە مێ پەیوەندیی سێکسیی حەرام دەبەستێ، لەسەر ئەو بناغەیە لێک دەداتەوە، کە ئەو ڕەفتارە لە بناغەدا ڕەفتارێکی خۆگونجاندنە و خزمەتی مەبەستی زۆربوون دەکات، هەروەک لە فرەژنی، یان فرەپەیوەندیی سێکسیدا ڕوو دەدات، بەڵام ئەم مەبەستە لە شارستانییەتی ئێمەدا کارا نابێ، ئەگەر بارودۆخی دەروونی و کۆمەڵایەتیی گونجاوی لە چوارچێوەی خێزاندا بۆ نەڕەخسێ، هەروەها ئەم پەیوەندییانە یان ئامانجی ئەم پەیوەندییانە پێویستە ئەوەندەش بەهێز بن تا بتوانن پراکتیزە بکرێن، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە ڕووی شارستانییەوە بە تابۆ و حەرام دانراون.

## جیاوازیی تەمەن

بەزۆری لە پەیوەندیی هاوسەرێتی یان بەستنی پەیوەندیی سێکسیدا، نێر چەند ساڵێ لە مێ گەورەترە، ئەم واقیعە دێرینە و تا ئێستاش لە زۆربەی شارستانی و کۆمەڵگەکاندا هەروەک خۆی ماوەتەوە. بۆ لێکدانەوەی ئەم دیاردەیە، ئەو تیۆرە دەهێنرێتە ئاراوە کە پێی وایە ئەوەی بڕیار لەسەر جیاوازیی تەمەن دەدات، فاکتەرێکی بایۆلۆژییە کە زامنی دابینکردنی باشترین تواناکان بۆ پیتاندن و زۆربوون دەکات، چونکە تواناکانی مێ سنووردارن، کە بە شێوەیەکی باشتر لە تەمەنی منداڵیدا دەست پێ دەکەن و هێدی هێدی لەگەڵ چوون بەتەمەندا ئەم توانایانە کەم دەبنەوە. هەرچی فاکتەری دووەمە بریتییە لە فاکتەری کۆمەڵایەتی، چونکە دابینبوونی هاوبەشێک بۆ مێ کە لە خۆی گەورەتر بێ، زیاتر زامنی دوارۆژی خۆی و دوارۆژی منداڵەکانی دەکات.

## نمایشە سێکسییەکان

زۆرێک لە بوونەوەرە زیندووەکان هەر لە مێرووەوە تا دەگاتە پۆلی مرۆڤ، جۆرە ڕەفتارێک دەنوێنن کە ئاماژە بە حەز یان پێداویستی دەدەن بەرامبەر بە هاوبەشێکی سێکسیی دیاریکراو.

ئەم جۆرە دەستپێشخەرییانە ئامانجی بایۆلۆژی بەدەست دەهێنن، سەرنجی بەرامبەر ڕادەکێشن و ئارەزووی دەوروژێنن و دەشێ ئەم ڕەفتاری خۆنمایشکردنە بۆ سەرنجڕاکێشانی بەرامبەر بە پەیوەندیی سێکسی و لێرەشەوە بە هاوژیانی، یان زۆربوون کۆتایی بێ. لە مرۆڤیشدا، هەردوو توخمەکەدا شێوەیەک لە شێوەکانی ڕەفتار دەنوێنن کە هەریەکەیان ئارەزووی بۆ ئەوی دیکە نمایش دەکات و لەم ڕێیەوە پێی دەڵێ کە ئەوی هەڵبژاردووە، بەڵام پیاو شێوازی خۆی هەیە و ژنیش شێوازی خۆی هەیە. بە شێوەیەکی گشتی مێ کەمتر لە نێر پەنا دەبات بۆ

ئەندامی سێکسی لەپێناوی مەبەستی سەرنجڕاکێشانی پیاو و ورووژاندنیدا. لەوانەیە نێر لەنێو توخمی مرۆییدا، لە شێوازی نمایشکردنی سێکسیدا نزیکتر بن لە ئاژەڵەوە، کە ئەم شێوازە لە بناغەدا ئامانجی بەدیهێنانی سەرنجڕاکێشانە لە نێوان هەردوو توخمەکەدا بە مەبەستی زۆربوون دابینبوونی خۆراک و پاراستنی مێ و وەچەکانی.

ئەو ڕەفتارانەی هەریەک لە نێر و مێ وەک خۆنمایشکردن بە مەبەستی سەرنجڕاکێشانی یەکدی دەینوێنن، تا ئێستا خزمەتی هەمان مەبەست دەکەن، هەرچەندە خۆیان بێئاگاش بن لێی.

### ورووژاندنی سێکسی

بەدەگمەن ورووژاندنی سێکسی بە شێوەیەکی خۆبەخۆ ڕوو دەدات، لەو حاڵەتانەدا کە وا دەردەکەوێ ئەم ورووژانە بە شێوەیەکی خۆبەخۆ ڕووی داوە، بەزۆری بۆ بوونی فاکتەرێکی ورووژێنەر بۆ ئارەزووی سێکسی دەگەڕێتەوە.

تەنانەت لە کاتی نووستنیشدا، ورووژانی سێکسی و ئەو وەڵامدانەوەیەی کە لە شێوەی ئستحلامدا ڕوو دەدات، بەهۆی ناوەڕۆکی خەونەکەوەیە کە فاکتەری ورووژێنەر بووە بۆ پاڵنەر و وەڵامدانەوەی سێکسی.

لە ئەنجامی گەڕان بە شوێن ئەو فاکتەرانەدا کە دەبنە هۆی ورووژانی پاڵنەری سێکسی لە نێر و مێدا، جیاوازیی ئاشکرا لە نێوانیاندا دەردەکەوێ، نێر بەگشتی زیاتر لەڕێی فیکر و خەیاڵ و هەستە گشتییەکانەوە دەورووژێ، لە کاتێکدا مێ لە نێر زیاتر بەهۆی ورووژانی ناوچەییەوە دەورووژێ و بە شێوەیەکی سەرەکی پشت بەو ورووژانی ناوچەیی دەبەستێ بۆ ئەوەی حەز و وەڵامدانەوەی سێکسییەکانی بەهێز بکات. نێر زیاتر بەو شتانە دەورووژێ کە لەڕێی چاوەوە سەرنجی ڕادەکێشن، بەڵام مێ

زیاتر دەکەوێتە ژێر کاریگەریی گوێییەکانییەوە، لەوانەیە لەبەر ئەم هۆکارە بێ وتراوە پیاو بە چاو و ژن بە گوێ خۆشەویستی دەکات.

هەروەها لەوانەیە لەبەر هەمان هۆکار بێ، نێر حەز دەکات بە چاوی کراوەوە و لە ڕووناکیدا سێکس بکات، بەڵام مێ بە لایەوە خوازراوترە لە کاتی سێکسدا چاوی دابخات و شوێنەکەش تاریک بێ. هەر لەبەر ئەمانەشە کە نێر پشت بە سەرنجڕاکێشانی بینراوەکان دەبەستێ لە مێدا، وەک هۆیەکانی جوانکاری و ڕازاندنەوە و جل و پۆشاک، هەوڵدانی مێ-ش بۆ ئەم مەبەستە هەر لەبەر ئەوەیە ئەم پێویستییەی پیاو ڕازی بکات، بەڵام نێر هەوڵ دەدات مێ لەڕێ دەنگەوە بوروژێنێ. ئەو توێژەرەی توێژینەوە دەربارەی ڕەفتاری سێکسیی هەندێ پۆل و لقی ئاژەڵان دەکات، هەندێک لە ڕوخسارەکانی ئەم جیاوازییانە لە نێوان نێر و مێدا بەدی دەکات لە ڕووی کاریگەریی ڕەنگ و دەنگەوە، هەروەها بۆنیش کاریگەرییەکی گرنگی لە وروووژانی سێکسی لای نێر و مێ هەیە، لەوانەیە ئەم هەستە بایەخی لای نێر کەمتر بێ، لەبەر ئەوەشە کە پێویستی بە بۆنی تێپەڕکەر و وروووژێنەر هەیە، لە کاتێکدا مێ بە شێوەیەکی ئاشکراتر بە بۆنی جەستەی پیاو بە شێوە سروشتییەکەی دەوروووژێ.

### ئۆرگازم

یەکێک لە جیاوازییە سەرەکییەکانی نێوان دوو توخم لە ژیانی سێکسییاندا بریتییە لە گەیشتن بە ئۆرگازم، چونکە تێربوونی سێکسی و هەستکردن بە چێژ و حەوانەوە، هەموو ئەمانە لەنێردا تەواو نابن تەنیا بە گەیشتن بە ئۆرگازم نەبێ، کە قۆناغێکی کورتە و دوا قۆناغە لە پرۆسەی وەڵامدانەوە سێکسییەکاندا، بەبێ گەیشتن بەم قۆناغە و تەواوبوونی، نێر هەست دەکات

وەڵامدانەوەی سێکسیی لە ئاستی شکستهێنان و فەشەلدا وەستاوە. بە شێوەیەکی گشتی ئۆرگازم بە ڕێژەیەکی بەرز لە مێدا و لە ڕێژەیەکی بەرزی پەیوەندییە سێکسییەکاندا ڕوو نادات، لە بەدواداچوونی ڕای مێ و وەرگرتنی بۆچوونیان دەربارەی ئەم بابەتە، ئەوە دەرکەوتووە کە نەگەیشتنی مێ بە ئۆرگازم مەرج نییە شکستهێنانی سێکسی بگەیەنێ لای مێ، چونکە تا ئاستێکی دوور و لەوانەیە بە شێوەیەکی هەمەکی لە زۆربەی حاڵەتەکاندا مێ پشت بە پرۆسەی هاوبەشیکردنی سێکسی و سازان و گونجان لە ڕووی سۆزدارییەوە لەگەڵ هاوبەشە سێکسییەکەی ببەستێ، بە چاوپۆشین لەوەی ئۆرگازم ڕوو دەدات، یان ڕوو نادات.

## چێژ و ئازار

ڕەگەزەکانی چێژ و ئازار لە ژیانی سێکسیی هەریەکە لە نێر و مێدا هەیە، ئەم ڕەگەزانە لە دوو بواردا دەردەکەون، بواری دەروونی و بواری جەستەیی و بە پلەی جیاوازیش لە بوارێکەوە بۆ بوارێکی دیکە و لە تاکێکەوە بۆ تاکێکی دیکە و لە پەیوەندییەکی سێکسییەوە بۆ یەکێکی دیکە. زۆربەی تێبینییەکان پشتیوانی لەوە دەکەن کە فاکتەری چێژ لە نێردا کاراترە و زیاتر ڕووەو ژیانی سێکسی ئاڕاستەی گرتووە، هەروەها کرداری پراکیتزەکردنی ئازار لای مێ ئاشکراترە و زیاتر لە نێر دووبارە دەبێتەوە، مێ لە نێر کەمتر سادییە، بەڵام لە نێر ماسۆشیترە. بۆ لێکدانەوەی ئەم جیاوازییانە چەندەها تیۆر هەن، هەندێکیان پێیان وایە کە نێر زیاتر خۆپەرستە، یان نێر لەڕێی ئازاردانی مێینەوە جەخت لە دەسەڵاتی خۆی دەکاتەوە، یاخود ئازاردانی مێ دەبێتە

هۆی بەهێزکردنی پاڵنەرە سێکسییەکەی، یان قبوڵکردنی مێ بە ئازاردانی لە لایەن نێرەوە، ئەو نرخەیە کە پێویستە بیدات و لە بەرامبەر ئەو زەمانەتە کۆمەڵایەتی و ماددی و مەعنەوییەی کە پیاو پێی دەبەخشێ.

بەڵام لە لێکدانەوەی ئەم دیاردەیەدا پێویستە توانای دابینبوونی فاکتەرە بایۆلۆژییەکان فەرامۆش نەکەین کە وا دەکەن بوونی ئەم جیاوازییانە لە نێوان دوو توخمەکەدا پێویست بێ. یەکێک لەم تیۆرانە لەم بارەیەوە، پێی وایە ئازاردانی مێ لە لایەن نێرەوە قبوڵکردنی مێینەش بۆ ئەو ئازارە، ئاماژەی تیایە بۆ ئەو ئامانجەی کە پەیوەندیی سێکسیی هەیەتی و هەروەها ئەنجامدانی بەو شێوەیەی کە تا ئاستێکی دوور زامنی پرۆسەی پیتاندن و زۆربوون بکات. لەوانەیە ئەم تیۆرە لەگەڵ ئەو تێبینییەدا بگونجێ کە ڕەگەزەکانی سادی و ماسۆشی لە ئاژەڵانی دیکەشدا هەیە غەیری مرۆڤ، کە نێرەکان بڕێکی تا ڕادەیەک کەم ئازاری مێیەکان دەدەن.

### قۆناغە سێکسییەکان

سەبارەت بە بابەتی پەیوەندیی نێوان سێکس و کات، کۆمەڵێک جیاوازیی سەرەکی لە نێوان دوو توخمەکەدا هەیە. لە کاتێکدا قۆناغە زەمەنییەکان لەدوای گەیشتن بە تەمەنی باڵقبوون هێندە کاریگەرییان نابێ بۆ سەر نێر، بەڵام لە مێدا وا نییە، قۆناغە بایۆلۆژییە بڕیارلێدراوەکان، بۆ نموونە وەک سووڕی مانگانە، تەمەنی نائومێدی، دووگیانی، منداڵبوون و شیردان، زۆر کاریگەرییان دەبێ بۆ سەر ژیانی سێکسیی مێ، هەروەها خودی

کاتیش کاریگەریی هەیە بۆ سەر پاڵنەر و هێزی سێکسی لە هەردوو توخمەکەدا. لە کاتێکدا نێر لە قۆناغی هەرزەکاریدا دەگاتە ئەوپەڕی پاڵنەرە سێکسییەکانی و پاشان هێدی هێدی بە تێپەڕبوونی کات ئەم پاڵنەرانە بەرەو خوارەوە دێنەوە، بەڵام پاڵنەرە سێکسییەکان لە مێدا بە چەند ساڵێک لەدوای نێر دروست دەبن، پاشان بۆ ماوەی چەند ساڵێک زیاتر لە نێر لەو ئاستەی خۆیاندا دەمێننەوە. لەوانەیە گرنگترین جیاوازیی نێوان دوو توخمەکە لە بواری سووڕی مانگانەدا بێ، کە سووڕێکە ژیانی مێی پێ جیادەکرێتەوە و سووڕێکی هاوتا بەو لە نێردا نییە. سووڕی مانگانەی مێ بە یەکەمین سووڕی مانگانە دەست پێ دەکات کە پێی دەوترێ بێنوێژیی یەکەم Menarche، بەڵام دەستپێکردنی ئەم سووڕە، مانای دەستپێکردنی ژیانی سێکسی نییە لای مێ و ئەوە ناگەیەنێ ئیدی ئەو کچە دەتوانێ بە ئۆرگازم بگات، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە لە ژیانی کوڕدا ڕوو دەدات، کاتێک دەچێتە قۆناغی نەرزەبوون یان باڵقبوونەوە، کە باڵقبوونی واتە تێروتەواوبوونی پاڵنەری سێکسی و نێر توانای پیتاندن و گەیشتن بە ئۆرگازم- هەیە. مێ بە لایەنی کەمەوە پێویستە دوو ساڵ بوەستێ بۆ ئەوەی پاڵنەرە سێکسییەکانی بەئاگا بێنەوە، هەروەها ماوەیەکی درێژتریش، تا بتوانێ بە ئۆرگازم بگات، تەنانەت ئەمەش مەرج نییە لە هەموو کچاندا هەر ئاوا بێ. لەدوای سەقامگیربوونی سووڕی مانگانەش، بەپێی لێکۆڵینەوەکان، مێ بە ڕێکخستنێکی تایبەتیدا تێپەڕ دەبێ لە ڕووی پاڵنەر و وەڵامدانەوە سێکسییەکانی، لە سەرەتای سووڕی مانگانەدا ئەمە لە نزمترین ئاستەکانیدا دەبێ، پاشان بەکاوەخۆ زیاد دەکات، تا لە ناوەڕاستی سووڕەکەدا دەگاتە

ئەوپەڕی، پاشان هێدی هێدی کەم دەبێتەوە تا ڕۆژی سێیەم، یان چوارەم بەر لە تەواوبوونی سووڕەکە و سەرەتای بێنوێژییەکە، پاشان پاڵنەری سێکسی بەرەو سەرەوە هەڵدەکشێ تا دەگاتە ئەوپەڕی، دەگاتە ئاستێک هاوتایە بە ئاستی نیوەی سووڕەکە. ئاشکرایە ئەم خەسڵەتانە سەرباری ئەوەی کە تێبینی دەکرێ چەندەها گۆڕانکاری لە ژیانی سێکسیی مێدا دروست دەکەن، وەک دووگیانی و منداڵبوون و تەمەنی نائومێدی، ملکەچی کاریگەریی کۆمەڵێک فاکتەری بایۆلۆژی و فسیۆلۆژیش دەبن کە لە دەرەوەی ئیرادەی مێن، یان ملکەچی کاریگەریی فاکتەری کۆمەڵایەتی دەبن کە هەر دەبێ ئامانجیان بەدیهێنانی زۆربوون و مانەوەی توخم بێ.

## کتێب و توێژینەوەکان لە بواری سێکسدا

لەگەڵ ئەو بایەخە بەرفراوانەی کە بە مەسەلە سێکسییەکان دراوە لە شارستانییەتە جیاجیاکانی جیهان لە سەردەمە دێرینەکانەوە تا ئەم سەردەمەی ئێستاش، بەڵام ژمارەی کتێبە نووسراوەکان تایبەت بە بابەتە سێکسییەکان هێشتا زۆر کەمن، ئەگەر بە نووسین لە بوارەکانی دیکەدا بەراورد بکرێ، ئەو بوارانەی کە کەمتر فیکری مرۆییان سەرقاڵ کردووە.

لەوانەیە هۆکاری ئەمە بۆ سڵەمینەوە و ترسی نووسەران بگەڕێتەوە لە هەڵگرتنی بەرپرسیارێتیی چوونە ناو ئەو بابەتە هەستیارانەوە و دەرئەنجامی ئەو بەرپرسیارێتییە لە ڕووبەڕووبوونەوەی حیسابلەگەڵداکردن و سزادا. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا سیمبول و دەقی زۆرمان بەردەست کەوتوون کە ئاماژە بە هەڵوێستە باوەکان دەدەن بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان لەو سەردەمانەدا. یەکێک لەو شارستانییەتانەی کە گەڕانی بەرفراوان و گشتگیری دەربارەی مەسەلە سێکسییەکان ئەنجام داوە، شارستانییەتی عەرەبە، کە ژمارەیەک لە کتێب و هێڵکارییان بۆ بەجێ هێشتووین تایبەتن بە ژیانی سێکسی لە چەند لایەنێکی جیاجیاوە. ئەمانە و شانبەشانی چەندەها ڕۆمان و دەق کە لە کتێبە ئەدەبی یان کۆمەڵایەتی، یان ئایینییەکاندا. لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەم شوێنەوارە بەجێماوانە ئەوە بۆ خوێنەر ڕوون دەبێتەوە، بەشێک لەو نووسینانەی کە تایبەت بوون بە مەسەلە سێکسییەکان، ئامانجیان چێژ و خۆشی بووە، هەندێکی دیکەیان ئامانجیان ڕوونکردنەوەی هەندێک لایەنی ژیانی سێکسی بووە کە پەیوەندییان بە ئەدەب و هونەرەوە هەبووە، یان پەیوەندییان بە مەسەلە دەروونی و پزیشکییەکانەوە هەبووە.

ئەوەی جێگەی داخە، زۆربەی هێلکارییە دێرینەکان دەربارەی ئەم بابەتانە، یان فەوتاون، یان تا ئێستا بڵاونەکراونەتەوە. تەنیا ژمارەیەکی کەمیان لە بەردەستی خوێنەر و توێژەراندایە، بەڵام ئەوەی لە پێرستی کتێبە ونبووەکاندا، یان بڵاونەکراوەکاندا دەیبینین، زۆر بە ئاشکرا ئەوە دەخەنە ڕوو، توێژەرانی ئەم بابەتە هیچ لایەنێک لە لایەنەکانی سێکس و ژیانی سێکسییان بەجێ نەهێشتووە بێ ئەوەی توێژینەوەی تێروتەسەلی لەسەر بکەن. توێژینەوەیان دەربارەی بایەخی سێکسی لە ژیانی مرۆڤ و دامەزراندنی کۆمەڵگە و ئایینەکاندا کردووە، هەروەها توێژینەوەیان دەربارەی لایەنەکانی جوانناسی لە پەیوەندیی سێکسیدا کردووە، هەروەها دەربارەی خەسڵەتە جەستەیی و سۆزداری و ئەقڵییەکانی هەردوو هاوبەشەکە لە پەیوەندیی سێکسیدا، بەتایبەتی لە مێدا و هەروەها توێژینەوە دەربارەی پێویستیی ژیانی سێکسی بۆ حەوانەوە و بەختەوەریی مرۆڤ، هەروەها کاریگەریی کەمی، یان زۆرئەنجامدانی سێکس بۆ سەر ئەقڵ و تەندروستی و مۆراڵ، هەروەها بە وردی باسی ئەندامە سێکسییەکان و وەسفی فەرمانەکانیان کردووە لەگەڵ ئەو هۆیانەی کە زامنی پارێزگاریکردن لێیان دەکەن و ئەوانەی دەبنە هۆی بەهێزکردنی کاریگەرییان و چالاکی و سەرنجڕاکێشانیان. توێژینەوەیان دەربارەی پەیوەندییە سێکسییە سروشتی، یان فرەجۆر، یان ناسروشتییەکان کردووە و ئەو پەیوەندییانەش کە بە شاز و نائاسایی دادەنرێن، هەروەها توێژینەوەیان دەربارەی هۆیەکانی چارەسەرکردنی کێشە سێکسییەکان کردووە و هەر لە خواردن و خواردنەوە و دەرمان و ئەو ئامادەکراوانەی کە پاڵنەرە سێکسییەکان کەم دەکەنەوە، یان زیادی دەکەن، ئەوانەش کە چارەسەری حاڵەتەکانی پەککەوتنی سێکسی و کێشەکانی نەگەیشتن بە ئۆرگازم و نەهاتنی تۆو دەکەن، تا دەگاتە ئەو

بابەتانەی تەنانەت تا چەند ساڵێک بەر لە ئێستاش توێژەران بە ئاشکرا توێژینەوەیان لەسەر ئەنجام نەدەدا، بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا، بە پلەیەکی کەمتر لە گشتگیری، بە شێوەیەکی ڕاشکاوانە و بابەتییانە، هەموو بابەتە هەستیارەکان لە بواری سێکسدا باسکران و توێژینەوەیان لەسەر ئەنجامدرا.

گرنگترین ئەو کتێبانەی کە لە ڕابردووی شارستانییەتی عەرەبەوە دەربارەی بابەتی سێکس بۆمان بەجێماون، ئەم کتێبانەن:

١- جوامع اللذة، ابی الحسن علی بن نصر الکاتب.

٢- کتاب نزهة الاصحاب فی معاشرة الاحباب، السموأل بن یحیی بن عباس المغربی.

٣- نزهة الاسیاب فیما لا یوجد فی کتاب، أحمد بن یوسف التیفاشی المغربی.

٤- کتاب الباهیة و التراکیب السلطانیة، نصیرالدین الطوسی.

٥- تحفة العروس و نزهة النفوس، محمد بن أحمد المغربی.

٦- رجوع الشیخ إلی صباه، أحمد بن سلیمان.

ئەمانە و چەندەها کتێب و نووسینی دیکە، بەڵام بەناوبانگترینیان کە مەرج نییە گرنگترینیان بن، دوا کتێبیانە (گەڕانەوەی پیر بۆ تافی لاوێتی) کە نووسەرەکەی ئەحمەد بن سلێمان لە چەندەها سەرچاوەوە کۆی کردوونەتەوە کە پێشتر نووسەرانی دیکە دەربارەی ئەو بابەتە قسەیان کردووە و باسیان کردووە. ئەم کتێبە لەگەڵ نووسین و بەچاپکەیاندنیدا لەو کاتەدا، ڕەواجێکی زۆری بەدەستهێنا. ئەم کتێبەش وەک کتێبەکانی دیکە دەربارەی ئەم بابەتانە بۆ مەبەستی گاڵتەجاڕی و چێژی بێبایەخ و بەدڕەوشتی قۆرغ کرا، هەرچەندە نووسەرەکەی ئەم جۆرە قۆرغکردنەی نەخواستووە و لە پێشەکیی کتێبەکەشیدا هۆشداری دەربارەی ئەم لایەنە داوە.

هەندێک لە سەرچاوە و نووسراوە عەرەبییەکان لەگەڵ ئەوەشدا کە بەشێکیان زۆر کۆنن و بۆ سەدەی سێی کۆچی دەگەڕێنەوە، بەڵام مایەی سەرسووڕمانن، چونکە جۆرێک لە گشتگیری و وردی و عیلمانییەتیان لەخۆ گرتووە لە سەردەمانێکی مێژوودا کە نەزانین و تاریکی باڵی بەسەر خەڵکدا کێشاوە، لەگەڵ ئەوەشدا عەرەب سوودیان لە هەموو ئەو بابەت و کتێبانە لە شارستانییەتەکانی دیکەی وەک هیندی و یۆنانی و ڕۆمانی وەرگرتووە، بەڵام باسکردن و چارەسەرکردنی زۆرێک لە بابەتەکان مۆرکێکی ڕەسەنی عەرەبییان پێوە دیارە کە ئاماژەیە بۆ شارەزایی و زیرەکی و گەورەیی دەرککردن و دانایی عەرەب لە دەرئەنجام و هەڵهێنجاندا. ئەگەر بوار هەبوایە بۆ لێکۆڵینەوە لەو نووسینە بەجێماوانە بە شێوەیەکی بابەتییانەی بەدەر لە لادانی ساختە بەرامبەر بە مەسەلە سێکسییەکان، ئەو کاتە ئەوە دەسەلمێنرا کە نووسەرە عەرەبەکان پێش نووسەران و توێژەرانی هاوچەرخ کەوتوون لە زۆرێک لەو ڕاوبۆچوون و تیۆری زانستی و تەنانەت هەقیقەتی زانستی دەربارەی مەسەلە سێکسییەکان.

**نووسینەکانی شارستانییەتی هیندی**

بە پێچەوانەی نووسینەکانی دەربارەی مەسەلە سێکسییەکانن لە شارستانییەتەکانی دیکەدا، ڕەگوڕیشەی نووسینە هیندییەکان دەربارەی ئەم بابەتانە بۆ خواوەند گێڕدراونەتەوە، بەتایبەتی بالاترین خواوەند بە ناوی پراجاپاتی Prajapati خولقێنەری زەوی و ئاسمان لە بیروباوەڕە دێرینەکانی شارستانییەتی هیندیدا. وا دانراوە کە ئەم خواوەندە زانیارییەکانی لە سەد هەزار بەشدا کۆکردووەتەوە، کە بۆ سێ بەشی سەرەکی پۆلێنی کردوون، بەشی یەکەم تایبەتە بە ژیانی ڕاستگۆیانە- دراما Dhrama، بەشی دووەم تایبەتە بە دەستکەوتنی سامان و دەسەڵات- ئارسا

Artha، بەشی سێیەم تایبەتە بە دەستکەوتنی چێژ- کاما Kama.
لە بەشی سێیەمەوە کە دوابەشە، ناوی کتێبە بەناوبانگەکەی هندییەکان هاتووە بە ناوی کاماسوترا Kamasutra کە ڤاتسیانا Vatsyanaی حەکیم دایناوە، ئەم کتێبە وەک سەرچاوەیەکی سەرەکی مایەوە بۆ هەموو ئەو کتێبانەی دیکەی دوای خۆی دەربارەی ئەم بابەتانە لە شارستانییەتی هیندیدا، بە شێوەیەک تەماشای کاماسوترا کرا کە وەحییەکە لە خواوە، لەبەر ئەوە جۆرێک لە ڕۆحانییەت و پیرۆزیی بۆ خۆی پەیدا کرد. لە نووسینە هیندییەکانی دیکە دەربارەی ئەم بابەتانە، وەک ئەم کتێبانە:

١- سامایا-متریکا Samya- Matrika

٢- ڕاتا-رەسیا Rati- Rahasya

٣- ئانانجا-ڕانجا Ananga- Ranga

ئەم کتێبەی دواییان، لەدوای کاماسوترا بە بەناوبانگترین کتێبی ناسراو دادەنرێ لە دەرەوەی هیند. ناونیشانی کتێبەکە واتە (شانۆی خواوەندی خۆشەویستی). ئەم کتێبە کاریگەریی بۆ سەر شارستانییەتی عەرەبی و ئیسلامی هەبوو، چونکە نووسەرەکەی لە خزمەتی پاشایەکی هیندی موسڵماندا بوو، کە ئەمە بڵاوبوونەوەی کتێبەکەی لەنێو جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا ئاسان کرد.

لەم کتێبانەوە و نووسراوەکانی دیکەشەوە، ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە هیندییەکان لە ڕوانگەیەکی ڕۆحی و ئایینییەوە لە سێکسیان ڕوانیوە، هەروەها ئەوان بەدەست خۆپارێزی و خۆبەستنەوە بە تەنیا بیروبۆچوونێکەوە و چەپاندنەوە نەیانناڵاندووە وەک شارستانییەتەکانی دیکە بەرامبەر ئەم بابەتە تێبینی دەکرێت، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی باسکردنی سێکس ئاسان بێ و بە شێوەیەکی ڕاشکاوانە و ئازادانە و دوور لە بێشەرمی و بەدڕەوشتی باس بکرێ.

## نووسین و توێژینەوە هاوچەرخەکان

نووسین و توێژینەوە هاوچەرخەکان دەربارەی بابەتە سێکسییەکان زۆرن. زۆربەیان زانایانی ئەورووپی لە سەدەی نۆزدەدا نووسیویانە کە دەرکیان بە بایەخی سێکس لە ژیانی مرۆڤایەتیدا کردووە، بەتایبەتی کاریگەریی بۆ سەر بواری دەروونی. بەناوبانگترین توێژەران دەربارەی ئەم بابەتە لە سەدەی نۆزدەدا ئەمانەن: کارل ئالرخس K. Uirichs، هاڤلوک ئالیس Havlock Ellis، کرافت ئبنج Kraft Ebing، ئەلبێرت مۆل Albert Moll و ماگنوس هرشفیلد Magnus Hirschfield، بەڵام لە هەموویان بەناوبانگتر، کە لە هەموویان زیاتر، پێگەی سێکسی لە ژیانی دەروونیی مرۆڤدا چەسپاند، سیگمۆند فرۆید بوو، کە بەشی گەورەی نووسینەکانی تایبەت کرد بەم بابەتە و ئەو لایەنانەی کە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا پەیوەندییان بەم بابەتەوە هەیە، کە دەکرێ بە دەروازەی توێژینەوە سێکسییەکان لە ژیانی هاوچەرخدا دابنرێ.

لەدوای فرۆیدیش لایەن و شێوازەکانی توێژینەوە دەربارەی بابەتی سێکس و کاریگەرییەکەی بۆ سەر لایەنە جیاوازەکانی ژیان، زۆر زۆر بوون و لقیان لێ بووەوە.

ئەم توێژینەوانە پەرەیان سەند بۆ دروستبوونی لقێکی تایبەتمەند لە زانست بە ناوی زانستی سێکس، یان سێکسۆلۆژی Sexology، بەڵام سنوورەکانی ئەم زانستە تا ئێستا ئاشکرا و دیاریکراو نین، لەوانەیە سنووردارکردنی لە تەنیا یەک بواری زانستیدا کارێکی قورس بێ، چونکە سێکس پەیوەندی بە چەندەها لایەنی ژیانەوە هەیە، وەختە بوترێ سێکس هەرچی پەیوەندی و پەیوەستییەک کە لە ژیانی مرۆڤدا بوونیان هەیە، لە خۆی دەگرێ. لە هەموو نووسین و توێژینەوە هاوچەرخەکان بەناوبانگتر و خاوەنی کاریگەریی زیاتر و کاریگەرتر لە ئاراستەکردنی بایەخدان

به مەسەلە سێکسییەکان، توێژینەوەکانی کنزی و توێژینەوەکانی سکوفیلد بوو، کە هەردووکیان لە توێژینەوەکانیاندا پشتیان بە ڕاپرسی دەربارەی واقعی ژیانی سێکسی خەڵک بەست.

هەروەها توێژینەوەکانی ماستەرز و جۆنسۆن کە بریتی بوون لە توێژینەوەی فسیۆلۆژی دەربارەی بابەتی وەڵامدانەوە فسیۆلۆژییەکان لە پەیوەندیی سێکسیدا. لێرەدا پوختەی هەرسێ توێژینەوەکە دەخەینە ڕوو.

### توێژینەوەکانی کنزی

توێژینەوەکانی کنزی دەربارەی ژیانی سێکسی، بەرفراوانترین توێژینەوەی ڕاپرسیئامێزە لە مێژوودا، توێژینەوەکانی سامڵێکی گەورەی لە دانیشتوانی ئەمەریکا لەخۆ گرت کە ژمارەیان گەیشتە ١٢٠٠٠ تاک لە هەردوو توخمەکە، کنزی ئەنجامی توێژینەوەکانی لە دوو کتێبدا بڵاوکردەوە، یەکەمیان بە ناوی (ڕەفتاری سێکسی لە مرۆڤی نێردا) ساڵی ١٩٤٨، دووەمیشیان بە ناوی ڕەفتاری مرۆیی لە مرۆڤی مێدا ساڵی ١٩٥٣. کنزی زانیارییەکانی ڕاپرسییەکەی لەڕێی چاوپێکەوتنی ڕاستەوخۆوە دەستکەوت، ڕاپرسییەکانی هەموو ئەو لایەنانەی لەخۆ گرتبوو کە پەیوەندییان بە ڕەفتاری سێکسییەوە هەیە، وەک: تەمەن، پێگەی کۆمەڵایەتی، ئاستی خوێندەواری، باری هاوسەریتی، پێگەی جوگرافی. گرنگترین ئەو دەرئەنجامانەی کە کنزی لە توێژینەوە بەرفراوانەکەیدا دەستی کەوتوون ئەمانە بوون:

١- ٩٢%ی نێر و ٥٠%ی مێ، لە قۆناغێک لە قۆناغەکانی ژیانیاندا ماستەربەیشنیان کردووە.

٢- دەربارەی پەیوەندیی سێکسی لە دەرەوەی چوارچێوەی پەیوەندیی هاوسەریتی، ئەنجامی ڕاپرسییەکە ئاماژە دەدات ٥٠%ی ئەو پیاوانەی لە ڕاپرسییەکەدا بەشداربوون لە ماوەیەک

له ماوەکانی ژیانیاندا، پەیوەندیی سێکسییان لەگەڵ غەیری ژنەکانی خۆیاندا هەبووە، بەڵام ڕێژەی ڕوودانی ئەم پەیوەندییە لە ژناندا نیوەی ڕێژەی پیاوان بووە.

٣- دەربارەی پەیوەندیی هۆمۆسێکسوالیتیی نێربازی یان لەیزبینزم، بەپێی ڕاپرسییەکە ٨-١٠%ی نێر بە تەواوی یان سنووورداری نێربازن، واتە سێکس تەنیا لەگەڵ هاوتوخمەکەی خۆیاندا دەکەن، بەڵام ڕێژەی مێ بۆ ٢-٦% دابەزی، ئەویش لە ماوەی تەمەنی (١٦-٣٥) و بە لایەنی کەمەوە بۆ ماوەی سێ ساڵ. شانبەشانی ئەم لایەنانەی توێژینەوەکە، کنزی باسی چەندەها بابەتی دیکەی کردووە کە پەیوەندییان بە شێوازی ئەنجامدانی سێکس و وەڵامدانەوەی سێکسی و ڕەفتاری سێکسییەوە هەیە.

لە دەرئەنجامی توێژینەوەکەوە گەیشتە ئەوەی کە ژیانی سێکسیی خەڵک دەکەوێتە نێو سنوورێکی بەرفراوان لە هەمەجۆری، کە ناچارمان دەکات بڕوا بەوە بێنین ئەستەمە بڕیار بدەین لەسەر ئەوەی چی سروشتییە و چی ناسروشتییە لە ژیانی سێکسیدا.

### توێژینەوەکانی سکوفیلد

توێژینەوەکانی سکوفیلد Schofield لە توێژینەوەکانی کنزی تازەترن، بەڵام سکوفیلد بایەخی لەسەر ژیانی سێکسیی گەنجان لە ئینگلتەرا چڕ کردەوە، ساڵی ١٩٧٢ لە کتێبێکدا بە ناوی (ڕەفتاری سێکسیی گەنجان) بڵاوی کردەوە. سکوفیلد قۆناغی گەنجانی بەپێی تەمەن جیا کردەوە و لە نێوان (١٥-١٩) ساڵی داینا. دەرئەنجامەکانی ئەم توێژینەوەیە کە وردتربوون لە ئەنجامی توێژینەوەکانی کنزی، ئەمانەن:

١- دەربارەی بابەتی ئەزموونی سێکسی، دەرکەوت ٢٠%ی نێر و ١٢%ی مێ ئەزموونی سێکسییان هەبووە.

٣- دەربارەی زانیاریی سێکسی، دەرکەوت کوڕ لە تەمەنی ١٢.٥ واتە دوانزە ساڵ و نیوەوە زانیاریی سێکسی دەزانێ، بەڵام کچ لە تەمەنی بچووکترەوە واتە لە ١٢.٢ ساڵییەوە. هەرچی سەرچاوەکانی ڕۆشنبیریی سێکسییە، بە پلەی یەکەم قوتابخانەیە بەتایبەتی بۆ کچان، کەمترین زانیاریش لەڕێی خێزانەوە وەردەگرن.

٤- سەبارەت بە ئەنجامدانی سێکس لەپێش هاوسەرێتی، نیوەی کوڕان ئاماژەیان بەوە داوە کە حەز دەکەن هەر بە کوڕی بمێننەوە و ئەزموونی سێکسی تەواو ئەنجام نەدەن تا ئەو کاتەی لە چوارچێوەی پەیوەندیی هاوسەرێتیی یاساییدا ئەنجامی دەدەن، بەڵام لە کچاندا ٦٤%یان پێیان باش بووە بە پاکیزەیی بمێننەوە تا کاتی هاوسەرێتی.

### توێژینەوەکانی ماستەرز و جۆنسۆن

توێژینەوەکانی ماستەرز و جۆنسۆن Masters and Johnson جیاوازن لە توێژینەوەکانی پێشوو، چونکە پشتیان نەبەستووە بەو زانیارییانەی کە لە ڕاپرسییەکاندا لە خەڵک وەگیراون. ئەو زانیارییانەی کە لەوانەیە لەگەڵ واقیعی ڕاستەقینەی ژیانی سێکسیی تاکدا کە لە ڕاپرسییەکەدا بەشداریی کردووە، نەگونجێن.

ماستەرز و جۆنسۆن پشتیان بەو وەڵامدانەوە سێکسییانە بەست کە بەڕاستی لە کاتی پراکتیزەکردنی سێکسیدا توانییان تێبینیی بکەن. ئەم وەڵامدانەوانە ناکرێ پەردەپۆش بکرێن. هەرچەندە وەرگرتنی زانیارییەکان لە توێژینەوەکانی ماستەرز و جۆنسۆن سیفەتی تاقیگەییان هەبوو، بەڵام ئاشکرایە ڕەفتاری سێکسیی تاک و وەڵامدانەوە سێکسییەکان لەوانەیە لە بارودۆخی سروشتی و بارودۆخی تاقیکردنەوە و تاقیگەییدا وەک یەک نەبن،

هەرچەندە تاک هەوڵ بدات وەک یەک بن، ئیدی ئەمە سەبارەت بە وەلامدانەوەی دەروونی بێ، یان وەلامدانەوەی جەستەیی. لەگەڵ هەموو ئەم ئەستەمییانەدا، بەلام کۆمەڵێک هەقیقەتی گرنگ لە ئەنجامی توێژینەوەکانی ماستەرز و جۆنسۆن بەچنگ کەوتن، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١- قۆناغەکانی سووڕی وەلامدانەوەی سێکسی، کە لە شوێنێکی دیکەی ئەم کتێبەدا بە وردی باسمان کردن، پوختەکەی بەم شێوەیەیە، تاک لە وەلامدانەوەی سێکسیدا بە چوار قۆناغی دوابەدوای یەکدا تێپەڕ دەبێ کە ئەمانەن: قۆناغی ورووژان، کە دەقیقەیەک بۆ چەند سەعاتێک لەوانەیە بەردەوام بێ، بەوە دەناسرێ نێر لە چووکدا تووشی گرژی دەبێ و هەڵدەستێ، بەلام لە مێدا، ناوچەی زێ تەڕوبڕ دەبێ، ئەمانەو چەندەها وەلامدانەوەی فسیۆلۆژیی ناوچەیی، یان گشتی لە هەردوو توخمەکەدا.

قۆناغی دووەم، قۆناغی هەڵسانە لە نێردا و هەڵکشانە لە مێدا، کە بەوە دەناسرێ هەژان و ورووژان زیاتر دەبێ، لە مێدا زێ دەکرێتەوە، هەروەها لەرزینی ماسوولکەیی خۆنەویستی ڕوو دەدات کە لە نێریشدا هەمان شت ڕوو دەدات، لە هەردوو توخمەکەدا پەشۆکانی دەروونی دەگاتە ئەوپەڕی سنوور، بەلام لە قۆناغی سێیەمدا کە قۆناغی لوتکەیە، یان دەناسرێ بە قۆناغی هاویشتن، قۆناغێکی کورتخایەنە و پڕ لە هەراوزەنایە، هەناسەدان خێرا دەبێ و پەستانی خوێن بەرز دەبێتەوە، لێدانی دڵ خێرا دەکات و کرژبوونی ماسوولکەیی ڕوو دەدات. لە نێردا بەر لە فڕێدانی یان هاویشتنی تۆو، هەستێک دروست دەبێ کە نێر دەزانێ ئیتر فڕێدان یان هاویشتنی تۆو ڕوو دەدات، یان هاویشتنی تۆو حەتمییە و وا ڕوو دەدات، پاشان چوونەوە یەکی ماسوولکەیی لە هەردوو توخمەکە ڕوو دەدات و پاشان چەند ورووژمێک کە هەریەکەیان ٨ لەسەر ١٠ی چرکەیەک لە

نێوانیاندایە و وردەوردەش لە ڕووی ماوە و هێزەوە کەم دەبنەوە. قۆناغی کۆتایی و چوارەم، قۆناغی خاوبوونەوەیە، کە بە کەمبوونەوەی کاوەخۆیی لە گرژبوونی سێکسی و کەمبوونەوەی ڕوخسارەکانی هەژانی سێکسی دەناسرێ لە ڕووی دەروونی و جەستەییشەوە، لە نێردا ئەوە ئاشکرا دەردەکەوێ لە نەمانی گرژبوونی چووک و کەمبوونەوەی حەزی سێکسی، لەم قۆناغەدا، بەزۆری نێر دەکەوێتە دۆخێکەوە توانای سێکسیی ڕێگر دەبێ لە سێکسکردن، چەندە حەزی سێکسیش بۆ بەردەوامبوون لە کاری سێکسی هەبێ، بەڵام لە مێدا هەندێ حاڵەت هەیە کە مێ لەم قۆناغەدا توانای هەیە زیاتر لە جارێ بە ئۆرگازم بگات، هەروەها دەتوانێ سەرلەنوێ ڕاستەوخۆ دەست بە چالاکیی سێکسی بکاتەوە بێ ئەوەی کێشەی نەتوانین و ڕێگری، یان خاوبوونەوەی هەبێ کە لە نێردا ڕوو دەدات.

یەکێک لەو ئەنجامە دیارانەی کە لە توێژینەوەکانی ماستەرز و جۆنسۆنەوە دەستکەوت، ئاشکراکردنی ئەو ڕاستییە بوو کە زۆربەی زۆری کێشە سێکسییەکان دەرئەنجامی بە هەڵە ئاڕاستەکردنە ڕووەو سێکس، هەروەها بەهۆی بەد تێگەیشتنەوە لە کێشەکانی سێکسدا و بەهۆی نەزانینەوە، ئەم هۆکارانە لە دروستبوونی کێشەکانی سێکسدا کاریگەرییان زیاترە لە هۆکارە ئەقڵی و نەخۆشییە جەستەییەکان. هەروەها دەرکەوتووە هۆکارە دەروونییەکان لە هەموو فاکتەرەکانی دیکە بایەخیان زیاترە لە زۆربەی کێشەکانی سێکسدا، کە هۆکارە دەروونییەکان تەنیا کار ناکەنە سەر ئەو کەسەی کە بەدەست کێشەکەوە دەناڵێنێ، هێندەی کار دەکاتە سەر پەیوەندییەکەی لەگەڵ هاوبەشە سێکسییەکەیدا، لەبەر ئەوە ماستەرز و جۆنسۆن بایەخیان لەسەر پەیوەندییەکە چڕ کردەوە، نەک لەسەر هۆکارەکانی کێشەکە، یان پەککەوتنی سێکسی تەنیا لە نێر، یان مێدا.

هەروەها دانانی بەرنامەی چارەسەرکردن بەو شێوەیەی کە هەردوو هاوبەشەکە پێکەوە لە کێشەکەدا کۆ بکاتەوە و پێکەوە چارەسەری هاوبەشیان بۆ دابنێ، بۆ ئەمەش وا پێویست دەکات، هەردوو هاوبەشەکە لە یەک کاتدا پێکەوە بەشداری لە کێشە و چارەسەکردنەکەیدا بکەن لەپێناوی یەک ئامانجدا، ئەویش سەرکەوتنی پەیوەندیی سێکسیی نێوانیانە. ئەم دوو توێژەرە پرۆگرامی چارەسەکردنیان بۆ پەککەوتنی سێکسی دانا، بەتایبەتی ئەو پەککەوتنانەی کە پەیوەندییان بە ڕەپبوون و هاویشتنی تووەوە هەیە لە نێردا، هەروەها کێشەکانی ئۆرگازم و گەیشتن پێی لە هەردوو توخمەکەدا.

***

هەروەها شایەنشانی ئەو نووسین و توێژینەوانەی کە ئاماژەمان پێ دان، چەندەها نووسین و توێژینەوەی دیکە هەن لە وڵاتە جیاجیاکانی دنیادا، کە باس لە لایەنە جیاواز و زۆرەکانی ژیانی سێکسی دەکەن، بە جۆرێ لێرەدا بوار بۆ باسکردن و ناوهێنانی هەموویان نارەخسێ، بەڵام بەشەکانی ئەم کتێبە، کەم تا زۆر پشتی بە کۆمەڵێک لەو سەرچاوانە بەستووە کە ژمارەیان کەم نین.

# بەشی سیودوو

## کۆتایی

ئەم سەردەمەی ئێستامان ڕوخساری جیاجیای لە گۆڕانکاری لە هەڵوێستە کلاسیکییەکاندا بەخۆوە بینیوە بەرامبەر بە ژیانی سێکسی.

ئەم ڕوخسارانە ڕەنگدانەوەی کۆمەڵێک گۆڕانی شارستانین بە فاکتەرە ئابووری و کۆمەلایەتی و دانیشتووانی و کولتوورییەکانیشەوە.

ئەم فاکتەرانە لە کاریگەرییان بۆ سەر کۆمەڵگە هاوچەرخەکان یەکسان نین. هەرچەندە کۆمەڵگە هاوچەرخەکان، تا ئێستا پارێزگاری لە بەها سەرەکییەکانی ژیانی سێکسی دەکەن، ئەو بەهایانەی کە پشت بە ژیانی هاوسەرێتی دەبەستن، بەڵام زۆرێک لەم کۆمەڵگەیانە، شانبەشانی ئەم بەها کلاسیکیانە هەڵوێستی دیکەشیان گرتووەتەبەر و بە پلەی جیاواز ڕێگەیان بەو ڕەفتار و پەیوەندییە سێکسییانە داوە کە لەگەڵ بەشێک لەم بەها کلاسیکییانەدا ناگونجێن، هەروەها بە پلەی جیاواز ڕێگەیان داوە بەو پراکتیزە سێکسییانەی کە لەگەڵ پێداویستییەکانیدا ناگونجێن. لەگەڵ فرەژمارەیی و جیاوازیی بەها و هەڵوێستەکانی کە پەیوەندییان بەم مەسەلانەوە هەیە لە نێوان شارستانییەتێکی

هاوچەرخ و یەکێکی دیکەدا، هەروەها لە نێوان کۆمەڵگەیەک و کۆمەڵگەیەکی دیکەدا لە هەمان شارستانییەتدا، تەنانەت لە هەمان کۆمەڵگەدا لە ماوەیەکی زەمەنییەوە بۆ ماوەیەکی دیکە و لە نێوان چینێکەوە بۆ چینێکی دیکە، هەروەها ئەگەر بکرایە بەدواداچوون بۆ پەرەسەندنی ئەم هەڵوێستە جیاوازانە و هۆکارەکانیمان بکردایە، ئەوا بۆمان دەردەکەوت زۆربەی ئەو پێشکەوتنەی کە ڕووی داوە لە سەرەتاکەیدا بە لایەنی کەمەوە، بەهۆی کرانەوەی زانستی بەرامبەر ئەم لایەنە لە ژیانی کۆمەڵگەدا، ڕووی داوە. کاتێک کرانەوەی زانستییش ڕووی دا، ئیدی هیچ شتێک ڕێگر نەبوو لە بەردەم تەشەنەکردنی کرانەوە بەرامبەر بە بابەتی سێکس لە سەرجەم بوارەکاندا، وەک بواری دەروونی و کۆمەڵایەتی و پزیشکی و ڕاگەیاندن و پەروەردەیی و تەنانەت ئایینی و یاساییش.

ئەو کەسانەی یارمەتیدەربوون لە پرۆسەی کرانەوە بەرامبەر بە ژیانی سێکسی، لە مێژووی نوێدا ژمارەیان زۆرە، دیارترین ئەو زانایانەی کە بایەخیان بە ژیانی سێکسی داوە لەسەر بناغەی زانستی و تێبینی و توێژینەوە، ئەم زانایانە بوون: هاڤلوک ئالیس، کرافت ئێبنج و ڤان دی ڤێلدی Van- de Velde و ویلیەم فلایس Fliess کە لێکۆڵینەوەی بەرفراوانیان دەربارەی ئەم بابەتە ئەنجام دا کە وەسفی وردی لادانە سێکسییە جیاجیاکانیش لەخۆ دەگرن، لەگەڵ زانیاری دەربارەی جۆر و شێوازە هەمەجۆرەکان لە پەیوەندیی هاوسەرێتیدا و ڕوخسارەکانی ڕەفتاری سێکسی لە منداڵدا. لە سەرووی ئەم ڕەوە ڕابەرەوە کە چەندەها توێژینەوەیان لەم بوارەدا پێشکەش کرد، فرۆید پێشەنگی قوتابخانەی دەروونشیکاری، دێت کە چەندەها تیۆر و توێژینەوەی دەربارەی پەیوەندیی نێوان ژیانی سێکسی و ژیانی دەروونی خستە ڕوو، بەتایبەتی دەربارەی کاریگەرییە دەروونییەکانی چەپاندنی سێکسی

لە قۆناغی منداڵیدا، پاشان توێژەر و زانایانی دیکە بەدواداچوونیان بۆ تیۆرەکانی فرۆید کرد، لەوانە ئەبراهام و ستیکل، کە هەوڵیان دا لەو دیاردە سێکسییانە تێبگەن کە لە پشت تیۆرە سێکسی و دەروونیشیکارییەکانی فرۆیدەوەن. هەندێک لە شوێنکەوتووانی فرۆید هێڵێکی بایۆلۆژی-سایکۆلۆژییان گرتەبەر، لەم زانایانە وەک ئانا فرید و ئێریکسۆن Erikson. ئاراستەی ئەم زانایانە کاریگەرییەکی مەزنی هەبوو بۆ هەوڵی توێژەرانی دیکە بۆ تێگەیشتن لە ژیانی سێکسیی مێردمنداڵ و هەرزەکاران و کێشەکانی لادانی سێکسی. لە کۆتایی چلەکانی سەدەی بیستدا، کنزی و یاریدەدەرانی، یەکەمین (لەوانەیە گرنگترینیشیان بێ) لێکۆڵینەوەیان دەربارەی ژیانی سێکسیی نێر و پاشان ژیانی سێکسیی مێ لە کۆمەڵگەی ئەمەریکیدا ئەنجام دا. لێکۆڵینەوەکانیان کۆمەڵێک تاکی بە شێوەیەکی هەڕەمەکی لە دانیشتووان لەخۆ گرت و هەردوو توخمەکەشی گرتەوە، بەڵام لێکۆڵینەوەکانی دواتر پشتیان بەست بە کارکردن دەربارەی ژیانی گەنجان (سکوفیلد ١٩٦٨)، هەروەها ژیانی سێکسیی مێ (فیشەر Fisher 1973)، لە گرنگترین لێکۆڵینەوە زانستییەکانیش دەربارەی ژیانی سێکسی لە ماوەی ساڵانی شەست و حەفتاکانی سەدەی بیستدا، بریتی بوون لە توێژینەوەکانی ماستەرز و جۆنسۆن (١٩٦٦) و (١٩٧٠)، کە توێژینەوەکانیان کاریگەرییەکی مەزنی هەبوو بۆ ئاراستەکردنی بایەخدان ڕووەو توێژینەوەی فسیۆلۆژیی زانستی دەربارەی ژیانی سێکسی، هەروەها توێژینەوەکانیان کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو بۆ سەر پەرەپێدانی شێوازەکانی چارەسەرکردنی حاڵەتەکانی پشێوی و پەککەوتنی سێکسی لای پیاو، یان ژن. دواجار توێژینەوەکانی ئایزنک زانای بەناوبانگی سایکۆلۆژی، هیچی کەمتر نییە لەو توێژینەوانەی کە پێشتر ئاماژەمان پێ دان. ئایزنک هەوڵی داوە ڕەفتاری سێکسی لەڕووی بایۆلۆژییەوە، بە خەسڵەتەکانی

کەسێتییەوە ببەستێتەوە، هەروەک ئاشکرایە و لەناو کتێبەکەیدا بە ناوی سێکس و کەسێتی (١٩٧٦)، دەردەکەوێ.

بەرئەنجامی سەرجەم ئەم توێژینەوانە، دەرگایەکی دیکەیان ئاوەڵا کرد کە ناکرێ دابخرێ لە بەردەم هەوڵدان بۆ تێبینیکردن و تێگەیشتن لە ڕووە جیاوازەکانی ژیانی سێکسی.

لە تەواوی ئەم توێژینەوانە، دوو ئەنجامی سەرەکی وەچنگ کەوتوون، یەکەمیان، سەلماندنی ئەوەی ئێمە ناتوانین لە بەرامبەر لایەنی سێکسی لە ژیانی مرۆڤدا چاو دابخەین، یان فەرامۆشی بکەین، ئەنجامی دووەمیش، بریتییە لە بڕیاردان دەربارەی ئاستی پەیوەستی و پتەویی نێوان فاکتەری سێکسی لە ژیانماندا لەگەڵ فاکتەرە دەروونی و کۆمەڵایەتی و ڕەفتاری و شارستانییەتەکانی دیکەدا، هەروەها بڕواهێنان بەوەی ئەم پەیوەستییە، پەیوەستییەکی کارلێکییە، دەشێ ڕەفتاری سێکسی و دەروونیمان لە ژیاندا بگۆڕێ و هەروەها لەوانەیە هەڵوێستەکانیشمان بەرامبەر بە ڕەفتاری سێکسی بگۆڕێ.

لەگەڵ زۆری و بەرفراوانیی توێژینەوەکان دەربارەی بابەتە سێکسییەکان، بەڵام ئێمە هێشتا لە سەرەتای قۆناغەکانی توێژینەوەداین، بەتایبەتی ئەگەر دەرکمان بەوە کرد کە ئاستی توێژینەوەکانمان لە بواری ژیانی سێکسیدا چەندە لە کاروانی توێژینەوەی زانستی دواکەوتووە، هەروەها فرەڵقیی بوارەکانی توێژینەوە لەم بابەتەدا کە وا پێویست دەکات هەموو ئەو لایەنانەی دیکەی ژیان لەخۆ بگرێ کە پەیوەندییان بە ژیانی سێکسییەوە هەیە، وای کردووە توێژینەوەکان ئەستەمتر بن. سەرباری ئەمانە، پەیڕەوکردنی شێوازی لایەنگریکردن لە هەندێک لە بابەتە سێکسییەکان و پەردەپۆشکردن و شاردنەوەی هەندێکی دیکەیان، بوونەتە ئاستەنگ لە بەردەم توێژینەوەکاندا، یان بوونەتە هۆی شێواندنی ئەنجامی توێژینەوەکان.

ئەمانە و ئەستەمە هیچ کەس بتوانێ دەربارەی تواناکانی توێژینەوەی زانستی لە دواڕۆژدا پێشبینی بکات، چونکە پێشکەوتنی تەکنیکی زانستی بە تەنیا بڕیار نادات لەسەر توانای جێبەجێکردنی ڕاستەقینەی ئەم تەکنیکە. لەوانەیە ئەوە ڕوو بدات کە چاوەڕێ ناکرێ و سەرلەنوێ پەردەی ڕەش بەسەر ژیانی سێکسیدا دابدرێتەوە و سەرلەنوێ نهێنی و پەنهانی و نادیاری باڵ بەسەر ئەم ژیانەدا بکێشێتەوە، بەرلەوەی بتوانرێ گەورەترین بڕ لە نهێنییە زانستییەکانی ئاشکرا بکرێ و دەرک بە هەقیقەتەکانی ئەم ژیانە بکرێ.

***

ئەنجامی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤی زۆر بەدەست هات، ئەویش بەهۆی توێژینەوە زانستییەکانەوە کە ژیانی سێکسییان خستە بواری سەرنج و بایەخپێدان لە ژیانی گشتیدا. دەرئەنجامی پۆزەتیڤ لەڕێی ڕوونکردنەوەی واقیعی ئەم ژیانەوە دەستکەوت کە یارمەتیدەر بوو لە لەناوبردن، یان چارەسەرکردنی بەشێک لە لایەنەکانی پشێوی لە ژیانی سێکسیدا، هەروەها یارمەتیدەر بوو لە ڕامالینی لایەنگیری بەرامبەر هەندێک لایەنی ژیانی سێکسی لە هەست و سۆز و فیکری زۆر کەسدا. وای لێ هاتووە ئەستەمە لەم سەردەمەدا کەسێک ئەو ڕا کلاسیکییە قبوڵ بکات کە سێکس لە ژیانماندا تەنیا لەپێناوی پیتاندن و زۆربووندایە، هەروەها وا پێویست دەکات بێ هیچ چێژێک، تەنیا لەبەر ئەم هۆکارە ئەنجام بدرێ. هەروەها ئەستەمە لەم سەردەمەدا خەڵک بڕوا بەوە بکات کە منداڵ ژیانی سێکسیی نییە و سێکس لە باڵقبوونەوە دەست پێ دەکات، یان ژیانی سێکسی لای مێ بوونی نییە، ئەگەر هەشبێت، ئەوە تەنیا تەسلیمبوون و ڕازیکردنی حەزی سێکسیی پیاوە. لە ئەنجامە پۆزەتیڤەکانی دیکەی کە لەم توێژینەوانەوە دەستکەوتن، دەرککردن بوو بەوەی زۆرێک لەو ڕەفتارانەی کە لە ڕابردوودا بە

لادان دادەنران، لە ئێستادا وەک فرەجۆری لە سێکسدا تەماشا دەکرێن، یاخود وا حیسابیان بۆ دەکرێ کە شێوازێکن لە حەتمییەتی گوزارشکردن لە وزەی سێکسی کە تاک لەڕێی هەندێ ڕەفتاری سێکسیی تایبەتییەوە ئەنجامی دەدات کە خۆی بە شیاویان دەزانێ، پاشان بە جۆرێ تەماشای هەندێ لادانی دیکە کران کە حاڵەتی نەخۆشین و پێویستە چارەسەر بکرێن لەسەر بناغەی نۆژداری، نەک مۆراڵی. دەرئەنجامێکی دیکەی پۆزەتیڤی توێژینەوەکان خۆی لە قبوڵکردنی سێکسیدا دەنوێنێ، وەک شتێک، یان بابەتێک کە مایەی شەرم و سەرشۆڕی نییە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا. مارتن لۆسەر پێی وا بوو (سێکس مەسەلەیەکە داخی بۆ بخورێت، بەڵام ناتوانیت خۆتی لێ بەدوور بگری). ئەم وتەیەی لۆسەر دەرچوون بوو لەو ڕوانینە خۆپارێزییەی کە پێشتر بەرامبەر بە سێکس هەبوو و سێکس وەک گوناه تەماشا دەکرا. لەدوای چەند سەدەیەک لە قسەکەی مارتن لۆسەر ناتوانرێ بوترێ کە سێکس مەسەلەیەکە بۆی بەداخەوە بێت، یان داخی بۆ بخۆیت، چونکە ناکرێ مرۆڤ بۆ دیاردەیەک بەداخەوە بێت کە لە قووڵایی ژیانی مرۆڤایەتیدایە و بوونی مرۆڤ بێ ئەو مەحاڵە.

دواجار بڵاوبوونەوەی توێژینەوەکان دەربارەی مەسەلە سێکسییەکان بوو بەهۆی دروستبوونی ئەو قەناعەتەی کە ژیانی سێکسی بە شێوەیەکی سروشتی، یان نەخۆشی بەندە بە ژیانی دەروونیمانەوە.

هەرچەندە زۆربەی زانایان ڕایەکەی فرۆید بەو جۆش و پەرۆشییەوە قبووڵ ناکەن کە پێی وایە چەپاندنی سێکسی لە پشت هەموو نەخۆشییە دەروونییەکانەوەیە، بەڵام ئەوە بووەتە بابەتێکی سەقامگیر کە چەپاندنی وزەی سێکسی و ڕێگرتن لە گوزارشتکردن لێی لە ژیانی منداڵ و گەورەدا، بە حاڵەتەکانی پەککەوتنی سێکسییشەوە، دەشێ زیان بە هاوسەنگیی دەروونیی

تاک بگەیەنن و کار بکەنە سەر ڕەفتار و کار و پەیوەندییەکانی، هەروەها ببێتە هۆی دروستکردنی ناڕەحەتی و ئازار بۆ تاک، دەرککردن بەم هەقیقەتانە لەوانەیە شیاو نەبوایە، یان نەکرایە، ئەگەر مەسەلە سێکسییەکان دوور لە بواری بایەخدان بمانایەتەوە و لەژێر پەردەی چڕی خۆپارێزی و خۆبەستنەوە بە تەنیا بیروبۆچوونێکەوە و ترس و عەیبە و نەزانین و لادان و دووڕووییدا بمانایەتەوە.

کاریگەریی پۆزەتیڤی کرانەوەی زانستی و دەروونی بەرەوڕووی بابەتە سێکسییەکاندا بەدی نەهات، بێ جێهێشتنی شوێنەواری نێگەتیڤ لەسەر ژیانی گشتیمان، چونکە بڵاوبوونەوەی ئەو بیروباوەڕەی کە ژیانی سێکسی پێویستە و چەپاندنی سێکسی زیانبەخشە و هەندێک لەو لادانە سێکسییانە تەنیا فرەجۆرییە لە سێکسدا، هەروەها مێ وەک پیاو خاوەنی ژیانی سێکسی خۆیەتی، هەروەها منداڵ ڕەفتاری سێکسی تایبەت و تاکانەی خۆی هەیە، هەموو ئەمانە پاڵییان بە ژیانی سێکسییەوە نا بڕواتە ناو پێچاوپێچێکەوە یان وێڵگەیەکەوە کە زیان بەو ژیانە بگەیەنێت. زۆرێک لە زانایانی دەروونی و کۆمەڵایەتی و پەروەردە و نۆژداری، ئازادانە باسیان لە تیۆرە سێکسییەکان و یەکسانی نێوان دوو توخمەکە کرد، کە بووە هۆی دەرچوونێکی بەرنامەبۆدانەڕێژراو و پابەندنەبوو، ئەمەش بووە هۆی دەرکەوتنی زۆرێک لە ڕوخسارەکانی ئازادی و ئیباحییەتی سێکسی کە لە زۆربەی کۆمەڵگەکانی خۆرئاوا چەسپاو کۆمەڵگەکانی دیکەش لاساییان کردنەوە. یەکێک لەو ڕوخسارانە ڕێگەدان بوو بە گوزارشتی سێکسی لای منداڵان و مێردمنداڵان، هەروەها ڕێگەدان بە پەیوەندیی سێکسی بەر لە هاوسەرێتی و ئاسانکاریکردن لە ڕوانین بۆ زۆربەی لادانە سێکسییەکان و دانانیان بە فرەجۆری و فرەشێوازی، نەک لادان.

ڕێگەدان بە هەموو بوارەکانی ئەم بابەتە لە پرەنسیپی گێڕانەوەی مەسەلەکان بۆ شوێنی سروشتی خۆیان، تێپەڕی، لەبەر ئەوە کۆمەڵێک گیروگرفتی کۆمەڵایەتی و ئابووری و تۆژداری و شارستانی و مۆراڵی سەریان هەڵدا کە کاریگەری و بایەخیان کەمتر نەبوو لە بایەخی لایەنە پۆزەتیڤەکانی کرانەوەی زانستی بەرامبەر بە سێکس، لەگەڵ ئەوەشدا کە ناتوانرێ بوترێ ئەم شەپۆلە لە ئاسانکاری بەرامبەر بە سێکس، جارێکی دیکە بۆ دواوە کشایەوە، بەڵام بەڵگە لەسەر ئەوە زۆرە هەندێک لەو کۆمەڵگەیانەی کە تا ئەوپەڕی ئەم ئاسانکارییەیان قۆرغ کردبوو، دەستیان کردەوە بە گەڕانەوە بۆ ژیانێکی سێکسیی هاوسەنگتر لە ڕووی وزەی سێکسییەوە، هەروەها زۆرێک لە زانایانی سایکۆلۆژی و پەروەردە کە لە سەرەتادا کاریان بە پیت بەپیتی تیۆرەکانی فرۆید دەکرد، هەروەها هانی تەقینەوەی ئاسانکاری و ڕێگەپێدانی سێکسییان دا و پێیان وا بوو ئەمە شێوازێکە بۆ خۆپاراستن لە نەخۆشیی دەروونی، بەڵام پەشیمان بوونەوە و دەرکیان بەوە کرد دەرئەنجامە نێگەتیڤەکان کە بەهۆی ئاسانکاری و ڕێگەدان بە سێکس پەیدا بوون، زۆر زیاتر بوون لە کاریگەریی ئەنجامە پۆزەتیڤەکان، کە لە ئەنجامی لابردنی چەپاندنی سێکسی لە ئەزموونی ژیانی تاک و هاندانی تاک بۆ چوونە ناو سێکسەوە پەیدا بوون.

هەروەها ئەنجامێکی دیکەی نێگەتیڤ و گرنگی کرانەوەی سێکسی کە کەمتر توێژەران بایەخیان پێ داوە و تێبینییان کردووە، بریتییە لە کاریگەریی شارستانی کە بەهۆی کرانەوەی هاوچەرخانەی ژیانی سێکسییەوە ڕووی دا، لەگەڵ ئەو گۆڕانانەی کە هاوکات بوون لەگەڵ ئەو شۆڕشەی کە بەسەر نەریتی سێکسیدا هات، چونکە کۆتوبەندە جیاوازەکان بۆ سەر ڕەفتاری سێکسی ئاشکرا و ڕاستەوخۆی تاک بە درێژایی سەردەمە

بەدوایەکداهاتووەکانی مێژوو، بوونە هۆی گۆڕینی بەشێک لە وزەی سێکسی (کە بەشێکی کەمیش نەبوو) بۆ شێوازی ناڕاستەوخۆ و نائاگایانە.

ئەو نرخەی کە مرۆڤ بە ناچاری لەپێناوی ئەم گۆڕانەدا بەخشیی، بریتی بوو لە بێبەشبوون و کوژان و ئازار، بەڵام ئەم نرخە بایەخی خۆی جێهێشت لەڕێی ئەو کاریگەرییە قووڵەوە کە بۆ سەر پێشکەوتنی شارستانی و مەدەنیەت هەیبوو، کە گومان دەکرێ ئەم پێشکەوتنە ڕووی بدایە ئەگەر مرۆڤ ناچار نەبوایە بە خۆشیی خۆی بێ یان بە زۆرەملێ کۆنترۆڵی وزەی سێکسی بکات. سەردەمی ئێستامان زۆرێک لەو گوزارشتە بەفیڕۆدەر و ئابڕووبەرانە دەربارەی ژیانی سێکسی بەخۆوە دەبینێ، کە تەنیا بەشێکی کەمیان کاریگەریی پۆزەتیڤ جێدەهێڵێ بۆ سەر پەیوەندیی سوودبەخش و داهێنەرانە بە ژیانی دەروونیمانەوە، چونکە ڕێگەدانی سێکسی دەشێ ژیانی سێکسی بۆ تەنیا وزەیەکی بایۆلۆژی بگەڕێنێتەوە و هیچ بوارێک نەهێڵێتەوە بۆ ئەوەی بەشی شاراوەی ئەو وزەیە بۆ ژیانی دەروونیمان دزە بکات و لێرەشەوە بۆ چالاکییە جیاوازەکانی ژیانمان لە چالاکیی کۆمەڵایەتی، یان شارستانی.

فرۆید خۆی یەکێک بوو لە یەکەمین ئەو کەسانەی کە دەرکیان بەم هەقیقەتە کرد. لەجیاتی ئەوەی هانی زەرووره‌تی لابردنی چەپاندنی سێکسی لە ژیاندا بدات، جەختی لە بایەخی بوونی ئەم چەپاندنە کردەوە لە ماوەی تەمەنی مێردمنداڵیدا، چونکە ئەم چەپاندنە سوودی هەیە بۆ کۆکردنەوەی وزەی سێکسی بۆ خزمەتی مەبەستە شارستانییەتەکان لە گەورەییدا، بەڵام ئەوەی لەم سەردەمەدا دەیبینین، پێچەوانەی ئەمەیە، چونکە زۆر سەرفکردنی وزەی سێکسی بووەتە هۆی کەمکردنەوەی ئەگەری ڕوودانی کۆکردنەوەی ئەو وزەیەی بۆ مەبەست و ئامانجی

شارستانی. وای لێ هاتووە ژیانی سێکسی لای زۆر کەس لە هەموو ئاماژە و سیمبولێک بەدەرە، هەروەها خاڵییە لە هێزی گوزارشکردن لە بوارە جیاوازەکانی ژیاندا. هەرچەندە ڕاپرسییەکان لە لێکۆڵینەوەکاندا تا ئێستا ئاماژە بەوە دەدەن کە سۆزی خۆشەویستی هێشتا لەناو نەوەی نوێدا لەو وڵاتانەی کە ڕێگەیان بە سێکس دراوە، بابەتێکی باو و چالاکە، بەڵام زۆرێک لەم سۆزە پەیوەستە بە پێداویستییە سێکسییە ڕاستەوخۆ و سنووردارەکانەوە، واتە خزمەتی ئامانجە ئەفرێنەرەکان ناکات کە تەنیا خۆشەویستی دەتوانێت بەدییان بێنێت و خۆشەویستیی سێکسییش ئەو توانایەی نییە. ئەگەر ژیانی سێکسی بە شێوەیەکی گونجاوتر لەگەڵ پێداویستییە مرۆیی و شارستانییەتەکاندا بۆ کۆمەڵگەی مرۆیی نەگەڕێتەوە، ئەوا دەبێت چاوەڕێی ئەوە بکەین کە مرۆڤ سەرچاوەیەکی سەرەکی و بێشومار و لەوانەیە مەزنترین سەرچاوەکانی هێز لە پرۆسەی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی و شارستانییەتدا لەدەست بدات. دەشێ پرسیارە گرنگەکە ئەوە بێت، لە کوێدا ئەو هێڵە جیاکراوەیە دابنێین لە نێوان ئەوەی کە زیانبەخشە لەگەڵ ئەوەی کە پێویستە؟ هەروەها لە نێوان ئەوەی ڕەزامەندیی لەسەرە یان ڕەزامەندیی لەسەر نییە لە پێویستییە مرۆیی و شارستانییەکاندا، هەروەها لە نێوان ئەوەی چەپاندنێکی ڕێگەپێنەدراوە، لەگەڵ ئەوەی ڕێگەپێدانێکی بێسوودە؟ لەوانەیە ئەستەم بێ بە شێوەیەکی یەکلاییکەرەوە و هەمیشەیی وەڵامی هەموو ئەمانە بدەینەوە، چونکە مرۆڤ بە سروشتی خۆی ملکەچی ڕێسا، یان کۆتوبەند نابێ، هەمیشە لە مەودایەکی بەرفراوان لە ناهاوتایی و جیاوازیدا هاتوچۆیەتی. هەموو ئەمانە دەکرێ لە ئێستادا دەرکیان پێ بکەین، چونکە لە ئێستادا بە قۆناغێکی زەمەنی و شارستانیی وادا تێپەڕ دەبین کە مرۆڤی هاوچەرخ زیادەڕۆیی دەکات لە سەرفکردنی وزەی سێکسیدا و بە شێوەیەک کە

خزمەتی گەشە شارستانییەتەکەی ناکات. لەوانەیە ئەمە تەنیا دیاردە نەبێ کە شارستانییەتەکانی ئەم سەردەمەی پێ جیادەکرێتەوە کە کۆی دیاردەکان، هۆکارێک پێکەوە کۆیان دەکاتەوە، لەوانەیە لە تەواوی ئەم شتانەدا ئاماژەیەک بەدی بکەین بۆ ئاوابوون و لەناوچوونی شارستانییەتی هاوچەرخ کە مژدەی دەرکەوتنی شارستانییەتێکی دیکەمان پێ بدات، شارستانییەتێک کە پشت بە بەهای مرۆیی نوێ ببەستێ، بە بەهای سێکسییشەوە لە ژیاندا.

## ژیاننامەی نووسەر

د. عەلی کەمال پزیشک و سایکۆلۆژیستی بە ڕەچەڵەک فەلەستینی، لە عیراق ژیانی بەسەر بردووە و کاری کردووە، مامۆستا و سەرۆکی بەشی تەندروستیی دەروونی بووە لە زانکۆی بەغدا، پزیشکێکی بەناوبانگ بووە، لە شەقامی ڕەشید کلینیکی هەبووە، بە هەزاران نەخۆش لە زۆربەی شارەکانی عیراقەوە بۆ چارەسەرکردنی کێشە دەروونییەکانیان سەردانیان کردووە.

لەنێو عەرەبدا و بەتایبەتی لە شاری بەغدا، وەک پزیشکێکی دەروونی ناوی دەرکردبوو کە دەگمەن خەڵک هەبووبێ ناوی نەبیستبێ، بەڵام لەنێو خوێنەر و ڕۆشنبیرانی کورددا زیاتر وەک نووسەر ناسراوە، بەتایبەتی بە دوو کتێبی یەکێکیان ( النفس، انفعالاتها و امراضها و علاجها)، ئەوی دیکەشیان ئەم کتێبەیە کە ئێستا وەرگێڕانەکەی لە بەردەستاندایە.

د. عەلی کەمال لەدوای کۆچی دوایی هاوسەرەکەی، زۆر دڵتەنگ و پەرێشان دەبێ و بە ماوەیەکی کەم دوای مردنی ئەو، لە ساڵی ١٩٩٦دا گیان دەسپێرێ، بەڵام گەنجینەیەکی گەورە لە زانیاری و بەرهەمی ناوازە بۆ خوێنەران بەجێ دێڵێت، سەرباری بڵاوکردنەوەی دەیان توێژینەوە و بابەتی سایکۆلۆژی لە گۆڤارە ئەکادیمی و ڕۆشنبیرییەکاندا، لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر موتەنەبی کردووە و لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە، بە پشتبەستن بە شیعرەکانی، کەسێتیی شاعیری شی کردووەتەوە.

**بەرهەمە چاپکراوەکانی:**

١. النفس، انفعالاتها وأمراضها وعلاجها
٢. النفس والجنس
٣. أبواب العقل الموصدة - باب النوم والاحلام
٤. فصام العقل (الشيزوفرينيا)
٥. العلاج النفسي قديما وحديثا

**بەرهەمە چاپکراوەکانی وەرگێڕ:**

١.ژن لە بەردەم قەیرانەکاندا، نووسین، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٤.

٢.ژن لە سەردەمی دیموکراسیدا، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، یەکێتیی ژنانی کوردستان، ٢٠٠٤. چاپی دووەم، چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی- کەرکوک ٢٠٠٨.

٣.باخچە نهێنییەکە، کورتەڕۆمان، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، بۆ نەوجوانان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٥.

٤.سایکۆلۆژیی منداڵ، نووسین، بەڕێوبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی ٢٠٠٦.

٥.بەرگریکردن لە مافەکانی ژن، وەرگێڕان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٦.

٦.ڕۆژنامەگەری و ڕۆژنامەنووسی هاوچەرخ، وەرگێڕان بە هاوبەشی لەگەڵ ڕۆژنامەنووس لوقمان غەفور، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٦.

٧.ڕووەکەکان، نووسین، بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، ٢٠٠٧.

٨.سایکۆلۆژیی ژیانی هاوسەرێتی، وەرگێڕان، خانەی وەرگێڕان، ٢٠٠٧.

٩.من هەم من شەڕانگێزم، وەرگێڕان، خانەی وەرگێڕان، ٢٠٠٨.

١٠.سایکۆلۆژیی و ڕۆشنبیریی منداڵ، نووسین، بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، ٢٠٠٨.

١١.خۆشەویستی و وزەی دەروونی، وەرگێڕان، خانەی وەرگێڕان، ٢٠٠٩.

١٢.سایکۆلۆژی و مێیەتی، نووسین، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریان، ٢٠٠٩.

١٣.کۆئەندامی هەرس، وەرگێڕان بە هاوبەشی لەگەڵ ئەکرەم قەرەداخی، خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا ٢٠٠٩.

١٤.چارەسەری سروشتی بۆ؟ وەرگێڕان بە هاوبەشی لەگەڵ ئەکرەم قەرەداخی، خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا، ٢٠٠٩.

١٥.نەخۆشیی شەکرە، وەرگێڕان بە هاوبەشی لەگەڵ ئەکرەم قەرەداخی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٩.

١٦.خۆکوشتن، وەرگێڕان لە زمانی عەرەبییەوە، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠١١ .

١٧.لەگەڵ سایکۆلۆژیادا، نووسین، بەڕێوبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، ٢٠١٢.

١٨.پەیوەندییەکانی ژن، نووسین، ٢٠١٣، لەسەر ئەرکی سندوقی کۆمەکی داهێنەرانی وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان چاپ کراوە.

١٩.پرسیار و وەڵام دەربارەی سێکس (لە دوو بەرگدا)، وەرگێڕان لە زمانی عەرەبییەوە، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠١٣.

٢٠.خەونە سێکسییەکان، وەرگێڕان لە زمانی عەرەبییەوە، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠١٤.

پرۆژەی سلیمانی پایتەختی ڕۆشنبیری

هێشتا ئەو هەقیقەتە بۆ مرۆڤ بە تەواوی ڕوون نییە، ماهییەتی سێکس چییە و بەدەر لە هۆکاری زۆربوون و مانەوەی توخمی مرۆیی، بۆچی مرۆڤ هێندە عەودالّی سێکسە و پراکتیزەکردنی سێکس بۆچی هێندە هەستیارە و بە چەندەها چەمکی سایکۆلۆژی و سۆسیۆلۆژییەوە پەیوەستە؟

بۆچی مرۆڤ پێویستی بە سێکسە؟ بەدەر لە غەریزەی زۆربوون، ئەگەر مرۆڤ سێکس نەکات، نامرێ، ئەی بۆچی ناتوانێ بێ سێکس بژی؟ زانست ڕای چییە دەربارەی ئەو بۆچوونەی کە دەڵێ: مرۆڤ لە سەرەتادا جووتتوخم بووە و هیچ پیاوێک بە تەواوی نێر نییە و هیچ ژنێکیش بە تەواوی مێ نییە....؟

D. Ali Kamal

# Sex and the Psyche

Translated by:
Suzan Jamal

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
Sardam Printing & Publishing House
2016